ناوی کتێب: بیرەوەرییەکانی سەنگاوی

نووسینی: مەحمود سەنگاوی

سالّی: ٢٠٠٥

نەخشەسازیو بەرگ: نازەنین سالّح

چاپخانەی: دەزگای چاپو پەخشی حەمدی

تیراژ: ١٥٠٠

ژمارەی سپاردن ( ١٢٩ )ی سالّی ( ٢٠٠٤ )ی وەزارەتی رۆشنبیری بۆوەرگیراوە.

پێشكەشە بە:

هەموو شەهیدانی گەلەكەم كە مۆمی سەرفرازی دوارۆژیان بە خـوێنی خۆیـان داگیرساند

# پێشەکی چاپی دووەم

چاپی یەکەمی بیرەوەرییەکانم نەگەیشتە دەست زۆر کەس بەهۆی ئـەوەی زۆرتـر بۆکتێبخانـە گشـتییەکانو هەنـدێ دامودەزگـاو لایـەنو کەسایەتی ڕۆشنبیری ناردبووم بۆیە داواکاریەکی زۆرم لەلایەن خەڵکیـەوە بۆ دەستخستنی پێگەیشتووە ، منیش لای خۆمـەوە بڕیارم دا جارێکی تـر چاپی بکەمەوە.

دیارە هەموو نووسینێك بە کامی دڵی هەموو کەسێك نییە ، بەڵکو خـەڵکی دابـەش ئەبنـە سـەر دوو بـەرەی : پشتیوانو دژ ..هەرکەسێکیش مافی خۆیەتی لەهەر بەرەیەکدا بێ ئازادانە بیرو ڕای خۆی دەربڕێ.

ئـەم بیرەوەرییانـەی منـیش بەهـەردوو ئاقارەکـەدا هـەمان هەڵوەستەی لەسـەر کـراوەو قسەی لەسـەرووتراوە .. خـەڵکانێك چی بـە نامـە یـان بـە نووسـین لەسـەر لاپـەڕەی ڕۆژنامـە یـان سـایتەکان شـتیان نووسـیوەو بـەدڵیان بـووە ، هەنـدێکی تـریش کـە زۆر کـەمن دژ بـوون تـا ڕادەی تۆمەت خستنە پاڵمان کە کاریگەری لەسەر من درووست نـەکردووە بەڵکو بەسنگی فراوانەوەوەرمگرتووەو دڵنیام ئەوانە هۆکارێك پـاڵی پێـوە نـاون ئەوشـتانەیان نووسـیبێتو ڕۆژێـك ئەگەونـەوە نـاو بازنەیویـژدانو هەست بە ئـازار ئەکـەن. ئەمـە بیرەوەرییـەکانی منـە ، ڕاو بوچوونی منـە لەسەر ڕووداوو باردۆخەکانو بۆ ستایشی خۆمم نەنووسیوە بـەڵکو باسـی شـۆڕشو میللەتەکـەمم کردووەوویسـتوومە لایـەنی کـەمی ئەوشـتانە لـە

فـەوتان ڕزگـار بکـەمو بـەپێی تـوانی خـۆم تۆمـارم کـردوون. دیـارە نووسـینێکیوا لـە هەڵەوکـەموکوڕی بـەدەر نـابێ بەتایبـەتی لـەکاتی نووسینەوە یان تایپ کردندا کە زۆر دەستی بینیوەو بڕانی کارەباش شتی لێ قرتاندووەو هەڵەشی تێکەوتووە یان شت پەڕیوە بۆیە لەم چاپەدا ئـەم مەسەلانە چاك کراونەتەوە یان دەستکاری کراون کە کاری لـە نـاوەڕۆکی بیرەوەرییەکان نەکردووە.

من لای خۆمەوە سوپاسی بێ پایانی هەموو ئـەو بـرادەرو دۆستانە ئەکـەم کـە بەتێبنیـەکانیان یارمـەتیان دام بـۆ دەوڵەمەنـد کردنـی بیرەوەرییـەکانم ..هـەروەها سوپاسـی هاوکـاری کردنـەکانی مامۆستا عـەلی پەرلـەمان ئەکـەم کــە لەگـەڵ پیاچـوونەوەو سەرپرشـتی کردنـی چاپکردنەکەیدا ماندوو بووە.

ئومێدەوارم ئەم کارەمان لە ئاستی داوای ئێوەی خوێنەری بـەڕێزدا بێ.

**مەحمود سەنگاوی**

٢٠٠٥/١٠/١

هەموو مرۆڤێك لە ژیاندا یادگاری هەیە، چ هی ڕۆژگاری خۆشیو شادیو چ هی سەردەمی ناسۆریو ناهەمواری. دیارە ژیانی پێشمەرگایەتی دەیان یادگاری سەرسووڕهێنەری تێدایە کە پەندو دەرسی باشی لێوەرئەگیرێ، بەڵام ئەوەی ڕەچاو ئەکرێ کەم پێشمەرگە بیرەوەرییەکانی یاداشت ئەکات، بەڵکو زۆر گەوهەریووشەدار ئەکەوێتە ناو گۆمی فەرامۆشیو لەیادچوونەوە، بۆیە پێویستە هەموو پێشمەرگەیەك ڕۆژانە هەر ڕووداوێك چ تایبەت بە ژیانی خۆیو چ هی شتی گشتی یاداشت بکەنو ئەوی بەدڵیاندا ختوورە ئەکات بینووسنەوە تاکو ئەو سەرچاوە بەنرخەوەکو مێژووی شۆڕش سوودی لێوەربگیرێ.

ئا لەم ڕوانگەیەوەو دەرککردن بەپێویستی ئەم مەسەلەیە دەستم دایە قەڵەم. ئەوەی خۆم تیا بەشداریم کردووەو بینیومە یا بیستوومەو پەیوەندی بەکوردو شۆڕشەوە هەبێ ئەوەی لە توانامدا هەیە نووسیومەتەوە. دیارە من نەدەستی نووسینم هەیە نەلە شێوەی یاداشت نووسینیشدا شارەزاییم هەیە، هەروەها نە لە شیکردنەوەی مەسەلە سیاسیەکانیشدا بەڵەدم. ئەوی من کردوومە هەوڵێکی بچووکە لە بواری یادگاری نووسینەوەدا کە پێویستە بۆ ئەوەیوەکو بەشدارییەکی بچکۆلانە تەماشا بکرێ بۆ نووسینەوەی مێژووی شۆڕش کە لە کۆی چەند سەرە قەڵەم نووسینێکی ئاوادا شتی باشی لێ هەڵئەهێنجرێ. چونکە زۆر جار بیرەوەری نووسینەوە ئەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ هەڵگۆزینی زانیاری بەپێز لە بابەت کێشەو مەسەلە سیاسیو ئابووریو فکریو شتە کۆمەڵایەتییەکان ... هتد. هەرچەند من بۆم نەلواوە زۆر مەبەست

لێرەدا بەتێرو تەسەلی بنووسمەوەو بەبەڵگەو مستەمسەکات شتەکان بخەمە بەردەست کەئەمە لە توانای خەڵکی شارەزا لە مەیدانی نووسینەوەدایە، بۆیە ئەوەی من ناچێتە ئەم خانەیەوە.

دیارە بە سنگێکی فراوانیشەوە هەر ڕەخنەیەك لە ناوەڕۆکی ئەم یاداشتانە بگیرێ‌وەرئەگرم چونکە لەهەموو مەبەستەکان بەرپرسیارم، بیرەوەرییەکانیش تائەم سنوورە نابڕێتەوە، بەڵکو لە نووسینەوەی شتەکانی داهاتوو ئەوەی پێویست بکات بەردەوام ئەبم.

لە کۆتاییدا هیوادرام هەموو پێشمەرگەیەك بە تایبەتی ئەوانەی کە کۆنن‌و شتەکانیان لە یاد ماوە لەم ڕووەوە کەمتەرخەمی نەکەن، چیان لە تواناداتە بیخەنە کار بۆ نووسینەوەی بیرەوەرییەکان هەر هیچ نەبێ با لە ئەرشیفدا بمێنێتەوە، کە پاشەڕۆژ سوودو کەڵکی خۆی ئەبێ، کە ئەنفالە شوومەکان زۆر شتی لێ فەوتاندین. هەقە ئەمە بکەینە داب‌و هانی برادەرانمان بدەین.

**مەحمود سەنگاوی**
**سەرەتای ساڵی ٢٠٠٤**

# مناڵی
# له جوگرافیای لادێ دا

سەنگاو ناوچەیەکی بەرفراوانە، دێهاتێکی زۆری هەیە، کۆمەڵێك هۆزی جیا جیای تێدا ئەژی وەکو: جاف، هەمەوەند، زەنگنە، ڕەباتی، شێخ ... هتد. ناحیێەك هەر بەو ناوەوە هەیە کە سەر بە قەزای چەمچەماڵە ئەکەوێتە بەردەم چیای سەگرمە، دەشتێکی پان و بەرینی هەراوە، لای خوارەوە چەمێکی بچووکی پێدا تێ ئەپەڕێ پێی ئەڵێن چەمی دەرەسوور، ئاوی زۆری نییە، جادەیەکی لێ ئەڕوات بۆ چەمچەماڵ و یەکێکی تر بەرەو قەرەداخ قیرتاو کراوە، جادەیەکی تری قیرتاو کراو بۆ قادر کەرەم بەسەر شاخی زالواودا، لەساڵی ١٩٧٦دا حکومەت دەستبەکار بوو بۆ کردنەوەی جادەیەکی تر بەبناری سەگرمەدا بۆ دەربەندیخان، دیارە ئەم ڕێگایانە هەموویان بەمەبەستی کاری سەربازی کراون نەك بۆ خزمەتگوزاری و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان و شارستانیەت.

زۆربەی دانیشتوانی سەنگاو لە دێهاتەکانی دەوروبەرییەوە هاتوون: ناوەکەی لەدووووشە پێکهاتووە: ( سەنگ + ئاو ) گوایە سەنگەکەی، خاکەکەی ئاوی هەیە یان ئاوی زۆری هەیە.

ئەم ناوچەیە زۆر دواکەوتووە، گەشە کردنی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیری ئەوتۆی بەخۆیەوە نەبینیوە، حکومەتی عێراقی بایەخی تەواوی پێ نەداوە بگرە درووست کردنیشی هەر بە مەبەستی کۆنترۆڵی ناوچەکە بووە بۆ

لێدانی دەسەڵاتی شۆڕش‌و هێزی پێشمەرگەو سەرکوتکردنی هەر جموجووڵێك ڕووبدات. دانیشتوانەکەی زۆرتر بە کشتوکاڵ‌و مەڕو ماڵات بەخێوکردنەوە خجلن، پاشماوەی پەیوەندی دەرەبەگایەتی تاڕادەیەك ئاسەواری هەرماوە، زۆر لە خەڵکەکەی پابەندی شێخ‌و مەلاو دەروێشایەتین‌و ئاغاکانی ئەو ناوەش زەبرو ڕەفتاری توندو تیژیان هەبووە بەرامبەر جووتیارو ڕەش‌و ڕووتەکان.

هەرچەندە شۆڕش پەیدابووە بەڵام ئەو ناوچەیەوەکو ناوچەکانی تر نەیتوانیوە گەشە بکاو هەلومەرجی‌وای بۆ درووست ببێ، هەر چەندە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستدا بووین، کە سەدەی پێشکەوتنی ژیارو شارستانی‌و ململانێی نێوان ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات‌و کێبەرکێ‌و جەنجاڵی ژیان بوو، ئەینا ئێمەی کورد کە لە سوچێکی لە بیر کراوی ئەم جەنجاڵییەدا قەتیس بووین بێبەری لە هەموو مافێك، بێ شناسنامەو هەمیشە لە بەردەم ڕەشەبای هەڕەشەی لە ناوچوون‌و دان پیانەناندا ئەژیاین، بە تایبەتی ئێمە لە هەموو شتێك بە تەواوەتی بێبەش بوین.

لە ناوچەیەکی ئاواداو لەدێیەکی سەرگوێ چەمی ئاوەسپیدا بە ناوی کۆیك لە بنەماڵەیەکی هەژاری جووتیار ساڵی ١٩٥٢ پێم نایە ئاسانەی ئەم جیهانە پڕ لە ئازارو ناهەمواریە، کە بە تیرە ئەچینەوە سەر ڕۆغزایی جاف کە یەکێکە لە تیرە دیارەکانی هۆزی جاف‌و لە گەرمیان‌و قەرەداخ‌و شارەزووردا نیشتەجێن، جگە لە بوونیان لە زۆر شارو شارۆچکەدا..وەکو ڕیشسپییەکانمان ئەگێڕنەوە کاتی خۆی باپیرە گەورەمان لە دێی باڵۆلی نزیك دسکەرە نیشتەجێ بووە، بەڵام بەهۆی ناکۆکی لەنێوان پیاوە باجوەرگرەکانی حەمە پاشای جاف‌و خزمەکانمانەوە یەکێك لە پیاوەکانی حەمە پاشا ئەکوژرێ، ئەو باجوەرگرانە سەرکاریشیان پێ ئەڵێن، زۆر ستەمگەرو دەستڕۆیشتوو بوون‌و ئازاری جووتیارو خەڵکە هەژارەکەیان داوە، بۆ ئەوەی کێشە بۆ ڕۆغزایی درووست نەبێت‌وایان بەباش زانیوە باربکەن، دوای ڕاوێژ پێکردنیان بەرێگای شەممەوویلەکەدا بەرەو گەرمیان کەوتونەتەڕێ.. لە قولیجان بەزیون کە هەر هۆزی سەرحەدی ڕۆغزایی تێدایە، لەوێشەوە بەدێهات‌و شارۆچکەکانی گەرمیاندا بلاوبوونەتەوە.

باوکیشم حەمە ئەمینی عەلی عەبدوڵڵای محەممەدی هەیەر، بێنەواو دەست کورت گەورە بووە. لە ساڵی ١٩٣١ باوکی لە شەڕی ئاوباریکدا شەهید کراوە، کەس نەبووە بیخاتە بەر خوێندن لە حوجرەی مەلاکان، هەر خەریکی جووتیاری بووە کە ژیانێکی تابڵێی پڕ لە ئەشکەنجەو ناهەمواری بووە، ساڵ دوانزەی مانگ وەکو هەموو جووتیارەکانی تری کوردستان بە دیار پارچە زەوییەکەوە کە کێڵاویەتی دانیشتووە خوا بارانی بۆ ببارێنێ و دەغڵەکەی بۆ سەوزبێ و بەرو بوومەکەی بچنێتەوە ئەگەر ئەویش دەردو ئافات لێی نەداو ئاغاو دەستوپەیوەندەکانیشی بەرۆکی پێ نەگرن.

دایکیشم ناوی (ئەمین مەحمود مرادخان)ە لە هۆزی ئاڵیبەگی تیرەی مکایەڵی جافە کە لە گوندی کۆیکی سەنگاو نیشتەجێ بوون و لە بنەماڵەیەکی دیاری ئەو هۆزەیە..

ئەو مەینەتیەش بۆ ئێمە بەمیرات مایەوەو بەشمان لەو باشتر نەبووە، پێنج براو خوشکێك لەپانتایی ئەم ژیانەداوەکو هەزاران بنەماڵەی ڕووت و ڕەجاڵی تری کورد ملی ڕێگای سەخت و پڕ لە ئەشکەنجەمان گرتە بەر لەژێر ساباتی ڕەنج و تەقەلای کاری کشتوکاڵی بەهۆیە دواکەوتووەکان ئارەقەی ڕەش و مۆرمان ئەڕشت، قامچی داغداری ئاغاو گەنە دەرەبەگەکان هەمیشە بە گازەرای پشتمانەوە بووە، ئەوانیش بۆ سوودی خۆیان ئامادە نەبوون کەسێك فێری حەرفێك بکەن، چونکە لەبەرژەوەندی پاشەڕۆژیان ئەترسان، بەڵام زەبرو زەنگ و چەوسانەوە خەڵك فێری خەبات ئەکەن، ئەگەرچی خەڵك لە قوتابخانەشدا نەخوێنێ، خۆ ئەگەر مەلایەك یان فەقێیەك بهاتایەو پێویست بوایە شتێك فێری خەڵکی بکات جەزرەبەیان ئەداو دووریان ئەخستەوە، پیاوە بەتەمەن و پیرەکانی ئەو ناوە بۆیان گێڕاومەتەوە کە مامۆستا مەلا کاکە حەمەی سەیفوڵڵا کە شاعیرو زانایەکی تێکۆشەرو مامۆستایەکی پایەبەرزی کورد بوو هاتووەتە دێیەکەمان و قوتابخانەیەکی کردووەتەوە، دوو سێ ساڵێك توانیویە بمێنێتەوە، جارێکی تریش هاتووەتەوەو چەند ساڵێك ماوەتەوەو پاشان چووەتە دێی فەقێ مستەفا لەوێش هەمان دەستوور قوتابخانەی کردووەتەوە، لەبەر ئەوە مەترسی لەسەر دەسەڵاتی دەرەبەگەکان

درووستکردووه، نەیتوانیوه لەوه فرەتر بمێنێتەوەو هەر خۆیشی مەبەستی بووه لە زۆر شوێنو جێگا قوتابخانە بکاتەوەو خەڵکی فێری خوێنەواریو زانست بکاتو لە کوێرەوەری نەزانین ڕزگاریان بکات ئەڵێن خەڵکەکە هەندێکیان لەوەوە فێری سروودی ئەی ڕەقیب بوونو مامۆستا هەموو ئاواتێکی فێرکردنو نووسینو خوێندنی کوردی بووه.

جا لە دەوروبەرێکی ئاواداو لە چوارچێوەی بارو دۆخێکی ئاڵۆزدا منیش زادەی دەستی ئەو دۆخو ڕۆژگارەمو ئەو هەلەم بۆ نەڕەخساوه کە ئێستاوەکو خاڵێکی ڕەش لە قووڵی دەروونما چەسپاوه، کە گەوره بوومو فامیدەم پەیدا کرد بەهۆی گوێگرتن لە خەڵكو نزیکبوونەوه لە ماڵی مەلای دێیەکەمان کەناوی مەلا سەعید بووو کابرایەکی هەژار بوو، حەزم لە خوێندن ئەکرد ئەو مەلایە جگە لە کتێبە ئایینیەکان شتێکی لە مەسەلەی فێربوونو خوێندن نەئەزانی، جارێکیان چوومە لای داوام کرد فێری خوێندنو نووسینم بکاتوەڵامی دامەوه: تازه تۆ گەوره بوویت ناتوانی فێری هیچ ببیت، منیش بە دڵشکاوییەوه گەڕامەوه لە ڕێگادا چاوم بە مەلا بەکری کوڕی کەوت مەسەلەکەم بۆ باسکرد، ئەم بە پێچەوانەی باوکیەوه ئومێدێکی گەشی پێبەخشیمووتی: نەخێر وانییە بە باشی ئەتوانی فێری نووسینو خوێندن ببیت، هەر سبەینێ دەفتەرو قەڵەم بێنەو هەوڵ ئەدەین. بۆ سبەینێ بوومە شاگردی مەلا بەکر لە سەر زەرعاتەکەمان کە پێکەوه شەریك بووین بۆ یەکەم جار هەندێ ناووووشەی بۆ نووسیم، منیش زۆر بە دڵ گەرمییەوه خەریك بووم، تاکو فێری ناوی خۆمو چەندووشەیەکی تر بووموازم نەهێنا، ئیتر بە تەواوی لە نووسینو خوێندنەوەدا شارەزابوومو ئەوەی ئێستا ئەیزانم خۆم بە قەرزارباری ئەو لە قەڵەم ئەدەم، چونکه ئەو بوو زۆر شتی فێرکردم، گرێکوێرەی گەلێك مەبەستی شاراوەی ژیانی بۆ کردمەوه.. گەر ئەو نەبوایە لەوانە بوو لە بەشە تاریکەکەی ئەم ژیانەدا بوایەم.

# خوليـــاى كوردايەتـــى

ناوچـەكەمان لـەڕووى مەسـەلەى سياسـييەوە دواكـەوتووبوو، هووشـيارى سياسىو حيزبايەتى نەبوو هەرچەند شۆڕشو هێـزى پێشمەرگە هـەبوو كـەمتر بيريـــان لـــە بڵاوكردنـــەوەى سياســـەتى شـــۆڕشو ڕۆشـــنبيركردنى خـــەڵكى لەدێهاتەكاندا ئەكردەوە، كاديرەكان ڕۆڵـى كاريگـەريان نەئـەبينى، تـەنيا هۆيـەك بـوو بـۆ چەسـپاندنى دەورى دەسـەڵاتى ئاغـاو شـێخو مـەلاكان كـە كـاديرە حيزبييـەكان ئەهاتنـە دێهاتـەكان بـە تـەنيا ئەچوونە ماڵە ئاغاكانو تەنانـەت ئابوونەكەشيان هـەر ئاغا كـۆى ئـەكردەوە، بـۆ ئـەوەى كاديرەكـان نەچـنە نـاو خەڵكييەوەدو نەكەونە ژێر كاريگەريتى بيرى شۆڕشگێڕييەوە.

زۆر جار ئەگەر كەسێك بزێو ببوايەو شتێكى بزانيايە لاى كاديرەكە بـە شيوعى لە قەڵەم ئەدراو دژايەتى ئەكرا. كەم كەس هەبوو بكەوێتە كۆڕى كـارى سياسييەوە، خزمێكم هەبوو بەناوى مەلا حەمە ئەمين قادر مراخان ئەيانووت شـيوعيەو نوێـژ ناكـاو كـافرە،وەكو شـتێكى پـيس تەماشـايان ئـەكرد بـە لاَم مەسەلەكە نوێـژو كـافر بـوون نـەبوو، بـەڵكو ئـەو خـەڵكى هوشيار ئـەكردەوەو هـانى ئـەدان نـەچـنە ژێـر ڕكێفـى شـێخو ئاغـاوە، تـاكو لەسـاڵى ١٩٦٨ هەرچـەند بەتەمەن منالْيش بووم هەر ئەو مەلا بەكرە پەيوەندى پێوەكردم بۆ ڕێكخستنى پـارتى ديمـوكراتى كوردسـتان منـيش ئەمـەم پێخـۆش بـوو هـەر ئيشـێكيان پـێ بسپاردايەم جێبەجێم ئەكرد تاكو ساڵى ١٩٦٩ كرامە ئەندام.

بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ ڕووداوێکی گرنگ بوو لەژیانی گەلەکەماندا کە شۆڕشی کوردو بەعسی حوکمڕان مۆریان کرد. ماوەی چوار ساڵ دانرا بۆ جێبەجێکردنی ناوەڕۆکەکەی، هەرکە بەیانەکە بڵاو بووەوە پارتی لە هەموو شارەکانی کوردستاندا بارەگای کردەوە، هێزی پێشمەرگە کەوتنە حەسانەوەو لە دێهاتەکاندا بارەگایان دانا.

پارتی حیزبێکی کۆنەو خاوەن مێژوویەکی دوورو درێژە لە هەلومەرجێکی بابەتیو لە ڕۆژگارێکی مێژوویی ناسکدا لە لایەن تێکۆشەرانی مەیدانی کوردایەتیو کەڵە دڵسۆزانی ڕێگای خەباتدا دروست بوو بۆ سەرکردایەتی کردنی جوڵانەوەی سیاسی کوردو خەباتی شۆڕشگێڕانەی خەڵکی کوردستانو ڕەتکردنەوەی ستەمو تاوانەکانی داگیرکەرانو دەستەبەر کردنی مافە ڕەواکانی کورد. ئەو زەمەنە مەلا مستەفاوەکو سەرکردەی یەکەمی پارتی دانرا گەر چی لە ڕووی بیری سیاسیو کاری حیزبایەتیەوە نەخشو داهێنانێکی تایبەتی نەبوو، تەنیاوەکو کەسێك لە ناوو ناوبانگی بنەماڵەکەیدا ئەو هەلەی بۆ ڕەخسا جڵەوی حیزبو سیاسەتو سەرکردایەتی شۆڕش بگرێتە دەستو دەنگۆیەکی گەورە بۆ خۆی پەیدا بکات، بە تایبەتی ئەو کاتەی کە بۆ خوارووی عێراقو دواتریش بۆ سلێمانی دوور خرابووەوەو لەوێشەوە بە هاوکاری تێکۆشەرانی سلێمانی توانی بگەڕێتەوە ناوچەی بارزان. ئەمەش پێگەی کەسایەتی بە هێز کردوەکو سەرکردەیەك تەماشا بکرێ. کاتێ حکومەتی قاسم لە گفتەکانی بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد پەشیمان بووەوەو ڕێگای سەرکوتکردنی کوردو پەلاماردانی کوردستانی گرتە بەر ئیتر شەڕو پێکادان لە نێوان کوردو حکومەتی قاسمدا بەرپا بوو، مەلا مستەفا توانیوەکو بەرپرسی یەکەمی شۆڕشو پارتیش دەربکەوێ. پارتی کە چووە شاخو هێزی چەکداری دروست کردو جاری شۆڕشی داو پێشمەرگەی لە سەنگەری بەرەنگاربوونەوەدا داناو لە شەڕەکاندا دەستی باشی لە هێزەکانی حکومەت ئەوەشاند. لە بواری سیاسیشدا چەندین جار لەگەڵ حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقدا گفتوگۆی کردووە کە دواترینیان ئەوەی ئازار بوو، کورد

هەناسەیەکی دا، هەندێ هەلی بۆ ساز بوو پشوویەکی باش بداو لە هەموو ڕوویەکەوە قازانج وەربگرێ، هەر لەم ساڵەدا پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان کە کاتی خۆی لە پارتی جیا بووبووەوە باڵی مەکتەبی سیاسیشیان پێ ئەووتن لە ئەنجامی ناکۆکی لە سەر کۆمەڵێك مەسەلەی سیاسی‌و فیکری دانوویان پێکەوە نەئەکولاّو جیا بوونەوەو کەوتنە شەڕەوە کە ئەمە گەورەترین هەڵە بوو شۆڕشی کوردی تێکەوت‌و نەتوانرا ڕێگری لەو کەم‌و کوڕی‌و گرفتانە بگرێ. مەلا مستەفا نەیتوانی تەرازووی بارەکە ڕابگرێ. لە هەلێکی تازەدا بۆئەوەی دوژمن سوود لەو ناکۆکییەوەرنەگرێ‌و ڕیزەکانی کورد یەك بگرێتەوە ئەمان خۆیان هەڵوەشاندەوەو هاتنەوە ناو پارتی، لەم پارتی شۆڕشگێڕەیش دوو لایەنی لێ جیا بووەوە، یەکێکیان جەماعەتەکەی شێخ ستار ئەوی تریشیان جەماعەتەکەی عەونی یوسفی بوون، ئەمانە نوسخەیەکی قەڵپی دەسەڵات‌و بەرنامەی شێواوی بیری بەعس بوون بۆ مەسەلەی کورد.

دوای چوار ساڵ.. بەعس لە بەڵێنەکانی خۆی پەشیمان بووەوە سەرکردایەتی پارتیش نەیتوانی سوود لەو هەلومەرجە وەربگرێ، جارێکی تریش دەمەداسیان تیژ کردەوە بۆ شەڕ وەکو بلێی خەڵاتێکە بەدرێژایی ڕۆژگار بەر باڵای کورد بڕاوە.

ساڵی ١٩٧٤ وەکو زۆربەی خەڵکەکە منیش بوومە پێشمەرگە بەلاّم بێ ئەوەی ئاگامان لەوەزعی شۆڕش‌و جۆری پەیوەندی‌و مەسەلە سیاسی‌و دبلۆماسییەکان هەبێت، ئەوە کارێك بوو تەنیا چەند کەسێك لێی بەئاگابوون. دوای ساڵێك شەڕو پێکدادانی خوێناوی حکومەتی عێراقی ئەو سەردەمە ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر سەرۆك کۆمارو سەدام حسین کەسی دووەم بوو، هەرچی تواناووزەی سەربازی هەبوو بەکاری هێنا بۆ لێدانی کوردو تەفرو توونا کردنی شۆڕش، لەم لاشەوە هێزی پێشمەرگە لە سەنگەردا بوو خوێنی سووریان ئاسۆی کوردستانی ئەنەخشاند.

ڕۆژ نەبوو حکومەت بە هێزو تۆپخانەی قورسیەوە پەلاماری گەورە نەدات، هەرچی قورسایی شەڕ هەبوو کەوتبووە ناوچەی ژووروو نزیك

سـەرکردایەتی، هـەموو کـەس ئاشـنای نـاوی شـاخەکانی سـەرتیزو حەسـەن بـەگ‌وکۆڕەك‌و هەنـدرێن بـوو بـوو، ئەوەنـدەت ئـەزانی هێزێـك بـە ئۆتـۆمبیلی ئەرتەش بەناو ئێراندا ئەچوون‌و سەریان لە خانـەوە دەرئـەکردو ئەگوێزرانـەوە ناوچەرگەی شەڕو پێکادانەکەو کۆمەڵێك شەهیدو بریندارئەهاتەوە.

لای خەڵك ئاشکرا بـوو کـە شـۆڕش بەتـەواوی پشـتی بـەئێران بەسـتووە، جبەخانەی دەوڵەتی شا لەخزمەتی شۆڕشدا بوو، خـودی ئەفسەرە ئێرانییـەکان سەرپەرشتی تۆپبارانیان ئەکـرد. بیری کــەس بـۆ ئـەوە نەئەچوو کارەساتێك ڕوویدات.

بە ڕاستیش خەڵکی لە ڕووی سۆزی نیشتمان پەروەرییـەوە شـوێن پـارتی کەوتبوون بێ ئاگا لەوەزعی سیاسی کوردستان‌و ناوچەکەو بەرژەوەنـدی ئێـران - عێـراق‌و دەوری ئیمپریـالیزم لەتێکشکاندنی هـەر سـەرکەوتنێك، بۆیـە شـتێکی سـەیر نییـە لـەدنیای سیاسـەتدا دوو دەوڵـەتی دژ بەیـەك لـە بـاری ئـاڵۆزو مەترسـیداردا بگەنــەوە یــەك‌وواز لەناکۆکییــەکانیان بهێــنن بکەونــەوێزەی میللەتەکەمان‌و نوقمی دەریای نوشستی بکەن.

زۆر جار ئـەم سـەمەرەیە لـە لاپـەڕە تاریکـەکانی ژیـانی کـورددا دووبـارە بووەتــەوە.. کەسـێك نـەبووە ڕێگـری لـەو تاوانانـە بکـات بەرامبـەر بـە کـورد ئەنجامـدراوەو بگـرە هەمیشـە لـە ژێـر هـەر پەردەیەکدا بـووبێ مرۆڤایـەتی لـە عاست کوردو ڕۆژگارە تەڵخەکانی بێدەنگ بووە.

# ئاشبەتاڵێکی ... تـــاڵ

لە بەرەبەیانی ڕۆژێکی مانگی ئازاری ١٩٧٥ دا هەورە برووسکەیەکی قایم ناخی هەموو کوردێکی سووتاندو پەل‌و پۆی شکاند، پێمان‌ووترا شۆڕش ئاشبەتاڵ.

بۆ یەکەم جار بوو گوێم بەم‌ووشەیە زرنگایەوە، لای ئێمە جۆبلاّو باوە، دوایی زانیم کە هەردووکیان یەك مانا ئەبەخشن، هەموو سەرسام بووین نەمان ئەزانی چی بکەین، دەیەها پرسیاری دڵتەزێن لە چاوی گیانمانەوە سەری دەرئەهێناو دەمەلالکێی‌وەلاّم بوون‌و بە نەهامەتی سەریان ئەنایەوە.

سەرانی شۆڕش شێواو بوون، کەس بەکەس نەبوو هەموو ماڵوێران.. هەزاران پێشمەرگەو بەرگری لوولەی چەکەکانیان شۆڕ ئەکردەوەو سەری کزیان خوارو ڕووەو مەرکەزەکانی حکومەت ئەڕۆیشتن، لە ماوەیەکی کەمدا ئەو هەموو خەڵك‌و هێزو توانایەوەکو بەفری بەهار توایەوە.. بەتەنیا یەك قسە ئەم هەموو کارەساتە ڕوویدا، مقۆمقۆی باسی یەکتر بینینی شاو سەدام لە پێتەختی جەزائیردا ئەکرا  کە ئاکام سەدام‌وازی لە هەندێ خاك‌و ئاوی عێراق هێناو دای بە شا، شایش دەستی نایە بینی شۆڕشی کورد، سەرکردایەتی پارتیش دەستی خۆبەدەستەوەدانی هەڵبڕی، بارێکی دەروونی تێکپرژاو هاتە ناوەوە، کەس بە تەمای هیچ نەما ئەیانووت جارێکی تریش کورد لە مەزاتخانەی نێودەوڵەتاندا بەشوو درایەوە. کەچی بەگوێگرتن‌و پەرۆشی شتی تازەوە ئەمبیست کە ئەمساڵ هەر کورد تووشی ئەم دەردە نەبووە، شۆڕشی  زەفار یش خەفەکرا، ئەمە دڵدانەوەیەك بوو بەلاّم بۆم دەرکەوت تیماری برینی بەسوێی

ئێمەی نەئەکرد بەسەرسامییەوە لە پاشەڕۆژمان ئەنواڕی، هەندێ جار تەنووری بیری جەهەنمییان لە بەردەمدا دائەخستین‌و ماوەیەك پێیەوە هەڵئەقرچاین: ئیتر کورد لە کوردستاندا نامێنێ.. پەرەوازەی هەندەران ئەکرێ‌و تۆوی نامێنێ.. جارێکی تر شۆڕش خەونە.

ڕۆژی ئاشبەتاڵەکە من لە دەربەند بێلوولە بووم، باسی ئاشبەتاڵم لە لایەن کادیرێکی پارتی بە ناوی حەمە جەبار بیست کە بە چاوی فرمێسکاوییەوە پێی ڕاگەیاندین، دواتر جەلالی سەیدوەلی جێگری بەتالیۆنی ٩ بانگی کردین‌و پێی‌ووتین: کێ لەگەڵمانا دێت بۆ ئێران با بێت، کێش تەسلیم بە عێراق ئەبێتەوە با بڕواتەوە. منیش کە زۆر ڕقم لە لێپرسراوەکانیان بوو بۆیە ئەم ڕێگەیەم هەڵبژارد. بەم دەروونە پڕ لە زوخ‌و زامەوە منیش لەگەڵ کۆمەڵە پێشمەرگەیەکدا لە ئاخر ڕۆژی عەفوەکەدا خۆم تەسلیمی ناحیەی سەنگاو کرد.

ئاشبەتاڵ دەرسێکی گەورە بوو بۆ کورد، دەرکەوت پارتی سەرەڕای ئەوەی پشتیوانی کوردی لەگەڵ بوو، هێزی گەورەی هەبوو، جبەخانەو پارەی باشی لەبەردەستدا بوو بەڵام حیزبێکی کارامەو هێزێکی هاوچەرخ نەبوو، لە ڕووی سیاسییەوە نەیتوانی لە گەمەی نێودەوڵەتی‌و ئیقلیمیدا یارییەك بکات هەم خۆی نەدۆڕێنێ‌و هەم کوردیش بەگورگان خواردوو نەدات، بە داخەوە ئەووەکو داشی دامە بەدەست حکومەتە ئیقلیمییەکانەوە بوو یاری پێ ئەکرا بێ‌ئاگا لەوەی گەر بەرژەوەندییەکانیان گەیشتە پلەی بڤە ئیتر کش‌ومرد لەکورد ئەکرێ. سەرکردایەتیەك ئەو هەمەوو تواناووزە جەماوەرییەی لەبەردەستدا بێ بۆ ئەبێ بەفیکەیەکی دوژمنان کاری تەواو بێت..؟

دیارە دەیان هۆی ناوەکی‌و دەرەکی بوونەمایەی ئاشبەتاڵ، کە هەتا ئێستاش ئەمووشەیە بەتەنیا ناوهێنانەکەی مایەی شەرمەزارییە، ئەگەر سەرانی شۆڕش ڕایان نەکردایە ماڵی کورد کاول نەئەبوو، لاشەی کوردو کوردستان نەئەبووە کێڵگەی نەخشەی جێبەجێکراوی بەعس کە بەنەمانی شۆڕش سێ‌کوچکەی بەعسیان: تەبعیس‌و تەعریب‌و تەهجیر شوێنیان گرتەوە.

# خەباتی
# ژێرزەمینی

دوایی گەڕامەوە دێیەکەی خۆمان جارێکی تر ئاوێزانی زێدی کۆنی خۆم بوومەوەوەکو دانیشتوویەك لەگەڵ خەڵکەکەیدا بەکاری کشتوکاڵو مەڕومالاتەوە خەریك بووینەوە. ئەو کارەساتە عەسکەریو سیاسییەی تووشی شۆڕشی کورد بوو مانای ئەوە نەبوو کورد چۆکی داداو ئیتر نەتوانێ سەر بەرزکاتەوە بەپێچەوانەوە ئەوە چۆك دادانی سیاسەتو بەرنامەی سواوی سەرکردایەتی جوڵانەوەی کورد بوو کە ئەبوو هەر ببێ، بۆیە لەبری ئەو بەرنامەیە حیزبو ڕێکخراوی شۆڕشگێڕترو خەڵکە ڕەشو ڕووتەکە بۆ ڕەتاندنەوەیواقیعی هەرەس هێناو بیریان لەوە ئەکردەوە ئەو بۆشاییە پڕبکەنەوەو تێهەڵبچنەوەو هەلومەرجی خەبات ساز بکەنەوەو نەهێڵن کوانووی تێکۆشان بێ‌پشکۆ بمێنێتەوە، ئەوە بسەلمێنن:

- ئەو سەرکردایەتییەی پێشوو لە ئاستی قوناغەکەدا نەبوو لە بەردەم سیاسەتی داگیرکەراندا حیساباتیان بۆ هەموو ئەگەرەکان ئالتی هێناو کارنامەیان لەسەر بناغەیوابەستەیی دارشتبوو.

- دوژمنواهەست نەکات کە کورد ناتوانێ بوونی خۆی بپارێزێو دژی پیلانەکانی ڕابوەستێو بەرگری لەخۆی بکات.

بۆیەوەکو ڕەدێکی ئیجابیو ڕەفزی چۆکدادانی شۆڕشو هەرۆژانی باڵەخانەی دەسەلاتی سەرکردایەتییەکەی لە مانگی ٦/١٩٧٥ یەکێتی نیشتمانی

کوردستانوەکو پێداویستییەکی گرنگی قۆناغێکی ناسکی جووڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی میللەتەکەمان لە دایك بوو کە لە دوو ڕێکخستنی کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینیو بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستانو باڵی هێڵی پان پێکهات.

کە کۆمەڵە لە مانگی ١٩٧٠/٦ درووست بوو بوو، پێنج ساڵ بوو خۆی کۆکردبووەوەو ڕەگی داکوتابوو، دەوری پەیداکردبوو، بزووتنەوەش هەر لەدوای ئاشبەتاڵەوە بیری درووست بوونی لای هەندێ خەڵکی نیشتمانپەروەر بەرجەستە بوو بوو.

لە دایك بوونی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەنگێکی گەورە بوو لە ئەنجامی پێویستییەکی بابەتی ڕاستەقینەی بارودۆخێکی ئاڵۆزی جووڵانەوەی کوردا هاتە کایەوە بۆ ئەوەی ڕەوتی ڕووداوەکان بباتەوە سەر شاڕێی مەبەستەکان بەکەرەستەی نوێو بەزەمینەیەکی پڕ بەرەکەتی هێزو توانای گەلەکەمان بۆ دابینکردنی پاشەڕۆژی ڕووناکتر.

(ی.ن.ك) وەرچەرخانێکی مەزن بوو بەهەورازی قووچدا ڕووەو لووتکەی سەرکەوتن هەڵزناو شێوازێکی نوێی هێنایە کایەوە چ لە ڕووی سەرکردایەتیو چ لە ڕووی بەرنامەی سیاسیو مامەڵە کردن لە کاروباری سیاسەتو بەڕێوەبردنی جووڵانەوەکەو تێڕوانینی بنەڕەتی مەفاهیمەکانو پەیوەندییەکانو دیاریکردنی هەڵوێست لە مەڕ هەموو ڕووداوەکانو خانەبەندی کردنی مەسەلەکان.

ئەو ماوەیەی پێشمەرگایەتیم کرد چاوم کرابووەوە فێری هەندێ شت بووم. زۆر شوێن گەڕابوومو لە ڕووی پەیوەندی کۆمەڵایەتیو عەشایەرییەوە شارەزاییم پەیداکردبوو، گەنە دەرەبەگەکان بەنەمانی شۆڕش ئەم هەلەشیان قۆستەوەوەکو لەوەپێشتر کەوتبوونە پیلانگێڕانو شەڕفرۆشتن بە جووتیارەکانی ناوچەکە، دەستو پێوەندەکانیان ئەنارده سەریان تا دەغڵو دانەکانیان بسووتێننو ماڵاتیان بدزن، ئەمجارەیانوا بیریان ئەکردوە کە ئەو خەڵکە چەکیان نەماوەو لەپشتیوانیەك ڕووت بوونەتەوە ،ئەگەر چی شۆڕش

زۆرتر پشتیوانی لەوان ئەکردو زۆر روویان بە جوتیاران‌و هەژاران نەئەدا.. ئەم‌وەزعە ئێمەشی گرتەوەو لێی بێبەش نەبووین، بەڵام ئێمە بە ئاسانی ملمان نەئەدا بۆیە نەخشەی دزێویان بۆ ئازاردانمان دائەڕشت، تاوای لێهات جارێکیان بەفیتی گەنە دەرەبەگەکان عاسەی ڕەوە کە بووە جاشێکی پیس بنێرنە سەرماڵی خاڵۆم، کەسمان لە ماڵەوە نەبووین هەموو ماڵەکەیان دزیبوو، لە تۆڵەی ئەمەدا عاسەی ڕەوەمان گرت‌و لێدانێکی باشمان کرد خەریك بوو بمرێت، ناکۆکییەکان توندتر بوون‌ووەزعمان خراپ بوو، پەنامان بۆ خزمەکانی ترمان لە دێی جامرێز بردو لەوێ ماینەوە، لەم لاشەوە هەرچیمان پێ‌ئەکرا بۆ ئازاردانی گەنە دەرەبەگەکان درێغیمان نەئەکرد.

پاش ماوەیەك لەساڵی ١٩٧٦ بەماڵەوە چووینە سەنگاو، من لە دائیرەی کشتوکاڵ بەکرێکار دامەزرام،وەنەبێ دامەزراندنم لە دائیرەی کشتوکاڵ خجڵی کردبم بۆ پەیدا کردنی بژێوی‌و نانی پاشەڕۆژو خەمی کوردو کۆستی گەورەی شۆڕشەکەی لە بیر بردبم، بەڵکو هەمیشە خایلەی ئەو بارودۆخە ناسازەم لە دەروونـدا بوو، بە سات‌وێنەی تەماوی ئاشبەتاڵم لەبەر چاووون نەئەبوووەکو هەندە کەسانێکیش تەمومژی نائومێدی کرۆکی گیانی نەکرۆژیبووم، بەڵکو هێشتاووزەم تێدا مابوو ئەگەر جارێکی تر پێشمەرگە پەیدا بێتەوە بە تەوژمتر تێ هەڵبچمەوە، بەڵام کێ هەبوو بوێرێ قسە بکات.. هەندێك هەڵسانەوەی شۆڕش‌و پێشمەرگەیان بەخەون ئەزانی، زۆر کەس هەر پشتی لەخەڵك‌و خوای گەلەکەی کردبوو دەستەمۆی دوژمنان بوو بوون.

لە ماوەی پێشمەرگایەتی پێشوومدا ئەوەندە فێر بوو بووم کە حیزب‌و ڕێکخستن بۆ خەبات‌و تێکۆشان پێویستن. لە ئەنجامی ئەو بۆشاییەی ئاشبەتاڵ درووستی کردبوو بە تاسەوە بە شوێن ڕێکخستنێکدا ئەگەڕام ڕێپێشاندەری خەڵك بێت بۆ هەڵایسانەوەی شۆڕش. ڕۆژانە کە لەگەڵ خەڵکدا لە مەسەلەی کوردو شۆڕش ئەدواین داخی دڵی خۆم هەڵئەڕشت. کاتێك دەنگە دەنگی بوونی پێشمەرگە پەیدا بووەوە گومانم لە هەر کەسێك بکردایە هەستی

کوردایەتی‌و شۆڕشگێڕی هەیەو نەبووەتە بەعسی ئەچوومە لای‌و باس‌و خواسی شۆڕش‌و کوڕانی چیام ئەپرسی.

تاکو لە مانگی ١٩٧٦/٦ دا سەردانێکی کاك شێخ عەبدولعەزیزی داربەڕووم کرد لەگەڵیدا بێ هیچ پەردەیەك کەوتمە گفتوگۆوە، ئەو کەسێکی ژیرو بەئاگا بوو لەوەزعەکان، کاتی خۆی لای ئەو پێشمەرگە بووم زۆر هاتوو چۆم ئەکرد هەموو قسەو دەمەتەقێیەکمان لەسەر شۆڕش‌و پێشمەرگە بوو، هەر جارەی شتێکی لێ تێئەگەیشتم.. کار گەیشتە ئەوەی جارێکیان باسی ئەوەی بۆ کردم کە نیازی هەیە هێزێك لە گەرمیاندا بە ناوی خۆیەوە بکاتەوە، منیش بە فەرماندەی مەفرەزە دابنێ، من هیچ ئاگام لە شێوەی شۆڕش‌و ڕێکخستنەکەی نەبوو تەنیا هەستی کوردپەروەری‌و دڵسۆزی خاکی کوردستان هانی ئەدام ئەگەر کەسێك یەکەم پێشمەرگەی کوردستان بێت من دووەم کەسم، لە دوایدا تێگەیشتم ئەو پەیوەندی بە (ی.ن.ك)وە هەیە، بیرم ئەکردەوە تۆ بڵێی ئەمەش هەر دەستووری جاران بێت یان جیاواز ترە، لە دوایدا ئەگەیشتمە ئەوەی هەرچی بێت هەر شۆڕش بێت‌و پێشمەرگە دەرکەوێ.

زۆر ئارەزووی بینینی پێشمەرگەم ئەکرد هەرجارەی شتێکی پێ ئەووتم، پاشان ئاگاداری کردمەوە ئەمجارە ئەتوانین برادەران ببینین. کاتێکی داناو چووینە سەروەخت، کاك حەمە غەفورو چەند برادەرێکی ترمان بینی، شایانی باسە جارێکیان بەیانێکی (ی.ن.ك)م لێوەرگرت کە ئێستا نازانم دەربارەی چی بوو. دواجار لەمانگی ١٩٧٦/١١دا چوومەوە بۆ سەردانی پێی‌ووتم: سبەینێ برادەران ئەبینینەوە. چاوپێکەوتنی پێشمەرگە عەشقێکی پیرۆز بوو لەلام، لەگەڵ برادەرێکی تردا کە تفەنگێکی سەلیبی هەبوو منیش برنەوێکم کە بەسەدو پازدە دینار کڕی بوو هەڵمگرت‌و پێکەوە کەوتینە ڕێ بۆ چاوپێکەوتنەکە، کە گەیشتین کاك شێخ پێی‌ووتین: جارێ بگەڕێنەوە ماڵی خۆتان. بێ‌ئەوەی کەس بمانبینێ گەڕاینەوە. نە خۆی باسی کردو نە خۆشم ئەوەم لێپرسی بۆ بگەڕێینەوە..؟.

پاش چەند ڕۆژێك بڵاوكراوەیەكی بۆ ناردم كە هی بزووتنەوەی سۆسیالیستی كوردستان بوو. دوایی بۆم دەركەوت كەكاك شێخ لەگەڵ برادەراندا لەسەر فەرماندەیی یەكەمی ناوچەكە ڕێك نەكەوتوون، شایانیووتنە كاك شێخ عەبدولعەزیزو كاك شێخ بەهادین لە ساڵی١٩٨١ بە دەستی جاشەكانی سەنگاو لە بۆسەیەكی ڕێگای داربەڕوو ـ سەنگاو لە نزیكی دێی كچان شەهید ئەكرێن.

دوای ئەوە چاوم بەئاشنایەكی ترم كەوت ئەویش كاك مەلا ئەحمەدی مەسۆیی قەرەداخ بوو، پێكەوە زۆر قسەمان كرد، ئەو بە ناوی كۆمەڵەی ماركسی ـ لینینی ئەدوا، كاكڵەیەكی بیرو بۆچوونی ڕێكخستنەكەی بۆ باس كردم لەسەر بناغەی بیری ماركسیزم ـ لینینیزم بەپێی تێگەیشتنی خۆی.

ناوی ماركسیزم ـ لینینزمم پێخۆش بوو هەندێ جاری تریش شتیان لەم بارەیەوە بۆ باس كردبووم كە ڕێپێشاندەری چینی چەوساوەو بەش خوراوانە، ڕێگەی سەختی خەباتو تێكۆشانە بۆوەدیهێنانی ئامانجی گەلی داگیركراوو ماف زەوتكراو، چونكە منیش كوڕە جووتیارێكی چەوساوە بووم حەزم ئەكرد ئاوێزانی جۆرە بیرو ڕێبازێك بم ئەو كۆتو پێوەندە چینایەتیو كۆمەڵایەتیو سیاسییە بشكێنم، پڕ بە گەرووم دژی داگیركەرو دەرەبەگە نۆكەرەكانی هاوار بكەم، قسەكانی كاك مەلا ئەحمەد بە جۆرێك كاریگەر بوو هەر ئەو ڕۆژە پەیوەندی ڕێكخستنم لەگەڵدا بەست. ئەو هەندێ ئەركی چاودێری كردنی پیاو خراپو جاسووسەكانی سەر بە بەعسی پێسپاردم كە مانگانە بەڕاپۆرت بۆی بنووسم، لەبەر ئەوەی لێمەوە دوور بوو درەنگیش یەكتریمان ئەبینیەوە ناچار بووم پەیوەندی بە كاك عەلی محەممەد حەسەن ناسراو بە سەركەوت بكەم كە لە حكومەت قاچاخ بوو، ئاشبەتاڵی نەكردبوو، لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێشدا بووەوە پێشمەرگە. یەكتریمان بینی باسی زۆر شتمان كرد ئەویش داوای لێكردم زانیاریو دەنگوباسی بەڕاپۆرت بۆ بنووسمو پانزە ڕۆژ جارێك چاو پێكەوتنی بكەم. بەداخەوە كاك مەلا ئەحمەد لەپەلامارێكی جاشەكانی تەحسین شاوەیسو قالە فەرەجدا لەگوندی قازانقایە لەدامێنی گردە سوور ڕۆژی ١٩٧٧/٩/٣ لەگەڵ كادیری هوشیاری یەكێتی شوان عەلی سەعید ناسراو

بەشامیل‌و ٤ پێشمەرگەی تر لەدوای ئەوەی لەلایەن جاشەکانەوە گەمارۆ دەدرێن‌و دوای ٣ کاژێر شەڕی قارەمانانە کە ڕێگای دەربازبوونیان نەمابوو دوو نارنجۆك بەخۆیاندا دەتەقێننەوەو شەهید دەبن تاکو بەزیندوویی دەست ئەو جاشانەی دووژمن نەکەون .

لەم قۆناغەی ژیانمدا هەستم بە جۆرە خۆشی‌و ئاسودەییەك ئەکرد چونکە بەئەرکم ئەزانی لە دوای ئەو ئاشبەتاڵە تاڵە کە بۆشاییەکی لەکاری کوردایەتیدا بەرپاکرد، خۆم بخەمە ناو ئەڵقەیەکی نوێوە بۆ خەباتکردن لەپێناوی دابینکردنی مافە ڕەواکانی کوردو گەیشتن بەدوا ڕۆژی سەرفرازی کەئەم دوا ڕۆژەی کورد بێ خۆبەخت کردن‌و جەختکردن هەرگیز وەدەستنایەت.

بۆیە هەمیشە لە جموجوڵدا بووم بۆ پەیداکردنی زانیاری لەسەر دوژمن‌و ئاگادارکردنەوەی ڕێکخستن لێی‌و هەروەها پەیداکردنی دۆست‌و لایەنگر بۆ کۆمەڵە کە جۆرە هیوایەکی پێئەبەخشین‌وەکو ئاڵا هەڵگری پشتیوانیکردنی چەوساوەکان‌و داکۆکیکەر لە مافی بێبەشکراوەکان.

# له سەنگەری پێشمەرگایەتیدا:

## ساڵی ١٩٧٧

من حەزم ئەکرد ببمە پێشمەرگە کەچی بڕیاردرا کاری ناو شار بکەم، هەر کارێکیان بۆ دەست نیشان ئەکردم بە پەرۆشەوە بۆی ئەڕۆیشتم، تا کۆتایی ساڵی ١٩٧٧ مەفرەزەیەکیان پێکهێنا بە فەرماندەیی کاك سەرکەوت ڕۆژێك دیم.. داوای کرد چالاکییەك بنێمەوە ئەوان ئەنجامی بدەن کە بوونی هێزی پێشمەرگە بسەلمێنن، دوای بیرکردنەوە شەوێکم داناو شوێنێکم دیاری کرد بچنە سەر مەرکەزی پۆلیسی سەنگاو، عەسری ئەو ڕۆژە زانیاریمەوەرگرت مفەوەزی ئەمن لەگەڵ دوو ئەمنی تردا لەماڵی مفەوەزی پۆلیس دەعوەتن ئەمە لەگەڵ ئەو مەوعیدەی من دیاریم کردبوو بۆ پێشمەرگەکان یەکانگیر بوو زۆرم پێخۆش بوو چونکە لەو سەردەمەدا ئەو زەلامانە بکوژرانایە دەنگی ئەدایەوە.. کاتژمێر هەشتی ئێوارە چوومە سەر مەوعیدەکە بەداخەوە پێشمەرگەکان شوێنەکەیان لێ تێکچوو بوو تاکاتژمێر نۆ چاوەڕوانم کردن ئینجا دوو کەس هاتن بۆ لام کە بینیم ئەوا پێشمەرگەیەك بەندییەکی پێیە لێی نزیك بوومەوە تا تەوقەم نەکرد نەمزانی عومەر عەزیزی دراوسێی ماڵی خۆمانە، ئەویش منی ناسییەوەو ئاشکرابووم.. لە پێشمەرگەکە هەواڵی کاك سەرکەوتم پرسی‌ووتی: چووەتە سەر مەرکەزەکە. فرەم پێناخۆش بوو چونکە لە دوو لاوە زیانمان لێکەوت:

١. لەکیس چوونی کوشتنی ئەمن‌و مفەوەزەکان.

٢. ئەو زەلامەی بەدیل گیرابوو شایانی کوشتن نەبوو کەبەریش بدرێ من ناتوانم بگەڕێمەوە.

پاش چەند دەقیقەیەك لە مەکەزی پۆلیسەوە تەقە دەستی پێکرد، دوای نیو کاتژمێر پێشمەرگەکان گەڕانەوەو کاك سەرکەوتم دی پێیم‌ووت: باشتان نەکرد پەلەتان کرد من کاری باشترم نابووەوە لەدەستمان چوو، ئەم کابرایەی کە گرتووتانە هیچ نییەو ئەمناسێ‌و ناتوانم بگەڕێمەوە، کاك سەرکەوت ووتی: ئەیکوژین‌و تۆیش بگەڕێرەوە. قبوڵم نەکرد کوڕەکەش دەستی بەسوێند خواردن کرد ئەگەر بگەڕێمەوە بەهیچ جۆری باسم نەکات، ئەوەشم ڕەتکردەوەو لەگەڵیاندا کەوتمە ڕێ، داخەکەم مێژووی شەوەکەم لەیاد نەماوە چونکە مێژووی بە پێشمەرگە بوونمەو ئەبوایە بمزانیایەو لەیادم نەچوایە.

ئەو شەوە هەر بەڕێگاوە بووین تا گەیشتینە نزیك دێی مەسۆیی کاك سەرکەوت نەیهێشت کەس ناوم بزانێ بەڵام لەوێ بە پێشمەرگەکانی‌ووت: ئەمە برادەری خۆمانەو ئاشکرابووەو ناوی مەحمودە، بۆئەوەی لەگەڵ مەحمودێکی تردا کە پێشمەرگە بوو لەیەك جیا بکرێینەوە من بووم بە مەحمود سەنگاوی.

دیارە لەو کاتانەدا هاتنە دەرەوەی کەسیکی تەنزیمی لە لای پێشمەرگەو خەڵکی شتیکی گرنگ بوو، ئاگام لێبوو پێشمەرگەکان بەتامەوە ئەیانووت: برادەرێکی تەنزیمی ئاشکرا بووەو هاتووەتە لامان.

مەفرەزەکەی کاك سەرکەوت بە مەفرەزەی گەرمیان ناسراو بوو ژمارەی شەش کەس بوو لەوانە: مام ساڵەح گۆڕی ئەسپی، مەحمود کێلە بەرزەیی کە لە دوایدا شەهید بوو، خولە مەسۆیی کە لە دوایدا بوو بە جاش، ئەو کاتە من بێ چەك بووم هەر چەندە بڕنەویکی درێژم هەبوو بەڵام دەستم پێی نەئەگەیشت هەر لەو ماوەیەدا زەلامێك بە ناوی تۆفیق جەبار بە بڕنەوێکی درێژەوە بۆ پێشمەرگایەتی هات، پیاوێکی خراپ‌و گومان لێکراو بوو ئەویان چەك کردو بڕنەوەکەیان بە من دا.

پاش ماوەیەکی تر لەبەر ئەوەی تەنزیم بووم‌و جێگەی باوەڕ بووم بڕیاریان دا کلاشینکۆفێکی ڕەقەم دەم بۆ بکڕن هەرچەندە ژەنگنیش بوو هەر

زۆرم پێخۆش بوو. ئەوەی پێویستە بوترێ پێشمەرگایەتی ئەم قۆناغە جیاوازی لەگەڵ ئەوی پێشوودا هەبوو، لە پێشوودا پێشمەرگە بنکەو بارەگای خۆی هەبوو جێگای حەسانەوەو پشوودانی هەبوو، ڕۆژانە بە دەستەو پەل لەناو دێهاتەکاندا جەولەی خۆیان ئەکرد، ناوچەی ڕزگارکراوی فراوان هەبوو حکومەتی عێراق دەسەڵاتی بەسەر دێهاتەکانی کوردستاندا نەبوو، جگە لە شارەکانو هەندێ شوێنی حەساس نەبێت. ڕێگاوبانو جادە گشتیو سەرەکییەکانی نێوان شارەکان بەقافڵەو کاروانی عەسکەری هاتو چۆیان تێدا ئەکرا. بەڵام ئەمجارەیان پێشمەرگە نە بنکەو بارەگای هەیە، نە ئەشیتوانی لە شوێنێکدا بمێنێتەوە بەڵکو گەڕۆكو كوڵ بە کۆڵەو کە ئەتبینی لە چاووتروکانێداوون ئەبێتو نامێنێ. جموجووڵو گەڕانو گەشتی بەپەلەو خێرا بووەتە بناغەی کارەکانی بۆ ئەوەی دوژمن پەی بە شوێنو جێگای نەباتو بەئاسانی نەکەوێتە داویەوە.

بۆ یەکەم جاروشەی پارتیزانم لەبرادەران بیست کە شێوەیەکی تازەی کاری پێشمەرگایەتییە، هەمیشە ئەو مرۆڤە تەییارو ئامادەیە لە هەموو ڕوویەکەوە سرەوتی نییە، سەر لەدوژمن ئەشێوێنێ، لێی ئەداو بەگورجی ئەڕوا. هێزەکەی دوژمن پەرەوازەو ماندووو شەکەت ئەکات. کەچی خۆیان تێشووی سەفەری دوورو درێژی خەباتییان پییە. پێشمەرگەی ئەمجارە: لە ڕەوشتو ئاکاردا نمونەی بەرزە، لە فیداکاریو دەستوەشاندندا، ناوازەترین تابلۆی سەروەری ئەنەخشێنن. هیچ فیداکارییەکی تری سەر ڕووی ئەم زەوییە خۆیان لە قەرەی نەداوە، پێشمەرگە لەڕووی سیاسییەوە هۆشیارو تێگەیشتووو دەورو کارتێکردنیان بۆ سەرجەماوەر گرنگو ڕەوتی تایبەتی هەیە، هەتا تەشکیلەی عەسکەریش لە هی پێشوو ناکات. زاراوەی نوێ هاتوونەتە کایەوەوەکو: هەرێم، کەرت، مەفرەزە، هەروەها بۆ لێپرسراویەتیش ووشەی تازە پەیدا بووە: فەرماندەی هەرێمو کەرتو مەفرەزە.

دیارە شۆڕش کردن بەواتای گۆڕینیواقیعی کۆنو داڕشتنی بناغەی نوێیە لە ژیانو کۆمەڵدا. بۆ ئەمەش پێوستە هەرچی شتی ڕزیوو دواکەوتووە

ڕێشەکێش بکرێت، شێوازی نوێتر بێتە کایەوە، بۆیە تازەکردنەوە بەرگێکی نەخشینە لەبەر ژیانی هەڵسانەوەی ئەم جارەی ڕۆڵەکانی گەلەکەماندا لەڕووی نەخشی سیاسیو پێشمەرگایەتیو کۆمەڵایەتیو ئایدیۆلۆژییەوە.

هەر گەلێکی چەوساوە بگری لە پێناوی ڕەتکردنەوەی چەوسانەوەو ستەمدا عەشقی خەباتو گیان بەختکردنی لا ئەبێتە بەرنامەیەکی پیرۆز.. ئێمەشوەکو گەلێکی ستەمدیدە نەئەبوا لە عاست تاوانەکانی ڕژێمە داگیرکەرەکاندا خۆمان تێنەگەیەنینوولامێکی پێویستی ئەو بارە پڕ لە ئەشکەنجەو دەردی سەریەمان نەدەینەوە کە تا ئەهات لە سەرمان توندتر ئەبو.. کە دوژمنەکەمان بە ئاگرو ئاسن نەك بە گفتوگۆ لە گەڵماندا ڕەفتاربکات ئەبێ جێگەی سنان قوزەڵقورت بێ.. کە ئەو بە چەك لێمان بداو بڕوای بە هیچ شتێکیتر نەبێ، ئێمەش نەك هەر لە گەڵ چەکدا بەڵکو بە هەموو ڕێگاکانی تری بەرخۆدان ئاشنایەتیمان هەیە، هەرکامەیان پێویستی کرد ئەوا لەگەڵ ئەوەیاندا ئەڕۆین.

بۆیە پێشمەرگایەتی ئەو عەشقە بوو کە خەڵکیوەکو ئێمەمانانی کێش ئەکرد بۆ لای خۆیو ئێمەش بەو پەڕی پەرۆشیەوە خۆمان ئەگەیاندێ.

## ساڵی ۱۹۷۸

تا ئەم کاتەش لە سنووری گەرمیاندا تەنیا مەفرەزەی کاك سەرکەوت هەبوو، کەرت درووست نەبوو بوو، پاش ماوەیەك دەنگوباسمان پێگەیشت کەوا فەرماندەی هەرێمی پێنج دێتە دیوی گەرمیانو کۆبوونەوەمان پێئەکات.

بۆ یەکەم جارە کاك سیروان تاڵەبانی دێتو منیش ئەیبینموەکو فەرماندەی هەرێمی پێنج کۆبوونەوەی پێکردین. زۆر دڵم خۆش بوو بە هاتنو دیتنی. لە کۆبوونەوەکەدا باسی شۆڕشی نوێو هێزی پێشمەرگەو بارودۆخی ئاسکی کوردو کوردستانو بەرپەرچدانەوەی هێزی داگیرکەری بۆ کردین. هەموو لەشم بووبوو بەگوێ. لە بارێکی دەروونی سەیردا بووم، دیارە

گیانم لە ئاسمانێکی بەرزدا ئەفڕی. لە پەسا مێشکم هەموو قسەکانی قووت ئەدا، زۆر تامەزرۆی بیستنی شتی تازەبووم، خۆبەکوشتدان بۆ ئاوەها ئامانج‌و بیرێك لووتکەی گەورەیی مرۆڤ دەرئەخات. دالغەم بۆ ئەوە ئەچوو بۆچی هەموو کورد ڕاناپەڕێت..؟ ئەوەنییە کوردستان داگیرکراوە..؟ ئەوەنییە چەوسانەوە توێژی بەسەرمانەوە گرتووە..؟ ئەوەنییە خەڵکی بێئازادی‌و بێ خاك‌و بێ مافن..؟ ئیتر ژیان مانای چییە..؟ تاکەی بەدیلی بژین..؟ تەنیاوەلام هەر شۆڕش کردنە، چەك هەلگرتنە بۆ سڕینەوەی ئاسەواری داگیرکردن، هەر بوون بە پێشمەرگەیە. ئۆخەی کە منیش پێشمەرگەم‌و شانازی بەخەباتەوە ئەکەم.

شایانی باسە ملازم فەرهاد کە ئامۆزای شەهید ملازم جوامێری هەڵۆی سوور بوو جێگری فەرماندەی هەرێم‌و مامۆستا عەزیز لێپرسراوی لق بوو ملازم فەرهادیش قسەی بۆ کردین زۆر بە باشی لێی تێنەئەگەیشتین چونکە فەیلی بوووشە کوردییەکانی‌وەکو ئێمە دەرنەئەبڕی، هەر ئەم جارەو جارێکی تر بینیمەوەو ئیتر لێی دا چوو بۆ هەندەران پاش کۆبوونەوەکە شۆڕبووینەوە بۆ پانتایی گەرمیان، ئەو کاتە کاك خالید گەرمیانی‌و هەژار لەدەستەی کاك سیروان بوون دەنگوباسیان هەبوو بکرێنە فەرماندەی مەفرەزە.

پاش ماوەیەك بە جەولە چووینە دیوی قەرەداخ، لەو کاتەدا هێز کۆکرایەوە بۆ سەرەوە، بە نیازی چوونە ناوچەی بادینان. هەرێمی پێنج هێزێکی ئامادەکرد بچن، لەوانەش کاك خالید گەرمیانی‌و کاك ڕۆستەم بازیانی‌و کۆمەڵێك پێشمەرگەی تر، کەچی فریای هێزەکەی سەرەوە نەکەوتن‌و گەڕانەوە.

ئەو هێزەی سەرەوەش مانگی ٦/ ١٩٧٨ لەناوچەی هەکاری ئەبێ، لەبەرئەوەی هێزێکی نەشارەزای ڕێگاوبان بوون‌و خەڵکی‌وایان نەبوو یارمەتیان بدات‌و جگە لەمەش قیادە مووەقەتە دەوری خراپی گێڕا لەهاندانی خەڵکی ناوچەکەو چەکدارکردنیان بۆ دژایەتی کردنی هێزەکەی (ی.ن.ك)و پڕوپاگەندە لەبارەی دەسەلات‌و مەبەست‌و نیازەکانی (ی.ن.ك) ئەمانە بوونە مایەی ئەوەی

تووشی شەڕێکی سەخت ببن جگە لە برسێتیوویڵ بوونو سەرلێشێوان.وایکرد ئەو هەڵمەتەی ئەو هێزە خۆی بۆ تەرخان کردبوو بۆ گەیشتنە ناوچەی بادینان سەرکەوتن بەدەست نەهێنێ. چونکە ناوچەی بادینان شوێنێکی فراوانو بایەخدار بوو بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش، قاعیدەیەکی باشی لێپەیدا ئەبوو، هەرچەندە سەرەتای دەستپێکردنی مەفرەزەو کارکردن لەو ناوەدا بووە بەڵام هەرجارەی بەهۆی ناکۆکی قیادە موەقەتە ئەو مەفرەزانە تووشی لێدان ئەبوون کە دواترینیان مەفرەزەکەی شەهید برایم عەزۆو هاوڕێکانی بوو لە ساڵی ١٩٧٦دا دواتریش مەفرەزەکەی ملازم حەسەن خۆشناو یش تووش بوونو کەسیان دەرنەچوونو هەموویان شەهید کردن. ئەو هێزە لەشەڕی هەکاریدا بەشێکیان شەهید بوون، بەشێکیان دیل بوونو کەوتنە دەستی قیادە موەقەتە بەشێکی تریان تەسلیمی حکومەتی عێراق بوونەوە، کەمێکیان دوای ماندووبونێکی زۆر گەڕانەوە ناوچەکانی خۆمانوەکو کاک حامی حاجی غالیو کاک حەمەی حاجی مەحمودی گوڵە خانە.

گەر بهاتایە ئەو هێزەی (ی.ن.ک) تووشی شکست نەهاتایە ئەوا دەسەڵاتی (ی.ن.ک) لەو ناوچە ستراتیژیەدا قەبە ئەبوو، ئەگەرچی چەندین جاری تریش بیر لە ناردنی هێز کراوەتەوە بەڵام لەبەر ناهەمواری هەلومەرجەکەوازی لێهێنراوە، ئەمەوایکرد کە نفوز لە ناوچەکاندا جێگیر بێت، بادینان قیادە موەقەتەی تێدابێو سۆرانیش (ی.ن.ک).

بۆ جاری دووەم کاک سیروان لەڕۆژی ١٩٧٨/٨/٢٥ لەگەڵ ملازم فەرهادو کاک سامان گەرمیانیدا هاتنەوە بۆ گەرمیان. لە لەیلو چوارئیمامی پشتی دێی تەپەگەڕوس دانیشتنمان کرد، لەوێدا مەفرەزەی گەرمیان کرا بە کەرتی دووی هەرێمی پێنج، کاک سامان دانرا بەفەرماندەی کەرتەکە. ئێمە دانانی کاک سامانمان پێناخۆش بوو، بەڵکو کاک سەرکەوتمان زیاتر بە موستەهەقتر ئەزانی لەولاشەوە کاک سامانمان نە ئەناسی. ئەو کاتەش هەرێم بریتی بوو لەم کەرتانە:

- کەرتی یەکی بازیان بە فەرماندەیی کاک ڕۆستەم.

- کەرتی دووی گەرمیان بە فەرماندەیی کاك سامان.

- کەرتی سێی قەرەداخ بە فەرماندەیی کاك گۆڕان.

حکومەت لەم ماوەیەدا بەمەبەستی ئاماری کشتوکاڵ لەگەڵ مووچەخۆرەکانی دائیرەی کشتوکاڵدا هێزی سەربازی ئەنارد، هێزەکەی بۆ پاراستنی مووچەخۆران بوو نەوەکو پێشمەرگە بیانگرێ، ئەو هێزانە زۆر ئیهمال بوون وایانئەزانی پێشمەرگە نییە دەستیان لێبوەشێنێ. ئەم ئیهمالییەمان قۆستەوەو ڕۆژی ١٩٧٨/٨/٢٨ لە دوو قۆڵەوە بۆسەیەکمان بۆ دانا، بەڵام تەنیا لەقۆڵی تەویلەگا کەئەکەوێتە نێوان هەزارکانیو دڕۆزنەوە لەو شوێنەی کە سەرچاوەی ئاوەسپی لێهەڵئەقوڵێ فریاکەوتینو لە هێزەکە هاتینە دەستو شەڕبەرپا بوو، تەنگمان بە دوژمن هەڵچنی، بەڵام لەبەر ئەوەی ژمارەمان کەم بوو، کەم فیشەکیش بووینو نەکا هێزی تر و کۆپتەریش بگاتە سەرمان دوای لێدانەکە بێ زیان شوێنی شەڕەکەمان بەجێهێشت، دوژمنیش زیانی گیانی هەبوو چەكو تەقەمەنی زۆریان لە شەڕگەکەدا بەجێهێشتبوو ئێمە پێمان نەزانیبوو ڕۆژی دواتر هاتنەوە بۆی، شایانی باسە ئەمە یەکەم شەڕی ڕووبەڕوو بوونەوە بوو لەلایەن مەفرەزەیەك پێشمەرگەوە چەند سەعاتێك بخایەنێ کە پێشتر شەڕی درێژخایەنی وانەکرابوو. هەر لەم ڕۆژەدا بوو کە شێخ جەمال بەهادین هات بۆ پێشمەرگایەتی، لاوێکی مێرد منداڵی تازە هەڵکەوتوو بوو. هەر لەم ڕۆژەدا خزمێکی من بە ناوی محەممەد حەمەساڵح مەولود لەلایەن برادەرانی هەرێمی پێنجەوە بەناوی جاسوسییەوە گیرا بوو بەڵام بەهۆی منالّ زۆرییەوە لە نزیك دێی بانی مۆرد بەرەڵاکرا، بۆ ڕۆژی دووەم برادەران ویستیان کاك خالید گەرمیانی بکەنە فەرماندەی مەفرەزەوەکو تاقیکردنەوە مەفرەزەیەکیان دایە بچێتە بناری گل مونەزەمەی بەعس بسووتێنێ، چوونو ئەو کاریان ئەنجامدا، دوای ئەوە کاك خالید کرا بە ف.م لە کەرتی دووی هەرێمی پێنج، ئەمەمان پێخۆش بوو لەولایشەوە هەستمان بە نەفس ئەکرد ئەم مەفرەزە تازەیە چالاکی بکاتو ئێمە هیچ نەکەین. کاك سەرکەوت

پێیووتم: تۆ شارەزای سەنگاوی شوێنێك بۆ چالاكی بدۆزەرەوە. منیش لە ڕووی شارەزاییەوە لێدانی ژووری ئەمنی سەنگاوم دەست نیشانکرد. دەستبەجێ بڕیارماندا ئەو کارە ئەنجام بدەین، بۆ ڕۆژی ١٩٧٨/٩/٣٠ چووینە سەری و دوو گوللە ئارپیجیمان لێدا، دوو پۆلیس بریندار بوون، کوژراویش هەبوو، لە کاتی گەڕانەوەماندا دوو پێشمەرگەوونبوون دوایی یەکمان گرتەوە.

دوژمن بەم چالاکییە شپرزە بوو، بۆ یەکەمجارە هاوەنی ٨٢ ملم بەکار بهێنێ و لەگەڵیدا تەڵقە تەنوورەشی هەڵدا، بۆ نەگبەتی یەکێك لەو تەڵقە تەنوورانە کەوتە پشت ملی پێشمەرگەیەکمانەوە بە ناوی خولە مەسۆیی کە زۆر ترسنۆك بوو، دەستی کردە تەپاوەتل و هاواری ئەکرد: پێغەمبەر بزنێك مەولوو بێ هیچم پێ نەیەت. دوژمن تۆپبارانیشی کردین، ڕێی کشانەوەکەمانی پێزانی، ناقیلەی بە شوێنمانا نارد بەڵام بێسوود بوو، گەیشتینە دێی باخەگردەڵە نانمان خواردو ئینجا ڕۆیشتین ڕۆژ بووەوە گەیشتینە دێی تەپە عارەب ئەمەندە هیلاك بووین کەس نەیئەتوانی حەرەسیات بگرێ، کاك سەرکەوت و کاك عومەر سەنگاوی بوونە کەمین، چونکە دوژمن شەوانە ئابلۆقەی دێکانی ئەدا کە ڕۆژ ئەبووەوە هێرشی ئەکردو دێکانی ئەپشکنی. یەکەم کەس منیان کردە حەرەس پێم عەیب بوو بڵێم ناتوانم ئەوەندە ماندوو بووم خۆم بەپێوە نەئەگرت، خۆمم هەڵسپاردە دیواری خانوویەکدا کە پێشمەرگەکان بەرامبەری خەوتبوون، دوای من نۆرەی حەرەسیاتی پێشمەرگەیەکی تر بوو نیو کاتژمێر بگرێ، خەبەرم کردەوە خۆی بۆ ڕانەگیرا ئەکەوتەوە زەوی، ناچار تاخۆر سەری دەرهێنا هەر حەرەس بووم، ئەو کاتانە مەترسی ئینزالی کۆپتەر هەبوو، ئەبوایە دوای نان و چاخواردن دوور بکەوتینایەتەوە کەچی کاك سەرکەوت ووتی: ئەگەر هەر هەمووومان کوژراوین لێرە ئەمێنینەوە. ماینەوە تا دەمەوئێوارە پاشان بەرەو دێی زستانە چووین. ئەوە تەحەدایەکی گەورە بوو لەلایەن کاك سەرکەوتەوە بۆ ئەو ڕۆژگارە گەر بەراووردی توانای دەسەڵاتی دوژمن بکەین لە ڕووی هێزو تەکنیکی سەربازی و

دەیان چاوی جاسوسییەوە بەرامبەر کەمی هێزی پێشمەرگەو سادەیی چەکەکانمان، بەڵام تەییار بە بیروباوەڕی پۆڵاینی شۆڕشگێڕانە کەبەهەموو توانای داگیرکەران لە بن نایەت.

ئەوەی شایانیووتنە لە شۆڕشی پێشوودا کۆپتەر تەنیا بۆ هەندێ کاری سەربازی بەکار ئەهێنرا فرۆکەی گەورەیوەکو: میگ، باجەر، سۆخۆی.. دەوریان ئەبینی لەلێدانو بۆردوومانی بارەگای پێشمەرگەو دێهاتەکان. لەگەڵ سەرهەڵدانەوەی پێشمەرگەو پەیرەوکردنی شێوازی پارتیزانی دوژمنیش شێوازی دژەپارتیزانی پەیڕەو ئەکرد. یەکێك لەو چەکانەی لەم بوارەدا بەکاری ئەهێنا بۆ شوێن کەوتنی پێشمەرگەو زەربەلێدانووەڕس کردنیان کۆپتەر بوو. لەسەرەتادا گوشاری زۆری هەبوو، بەڵامووردەووردە پێشمەرگە لەگەڵیدا ڕاهاتن.

عێراق لەبەر چەند هۆیەك سوودی زۆری لەکۆپتەر بینی:

١. کاتی زۆری بۆ ئەگەڕاندەوە

٢. هێزی زۆری ناوێت بۆ مەیدانی شەڕ

٣. دژەکەی لای پێشمەرگەو شۆڕش نییە

٤. هەم ئەتوانێ ماوەیەکی زۆر لەمەیدانی شەڕدا بمێنێتەوەو شەڕبکات هەم ئەتوانێ هێزیش بێنێو بیباتەوە.

کۆپتەریش دوو جۆری هەیە: بارهەڵگرو شەڕکەر، لە شەڕکەرەکاندا: غەزال، سەمتی، پیلاتۆز ... هتد هەیە. هەرچەندە پیلاتۆز لە بنەڕەتدا بۆ مەبەستی کشتوکاڵی بەکارئەهێنرا، بەڵام پەرەی پێدراو خرایە کاری شەڕی پارتیزانییەوە.

لەگەڵ گەشەکردنی هێزی پێشمەرگەو شارەزابوونیان لە فرۆفێڵەکانی دوژمن بە تایبەتی بەکارهێنانی کۆپتەر توانرا زیاتر خۆ لە کۆپتەر بپارێزرێو بەرەنگاریشی ببنەوەو ڕاویشی بنێن، هەر چەندە بەهۆی شەڕی کۆپتەرەوە زۆر کەسمان شەهیدو فرەی تریشمان بریندارو سەقەت بوون.

کاك ڕۆستەم بۆی گێڕامەوە کەوا لە دێی پاپیلان شێتێکی زۆر خۆش هەبوو هەندێ قسەی ئەکرد لە هی شێت نەئەچوو: جارێکیان لای کاك ڕۆستەم

ئەبێو ئەڵێ: هەر کە برسیم ئەبێ بە ئیرادەی خوا حەزم لە پلاووو گۆشتە، کە سەرمام ئەبێ ئارەزووم لە زۆپایە.. لەو کاتەدا دەنگی کۆپتەرێك هات شێتەکە ئەڵێ:وەڵلاهی کە دەنگی کۆپتەریش دێت بە ئیرادەی خوا لە حەیبەتا میز بە خۆما ئەکەم.

لە جەولە کردندا بووین لە بناری دەلۆ، سەردانی هەندێ لە دۆستەکانمان کرد، کاتێ کە بیستمان یەکێك لە پیاوەکانی دوژمن لە گەرمیاندا بە ناوی ڕەئوف تۆفیق خەڵکی دێی فەقێ مستەفا لە لایەن کاك سیروانەوە بڕیاری گرتنی دەرکراوە، برادەرانی گەرمیان گرتبوویان، ناوبراو لە لایەن دوژمنەوە تەرخان کرابوو بۆ چاودێری جموجووڵی پێشمەرگەو هەڵوێستی خەڵکی. ئەو خوێندەواری هەبوو، کاتی خۆی لە سەر دەستی مامۆستا مەلا کاکە حەمەی سەیفوڵلا فێری خوێندەواری بوو بوو، هەر بە هاندانی ئەویش خەڵکەکە فێری یاداشت نووسینەوە کرابوون، ئەمیش لە دەفتەرێکی بەر باخەڵدا هەموو شتێکی ڕۆژانەی یاداشت ئەکرد. پاش لێکۆڵینەوە لە تاوانەکەیو دانانان بە خراپەکارییەکانی خۆیدا بڕیاری کوشتنی دەرکرا بوو بە سزای گەلو شۆڕش گەیشت. ئێمە کە لەگەڵ کاك سەرکەوت دا بووین ئاگامان لەوە نەبوو ئەم ئیجرائاتە کراوە.

دوای ئەوە لەو جەولەیەماندا چووینە نزیك دێی دووبراو لەو ناوەدا خۆمان حەشاردا دوو دۆستمان هاتن بۆلامان یەکێکیان عومەر حەسەنساڵەحو ئەوی تریان حەمەئەمین کاکە ئەحمەد بوو پێیان وتین: کەسی ترتان لەگەڵە..؟ووتمان: نە.ووتیان: ئەی ئەو چەکدارانەی خوارەوەتان کێنو چین..؟ تەماشامان کرد گەلە جاشێك هاتوون، دوایی زانیمان بەفەرماندەیی تەحسین شاوەیسو عاسی کوڕی جاسووسە کوژراوەکە پاکسازی ناوچەکە ئەکەن.ویستمان لەو شوێنەی خۆمان دەرباز بین کەچی ئەوان پێیان زانینو پەلاماریان داین، کەمی ئێمەو زۆری جاشەکان بەراورد نەئەکرا، هەرئەوەمان پێکرا خۆمان دەرکەین ئەوانیش دوامان کەوتن تا دێی هەسەن کەنۆش کەتاریك داهات چووینە ماڵی مەلا ئەحمەدی کەریمی شاسوار کە دۆستمان بوو، کاتی خۆی

شیوعی بوو، دواتر بووه کۆمەڵە، ئەومان کرده حەرەس تاکو نانمان خوارد، ئینجا بەرەو زستانە ڕۆیشتین لەوێ خەبەری جاشەکانمان زانی لەدێی دووبڕاو ماونەتەوە دەستی برایەکی کاك سەرکەوتیان شکاند بوو. ئەو ناوەمان بەجێهێشت بەرەو ناوچەی جاف، لەو ناوە مەفرەزەکەمان دۆزییەوە کەوتینەوە جەولەو ڕووەو بناری سەنگاو بووینەوە ئەمجارەیان نەخشەی کوشتنی ئەندامێکی مونەزەمەی سەنگاومان لەرێگەی زەلامێکەوە بەناوی حەسیب شێخ ئیسماعیل دارشت کەئەو ڕێنماییمان بکا، نەیئەزانی ئێمە پێی ئەزانین دەستی دوژمنەو داومان بۆ دائەنێت. لەدێی زینانە ی سەنگاوەوە شەو بەرەو شاخی ئاژداخ چووینو خۆمان شاردەوە لەوێ برادەرێکی خۆمان بە ناوی عاسی مستەفا ئەحمەد خەڵکی زینانەی سەنگاو نانو خواردنێکی زۆری بۆ هێناین عاسی تاکو ساڵی ١٩٨٧ لە نزیکەوە هاوکارمان بوو دوایی بوو بە سەربازو لە شەڕی ئێران - عێراق بە دیلگیراو لە ئەنفالیشدا ژنو منداڵەکانی تیاچوونو تەنیا کوڕێکی مابوو ئەویش بە هۆی نەخۆشییەوە مرد، ئیتر کەسی لە دارای دنیادا بۆ نەما، کە لە دیلی گەڕایەوە هاتەوە سەر خانەی وێرانە. سکاڵای بردە لای سەرانی ڕژێمی بەعس کە چارەنووسی ژنو منداڵەکانی دیاری بکرێ کەچی ڕژێم لە باتی خەڵاتکردنی کە لە پێناوی شەڕی داسەپاوی ئەودا بە دیلگیرابوو ژنو منداڵەکانی بدەنەوە کە چی بۆی دەرکەوت ئەوانیش بوونەتە خۆراکی شەڕی جینۆساید.

کاك سامانمان لەگەڵ بوو مەشقی هەڵگرتنی تەرمو دەرباز کردنی بریندارى بەهۆی برنەوی درێژو پشتوێنەوە پێئەکردین لەجیاتی دارە تەرم. کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ بەسەر شاخدا. بەرەو سەنگاو شۆڕبوینەوە، باران شەست ئەباری کەنزیك بوینەوە دنیا تاریك داهات چووینە شوێنی دیاریکراو شارەزاکەشمان لەوێ بوو، لای خۆیەوە خەبەری لێدابووین کە ئەو شەوە ئەچینە سەر سەنگاو، دوژمن بڕیاری دابوو لەدەوروبەری ماڵی ئەندامی مونەزەمە بۆسە دابنێت، لە نەخشەکەماندا دامان نابوو کاتژمێر ٨ ی شەو کارەکە ئەنجام بدەین کەچی پەلەمان کردو کاتژمێر ٧٫٣٠ لەگەڵ بۆسەکانی

دوژمنــدا پێکــەوە گەیشــتینە ئــەوێ کــاك ســەرکەوت بەســەر دیــوارا چــووە حەوشەکەو شەڕ لەدەرەوە لەنێوان ئێمەو بۆسەکانی دوژمنــدا بــەرپابوو، کاك سەرکەوت کەوتە نێوان شەڕی دەرەوەی ماڵەکەو تەقەکردنی ماڵی ئەنـدامی مونەزەمەکە، کاك سەرکەوت زۆر بەدەستو برد بوو تەقەی زۆری لەناو ماڵی ئەندامی مونەزەمەکەدا کردو لەدیوارەوە خۆی دەربـاز کـرد، پێشمەرگەکانیش بـەدەم تەقـەوە لـە کۆڵانەکانـدا دەرچـوونو لـەدەرەوەی شـار کۆبووینـەوە، دوو پێشمەرگەمان: ئەحمەد ١٢ ئیمامیو سەلام عەلی دیارنـەبوون، مـن گەڕامـەوە بەدوایانداو لەنزیك شار دۆزیانمەوەو گەیشتینەوە بـرادەرانو بـەرەو ناوچـەی دوورە دوژمن بەڕێ کەوتین.

لـەو شـەڕە دسـتو یەخەیـەدا سـێ سـەرباز کـوژراوو شـارەزاکەشمان نەگەڕایـەوەو بـوو بـە جاشـێکی خـۆفرۆشو دەسـتی لـە شـەهیدکردنی برایمـە ڕەشو بریندارکردنی کاك شێرزاد عەزیز شەهابدا هەبوو.

لـەم جەولەیـەدا بڕیـاردرا بکرێمـە جێگـری مـەفرەزەی ٢ی کـەرتی ٢ی هەرێمی پێنجو تەشکیلاتی کەرتی ٢ بەم شێوەیەی لێهات:

- مەفرەزەی یەك بە فەرماندەیی کاك سەرکەوت جێگرەکەی مام ساڵەح گۆڕی ئەسپی.
- مەفرەزەی دوو بە فەرماندەیی کاك هەژار یاریدەدەرەکەی من بووم.
- مـەفرەزەی سێ بەفەرمانـدەیی کـاك خالیـد یاریدەدەرەکـەی تـاهیری حـاجی ڕۆستەم بوو.

مەفرەزەی یەكو دوو بڕیارماندا بچینە ناو باوەنوور بۆ گرتنی هەنـدێ کەس کە بەنیازبوون ببنە جاش، هێزەکەمان کـردە دوو بەشـەوە، بەشێکیان بـۆ نـاو شارۆچـکەکە کـاك سـەرکەوتو کـاك شـێرزادو هەنـدێ بـرادەری تـر بـوون باقییەکەی لە دەرەوەی شارۆچکەکەدا دامەزران، یەکەم جار چووینە سەر ماڵی لێپرسراوی نەقابەی کرێکارانی کشـتوکاڵ بـەناوی مـەلا محەممـەد کـەزۆری لـە کرێکاران ئـەکرد ببنـە بەعسی، دامـان لـەدەرگا بـۆی نەکردینـەوە، زۆر قسەمان لەگەڵ کرد سوودی نەبوو، کـاك سەرکەوت کـە پیـاوێکی باڵابـەرزی تێکسمڕاوی

زۆر بەهێز بوو شانێکی لەدەرگاکەدا چوارچێوەکەی شکاندو مەلای هێنایە دەرەوە، پاشان چووینە سەر جاشێکی سەرەك جاشێك بەناوی حسێن سەبری بەگ کەبەناوی فەرماندەی مەفرەزەکەیەوە بانگمان لێکرد دەرگاکەی کردەوە کە ئێمەی بینیویستی دایبخاتەوە، کاك سەرکەوت ملیوانی کراسەکەی گرتو ئەویشی هێنایە دەرەوە منیش لای خۆمەوە دەستبەجێ دامە بەرشەق، کاك سەرکەوت زۆر تووڕە بوو پێیووتم: لێی مەدە.. هەردووکیان ببە لای برادەرانی قەراغ شارو بگەڕێوە. هەردوو دیلەکەم پێش خۆم دا خێزانەکەی مەلا بەمناڵێکی قژ سوورەوە دوام کەوت، زۆرم هەوڵدا نەیەت بێسوود بوو کە گەیشتینە لای برادەران تەقە پەیدا بوو ژنەکە هاواری کرد بمگەڕێنەوە لە بەر ئەوەی دوو گیان بوو نەیتوانی ڕابکات ناچار دەستم گرتو بردمەوەماڵەوەیان، لەوێ پێشمەرگەکانم تووش بوو پرسیم ئەو تەقە چییە..؟ووتیان: چووینە سەر ماڵە جاسوسێك هێنامانە دەرەوە بەرەو چەمی سیروان ڕایکردو تەقەمان لێکرد. لەدوایدا بۆمان دەرکەوت کە بەبرینداری کەوتبووە سیروانەوەو خنکابوو. بەهەردوو دیلەکەوە گەڕاینەوە، دوای چەند ڕۆژێك گەیشتینە ناوچەی ڕۆغزایی چاومان بە کاك سیروان کەوت کە هەڤاڵان عەلی چەلەبیو حەسەن خاوێو ئاسۆی دەلاکی لەگەڵ بوون گیراوەکانمان دایە دەستی بڕیاردرا بەکەفالەت ئازاد بکرێن، باوکی کوڕە جاشەکە هاتبوو کە کوڕەکەیمان ئازاد کرد زۆری پێخۆش بوو، تاساڵێك هەر سەردانی ئەکردین، جاشەکەش بووە کاسبکار، هەر لەو ماوەیەدا هەرێم داوایان کرد مەفرەزەیەك بنێرین بۆ قەرەداخ بۆ ئەوەی بچینە سەرەوە بۆ لێدانی قیادەی موەقەتە لە دزلی، بەشێکی مەفرەزەی یەكو بەشێکی مەفرەزەی دوو بە فەرماندەیی کاك سەرکەوتو جێگری من کەوتینە ڕێ چووینە دیوی قەرەداخ لەگەڵ مەفرەزەی سالار دەرەدۆینی یەکمانگرتو بەرەو دێی سەرچاوەو هۆمەر قەڵا کەوتینە جەولە کە دوو دێن ئەکەونە ژێر دەمی کەژی زەردەو خۆرئاوای کەژی گوڵان. کە هەردوو کەژەکە لەڕووی سەربازییەوە شوێنی ستراتیژییان هەیە چونکە زاڵن بەسەر هەردوو دیوی گەرمیانو قەرەداخدا، لەساڵی ١٩٧٤ مەیدانێکی بەرینی شەڕی نێوان

شۆڕش لەلایەكو چەكدارەكانی حشعو میری لەلایەك بوو. لەنێوان گوڵانو زەردەدا مەخفەری پەیكوڵی لێیە تا شۆڕشی ٧٤ی تەمووزیش بەدواوە شوێنی باجوەرگرتنی پۆلیسو ڕێگا گرتن لە دزو جەردەو پیاوخراپ بوو، لە خوار ملەی پەیكوڵییەوە لە نزیك دێی بەركەل هەندێ شوێنەواری كۆن هەیە كە بەردی نوسراوو پەیكەری سەرە زەلامی لێیە، خەڵكەكە پێی ئەڵێن: بتخانەكە. حكومەت بۆ پاراستنی ئەو شوێنەوارە پاسەوانی دانابوو لەبەر ئاڵۆزی دۆخەكەوازی لێهێنرا، مەخابن خەڵكی ناوچەكە لەبەرنەزانینی بایەخی ئەو شتە مێژووییە هەموویان تێكوپێك دا، زۆریان شكاند بەبیانووی ئەوەی بەقسەی هەندێ كۆنەپەرست گوایە ئەوانە بتن نەیانئەزانی ئەمە بەشێكی مێژووی میللەتەكەمانە بەدەستی خۆمان لەناوی ئەبەین.
لە دێی سەرچاوە چاومان بە مەفرەزەكەی مامە عەلە ڕەش كەوت كە لە ناو خۆیاندا تێكچوو بوون عەبەی دایە فاتە یان چەك كردبوو. سالارووتی: مامە عەلەڕەش بۆ لای پارتی ڕائەكا باچەكی بكەین. بڕیاری چەك كردنمان دان، ئازادی مامە عەلەو ڕەئوفە كەرمان چەككرد كەچی مامە عەلە خۆی نەدا بەدەستەوە.. ئاگاداری ئەوە نەبووین دوژمن هێزێكی زۆری كۆكردووەتەوە بەتەمای هێرشی گەورەیە، شەو لە سەرچاوە خەوتین دنیاش تەمو مژوتاریكو بارانێكی ڕەهێڵە بوو، بەیانی دوای نانو چا خواردن تەمومژەكە هەندێ ڕەویبوەوە، چووم حەرەس بگۆڕم تەماشام كرد لە دووری ٥٠٠ مەتردا خەڵكێكی زۆر دیارن ڕائەكەن پاشوورد بوونەوەیان بۆم دەركەوت هەموویان سەربازنو لە سەرچاوە ڕەت بوون بەرەو هۆمەر قەڵا ئەڕۆیشتن بێئاگاین لەوەی كاك سیروانو هاوڕێكانی لە دێی سێوسێنان ئابلۆقە دراونو شەڕكراوەو كادیرێكمان بە ناوی پۆلا لەلایەن جاش عەزەی سڵەوە گیراوەو بریندداریش هەیە، هێزەكەی كاك سیروان پەرەوازە بووە، ئێمە لای خۆمانەوە بڕیارمان دا لێیان بدەین، خۆمان كۆكردەوەو كەوتینە دوایان كە گەیشتینە هۆمەرقەڵا دوژمن لەوێ دەرچوو، ئانمان كۆكردەوەوهێزەكەی خۆمان بەپێی نەخشەیەك كردە دوو بەشەوە:
- مەفرەزەی سالار دەرەدۆینی لە پێشەوە لێیان بدات.

- مەفرەزەی ئێمە کاك سەرکەوت، من، شاهۆ، نەجم بۆیسانە کە تازە هاتبوو، لە پشتەوە لێیان بدەین.

ئێمە شوێنیان کەوتین تا گۆڕستانێك لە نێوان هۆمەر قەلاو عەلیاوا دا لەوێ هێزەکەی دوژمن موعەلەباتیان ئەخوارد، ئێمەش دامەزراین، چاوەڕوانی سالار بووین تەقە هەڵسێنێ کەچی دەنگ نەبوو، نەخشەکەمان تێکچوو، دوژمن لە عەلیاواوە بۆ سێوسێنان ئەڕۆیشت تاکو لەگەڵ هێزەکەی تریان یەك بگرنەوە، ئێمەش هەر بە دوایانەوە بووین تا هەلمان بۆ هەلکەوێ دەستێك بوەشێنین، لەنێوان عەلیاواو مەسۆییدا لەگەڵ مەفرەزەی کاك گۆڕان لەیەکتر گۆڕاین‌و تەقەمان کرد لەهەر لایەکمان‌وایە ئەویتر جاشە، خۆشبەختانە زیانمان نەبوو، کەلە یەکتر ئاشکرابووین لە عەلیاوا کۆبووینەوە تا بڕیاری لێدانی دوژمن بدەین، هەر لەو کاتەدا خەبەریان هێنا دوژمن گەیشتووەتە تەکیە بڕیارماندا لەوێ بچینە سەری، کاتژمێر ٢ی پاش نیوەڕۆ لە بەڵخەوە بەرەو تەکیە ڕۆیشتین. لەو کاتەدا کاك سەردار ناوتاقی بە مەفرەزەیەکەوە پەیدا بوو، نەخشەی شەڕەکەمان بەم شێوەیە دانا:

- کاك سەردار ناوتاقی بەچەند پێشمەرگەیەکەوە بەبناری شاخدا بۆ ڕۆژئاوای تەکیە بۆ سەر سەنگەرەکانی پشتی دێ بڕوا.

- ئێمەو کاك گۆران‌و مەفرەزەی مامە عەلە کە چەند ڕۆژ پێشتر بڕیاری چەك کردنمان دابوو، پەلاماری هەموو شوێن‌و مۆلگەکانی دوژمن بدەین لە قوتابخانەکەو چەند شوێنێکی تر، نزیکی دێکە بووینەوە لەناکاو کۆپتەرێك هات هەندێ سەربازی نێوان تەکیەو بەلەکجاڕ کە بۆ بۆسە دانرابوون هەلگرتەوە، ئەمە ڕێگەی پەلامارەکەی خۆشتر کرد، لە کاتژمێر ٥ ی ئێوارە لەناو دێدا پەلاماری هێزەکەی دوژمنمان دا، زۆرمان لێکوشتن، لێپرسراوەکەیان کە موقەدەم فەریق بوو خەلکی باوەخۆشێنی‌وارماوا بوو برینداربوو، دوایی‌ویستمان پەلاماری مۆلگە سەرەکییەکەیان بدەین کاك گۆران‌ووتی: تائێستا نە شەهیدمان داوەو نە بریندار بابکشێینەوە، بەلام مامە عەلە سوور بوو لە سەر لێدانی، لە دوایدا بڕیاری کشانەوەمان دا بەرەو بەلەکجاڕ لەوێ هەندێ

نانمان خواردو چووین بۆ بەڵخە کە دوژمنی تێدا نەبوو کاك سیروان لەوێ بوو پێیووتین: باشتان نەکرد ئەو شەڕەتان کرد، ئەوە هێرشی گشتی بوو دوژمن ٢٤ هەزار سەربازی هێناوە لە دەربەندی بازیانەوە تاکو دەربەندیخانی گرتووەتەوە، لەدیوی سەنگاویشەوە بڕیاریوایە هەموو هێزەکانی بکشێنێتەوە ناو قۆپییەوە. هەر ئەو شەوە چووینە ماڵەکانی قۆپی حەمەی هەواس کە ئەکەوێتە ناو قۆپی دەربەند بەرێوڵێ لە ژێر دەمی کەژێ زەردەدا لەناو دارستانێکی چڕدایە، حەیوانە کێویوەکو بزنو فیلەگێژەی بەکەمی تێدایە، ماڵەکان ژمارەیان حەوت ماڵ بوو، ڕێگەی ئۆتۆمبیلو جادەی بۆ ناچێت بەوولاغ هاتووچۆی بۆ ئەکرێ بەزەحمەت. تاریکی دەمەوبەیان چووینە جێگایەك دوژمن هێزەکانی تیا بەشبەش کردبوو، ئێمەش خۆمان تیا حەشاردا کاك سیروان پێیووتین: نابێ کەس ئاگر بکاتەوە. منو کاك سەرکەوتو کاك گۆڕان لەبن بەردێکدا بووین کاك گۆران ووتی: مەحمود هەندێ چیلکەو چەواڵ کۆبکەرەوە باکەس نەزانێ ئاگرێکی بچووك بکەینەوە، ناهەقمان نەبوو مانگی ١٩٧٨/١٢ بوو دنیا زۆر سارد بوو بەفرێکی زۆریش کەوتبوو، ئاگرێکی بچووکمان کردەوەو لەپڕ کاك سیروان پەیدا بوو بە توورەییەوە پێیووتین: مەسئولەکانوابکەن ئەبێ پێشمەرگە چی بکەن..؟ ئاگرەکەمان کوژاندەوە، تا نیوەڕۆماینەوە. کاك سیروان بانگی کردین: با مەفرەزەی گەرمیان بگەڕێتەوە.

خۆمان کۆکردەوە بارانیش ئەباری لە چیای قۆپییەوە سەرکەوتین بۆ دیوی گەرمیان، سەر شاخەکان هەور گرتبووی خوارەوەمان بەڕوونی نەئەبینی،ووردەووردە شۆڕ بووینەوە لە پڕ دەنگی کۆپتەر هات سەیرمان کرد حەوت کۆپتەر لەپشتی تەپەگەڕوسو قەڵاوە سەرباز پیادە ئەکەن زانیمان کە ئەم دیویشمان لێتەنراوە، ناچار بەشاخدا سەرکەوتینەوە بەرەو قۆپی دابەزینەوە، بەفریش ئەباری زۆر ماندووو شەکەت بووین فرەیش برسیمان بوو، چەند پێشمەرگەیەکمان بەرەو ماڵەکان نارد بزانن دوژمنی لێیە ئەوان گەیشتنە نزیك دێو چەند فیشەکێك تەقیوامانزانی ئەوێش گیراوە ئیتر دامان

نابوو لەبرساو لەسەرما بمرین، دوای چارەکێك گەڕانەوەووتیان: دوژمن لەدێدا نییە لە پێشمەرگەی خۆمان زیاتر، کە کاك گۆران و ئەوان بوون.

ـ ئەی ئەو تەقانە چی بوون..؟

ـ سەگ پەلاماری داین.

کاك سەرکەوت تووڕە بوو سەبارەت بەوەی لەم کاتانەدا نابێ تەقە بکرێت، ئینجا کەوتینە رێ بۆ ناو دێو دابەش بووین، شۆرباى دۆینەی گەرم و گوڕیان داینێ، حەساینەوەو شەو حەرەسیاتمان دەرکردو خەوتین. نیوەشەو شاهۆ ئاگاداری کردینەوە کە لەسەر شاخەکەی پشتی زەردەلیکاو بەرد بەر ئەبێتە خوارەوە، رەنگە دوژمن ئەوێشی گرتبێ با بەیانی زوو لەدێ دەربچین، کاك گۆران تاقم و پشتوێنەکەی کردەوەووتی: تاخۆر لێم نەدا لەدێ دەرناچم، خەوتینەوە، ساڵەحی کوێخا عەزیز داوای کرد کاتژمێر ٦ی بەیانی بۆسە دەربکەین. هەموومان هەڵساین چووینە پشتیماڵەکان، دنیا تەواو ڕوون بووەوە لەسەر لووتکەی شاخەوە سەربازەکان بەناو بەفرا ئەسووڕانەوە کە خۆر کەوت بۆ ناودێ شۆڕبوونەوە، مامە عەلە لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگەدا چوو بوونە سەرشاخی مەڕۆ کاك سەرکەوت ووتی: بچۆ بیانهێنە خوارەوە با لێرە دەرچین،ووتم: تا من ئەچم و دێمەوە دوژمن ئەگاتە ناودێ، رێگاکەمان لێئەگرێ، ئەو تووڕە بووووتی: من خۆم ئەچم. ناچار بووم بچم. تا چووم و گەڕامەوە پێنج سەد مەتر مابوو رێگاکەمان لێ بگرن منیان بەدی کرد بەڵام تەقەیان لێ نەکردم، کەنزیك بوومەوە تەنیا کاك سەرکەوت و چەند پێشمەرگەیەکی تر مابوون، هەموویان ڕۆیشتبوون هێزەکەی خۆمانمان لە ناو قۆپییەکەدا لێوونبوو، ڕۆیشتین پێشمەرگەیەکی تریش بەناوی دلێر قەڵایی وونبوو بوو گەیشتە لامان و حەسەن کۆڵنەدەریشمان بینی و بووینە چوار کەس، ڕوانیمان هێزەکەی دوژمن بوو بە دوو بەشەوە: بەشێکی ئەوبەری شاخەکەی گرت و ئەو بەشەکەی دەستەیەکی ١٩ نەفەری بوو لەگەڵ جاشێکدا دوامان کەوتن هەرچەند ڕۆیشتین هەر بەدوامانەوە بوون تا چووینە پشتی بەلەکجاڕ بەدیوی قۆپیدا، کاك سەرکەوتووتی: لەم ناوەدا رێگەیەك هەیە بۆ

سەرشاخ بالێیەوە سەرکەوین، ڕێگایەکی یەکجار سەخت بوو پیاهەڵزناین، هێزەکەش بەدوامانەوە بوون کاك سەرکەوت ووتی: ئەمانە لە کۆڵمان نابنەوە با دانیشین لێیان بدەین، بۆیان دامەزراین سێ کلاشینکۆفو برنەوێکمان پێ‌بوو، جێگەکەش‌وابوو ئەوان ئەکەوتنە ناو دۆڵێکی باریکەوە نەیان ئەتوانی بەملاو ئەولادا ڕابکەن‌و دەرباز بن، کاك سەرکەوت ووتی: تایەکەم کەس نەگاتە بەردەستی من تەقەیان لێ ناکەین، ئەوەندە نزیکبوونەوە نیشانەی ئەفسەرەکەیان کە سێ ئەستێرە بوو لە پێشیانەوە بوو بەڕوونی دیار بوو. ئێمە بە هەر چوارمانەوە دامانە بەر ڕێژنەی گوللە. یەکی دوو مەخزەنمان پێوەنان هەموویان کەوتن تەنیا یەك سەربازم بینی ڕایکرد، ئێمەش شوێنەکانی خۆمان بەجێهێشت‌و بەرەو سەرووتر هەڵکشاین، چەك‌و دەستکەوتمان پشتگوێ خست‌وامانزانی هەموویان کوژراون، بەڵام ڕۆژی دوایی خەڵکی دێی قۆپی بەزۆر نێردرابوون تەرمی حەوت کەسیان پێ هێنا بوونە خوارەوەو کاتێ تەقەی ئێمە دەستی پێکرد دوژمن لە هەر چوارلاوە ڕوویان تێکردین‌و دەستیان کردە تەقە، لە سەر شاخ ڕێگە نەما، کاك سەرکەوت زۆر زیرەك‌و بە توانا بوو لە شاخدا، خۆی ئەچووە جێگایەك ئەوەستاو ئێمەی بەسەرشان بۆ جێگایەکی تر دائەگرت، لەو کاتەدا کۆپتەرێکی زۆر هات‌و کوێرانە ئەو شاخەیان داگرتەوەو بوو بەئاگرباران، ئێمەش بە ناشارەزایی لەسەر شاخەوە بەرەو حەوشەکەی پشتی بەلەکجاڕ دابەزین هەموو دەوروبەری تەکیەو بەلەکجاڕیش لە دوژمن سیخناخ بوو، هیوای دەرباز بوونمان کەم بوو بووەوە، بەڵام‌وورەمان بەرزبوو، خۆمان ئامادە کرد دەستێکی تریش بوەشێنین‌و شەهید بین، هەندێ نامەو ناوی خەڵکیمان پێبوو شاردمانەوە، هەریەکە کیسەیەکمان پێبوو نانەڕەق‌و فیشەك‌و دۆینەی تێدابوو، ئەوەندە ئەکەوتین‌و هەڵئەساینەوە، بارانیش ئەباری فیشەك‌و نان‌و دۆینە بەیەکەوە لکابوون، داکشاین بەرەو بەلەکجاڕ هێدی هێدی ڕێمان ئەکرد دنیاش تاریك بوو بوو، بەڵام کۆپتەرەکان هەر ئەسووڕانەوە،وە لەبەر تاریکی بەدی نەئەکران تەنیا گڵۆپی سوور نەبێت ئەسووتاو ئەکوژایەوە، کە نزیکی دێکە بووینەوە کاك سەرکەوت ووتی: خۆتان گورج بکەنەوەو باش

پشتوێن‌و تاقمەکانتان توند بکەنەوە من لەپشتی دلێرەوە بووم خەریکی چاك کردنی پووزەوانەکەم بووم لە ناکاو فیشەکێ لە دەستی دلێر دەرچوو، نەختێ تەوێڵمی سووتاند، هەموو شڵەژان‌ووتم: هیچ نییە.. کاك سەرکەوت تووڕە بوو بە دلێر یووت: ئەگەر بتکوشتایە دەستبەجێ تۆم ئەکوشتەوە. ئیتر زۆر بەوورياييیەوە ڕووەو دێ کەوتینە ڕێ، جێگای هێزەکانی دوژمن دیار نەبوو بەڕۆژ گۆڕانی بەسەردا ئەهات، لەسەرەوەی دێکەوە لەپەڕەوە چووینە یەکەم ماڵ، خاوەن ماڵ حەپەساووتی: ئەوە لەکوێوە هاتوون چوار دەوری دێکە دوژمنی لێیە.ووتمان: دوژمنیش هەبێ هەر هاتووین. نان‌و چایمان خواردو هەندێ نانیشمان هەڵگرت.ووردەووردە بەفر ئەباری‌و زریانی ئەکرد، بەخاوەن ماڵمان‌ووت: شوێنێکمان نیشان بدە تاکو سبەی تیا بحەسێینەوە ئێمە گەرمیانین‌و شارەزای ئەم ناوچەیە نین، کابراووتی:وەڵڵا جێگە نییە،ووتمان: لەم چیا گەورەی قەرەداخەدا جێیەك نییە..؟ووتی: هیچ شارەزا نیم.ووتمان: تالای تەکیە بمانبەووتی: تاکو دەرەوەی دەرگاکە نایەم. هەر خەریك بووین بەقسەی خۆش مار لەکون نەهاتە دەر، پێمان‌ووت: بۆچی.. خۆ هەموو ڕۆژێك لێمان ناقەومێت ئەمڕۆ ڕۆژی هیمەتەو ئێمەش شارەزا نین..؟ کابرا ڕازی نەبوو، پێمان چاك نەبوو لەبەر چاوی منداڵەکانی فەلاقە یان قسەی ناشرینی پێبکەین،ووتمان: دەباشە هەر بمانخە سەر ڕێگای تەکیە، هەر چەند هەنگاوێك لەماڵەکە دوور نەکەوتینەوەووتی: ئەمە ڕێگەی تەکیەیە. کاك سەرکەوت پەست بووووتی: ئێوە کەمێك دوور کەونەوە، ڕووی کردە خاوەن ماڵەکە: ئەگەر نەیەیت ئەتکوژم. کابرا ترساو هات، کورد ئەڵێ کە زۆر هات قەواڵە بەتاڵە.. کە نزیکی تەکیە بووینەوەووتی: ئا لەوێوە بڕۆن، ئەو شوێنەش سێ ڕۆژ پێشتر شەڕمان تێدا کردبوو دوژمنی لێ بوو، پێمان‌ووت بۆچ ئەوەندە بێویژدانی خۆ ئەوێ هێزی دوژمنی لێیە..؟.

بەهەرحاڵ تا پشتی تەکیە بردمان بەکاك سەرکەوتم‌ووت با ئەم کابرایە بگەڕێتەوە، خۆم ڕێگای دەربەند ـ نەرام سین شارەزام، کابرامان ئیزن داو کاك سەرکەوت بەزۆر دە دیناری دایە، کەوتمە پێش برادەران هەر لە بازیانەوە تا

دەربەندیخان دوژمن دیار بوو چونکە بەفری زۆر باری بوو، دنیاش یەکجار سارد بوو، لە هەر شوێنێك هەبوون ئاگریان کردبووەوەو گڕی ئاگرەکە بەرز بوو بووەوە بەتایبەتی لە شاخەکانی قەرەداخ، سۆڵە، سێوسێنانو ئەڵلایی‌و دەشتەکانی دۆڵی قەرەداخ‌ووارماوا. شەوێکی تاریك‌و نووتەك بوو، ترسی ئەوەمان هەبوو لێك دابڕێین. ئاخریش لێك دابڕاین کاك سەرکەوت‌وێڵ بووو تەقەی کردو بەوە یەکترمان دۆزیەوە، ئینجا ڕۆیشتین تا چووینە سەر شاخ، لە پێش برادەرانەوە ئەڕۆیشتم تا چوومە سەر کانی ڕازیانەی پشتی بانی مۆرد لە نزیکەوە هیچ ئاپۆرەو ئاگری سەربازەکانم بەدی نەئەکرد.

ئەوەندە ڕێم کردبوو تەواو ماندوو بوو بووم، تینووشم بوو، دەمم نایە ئاوەکەو تێرم خواردەوە دوایی گەڕامەوە لای برادەرانو پێشیان کەوتم بەرەو دێی بانی مۆرد پاشان‌وەکو زانیمان سەربازەکان چوو بوونە ناودێ‌و بە خەڵکەکەیان‌ووتبوو: ئەمشەو موخەڕیبێك هاتۆتە سەر کانییەکەو ئاوی خواردۆتەوە، دەستمان چەکی نەئەگرت تەقەی لێ بکەین، توومەز نزیك کانییەکە هێز هەبووەو پێمان نەزانیبوو، کە نزیك دێی بانی مۆرد بووینەوە دارێکی درێژم بەدی کرد، بەلامەوە سەیر بوو تا ئێستا نەم بینیبوو، ئاگاداری کاك سەرکەوتم کردەوە کە بچم ڕێگا تاقی‌بکەمەوە، بزانم ئەو دارە چییە.. کە نزیك بوومەوە بینیم چادرێك کەوتووەو دارە درێژەکەش تەلی جیهازە، کە زیاتر چوومە پێشەوە ڕوانیم کۆمەڵێك سەرباز چادرەکەیان خستووەو لە ژێریا بێ حەرەسیات خەوتوون، گەڕامەوە لای برادەرانو ئەوەم بۆ گێڕانەوە، کاك سەرکەوت بڕیاری دا بچینە سەریانو بیانکوژین، من ئەمەم پێ‌چاك نەبوو، پێم‌ووت: ئەوە دوو شەوە ڕائەکەین‌و نەخەوتووین، شەکەت‌و هیلاکین،وەزعی ئەودیویش نازانین، دەستیان لێنەدەین باشترە، بە هەر حاڵ کاك سەرکەوتم قایل کرد تەقەیان لێنەکەین، خۆمان کرد بە دێدا، چووینە ماڵی کاك قادر ڕەسوڵ خەبەرمان کردەوە هەندێ پەشۆکا بەلام کابرایەکی بەهیمەت بوو.ووتی: چۆن هاتوونەتە ئێرەو چواردەوری دێ‌وەکو داو تەنراوە..؟ووتمان:

پێشمەرگایەتییە، کە ئەمە نەکەین چۆن دوژمن لێمان ئەترسێ. نانی بۆ هێناین و پێی ووتین: کە ڕۆیشتن لە دەشتاییەکەوە بڕۆن هەموو بەرزاییەکان کەمینی دوژمنی لێیە. کە لەدێ دەرچووین بووینە دوو بەشەوە، هەر دوو کەسمان بەرەو لایەك تێمان تەقاند، من و کاك سەرکەوت ڕووەو هەنجیرە بووینەوە، کاك سەرکەوت ووتی: ئەگەر کوژراویشین.. لە ماڵی شێخەکانی هەنجیرە خۆمان ئەشارینەوە، کاتژمێر ٦ی بەیانی چووینە ماڵی حەمەی شێخ سەعید پێمان ووت: بەڕاستی زۆر هیلاکین و ئەمێنینەوە. ووتی: وەرن بخەون و گوێ بەهیچ مەدەن، هەموو جلەکانمان تەڕ بوو بوو، خۆمان گۆڕی و خەوتین، بۆ نانی نیوەڕۆ هەڵساین، بەڕاستی خزمەتیان کردین.

ڕۆژی دواتر لەوێ دەرچووین بەنیازی ماڵی کاك سەرکەوت. لێیان پرسین: بۆ کوێ ئەچن..؟ ووتمان: بۆ خێڵی ئاخە، کە گەیشتینە ئەوێ دانیشتین برایەکی کاك سەرکەوت ووتی: لێرە مەمێننەوە چونکە لە هەنجیرەوە هاتوون حەتمەن ئیخباری کراون، کاك سەرکەوت قەڵس بووووتی: هەر لێرە ئەمێنینەوە، کەس و کارەکەی هاتن و دەخیلم کەوتن ڕازی بکەم و بڕۆین، چوومە لای قایلم کرد کە نەمێنینەوە، یەك ساتەڕێ لە دێ دوور کەوتینەوەو دەنگی کۆپتەر هات، ڕوانیمان حەوت کۆپتەر لە خێڵی ئاخە داچۆڕان و نیشتنەوە، بە کاك سەرکەوتم ووت: ئەگەر بە قسەی ئەو خەڵکەمان نەکردایە چاك ئەفەوتاین.

بۆ ئێوارەی ڕۆژی دواتر گەڕاینەوە بۆ دێ ووتیان: ئەو حەوت کۆپتەرە پرسیاری ئێوەیان ئەکرد، پاش سەردان بڕیارمان دا بەرەو بناری شاخ بگەڕێینەوە، چووینە دێی مەسۆیی بەرگەچ خەڵکەکە ووتیان: لەبەیانییەوە کۆپتەر هێز کێش ئەکات و ئەیباتەوە،وا دیار بوو کۆتایی بەهێرشەکە ئەهێنا، شایانی باسە دوژمن بڕیاریدا بوو لە ماوەی دە ڕۆژدا ئاسەواری هێزی پێشمەرگە نەهێڵێ، هێرشەکەی پەیگیر و هەمە لایەن بوو، ژمارەی سەربازەکانی ٢٤ هەزار سەرباز بوو، بە هەموو جۆرە چەکێکەوە دەیان کۆپتەر چ شەڕکەر یان

هێزکێشکەر بۆ ناوچەیەك کە دۆڵی قەرەداخە لەگەڵ بەشێکی گەرمیاندا، شوێن نەمابوو سەربازی دوژمنی تێدا نەبێ یان نەیپشکنی بێو سۆراخی پێشمەرگەیان نەکردبێ.

ئەم هێرشە گشتییە دەرۆژی خایاند بەسەرکردەیی فەرماندەی فەیلەق وەلید مەحمود یەکدەست کەخۆی لەناحیەی سەنگاو دائەنیشت و سەرپەرشتی گشتی هێرشەکەی ئەکرد. ڕۆژگاری هێرشەکە زستان و سەرماو سۆڵە بوو بەفر کڕێوەی ئەکرد تەنانەت باڵندەش بەدەرەوە نەبوو، هەر پێشمەرگە بوو لە ناو بەستەڵەکی وەرزێکی ساردو سڕا خۆی ڕائەگرت و لەدوو ڕووەوە بەرگری ئەکرد. لایەك ڕووبەڕووی دوژمنە داگیر کەرەکە ئەبووەوە، لایەکیش بەگژ بێ بەزەیی سروشتدا ئەچووەوە.

١٠ ڕۆژ ڕێکردن و هەوراز بڕین و برسێتی و بەدەرەوە بوون و بەفرو باران تەڕکردن، تەنانەت خەڵکیش نەیان ئەوێرا داڵدەمان بدەن لەوورەی پێشمەرگەی نەهێنایە خوارەوە بەویستی پۆڵایینەوە بە گیانی گەرمی دڵسۆزی و خۆشەویستی خاك و کوردەوە درێژەیان بەڕێی سەختی خەباتی بێ ووچان ئەدا، لەم هێرشە گەورەیەدا نەك دوژمن هەر هیچی بۆ نەکراو نەخشەکەی پوچەڵ بووەوە، بەڵکو لە هەندێ شوێن ئەکەوتە بەر پەلاماری پێشمەرگەو کوشتاری لێئەکراو زیانی لێئەکەوت، لە شەڕی تەکیە دا ٢٤ سەربازکوژرا، بە تەنیا لە شەڕەکانی قۆڵی ئێمەدا ١٩ سەرباز کوژرا جگە لەوەی باران و سەرما ٤٧ کەسی تری لێ ڕەفکردنەوە، زیانی ئێمەش تەنیا دیلێك و بریندارێك بوو، کاك سامان و کاك خالید لە کاتی ئەم هێرشەدا چوو بوونە سەر ناحیەی سەرقەڵاو شەڕێکی باشیان کردبوو بەمەش سەریان لە دوژمن تێکدابوو، کە پەلاماری قەرەداخی ئەدا بۆ پاککردنەوەی لە پێشمەرگە کەچی لە گەرمیانی خوارەوە زرمەی دەستی پێشمەرگە دێ و تاڵاوی مەرگ بەهێزەکانی ئەچێژێ.

لە تەپە گەڕوس یەکمان گرتەوەو باسی بەرفراوانی ئەو هێرشە گشتییەمان کردو چۆن سەرکەوتووانە لێی دەرباز بووین، جارێکی تر ئەوەمان سەلماندەوە کە پێشمەرگەی بیروباوەڕین بەپێی ئەو هەلومەرجە نوێیەی

تێیدایین درێژە بە خەباتی شێلگیرانەی خۆمان ئەدەین‌و نەخشە دزێوەکانی داگیرکەران نامان تۆقێنێ، برسێتی‌و ماندوێتی‌و شاخ‌و داخ‌و ڕێگابڕین کۆڵمان پێنادات.

کۆتایی ساڵی ١٩٧٨ بوو حیزبی شیوعی عێراق کە لەگەڵ حیزبی بەعسدا لە بەرەیەکدا بوون‌و پێکەوە شەڕی کوردیشیان ئەکرد، کەوتنە بەر پەلامارو ڕاوەدونانی حیزبی بەعس‌و گرتنی ئەندام‌و لایەنگرەکانی. حیزبی شیوعی‌وایانزانی گەر بەرە لەگەڵ بەعسدا پێکەوە بنێن‌و بە هۆی دۆستایەتی بەعس لەگەڵ یەکێتی سۆڤێتدا ئەتوانن پێگەیەکی باش بۆ خۆیان درووست بکەن‌و بگرە ڕێڕەوی بیر کردنەوەی بەعس‌و هەڵسوکەوتیشی بگۆڕن بە قازانجی بیرو بەرنامەی سیاسییان.

کەچی حیزبی شیوعی نەیانتوانی بچووکترین بۆچوونی بەعس بۆ سوودی خۆیان بگۆڕن، بەڵکو بەعس ئەوانی ڕاکێشایە ناو چوارچێوەی بەرنامە دۆزەخییەکانی خۆیەوە. بە تایبەتی پاڵپێوەنانی شیوعی بۆ شەڕکردنی لە گەڵ پارتیدا نەك هەر ئەمە شیوعی گەر چی لەناو بەرەی حیزبی بەعسدا بوون لە گوشاری بەعس‌و دامو دەزگا تۆقێنەرەکانی ڕزگاریان نەبوو.

حشع بیریان لەوە نەکردبووەوە کە ڕۆژێك دێت ئەکەونە بەر شاڵاوی تەفروتووناکردنی بەعسەوە، هیچ جۆرە قایمە کارییەکیان بۆ دوا ڕۆژی خۆیان نەکردبوو لە شاردنەوەی چەك‌و تەقەمەنی‌و پێویستییەکانی شەڕو ڕووبەڕوو بوونەوەی هێزو دەسەڵاتی بەعس، هەرچەندە چەك‌و تەقەمەنییەکی زۆریان لابوو نەیانکرد بڕێکی زۆری ڕەوانەی کوردستان بکەن بەڵکو تەسلیمی ڕژێمیان کردەوە.

کە حشع تەنگی پێ هەڵچنراو هەموو دەروازەکانی لێگیرا ناچار بوو ڕوو بکاتەوە کوردستان‌و دەستبەرداری بەرەی بەعس بێت.

زۆر لە ئەندامانی سەرکردایەتی گەیشتنە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش‌و لە لایەن (ی.ن.ك) پێشوازی کران‌و یارمەتی دران‌و بارەگایان دانا‌و هەندێ چەکیشیان پێدرا، کاتی خۆیشی هەندێ پێشمەرگەیان ڕای کردبوو

هاتبوونە ناو یەکێتییەوەو خەڵکی ئازاش بوون کە حشع هاتە دەرەوە ئیتر پەیوەندییان بە حیزبەکەی خۆیانەوە کردو لای ئێمە نەمان.

# ساڵی ١٩٧٩

پێمان نابووە هەواری ساڵی ١٩٧٩ ئەمانویست چالاکییەك ئەنجام بدەین‌و دەستێك لە دوژمن بووەشێنین لەگەڵ کاك سەرکەوت‌و برادەراندا دەستمان کرد بە جەولەو مەفرەزە دابڕاوەکانمان کۆکردەوە، ئێوارانێك لە دێی دەرەدۆین بەرەو جادەی دەربەندیخان ـ کەلار شۆڕبووینەوە بۆ بۆسەدانان بەدوو نیاز:

١. بۆ ڕوونکردنەوەی ڕێبازی شۆڕش بۆ خەڵکی کە ئەمە شێوازێکی هوشیار کردنەوە بوو دەوری خۆی هەبوو.

٢. بۆ دەستگیر کردنی پیاو خراپی سەر بەڕژێم.

کە لەو کاتانەدا ئەمە تاکە ڕێگایەك بوو بۆ گەیاندنی دەنگی شۆڕش‌و ڕێبازی خەبات‌وکوردایەتی کردن بە خەڵکی چونکە ئیزگە نەبوو یان ئەگەر هەشبوایە بە باشی دەنگی نەئەگەیشت، تەشویشی توندو بەهێزی لە سەر بوو. لەم ڕێگەیەوە خۆمان بە خەڵکی ئەناساند، سیاسەت‌و بەرنامەی شۆڕشمان بۆ باس ئەکردن لە هەمان کاتیشدا بە دوای پیاو خراپ‌و دەستو پێوەندەکانی ڕژێمیشدا ئەگەڕاین کە زیانیان بە خەڵکی ئەگەیاندو خەڵکیش ئەمەی پێخۆش بوو.

ڕوومان کردە قەترە کە ئەکەوێتە خوارووی پردی دەرەدۆین لەسەر جادەی دەربەندیخان ـ کەلار.. چەمی دەرەدۆین کە ئاوەکەی لە چەمی چرچەقەڵاوە سەرچاوە ئەگرێ‌و ئەکەوێتە سەرووی تونی بابە عەمرەوە، ئەم چەمە توونی باباو چیای گوڵان ئەکاتە دوو بەشەوە: قەترەو توونی بابا شوێنێکی سەخت‌و قاییم‌و هەڵدێری هەزار بەهەزاری تێدایە، کەم کەس ئەتوانێ لێی سەرکەوێ، زۆر جار شوێنی خەڵکی یاخی‌و قاچاخ بووە، کەبچیتە ناوی بەئاسانی نادۆزرێیتەوە، خوارووی قەترە بەدێی پونگەڵەی حاجی

مـەحمودی هـارونی ئەبەسـرێتەوە کـە ئەکەوێتـە سـەرووی دەشـتی پێـواز کـە دەشـتێکی تەختاییوکشـتوکاڵییەو چـەند دێیـەکی گـەورەیوەکو: لاڵیخـان، بانیخان.. هتد بەسەرەوەیە، کاتی خۆی مەلیك فەیسەڵ مەلیکی عێـراق بـۆ ڕاو هاتووەتە دەشتی پێوازو قەترە کە بزنـە کێوی زۆری لێبـووە کـە بـۆ مـەلیکیان باسکردووە ئارەزووی دیدەنیو ڕاوی ئەوێی کـردووە، لـە کـاتی بـەهاردا هـاتووەو حـاجی مـەحمودی هـاروونی لەگـەڵ چـووە بـۆ ئـەو ناوچـە ڕازاوەیـەو حـاجی خزمەتی زۆری مەلیکی کردووە، کە مـەلیك ئەگەڕێتـەوە بەغـدا بـانگی ئـەکاتو ڕێـزی زۆری لێئـەگرێو دیاریشـی بـۆ نـاردووە، هـەموو جـارێ مـام حـاجی ئـەم باسەی بە تامەوە بۆ ئەگێڕاینەوە.

لەسـەر جـادەی قـەترە لـەخواروویی بانیخێلانـەوە بۆسـەیەکمان لەسـەر چەقی جادەکە دانا، ئۆتۆمبیلێکی زۆرمان ڕاگرت ئـەوەی کـورد بـوو کـاك سـامان کۆبوونەوەی پێئەکردن، ئـەوەش عـەرەب بـوو مـەلا بـرایم قسـەی بـۆ ئـەکردن، دیـار بـو خەڵکەکـە دوو کەڵکەڵـەیان تێـدابوو، لەلایـەك زۆریـان پـێخۆش بـوو پێشمەرگە ببیـنو بەچـاوی خۆیـان فیـداکاری کـوڕانی (ی.ن.ك) تەماشـا بکـەن، لەلایەك ئەترسان دوژمن بێتو تیابچن، بەڵام قسەکان کـاری خۆیـان کـرد، هـەر لـەو کاتـەدا دوژمـن لەدەربەندیخانـەوە هێزێکـی بـەرەو لای ئێمـە خسـتەڕێ، خەڵکەکـەمان ئیزنـدا تـا تووشـی زیـان نـەبنو خۆشمـان لەقـەراغی جادەکـە دامەزراینو ئیسنادمان لەسەرووتر دانا بوو، دوژمن نەیوێرا بێتـە پێشـەوە هـەر لە دوورەوە بە دۆشکاو هاوەن تەقەی لێئـەکردین، لەهـەمان کاتـدا نەخشـەیەکی کوتوپڕی پەلامارمان داڕشتو بـۆ هێزەکـەی دوژمـن کشـاین، دوژمـن نـاچـار بـوو پاشەکشە بکا بەڵام زیانو خەسارەتم لە بیر نەماوەو پاش شەڕەکە بەرەو بنـاری شاخ کشاینەوە جەولەکەمان بەرەو خوار بووەوە.

ڕۆژێکی مانگی دووی ۱۹۷۹ لەدێی ئیمـام موحەمـەدەوە بـەرەودێی گـۆڕی ئەسپ ئەچووین لـە ڕادیۆنـەوە دەنگوباسـی ڕووخـانی شـای ئێـران بلاوبـووەوە. خەبەرێکی خـۆشو شـادی هێنـەر بـوو. میردەزمەیـەك لـە کـۆڵی خـەڵکی ئێـران بـووەوە پایەگایـەکی گـەورەو بـەهێزی ئیمپریـالیزمی جیهـانی لـە ناوچـەی

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەرەسی هێنا، شا یەکێك لە دوژمنە سەر سەختەکانی نەتەوەکەمان بوو، بەهەموو شێوەیەك هەوڵی لەناوبردنو قەڵاچۆکردنی ئەدا، دواکاری دزێوی شا دژی کورد مۆر کردنی پەیمانی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥ بوو لەگەڵ سەدام حسیندا دوای ئەوەی ڕژێمی بەعس گلۆڵەی کەوتبووە لێژی.

ئەوی ئاشکرایە ناکۆکی لە نێوان ئێرانو عێراقدا هەبووە کە بۆ کۆمەڵێك هۆکاری سنووریو جوگرافیو مێژوویيو مەزهەبیو پەیوەندی دراوسێتی ئەگەڕێتەوە، کە زۆرجار بووەتە هۆی پێکادانو شەڕی خوێناویو دواتر ڕێککەوتن لەسەر کۆمەڵێك خاڵ لە نێوان هەردوو لایەندا.. عێراقو بەعس هاشو هووشی بەرگری لە ئوممەی عەرەبی ئەکەن خاکی خوزستانو هەندێ دوورگەی کەنداو بەموڵکی خاکی عەرەبی ئەزانن، بانگەشەی ئەوەیان ئەکرد بیخەنەوە سەر نەخشەی خۆیان، لەڕێگەی ڕاگەیاندنو ڕادیۆنەوە هێرشی بەر بڵاویان ئەکردە سەر دەسەڵاتی ئێرانی، لە کاتێکدا شا سێ دوورگەی کەنداوی خستە سەر ئێران بەعس جگە لە هاشوهووش هیچی پێنەکرا. بەرامبەر بەمەش بارودۆخی شەڕی کوردو عێراقی قۆستەوە بۆ دەمکوتکردنو بێهێز کردنی بەعس بەرامبەر بە هەڕەشەکانی لەسەر ئێران.

ساڵی ١٩٧٤ کە شەڕ دەستی پێکردەوە یارمەتی ئێران بۆ کورد بەزەقی دەرکەوتوەنەبێ سەرکردایەتی کوردیش لە ڕووی سیاسیو دبلۆماسییەوە ئەو هەلومەرجەی بۆ سوودی خۆی قۆستبێتەوە بگرە هیچ نەخشێکیان نەبووە بەرامبەر بەو ڕووداوەی کە چارەنووسی بەرەو چاڵی مردن لێژ کردنەوە.

هەرکە لە شەڕەکاندا نیشانەی لاوازی بەعس دەرکەوت هەستی بەمەترسی تیا چوونی دەسەڵاتی خۆی کرد ئەوا لەو بارەدا کەزۆر ناکۆکیش بوو لەگەڵ ئێراندا بەعس دەستی لە دژایەتی کردنی ئێران هەڵگرتو سەریان شۆڕکردو بەهۆی ناو بژیوانی هەواری بومیدیەن سەرکۆماری جەزائیر لەپێتەختی جەزائیردا شاو سەدام لەسەر دووشت ڕێککەوتن:

١.وەلاخستنی ناکۆکی دێرینەی هەردووووڵاتو ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی ڕۆژ.

٢. دارشتنی نەخشەی لەناو بردنی شۆڕشی کورد کە هەردوولایان یەك ستراتیژی هاوبەشیان هەیە لەم ڕووەوە گەرچی جیاوازیش بن لە زۆر مەسەلەدا.

سەدام بۆ لەناوبردنی کوردو شۆڕشەکەی بەلایەوە عاجباتی نەبوو بەشێك لە خاكو ئاویوولاتەکەی لەسەر نەخشە بگوێزێتەوە بۆ سەر نەخشەی ئێرانوەکو دیارییەك لەسەر مێزی گفتوگۆی هەردوو لایان پێشکەش بکات، بەلام دەرکەوت ڕێککەوتنی جەزائیر دوایی بە شۆڕشی کورد نەهێنا، بەلکو هەلومەرجی تازەتر هاتە پێشەوە بۆ سەرهەلدانیوەرزێکی تازە لەژیانی گەلەکەماندا ئەمەش لە کاتێکدا کە شاو سەدام ڕێكو تەبا بوون. لە هەردوو دیوەوە یەك شێوە دژایەتی کردنی شۆڕش هەبوو گوشاریان خستە سەر هێزی پێشمەرگە، سوپای عێراق پەلاماری پێشمەرگەو بارەگاکانی ئەدا ئەرتەشی ئێرانیش بۆ هەمان مەبەست دەست بەکاربوو. کۆپتەری عێراقو ئێران بەسەر ناوچەکاندا ئەسووڕانەوە، بۆیە لەناوچوونی شا کەرەسەی بارودۆخێکی خۆیی پەیداکرد چ بە نسبەت ئێران خۆیو چ بە نسبەت کوردی هەردوو دیوەوە.

لە مانگی ٣ی ١٩٧٩دا جەولەمان بەرەوخوار بووەوە بۆ ناوچەی کەلار بە نیازی کۆبوونەوە کردن بەخەلکی دێهاتەکان. ئێوارەیەکیان بە دوو ئۆتۆمبێلی دوابەتالْ چووینە سەرجادەی کەلار- باوەنوور یەکسەر دابەزینە ناو دێی بەرلووتەوە کە ئەکەوێتە سەر چەقی جادەکەو نزیك چەمی سیروان ٢٨٠ مالێك ئەبوو قوتابخانەو هەرەوەزی کشتوکالیان هەبوو خەلکەکەی بە کشتوکالْو ڕانداریو بۆیسانەوە خجلْ بوون، زۆریشیان لە سالەکانی ١٩٦٠-١٩٧٠دا خەریکی قاچاخچێتی لەسەر سنووری ئێران بوون. زۆریان خاوەنی ئۆتۆمبێلو دەراسە بوون، لەناوچەکەدا بە زۆر دەولەمەند ناوبانگیان دەرکردبوو. کاتی خۆی تەنیا پاسێکیان هەبوو هەرچی لە ناوچەی باوەنوورو دێهاتەکانەوە هاتوچۆی کفری بکردایە بەیانی زوو بەو پاسە ئەڕۆیشتنو ئێوارەش ئەگەڕانەوە، پشتی ئەم دێیە زنجیرە گردۆلکەیەکە لووتکە بەرزەکەیان ببووە هێلانەی سەربازەکانی عێراق بۆ پاراستنی جادەکە، خەلکی ئەم دێیە بەشێکیان لە عەشیرەتی ڕەباتیو

بەشێکیان جافن، هەروەها یەك دوو مـاڵ سەیدیشی تێدایـە. کـە چووینە دێکە ڕابەری سیاسی کەرتەکەمان کە کاك شەماڵ بوو کۆبوونەوەی بەخەڵکەکە کـرد، پـاش تـەواو بـوونی کارەکانمـان بـەرەو دێـی ژاڵـەی سـەفەر بەڕێکـەوتین، لـە سـەرووی دێـی ژاڵـەوە کەوتینـە بۆسـەی جاشـەکانی کـەلارەوە، بـە پەلـە لـە ئۆتۆمبیلەکە دابەزین‌و لێیان هاتینەدەست، هـەر لەیەکـەم دەسـتڕێژدا ڕایـانکردو ڕێگەی دێی تووڕکەیان گرت بەرەو کەلار، یەك جاشمان بریندار کـردو خۆشمـان بێ زیان بووین.

هـەر لـەم مـانگی ٣ یـەدا بـوو مـەفرەزەکانی ٢و٣ ی کـەرتی ٢ی گـەرمیان گەشتێکمان بۆ شەلەییەکان کـرد ، ئێوارەیـەکیان هـەواڵیان هێنـا کـە جاشـەکانی تەحسـین‌و ڤالـە فـەرەج لـە سـەنگاوەوە دەرچـوون‌و لـە کێلـە بـەرزەن‌و ڕەنگـە بەیانییەکەی بچن گەمارۆی گوندەکانی قەڵاو تەپە گەڕووس بـدەن کـەزۆر جار پێشـمەرگەکانمان بـۆ حەسـانەوە ئـە چـوونە ئـەو دێهاتانـەی بنـار ،کـاك سامان فەرمانی پێداین بچینە دەرەواری خـوارووو ، لەوێ خـەوتین‌و بەیانییـەکەی زوو لـە نێـوان دەرەواری سـەرووو تـەپـە گەڕووسـدا بۆسـەیەکی بـە هێزمـان دانـا بـۆ لێـدانی جاشـەکان بـەیانی زوو دنیـا ڕوونـاك بـووەوە هـیچ دەنـگ نـەبوو ئێمـە نەمانزانی کە جاشەکان شارەزان‌و لـە ڕێگـەی لـەیل‌و چـوار ئیمامـەوە تێپـەڕیون ،وەختێکمان زانی لە دوای ئێمەوە تەقە دەستیپێکرد..ئێمـە بـەرەو ڕووی تەقـە ڕۆیشتین بۆ پشتی قەڵاو تـەپە گەڕووس بەلام جاشەمان پشـتی تەپەگەڕووسـیان گرتبوو ، نەشماندەزانی ئەو تەقەیە لەگەڵ کێدایە ، ئاگامان لەوە نەبوو کە مـام ساڵەحی خـاڵی کـاك ڕۆسـتەم بەمەفرەزەیەکـەوە چـووەتە تەپەگـەڕووس‌و بـێ بۆسەدانان لێی خەوتبوون.. پێشمەرگەکان ٦ کـەس بـوون ، فـازیلی شـێخ فـەرەج فەرمانـدەی مـەفرەزەو عوسمـان دێچ ڕەشـە جێگـری مەفرەزەکـە بـوو کـە دوژمنداربوو، ئابلۆقە درابوون ..کاك سامان‌وکاك سەرکەوت بەمنیان‌ووت چـەند پێشمەرگەیەك بەرەو هەرەسەکەی پشتی تەپەگـەڕووس بـەلای شـۆڕاوەکەدا ببـە نەکو لەوێوە سەرکەون ، لەو کاتەدا کۆپتـەر هاتـە سـەرمان ، سـەیرم کـرد لـەناو ژاڵەکانی تەپەگەڕووس زەلامێکیان دەرهێناو کۆپتـەرێك نیشـتەوەو هـەڵیگرت ..

هەر لەو کاتەدا زەلامێکمان لێ نزیك بووەوە ، ناسیمانەوە کە عوسمان دێ ڕەشەیە، گەیشتە لامانو دۆخەکەمان لێ پرسیوووتی : لەگەڵ مام ساڵەح بووینو ئابلۆقە دراینو  من دەرباز بوومو نازانم ئەوان چییان بەسەر هاتووە ..دوایی ڕۆشتنی جاشەکانو کۆپتەرەکان چووینە گوندی قەلاّو پرسیمانووتیان : هەموویان بەدیل گیراون لەناو گیراوەکاندا مام ساڵەحی خاڵی کاك ڕوستەمو فازیلی شێخ فەرەجو ٣ ی پێشمەرگەی تر بوون کە مام ساڵەح فیشەکێك بەر ڕانی کەوتبوو بریندار بووبوو ، هەموویان ئەبرێنە فەوجەکەی سەنگاو پاشان بۆ لیوای چەمچەماڵو شەوەکەی بۆ هەیئەی کەرکوك ، دوای ماوەیەك لە زینادنی کردن بەواسیتە کردن لە ڕێگەی شەوق حەمە خان کە سەر بە مەنزومەی کەرکوك بوو ئازاد ئەکرێن .

لە کۆتایی ئەم مانگەدا هەواڵێکی دڵتەزێنمان پێگەیشت کەوا لە ڕۆژی ١٩٧٩/٣/٢٤ مامۆستا عەزیز لێپرسراوی لقی کەرکوکی (ی.ن.ك) کە پێشتر لە ناو شاری سلێمانیدا لەلایەن ڕژێمەوە دەستگیرکرابوو لەشاری موسڵ لەسێدارە دراوە. جێگەی داخێکی زۆر بوو چونکە سەرکردەیەکی لێهاتوو بوو هەر چەندە لەوانەیە کەمتەرخەمی خۆی بووبێ یان گوێی نەداوەتە قسەی برادەران کە نەچێتە شارەوەو هەر بە قسەی خۆی کردووە.

دوای ماوەیەك لەمە ئاگادارکراینەوە کەوا کاك سیروان بۆ سەرکردایەتی ئەچێت. زۆرمان پێ خۆش بووواMان لێك دایەوە چەكو تفاقو کەرەسەی باشترمان بۆ دێنی بەتایبەتی دەنگوباسی پەیدابوونی دژەکۆپتەر هەبوو، ئەوەی ئێمەی هەراسان کرد بووو لە تواناشماندا نەبوو بە ئاسانی دژەکەی پەیدا بکەین شەڕی کۆپتەر بوو. چەکەکانمان زۆر سادە بوو بەرامبەر بە هێزی سوپای عێراق لە ڕووی تەکنیکی چەکەوە بەراوورد نەئەکرا.

پاش ئاشبەتاڵ عێراق کەوتە جموجووڵێکی باشەوە بۆ دەست بەخۆدا هێنانو بیناکردنەوەی سوپاکەیو پرچەك کردنی دوای ئەوەی کێشەی لەگەڵ ئێراندا نەماو شۆڕشی کوردستانیشی بۆ خەفەکراو توانی لە ڕووی ئابوورییەوە ببووژێتەوە. جا کەمی هێزی پێشمەرگەش دەوری خۆی ئەبینی بۆ باڵا دەستی

دوژمـن لەشـەڕداو بەتایبـەتی بـە بـەکارهێنانی تـەکنۆلۆژیای تـازەی عەسـکەری هەرچـەندە بـاوەڕی پێشـمەرگەو زەبـری دەستومەچـەکی، سـەری بـەتوانای تـەکنیکی سـوپای عێـراق دائەنەوانـد، لەگـەڵ ئەوەشـدا خولیـای ئـەوەمان بـوو ئێمـەش لـەم تەکنیکـە تازەیـەی دنیـای چەکسـازی بێبـەش نـەبین. ئـەوەشمان ئەزانی پەیداکردنی ئەم جۆرە چەکانە ئاسـان نییـە، هەرچـەندە لەوکاتـەدا شـا ڕووخابوو جمهوری ئیسلامی پەیدابوو بوو لەوانەیە دەسکەوتنی هەندێ پارچـە چەك زۆر قورس نەبوو بێ.

هەر لەم ماوەیەدا کاك برایم جەلال لێپرسراوی لقی کەرکوکی (ی.ن.ك) لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی گورجو گۆڵدا هاتبوونە دیوی گەرمیان بۆ جەولەو چـاوپێکەوتنی پێشـمەرگەکانی گـەرمیان لـەم کاتانـەدا جاشـەکانی تەحسـین شاوەیسو قاله فەرەج دەرچوو بـوون بـۆ گـەڕان بـەدوای پێشـمەرگەدا، ئـەم دوو سـەرەك جاشـە بـەدناوە هەمیشـە لەلایـەن بەعسـەوە ئـەنێردران بـۆ ڕاوکردنـی پێشـمەرگەی تاکوتـەرای ئیخبـاری کـراو کـە لەلایـەن هەنـدێ دەسـتوپێوەندی دەروون نزمەوە لە دێهاتەکاندا زانیاریان پێئەگەیشت.

ڕۆژی ۱۹۷۹/٤/۱۹ کاك عومەر سەنگاوی که لە مەفرەزەی کاك سـەرکەوت بوو بە ئیشوکاری شۆڕش چوو بوو بۆ دێی هەسەن کەنۆش لەگەڕانەوەدا لەدوو ڕێیـانی جـامرێز ـ مەسـۆیی لەکاتـژمێر۳۰ر۸ بـەیانی کەوتـە بۆسـەی جاشـەکانی قاله فەرەجەوە کە ژمارەیان لە حـەفتا کـەس زیـاتر بـوو، کـاك عومـەر بـەتاقی تەنیا بەتفەنگێکی یـەك مەخزەنـەوە تـوانی سـەر لـە جاشـەکان بشـێوێنیو بـەو پەڕی ئازایەتییەوە دەرباز ببێ، جاشەکان ماوەی ٤.٣ سەعات بەدوایەوە بوون تـا گەیشتبوونە بناری شاخی ئازداخ پەکیان ئەکەوێو ڕێگەیان لێوون ئەبێووازی لێئـەهێنن، لـەو لاشـەوە کـاك سـامانو کـاك خالیـدو مـەفرەزەکانیان ئاگـادار ئەکرێنـەوە کـەجاش دەرچـووە، لـەنزیك دێـی دەرەوار بۆسـەیەکی مەحکـەم دائـەنێنن کەچـی جاشـەکانی تێناگـەوێو ڕەت ئـەبن، پێشـمەرگە دێ بـەدێ بەدوایانـەوە ئـەبن تـاکو دەیانکەنـە نـاو دێـی تەپـە عارەبـدا، ڕۆژی ۱۹۷۹/٤/۲۰ کاتـژمێر ٥ی ئێـوارە شـەڕ دەسـت پێئـەکات تـاکو ۷ی ئێـوارە بـەردەوام ئـەبێت،

جاشەکان ئابلۆقە ئەدرێن‌و شپرزە ئەکرێن‌و لەناو دێکەش دەریان ئەپەڕێن‌و چەواشە ئەبن، هەندێکیان ئەو شەوە لەو هەردە ئەمێننەوەو بڕێکیان خۆیان ئەگەیەننە دێی تۆپخانەی زەنگنە کە جاشەکانی تەحسین لەوێ ئەبن، لەکاتێکدا شەڕ دەستی پێکرد ئێمە لە دێی کوردە میری عەلی حسین بووین بەپەلە کەوتینە ڕێ هەر بەڕاکردن ڕێگامان ئەبڕی کە ماوەیەکی زۆر دووریشە، کە گەیشتینە ئەوێ شەڕ بەرەو تەواو بوون ئەچوو، جاشەکان شکابوون، لەو شەڕەدا ٨ جاش کوژرابوون‌و دوو جاشیش بریندار، کۆمەڵێ کەلوپەلمان دەست کەوت بوو، دوو پێشمەرگەش بریندار بوون یەکێکیان دلێر قەلایی کەبەسەختی بریندار بوو، ئەو شەوە هەموومان بەرەو تیلەکۆی قەلەندەر کشاینەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی جاشەکان گەڕانەوە دێی تەپە عارەب‌و کەوتنەوێزەی خەڵکەکەی‌و شەش کەسیان فەلاقە کرد کە یەکێکیان لەبەر کاریگەری ئەو لێدانە پاشان شەهید بوو.

دوای ئەوەی دەستمان کردەوە بەجەولەی خۆمان هەر مەفرەزەیەك بۆ لایەك‌و لەو لایشەوە هەر چاوەڕوانی کاك سیروان بووین بگەڕێتەوە دەنگوباسی سەرکردایەتی‌و شتی تازەمان بۆ بێنێ، ڕۆژێکی سەرەتای مانگی ١٩٧٩/٥ بوو لەدێی سەڕەشی گەرمیان کە دێیەکی هۆزی زەنگنەیەو هاو سنووری تیرەی ڕۆغزاییە، دێیەکی دێمەو ئاوی کەمەو دوای ئاشبەتاڵ قوتابخانەی لێکرابووەوە زۆربەی کات شوێنی حەوانەی پێشمەرگە بوو، دوور لەدەسەلاتی دوژمن بوو، پیاوێکی لێبوو بەناوی مام ساڵەح ڕەزا کەپێی بوترایە مام ساڵەح ئیف زۆر تووڕە ئەبوو هەزار جنێوی ئەدا.

ئەو ڕۆژە لەوێ کابرایەك خەبەری زۆر دڵتەزێن‌و جەرگبڕی کاك سیروانی پێداین. بەم هەواڵە فرە شڵەژاین چونکە کاك سیروان فەرماندەیەکی قارەمان‌و بەتواناو خاوەن کەسایەتییەکی تایبەتی بوو، هەرێمی پێنجی قەرەداخ بەناوی ئەوەوە شۆرەتی پەیدا کرد، ئەو قوتابخانەیەکی تایبەتی بوو بۆ پێگەیاندنی پێشمەرگەو خەڵکی شۆڕشگێڕ، دوژمن ئەوپەڕی حیسابی بۆ ئەکرد،

ڕۆژ نەبوو دەزگا جاسووسیەکانی بەعس خەڵك نەنێرن بۆ کوشتن‌و لەناوبردنی، ئەمەندە خۆشەویست بوو نەك هەر لە ناو پێشمەرگەدا جێگەی خۆی کردبووەوە بەڵکو خەڵکی زیاتر پەرۆشی دیتنی بوو بوون، کەس نەبوو لە سنووری هەرێمی پێنجدا ناوی نەبیستبێ، یەکێك بوو لەو لێپرسراوانەی لە رووی سیاسی‌و عەسکەریشەوە دەوری تایبەتی هەبوو لە ئاراستە کردن‌و پەروەردە کردنی پێشمەرگەو کادیرەکاندا، شارەزاییەکی باشی لەناسینی خەڵکیدا هەبوو، بە تەماشاکردن پیاو خراپ‌و خەڵکە جاسووسەکانی ئەناسییەوە، پارتیزانێکی لێهاتوو بوو نەخشەکانی هەمیشە سەرکەوتنی تێدا مسۆگەر بوو، زانیارییەکانی لە بابەت دوژمنەوەووردو بەهێز بوو، ڕۆژانە شتی تازەی‌وەرئەگرت لەو سەرچاوە تایبەتیانەی درووستی کردبوو، بە ئاسانی خۆی‌و پێشمەرگەکانی لە داوی دوژمن دەرباز ئەکرد. بوونی ئەو بۆ ئەو قۆناغە ناسکە زۆر پێویست بوو، شەهید بوونی کەلێنێکی گەورەی خستەوە بە ئاسانی پڕنەکرێتەوە، هەرکە هەواڵەکەمان بیست هێزەکەمان کۆکردەوە بەرەو بناری تەپەگەڕوس کەوتینەڕێ لەو ناوەش لە هەندێ دۆست‌و ڕێکخستن پرسیارمان کرد، ئەوان زانیاری زیاتریان هەبوو کەوا کاك سیروان‌و حەسەن خاوێ‌و عەلی چەلەبی لە دێی زێرینجۆی شارەزوور ڕۆژی ١٩٧٩/٤/٢٨ کەوتوونەتە بۆسەی جاشەکانی زەڕایەنەوەو شەهید بوون، بەڵام لەبەر ئەوەی نەجیهازو نە ئیزاعەش هەبوو، نەمانویست بە پێشمەرگەی ڕابگەیەنین نەکو کار لەوورەیان بکاو بێتاقەت بن، شتەکە هەر دەماودەم بڵاو بووەوە ماوەی مانگێکی خایاند تا بەتەواوی هەموو خەڵك‌و پێشمەرگە قایل بوون کە ئەستێرەی گەشی ئەو هەڤاڵە خەباتگێڕە ئاوابووە.

ئەوەی پێویستە بگوترێ دوای هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ، هەندێ خەڵکی خۆفرۆش‌و دەروون نەخۆش لەلایەن دەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێمەوە درووست کران بۆ ڕاوکردنی پێشمەرگەو دژایەتی کردنی شۆڕش‌و بەرپەرچدانەوەی هەڵوێستی خەڵکی شۆڕشگێڕ. زەڕایەن بوو بەبنکەی ئەو جاشانەی کە لەشوێنەکانی تریشەوە پەیوەندیان پێوە ئەبەستن، بۆیە زەڕایەن

لەم ڕووەوە ناوێکی دزێوو مێژوویەکی ڕەشی هەیە لەگرتنە ئامێزی ئەو خەڵکانەی دژ بەگەلەکەیان سەنگەریان گرتبوو، بگرە دەستیان تا بینە قاقایان سوورە لەخوێنی پێشمەرگەو خەڵکی شۆڕشدا. لەپەنا ئەمەشدا هەندێ خەڵکی کەمی شۆڕشگێڕمان هەبوو لە ناوجەرگەی ئەواندا ئالای تەحەدای ڕژێمیان بەرز ئەکردەوە، کاری ڕێکخستنیان ئازایانە ئەنجام ئەدا.

هەر لە سەرەتای مانگی٥/١٩٧٩ دا بوو هەموو کادیرانی کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی لە شێنێ کۆبوونەوەیەکی فراوانیان ئەنجام دا بۆ قسە کردن لە سەر ناوگۆڕینی کۆمەڵە. کە پێش ئەم دانیشتنەش لە ناوەندی کۆمەڵەوە هەموو ڕیزەکانی کۆمەڵە ئاگادار کرابووەوە ڕای خۆیان لەسەر ناوی کۆمەڵە دەربڕن. چونکە ناوی کۆمەڵە بەو زەقییە تەنیا لە ناو توێژی کادیرەکاندا نرخی خۆی هەبوو، لە ناو ڕیزەکانی خەڵکیدا شتێکی نامۆ بوو، بە ئاسانی قبوڵ نەئەکرا بگرە دژایەتیشی ئەکرا. نەك هەر لە ناوخۆی خۆماندا بەڵکو لە دەوروبەریشەوە سڵ لەم جۆرە ڕێکخستنانە ئەکرایەوەو بە توندی دژی ئەوەستان، بۆیە ئەبوایە گونجاندنێك ڕەچاو بکرایە لە ڕووی هەڵبژاردنی ناوو ناوەڕۆکەوە، زۆر جار ناو سەریەشە درووست ئەکات ناوەڕۆکەکەی ئەوەندە کێشە نانێتەوە، بۆ ئێمەش ناوەڕۆك گرنگ بوو نەك ناو. بۆیە دوای لێدوان و گفتوگۆیەکی تێرو تەسەل بڕیاردرا ناوی کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی بکرێتە (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان) کە گونجاوترو لە بەر دڵانیش خۆشتر.

پاش شەهید بوونی کاك سیروان کاك سامان گەرمیانی سەرپەرشتی هەرێمی پێنجی ئەکرد، هەر لەو سەروبەندە دا کاك سیامەند کە لێپرسراوی لقی کەرکوك بوو هات بۆ گەرمیان و لە نزیکی دێی بۆیسانە کە ئەکەوێتە بەردەم زنجیرە گردۆڵکەکانی چوارملان و لە تیرەی تەرخانین و دێیەکی ئاوادارەو چەڵتوکی باش ئەکەن. پێشمەرگەیان زۆر خۆش ئەویست و خۆشیان پێشمەرگەیان هەبوو، لەوێ کۆبوونەوەیەکی پێکردین و بە کۆمەڵێك دێهاتی تری گەرمیاندا گەڕاو پاشان بۆ قەرەداخ ڕۆیشتەوە، دوای شەهید کردنی کاك سیروان دوژمن بەخەستی تەرکیزی کردە سەر ناوچەی قەرەداخ و ڕۆژ نەبوو

هێز دەرنەچێتو دەست لـە پێشمەرگە نەوەشێنێو شـەهیدیان نـەکات، یـەکێك لەوانە کاك ئەحمەد داری زیاین بوو، کاك سیامەند نامەیەکی بۆ ناردین کەوا جەولەیەکی قەرەداغ بکەینو گەرکرا دەستێك لـە دوژمـن بوەشێنین لە تۆڵـەی ئەو شەهیدانەمان، ئەو کاتە لیـوای ٢٠ لـە سـەربازگەی خـاتوو نـازاری خـوارووی قـەرەداخ بـوو، ئـەم لیوایـە سـەربازەکانی هـەموویان کـۆن بـوونو دەورەی دژی پارتیزانییان بینی بوو بۆ لێدانی پێشمەرگەو کۆنترۆڵ کردنـی دەسـەڵاتیان، زۆر جار بە شەو دەرئەچوونو دەوری دێهاتەکانیان بۆ دۆزینـەوەی پێشمەرگە ئـەدا. ئەبوایە پێشمەرگە بـۆ هـەر دێیـەك بچوایە شـەبەقی بۆسـەیان دەربکردایـە بـۆ ئەوەی ئەگەر دوژمن هات دەست بەکار بوونایە. زۆرجاریش بەشەو لە نـاو دێـدا نەئەخەوتین، پاش نان خواردنی ئێوارە پێخەفمان ئەبردو لـە شـوێنێکی چـەپدا حەرەسیاتمان دائەناو لێی ئەخەوتین.

لـە گەرمیانــەوە کـاك خالیـدو کـاك سـەرکەوتو کۆمـەڵێك پێشـمەرگە خۆیان کۆکردەوە بۆ دیـوی قـەرەداخ، گەیشتینە دێـی گومەتـەی خـوارووی دێـی مەسـۆییو خۆرهـەڵاتی سێوسـێنان کـە شـێخە دێ بـوو خەڵکەکـەی چاكو بـێ کێشـەو گرفـت بـوون ، پیـاوی‌وەکو خاڵـە سـەید ئەحمـەدی تیـابوو کـە کەسـێکی ڕێكو پێـك بـوو خزمایـەتی لەگـەڵ حـاجی عەبـدوڵڵای کەڵوەشـیدا هەبووـئـەم دێیە قوتابخانەیان هەبوو، بەڵام ئاوەکەیان چاك نەبوو نەخۆشی سیلی تیـابلاو بـوو، خەڵکەکەی بـەزەرعاتو باخدارییـەوە خـەریك بـوون، زۆربەشـیان شـێخن. لەوێوە بـەرەو سێوسـێنان ئەڕۆیشـتین کۆپتـەریش هـەر ئەسووڕایەوە، ئەوەنـدە قسەی زلمان کردبوو لە ڕوومان نەئەهات خۆمان بشارینەوە، چووینە سێوسـێنان تاکو ئێوارە ماینەوە ئینجا لـە نێـوان دێـی کۆشـكو سـەربازگەی خـاتوو نـازداردا بۆسەیەکمان نایەوە، ئەو شەوە دوژمن دەرنەچوو، ئەوەندە مێشوولە پێـوە دایـن تەواو بێـزاری کردبـووین. بـە بەیانییەکـەیا لـە سێوسـێنان نـانو چامان خـوارد پاشان بـۆ مەسـۆیی چووین، لـە ڕێگـا کـاك سیامەندمان بینـیو بـۆ سێوسـێنان ناردینیەوە، بەڵام خۆی نەهات، تا پێش نیـوەڕۆ لـەوێ ماینـەوە، مـن خـەوتبووم برادەران بـە ئاگایـان هێنامـەوە کـە کۆپتـەر ئەسووڕێتەوە، هەڵسامو داوام لـە

پێشمەرگەکان کرد کە خۆیان تەییار بکەن‌و لەدێ دەرچن، پێشمەرگەکان دەرچوون‌و ئێمەش بەدوایانەوە، ماوەیەکی کەم لە دێ دوورکەوتینەوە کۆپتەرێکی بارهەڵگر کۆمەڵێك سەربازی دابەزان پەلاماری گاوانی دێکەیان دا کەناوی نوری عەلە گوێزە بووو کەوتنە لێدانی ئەمەمان بەهەلزانی‌و ڕووەو شاخەکە خۆمان دەرباز کرد، بەڵام لە خوار دێکەوە تەقەیەکی گەرم بوو زۆریشی خایاند ئاگریش لە هەموو لایەکەوە کەوتەوەو دووکەڵ ئەوناوەی داگرتەوە کە دەرەنگی لێهات خەڵکی دێکەیان لەدەوری خۆیان خڕکردەوە، لەئێمەوایە بۆ کوژاندنەوەی دەغڵ‌و دانەکەوانەکەن، کەچی کۆپتەرەکان هاتن‌و هێزەکەیان بارکردو بردیانەوە، دیارە لە ترسی خۆیاندا ئەوەیان کرد ئیتر ئێمەش هاتینە خوارەوە نزیکی دێبووینەوە، تووشی کابرایەك بووین هەواڵی تەقەکەمان پرسی‌ووتی: براکانی شەهید سیروان لەکاتی هاتنی کۆپتەرەکاندا چوونە ناو دێوە تەقەی زۆریش کرا نازانم چیان بەسەرا هاتووە. ئیتر ئاگاداری برادەرانم کردەوە هەرچەند مەترێك چوومە پێشەوە شوێنەواری خوێن‌و لەفاف‌و کورتە شەرواڵم بینی، لەپڕ یەکێك بانگی کردم: کاك مەحمود لێرەم‌و بریندارم. بەرم کردە لایەوە تەماشام کرد کاك ئەیوبی برای شەهید سیروانە. ڕامکرد بۆ لای‌و هەواڵیم پرسی زۆر بەووره بوووتی: کاك ئەکرەم‌و دکتۆر خەبات لە سەرووی منەوەن بزانن ماون یان نە. چوومە ئەولاترەوە ئەبینم ئەو دوو کەڵە مێردە گیانی پاکیان سپاردوەو بوونەتە قوربانی ڕێگای کوردو کوردستان، پاش ماوەیەك لە خوارەوەتر غەریبی برای شەهید سیروانیشمان دۆزییەوە. ئەو تەقە گەرمە شەڕی ئەو شۆڕە سوارانە بوو لە ڕوو بەڕووبوونەوەی هێزەکەی دوژمندا دەستیان لێکردبوونەوە، تەرمەکانمان هەڵگرت‌و هەر ئەو شەوە لەگۆڕستانی سێوسێنان ناشتمانن، کەچی بە بەیانیا هێزەکەی بەعس هاتنەوە هەردوو تەرمەکەیان لە گۆڕ دەرهێناو بردیان، لەو کاتەی لەسەر گۆڕستان بووین بڕیارمان دا بچین لێیان دەین، لەڕێگا لەگەڵ برادەرانی کاك ڕۆستەم لێك گۆڕاین‌و نەخشەکەمان سەری نەگرت.

پاش ئەم ڕووداوانە ئیزنمان وەرگرت و بەرەو دیوی گەرمیان گەڕاینەوە، ئەو کاتە دەنگوباسێکمان پێگەیشت کە مەفرەزەیەکی جاش بە سەرپەرستی عاسی ڕەوە بەدزە بۆ ڕاوکردنی پێشمەرگە بەرەو چیای ئاژداغ و بناری دەلۆ دەرچووبوون ئێمە کەوتینە سۆراخی ئەو زانیاریەو لە مەفرەزەکەی خۆمان ٥ کەس جیابووینەوە : کاک سەرکەوت ، مەحمود سەنگاوی ، قادر مەحمود ، عەزیز بێستانەیی ، عومەر سەنگاوی .. چووینە گوندەکانی زستانە ، دووبراو لەوێ زەماوەندێك هەبووو وامن دانبوو جاشەکان خۆیان بدەن لەو ناوە بۆیە بۆسەمان بۆ دانان و دۆست و لایەنگرەکانمان بۆ هەواڵ زانین و گەیاندنی زانیاری بە ماڵی قادر مەحمود بلاوکردەوە ، هەواڵێکمان بۆ هات کە جاشەکان بە چاوساغی حسێن فەتاح لە خێڵی ئاخەن ، ئێمە بەرەو گوندی پێنج ئەنگوست و لەوێشەوە بۆ چیای ئاژداخ چووین بۆ چاودێری کردنیان ، لەوێ چووینە ئەشکەوتێکەوە کۆمەڵە کاغەزێکمان دۆزییەوە تازە دڕابوون کە کاغەزەکانمان دایەوە دەم یەك دەرکەوت نامەی حسێن فەتاحی چاوساغی جاشەکانە کە داوای کردبوو بە فەڕاشی خوێندنگەی خێڵی ئاخە دابمەزرێ ، دیارە هەر بۆ ئەوەش ئەو چاوساغیەی کردبوو.

شەوی ٢٠ـ١٩٧٩/٦/٢١ بە کاك سەرکەوتەوە پێنج کەس بووین لەنێوان مەسۆیی سەرچەم و خێڵی ئاخەدا خەوتبووین، حەرەسیاتمان دەرنەکردبوو ئاگامان لەوە نەبوو دوژمن هێزی هێناوەو هێرشی کردووەو پەلاماری گەرمیانی داوە، کاتژمێر ٣ی شەو هەڵساین لەو شوێنە دووربکەوینەوە، کاك سەرکەوت من و پێشمەرگەیەکی نارد بۆ مەسۆیی سەرچەم هەندێ پسکیت و خواردەمەنی بکڕین، دواییش بە سواری ئۆتۆمبیل بۆ شوێنی دیاریکراو بگەڕێینەوە، بەرەو مەسۆیی ڕۆیشتین نازانین بەجاش گەمارۆ دراوە، کە نزیك بووینەوە دنیا هێشتا لێڵ بوو، لە قەراخ دێ خۆمان گورج کردەوە، تاقم و پشتوێنمان توند کردەوە تومەز بە لای دوو جاشدا تێپەڕیوین، دوایی زانیمان یەکێکیان عوسەی هۆکل و ئەوی تریان خەلیفە شەریف بوو ناسراو بە شەفەی عەزە جۆخۆر، خەلیفەووتبووی: باتەقەیان لێبکەین. عوسە نەیهێشتبوو داینابوو بگەینە

ناودیّو لە ماڵدا دەرگامان پێبگرن‌و دەستگیرمان بکەن، چووینە یەکەم ماڵ میوانێکیان هەبوو حاجی حەمە ڕەشید دراوسێمان بوو لە سەنگاو زۆری پێ‌خۆش بوو یەکتریمان بینی‌وووتی: ئاگاداری ماڵەوەتان ئەکەم کە تۆم بینیوە ماڵەکە منالێکیان هەبوو ناوی کەریم بوو خەوتبوو، کە گوێی لەدەنگی من بوو ڕاپەڕی‌وووتی: کاك مەحمود ئەو حەرەسەی ئێوە ئەو جارەکە لەناو جاشەکاندا بوو،ووتم: کەریم گیان حەرەسمان نییە. یەکسەر گومانم کرد شتێك هەیە، هەڵسامە سەرپێ تەماشا ئەکەم چواردەورمان تەنراوە. هاورێکەم‌ویستی ڕابکا، دەستم گرت‌و پێم‌ووت: ڕێگەی ڕاکردن نەماوە، ئەگەر ماڵەکەیان پشکنی شەڕئەکەین تا ئەکوژرێین، ئەگەریش نەیان پشکنی ئەوا دەرئەچین، جاشەکان هاتنە بەردەرگای ماڵەکەووتیان: خاڵۆ میوانتان هەیە..؟

خاوەن ماڵ: نەخێر

جاشەکان: ئەی دوو زەلام هاتنە ماڵەوە چیان لێهات..؟

خاوەن ماڵ: کەس نەهاتووە.

ژنی خاوەن ماڵەکە لە پەسا دەم بەدوعا ئەیوت: پێغەمبەر دوو بزن مەولوو بێت هیچیان لێنەیەت. ئەمە ئەوەندەی تر ترسی ئەخستە سەرمان جاشەکان پێمان بزانن، لەم دڵە ڕاوکێیەدا بووین، لەپڕ کۆمەڵە جاشێکی تر خۆیان بەماڵەکەدا کردووتیان: پورێ کەس لەماڵتانا نییە..؟

پورێ‌ووتی : نەخێر

جاشەکان‌ووتیان : ماڵەکەتان ئەپشکنین

پورێ‌ووتی : منەتتان نەبێ

جاشێك فیشەکی لێخوڕی‌و بەرەو ژوورەکەی ئێمە هات‌ووتی: خوا داوێتی. هاورێکەم خەریك بوو تەقەی لێبکات، نەمهێشت‌ووتم: باپێمان بزانن ئەوسا تەقە ئەکەین. جاشەکە زۆر ترسنۆك بوو باش سەیری ژوورەکەی نەکردو گەڕایەوە، ژوورەکە درێژو باریك‌و تاریك بوو، بەئاسانی دەرنەئەکەوتین، جاشەکانی تریش لە ماڵەکە دەرچوون، پوریش هەر ئەپاڕایەوەو ئەیووت: شکور خوایە شەرمەزار نەبووین. پاشان جاشەکان داوایان

لەخەڵکی کرد لە شوێنێکی ناودێ کۆببنەوە سۆراخی ئەو دوو زەلامەی هاتنە ناو دێوە پەیدابکەن ئەگینا تووشی کێشە ئەبن، ئێمە لە کونێکی بچووکەوە تەماشای جاش‌و خەڵکەکەمان ئەکرد، خاوەن ماڵەکەمان عومەر عەلی ناوخاس ڕەنگی گۆڕابوو، شەو لەناو ڕاندا خەوتبوو، یەکجار قەڵس بوو بوو بەتوندی‌و دەنگی بەرز قسەی ئەکرد، جاشەکان ڕوویان تێکرد: ئەم بەیانییە لەناو ڕانەکەتدا بووی دوو زەلام بەلاتا تێپەڕین چۆن نازانی چیان لێهات..؟ کابراوەڵامی دانەوە: ئەم بەیانییە دووکەسم بینی بەرەو تەپەسێ بە هەڵەداوان ڕۆیشتن. جاشەکان کەئەمەیان بیست‌وازیان لە خەڵکەکە هێناو بەرەو تەپەسێ ڕۆیشتن، لەو لاشەوە کاك سەرکەوت‌و دوو برادەرەکەی تر کەوتبوونە ناو سوپای دوژمنەوە، بە پەلە پرۆزێ بۆی دەرچوو بوون، کە جاشەکان دوور کەوتنەوە، ئێمەش لەناو دێ دەرکەوتین.
بە ڕاستی لە بارێکی‌وادا دوژمن ئابلۆقەت بداو کەست بەدەورەوە نەبێت، شتێکی ئاڵۆزو ناهەمواره. جۆرەها بیرۆکە لە مێشکتدا تێئەپەڕن، دڵ ختووره‌ی‌وا ئەکات لە کاتی ئاساییدا بۆی ناچێ. ئەمە لەوانەیە دوو لایەنی هەبێت، یەکێکیان لە ئەنجامی ترسدا بێت، ئەوی تریان گەڕان بەدوای دەرباز بوون، جاری‌واشە، هەردوو لایەنەکە تێکەڵ ئەبێ‌و یەکێکیان زاڵ ئەبێت. لەجەنجاڵی ئەم مەسەلەیەدا بەپەلەوەکو فلیمی سینەمایی چەندین جۆرە بیری تیژ بە بەرچاوو مێشکمدا ئەهات‌و ئەچوون، جارێك بیرم ئەکردەوە خۆم بکوژم، دوای شەڕێکی باش‌و دەست‌وەشاندن نەك بەردەستی دوژمن بکەوم، بڕیاری ئەوەم دابوو خۆبەدەستەوە نەدەم، یائەبێ بکوژرێم یا ڕزگاربم، خۆبەدەستەوەدان هی پیاوی نائازایە، جگە لەوەش کار لەدەروونی پێشمەرگەو خەڵکیش ئەکات. دوو فیشەکم دانابوووەکو یەدەك بۆ خۆکوشتنم. دوای ئەوەی دوژمن تەنگم پێهەڵبچنێ خۆمی پێ‌تەواو بکەم. هەرچەندە بیری خۆکوشتنم بەناچاری نەبێ بەلاوە چاك نەبوو، کە من ئاواتم ڕزگاری گەلەو زیاتر بەردەوام بوونم لە مەیدانی خەباتداووردەووردە گزنگی گەشبینی بەسەر دەواری ڕەشبینیدا هات‌و کونجی دڵ‌و دەروون‌و مێشکمی ڕووناك ئەکردەوە، کەواتە جگە لە هەڵبژاردنی

مردنی ناچاری ڕێگەی دەربازبوونیش هەیە، زۆر کەڕەت پێشمەرگە ئەتوانێ دەستیش بوەشێنێو خۆشی ڕزگاری ببێ، بەلاّم ئەوی ئێمە خەلّکە دلّسۆزەکە دەوریان بینیو جاشەکانیان چەواشە کرد، بۆ ئەوەی پارووبەکی تێرو تەسەلیان دەسکەوێ کەوتنە هەلّپە بۆ دۆزینەوەمان لە شوێنێکی تر، کە لەدێ دەرچووین تەماشا ئەکەین کاك سەرکەوت بەسواری ماینێك بەغار بەرەو لامان دێت، لەووایە ئێمە گیراوین، کە ئێمەی بینی گەشایەوەو بەرەو دێی قەلّۆز لوغمان کەوتینە ڕێ، لەگەلّ ئەوانی تریش یەکمان گرتەوە، لەوێ پشوومان‌دا، ئینجا بەرەو ناوچەی باشکیو شاتری ڕۆیشتین، شەوێك لە کانیکەوەی باشکی ماینەوە، خەبەری کاك سامانمان زانی کە لە دەوروبەری تووە قوتە، بەرەو لایان ڕۆیشتین لە دێی قەلّبەزەی کە مالّەیی یەکمان گرتەوە، لەگەلّ کاك ساماندا بڕیارمان‌دا بەو دێهاتانەی نزیك جادەی کەلار - دەربەندیخاندا جەولە بکەینو کۆبوونەوەیان بۆ بگێڕین، لەوێوە بەرەو ڕۆسەی شامار ڕۆیشتین لە ڕێگەی ڕێکخستنەوە ئاگادار کراینەوە کە هێزێکی سەربازی لەگەلّ کەمپاینی هەرەوەزیدا نێردراوە بۆ درەوکردنی دەغلّو دانی ناوچەی شاتری بەهەلّمان زانی لەبەر چەند هۆیەك دەستێکیان لێبوەشێنین:

١.وەرزەکەی هاوینو گەرماوسەبوون بوو، دونیا تۆزو گەردەلوول بوو، ڕۆژەکەی لەبار بوو بۆ شەڕکردن، ترسی هاتنی کۆپتەریشمان نەبوو.

٢. لەو ناوچەیەدا لەدوای ئاشبەتالّەوە شەڕی پێشمەرگەو دوژمن نەکراوە.

بۆیە بڕیارمان‌دا لێیان بدەین، دیراسەی هێزەکەی دوژمنمان کرد، شوێنی شەڕەکەمان هەلّبژارد، بەپێی نەخشەیەکیووردو ڕێکو پێك هێزەکەی خۆمان کرد بەسێ بەشەوە:

١. بەشێکی: لای خوارەوەی هێزەکەی دوژمن بگرێت بۆ دوو مەبەست:

أ. کەمین بن بۆ دەرباز نەبوونی سەربازەکان

ب. کەمین بن بۆ لێدانی هێزی تازەی لە ڕێگاوە هاتووی دوژمن

٢. بەشێکی تر لەسەر زنجیرە شاخی پشتی هێزەکەی دوژمن بنوەکو پشتیوان

٣. هێزێکیش لەسەرەوەو ناوەڕاستەوە بۆ پەلاماردان.

گەیشتینە نزیکی دێی خاڵەبەگی سەر بەناحیەی تیلەکۆ کەلەسەر جادەی کەلار ــ باوەنوور ۹ کیلۆمەتر دوورە. ئەکەوێتە بەردەمی زنجیرە گردۆلکەیەك‌و چەمێکی بە بەرا ئەڕوات، خەلکەکەی تێکەڵن لەتیرەکانی مامۆیی‌و شاتری‌و خەریکی کشتوکاڵ‌و ئاژەڵدارین. ئاویان کەمە، قوتابخانەیان هەبوو، مامۆییەکان خزمی مام ساڵەح گۆڕی ئەسپین، لەدوای حاجی ئەحمەدی برای دەم سپی تیرەکەیە، لەبنەڕەتدا مامۆییەکان ئەچنەوە سەر تیرەی هاروونی، بەهۆی ناکۆکی ناو خۆیانەوە پەڕەوازەی ناو ڕۆغزایی‌و شاتری بوون.

هێزەکەی دوژمن لەسەرووی دێی خاڵەبەگ کەپێی ئەوترێ: پەینکەبڕاو کە کەمپاینەکان کاریان ئەکرد لە چەند جێگایەك مۆڵی دابوو.

ڕۆژی ۱۹۷۹/٦/۲٤ کاتژمێر ٥ی ئێوارە تەقە دەستی پێکرد، ئێمە لەگەڵ کاك سەرکەوتدا دەستەی هێرش بووین بەڕاکردن خۆمان نزیکی ئۆتۆمبیلەکان کردەوە، تەقەیەکی چڕو خەستمان لەسەر بوو، سەربازەکان دۆڵێکی قووڵیان لێگرتبووین بە سەنگەر، کاك سەرکەوت زۆر بەئەسپایی ئەهاتە ڕێوەو تەقەی گەرمی لە سەر بوو، لە شوێنێکەوە زاڵبووین بەسەریاناو پەلامارماندان، دەستمان گەیشتە یەکەم ئۆتۆمبیل‌و شۆفێرەکەمان کوشت، کۆمەڵێك فیشەك‌و کەل‌وپەلمان گرت، کلاشینکۆفێکی مزەلی فازمان دەست کەوت، هەروەها کۆمەڵێك ئۆتۆمبیلمان سووتاندو بڕێك سەربازی تریش کوژران، کاك سەرکەوت لە پێشەوەو منیش بەدوایدا بەدۆڵەکەدا چووینە خوارەوە، بەدەم ڕێوە خەریکی مەخزەن پڕکردن بووین‌و تەقەشیان لێئەکردین، سەربازێك بەرامبەری سەرەتاتکێی ئەکرد، ئاگادارم کردەوەووریابێ،ووتی هیچ نییە، دووجاری تر بانگم کردەوە تووڕە بوو.

لەبەرئەوەی سەربازەکە لە عاستی ئەودابوو بوار نەبوو تەقەی لێبکەم، سەربازەکە تەقەی لێکردین‌و کاك سەرکەوت لەپێشەوە پێکرا، سەربازەکە لە تەقەکردن‌وەستا چاودێری منی ئەکرد بزانێ چی ئەکەم، کە کاك سەرکەوت کەوت هەڵگەڕامەوە لە پشتەوە مشتم لێگرت‌و تەقەم لێکردو کوشتم، بەپەلە

گەڕامەوە لای کاك سەرکەوت تەنیا تەماشایەکی کردمو هیچ دەنگی لێوە نەهات، چاوەنەرمەکانی تاهەتا هەتایە لێکنا، چووم ئاگاداری برادەرانم کردەوە کە کاك سەرکەوت بریندارە بادەربازی بکەین، نەمووت شەهید بووە، نەکو کار لەووڕەی برادەران بکات، لەو کاتەدا هێزێکی تری دوژمن لە ڕێگەی زەماوەنگەوە بەهانای هێزەکەیەوە هات، برادەرانی تر کە بریتی بوون لە کاك سامانو مام ساڵحو شێخ کەریمو شێخ جەمال لەخوارەوە لێی ڕاپەڕین، بە یەك پەلاماری شێرانە ئەو هێزەیان پرزۆڵ پرزۆڵ کرد، بەشێکی لێکوژراو بەشەکەی تر بە پەلەقاژە لە مەیدانی شەڕەکە هەڵهات، هەر پێشمەرگەیەك پاڵەوانێك بوو بۆ خۆی، هیچ هێزێکی دوژمن خۆی لە بەردەم شاڵاوی ئازایەتیو تەوژمی تووڕەییاندا ڕانەئەگرت، کردەڕەهاتێك بەسەر ئەو هێزەی دوژمندا هات مەگەر کامێرای هونەرمەندێکی لێهاتوو بتوانێ وێنەی بگرێ. سەرکەوتنی گەورەمان بەدەستهێنا بەڵام داخمان ناچێ گیانی بەرزی ڕۆڵەیەکی دلێری گەلەکەمان لە دەست دا، نەك هەرئەوە بەڵکو تەرمەکەشی دەرباز نەکراو دەست ئەو هێزەی دوژمن کەوت.

کاك سەرکەوت شاخێك بوو بۆ خۆی، دنیایەك ووره بوو سڵی لە مردن نەئەکردەوە، ئەو هەر ئاشبەتاڵی بە شۆڕش نەکردبوو، ڕێبازی دوژمنایەتی بەعسی داگیرکەری گرتبووەبەر، ئاواتی هەرە گەورەی ڕزگاری کوردو کوردستان بوو. بە شەهید بوونی کۆڵێك خەمو پەژارە دایگرتین تا ئەو کاتە پێشمەرگە لەو ناوچەیەدا شەهید نەبوو بوو هێشتا برینی شەهید بوونی کاك سیروانو هاوڕێکانی سارێژ نەبوو بوو برینێکی تر لە ناخمانا سەری کردەوە، بە تایبەتی گیرانی تەرمەکەی زۆر ئازاری داین، بەڵام پیرۆزی ڕێگای خەباتی، گەورەیی بیرو ئامانجەکانی، دڵسۆزیو پاکی کەسێتی ئەو هانی ئەداین لەسەر ڕێی تێکۆشان شێلگیرتربین.

کاك سەرکەوت خۆشەویست بوو، لەناو پێشمەرگەو خەڵکدا ناوی ڕۆیشتبوو، تەنانەت دوژمنیش حیسابی زۆری بۆ ئەکرد، کە تەرمەکەی برایە کەلار خەڵکێکی زۆر لە دەوری کۆبووبووەوەو بەوپەڕی شکۆمەندییەوە بەرەو

گۆڕستانی کەلار بەڕێکرابووو ناشتبوویان، لەو شەڕەدا ٨٠ سەربازو یەك سەرەك جاش بەناوی عەلی‌وەسمان کوژرا، هەشت ئۆتۆمبیل سووتێنرا کۆمەڵێك چەكو کەرەسەی سەربازی ترمان دەسکەوت.

لەو شەڕەدا هەندێ هەڵەمان هەبوو:

١. هەرچی ئۆتۆمبیل کەوتە بەردەستمان سووتاندمان، ئەبوایە ئەوەمان نەکردایە هەرچی کەرەسەی دەستکەوت بوو پێمان بگواستایەتەوە.

٢. کە کاك سەرکەوت شەهید بوو هەوڵی دەربازکردنیمان نەدا، خجڵی شەڕەکە بووین، کاتێ شەڕ تەواو بوو زانیمان هێزەکەی دوژمن تەرمەکەیان بردووە، ئەمەش لە دوو سەردوە خراپی هەیە:

أ/ کار لەووردی پێشمەرگە ئەکاتو زۆرجار ئەبێتە مایەی ڕووخاندنی‌ووا هەست ئەکا هەرکە شەهید بوو بایەخی نادرێتێ، بە پێچەوانەوە گیانی شەهید زۆر بەنرخو بەرزە، لە گیانی پێشمەرگە زیندووەکان کەمتر نییە.

ب/ هەستی خەڵکی ئەووروژێنێو بگرە هەڵوێستی سەلبیان لا پەیدا ئەبێ.

لە هەر شەڕێکدا ئەبێت کۆمەڵێك شت ڕەچاو بکرێ، یەکسەر حوکمی ڕەهاو بڕیاری سەرپێیی نەدرێ، هەرکەس بەئارەزووی بیرو لێکدانەوەی مێشکی خۆی دیوەخانی قسە نەڕازێنێتەوە:

١. ئەبێ ڕەچاوی بارودۆخی شەڕەکە بکرێ، ئەبێ ئێمە هەڵیبژێرین نەك دوژمن بیسەپێنێ.

٢. ژمارەی هێزی ئێمەو دوژمن کە بەراوورد ناکرێ ڕەچاو بکرێ، لەوانەیە دەستەیەك پێشمەرگە بکەونە شەڕی فەوجێك یا لیوایەك کەواتە شەڕەکە نابەرامبەرە.

٣. جۆری چەکی ئێمەو دوژمن لە یەك ئاستدا نین، چەکی ئێمە کۆنو سەرەتاییو هی دوژمنیش تازەترین تەکنیکی سەربازی هەبوو.

٤. دوژمن دەیان دەزگاو تۆڕی جاسوسیو چاوی هەبوو بۆ کۆکردنەوەی زانیاریو پەلاماری پێشمەرگە لەهەر هەلومەرجێکدا، بەڵام ئێمە ئەو توانایەمان نەبوو، مەگەر ڕاپۆرتی ڕێکخستنو زانیاری دۆستەکانمانو بەشوێندا

گەڕانی خۆمان کە ئەویش زۆری ئەویست لە ڕووی کاتو تواناو شارەزاییەوە. ئەم شەڕە دەرسێکی باشی دادایین بۆ خۆ کۆکردنەوەو بیرکردنەوە لە مەسەلەی شەڕو زیانو دەسکەوتو پەلامارو پاشەکشە.

پاش شەڕەکە هەڵکشاینەوە بۆ دێهاتەکانی سنووری باشکی. خەڵکی لە لایەکەوە بەخۆشییەوە پێشوازی سەرکەوتنەکەیان لێئەکردین، لەلایەکی تریشەوە بەدڵێکی پڕ لە کەسەرەوە تەماشایان ئەکردین، کاك سەرکەوت دیار نییە، ئێمە دڵخۆشی خۆمانو خەڵکەکەشمان بەوە ئەدایەوە کە خۆمان ئەو ڕێگایەمان هەڵبژاردووەو ئەبینە قوربانی، هەرچەندە کاك سەرکەوت شەهید بووە بەڵام یادی ئەوو ناوی ئەو هەمیشە نەمرە.

ڕۆژی ١٩٧٩/٦/٢٨ لە کۆبوونەوەیەکی کەرت دا من کرام بە فەرماندەی مەفرەزە لەم ماوەیەدا بە دەم جەولە کردنەوە ڕۆیشتینە دێی قولیجانی سەرحەد لە ماڵی قادری گوڵخاس لامان دا، مام قادر کەپیاوێکی پیرو کەنەفت بوو لێی پرسین: ئێوە چی ئەکەن..؟ ووتمان: شۆڕش ئەکەین.ووتی بە چ شێوەیەك شۆڕش ئەکەن..؟

ووتمان: ئەمجارە بەشێوەی پارتیزانی شۆڕش ئەکەین.ووتی: پارتیزانی چییە..؟ ووتمان: لە دوژمن ئەدەینو کوتوپڕ ئەگەڕێینەوەدو خۆمان ئەشارینەوەو ئەوەی دەستمان ئەکەوێت لە کەرەسەو کەلوپەلوچەكو تەقەمەنی دوژمن لەگەڵ خۆماندا ئەیهێنینەوە.

ووتی: بەچی ئەگەڕێن،ووتمان: بەپێ ئەگەڕێین! سەرێکی باداوووتی: هەتا هەریەکەتان ئەسپێکی باشی پێ نەبێ بڕوام بەسەرکەوتنتان نییە.

دیارە مام قادر لەسۆنگەی شۆڕشەکەی شێخ مەحمودی نەمردوە ئەیڕوانییە ئێمەو شۆڕشی نوێ، کە ئەو زەمانە پیاوەکانی شێخ مەحمودی نەمر کەچەتەیان پێ ئەووتن زۆربەیان بەسواری ئەگەڕان، کەلوپەلی جەنگییان سەرەتایی بوو، دیارە بۆ ئێمەی پارتیزانووڵاخ دەست نادات چونکە زوو لەلایەن دوژمنەوە ئاشکرا ئەبین، هەر چەندە هەندێ جار هەندێ لەبرادەرانمانووڵاخیان هەبوو سواری ئەبوون کە پێویستیان نەبوایە لە دێیەك لای دۆستێك دایان ئەنا.

جاشـەکانوەك هەمیشـە بـوو بـووە پیشـەیان دەرئەچـوون بـۆ ڕاوە پێشمەرگە بە تایبەتی لە گەرمیاندا. جاشەکانی تەحسین شاوەیس خوێڕییانە بەو کارە هەڵئەستان.

ڕۆژی ١٩٧٩/٨/٧ ئێوارە ئـەبێ لـەخوار دێـی تەپەگەڕوسـەوە جاشـەکانی تەحسـین تووشـیان بـە کـاك شـەماڵو دوو پێشـمەرگەی تـرەوە ئـەبێ، تەقـە بەرپائەبێ، ماوەیەك بەرگری ئەکرێ، لـە دواییـدا کـاك شـەماڵ کەناوی نـەوزاد محەممـەد ئـەمین بـوو، ڕابـەری سیاسـیمان بـوو بەرئەکـەوێتو شـەهید ئـەبێت، پێشمەرگەکانی تر دەرباز ئەبن، ئەم مەفرەزە جاشە پێشەنگی هێزێکی گەورەی دوژمن بوو بۆ ناوچەکە، ئەوەبوو ڕۆژی دواتر ئەو هێزە ئەچێتە ناو دێی گۆڕی ئەسـپ لـەوێ مـام سـاڵەحو ڕووتـە کـەلاری (نەبـەردی حەمـەی مینـا)و چـەند پێشمەرگەیەکی تر تووش ئەبنو لە دووری دووسەد مەترێك لە سـەربازەکانەوە خۆیـان دەربـاز ئەکـەن، بـەرەو هـەردەو تـەلانی ئـەو دیـو دێکـە شـۆڕ ئەبنـەوە، سـەربازەکان بـە دوایانـەوە ئۆگـەف ئۆگـەفیان لێئەکـەن، هـەر لـەو کاتانـەدا کۆپتـەرەکانیش بـە سـەریانەوە ئەسـووڕێنەوە،وا خۆیـان قـایم ئەکـەن بۆیـان نادۆزرێنـەوە، هـەر لـەو کاتانـەدا کۆپتـەرەکانیش حەرەسـی دەسـتەیەکی تـری پێشمەرگە لەدێی کانی گوڵی بناری شاخی شوقەیت بـەدی ئەکـەنو هەڵئەکوتنـە سەر دێکەو بۆردومانی ئەکەن، پێشمەرگە ئەیانەوێ لە دێ دەرچن، کۆپتـەرەکان لێیـان ئـەدەنو تەقـە دەسـت پێئـەکات، ئـەنجام سـێ پێشـمەرگە: برایمـە ڕەش گۆبـانیو سـەلام کـوردەمیریو نەبـەز گـۆڕی ئەسـپی شـەهید ئـەبنو چـەند پێشـمەرگەیەکیش برینـدار، لەوانـە کـاك شـێرزاد کـادیری ناوچـەی بـاوەنوور بەسـەختی دەسـتی بەرئەکـەوێو دواتـر ڕەوانـەی نەخۆشـخانەکانی ئێـران کـراو لەوێ تیمار کرا.

ڕووەو دێهاتەکانی زەنگنە چووین، گەیشتینە دێی حاجی چاوشین، مامـە چاوشین پیاوێکی بالابەرزو پیرو بەساڵا چوو بوو، کاتی خۆی زۆر بـەهێز بـووە، زۆر دڵسۆزی کوردایـەتی بـوو، کـەدەنگو باسـی شـەڕەکەی بیسـتو کۆپتـەر چـی کردووە، ڕووی دەمی تـێکردینوووتی: ڕۆڵـە ئـەو کۆپتەرانـە ڕۆژانـە دێنـە سەر

خەڵكی دێهاتەكانو بۆردومان ئەكەنو پێشمەرگە شەهید ئەكەن، بۆچی چارەیەكیان بۆ نادۆزنەوە..؟ ئێمەش ووتمان: چەكەكانمان سووكە، كۆپتەر چەكی قورسی ئەویو ئێمەش نیمانە تاكو بیخەینە خوارەوە. مامە چاوشینووتی: ئەگەر بەقسەم بكەن چارەسەرەكەتان پێئەڵێم،ووتمان: فەرموو،ووتی: لە نزیك دێهاتەكان سەنگەری قووڵ بكەنو بە پووشو دار سەری بگرنو خۆتانی تیا بشارنەوە، كاتێ كۆپتەرەكان ئەنیشنەوە هەڵسنو پەلاماری بدەنو فیشەك بنێنە جەمسەرەكەیەوەو ئیتر ناتوانێ هەڵسێتەوەو سایەقەكەی بگرنو بیكوژن، مەبەستی لە جەمسەرەكە پەروانەكەی بوو.

ئەم قسانەی مامە چاوشین دوو لایەنی هەبوو:

١. ئەویش وەكو ئێمە لە كۆپتەروەرس بووبوو كە زیانی زۆری ئەدا چ لە خەڵكیو چ لە پێشمەرگە.

٢. ئەیویست پێشمەرگەوەكو چۆن ئازان بۆ رێگا چارەیەك بگەرێن بۆ چاوترساندنی كۆپتەرەكانی دوژمن تائەوەندە بواریان نەبێ دەستبكەنەوە.

هەرچەندە بۆچونەكەی ئەو رێگاچارەیە نەبوو بەلام پەرۆشیەكەی جێگەی تێرامان بوو.

لە گۆرانێكی كوتوپردا رۆژی ١٩٧٩/٧/١٧ ئەحمەد حەسەن ئەلبەكر لە كاری سەركۆماری عێراق لابراو سەدام حسێن هاتەشوێنەكەی.

ئەمە كودە تایەكی بێدەنگ بوو، بێ خوێنرشتن خوێنرێژێكی چەقۆكێش بگاتە كورسی فەرمانرەوایی. دیارە ئەمە نەك لە ئاستی كاری حكومەتیدا بوو بەڵكو لە ناوەوەی حیزبیشەوە كاری بۆ كرابوو. پشتیوانییەكی باشی مسۆگەرو زەمینەی خۆشكردبوو بۆ ئەو هەنگاوە كوتوپرەی.

هەرچەندە بەرنامەی حیزبی بەعس بە دەست ئەحمەد حەسەن ئەلبەكر یان سەدامەوە بێ هەر هەمان بەرنامەیە گۆرانی تیا ناكرێ بەلام جیاوازییەك هەر لە هەڵسوكەوتی كەسەكاندا هەیە.

كەسایەتی ئەلبەكرو سەدامیش جیاوازییان هەیە بە تایبەتی ئەلبەكر نەفسەری سەربازی بوو، ئیلتیزاماتی تایبەتی خۆی هەبوو كە چی سەدام

بەرەلایەکی چەقۆکێش بوو، کاتێ دێتە سەر حوکمیش هەر هەمان ئەو کەسە چەقۆکێش‌و توند ڕەوەیەو گۆڕانی ئەوتۆی بە سەرا نایەت بۆ چارەسەرکردنی گرفتە ئاڵۆزەکانی ناو کۆمەڵگای عێراقی‌و بە تایبەتی دۆزی کورد کە حیزبی بەعس هەر لە کۆنەوە لە سەنگەری دژایەتی کردنیدا بووە.

ئێمە لەجەولەدا بووین، ئاگادار کراینەوە کاک سیامەند بەرەو سەرکردایەتی ڕۆیشتووە، مانگی ١٩٧٩/٩ لە لایەن سەرکردایەتییەوە کاک مستەفا چاوڕەش‌وەکو فەرماندەی هەرێمی پێنج بۆ قەرەداخ نێردرا. بۆ پێشوازی‌و چاوپێکەوتنی چووینە دیوی قەرەداخ‌و لەنزیك دێی هۆمەر قەڵای پەنای شاخی زەردە دا یەکمان گرت‌و کۆبوونەوەیەکمان کرد کەتێیدا لە مەر کاری تازەی هەرێم‌و ئەو ئاڵو گۆڕانەی لەمەیدانی خەباتدا هاتووەتە پێشەوەو باسێکی بارو دۆخی شۆڕش‌و دەوری پێشمەرگە لە ئەنجامدانی ئەرکەکان‌و چوونە ناو خەڵك‌و ئاڕاستەکردنیان‌و دەست‌وەشاندن لە دوژمن‌ووەرسکردنی کرا.

لەو کاتەشدا کاک مەلا بەختیار کە ئەندامی سەرکردایەتی بوو بۆ سەردانی هەرێمی پێنجی قەرەداخ هاتبوو، لە سەرووی دێی تەنگیسەر کۆبوونەوەیەکی پێکردین‌و لە سەر بارودۆخی شۆڕش‌و خۆڕاگری هێزی پێشمەرگەی کوردستان‌و شەهید بوونی کاک ئارام قسەی بۆ کردین کە لە ڕۆژی ١٩٧٨/١/٣١ لە لایەن مەفرەزەیەکی تەحسین شاوەیسی خۆفرۆشەوە لە دێی تەنگیسەری قەرەداخ بە پێی زانیارییەك کە پێیان گەیشتبوو پەلاماری ئەدەن‌و لە ئەنجامدا شەهیدی ئەکەن.

کاک ئارام نەك هەر سەرکردەیەك بوو بەڵکو ڕۆشنبیرێکی گەورەی کورد بوو لە دوای خاڵە شەهاب ڕۆڵی سکرتێری کۆمەڵەی ئەگێڕا. لەو کۆبوونەوەیەشدا هەڤاڵ کوێستانی شیعرێکی لە سەر شەهید ئارام‌و تەنگیسەر خوێندەوە کە ئەمە دەقەکەیەتی :

ئەوا ئێستا
لە کوردستانی ئاراما
لە کوردستانی قەتماغەو

کێڵگـــەی زامـــا

هـــــەر دەوەن و

بن تاشە بەردی چیایە

ســـەنگـەرێـــکە

قوتابخانەی درووستبوونی

ئارامێـکی تـری تیایـە

ئەوەی پێویستە بووترێ لە نەورۆزی ١٩٧٩ دا بوو بۆمبێکی گەورەی تیا تەقیبووەوە کە ئەویش جیا بوونەوەی بەشێکی بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان بوو، کۆمەڵێك پێشمەرگەو خەڵکی تر بەچەكو تفاقەوە دوورکەوتنەوە، حیزبی سوسیالیستی یەکگرتووی کوردستانیان پێکهێنا کەپاشان حیزبی سوسیالیستی کوردستانی لێجیابووەوە، بۆیە کاك مەلا بەختیار بەپەلە گەڕایەوە سەرکردایەتیو هێزێکی لە هەرێمی پێنج لەگەڵ خۆیدا برد کە بەشێکی زۆری لەکەرتەکانی گەرمیان بوو، کاك سامان سەرپەرشتی ئەکردو منیش وەك (ف.م) لەگەڵیا بووم. مانگی ١٩٧٩/١٠ گەیشتینە سەرکردایەتیو لەبارەگاکانی ماینەوە.

ئەو ناکۆکیو جیابوونەوەی هێزە شتێکی ناخۆش بوو. بۆ یەکەم جاریش بوو هێز لە یەکێتی جیابێتەوە. بەڵام ئەمە نەبووە مایەی شکستی یەکێتییان لاواز بوونی ڕیزەکانی، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە زەمینەی خۆش کرد بۆ ئەمسەرەو سەرکردنی هەندێ خەڵکی کەلەوانەیە هەندێ قەوارەی شۆڕشگێڕانە بشێوێو شێوازی تازە بێتە ناوەوەوکێشەو ئالۆزی پەیدا ببێ. لێرەدا دەوری ڕێکخستنو ڕاگەیاندن دەرئەکەوێ بۆ بەرپەرچدانەوەی کاری چەواشەو بێ بەرنامەیی کارکردن.

(ی.ن.ك) دەرسێکی باشی لەم مەسەلەیەوەرگرتو بەگورجی خۆی بۆ تەیارکردو بیرو ئامانجی ڕەوای خۆی بۆ سازدا، کادیرەکانی مەسەلەکانیان بەووردی ئەورووژانو مێشكو بیری پێشمەرگەیان بە مەبەستی ڕاستیو درووستی کێشەکە ڕۆشن ئەکردەوەو لە ناو خەڵکیشدا بە کۆبوونەوە شتەکان ئەخرایە بەرباسو قسە.

ئێمە باوەڕمان بەیەکێتی ڕیزەکانی گەلەکەمان هەبوو، حەزیشمان نەئەکرد لەم بارودۆخە ناسکەی خەباتو شۆڕشدا تووشی پەرتو بڵاویو لێکدابڕان ببین.

لەو بەشبەش بوونەدا تەنیا دوژمن سوودمەند ئەبێو نەخشەکانی باشتر سەر ئەگرێو بواری هاتنە ژوورەوەی جاسوسو چاوەکانی بۆ ناومان ڕەخساوتر ئەبێ.

گەر تەماشای مێژووی شۆڕشی کوردو حیزبو ڕێکخراوەکانی بکەین، ئەمە یەکەمین جیابوونەوە نەبووە، بەڵکووێنەی لەم بابەتە زۆر بووە، لە هەر جارێکدا هەر شتێك لەم بارەیەوە ڕووئەدات کاریگەری خۆی ئەبێ جگە لەوەی ڕەوڕەوەی شۆڕش لە گەشەکردن دوائەخاتو بێبڕوایی‌و متمانەی ناو خەڵکی کەم ئەبێتەوەو زۆر هەلمان لە کیس ئەچێ.

هەموو یەکگرتنو جیابوونەوەیەکیش هۆی دەرەکیو ناوەکی خۆیان هەیە. ئەگەر هۆیە ناوخۆییەکان لەبەر نەبوونی بەرنامەیەکی تێرو تەسەلی خەبات لە ڕووی فیکری‌وسیاسی‌و نەبوونی دیموکراسی‌و بگرە ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی تاکەکەسییەوە ڕۆڵی خۆی بینی بێت، بەڵام لە پەنایدا کنەی دوژمنانو هانەهانەی نەیارانوەکو هۆی دەرەکی بوونەتە سەرچاوەی تەقاندنەوەی ناکۆکییەکانو ئەنجا جیابوونەوەیش کە لێرەدا بەرژەوەندی شۆڕشو خەڵکی ڕەچاو ناکرێ تەنیا بەرژەوەندی دەستەو تاقمێك نەك هی گەل لەبەرچاو ئەگیرێ، بۆ یەکلایی کردنەوەی گرفتەکانیش پەنا ئەبرێتە بەر لوولەی تفەنگ کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا کارەساتە، چونکە زمانی گفتوگۆ حاکم نییە، لەم بوارەشدا پێکادان ئەبێو خوێن ئەڕژێتو هەتا دێت گۆمی ڕق قووڵتر ئەبێت، زۆر جار ئەگاتە ئەو ڕادەیەی بەشی ئاشتی تێدا نامێنێتەوە، چونکە ئاسۆی ئاشتی‌وونە یان ئەو تاقمانە لەکەلی شەیتانی ئارەزووەکانیان نایەنە خوارەوە. کەچی‌واقیع ئەوە پێویست ئەکات دواڕۆژ بەچاویلکەی تەڵخ نەبینن‌و بیریان بۆ ئەوە بچێت دوور یان نزیك لەسەر خوانی گفتوگۆ دانیشنو بۆ چارەنووسی گەل بە هەنگاوەکانی خۆیاندا بچنەوە. ئەو هێزە بۆ جیابوونەوەکەیان پاساوی زۆر دێننەوە بۆ ڕەوایی دانە ئەو هەنگاوەیان کە

نابوویان، مەرجیش نییە هەموو بیانووەکانیان ڕاستو درووست بوو بێ، بەڵکو بەشێکی زۆری لە دەروونێکی نەساغو دوور لە پرەنسیپی ڕێکخستنو کاری حیزبییەوە سەری هەڵئەدا کە نەیانئەتوانی خۆیان بە خەباتی ڕاستو ڕەوا بۆ پاکسازی ڕیزەکانی ڕێکخستن لە ڕێگەی ململانێی شەریفانەوە یەکلا بکردایەتەوە.

کادیرو سەرکردەکانی بزووتنەوە خۆی لە خەڵکی تر بە گەورەتر ئەزانی ئەیانویست کەسی یەکەمو بڕیاردەر بن، جگە لەوەی بەرنامەی کۆمەڵەیان بە دڵ نەبوو، دژیشی بوون. گەرچی لە ناو سەرکردایەتی بزووتنەوەشدا یەکدەنگی نەبوو، نەگونجانو ناکۆکی لە ڕیزەکانیانا هەبوو، بە تایبەتی ڕەسوڵ مامەندو د.مەحمود زۆر دانوویان پێکەوە نەئەکولا، کاتێك کە ئەو ناکۆکییانە لە ناو هێزەکەیاندا ڕەنگی ئەدایەوە زۆر لە پێشمەرگەکانیان ئەگەڕانەوە ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

ئەو هێزەی جیابوونەوە، دوور کەوتنەوە، ئێمەش لەبارەگاکانی خۆمانوەزعەکەمان ڕاگرت، کاتەکەمان بەلێدوانو لێکدانەوەی ئەو مەسەلەیە بەسەر ئەبرد، زیاتر سوور ئەبووین لەسەر تێکۆشانو بەرگریو پاراستنی هێڵی ڕاستەقینەی بەرنامەی (ی.ن.ك)و گردبوونەوە لەدەوری.

هەر لەو کاتانەشدا بوو ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی لە شەڕو پێکادانەدا بوون لەگەڵ دەوڵەتی ئێرانی لە ناو شارەکاندا. ڕۆژێکیان هەڤاڵ مام جەلال نامەیەکی بۆ حەمەسووری لێپرسراوی عەسکەری کۆمەڵە پێداین بیبەین بۆ دێی هەڵۆێ کە لە نێوان خانەو سەردەشتدایە. کەچی ئەو لەوێ نەبوو چوو بوو بۆ سەردەشت، گەڕاینەوە بەرەو سەردەشت کە گەیشتینە ئەوێ حەوت کۆپتەرو فڕۆکەی جەنگی بەتوندی بۆردومانی شاریان ئەکرد، خەڵکی لەحەیبەتا هەر یەکە بەلایەکدا ڕای ئەکردو خۆی حەشار ئەدا. لە ناو شاردا نامەکەمان دایە دەستی حەمە سوورو کارەکەمان بەجێگەیاند.

هێزی ئۆپۆزسیۆن بڕیاریاندا سەردەشت چۆڵ بکەن، ئێمەش لەگەڵ ئەواندا دەرچووینو بەرەو سەرکردایەتی گەڕاینەوە، مانگی ١٩٧٩/١٢ بوو کاك سامان هاتە لامانو داوای ئەوەی کرد خۆمان ئامادە بکەین بۆ گەڕانەوە بۆ

گەرمیان، لە سەرکردایەتی لەگەڵ کاك سامانو کاك گۆرانو م. جەلال شێخ تۆفیقو کاك دلێری قادرکەرەم چووینە سەردەشتو لەوێوە بەرەو بانە. کۆمەڵێك چەکمان پێبوو لە بابەتی هاوەنی ٨١و ٦٠ ملمو هەندێ شتی تر. لە سەر پردەکەی ڕەبەت سوپای ئێرانی هەبوو چەکەکانمان لە ناو ئۆتۆمبیلی پێکابدا قایم کردو چەکەکانی خۆشمان لە بەردەستدا دانا، بە شۆفێرەکەمانووت کە داوایان کرد بوەستین، تۆ مەوەستەو بڕۆ. کە گەیشتینە بازگەکەو لەبەردەم سەربازەکەدا خاوی کردەوە، کەویستی تەماشای ناوەوە بکات شۆفێرەکە بۆی دەرچوو هەرچەندە سەربازە کە ئیست ـ ئیستی کرد سوودی نەبوو، ئێمە دەربازبووین. گەیشتینە بانەو لەوێوە بۆ بلەکێو لەوێشەوە چووینە پارەزانی شارباژێڕ، لەوێ چەکەکانمان دایە کاك گۆرانو م. جەلالو ئێمەش لە گەڵ کاك حەمەی حاجی مەحمودی گوڵەخانە کەماڵەکەی لە دێی گوڵەخانەبوو بەرەو شارەزوور بەڕێ کەوتینو دوای چەند ڕۆژ حەسانەوە، شەوێك لە بناری سوورێنەوە بەرەو ناوچەی قەرەداخ کەوتینە ڕێ. بارانێکی توندو ڕەهێڵە ئەباری خۆشمان نەشارەزا بووین، ڕێگەمان هەڵەکرد، چونکە ئەو ساتانە پێشمەرگە بەڕۆژ نەیئەتوانی لە دەشتی شارەزووردا بمێنێتەوە، ناچار بووین تا کاتژمێر ١٢ی شەو ڕێ بکەین تانزیکی سەر بەحرەکە ببینەوە. شارەزاکەمان پێشمەرگەیەکی هەرێمی یەك بوو، لەبەرئەوەی ڕێگاکەی هەڵە کردبوو نەیئەوێرا قسەبکات، کە پرسیارمان لێکرد : ئێرە کوێیە..؟ووتی: سەرم لێشێواوەو نازانم کوێیە..؟ تومەز شەوارەی کردووە، ڕوومانوەرچەرخاند بەرەو لای سەیدسادق ماوەیەك ڕۆیشتین تا گەیشتینە سەر ئاوی تانجەرۆ لەوێشەوە پەڕینەوە بەرەو دیوی قەرەداخ، تا کاتژمێر ٤ی بەیانی نەوەستاین نزیکی خانوویەك بووینەوە نەخۆمان نەشارەزاکەشمان نەمانئەزانی کوێیە. کاك سامان منو سێ پێشمەرگەی تری نارد بۆ سۆراخ کردن کە نزیك بووینەوە گوێمان لە دەنگی گریانی منداڵێك بوو، دەرکەوت ئەمە دێیە، یەکێکمان لە دیواری حەوشەی خانووەکە بازیداو چووە ژوورەوە خاوەن ماڵمان هەڵساندو پرسیارمان لێکرد: ئێرە کوێیە..؟ووتی: قەڵبەزەیە، لەبەر ئەوەی

شەو زۆری نەمابوو، ڕێگاکەش دوور بوو، نەشمان ئەتوانی لە جادەی دەربەندیخان - سلێمانی بپەڕینەوە بڕیارماندا بمێنینەوە، بەسەر ماڵەکاندا دابەش بووین. کە ڕۆژ بووەوە ڕیشسپی دێکە نەیانهێشت کەس بۆ شار بچێ نەك ڕژێم پێبزانێ کە پێشمەرگە لەناو دێدایەو پەلاماری ئەوێ بدات. ئەو کاتانە باو بوو خەڵکی خۆفرۆش‌و خەفیە ئاگاداری دوژمنیان ئەکردەوە، بەڵام ئەم دێهاتانە کە زۆربەیان گەلاڵی بوون بە تایبەتی قەڵبەزە خەڵکێکی باش بوون زیاتر بە بەخێوکردنی مەڕومالاّت‌و ڕاوەماسییەوە خجڵ بوون، پیاو خراپیان نەبوو. ئەم گلاڵییانە بەشێکن لە هۆزی جاف‌و کۆن گەرمیان‌و کوێستانیان کردووەو بەشێکیان لە گەرمیان‌و بەشێکیان لە شارەزوورو لە زۆر شوێنی تری کوردستانی عێراقدا هەن، شێوەی قسەکردنیان (ئەڕا - ئەڕا) یەو لەگەڵ گفتوگۆی جاف دا جیاوازی هەیە کەئەم شێوەیە زیاتر لە ناوچەی خانەقین باوەو زانیارییەکی ئەوتۆم نییە چۆن ئەم شێوە قسەکردنەیان‌وەرگرتووە مەگەر زمانناسەکان لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن‌و بگەنە ئەنجامێك.

دوا نیوەڕۆکەی کاك سامان خۆی کۆبوونەوەی بەخەڵکەکە کردو سوپاسی بێپایانی خزمەت‌و یارمەتی دانیانی کردن، پاشان بەرەو کانی مرواری‌و قلیجە بەرێ کەوتین، لەبەرئەوەی جادەی گشتی سلێمانی - دەربەندیخان بۆسەی دوژمنی لێدانرابوو، ڕێڕەوەکەمان گۆڕی‌و ڕوومان کردە ئەحمەد برنەو عازەبان. لە عازەبان کەسێك نەبوو شارەزاییمان بکات، پیاوێکی پیر دەرپەڕی‌و ڕووی کردە خەڵکەکە: زۆر شوورەییە بۆ ئەم گەنجانەوابێ غیرەتن، ئینجا پیرێکی تری لەتەمەنی خۆیدا پەیدا کردو کەوتنە پێشمان تا دێی ناوتاق، لەوێ خوا حافیزییان کردو گەڕانەوە.

زۆرجار پیرەکان لە ڕووی دنیا دیدەیی‌و ئەزموونیانەوە بوێرانە ڕێنمایی هێزی پێشمەرگەیان کردووە کە گەنجەکان پرکێشی ئەوەیان نەکردووە. ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی یان کادیر هاتوچۆی ئەو دێهاتانەی نەکردووەو پێگەی ڕێکخستنی تیادا درووست نەبووە بۆ ڕاکێشانیان بۆ دۆستایەتی کردنی شۆڕش

یان ئەو گەنجانە لە ترسی دوژمن‌و ئیخباری کردن نەیان‌وێراوە هاوکاری بکەن مەگەر بەدزییەوە، لە ڕاستیدا کادیر لە شۆڕشدا کەسێکی خاوەن پلەو بە دەسەڵات بوو بگرە هۆکارێکی باشبوو بۆ تێگەیاندن‌و ڕێکخستنی خەڵکی بۆ خەبات‌و شۆڕشش‌و دوور خستنەوەیان لە خراپەکاری، سەرچاوەیەکیش بوو بۆ کۆکردنەوەی زانیاری‌و هەواڵ‌و دەنگوباسەکان‌و لێکۆڵینەوە لە سەر کێشەو گرفت‌و کەموکوڕی‌و تاوان.. بۆیە نەك هەر خەڵکی سڵیان لێکردۆتەوە بەڵکو پێشمەرگەش زۆر حیسابیان بۆ کردووە.. لەم میانەدا پێشمەرگەیەکمان هەبوو بە ناوی فایەقی شوانکارە کە خەڵکی خێڵی مەنسور بوو زۆر لە کادیرو ڕاپۆرتنووسین ئەترسا، هەر کادیرێکی ئەبینی تەماشایەکی ئەکردو سەرێکی ڕائەوەشاندو بە هاوڕێکانی ئەووت: دەنگتان هێواش کەنەوە ئەوە قەڵەمەکەی ژاراوییە با پێمان نەزانێ..

لە ئەنجامی ڕێکردنی زۆردا ئەمەندە ماندوو بووین نەمانتوانی حەرەسیات بگرین، برایەکی کاك سەردار ناوتاقی کە دانیشتوو بوو حەرەسیاتی گرتین، دەمەو بەیانی من‌و کاك شێخ جەمال کەمین بووین لەسەر چیای پشتی دێکە تاکو ڕۆژ بووەوە، بەفری ڕۆژی پێشوو هەر مابووەوە سایەقەی کردبوو، ڕەشەبایش هەڵیکردبوووەختبوو لە سەرمانا ڕەق بینەوە. ناوتاق هەرچەندە لە شوێنێکی چەپدا بوو، چەند ماڵێکی کەم بوون لە تیرەی تەرخانی جاف، خەڵکەکەی باش بوون‌و کاك سەرداریش پێشمەرگە بوو، بەڵام لە دەربەندیخانەوە زۆر نزیك بوو. کە دنیا ڕووناك بووەوە لەوێ دەرچووین بەسەر شاخدا بەرەو مچەکوێر مەسافەمان دا. بۆیەش بەوێدا ڕۆیشتین چونکە دوژمن لە دەشتایی نێوان کانی سارد ـ دێوانەدا خەریکی جادە لێدان بوو، گەر دەربکەوتینایە هێرشمان بۆئەکراو کۆپتەرمان بۆ هەڵئەستا، لە مچەکوێر لامان دا کە لە بناری شاخی سۆڵەدا بوو، بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە مەسۆیی قەرەداخ کە پێی ئەڵێن مەسۆیی قشڵاخ‌و لەدەشتایی خوارەوەی کەژی کەڵوەش دایە ٥٠ ـ ٦٠ ماڵێك ئەبوو سەر بەتیرەی ڕۆغزاین، خەڵکێکی باش‌و دڵسۆزی شۆڕش‌و پێشمەرگە بوون، قوتابخانەو مزگەوت‌و مەلایان هەبوو، شەهید مەلا ئەحمەدی

گەرمیانی خەڵکی ئەم دییە بوو، زۆرتر خجڵی کشتوکاڵو مەڕدارینو هەندێ باخیان هەیە، بەڵام دێکە کام ئاونو بیریان هەبوو بۆ خواردنەوە، لەوێ حەساینەوە کە لە ماڵان هاتینە دەرەوە خەڵکەکەی لە دەورمان کۆبوونەوەو هاوەنەکەیان بینی، کەوتینەوەسف کردنیو بەتانو پۆیا چووینە خوارەوە، هەرچەندە ساجەکەی ئەسڵی نەبوو یەك گوللەشی هەبوو کاك سامان بە بەرچاوی خەڵکەکەوە تەقاندی پاشان هاوەنەکەمان دا بە کۆڵماندا و بەرەو بەلەکجاڕ ڕۆیشتین، کە ئەکەوێتە نزیکی تەکیەو لەوێ چاومان بە کاك مستەفا چاوڕەش کەوتو لەگەڵیدا کۆبووینەوە، لەو کۆبوونەوەیەدا کە دوا دوایی مانگی ١٩٧٩/١٢ بوو بڕیار درا کەرتی پێنجی دووز درووست بکرێ. کە گەڕاینەوە گەرمیان کەرتەکە درووست کرا، کاك خالید گەرمیانی کرا بەفەرماندەی کەرتو منیش بە جێگری. سنووری کەرتی پێنجی دووز هەر لەبناری سەنگاوەوە تا ناوچەی کفریو دووز بوو کە هەموو دێهاتەکانی سەنگاوو بناری ئاژداخو بناری زەنوورو ناوچەی زەنگنەو بناری گڵو ناو داودەو دێهاتەکانی سەر ئاوەسپی تاکو ناوچەی سەرقەڵا ئەگرێتەوە.

درووستکردنی ئەم کەرتە لە جێی خۆیدا بوو بۆ ئەوەی بتوانرێ لە ڕووی کاری پێشمەرگانەوە دەست لە هێزەکانی دوژمن بوەشێنرێو پێگەی نوێ بۆ شۆڕش لە ناو خەڵکیدا پەیدا بکرێ.

## ساڵی ١٩٨٠

پێمان نابووە ناو دەروازەی ساڵی نوێوە، لەگەڵ کاك خالید دا دانیشتنێکمان کرد، لەسەر شیرازەی کەرتو نەخشەی کاری داهاتوومان بۆ زیاتر کردنی پێشمەرگەو دروست کردنی مەفرەزەو ئەنجامدانی کارو چالاکی پێشمەرگانەو دەستوەشاندن لە دوژمن بە تێرو تەسەلی قسەو گفتوگۆمان کرد، ئینجا کاك خالید نەخشەی شەڕێکی کێشا لەکانی شیرینە ئەنجامی بدەین. کە شوێنێکی گرنگی شەڕکردن بوو ئەکەوێتە نێوان ناحیەی قادر کەرەمو دووزەوە، بە چەمی گاوبازەش ناوئەبرێ. هەردەو چەمێکی سەختەو لە کۆتایی

ئەم هەردەو چەمەوە بەلای دووزەوە گردی پیزلی لێیە، ئەم گردە نەوتی هەیە، ڕۆژهەلاتی گردەکە دەشتی مارداری پێئەلێن کە شەریکەی نەوتی لێ دانراوە، کانی شیرینە کە شاهیدی دەیان شەڕو نەبەردییە، چ لە شۆڕشی پێشووو چ لە شۆڕشی نوێدا، دەیان کوڕی ئازاو نەبەزی تیا شەهید بووەو دوژمن شکستی زۆری تیا خواردووە.

بەپێی هەندێ زانیاری کە بەدەستمان گەیشتبوو لێپرسراوی مونەزەمەی قادرکەرەم لەجادەی دووز ـ قادرکەرەم هاتو چۆی ئەکرد، ڕۆژێکی مانگی ١٩٨٠/١ لەسەر جادەی کانی شیرینە بۆسەیەکمان بۆ تێکەوتنی ئەو کابرایە دانا، زۆر بەووردی تەماشای جادەکەمان کرد هیچی تیانەبوو بەکاك خالیدموت: بابچینە سەرجادەکە. ئەووتی: ئێوە بچنە سەر گردۆلگەکانو جێگەی سەربازەکان نەکو ئێمەیان بەدێ کردبێو لە بۆسەدابن بۆمان. چونکە سەربازەکان بە ڕۆژ لە هەندێ شوێندا ئەمانەوە بۆ پاراستنی ڕێگاوبانو جادەکان تاکو کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ. چەند کەسێك چووینە شوێنی سەربازەکان، بەکاك ئەحمەد دوانزە ئیمامیموت: نزیك بەرەوە بزانە چی هەیە..؟ کاك ئەحمەد یەك دوو خڕکە بەردی گرتە شوێنەکە هیچ دەنگ نەبوو، تومەز سەربازێکی تێدانووستووە، ئینجا چووینە سەر جادەکەو دامەزراین، برادەرێکمان ناردە سەر بەرزاییەك تاکاتێ ئۆتۆمبیلی کابرا دەرکەوێ ئاماژەمان بۆ بکات، دوای ماوەیەك بانگی کرد:ووریابن هات. چوار پێنج قەمەرە بەشوێن یەکدا تەراتێنیان ئەکرد، ئۆتۆمبیلی مونەزەمە تێکەلیان بوو بوو، ئێمە نەمانزانی ئەمانە ئۆتۆمبیلی بووکن، کە گەیشتنە بەردەستمان تەقەمان لە ئۆتۆمبیلی مونەزەمە کرد، ئۆتۆمبیلی بووکیش بەرکەوت، بەلام بووکەکە بەرنەکەوت، هەندێك زەلامی ناو ئۆتۆمبیلەکانی دوای بووك بریندار بوون. لە گەرمەی تەقەکاندا لە قوللەکەوە سەربازەکە کە نووستبوو بوو تەقەی لێکردینو شپرزەی کردین، بەلام لێی هاتینە دەستو کوشتمان، ئۆتۆمبیلی مونەزەمە بەپەلە پڕوزێ دەربازی بوو. پاشان کشاینەوە. لە جادەکە کەمێك دوور کەوتینەوە تەماشا ئەکەین دوژمن بەهێزێکی گەورەوە هات، بۆی

دامەزراین کە گەیشتنە بەردەستمان دامانە بەر ئاگری لوولەی تفەنگەکانمان، سێ جاش ناشەعبیمان لێکوشتن، ناچار بوون بەرەو کولانەکانیان سەر شۆڕبکەن‌و ئێمەش بە ساغی گەڕاینەوە، دوای ئەوە کەرتەکەمان کۆکردەوەو کردمانە دوو بەشەوە:

١. بەشێکی لەگەڵ کاك خالید دا تاهیری حاجی ڕۆستەم فەرماندەی مەفرەزە بوو.

٢. بەشەکەی تری لەگەڵ منداوالی قۆبەیی فەرماندەی مەفرەزە بوو.

هەریەکە لە ئێمەش دەستەیەکی چەند کەسیمان هەبوو، دەستمان کردە جەولە کردن لە ناوچەی زەنگنەو قادرکەرەم، کە شارۆچکەیەکە لە ڕۆژهەلاتی کەرکوك لەسەر چەمی ڕۆخانە، دام‌و دەزگای ئیداری میری‌و فەوجێکی سەربازی بۆ سەرکوتکردنی خەلکی ناوچەکەی تێدا بوو، مەلبەندی دەروێشی قادرییەو گۆڕی شێخ حەسەنی قەرەچێواری تێدایە، زۆرتر عەشیرەتی زەنگنەو شێخان‌و جەباری‌و گلی تێدا نیشتەجێیە، لە کەرکوك‌و دووزو سەنگاوەوە جادەی قیری بۆ دێت، لەسەر چەمی ڕۆخانە پردێك درووستکراوە بۆ ناو قادرکەرەم، ئەم شارە کوڕی ئازاو پێشمەرگەی قارەمانی زۆری لێ هەلکەوتووە، لەو ماوەیەدا دوژمن بەزۆر چەکی ئەدا بە خەلکی‌و ئەیکردنە جەیشی ناشەعبی، هەندێك هەواڵمان بۆ هاتبوو کەئەو جەیش ناشەعبییانە لە ماڵەوە ئەخەون، بۆیە بڕیارمان دا بچینە سەریان بەنیازی گرتنیان.

شەوێکی مانگی ٢/١٩٨٠ چووینە ناو قادرکەرەمەوە، لە سەرەتادا دامانە سەر ماڵی عەلی باوە کە کۆنە ئەندامی حشع‌و تازە بەعسییەکی چەپەڵ‌و خراپی لێدەرچوو بوو چەکی دوژمنی هەلگرتبوو، ئەندامی کۆمەڵەی جووتیارانیش بوو، لە دەرگاوە ڕێگامان نەبوو بچینە ژوورەوە، بە برادەرانم‌ووت: ئێوە هەلّمبڕن بچمە سەربان‌و لەوێشەوە ئەچمە حەوشەو لە بەردەرگای ماڵەوە خۆم حەشار ئەدەم، ئێوەش لە دەرگا بدەن کە هاتە دەرەوەو تێم خوڕی چەکەکەی دانەنێ ئەیکوژم. کە چوومە سەربان تەماشا ئەکەم دارێك نیومەتر لە خانووەکە زیاترەو ها لەناو حەوشەکەدا، دووربینێکم لەملدا

بوو،ویستم به دارەکەدا بچمە خوارەوە، باوەشم به داردا کرد دابەزم، بەڵام پێم نەیدا لەزەوی، قایشی دووربینەکە کە بە تاقمەکەوە بوو لە دارەکە گیربوو، هەڵواسرامو عاسی بووم، لەوە ئەترسام خاوەن ماڵەکە بەخەبەر بێتەوە، خۆم ڕاپسکانو قایشی دووربینەکە پچڕاو کەوتمە خوارەوە، دەنگی چەكو مەخزەنەکانم هات، بە ڕاکردن گەیشتمە بەر دەرگای ژوورو کابرای خاوەن ماڵ بەئاگا هاتو دەرگاکەی کردەوە، لوولەی تفەنگەکەم لەسەر سنگی توند کردو پەلم ڕاکێشاو هێنامە دەرەوە، هەر لەو کاتەدا برادەرانیش دەرگای حەوشەیان شکاندو هاتنە ژوورەوە، کابرا بەپەشۆکاوییەوەووتی: ئەوە لە کوێوە هاتوون..؟ هەر چوار دەوری شار بۆسەیە. پێمانووت:وادیارە ئێوە بە پشتیوانی ئەوە لە ماڵەوە ئەخەون. چەکەکەت کوانێ..؟ووتی: ئێوارە لە مونەزەمە نەم هێناوەتەوە، دامانە پێش خۆمان بۆ ماڵی هەندێ کەسی تر کە چەکیان هەبوو. چووینە سەر ماڵی خەیاتێ هەندێ بانگمان کردوەلاّم نەبوو، خۆمان چووینە ژوورەوەو ماڵەکەی گەڕاین، خۆی لەماڵا نەبوو، سێ مەخزەنو هەندێ فیشەکمان دۆزییەوە، پاشان گەڕاینەوەو یەکمان گرتو لە شار دەرچووین، لە ڕێگا هەندێ فیشەکمان نابە ڕەبایەکەوە، ئەویش هەندێ هاوەنی تێگرتین، عەلی باوەمان هێناو چەکێکمان پێ کڕیو دامان نا تا پاش ماوەیەکی تر بەرەڵای بکەین.

مانگی ٤/١٩٨٠ بوو هەواڵێکمان پێگەیشت کە ڕژێمی بەعسی عێراقی لە کارێکی نامرۆڤانەدا خەڵکێکی زۆری لە ژێر ناوی تەبەعیەی ئێرانی دەرکردووە کە تەنیا مەبەستیشی لەم کارە مەترسیدارە هەر کوردە فەیلیێەکانە کە لە کۆنەوە لە عێراقدا ئەژینو بوونەتە خاوەن دەسەڵاتێکی دارایی بەرچاو لە بەغدادا.

ڕژێمی بەعس لەم هەنگاوەیدا چەند مەبەستێکی پەنامەکی هەبوو:

- ئەو کوردانە بوو بوونە خاوەن بازاڕی ئابوریو بە دەرکردنیان بەڕووتو قووتی دەستی پێوەنانو هەرچی سامانیان هەبوو دەستی بەسەراگرت کە لەوانەیە بە چەندین ملیار دینار مەزنە بکرێ.

ـ ئەمانــە لــە ڕووی هەسـتی نەتەوایــەتیو دڵسـۆزی بــۆ کـوردو کوردایــەتی هەڵوێستیان هەبوو، ڕۆڵی تایبـەتیان ئـەگێڕاو بـەعس مەترسـی زۆری بـۆ پاشـە ڕۆژ لێئەکردن.

ـ ئەمانـە لـە ڕووی مەزهەبییـەوە شـیعە بـوون، بـەعس مەترسـی کاریگـەرێتی ئـەوانی ئـەکرد کـە پارسـەنگی بەغـدا بگـۆڕنو سـەر پەشـە بـۆ سـوننەی بەغـدا درووست بکەن.

بۆیە بەلای خۆیەوە بە دەرکردنیان ئـەو کۆمەڵـە گرفتانـەی لـە کـۆڵ ئەبێتـەوە، بــێ گوێدانــە ئــەوەی کــە ئەمــە ســتەمێکی ناڕەوایــەو پێشـێلکردنی ئاشـکرای بەندەکانی مافی مرۆڤە.

لای کاك خالید پێشنیارم کرد بەو هێزەی لای خۆمـەوە لـە تۆڵـەی یـادی ساڵڕۆژی شەهید سەرکەوت دا کە ئەکاتە ڕۆژی ١٩٨٠/٦/٢٤ شەڕێك بکـەین، زۆری پێخۆش بـوو، هێزەکـەمان بەخۆمـەوە ٩ کـەس بـووین. چووینـە کـانی شـیرینەو دامەزراین، یەکەم ئۆتۆمبیلمان ڕاگرت، خەڵکی ڕانیە بوو، تینوومـان بـوو، داوای ئاومان کرد، ئاوی داینیو لێیپرسین:

ئێوە چین..؟

ـ پێشمەرگەین.

ـ بابەگیان هێشتا زووە، تووشی شەڕ ببن تیائەچن، سەرجادەکە بەربدەن.

ـ نەخێر زۆر ئاساییە لێرە بین، کە دوژمن هـات شـەڕئەکەین، هـەر لـەو کاتـەدا تیۆتایـەکی جووتیـاری هـات، ئـەملاولامان لێگرت،وەسـتا شـکوری شـێخ غـالبی تاڵەبانی لێئەخوڕی کە پیاوێکی خراپ بـوو، دەرگـای ئۆتۆمبیلەکـەمان کـردەوەو چـەند سەرنشـینێك دابـەزینو بەویشـمانووت: دابــەزە، کەچــی ئــەو پێــی بــە بەنزیندا ناو فرتـەی کـردو لـە دەستمان دەرچـوو، هەرچـەندە تەقـەمان لێکـرد سـوودی نــەبوو، بــەڵام منــاڵێکی چــوار ســاڵەو چــاکەتەکەی لــە ئۆتۆمبیلەکــە بەربوونــەوە. ئــەو زەلامانــەی کــە لــە ئۆتــۆمبیلی کــابرای ڕانیــەیی دا بــوون دامانبەزاندن بەرەو دێی مامیسك ڕەوانەمان کردنو مناڵەکەمان نایە باوەشی یەکێکیانـەوە، ئـەم مناڵـە کـە نـاوی عـەلی بـوو لـە حکومـەتی هەرێمدا بـوو بـە

مقەومزی ئاسایش لە چەمچەماڵ، پاشان لە شەڕی ناوخۆدا شەهید بوو. بە کاکوالی قۆبیەیم‌ووت: با کەمێك لەسەر جادەکە بکشێینەوەو سەنگەر بگرین، نەوەکو دوژمن لە قادر کەرەمەوە بێت، تومەز بارەگای لیوای قادرکەرەم ئەو ڕۆژە ئەگۆڕێ‌و بەرەو دووز ئەڕوا، هەروا پەنجا مەترێك دوور کەوتینەوە، پێنج زیل گەیشتنە سەرمان، بە پەلە دامەزراین، شەڕ دەستی پێکرد، هێزەکەی دوژمن هەتا ئەهات پتر ئەبوو، بەڵام ئیتر ڕۆژ بەرەو لای ئێوارە ئەچوو، ترسی هاتنی کۆپتەرمان نەمابوو،وورەمان بەرز بوو، کاکوالی هاتە لامەوەووتی: چی بکەین..؟ووتم : باهێرشێکی بچووکیان بۆ بکەین. خۆمان سازداو هەڵمان کوتایە سەریان، سەربازێك کە تفەنگێکی ئاڕ بیکەی پێبوو یەکسەر کوژرا،ویستمان چەکەکەی بهێنین، لەو کاتەدا کاك والی پێکراو شەهید بوو، داخێکی زۆری نابە ناخمانەوە، چونکە لاوێکی جەربەزە بوو، لە شەڕدا زۆر بەهەڵمەت بوو، گوێی بە مردن نەئەدا، کەهێزەکەی دوژمن کشایەوە، ئێمەش تەرمەکەی شەهیدوالیمان هەڵگرت‌و بەرەو دێی مامیسك کەوتینە ڕێ، لە پێش خۆمانەوە دوو پێشمەرگەمان بۆوولاخ نارد بوو، ڕێگەیان لێتێکچوو بوو، پێکەوە گەیشتینە ناودێ. کاتژمێری ٢ی شەو بوو، زۆر تینوومان بوو، خەڵکی دێ هاتنە پێشوازیمانەوە، هەواڵی شەهید بوونی کاکوالی غەمباری کردن، هەر بەو شەوە تەرمەکەیان لێوەرگرتین لەگەڵ دوو پێشمەرگەدا بردیان بۆ دێی بەگزادەو بەخاکیان سپارد، ئێمەش بۆ ئەوەی دوژمن هێرشمان بۆنەکات کاتژمێر ٣ی شەو بەرەو دێی بەکرەگەڕە ڕۆیشتین، دنیا گەرمبوو، گیانمان خەڵتانی خوێنبوو ئەمە ئەوەندەی ترومرسی کردبووین، خەڵکەکەمان لێکۆبووەوەو پرسیان: بۆوا خوێناوین..؟ووتمان: کاکوالی قوبەیی شەهید بوو.

لەم شەڕەدا ١٨ سەرباز کوژرا، بریندارێکی زۆر هەبوو، بەڵام بەداخەوە لە یادکردنەوەی شەهیدێکی قارەماندا هاوڕێیەکی نەبەزی ترمان شەهید بوو.

ڕۆژی دوایی لە ئاوەسپی پەڕینەوە، چووینە دێی خانی سەروو کە ئەکەوێتە لێواری ئاوەسپی‌و لە عەشیرەتی زەنگنەو ماڵی سەرۆکی عەشیرەتی زەنگنە ڕۆستەم ئاغای لێیە کە پیاوێکی باڵابەرز بوو، زۆرتر بە زەنگنانە قسەی ئەکرد، کاتی خۆی زەبرو زەنگێکی زۆری هەبووە بەرامبەر بە جووتیارەکان،

کەس نەیوێراوە سەرپێچی بڕیارەکانی بکات، هەموو زەنگنە گوێڕایەڵییان ئەکردو خاوەن دیوەخان بوو، لە ڕووی نانەوە چاوتێر بوو.

لەوێ کاک خالیدمان بینی، هەواڵی شەهید بوونی کاکوالیمان پێدا کەخزمی خۆی بوو زۆریشی خۆشئەویست.ئێمە زۆر خەمبار بووین. کەچی ئەو دڵی ئەداینەوەو ئەیووت: ئەوە ڕێی هەموومانە، سەرکەوتنی گەلو نیشتمان بە خوێنی سووری شەهیدان مسۆگەر ئەبێت.

ئینجا بەرەو ناوچەی سەنگاو هەڵکشاین، بەمەبەستی جەولەو ئەنجامدانی چالاکییەك کەپێشتر بیرمان لێکردبووەوە. هێشتا شەڕی ئێران ـ عێراق دەستی پێنەکردبوو، ڕژێمی عێراق بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچەکانی گەرمیانو دابڕینی قەرەداخو جێبەجێکردنی کارە سەربازییەکانی یان باشتر بڵێین بۆ سەرکوتکردنی هێزی پێشمەرگە جادەیەکی لە سەنگاوەوە بۆ دەربەندیخان دەستپێکرد، ئێمەش لای خۆمانەوە بەچاکمانزانی تەنگوچەڵەمەی بخەینە ڕێ بە تەقاندنەوەی ئەو کەرەسەو پێداویستییانەی بۆ جادەو پرد درووستکردن بەکاری ئەهێنا. ئەم کارەی ئێمە لەچەند ڕوویەکەوە سوودی هەبوو:

١. لەڕووی مادییەوە زیانێکی باش لەدوژمن ئەکەوتو ناچار ئەبوو جارێکی تر ئەو کەرەسانە بهێنێتەوە.

٢. ئەو قۆنتەراتچییانەی دەستیان لەگەڵ تێکەڵ کردبوو بۆ جێبەجێکردنی نەخشە بۆگەنەکەیان ئەکەوتنە ناو بازنەی مەترسیو زیانەوە لە دوو ڕووەوە:

أ. زیانی مادی.

ب. مەترسی لەکیس چوونی خۆیان.

٣. دەسەڵاتی شۆڕش باشتر لەناو خەڵکیدا پێگەی دائەکوتاووزەیەکی باشی پێئەبەخشین، جێیوەبیر هێنانەوەیە ساڵی ١٩٧٩ جارێکی تر لەگەڵ شەهید سەرکەوتدا هەموو ئەو پردانەمان تێکداو کەرەسەکانمان سووتاند، ئەمجارەیانویستمان زیان بەو قۆنتەراتچییە کرێگرتانە بگەیەنین.

شـایانیووتنه ئـەو ناوچـەیە هێـزی زۆری دوژمنـی لێبـوو بـۆ پاراسـتنی ڕێگاوبانەکە.

ڕۆژێکـی مـانگی ٦/١٩٨٠ لەگـەڵ دەسـتەیەك پێشـمەرگەدا چـووینە سـەر پردێکی نزیکی دێی کچان کە ٥ کلم لە سەنگاوەوە دوورەو لەبناری ئاژداخـە، کـە بەشێك لە خەڵکەکەی خۆشناویو خزمی ئـەنومر بـەگی بێتواتـەنو کـاتی خـۆی هاتوونەتـە ئـەم ناوچـەیە. کاتـژمێر ٥ ی ئێـوارە بـوو ئـەو ئۆتۆمبیلـەی هـەموو ڕۆژێ فۆنتەراتچیو کرێکارەکانی ئەگواستەوە نزیك بووەوە، دەستمان لێڕاگرتو نەوەستا، دەسترێژێکمان لێکرد ئینجاوەستا جاشێکی تێدا بەرکـەوتو هەنـدێك پیاوباش لەگەڵ شۆفێرەکەدا. دوای ئەوە بەرەو شاخی ئاژداخ کشاینەوە. دوژمـن لەهێزەکەی ئەو ناوچـەیە هێزێکـی لـە زرێپـۆشو ناقیلـەو چـەند ئۆتـۆمبیلێکی قوات خاسە ناردە دواماندا. ئەو شوێنەی دامێنی ئاژداخ ئێمەی بۆ چـوو بـووین ڕووتەن بوو شوێنی شەڕیوای نـەبوو، هـەر چۆنێ بـوو دامـەزراین، بڕیارمـان دا تاکو هێزە پیادەکـەی نەگاتـە ناومـان دەسـت نەکەینـەوە، ناقیلـەکان بـە دۆشـکاو هێزە پیادەکەش بە هاوەنو چەکی سووك لێیان ئەدەین، کە هاتنـە بەردەسـتمان لێیان ڕاپەڕین، هەندێکمان لێکوشتنو هەندێکیش بریندار، شەڕ تاکاتژمێری ٧ی ئێوارە درێژەی کێشا. دوژمـن چیـتر نـەیتوانی بێتـە پێشـەوە، تاریـك داهـات، بـێ زیـان شـەڕگەکەمان بەجێهێشـتو بـەرەو دێـی پێـنج ئەنگوسـتو لـەوێ تۆزێـك حەساینەوە، پاشان پێنج کاتژمێر لـەو ناوچـەیە دوورکەوتینـەوە، چـونکە کـاری دوژمن پاش شەڕکردن، پشکنینی ناوچەکە بوو تاکو بەهێزی تازەو هەلیکۆپتـەر پەلاماری بداتەوە.

چـووینە دێـی تەپـە عـارەب کـە ئەکەوێتـە خـوارووی شـاخی زەنـوور. بەپێشـمەرگەکانمووت: بـەیانی زوو دەرئەچـین لـەدێ، بـەپێی هـەواڵێك کۆپتـەر دێـتو دائەبـەزێت. بـەیانی زوو دەرچـووین، ئێمـە دەگـەس بـووین، چـووینە شوێنێك هەم نزیکی کانییـەك هـەم تـۆزێ سـەخت بـوو، بەپێشـمەرگەکانمووت: جێگـا بـۆ خۆتـان خـاس بکـەنو دانیشـن زۆر مـەجوڵێن. دوای خـۆر گـەرم بوونوەختێکمـان زانـی ١١ کۆپتـەر هـات. ئێمـە دەگـەس بـووینو کۆپتـەرەکان ١١

بوون، شینەی حەمەڕەش ووتی:وەڵلا ئەمە بۆ گرتنی خۆمان هاتوون، هەر کۆپتەرێ زەلامێکی تێئەخەن و ئەکێکیان لە پێشەوە ئەڕوات ئەڵێ: ئەمانەمان گرتووە. پێشمەرگەیەکی خەڵکی کفریمان لەگەڵ بوو ناوی مستەفای بلە سەمەنە بوو، تازە هاتبوو، شارەزای پێشمەرگایەتی نەبوو، ئەترسا، نەیتوانی شوێنێك لەبنە بەردێکدا بۆ خۆی چاك بکات هەر ئەسووڕایەوە، شینە لێی تووڕە بوو: ترسنۆك تۆ هەر دانانیشی تا کەشفمان ئەکەیت و کۆپتەرەکان دێنە سەرمان. مستەفاش بە شێوە قسەی کفری ووتی: توو کون چاك بۆ خۆت دۆزیوتە، منیش لەم ڕاستییا دانیشتووم، ئیشتە گەرەکتە بکوژرێم.

لەم جەولەیەدا لەگەڵ کاك خالیددا یەکمان گرتەوە، ڕۆژێکی مانگی ١٩٨٠/٧ بوو، کاك خالید پێی ووتم بچینە سەر بارەگای سریەی حیمایەی قادرکەرەم و بەهاوەنی ٦٠ملم لێی بدەین، من لەهاوەنم نەئەزانی، هەر ئەو کاتە کاك خالید بەسەر پێی هەندێ شتی لەبارەی هاوەن تەقاندنەوە فێرکردم، خۆشم حەزم ئەکرد لەم بوارەدا تاقی بکەمەوە. هەندێ پێشمەرگەم لەگەڵ خۆمدا بردو هاوەنە ٦٠ ملمەکەو ٦ گوللەش، بەرەو قادر کەرەم جوولاین، هێشتا خۆری مابوو، هاوەنەکەم دانا لە شوێنێکدا کە بە چاو بارەگای سریەکەم ئەبینی، یەکەم گوللەم هاویشت هەر نەمزانی لە کوێ دای لە زەوی، گوللەی دووەم و سێیەم تا شەشەم لە هیچ شوێنێکی نەدا. دوژمن لە وەڵامی ئەم کارەماندا بە هاوەن دایبێژاین، شپرزەی کردین و دوو پێشمەرگەمان بریندار بوو، ئینجا گەڕاینەوە.

بەکارهێنانی هاوەن شارەزایی ئەوێ، بەلای کەمەوە ئەبێ دەورەی لە سەر بکرێ، نەك بە هەڕەمەکی بەکاربهێنرێ، ئەوەی هاوەن ئەتەقێنێ ئەبێ ئاست و مەداو گۆشەو نەخشە بە چاکی بزانێ، ئەبێ یەکێکیش ڕەسەد بێ، ئەبێ پێشمەرگە فێری زانستی جەنگ بێ لەگەڵ ئەو لێهاتوویی و ئەزموونەی خەباتدا کەوەدەستی ئەهێنێ، یەکێك لە کەموکوڕیەکانمان لە ماوەی چەند ساڵی پێشووی پێشمەرگایەتیماندا فێرنەبوونی زانستی جەنگ بوو. نەبوونی نەخشەو پلانی زانستیانە. نەبوونی جۆری پێشکەوتووی چەکە، ئەگەرچی لە

بوارێکی تەسکدا هەندێ خولی فێربوونی چەك لە سەرکردایەتی کراوەتەوە، بەلاّم هەموو پێشمەرگەیەك سوودی لێنەبینیوە، هەموو کارەکانمان بەسەلیقەی خۆمان کردووە، لەم سالاّنەی دوایشدا لە ئێران چەند خولێك کرایەوە، بەلاّم زۆر کەڵکی لێومرنەگیراوە لە بواری شەڕدا، لە حالەتی شەڕی پارتیزانیدا زیاتر لای ئێمە پشت ئەبەسترێتە ئەزموونو شارەزاییو لێهاتوویی فەرماندەو پێشمەرگەکانو لە ڕێگەی هەندێ نووسینو بلاّوکراوەشەوە ئەزموونی شۆڕشەکانی ترمان بۆ باسکراوە.

لە جەولەکەماندا بەرەو بناری سەنگاو ئەگەڕاینەوە، هەندێ دۆست ئاگاداریان کردین کە بەشەو هێزی دوژمن دەرئەچێتو ئەبێ ووریا بین، ئێمە خۆمان حەشاردا، چووینە جێگایەك بێشك بوو، لە نێوان دووبڕاوو زستانەو تەپەسێدا، سەرەتای پایزو دنیا سارد بوو، پشتوێنەکەم بە خۆمدا دابوو، پێشمەرگەکان دەمەتەقێیان ئەکرد، فەرهادە بچکۆڵو میران بووە قڕمیان. میرانووتی: ئەمجارە بچمە خوارەوە مەردانی زینانە ئەکوژم، فەرهادووتی:وەڵلاّ ناتوانی. میرانووتی: ئاخر ئەیکوژم، فەرهادووتی: حەدت نییە ناتوانی بیکوژی. لە ئەنجامدا بووە فەرتەنەیانو فەرهاد دەستی کردە مرخاندن، منیش لێیان ڕاپەڕیمووتم: ئەوە داناوەشێن ئەم هەرایەتان لەچییە..؟ دواجار ئاشت بوونەوە، میرانووتی:وەڵلاّهی هەتا نەبووە مرخان نەمزانی شەڕە. میران هەمیشە ئارەزووی ئەوەبوو سەر بنێتە سەر پێشمەرگەو حەزی لە نوکتەو قسەی قۆشمە بوو، جگە لەوەش بەو جۆرە کاتەکەیان بەسەر ئەبرد.

ئێمە لەم جەولەیەدا بووین، دەنگو باسمان بۆ هات کە ڕۆژی ١٩٨٠/٨/٩ هەندێ لە شارەزایانی ڕووسی بە ئۆتۆمبێلێکەوە هاتبوونە سەر پردی باسەڕە بۆ سەیرانو مەلەکردن، مامەڕیشەی قارەمانیان لێ تاین ئەبێو ئەیانگرێو بەرەو ناوچەی قەرەداخ ئەیانبات، تەسلیمی کاك گۆرانو برادەرانیان ئەکات، کاك گۆران لە سەرتای ساڵی ١٩٨٠ دا ئەکرێتە فەرماندەی کەرتی هەرێم، هەر چەندە کاك گۆران پیاوێکی نەخوێنەوار بوو کە چی فەرماندەیەکی ئازاو گورجوگۆڵو

دڵسۆز بوو جێگەی دڵخۆشی بوو بۆ پاشەڕۆژی ( ه.پ.ك )، چەندە لە ڕووی پێشمەرگایەتییەوە لێهاتوو بوو ئەوەندەش قسەخۆش و تالیقباز بوو، ڕۆژێك سەلامی کوێخا عەزیز لێی ئەپرسێ: کاك گۆران ئێستا چی ئەکەیت.. لە کام کەرتی..؟ لەوەڵامدا ئەڵێ: ئێستا کوێخای بەغدام.واتە فەرماندەی کەرتی هەرێم وەکو ئەوەوایە لە بەغدا کوێخابێت چونکە دەسەڵاتی کەمترە بە بۆنەی بوونی فەرماندەی هەرێم لە سنوورەکەدا. جارێکیان بۆ یەکەمجار لە گەڵ برادەراندا جەولەیەکی گەرمیان ئەکات، خەڵکی گەرمیان زۆر بە چاکی ناوی ئازایەتیان بیستبوو بۆیەش زۆر خۆشیان ئەویست هەر کە ئەیانبینی بە مامۆستا گۆران بانگیان ئەکرد، ئەمەش وەکو ڕێز لێنانێك بۆ پلەو ئاستی ئەو فەرماندە قارەمانە.. کە گەڕابوونەوە بۆ دیوی قەرەداخ کە بیری جەولەکەی گەرمیانی ئەکردەوە زۆر پێئەکەنی و ئەیووت: یەك جەولەی تری گەرمیان بکەم ئەبم بە خەتیب.

ڕۆژی ١٩٨٠/٨/١٠ دوژمن بە هێزێکی زۆرەوە لە چەند قۆڵێکەوە پەلاماری ناوچەی قەرەداخ - بازیان ئەدات، بەشوێن ڕووسییەکاندا ئەگەڕا، لە نێوان مێوڵی و خاوێدا پێشمەرگەکان ئاگر ئەکەنەوەو دوکەڵ بەرز ئەبێتەوە، بەمەش ئاشکرا ئەبن، کۆپتەرەکانی دوژمن ئەچنە سەریان و لێیان ئەدەن، شەڕ تا ئێوارە بەردەوام ئەبێت، بەداخێکی زۆرەوە شەش پێشمەرگە شەهید ئەبن، یەکێکیان کاك گۆران ئەبێ، ئەمەش زیانێکی گەورە بوو، کەلێنێکی لەناو هێزەکانماندا درووستکرد.

لە قۆڵی هۆمەرقەڵاشەوە پێشمەرگەکان لەگەڵ هێزەکەی دوژمندا کەوتبوونە شەڕەوەو زیانێکی باشیان لێدابوون، لێرەش کاك بەختیارو کاك هیوا حەمەفەرەج گیانیان ئەکەنە قوربانی خاکی کوردستان.

دوای شەڕەکان هەر ئەو ئێوارەیە ڕووسییەکان لەلایەن برادەرانەوە ئازاد ئەکرێن و ڕەوانەیان ئەکەنەوە. گرتنی ئەم ڕووسییانە خۆی لە خۆیدا کارێکی گەورەو دەنگێکی باشی دایەوە، جگە لەوە خۆیان بەچاوی خۆیان (ه.پ.ك)و شۆڕشی کوردووەزعی کوردستانیان بینی چۆن لەلایەن ڕژێمی عەفلەقییەوە

مامەڵەی لەگەڵ ئەکرێ‌و کورد لە پێناوی چیدا خەبات ئەکات‌و جیاوازی نێوان (هـ.پ.ك) کە بەبیروباوەڕەوە شەڕ ئەکات‌و هێزە پڕ چەك‌و مۆدێرنەکەی بەعسیان دی کە یەکێك لەسەرچاوەکانی پڕچەککردنی بەعس یەکێتی سۆڤیەتی ئەوسا بوو. ئەمەش یەکەمجار نەبوو بیانی بکەوێتە دەست (هـ.پ.ك) بەڵکو لەساڵی ١٩٧٧ کاك سەرکەوت‌و پێشمەرگەیەك ئەندازیارێکی ئیتالی کە بۆ مەسح هاتبووە دێی مەسۆیی سەرچەم ئەگرن‌و تووشی شەڕێکی قورس ئەبن لەگەڵ دوژمنداو جیهازێکی گەورەی دوژمن ئەگرن.

بەرەو کۆتایی مانگی ١٩٨٠/٨ بووبینەوە کەوتینە ناو بارێکی تازەوە کە تەقینەوەیەکی گەورە بوو نەك بۆ ئێمەو ناوچەکە بەڵکو بۆ هەموو جیهانیش، پاش سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران‌و هاتنی جمهوری ئیسلامی مەترسییەکی گەورە کەوتەوەو هەموو دنیا بەووریاییەوە تەماشای دوارۆژی ڕووداوەکانی ناوچەکەیان ئەکرد، چ ڕۆژئاواو چ ڕۆژهەڵات، هەریەکە لەڕوانگەی بۆچوونی خۆیەوە بەچاوێکی زلەوە ئەیانڕوانییە ئەم دەوڵەتەو سیاسەتەکانی ئایندەی، هاتنی ئەم ڕژێمە تازەیە تای تەرازووی‌وەزعەکەی لاسەنگ کردو پێوانەکانی هەڵوەشاندەوە، ئەوەی ئەیویست سوود لەم هەلومەرجە نوێیەوەربگرێت‌و بەرژەوەندییەکانی لە بشێوی بارودۆخەکە دا ببینێتەوەو ناوی تکاوی بگێڕێتەوە ناوچەوانی کە چەند ساڵ پێشتر لە دەستی دابوو عێراق بوو. ئێران هێشتا چەند مانگ بوو شا ڕای کردبوو، خەڵکی سەرگەرمی هەلی نوێ بوون‌و دەسەڵات بەتەواوی نەگیرسابووەوە، لە هەموو لایەکەوە پایەکانی قایم نەکردبوون، عێراق بیری لەوە ئەکردەوە کارێك بکات لە چەند ڕوویەکەوە کەسێتی دەربکەوێت:

١. ئەو شوێنە گرنگانەی سەر کەنداو کە لەپەیمانی ئەلجەزائیردا لە دەستی دابووەوەدەستی بهێنێتەوە.

٢. بەناوی بەرگریکردن لە ئوممەی عەرەبی عەرەبەکانی ئەهوازو سێ دوورگەی تر ڕزگار بکات‌و بیخاتەوە سەر نەخشەی عێراقی عەرەبی گەرچی سەر بەعێراقیش نین.

٣. بـــەدنیای بســـەلمێنێ عێـــراق دەوڵـــەتێکی بـــەهێزەو لـــە ڕووی تـــەکنیکی سەربازییەوە توانایەکی فراوانی هەیە.

٤. لەهەمووی گرنگتر بەر بەمەدی ئیسلامیو شیعەگەری بگرێ کە عێراق خۆی بەشێکی زۆری شیعەیەو مەترسی هەڵگیرسانی شۆڕشی شیعەی لێئەکرا.

ئـا لـەم ڕووەوە عێـراق کەوتـە بیـانوو گـرتنو شـەڕە دەنـووکی سـەر سـنوورو دنەدانیومزعەکـەو هەلەکەشـی لـەبار بـوو بـۆ هەڵسـووڕاندنی ئـەم مەسـەلەیەو دنیـای دەرەوەش پشـی پشیان بـۆ ئـەکرد بەتایبـەتی زۆربـەی بیرو بۆچـوونەکان بـۆ ئـەوە ئەچـوون کـە ئێرانێـك هێشـتا لەنگـەری نـەگرتووەو ماسـتەکەی نەمـەیوە هـەر ڕەشـەبایەکی دەرەوە لێـی هـەڵبکات ڕژێمـی تـازە تـەفروتوونا ئـەکاتو بەئاسـانی ئـەگۆڕێو ئـەوەی دەرەوە ئەیـەوێت دێتـە سـەر تەختی حوکم. ئەوەبوو لەڕۆژی ١٩٨٠/٨/٢٢ بە ئاشکرا عێـراق جاڕی شـەڕی داو بە بەرچاوی هەموو جیهانـەوەوەرەقەی مۆرکراوی پەیمانی ئەلجەزائیری دڕی.

بەمەش کەرایەتییـەکی گـەورەی کـردو خـۆی خسـتە نـاو داوی شـەڕێکی بێئامانەوە کە سەرەتا دەستپێکردنی ئاسان ئـەبێ بـەڵام کۆتاییەکـەی کارەسات ئـەبێ. بەخـەیاڵی خـۆیوای ئـەزانی ئـەتوانێ بەهێرشـێکی سـەربازی هـەموو شوێنێك بگرێو کەس خۆی ڕانـەگرێ لەبەردەمیـدا. سـەرەتا هێرشـێکی زەمینـی گـەورەی بـەرەو قـووڵایی نـاو ئێـران دەسـتپێکرد لـە کاتێکـدا ئەرتەشـی ئێـران لـەبارێکی ناسـازدا بـوو، ڕژێمـی تازەیـان بـەدڵ نـەبوو، پشـتیوانیان لێنەئـەکرد، دەسەڵاتی پاسداران لە سنوورەکاندا دانەمەزرابوو، کەسێك نەبوو بەرگری بکات، هەر پایەگاو مەخفەرو شارۆچکەو شاری ئێرانی بوو ئەکـەوتو خەڵکەکـەی ڕای ئەکرد، سوپای عێراقی تەتار ئاسا بێبەزەییانـە کەوتنـەوێزەی ئـەو شوێنانەی ئەکەوتـە چـنگیانو تـەفروتوونایان ئـەکرد هـەر ئەمەشـە لـۆجیکی هێـزی داگیرکەرو نەریتی سوپایەکی دواکەوتووو لەگەڵ ئـەو دروشمـەی بـەعس بـەرزی کردۆتەوە یەکانگیر نـەبێ: سـوپا بـۆ شـەڕو ئاوەدانکردنەوەیـە. بـەلای بەعسـەوە سوپا بۆ شەڕی  مالوێرانکەرە، سوپایەك کە هەمیشە لەشـەڕی کوردسـتاندا بـووە

قەت هیچ شوێنێکی ئاوەدان نەکردۆتەوە جگە لەوێرانکردن. ئەگەر بەعس ئەو دروشمەی‌وا دابڕشتایە: سوپا تەنیا بۆ شەڕە. باشتر ناوەڕۆکی بیرۆکەکەی ئەپێکاو ڕاستتر دەرئەچوو.

لەگەڵ بەرپابوونی شەڕەکەدا هەندێ ئاڵوگۆڕ کەوتە ناوچەکەوە بە تایبەتی حکومەت زۆر لەسەربازگەو ڕەبایەکانی ناوچە جیاجیاکانی لە هێزەکانی فەیلەقی یەك لە کوردستاندا چۆڵکردو هێزەکانی نارده بەرەکانی شەڕ لە خواروو ناوەڕاستی عێراق. بەمەش مەودای جوڵانەوەی هێزی پێشمەرگە زیاتر بوو، هەروەها سەرەتای ڕاکردنی خەڵك و نەچوونە شەڕ دەستی پێکرد، چونکە خەڵکی باوەڕیان بەو شەڕە بێهودەیە نەبوو.

لەم سەرو بەندەدا بوو دوا دوایی مانگی ١٠/١٩٨٠ بوو قیادەی مووەقەتە لە نۆکان‌و بێدەلان کە دوو دێ بوون لەسەر چەمی قاسمەڕەش‌و لە سەرەتای شۆڕشی نوێدا بەشێکی بارەگاکانی (ی.ن.ك) لەوناوە بوو، هێزیان کۆکردبووەوە بۆ پەلاماردانی سەرکردایەتیمان، برووسکەی بەپەلەمان بۆهات کە هێزێك بگاتە بارەگاکانی سەرکردایەتی، لەگەڵ کاك خالید دا ئازا هێزمان ئامادەکردو بەرەو دیوی قەرەداخ بۆ دیتنی کاك مستەفا چاوڕەش ڕۆیشتین، کەچی ئەو پێش ئێمە کەوتبووە ڕێ. هەتا جێشانە کە دێکە لەبناری گڵەزەردە بەدوایدا چووین نەمانگرتەوە. دوو ڕۆژ لەو ناوەدا ماینەوە، لەبەر نەشارەزایی نەمانتوانی بڕۆین. پاشان کاك ئەنوەر باڕۆیمان دۆزییەوەوەکو شارەزایەك بەناو خانووەکانی قادسیەی سلێمانیدا بەناوجەرگەی بۆسەی دوژمندا ڕەتی کردین، دوای چەند ڕۆژێك گەیشتینە سەرکردایەتی.

قیادە موەقەتە بەرامبەر بارەگاکانی سەرکردایەتی سەنگەریان لێدابوو، ئێمەش لە شێنێ‌و زەڵێ سەنگەرمان لێگرت، بەووریاییەوە لەوێ ماینەوە. دوای ماوەیەك قیادە موەقەتە هێزەکانیان کشانەوەو هێرشیان نەکرد. کاك خالید بەبڕیاری سەرکردایەتی گەڕایەوە گەرمیان‌و ئێمەش ماینەوە. پاشان بڕیاردرا هێزێکی هەرێمی پێنج‌و هەرێمی دوو جەماعەتی خۆشناوەتی‌و دەشتی هەولێر لەگەڵ هەڤاڵان ملازم سەید کەریم‌و عومەری سەید عەلی‌و ڕۆستەم

بازیانی پێک بهێنرێن بەرەو باڵەکایەتی، هەڤاڵان فەرمیدوون عەبدولقادرو برایم جەلالیشمان لەگەڵ بوو، پێش ئەوەی بکەوینە ڕێ کاک نەشیروان مستەفا کۆبوونەوەیەکی پێکردین لەمەڕ ئەرکەکانمان.

ڕۆژی ۱۹۸۰/۱۱/۱٦ لەشێنێ بەرەو قەڵاتۆکانی بناری قەندیل کەوتینەڕێ، شەو لەوێ ماینەوە، بارانێکی لێزمە دایکرد، بۆ شەوی دوایی گەیشتینە ماخ و بزنان. بەبەیانییەکەیدا چووینە جەلکان و مەمکان و بڕیارمان دا شەوەکەش بمێنینەوە. ڕۆژی ۱۹۸۰/۱۱/۱۸ بوو لەگەڵ کاک ڕۆستەم داوەستابووین قسەمان ئەکرد، دەنگی کۆپتەر هاتەگوێم،ووتم: دەنگی کۆپتەر دێت، کاک ڕۆستەمووتی: کوا دەنگی نایەت. لە ناکاو کۆپتەرەکانم بەدیکرد. دووان بوون و نیشانی کاک ڕۆستەمم دان. بەوە نازانین ملازم سەید کەریم بەڕێ کەوتووەو کۆپتەریان لێپەیدا بووە، گردێك لە ڕۆژئاوای دێکەدا بووووتم: من ئەچمە سەر ئەو گردەو ڕەشاشی ژ ـ۳یەکە ئەبەم، ئەم ڕەشاشەمان لە شێنێ بە تفەنگێکی سەلیب گۆڕی بووەوە، بانگی غائب دووزیم کردوپێکەوە سەرکەوتین، ئێمە نەگەیشتینە سەر گردەکە لەو دیوەوە کۆپتەر دەستی بەتەقە کرد، تومەز لە برادەرانی ملازم سەید کەریم ئەدات، لەو کاتەدا کاک ڕۆستەمیش گەیشتە لامان و پێکەوە دەستمان لە کۆپتەرەکان کردەوەو کۆپتەرەکان لێیان دا ڕۆیشتن. کاک ڕۆستەم من و د.ساجدو پێشمەرگەیەکی تری بۆ شوێنی تەقەکان نارد، کە نزیک بووینەوە، لێپرسراوێکمان بە ناوی ئازاد خۆشناو بینی لە ناو خەرمانێك پووشدا خۆی شاردبووەوە، لێمان پرسی: ئەوە چییە..؟ووتی: کۆپتەر لێیداین. نەختێ تر چووینە ئەولاتر بریندارێك هاواری ئەکرد. بە ئازادمانووت بچێتە لای، خۆمان بەرەو کەڵەکە بەردێك چووین دوو پێشمەرگەی تێدابوو، یەکێکیان کاک عومەری سەید عەلی بوو برینەکەی زۆر سەختبوو، ئەوەی تریان ناوی سدیق بوو خەڵکیووڵاخلوو بوو. لە پاڵ کاک عومەردا شەهید بوو بوو. د.ساجد کاک عومەری تیمار ئەکرد، ئێمەش بەشوێن بریندارو شەهیدی تردا ئەگەڕاین چووینە سەر شەهیدێك ناوی جەنگی بوو دەمانچەیەکی میکارۆفی بەدەستەوە بوو، پەنجەی بەسەر پەلەپیتکەکەوە بوو، چووینە سەر شەهیدێکی تر ڕەئوفی

ناوبوو، تەقەی لە کۆپتەرەکان کردبوو، دوایش لە شوێنی خۆیدا پێکرابوو، بەداخەوە لەم شەڕەدا جەمیل ڕەنجبەری شاعیریش ئەپێکرێ‌و شەهید ئەبێ کەشاعیرێکی دیاری بواری شیعری بەرگری شۆڕشگێڕانە بوو تاکو شەهید بووشیعرەکانی داینەمۆی شۆڕش بوو ، لەڕێگەی ئیزگەوە جۆش‌وخرۆشێکی ئەدایە خەڵکی کوردستان .. من‌وەکو شاعیر نەم ئەناسی بەڵام لەڕێگادا بەرەو بناری قەندیل‌و دۆڵە ڕەقە پێی ئاشنابووم‌وەکو کەسێکی گەورە ئەهاتە بەرچاوم ، پیاوێکی ڕووخسار جوان‌و قژێکی سپی هەبوو ،وەختێ شەهید بوو بوو چوومە سەر تەرمەکەی‌ووتم ئەمە پیاوە قژ سپییەکە..د.ساجیدووتی : ئەمە کاك جەمیل ڕەنجبەری شاعیرە . دواتر بۆم ڕوون بووەوە کە ئەم پێشمەرگە شاعیرە خاوەن قەڵەمێکی بە پێزە، کە سێتیەکی دیاری دەفەری هەولێرە . کاتێك گەیشتینە سکتان برایەکیم بینی پێم‌وایە ناوی کاوە بوو لە زیندانی بەعس هەڵهاتبوو ، هێشتا نەی ئەزانی کاك جەمیل شەهید بووە . پێشمەرگەیەکیش بریندار بوو بوو پارچەیەکی زۆر بەر لەشی کەوتبوو ، خستمانە سەرووڵاخێك هاواری لێ هەستا بەر هەر شێوەیەك دامان ئەنا هەر هاواری ئەکرد ناچار دەرگایەکمان هێناو خستمانە سەر سەری‌و نامانە سەر پشتی‌ووڵاخەکەوە کەچی هەر هاواری ئەکرد ئیتر منیش تووڕە بووم‌و هەڵمرێژایە ناو کەنێکەوە ، بانگی کرد : ئەمجارە هەڵمگرنەوە ئیتر دەنگ ناکەم .. بەو جۆرە بردمانە ناو بریندارەکان. لە ڕاستیدا ناهەقی نەبوو چونکە پارچە لەشی‌وێرانکردبوو .. لە دواییدا بۆم دەرکەوت ئەو بریندارە کاك جەبار یاوەر بووە ، لەو شەڕە کۆپتەرەدا ۸ شەهیدو ١٦ بریندارمان هەبوو. پاش کۆکردنەوەی شەهیدو بریندارەکان لەلای پیرانەڕەش گۆڕێکی درێژمان هەڵکەندو شەهیدەکانمان لەوێ ناشت، لە هەمووی ناخۆشتر ئەوە بوو گۆڕێکمان بۆ بریندارێك هەڵکەندبوو هێشتا گیانی پاکی دەرنەچوو بوو، بە دیارییەوە دانیشتبووین، پاش کاژمێرێك بڕیارێکمان بۆ هات هەرێمی پێنج بچینە سەرشاخی کێوەڕەش بۆسەبین بۆ ئەوەی ڕۆژی دوایی بریندارەکان ڕەوانەی دیوی دۆڵەڕەقە بکرێت ... چووینە سەرشاخ، شەوێکی تاریك‌و نووتەك بوو،

باران‌و تەرزە ئەباری، سەرماو تۆفێکی سەختو بایەکی توندی ئەهات، کاک فەرەیدونمان لەگەڵ بوو، تا بەیانی لەسەر شاخ ماینەوە، ڕۆژی دواتر چووینە دۆڵەڕەقە، جەماعەتی سوارەئاغای لێبوو، هیچ ڕێزو حورمەتێکیان نەبوو،وەکو پێویست بۆ یارمەتیدانی کاک عومەری سەید عەلی نەجووڵانەوە، شەوی دواتر کاک عومەر لەگەڵ دەستەیەك پێشمەرگەدا بە سەر پەرشتی کاک عەلی نەبی بۆ سەرکردایەتی بەڕێکرا. ئێمەش چەند ڕۆژی لەبەردانکەو دێهاتی ئەو دەوروبەرە ماینەوە، پاشان چووینە ساوسێوەکان کە دۆڵێکی درێژەو لە ڕۆژهەڵاتی مەلەکانەوە دەست پێئەکات تاکو ئەچێتە نزیك چیای کاروخ، لەوێشەوە ئەبێتە دوو شیو، یەکێکیان شۆڕ ئەبێتەوە بۆ فەقێیان، ئەوی تریان بۆ دۆڵەڕەقە، لەوێشەوە چووینە خۆشناوەتی، شەوێك لە دێی بیراوا ماینەوە. ئەوەی بە لامەوە سەیر بوو ئەوە بوو ژنەکانیان کە خەڵکی غەریبەیان بدیایە چارۆکەیەکی ڕەشیان ئەدا بەسەریانا، گوایە ئەمە دەستووری ئەم ناوچەیەیە، ئەمەش پێچەوانەی هەموو ناوچەکانی تر کوردەوارییە کە ژن پەچەو ڕووپۆش بەکارنایەنن‌و ئەو پەتایەی چارشێوی شارەکانیان پێنەگەیشتووە، یان زۆر پابەندی نەبوون‌و ژنان لە لادییەکاندا ئازادترن لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی‌و هەڵسوکەوتدا.

بەدەم جەولەکردنەوە چووینە بالیسان‌و هەردوو چیوەو سکتان کە ناوچەیەکی دڵگیرەو ئەکەوێتە دۆڵێکی سەوزو ئاودارو درەختاوی‌و شاخ دەوری داوە. لە سکتان کاک فەرەیدون کۆبوونەوەیەکی پێکردین‌وبڕیاردرا ئێمە لەگەڵ هێزەکەی هەرێمی دوودا بچینە سنوورەکەیان‌و لەوێشەوە بەرەو بەری قەرەداغ‌و گەرمیان، دوای کۆبوونەوەکە بەرەو قەمتەران کەوتینەڕێ، بەیانییەکەی لە خدران ماینەوە لەوێ هەواڵێکی سەرپێیی شەهید بوونی کاک بێستوون بارۆییمان بیست، هەرچەندە هێشتا لە دەنگ‌و باسەکە زۆر دڵنیا نەبووین.

عەسری ئەو ڕۆژە چووینە کانی‌وەتمان، شەو لەوێ خەوتین، کاتژمێر ٤ی بەیانی سەرکەوتینە سەر شاخی حاجی‌قەڵا، نیوەڕۆ لەپشتی حاجی قەڵاوە

بەناو دەربەندێکا کە باخی هەناری تێدابوو چووینە سەر جادەی بۆگدو بە ئۆتۆمبیل گەیشتینە ناو دێی بۆگدو شەو ماینەوە لە مزگەوتەکەدا نووستبووین، دنیا زۆر ساردبوو، پێشمەرگەیەك بە ناوی حەمە کەریمی سەید سایەقی لە جاشییەوە تازە ڕایکردبوو بۆ پێشمەرگایەتی دەرمانی ئەکردە جلەکانییەوە، پێشمەرگەکان پێیان ووتبووووریا بە کەمی پێوە بکە، حەمە کەریم ووتبووی:وەڵلا هەر ئەسپێیەك بجووڵێتەوە پڕ چاوی ئەکەم. کاتژمێر یەکی شەو بە ئاگاهاتم تەماشا ئەکەم حەمە کەریم زۆر هیلاکەو ئەلرخێنێ، بانگی عوسمان تلیشانیم کرد بیبەن بیخەنە ناو حەوزی ئاوەکەوە. باش بوو بۆ بەیانیووردەووردە چاك بووەوە. ماوەیەك پێش ئەمەش سامی مامە نوری هۆمەرملی لە بێتووش دەرمانی کردبووە جلەکانیەوەو ژاراوی بووبوو گیانی لە دەستدا بوو. بۆ بەیانی ڕۆیشتینە کلێسەو بۆڵقامیشو لەزێ پەڕینەوە بۆ دێی عەسکەر، شەوەکەی ماینەوە، بەیانی شارەزایان داینێ بۆ سەروچاوەو ئێوارەکەی لەدەرگەزێنەوە بەرەو بازیان ڕۆیشتین، بۆ حەسانەوە چووینە دێی چۆڵمەكو لەوێ بەتەواوی هەواڵی شەڕەکەو شەهید بوونی کاك بێستوونو برادەرانمان زانی کەکەرتی چواری جەباری ڕۆژی ١٩٨٠/١١/١٨ تووشی شەڕ بوو بوون لەشاخی شۆراوی بازیان کە ئەکەوێتە ڕۆژهەلاتی چەمچەماڵ لەنێوان دەربەندی بازیانو دەربەندی باسەرە، کە چیایەکی سەختەو دارودرەختی لێیە.. لە ڕووی خوارەوە ناوچەی هەمەوەندو لە ڕووی سەرەوە بازیانە، لەم ڕووەوە ڕادارێکی گەورەی لێدانراوە، بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچەی سلێمانیو قەرەداخو گەرمیان. هێزێکی سەربازی پارێزگاری ئەکات. هەرگیز پەلاماری ئەو شوێنەمان نەدا، گەر بمانگرتایە ئەوا لە ڕادار هیچمان نەئەزانیو شارەزای فەنیشمان نەبوو سەری لێدەربکات، مەگەر بمان تەقاندایەتەوە. لەم شەڕەدا ١٦ شەهیدو کۆمەڵێك بریندارمان هەبوو، دوای ئەوە چووینە خاڵدان، دوو چەکی شەهیدەکانمان کەوتبوونە دەستی خەڵکی ئەو ناوەوەرمان گرتەوەو دامانەوە دەستی کاك ڕۆستەم. ئینجا بۆ سەرخۆشی سەردانی ماڵی باوکی کاك بێستوونمان کردووووردەووردە بەرەو خوار بووینەوە، لەبرایم ئاوا چاومان بەکاك مستەفا

چاوڕەش و کاک شێخ جەعفەر کەوت، پێیان ڕاگەیاندین بچینەوە گەرمیان. بە ئۆتۆمبیل ڕۆیشتینە مریەم بەگ پێشمەرگەیەکی گەرمیان کە سەلام عەول بوو بینیمان هەواڵی نەقڵ بوونی کاک خالید گەرمیانی پێدایین بۆ کەرتی چواری جەباری، هەواڵێکی ناخۆش‌و برووسکە ئاسابوو، زۆر کاری تێکردین. حەزمان نەئەکرد کەسێکی‌وەك کاک خالید گەرمیان بەجێ‌بهێڵێ، بەڵام بەویستی ئێمە نەبوو، بڕیاری سەرەوە بوو ئەبێ جێبەجێ بکرێ، بەئازاری ئەو هەواڵە ناخۆشەوە بەرەو گەرمیان شۆڕبووینەوە، لە داربەڕوو کاک سامان‌و کاک خالیدمان بینی، کاک خالید تەماشای ئەکردین‌و پێئەکەنی، پێی‌ووتم: کاک مەحموود نەقڵ بووم. منیش‌ووتم: ئێمە نایەڵین. زۆریش هەوڵماندا نەڕوات، بەڵام کاک سامان‌ووتی: ئەگەر کاک خالید نەڕوات کەرتی چواری جەباری خۆی ناگرێتەوە. ئیتر نەقڵەکەی کاک خالید بوو بە ڕاست. ئەوکاتە مامۆستا جەعفەر کە ئەندامی سەرکردایەتی بوو لە گەرمیان بوو، بەتەمابوو بەرەو بازیان بچێت‌و کاک سامان ڕەوانەی بکات، بەڵام کاک خالید بڕیاریدا لەگەڵ خۆیدا بیبات، چونکە ئەو بۆ بازیان ئەچوو بۆ چاوپێکەوتنی برادەرانی هەرێم، خواحافیزیمان لە کاک خالید کردو جیابووینەوە.

لە ناکاو ١٩٨٠/١٢/٨ هەواڵێکی دڵتەزێن دڵی هەموو کوردستانی هەژاند کاک خالید گەرمیانی لە نێوان دێی خاوێ‌وکەسنەزانی ناوچەی قەرەداخدا لە شەڕێکدا گیانی پاکی ئەگاتە کاروانی سەروەری. تەرمەکەی ئەبرێتە تەنگی سەرو لە پاڵ ئارامگای شەهیدی سەرکردەی ڕۆشنبیری گەلەکەمان کاک ئارام بەخاك ئەسپێرێ. دوو ڕۆژ دوای ئەوە مەفرەزەکەی بەرەو گەرمیان گەڕایەوە. شەهیدبوونی کاک خالید درزێکی گەورە بوو کەوتە هێزەکەمان، بە ڕاستی ئەو نموونەی فەرماندەیەکی ئازاو بەتوانا بوو لە بواری شەڕی پارتیزانیدا قارەمانێکی بێوێنەو بە دەست‌و برد بوو لە پێکادانەدا، تابلێ لە دارشتنی نەخشەی شەڕدا بیری‌ووردو تیژ بوو، بەو پەڕی کارامەییەوە کارەکانی ئەنجام ئەدا، هەموو کەس نەیئەتوانی لەگەڵیدا پێشمەرگە بێ‌و لەگەڵ ڕەوتی ئەودا دەربچێ، ئەمەندەووریا بوو ئەیزانی چۆن لەگەڵ دەوروبەریدا ئەگونجێ‌و

بەئاسانی دوژمنی لەداو ئەناو سەری لێئەشێواند، ئەوەندە گورجو گۆڵ بوو دوژمنی سەرسام کردبوو، شێوازی هەڵسووڕاندنی کاری ئەو لەمەیدانی پارتیزانیدا دەرسو پەندێکی زۆری بۆ ئێمە تێدابوو، هەرچەندە ئەو نە لە قوتابخانەیەکی سەربازی دەرچوو بوو نە لەرێگەی خوێندنەوە شارەزایی شێوە نوێیەکانی شەڕی دنیا بوو بوو، تەنیا بەسەلیقەو هۆشمەندی خۆیو بەتێڕوانینی بارودۆخی شۆڕشو (ه.پ.ك)وە بەکارهێنانی جۆری دواکەوتووی چەك بەرامبەر بەتواناییو پێشکەوتویی تەکنیکی دوژمنو جبەخانەی فراوانیدا هەندێك هەڵوێستی نوێی لەجموجووڵی کاری پێشمەرگانەدا دائەهێنا، لەپەلامارێکدا داخی دڵی خۆی بەهێزی دوژمن ئەڕشتو لەچاوتروکانێکداوون ئەبوو لەپڕ لەشوێنێکی دیکەوە دەستێکی تری ئەوەشاندو قووتی ئەخواردەوەو لەجێگایەکی تر سەری هەڵئەدایەوەو دەنگی دەستی ئەهات، دوژمن حیسابی زۆری بۆ ئەکرد، بەڵام ئەو بەزیتەڵەییوووریاییەوە لە هەموو داوەکان دەرباز ئەبوو. ئەگەر ڕۆژێك قارەمانێ بۆ شەڕی پارتیزانی دەستنیشان بکرێو میدالیای بدرێتێ ئەوا کاك خالید گەرمیانی یەکەم کەس ئەبێت ئەو خەڵاتەی بەرئەکەوێ.

شایانی باسە ئەو بۆ یەکەم جار بارمتەی لە حکومەتی بەعس گرت کاتێ ساڵی ١٩٨٠ کوڕەکەی قائمقامی کفری لەسەر جادەی کفری - دووز لە بۆسەیەکدا بە دەستگرتو دوایووتوێژ توانی دووکەسی سەر بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە بەندیخانەی ئەمنی کفری پێبگۆڕێتەوە. ئەم ڕووداوە خودی سەدامی شڵەژاندو بووە هۆی ئەوەی قائمقامی کفری بگیرێو لە سەرکار لابرێ کە قائمقام خزمی سەدام خۆی بوو.

شەهیدبوونی کاك خالید بەڕاستی زیانێکی قورس بوو لە شۆڕشو کەلەبەرێکی زلی کردە باڵەخانەی (ه.پ.ك). تادنیا ماوە شوێن دەستەکانی کاك خالید دیارە، کارە مەزنەکانیوەکو سروود بەسەر زمانی خەڵکییەوەیە. پاش ماوەیەك لەلایەن هەرێمەوە بڕیاردرا لە شوێنەکەی شەهیدی فەرماندە کاك

خالید بکرێمە فەرماندەی کەرتی پێنج. کەرتەکەمان کۆکردەوەو دەستمان کردە جەولەکردن.

یەکەم ئەرکمان ئەوەبوو کە بە پەلە بە ناوچەی کارکردنماندا بە ناو خەڵکەکەدا بگەڕێین و دۆستو لایەنگرەکامان بەسەر بکەینەوەو شارەزایی لە جوگرافیای ئەو ناوچەیەو ئاگاداربوون لە بوون و جموجووڵی هێزەکانی دوژمن تاکو بۆ کاتی پێویست بتوانین کاری خۆمانی لەسەر بکەین.. جگە لەوە ئەمانویست بەو گەڕانە هەندێك لە کەسەری و پەژارەی شەهید بوونی کاك خالید گەرمیانی و بەسەر دڵ و دەروونی خەڵکی بڕەوێنینەوە کە زۆریان خۆشئەویست و بۆشاییەکی بۆ ئێمەش بە جێهێشتبوو ئەبوایە بەووردبینیەوە کار بۆ پڕکردنەوەی بکرێت.

# ساڵی ١٩٨١

بە بۆنەی ساڵی تازەوەویستمان چالاکی بکەین، بۆ ئەوەی هەندێك لەو شڵەژانە دەروونییەی بەهۆی شەهیدبوونی کاك خالید بەسەر دڵ و دەروونی پێشمەرگەکانەوە بوو بڕەوێنەوە، ڕۆژی ١٩٨١/١/١ لە کانی شیرینەی سەرجادەی قادرکەرەم - دووز چالاکییەکمان کرد ٣ سەربازمان بە دیل گرت و ٣ چەکمان دەستکەوت، هەر لەم مانگەدا نەخشەی پەلاماردانی هەندێ شوێنمان دارشت کە لە سەردەمی شەهید خالید دا بە نیازبووین بچینە سەری،وەکو جادەی نێوان کەرکوك - دووز، جادەی قادرکەرەم - دووز، سەرجادەی ئاغجەمەشەت - خدروەلی، کە ئەم دوو دێیەی دوایی سەربە عەشیرەتی داودەن و سنووریان لەگەڵ دێهاتە عەرەبەکاندا تێکەڵە.

پاش دارشتنی نەخشەکە، شەوێ لە شۆراوی نزیك دووزەوە چووینە تاوێرکەوە لە چەند کیلۆمەتری شارۆچکەی دووزدا، تاقی ئێوارەی ڕۆژی ئایینده لە خۆرهەڵاتی دووزەوە بۆ ماوەی ٤ کاتژمێر بە شوێنی نزمایدا ڕێمان کرد تا دوژمن نەمانبینێ گەیشتینە شوێنی دیاریکراو لە کاتی تایبەتیدا لەسەر

جادەكە دامەزراین، ٧كەس بۆ ڕۆژهەڵاتی جادەكە دانرا كە لەوێوە ئۆتۆمبیل لەقادركەرەم ـ نەوجولەوە بۆ دووز ئەچن، ٧ كەسی تر بۆ ڕۆژهەڵاتی جادەكە كەلە دووزەوە بۆ قادركەرەم ـ نەوجول ئەچن، خۆیشم لەگەڵ ٤ كەسدا لە ناوەڕاستدا بە ئارپیجییەكەوە دامەزراین، ئەگەر هەر ئۆتۆمبیلێك لە یەكێك لەو بۆسانە دەرباز ببوایە ئێمە لێمان ئەدا. لەو كاتەدا ئۆتۆمبیلێك هات و لە بۆسەی ڕۆژهەڵات نەوەستاو ئێمە بۆی دەركەوتین كە زانییان دەرناچن، شۆفێرەكەو یەكێكی تر لێی دابەزین و ڕایان كردو تەقەمان لێكردن، شۆفێرەكە گوللەی زۆر بەر جلەكانی كەوتبوو بەڵام برینداری نەبوو بوو، لەبەر ئەوەی جاش ناشەعبی بووویستی نەگیرێ و لەگەڵ جاش ناشەعبییەكەی تر كەخەڵكی خدروەلی بوو گیران و ئۆتۆمبیلەكەشمان دەستكەوت بوو.

ئەمجارەیان ویستمان لەسەر جادەی كفری ـ كەلار شەڕێك بكەین، مانگی ١٩٨١/٢ بوو، هێزەكەمان كۆكردەوەو چووینە سەرجادەو كۆمەڵێك ئۆتۆمبیلمان ڕاگرت و هەندێ پیاوخراپ كەوتە بۆسەكەمانەوە، یەكێك لەوانە بەهادین مەجید محەممەد عەلی سەرۆكی بەشی كشتوكاڵی كەلارو فەرماندەی قاتعی جاش ناشەعبی كەلار بوو كە ئەو ڕۆژە لەدەورە بوو لە تكریتەوە گەڕابووەوە، لەگەڵ یوسف مەجید دەلۆیی كە كاتی خۆی بەڕێوەبەری ناحیەی كۆكس بوو لەسەر دزی دەركرابوو، بوو بووە جاسوس بەسەر كوردەوە، هاتوچۆی دەرەوەی عێراقیشی ئەكرد بۆ ئەم كارە تادەستی چووە خوێنی شەهید سیروان دەلۆیی ژن برای خۆی كەلە ڕێكخستنی كۆمەڵەدا بوو. لەم بۆسەیەدا ٨ سەربازمان بە دیل گرت، دوای ئەوە گەڕاینەوە دێی گۆبان عارەب، برادەرانی حشع لەوێ چاویان بەیوسف كەوت و داوایان كرد بەو حیسابەی كۆنە شیوعییە، لەبەر تەكلیفەكەیان تەسلیممان كردنەوە بێنەوە لێكۆڵینەوەی لەگەڵ بكەین و نەشمان ئەزانی چ تاوانبارێكە. ئەمەش دیاردەیەكی ئاساییە لەمەیدانی خەباتدا كەچەند هێزولایەنێكی جیاجیای یەك نەگرتوو لەبەرەیەكدا لەسەر ئاستی دژایەتی كردن و كۆكردنەوەی خەڵكی دەیان و بگرە سەدان خەڵكی خراپ و بوودەڵە تێهەڵكێش ئەبن و بگرە هەندێكیشیان ببنە جاسوس و خراپەكار. ئەمە

نه یەکەم ڕووداو نە دوا ڕووداویش بوو بەڵکو بەدرێژایی تەمەنی شۆڕش کە هێزەکان هەریەکە لەسەنگەری خۆیدا بێ ئەم مەسەلەیەش دەپات ئەبێتەوە، بێئەوەی حیسابی بۆ بکرێ یان سنوورێکی بۆ دابنرێ، چۆن لەو کاتانەدا لە سەر تاوانباران مامەڵە بکرێو لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەو دادگاوە سزا بدرێنو گوێ نەدرێتە لایەنی پەیوەندی حیزبییانەوە.

ئێمە دڵنیاین کە برادەرانی حشع ئەو یوسفەیان وەکو جاسوسێك کە دەستی لە خوێنی شەهیدان سیروان دەلۆیی و مەجید غاندیدا هەبوو ناسیوەو زانیویشیانە پیاوی مخابەراتی ڕژێمی عێراق بووە، بەڵام بە مەبەستی تایبەتی داکۆکیان لێکردو لە دەستمان دەرچوو ئەگینا بەسزای تاوانەکانی خۆی ئەگەیشت، بەهادین مەجیدیش ئەڵقە لەگوێیەکی بەعس بوو، هەرچەندە خەڵکێکی زۆر لەهۆزی زەنگنە کەوتنە دوای بەڵام بڕیاری کوشتنی لە سەرەوە دەرچوو بوو. لە ناو عەشایەری خۆماندا بوو بووە باو هەر کەسێکی تاوانباری سەر بەڕژێم بگیرایە، شاڵاوی خەڵکی عەشیرەتی هەڵئەستاو نەهاتنەلامان بۆ پاکانەکردنو بەخشینیانو بەرەڵاکردنیان بێئەوەی ڕەچاوی جۆری تاوانەکەی بکرێ، زۆرجاریش خەڵکمان لێ زویر بووە کە کەسێکی خۆفرۆشمان بۆ بەرنەداون بەڵکو هەڵوێستی خۆیان گۆڕیوەو کەوتوونەتە دژایەتی شۆڕشەوە. زۆرجاریش لە قسەو کۆبوونەوەکانماندا لە دێهاتەکاندا ئەم مەسەلەیەمان بۆ ڕوون کردوونەتەوە بەڵام هەر سوودی نەبووە، هەروەها پارێزەر عە بدولوەهاب باجەلانیشمان گرتبوو ، لەدێی گۆبان عارەب ئازادمان کرد ، چونکە شتێکی ئەوتۆی لەسەر نەبوو، لەکاتێکدا ئەیویست بڕواتووتی : چیتان ئەوێ بۆتان بکەین ..؟ منیش وەڵامم دایەوە : ئەوە هەموو کەسوکارمان لەزیندانداییە ، ئەتوانن ڕزگاریان بکەن..؟ ووتی : نەوەڵا لەم بارەوە هیچمان پێ ناکرێ..!!

ڕۆژی ۱۹۸۱/۲/۲۵ لەگەڵ مامۆستا سەلاحەدین حەمید عەبدوڵڵا ڕەمەزاندا لە دێی کەریم باسام مەوعیدێکمان هەبوو بۆ کۆبوونەوەی پێشمەرگەکانو چارەسەرکردنی کێشەی خەڵکی ناوچەکە. دانانیمەوعید لە ڕووی شوێنو کاتەوە زۆر نهێنی بوو جگە لە کادیرو فەرماندەکان کەسیتر پێی

نه ئەزانی. گەر دوژمن هەر زانیارییەکی چنگ بکەوتایە یەکسەر بەهێز یان بە کۆپتەر هێرشی ئەکردو تووشی شەڕی داسەپاوی ئەکردین و فرەجاریش زیانی چاوەڕوان نەکراومان پێئەگەیشت، مامۆستا سەلاحەدین مەوعیدەکەی لای هەندێ کەس بەبێ مەبەست درکاندبوو. ئێمەش ئاگامان لەوە نەبوو، بۆ ڕۆژی دیاریکراو بڕیارم دا ئێوارە درەنگ بگەمە دێی کەریم باسام، نیوەڕۆکەی لە باوەکر مامەوە کە بە پێ کاتژمێرو نیوێك لەکەریم باسامەوە دوورە، ئاگادار کراینەوە کە جاش و سەربازێکی زۆر ڕژاونەتە دێی قەوالّی و لەکی قادر سەرهەنگ، لەدێ دەرچووین و چووینە نێوان کەریم باسام و باوەکر خۆمان حەشاردا تا دوای نیوەڕۆ، ئەشمانزانی مەفرەزەیەکمان لەو ناوەدا جەولە ئەکەن، مەفرەزەکەی تریش ئەیزانی ئەچین بۆ کەریم باسام. کاتژمێر ٢ی دوای نیوەڕۆ جاشەکان بەرەو دێی کۆشك کەوتنە ڕێ لەناکاو بوو بەتەقە، لەئێمەوایە جاشەکان بۆ ئارەزوو تەقە ئەکەن، ئێمەش کەوتینە ڕێ بەرەو کۆشك بۆ ئەوەی لای ئێوارە لێیان بدەین، کەگەیشتینە نێوان کۆشك و کەریم باسام دوو کۆپتەر دەرکەوتن، لەنزیك کۆشك دەستیان کردە تەقە، ئێمە لەو هەردەی دەرەوەی دێکە خۆمان حەشاردا، دوای ڕۆیشتنی کۆپتەرەکان بەپەلە گەیشتینە قەراخی دێ، لەو کاتەشدا جاش و سەربازیش گەڕانەوە، مەوعیدەکەش نزیك بوو بووەوە دوو پێشمەرگەمان نارد بۆ دەنگوباس، کەگەڕانەوە هەوالّی تەقەکانیان پێووتین کە مەفرەزەیەکی خۆمان کەوتبووە شەڕەوەو دوو پێشمەرگە دەستگیر کرابوون: ئەسکەندەر حەیدەروسەید ئیبراهیم گەرمکی.

ئیتر کەوتینە سۆراخی برادەرەکانمان و دوای یەکگرتنەوەمان کەوتینە لێکۆڵینەوەی شەڕەکە، بۆمان ڕوون بووەوە لەئەنجامی نەپاراستنی نهێنی دانانی مەوعیدەکەوە بووە، م. سەلاحەدین کەمتەرخەمی کردووەو لای خەلّکی درکاندوویەتی و ئیخباری کرابووین، ئەگەر مەوعیدەکە بپارێزرایە تووشی ئەو زیانە نەئەبووین.

ڕۆژی ١٩٨١/٣/٩ برادەرانی حشع لە نزیك دێی مەلاهۆمەر تووشی پەلامارێکی کۆپتەرەکانی دوژمن ئەبن، ٢٦ کەسیان شەهیدو ٧ کەسیان دەرباز

ئەبن، یەکێکیان عومەر زامدار بوو هەموو گیانی بەگوللە دابێژرابوو، جاشەکان چوو بوونە سەری خۆی کردبووەمردوو، چاك بووەوەو هاتە ناو هێزەکانی خۆمانو بوو بە کۆمەڵە، دوایش لە شەڕێکدا لەلای سکەی کفری شەهید ئەبێ.

ئەم ڕووداوە کاری زۆری لە خەڵکی کرد، ترسی زۆریان لێنیشت، ٢٦شەهید ژمارەیەکی زۆرە، کاریگەرێتی لەسەر حشع زۆر بوو بە تایبەتی لە سەر دۆستو لایەنگرەکانیان، ئێمەش دەستبەجێ هێزەکەمان کۆکردەوەو بەبناری گڵ دا کە دۆستو لایەنگری حشعی تیا بوو جەولەیەکمان کرد، خەڵکەکە تا ڕادەیەك هاتنەوە سەر خۆیان، ئەم سنوورە ئەکەوێتە نێوان دێهاتەکانی زەنگنەو بەهۆی شاخی گڵەوە لە ناوچەی داودە جیائەکرێتەوە، دانیشتوانەکەی زۆربەیان گڵنو هەندێ زەنگنەو تاڵەبانی تێدایە، پێش سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێ حشع زۆرتر بوو، بەڵام پاشان خەڵکەکەی پەیوەندییان بە کۆمەڵەو شۆڕشگێڕانەوە کردو ڕێکخستنەکانی یەکێتی زۆر بوون.

ڕۆژێ لە دێی سۆفی ڕەزا بووین کاتژمێر ٧ی ئێوارە کاك شێخ جەمال هاتو بە هێواشی چرپاندی بە گوێمدا:وریابە ئەمشەو ئەتکوژن.!ووتم: چۆن..؟ووتی: کەرتەکەت پەیوەندییان بە دوژمنەوە کردووەو ئەمشەو کارەکەیان جێبەجێ ئەکەنو ڕائەکەن. کاك ئەحمەد دوانزە ئیمامیو مامۆستا سەلاحەدینو کاك شێخ جەمالم بانگ کردو باسی مەسەلەکەم بۆ کردن. لە کاك شێخ جەمالم پرسی: چۆن بەمەت زانی..؟ووتی: بە کاك سوارمیانووتووە کە لەگەڵیاندا بێو ئەویش منی ئاگادار کردەوە. یەکسەر چووم بۆ ئەو ژوورەی کە بۆ خەوتنی شەو دیاری کرابوو، هەموو پێشمەرگەکان لەوێ بوونووەزعیان ئاسایی نەبوو. شڵەژان بە ڕوویانەوە دیاربوو، تێگەیشتم کە کارێکیان لە ژێرسەردایە، لەگەڵ برادەراندا بڕیارماندا کەرتەکە بکەینە ٤ بەشەوە هەر بەشێکی دوو پێشمەرگەی دەستەکەمی لەگەڵدا بێ پێیان بڵێین دوژمن نیازی هێرشی هەیەو بەڕێ ئەکەوینو هەر مەفرەزەیەك بۆ دێیەك ئەچین. لەوێ پیلانگێڕەکان چەك بکرێن، چونکە بە کۆمەڵ چەك کردنیان زەحمەت بوو.

دوای ئەنجامدانی کارەکە رۆژی دواتر لە دێی خان یەك ئەگرینەوە، هەر ئەوشەوە بڕیارەکەمان بەجێگەیاندو هەر مەفرەزە بەبێ کێشە پیلانگێڕەکانیان چەککرد، لەخان هەموویانمان بەمەفرەزەیەکدا ڕەوانەی هەرێمی پێنج کردن. شەوەکەی پێشمەرگەیەك بەناوی گەوهەر ئەمین لەك لەدێی قولیجان هەموویانی بەرەڵاکردو ڕووەو لای ڕژێم ڕایانکرد، هەندێك لەوانە: نەجم دەروێش، قالە کەچەڵ، کە هەتا دوایی هەر لەگەڵ ڕژێمدا بوونو هەندێکیشیان وەکو جەباری مەلا عەلی بەلەگەو عومەری برای و گەوهەر خۆیشی هەڵوێستیان گۆڕی و گەڕانەوە ڕیزی خەبات.

دیاردەی درووستکردنی دەستوپێوەند لەلایەن دوژمنەوە لەناو (ه.پ.ك) دا جار جار ڕووی ئەدا بۆ دەستوەشاندن لە فەرماندەو کادیرەکانو هەڵوەشاندنەوەی هێزی پێشمەرگەو دڵساردکردنەوەی پشتیوانی خەڵکی. بەڵام بەهۆی ووریایی پێشمەرگەوە ئەو جۆرە دەستەخۆفرۆشانە ئاشکرائەبوون. ئەمەش هەندێ جار ئەگەڕێتەوە بۆ کەمتەرخەمی لەکاتی وەرگرتنی پێشمەرگەو چاودێری نەکردنی جموجووڵیان، بۆ بەرگرتن لەم دیاردەو تەشەنە سەندنی بڕیارمان دا هەر کەسێك پەیوەندی ئەکات یان ئەبێ لەلایەن ڕێکخستنەوە پسوڵەی پێبێت یان ئەبێ کەفالەتێکی هەبێ یان چالاکییەك لەناو دوژمندا ئەنجام بدات.

پێش ئەم ڕووداوە دامنابوو خۆم نەقڵی دیوی قەرەداخ بکەم، کە ئەمە هاتە پێشەوە چوومە سەردانی کاك ڕۆستەمو مەسەلەکانی خۆمم تێگەیاندو داوام لێکرد کە لەو کەرتەدا نامێنمەوە ئەویش ووتی: کەرتی شارەزوورمان کەسی نییە بیباتەڕێوە، بەڵکو ماوەیەك سەرپەرشتی بکەیت، لەسەر بڕیاری ئەو چوومە شارەزوورو پەیوەندیم بە کەرتەکەوە کردو دەستم کردە جەولەکردن. لە ڕێی دەربەندیخان - سلێمانی هەندێ چالاکیمان کرد.

١٩٨١/٥/٢٥ بوو کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە دۆڵی مالیمۆسی لای دێی کانی زەردی نزیك چیای بلفەت کۆنفرانسی یەکەمی خۆی بە ئامادەبوونی ١٨٢ ئەندامی بەشداربوو بەست.

دیاره بە هۆی هەلومەرجی تایبەتی کۆمەڵە لە ناو شاردا نەیتوانی کۆنفرانسی خۆی ببەستێ، کە شۆڕش بەرپابوو دیسانەوە شەڕو پەلامارەکانی دوژمن‌و کارەساتەکان گرفت بوون لە بەردەم بەستنی هەر کۆبوونەوەیەکی فراوان‌و کۆنفرانسێکدا کە گرنگی خۆیان هەیە بۆ پیاچوونەوەی بەرنامەو تاکتیک‌و ستراتیژو هەڵسەنگاندنی بارودۆخ‌و هەلومەرجی شۆڕش‌و خەبات‌و کاروباری ڕێکخستن‌و هەڵبژاردنی سەرکردایەتی‌و نوێکردنەوەی‌وەرگرتنی کۆمەڵێك بڕیارو دەرکردنی ڕێنوێنی‌و بەخشینی زانیاری.

لەم کۆنفرانسەدا بە هەڵوێستەکانی کۆمەڵەدا چوونەوەو پەیڕەوو‌پڕۆگرامەکەی تاوتوێکراو سەرکردایەتی هەڵبژێردرا بەم شێوەیە:

کاك نەوشیروان مستەفا بوو بە سکرتێری کۆمەڵە، هەندێك هەڤاڵیش بوونە ئەندامی سەرکردایەتی لەوانە هەڤالان: فەرەیدون عەبدولقادر، د.کەمال خۆشناو، مەلا بەختیار، عومەری سەید عەلی. ئەمە شرینقەیەکی باش بوو هێزو گوڕو تینی دایە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە.

ئێمە بڕیارماندا لە یادی شەهیدان سەرکەوت‌ووالی قوببەیی دا دەستێك لە جاشەکانی زەڕایەن بوەشێنین، بۆ ئەم مەبەستە نەخشەیەکمان دارشت، ڕۆژی ١٩٨١/٦/٢٤ شەش پێشمەرگەمان نارد تەقە لەجاشەکانی زەڕایەن بکەن تاکو جاشەکان دەرچن، لەم لاشەوە بۆسەیەکمان بۆدانان، تومەز هێزێکی زۆری جاشەکان کۆبوونەتەوە بۆ پەلاماردانی بناری شارەزوور ئێمەش بێ‌ئاگابووین، هەرکە پێشمەرگەکان تەقە دەست پێئەکەن، جاش لە هەموو لایەکەوە دەستیان لێئەکەنەوەو دوایان ئەکەون، پێشمەرگەیەك بریندار ئەکەن، پێشمەرگەکان بریندارەکە تا ماوەیەك ئەهێنن‌و دوایی بەجێی ئەهێڵن، ئێمەش ناچار لەبۆسەکە دەرچووین‌و چووینە فریایانەوەو لەجاشەکانمان داو هەندێك گەڕانەوە، بەڵام تابریندارەکەمان دەرکرد هێزێکی زۆری دوژمن هێرشی کردە سەر قۆڵی ڕاستمان‌و زۆر بەرگەیان نەگرت‌و بەشی قۆڵی چەپێشمان شکاو بۆ لای ئێمەهاتن، تووشی شەڕێکی دەستەویەخە بووین. شەڕ تائێوارە درێژەی کێشاو جاشەکان شکان، لای ئێمەش پێشمەرگە ڕەفیق باریکەیی شەهید بوو،

بریندارەکەشمان پ.م عەلی عومەر بوو ڕەوانەی لای پزیشك کرد لە دیوی قەرەداخ، هەر لەم ڕۆژەدا باوکی هاتبوو بۆ چاوپێکەوتنی کەچی بە برینداری بینیو هیچ خۆی تێکنەداو بەدیاریەوە مایەوە تاکو ڕۆژی ١٩٨١/٦/٢٥ کاك عەلی عومەر گیانی پاکی سپارد، شایانی باسە خاوەنی ٦ شەهیدی ترەو لەکاتی گیانەڵادا باوکی نێوچەوانی ماچکردوووتی: ئافەرین ڕۆڵە، بەڕاستی شەهیدبوونت سەرمان بەرز ئەکاتەوە.

بەڕاستی ئەمە نموونەی مرۆڤی خۆڕاگرو شۆڕشگێڕو هەڵوێست بەرزییە، باوکێك بە بەرچاویەوەو لەبەردەستیدا جگەرگۆشەکەی بە گوللەی دوژمن شەهید ببێو تێکنەچێو بەوپەڕی دڵقایمییەوە بە دەستی خۆی کفنی بکات.

هەر لەم مانگەدا سەفەرێکی گەرمیانم کرد، لەگەڵ هێزی کەرتی یەكو کەرتی سێدا چووینە سەرجادەی کفری ـ دووز لەعاستی غەرە، بۆسەیەکمان بۆ ئۆتۆمبیلی مونەزەمەی عەفلەقییەکانی کفری دانا، بەیانی زوو بوو کۆمەڵێك ئۆتۆمبیلی خەڵکمان ڕاگرت، دوو لۆری گەورەی حکومەت کە پڕبوون لەسەهۆڵو بەرەو بەرەی شەڕی گێلان غەرب ئەچوون کەوتنە بەردەستمان، لەو کاتانەدا ئۆتۆمبیلێکی جاش ناشەعبی لە بۆسەکەی داینو نەوەستاو لەناو دەستڕێژی لوولەی تفەنگەکانمان خۆی دەربازکردو لەسەر ڕێنگ ڕۆیشت تاگەیشتە بازگەی سلێمان بەگ، شۆفێرەکەی جاش ناشەعبییەك بوو بریندار بووو دۆستێکی خۆمان بە ناوی عەلی بێتار لەگەڵ کوڕێکی بۆ سەوزە ئەچوونە کەرکوك خۆی شەهید ئەبێو کوڕەکەی بریندار ئەبێو ئێستاش کەم ئەندامە.

پاش ئەنجامدانی کارەکە گەڕاینەوە ناوچەی داودەو سەهۆڵەکەمان بە سەر خەڵکیدا بەخشییەوە، دوای سەردانی ناوچەکەو بینینی کەسوکارو دۆستەکانمان گەڕامەوە ناوچەی قەرەداخو شارەزوور.

لەم ساڵەدا ئەوەی گرنگ بێ لە ژیانی گەلەکەماندا درووست بوونی بەرەیەك بوو لەناو هێزەکانی کوردستاندا بەناوی (جوقد) کە تەمەنی درێژی بۆ نەنوسراو لەگەڵ خۆیدا هۆیەکانی هەڵوەشاندنەوەشی هێنا:

١. لایەنـەکان زیـاتر بـەکاری دیعایـەی حیزبییـەوە خجـلّ بـوونو هەریەکـە بـۆ خواستی تایبەتی خۆی کاری ئەکرد.
٢. بەشداری نەکردنی پارتی تێیدا.
٣. فرتوفێڵی حشع لەهاتنە پێشەوە.

هەر لەسـەرەتاوە لەسـەر کۆمـەڵێك مەسـەلە کـە پەیوەنـدی بـە ئامـانجی بـەرەو شـێوەی کـاری سیاسـیو هەڵوێسـت لەسروشـتی ڕژێـمو دەسـەڵات دەنگـی جیاجیا هەبوو، ئەمانەوایان کـرد کـە (جوقـد) گیـانی نەکرێتـە بـەرو دەورێکـی ئـەوتۆی نـەبێ. لـەبری ئەمـە تەکـەتولاتی تـر هاتەکایـەوە، زیـاتر مەبەسـتی پیلانگێرییـان هـەبوو، بـە تایبـەتی بەرامبـەر (ی.ن.ك)، (جـود) بـەری ئـەم هەڵوێستو تەکەتولاتە بوو.

(جـود) تـەحالف بـوو لـە نیـوان پـارتیو حسـكو حشـعدا، حشـع لـە (جود)یشدا بوو، پەیوەنـدی لەگـەڵ (ی.ن.ك) دا هـەر هـەبوو، جـود بـە کۆمـەڵێ بیانووەوە هەمیشە لە هەوڵی تەندنو لـە داوخسـتنی (ی.ن.ك) دابـوو لەکاتێکـدا نفوزی (ی.ن.ك) لـە نـاو خەڵکیـدا بـاشو لای دوژمنـیش سـەنگی خـۆی هـەبوو، بۆیـە جـود لـە مـانگی ١٩٨١/٦دا هێزیـان کۆکردبـووەوەو دابەزیبوونـە ناوچـەی شـارباژێر بـەنیازی کـۆنترۆڵ کردنـیو دەرپەڕانـدنی هێزەکـانی (ی.ن.ك). لـە بەرامبـەردا بڕیـاردرا هێزەکـانی هـەرێمی پێـنج بچـنە سـنووری هـەرێمی سـێی شـارباژێر بـۆ بـەرگریکردن لـەو ناوچـانەی کـە دەسـەڵاتی جـودی تێـدابوو، پێشـتریش بـەهۆی شـەڕی ئێـران ـ عێراقـەوە ڕژێـم چـۆڵی کردبـوو، کەرتـەکانی قەرەداغو بازیانو دووزو کەلار هەموویان بـەرەو شـارباژێر کەوتنـەڕێ جگـە لـە چەند پێشمەرگەیەکی کەم نەبێ کەسی نەمایەوە، لەدێی ڕەزلـە یەکـەم پێکـادان ڕوویـدا، هێزەکـەی جـود شـکاو لـە ناوچـەکە دەرپـەڕێنرانو ل ووتیـان شـکا، هێزەکـەی هـەرێمی پێـنج ٣ مـانگ لـەو نـاوەدا جەولـەیان کـردو جارێکیشیان سەردانی ناوچەی شارەزووریان کرد کە ئەو کاتە لیژنەی هەرێمی یەك بەڕێوەی ئەبرد کەبریتیبوو لەم هەڤاڵانە: شەوکەتی حاجی مشیر، حـامی حـاجی خالیـد، حـاکم عومـەر، تـاکو مـانگی ١٩٨١/٩ بـەبڕیاری سـەرکردایەتی هـەموو هێزەکـان گەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان.

لە سنووری هەرێمی پێنجدا هەندێ کێشە هەبوو لە نێوان کاك مستەفا چاوڕەش‌و کاك سامان گەرمیانیدا کە لە کۆنفرانسی یەکی کۆمەڵەدا کاك سامان قسەی لە سەر کردبوو کاك مستەفاش ئەو قسانەی پێ هەرس نەکرابوو، هەڕەشەی لە کاك سامان کردبوو نەگەڕێتەوە سنووری هەرێمی پێنجی قەرەداخ، بەلأم کاك سامان گوێی نەدایەو گەڕایەوە بۆ سنوورەکە.

شەوێکیان لە سێوسێنان بووین کاتی خەو کاك مستەفا لەگەڵ فوئادو بابەتاهیرو د. چیا دا قسەیان ئەکرد، هەوڵیشیان ئەدا من ئاگام لە قسەکانیان نەبێ، خۆمم کردبووە خەوتوو. لە ناو دەمەتەقێو گفتوگۆکاندا کاك مستەفاووتی: سامان گەرمیانی گەڕاوتەوەو لە سۆڵەیەو سبەینێ کە هاتە ئێرە هەوڵی چەککردنی ئەدەین.

منیش کە ئەمەم بیست بانگی پ.م سەلامی عەلە گوێزەم کردوووتم: بچۆ بۆ مچەکوێر کە کاك سامان هات ئاگاداری بکەرەوە نەچێتە لای کاك مستەفا تاکو چاوی بە من ئەکەوێ .

من مەبەستم ئەوە بوو لەو بەرنامەیە ئاگاداری بکەمەوە کە نەکەوێتە ناو داوی سزادان‌و ڕیسواکردن‌و کێشەو بگرەو بەردەیەك لەم نێوانەدا ڕوو بدات کە کار لە دڵ‌و دەروونی پێشمەرگەو خەڵکیش بکات‌و بە زیان بۆ شۆڕش بگەڕێتەوە.

سەلام ڕۆیشتو تاکو کاتژمێر ٨ ی بەیانی چاوەڕوانی کردبوو کاك سامان هەر دیار نەبوو.. ئێمەش لە سێوسێنانەوە بەرەو مەسۆیی ڕۆیشتین، نەمئەزانی ئەمە بەشێکە لە بەرنامەی داونانەوەکە.. چووینە ناومزگەوتەکەی مەسۆیی، من‌و شاهۆ پێکەوە دانیشتبووین‌وەختێکمان زانی کاك سامان پەیدا بوو، بواری ئەوەم نەبوو بچم ئاگاداری بکەمەوەو پێی بڵێم کەوا چەکی ئەکەن.

کاك سامان گەیشتە لای برادەران‌و هەندێ نامەی ناوەندی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانی پێبوو بۆ کاك مستەفا دیار بوو پەیوەندی بەو کێشەیەی نێوانیانەوە بوو بۆ چارەسەرکردنی. کاك مستەفا ئەیزانی لە مزگەوتەکەدا کاك سامانی بۆ چەك ناکرێ‌و پێشمەرگەکانی کە شێخ جەمال‌و

کەریم چاوڕەش‌و مام ساڵەح سەید مورادی بوون دەست ئەکەنەوە، بۆیە بەکاک سامانی‌ووت: بابچینە ماڵێکەوە ... کە چووبوونە ماڵەکەوە یەکسەر کاک سامانیان چەککردو پاش چەند خولەکێك بە چەککراوی هێنایان بۆ مزگەوتەکە کە لەکاتی چەککردنەکەیدا یەخەی کراسەکەیان ڕاتەکاندبوو هەندێکی لێدڕابوو.. ئێمە ئەمەمان زۆر پێناخۆش بوو، بۆ ئەوەی کێشە درووست نەبێ بە بەرچاوی ئێمەوە چەکەکەیان دایەوەو بە کاک سامانیان‌ووت کە ئەبێت بۆ سەرکردایەتی بگەڕێتەوە، کاک سامانیش چەکەکەی‌وەرگرت‌و بە خۆی‌و پێشمەرگەکانیەوە دوور کەوتەوەو خۆیان‌ونکردو یەکسەر بەرەو گەرمیان تێیان تەقاندبوو.

لە گەرمیان هەموو کادیرو پێشمەرگەکان لە دەوری کۆ بووبوونەوەو سۆزێکیان لەگەڵیدا هەبوو دژی ئەو جۆرە سزادانەو پێکەوە کەوتبوونەجەولە کردن بە دێهاتەکانداوەکو بڵێی خۆیان بۆ هەر ئەگەرێکی ئایندە ئامادە بکەن گەر برادەرانی هەرێم شتێکیان بە دەستەوە بێ.. ئەو کاتە لە گەرمیاندا دوو کەرت هەبوو: کەرتی دوو کە کاك عادل شوکور فەرماندەی بوو، کەرتی سێ بابە تاهیر فەرماندەی بوو پێشمەرگەکانی کەرتەکە لێناڕازی بوون‌و دەریان کردبوو.. بۆیە هەموو پێشمەرگەو کادیرەکان بە قسەی کاك سامانیان ئەکردو لەگەڵیدا بوون.

کاك مستەفاش کە بیستی کاك سامان گەڕاوەتەوە بۆ گەرمیان زۆری پێناخۆشبوو، ئەیویست تۆڵەی لێبکاتەوە چونکە ئەمجارەیان بڕیاریشی شکاندبوو.. ڕۆژێك بانگی کاك ڕۆستەم‌و شێخ جەعفەرو هێمن‌و من‌و حەمەڕەشی کردوووتی: بابچین بۆ سەردانێکی گەرمیان. من تێگەیشتم کە ئەم چوونە بۆ سەر کاك سامانەو بۆ ئەنجامدانی ئیجرائاتە لە بەرامبەری کە لەوانەشە خراپەی لێبکەوێتەوە. ئینجا بە دوو سەیارەوە بەڕێکەوتین‌و چووینە دیوی گەرمیانا لە تەپەگەڕوس کاك مستەفا لە حاجی کەریمی فاتە هەواڵی کاك سامانی پرسی ئەویش‌ووتی کە لێرە بووەو چووەتە خوارەوە.. ئیتر ئێمە دابەزین‌و بەگوێ چەمی ئاوە سپیدا ڕۆیشتین‌و چووینە قەواڵی دێیەکەی ماڵی

کاك ڕۆستەمو لەویشەوە دوای هەواڵپرسین هەڵگەڕاینەوە بەرەو دێهاتەکانی ناو جاف.. دوای نوێژی شێوان لە دێی ژاڵانی ڕۆغزایی کەوتینە ناو بۆسەی هێزەکانی گەرمیانەوە کە زیاتر لە ٨٠ پێشمەرگە ئەبوون. کاك سەید محەممەدو م.عەلیو مام ساڵەح گۆڕی ئەسپی لەوێ بوون، کاك سامانو عەدنانو عادل شکورو مەلا ئەحمەدیش چووبوونە گامەخەڵ.

هەندێ لە پێشمەرگەکان چووبوونە سەر گردەکەی پشتی ژاڵانو ئەوانی تریش لە ناو دێکەدا دابەشبووبوون، کە ئێمە چووینە ناویانەوە لە هەر چوارلاوە دەوریان داین. کاك ڕۆستەم لەم دیمەنە تووڕە بوو کردیە دکتاریۆفی دەستی پێشمەرگەیەکدا تەقە لەوانەی سەر گردەکە بکات، م. عەلی دکتاریۆفەکەی لە دەستی سەندو هێوری کردەوەو لەگەڵ کاك سەیدو مام ساڵەحو م. عەلیدا کۆبووینەوەو گفتوگۆی زۆرمان لە سەر ئەو مەسەلەیە کرد، م. عەلی قەناعەتی بە کاك مستەفاو برادەران کرد بەم شەوە هیچ ناکرێو ئەوان بچنە دێی سەرکەلی مارف تاکو بەیانیوەڵام ئەدرێینەوە بۆ شارەزاییش پ.م برایمە سووریان لەگەڵماندا نارد.

دوای ڕۆیشتنی ئێمە کاك سامان هاتبووە ژاڵانو لەگەڵ برادەرانیدا دانیشتبوونو قایل نە بووبوون بە بینینی ئێمەو ئەو کارەی کە برادەران لەگەڵ ئێمەدا کردیان تەنیا بۆ ئەوە بوو کە لەو شەوەدا شتێك نەقەومێو پێشمەرگە تیا نەچێ.. بۆ بەیانییەکەی بەرەو سنووری دێهاتەکانی زەنگنە ڕۆیشتبوون. کە ئێمەش لە خەو هەڵساین تا چێشتەنگاوێکی درەنگ چاوەڕێی وەڵام بووین هەر دەنگ نەبوو بۆیە دوای نانو چایی خواردن بەرەو دێهاتەکانی سەرەوە هەڵکشاینەوەو چووینە بەکربایەف.

لەم مەسەلەیەدا نە کاك مستەفا لە من دڵنیا بوو من لەگەڵیدا بم نە کاك سامانیش بڕوای بەوە ئەکرد لە گەڵ ئەودام کەچی لە ناخەوە لەگەڵ کاك ساماندا بوومو زۆرتر بەلای ئەودا ئەمشکاندەوە، پێم ناخۆشبوو هەر جۆرە ئیجرائاتێکی لەگەڵدا بکرێ بە مەرجێ کاك سامان لە ڕووی پێشمەرگایەتیو

کاری حیزبییەوە هەڵەیەکی ئەوتۆی نەبوو جگە لەوەی کە هەندێ گرفت هەبوون پێویستی بە چارەسەرکردن بوو تەنانەت خەڵکیش لەو شتانە بە ئاگا بوونو لە پەناو پەسێردا قسە ئەکرا.

ئێمە لە بەکر بایەف دانیشتبووین گوێمان لە ئیزگەی گەلی کوردستان ئەگرت بروسکەیەکی جفرەدار بۆ کاک مستەفا کرا کە ئەوکاتانە ئەوەندە جیهاز لە خوارەوە نەبوو بۆ پەیوەندیکردن بەسەرەوە بەڵکو لە رێگەی ئیزگەوە بە بروسکەی جفرەدار مەبەستەکان ئەگەیەنرایە خوارەوە بۆ جێبەجێ کردن.. هەر هەرێمەو هێزو لێپرسراوێك ژمارەی تایبەتی خۆیان هەبوو پێی ئەناسرانەوەو کلیلی جفرەکانیشیان لابوو کە بە هۆیەوە ناوەرۆکی بروسکەکانیان ئەکردەوەو لێی تێئەگەیشتن.

کاك مستەفا بروسکەکەی کردەوەو هەستا منی بانگکردە ئەولاوەو پێیووتم: رەنگە بابە تاهیر لەگەڵ گەرمیانییەکاندا نەگونجێ بەڵکو تۆ ببیتە فەرماندەی کەرت لەوێ.. من لە دڵەوە ئەوەم پێخۆشبوو بگەرێمەوە گەرمیان بەڵام ئەمزانی بە هۆی ئەو کێشەیەوە برادەران لەوانەیە من بە لایەنگری کاك مستەفا بزانن‌و ئیلتیزامم پێوە نەکەن، بۆیە قایل نەبووم بەوەی بگەرێمەوە گەرمیان‌و پێشنیارەکەی کاك مستەفام رەتکردەوە کاك مستەفاش ئەمەی پێناخۆش بوو.لە ئەنجامی ئەمەداوامدانابوو بۆ دوور کەوتنەوە لەم بگرەو بەردەیەی هەرێم‌و کێشەی نێوان برادەران بە خۆم‌و مەفرەزەکەمەوە بچمە سنوری شارباژێر.

لە گەرانەوەماندا بۆ سەرەوە سەردانێکی دیوی شارەزوورم کرد، لەوێ چاوم بە ئەبوشەهاب کەوت کە لە لایەن ناوەندی کۆمەڵەوە بۆ لێکۆڵینەوە لەو کێشەیەی نێوان برادەران نێردرابوو چونکە کاك سامان لە رێگەی خۆیەوەو دوای تاوتوێکردنی دۆخەکە لەگەڵ کادیرەکانی گەرمیاندا نامەیەکیان بۆ ناوەندی کۆمەڵە نووسیبوو لە سەر ئەو رێگرتن‌و چەککردن‌و ستەملێکردن‌و خڕبوونەوەی گەرمیانیەکان لە دەوری‌و نارەزایی دەربرین لەو بارەیەوەو داوا کردنی چارەسەرکردنی کێشەکە بە شێوەیەکی گونجاو، بۆیەش ناوەندی لای خۆیەوە ئەبوشەهابی بۆ پەیجۆری ئەو مەسەلەیە نارد.

ئەبو شەهاب بانگی کردمو هەندێ پرسیاری ئاراستە کردمو داوای ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتەی لێکردم منیش بەویژدانەوە هەموو ڕاستییەکانم پێڕاگەیاند کە تەنیا مەبەستیشم لابەلا کردنەوەی گرفتەکان بوو نەك قوولکردنەوەیان.

ڕۆژی ١٩٨١/١٠/٦ بوو ئێمە لە دێی سێتەڵانی سەروو بووین شەوەکەشی هەر لەوێ ماینەوە، من لە سەر بانێك نووستبووم لە ناکاو گوێم لە دەنگی ئارپیجییەك بوو لە سێتەڵانی خواروو تەقییەوە یەکسەر خۆمان گورجکردەوەو بەدەم ئەو تەقەیەوە چووین کە جاشەکان هاتبوونە سەر ماڵی کاك حەمە سەعیدی حاجی غەریب کە کادیری کەرتی قەرەداخ بوو، ئێمەش لای خۆمانەوە پەلاماری جاشەکانمان داو تا دێی ئەحمەد ئاوا ڕاومانانن، جاشەکان هاواریان ئەکرد ئێستا شەوە ڕاومان نێن، بەیانی باوکمان دێتو ئەوکاتە ئەزانین چیتان لێئەکەین.. مەبەستیان لە هاتنی کۆپتەر بوو بۆ سەرمان.. بۆ بەیانی چووینە نێوان سێتەڵانو کانی هەنجیر لەو ناوەدا بڵاوەمان لێکردبوو هەر چەند پێشمەرگەیەك بەیەکەوە بووین.

ئەبو شەهاب جیبێکی لاندرۆڤەری هێنابوو هەندێ فیشەکی تیا بوو لە خواری ئێمەوە ڕایگرتبوو لە ناکاو گوێمان لە دەنگی باوکی جاشەکان بوو (کۆپتەر) ڕوانیمانوا دوو کۆپتەر هاتنو نزیکبوونەوە.. داوام لە پێشمەرگەکان کرد بڵاوەی لێبکەن کەچی ئەوان هەر لە دەوری من دوور نەکەوتنەوە، کۆپتەرەکان تەقەیان کرد یەکەم جار دایان لە جیبەکەو ئاگری گرت کە هەڵگەڕانەوە مشتیان لە ئێمەش گرتو تەقەیان لێکردین یەکسەر دوو پێشمەرگەمان: عومەر عەلی ئەحمەدو یوسف محەممەد قادر شەهید بوون. لەو کاتانەدا جاشەکانیش بەرەو کانی هەنجیر ئەهاتنو کەوتنە سەرووی دێیەکەو نزیکی ئێمە بوونەوە گوێم لێبوو جاشێك بە برادەرە جاشەکەیووت: مەڕۆو بگەڕێرەوە. ئەویشووتی: کورە بۆ کوێ بگەڕێمەوە ئەوەنییە باوکمان لەگەڵمانایە.

ئەوەی یەکەمووتی: بەخوا باپیریشت لە گەڵا بێت ئەتکوژن. ئیتر جاشەکەی تر بە قسەی کردو گەڕایەوە.

دوای تـەواو بـوونی شـەڕەکە ئێمـەش تـەرمی شـەهیدەکانمان بـردە گۆڕسـتانی کـانی هـەنجیرو بـەخاکمان سپاردن، ئـەبو شـەهابیش بـەرەو دیـوی قەرەداخ ڕۆیشت بۆ ئەنجامدانی کاری لێکۆڵینەوەکەی خۆی لـە سـەر کێشـەکەی نێوان کاک مستەفاو کاک سامان.

# ساڵی ١٩٨٢

دوا دوایـی مـانگی ١٩٨١/١٢ بـوو کـاک ئـازاد هـەورامی لێپرسـراوی لقـی کەرکوکی (ی.ن.ك) بە مەفرەزەیەکەوە بۆ جەولـەی گـەرمیان دابـەزی، منیشی لەگەڵ خۆیدا بـۆ شـارەزایی داواکـرد، بـە قـۆپی حەمـەی هەواسـدا سـەرکەوتینە سـەر شـاخی پشـتی چرچـەقەڵاو شـۆڕبووینەوە بـۆ دێهاتـەکانی شـێخ تـەویل‌و ئیمام محەممەد، لەو ناوەدا گەیشتینە برادەرانی کەرتی سێ کە مام ساڵەح گۆڕی ئەسپی سەرپەرشتی ئەکرد، لەوێشەوە دابەزین بۆ زاوت. بەبۆنـەی سـەری سـاڵی تازەوە ناردمان لە شارۆچکەی کەلار هەنـدێك میوەیـان بۆمـان هێنـا کەلـە ڕۆژی ١٩٨٢/١/١دا گەیشت‌و دابەشمان کردە سەر پێشمەرگەکاندا.

لــەو ماوەیەشــدا چــەندین کۆبوونــەوەی تێروتەســەل لەســەر کــاری پێشمەرگانەو پەیوەندی بەکۆمەڵانی خەڵکییەوە کردو موناقەشـەی زۆر لەسـەر مەبەستە جیاجیاکان کرا.

ڕۆژی ١٩٨٢/١/٣ گەیشـتینە دێـی تووەقـوتی‌ووردە شاتری کـە چـل ماڵێـك ئەبوو، قوتابخانەو مزگەوتی هەبوو، خەڵکەکـەی هـەژارو دۆسـتی شـۆڕش بـوون هەمیشە پێشمەرگە لەناویاندا هـەبوو، هێشـتا تـازە لـە ماڵەکانـدا دامـەزرابووین، ئاگادارکراینەوە کەوا جاش هات، دیار بوو ئیخبـاری کرابووین کـە هێزێکـی ٥٠ ـ ١٠٠ کەسی پێکەوە جەولە ئەکەین. بۆ لێدانی جاشەکان بووین بە ٣ بەشەوە:

١. بەشێك چووینە سەر ڕێگای دێی چەمە بیسمیلا

٢. بەشێك بۆ سەر ڕێگای نێوان تووەقووت ـ کیژۆك

٣. بەشەکەی تر بۆ یەدەك‌و لەنزیك بەشی دووەمەوە بوون

که جاشەکان جموجووڵی پێشمەرگەیان بینی کشانەوە بەرەو دەشتایی زەماوەنگە، پێشمەرگەش دوایان کەوتن، شەڕ لەو دەشتاییەدا گەرم بوو، هێزەکەی دوژمن تا ئەهات زیادی ئەکرد لە کاتژمێری ١٠ی بەیانییەوە تاپێنجی ئێوارە شەڕ بەردەوام بوو، دوژمن بە چەندین زرێپۆشەوە پەلاماری پێشمەرگەکانی ئەدا.

لەو تەختاییە کاکی بەکاکییەدا شەڕێکی گەرم ڕوویدا، تۆپبارانی خەست هەبوو، بۆ یەکەمجار بوو لەگەرمیاندا قومبەلەی فسفۆڕی بەکاربهێنرێ بە مەبەستی تۆقاندنی پێشمەرگە، بەڵام ئەمەکاری لەوورەیان نەکرد، ئازایانە بەرپەرچی پەلامارەکەیان ئەدایەوە، ئەو دەشتە بوو بووە مەیدانی ئاگربازیو مەرگبارین، گرمەی ئاربیجی دەستی پێشمەرگە گیانی لەرزۆکی جاشو سەربازەکانی هێنابووە لەرزین، بۆ یەکەمجارە حەوت کاتژمێر شەڕ هەبێو کۆپتەر هەڵنەسێو بەشداری نەکات، هەرچەندە هەمیشە پێشمەرگە گوێ قولاخ بوون بۆ هاتنی دەنگەکەی. لەگەرمەی هێرشەکاندا لەناو گرمەو هاژەی تۆپو هاوەندا پێشمەرگەکان داستانی عیشقو خۆشەویستیان تۆمار ئەکرد، تەنانەت کاك عادلی ڕابەر سیاسی بە تەنیا پەلاماری زرێپۆشێکی داو ماوەیەك بەدوایەوە بوو.

لە ناو جەرگەی شەڕەکەدا کۆمەڵە پێشمەرگەیەك بەسەر گردێکەوە نەخشەی پەلامارێك دائەرێژن لەناکاو لەناوەڕاستیاندا گوللە هاوەنێك ناڵەئەکات، گەردو تۆزێکی زۆر بەرز ئەبێتەوە، مەیدانی شەڕەکە بۆ چەند چرکەیەك مات ئەبێ، دوو پێشمەرگە بریندار ئەبنو بە پەلە بۆ پشتی شەڕەکە ئەگوێزرێنەوە، کاك قاسم فەقێ عەلی فەرماندەی مەفرەزەی کەرتی ٢ برینەکەی سەخت ئەبێو ڕەوانەی بناری شاخ ئەکرێ بۆ دیوی قەرەداخ ببرێو تیمار بکرێ. ئەمەو ئێوارە هێزەکەی دوژمن کشانەوە بۆ سەر جادەو هێزەکانی ئێمەش کشانەوە.

ڕۆژی ١٩٨٢/١/٤ بۆ پیاچوونەوەی کارو نەخشەی شەڕەکە بە سەرپەرشتی کاك ئازاد هەورامی کۆبوونەوەیەکمان سازکرد، لێدوانێکی گەرم لەسەر جۆری

شــەڕی پێشــمەرگانەو دوژمــن‌و شــێوەی هێــرش‌و پــەلاماردان‌و هەڵــەکانمان لەشەڕداو خاڵی سەرکەوتن‌و ژێرکەوتنەکانمان کرا، ئەمە بوو بەدابێکی باش لە گەرمیانــدا دوای هــەر شــەڕێك هەڵســەنگاندن هــەبێ بــۆ زیــاتر شــارەزایی‌و تاوتوێکردنی دۆخەکە. ئەم کۆبوونەوەیە لە کەلاوەکانی سۆفیوەنەکاندا کـرا، کـە کاتی خۆی دێیەکی گـەورە بـووەو لەئـەنجامی شـەڕو ناکۆکییـان لەگـەڵ شـاتریدا لەو ناوچەیە دوورخرانەوەو ڕوویان کردە ناوچەی هەمەوەندو لەوێ نیشتەجێ بوون‌و تـا ئێستاش بنـەڕەتی دیوەخانەکەی کوێخـا حەمـە نـامیق ماوەتـەوە کـە پیاوێکی ناودارو نان بدە بووە.

نیـوەڕۆی ئـەو ڕۆژە چـووینە دێـی بنەبـەراز کـە لـە شۆڕشـی پێشـوودا بنکەیـەکی پێشمەرگانەی لێبـوو، میمەکـە پانـێ خزمـەتی زۆری ئـەکردن‌و بـە دایکی پێشمەرگە دائـەنراو لـەتیرەی باشـکی جـاف بـوو. بـۆ ئێوارەکـەی چـووینە سەرکەلی مارف.

ڕۆژی ١٩٨٢/١/٥ هـەر کـە پێمـان نایـە نـاو دێـی گامەخـەڵ یەکـەم هـەواڵ باسی شەهید بوونی قاسم درا بەگوێماندا لە ئەنجامی ئەو برینە سەختەی بـەر بەرزەهاری کەوتبوو. شەهید بوونەکەی شتێکی چاوەڕوان کراو بوو چونکە هەم شوێنی برینەکـەی کاریگـەر بـوو، هـەم پزیشـکمان لەگەڵـدا نـەبوو، هـەم بنکـەی پزیشکی دوورە دەست بـوو فریـای ئـەو جـۆرە برینداریيـە نەئەکـەوت سـەرەڕای ئەوەی ئەو کەرەستە پزیشکیانە بۆ عەمەلیاتی لەو جۆرە لەبەر دەسـتدا نـەبوو. شــەهیدبوونەکەی کــاری زۆری تێکــردین‌و هەنــدێ لــە نەخشــەکانمانی هەڵوەشاندەوە بۆیە بەرەو بنار گەڕاینەوە، لەوێشەوە بۆ دیوی قەرەداخ.

دوای ئەم شەڕەی ئێمە ڕۆژی ١٩٨٢/٣/١٩ برادەرانی حشع لە گەشتێکیاندا لــە دێــی بەکربایــەف کۆئەبنــەوە، ســەر لەبەیانییەکــەی -وا پــێ ئەچــێ ئیخباری‌کرابن، دوژمن بە چەند کۆپتەرێك ئەگاتە سەریان، لە هەموو لایەکەوە ئینزالیــان بــۆ ئــەکرێ‌و شــەڕ بــەرپا ئــەبێ، لــەوە ئەچــێ پێشــمەرگەکان بــاش دانەمــەزرابن‌و شــوێنی خۆیــان نــەگرتبێ بــۆ بــەرگری، گەرچــی هێــزی پیــادەی دوژمن نەهاتبوو، تەنیا هەر بەکۆپتەر لێیان درا، سـەرەنجامی شـەڕەکە شەهید

کردنی ٢٢ پێشمەرگەی حشع بوو، ئەمە گورزێکی توندی تر بوو لەهێزەکانی حشع کە ساڵێك پێشترو هەر لەم مانگەدا لە دێی مەلاهۆمەری ناو زەنگنە تووشی شەریکی دەستەو یەخە بوونو کۆمەڵێکی تریان لێ شەهید بوو بوو.

مانگی ١٩٨٢/٤ هەرێمەکان گۆڕانو لە شوێنیدا تەشکیلاتی تیپەکان درووست بوون دیارە ئەمەش بەشێکی پەیوەندی بەو ئاڵۆزیەی سنووری هەرێمی پێنجەوە هەبوو کە ناکۆکیەکانوایکرد ئەگەر چارەسەر نەکرایە هەر هێزەو لە ناوچەیەکدا بۆ خۆیان سەربەخۆ کاربکەنو کەس نامەی ئەویتر نەخوێنێتەوە، ئەمەوایکرد کە بیرۆکەی بوونی هەرێمەکان بگۆڕیو ماوەیەك لە هەر ناوچەیەکدا هێز ( قوە ) دامەزراو ئینجا بە یەکجاری گۆڕانەکە کراو بیرۆکەی تیپەکان هاتە ئاراوە کە هەرێمی پێنج بووە سێ تیپ:

١. تیپی٥٥ ی قەرەداخ کە سنووری کەرتی یەکی قەرەداخ بوو.

٢. تیپی ٥٧ ی سەگرمە کە سنووری کەرتی دووی بازیانو کەرتی چواری جەباری بوو.

٣. تیپی٥١ ی گەرمیان کە سنووری کەرتی سێی کفریو کەرتی پێنجی دووز بوو.

کاك ڕۆستەم کرایە سەر تیپی ٥٥ ی قەرەداخو کاك شێخ جەعفەر جێگری تیپو منیش فەرماندەی کەرتی قەرەداخ. ماوەیەك سەرقاڵی تەشکیلاتی تازەو ڕێكو پێککردنی کەرتو دابین کردنی مەفرەزەو پێشمەرگەکانو دیاریکردنی سنووری کەرتەکان بووین.

لە ڕۆژی ١٩٨٢/٤/١٩ کۆمەڵە پێشمەرگەیەکی تیپی ٥٥ی قەرەداخ کە کاك ڕۆستەمو کاك شێخ جەعفەریان لەگەڵدا بوو لە دێی ژاڵەی دەربەند بۆ حەسانەوە لایان دابوو، ئەم دێیە ئەکەوتێتە بناری چیای سەگرمە، دانیشتوانەکەی هەمەوەندو زەنگنەنو لە ڕۆژهەڵاتی دێکەوە مەخفەرێکی پۆلیسی لێیە لە بەردەم چیای باسەرە. لاموایە پێشمەرگەکان ئیخباری کرابوون، دوژمن هێزی کۆکردبووەوە، چ پیادەو چ بەکۆپتەر، کۆپتەرەکان لە سەر شاخی پشتی دێکە هێزیان دابەزاند، لە جادەشەوە هێزێکی بە ناقیلەوە هێناو

دەوروبەری دێکە تەنرا. پێشمەرگەکان لە ناو دێدا دامەزران، هەریەکەو لەو ماڵەی لێی بوو خۆی مەڵاس دابوو، چاوی خستبووە سەر قەرەوڵی تفەنگەکەی‌و دەستی بەسەر پەلەپیتکەکەیەوە. لە سەرەوە کۆپتەرەکان دێکەیان داگرتەوە، شەستیرو ڕۆکێتەکانیان ڕۆ کردە خوارەوە، دەستیان لە خەڵکی‌و تەنانەت لە ئاژەڵیش نەئەپاراست، لە خواریشەوە ناقیلەکان لوولەی تۆپەکانیان هەناوی دێی ئەهەژاند، هێزی پیادەش‌ووردەووردە پێش ئەکەوتن بەدەم تەقەکردنەوە، لە کاتژمێر ١١ی بەیانییەوە شەڕ دەستی پێکرد، پێشمەرگە نەبەزەکان سنگیان داکوتابوو ڕووبەڕووی دوژمن‌وەستابوونەوە نەیانئەهێشت بە ئاسانی بگاتە ناودێ. شەڕەکە گەرم بوو، ناقیلەکان نزیکبوونەوە، تا ئەو ڕادەیەی چوار پێشمەرگە لە ناو حەوشەیەکدا لەلایەن ناقیلەکانەوە گەمارۆدرابوون، پێشمەرگەکان نارنجۆکی دەستیان بۆ هەڵدان، ناقیلەکان ڕایانکرد، ٩ کاتژمێر شەڕ بەردەوام بوو. لەم شەڕەدا سێ‌ماڵ سووتان، یەك هاووڵاتی شەهید بوو، کاك ڕۆستەمیش بریندار بوو.

زیانی دوژمنیش: کوژرانی ١٢ جاش‌و ١٩ سەربازو خستنە خوارەوەی ٢ کۆپتەر. ئەوەی ڕاستی بێ زیانی پێشمەرگەو هاووڵاتیان لە چاو زۆری هێزی دوژمن‌و قورسی هێرش‌و پەلامارەکەی شتێکی ئەوتۆ نەبوو کە جۆرەها چەکی قورس‌و تانك‌و کۆپتەری تیا بەکارهات. دوای شەڕ پێشمەرگەکان لەناو دێ دەرچوون.

ئەوەی جێی باسە ئەمە یەکەم شەڕی ناو دێیە کە هێزەکانی (ی.ن.ك) ئەیکەن، کە خۆی لەخۆیدا ئاڵوگۆڕێکی گرنگی لە شێوازی شەڕدا هێنایە کایەوە کەتا ئەوکاتە شەڕی‌وا نەکرابوو، بەمەش نەخشەیەکی تازە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمندا دارێژرا کە ئەویش دیفاع کردنە لەناو دێدا کە دوو لایەنی تیا دەرئەکەوێ:

١. دوژمن بە ئاسانی ناوێرێ بێتە پێشەوە.

٢. ناودێ شوێنێکی قایمە بۆ: بەرگری‌کردن، لێدانی دوژمن، خۆپاراستن چ بەرامبەر کۆپتەرو چ بەرامبەر هێزی پیادەو زرێپۆش، بە پێچەوانەی

شەڕی دەشتودەر بە تایبەتی گەرمیان کە نەدارستانی لێیەو نەشیوو دۆڵی قووڵیوەکو پەناگای سروشتی لێیە بۆ شەڕی بەرگری. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم جۆرە شەڕە لایەنی خراپێشی هەیە کە: هەم دێکە زیانی لێئەکەوتو زۆرجار ئەسووتا یان ئەڕووخا، هەم خەڵکەکەی بەرئەکەوتن، هەروەها سەروەتو سامانو کەرەستەی ناوماڵیش زیانۆمەند ئەبوو، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا شەڕی ناودێ دەرزێکی باش بوو بۆ شپرزە کردنی هێزەکانی دوژمن بەڵکو داهێنانێکی نوێی پێشمەرگانەش بوو لە شەڕکردندا.

هەر لەم مانگەداو لە یادی هەشتەمین ساڵڕۆژی بۆردومانی فڕۆکە جەنگییەکانی ڕژێمی عێراقی بۆ سەر شارۆچکەی قەڵادزێ لە ڕۆژی ١٩٧٤/٤/٢٤ دا کە زانکۆی سلێمانی بەر ئەو بۆردومانە کەوتو زیانی زۆری لە خوێندکارانو مامۆستا داو زۆریشیان شەهیدبوون.

لەم ڕۆژەدا خەڵکی شارۆچکەکە لە گۆڕستانی شەهیدانەوە خۆپێشاندانێکی گەورەیان سازداو دایکە ئامینەو مامۆستا سنۆبەر کە دوو ژنی قارەمانی ئەو شارۆچکەیە بوون لە پێش خەڵکە خۆپێشاندەرەکەوە بوون بە سروودو دروشمی شۆڕشگێڕانە دژی بەعس. دەستوپێوەندەکانی ڕژێمو دەزگا تۆقێنەرەکانی لەو خەڵکە هاتنە دەستو دایکە ئامینەو مامۆستا سنۆبەریان شەهید کرد.پریشکی ئەم هەنگاوە بۆ ناوچەکانی تریش تەشەنەی سەندو خۆپێشاندان گەیشتە شوێنەکانی تریوەکو ڕانیەو چوار قوڕنەو هەولێرو سلێمانی.

ئەوی پێویستە بوترێ ئەم خۆپێشاندانانە زۆربەی لە لایەن خوێندکارانەوە ساز ئەکراو بەڕێوە ئەبرا کە لە ڕۆژی ١٩٨٢/٥/٣ دا گەورەترین خۆپێشاندان لە لایەن خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر بەر پاکراو دوژمنی تۆقاندو کەوتەخۆی دەستیان لێبووەشێنێ، لە بری ئەوەی گوێیان لێ ڕابگرێو بە پیر داخوازییەکانیانەوە بچێو لە ڕێگەی گفتوگۆوە لێیان تێ بگات لوولەی تفەنگو تۆپی تێکردن، کە خوێندکاران تەنیا داوای تایبەتیان بۆ خۆشگوزەرانی خۆیان بەرز نەکردبووەوە بەڵکو داخوازی نەتەوەکەیان ئەدا بە

ڕووی ڕژێمدا بۆ چارەسەرکردن. ئەمەش بەڵگەی مێشکووشکی ڕژێمێکە نایەوێ بکرێتەوەو لە ڕێی دانوستانەوە لە گرفتەکان بپێچێتەوەو بە هۆی خوێندکارانیشەوە پردێك بۆ تێگەیشتن لە دۆزی کورد درووست بکات، ئەم خەفە کردنە حەتمەن باجی خۆیوەرئەگرێ. لە ڕاستیدا ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بە زۆری لە پشت ئەم جۆرە کاری خۆپێشاندانو نارەزاییانەوە بوون.

لە مانگی ١٩٨٢/٥ داو لە ڕۆژی ١١ دا مامەڕیشەی قارەمان لەگەڵ دەستەیەکدا لە دێی حەمکی ناوچەی جەباری ئەبن، دوژمن پێیان ئەزانێ کەشەوی پێشوو لە گەڕەکی ئەلحورییەی کەرکوك ئەدەن کە جاش تەعریبەکانی تێدا بوو، شوێنیان ئەگەون.. حەمك دێیەکی بچکۆلەی چەند ماڵی بوو ئەو شەوە بۆ حەسانەوە پێشمەرگەکان لایان دابووە ئەوێو لە ئامێزیا پشوویەکیان دابوو، هێزەکانی دوژمن ئابلۆقەیان دابوو کە ڕۆژ بووەوە کەوتنەوێزەی، هەر لەبەیانییەوە تائێوارە چەندین پەلاماری یەك لە دوای یەکی ئەدەن، بەڵام پێشمەرگەکان ماڵەکان ئەکەنە سەنگەرو دابەش ئەبنو بەپێی ئەو نەخشەیەی مامەڕیشە دایرشتبوو، بەوورەیەکی پۆلایینەوە هەموو پەلامارەکانی دوژمن تێك ئەشکێنن، شەڕەکە ئەوەندە سەخت ئەبێکە ١٤ کاتژمێر ئەخایەنێ، هێزێکی زۆری دوژمن ئەکوژرێن لەوانە جاش عاسی ڕەئووف، سێ پێشمەرگەش شەهید ئەبن.

لەم جۆرە شەڕەدا دوژمن ئەیەوێ سوود لەم کەلێنانەوەربگرێ بۆ زیان گەیاندن بە پێشمەرگە:

١. ئابلۆقەدان بە مەبەستیوەرس کردنووورە بەردان.

٢. قۆستنەوەی کات بۆ دەست بەسەراگرتنو کۆتایی هێنان بە شەڕەکە.

٣. تەنگ پێهەڵچنینی پێشمەرگە بۆ تەقەکردنو خاڵی کردنەوەی مەخزەنەکانیانو نەمانی فیشەكو تەقەمەنی بۆ دەستگیرکردنیان.

لەو لاشەوە پێشمەرگە سوود لەهەندێ لایەنیتر وەرئەگرن:

١. خۆمەڵاسدان لە سەنگەرەکانیان بۆ دەستوەشاندنی کوتوپڕو لووت شکاندنی هێزەکانی دوژمن.

٢. کەم تەقەکردن‌و دەست بەفیشەکەوەگرتن‌و نیشانە ئەنگاوتن بۆ ترساندنی دوژمن‌و زیان پێگەیاندنی.
٣. قۆستنەوەی کات بە دوو مەبەست:
أ. هەل ڕەخساندن بۆ دەربازبوون بەتایبەتی دەمەو ئێوارەو شەو کە دوژمن ئیتر توانای مانەوەی نامێنێ‌و ئەکشێتەوە.
ب. گەیشتنی هێزی پشتیوان لە پێشمەرگە یان پشتگیری بۆ کۆمەك‌و هاوکاریکردن.

شەڕی حەمك دووەم شەڕی ناو دێیە دوای شەڕی ژاڵەی بەر دەربەند کە گۆڕانێکی بابەتی درووستکرد لە ئاستی شەڕی پێشمەرگانەداو سەرکەوتنی تێدا بەدیهێنراو دوژمنی خستە ناو شڵەژانێکی قورسەوە کە هێزەکانی نەتوانن بە سانایی بەو تەکنیکە پێشکەوتووەی لەبەر دەستیاندابوو پێشڕەوی بکەن‌و ئیتر لەمەوە هێزی پێشمەرگە لە خۆحەشاردان‌و مانەوەی ڕۆژ لە پەناو پەسیردا زیاتر دەربکەون‌و لەناو دێهاتەکاندا بمێننەوە تەنانەت لە نزیکترین شوێنی دوژمن‌و جارجاریش ئاگاداری دوژمنیان ئەکردەوە تاکو بەهێزەوە دەربچن‌و تووشی شەڕ ببن.

کۆتایی مانگی ١٩٨٢/٦ بڕووسکەیەکمان بۆ کرا کەتیپەکەمان بچێتە سنووری تیپی٤٧ ی پیرەمەگروون، تیپە کەمان (تیپی ٥٥ی قەرداغ ) کۆکردەوەو خۆمان ڕێکخست‌و بە ڕێکوپێکی پەڕینەوە بەری سنووری تیپی ٤٧ ی پیرەمەگرون.. ڕۆژێك کاك ملازم عومەر لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری لای دێی قەیوان کۆبوونەوەیەکی پێکردین‌و پێی ڕاگەیاندین کەوا لەشکری ئیسلامی چەك ئەکەین‌و نەخشەی ئەنجامدانی کارەکەی پێووتین.

لەشکری ئیسلامی هێزێکی چەکدار بوون لە ئێرانەوە درووست کرابوون لە ڕێگەی هەندێك کەسی ئایینییەوە خەڵکیان پەیدا کردبوو هێزیان پێکەوە نابوو، بەشداریکردنی خەڵکانێك بە ناوی ئایینەوە لە خەباتی ڕزگاریخوازی کورددا کارێکی باشە ئەگەر لەپشتی پەردەوە بەرنامەیەکی دژی گەلیان هەڵنەگرتبێ‌و بەپێی نەخشەیەکی بۆ دارێژراو لەلایەن دوژمنانی کوردەوە

هەڵنەسووڕێن. یەکەم جار کەهاتنە ناوەوە ڕێزیان لێگیراو پێشوازیان لێکرا، بەڵام دواتر بەپێی هەندێ زانیاری تایبەتی ناوەڕۆکی شاراوەیان دەرکەوت کە ئەمانە مەترسییەکی زۆریان هەیەووەکو دەستێك دێنە ناوەوە بۆ پیلانگێڕان و تێکدانی ڕەوتی شۆڕش و لەناوبردنی دەسەڵاتی (ی.ن.ك)و خەفەکردنی هەستی نیشتمانیو دابڕینی خەڵکی لەبەشداریکردنی شۆڕش و خەبات. دیار بوو ئەمانە هەستی ئایینییان بەکارئەهێنا بۆ ڕاکێشانی خەڵکی بۆ ڕیزەکانیانو بەکارهێنانیان بۆ مەرامە گڵاوەکانیان، بەمەش ئایینیان ئەکردە بەردەبازێك بۆ شێواندنی هەستی نەتەوایەتیو لێرەشەوە ڕێڕەوی کۆنەپەرستانەیان ڕوون بووەوە، هەرچەندەوەکو ڕێکخستن‌وپێگەی جەماوەری بوونێکی ئەوتۆیان نەبوو، بەڵام هەر مەترسی بوونو گەرای کۆنەپەرستیان دائەناو کە تاڵە دەزووەکانی پیلانە نهێنییەکەیان بۆ (ی.ن.ك) ئاشکرا بووو بەپێویست زانرا سنووریکیان بۆ دابنرێ تامەترسی گەورەتریان لێنەکەوێتەوە.

ڕۆژی ۱۹۸۲/۷/۲ هێزێکیان هاتو لێمان پرسین : ئێوە کێن..؟

ووتیان: لەشکری ئیسلامین. دەستبەجێ کاك ملازم عومەر بڕیاری چەککردنیانی دا. یەکسەر گەمارۆدرانو بە چاوتروکانێك چەککران و بە دیلگیران تەنیا یەکێکیان ڕایکرد کە خەڵکی چوخماخ بوو. چەکەکانمان کۆکردەوە. هەندێك پێشمەرگە دەستکاری چەکەکانیان کردبووو لەگەڵ ئەوانەی خۆیاندا بە بێ بڕیار ئاڵوگۆڕیان کردبوو، کاك ملازم عومەر بەم کارە زۆر تووڕە بوو، چەکە گۆڕاوەکانی دایە بەرشەق، ئێمەش زاتمان نەئەکرد پێی بڵێین کێ ئەمەی کردوە. دیارە ئەمە بوو بووە خووی پێشمەرگە لە هەر شەڕو چالاکییەکدا دەستکەوت هەبوایە چەکی تازەیان ئەبردو کۆنەکانیان ئەخستە شوێنی، بەبێ ئەوەی چاوەڕێ بکەن ئەمە بەپێی بەرنامەو بڕیاری سەروویان بکرێو بدرێتە ئەو کەسانەی کە کۆنن یان مستەحەقن، یان هەندێ جار چەك نەئەماو ئەشاردرایەوە، کە ئەمەش بەشێکە لەدیاردەی شەڕەخۆریو ئەبوایە پێشمەرگەوەکو ڕەوشت لێی بەدوور بوایە، چونکە ئەو گیانی بەخت ئەکاو خوێنی ئەڕێژێ، بۆچی ئەوەندە عاشقی جۆری چەك بێ..؟ بەڵکو لەهەندێ

حاڵەتـدا پێشـمەرگە گرەویـان لەسـەر دەسـت بەسـەراگرتنی ڕەبایـەو مولگـە سەربازییەکاندا ئەکرد بۆ دستکەوتی چەك بێگوێدانە مەترسی تیاچوون.

پاشان کاك ملازم عومەر بڕیاریـدا مـنو کـاك ئـاواتی شـێخ جـەناب ئـەو چەكو کەلوپەلە دەستکەوتانە ببەینە نەخۆشخانەکەی مالومـە کـە لـە دواییـدا هەنـدێك لـەو شـتانە بـە نامـەی خـۆی درایـەوە بـە خاوەنـەکانیان، لەوانـە ئەنگوسـتیلەی زێـڕی تێـدابوو، لەگـەڵ هەنـدێ شـتی تـردا. ڕۆژی دواتـر هـەموو بارەگاکانی لەشکری ئیسلامی لە حاجی مامەند دەستی بەسـەراگیرا. بـە داخـەوە هەنـدێ پێشـمەرگەو فەرمانـدەی ئازامـان شـەهیدبوون لەوانـە کـاك سـەلاحی موهەندیس کە کەسو کاری کاك سـەلاح دەنگـوباسـی شـەهیدبوونەکەیان بیست گەیشـتنە لامـانو دیلـەکانیان بینـی پـەلپیان گـرت کـە تۆڵـەی شـەهید سـەلاح بکەنـەوەو لێیـان بکـوژن، بـەڵام مـن ڕازی نـەبووم، کەچـی هـەلیانوەرگرتو تەقەیان لێکردنو دوانیان کوشتو هەندێکیش بریندار، زۆرمان پێناخۆش بوو، دەستمان لێدانە چەكووەخت بوو تەقە لە شەهید شێخ محەممەد بکەین، بەڵام ئـەو دەنگـی نـەکرد، ئـیتر ڕۆیشـتن. هەڵوێسـتێکی چـەند دژوارە لـە لایەکـەوە کەسوکاری شەهید بە دڵبریندارى ببینی، لە لایەکیشەوە تۆڵە لە دیـل بکرێتـەوە کە هیـچ دەسەڵاتێکیان نییە. ڕەوشتی (ی.ن.ك) دیل کوشتن قبـوڵ ناکـات، بـەڵکو هەمیشە لە ڕاسپاردەکانیدا ئاگاداری هێزی پێشمەرگەی کوردستانی کردووەتـەوە کە ئەبێ لەگەڵ دیلدا مامەڵەی مرۆڤایەتی بکرێو ئازار نەدرێن. ئەوەی کـە کـرا ڕووداوێکی ناپەسەند بوو.

چەککردنی لەشکری ئیسلامی نەخشـەیەکی ڕێکوپێـك بـوو، کەلـە دوو ـ سـێ قۆڵـەوە ئەنجامـدرا تیپـەکانی گـەرمیانو شـارەزوورو کـەرکوكو شـارباژێر هـەموویان بەشـداریيان کـرد.لـەم شـەڕەدا لـە قـۆڵی ئێمـەوە ٢٣ مـزەلیو ٨٠ کلاشـینکۆفی یـەك لاق و١٠ ژ ٣و کۆمـەڵێ کلاشـینکۆفی فۆناغـدارو ژمارەیـەك جیهازو کەلوپەلی تر دەسـتکەوت بـوون، هەنـدێك لـەو چـەکانە درا بـەتیپی ٢١ی کـەرکوكو تەسـلیمی کـاك شـێرزاد کـرا دوای ئـەوەی چـەکەکان دابەشـکرا سـێ کلاشینکۆفی یەك لاقو دوو فەردە مەخزەن زیـاد بـوو، چوومـە لای کـاك مـلازم

عومەرو چەکەکانم بۆ بردو پێم‌ووت: ئەمانە زیادەن. نەیهێشت باسی مەخزەنەکانی بۆ بکەم تووڕە بوو: بۆ لە ماڵی باوکت هێناوتەوا زیادە..؟ منیش ناچار باسی مەخزەنەکانم نەکردو دوایی بە سەر پێشمەرگەکاندا دابەشم کرد. دوای ئەنجامدانی چەککردنی لەشکری ئیسلامی بڕیاری گەڕانەوەمان بۆ ناوچەکانی خۆمان پێدرا.

ڕۆژێکی مانگی ١٩٨٢/٧ لەگەڵ فەرماندە مەفرەزەکانی کەرتدا کۆبووینەوە بۆ ئەنجامدانی چالاکییەك لە نێوان سەربازگەی دووو دارەو دەربەندیخاندا، بۆ ئەم مەبەستە نەخشەیەکمان داڕشت، هێزەکەمان کردە دوو بەشەوە:

- بەشی یەکەم خۆم سەرپەرشتیم ئەکرد، بڕیاردرا بچینە نزیك دێی سیارە نزیك دەریاچەی دەربەندیخان‌و لەوێ خۆمان بشارینەوە، دوای نیوەڕۆ بەلێواری بەحرەکەدا بچینە سەرجادەی دەربەندیخان - سلێمانی.

- بەشی دووەم کە زۆربەی هێزەکە بوو بەسەر چیای ناوتاقدا خۆیان بگەیەننە سەرجادەکە، بە دوو جیهازی بچووکەوە پەیوەندی بەیەکترەوە بکەین.

بڕیاروابوو بۆسەیەك دابنێین بۆ ئۆتۆمبیلێکی شۆفرلێتی ئیستخبارات کە هەموو ڕۆژێك بۆ دەربەندیخان ئەچوو، کاتژمێری ٢ -٣ی ئێوارە ئەگەڕایەوە. بە پێی نەخشەکە ئێمە لای خۆمانەوە گەیشتینە سەرجادەکە، هێشتا بەتەواوی دابەش نەبوو بووین ئۆتۆمبیلەکە ڕەتبوو، فریا نەکەوتین لێبدەین، هەندێ ئۆتۆمبیلی ترمان ڕاگرت‌و ئەمان پشکنی تومەز دوژمن بە بۆسەکەمان ئەزانێ، لە ڕەبایەکانی ئەو ناوەوە دەستی بەتەقەکردن کرد، لەوکاتەدا قەمەرەیەکی تیۆتا کراون هات دەستمان لێراگرت بۆوەستان ئەو هۆرنی لێئەداو خێراتری ئەکردەوە، تەقەمان لێکرد، ناکاو ئەکسلەکەی بچڕا، لە هەورازەوە شۆڕبوەوە، هەروەکو باڵی گرتبێتەوە، تا ئێستا مەگەر لە فلیمدا بینرابێ ئەگینا شتی‌وامنەبینیوە، چووینە سەری لەسەر تایەکانی‌وەستا بووەوە، شۆفێرەکەی مرد بوو، سێ‌برینداری تێدابوو، خوێنێکی زۆر ڕژابوو، برینداریکیان‌وەزعی

باشتربوو، لێمان پرسی: بۆواتان کرد..؟ووتی: شۆفێرەکە جاش بوو، یەکێ لەم بریندارانەش ئەندامی مونەزەمەیە نەمانوێرا بوەستین. جاشەکە بە تەمابوو ئەم ئێوارەیە مارەی ژن ببڕێت، لەو کاتەدا جیهازی بۆسەکە ئاگاداری کردینەوە کەوا دوژمن بەهێزێکی زۆرەوە خەریکە بگاتە سەرمان، بڕیارماندا سەرجادەکە چۆڵ بکەین و بەرەو دێی سیارەکشاینەوە، هەوای بەحرەکە زۆرگەرم بوووەخت بوو بخنکێین، دوژمن بەهاوەن لێی ئەداین، جاشەکانی زەڕایەنیش ویستیان پشتمان بگرن، بەلام ئێمە خۆمان قوتار کرد. دوژمن گەیشتە شوێنی رووداوەکە، هێزی بۆسەکە لێیان دەرپەڕین، زیانێکی زۆریان پێگەیاندن لە کوژراوو بریندار، لە ئەنجامی تەقەی کوێرانە ناوچەکە ئاگری گرت، ئێمەش بێ زیان گەڕاینەوە ناوچەکەی خۆمان. دوای چەند رۆژێکی تر چووینەوە سەرهەمان جادە، کاتژمێر ٣ی ئێوارە بۆسەیەکمان دانایەوە، هەندێ ئۆتۆمبیلمان راگرت، تیۆتایەکی سەر بە رۆژنامەی ئەلعێراقمان کەوتە بەردەست، کە زانیمان بۆمان دەرناچێ لە بەرزاییەکەوە خستمانە خوارەوە تا لە تەختاییەکداوەستایەوە، رۆژنامە ئەو ناوەی سپی کردەوە، شۆفێرەکەی کابرایەکی میسری بوو لە پێشەوە رەوانەمان کرد، دوژمن هاتو تەقەمان لێکرد، لە ترسا کشایەوە، کە ئەگەیشتینە هەر شوێنێك میسرییەکە ئەیووت: کێ مەسئولی عەسابەیە پارەی بدەمێ، منیش عەرەبیم نە ئەزانی هەروا هیچ یەکێك لە پێشمەرگەکانیش. چووینە دێی سیارە لە ماڵە فیرارێك لامان داو دانیشتین خێزانەکەی ژنێکی چاك بوو پرسی:

- ئەوە ئێوە ئەو شەڕەتان کرد..؟

+ بەڵێ

- ئەی ئەم زەلامە چییە..؟

+ عەرەبێکی میسرییەو ئێمەش نازانین قسەی لەگەڵ بکەین.

ژنەکە خەڵکی خانەقین بوو، عەرەبی میسریشی ئەزانی، دیارە لە رێگەی تەماشاکردنی فلیمی میسرییەوە فێر بوو بوو، لەگەڵ میسرییەکەدا کەوتە گفتوگۆ، میسرییەکە لە ترسا ئەگریا، ژنەکە پێی ووت: ئەمانە

پێشمەرگەی کوردن، شۆڕشگێڕن، مەترسە ناتکوژن، ئەمانە دزنین، لە پێناوی ئازادی کورددا خەبات ئەکەن، کورد خەڵکی بەویژدانەوەکو بەعس نییە.

کابرای میسری هەندێ هۆشی هاتەوە، دوای ڕوونکردنەوەیوەزعی کوردو شۆڕش لەلایەن ئەو ژنەوە. بۆیە ئێمەش بڕیارماندا ئازادی بکەین، دامانە دەستی زەلامێك تاكو بەیانی تاریكو روون بیباتە سەر جادەكەو بەجێی بهێڵێ. پاش چەند ڕۆژێکی تر چووینەوە سەر جادەی دەربەندیخان - دووداره لەنزیك دێی چناره، سەیتەرەیەکمان دانا، کاتژمێر ٣ی ئێواره بوو، خەڵکێکی زۆرمان لە ئۆتۆمبیلەکان دابەزاند لە ناویاندا کوڕێکی باڵابەرزی سەرخۆشی تێدابوو، پێمووت: کاکە بچۆ ناو خەڵکەکەوە نەوەك تەقە دەست پێبکات.

کەمێ دوور کەوتەوە، لەولاوە فەرماندەی مەفرەزەیەکمان لێی تووڕه بوو داوای لێکرد لەسەر جادەکە لاچێت، هەر لەو کاتەدا بۆسەی لای دەربەندیخان هاواری کرد: ئۆتۆمبیلی مونەزەمەی دەربەندیخان هات. منیش دانیشتم بۆ تەقە کردن، ڕوانیم سەرخۆشەکە پەلاماری فەرماندەی مەفرەزەکەی داو بۆکسێکی لێداو دەستی بۆ چەکەکەی برد لێی بستێنێ، لە برادەرانوایە پیاوخراپو ئیستیخباراتە یان جاشە، تەقەیان لێکردوکەوت. لە دوای ئەوسا خەڵکەکەووتیان: ئەوە کوڕێکی باشە، پێشمەرگەی زۆر خۆش ئەویست، تومەز ئەمە پێشمەرگەی ناو شارو لە ڕێکخستندا بووە، داخێکی زۆر دایگرتین. لەم مشتو مڕەدا بووین دوژمن هاتە سەرمانو شەڕێکی یەك سەعاتیمان کرد. ئەفسەرێكو دوو سەربازمان کوشت، ئێمەش بێزیان بووینو بە سەلامەتی گەڕاینەوە. لە ناو ئەو خەڵکانەی کە لە ئۆتۆمبیلەکاندا بوون (تەها خەلیل)ی ئەکتەری هونەرەجوانەکانی سلێمانی تیابوو، چووینە لایەوەو گلمان دایەوە، چونکە هەندێ کەس باسی ئەوەیان ئەکرد تەمسیلی بەسەر سەدامدا دەرکردووه، دوای سۆراخو پرسیارکردنو پاکانەی خۆی بۆمان دەرکەوت پیاوێکی باشە ئازادمان کرد.

ماوەیەك دوای ئەمە هێزێکی گەرمیان هاتنە دیوی قەرەداخو شارەزوور لەگەڵ ئەواندا نەخشەیەکمان داڕشت پێکەوە بدەینە سەر زەڕایەندا. بەپێی

نەخشەکە لەکاتی دیاریکراودا من بەهاوەن دێکەم تۆپباران کردو برادەرانیش پەلاماریاندا، لە ئەنجامدا چوار جاش کوژران‌و دوو کلاشینکۆف دەستکەوت بوو، ئێمەش بێ‌زیان.

لە ١٩٨٢/٨/٢١ دا کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە خڕی ناوزەنگ‌و لە هۆڵی شەهید شەهابی ناوەندی کۆمەڵە کۆنفرانسی دووەمی بە ئامادەبوونی ٢٢٢ ئەندام بەست.

دیارە هۆکار زۆر بوو بۆ سازدانی ئەم کۆنفرانسە بە تایبەتی کە ناکۆکییەکانی ناو هەناوی کۆمەڵە بە توندی تەشەنەی سەند بوو بە ڕادەیەك گەیشتبووە ڕیزەکانی خوارەوەش، زیاتر هەندێك لە کادیرو لێپرسراوکان داسی ئەو ناکۆکییانەیان دەمەزەردو زەمینەیان خۆش ئەکرد لێکدانەوەی جۆراو جۆری بۆ بکرێ تا ڕادەی تەنزیر کردن‌و بە ئایدیۆلۆژیا کردنی ناکۆکییەکان کە پێموایە زەمەنیش دەریخست ئەوانە تەنیا یارییان بەووشەو قسەڵۆکەکانەوە ئەکردو خۆیان لە ناو مەزادخانەی هەندێ بیرۆکەی سواوی‌وەرگیراودا ئەبینییەوە کە دوا ڕۆژەکەی لە بەرژەوەندی کەسدا نەبوو.

لە ناو هۆڵی کۆبوونەوەکاندا کە ڕۆژانە زۆری ئەکێشا گفتوگۆی گەرموگوڕ لە سەر هەموو مەسەلە پەیوەندیدارەکانی پەیوەست بە بیرو ئایدۆلۆژیاو سەرکردایەتی‌و شێوازی خەبات‌و پەیوەندی‌و هتد ئەکرا.

لە هەندێ باردا ڕەخنەکان توند ئەبوونەوە،وای لێهات هەندێ هەڤاڵ لە کۆبوونەوەکان دەرچنە دەرەوە لەوانەی کە دواتر ئالای شۆڕشیان پێکهێنا. دیاریش بوو کە لەم کۆنفرانسەدا کاریان بۆ ئەوە ئەکرد لەوێدا هەندێ لە شتەکان بتەقێننەوە بەڵام بۆیان نەلواو مەبەستەکانیان ئالتی هێنا.

لەم کۆنفرانسەشدا سەرکردایەتییەکی نوێ هەڵبژێردرایەوە:

نەوشیروان مستەفا کرایەوە بە سکرتێری کۆمەڵە، فەرەیدون عەبدولقادر، ملازم عومەر، م. جەمال تایەر، د.کەمال خۆشناو، عەلی بچکۆل، مەلا بەختیار ... بوونە ئەندامی سەرکردایەتی.

لەگـەڵ ئەوەشـدا ناكۆكییـەكان كـە دووری فكریوەرگرتبـوو، هەنـدێ هەڤاڵی لە پشتەوە بوون نەتوانرا چارەسەری بنەڕەتی بۆ دابنـرێ بگـرە زەمینـە لە بارتر كرا بۆ كنەی ئەوانەی لە بنەوە ئەجووڵانو بە نهێنی كاریان ئەكرد.

ڕۆژی ١٩٨٢/٩/٢٥ كـاك ڕۆستـەم بـەبڕیاری سـەركردایـەتی گوێزرایـەوە بـۆ تیپـی ٢١ی كـەركوكوەكو سـەرتیپ، منـیش دامنـابوو لەگەڵیـدا بچـم، پێشمەرگەیەكی ئازام لابوو ناوی محەممەد قادر سەعدون بـوو، داوای ئیجازەی شەوێكی سەردانی ماڵەوەی كرد، لە ڕێگای كانی سپیكەی نزیكی گڵەزەردە كەوتە بۆسـەی جاشـەكانی ڕەئـوف زرگـوێزیو شـەهیدكرا. ئەمـە زۆر كـاری تێكـردمو لەچوونەكەم بـۆ تیپـی ٢١ی كـەركوكوازمهێنا لـەڕێگا گەڕامـەوە ، لـەبازیان پـێ یانووتم ببە بە جێگری ٥٧و لەگەڵ كاك ڕۆستەم مەچۆ .

تیپی ٥٧ی سـەگرمـە تـازە درووسـت كـرابوو، كـاكوەهـاب سـەرتیپی بـوو، منیشوەكـو جێگـری سـەرتیپ بـۆ ئـەوێ گوێزرامـەوە، مـانگی ١٩٨٢/١٠ سەركردایەتی برووسكەیەكی بۆ كردین هێزێك ئامـادە بكـەینو بـەرەو سـەرەوە بـەڕێ بكـەوینو لەوێشـەوەوەكو هێـزی پشـتیوان بـۆ دیـوی ئێران،كاكوەهابو منیش لەگەڵ هێزێكدا بەسـەر دێهاتـەكانی سنووری مەڵبـەنـدی دوودا بـەچـەند قوناغێك گەیشتینە دێهاتەكانی هەرزنەو بێتوشو لـەوێشەوە بۆ بێوران لـە نـاو ئێـرانـدا. لـەوێ كـاك عەلی بچكۆڵان بینی، لێمان پرسی: چی بكەین..؟

ووتی: یەكسەر بچنە ئاڵوەتان.

بە پەلـە خۆمـان گەیانـدە ئاڵوەتـان، لەبـەر مانـدوو بـوون زۆر نـەخۆش كـەوتم، هەرچی ماسـوولكەكانی لەشـم بـوو ئـازاری ئـەهات، بـوو بوونـە خـوێن، دكتـۆر كامیـل نـەیتوانی دەرزیـم لێبـدات. لـە ئاڵوەتـان كـاك مـلازم عومـەرمان بینی. كاك سەربازی جێگری تیپی ٩٣ی كۆیەو كـاك مـەحمودی حـاجی فـەرەجو كاك ملازم خولەی لابوون. لەبری ئەوەی بەخێرهاتنمان بكات لێمان تووڕە بوو. تومەز هێزی تر پێش ئێمە چووەو كاك دلاوەری ئەحمـەد مەجیـد لێپرسـراوی بووەو خۆیان شاردبووەوە، هەندێكیان بریندار بوون یەكێكیان دێو حەسەن بوو كەچـاوێكی لەدەسـت دابـووو هەنـدێكیان ڕایـان كردبـووو بەنـدكرابوون. دوای

ئەوە کاک دلاوەرمان بینی، بووە مشتومڕمان لەسەر بێتوانایی پێشمەرگەو دەورنەبینین و سەرپەرشتی نەکردنی هێز. پاشان چووینە لای کاک ملازم عومەرو پێم ووت : هەرچی شوێنێکمان بۆ دیاری ئەکەن، ئامادەین پەلاماری بدەین.

شوێنێکیان لە ناو دارستانێکی چڕدا بۆ دیاری کردین، هێزێکی گەورەی دوژمنی لێبوو، کە نزیک بووینەوە ڕێگای گرتنی نەبوو، هەر ئەو ئێوارەیەش بەهۆی تۆپبارانی خەستەوە پێشمەرگەیەکمان شەهید بوو، ناچار گەڕاینەوەو هێزەکەمان بەسەر گردەکەی پشتی ئالۆەتان و چەند شوێنێکی تردا دابەشکرد، شەو دوژمن هێرشی بۆ کردین، مستەفا سەرگەڵوێی لە پێشمانەوە بوو شوێنەکەی خۆی چۆڵ کردبوو، شەڕێکی دەستەو یەخەی سەختکراو پاشان کشاینەوە ناو ئالۆەتان. کاتژمێر ٥ی بەیانییەکەی لە ئاستی ئالیمرانەوە دەنگی تەقە ئەهات، کاک ملازم عومەر ئاگاداری کردینەوە دوژمن لەو قۆڵەوە بەرەو قەندیل هێرشی کردووە، کە مامۆستا ئەنوەری لێپرسراوی ئیدارەی خۆمان و سەید ڕەسوڵی بابەگەورە لێپرسراوی دیموکرات لەوێ بوون، ئێمە بەهانایانەوە چووین. سەید بابەڕەسوڵ هەر زوو ڕایکردبوو، مامۆستا ئەنوەریشمان هەرنەبینییەوە، دوژمنیش بەرەو قەندیل پێشڕەوی ئەکرد، ئێمە لە نێوان گوێزێ و ئالیمران سەنگەرمان لێدا، دوژمن قەندیلی گرت و بەرەو لای ئێمە گەڕایەوە بێئەوەی لەو شوێنانە هێز بەجێبهێڵێ، پێشەنگی هێزەکەی دوژمن پارتی و پاسداران بوون لە ئێمە نزیکبوونەوە، چادری ماڵە ڕەوەندەکانیان بە ئارپیجی ئەسووتان. ڕوو بەڕوویان بووینەوەو شەڕێکی سەختمان کردو ئەوان گورێزەیان کرد، تەماشامان کرد بەدەم ڕاکردنەوە بزنێکی سووریان فڕاند، تەقەمان لێکردن، یەکێکیان لێکوژراو لاشەکەیان بەجێهێشت کەچی بزنەکەیان هەر برد.

کاتژمێر ٧ی ئێوارە جەبهەکەمان تەسلیمی هاوڕێ کاوە مەخموری جێگری تیپی ٨٦ی هەولێرو سەرباز جێگری تیپی ٩٣ی کۆیە کردو بۆ ئالۆەتان گەڕاینەوە، پاش دوو ڕۆژ جەبهەکەی پشتی ئالۆەتانیان پێسپاردین. دوژمن

هێرشی هێنایەوە سەرمان، دوو ڕۆژ نەمانهێشت یەك بست بێنە پێشەوە. دوایی تیپی ٥١ی گەرمیان ئێمەیان گۆڕی. کاتژمێر ١١ی شەو خەبەریان هێنا کەهێرشیان لەسەرە. کاك ملازم عومەرداوای کرد هێزێك سەربخەین، کەرتێکمان نارد بۆلایان، هێرشەکە زۆر بەربلاوبوو، کاتژمێر ٢ی شەو داوایان لێکردین هەموومان خۆمان کۆبکەینەوە بچینە زینۆی زیندان لەوێ کاك ملازم عومەرو مەلا حەسەنی شیوەشەلی قسەیان بۆکردین، لەو کاتەشدا تۆپبارانی خەست ئەکراین، لە ڕوومان نەئەهات قسەبکەین. پاشان هێزەکە بەشبەش کراو دامەزراین بۆ لێدانی دوژمن. دوای نیوکاتژمێر هێرش دەستی پێکرد، شەڕەکە زۆر قورس بوو تاکاتژمێر ١١ی پێش نیوەڕۆی ڕۆژی ئایینده بەتوندی بەردەوام بوو، بەجۆرێك پێشمەرگەو پاسدار تێکەڵ بوو بوون، پێشمەرگە سەلام مەلا هۆمەری بە قۆناغە تفەنگ لە پاسداری داو قۆناغەکە شکا، لە کاتژمێر ١٢ی نیوەڕۆدا شکاین، بەرەو دێی کونەمشکێ کشاینەوە، کاك ملازم عومەرو کاك ئازادی سەگرمەو کاك حاکم عومەرمان لەگەڵ بوو لە پشتی کونەمشکێ لەنگەرمان گرتو سەنگەرمان لێدا، دوژمن چووە ناو ئاڵومتانەوە، تیپی ١٥ی هەورامان هێزەکەی ئێمەیان گۆڕیو دوژمن هێرشی بۆکردن، برادەران لێیان دانو زیانیان پێگەیاندنو چەند چەکێکیان دەستکەوت بوو، ئێمەش دوو شەهیدمان دا. ئەمە لە ڕۆژی ١٩٨٢/١١/٢٤ بوو. ئیتر هێزەکەی ئێمە بۆ حەسانەوە بەرەو مامکاوێ ڕۆیشتین.

ڕۆژی دوایی هەڤاڵ مام جەلال ناردی بەدوامانـدا، لە ڕێگا تووشی هەندێك پێشمەرگەی تیپی ٥١ی گەرمیان بووین،ووتیان: هەڤاڵ مام جەلال کاك سۆرانو کاك عومەری برای شەهید سیروانی سزاداوە، ئێوەش تووش ئەبن. بەڵام ئێمە باکمان نەبوو، کەموکوڕییەکیوامان نەبوو تا سزا بدرێین، گەیشتینە داوداوێ بە پاسەوانەکەی هەڤاڵ مام جەلالمانووت کە پێی بڵێ مەحمود سەنگاوی هاتووە، چووینە ژوورەوە بە گەرمی بەخێرهاتنی کردینو ڕێزی زۆری لێگرتینو سوپاسی خۆڕاگری کردین. کە زانیمەزعمان لەبارەووتم: مامە ڕەنگە بەڕێزتان لە بارەی برادەرانی گەرمیانەوە هەندێ هەواڵتان پێگەیشتبێ،

بەو شێوەیە نییە،ووتی: نەخێر پیاوی ئازا خەڵات ئەکرێ، پیاوی ترسنۆکیش سزائەدرێ.

پاشان کابرایەکی قسەزل هات بەکامێرایەکی ڤیدیووەوێنەی گرتین، گفتوگۆی لەگەڵ کردین.

پاش چەند ڕۆژێك حەسانەوە دیسانەوە ڕەوانەی جەبهەی پشتی کونەمشکێ کراینەوە. هەفتەیەك لە ژێر تۆپبارانی خەستدا لەو بەرزاییانەدا ماینەوە، پاشان سەنگەرەکانمان تەسلیمی کاك ملازم خولە کرد کەهێزەکەی کەم بوو، زنجیرە سەنگەرێك کە بە ٢٨ پێشمەرگە پڕ ئەکرایەوە ئەو بە٦ پێشمەرگە دابینی کرد بوو، زۆر مەترسی هێرشیشی لە سەر بوو.

ئێمە چووینە کونەمشکێ، جلەکانمان شوشتولێی خەوتین، کازێوەی بەربەیان بە کۆمەڵ دەنگی ئارپیجی ئەهات، کاك ملازم عومەر پێی‌ووتم: هێزێك ببە بۆ یارمەتی ملازم خولە. بە جلی تەڕەوە لەگەڵ هێزەکەدا سەرکەوتمەوە، کە چووینە ناو سەنگەرەکانی ٦ کەسەکەی ملازم خولە، تەماشا ئەکەم خۆی پێکراوەو پشتی شکاوە، دوو پێشمەرگەی شەهید بوونو دوانیش بریندارن، تەنیا یەکێکیان ساغ بوو، سەنگەرەکانی تریش زۆری گیرابوون. شەڕی ئێمەو دوژمن لە دووری چەند مەترێکەوە دەستی پێکرد. برادەرانی دیموکرات ١٥ پێشمەرگەیان نارد بۆ پەلاماردانی دوژمن خۆم لەگەڵیانا چووم، ئەوان نیازی شوێنێکیان هەبوو، گوایە پشتگیری لێیە، کەچی هەموو جامانە سوور بوونو کۆڵەپشتیان بەکۆڵەوە بوو، بەلێپرسراوەکەیانم‌ووت: ئەوانە پشتگیری نینو پارتین. هاین لە ژێر دەستیان باچەند پێشمەرگەیەك لەسەر ئەو گردە بچووکە بمێننەوە تائەگەڕێینەوە، هەر کە جووڵاین لە هەر چوارلاوە دراینە بەر ئارپیجیو چەکی سووك، لە شوێنێکدا دامەزراین شەڕ تائێوارە بەردەوام بوو شەهیدێكو چوار بریندارمان داو ئینجا کشاینەوە بۆ پشتی دۆڵەتوو. لە سیرەمێرگو دۆڵەتوو چەند ڕۆژێك پشوومان داو دیسانەوە ڕەوانەی پشتی گوێزێو کونەمشکێیان کردینەوەو لەوێ سەنگەرمان لێدایەوە. کاك‌وەهابو مامەڕیشەیان ناردە لامان. لەبەرئەوەی پێویستیان بەپێشمەرگە

بوو نەیان گۆڕین لە هەمان کاتدا بڕیاری هێرش کردنە سەر دوژمن درا، بەپێی نەخشەیەك لە نێوان کونەمشکێو ئالوەتاندا لە دوو قۆڵەوە پەلاماری دوژمن دراو زیانێکی زۆری لێکەوت، دوای ئەنجامدانی چالاکییەکە گەڕاینەوە چیای نێوان گوێزێو دۆڵەتووو کونەمشکێ لەوێ شوێنی خۆمان گرتو ماینەوە.

تاکۆتایی مانگی ١٩٨٢/١١ شەڕ بەردەوام بوو. دنیا زۆر ساردو سەرمایەکی سەخت بوو، بەفری زۆر باریبوو، حاڵی پێشمەرگە زۆر شڕبوو، خێوەتەکانمان هەمووی کەوتبوو، بەجیهاز لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلال قسەمان کردووەزعەکەمان بۆ شیکردەوە، هەڤاڵ مام جەلال لەوەڵامداووتی: هەرکەسێ بێتەخوارەوە بەخائین لەقەڵەم ئەدرێ. لە ناو ئەو بەفروسەرماو سۆڵەیەدا ماینەوە، ئێوارەکەی هێزێکیان بۆ گۆڕینمان نارد، کە دابەزین بۆ دۆڵەتوو خوارووو ژووری خۆمان نەئەزانی.

لە کاتی ئەو شەڕانەدا هەڤاڵ مام جەلال چەند جارێك کۆبوونەوەی پێکردینو ئەیهەژاندین بۆ بەرگری کردنو ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنو لە ئەرکەکانی سەرشانمان ئاگاداری ئەکردینەوە.

لە ڕاستیدا ناردنی هێزی پشتیوان لە لایەن (ی.ن.ك) لەو کاتانەدا ناوەرۆکێکی سیاسی گرنگی هەبوو بۆ دیفاعکردن لە خاکی کوردستان لە کاتێکدا داگیرکەرانی کوردستان لە هەوڵی کاولکاریو کوشتنی خەڵکەکەیو خەفەکردنی شۆڕشەکەیو لەناوبردنیویستو ئارەزووەکانی کورد بوو.

لەم ڕووەوە پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك) بەوپەڕی خۆڕاگریو فیداکارییەوە لە سەنگەردا بوونو بەری شاڵاوی دڕندانەی دوژمنیان ئەگرتو بە خوێنی سووریان کەژو بەندەنەکانی کوردستانیان ئەنەخشاند، بەڵگەی یەك ئاواتو ئامانجو خەبات لە پێناوی ڕزگاریدا بەگوێی خەڵکیوجیهاندا پێشان ئەدا.

هەڵوێستی سیاسی هەرئەوە نییە تەنیا دروشمێك لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بنووسرێتەوە، بەڵکو بەکردەوە، بە بەرگری پێشمەرگانە، بە گیان بەخشین، مەسەلەکان یەکلا ئەبێتەوە، بۆ ئەو ڕۆژگارە ناردنی هێزی پشتیوانو بەشداریکردنی (ی.ن.ك) دەورێکی بەرچاوی هەبوو لە دۆستایەتیو

پشتگیری هێزە شۆڕشگێڕەکانی کوردستاندا، هەروەها دابێکی شۆڕشگێڕانەی داهێنا لە سنوور بڕینو بە هانا چوونو یەکخستنی هەڵوێستی ستراتیژی شۆڕشی کوردستان.

لە مانگی ۱۹۸۲/۱۱ دا بوو لە کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتیدا بڕیاری دامەزراندنی مەڵبەندەکان دراوەکو پێکهاتەیەکی نوێی کارکردنو دەسەڵات بەڕێوەبردن لە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی شۆڕشدا کە قۆناغەکە ئەوەی ئەخواست بەرنامەڕێژییەك بۆ پەیڕەوکردنی کارنامەی توندوتۆڵتر کردنی ئەرکو کار ڕاپەڕاندن.

کوردستان کرایە چوار مەڵبەندەوە:

١. مەڵبەندی یەك: لە حاجی مامەند دانراو سنووری کارکردنی: شارباژێڕ، شارەزوور، قەرەداخ، گەرمیان.

٢. مەڵبەندی دوو: لە سەرگەڵوو دانراو سنوورەکەی: دۆڵی جافەتی، سلێمانی، کەرکوك بە دیوی جادەی چەمچەماڵ ـ کەرکوك دا.

٣. مەڵبەندی سێ: لەوەرتێ دانراو سنوورەکەی: بناری قەندیل، باڵەکایەتی، پشدەر.

٤. مەڵبەندی چوار: لە بالیسانو سنوورەکەی: خۆشناوەتی، هەولێرو دەورو بەری.

پێکهاتەی مەڵبەندیش بریتی بوو لەم بەشانەی خوارەوە:

پێشمەرگایەتی، کۆمەڵایەتی، دارایی، ڕاگەیاندن، دادگا ...

لێپرسراوانی ڕێکخراوو لقی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەو شۆڕشگێڕانیش بەشدار بوون تیایدا.

لە سنوری هەر مەڵبەندێکیشدا کۆمەڵێك تیپ هەبوون کە زۆرتر هەر مەڵبەندەی ٦ تیپی بەرئەکەوتو ژمارەی تیپەکانی هێزی پێشمەرگە گەیشتبووە ٣٠ تیپ. ژمارەی پێشمەرگەی هەر تیپێکیش لە سنوورێکەوە بۆ سنوورێکی تر ئەگۆڕا، تیپیوا هەبوو لە ١٠٠ پێشمەرگە کەمتری هەبوو، تیپیوایش هەبوو لە ٣٠٠ پێشمەرگە زیاتری هەبوو، زۆرتر ئەو تیپانەی کەوتبوونە ناوچەی

تەماسەوە لە گەڵ دوژمندا ژمارەیان زۆررتر بوووواتە تاکو بەرەو خوارەوە بێت ژمارەی پێشمەرگە بەرچاو تر بوو تا سەرەوەتر.

لە هەموویشی گرنگتر پێش دامەزراندنی مەڵبەندەکان ئەنجومەنی دێهات دامەزرا کە بە ڕێگەیەکی دیموکراسیانە لە سنوری هەر دێیەکداو لە ناو خەڵکەکەی خۆیدا ئەنجومەن هەڵئەبژێرا بۆ ڕاییکردنی کاروباری خەڵکیوەکو مومارەسەیەکی دیموکراسیانە بۆ کەمکردنەوەی ئەرکی کادیرەکانو پێشمەرگەو کەمتر دەستوەردانە ناو کاروباری جەماوەرییەوە.

لە ڕاستیشدا دامەزراندنی مەڵبەندەکان بەو شێوازە نوێیەواتایەکی تری ئەبەخشی کە بە یاسایی کردنی دەسەلاتو بڕیارەکان بوو، جگە لەوەش جۆرە ڕێگرییەك بوو لە کردەوەی هەندێ کادیرو بەرپرسی نەشارەزا لە کارو باری هاوولاتیان، ئەمەش پەرۆشی یەکێتی دەرئەخست بۆ ڕێکخستنی دەسەلاتو خزمەتکردنی هاوولاتیانو پاراستنی مافەکانیان.

چونکە لە نێوان کادیرو فەرماندەی پێشمەرگەشدا هەمیشە بگرەو بەردە هەبوو لە سەر کاری ئیجرائاتی جەماوەری، هەریەکە خۆی بە دادوەرو بڕیاردەر ئەزانی، بگرە زۆرجاریش لە ڕقی یەکتریدا ئیجرائاتی لابەلا ئەکراو لە سزاداندا جیاوازی دەرئەکەوت لە بەرامبەر گرتنی کەسێکدا..هەرچەندە زۆرجاریش ڕێنوێنی دائەبەزی بەلام هەر تیماری ئەو دەردەی نەئەکرد کە پەیوەندی بە نەخۆشی دەسەلاتداریەوە هەبوو.

لە مانگی ١٩٨٢/١٢ بەبڕیاری سەرکردایەتی گەڕاینەوە ناوچەکانی خۆمان، ڕۆژی ١٩٨٢/١٢/١٦ خەبەرمان پێگەیشت کە پێشمەرگەکانی تیپی ٥١ی گەرمیان داستانی پیازەجاڕیان ئەنجامداوە، مەدرەعەیەك تێکشکێنراوەو بیست پارچە چەكو بیست سەرباز بە دیل گیراوە کە بۆ یەکەم جارە شەڕی بەو شێوەیە بکرێو پێشمەرگەش بێ زیان بێو کۆپتەر نەیەتو دوژمن بە هانای هێزەکەیەوە نەیەت کە لە پەنای ناحیەی تیلەکۆدا بوو هەرچەندە ڕۆژی دواتر ڕژێم چوو بووە شوێنی شەڕەکەو خەڵکی دێیەکەیان کۆ کردبووەوە بۆ ئیجرائات کردن بەلام دواتروازیان لێهێنابوون.

# ساڵی ١٩٨٣

بە دەم ئەو هیلاکیو شەڕانەوە کەوتینە ناو ئاوو هەوای ساڵێکی تازەوە بە هەوبای ئەوەی لە رووی پێشمەرگایەتییەوە گورزی باشتر بوەشێنینو لە رووی سیاسیشەوە گوشاری زۆرتر بخەینە سەر دوژمنەکەمان چونکە لە شەڕێکی سەختی ماڵوێرانکەردا بوو بەرامبەر بە دەوڵەتێك کە گەلەکۆمەی نێو دەوڵەتیشی لە سەر بوو، هەروا بە ئاسانی لە مەیدانی شەڕدا خۆی نەئەدایە دەستەوە. کە بە بڕوای ئێمە ئەمە پەیوەندی نییە بە لایەنی بەرنامە چاکی کۆماری ئیسلامییەوە بەڵکو بەشێکیوەکو تەحەدایەكوابوو بەرامبەر بە هێزی داگیرکەر، خەڵکەکەی ئێران پێیان خۆش نەبوو خاکەکەیان داگیربکرێو چارەنووسیان بکوژێتەوە، بۆیە بەرگرییان ئەکرد ئەگینا مەرج نییە هەموو خەڵکی رژێمەکەیان خۆش بوێت ئەگەر چی بەشێکی زۆریشیان دەروێشی خومەینی بوون یان هەر هیچ نەبێ پێگەیەکی باش لە رووی شیعە گەرێتییەوە دامەزرابوو بە ئاسانی لەق نەئەبوو.

سەرەتای مانگی ١٩٨٣/٢ بوو، هەندێك زانیاریمان چنگ کەوت کە پۆلیسێك بە ناوی جەزای گومرگ پەیوەندی بە پێشمەرگەکانەوە کردووەو بەڵێنی داوە گومرگەکەی سلێمانی بەدەستەوە بدات، یەك دوو شەو لەسەر یەك برادەران چوون بۆیان رێکنەکەوت، جارێکیش خۆم چووم هەر جووت نەئەبوو.. کارەکەیان ئەنجامداو حەفتا کلاشینکۆفو کۆمەڵێ دەمانچە دەستکەوت بوو، ئەم کارە دەنگێکی باشی هەبوو سەرکەوتنێکی چاکیش بوو کە دوژمن هەرگیز بۆئەوە نەئەچوو ئەوەی لێبکرێ.

دوای ئەم چالاکییە رۆژی ١٩٨٣/٢/٦ ژنم هێناو لە دێی خاوێ گواستمەوە، کە ئەکەوێتە بناری سەگرمەو دێیەکی خۆشو خەڵکەکەی زۆرچاك بوون، بەو بۆنەیەوە ماوەی چەند رۆژێکی کەم ئیجازە بووم.

هەرچەندە ژنداری و ماڵداری لە زەمەنی پێشمەرگایەتیدا ئەرکێکی قورس بوو ئەوەی بەرەبەنی لە بواری کاری پێشمەرگانەدا ئەتوانرێ ئەنجامبدرێ لە کاتی ژنداریدا کەمتر دڵگەرمی هەیەو بەڵکو بە کۆمەڵێك کۆتوبەند ئابلۆقە ئەدرێ.. من پەشیمان نەبووم ببمە خاوەن ژن و بچمە ناو ئەو تەلبەندەوە کە بەرنامەیەکی ژیانە، کەچی تامی ژن هێنان لەمواقعە تفتوتاڵەدا جیاوازە لەگەڵ کەسێك لە دەرەوەی ئەمواقیعەی ئێمە بیهێنێ.. ئێمە هە ڕۆژێك لە شوێنێك بووین، هەر ڕۆژەی لە ناو تەپوتۆزی شەڕو هێرش و ئەمسەرو ئەوسەردا بووین بەڵام بۆ ئێمە ئەم کارە تامەزرۆیی تایبەتی هەبوو چونکە ئەرکێکی نیشتیمانی بوو، ژن نەبووە ڕێگر لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانماندا.

لەو پانتایی گەرمیانەداو لە ڕۆژی ١٩٨٣/٣/٨ دا هێزەکانی گەرمیان لە دەشتی سەرقەڵادا داستانێکی تازەیان تۆمارکرد، کاتێ هێزێکی گەورەی ڕژێم پەلاماری دێی سەید جەژنی ئەدەن لە لایەن کورە دلێرەکانی تیپی ٥١ ی گەرمیانەوە هێرشیان کرایە سەرو سەرەڕای نابەرامبەری هێزەکەی دوژمن لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا دوژمن خۆی پێڕانەگیرا، مەیدانی شەڕەکەیان بەجێهێشت زیانێکی زۆریان لێکەوت و بە دەیان کوژراوو بریندارایان هەبوو جگە لە گرتنی تانکێکی بەرازیلی و ٣ جیبی سەربازی و سووتاندنی یەك ئیڤاو گرتنی ١٩ پارچە چەکی جۆراو جۆر. ئەم داستانە گەورەیە بە خوێنی پێشمەرگەی ئازاوەلی گلاڵی نەخشێنرا.

هەر لەو کاتەدا لەگەڵ کاك ئاواتی شێخ جەنابدا جەولەیەکی بە پەلەی ناوچەی جەباریمان کرد، پاش گەڕانەوە بەهۆی هەندێ کێشەوە نەقڵی تیپی ٥٥ی قەرەداخ بووم کە دەوروبەری ١٩٨٣/٣/٢٠ بوو چوومەوە بۆماڵ.

هەر لەو کاتانەدا بوو داوای هێزکرا بۆ سنووری شاربازێر، دیار بوو بەپێی هەندێ زانیاری جموجووڵێکیان بەدەستەوە بوو بۆ ئەنجامدانی چالاکییەك. منیش پێم ناخۆش بوو لە ماڵەوە بمو پێشمەرگە بۆ شەڕ بچن،

چوومه شارباژێر، نامەیەکم بۆ لێپرسراوی مەڵبەندی یەك کاك مەلابەختیار نووسی کە بە خۆمو دەستەکەمەوە ئامادەین‌و بچینە کوێ..؟.

ئەویش ئاراستەی لای کاك مستەفا چاوڕەشی کردین لەبەرەی مامەخەلان، لەوێ هێزەکانی جود لەبەرزاییەکاندا سەنگەریان لێدابوو. بەرەی شیوی مەڕیان دا بەئێمەو بەرەی لای چوارتایش بە کاك مستەفاو کاك عادل‌و کاك نازمی حەمەی سلێمان.. چەند ڕۆژێك بە هاوەن لێیان داین‌و ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٣/٤/١٤ پەلاماریان داین، بەڵام ئەوان ئەوە نەبوون بتوانن بەهاسانی لە سەنگەرەکانمان دەرمان پەڕێنن‌و لە هەقمان بێن. پاش دە ڕۆژ بەپێی نەخشەو بڕیارێك بەیانییەك کاتژمێر ٤ی بەیانی هێرشمان کردە سەریان‌و کەوتینە ناو بۆسەکانیان، شەڕ بەخەستی دەستی پێکرد تاکاتژمێر ٤ی ئێوارە درێژەی کێشا، دوای ئەوە هێرشێکی قورسمان بۆکردن بۆ تەفروتوناکردنیان لەئەنجامدا شکان‌و لەسەنگەرەکانیان دەرچوون، هێزێکمان ناردە ڕێگای کشانەوەکەیان، ئەوەی کوژرا کوژرا، ئەوی تریشی بەدیلگیرا، شەو لەمامەخەلان ماینەوە، بەیانییەکەی هێرشی گشتی کرا بۆ سەر هەموو سەنگەرەکانی تریان، تاچیای تالیەر ڕاونران‌و لەوێشەوە خۆیان کردەوە بەناو ئێرانداو شەڕەکە کۆتایی هات، پاشان گەڕاینەوە ناوچەی قەرەداخ.

شایانی باسە ڕۆژی ١٩٨٣/٤/١ کاك سامان‌و برادەرانی گەرمیان بەسێ ئۆتۆمبیلەوە ئەچنە دێی قەیتولی سەر بە ناحیەی قادرکەرەم بۆ چاوپێکەوتنی مامەڕیشە بەڵام ئەو نەهاتبوو، بەڵکو ئەو ڕۆژە ئەو لەدێی مەسۆیی سەرچەم بوو لە زەماوەندێکی ئەوێدا بەشداری کردبوو.. هەر کە برادەران لەدێی قەیتول دەرئەچن، سێ کۆپتەر ئەگاتە سەریان، بە پەلە خۆیان ئەگەیەننە ناو دێی هەرێنەو دائەمەزرێن، دوای ماوەیەك چەند کۆپتەرێکی تر دێن‌و لەدەوروبەری دێکە هێز دائەبەزێنن، کاتژمێر ٨ی بەیانی ئەبێ لەبەر کەمی پێشمەرگەو کەمی تەقەمەنی سەرەتا دەست ناکەنەوەو خۆیان مات ئەکەن تاکو ئەچنە بەردەستیان، دوژمن دێ هاوەنباران ئەکەن‌وووردەووردە نزیك ئەبنەوە،

کۆپتەرەکانیش ئاگری ڕقیان دائەبێژنە سەر ئەو دوو دڵدارەی توند باوەشیان بەیەکدا کردووە: پێشمەرگەو دێی گەمارۆدراو ... لە سەرو خوارەوە ئاگربارانە، لە ناو ڕەشبەڵەکی ئەم ئاگربارانەدا پێشمەرگەو خەڵکی بەئەمەکی هەرێنە دامەزراونو بەرگری ئەکەن، تیری دەستو دەروونیان ئەهاونە گیانی دوژمنەوە، عەسری ئەو ئێوارە لە شاخی زمنوورەوە سێ پشتگیری دێنە خوارەوە کە ئەزانن لەدێکەدا شەڕەو کۆپتەر دالآن گێژیانە، لوولەی تفەنگەکانیان ئەکەنە کۆپتەرەکان. لەمە دوژمن ترسی هاتنی هێزی پشتیوانی لێئەنیشێو بەپەلە هێزەکەی کۆئەکاتەوەو تانزیکی ئێوارە ئەیگوێزێتەوەو شەڕەکە تەواو ئەبێ. ئەمە دووەم شەڕی ناو دێیە لە سنووری تیپی ٥١ ی گەرمیان دوای شەڕی عەلیان کەتووشی کاك عادلو برادەرانی هاتبوو، بە داخێکی زۆرەوە لەم شەڕەدا گیانی بەرزی کاك ئەیوب تاڵەبانی برای شەهید سیروان ئەگاتە کاروانی سەروەریو دوای تەواو بوونی شەڕەکە تەرمەکەی ئەبەنە گۆڕستانی دێی بانی مۆردو لەوێ ئەنێژرێ.

هەروەکوووتمان جود لەجموجووڵدا بوون، دیارە ئەو کارەیشیان لەلایەن سەرکردایەتی (ی.ن.ك) چاودێری ئەکرا، بۆ ئەوەی ئەو نەخشەیان سەرنەگرێ لە هەموو لایەکەوە هێز بۆ سەرکردایەتی ڕەوانە کرا. ئەو کاتەش هێزەکانی ئێمە لە شاربازێر لە شەڕدا بوو لەگەڵ جوددا.

ئەو هێزانەی گەیشتبوونە سەرکردایەتی بەسەرپەرشتی کاك نەوشیروان بەرەو چیای قەندیل بەڕێ ئەکەون کەبارەگاکانی لایەنەکانی جودی لێبوو.

بەپێی نەخشەیەکی ئامادەکراو ڕۆژی ١٩٨٣/٥/١ هێرشێکی بەربڵاو کرایە سەر هێزەکانی جود لەقەندیل کەبریتی بوون لە هێزەکانی پارتیو حسكو حشع، لەماوەی ١١ کاتژمێردا هێزەکانیان لە شوێنە سەرەکییەکانیان تەفروتوونا کرانو دەست بەسەر بارەگاکانیانو کەرەسەو کەلو پەلەکانیان گیراو ئەو ناوەیان

لێ پاككرایەوە كە كردبوویانە هێلانەی پیلانگێڕی بەرامبەر بەهێزەكانی یەكێتیووەكو كۆسپێكوابوون لە بەردەم گەشەكردنی هێزی پێشمەرگەدا.

پاش چەند ڕۆژێك حەسانەوەی هێزەكانی یەكێتیو ئەنجامدانی ئەركەكانیان ئینجا كەوتنەڕێ بەرەو سنووری مەڵبەندی سێو مەڵبەندی چوار كە هەندێك لە هێزەكانی جود لەو ناوچانەدا خۆیان مۆڵدابوو.

ئەو ناوچەیەش لە ماوەیەكی كەمداو لەچەند شەڕێكی پچڕپچڕدا پاكسازی كراو جود بە تەواوی دەرپەڕێنرانو ناوچەكەیان چۆڵ كرد.ئێمە كە گەیشتینە قەرەداخو لەبەر ڕۆشنایی ئەو شەڕانەی قەندیلدا لای ئێمەشەوە جموجوولی شەڕ لەگەڵ حشع كە لایەنێكی جود بوو هاتە ئاراوە، لەمەشیاندا حشع دەستپێشكەر بوو، ئەوان لە دێی شەممەی بناری شارەزوور یەك پێشمەرگەو لە دێی كانی هەجیریش دوو پێشمەرگەیان چەككردبوو، شەڕێكیشیان لەگەڵ برادەرانی تیپی ٥١ی گەرمیاندا لە دێی مەسۆیی قەرەداخ بەرپا كرد كەبەزیانی خۆیان شكایەوەو دوو چەكداریان كوژران.

دوای ئەوەی كەنیازەكانی حشعمان بۆ ڕوون بووەوە كە ئەیانەوێ لێرە فەرتەنەیەك بەرپا بكەن بۆ جەنجالكردنی هێزەكانی یەكێتیو سەرگرتنی نەخشەكەی خۆیان، بۆیە ئێمەش لەدێی مەسۆیی خۆمان كۆكردەوە بەپێی نەخشەیەكی داڕێژراو بۆ پەلامارێكی ڕێكوپێك بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

١. هێزێك بە فەرماندەیی شینە لەسەر چیای پشتی بانیمۆرد بۆ سەر بارەگاكانیان لەناو قۆپیو دەربەندی تەكیەدا.

٢. سەردار ناوتاقیو هێزێك لە دێی حەمەی هەواسەوە بۆ دەربەند تەكیە.

٣. نەجم بۆیسانەو هێزێك لەبەردەم تەكیەوە بەرەو ناو دێی تەكیەو دەربەندەكەو ئینجا پەلاماردان بەرەو بارەگاكانیان.

بەلام لەلایەن لێپرسراوی مەڵبەندەوە مامۆستا ئەنوەری لێپرسراوی ڕێكخراوی كۆمەڵە نێردرا بۆ ئەوەی ئەو هێرشە دوابخرێو نەكرێ. هەرچەندە ئێمە هێرشەكەمان نەكرد،وادیاربوو حشع لە نەخشەكەمان ئاگاداربوون، شوێنەكانی خۆیانیان چۆڵ كردبووو چووبوونە چیای ناوتاقو

دەورو پشتی دێوانەو باوەخۆشێن، حشع فێڵێکیان لە کاک مەلا بەختیار کرد گوایە ئەوانوەکو لقی سلێمانیو کەرکوك باوەڕیان بە شەڕ نییەو داوای دانیشتنێکیان کرد، کاک مەلا بەختیاریش بەمە ڕازی بوو، هەردوو پێکەوە دانیشتنیان کرد،وەفدی مەڵبەندی یەکی یەکێتی بریتی بوو لە: کاک حەمەی فەرەجو مامۆستا ئەنوەرو مەلا برایم.وەفدی حشعیش بریتی بوو لە: کاک بەهائەدین نوریو کاک عەبەی مەلا فەرەجو چەند کەسی تر.

دوای گفتوگۆ لە نێوان هەردوو لادا ڕێککەوتنێك مۆرکرا. هێشتا مرەکەبی ئیمزاکانی ڕێککەوتنەکەووشك نەبووەوە حشع پەلاماری دێی دووکانیان داو مام دەروێشیان گرت، پاش ماوەیەك بەریاندا. کە بەمەمان زانی خۆمان کۆکردەوەو پەلامارماندان، تەقەقە بەرپابوو، یەکێکیان لێکوژرا، بۆ شەوی دووەم خۆیان پێ ڕانەگیراو ناوچەکەیان بە تەواوی چۆلکرد.

لای هەمووان ئاشکرایە جود بەهەموو باڵەکانیەوە لە دژی یەکێتی نیشتمانی کوردستان درووست بوو نەك وەکو پێویستییەکی قۆناغەکەو بۆ پرکردنەوەی بۆشاییەکی سەربازی - سیاسی، هەموو لەوە ئەگەڕان بە ڕاگەیاندنیش لە ناوەوەو دەرەوە دەسەڵاتی (ی.ن.ك) لەناو بەرنو بگرە دەیان شتی ناڕەوایان ئەدایە پاڵی، بۆ ئەم مەبەستەش نەخشەی پەلامارێکی کوتوپڕی بەربڵاویان بۆسەر مەڵبەندی سێو سەرکردایەتیو پاشانیش مەڵبەندەکانی تر داڕشتبوو، بەڵام ئەو نەخشەو خەونەیان ئاشکرابوو، بە زیانی خۆیان تەواو بوو.وەنەبێ ئەم کارەی یەکێتی هەروا لە خۆیەوە هاتبێتو ئارەزوویەکی عەسکەرتاریانە بێت بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی ناوچەکانی دەسەڵاتو دەرپەڕاندنی لایەنەکای جود کە چەندین جاری تر هەوڵی داوە لەگەڵیاندا بەپێکەوە ژیانی ئاشتییانە لە کۆڕی خەباتداو لەسەنگەری دژایەتی دوژمنی سەرەکیدابن دوور لە پێکادانی ناوخۆو نەپسانی تاڵەدەزووی پەیوەندییەکان کە لە قازانجی دوژمندا بوو. دیارە ئەوەی چاڵ بۆ بەرامبەرەکەی هەڵبکەنێ خۆی تێئەکەوێ، ئەمە لە ناوەڕۆکدا کاردانەوەی ئەو هەڵوێستو بەرنامە

پیلانگێرییەی جود بوو کەزۆر بەنهێنی کاری بۆ نابووتکردنی یەکێتیو دوورخستنەوەی لەمەیدانی خەباتدا ئەکرد.ئەوان یان بێئاگابوون یان خۆیان گێل ئەکرد لەوەی کە یەکێتی بەئاسانی ناشکێو لای خۆشیانەوە ناتوانن بیری پاوان خوازیان جێبکەنەوە کەلەبنەڕەتدا بۆ لەباربردنی هەلومەرجی نوێی شۆڕشی نوێ بوو، چونکە ئەوان مەبەستیان نەبوو کوانووی خەبات بە هیمەتی رۆڵەکانی گەل گەرموگوڕو ئاوەدان بێت، بەڵکو بۆ ئەوە هاتبوونە ناوەوەو خزێنرابوونە ناوەندەکەوە تا رێگربن لە بووژانەوەی هەستی شۆڕشگێڕیو کۆسپ بن لەبەردەم کارنامەی بەرگری لە مانەوەی کورد دوای ئاشبەتاڵێکی ئابڕوو بەرانە. ئەگەرچی لە دوا ئەنجامدا ئەم شەڕە کارەساتێك بوو یەکێتی لای خۆیەوە پێی خۆش نەبوو هەنگاوی بۆ بنێ، بەڵام کە ئەوان تانوپۆی ئەو کارەساتانە بچنن‌و لە بەرزییەوە گیانی کورد بۆ جارێکی تر فڕێ بدەنەوە دۆزەخی نائومێدی، بۆیە جگە لە هەوڵی تێکدانی ئەو تێکدانە رێگایەکی تر نەبوو.

پاش ئارام بوونەوەی دۆخەکە هێزەکان هەریەکە بەرەو شوێنی خۆیان گەڕانەوە. ئەوەی لەم ڕووەوە سەرنج ڕائەکێشێ بەعس‌وەکو چاودێرێك تەماشای ئەم‌وەزعەی ئەکردو لەو کاتانەدا هیچ جۆرە هێرش‌و پەلامارێکی نەبوو بۆ سەر هێزی پێشمەرگە، لە لایەکی تریشەوە بۆی ڕوون بووەوە کەدەسەڵاتی (ی.ن.ك) سەرچاوەیەکی لەبن نەهاتووەو پشتیوانی گەلی کوردی لەگەڵدایە.

شەوی ٢٨ ـ ٢٩ /١٩٨٣/٦ دەستەیەك پێشمەرگەی قارەمانی سنووری شارباژێڕ بۆ ئەنجامدانی کاری پێشمەرگانە چووبوونە ناو شاری سلێمانی‌و لە گەڕانەوەیاندا بە سواری تراکتەرەوە لە دەرەوەی دێی قرگە، بێئاگا لەوەی دوژمن پێی زانیون، ئەکەونە ناو بۆسەی دوژمنەوە، گڕی ئاگری ئارپیجی‌و تفەنگەکان ئەو شەوەزەنگە ئەکەنە ڕۆژی ڕووناك. دیسانەوە لە زەماوەندی خۆ بەختکردندا پۆلێك پێشمەرگە گیانیان بەخشی کە ١٧ پێشمەرگەی دڵسۆزی

خاك‌و گەل لە ئاسمانی شۆڕشدا ئەبنە چراخانێك. ئەمانە بە شەهیدانی قڕگە ئەناسرێن، شاعیران‌و نووسەران بە سۆزی شیعراوییان بە بالآیانا هەڵئەدەن‌و چەندین پارچە شیعری جوانیان بۆووتراوەتەوە.

دوای ئەوەی هێزەکانی (ی.ن.ك) لە مەڵبەندی سێ‌و چوار ئەگەڕێنەوە سنوورەکانی خۆیان، جود ئەم هەلە ئەقۆزنەوەو جارێکی تر لەو دیو سنوورەوە خۆیان کۆئەکەنەوەو سەرەتاتکێ ئەکەن بۆ پەلاماردانی شوێنە کۆنەکانیان کە لەژێر دەسەلآتی هێزەکانماندا بوون.

ناوەڕاستی مانگی ١٩٨٣/٨ هێزەکانی (ی.ن.ك) جارێکی تر خۆیان سازدایەوە بۆ ڕاونانیان، ئەمجارەش شەڕێکی توندوتیژ کراو داستانی سەرکەوتن تۆمارکراو دیسانەوە بەسەروگوێلاکی شکاوییەوە لە چیای قەندیل هەڵکەنرانەوە ئاودیوی سنوور کرانەوە، یەکێك لە فەرماندەکانی هێزەکانی جود بەناوی حەسۆ میرخان لەسەر شاخی کونەکۆتر کوژرا، لای یەکێتیشەوە فەرماندەی قارەمان کاك نازمی حەمەی سلێمان لەم پێکادانانەدا گیانی بەخشی‌و گەیشتە کاروانی پرسەروەری گەلەکەمان. دوای ئەمە هێزەکان گەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان. جێی‌وەبیر هێنانەوەیە هەر لەگەڵ ئەوەی جاری یەکەم جود لە ناوچەکانی مەڵبەندی سێ‌و چوار دەرکران بەشێك لەسەرکردایەتی یەکێتی چوونە ئەو ناوە، بارەگاکانی دۆڵی نۆکان‌و زەڵێ‌و تۆژەڵەو ناوزەنگ گوێزرانەوە بۆ باوزێ، هەرکە بارەگاکان لەوێ جێگیر بوون، دوژمن پەلاماری ئەو ناوەی داو شەڕی سەخت بەرپابوو، زیانی زۆر لەدوژمن کەوت، پاشان بارەگاکان لەو ناوە بەسەرپەرشتی مامۆستا جەمال تاهیر گوێزرانەوە بێ ئەوەی دوژمن‌وەدەستیان بخات بۆ دێهاتەکانی خەتێ‌و بالیسان لە بەری خۆشناوەتی.

دوای ئەوە بیرلەوە کرایەوە کە لە ناوچەی خۆشناوەتی یەکێتی جێ پێی خۆی بکاتەوەو زیاتر ڕۆڵی خۆی ببینێ لەم کاتانەشدا دوژمن‌ویستی یەکێتی لەم سنوورەشدا ئاسوودە نەبێ‌و بارەگاکانی بکەوێتە ژێر ئاگری لوولەی چەکە قورسەکانییەوە، بۆیە ڕۆژی ١٠/١٣ دوژمن بە هێزێکی زۆری سوپاو جاش بە

پاڵپشتی تانكو فڕۆكەی سەربازییەوە پەلاماری دۆڵی بالیسانی دا كە بارەگای هێزەكانی یەكێتی لێبوو. هێرشەكە بە جۆرێك فراوان بوو هێزەكەی دوژمن توانی پێشڕەوی بكاتو بگەیەتە مێرگەسەرو بەمەش بارەگاكانی یەكێتی كەوتبوونە بەر ڕەحمەتی تۆپخانەی سوپای دوژمنەوە، سەرەڕای ئەوە هەندێ لووتكەی بەرزی وەكو نووسەكو كلاوی دێوانەو سەری ماكۆك گیرانو كۆمەڵێك دێهاتی ئەوێ بە ئاسانی كۆنترۆڵكران.

بۆیە بە پێویست زانرا چارەیەكی ئەو كارە بكرێ، بۆ ئەم مەبەستە لێكۆڵینەوەی چڕو پڕ لە بارەی هێزەكانی دوژمنەوە لە ناوچەكەدا كراو نەخشەی پێویست بۆ گرتنی بێتواتەو لووتكە بەرزاییەكان داڕێژرا. ئینجا بۆ جێبەجێكردنی ئەو بەرنامەیە هێزی هەموو مەڵبەندەكان بانگكرا بۆ خۆشناوەتی.

ڕۆژی ١٩٨٣/١٠/٢٣ هێزێكی گەورەی (ی.ن.ك) بەسەرپەرشتی هەڤاڵ مام جەلال پەلاماری چیای ماكۆكو شارەدێی بێتواتە درا، لە ماوەی یەك ڕۆژدا هەموو شوێن مەبەستەكان گیران، دەستكەوتی زۆر هەبوو كە خۆی ئەدا لە ٢٠٠٠ پارچە چەكی جۆراوجۆرو سەدان هەزار فیشەكو گوللە ئارپیجیو گوللە هاوەن.

لە گرتنی ڕەبایەی سەر چیای ماكۆكدا پێشمەرگەی چاونەترسی گەرمیان جەلال بێكەس شەهید ئەبێ، كە ئەمجارەیان وا سەركەوتبوو بۆ بەشداریكردن لەم چالاكییەدا دوای گەڕانەوە برادەران داوای ژنی بۆ بكەن كە دڵی بە كچێكەوە بوو، دڵدارییەكی بێگەردیان ئەكردو زۆریش یەكتریان خۆش ئەویست، بە داخەوە ئاواتەكەی نەهاتە دیو بردیە ژێر گڵەوە.

بۆ یەكەم جارە چالاكیوا ئەنجام بدرێو شوێنێكی گرنگی دوژمن بكەوێتە ژێر چنگی شۆڕشو هێزی پێشمەرگە دوای ئەو سەركەوتنانەی لەشەڕەكانی جود داوەدەستهێنرا بوو. دوژمن بەم زنجیرە چالاكییانە زۆر شڵەژا. یەكێتی نفوزی باشی لە ڕووی عەسكەرییەوە پەیداكرد، لەدوای شەڕی بێتواتە حكومەتی عێراق وەفدێكی ناردە سەركردایەتی بۆ گفتوگۆ كردن. كە ئەمە یەكەم جاری نییە، بەڵكو هەر لە سەرەتای دەستپێكردنی شۆڕشەوە چەندین

جاریتر هەوڵیداوە بۆ گفتوگۆ، خەڵکی خۆی ناردووە، بەڵام ئەنجامەکەی هیچ بووە، بەڕاستیش ئێمەوەکو پێویست شارەزایی تەواومان لە هونەری گفتوگۆدا نەبووە، هەر بەدرێژایی مێژوو گۆڵدراوین، فێڵیان لێکردووین، ئەوان سازشیان کردووە، ئێمەش نەمان توانیوە بەباشی لەو بوارە بپەڕینەوە، لەبەر سادەیی خۆمانو بچووکی داواکانمان زۆر بەئاسانی کەوتووینەتە ژێر کارتێکردنی بریقەداری دوژمنەوە، ئەمجارەیان حکومەت لەهەموو کات زیاتر هاتبووە پێشەوە، تەمای باشتری پێشان داوە، دیارە ئەمەش هۆی خۆی هەبوو چ لەڕووی سیاسیو چ لەڕووی سەربازییەوە کە لەلایەکەوە ئێران تەنگی پێهەڵچنی بوو لەبەرەکانی شەڕداو لەناو خاکەکەیدا دەرپەڕاندبووە سەر سنوور، لە لایەکی تریشەوە زەبری شۆڕش کاری خۆی ئەکردە سەر پێگەی دوژمنو نەیئەپەرژایە سەر دووبەرەی شەڕ. لەلایەکی تریشەوە دۆخەکە لەباربوو (ی.ن.ك) لەم هەلەدا هەوڵێك بدا بۆوەدەستخستنی ڕێگا چارەیەك بۆ مەسەلە ڕەواکەی گەلەکەمان لە ڕێگەی گفتوگۆوە کە لە ڕاستیدا شێوەیەکە لە شێوەکانی خەباتو ئەبێ ئەوپەڕی سوودی لێوەربگیرێ جگە لەمە سەردەمەکە زۆر ئاڵۆزاوییەو بە شەڕ هەموو شتێك نابڕێتەوە، خۆ ئەگەر مەبەستی حکومەتی عێراقیش سازشکردنو پشوودانی هێزەکەی بێت ئەوا لەم لاشەوە کورد ئەتوانێت خۆی باشتر قایم بکاتو هێزەکانی مشتومالْ بکاتو پێگەی بەهێزتر بکاتو لە کونو کەلەبەرەکانی دوژمن چاکتر شارەزا بێت.

بۆ ئەم کارە هەڤاڵ مام جەلال لە ناوەڕاستی مانگی١١/١٩٨٣ دا کۆمەڵێك زۆر کادیری یەکێتی کۆکردەوەو باسێکی تێرو تەسەلی لە سەرەنجامەکانی شەڕی بێتواتەو دەستکەوتەکانو هەنگاوەکانی ڕژێمو داوای گفتوگۆکردن لەگەڵ یەکێتیدا پێشکەش کرد، بە داخەوە کادیرانی گەرمیان لەم کۆبوونەوەیەدا ئامادە نەبوون، کەسیان بانگ نەکرابوون، بە تێکڕا هەموو کادیرەکان ڕایان لەگەڵ گفتوگۆدا بوو تەنیا دوو کادیر نەبێ دژوەستابوون ئەوانیش: م. سەیفەدینی هەولێریو پۆلای کەرکوکی بوون. ئینجا بۆ ڕاوەرگرتنی هەڤاڵانی خوارەوە لەسەر مەسەلەی گفتوگۆ نوێنەری سەرکردایەتی کە بریتی بوون لە

هـەڤاڵان: ئـازاد هـەورامی‌و قـادری حـاجی عـەلی‌و م. محسـن هاتنـە ناوچـەی قەرەداخ، لە کۆبوونەوەیەکی گەورەدا باسی شۆڕش‌و گفتوگۆو ڕوخانی ڕژێم‌و چارەنووسی کورد کـرا. هەنـدێ کـادیری قسە زل‌وا بـۆ مەسـەلەکە ئەچوون کـە ئێمە خاوەنی هێزێکی زۆر زەبەلاحین‌و بەفیکە ئـەتوانین ڕژێم لەناوبـەرین، دیـارە لـە هـەموو هەلومەرجێکدا خـەڵکانی تونـدڕەوی تەنگەتیلـەو خۆبـەزلزان پەیدا ئەبن‌و تەنیا لـەڕووی تیۆرییـەوە ئەڕواننـە دەردوەی شـتەکان‌و لەواقیعدا خۆیان هیچیان پێناکرێ‌و ناوەڕۆکیان پووچـەو زیـاتر شوێن دروشمی منالانـەو جوینەوەی هەندێ‌وشەو ڕستەی پەککەوتـەی پیرە سیاسییەکان ئەکـەون‌و لـە مەیـدانی کـردەوەدا نـاتوانن گورزێـك بوەشـێنن.لەمیانـەی ئەوانـەی کـە دژی گفتوگۆ بوون مامە عەلە ڕەش یەکێکیان بوو کە بەم جۆرە ڕای خـۆی دەربـڕی : من بڕوام بە گفتوگۆ نی یە ، ئێوە بینیوتانە یان بیستووتانە هەنگوین لە قنگی کـەر بێتـە دەرەوە ..؟ هـەموو برادەران‌ووتیـان : نـەخێر .. مامـە عەلـەووتی : سەدام قنگی کـەرە ، هـەنگوینی لێ نایەتـە دەرەوە ..واتـە گفتوگـۆکردن لـە گـەڵ سەدامدا هیچ قازانجێکی کوردی تیانی یە..لەم کەینو بەینەدا من لـە قوژبنێکدا دانیشتبووم، نە کادیری سیاسی بووم، نـە سـەرم لـە کـاری سیاسـەت دەرئەچوو، بـەڵکو زۆرتـر بـەو قسانە هەڵئەچووم‌و لەبـەر خۆمـەوە قـەڵس ئـەبووم، ئـەو برادەرانە ئەوەندە قسەی سـەیرو موناقەشـەی پـڕ لـە عاجباتیـان ئـەکردو دژی گفتوگـۆ بوون‌وەکـو هـەموو هـەرزەکارێکی بـێ ئـاوەزوەکو فیشـەکە شـێتە دەرئەپەڕین، ناچار داوام لە سەرپەرشتی کۆبوونەوەکـە کـرد ڕای خـۆم دەربـڕم: بە ڕاستی ئەم برادەرانە باسی شۆڕش‌و سەرکردایەتی ئەکەن‌وا ئـەزانن لـە ڕووی عەسـکەرییەوە خـاوەنی پەیمانی‌وارشـۆین، ئـەوەی هەمانـە تـەنیا ئـەم هێزەیـە کەلەوە زیاتری پێناکرێت‌و لەهەموو کاتێکدا خـاوەنی نـین، چونکە زۆربـەی لـە ئەنجامی شەڕی عێراق ـ ئێران دا کۆبووەتـەوەو کەشـەڕ ڕاوەسـتا نیـوەی زیـاتری ئەڕواتـەوە، ئەمانـەی ئێسـتا باسـی ڕووخـانی ڕژێـم‌و دژی گفتوگـۆن کەسـیان نامێننـەوە، ڕەنگـە هـەر مامـە عەلـەڕەش بمێنێتـەوە، ئێمـە سـاڵی ١٩٧٨ حـەفتا

پارچە سەلیبیمان هەبوو، چلیان لە ژێر خاكدا شارا بووەوەو كەس نەبوو بیكاتە شانی، چونكە قۆناغەكە زۆر سەخت بوو، بۆیە زۆرم پێباشە گفتوگۆ بكرێ، نەختێوەزعی شۆڕشو خەڵك چاك بكرێ، هەوڵ بدرێ بوونی كورد بپارێزرێ كە گفتوگۆ خۆی داننانە بەمافی كورددا لەلایەن ڕژێمەوە ئەگەر مراوەغەش بكات.

كەچی كۆمەڵێك دەمیان لێكردمەوەووشەی كوردیو عەرەبییان تێكەڵ ئەكردو زاراوەی چاوزاقیان لێئەهاتە دەرەوە. كەچی بە پێچەوانەیویستی ئەوان گفتوگۆ ڕەوتی خۆیوەرگرتو لە كۆتایی مانگی ١٩٨٣/١٢ دا سەركردایەتی (ی.ن.ك)و حكومەتی عێراق بڕیاری تەقەوەستاندنیان دا.

وەفدی (ی.ن.ك) سەردانی بەغدایان كرد، بەڕووكەشو لە یەكەم هەڵوێستدا حكومەت نەرمی نواندو لیژنەی تەنسیق لەشارەكاندا دانرا، پێشمەرگە بۆ سەردانی كەسو كاریان دابەزینە ناو شارەكانەوە.

لە ڕاستیشدا ئەمجارە بیرۆكەی گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێمدا ئەگەڕێتەوە بۆ دوای ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٢ كاتێك كە ڕژێم تووشی شكستی كەمەر شكێن بوو بوو لە شەڕەكانیدا لەگەڵ ئێرانداو گەیشتبووە بارێكی لاوازیو بێ توانایی. بۆ ئەمەش لە هەندێ كەناڵەوە د.قاسملو ڕاسپێردرا بوو ئەم ئەركە بگرێتە ئەستۆو لەگەڵ لایەنەكانی كورداوەكو یەكێتیو پارتیو حشع قسە بكات تاكو لە سەر مێزی گفتوگۆی ڕژێم دابنیشن. دوای تاوتوێ كردنێكی زۆر سەركردایەتی یەكێتی قایل بوو گفتوگۆ ئەنجام بدرێو چەند مەرجێك دانرا بۆ دەستپێكردنو هەندێ هاتووچۆ لەلایەن نوێنەرانی ڕژێمەوە بۆ لای سەركردایەتی یەكێتی كراو دواتریش نوێنەرەكانی یەكێتی سەردانی بەغدایان كرد. جاریوا هەبوو قسەی توندی خوێناوی كراوە لەوەش ئەچێ مەبەستیان تاقیكردنەوەیوورەی سەركردەكانیوەفدی گفتوگۆ بووبێ، كار گەیشتە ئەوەی لە مانگی ١٩٨٣/١٢وەفدێكی ڕژێمی عێراقی سەردانی هەڤاڵ مام جەلالو (م.س) بكەن بە ئامادەبوونی د.قاسملو، بە مەش ڕێگا خۆشكرا بۆ بە ڕەسمی

چوونی وەفدی یەکێتی بە سەرۆکایەتی هەڤاڵ مام جەلال و ئەندامێتی هەڤالان: فەرەیدون، ملازم عومەر، مەلا بەختیار، د.خدر، حاکم عومەر بۆ بەغدا کە لەوێ دیداریان لەگەڵ نوێنەرانی عێراقدا کرد بە سەرۆکایەتی: تاریق عەزیزو وەزیری دەرەوەو گەورە بەرپرسانی دەزگاکانی ئەمن و موخابەرات و سوپا.

دوای مشتومڕێکی زۆر گەرم لە سەر مەسەلەکان کە لە هەندێ بارداوەکو باس ئەکرێ لە بەرەکانی شەڕ ئەچوو، لە گێمی یەکەمداوەفدی کورد توانی چاوی بە دیکتاتۆری عێراق بکەوێ و نەرم و نیانییەکی زۆری نواندبوو قایل بوو بەو قسانەی لە کۆبوونەوەکاندا کرابوو، تەنانەت داوای لە هەڤاڵ مام جەلال کردبوو کە لە ڕێگەی ئیزگەو تەلەفزیۆنەوە بڵاوی بکاتەوە. ئیتر وەفدی یەکێتی گەڕایەوە بۆ زیاتر ڕاوێژ کردن. لەو ماوەیەشدا لیژنەی تەنسیق دەستی کردبووە کارەکانی خۆی.

هەر لەم ساڵەدا بوو کە هێزەکانی لایەنە جیاجیاکانی کوردستانی ئێران ڕوو بە ڕووی شەڕی سەخت بوونەوەو لە ناوچەکانی خۆیان هەڵئەکەنران و زۆر تر بەرەو سنوری عێراق - ئێران ئەهاتن.

ئەم شکستە قازانجێکی باشی بۆ ئێران هەبوو کە لە گۆڕەپانی کاری ناوەوە ئەو هێزانەی دەرئەپەڕاندو ڕووبەری چالاکییان بچووک ئەبووەوە، لە لایەکی ترەوە ئەمە بە قازانجی عێراق تەواو ئەبوو کە ئەو هێزانە ناچار بوون ڕوو بکەنە لای ئەوو یارمەتی لێوەربگرن کە لە ڕوویەکی تریشەوە زیانی بۆ ئێران هەبوو چونکە لە پاڵ هێرش و پەلامارەکانی سوپای عێراقدا هێزەکانی کوردستانی ئێرانیش گوشاریان ئەخستە سەر ئێران.

شکانی هێزەکانی کوردستانی ئێران بۆ چەند هۆکارێك ئەگەڕێنەوە:

- باش خۆ ڕێك نەخستن لە ڕووی سەربازی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە.
- کەمی شارەزایی لە بواری زانست و هونەری شەڕو ڕوو بە ڕوو بوونەوەی دوژمندا.
- ناکۆکی ناوخۆی حیزب و لایەنەکان کە بە زیانی کوردو قازانجی ئێران تەواو ئەبوو.

# ساڵی ١٩٨٤

سەرەتای ساڵێکی بێ ئاژاوەو هەروگیفی شەڕو پێکادانی نێوان هێزی ئێمەو دوژمن دەستی پێکرد، خەڵکی لە ئاسودەییدا بوون، پێشمەرگە ئەچوونە شارەکانەوە، هەرچەندە چارەنووسی ئەم هەلومەرجە بە گومانەوە تێی ئەڕوانرا چونکە زۆر دڵنیا نەبوون لە هەڵوێستەکانی بەعسو فڕوفێڵەکانی دەزگا تۆقێنەرەکانی لەگەڵ ئەوەشدا گێمی دووەمی گفتوگۆ لە مانگی ١٩٨٤/١دا دەستی پێکردەوە ئەمجارەوەفدی یەکێتی بە سەرۆکایەتی د.فوئادو ئەندامێتی کاک نەوشیروانو هەڤالانی تریوەفدی پێشوو بوو.

سەرەڕای گفتوگۆ لە سەر مادەکانی بەرنامەی پێشوو هەندێ هەنگاو نرا بۆ بەردانی زیندانە سیاسیو پێشمەرگە دیلەکان.گفتوگۆ هەندێ سستی تێکەوت کەچی لە مانگی ١٩٨٤/٣ دا جارێکی تر هەڤاڵ مام جەلال بۆ گێمی سێیەمی گفتوگۆ سەردانی بەغدای کردەوە بۆ بەگوڕتر کردنی گفتوگۆ.

دوای گەڕانەوەی لە ڕۆژی نەورۆزدا لە ئاهەنگێکی مێژووییدا لە سووورداش خەڵکێکی یەکجار زۆر کە خۆی لە ٥٠٠ هەزار کەس ئەدا بەشداری کردوووتارێکی گرنگی خوێندەوە. نەك هەر باسی گفتوگۆی لەگەڵ ڕژێمدا کرد بەڵکو داوای ئاشتبوونەوەی گشتیشی کرد لەگەڵ هەموو لایەنەکانی تری شۆڕشدا کە هەڵوێستی دژیان هەبوو لە بەرامبەر ئەم گفتوگۆیەو قسەشیان لە گەڵدا کراوە لە لایەن ڕژێمەوە.

ماوەیەکی زۆر خەڵکیو ئێمەش هەر خجڵی لێکدانەوەی ئەوووتارەی هەڤاڵ مام جەلالو دەسپێشکەرییەکانی بووین کە ئەو پەڕی ئازایەتیو لە خۆبردووییوووردبینی تیا بەدی ئەکرا.

وەنەبێ گفتوگۆ بەلای هەموو کادیرەکانی یەکێتییەوەوەکو یەك کارێکی باش بووبێ، هەندێکیان بڕوایان بە گفتوگۆی ڕژێم نەبوو، هەندێکیشیان بارودۆخی شۆڕشیان بە ئاڵۆزی ئەبینی، بۆیە هەر لایەکیان بیانووی خۆی

هەبوو بۆ قایلکردنو ڕەفز کردنی گفتوگۆ هەربۆیەشە هەندێکیان دژیوەستان بەڵام نووزەیان کەم بوو، خۆ ئەوە هێزەکانی تری کوردستانیو عێراقی بە تایبەتی (جود )و( جوقد ) دژی ئەم هەنگاوەی یەکێتیوەستان بە تایبەتی ١٤ حیزبو لایەن لە بەیانێکدا ڕۆژی ١٩٨٤/٣/١٠ دژی گفتوگۆ بوونو یەکێتییان کردە پشتیوانێکی بە هێزی ڕژێم دژی جوڵانەوەی نیشتمانی.

لە هەمان کاتدا ئێرانیش دژی گفتوگۆ بوووای دائەنا کە یەکێتی هاوکاری ڕژێمی عێراقی ئەکات لە شەڕەکەیدا. ئەگەر چی ئەو حیزبانە خۆیان چەندین جارو بە دزییەوە لەگەڵ ڕژێمدا گفتوگۆی نهێنییان کردووەو کەسیش نەیووتووە بەری چاویان کلی پێوەیە. بەڵاموەکو گەلە کۆمەیەك دژی یەکێتی بوون.

هەر لەقەرەداخ مامەوە تا مانگی ١٩٨٤/٦، کاك نەوشیروان هاتە تیپی ٥٥ی قەرەداخو کۆبوونەوەیەکی پێکردینو منی نەقڵکردو لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆ تیپی ١٥ی هەورامانو کاك مەحمودی حاجی فەرەجی لە سەرتیپی لادا، ماوەی پێنج مانگ مامەوە، لەو ماوەیەدا چەندین شەڕو پێکادانمان لەگەڵ جودا کرد کە دوا شەڕیان لە ئەحمەدئاوا بوو کە هاوینە هەوارێکی دلگیرو سازگارو سەیرانگایەکی دڵرفێنی سەرووی خورماڵەو لەو شەڕەدا منو کاك جەلال کولکنیو سێ پێشمەرگەی تر بریندار بووین.

جارێکیان داوێکمان بۆ ڕەشەی ساڵەحەی سەرۆك جاشی هەڵەبجە دانایەوە کەچی لەجیاتی ئەو حسین عیسەوی لێپرساوی مونەزەمەی هەڵەبجەی تێکەوتو کوژرا. لەسەر ئەم کارە بۆ لێپرسینەوە بانگکرام لەلایەن سەرکردایەتییەوە.

لەم ماوەیەدا کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان خۆی ئامادەکردبوو بۆ بەستنی کۆنفرانسی سێیەم، ئەوەبوو لە ڕۆژی ١٩٨٤/٧/٢ لە کانی سێوی دۆڵی مێرگەپان کە شوێنێکی فێنكو دلگیرە بە ئامادەبوونی نوێنەرەکانی کۆمەڵە کە لە هەموو شوێنێکەوە هاتبوونو هەڤاڵ مام جەلالو د.قاسملویش بانگهێشت کرابوون، کۆنفرانسی سێیەم سازکرا.

لەم کۆنفرانسەدا زۆر گیرو گرفت لە بەردەمدا بوووەکو مەسەلەی گفتوگۆ، مەسەلە نێو خۆییەکانی کۆمەڵەکە کەڵەکەبووی ناکۆکییەکانی رابوردووە کە لە هەمووی گرنگتر بوو چونکە دەمێك بوو هەوڵێك لە ناوا بوو بۆ تێکدانی رەوتی کۆمەڵەو دوو بۆ چوون هاتبووە ناوانەوەو هەریەکە چەقۆی لەوی تر تیژ ئەکردو لایەنگری بۆ خۆی پەیدا ئەکرد.واتە زەمینە لەبار بوو بۆ جیابوونەوە بەڵام هێشتا لێرەشدا رانەگەیەنرا.

لە ئەنجامی ئەو دەمەتەقێیانەدا بوو کاك نەوشیروان تیشکی خستبووە سەر کەمو کورییەکانی مارکسیزم‌وووتبووی: مارکسیزم گەرو گول بووە.

ئەم قسەیە بۆ ئەو کاتە زوو بوو جگە لەوەی هەڵایەکیشی نایەوە بە تایبەتی لە لایەن ئەوانەی کە هەر بەلایەنە بریقەدارەکانی مارکسیزمەوە خەریکبوون‌و خۆیان نە ئەدا لە گەوهەری گرفتە پڕ مەترسییەکانی پراکتیك‌و نەگونجانی لە گەڵ تیۆریدا.لەئەنجامی قسەکانی کاك نەوشیرواندا مەلا بەختیارو ٢٧ ئەندامی کۆنفرانس تووڕەبوون‌و چوونەدەرەوە ، لەوکاتەدا کاك رۆستەم میلی تفەنگی هێنایەوەووتی : لێتان قبوڵ ناکەین یەکێتی نیشتمانی کوردستان تێك بدەن.ئیتر لەلایەن هەڤاڵانی تریشەوە هەوڵی زۆر بۆ چارەسەر کردنی ئەوگرفتە دراو لەئەنجامدا ئەو هەڤاڵانەی چووبوونە دەرەوە گەڕانەوە ناو هۆڵی کۆنفراسەکە.. کەلەڕاستیدا ئەمەش چارەسەرێکی چەك‌و پینە بوو نەك تیمارکردنی یەکجارەکی برینەکە .

لەم کۆنفرانسەشدا دیسانەوە کاك نەوشیروان بە سکرتێری کۆمەڵە هەڵبژێرایەوەو کۆمەڵێك هەڤاڵ کە هەندێکیان تازە بوو بوونە سەرکردایەتی کۆمەڵە: فەرەیدون، قادر حاجی عەلی، مەلازم عومەر، کۆسرەت رەسوڵ، جەبار فەرمان، ئازاد هەورامی، مەلا بەختیار.

هەروەها چەند هەڤاڵێکیش بوونە ئەندامی یەدەك: عومەر فەتاح، حەمەرەحیم تۆفیق، د.خەسرەو خاڵ، حەسەن کوێستانی.

هەر لەو ماوەیەداو دوای چەند رۆژێك باڵەکەی تری یەکێتی کە یەکێتی شۆڕشگێرانی کوردستان بوو لە هەمان جێگادا کۆنفرانسی خۆیان بەست.

یەکێتی شۆڕگێڕان بە قەدەر کۆمەڵە کێشەیان نەبوو، سەرکردایەتی خۆیان بە بێدەنگی هەڵبژارد کە بریتی بوو لە هەڤالان:

د.فوئاد، د.کەمال فوئاد، شەوکەتی حاجی مشیر، حاکم عومەر، شێخ دارا، حەمەی فەرەج، شێخ عەلی، شێخ محەممەد چاوشین، د.خدر، سەربەست بامەڕنی، م. نازم، پێشەوا تاڵەبانی.

هەر لە دوای ئەمە پێکهاتەی سەرکردایەتی گۆڕاو هەندێ ئەندامی تازە سەرکەوتن‌و مەڵبەندەکانیش دەستکاری کران بەم جۆرە:

- مەڵبەندی یەك: جەبار فەرمان.
- مەڵبەندی دوو: قادر حاجی عەلی.
- مەڵبەندی سێ: حەمەی فەرەج.
- مەڵبەندی چوار: کۆسرەت ڕەسوڵ.

ڕەوتی گفتوگۆوەکو پێویست نەئەڕۆیشت، حکومەت دەستی دەستی پێئەکردین، هەرجارەی بیانوویەکیان ئەهێنایەوە بۆ پشتگوێ خستنی‌و بەرەو پێشەوە چوونی مەبەستەکان، لەم ڕووەوە پشێوی‌و ئاڵۆزی ئەخولقاند لە هەر شوێنێکی پێشمەرگەی بدیایە ئەیگرت، لە هەندێ شوێندا بە کۆپتەر دائەبەزی‌و چەکی ئەکردن، لە زانکۆی سەلاحەدین کەوتەویزەی خوێندکاران‌و ڕاوەدوونانیان‌و لە سلێمانی‌و کەرکوك گرفتی زۆرتری هێنایە ئاراوە بەگرتن‌و کوشتنی خەڵکی بێتاوان بۆ چاوترساندن‌و تێگەیاندنی خەڵکی کە گفتوگۆ بەلێواری کۆتاییدا ئەڕوات، هەروەها لە هەندێ شوێن هێزی سەربازی دەرئەکردو شەڕی بەهێزەکانمان ئەفرۆشت هەروەکو لە دێی سەید خەلیلی سەر بەناوەندی قەزای کەلار هێرشێکی گەورەی بەسەربازو جاش‌و تانك‌و کۆپتەرەوە بەسەرپەرشتی بارقی عەبدوڵڵا حاجی حونتە کردە سەربارەگای کەرتی ڕێکخستن‌و پێشمەرگەکانی هەڤاڵ کوردۆ قاسمی لێپرسراوی کەرت، بەڵام دوژمن دەرسێکی باش دادراو زیانێکی زۆری لێکەوت‌و هەر لە بەیانییەوە شەڕبوو تا دەمەو ئێوارە لەهەموو لایەکی گەرمیانەوە پێشمەرگە فریاکەوتن‌و نەیانهێشت دوژمن بەو هێزە زلەیەوە بستێك بێتە پێشەوە تەنانەت هەندێ خەڵکی دێی

سەید خەلیل بەقورئانێکەوە بەرەولای بارق چوون بۆ ئەوەی شەڕەکە ڕاگرێو زیان بە دێکەیان نەگەیەنێ کەچی ئەو چوار پیاوی پیری بەتەمەنی لێکوشتن، هەروەها جاشەکانی حەمەی حەسۆلی بۆسەیەکیان لە ڕێگەی تاسلوجە بۆ فەرماندەو پێشمەرگەکان دانابوو هەڤاڵ ملازم سەید کەریمو دوو پێشمەرگەی تێکەوتبوونو شەهید کرابوون. ئەمە ڕقی هەموو پێشمەرگەی هەڵساند بە جۆرێك حەزمان ئەکرد لە یەك ساتدا هەموو جاشەکانی کوردستان بە یەك فیشەك بنەبڕ بکەین. بۆیە لە زۆر قوڵەوە پێشمەرگەی یەکێتی بۆسەیان بۆ جاشەکان داناو هەندێکی باشیان لێکوشتن لە تۆڵەی ئەو کارانەی لە ماوەی گفتوگۆدا  بە فیتی ڕژێم ئەنجامیان ئەدا.

ڕۆژی ١٩٨٤/٩/٢ بوو هەواڵێکمان پێگەیشت کە پێشمەرگەی ئازاو دوژمن بەزێن کاك ئەحمەد شاتوانی شەوی ٩/١ کەرتەکەیان ئەچێتە گوندی تەپەڕێزینە کاك ئەحمەد شاتوانیو کاك مەحمود گەرمیانی  لادەدەنە ماڵێكو دەبنە میوانو دوای ماوەیەك هێزێکی چەکدار دێنە سەریانو تەقەیان لێدەکەن ، کاك ئەحمەد شاتوانی شەهید ئەبێ ، دیارە ئەمە پیلانێك ئەبێ ڕێکخرابوو بۆ لە داونانی ئەو دوو کادیرە پێشمەرگەیەی شارەزوور کە دەمێك ساڵ بوو بە هۆی شەڕی ناوخۆیی هێزە جیاجیاکانی کوردستانەوە بوو بووە مەیانی ململانێو بۆسەدانانو لە ناوبردنی یەکتری کە ئەحمەد شاتوانی کە لە ساڵی ١٩٧٧وە پێشمەرگە بوو ، بووە قوربانی ئەو هەلومەرجەی ئەو کاتە ..

ئەو کاتانە فەرماندەی تیپی ١٥ ی هەورامان بووم، ڕۆژی ١٩٨٤/٩/٢٥ لە شارەزوورەوە چومەوە بۆ پرسەی ژنێکی خزممان لە باخانی قەرەداخ کە ڕۆژی ٩/١٨ بە ڕووداوی مین شەهید بوو بوو، دوای تەواو کردنی پرسەکە پرسیاری ڕێگەی ناو قەرەداخم کردووتیان زالگەی لێ نیەو چۆڵە، کە زۆر جار لەو جادەیەوە خۆمان ئەکردە ناو قەرەداخدا.

بە ئۆتۆمبیلێکی تیۆتای کرۆنا کە ماوەیەك پێش ئەوە  گرتبوومانو بە سلف کاری نەئەکرد لە گەڵ دوو پێشمەرگەدا: هەژار دەرەویانیو عەلی جافەرانی ڕۆیشتینو گەیشتینە نزیك قەرەداخ بێئاگا لەوەی دوژمن لە

شوێنێکی نەدیودا زاڵگەیان داناوە، کاتژمێر ٤ ی دوانیوەڕۆ بوو. کە گەیشتینە زاڵگەکەویستم بگەڕێمەوە، ئۆتۆمبیلەکە کوژایەوە ئینجاویستمان بە پاڵ بیخەینە ئیش سوودی نەبوو لەو کاتەدا هێزی دوژمنیش گەیشتنە سەرمان‌و هەردوو پێشمەرگەکە کەوتنە دەست دوژمن‌و منیش ڕامکرد، دە سەرباز بە دوامدا هاتن نەیانتوانی بمگرن. بە دەم ڕاکردنەوە بیرم کردەوە زۆر ناشیرینە پێشمەرگەکان گیراون‌و منیش ڕا بکەم. گەڕامەوەو دەستم بە سەر بەلە پیتکەی تفەنگەکەمەوە بوو داوایان لێکردم خۆم بە دەستەوە بدەم‌و چەکەکەم دابنێم پێم ووتن: چەکەکەم دانانێم‌ووتیان: با بچین بۆلای فەرماندەکەمان،ووتم: باشە.

ئیتر ڕۆیشتین‌و لە ژوورێکدا دایاناین‌ووتیان : فەرماندە دێتە ئێرە. دوای چەند خولەکێك گرمەی ئۆتۆمبیلێك هات‌وەختێکم زانی زرێپۆشێك لە بەردەم دەرگای ژوورەکەداوەستا کە خۆیان نەیانوێرا چەکم بکەن لوولەی دۆشکای ١٤٫٥ ملم ڕوو تێکردین چارمان نەماو چەکیان کردین. ئیتر جۆرە بێ ئومێدییەك ڕووی تێکردم‌و بە برادەرانم‌ووت: ئێمە تووش بووین ئەبێ مەردانەڕوو بە ڕوو ببینەوەو بە زەلیلی خۆمان نیشان نەدەین، لەو کاتانەدا ئیستخباراتێکی کورد کە خەڵکی سێوسێنان بوو، قسەی ناشیرینی پێکردین‌ووتی: ئێوە کێن..؟

منیش بە توندی لە ڕووباوەستام: ئێمە لە پیاوی دوژمن‌و خائینی‌وەکو تۆ ناترسین، ئێمە پێشمەرگەین‌و لە هیچ کەسێك سڵناکەین. ئینجا لە فافێکی دەرهێنا چاوم ببەستێ، پێم‌ووت: چاو بەستن بۆ پیاوی ترسنۆکە.ووتی: تۆکێیت..؟ووتم: من مەحمود سەنگاویم، لە ساڵی ١٩٧٧ەوە پێشمەرگەم، هەرکەسە لە ناو پێشمەرگەدا زۆر بمێنێتەوەو شەهید نەبێ شەرمەزارە. منیش تا ئێستا کە ماومەتەوە خۆم بە شەرمەزار ئەزانم ئێستاش کە کەوتوومەتە دەست ئێوەو شەهید ئەکرێم هەست ئەکەم سەربەرز ئەبم‌و ئەو شەرمەزارییەم لە سەر نامێنێ. بۆ ئاگاداریشتان من فەرماندەی تیپی ١٥ ی هەورامانم.

پاش چەند خولەکێك کابرایەکی ئیستخباراتی قەرەداخ کە ناوی عەریف عەلی بوو هاتبووە سەربازگەکەو بە فەرماندەکەی‌ووتبوو: کێتان دەسگیر

کـردووه..؟ ئـەویش‌ووتبووی: مـەحمود سـەنگاوی‌و دوو پێشـمەرگە. عـەریف عەلی‌ووتبووی: بە پەلە ئازادیان بکەن، ئەگینا ئاسوودە نـابن‌و هەموو ڕۆژێ لە تۆڵـەی ئەوانــدا سـەربازەکانتان ئەکەونــە بــەر پــەلامارو ئــەکوژرێن. ئـیتر فەرماندەکە قایل ئەبێ ئێمە ئازاد بکرێین، لە ناکاو گوێمان لە دەنگە دەنگ بـوو کە هاتن بۆ لامان، فەرماندەکە لەو ئەفسەرو سەربازانە توڕە بوو کە بـە خـراپ مامەڵەیان لە گەڵا کردوین، بانگی کردین‌و پێی‌ووتین: چیتان پێویستە بۆتـان بکەین. ئەمشەویش میوانی منن. منیش‌وەڵامم دایەوە: ئەگەر زینـدانین گـرنگ نییـە. ئەگـەریش ئـازادین حەزئەکـەین بـڕۆین. فەرماندەکەووتی: ئۆتۆمبیـل‌و چەکەکانیان بدەنەوەو خواتان لە گەڵ.

شـتەکانمان‌وەرگرتەوەو سـواری ئۆتۆمبیلەکـەمان بـووین کـە چـاك کرابووەوەو تێمان تەقاند تاکو دێی تافان نەوەستاین. هەر بیریشمان لای ئـەوە بوو لـە ڕێگـادا بۆسـەمان بـۆ دانێن‌و تەقـەمان لێبکەن. بـەڵام ئەمـەیانم بـەلاوە گرنگ نەبوو لەوانەیە دەستمان بکردایەتەوەو ئێمە لەوانمان بکوشتایە. کە چی هیچ ڕووی نەدا.

ومنەبێ مەسەلەی گفتوگۆ هەر لایەنەکانی ناوخۆی قەڵس کردبێ بـەڵکو دەرو دراوسێشی زویر کرد چونکە هەر ڕێککەوتنێکی کورد ـ عێراقیـان بە زیـان بۆ سەر خۆیان ئـەزانی. بە تایبـەتیش تورکیـا لـە کۆمـەڵێك ڕووەوە ئەمـەی بـە مەترسـی دائـەنا: بەشێکی‌وولاتەکەی کـوردە، هێڵـی نـەوتی عێـراق بـە خـاکی تورکیـادا ئـەڕوات، تورکیـا خۆی بـە کوێخـای تورکمانـەکانی کوردسـتان‌و عێـراق دائەنێ. ئەمانەی هەموو بـە گرفـت ئـەزانی بـۆ سـەر ئاسایشـی ستراتیژی خۆی، بۆیە بە پەلە هاتە سـەر خـەت‌و کلکێکی گێـڕاو نەیهێشت ئـەو گفتوگۆیـە سـەر بگرێ، گەر چی عێراق خۆیشی لە ڕەوتی گفتوگۆ سارد بووبووەوەو گـەرم‌وگوڕی نـەما بـوو. بـە تایبـەتی دوای ئـەوەی جارێکی تـریش د.قاسملو کەوتـەوە نێوان بـەڵام لـە سـەر زۆربـەی مەسـەلەکان گرفتیـان درووست ئـەکرد تـەنیا لـە سـەر هەڵوەشانەوەی فەوجە جاشەکان سەرێکیان لە قاند.لە ئەنجامدا دەرکـەوت هـیچ ناکرێ.

ئەمەوایکرد کە ئیتر ئێمە لە دوژمن بەئاگابین کەبەهەموو شێوەیەك هەوڵی تێکدانی گفتوگۆی ئەدا بەتایبەتی کە لە بەرەکانی خوارووادا هەندێ سەرکەوتنی بەدەستهێنابوو، هەروەها ئەو هەڕەشەیەی ئێران لەمەڕ هێرشی بەربلاوەوە ئەیکردو نەئەکرا بووە مایەی ئەوەی لە هەموو بەڵێنەکانی پەشیمان بێتەوەو ئاو بکرێتە سەر پشکۆی گفتوگۆدا. بۆیە ئێمە بەچاکمان زانی بارەگاکانی تیپی ١٥ی هەورامان بۆ دێی قەڵبەزەی شارەزوور بگوێزینەوە. هەر لەو کاتانەدا دوژمن بۆ هەندێ مەرامی سەربازی خۆی جادەیەکی لە قلیجەوە بۆ دێی تووەقووتی سەر بەحرەکە لێدا، ئێمەش بە هێزەکانمان ڕێگریمان لێکردو دەستمان لێکردنەوەو دوو جاشمان لێکوشتن، لە هەمان کاتدا ئاگاداری سەرکردایەتیمان کردەوە، بە برووسکەوەلامیان داینەوە کە ڕێگەی حکومەت بدرێ جادەی خۆی درووست بکات لەو کاتەدا کە جاشەکان هێرشیان ئەهێنا کاك مەحمود گەرمیانی هاواری ئەکردو ئەیووت: بڕوانن پرۆلیتاریای کورد هات، ئەو هەموو جاشە خەڵکی ڕەش‌و ڕووتی کوردن دێنە سەرمان نەك خەڵکی بورژوازی.

شایانی‌ووتنە ئەم مەسەلەی جاشایەتییە شتێکی نوێ نەبوو، بەڵکو گەر تەماشای مێژووی جووڵانەوەی میللەتەکەمان بکەین دوژمنان توانیویانە بەشێوازی جیاجیا دژە هێزی کورد بەرامبەر بەشۆڕش درووست بکەن بۆ کوژاندنەوەی ئاگردانی شۆڕش، هۆکاری زۆر هەن بۆ پەیدابوونی ئەم دیاردە دزێوە:

١. ناهوشیاری ئەو کەسانەی ئەبنە جاش لە ڕووی ئەرکی نەتەوایەتییەوە.
٢. هەڵخەڵەتاندنیان لەلایەن دوژمنەوە بەپارەو پوول.
٣. ناکۆکی بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ ڕەوتی دەسەڵاتی شۆڕشدا.

بەلام ئەوەی ڕەچاو ئەکرێ لەکاتی گفتوگۆی ساڵی ١٩٨٤ دا دیاردەی جاشایەتی زۆرتر زەق بووەوەو بووە کارێکی سەرنجڕاکێش، بەهۆی ئەو نەرمییەوە حکومەت ئەینواند بەرامبەر بەو خەڵکە زۆرەی لەبەرەکانی شەڕ هەڵهاتبوون‌و ڕوویان کردبووە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش‌و نەتوانرا دابین

بکرێن‌و سوودیان لێوەربگیرێ‌و حکومەت پشی پشی بۆ کردن بۆ ئەوەی بچنەوە ژێر ڕکێفی خۆی‌و سزا نەدرێن‌و بکرێنە جاش‌و چاوپۆشی لە هەموو هەڵسوکەوتەکانیان ئەکرا لەلێدان‌و سزادانی خەڵکی‌و دزی‌و ڕاوڕووت‌و فرۆشتنی چەك‌و تەقەمەنی.

بەداخەوە شۆڕش لەم ڕووەوە خەمسارد بوو، حسابی‌ووردی بۆ ئەم لایەنە نەکردو بیرێکی باشتری بۆ چارەسەرکردنی نەدۆزییەوە تا دوژمن بۆ خۆی ئەوەی قۆستەوە کە هەموویان ڕابکێشێتەوە، لە هەمووشی خراپتر لەوانە ئەمە هەلێك بوو بۆ کوردانی شەڕ بەهۆی هەلومەرجی شەڕی ئێران - عێراق بۆ ئەوەی بەئاسانی بتوانێ هێزە سەربازییەکانی بخاتە بەرەکانی شەڕی خوارووو ناوەڕاست‌و هێزەکانی جاشی کوردیش بکاتە گژی هێزی پێشمەرگەی کوردستاندا.

هەر لەم ماوەیەدا سەردانێکی حاجی ڕەسوڵی تەرخانیم کرد لە نزیك دێی زەلە ڕەش کە حاجی خەریکی جافداری بوو ، پیاوێکی زۆر قسە خۆش‌و بیر تیژوووریاو خاوەن کەسایەتیەکی عەشایەری بوو.. لێم پرسی : مامە حاجی ئەمانە چین بەم تازەییە دروست بوون‌و پێیان یەژن خەفیفە ..؟ یەکسەری‌وەڵامی دامەوە : ئەوانەوەکو تانجی‌وان‌و پاشای سەگن ،واتە ئەوانیش جۆرێکن لە جاش .

مامە حاجی لە میانەی قسەکانیداووتی : حەمە خانی برازام کە جاشە هاتووەتە سەرمان‌و تەقەی لە خێڵەکەمان کردوە ، چوومە لای‌و پێم‌ووت : ڕۆڵە بۆوا ئەکەی ..؟ حەمە خان‌ووتی مستەفا ئەکوژم‌و کەسیش نابێ قسە بکات ، ئەگەر خوایش قسە بکات هەر ئەیکوژم ..! منیش پێم‌ووت : قەیناکە مستەفا بوکوژە بەڵام هەمووومان هەر خوامان هەیە ، توخوا مەیکوژە !..

ناوچەکانی گەرمیان بەگشتی‌و لە شارەزووریشدا نەتوانرا لە ڕێگەی تایبەتییەوە سوود لەو هێزە زۆرەی جاش‌وەربگیرێ‌و پەیوەندییان پێوەبکرێ‌و پردی دۆستایەتی ببەستن‌و هاریان نەکەن بۆ ڕوو بەڕووبوونەوەی شۆڕش‌وەکو لە هەندێ ناوچەی تردا ئەمەکراو تاڕادەیەکیش قازانجی هەبوو.

دوای ماوەیەك بەبڕیاری مەڵبەندی یەك گوێزرامەوە بۆ گەرمیانو لەو کاتەدا تیپی ٥١ی گەرمیان کە ١١ کەرتی هەبوو کرا بەدوو تیپ:

١. تیپی ٥١ی گەرمیان من بوومە سەرتیپیو لەسنووری کفریو دووزو ناحیەکانی قادرکەرەمو نەوجولو سەرقەڵاو سەنگاودا جموجووڵو چالاکی ئەنجام ئەدا.

٢. تیپی ٥٣ی شێروانە کاك عادل شکور دانرا بەسەرتیپی لە سنووری کەلارو زەنگاباتو باوەنووردا کاریان ئەکرد.

ماوەیەك سەرقاڵی تەشکیلاتو ڕێکوپێك کردنی کاری پێشمەرگانەو دانانی بنکەو بارەگاو دەستنیشان کردنی سنووری ناوچەی تیپو بەسەرکردنەوەی کاری خەڵکی بووین.

ڕۆژی ١٩٨٤/١٢/٧ لەلایەن کاك جەبار فەرمانەوە لێپرسراوی مەڵبەندی یەك بانگ کراین بۆ بارەگای مەڵبەند لەدێی سیتەکی شارباژێر بۆ باسکردنی مەسەلەی گفتوگۆ کە دوژمن نیازی تێکدانی هەبوو، بۆیە پێویست بوو بەرپەرچی فرتوفێڵەکانی بدرێتەوەو خۆمان سازبدەین بۆ هەر ئەگەرێك کەدێتە پێشەوە بۆ ئەوەی ئاگاداربین لە ڕەوتی ڕووداوەکان نەوەکو بکەوینە ناو داوی شتی ناکاوەوە.

چونکە ڕژێم گفتوگۆیوەکو بەرنامەیەك کە ڕێگا چارەیەك بێ بۆ کۆتایی پێهێنانی مەسەلەی شەڕ لە کوردستانودانانی تەواو بە مافە بنەڕەتیەکانی گەلی کورددا لە چوار چێوەی عێراقدا..بەڵکو هەمیشەو هەر کاتێ بەعس پەنای بۆ گفتوگۆ بردبێ‌وەکو سازشێك بووەو زۆرتریش بە مەبەستی هەڵخلیسکاندنی پێی شۆڕشو سەرکردەکانی بووە لە ڕێڕەوەی خەباتو تێکۆشانو دەستهەلگرتن لە ڕەوتی شۆڕشگێڕیو لەلایەکی تریشەوە بۆ خۆیوەکو هەوڵی پشوودانێك بووە لەو دۆخە مەینەتاویەی تووشی ئەبوو بە دەست شۆڕشگێڕانی کوردەوە کەنەك بەتەنیا لە ڕووی سیاسیو سەربازیەوە سەرئێشەی بۆ ئەنرایەوە بەڵکو لە ڕووی ئابووریشەوە بارگرانیەکی ئەکەوتە سەرشان کەکاری لەسەر گوزەرانی خەڵکی ئەکردو تائەهات ناڕەزایی زیادی

ئەكرد ئەگەر چی بەئاشكرا نەئەتوانرا قسە بكرێ.. ئەگەریش شتێك بووترایە ئەوا گوێیان لە كەس نەئەگرت.

وا ئـەمجارەش دوای ئـەوە پشـوویەكی داوە.. كەوتووەتـەوە بـەزمگێڕان‌و شـەڕ فرۆشـتن بـە پێشـمەرگەو ئاڵۆزانـدنی باردۆخەكـە كـە ئـەوەی لێچاوەڕوان ئەكرا ئیزندانێك بێ بۆ كۆتایی‌وەرزی گفتوگۆو دەستپێكردنەوەی گێمێكی تـری شەڕی چاوەڕوانكراو.

# ساڵی ١٩٨٥

كە چووینە ساڵی ١٩٨٥ ئەمانزانی چارەنووسی گفتوگۆ بەرەو تـوونی بابا ئەچـێ‌و ئـەوەی ئێمـە خـەونمان پێـوە ئـەبینی بـەعس لـە خەیاڵیشـیدا جێـی نەكردبووەوە، جگە لەو گوشارو تەنگ پێهەڵچنین‌و كۆسپانەی درووسـتی ئـەكرد بۆمان.

بۆ ئـەم مەبەسـتە سـەركردایەتی (ی.ن.ك) لـە بەیانێكدا بڕیاریـدا ڕۆژی ١٩٨٥/١/١٥ گفتوگـۆ لەگـەڵ حكومـەت ڕابگـرێ، ئێمـەش لـە مەڵبەنـد گەڕاینـەوە. كەوتینە جەولە كردن، بەڵام پەلاماری هیچ شوێنێكمان نەدا، هەرچەندە دوژمن لـە كـاتی گفتوگـۆداو لـە زەمـەنی ڕاگرتنیـدا گرفتـی جۆراوجـۆری درووسـت ئەكردوەكو كوشتنی لێپرسـراوان‌و پێشـمەرگە، بـە تایبـەتی ئـەوەی كاریگـەرێتی هەبوو لـە سـەر كوردو سـەركردایەتی‌و پێشـمەرگەش شـەهیدكردنی مامەڕیشـە بوو لەدێی قازان بلاّخ لە ڕۆژی ١٩٨٥/١/٢٤ بەشێوەیەكی نامەردانە لەلایەن جاشە ڕووڕەشـەكانی بەعسـەوە تەحسـین شـاوەیش‌و قالەفـەرەج. كـە شـەهیدكردنی مامەڕیشە كۆستێكی گەورە بوو نەك هەر بۆ (ی.ن.ك) بـەڵكو بـۆ هـەموو كـورد. ئـەو موجیزەیـەكی ئـەم سـەردەمەی شۆڕشـی كـورد بـوو كەوێنـەی كـەمبوو لـە ئازایەتی‌و جەربەزەیی، قەت لـەمردن نەئەترسا، بـەڵكو خـۆی بڕووسكە مـەرگ بـوو بۆ دوژمـن، ترسـێكی هەمیشـەیی نـاخی ئەكرۆشـتن، هـەر بۆیـە دوژمنـیش ناوی لێنابوو پیاوی پۆلایین. ئـەو پێشـمەرگەیەكی نەخوێنـدەوار بـوو، بـەڵام لـە

هونـــەری شـــەڕکردندا زۆر شـــارەزاو لێهـــاتوو بووەوەکـــو بڵێـــی لـــە یـــەکێك لەدانیشگاکانی سەربازی جیهانـدا دەرچـووە، بـۆ تۆڵـە سـەندنەوەی بـە پێویست زانرا بەقەدەر خۆشەویستیو گەورەیی مامەڕیشە ئـاگری ڕقو تۆڵـە بەربدرێتـە گیانی دوژمنی داگیرکەرو ڕەشەکوژ. بە بڕیاری سـەرکردایەتی ڕۆژی ١٩٨٥/١/٢٦ دانرا تۆڵەی مامەڕیشە بکرێتەوە لە سەرتاسەری کوردستاندا.

ئێمـەش لـە ئاسـتی خۆمانـەوە هـەمان ڕۆژ بەهێزێکـەوە چـووینە سـەرجادەی قادرکـەرەم - کـەرکوك لەشـەڕێکدا ٢٤ خۆفرۆشمـان بەسـزای گـەل‌و شۆڕش گەیاند. هەر لەمەشەوە جارێکی تـر ئـاگری شـەڕی کوردستان‌و دوژمنـی داگیرکـەر هەڵگیرسـایەوە دوای سـاڵێك گفتوگـۆی سـەرنەکەوتوو.ومنـەبێ کـورد ئەمـە یەکـەم ئـەزموونی گفتوگـۆی بێـت، بـەڵکو هـەر لـە کۆنـەوە ئـەم ڕێگایـەی گرتووەتەبـــەر، بگـــرە لـــە هـــەموو ســـەردەمە جیاجیاکـــانی شۆڕشـــدا هـــەم ســـەرکردایەتی شـــۆڕش‌و هـــەم لایـــەنی دوژمـــن هەریەکـــەیان بـــەپێودانگی خۆیان‌ویستوویانە سـوود لـە هەلومـەرجی گفتوگـۆوەربگرن بەتایبـەتی دوژمـن مەبەستی بوو:

١. پشوو پێدانی هێزە ماندوو شەکەتەکەیان لەبەرەکانی شەڕدا.

٢. ساردکـــردنەوەی کـەفوکوڵی دڵـی خـەڵکی‌و ڕازیبـوون بـەبێهوودەیی خەبات.

٣. کەسبیوەخت بۆ پیاچوونەوەو ڕێکخستنەوەی هێزەکان.

٤. بیـانوو گـرتن‌و کـۆسپ درووست کردن لە ڕێی پەیـوەندی شۆڕش بە خەڵکییەوە.

لایەنی شۆڕشیش مەبەستی بوو:

١. هەرهیچ نەبێ هێزەکانی ماوەیەك بحەسێنەوە دوور لە شەڕو پێکادان.

٢. خـەڵکێکـی زۆرتـــر ڕوو بکـــەنە شـــۆڕش‌و ببنـــە پێشمـــەرگە بـــۆ پاشـــەڕۆژ پڕچەك بکرێن.

٣. ناسینی دەسەڵاتی دوژمن‌وباشتر شارەزابوون لە تواناو هەڵوێستەکانی.

٤. ئاسایی کردنەوەی دۆخەکەو ڕاستکردنەوەی خـەڵکی‌و پێشمەرگە لـە بـارێکی تازەتردا.

گفتوگۆ خۆی لەخۆیدا کێبەرکێیە لەنێوان دوولادا شۆڕش - حکومەت بۆ دەستخستنی دەستکەوتی تازە کە لە شەڕداوەدەست ناهێنرێت، بۆیە گفتوگۆ بەهۆیەکی باش ئەزانرێت لە پرۆسەی خەباتدا، چەند بتوانری سوود لەهەلومەرجەکانوەربگیریو لە پیلانی دوژمنووریابین ئەوەندە لە سەرکەوتن نزیك ئەبینەوە.

بۆ چوونە ناو چوارچێوەی گفتوگۆوە شۆڕش لە دوو ڕوانگەوە تێی ئەڕوانی:

١. داخرانی هەموو دەرگاکان بە ڕووی شۆڕشدا.

٢. کێشەکان بە ڕێگای سیاسی نەك شەڕ چارەسەر ئەکری.

کوردیشووتوویەتی: دوای شەڕ ئاشتییە. ئەم مەسەلەیە لای کورد دەمێکە چەسپیوە، بە داخەوە دوژمنانی گەلەکەمان لە ئەنجامی خۆ بە کەڵەگا زانین ئەم لایەنە فەرامۆش ئەکەنو خۆیان گێل ئەکەنو تەنیا ڕێگەی شەڕ هەڵئەبژێرن. بۆیە سەرەنجام گفتوگۆی (ی.ن.ك)و حکومەت ئەمجارەیش هەر بەهەرەسی جارانی پێشوو چوو، هەرچەندە لە ڕووی سازشەوە هیچ سوودێکمانوەرنەگرتو تێیدا سەرنەکەوتین کە بەشێك پەیوەندی بەکەندو کۆسپی دوژمنەوە هەبوو، بەشێکیش ئۆباڵی لە ئەستۆی کەمو کوڕی خۆمانە، بێجگە لە پڕوپاگەندەی نەیارەکانیش کە لە ڕوانگەی تەسك بینییەوە تەماشای مەسەلەکەیان ئەکرد، بەڵکو لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنیانەوە بەتوندی هێرشیان ئەکردە سەر گفتوگۆو بە کارێکی خراپیان لەقەڵەم ئەدا، چونکە تەنیا بەرژەوەندی خۆیان لەبەر چاو بوو نەك سەرەنجامی مەسەلەکەو ئاییندەی چارەنووسی کورد. هەروەها جەماوەریش لە بارەی گفتوگۆوە بێدەنگ بوون تەنیا چاوەڕوانی ئەنجام بوونو هەڵوێستێکیان نەنواند بۆ پاڵپشتی کێشە ڕەواکەیانو فشار خستنە سەر حکومەت بۆ ئەوەی بەتەنگ ئەو دۆخەیە بێتو ترسێکی لێبنیشی.

بۆیە پێویستە لەمەسەلەی گفتوگۆدا بەرژەوەندی گەل ڕەچاو بکری، بەوپەڕی هوشیارییەوە هەنگاو هەڵبگیرێت، بەگژ لایەنی سەلبیاتدا بچنەوە، پشتیوانی لایەنە باشەکانی بکرێت، هیچ کەسو لایەنێك تەنیا خۆیو

بەرژەوەندییەکانی خۆی ببینێو کەسی تری لە بیر نەبێت، هەقە هەر یەکێکیش هەنگاوێکی نا، هەموان چاوەڕوان بین بزانین ئەنجامی بەچیئەبێت، نەك یەکسەر لە سەنگەری هێرشی بێ سەرو بەرەوە ئەو پرۆسەیە پەك بخرێت.

ئەمجارەش بەباری باشو خراپیدا گفتوگۆ تێك چووەوە، تاوانەکەش ئەکەوێتە ئەستۆی حکومەتی عێراقی.

بۆ ئەوەیوەڵامێکی ئەو هەڵوێستەی حکومەتی عێراقی بدرێتەوەو زەبرێکی توندی تێبسرەوێت مانگی ١٩٨٥/٢ لەهەر سێ مەڵبەند ١،٢،٣ هێزێکی گەورە خڕکرایەوەو ڕەوانەی دۆڵی جافایەتی کرا. هەموو لێپرسراوە سەرەکییەکانی هێزەکە لە بەرگەڵو لەلایەن کاك ملازم عومەرەوە کۆبوونەوەی پێکراو نەخشەی گرتنی ڕەبایەکانی دابانو هەلاجو دۆڵی شەدەڵەمان خرایە بەردەست، ئەم چالاکییە لەبەر چەند هۆیەك پێویست بوو:

١. بە دوژمنی بسەلێنێ کە شۆڕشو پێشمەرگە هەر سوورن لەسەر خەبات.

٢. ئەو پڕوپاگەندەیە ڕەت بکرێتەوە کە دوای گفتوگۆ کەس شەڕی پێناکرێت.

٣. هێزی پێشمەرگە گورج بکرێتەوە بۆ دەستوەشاندنی باشتر لە دوژمن.

٤. کۆمەلانی خەڵکی کوردستان ووریا بکرێتەوە لە نیازە بۆگەنەکانی دوژمنو نەخشەی تەفروتونا کردنی کوردستان.

بەپێی بەرنامەیەکی ئامادەکراو هەر تیپە یان چەند تیپێك شوێنێك یان چەند ڕەبیەیەکی پێ سپێردرا، تیپەکانی ٥١و٥٣ ئەرکی گرتنی ڕەبایەکانی ڕۆژهەلاتی دابانیان پێسپێردرا کە شوێنێکی زۆر سەختبوو.

شەوی ١٤ـ١٥/٢/١٩٨٥ شەوێکی ساردی زستانێکی بەفراوی لە دێی هەڵەدن کۆبووینەوە، پێشمەرگەکانمان سازداو ئاگادارکراینەوە کەکاتژمێری ٤ ی دەمەوبەیان پەلاماری دوژمن ئەدرێت، کاتژمێر ١١ی شەو بەرێ کەوتین، بە هەورازو ناوبەفردا، بایەکی سارد هەڵیکردبوو، بارێکی سەیر بوو کەلەسەرو

سیمای هەر پێشمەرگەیەکدا ئەدرەوشایەوە، گەشانەوەو خۆشییەکی زیاتر ئەبینرا، ئاوازی سەرکەوتن لە ناخیانا بەرز ئەبووەوە، یەكووزەی پۆلایینو گیانێکی مەزن بوو لەپێناوی خۆبەخت کردندا. دوو پێشمەرگەی برا پێکەوە قسەیان ئەکرد برا گەورەکەیان بەویتری‌ووت: بزانین ئەمشەو کاممان ئەبینە قوربانی‌و لەم چالاکییەدا سەرومری بۆ گەل‌و شۆڕش ئەنووسینەوە، کاك سمایل عەترە کە برا بچووکەکە بوو لەگەڵ یەکەم پەلاماردانا بۆ سەر ڕەبایەی شاخی هەڵەدن ناوی لەلیستی سەرومریدا تۆمار کرد کە دوای چوار کاتژمێر لەپێکرانی گیانی بەخشییە خاکی کوردستان.

شارەزاکەمان کاك غەریب هەڵەدنی بوو کە کوڕێکی ئازاوزیرەك بوو، یەکێکی تریشمان لەگەڵ بوو بەڵام ئەو هیچ نەبوو بەشێك لەهێزەکەی‌وێڵکردین. بە هەزار حاڵ ڕەبایەکەمان دۆزییەوە، تەقە لەزۆربەی ڕەبایەکانی ترەوە دەستی پێکرد ئێمە هێشتا هەر بە دوای ڕەبایەدا ئەگەڕاین. کاك عادل شکورو کاك عەدنانو م.عەلی پێش ئێمە گەیشتبوون. ئەو بەشەی هێزەکە کە گەیشتبوو کرایە دوو بەرەوە، بڕێکیان لە سەرەوەی ڕەبایەکەو ئەوی تر لەخوارەوە پەلاماریاندا، لەو کاتەدا من‌و کاك کەریم چاورەش گەیشتینە ئەوێ، سیمی دەوری ڕەبایەکەمان بەرز کردەوە، هەرچەندە دەورو پشتەکەی مینرێژکرابوو لەبەر زۆر کەوتنی بەفر بەسەریدا هیچی نەتەقییەوەو چووینە ژوورەوە، بوو بە تەقە لەشەرێکی دەستەویەخەی کەم خایەندا دەستی بەسەرا گیرا، چەند جاش ناشەعبییەك کوژران‌و هەندێك بەدیلگیران، یەکێك لەو جاش ناشەعبیانە لەکاتی تەقە کردنەکاندا خۆی دزیبووەوەو چووبووە شوێنێکی سەخت لە نێوان تاشە بەردێك‌و شاخەکەدا کەپشتی چۆڵ بوو ڕێگەی پەلاماردانی نەبوو ، ڕومانەمان تێ ئەگرت ئەچووە ئەو دیوداو بەری نە ئەکەوت .. کاك هەژار دەرەویانی بەبێ تەقە خۆی لەجاش ناشەعبیەکە نزیك کردەوە لە ناکاودا خۆی بۆ هەڵداو کردیە بۆقەتە ملیدا ، کابرا لە حەیبەتا بەرزبووەوە .. تەماشا ئەکەین زەلامێکی زەبەلاح بوو ، لێمان پرسی خەڵکی ڕەمادی بوو .. پەلمان گرت‌و هێنامانە لای دیلەکانی ترو ڕەوانەی بەرگەلۆومان

کـرد ، لێـره چـەكو تفـاقو تەقەمـەنی زۆرمـان دەسـتكەوت. كـەرۆژ بـووەوە بەشـەكەی تـری هێزەكـە پـەلاماری ڕەبایـەی سـەری دابانیـان داو لـە چاوتررووكانێكدا گیراو چەكدارەكانی خۆیان بەدەستەوەدا. پاش ئـەوە مـنو كـاك عـادلو كـاك غـەریب هەڵـەدنی بـۆ دۆڵـی شـەدەڵە دابەزینـە خـوارەوە، لـەو نـاوە شـەڕی مەقـەڕ سـریەو مەقـەڕ فەوجەكـە بـوو. مەقـەڕ سـریە هـەر لەیەكـەم پـەلاماردا گـیرا، ئینجـا شـەڕ كەوتـە لای مەقـەڕ فەوجەكەوە. لـە ڕێگـادا بـەناو دارەكانـدا ئەڕۆیشتین لەبەردەممانـدا خشـەیەك هـات، تەماشـام كـرد سـەربازێك ئـەمنی چـەكەكەی ئـەترازێنێ، منـیش یەكسـەر میلـی تفەنگەكـەم هێنایـەوەو فیشەكێكم پێوەنا، قەباغی تفەنگەكەم لـەو ساتەدا پـەڕی، سەربازەكە كـە زانـی ئیتر ناتوانم تەقە بكەم، هەستایەوەو تەقەی لێكردم، بەرنەكەوتم، كوتـوپڕ كـاك عـادلو كـاك غـەریب هاتنـە دەسـتو تەقـەیان لێكـردو كوشـتیانو چـەكەكەمان هەڵگرت، لەولاتر سەربازێكی تر خۆی نەئەدایـە دەسـتەوە، لـە ئـەنجامی تەقـەدا ئـەویش بەركـەوت، دوای ئـەوە لەگـەڵ هـەڤاڵان قـادری حـاجی عـەلیوملازم عومـەرو جـەبار فـەرمانو سامان گـەرمیانیو ئـازادی سـەگرمە یـەكمان گـرتو نەخشەی پەلاماری سەربازگەی شەدەڵەمان داڕشتەوە، پاش پشوودانێكی كـەم لـە نـاو دێـی شـەدەڵەوە هێرشمـان كـرد، هەرچـەندە بەخەسـتی تۆپبـارانی سـەر ڕێگەكـەمان ئەكرا، بـەڵام نەوەسـتاین تـا گەیشـتینە نزیكـی سـەربازگەكە، لەوێ شـەڕێكی سـەخت ڕوویـدا، بەشـی سـەرووی كەوتـە دەسـت پێشـمەرگە، لای خوارەوەشی پێشمەرگەكان خۆیان گەیاندە ڕەبایـەی حیمایەكـە، لـەو كاتـەدا دوو پێشمەرگە پێكرانو شەهید بوون، ئێمەش ئەوەنـدەی تـر هێرشـەكەمان تونـدتر كردو فشاری زۆرمـان خسـتە سـەر سـەربازگەكە لـەوەدا بـوو بەتـەواوی بكـەوێ، بەڵام بۆسەكانی لای هۆمەر قەوم كە كاك شێرزادی تیپی ٢١ سەرپەرشتی ئـەكرد ڕێگەكـەیان چـۆڵ كردبـوو، هێزێكـی دوژمـن بەچـەند تانكێكـەوە فریـای سەربازگەكە كەوتن. نەخشەكەی بێئاكام كردین. بەڵام شەڕی خوێناویو دوژمن بەزێن لەسەر جادەی تاسلوجە ـ دوكان بـوو، بەڕاسـتی دوژمنـی تۆقانـدبوو، لـەو دەشتە كاكی بەكاكییـەدا پێشـمەرگە ئازایانـە ڕووبـەڕووی ئـاگرو ئاسنی دوژمـن

نەبوونـەوەو دەیـان گیـانی ترسنۆكو خـۆفرۆشو داگیرکـەر ڕەوانـەی دۆزەخـی مـەرگ ئـەکران. بـە ڕاسـتی شـەڕی گرتنـی دابـانو هـەلاج کـارێکی گـەورەو کەموێنەی سەرکەوتووی شەڕی پێشمەرگانە بوو دوای ئەوەی پێشمەرگە سالێك بوو لە هەلی گفتوگۆدا چالاکی گەورەی لەو جۆرەی ئەنجام نەدابوو.

دوژمن زیانی گەورەی لێکەوت لە دیلو کوژراو، دەستکەوتی زۆر کەوتـە دەسـت پێشـمەرگە، ناوچـەیەکی فراوانــی سـەربازی ڕزگـارکرا کـە نرخێکـی سـتراتیژی هـەبوو، بـووە هـۆی دوور خسـتنەوەی مەترسـی ڕۆژانـەی هێزەکانی دوژمن لە ناوچەکەدا، کە بەرزترین قوتە لە دابانو هـەلاج داگیرکرابوو، ڕێگەی لـە جموجـوڵو هەڵسـوکەوتی پێشـمەرگە گرتبـوو، ئـەم سـەرکەوتنە مەزنـە بەخوێنی گەشی چەند پێشمەرگەیەکی چاونەترسو چەلەنگ تۆمار کرا.

پـاش گرتنـی ڕەبایـەکان هێزەکانمـان تێیـدا مانـەوە بـۆ پاراسـتنی لـە هێرشـی دوژمـن، چـەند ڕۆژێـك ماینـەوە هـیچ ڕووینـەدا، بڕیـاری گەڕانـەوەیان داین. لە شارباژێڕەوە بـەرەو گـەرمیان گەڕاینـەوە، هەمووی هەفتـەیـەکی نـەبرد دیسانەوە برووسکەیان کردەوە هێزەکەمان بە پەلـە بگاتـەوە دۆڵـی جافـەتی، بـە هـەمان ڕێگـادا گەڕاینـەوە، لـە ڕێگـادا بـارانێکی شەسـت دایکـرد هـەموو لـەشو کەلوپـەلمان بـوو بـەئاو، لەگـەڵ کـاك جـەبار فەرمانـدا یـەکمان گرتـەوەو بـەرەو گاپیلۆن ڕۆیشتین، شەوێکی تاریكو نووتەك بـوو، بارانەکـەی بـەخوڕ بـوو، هـەر پێشمەرگەیەك دەستی بەپشتی هاوڕێیەکەیەوە نەبوایەوون ئـەبوو، بـە حـالێکی شڕ گەیشـتینە گـاپیلۆنو دابەشـبووین، کەچـی ڕۆژی دووەم ئـیزن درایـن، دیـارە (ی.ن.ك) چالاکییەکی گـەورەی بەدەسـتەوە بـوو، بـەلام هەلەکـەی لـەبار نـەبوو، دەستیان لێهەڵگرت.

جـارێکی تـر لەدۆڵـە ڕووتـەوە شـۆڕبووینەوە بـۆ قولەڕەسـی، شـەوەکەی بەرەو باخی بەختیاری. بـاوبۆرانو تـەرزەو چـەخماخە لێیکردینـەوە، مەترسـی ئەوەمان هەبوو پێشمەرگەمان تیابچن، بەهەر شێوەیەك بێ لە جـادەی سـلێمانی بـەرەو عـەواڵو کۆسـەی چـەم پەڕینـەوە بـۆ جێشـانە بـە نـاو قـوڕو قـوڕاودا، پێشمەرگە نەبوو چەند جارێك نەکەوێ هەموو گیـانی قوڕاوی نـەبێ، چـەندین

کەس پێڵاوەکانیان لە ناو قوردا بەجێما، قوڕی شارەزوور بەناوبانگە، لەوکاتانەدا پێشمەرگەیەك هەواڵی کاك عادل شکوری ئەپرسی : کوا کاك عادل چی بەسەرهات ..؟ پێشمەرگەیەك لەولاوەووتی : کاك عادل لەشوێن پێکەی نەهرۆدا چەقیوە.. نەهرۆ پێشمەرگەیەك بوو لەڕووی تەمەنەوە تازە پێئەگەیشت ، لەش‌ولارێکی کەتەو زلەی هەبوو، قاچ‌وقولێکی ئەستوری هەبوو، کاك عادلیش پیاوێکی کو رتە باڵاو لاوازبوو.. شەو لەجیشانە حەساینەوە، خۆمان‌ووشك کردەوە، بەیانییەکەی بەرەو بازیان‌و دێهاتەکانی قەرەداخ ڕۆیشتین‌و لەوێشەوە بەرەو گەرمیان‌و هەر کەرتێ بۆ سنوورەکەی خۆی. بۆ چەند ڕۆژێك حەواینەوە.

لە مانگی ١٩٨٥/٢ دا بوو کە مقۆمقۆی ئەوە کەوتەوە کە ڕژێم ئەیەوێ جارێکی تر پردی گفتوگۆ دابمەزرێ‌و بۆ ئەو مەبەستەوەفدێکی ناردبووە سەرکردایەتی یەکێتی‌و چەند ڕۆژێك مابووەوەو قسەیان لە سەر هەموو مەسەلەکان‌و ئاستەکان کردبوو، بەڵام سەرەنجام هیچی لێنەکەوتەوەو پەتی ئەم هەوڵەش پسا.

ئێمەویستمان لە گەرمیاندا دەستێك لە دوژمن بوەشێنین، دوای کۆکردنەوەی زانیاری بڕیارماندا بچینە سەر مونەزەمەی دێی لەك کە ئەکەوێتە نێوان ناحیەی نەوجول‌و قەزای دووز، کاك شێخ جەمال جێگری تیپ بوو، شارەزاییەکی باشی هەبوو لەو ناوچەیە، لە کاتی گفتوگۆدا سەردانێکی ئەوێی کردبوو، بەچاکی ڕمبایەو شوێنەکانی بینیبوو، نەخشەی پەلامارەکەی بەم شێوەیە دارشت:

هێزەکەمان کردە دوو دەستەوە:

١. دەستەی یەکەم بەسەرپەرشتی شێخ جەمال + جەوهەرو ٨ پێشمەرگە.

٢. دەستەی دووەم: بەسەرپەرشتی من‌و شێخ کەریم چاوڕەش‌و ٢٢ پێشمەرگە.

دوو بۆسەمان دانا: یەکێکیان لەسەر ڕێگای قەڵخانلوو، ئەوی تریان لەسەر جادەی نەوجول بۆ لێدانی هەر جموجووڵێکی ناکاوی دوژمن.

ڕۆژی ١٩٨٥/٣/٥ جارێکی تر ڕێگاوبان‌و شوێنەکانمان بەسەر کردەوەو نوقتەکانمان دیاریکردو گەڕاینەوە.

هەر دەستەیەك دانرا بۆ جێبەجێکردنی کاری خۆی، پێنج ئارپیجی دانرابوو بۆ پەلاماردان هەریەکەی دوو گوللە بتەقێنێ، دەستەی یەکەم بەنارنجۆکی دەستی هێرش بکەن. ئاگاداری پێشمەرگەکانمان کردەوە کەوا هەوڵ بدەن ناقیلەکەی ئەوێ بەساقی بگرن‌و دەربازی بکەن.

بڕیار بوو یەکەم ئارپیجی من بیتەقێنم، هەر لەگەڵ یەکەم گوللەدا خانووەکانی مونەزەمە یەك پارچە بوونە ئاگر، نۆ دانە گوللەیان بەرکەوتبوو، یەك گوللەش ناقیلەکەی پەکخستبوو. دەستەی یەکەم خۆیان گەیاندە ناو حەوشەی مونەزەمە کە بەرگری تێدا نەبوو، پاشان دەستەی دووەمیش خۆیان گەیاندە هەمان شوێن، تومەز ئەمنەکان خۆیان خزاندووەتە ژێر زەمینێکەوەو لەوێوە بەرگری ئەکەن. ئێمەش بەمەمان نەزانیبوو، لە سەرەتادا هەر لەگەڵ یەکەم پەلاماردا پ.م سەلام حەمید پێکراو شەهید بوو، کە بەمەم زانی بە زۆر دەستەی دووەمم لە حەوشەکە دەرکرد بۆ ئەوەی زیانی زیاتر نەدەین، دەستەی یەکەمیش بەردەوام بوون بە نارنجۆکی دەستی لەژێر زەمینەکەیان ئەدا، ئەمنەکانیش بە نارنجۆك بەرپەرچیان ئەدایەوە، لەم شەڕە نارنجۆکەدا پ.م ئەنوەر قەڵەمز لوغمانی‌و سەید ئەحمەد پێکران‌و شەهید بوون. هەموو پێشمەرگەکان کشانە دواوە، سەر لە نوێ بە ئارپیجی لێمان دانەوە، چل گوللە ئارپیجی‌و بیست‌و هەشت نارنجۆکی دەستیمان لێدان بێسوود بوو،وەختی ئەوتۆمان بە دەستەوە نەما، ناچار کشاینەوە، تەرمی شەهیدەکانمان ڕەوانە کرد بۆ دێهاتەکانی خۆیان‌و دەستکەوتەکانمان کۆکردەوەو گەڕاینەوە، لەم هێرشەدا زیانی دوژمن: دوانزە کوژراو، شکاندنی ناقیلەیەك، گرتنی گرینۆفێك بوو، جگە لە شەهیدەکان دوو بریندارێشمان هەبوو، لە دێی دوراجی تیمارکران‌و تاکو ئێوارە ماینەوە چاوەڕوانی دوژمنمان کرد هێرشمان بۆ بکات‌و تۆڵەی شەهیدەکانمان بکەینەوە کەچی بە دواماندا دەرنەچوو.

کەرتەکانمان کەوتنە جەولەکردن‌و شەڕی بچووك‌و لێدانی دوژمن لە ناوچە جیاجیاکانی سنووری تیپداو ڕۆژ نەبوو زەبر لە هێزەکانی دوژمن نەدرێ‌و لێیان نەکوژرێ‌و دەستکەوت نەبێ، بە مەشووورەی خەڵکی زۆرتر بەرز

ئەبووەوەو بەڵكو لە شەڕو پێكادانەكانـدا بەشدارییان ئـەكرد، بـە تایبـەتی لـە ناوچەی داودە خەڵكەكە خۆیان تەییار ئـەكردو زۆربـەیان چـەكیان بەدەسـتەوە بوو شێر ئاسا ئاوقای دوژمن ئەبوونەوە. ناوچەی داودە لە ساڵی ١٩٨٢ مەفرەزەی پشتگیری تیادرووست بوو بوو كە پێشتر لـە ناوچەی باشكی یەكـەم مـەفرەزەی پشـتگیریو دواتـریش لـە ناوچـەی ڕۆغزایـی مـەفرەزەی تـر پەیـدابوون وەكو ناوكێك. بەڵام نەكەوتبوونە شەڕەوە. كەچی لە ناوچـەی داودە چاكتر گەشـەیان كردو جموجووڵی زۆرتریـان هـەبوو، ئەچوونە سـەرجادەو دەسـتیان لـە دوژمـن ئەوەشـاندو شـارەزاییەكی ڕێكوپێكتریـان پەیـداكرد لەبـەرگریو ڕووبـەڕوو بوونـەوەدا بـە تایبـەتی دوای گفتوگـۆی سـاڵی ١٩٨٤ كـە دوژمـن كەوتـەوەوێزەی كوردسـتان بـە تـازەترین چـەكو تـەكنۆلۆژیای سـەردەم، خـەڵكی ئـەم ناوچـەیە لەپانتایی داودەدا سەنگەری فرەیان لێداو حەشارگەیان بۆ كـاتی هێرشـی سـوپاو پـەلاماری ناكـاوی كۆپتـەرەكان درووسـتكرد بـوو بـۆ بـەرگریو خۆپاراسـتن لـە تۆپبـارانی بـەردەوامی ڕۆژانـەو شـەوانە. ئەمـە دەوری خـۆی هـەبوو بـۆ سـەر ناوچـەكانی تـری گـەرمیانو فێـری ئـەوەی كـردن كەئـەوانیش خۆیـان چـەكدار بكەنو ڕێگە نەدەن دوژمن بە ئاسانی ناوچەكانیان پەلاماربـداو مەترسییان لـە سەر درووست بكات. سەرەتا خـەڵكی بـە پـارەی خۆیـان چـەكیان ئـەكڕی، پاشـان لەلایەن تیپەكانەوە چەكیان پێئەدرا، لـە كـاتی گفتوگـۆدا لـە ناوچـەی زەنگابـات هێزێكـی پشـتگیری درووسـت كـراو كـاك شـێرزاد عـەزیز شـەهاب سەرپەرشـتی ئەكرد، پاش گفتوگۆ هێزی پشتگیری پەرەی پێدراو لـە هـەموو ناوچـەكانداوەكو هێزی ڕەسمی پێكهێنراو لە سنووری هـەردوو تیپـی ٥١و٥٣ دا مـام سالەح گـۆڕی ئەسـپی سەرپەرشـتی ئـەكرد لـە ڕووی چـەكداركردنو تەقەمـەنی پێـدانو سازدانیانو كۆكردنەوەیان. بە ڕاستی هێـزی پشـتگیری دەوری گـرنگیـان ئـەبینی لـە بـەرگریو پاراسـتنی ناوچـەكانو هاوكـاریكردنی (هـ.پ.ك)و دەمیـان تـابلۆی گەورەیان لە سەروەریدا نەخشاندووە.

هێشتا لە مانگی ٤ دا بووین كە ڕۆژێك بەرەو سەر جادەی دووز ـ كفـری ئەچووین بۆ ئەنجامدانی چالاكییەك. چووینـە دێی پەڵكانـە، لـە ناودێـدا حـاجی

کەریممان بینی پیاوێکی زۆر ترسنۆك بوو، بانگی کردین: کێتان لەگەڵدایە..؟ برادەران ووتیان: مەحمود سەنگاوی. حاجی‌ووتی: کاکەوەرن دوو مەڕتان بۆ سەر ئەبڕم مەچن بۆ شەڕ. منیش‌ووتم: بەخوا هەرچی ماڵت هەیە بماندەیتێ هەر شەڕ ئەکەین. وەختێکم زانی حاجی تلیسایەوە، ژنەکەی هاواری کرد: باوانت شێویێ بۆ ترسنۆکیت.

ئیتر ئێمە چووینە سەر جادەی سلێمان بەگو لەگەڵ جاش شەعبییە عەرەبەکاندا شەڕێکمان کردو ١٨ کەسیان لێکوژرا. لەم شەڕەدا هەندێ پێشمەرگەی خەڵکی سلێمانیمان لە گەڵا بوو، یەکێکیان بە لایەنی سوعبەتەوە ووتی: تکایە کاك مەحمود بمانبەرەوە بۆ کوردستان‌و لەم عەرەبستانە ڕزگارمان بکە. چونکە ناوچەیەکی دەشتایی‌و قاقڕ بوو.. زەحمەتیشە کەسێك لە ناوچەیەکی ئاوەدانی‌و سەوزەلانی‌و دارستاندا پەروەردە بووبێ لەم ناوچەیەدا هەڵبکات، جگە لەمانە لە هاوینیشدا پلەی گەرما ئەگاتە ئەوپەڕی کە ئەمان پێی ڕانەهاتبوون .

هەر لەم مانگی١٩٨٥/٤ دا مەلا بەختیار هەندێ جموجووڵێ کردبوو، قسەش کەوتە ناوانەوە گوایە داوای لە سەرکردایەتی کردبوو ئیتر بە ناوی ڕێکخستنی ئاڵای شۆڕشەوە (ئاش) کار ئەکات. سەرکردایەتی لە سەرەتاوە هیچ نرخێکیان بۆ ئەم داخوازییە دانەنا بوو، ئەویش چووبووە دۆڵی قەرەداخ‌و لە دێی تەکیە بارەگای دانابوو، کۆمەڵێك پێشمەرگەو کادیری لێ کۆ بووبوەوە، جگە لەوەی زۆر لە کادیرەکانی ئاش هەبوون‌و بڵاوبووبوونەوە. خەریکی خۆڕێکخستن‌و دەرکردنی بڵاوکراوە بوون بە هۆی دەزگایەکی چاپەوە کە هەیانبوو.

دیارە هۆکاری جیاجیا هەیە بۆ پەیدابوونی (ئاش) کە لە ڕاستیشدا پەیدا بوونی ڕێکخستنێك بوو لە ناو ڕێکخستندا، ئەویش ئەگەڕێتەوە بۆ:

- ناکۆکی فیکری لە سەر کوردستانی بوون‌و عێراقی بوونی شۆڕش‌و ڕێکخستن.

- ئەماحی سەرکردایەتی کردنی شۆڕش‌وەکو دەسەڵاتی یەکەم.

ـ ناڕەزایی بەرامبەر بە گفتو گۆ. هەرچەندە ئەمەوەکو ڕووکەش بەکار هێنرا بوو بۆ هەردوو هۆکارەکەی تر.

دیارە دەمێکە مقۆمقۆی ئەم ڕێکخستنە لە ناو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا پەیدا بووبوو بە تایبەتی دوای ئازاد بوونی هەڤاڵانی زیندان نیشانەی ناکۆکییەکان لە ئاسۆوە سەری دەرهێناو لە کۆنفرانسی دووەمدا ڕوونتر دەرکەوتو بۆ هەلێك ئەگەڕان جاری بۆ بدەنو خۆیان ئاشکرا بکەن.

دوا دوایی مانگی ١٩٨٥/٤ بوو کاك حەمەڕەش جێگر تیپی ٥٧ی سەگرمە سەردانێکی تیپەکەمانی کردو ڕێکەوتین پێکەوە لە سەر جادەی کفری ـ دووز ـ بەغداد شەڕێك بکەین. کاك شێخ جەمالمان بینیو ڕۆژی ١٩٨٥/٤/٢٨ لە نزیك ناحیەی سلیمان بەگ دامەزراین، دوژمن پێی زانینو پەلاماری داین، شەڕێکی دوو کاتژمێریمان کرد کە تێیدا بەڕیوەبەری ئەمنی دووز بەناوی حەمەد لەگەڵ محەممەد سەید موسا کەئەمن بوو لەگەڵ ١٨ جاش ناشەعبیدا کوژران، سێ کلاشینکۆفو دوو دەمانچەش دەستکەوت بوو، ئێمە بریندارێکمان هەبوو، شایانیووتنە شەوی پێشووتر هێزێکمان ناردبووە ناو کفریو دەستی کوشندەیانوەشاندبوو، معاونی ئەمنی کفری بە خەستی بریندار کرابوو کە پاشتر تووشی ئیفلیجی بوو بوو، هەروەها چوار ئەمنیش کوژرابوون، چوار کلاشینکۆفو یەك بیکەیسیو جیهازێك دەستکەوت بوو، پێشمەرگەکانیش بێزیان بوون.

ئەم زەبرانەی لە دوژمن درا زۆر زۆر سەخت بوو، بە تایبەتی لە دەزگاکانی ئەمنی هەردوو شارۆچکەی کفریو دووز، بۆیە چاوەڕێی هێرشی دوژمن بووین بۆ سەر سنوورەکەمان،واشی بۆ ئەچووین لە ڕێگای سەرقەڵا ـ هۆمەرملەوە بێت، بۆیە لە دێی بەلەگە ماینەوە، هێزێکیشمان نارده زینانە بۆ ڕێگری لە هەر ئەگەرێکی هێرشی دوژمن لە دەرگای نەوجول ـ دووزەوە. بەڵام دوژمن بەپێچەوانەی بۆچوونەکەی ئێمە لە ڕێگای نەوجول ـ دووزەوە پەلاماریداین، بەهێزێکی گەورەوە کە بریتی بوو لە زیاتر لە دە فەوجی جاشی هەرکیو سوورکیو تەحسین شاوەیسو جاشەکانی سەنگاوو قادرکەرەمو دووزو

بەپشتیوانی چوار کۆپتەرو دوو پیلاتۆس‌و دە تانك‌و ٦٥ ناقیلەو چەندین تۆپی دوور هاوێژو تۆپی ١٠٦ ملم‌و هاوەنی جۆراوجۆری زۆر بەفەرماندەیی قائید فیرقەی تاوانبار بارق عەبدوڵلا حاجی حونتە.

لە ڕۆژی ١٩٨٥/٤/٣٠ لەدوو قۆڵەوە پەلاماریان داین. لە نەوجول‌و لە دووزەوە. دوژمن بە تەواوی لەزینانە نزیك بووەوە کە دوو کەرتی تیپی ٥٧و دوو کەرتی تیپی ٥١ی لێبوو، دوژمن ڕووبەڕووی قارەمانەکانی یەکێتی بووەوە، شەڕێکی دەستەو یەخە بەرپا بوو، کاك شێخ جەمال سەرپەرشتی هێزەکەی ناو زینانەی ئەکردو باش دامەزرابوون لە ناو ماڵەکاندا، سەنگەری مان‌و نەمانیان گرتبوو، تۆپخانەو کۆپتەرەکانی دوژمن بەردەوام هەناوی دێکان ئەهەژاند، لە هەموو خانوویەکەوە چڕە دوکەڵ بەرز بوو بووەوە، لە ڕێگەی جیهازی دەستی بچووکەوە ئاگاداری پەیوەندییەکانی فەرماندەی هێزی زەمینی بووین کە داوای لە کۆپتەرەکان ئەکرد لە جێگای دوکەڵەکان بدەن، فڕۆکەوانی کۆپتەرەکان‌وەڵامیان ئەدایەوە کە شوێن نییە دوکەڵی لێ هەڵنەسێ، شەڕەکە ئەوەندە گەرم بوو بوو، پەلاماری پێشمەرگە توندو تۆڵ بوو، لەهەندێ لاوە تێکەڵاوی هێزەکانی دوژمن بوو بوون، فڕۆکەوانی کۆپتەرەکان ئەیان‌ووت: نازانین کامە هێزی خۆمان‌و هێزی دوژمنە..؟ فەرماندەی هێزی زەمینیش ئەیووت: هەرچی جلی کوردی لەبەر بوو لێیبدە.

کۆپتەرەکان هەموو دەوروبەری دێکەیان بۆمباران ئەکرد بۆ ڕێگری کردن لە هاتنی پێشمەرگەو پشتگیری کە لە هەموو ناوچەکانی ترەوە بە ئۆتۆمبیل‌و تراکتۆرو ماتۆڕی سواری خۆیان گەیاندبووە ئەو نزیکانەو بەهانای هێزەکەی ناو دێی زینانەوە هاتبوون.

ئێمە دڵنیابووین کە دوژمن لەدەرگای سەرقەڵاوە نایەت، خۆمان کۆکردەوە بۆ بەهانا چوونی برادەرانی ناو زینانە، بەڵام هێزی ئاسمانی دوژمن بواری نەئەداین بەئاسانی بگەینە ئەوێ. هێزێکمان لە پێشمەرگەکانی خۆمان‌و پشتگیری ٥١و٥٣ کۆکردەوەو بە بەربڵاوی پەلامارمان داو دوژمن لەهەندێ لاوە گەڕایەوە دواوە، خۆری مابوو خۆمان گەیاندە ناودێ، لە هەمان کاتدا هێزێك لە

گەڵ کاك عەدنانی حەمەی میناو م.عەلی‌و سەید محەممەد دا لە ناوچەی جافەوە هاتبوون‌و لە قۆڵی چەورییەوە بەرەو ناودێ ئەهاتن. ئەو کاتە چوار شەهیدو پانزدە بریندارمان هەبوو، د.بێستوون کاکەیی بریندارەکانی تیمار ئەکرد، جارێکی تر ئێمەو برادەرانی تر پەلامارێکی دوژمنمان دا، بەمەش دوژمن مەترسی لێنیشت‌و لەشوێنی خۆیدا ڕاوەستاو خۆی باش قایم کرد لە شوێنێکی گرنگی ئەوپەڕی دێی زینانەو لەخوارتریشەوە هێزێکی تری مۆڵدابوو، بۆمان دەرکەوت مانەوەمان لەناو دێدا سوودی نییەو لەمەش زیاتر بەرگری ناکرێ‌و زیانی زۆرترمان لێئەکەوێ‌و خەڵکەکەش تیائەچن، تاکاتژمێری ١٠ی شەو ماینەوەو خۆمان کۆکردەوەو خەڵکەکەمان ئاگادار کردەوە لەدێکە دەرچن‌و ئینجا شەهیدو بریندارەکانمان گواستەوە. ئەو کاتەی خەڵکەکە دەرئەچوون ناقیلەیەك لە ئاستی ڕێگاکە بوو بە دۆشکا ئەو ناوەی ئەبێژا، لەوکاتەدا ژنێك لەسەر ڕێگاکە بوو زۆربەی گوللەی دۆشکاکە لای ئەودا ئەیدا لە زەوی‌و هیچ نەترسا، بانگی کردم یارمەتی بدەم‌و هەندێ کەلوپەلی بۆ باربکەم، گەڕامەوەو هاوکاریم کردو بەئەسپایی لێیدا ڕۆیشت.

چووینە دێی زینانەی سەروو، بەڕێوە هێزێکمان نارده دێکانی عەزیز قادرو تووکن بۆ ئەوەی ئەگەر دوژمن نیازی هێرشی بوو بۆ شەڕ لێیبدەن. بەڵام دوژمن پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی دێی زینانەی خوارووی بەجێهێشت‌و گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی. ئێمەش چووینەوە بۆ زینانە، دێ هەمووی تێکڕووخابوو، بوو بووە کەلاوە، لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا شارستانیەتی بەربەری یانەی بەعس ناوەڕۆکی خۆی دەرخستبوو،وەکو کوننە بەبوو تەنیا حەزی لە کەلاوەیەو ڕقی لە ئاوەدانییە. بە قەپی شۆفڵەکانی دێیەکی خنجیلانەی ناوچەی داودەی یەکسانی زەوی کردبوو، هیچ ڕووخسارێکی ئاوەدانی نەمابوو، تەنیا بۆنی مردن‌و سووتان‌و ڕووخان ئەهات،ووردەووردە خەڵکەکەی ئەگەڕانەوە سەروێرانە خاك، ئێمە زۆر دڵتەنگ‌و زویر بووین کەچی دوو پیاوی دێکە دڵیان ئەدایەنەوەو داوای لێبوردنیان ئەکرد کەماڵیان نەماوە بمانبەوەو لە پاش ئەو شەڕە سەختە نەختێك بحەسێینەوە، بە ڕاستی

خەڵكێكی مەردو خاوەن هەڵوێست بوون، نەك هەر ئەمە بەڵكو لە بەرگریشدا لەگەڵ پێشمەرگەكاندا دەوری چالاكانەیان ئەدی. پیاوێكیان ووتی: سەد جاری تر دوژمن دێكەمان بڕوخێنێ مادام بەرگری چاكی تێداكراوە دڵتەنگ نابین. ئەوەیشی لێمانگیراوە لەڕێگای مەردایەتیدا ڕۆیشتووە.

شایانی ووتنە بەشێكی زۆری خەڵكی دێكە دەرچوو بوونو بەگیان سەلامەت بوون، بڕێكیشیان دەستگیر كرابوونو دوای چەند مانگێك ئازادكران كەزۆربەیان ئاغاكانی زینانە بوون. لەم شەڕەدا زیانی دوژمن زیاتر لە چوارسەد كوژراو برینداریكی زۆر كەدوو نەخۆشخانەی مەیدانی گرتبووەوە كەرەستەو كەلو پەلی خوێناوی زۆر لەو دەشتەدا كەوتبوو. زیانی ئێمەش چوار شەهیدی پێشمەرگەو یەك پشتگیریو شوانێكی پانزە ساڵەو زیان لە مەڕو ماڵاتو تراكتۆری دێكە كەوتبوو. جگە لە سووتانی هەموو خانووبەرەو ڕووخاندنیان. پاش دوو ڕۆژ لە شەڕەكە خەڵكەكەی دەستیان كردەوە بە درووست كردنەوەو بیناكردنەوەی زینانە. لە هەموو ناوچەكانی گەرمیانەوە یارمەتیو كۆمەكیان بۆ نێردرا. كەئەمەش بوو بووە داب، لە دوای شەڕی عەلیانی ساڵی ۱۹۸۳و سەیدخەلیلی ساڵی ۱۹۸٤، ئەمە یەكەم شەڕی گەورەو گرانی ناودێ بوو كە بەو بارستاییە دوژمن پەلاماری بداتو زیانیوا فراوانیشی لێبكەوێ. جگەلەوە ئەمە سەرەتای دەست پێكردنی سیاسەتی ڕووخاندنی دێهات بوو دوای گفتوگۆ بەمەبەستی تۆقاندنی خەڵكیو گوشار خستنە سەر هێزی پێشمەرگە، كە هێشتا شەڕی بەرەیی نەهاتبووە كایەوە كە ئەمەش مستلزماتی خۆی هەیە چ لە ڕووی ژمارەی پێشمەرگەو جۆری چەكو لایەنی لۆجستیكیو خۆسازدان بۆی كە تا ئەو كاتە بە چەندین قۆناغی جیاجیای شەڕدا تێپەڕی بووینو سەركەوتنمان بەدەستهێنابوو هەر لە مەفرەزەی بچووك تا هێزی گەورەو ڕەبایەگرتنو شەڕی ناودێوە.

لە هەموو بارەكاندا هێزو توانامان لەگەڵ دوژمندا بەراوورد نەئەكرا. بە ڕای من شەڕی زینانە خاڵیوەرچەرخان بوو لە ڕووبەڕوو بوونەوەداو دەرسێكی باش بوو زۆر لایەنی بەرگریو تەكنیكی شەڕی بەعسی فێركردین.

ئەمەوای لێکردین خۆمان چاکتر ساز بدەینەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی دەسەڵاتی فاشیەت بەدەستوەشاندنی توندترو بوار نەدانە دوژمن و هێزەکانی تابجەسێنەوە.

پاش ئەم شەڕە لە سەرکردایەتییەوە داوای هێزێکی تیپەکانی ٥١و ٥٣ یان کرد بۆ دۆڵی ئاکۆیان بچێ، ڕۆژی ١٩٨٥/٥/٢٤ هێزەکەمان کۆبووەوەو بڕیار بوو بگەنە بازیان، کەچی فریانەکەوتن و لە هەنارە مانەوە، کە دانرابوو ڕۆژی دواتریش بەئۆتۆمبیل لە بازیان بیانگرمەوە، دوژمن ئاگاداری ڕۆیشتنی ئەم هێزەبوو، بەیانی ڕۆژی ١٩٨٥/٥/٢٥ بە دزە هێزێکی ناردبووە سەر ڕێگای ڕۆیشتنی هێزەکەمان لەسەر شاخی سەگرمە، بەڵام پێشمەرگەکان بەم هەنگاوەی دوژمنیان زانی و پەلاماریان داو لەسەنگەرەکانیان هەڵکەنران و لەو کاتەدا ئێمەش فریاکەوتین، شەڕ بەگەرمی دەستیپێکرد، دوژمن شکاو چوار تەرمی جاش لەبەردەستماندا کەوتبوو، لەو کاتەشدا چوار کۆپتەر هاتنە سەر مەیدانی شەڕەکە، لە چەمچەماڵیشەوە هێزێکی تر بەهانای هێزە شکاوەکەیەوە هات بۆ تۆڵەسەندنەوە، تا کاتژمێر چواری ئێوارە شەڕ درێژەی کێشا، ئەم هێزەش وەکو ئەوەی پێشوو لەبەرزییەوە خلۆربووەوە، ئەوەی تازە بوو لەم شەڕەدا کۆپتەرەکان بۆ یەکەمجار قومبەلەی چارەکە تەنییان وەشاند بەڵام یەکێکیان پێکرا. تاقی ئێوارە کەس و کاری جاشە کوژراوەکان هاتن بۆ بردنەوەی تەرمەکانیان و ئێمەش وەکو ئەرکێکی مرۆڤایەتی پێمان دانەوە، زیانی ئێمە بریندار بوونی پێشمەرگەیەك بوو. دوای تەواو بوونی شەڕەکە بەوورەیەکی پۆڵایینەوە بەرەو دیوی بازیان ئاوابووین و لەوێشەوە بەرەو سنوورەکانی مەڵبەندەکانی سێ ودوو. کەگەیشتینە بارەگای مەڵبەندی سێ لەسماقولی فرۆکە جەنگییەکانی دوژمن هاتنە سەرمان و بۆردومانیان کردین، هەندێ خانووبەرەی دێکە بەرکەوتن و ئاگریان تێبەربوو، یەك پێشمەرگەشمان بریندار بوو، دایکی شەهیدێکمان پەلی ئەو بریندارەی گرتبوو ،بۆناودارەکانی برد نەوەك جارێکی ترفرۆکەکان بێنەوەو لێیان بداتەوە.. پێشمەرگەکە بەدەم ڕێکردنەوە لەدایکە شەهیدەکەی ئەپرسی : ئەرێ پورێ نامرم ..؟ پوریش دڵخۆشی ئەدایەوە : نا ..

ڕۆڵە گیان ئیشاڵڵا نامری . ئەم پێشمەرگەیە ساڵەحی ناوبوو لەبەرئەوەی فرۆکەی سیخۆ لێی دابوو ناویان نابوو ساڵح سیخۆ ..بۆ ڕۆژی دواتر کەوتینە ڕێو گەیشتینە شوێنی مەبەستو چاومان بەکاك نەشیروان کەوتو پێی ووتین کەوا بچینە سەر شاخی کوڕا شەل کەلەوەو پێش تیپی ٢٥ خاڵخاڵان چۆڵیان کردبوو، کە سەرکەوتین دوژمن بۆماوەی شەوو ڕۆژێك بێووچان تۆپبارانی کردینو ژیواری تاڵ کردین، ناچار بووین بێبڕیار دابەزینە خوارەوە، لەسەر ئەمە کاك نەشیروان گلەیی لێکردینوووتی: من نامەم بۆتان نوسیبوو دابەزن، بەڵام ئەبوایە بەگەیشتنی نامەکە دابەزینانە، نەك پێشترو بەبێبڕیار.

لەو ناوچەیە چەند شەڕێکمان کرد، لە دۆڵە ڕەقە بە توندی بەرگریمان لە پێشڕەوی هێزەکانی دوژمن کرد. ڕۆژی ١٩٨٥/٧/٢ لە دۆڵی ئاکۆیان چالاکییەکی گەورە ئەنجامدرا کە زنجیرە ڕەبایەیەك گیراو کۆمەڵی کوژراو دیلو دەستکەوت هەبوو، ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەستوەشاندێکی کوشندە بوو لە دوژمن، گەرچی چاوەڕوانی ئەنجامی باشتر ئەکرا لە چالاکییەکەدا، بەڵام بەهۆی کەموکوڕی لە جێبەجێکردنی نەخشەکەدا ئەوەی دانرابوو بکرێت نەبوو کەچی بەتوندی دوژمنی تەزاند. جێی داخە کەلەم نەبەردییەدا مەحمودی حاجی فەرەج کەسەرتیپی ١٥ی شارەزوور بوو شەهید دەبێ .. شەهید مەحمود کۆکۆییەو خەڵکی سنووری هەڵەبجەی شەهیدەو یەکێك بووە لە لاوە جوانو جوامێرەکانی هەڵەبجەو لەسەرەتای شۆڕشی نوێوە پێشمەرگە بووەو لەزۆربەی چالاکییەکانی سنووری هەڵەبجەو شارەزووردا بەشداریکردووەو کەسێکی بزێوو چاونەترسو دەستوەشێن بووەو کەرتەکەی یەکێك لەکەرتە هەڵسوڕاوەکان بووەو بۆ یەکەمین جار ئاربیجیان لە بینای تەلقیحەکە داو شەهید مەحمود دەستی لە تەمبێ کردنی پیاو خراپانی سەر بە ڕژێمی ئەوسنوورەدا هەبوو .

پاش ماوەیەك هێزەکان گەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان، هەر لەو کاتەدا کە (ی.ن.ك) بەشێوەیەکی سەرەتایی پەیوەندی دۆستانەی سەر لە نوێی لەگەڵ ئێراندا بەست، دوای ئەوەی پردی پەیوەندییەکانی پسابوون لەو

سونگەیەوە مانگی ١٩٨٥/٨ کۆمەڵێ بریندارمان گەیشتە ناوخاکی ئێران بۆ چارەسەر، ئەمەش بووە مایەی پەیوەندییەکی پتەوو چەسپاوتر بۆ پاشەڕۆژ.

ئەم دۆستایەتییە لە دوای تێکچوونی گفتوگۆی شۆڕش لەگەڵ عێراقدا بوو. بە ڕای من هەنگاوێکی پێویستو کردەیی بوو، دەوری سیاسیو سەربازی خۆی هەبوو لە لایەن عێراقەوە حیسابی زۆری بۆ ئەکراو کەوتبووە شڵەژانەوە، چونکە یەکێتی لە مەیدانی کاری خەباتدا جێگەو قورسایی خۆی هەبوو، هێڵی سیاسی سەربەخۆیی خۆی پاراستبوو، لە ناوجەرگەی ڕووداوەکانی گەلەکەماندا پێگەی خۆی داکوتیبوو. زەبرو گوشارێکی فرەی خستبووە سەر عێراقو زیانی مادیو مەعنەوی پێگەیاندبوو، ئەمەشوای لەبەعس کرد بێسڵکردنەوە هەرچی ڕێگای نارەواو نالەباری هەیە بیگرێتەبەر بۆ لێدانی کورد.ئەمە یەکەمین پەیوەندی دۆستانە نەبوو لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێکاندا ببەسترێ، بەڵکو لە بەر هەلومەرجی شۆڕشی کوردو پێویستی قۆناغی خەبات مامەڵەی لەم بابەتە کراوە، سەرەنجامەکەشی بەندبووە بەهەلومەرجی سیاسیو ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییەکانو هۆشیاری لەبەکارهێنانی شێوازی زیرەکانەی ئالۆگۆری مەسەلەو بابەتە گرنگەکانو پابەندبوون بە تاکتیکو ستراتیژییە بنەڕەتەکانی شۆڕشو جۆری هەڵبژاردنی هەڵوێستەکانی لە قازانجی هەردوولا. عێراق ترسێکی گەورەی ئەم دۆستایەتییەی لێنیشتبوو حیسابی تایبەتی بۆ ئەکردو لەڕێگای دەزگا جاسووسییەکانییەوە هەڵپەی زانیاری بوو بۆ تێگەیشتن لێی. لە گەرمەی ئەمەوەزعەدا ئێمە لە ناوچەکانی خۆماندا بووین بۆ دەستوەشاندنو لێدانی پێگەکانی دوژمنو شڵەژاندنیووەڕسکردنی.

ڕۆژێکی مانگی ١٩٨٥/٨ لەگەڵ کەرتی یەکدا هێزێکمان بردو لە کانی شیرینەکەی قادرکەرەم بۆسەیەکمان بۆ کاروانێکی سەربازی دانا کە بریتی بوو لە ناقیلەیەکو دوو ئۆتۆمبیلی هێزی پڕ لە جاش ناشەعبی. هەرکە ئۆتۆمبیلی یەکەم نزیك بووەوەو کەوتە ناو داوەکەوە لێیهاتینە دەستو بەیەکەم دەستڕێژ ١٢ کەس کوژرا. ئێمەش بێزیان بۆ دێی برایم غولام کشاینەوە.

دوژمن لە تۆڵەی ئەم زیانەی کەوتە کاتیۆشابارانی دێی برایم غولام. خۆشبەختانە نەپێشمەرگەو نەخەڵکی زیانیان لێنەکەوت ئێمە لە جەولەی

ناوچەی داودە بووین، ڕۆژێك سواری ئۆتۆمبیلیەکی شلەخەجێ بووین، بە پێشمەرگەکانم ووت: ئاگاتان لە ئاسمان بێت،ووریا بن نەك کۆپتەر بێتە سەرمان، چووینە زینانە، لەوێشەوە بەرەو بەلەگە کە زۆر دەشتاییە، کە چووینە ڕووی بەلەگەدا تەماشام کرد دوو کۆپتەر لە پێشمانەوە بەئاسمانەوە ئەسووڕێتەوە، بە پێشمەرگەکانم ووت: برادەران ووریان،ووتیان: بەڵێ ووریاین،ووتم: ئەی کوێراییتانە، ئەو دوو کۆپتەرە نابینن، شۆفێرەکە شپرزە بوو، ئۆتۆمبیلەکە تۆزێك لار بووەوە خەریك بوو خۆی بخاتە ناو دارەکانی بەردەم دێکە،ووتم: پێچ کەرەوەو بڕۆ بۆ ناو دێکەو چوو بۆ ناودارەکان، کە هاتە سەریشمان تەقەی لێئەکەین، زۆر بە پەلە چووینە ناو دێکەو کۆپتەرەکان فریا نەکەوتن بێنە سەرمان. دابەزین لە ناو دێکەدا دابەش بووین و شوێنی خۆمان گرت. پیاوێکی پیر لەگەڵ ژنەکەیدا لەپەنا دیواری خانووەکەیانا دانیشتبوون ووتی: ئەوەچییە..؟ووتم: مامە حاجی ئەوە کۆپتەرە ئەسووڕێنەوە. ووتی: جا چی ئەکەن..؟ووتم: بۆ..؟ووتی: ئەوەوەکو قوشەکەی میر سمایل وایە. میر سمایل قوشێکی هەبوو، هەموو ڕۆژێ ئەیبرد بۆ ڕاو هیچی نەئەکوشت، کە ئەهاتەوە هەرچی مریشکی دێکە هەبوو ئەیخوارد.ئەو ئەزانێ ئێوە چەکتان پێیە پێتان ناوێرێ دوای ئێوە غەزەبی خۆی ئەخاتە ملی خەڵکەکە.

سەرەتای مانگی ١٩٨٥/١٢ بوو کاك مەحمود گەرمیانی کە جێگری تیپی ٥٣ ی شێروانە بوو تازەش لە شارەزوورەوە بۆ ئەو سنورە گوێزرا بووەوە بۆ ئەنجامدانی هەندێ کاری شۆڕش شەوی ١ـ١٩٨٥/١٢/٢ ئەچێتە دێی تازە دێی سەر جادەی کەلار ـ باوەنوور کە ڕەبایەیەکی سەربازی دوژمن لە سەر گردی دێکەوە بوو، سەرەڕای ئەوە ئەم دێیە بوو بووەوێستگەیەکی گرنگی هاتوچۆی خەڵکی بە ئۆتۆمبیل و تراکتۆر بۆ گواستنەوەی کەل و پەل و خواردەمەنی لە شارۆچکەکانەوە بۆ ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی شۆڕش کە بە بڕیاری سەربازیی بەعس قەدەغە کرابوو لە ئەنجامی ئەو ئابلۆقەیەی خرابووە سەر دێهاتەکان. زۆر خەڵکی ئەکەوتنە بەر ڕێژنەی دەستڕێژی چەکەکانی دوژمن و جاریش

هەبوو دوژمن لە دەوروبەری ئەو ناوە بۆسەی دائەناو خەڵکیو پێشمەرگەشی تێئەکەوت.

دوای ئەوەی کاك مەحمود گەرمیانیو برادەرەکانی کارەکانیان تەواو ئەکەن بە ڕێگەی دێی هەسەن محەدا ئەگەڕێنەوە بۆ ژاڵەی سەفەر، هێزێکی جاشەکان لە نێوان ئەو دوو دێیەدا کە جێگەی گومان نەبوو بۆسەیان بۆ دائەنێن، کە پێشمەرگەکان بە سەیارەکەی سابیرە بچکۆل دێن ئەکەونە ناو ئەڵقەی بۆسەی جاشەکانەوە، یەکەم دەستڕێژ کاك مەحمود گەرمیانی بەرئەکەوێو بریندار ئەبێو پێشمەرگەکانیش تەقە لە جاشەکان ئەکەنو ڕاویان ئەنێن. دواتر کاك مەحمود ئەگوێزنەوە بۆ دێیوڕێڵەو گیانی پاکی بە کوردستان ئەبەخشێ.

ئەو کاتەی کاك مەحمود ماڵی لەوڕێڵە ئەبێ دراوسێتی لە گەڵ خەڵکەکەیدا بە تایبەتی ماڵی هەڤاڵان : سەلاّحی کوێخاو کاك مەحمودی مراد عەلی خۆش ئەبێ، جارێکیان ئەڵێ: خۆزگە کە ئەمردم هەر لە ناوئەماندا بمردمایە.وارێکەوت بە برینداری لە ماڵی کاك مەحمود مراد عەلی دا گیانی سپاردو شەهید بوو.

کاك مەحمود یەکێك لە ڕێکخستنە دڵسۆزەکانی کۆمەڵە بوو، هەستی کوردایەتی زۆر بتەو بوو، ڕەنجدەرێکی بە هەڵوێست بوو، کە بوو بە پێشمەرگەش فرە لێهاتوو بوو، فەرماندەیەکی بە توانای لێدەرچوو. قسەی زۆر خۆشو گفتاری شیرین بوو، حەزی لە نوکتەو توانج بوو، لە ناو پێشمەرگەدا سەدان قسەو نوکتەی دانسقەی لێبەجێماوە: ئەو کاتەی لە شارەزوورەوە نێردرایە گەرمیان هەمیشە بیری شارەزووری ئەکردو ناوی ئەهێنا، جارێکیان لە گەڵ عەلی شەهید محەممەددا بە سەردان ئەچێتەوە شارەزوور، شەو ئەبێ کارەبای ئەو شارۆچکەو دێهاتانە ئەگرا ئەویش بانگی کردبوو: ئایتە هەموو شارەزوور چۆن بریسکەی دێ خۆ لە گەرمیاندا مەگەر بە لوورەی سەگو زەڕەی نێرەکەر دێهات بدۆزرێتەوە.

جارێکیشیان برادەرانی تیپی ٥٣ خۆیان بۆ چالاکییەك ئامادە ئەکەن، لە کانی چایلە تووشی شەڕی دەستەو یەخە ئەبنو بە تانكو سەربازو جاش

دەوریـــان ئــەگیریّو کۆپتــەریش لــە ســەرەوە هێڵــەیان پــێ ئــەکات، ڕێگــەی دەربازبوونیان نابێ، کاك مەحمود هاوار ئەکات: گەرمیانی ئەوەنە دۆو دۆینەی ترشیان خواردووە شێت بوونو چاویان نابینێ هەرئەوەنە ئەزانن بڵێن با بڕۆین.

جــارێکیشیان کــاك مەحمــود ئــەچێتە دێــی بووەکــە مامــە قالــە سەلیبێکی پێبوو نۆرەی ئەکرد، کاك مەحمود سەری نابووە سەری نیشانێك بشکێنێ، ئەو هەر نیشانەکەی نەئەشکاند، کاك مەحمود پێیووتبوو: ئەم سەلیبەت بۆچییە..؟ووتبووی: جاشی پێئەکوژم. کە کاتێ دوژمن پەلاماری کانی چایلەو دەوروبەری دابوو، مامە قالە هێزەکەی دوژمنی بە سەلیبەکەی دابووە بەر تەقە، دوژمن شوێنی کەوتبوو تا لە دێی دەنگەوەرە شەهیدیان کرد.کاك مەحمودیش ئەمەی زۆر پێناخۆش بوو لە بەر خۆیەوە ئەیووت:

**مامە قالەی کۆڵنەدەر　　　　تەقەی کردوە لە کۆپتەر**

**باشکی دا لە بلدۆزەر**

ساڵی ١٩٨٥ بەرەو کۆتایی ئەچوو، بەڵام ئاسۆیەکی گەشتر لە بەردەم جووڵانــەوەی شۆڕشــگێڕانەی گەلەکەمانــدا دەرئەکــەوت کــەدەمێك بــوو بــە ئاواتیوەها کاتێکەوە بووین. ئەویش مەسەلەی ئاشتبوونەوەی گشتی هێزەکانی سەر ساحەی خەباتی کوردایەتی بوو کە (ی.ن.ك) هەر لە سەرەتاوە بانگەشەی بۆ کردووە، لە جیاتی خوێن ڕشتنی ناوخۆو بێهوودەیی شەڕی کوردایەتی هەموو تواناکان یەکبخرێنو یەك دەست ڕوو لە لێدانی داگیرکەر بکەین. لە دیدێکیواقیعبینانەوە سیاسەتی خەباتی درێژ خایەنەو بەرگری هەمەلایەنە دابڕێــژرێتو چاو لەبەرژەوەندی تەسکی حیزبایەتی بپۆشرێتو تاکڕەوانە بەرنامەی کاری شۆڕش ئەنجام نەدرێو دوژمن سوود لەو پەرشوبلاوی تواناو هەوڵەکانی لایەنە جیاجیاکانیوەرنەگرێ کەبێگومان ئەو هەموو ماڵوێرانیو جۆگەلــەی خوێن هەڵبەســتنو شەڕوشــۆڕانە ئــەنجامی نــاکۆکی کوێرانــەو تێنەگەیشتن لە ئەرکە ناسکەکانی سەرشانمانو تەنیا تەماشا کردنی تاك

لایەنەی بەرژەوەندییەکان لە بەرامبەر دوژمنانی بەهێزو خاوەن ئەزموونی فێلاویو لە ناوبردنی یەکڕیزیو تێکبەردانی لایەنەکانی سەر مەیدانی خەبات بووە.

ئا لەم ڕوانگەی هەست کردنو دەرك بە لێپرسراوێتییەوە برایانی شۆسیالیست دەست پێشکەرییان کردو یەکەم لایەنی (جود) بوون بەتەنگ بانگەوازی ئاشتبوونەوەی گشتییەوە هاتنو سەرەتا لەشارەزوور هەردوولا لای سۆشیالیست پێکەوە دانیشتنو نوێنەری یەکێتی کاك شەوکەتی حاجی مشیرو نوێنەری سۆسیالیست کاك حەمەی حاجی مەحمود بوو دوای تاوتوێکردنی مەبەستە گرنگەکانو ئەنجامەکەی ڕێککەوتنێکی ناوچەیی بوو لەهەمان کاتدا زەمینە خۆشکردن بوو تا سەرکردایەتی هەردوولا لەنزیکەوە بکەونە گفتوگۆوە .. لەڕستیشدا ئەمە هەنگاوێکی بوێرانە بوو بۆ پشتکردنە شەڕو گەڕانەوە بۆ باوەشی یەك سەنگەرو دوورگرتن لە ناکۆکییە لاوەکییەکان . ئەم کارەش دنیایەکی ڕازاوەتری لە هەموولایەکدا خەملاندو نوقلانەی ئەوەی لێکەوتەوە هەموو لایەنەکانی تریش هەمان هەنگاو هەڵبگرن کەلەڕاستیدا دەستی دۆستایەتیشی لەپشتەوە بوو. دیارە یەکێتی بوونی حیزبو ڕێکخراوو لایەنەکان ڕەت ناکاتەوە کە لە خزمەتی کوردایەتیو بەرژەوەندی گشتی نیشتمانیدا بن. بۆیە بەمە دەرگاکەوالا کراو قفڵە داخراوەکان شکێنران. گەرچی یەکێتی لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا لەگەڵ هێزەکانی تردا هەوڵی ئاشتبوونەوەو ڕێکخستنی پەیوەندییەکانو یەك هەڵوێستی بۆ یەکخستنی هێزو تواناو پوچەڵکردنەوەی پیلانی داگیرکەران. بەڵام لە ناوخۆشەوە هەلایەکی تر هەبوو. ئاراستەی تێکدابوو، مەترسی قڵیشانەوەو پەرتبوونی ڕیزەکانی لە پێش بوو. گەرچی لە ڕاستیدا هیچ شتێکیوا لە ئارادا نەبوو ئاگری ئەوبارە خۆش بکات بەڵام دەنگێکی نەشاز سەرتاپای گیانی ئەسمی. ڕەوایە لەناو هەر حیزبو ڕێکخراوێکی سیاسیدا ڕەوتی فیکری جیا خۆی بنوێنێ، بەڵام بە ئاقاری خزمەتی بەرنامەی ستراتیژی، نەك بۆ مەبەستی تێکدەرانەو هەلاهەلا کردنی جەستەی بریندار شۆڕشێك لە هەنگاوی یەکەمیدا ئەیەوێت شناسنامەی خۆی بچەسپێنێت. ئەو

دەنگە هەتا ئەهات تەشەنەی ئەکرد بە ناوی ئەوەی جیاوازی فیکری هەیە. ئەبێ هێڵەکان لە یەکتر بترازێن‌و هەریەك لە خانەی خۆیدا دەربکەوێ. یەکێتی لە بنەڕەتدا یەکێتی‌و یەکگرتنی چەند لایەنێك بوو لە ئاستی خەباتی کوردستانیدا، ڕاستە ئێمەوەکو کورد داگیرو دابەشکراوین‌و هەر بەشەش تایبەتمەندی خۆی هەیەو ئەبێ بەپێی هەلومەرجەکان هەڵبسووڕێنی بەسوودوەرگرتن لەو مەسەلانەی دێنە پێشەوە لە ئاستی ناوچەکەو دنیادا. هەرکەووتمان کۆمەڵە بەپێی فیکری مارکسیزم ـ لینیزم کارئەکات، مانای‌وانییە کوتومت بەندەی ئەو فیکرو هەڵوێستە دیاریکراوانەی ئەو بن بەبێ ڕەچاوکردنی تایبەتمەندی خۆمان، بەلاّم ئەو دەنگە ئەوەیان بە گوێی خەڵکیدا ئەدا کە ئێمە ئەبێ لە چوارچێوەی بازنەی گشتی فیکریدا بین‌و خەباتی سەرتاسەری بۆ ڕزگاری گەلانی عێراق بکەین کە جەمسەرەکەی لە خەباتی کرێکاراندا خۆی ئەنواند بەمەش تایبەتمەندی کوردستانی لە بیر ئەکراو ئەخرایە بنی گۆمەوەو بەمەش جارێکی تر لە ئەڵقەیەکی‌وونبوودا خۆمان‌وێڵ ئەکرد، سەرەتا داش عێراق‌و پاشان عێراقچێتی بووەوێردی سەرزمانی ئەو خەڵکەوێلانەی کرمی ناو کتێبی مارکسیەت‌و سەرلێشێواندنی گەلەکەمان کەلەبەردەم مەترسی لەناو چوونی دوژمنی داگیرکەردا قەتیس مابوو. ئەوانە هەر بەو دەنگەوە نەوەستان بەڵکو بوونە خاوەنی هێڵی فیکری جیاوازو بەو ناوەشەوە لەژێرەوە بلاّوکراوەو پەخشنامەیان دەردەکردو بگرە لەچوارچێوەی ڕێکخستنێکی نهێنیدا بەناوی (ئالای شۆڕش ) کاریان ئەکرد.پەیوەندی بەزۆر خەڵکی ناوشارەکانەوە ئەکرد،وورتەووورتیان خستبووە ناو پێشمەرگەو فەرماندەکانەوە، ڕۆژانە بۆچوونەکانیان لە لای خەڵکی ساویلکە ڕەنگی ئەدایەوە، نەك هەر ئەمە بەڵکو لە شەڕی ساڵی ١٩٨٢ لەگەڵ جود داو لەسنووری قەرەداخ‌و لەو هەڵوێستەی لەگەڵ حشعدا ناوەڕۆکیان دەرکەوت‌و بەبێ بڕیاری سەرکردایەتی سازشێکیان کرد. دوابەدوای ئەوەش هەندێ کەسی کاڵفامیان هەڵنا بۆ ئەنجامدانی یاخیبونێکی عەسکەری لە گەرمیاندا بە مەبەستی تاقیکردنەوەی هێزو لایەنگرەکانیان کەئەگەر سەربکەوتنایە شوێنەکانی تر

بەئاسانی ڕەدوویان ئەکەوتن. بەڵام ئەم هەوڵەیان هەر لە جێگادا تووشی ئیفلیجی هات‌و پەکیکەوت. لە کاتی گفتوگۆشدا کاك مەلا بەختیار سەردانێکی دەرەوەی کردو هەندێ‌وەرەقەی کرچ‌وکاڵی فڕێدا جێگەی خۆی نەکردەوە، لە ناوخۆشدا جموجووڵێکی زۆری ئەنواندو سەردانی خەڵکێکی زۆری لە سلێمانی‌و گەرمیاندا کردو هەندێ لەدەوری خڕبوونەوە، هەندێ جار لە ڕێگەی شەڕفرۆشتن بە هەندێ خەڵکی ئەویستڕا ئاگری ناکۆکی‌و تەقینەوە خۆش بکرێ‌وەکو ئەوەی لەسێوسێناندا ڕوویداو هێزێکی گەرمیان ڕژایە ناوچەی قەرەداخ‌و لەبەردەم ئەمری‌واقیعدا پاشەکشەیان کرد. جموجووڵە نهێنییەکانی ڕێکخراوەکەیان لەو دێهاتانەی تەکیەو سێوسێناندا بەڕێوە ئەبرد،وەنەبێ سەرکردایەتی یەکێتی‌و کۆمەڵەش لەم کارە بێ‌ئاگابن.

سەرەنجام لەکۆتایی مانگی ١٩٨٥/١٠ دا کاك مەلا بەختیار بانگ کرا بۆ سەرکردایەتی بۆ خۆساغکردنەوەی خۆی لەمەڕ ئەو دەنگ‌و باس‌وزانیارییانەی لە بەردەستدا بوون، ئەو لەبەردەم سەرکردایەتی نکوڵی لەوە نەکردو خۆی‌واپێشاندا کە خاوەنی ڕێکخستنێکی جیایەو خۆشی ڕاتەگەیەنێ، ئەمە زەنگی مەترسییەکی گەورە بوو ناخی یەکێتی‌و کۆمەڵەی ڕاتەکاند، کار لەکار ترازابوو، ئەو هێڵی سووری کێشابوو، ئەبوایە نەخشەکەی پووچ بکرێتەوە پێش ئەوەی بکەوێتەخۆ، ڕێگەی درا بگەڕێتەوە قەرەداخ، بۆ ئەم مەبەستە ڕۆژی ١٩٨٥/١١/٢ کاك جەبار فەرمان‌و کاك سامان‌و دەستەیەك لەپێشمەرگەکانی مەڵبەند چوونە سەر بارەگاکەی لەتەکیەو بەئاسانی دەستگیر کرا، هەندێ پێشمەرگەو کادیر لە دەوری بوون ڕایانکردو خۆیان گەیاندە ئێران‌و لەوێ جێگایان بۆ خۆیانکردەوەو لایەنەکانی تری‌وەکو پارتی‌و حسك‌و حشع باوەشیان بۆ گرتنەوەو لە خواریشەوە ڕێکخستنەکانیان ئەجووڵان‌و هەندێك لە پێشمەرگەکانیان لە سنوری قەرەداخ‌و گەرمیاندا بە پارتیزانی ئەژیان‌و کاری حیزبییان هەڵئەسووڕاند، هەرچەندە ئەمانە لە ناوخۆی خۆیاندا هێزێکی یەکگرتوو نەبوون، ناکۆکییان لە سەر زۆر مەسەلە هەبوو، گومان ئەکرا بتوانن قورساییان هەبێ‌و بەرەکە لە ژێرپێی کۆمەڵە بە ئاسانی دەربێنن.

له سەرکردایەتیشەوە هێزێك بەسەرپەرشتی كاك شەوکەت نێردرابوو بۆ گواستنەوەی بۆ دۆڵی جافایەتی. بەم جۆرە ئەستێرەی بەرگری کردن لە بەرنامەیەکی نامۆی عێراقیانە بەناوی کرێکاران‌و دژ بەئیرادەی کوردستانیەتی خەبات داچۆڕا کە لەبنەڕەتدا کارێکی تێکدەرانەو پیلانێکی داڕێژراو بوو نەك هەر سەری نەگرت بەڵکو بەرگەی هەڵمەتی دەستەیەك پێشمەرگەی نەگرت، ئەگەرچی ئەوانەی لەگەڵیدا بوون کوڕی ئازاو تێکۆشەری ڕۆژی تەنگانە بوون.

له بەردەم سەرکردایەتیشدا لەبری بەرگری لە هەڵوێستەکانی خۆی‌و ڕاستی هێڵی فیکری‌و دیدو بۆچوونەکانی لە بەرزییەوە تلیسایەوەوخۆی پێڕانەگیرا، مەلاو ئاش زەربەیەکی کوشندە بوون لە شۆڕش، بوونە مایەی پشێوی مێشکی خەڵکی‌و سەرلێشێوانی هەندێ کادیرو پێشمەرگەی دڵسۆز. ئەمەش سوودی زۆرتری بۆ دوژمن هەبوو. کە یەکێك لە کارە ترسناکەکان فەرامۆشی ئەو لایەنە بوو،وایانئەزانی شتێك ئەنجام ئەدەن لە دەرەوەی بازنەی بیروپیلانەکانی دوژمن‌و ئەو لێی بێئاگایە یان خۆی تێناگەیەنێ. ئەمە کارێکی هەرزەکارانەی سیاسی بوو، دوور لە لێکۆڵینەوەو نەخشە داڕشتن، تەنیا شوێن هەندێ سات‌و سەودای بیری منالآنەی سەرپەڕ کەوتبوون کە تموحی بوون بە سەرکردەی پاشەڕۆژو جڵەوی خۆ بەزلزانی‌و ڕاسترانی کەوتنە دەست لە پشت ئەم هەنگاوە بووەوەکو گرێیەکی دەروونی تووشی بوو بوون نەك پێداویستییەکی قۆناغێکی خەبات‌و تێکۆشان بێ، کە ئەگەر لەم هەوڵەدا سەرکەوتوو بوونایە کارەسات نەقەوماو کەلێنێکی دژوار لە گیانی (ی.ن.ك)دا درووست ئەبوو کە لایەنی تر زەمینەی بۆخۆش ئەرکرد. گرتنەکەی دەنگدانەوەی جیاجیای لێکەوتەوە، بەشێك بە تیرۆری بیری لە قەڵەم ئەدا، کە لە ڕاستیدا ئەمە قسەیەکی بێ بناغەیە، هیچ حیزب‌و ڕێکخراوێك پێی خۆش نییە پارچە پارچە بکرێ‌و بەرنامەکانی تێکوپێك بدرێ. بەشێکیش بەتوندی ئەم گرتنەیان پێ ڕەوا بوو، بەڵکو داوا ئەکرا ئەگەر تەسفیەی جەستەیی نەکرێ ئەوا یان لەبەردەم دادگایەکی حیزبیدا سزابدرێ یان‌وەکو لاتە سیاسییەك بەبێدەنگ بمرێ.

ڕۆژی١٥/ ١٢/١٩٨٥ پلنیۆمی کۆمەڵە لە دێی بەرگەڵوو بە ئامادەبوونی ٦١ کەس لە کادیرە سەرەکییەکانی کۆمەڵە گیرا. کۆمەڵێك باسی گرنگی تیاخرایە بەردەست یەکێك لەوانە مەسەلەی مەلاو ئاش بوو، کە تێکڕای دەنگ کادیرە سیاسیو عەسکەرییەکان داوای تەسفیەی جەستەییان ئەکرد.تەنیا یەك هەڤاڵ ڕای وابوو کە کوشتنی سیاسی بێ. سەرەنجام مەبەستی دووەم جێگرکراوو مەسەلەی کوشتنی دوورخرایەوە، کە لەو کاتەدا هیچ ڕێکخراوێکی سیاسی بەرامبەر بەوانەی کاری جیابوونەوەو تێکدانی ڕیزەکان ئەنجام ئەدەن لێخۆش بوونی نەبوو. لەکاتی بەستنی پلینۆمدا ڕژێمی عێراق هێرشێکی سەختی تۆپبارانی کردە سەر دۆڵی سەرگەڵووو بەرگەڵوو، چونکە ئەیزانی کۆمەڵە پلینۆم ئەبەستێ ، بەسەدان ڕۆکێتی کاتیۆشاو گوللە تۆپ ئەیدا لەو دۆڵەو زیانی زۆری گیانیو ماڵی لەخەڵکی سەرگەڵوو کەوت بۆیە برادەران ئەو پلینۆمەیان ناونا : پلی تۆپ .

پاش ئەم ڕووداوە لە مەڵبەندی یەکدا ئاڵوگۆڕێك کرا کاك جەبار فەرمان نەقڵی سەرکردایەتی کراو کاك شەوکەتی حاجی مشیر کرایە لێپرسراوی مەڵبەند.

لە دوا ڕۆژەکانی مانگی ١٢/١٩٨٥ داو بە تەواوی ڕۆژی ١٢/٢٥ دوژمن هێزێکی زۆری لە جاشو سەرباز کۆکردبۆوە لە سەر قەلاوە پەلاماری گوندی تووکنی دا ، هێرشێکی چڕوپڕ بوو ، لە ناو دێیەکەدا هەنێك پێشمەرگە هەبوون (مەلا کەریم ، مەلا یاسین ، جیهاد، سەمەد ئۆمەر بلی) لە گوندی بنەکەوە هێزێکی تری پێشمەرگە بەهانی ئەو برادەرانەوە دەچن کە هەندێك لەوانە (حەمە ئاخە ،سەید محەمەد ،مەردان چاوشین، تەیب دوزی، عەلی ئەکبەر، عوسمان تلیشانی، شوکر١٢ ئیمامی..هتد) شەڕەکە زۆر گەرم بوو ئێوارەکەی دوژمن شکابوو چوار کوژراوی لەبەر دەستی پیچشمەرگەدا بەجێهێشتبوو ، ئەم دەستکەوتانەش هەبووە:

١ دەبابەی کاسکافیل

١ ئیڤا

١ جیبیواز

لەگەڵ نەخشەی شەڕەکەو دیکۆمێنتی فەرماندەی هێزەکە بەناوی عەقید عەتا ئیبراهیم.

# ساڵی ١٩٨٦

وا دانرا ئەم ساڵە جموجووڵی پێشمەرگانە زۆر بێ، بیر لە زۆر بەرنامەی شەڕی گەورەو فراوان کرایەوە. ڕژێم نەك هەر لای ئێمەوە لە کوردستاندا تەنگی پێ هەڵچنرابوو، هێزەکانی کەوتبوونە بەر شاڵاوی پەلامارو زیان پێ گەیاندن. ئێرانیش ئەیویست سنووری شەڕەکانی بەربلاوتر بکات. کاتێك بەرەیەکی لە قۆڵی کوردستانەوە کردەوە، هێزەکانی ڕژێمی بەم ناوچەیەشەوە سەرقاڵ کرد کە پێشتر ئەم قۆڵە ئارام بووو هیچ جموجووڵێکی ئێرانی تێدا نەبوو، هەرچەندە فراوانکردنی بەرەکانی شەڕو گواستنەوەی بۆ کوردستان بۆ ئێمە خراپ بوو، ناوچەی کارکردنمانی تەسکتر ئەکردەوەو کێشەی بۆ ئەخوڵقاندین، هەردوولای شەڕکەریش بە شێوەیەك لە شێوەکان سوودمەند بوونو پێیان خۆشبوو کورد لە ناو دارو پەردووی ئەو شەڕەدا بە یەکجاری تیا بچێ، جگە لەوە هەردوولا گرفتی شەڕی لایەنەدژەکانی خۆیانیان دوور تر ئەخستەوە لە خۆیان، گەرچی لە هەندێ حاڵەتیشدا ئەولایەنانە تێکەڵ بە شەڕەکان ئەبوون.

هێشتا سەری مانگی١٩٨٦/١ بوو، لە ڕۆژی ١/٦ داکە ڕۆژی دامەزراندنی سوپای عێراقییە، جەژنیشی بۆ ئەگێڕن کەچی ئەم سوپا داگیرکەرە لەم ڕۆژەدا بە هێزی پیادەی سەربازو جاشە کوردەکانو تانكو فڕۆکەوە هێرشێکی فراوانیان کردە سەر سنوری مەڵبەندی چوار لە دۆڵی سماقولییەکانو زیارەت. شەڕەکە زۆر توند بوو، ڕژێم زۆربەی دێهاتەکانی ئەو دۆڵەی سووتاند، زیانی زۆری بە سامانی خەڵکی گەیاند بە تایبەتی بەروبوومی کشتوکاڵی، ژمارەیەکیش پێشمەرگە شەهیدو بریندار بوون.

ئەو ڕێککەوتنە سەرەتاییەی نێوان یەکێتی‌و سۆسیالست لەشارەزووردا کرا هەنگاوی تری بەدوادا هات‌و ڕۆژی ١٩٨٦/١/٩وەفدێکی برادەرانی سۆسیالست بە سەرپەرشتی کاك شێخ محەمەد شاکەلی گەیشتنە سەرکردایەتی یەکێتی‌و بۆماوەی دەرۆژێك میوانی مام جەلال‌و یەکێتی بوون‌و پێکهاتن لەسەر پرەنسیپی ئاشتبوونەوەو هەندێ مەسەلەی مەیدانیش جێبەجێ کران ، پاش ماوەیەك‌وەفدی ڕەسمی سۆسیالست سەردانی سەرکردایەتی یەکێتیان کردو پەیمانی هاوکاری‌و ئاشتبوونەوەیان مۆرکرد .

کۆتایی مانگی ١٩٨٦/١ لەکاتێکدا ئێمە خجڵی دارشتنی بەرنامەی گرتنی ناحیەی سەنگاو بووین لەسەرکردایەتییەوە داوای هێزێك کرا بۆ سنووری تیپی ٣٧ی شارباژێر، ئیتر مەسەلەی گرتنی سەنگاو دواخرا. بەهێزێکەوە بەرەو سەرکردایەتی ڕۆیشتین‌و لەوێشەوە بەرەو سنووری تیپی ٣٧ لەگەڵ کاك عەلی بچکۆلدا بۆ گرتنی شاری ماوەت، چەند ڕۆژێك خەریکی دارشتنی نەخشەی گرتنەکەی بووین، لەو کاتەدا دوژمن هێرشی بۆ ناوچەی شارباژێر دەستپێکرد، دوای شکستی هێزەکانی ئێران لەو ناوچەیەدا کەوا دانرابوو تاکو دەوروبەری شارۆچکەی چوارتا بگرن. لەو هێرشانەدا بەتوندی هەڵێنەکوتایە سەر شوێنی پێشمەرگەکان، هێزەکەی ئێمە لەچیای‌وەراس بوو، پاش چەند ڕۆژێ شەڕو خۆڕاگری بەرەو لای دێی کورەداوێ کشاینەوە لەبەرئەوەی دوژمن ڕێگای گواستنەوەی ئازووقەو خواردنی لێبڕین، بە بەردەوامی‌و شەوو ڕۆژ تۆپبارانی خەستی ئەکردین، دوای چەندین شەڕی خوێناوی لەو ناوچەیەش بۆووڵاخڵوو شاخی برزووت‌و بالۆسە کشاینەوە، ماوەی مانگێك پارێزگاریمان لەوێ کردو ئینجا گەڕاینەوە گەرمیان. پاش گەڕانەوەمان برادەران جارێکی تر کەوتنەوە هەوڵی گرتنەوەی سەنگاو، بۆ ئەم مەبەستە هێزێکی گەورەی مەڵبەندی یەك لەتیپەکانی ٥١و٥٣و ٥٧و ١٥و١٧و تیپی مەڵبەند کۆکرایەوەو لەنێوارەی ڕۆژی ١٩٨٦/٣/٩ دایانە سەر ناحیەی سەنگاودا، هێزەکان دابەش کرابوونە چەند بەشێکەوە:

- بەشێك بۆ ناو شارۆچکەکە.

- بەشێك بۆ بارەگای فەوجی سەر شارۆچکەکە.
- بۆسەیەك بۆ سەر ڕێگای سەنگاو ـ چەمچەماڵ.

پاش شەڕێکی قارەمانانە توانرا شار بخرێتە کۆنترۆڵی پێشمەرگەوە جگە لە مەرکەزی ئەمن‌و ئیستخبارات‌و بارەگای فەوجەکە، زیانێکی زۆر لەدوژمن کەوت، دام‌و دەزگاکانی حکومەت لەناو شاردا کەوتە دەستمان، بەڵام لەبەر کەم‌و کوڕی لە جێبەجێکردنی نەخشەکەو باش سەرپەرشتی نەکردن‌و لەهەموویشی گرنگتر باش دیراسە نەکردنی پەلاماردانەکە بووە هۆی ئەوەی بارەگای فەوجەکەو مەرکەزەکە نەگیرێ. هەرچەندە لەوانەیە هۆیەکی سەرەکی نەگرتنەکەی بگەڕێتەوە بۆ خەبەردانی زەلامێك کە ئاگای لە بەرنامەکەی ئێمە هەبوو بە پێی هەندێ زانیاری کە دواتر دەستمان کەوتبوو لەو بارەیەوە.لەگەڵ ئەوەشدا گرتنەکەی دەنگێکی باش‌و سەرکەوتنێکی گەورەی هێزی پێشمەرگە بوو کە تیایدا چوار پێشمەرگە شەهید بوون‌و کەلوپەل‌و کەرەسەیەکی زۆری دوژمن دەستکەوتبوو لەگەڵ بەلگەنامەو ئەوراقی مونەزەمەی فاشیەکان، گەرچی شەڕی شارۆچکە گرتن پێشتر ئەنجامدرابووەکو ئەوەی بێتواتە لەساڵی ١٩٨٣ کەدەرسێکی گرنگ بوو بۆ هێزی پێشمەرگەی کوردستان، بۆیە گرتنی سەنگاو هەرچەندە تازە نەبوو بەلامانەوە هەنگاوی ترنرابوو، زۆری پێشمەرگە بەشداربووەکانی شەڕی بێتواتە لێرەشدا هەبوون، ئەوا سەرکەوتنەکە بەقەدەر ئەزموونەکە نەبوو لەبەر:

١. نەبوونی تۆپخانەی ڕێکوپێك بۆ کوتانی شوێنە گرنگەکانی دوژمن‌و سەرکوتکردنی‌و ڕێگەخۆشکردن بۆ پەلاماردان.

٢. نەبوونی نەخشەی عەسکەری داڕێژراو لە ڕووی شارەزایی شوێن‌و ژمارەو توانا سەربازییەکانی دوژمن.

٣. کەمی تەقەمەنی جۆراو جۆری پێویست.

٤. ناڕێکی لەدانانی بۆسەکانی سەر ڕێگای سەنگاو ـ چەمچەماڵ کە دوژمن توانی تێپەڕ ببێ بە هۆی:

أ. نەبوونی مین بۆ ناشتنی لەڕێگای تێپەڕبوونیدا.

ب. لێنەزانینی بەکارهێنانی چەکە قورسەکانوەکو ڕاجیمەو هاوەنەکانو ١٠٦ملم.

پ. هەڵنەبژاردنی شوێنی گونجاو بۆ دەستوەشاندن.

ت. نەبوونی سەنگەر لەشوێنە گرنگەکاندا بۆ بەرگری کردن.



لە هەموویشی گرنگتر ئەوەیە کە بووبووە داب و ئەبێ لێپرسراوی یەکەم خۆی لە پێشەوە بێ، هەرچەندە مایەی سەربەرزییەو هێز بە گیانی خۆبەختکردن پەروەردە بکرێ، بەڵام لەڕووی سەربازییەوە هەڵەیەو زۆرجار کەلێن پەیدائەبێو لێپرسراو ڕاستەوخۆ نەتوانی بڕیاری پێویست بداتو بەهۆیەوە هێزەکە نوشوست دێنێو بگرە لەم بارەدا لێپرسراو دەوری تەنیا پێشمەرگەیەکی قارەمان ئەبینێو ناپەرژێتە سەر سەرپەرشتیکردن.

لە شەڕی شارۆچکە گرتندا سەرەڕای قارەمانێتی پێشمەرگەو شەهیددان دیاردەی دەستکەوتەکان شتێکی بەرچاوەو زۆرجار شتەکان وەکو خۆی ناگاتە سەرەوە بۆیە ئەبوایە:

١. لیژنەی تایبەتی بۆ سەرپەرشتی کەلوپەلەکانو کۆکردنەوەیان دابنرایە.

٢. ڕێگەنەدان بە پێشمەرگە بۆ شتبردنو دەستکاری کردنیو سزادانی چەپاوکەر.

هەروەها لەم شەڕانەدا بیر لەوە نەکرابووەوە کە نەخۆشخانەیەکی گەڕۆکی مەیدانی دابنرێ بۆ تیمارکردنی بریندارەکانو چارەسەرکردنیان، کە هێزێکی مەعنەوی ئەداتە پێشمەرگەو لە حاڵەتی تووشبووندا گیانیان ئەپارێزێ، گەرچی پزیشك لەگەڵ هێزەکاندا هەبوون بەڵام نەتوانرا هەموو شتێك بکرێ.

سەرەتای مانگی ٦/١٩٨٦ بوو مەلا بەختیار هەوڵێکی ڕاکردنی دا لە زیندانەکەی یاخسەمەر، دیارە ئەمەش لەئەنجامی گفتوگۆکانی ناو پلنیۆمەکەی کۆمەڵە بوو، شەوی ٩ ـ ١٠ /٦/ ١٩٨٦خۆی دەرباز کردو گەیشتە دیوی قزلەر، هەرکە بەو ڕاکردنە زانرا لە هەموو لایەکەوە پێشمەرگەو پشتگیری بۆی دەرچوون بۆ دەستگیرکردنی، بە ڕێکەوت ئەکەوێتە دەستی کۆمەڵێك پشتگیریو

ئەینێرنەوە یاخسەمەرو ئەخرێتەوە کونجی زیندانەکەی خۆی، لەوە ئەچوو ڕاکردنەکەی تەوقیت بووبێ‌و ڕووەو لای حکومەت بێت، چونکە هەندێ لە لایەنگیرەکانی تەسلیم بوو بوونەوەو بوو بوونە جاش‌و چاوەڕوانی بوون لە هەلێکدا ڕابکات یان بچێتە سلێمانی‌و لەوێ بمێنێتەوەو کارەکانی ئەنجام بدات، دوای ئەم هەوڵە سەرنەکەوتووە خرایە ژێر لێکۆڵینەوەو بەئاسانی دانی بەکردارەکانیدا نا، ئەمە کارێك بوو کەس‌وابەئاسانی بڕوای نەئەکرد مەلا ئاوا چۆکی بشکێ‌و هیچ خۆی ڕانەگرێ بەبێ ئەوەی ناهەقییەکی ئەوتۆی بەرامبەر بکرێ کە ڕەفتاری زیندانییەکی سیاسی لەگەڵ ئەکراو پێداویستی باشیشی بۆ دابین کرابوو، لەئەنجامی ئەم هەڵوێستەدا ئاش لەناو خۆیاندا دوو ئاراستەیان هەبوو: یەکێکیان مەلایان بەخائین‌و ئەوی تریشیان بەسەرکردەیەکی پیرۆزیان لەقەڵەم ئەدا.

ئەمەش لەئەنجامی ئەووەزعەی کەئەوانی تێکەوتن‌و ئەو خەونەیان نەهاتەدی‌و بگرە بوونە ئاردی بن درك لەجیاتی ئەوەی لەڕێگەی کودەتایەکەوە ببنە خاوەن دەسەڵات کەچی بەشێکیان تەسلیم بوونەوە، بەشێکیان خۆیان حەشارداو هەندێکیان ڕێگای هەندەرانیان گرتەبەرو ئەوانەی مانەوە ڕایان کردە بندەستی بەرەی جود کەتا دوێنێ قسەی ناسازو توندیان پێئەگوتن.

ئەمەیە سەرلێشێواوی هەندێ خەڵکی ساویلکەی سیاسی کە بۆ نیازی خۆیان جڵەوی چارەنووسی شۆڕشێك یان حیزب‌و ڕێکخراوێك ئەدەنە دەست قەدەرو پاشەڕۆژیش بە هەڵە حوکمی بەسەردا ئەدرێت، بەتایبەتی هەندێك‌وای بۆ ئەچن کە ئازادی فیکرو بیرکردنەوە نەبێت، نازانن کە ئەمە پەیوەندی دوورو نزیکی بە ئازادی‌و فیکرەوە نییە، بەڵکو هەرزەیی لە بیرو بۆچوون‌و هەڵوێستدا بۆ بنیاتنانی کەسێتی‌و دەستکەوتی ڕۆژ ئەمە دێنێتە پێشەوە کە حوکمدانیش لە سەری ڕاست دەرناچێت.

دوای گفتوگۆ بواری چوونە ناو شاری سلێمانی بۆ چالاکی کردن تەسك بوو بووەوە، هەموو شارۆچکەکان بە هێزی سەربازی‌و دەزگا داپڵۆسێنەرەکان ئابڵۆقە درابوو، لەگەڵ ئەوەشدا جارناجار پێشمەرگە لەهەموو داوەکانی دوژمن تێئەپەڕین‌و دەستیان لە پیاوەکانی دوژمن ئەوەشاند.

شـەوی ٧ـ١٩٨٦/٦/٨ مەفرەزەیـەکی بچـووکی تیپـی ٥٥ی قـەرەداخ بـە سەرپەرشتی جێگر تیپ هەژار دەرەویانی ئەچنە ناو شارەوە بۆ دەستگیر کردنی چـەند خۆفرۆشـێك‌وترس‌و بـیم خسـتنە دڵـی رژێمـەوەو شـکاندنی قفڵـی ئـەو دەرگای ترسـە کـە دەمێك بـوو کـەس نەیئـەتوانی بچێتە ناوشـار. بـەڵام ئـەمان ئاشکرا ئـەبن‌و ئەکەونـە شـەڕی دەسـتەو یەخـەو پـاش بـەرەنگار بوونەوەیـەکی قارەمانانـــەی کەم‌وێنـــە هـــەژارو چـــوار پێشـــمەرگەی تـــر شـــەهید ئـــەبن‌و دوو پێشمەرگەی تریان بەئازایەتییەکی سەرسوورهێنەر دەربازئەبن، شەهید بـوونی هەژار زیانێکی گەورە بوو لە تیپی ٥٥ی قەرەداخ، چونکە ئومێـدی پاشـەڕۆژێکی باشی لێئەکرا، تا ئەوپەڕی ئازایەتی‌و جەربەزەیی تێدا ئـەبینرا، نـە ئـەبوو ئـەم رووداوە بێ‌تۆڵەکردنـەوە تێپـەڕێ، بۆیـە تیپـی ٥٥ی قـەرەداخ لـەیادی چلەکەیدا رۆژی ١٩٨٦/٧/١٧ پـەلامارێکی فـەوجی دەمرکانیـان داو تـەفروتونایان کـرد بـە جۆرێك دوژمن تەوەقوعی ئەمەی نەئەکرد.. دەستکەوتی زۆرو زەوەند هـەبوو، ئەمـە سـەرکەوتنێکی مـەزن بـوو بـۆ هێـزی پێشـمەرگە، دوای ئـەم چالاکییە لەسەرکردایەتییەوە داوای هێزێك لە مەڵبەنـدی یـەك کـرا، لـە هـەموو تیپـەکان هێز رەوانـەی سـەرەوە کـرا هـەمووی لەدەوروبـەری کونەماسـی‌و دۆڵبێشـکەکان‌و قامیش‌وووڵاخلو دابەشبوون بـۆ ئێشـکگرتنی ناوچـەکەو پاراسـتنی دەوروبـەری سەرکردایەتی.

تـا لـەرۆژی ١٩٨٦/٩/١ یەکـەم هێرشـی دوژمـن دەسـتی پێکـرد کەبەشـەڕی قەیوان ـ ماوەت ناسـراوە، هەرچـەندە یەکـەم هێـرش زۆر گـەورەو گـران نـەبوو، بـەڵکووەکو تاقیکردنەوەیـەك بـوو، بـەڵام رۆژانـە نیازەکـانی دوژمـن روون ئەبووەوە کە مەبەستی دەرپەڕانـدنی پێشـمەرگە بـوو لـە شـوێنەکانیان‌و کۆسـپ خستنە سەر رێگای ئـەو چـەك‌و تفاقانـەی لـە ئێرانـەوە ئـەهات کـە کـاتی خـۆی کەرەسەیەکی زۆری عەسکەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان لـە ئێرانـدا دەسـتی بەسەردا گیرابوو لەو دواییانەدا بەشێکی ئازاد کراو رۆژانە کاروانی جۆراوجـۆر ئەگەیشتە بارەگاکـانی سـەرکردایەتی‌و حکومـەتی عێـراق لەمـە شـێتگیر بـوو، سـەرەتا لـە قـوڵی دۆڵ بێشـکەکانەوە پـەلامار درایـن، دواتـر مـەودای شـەڕەکە

فراوانتر بووەوەو بەرەو خوارتر داکشا بۆ دەوروبەری شاخەکانی قەیوانو دووبرا. بەڵام بەوورەی پڕ لە نەبەزی پێشمەرگە هەموو هێرشەکان تێکشکێنرا، بۆ تێکدانی بەرنامەکانی حکومەت هێزی پێشمەرگەی کوردستان پەلامارێکی ناحیەی کارێزەیان داو گرتیان، دیلو دەستکەوتی باشی تیا هەبوو، بەڵگەنامەی نهێنی زۆر کەوتە بەردەستی شۆڕش، جێگەی داخە کەسێکی دڵسۆزو پیاوێکی دۆستی (ی.ن.ك) بەناوی کاکە حەمەی مەلا عەلی کەخەڵکی کوردستانی ئێران بوو بەئەرکی شۆڕش چووبووە لای لێپرسراوی شارەکەو گل درابووەوە شەهیدی ئەکەن. کە دوژمن هێرشێکی بەربلاو لە قوڵی دۆڵبێشکەوە ئەکاتە سەر سەنگەرەکانی پێشمەرگەو بەخرایی تێئەشکێتو هێزەکە ڕائەکەنەوە مۆڵگاکانیانوەکو پیشەیان بوو تۆپبارانی سەنگەرەکانی پێشمەرگە ئەکەن، ئالەو کاتەدا جێگر تیپی ٥١ی گەرمیان کاك شێخ جەمال لەگەڵ پێشمەرگەکانیا بەدوور بین تەماشای شوێنەکانی دوژمن ئەکات ناکاو گوللەیەك دێتو دڵی ئەو مەزنە مرۆڤە ئەسمیَو گیانی پەپوولەیی باڵ ئەگرێتەوە بەرەو جیهانی سەروەری، چەندە ستەمە ئەم کەڵە مرۆڤانە کەبەشداری نەخشاندنی دەیان تابلۆی قارەمانێتی ئەکەن مەرگی بێ ووره لێیان نزیك ئەبێتەوەو چەپکە نێرگزی باخچەی ژیانیان هەڵئەوەرێنێ. شێخ جەمال یەکێك لە کورە دلێرەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوو، تابلێی بزێوو گورجو گۆڵ بوو، قەت سرەوتی نەبوو، هەمیشە لە هەوڵی دەستوەشاندنی دوژمندا بوو، بۆیە لای دوژمن زۆر گەورە بوو، لە ڕێگەی خۆفرۆشەکانەوە نەخشەی لەناوبردنی بۆ دانرابوو. شەهید بوونی کەلێنێکی درووستکرد لە هێزەکەماندا.

ئەم شەڕە ماوەی ١٠٢ ڕۆژی خایاند، زیانێکی زۆر لە هێزەکانی ڕژێم بە سەربازو جاشەوە کەوت کە بە سەدان ئەژمێردرێ. چەندین پێشمەرگەو فەرماندەش شەهید کران. لەم شەڕانەشدا پێشمەرگەی لایەنە ئاشتبووەکان بەشدارییان کرد، گەر چی لە ئاستێکی کەمو بچووکدا بوو.

ماوەیەك پێش ئەمە برادەرانی حشع لەئەنجامی ناردنیوەفدێك بۆ سەرکردایەتی (ی.ن.ك) ڕێککەوتن لەسەر مەسەلەی بنەڕەتی بانگەوازی

ئاشتبوونەوەی گشتی‌و ڕەخساندنی زەمینــەی لەبار بۆ نەهێشتنی سـەلبیاتی ڕابـوردوو. ئەمــەش لـە خۆیـدا هــەنگاوێکی بـاش بـوو بـۆ دوورکەوتنــەوە لـە هەڵوێستی بیرتەسکی‌و ڕق‌و کینــە لـە دڵابـوون بـە تایبـەتی لـە نێـوان هێـزە شۆڕشـگێڕەکانی شـاخدا کـە ئـەبێ یـەکریز بـن بـۆ لێـدانی دەسـەڵاتی دوژمنــی عەفلـەقی..ئـەبێ هەرچـی ناکۆکییـە لاوەکییـەکانــەوەلاوە بنـرێ، چـونکە لــە هەلومــەرجی‌وادا نـاکرێ خانەیـەك بۆوەهـا بیرکردنــەوەو هەڵوێستی دژایـەتی کردن بکرێتەوە کە لە قازانجی کەسدا نییـە..! دوای ئـەم ڕێککەوتنـە دەستەو مــەفرەزەکانیان گەڕانــەوە گــەرمیان‌و کەوتنــەوە جموجـوولی خۆیــان لــە نــاو جەماوەرو هاوکاریکردنی ئێمەش بۆ پتەوکردنی دۆستایەتی‌و ڕووکردنە لێدانی هێزەکـانی داگیرکـەر، ئێمـە ئـەو کاتـە لـە بـیری تۆڵەکردنـەوەی شـەهید شـێخ جەمالدا بووین بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ برادەرانی حشعدا پێکهاتین چالاکییەکی هاوبەشی تۆڵەسەندنەوە ئەنجام بدەین.

ڕۆژی ١٩٨٦/٩/٢٥ هێزێکی هاوبەشی هـەردوولامان کـەبریتی بـوو لـە چـل پێشمەرگەی یـەکێتی‌و بیست پێشـمەرگەی حشـع ڕووئەکەنـە کـانی شـیرینەکەی قادرکەرەم بۆ لێـدانی کاروانـە سـەربازییەکەی ڕژێـم، هـەر کـە کاروانەکـە نزیـك ئەبێتەوە ئەکەوێتە بەر ڕێژنەی گوللەی تفەنگی پێشمەرگەکان، هـەر فیشـەکێك ئەچزایە گیانی سوپای داگیرکەردا داستانی تۆڵەی نوێ ئەکردەوە، زیـانی دوژمـن ٥٠ کـوژراو زیـاتر بـوو، لـە ناویانـدا یـەك ئەفسـەری عەقیـدو ملازمێـك‌و دە ئیستخبارات‌و چەند جاشێك، دوو جاشـیش بـە دیـل گـیران، هەشـت ئۆتـۆمبیلی سـەربازی سـووتێنران، چـەکێکی زۆر دەسـتکەوت بـوو، لـە ناویانـدا ڕەشاشـێکی بیکەیسی‌و جیهازێکی ڕاکاڵ بە ( تجهیز قـدرەو مجفـر)ەوە، هـەروەها تیۆتایـەکی پێکابیش. بیکەیسی‌و چەکەکان‌و ئۆتۆمبیلەکـە درا بـەبرادەرانی حشع‌و جیهـازە ڕاکاڵەکەش بۆ یەکێتی. زیانی ئێمـەش شـەهید بـوونی کـادیری حشـع کـاك کـاوە بـوو. ئـیتر پـاش ئـەم چـالاکییە دوژمـن بـەکاروان‌و هێـزی زۆرەوە هـات‌و چـۆی قادرکـەرەمی ئـەکرد، کـە زانیـاری هەبوایـە لـەو نزیکانـە پێشـمەرگە هەیـە دەرنەئەچوو.

ڕۆژێك لە ئاوایی جەلالی بناری گل بووین کە لەنزیکی جادەی قادرکەرەم - دووزە، دوژمن بە هێزێکی زۆرەوە هات، ئێمەش لە ناو دێیەکەدا دامەزراین، دوو کۆپتەریش بەئاسمانی دێیەکەدا ئەسووڕانەوە، لەگەڵ عەسکەری جێگر کەرتدا لە ماڵێکدا بووین، کۆپتەرەکان دێکەیان بەڕۆکێت داگرتەوە، یەکێك لە ڕۆکێتەکان بەرماڵەکەی ئێمە کەوت، ژنی هاوسێ ماڵەکە هاواری کرد تراکتۆرەکەیان سووتا، منیش چوومە هاواریەوە تومەز خانووەکە بەرکەوتووەو تراکتۆرەکە هیچی لێنەهاتووە، هەر ئەوەندەم زانی گرمە هاتو خانوو بەسەرما تەپی، کۆپتەرەکە جارێکی تر لێیدایەوە، بووم بەژێر تەپو تۆزو دارو پەردووەوە، بە پەلە پرۆزە دەرباز بووم، چوومە کۆڵانێکەوە یەکپارچە دووکەڵ بوو، لەو لاوە هەندێك حەسامەوە ئینجا گەڕامەوە بۆ ماڵەکەی خۆمان ئەویش بەرکەوتبوو، ڕۆکێتێك لە بەردەم پەناگەی ماڵەکەی دابوو، لەناو پەناگەکەدا ژنێك کە ناوی گورجیە ڕەشید عەلی بوو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا بوو، ئارەقی زۆری کردبوو، پێش هاتنی کۆپتەرەکان نانی بۆ خاس ئەکردین، پاش ڕۆیشتنی کۆپتەرەکان بۆ نان خواردن کۆبووینەوە، هێشتا نانەکەمان تەواو نەکردبوو گورجیە زەندەقی چوو شەهید بوو، بەم دیمەنە زۆر دلگران بووین، کە لە ماڵەکە دەرچووین بۆ ناو دێ ژنێکی ترم بینی تێکچوو بوو، لەگەڵ پیاوەکەیدا دەمەقڕەی بوو، ئاگای لە دنیا نەبوو، چونکە لە نزیکیدا ڕۆکێتێك تەقیبووەوەو کاری تێکردبوو، بەعس بە هەموو شێوازێك کاری کردووە کە مرۆڤی کورد بکوژێ، ئاسەواری نەهێڵێ، زیاتر ترس بخاتە ناخیەوە. شەڕی بە تەنیا دژی هێزی پێشمەرگەی چەکدار نەکردووە، بەڵکو دژی هەموو کورد بووە، دەستی لە گەورەو بچووكو پیرو پەککەوتەو منداڵو ژن نەپاراستووە، بە دڵێکی پڕ لە خەمەوە لەدێ دەرچووینو بەرەو بنار بووینەوە. خەمەکەشمان زیاتر هی ئەوە بوو کە نەمانئەتوانی دژی ئەو کۆپتەرانە شتێك بکەین.

ڕۆژی ١٩٨٦/١٠/٦ لەلایەن مەڵبەندەوە ئاگادارکراینەوە کۆببینەوە بۆ ئەنجامدانی چالاکییەکی گەورە، بۆ ئەم مەبەستە چوومە دێی مێولێو سەردانی کاك ئازادی سەگرمەم کرد، ئەو لە سەرکردایەتی گەڕابووەوە، لە شێوەو شوێنی چالاکییەکە ئاگاداری کردمەوە کەهەندێك لە ئەرکەکان بەو سپێردرا بوو.

٦/١٠/١ ئازادی سەگرمە

لـە سـەرکردایەتییەوە تەقەمەنییـەکی زۆر بـەتراکتۆر گوێزرابـووەوە سنووری تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان، بەشەکەی مەڵبەندی یـەك بـە سەرپەرشتی کـاك عـادل شـکورو مـام سـاڵەح گـۆڕی ئەسـپی لـە بـەری هەمەوەنـد لەلایـەن کـاك ڕۆستەمو کاك حەمەڕەش بۆ سنووری تیپی ٥٧ی سەگرمە گوێزرایەوە، هەنـدێ پسپۆڕی ئێرانیش درایە دەستمان.

ڕۆژی ١٩٨٦/١٠/٨ گەیشـتینە قـەیتول‌و هەڕێنـە، چـاوەڕوانی گەیشـتنی چەکەکان بووین، لە شوێنێکدا پسپۆڕەکانمان دانـا، خۆمـان چووین بـۆ ناوچـەی هەمەوەنـد، ڕۆژی ١٩٨٦/١٠/١٠ لـەدێی خاڵـدان چـاومان بـەکاك شـەوکەت‌و کـاك ڕۆستەمو مام ساڵەح گۆڕی ئەسپی کەوت.

ئێمە چاوەڕوانی ئەوە نەبووین ئەو کـارە بەپەلـە ئـەنجام بـدرێ. کەچـی کاتژمێری چواری پاش نیوەڕۆ لەلایەن کان نەوشیروانەوە برووسـکەمان بـۆ کـرا کەهەر ئەمشەو ئەبێ چالاکییەکە بکرێ. کـاك شـەوکەت داوای دواخسـتنی کـرد چونکە هێزەکـانی مەڵبەنـدی یـەك فریاناکـەون، بـەڵام کـاك نەوشـیروان‌وەڵامی دایـەوە: ئـەبێت هـەر ئەمشـەو ئـەنجام بـدرێ ئەگـەر ئەمشـەو نـەکرێ دیـارە ناتانەوێ ئەنجامی بدەن.

من بە کاك شەوکەتم‌ووت: کام لامان پێ ئەسپێرن ئەنجامی ئەدەین. ئەو ئەمـەی زۆر پێ‌چـاکبوو، بەشـی خۆمـان چـەك‌و تەقەمـەنیمان جیـاکردەوە کـە بریتـی بـوو لـە دوانـزە تـەن قومبەلـەی ١٢٠ملـم‌و یـەك کاتیۆشـای ١٢ دانـەیی، کاتژمێر ٥ی ئێوارە دنیا تاریـك بـوو، لـە خاڵدانـەوە چووینـەوە قـەیتوول، لـەوێ کاتیۆشاکەم تەسلیمی دەستی کاك دلێر جاف‌و حاجی حەبیبی تۆبچی کرد کە بچینە دێی تۆپخانەی زەمبوور لـەوێ دابمـەزرێن تـاکو هـەموو هێزەکـە ئـەگات. ئـەوان ڕۆیشـتن‌و ئێمـەش بـەدوایانا، زۆر درەنـگ بـوو کاتـژمێر ٣ی شـەو لـەو شوێنەی دیـاری کرابـوو دەسـتمان کـردە لێدانی کۆمپانیـای نـەوتی زەمبـوور بـۆ مـاوەی یـەك کاتـژمێر، گڕوبلێسـە لـە نەوتەکـە بـەرز بـووەوەو بـەری ئاسمـانی گـرت‌و ئەو ناوەی کـردە ڕۆژی ڕووناك. هەموو نـیشانەکانمان بـە باشی پێکـاو بە بەرچاومانەوە ئەسووتان، دوژمـن لای خۆیـەوە بەچـەکە دژی ئاسمانییـەکانی ناوچەرگەی ئاسمانی سوور کردەوە.

زیانــەکانی دووژمــن لــەم قۆڵــەوە بــە ٧٠٪ مەزەنــدە دەکــرا دوای ئەنجامـدانی کارەکـە خۆمـان کۆکردەوەو بـە دوانـزە ئۆتۆمبیـل گەڕاینـەوە، لـەو کاتەدا هەندێ فڕۆکەی گەورەی دوژمن هاتنە سەرمان بۆ لێدانمان، بەڵام پێش ئەوەی بێینە دەست فڕۆکەیەکیان لە خۆیەوە بەر بووە خـوارەوەو گـڕی گـرتو سـووتا بێئـەوەی تەقـەی لێبکـرێ. لەگەڕانەوەمانــدا لاماندایـە دێی قیرچـە زۆرمانـدووبووین ، چووینە ماڵێـك لەگـەڵ پسپۆڕێکی ئێرانیـدا کـە لەگەڵمانـد بوون ، تەماشا ئەکەین وێنەی هایدەو مەهەستی کـە دوو گۆرانیبێـژی دەنگخۆشـی ئێرانین بەنیوە ڕووتی هەڵواسرابوو ، ئێرانیەکان ئەیانڕوانیەوێنەکان و سەریان بائەداو ئینجا یەکێکیان ووتی : ئەمەوێنەی قەحپەکانی ئێمەن لەهەموو دنیادا بلاو بوونەتەوە ..هەرچەندە من لەگەڵ ئەو قسەیەدا نەبووم ، ئەوان مەرج نیە ئەو قسەیەیان لە ناخەوە کردبێ

ئەم چالاکییەی ئێمە بەشێکی بچووکی بەرنامەی داستانێکی گەورە بوو بە ناوی داستانی نەوتی کەرکوك کە کارە سەرەکییەکە لە قۆڵی کەرکوکەوە بوو، بەهێزێکی زۆرەوە بەپێی نەخشەیەکی گونجاو تۆپبارانی خەستی جەوەڵ بۆرو کـەیوان کـرا، بـڕی چـل تـەن تەقەمـەنی قورسـی لێـدرا، لـە چـەند لایەکیشـەوە پەلاماری هێزەکانی دوژمن درا، بۆسـەیان بـۆ دانـرا بـوو، زیانێکی زۆر لـەدوژمن کـەوت لـەڕووی ئابووریـیـەوە کـە بەتەقـدیر٣٠٪ بـوو، جگـە لـەوە لـە ڕووی سەربازییەوە هێزێکی زۆری لە پێکادانەکاندا کوژران.

ئـەم چالاکییە دەنگێکـی زۆری دایـەوەو بەعسـی شـپرزە کـرد، چـونکە چالاکییەکە زۆر گـەورەو کەموێنـەو لـە قـووڵایی دەسـەڵاتی پـڕ لـە دڕك و داڵـی تەنراو بەهێزی سوپایی متمانە پێکراو ئەنجامـدرا بێئـەوەی دوژمـن هەسـت بـە هیچ جۆرە جموجووڵێکی چەك و تەقەمەنی گواستنەوەو هەڵس و کەوتی هێـزی پێشمەرگە بکات بۆ ئەو سنووورە دوورو گرنگە.

یەکـەم دەنگوباسـی ئـەم چـالاکییە لـە ڕادیـۆی تارانـەوە بڵاوکرایـەوەو دەوری (ی.ن.ك) ی فەرامۆشـکردو شـتەکەی کـردە هـی خۆیـان کەلـە حەقیقەتداوانەبوو، نەخشەو هێزی سەرەکی ئەنجامدەری چالاکییەکە (ی.ن.ك)

بوو، پسپۆڕەکان هی ئێران بوون. بۆیە نارەزایی ئاراستەی ئێران کرا، ئەوە بوو لە دەنگوباسی داهاتوودا دارشتەی راگەیاندنەکە گۆڕاو دەوری (ی.ن.ك) تیا باسکرا.

ئەم چالاکییە سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ (ی.ن.ك)و شێوەیەکی نوێ لە ئەنجامدانی کاری پێشمەرگانە بوو دژی دامەزراوە ئابووری‌و پیشەسازییەکانی نەوتی عێراق‌و پەیامێکی‌ووریاکردنەوە بوو بۆ سەرانی بەعس کە (ی.ن.ك) هێزێکە ئەتوانێ دەست لە شوێنە گرنگە بایەخدارەکانی بوەشێنێ کە بربرەی پشتی ئابووری شەڕەو بە پارەی نەوت بەردەوامی بەپرۆسەی شەڕی ماڵوێرانکەری داسەپاو بەسەر کوردستان‌و عێراقدا ئەداو لە جیاتی دانانی بەمافە رەواکانی گەلی کوردو ئاوەدانکردنەوەی کوردستان‌و عێراق بەو ملیارەها دۆلارەی لە داهاتی نەوت دەستی ئەکەوت‌و پێشخستنی لە بوارە جۆربەجۆرەکاندا کەچی سەرەڕای دزینی بەشێکی زۆری ئەو داهاتەو دانانی لە بانکەکانی جیهاندا بەشێکی تریشی ئەخستە خزمەتی ئەو بەرنامە سازییەی جەنگێکی بێهوودە لەگەڵ کوردو دراوسێکانیدا کە شەڕ فرۆشتن بە ئێران روویەکی رەشی ئەو سیاسەتە نگریسەی بەعس بوو. گەرچی هەندێ لایەنی شارەزایانی سیاسی‌وای بۆ ئەچن ئەو جەنگە بەپێی نەخشەیەکی دەوڵەتی رەنگرێژی بۆ کرابێ‌و سەدام لە دواقۆناغدا پاڵەوانە دۆڕاوەکەیەتی.

هەرچەندە لە جێبەجێکردنی نەخشەکەدا هەندێ کەمو کوری هەبوو بەڵام بەمە زرمەیەکی توند لە جەستەی بەعس سرەوێنرا، هەروەها بۆئەوەی تێبگا کە لووت بەرزی‌و باڵادەستی هێزو خۆ بە کەڵەگا زانی ناکاتە ئەوەی کەس نەوێرێ خۆی لە قەرەی بدات.

هەر لەو کاتانەدا شەڕی قەیوان ـ ماوەت گەرم بوو، بە تایبەتی لە قوڵی حەسەن بەگ‌ووڵاخلوو، ناوەراستی مانگی ١٩٨٦/١١ بوو داوای هێزێکیان لێکردین بۆ ئەو بەرەیە، هێشتا بە رێگاوە بووین لە دێی حاجی ئاوای سنووری تیپی ٢٣ی سووورداش لە ئیزگەوە باسی گیرانی‌ووڵاخلوو لەلایەن دوژمنەوە بڵاوکرایەوە، کە لەم شەڕەداووریا شێخ رەشیدی خەڵکی قەڵای سەنگاو شەهید

بوو، كە گەیشتینە سەرکردایەتی کاك نەوشیروان ڕەوانەی دۆڵی سەفرەی کردین بۆ لای کاك جەبار فەرمانو خۆیشی بەرەو ئێران بەڕێکەوت بۆ گەشتێکی دمرەوەووا باس ئەکرا کە شەش مانگی پێئەچێت.

دنیا زۆر سارد بوو، بەفری زۆر دایکردبوو، ڕێگای هاتو چۆ گیرا بوو، ئەبوایە لە کوێستانی سێگۆمانەوە سەرکەوین، بەڵام ئێمە ڕێگایەکی ترمان گرت، بە عەزیەتێکی زۆر کاتژمێر ١٠ی شەو گەیشتینە گەلاڵەی دۆڵی سەفرەو زەروون، دوای حەسانەوەیەکی کەم ئێوارەی ڕۆژی ئایندە سەریان خستینە سەرشاخی برزوتو بالۆسەو دۆڵی قامیش بۆ گۆڕینی تیپەکانی ٥١و ٥٥.

لە ڕاستیدا ئەم گۆڕینە کارێکی بێهوودە بوو، جەبهەکە بە تەواوی لە دەست درابوو، بە هۆی گرتنی شاخی حەسەن بەگو دێیوولاغلوو پێشەوەی شاخی بالۆسە. لە هەندێ لاوە سەنگەری پێشمەرگەکان کەوتبووە ناو قورگی هێزەکانی دوژمنەوە بواری خۆپاراستن نەمابوو. لەهەردوو دیوی ماوەتووولاخلووەوە تۆپباران ئەکران. کەسیش زاتی ئەوەی نەبوو ئەووەزعە بە سەرکردایەتی بڵێ نەبادا بە ترسنۆك لە قەڵەمی بدەن. زۆر جاروابووە هەندێ کارو ئەرکمان بە کوردەناموسە کردووە، زیانی باشیشمان لێکەوتووە، جگە لەوەی شەڕی بەرەیی بۆ هێزێکی بچووکیوەکو (ی.ن.ك)و دواکەوتوویی تەکنیکی چەك لە شوێنی خۆیدا نەبوو، بە ناچاری ئەم شێوازە شەڕەمان هەڵبژاردووە هەرچەندە سەروەری زۆرمان تۆمار کردووە، زیانی مادیو مەعنەوی فراوانو بەدوژمنو هێزەکانی کەوتووە.

بۆیە ئێمە کەوتبووینە مەوقیعی بەرگری سەلبییەوەو نەمانتوانی گۆڕانێکی عەسکەری بە قازانجی خۆمان ئەنجام بدەین. هەر لەو کاتانەدا دوژمن دزەی کردو هێزی سەرخستە سەرشاخی گۆجار بە تایبەتی ڕۆژی ١٩٨٦/١١/٢٦ کۆپتەر لە سەر ترۆپکی شاخی گۆجار دابەزیو کەلو پەلو کەرەسەی ڕەبایەیەکی داناو هێزی سەربازی تێدا مایەوە کە ئەو شوێنە سەخترین شوێنی ئەو کوێستانە بوو. کەواش دانرا بوو هێزی خۆمانی لێبێو قایمکرابێ، کەچیوانەبوو، هێزەکەمان لە خوارتر بوو، نەیانتوانی بوو

سەرکەون، دۆخی جەبهەکە زۆر خراپ بوو، لە لایەك سەرماو سۆڵەو بەفرێکی زۆر باریبوو، نانو خواردن هەرچەندە زۆر بوو بە ئاسانی نەئەگەیشت، جگە لەوە شوێنەکەوەکو زمانێك لەدەمدا بێ هاکا ئەو دەمە بنوقێ، لەلایەکی تریشەوە دوژمن هەر لە پێشڕەویدا بوو بە دوو مەبەست: یەکێکیان جێپێ قایمکردنی خۆی بوو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هێزەکانی ئێرانو ئەوەی تریشیان تەنگ پێهەڵچنینی هێزەکانی یەکێتی بوو لەو ناوچەیەدا کەهەم ڕێگای هاتووچۆی ئێرانی بوو، هەم بارەگاکانی سەرکردایەتی لەو ناوە بووو هێزێکی زۆریشی گردکردبووەوە بۆ پاراستنی. دیارە دوای گرتنی دێیوولاخلوو بڕیار بوو کاك قادری حاجی عەلی بەهێزێکەوە سەرکەونە سەر چیای گۆجاڕ بۆ ڕێگری کردن لە سەرکەوتنی دوژمن بۆ ئەوێو دوورخستنەوەی مەترسی بۆ سەر دۆڵی گەلاڵەو سەفرەو زەروون ، کاك جەبار فەرمانیش هەموو ڕۆژێك ئەو مەسەلەیەی دووپات ئەکردەوە لێیان ، کەچی ئەوان سەر نەکەوتبوون ، تاکو ئەو ڕۆژە بە بەر چاومانەوە کۆپتەری لەسەر دابەزی .. من بە کاك جەبارمووت : ئەرێ کاك قادر کۆپتەری پێیە ..؟ کاك جەباروتی : نەخێروتم : ئەوە تا کۆپتەر بەسەر گۆجاڕەوە نیشتەوە ..با ئێمە فریای خۆمان بکەوینو چارەیەك بدۆزینەوە ، بۆیە کاك جەبار ئێوارەی هەمان ڕۆژ بڕیاری دا منو مامۆستا جەمال بە هێزێکەوە سەر کەوینە سەر گۆجاڕ . ئێمەش بە هێزیکەوە بۆ سەر شاخ بەڕێکەوتین ، دنیا زۆر سارد بوو ، بەفرێکی بێ ئەناز باریبوو ، هەتا بەرز ئەبووینەوە ڕێژەی بەفر بارینەکە زۆرت ئەبوو لەگەڵیشیدا توانای ڕێکردنمان کەمتر ئەبووەوە ، سەرماش توندتر کاری تێئەکردین ، خەریك بوو ڕەق ئەبووینەوە ڕووشمان نەئەهات قسە بکەین تەنانەت دەستیشمان چەکی نەئەگرت .. بۆیە لەگەڵ مامۆستا جەمالدا کەوتینە قسەوووتم : مامۆستا ئەگەر ئێمە بچینە سەرەوەش ئایا ئەتوانین شەڕ بکەین..؟ مامۆستا جەمالووتی:وەلا نازانم ..؟ووتم : یاڵلا با بگەڕێینەوە.. مامۆستا جەمال لە من زۆرتر حەزی بە گەڕانەوە ئەکرد ،ناهەقمان نەبوو ..کە چووینە خوارەوە هەموو شتەکانمان بۆ کاك جەبار باسکردو ئینجا ڕێوشوێنی ترمان بۆ بەرگری کرد دانا .

شایانیووتنە هەر لەم ڕۆژەداوەفدێکی برادەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان گەیشتنە سەفرە کەبریتی بوون لە فازیل مەتنیو فەرەنسۆ هەریریو ئازاد قەرەداخی کە لە هەنگاوێکدا بۆ بەپیرەوە هاتنی بانگەوازی ئاشتبوونەوەی گشتی هاتبوون کە پێشتر بە ناوبژیوانی ئێران هەڤاڵ مام جەلال سەردانی ئێرانی کردبوو بۆ گفتوگۆ لە گەڵ پارتیو چاوی بە ئیدریس بارزانی کەوتبوو تا دواجار لە ڕۆژی ١٩٨٦/١١/٧ دا ڕێککەوتن لە نێوان هەردوو لایاندا مۆربکریو لەلایەن کاك جەبار فەرمانو برادەرانەوە پێشوازیان لێکراو شەو گەیشتنە گەلاڵەو بەیانییەکەی بەرەو سەرکردایەتی بەڕێکران. فازیل مەتنی لە ڕێی ئەشکاندا بۆ سەفرە کە ٣ ـ ٤ کاتژمێرە قاچی ئەخلتیو ئازاری پێئەگات، بە سواریووڵاخ گەیشتە لامان چونکە لە دوای ئاشبەتاڵەوە ڕێگەی نەکردبوو، ناسك بوو بوو. چەکدارەکانی پارتی باوەشیان پیانەکردو سواریان ئەکردو دایان ئەبەزاند لەووڵاخەکەو مەسینەیان بۆ ئەبردە سەر ئاودەست. ئێمەش هەمیشە لە ژیانێکی دژواری پڕ لە شەڕو ئازارو پەلامارو هێرشو زۆرانبازیدا بووین لەگەڵ ڕژێمدا. کە ئەووەفدەی پارتی هات ئێمە هێرشێکی سەختمان لە سەر بوو، لەو جەبهەیەدا ٨ ڕۆژ بەوپەڕی زەحمەتییەوە ماینەوە، هەرووەرەو دڵسۆزی پێشمەرگە بوو ئاوڤای ئەو هەموو مەینەتییە بێتەوەو تادوا هەناسەش زرمەی دەستی بێت، ڕۆژی ١٩٨٦/١٢/٣ ناکاو دوژمن هێرشێکی بەربلاوی کردە سەرمان، بەجەربەزەیی پێشمەرگەکان هێرشەکە تێکشکاو لووتی چزا بە سکلی دلێری کوڕانی گەرمیانداو زیانی باشی لێکەوت. لەم هێرشەدا ڕۆڵەی قارەمانی گەلەکەمان فەرماندەی کەرت حەمە تیماری گیانی بەخشی. دوژمن بەمەوە نەوەستا سەرلەنوێ خۆی ئامادە کردەوەوەکو چۆن لەبەرەکانی شەڕی ئێران ـ عێراقدا هەرچی لە تواناد بوو بەکاری ئەهێنا ئاواش هەڵیئەکوتایە سەر سەنگەرەکانمان، هێزی پیادەی زۆرو زەوەندی لە سەربازو جاش تەییار کردبوو، تانكو زرێپۆشی فرەی سازو ئامادە بوو، هەموو جۆرە چەكو جبەخانەیەکی نرکەی ئەهاتو بێوەستان بۆ ساتێکیش بەندەنو بالای کەژو کێوەکانی ئەهەژاند، جگە لە ئاگرو ئاسنبارین هیچ شتێکی تر نەبوو.

تەنانـەت سروشـتیش خـەمبارو کەسـەر. لـەو کاتانـەدا کـاك ئـازادی سـەگرمە بەهێزێکـــەوە گەیشـــت بمـــانگۆڕێ بـــەڵام دوژمـــن دزەی کردبـــووە پشـــت هێزەکەمانەوە.

ڕۆژی ١٩٨٦/١٢/٤ هێرشێکی تونـدی کـردو شـەڕێکی نابەرامبـەری سـەخت بـەرپابوو، هێزەکـەمان شپرزە بـوو، زۆر شـوێنیان لـێگیرا. پاشـان شـکاین. ئینجا تیپەکەمان لەشاخی برزوتو بالۆسە بۆ لای گەلاڵە کشایەوەو لـەوێ سـەنگەرمان گرت.

هێزەکـانی تیپـەکانی ٣٧و ٥٧ لــە سـەفرەو گـردەڕەش بـوون، دوژمــن ئەمجارەیان لەو قۆڵەوە هێرشیکردو شـەڕێکی قـورس ڕوویـدا، ئـەنجام سـەفرەش گیرا، ئـیتر بـواری مانـەوە لـەو دۆڵەدا نـەماو بـەری جەبهەکـە تاتـەهات تەسکتر ئـەبووەوە، بۆیـە بڕیـاری کشـانەوە دراو بەکوێسـتانی گەلاڵـەدا بـەرەو بەرگـەڵوو سـەرگەڵوو چـالاوە گەڕاینــەوە، زۆر شـەکەتو مانــدوو بـووین، بـەفری ئـەو کوێسـتانە هـەرای پێکـردین، هەنـدێ پێشـمەرگەمان بەهیلاکـدا چـوون. مـن لەپێشیانەوە بووم گەیشتمە سەر دارو شەخسەکەی شێخ محەمـەد لـە کوێستانی دۆڵـی شـێخ محەمـەدا کەبەدرێـژایی مێـژووی ئـەوگۆڕە داریووشـکی ئـەو دەورو بەری لەسەر کەڵەکە کرابوو ، سەدان پارچـە پەڕۆی سـەوزی پیـا هەڵواسـرابوو، لەبــەر مانــدووبوونو ســەرمای پێشــمە رگــەکان ئــاگرم بەردایــە داری ســەر شەخسـەکەو پێشمەرگەکان هـەموو هاتنـە بـەریو خۆیـان گـەرم کـردەوە ، بـۆم ڕوون بــووەوە چـۆن خــەڵکی بــەخۆڕایی لــەدارو شــەخس ئەترســنو جگـە لـە ئەفسانەیەك هیچی تر نیە.

هەڤاڵ مام جەلال ناردی بە دوامدا، چوومەی لای زۆر تووڕە بوو تاوانی شکسـتەکەی خسـتە ئەسـتۆی مـنو فـەرمانی لـە سـەیدارەدانی دەرکـردم. بـەڵام برادەران پیاگەیشتنو داوای لێبوردنیان کرد، فەرمانی سـزادانەکەم کەمکرایـەوە بۆ سێ مانگ تەجمید کردنو گواستنەوە بۆ تیپێکی دوور. لـە ڕاستیدا منوەکو فەرماندەیـەکی پێشـمەرگە لـەو بەرەیـەدا هـیچ تـاوانێکم نـەبوو، پێشـمەرگەش ئەوەی لە دەستیان هاتبێ کردوویانەو درێغییـان نـەکردووە.. هـەر سـزادانێکیش

بۆ تێکشکانی پێشمەرگەو فەرماندەکانیان کارێکی قورسبوو مەگەر هەر ئێمە پێی قایل بووبین..ئینجا مەسەلەی شەڕی بەرەیی بەو کەرەسە سەرەتاییانەی ئێمە بەرامبەر ئەو هەموو توانایەی سوپای عێراق نەك بەراوورد نەئەکرا بەڵکو جۆرێك ملهوڕیش بوو. بۆیە شتێکی ئاسایی بوو گەر ئێمە لە بەرەیەکدا دەرەقەتی ئەو هێزەی دوژمن نەهاتبین.. بەڵگەش بۆ کەمتەرخەمی نەکردنمان ئەو هەموو شەهیدە بوو لە سەر ئەو لووتکە شاخانە گیانیان ئەبەخشی.. لە لایەکی تریشەوە دوژمن کە شوێنێکی مەبەست بوایە بۆ گرتنەوە نەك بە پەلامارێ بەڵکو دەیان هێرشی بۆ ئەکرد، گوێیشی لە زیانی مرۆیی و مادی خۆی نەبوو، بەڵکو مەبەستی ئەو شوێنە بوو کە بە لایەوە ستراتیژی بوو.. ئیتر بۆچی حیساب بۆ ئەوە نەئەکرا کە بەراوورد لە نێوان ئێمەو دوژمندا لە هەموو ڕوویەکی کاری سەربازییەوە نەکرێ نە لە ڕووی ژمارەو نە لە ڕووی تەکنیکی شەڕو نە لە ڕووی بەرنامە ڕێژیشەوە.. کە لە بنەڕتیشدا ئێمە هێزێکی پارتیزان بووین‌و بە زۆر شەڕی بەرەییمان بە سەر خۆماندا سەپاند کە شەڕی بەرەیی تەنیا لە نێوان دوو دەوڵەتدا ئەکرێ کە هەردوو لایان توانایان‌وەکو یەك بێ یا لە یەکەوە نزیك بێ. ئەو هەموو شتانە ڕەچاو نەکرا یان لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە دانەنراو ئەو سزایە بە سەر مندا سەپێنرا..

دوای ئەمە لەگەڵ کاك جەبار فەرمان‌و کاك سامان‌و م.عەلی‌و دەستەیەك پێشمەرگەدا شۆڕبووینەوە بۆ دیوی قەرەداخ‌و گەرمیان، لەگەڵ خۆشماندا ئاغای ڕەحیمیمان بردە خوارەوە کەئەو کاتە فەرماندەی تیپ بوو لە قەرارگای ڕەمەزان.

گەیشتمەوە گەرمیان‌و چوومەوە ناو ماڵ‌و منداڵەکەم،ویژدانم قبوڵی نەکرد هەروا دانیشم‌و دەستبەرداری خەبات بم سەرەڕای ئەو سزادانە قورسە سەپێندراوە بە سەرمدا کە تاوانی منی تێدا نەبوو، بەڵکو هەلومەرجی جەبهەکەو هێرشە توندو بەربڵاوەکانی دوژمن‌و نەخشە بەردەوامەکانی بۆ گرتنی ئەو ناوچەیە هۆ بوون بۆ لەدەست دانی‌و شکستی پێشمەرگە. حەزو خولیای چالاکی کەوتە گیانمەوە. لەو ماوەیەدا لە مەڵبەندەوە هێز کۆکرایەوە

بۆ گرتنی سەنگاو بۆ جاری دووەم. کاك شەوکەت هاتەلام بۆ دڵدانەوەم‌ووتی: هیچ دلگران مەبە هەڤاڵ مام جەلال سەرکردەی هەمووانە. منیش مەسەلەکەم بە گیانی شۆڕشگێڕانەوەرگرت، سزادانەکەم بە هەند هەڵنەگرت،وەڵامم دایەوەوووتم: ئێمە پێشمەرگەین، هەڵەش ئەکەین، هەقە هەر سزایەك لە سەرکردایەتییەوە دەربکرێت ئێمە پێش هەموو کەسێکی تر قبوڵی بکەین، ئینجا کاك شەوکەت پرۆژەی گرتنی سەنگاوی بۆ باسکردم، منیش لای خۆمەوە ئامادەی بەشداری کردنم دەربڕیوەکو پێشمەرگەیەك. کاك شەوکەت‌ووتی: تۆ مەسئولی پێشمەرگەی رووتەڵە نیت. ڕۆژی ١٩٨٦/١٢/٢٠ هێزەکەمان کۆکردەوەو شەو نەخشەی پەلاماردانەکەمان داناو بەو پێیە هێزەکەمان کردە چەند بەشێکەوە، هەر بەشەی لە قۆڵێکەوە. ئەبێ ڕەتڵی تیپەکانی ٥١، ٥٣ بچنە شوێن مەبەستە دیاری کراوەکان، پاشان ڕەتڵەکەی کاك شەوکەت بگات‌و جێگاکان قایم بکرێت بۆ ئەوەی بەیانییەکەی هێرشی تر بکەین‌و دوژمن ڕابماڵین، ڕەتڵی یەکەم بەئاسانی شوێنەکانیان گرت‌و ئەرکەکانیان جێبەجێکرد، لەگەڵ کاك شەوکەتدا جیهازمان کردەوە، لەسەر خەت نەبوو، کاك کاوە برایمان لە تیپی ٥١ ناردە لای قەڵای سەنگاو تاکو هێزەکەی بێنێ، کەچی بەیانی پێش خۆرکەوتن هاتەلامان، داوای کرد هیمەتێ بکەین شارەکە پاکسازی بکەین. کاتژمێر ١٠ - ١١ ی بەیانی هێرش دەستپێکرد شارمان کۆنترۆڵ کرد جگە لەمەرکەزو سەربازگەکە ئەویش کاك حەمەڕەش بەڵێنی گرتنی دا بەڵام منو کاك عادل قایل نەبووین، مەگەر تۆپی ١٠٦ملم لێی بدات ئینجا پەلامار بدرێ، ئەمەش نەبوو، بۆیە نەگیران. هەموو هێزەکەی دوژمن لەو دوو شوێنە خۆیان حەشار دابوو، چاوەڕوانی کۆمەکیان ئەکرد لە چەمچەماڵەوە بۆیان بێت، هەرچەندە بۆسەی باشمان دانابوو لەسەر جادەی سەنگاو - چەمچەمال بۆ لێدانی هەر هێزێك بیەوێ بگاتە فریای سەنگاو.

لە ماڵێکدا خەریکی نان خواردن بووم ئاگام لەغەڵبەغەڵبێك بوو، چوومە دەرەوەوەزع شڵەژابوو،ووتیان هێزی دوژمن گەیشتووەتە ناو شارۆچکەکەو ڕەتڵەکەی کاك شەوکەت چووەتە قەراغ ماڵەکان. تومەز تەنیا

دەبابەیەکی بەرازیلی لە چنگی بۆسەکانمان دەرباز بووەو گەیشتوەتە ناوەوە، کە زانیویەتی پێشمەرگەی تیایە یەکڕاست بە ڕێگەی خۆیدا ئەگەڕێتەوە بێئەوەی دەستی لێبوەشێنرێ، بۆسەکانوەکو پێویست دەوریان نەبینیبوو، ئەگینا ئەو دەبابەیە نەیئەتوانی دەربازبێ، ئێمە لای خۆمانەوە جارێکی تر کۆبووینەوە بۆ پەلاماردانی سەربازگەکە، کەنزیك بووینەوە عەقڵم نەیبڕی بە ئاسانی بیگرین جگە لەوەی زیانێکی زۆریشمان لێئەکەوێ، بۆیەوازمان لێهێناو گەڕاینەوە ناو ماڵەکان. ئەو ڕۆژەماینەوە تاکو ئێوارە، شەوەکەی سەنگاومان بەجێهێشت، لەو دەورووبەرە خۆمان مەڵاس دا بۆ هەر پەلامارێکی دوژمن، بەیانی تائێوارە هیچ نەبوو، ئینجا بڵاوەمان لێکرد، لەم شەڕەدا زیانی دوژمن لەدیلو دەستکەوت زۆر بوو، ئێمەش پێشمەرگەیەکمان بە ناوی همزە ڕەش کە خەڵکی سەنگاو بوو شەهید بووو چەند بریندارێکی سووکمان هەبوو.

# ساڵی ١٩٨٧

مەڵبەندی یەكوەزعی باش بوو، بەڵام پێویستی بە هەندێ ئاڵوگۆڕ هەبوو لە ڕووی بەڕێوەبردنو هەڵسووڕانو بەهێزکردنەوە. مانگی ١٩٨٧/١ بوو کاك قادری حاجی عەلیوەکو لێپرسراوی مەڵبەند هات، ئەو توانی کۆمەڵێك گۆڕانکاری بکات، لە دوای کۆبوونەوەی تێروتەسەل هەوڵدرا بەرنامەی باشترکردنی مەڵبەند دابنرێو دەست بدرێتە جموجووڵو چالاکی، کە بەراوورد بکرێت لەگەڵ مەڵبەندەکانی تردا ئەم زۆر کز بوو. یەکەم هەنگاوێك بۆ بەگەڕ خستنەوەی مەڵبەند لە ڕووی چالاکی شەڕەوە دانانی نەخشەی شەڕی ڕێگای سەرقەڵا ـ کفری بوو.

بە سەرپەرشتی کاك قادر خۆی هێز ئامادە کراو پەلاماری ڕەبایەکانی دەوروبەری ناساڵح درا، بەڵام بەهۆی کەموکوڕی لە نەخشەکەداو نە شارەزایی ناوچەکەو نەزانینی توانای دوژمن، نەتوانرا سەرکەوتن بە دەست بهێنرێ سەرەڕای ئەوە ئێمە زیانی بەرچاومان لێکەوت. من تا مانگی ٤ / ١٩٨٧ لە

ماڵدا مامەوە، لەو ماوەیەدا لە مەڵبەندەوە داوای هێزکرا بۆ سەرکردایەتی، دیارە لە مەڵبەندەکانی تریش هەمان هێز داواکرابوو. هێزەکانی مەڵبەندی یەك بەشێکی لە ڕێگەی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵانەوە بەڕێکەوتو بەشەکەی تری لە ڕێگەی تیپی ٢٣ی سووورداشەوە، منیش لای خۆمەوە سەرکەوتمە سەرەوە بۆ سەردانی سەرکردایەتی، دیارە کاك قادری حاجی عەلی هەڤاڵ مام جەلالی بینیبوو، ئەو باسی مەسەلەکەی منی بۆ کردبوو ئەویش لای خۆیەوە چاوی بە بڕیارەکەی خۆیدا خشاندبووەوە.

لە شەوی١٣ ـ ١٩٨٧/٤/١٤ کە شەوی داستانی ڕزگارییە بە فەرماندەی تیپی ٥٧ ی سەگرمە دانرام.وا دانرابوو ساڵی ١٩٨٧ بکرێتە ساڵی دەستوەشاندنی کاریگەر لە دوژمن لە هەموو لایەکەوە شەڕی گەورەی لەگەڵ بکرێو بە تایبەتی سوود لە هەندێ هەلومەرجی شەڕی ئێران ـ عێراقوەربگیرێ، بە تایبەتی لەو ماوەیەدا لە لایەن ئێرانەوە دەنگۆی پەلاماردانی ناوچەی شارباژێڕ هەبوو، بۆیە یەکێتیشویستی لای خۆیەوە کارێك بکاتو گوشارێك بخاتە سەر هێزەکانی دوژمنو نەخشەی پەلاماردانەکەش کرا بە چەند قۆڵێکەوە:

- قۆڵی زمروون ـ گلاڵە ـ زینۆی سپی.
- شاخی گۆجاڕ.
- شاخیووڵاخلوو ـ باڵخ ـ پیرئەلیاس.
- کلکەی پیرە مەگروون ـ قوڵە پووشێن ـ قوڵە سەوز.
- شاخی قەیوان ـ دووبرا ـ خەمزە.
- شاخی ئەزمەڕ.
- شاخی گۆیژە.
- شاخی گەوەڕە ـ شاخەسوور.
- شاخی قوڵە جاخ ـ خەجە لەرزۆك ـ کۆڕەنگ.

هەموو هێزەکانی یەکێتی لە شوێن مەبەستە سەرەکیەکانیان نزیکبوونەوە. دوژمن زۆر بێئاگا بوو لەوەی چی ڕوو ئەدات،وەختێکی زانی شەوی ١٣ ـ ١٩٨٧/٤/١٤ لە یەك کاتداو بە یەك تەوژمی شێر ئاسا هێزی

پێشمەرگە پەلاماری هەموو شوێنە دەست نیشانکراوەکانیانداو دەیان ڕەبایەو چەندین بارەگای سریەو بارەگای فەوجیان خستە ژێر کۆنترۆڵی گرێ چەکەکانیان‌و لە ماوەیەکی زۆر کەمدا لە چنگی داگیرکەریان دەرهێناو ئاسەواری دوژمنیان تێدا نەهێشت. هەر لەو شەوەدا لە قۆڵی شاخی گوڵێی بەری ماوەت ئێران هێرشێکی توندی کرد، بەڵام نەیانتوانی ئەوەی مەبەست بوو کە گرتنی شاخی گوڵێ بوو جێبەجێی بکەن.

لەم قۆڵەوە یەکێتی بەشداری نەکرد بەڵام ناوچەکە ناوچەی تیپی-٣٧ ی شارباژێڕ بوو لێی هاتنە ناوەوە، لەبەر ئەو شەڕانە تیپەکە ئەوێیان چۆڵکردبوو.

ئەو چالاکییەی یەکێتی ناونرا داستانی ڕزگاری، کە ڕزگار کردنی ناوچەیەکی زۆری گرتەوە، کە لە ڕووی کاری پێشمەرگانەوە شتێکی کەموێنە بووو دەنگێکی باشی دایەوە. ئەگەر هەموو بەرنامەی نەخشەکە جێبەجێ بکرایە بە تایبەت قۆڵی بورجەکەی ئەزمر ئەوا سەرکەوتنێکی مەزنتر ئەبووو بەشێکی زۆری ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی عێراق پاك ئەکرایەوەو بگرە هەندێ شوێنی تری گرنگ ئەکەوتنە مەترسییەوەوەکو شاری سلێمانی. لەم شەڕانەدا هەندێ لە چەکدارەکانی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی عێراق بەشداربوون لەگەڵماندا‌وەکو هاوکاری کردنێك.

ئەم داستانە لە ڕادیۆی ئێرانەوە لە ژێر ناوی (فەتحی/٥ ) دا بڵاو کرایەوە، پێنج هەزار پێشمەرگەی یەکێتی بەو کارە هەڵسان تەنیا هەندێ پاسداری فەننی‌و شارەزایانی چەکی قورس‌و مین هەڵگرتنەوە لە قۆڵی ئەزمەڕدا بەشدارییان کرد.

داستانی ڕزگاری جارێکی تر ئەوەی دووپات کردەوە کە (ی.ن.ك) خاوەن دەسەڵاتێکی شۆڕشگێڕانەیە، بەرامبەر بەو دوژمنە باڵادەستە زەبەلاحەی خاوەن تەکنۆلۆژیای نوێ سەرومری گەورە ئەنەخشێنێ. دوژمنی عەفلەقی لەم زەبرە ڕاچەنی‌و هەستی بە کاریگەرێتی ئەم دەستوەشاندنە کردو ڕۆژی دواتر بە هێزێکی قەبەی سەربازی‌و بە پاڵپشتی تۆپخانەی قورس‌و کۆپتەرو

پیلاتۆس‌و فڕۆکەی جەنگی‌و کاتیۆشای٤٠و هاوەنی هەمەجۆرو تەنانەت چەکی کیمیایی بەکارهێنرا، هێرشێکی سەرسەختانەی کردە سەر سەنگەرەکانی (ه.پ.ك) لە پشتی خەمزەو چیای دووبراو کۆڕەنگ‌و شاخەسوور شەڕێکی نابەرامبەر بەرپا بوو کە هەشت ڕۆژی بەردەوامی خایاند، کە هیچی لە بەرەکانی ناوەڕاست‌و خوارووی عێراق کەمتر نەبوو بگرە توندتریش بوو، لەم داستانە گەورەیەدا دوژمن زیانی بێ ئەندازەی لێکەوت:

- گرتنی : ١١٧ ڕبیە، ٥ بارەگای سریە، ٤ بارەگای فەوج، ١ سەربازگەی گەورە.
- کوشتنی :١٧٦٢ کەس.
- بریندداربوونی :٢٨٥٦ کەس.
- بەدیلگرتنی :١٨٦ کەس
- هەروەها دەستکەوتنی سەدان پارچە چەکی جۆراوجۆرو کەل‌و پەلێکی زۆری سەربازی.

لە لای ئێمەشەوە ١٠٦ ڕۆڵەی بە ئەمەکی گەلەکەمان بە خوێنی گەشیان لووتکەی سەرکەشی ئەم سەرکەوتنەیان سوور کرد.

دوای هەندێ ئاڵوگۆڕ لە دۆخی شەڕەکەدا هەموو هێزەکانمان لە شاخی پیرکەو تەلاش‌و کونەکۆترو پشتی قوڵەجاغ‌و پیربایز گیرسانەوە. هەر ڕۆژی دوایی ڕژێمی بەعس بە فڕۆکە پەلاماری دێی شێخ‌وەسانانی دا، بە بۆمبی کیمیایی خەڵکێکی زۆری شەهید کرد لە ناویانا کۆمەڵێکی زۆر ژن‌و منالی بەستەزمانی تیابوو. کە لە یاسای نێو دەوڵەتیدا قەدەغەکراوە، بەڵام کەسێك نییە لەسەر کورد هەڵبدات‌و بەرگری لێ بکات‌و ئەو ستەمەی لە سەر لاببات.

هەر لەم کاتانەداو بۆ چەواشەکردنی دوژمن‌و کەمکردنەوەی هێرشەکانی بۆ سەر ناوچەکانی داستانی ڕزگاری، لە مەڵبەندی یەکەوە بە هاوکاری برایانی پارتی‌و حسك‌و حشع‌و بە سەرپەرشتی کاك جەبار فەرمان نەخشەی گرتنی ناحیەی قەرەداخ دارێژراو شەوی ١٩ـ١٩٨٧/٤/٢٠ لە چەندین قۆڵی جیاجیاوە پەلاماری ڕەبایەکان‌و ناو شارۆچکەکە دراو لە ماوەی سێ سەعات‌و نیودا دەستی بەسەردا گیراو کۆمەڵێك دەستکەوتی زۆر کەوتنە دەست

پێشمەرگە لەوانە ٣ زریپۆش‌و ٣ ڕەشاش دیمترۆڤو جیهازێکی ڕاکاڵ‌و جیهازێکی بێڵ، دەیان پارچە چەکی جۆراجۆرو هەشت ئۆتۆمبیل تەقەمەنی‌و شۆفلێك‌و کەلوپەلی دامودەزگاکانی ناحیەکەو کوژرانی ٨٥ کەسی دوژمن‌و بە دیلگرتنی ١٣٠ کەسی تر لە خۆشمان دوو شەهید هەبوو. ئەمە سەرکەوتنێکی گەورە بوو، ناوچەیەکی گرنگی سەربازی بۆ یەکجاری لە چنگی دوژمن ڕزگار کراو لەوەش بە بایەختر هاوکاری‌و بەشداری هێزەکانی لایەنەکانی تر بوو کە پشتیوانییەکی باش‌و دڵخۆشکەر بوو لە ڕووی ناشتبوونەوەی نیشتمانییەوەو هەڵوێستێکی شۆڕشگێڕانە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی دەسەڵاتی داگیرکەردا.

هەر لەم ڕۆژانەدا بوو لە دەشتە بە فەڕەکەی شارەزووری گڕکانی شۆڕشدا خەڵکی پێشاوەی ژێر قامچی دەستی داگیرکەران دژی دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی بەعس ڕاپەڕین. ڕۆژی ١٣/٥/ ١٩٨٧ ڕۆژێکی‌وورشەدارە لە مێژووی بەگژداچوونەوەی دەسەڵاتی عەفلەقییەکان، هەر لە هەڵەبجەوە هەتا سیروان‌و خورماڵ‌و سەید سادق‌و عەربەت خەڵکی بە توندی‌ووروژان. هەڵسانێکی جەماوەری بوو کە دوژمنی ڕاچڵەکان‌و خستییە دوو ڕێیانی مەترسییەوەوای لێکرد بێ بەزەییانە بکەوێتەوێزەیان. تەنیا تاوانیان ئەوەبوو دژی ڕەفتاری بەعسیان بوون کە تەقەلای بێووچانی ئەدا بۆ قەلاچۆکردنی گەلی کورد. ئەم هەڵایسانە مانای ئیسپات‌وجود بوو.وە نەبێ ئەم هەڵوێستە هەر لەم دەڤەرەدا قەتیس بێت، بەڵکو پریشکەکەی شوێنەکانی تری‌وەکو شارۆچکەکانی ڕەواندزو شەقڵاوەو هەندێ لای تریشی گرتەوە، بەڵام بە زەبری ئاگرو ئاسن خەفەکرا، زۆر بە پەلەو بەوپەڕی کەللەڕەقییەوە دایمرکاندەوە. بەڵام ئەم ڕاپەڕینە سەرەڕای کەموکوڕی لە نەخشەی ئەنجامدانەکەیدا کە نەبوونی دەوری ڕێکخستن‌و ڕابەرایەتی تێدا کزبوو، نەتوانرا سەرئەنجامێکی سەرکەوتووەدەست بهێنێ. بەڵام خۆی لە خۆیدا پرشنگێکی ڕووناك بوو لە ئاسۆی خەباتی جەماوەری‌و تەقینەوە بە ڕووی دوژمنێکی شۆڤینیدا.وەنەبێ هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە ئاستی ئەم هەڵوێستە مەزنەی خەڵکی دڵ گەرمی شارەزووردا بێدەنگ ڕاوەستابن‌و لە دوورەوە چاودێری بارودۆخەکە

بکــەن، بــەڵکو بــۆ پاڵپشــتی ئــەوان هێزێکــی هاوبەشــی تیپــی ١٥و برایــانی سۆسیالیست پەلاماری ناحیەکانی خورماڵو سیروانو ڕەبایەکانی دەوروپشتیاندا لە شەڕێکی قورسدا هەرچی ڕەبایەی ئەو نـاوە هـەبوو دەسـتی بەسـەردا گـیراو ئینجا هێرشیان کردە سـەر ناحیـەی خورمـاڵو لـە ماوەیـەکی کەمـدا لـە دوژمـن پاککرایەوە. پاشان خەڵکی ناحیەی سیروانو هێـزی پێشمەرگە پێکەوە توانیـان هێزەکانی بەعس پاکسازی بکەنو دامو دەزگاکـانی کـۆنترۆڵ بکـەن بـۆ پاڵپشتی ڕاپەڕینی ئەم ناوچانە، خەڵکی هەڵەبجە بڕیـاری مـانگرتنو ڕاپەڕینیانـدا. ڕۆژی ٥/١٤ دەستیان پێکرد، بازاڕیان نەکردەوە خەڵکەکە لە ماڵـەکانیان هاتنـە دەرەوە، ناڕەزاییــان بەرامبــەر دەرکــردنو ئــاوارەکردنی خــەڵکی دێهــاتوویرانکردنی شارۆچکەکان دەربڕی.

پێشمەرگەش ئەم هەلەیان قۆستەوەو چوونە ناوشار بۆ پاڵپشتی خەڵکە ڕاپەڕیوەکە. شەڕ لە نێوان دوژمنو ڕاپەڕیوانـدا بـەرپابوو. دوژمـن زیـانی زۆری لێکەوت.وەکو هەمیشە پیشەی بووە پەنای بردە بەر زەبرو زەنگو ڕووخاندنی ماڵی هاووڵاتیـان بـە تایبـەتی گـەڕەکی کـانی ئاشـقان تـەختکرا کـە ئـەم گەڕەکە کۆمەڵێك سەروەری تۆمارکردووە : یەکەم شەهیدی شۆڕشـی نـوێ فـاتیحی شـێخ حەیدەر خـەڵکی ئـەم گەڕەکەیـە ، خـەڵکی ناویـان نـابوو سـەرکردایەتی یـەکێتی بەشـەو ،چـونکە هەمووشـەوێ تابـەیانی پێشـمەرگەی یـەکێتی تیـا دەمایـەوە .. تەنانەت مزگەوتەکانیش لەم خراپەکارییە دەربازنەبوون، خەڵکەکـە ناچاربوون شارۆچـکەی هەڵەبجـە بـە جـێ بـێڵنو ڕوو بکەنـە ناوچـەکانی ژێـر دەسـەڵاتی پێشمەرگەو چەکدارێکی زۆری سەر بە ڕژێمیش پەیوەندی بە شۆڕشـەوە بکـەن. لەم بارەدا هێزەکانی دوژمن زۆر شپرزەبوو بوون. دوژمنویستی بە هانـای ئـەو هێزەیـەوە بچـێت بـەڵام لـە سـەر پـردی زەڵـم کەوتنـە ژێـر زەبـری چـەکی مەرگبارێنی شۆڕشگێڕەکانی کوردەوەو بە سەرشۆڕی کشانەوە. ئینجا بـە فرۆکـە دەستیکردە بۆردومان کردنی ناوچەکە بـۆ چاوترساندنی خـەڵکی کـەبووە هـۆی شەهید بوونی چەند هاووڵاتییـەکی بێتـاوان. لـەم شـەڕانەدا دوژمـن گـوژراوێکی زۆریداو ٧١ کەس لە جاشو سەرباز بە دیلگیران.

هـــەر لـــەم ماوەیـــەدا بـــوو دوژمـــن لـــە گەرمیانـــدا هێزێکـــی زۆری کۆکردبووەوەو ڕۆژی ١٩٨٧/٥/١٠ پـەلاماری ناوچـەی داودەیـدا. لـە دێـی چەچـان پێشمەرگەکانی تیپی ٥١ لێی ڕاپـەڕینو زیـانێکی قورسـیان لێـداو ناچـاربوو بـە سەرشۆڕی ناوچـەکە بـەجێ بهێڵـی، دەسـتکەوت: یـەك شۆفڵ، یـەك ئۆتۆمبیـل، گرتنی موستەشارێكو گرتنی نەقیب کاوەی برازای شێخ ستار بوو.

دیسانەوە ڕۆژانـی ١٢و ١٩٨٧/٥/١٦ لـە ڕێگـای قـوری چاییەوە پەلاماریدا یـەوەو دیسانەوەش بـە مـەرەی جاری پێشوو چـوو بـە خراپـی تێکشکا، بـەڵام هەروازینەهێنا، ڕۆژی ١٩٨٧/٥/١٨ پەلاماری دێی هۆمەرملیدا بە هێزێکی قەبەوە کە بریتی بوو لە دەیـان تانـكو دەیـان ئۆتۆمبیـلو چـەندین شـۆفڵو تۆپخانـەی قـورسو سـەربازو جاشێکی زۆر بـە جۆرێـك خـەڵکی ترسـیان لێنیشتبوو، ئـەم هێزە گەورەیە هیچ ناهێڵێو هەموو ناوچەکە داگیر ئەکات. بەڵام هۆمـەرمل کـە دێیەکی١٠٠ ماڵ زیـاتر نـەبوو، پێشمەرگەو پشتگیری زۆریـان هـەبوو، لـە ڕێگـای شۆڕشـدا شـەهیدی زۆریـان دابـوو. مێژوویـەکی دێرینـی لـە نەبـەردو پێکادانـدا هەیە. هەرکە دوژمن هەڵیکوتاوەتە سـەریو شـەڕی دەسـتەو یەخـەی تێـداکراوە بە سـەروگوێلاك شکاوی ڕایکـردووەو بـۆ جـارێکیش نـەیتوانیوە سـەرکەوتنێکی بچکووك مسۆگەر بکات. هۆمەرمل بوو بە گرێکوێرەی ناو دڵەڕەشەکەی بـەعس، هـەر جارێكویستوویانە دەسـتیان پێبگـاو کـەفی ڕقیـان بەسـەریدا بچـەڕێنن، خانووەکـانی بـڕووخێنن، خەڵکەکـەی بکـوژن، خاکەکـەی خـاپور بکـەن، بـەڵام ڕووبـەڕووی دیـواری قـایمیووڕەی خەڵکـە ئـازاو پشـتگیرییە قارەمانەکـەیو پێشـمەرگە چاونەترسـەکان بووەتـەوە. بۆیـە ئـەمجارەشوەکو جـارانی دی ئـەو هێـزە زلو زەلامـە لـە بەرامبـەر جەربـەزەیی ئـەم دێیـەدا خۆیـان پێڕانـەگیراو لەبەردەم گـڕی لوولـەی تفـەنگی خـەڵکی پـارێزەری کوردسـتاندا هەرچـەندە بـە ژمارەش کەمبوون لە چاو دوژمنداو هەر یەکێکیان کێوێك زاتو پیاوەتی بـوون، زارەتـەرەك بـوون، ئـەو تانکانـەی کـە لـە ١٨٥ دانـە تێپـەڕی بـوون شـپرزەبوونو خۆیان لوول کردو بەرەو دواوە پاشەکشەیان ئەکرد. دوای ئـەوەی هەندێکیشـیان تێکشکان، ئەو شۆفڵانەی هێنابوویان خانووبەرەی خەڵکە ڕەشو ڕووتەکـەی پـێ

تەختو تاراج بکەن لە بەردەستی پۆلایینی پێشمەرگەدا زەندەقیان چووبوو، شۆفێرەکانیان گیانیان هەڵپرووکابوو. هەر گەلەجاش بوو بە پەلە پرووزێو بەو چەمو چوغردەدا گورێزەیان کرد بووو خۆیان لە مەرگی تاین دەرباز کرد.ووردەووردە ئاسمانی تەپوتۆزاوی ناوچەکە ڕەوی بووەوەو تەقو تۆقو زرمەی تۆپ نەما بووو شەڕەکە کۆتایی هات. بۆ خەڵکەکە دەرکەوت کە چەند دوژمن هێزەکەی گەورەبێ بەڵام بە ئیرادەی بەتینی خەڵکی خۆڕاگر هەموو پیلانەکانی پووچەڵ ئەکرێتەوە. دوژمن بە جۆرێك پۆزی شکا بوو هەر بن بەردو دەوەنو پاڵ هەر گردۆڵکەو نشێوێك بوو بووە پێشمەرگەو لە حەیبەتا سامی مردنی لێنیشتبوو.

جارێکی تریش هۆمەرمل بە سەربەرزی مایەوە. هیچ بستێکی خاکی ئەم دییە بە چەمو بەردو داری باخە چڕەکانیەوە نەماوە داستانی بەرگریو قارەمانێتی نەگێڕنەوە ڕازی ئازایەتیو نەبەزی کوڕە دڵسۆزەکانی باس ئەکەن. لەم شەڕە گەورەو گرانەدا گیانی دوو پێشمەرگە بوونە چرای ڕێگای ئازادی کوردستان، یەکێکیان مەلا کەریمی فەرماندەی کەرتی پێنجی تیپی ٥٣ی شێروانە بوو. دوژمن زیاتر لە ٩٣ کوژراوی هەبوو، تەرمی ٤٠ کەس لەبەر دەستی پێشمەرگەدا بەجێما، ١٨ شۆفڵ گیرا، چەند تانکێك تێکشکێنراو یەك دانەشیان بەساغی کەوتبووە دەست. سەرەڕای ٣٠ پارچە چەك دەستکەوت بوو.

ئەو کاتە ئێمە لەسەر شاخی پیرکە ـ تەلاش بووین، ڕۆژێ بە جیهاز گوێم لە جاشەکان گرتبوو کەوا لە ناوچەی بازیانن داوای خواردن ئەکەنو باسی دەربەند چۆلەکە ئەکەن کە ئەکەوێتە نێوان تاسلوجەو شاخی پشتی جێشانە، ئەم زانیاریانەم بە پەلە دایە سەرکردایەتیو بڕیار درا هێزێکی مەڵبەندی یەك بگەڕێتەوە دیوی بازیانو قەرەداخ بۆ پوچەڵکردنەوەی مەبەستەکانی دوژمن. کە گەیشتینە بازیانو قەرەداخ هێزەکانی دوژمن زنجیرە شاخی گڵەزەردە هەر لە بورجی دارەڕەشەوە تا تاسلوجەیان گرتبوو، لەوێ مۆڵیاندابوو، ئێمەش کۆبووینەوەو نەخشەی پەلامارمان بەم شێوەیە داڕشت:

• تیپی ٥٧و بەشێك لە تیپەكانی ٥١و ٥٩ بۆ سەر دێی جێشانەو شاخی داراغاو قەڵای هەزار مێردو شاخی بەرانان بە سەرپەرشتی كاك رۆستەم.
• بەشێكی تری تیپەكانی ٥١و ٥٣و تیپی مەڵبەندی یەك بۆ سەرشاخی گۆپتەپەو گڵەزەردە بە سەرپەرشتی كاك قادری حاجی عەلیو كاك شێخ جەعفەر.
• هێزێكی تیپی ٥٥و تیپی مەڵبەند بۆ پشتی زرگوێزو ناو دێی زرگوێزو ڕەبایەی كڵاو گورگ بەسەر پەرشتی كاك ئاوات قارەمانی.

لە كاتژمێری سفردا هەموو هێزەكانمان نزیكی شوێنە دیاری كراوەكانیان بوونەوە، لە شەوی ٢٥ـ١٩٨٧/٥/٢٦ دا هەر لەگەڵ زرمەی یەكەم گوللەی ئارپیجیدا دۆزەخێكی گەرم بۆ هێزەكانی دوژمن داخرا. بە جۆرێك بوو كەس فریای كەس نەنەكەوت. لە ماوەیەكی كەمدا هەموویان ڕامالران. كوژراوو برینداروو دیلو دەستكەوتی زۆرمان هەبوو، جگە لە هەندێ كەمو كوڕی بەهۆی نەشارەزاییو جێوونكردنو لێگۆڕان، سەركەوتنێكی باشمان وەدەستهێنا.

بۆ بەیانی دوژمن بە هێزێكی شەقو شڕەوە هاتەوەو هەندێ شوێنی گرتەوە، بۆ ئەوەی ئەم هێزەش گورزی كوشندەی لێبدرێ بە پێی نەخشەیەكی بەربڵاو خۆمان سازدایەوەو شەوی ٢٦ـ١٩٨٧/٥/٢٧ بە توندی لە چەند قۆڵێكەوە پەلاماریاندرا بەم شێوەیەی خوارەوە:

قۆڵی یەكەم: بەشێكی هێزەكانی تیپەكانی ٥٧و٥٩ لە داراغان هێرشیان كردە سەر بارەگاكانی فەوجی سووكی ٦٠و ڕەبایەكانی دەوروبەریداو گیرا. بەشێكی تری هێزەكە هێرشیان كردە سەر بارەگای فەوجی سووكی٩٧و گورزێكی كاریگەریان پێگەیاندن.

قۆڵی دووەم: لە لایەن پێشمەرگەكانی تیپی ٥٣و تیپی مەڵبەندی یەك لە گۆپتەپەوە پەلاماری فەوجی یەكەی ٨٧٩٠و بارەگای فەوجی ٩٠ پەلاماردرانو هەمووشوێنەكان گیران.

ئاسمانی ناوچەكە لەو شەوەدا یەكپارچە بوو بووە ئاگر، دیسانەوە ئەو هێزانەی دوژمنوەكو جاری پێشوو كەوتنە ناو تەڵەی مەرگەوەو كوژراوو

برینداری زۆریداو بە بەرچاوی خەڵکی سلێمانییەوە جبەخانەیەکی گەورەی سووتاو لە حەژمەتاندا هیچ جاشو سەربازێك خۆی پێ ڕانەگیراو بەرەو سلێمانی هەڵاتن. بە گشتی لەم نەبەردییەدا زیاتر لە:

١٥٠ ئەفسەرو سەربازو جاش کوژرانو ١٣ چەکداریش بە دیل گیران جگە لە سووتاندنی ٢٠٠ پارچە چەكو ١٥ ئۆتۆمبیل.

دەستکەوتیش:

- ١٠ ئارپیجی
- ١٦٠ کلاشینکۆف
- ٣٠ دکتاریۆف
- ١ دەمانچە
- ٣ ئۆتۆمبیل
- ٥ جیهازی ١٠٥
- ١ تایپ
- ١ هێستر

پێشمەرگە لەو سەر شاخانە سەنگەریان لێدا. شەڕی ڕووبەڕوو بوونەوە چەند ڕۆژێکی خایاند، هەموو ڕۆژێك کۆپتەر ئەهاتو سەنگەرەکانی ئەکوتا، لە خوارەوەش تۆپخانەی قورس تۆپبارانی ئەکرد. ئەم شەڕانە شکستی قورسی لە دوژمندا، شڵەژانی خستبووە ڕیزەکانیەوە، ترس ناخی تەنیبوو، ئێمەش ئەم سەرکەوتنەمان بە بەخشینی گیانی شەهیدان دلێر جاف فەرماندەی تیپی مەڵبەندو عەبدوڵڵا ڕەمباتی فەرماندەی کەرتی تیپی ٥٥ دەستەبەرکرد، پاش ئەوە ئەو شوێنانەمان چۆڵکرد، هەر تیپە گەڕایەوە سنوورەکانی خۆی.

هاوکاتی ئەم زنجیرە چالاکییە هێزێکی هاوبەش لە مەڵبەندی دووو سێ شەوی ٢٩ ـ ٣٠ /١٩٨٧/٥ پەلاماری ناحیەی تەق تەقیاندا کە ٤٥ کیلۆمەتر لە کەرکوکەوە دوورە، پاش شەڕێکی قارەمانانە دەستی بەسەراگیراو هەموو دامو دەزگاکانی ناحیەکە بە هەموو کەلوپەلو پێداویستییەکانیانەوە دەستکەوت بوو، زیانی دوژمن زیاتر لە ٦٠ کوژراو بوو، بڕێکی زۆر چەكو تەقەمەنیو

جیهازو ئۆتۆمبیل، زیانی ئێمەش شەهید بوونی چوار قارەمان بوو کە یەکێکیان کاك عەبدولڕەحیم عەبدوڵلا لێپرسراوی عەسکەری مەڵبەندی دوو بوو.

دوژمنی فاشی گوشاری زۆری کەوتبووە سەر، ڕۆژانە زیانی قورسی پێئەگەیشت، لە ناوچەیەکی فراوانەوە کە دێهاتەکان بوو پەلاماری ئەدرا. بۆیەویستی ڕێگری لەمە بکات سەرۆکایەتی ڕێکخراوی باکوری حیزبی بەعس پلانێکی تۆکمەی دارشت بۆ ئابلۆقە خستنە سەر دێهاتەکان و قەدەغەکردنی هاتوچۆکردن و گەیشتنی پێداویستییەکانی ژیان. بە پێی ئەو بڕیارەی حیزبی بەعس ژیانی خەلکی و ئاژەلیش قەدەغەو هەموو ناوچەی دێهاتەکانی بە ناوچەی سەربازی داناو ئەبێ لە ژێر چاودێریدا بێت و بگرە هەموو جموجووڵێکی قەدەغە کردو ڕێگەی بە فەرماندە سەربازییەکاندا لە لایەن خۆیانەوە هەموو ئیجرائاتێك بکەن. کە ئەمە خۆی لە خۆیدا حوکمی قەرەقوشییە.وایئەزانی بەو ڕێگە گرتنەبەرە ئەتوانێ دەسەڵاتی شۆڕش کۆنترۆڵ بکات.

ئەوەی پێویستە بووترێ هێزی پێشمەرگە لە ڕووی هێرش و جێبەجێکردنی نەخشەی شەڕی گەورەوە هەنگاوی باشی نابوو. دوژمن کەمتر توانای بەرگری هەبوو، بە تایبەتی گرتنی زنجیرە ڕەبایەو شارۆچکەو سەربازگە، بۆیە لەم ساڵەدا چەندین سەربازگەو شارۆچکەی داگیرکراوو تەنراو بە هێزی سەربازی و جاش دوای شەڕێکی کەم خایەن لە چنگی سوپای داگیرکەر ڕزگاری ئەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا دوژمن دەستی لە سیاسەتی تەفروتوونا کردنی کوردستان و تۆڵەسەندنەوە لە خەلکی بێتاوان هەڵنەئەگرت و شێتگیرانە بە هەموو هۆیەکانی دەستوەشاندن لە هەر شوێنێکدا بوایە کاری خۆی ئەکرد بۆ چاندنی تۆوی تۆقاندن و خەفەکردنی گیانی بەرەیی و وورە بەرزکردنی ئەفرادەکانی خۆی. ئەوەی زۆرتر ڕۆژانە خەلکی وەرس ئەکرد پەلاماری کۆپتەرەکانی بوو کە لە هەر لایەك پێشمەرگە چالاکییەکانی ئەنجام بدایە دوای ئەوە کۆپتەرەکانی ئەهاتنە ئاسمانی ناوچەکەو بۆ ماوەیەکی زۆر

ئەکەوتنەوێزەی ئەو دێهاتانەی ئەو سنوورە بۆردوومانی خەڵکەکەیان ئەکردو دەستیان لە تەڕوووشك نەئەپاراست. ئەمەش بە مەبەستی ئەوەی خەڵکەکە بترسن‌و ناوچەکان بە جێبهێڵن‌و کار بکاتە سەر جموجووڵی پێشمەرگەو چالاکییەکانی کەمبکەنەوە. بەڵام خەڵکی‌وا ڕاهاتبوون لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا کە لە ناو دێهاتەکاندا پەناگەی چاك درووست بکەن هەرکە دەنگی کۆپتەر ئەهات پەنایان بۆ ئەبردو خۆیان حەشار ئەدا تاکوو دووربن لە مەترسی یان دەرئەچوونە دەرەوەی دێهاتەکانیان‌و لەسەر کێلگەکانیان یان لەو چەمو چخوردانە تا ئێوارەی درەنگ ئەمانەوەو پاشان ئەگەڕانەوە ناو لانەو مانەیان.وەنەبێ هەر مەترسی کۆپتەریان لەسەر بووبێ بەڵکو بەشەوانیش بەهۆی تۆپی دوورهاوێژەوە تۆپباران ئەکران. بە گشتی خەڵکە خۆڕاگرەکە لەگەڵ هەموو جۆرە شێوازە دڕندانەکانی پەلاماردانی بەعسیەکاندا بە باشی ڕاهاتبوون‌و بەوپەڕی دڵ قاییمییەوە پەنجەی تەحەدایان بەرز ئەکردەوە بە ڕووی بەرنامە دزێوەکانیدا، سەرەڕای ئەو زیانانەی لێیان ئەکەوت. یەکێك لەو ناوچانەی کە بەرگەی دوژمنکاریەکانی بەعسی ئەگرت‌و تۆزقاڵێك کاری لەوورەو زاتیان نەئەکرد ناوچەی داودە بوو کە هەم لە دێهاتەکانیاندا پەناگەو حەشارگەیان درووستکردبووو هەم لە دەشتایی پەتەکیدا دەیان شوێنیان چاککردبوو بۆ حاڵەتی پێویست. کەچی دوژمن هەمیشە بە چڕی ڕقی نابووە سەریان بۆ تۆڵەسەندنەوە.

ڕۆژی ١٩٨٧/٧/١٧ کۆپتەرەکانی بەعس هێرشیان کردە سەر دێی دوڕاجی‌و لە ناوەختدا ٩ کەسی بێتاوانی لێ شەهید کردن لە کاتێکدا ئەمانە لەسەر داس‌و درەو بوون. خوێن‌و عەرەقیان تێکەڵی خەڵەو دانەوێڵەی درەوکرابوو. ئەمە یەکەم‌و دوا تاوانی دوژمن نییەو نەبووە دەرهەق بە خەڵکی بێدیفاعی کوردستان‌و لە زاتی کەم نەکردوونەتەوە. ئەمە نەك لە زاتی خەڵکی کەم کردبێتەوە بەڵکو دەیان قات ڕق ئەستوور تر ئەبوون.وەنەبێ پێشمەرگە ساتێ بیر لە حەسانەوە بکەن بەڵکو هەمیشە بیریان لای تۆڵەی ئەو ناهەقیانەبووەو لوولەی تفەنگەکانیان لە لاشەی بۆگەنی دوژمندا گەرم

کردوومتەوە. هەر ماوەیەك پێش ئەمە هێزێکی ئامادەکراوی مەڵبەندی یەك، کە لە تیپەکانی ٥٣و ٥٥و تیپی مەڵبەند پێکهاتبوو بە پێی نەخشەیەك شەوی ٩ ـ ٧/١٠ پەلاماری سەربازگەی دوو دارەی سەرووی دەربەندیخانیان دا. لە بەرئەوەی نەخشەکە باش دانەرێژرابوو، دوژمن ئاگای لەو بەرنامەیە بووکە هێرشی بۆ ئەکرێ. هێزەکانی پێشمەرگە سەرکەوتنیان بە دەستنەهێنا، زیانی دوژمن شتێکی ئەوتۆ نەبوو، بەلام ١١ پێشمەرگە شەهید بوونو تەرمەکانیشیان کەوتە دەست دوژمنو برانە دەربەندیخانو لەوێ کرانە ژێر خۆڵەوەو نەدرانەوە بە خاوەنەکانیان.

لە تۆڵەی ئەمەدا رۆژی ٧/١١ هێزەکانی تیپەکانی ١٥و١٧و ٥١و ٥٣و٥٧ هێرشیان کردە سەر ئۆردووگای نەسری تازە درووستکراو ئاگریان تێبەرداو سووتاندیان.

هەر لەم مانگی (٧) دا بوو بەهێزێکەوە لەلایەن مەڵبەندەوە بۆ هێنانی چەكو تەقەمەنی گولله هاوەنی ١٢٠ ملمو گوللەی کاتیۆشای ١٢ لوولەی بچوك بۆ بەری قەرەداغ نێردراین ، کە سەرەتای ئەم مانگە بوو هێزێکی تر لەگەڵ شەهید حەمە سەعید حاجی غەریب دا بۆ ئەو مەبەستە چووبوون . ئەو هێزەی ئێمە پێکهاتبوو لە بەشێك لە کەرتەکانی تیپی ١٥ ی شارەزوورو تیپی ٣٥ ی کورە کاژاوو چەند پێشمەرگەیەکی دەستەکەی خۆم بە چاو ساغی (  ) کە شارەزای ئەو سنووورە بووو خۆشم تەکلیفم لێکرد ..هێزەکەمان لە گوندی دووکانی قەرداغەوە خستە رێ بەرەو شارەزوورو شەو لە ئاستی گوندی داری قەلان بەرەو ئالانو حاسڵ پەرینەوەو نەوەستاین تا گەیشتینە بیە رەشکەو لە چەمەکەی خواریەوە ماینەوە چونکە هێزەکەمان ماندوو بوو بوون پێویستیان بە پشوو هەبوو، پاش نیوەرۆ لەوێوە بەرێکەوتینو بە گوندی دۆلاشو قاجرو چەمی زەڵمدا تێپەرینو لەگەڵ تاریكو لێڵی ئێوارەدا چووینە گوندی تەپە تۆڵەکە ، دوای ئەوەی لە جادەی سەرەکی هەڵەبجە- سەیدسادق دڵنیابووین پەرینەوە بەرەو گوندی تەپی سەفاو لەوێشەوە چووینە ئوردوگای خورماڵ ، لە بەرئەوەی لە خورماڵەوە تاکو دیوی ئێران ئاوەدانی تیا نەبوو لە هەندێ ماڵە

دۆستو ناسراو نانو کەلوپەلی پێویستمان هەلگرت.. ئینجا چووینە ئاوایی ڕۆستەم بەگو بە ملەی دەرەتوێدا چووینە گوندە چۆلەکەی سەرگەتو بەلای پەلکی خوارووی شرامدا سەرکەوتینو لەوێشەوە بەرەو هەورازی هانەنەوا کە ئەو ناوچانە بە هۆی شەڕی ئێران- عێراقو سیاسەتی ڕەگەز پەرستانەی بەعس چۆلوویران کرا بووو زۆربەی مینرێژ کرابوو تەنیا یەك باریکە ڕێ هەبوو بوج هاتو چۆی پیادەوووڵاخ کە زۆر ترسناك بوو ، چووینە قەلەخانیو لەوێشەوە بەرەو هەورامانی تەخت کە ئەکەوێتە دیوی کوردستانی ئێرانەوەو ئینجا گەیشتینە () کە مۆلگای سوپای پاسدارانی لێبوو لەوێشەوە چووینە گوندەکانی دەرەکێو دەمەوێ کە هەموویان سونی بوونو سەر بە تەریقەتی نەقشی بوون ، پاشان چووینە گوندی دارێ ، لەو ناوە بارەگای تیپی ٣٣ ی سورێنی خۆمانی لێ بوو کە تازە دروست کرابوو ، ئەم تیپە کار ئاسانیان بۆ کردین لەوەرگرتنی تەقەمەنیو ڕێکخستنی کاروبارەکانمانو گەڕانەوەی هێزەکانمان .

ئەو کاتە مەفرەزەیەکی هاوبەشی حسكو سوپای پاسداران چووبوونە شارەزوورو لە چەمی زەلم پاسدارێك خۆی تەسلیم بە هێزەکانی عێراق کردبوو ، دیار بوو زانیاری لێوەرگیرابوو .شایەنیووتنە بارەکەی ئێمە ٦٥ووڵاخ گوللە کاتیۆشاو هاوەنی ١٢٠ ملم بوو کە گەیشتینە نزیکی جادەی سەرەکی سەیدسادق- هەلەبجە لە سەربازگەو ڕەبیەکانی دەوروبەری سەیدسادقو گردی گۆوە تۆپباران کراین کە باش بوو زیانی بەدواوە نەبوو ، لە چەمی زەلم ڕۆژێك ماینەوە ئینجا بەرەو ئالانو حاسلۆ بەری قەرەداغ ..کە گەشتێکی پڕ لە ماندوو بوونو مەترسی بوو بەلام ئێمەوەکو پێشمەرگە ئەرکەکەمان بەجێگەیاند .

لە ڕۆژی ١٩٨٧/٨/١٠ دا هێزێکی هاوبەشی تیپەکانی ٥١و ٥٩ لەسەر ڕێگای قادر کەرەم - دووز بۆسەیەکیان داناو چوار ئۆتۆمبیلی پڕ لە جاشی کەوتە ناوەوە، لەگەل قرمزنی تفەنگەکانو گرمەی ئارپیجیدا پیاوەکانی ڕژێم بە دەم

زریکـەی ترسـنۆکانەوە ئـاودیوی دۆزەخ بـوونو ٢٣ لاشـەیان لـە بەردەسـتی پێشـمەرگەدا ئەکـەون، دوو ئۆتۆمبیلیـان ئەبنـە قـەرەبرووت، ٢٤ چـەك دەستکەوتبوون. بـەراتی ئـەم چالاکییەش ٣ ڕۆڵـەی فیـداکاری کوردستان بـوون، نەك هەر ئەمە بەڵکو لە دەیان لای تـرەوەووردە چالاکی ئەنجامـدراوەو دوژمـن بە جارێ شپرزەو هەراسان کراوە.

هـەر لـەم مانگـەدا بـوو کـاك نەوشـیروان لـە گەشـتەکەی دەرەوەی دا لـە ڕێگەی ئێرانـەوە گەڕایـەوە بـە سووریێندا گەیشتە شارەزوور ئینجا مەڵبەنـدی یـەك کـە تـازە بارەگاکـانی گواسـترابووەوە نـاو قـۆپی. بـۆ چـاو پێکـەوتنی کـاك نەوشیروان بانگ کراین. ئەویش لە بارەیوەزعی جیهانو کوردستانو شۆڕشو پەیوەندییـەکانمان بـە دەرەوەو دۆسـتو پشتیوانەکانی گەلەکـەمان بـە تێـرو تەسەلی قسەی بۆ کردینو تیشکی خستە سەر هەندێ خاڵی شاراوە بـە تایبـەتی ئاییندەی عێراقو چارەنووسی کوردستان کە تا ئەو کاتە ئەو شتانەمان لا ڕوون نەبوو. دوای چەند ڕۆژێك حەسانەوە بەرەو سەرکردایەتی بەڕێ کەوت.

هەر لەم مانگەدا (حرکە الدیمقراگیین العـراقیین ) هاتنـە گـەرمیانو لـە سنووری تیپی ٥١ ی گەرمیان بارەگایان دانا. ئەمانە پێشتر وەفدێکیان گەیشتبووە سـەرکردایەتیو دوای چـاوپێکەوتنو کۆبوونـەوە لەمـەڕ هاوکـاریو دۆسـتایەتی بەیانێك لە نێوان هەردوولادا مۆرکرا.

مـانگی ١٩٨٧/٩ کۆمەڵـە ڕووداوێکـی گرنگـی تێـدابوو، جموجـووڵی پێشمەرگە زۆر بوو، ڕۆژ نەبوو شـڵپە لـە دوژمـن هەڵنەسـێنرێو ئـازاری تونـدی پێنەگات. ئەویش لە حەیبەتا لەسەر ڕێگاو بانە گشتییەکاندا دەستی لە خـەڵکی ئەوەشـاند بـە تایبـەتی لەسـەر جادەی کفـری ـ دووزو کفـری ـ سەرقەڵا. ئەمـە چەند جارێك دووبارە بووەوە بۆ تەمبێکردنی بڕیاردرا تۆڵەی ئەمە بکرێتەوە.

هەروەکووتمان ئەم ساڵە چالاکی زۆر بوو، ناوچەی شەڕیش فراوان بـوو پێویستی بە چەكو تەقەمەنی زۆرتر بوو بۆ دابەشکردنی بەسەر هێزی پێشـمە رگەی شـەڕکەردا ، نـەش دەکـرا لەڕێگەی قاچاخچییەوە پەیـدا بکـرێ یـانوەکو

دەسـکەوتی شـەڕ کەژمارەیـەکی زۆر کـەم بـوو بۆیـە هەمیشـە شـۆڕش لەهـەوڵی ئەوەدابوو لەپاڵ کاری سیاسیو دیبلۆ ماسیدا کـەخۆی لـە شـەڕێکی زۆر سـەختی نابەرامبەردا بوو چەكو تەقەمەنی پەیدا بکات تاکوبتوانێت بـەرگری لـە خـۆی بکاتو ڕووبەڕووی پیلانو هێرشەکانی داگیر کەریش بێتەوە .

شۆڕشی کودستان گەرچی بـەدوژمنی جۆراوجـۆر ئابلۆقـە درابـوو بـەڵام ئەو دوژمنانە لەناو خۆیانـدا گونجاوو تـەبا نـەبوون هەریەکـەیان لەگـەڵ ئـەوی تـردا چـەندین مـادەی ناکۆکیـان هـەبوو ، پێویسـتیان بـەوە هـەبوو بـە کـارتی جیاجیا یاری بکەن تا لەو ڕێگەیـەوە بگەنـە هەنـدێ لـە نامانجـەکانیان ، یـەکێك لەو کارتانەش مەسەلەی کورد بوو کەبۆ هەر چوار دەوڵەتەکە (ئێـران ئێـراق ، تورکیا ، سوریا ) کارێکی زیندوانەبوو .

لەڕووەکەی ترەوە شۆڕشـی کوردیش لـەناو ئـەو بـارودۆخو هاوکێشـانەدا کـاری خـۆی دەکـردوو دەیویسـت لەسوچـێکەوە سـودێکی دیبلۆماسـیانەی بـۆ بەرژەوەندیەکانی خۆی هەبێ بەلۆژیکی کاری سیاسیانە لەسەر بنەمای دوژمنـی دوژمـنم دۆسـتمە ..بۆیـە لەهـەر جموجـولێکی دۆسـتانە لەگـەڵ ئێرانـدا بڕێـك چەكو تەقەمـەنیمان دەسـت دەکـەوت کـە بـۆ بـەردەوامبوونی کاروبـاری شـەڕو چـالاکی پێشـمەرگانە سـودمەند بووونـەرکێکی قورسـی پەیـداکردنی لـەڕێگا نائاسـاییەکانەوە لـەکۆڵ دەکرینـەوە کەزەحمـەتیش بـوو.. ئەمـەش کـارێکی ئاساییەو هەموو شۆڕشو جوڵانەوەیەك پەنایان بۆبردووە .

ئەوکاتانە من فەرماندەی تیپی ٥١ی گـەرمیان بـووم ، لـەمانگی ١٩٨٧/٩ دا بوو کاك قادری حاجی عـەلی لێپرسـراوی مەڵبەنـد بـانگی کـردمو داوای لێکـردم بەهێزێکـەوە بچـمە دزڵـی لای کـاك شـەوکەتی حـاجی مشـیر کەلێپرسـراوی پەیوەندیـەکانی یـەکێتی بـوو بۆگواسـتنەوەی ئـەو تەقەمەنیانـەی بۆمـان دابـین کرابوو .منیش هێزێکم نامادەکردکە بریتی بوو لە بەشێك لە کەرتەکانی تیپی ١٥یشارەزوور ، تیپی ٣٥ی کوڕەکازاو ، چەند پێشـمەرگەیەکی دەسـتەکەی خـۆمو ڕۆژی ١٩٨٧/٩/١٨ لـە گونـدی دوکانـەوە بـەرەو گونـدی کـۆرەی بنـاری شـارەزوور

شەو بەتاریکی لەجادەی دەربەندیخان _ عەربەت لەئاستی گوندیداری قەلان ڕووەو ئـالانو حاسـڵ پەڕینـەوە ، هەرهـەمان شـەو نەوەسـتاین هەتاگونـدی بییەرەشکە لەچەمەکەی خواری گوندەکە ماینـەوە تـاکو هێزەکەمان پشوویەك بداو خۆبۆ سبەینێ ئامادە بکەین .پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی بـەڕێ کـەوتینو بـەلای گونـدی دۆلاشـا بـەرەو گونـدی قـاجرو چـەمی زەڵـم تێپـەڕینو لەگـەڵ تاریكو ڕوونی ئێوارەدا چووینە گوندی تەپەتۆڵەکە کە بۆدلنیا بوون لە جادەی سەرەکی هەڵەبجە _ سەیدسادق بەرەو گوندی تەپی سەفا ڕۆیشتین ، لەوێشەوە یەك سەر چووینە ئۆردووگای خورماڵ!و لەهەندێك ماڵە دۆست نامو خۆراکمان لەگەڵ خۆمانـا هـەلگرت لەوێشـەوە چووینە ئـاوای ڕۆستەم بـەگو ملـەی دەرە سوندا سـەرکەوتینو چووینە گونـدە چۆڵەکەی سـەرگەت پاشـان بـەلای پـەلکی خـواروی شـرامدا بـەرەو هـەورازی هانەنـەوا . چاوسـاغەکانمان :مامـەناجی ، قالەسـوور ، خـەلیل سـەرکانی بـوون . شـایانیووتنە پێشـتریش هێزێـك بـە سەرپەرشـتی شـەهید حەمـە سـەعید سـێتەلانیو خـەلیل سـەرکانی کـەبڕی ٦٠وولاخ گوللە هاوەنی ١٢٠ ملمو گوللە کاتیۆشـای ١٢وولـەیی بچووك بۆ بـەری قــەرەداغ گوێزرایــەوە . ئەوکاتــە دێهاتــەکانی شــارەزوور لەلایــەن ڕژێمــەوە چۆلکرابوو.. دەبوایـە زۆر بەووریایی بڕۆشتینایە تـا دوژمـن نـەزانێو هێزمـان لەسـەر کۆبکاتـەوە ، لـەنزیك گونـدی ئەحمـەدئاوا لـەنێوان گوڵپو سـەرگەت کەهێڵی پێشەوەی شەڕگەی ئێران –ئێراق بوو ،مینڕێژ کرابوو تەنیا ڕێگەیـەکی باریك لەلایەن قاچاخچیەکانەوە پاك دەکرایەوە بۆهاتوچۆو سەربازەکانی ئێراق ڕۆژانە دەیان پشکنی ، چونکە هەستیان دەکـرد خـەڵکی پیادەڕواتو دەسکاری شـوێنە مینڕێــژکراوەکان دەکــرا..بۆیــە هەمیشــە بۆســەیان دادەنــا ،بــەلام قاچاخچیەکان تەرەقەی مینەکانیان دەردەهێناو مینەکانیان دەخستەوە شوێنی خۆیـان بۆچەواشـە کردنـی دوژمـن، کەخـەڵکی بەوڕێگایـەدا دەڕۆیشـتن دەبوایـە بـەبێ دەنگی بـڕۆن نـەبادا دوژمـن ئاگاداربێ ..کەئێمـە دەمەوبـەیان گەیشـتینە

هانەنەوا دنیا کەمێك ساردبوو، لاماندا پشوویەك بدەین، قاچاخچیەکان دەنگە دەنگیان کردو دوژمن بەتۆپی ١٢٠ملم لێیداین بەلاّم ئێمە گوێمان نەدایەو لەوێ ماینەوە تارۆژ بووەوە ئینجا لە ملەی قەڵەخانییەوە ئاودیوی ئێران بووین و گەیشتینە بارەگاکەی کاك شەوکەت و پێشوازی لێکردین و شوێن و جێگەی پشوودانی بۆ دابینکردین تاکو چەك و تەقەمەنی ووڵاخەکان ئامادە دەکرێن .بەهەلم زانی سەردانێکی سنە بکەم ، چووم و ڕۆژێك لەوێ مامەوە ئینجا گرامەوە بۆ قەڵەخانی و دەستمان کردە چاککردنی بارەکان کەبەشێکیان گوللەی کاتیوشای دوورهاوێژو بوو گواستنەوەیان بەووڵاخ قورس بوو بەتایبەتی لە شاخدا ئەگەر بەر بەرد بکەوێ یان لەزەوی بدا مەترسی تەقینەوەی ئەبێ ناچاربووین هەڵیان بوەشێنینەوەوەو بیانکەینە دووبەشەوە تا بەئاسانی بگوێزرێتەوە .

لەوکاتانەدا دەنگوباسمان بۆهات کە هێزەکانی پارتی بەهاوکاری سوپای پاسداران پەلاماری ووشکە ناویان دابوو ، ڕەبیەکانیان گرتبوو، ١٨ جاشیان بەدیل گرتبوو..ئێمە سەرکەوتینە سەرشاخی مڵە خوردو تەقەیەکی گەرمی دۆشکاو هاوەن تەقاندن بوو ، لەوێ ئاغای حورمەتم بینی کە فەرماندەیەکی سوپای پاسداران بوو،ووتی: ئەم عەمەلیاتە گەورەیە یان داستانی ڕزگاری ..؟ منیش پێم ووت : ئەمە بەداستانی ڕزگاری بەراورد ناکرێت کەگورزێکی کوشندەبوو لەهێزەکانی ئێراق کەوت تێیدا ١١٧ ڕەبیەو بارەگای سریەو ٤ بارەگای فەوج گیراو ١٧٦٣ کەس کوژران و ٢٨٥٦ کەس بریندارو و ١٨٩ دیل گیران .

بەم چالاکیە ڕێگای هاتوچۆکەیان خراپ کردبوو ، هێزێکی زۆری ئێراق هاتبووە شارەزوورو ئەحمەدئاوا . بۆیە ئێمەش گەڕانەوەکەمان دواخست ڕۆژی دواتر بارەکانمان بارکردو بەرەو شارەزوور شۆڕبووینەوە.. ڕێگا زۆر سەخت بوو، هێسترەکان بارەکانیان دەخست ، نیوەی ئەو پەنجا بارە بەکۆڵی پێشمەرگە گەیەندرایە هانەنەوە، جگەلەوە هێسترەکان هی سوپای ئێران بوون بەزمانی فارسی تەعلیم درابوون و ئاشنای قسەی ئێمە نەبوون و لە جل و بەرگەکانمان

سڵیان دەکردەوەو هەندێ جار بەرەو کێڵگەی مینەکان دەردەپەڕینو بە حاڵێکی شڕ دەمانگرتنەوە .. بە ماندووبوونێکی زۆر گەیشتینە دەشتی شارەزوورو لە چەمی زەڵم تەقەمنیەکانمان داگرتو لە بەر کۆپتەرووڵاخەکانمان لەو چەومەدا شاردەوە تا کاتژمێر ٤ ی ئێوارەو پاشان کەوتینە ڕێ لە خواری سەیدسادقدا ١٢ کۆپتەری پیلاتۆس بەنزمی بەسەرمانا بەرەو ئەحمەدئاواووشکەناو چوون ..دەستمان لەسەر دڵمان بوو کە پێمان بزانو لێمان بووروژێن باش بوو لێمان ڕەت بوونو دایان لەو شوێنانەی هێزەکانی پارتیو پاسداران گرتب ووتیان .. بۆ شەوەکەی لە جادەی زەڕایەنمان دا بەرەو گوندی دسکەرە .. لەوە دەچوو دوژمن هەستی بە شتێك کردبێ ، هەموو جادەکەیان بە گوللەی گڕدار دەبێژا .. هەر کە گەیشتینە دسکەرە زۆربەی هێزەکەمان لە بەر ماندووبوون خۆیان شاردەوە ئێمەش بارەکانمان بردە بنکەی کۆرەو لەگەڵ هێسترەکاندا تەسلیممان کردن ،خۆشمان گەڕاینەوە بارەگاکانی خۆمان .

هەرلەم مانگەدابوو کۆمەڵێك چالاکی لەسنوری تیپەکەماندا ئەنجام درابوو کە لە ڕۆژی ١٩٨٧/٩/١ هێزێکی تیپی ٥١ لەسەر جادەی کفری ـ سەرقەڵا بۆسەیەکیان دانا. دوو ئۆتۆمبیلی دوژمنی تێکەوت، یەکێکیان تۆپی ١٠٦ ملمی پێبوو، ئەوی تریان دۆشکایەك. لەگەڵ یەکەم دەستڕێژدا هەردوو ئۆتۆمبیلەکەو چەکەکانی سووتێنرانو چەند ئەفسەرێك بوونە خەڵوزو ٩ سەربازیش کوژران. بەمە خەڵکەکە زۆر دڵشاد بوون. هەروەها شەوی ١٧ـ ١٩٨٧/٩/١٨ هێزێکی هاوبەشی تیپەکانی ٥١و ٥٣ لە جادەی کفری ـ کەلارەوە بەرەو ناوچەی زەنگاباد دابەزینە خوارەوە. بە پێی نەخشەیەکی داڕێژراو شەوی ١٩ـ١٩٨٧/٩/٢٠ پەلاماری ناحیەی کولەجۆیان دا. دەستێکی باشیان لێوەشاندو زیانی زۆریان پێگەیاند.گرنگی ئەم چالاکییە لەوەدا بوو بۆ یەکەمجارە دوای گفتوگۆی ساڵی ١٩٨٤ بە هێزێکی زۆرەوە پێشمەرگە دابەزێتە ئەو ناوچەیەی ئەکەوێتە خواری کفریو کەلارەوە چالاکی لە بابەتی پەلاماردانی ناحیەیەكو دامو دەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێم ئەنجامبدەنو دوژمن بێئاگابێت. بە

مەرجێ ئەم ناوچەیە ڕزگارکراو نەبوو،واتە بوونی پێشمەرگەی بە بەردەوامی تێدا نەبوووەکو ناوچەکانی ترو دوژمن ئەو ناوچەیەی تەنیبوو بە هێزەکانی لە قەرەتەپەو جەلەولاو کوڵەجۆو کفریو لەسەرەوەش کەلار ئەوەندە بواری پێشمەرگە نەبوو بە ئاشکرا تێیدا بمێنێتەوە مەگەر بە مەفرەزەی بچووک نەبێت.

هەر لەم مانگەدا لە مەڵبەندەوە ئاگادار کراینەوە بۆ کۆبوونەوە بە مەبەستی گرتنی بورجی دارەڕەش‌و ڕەبایەکانی زرگوێز. بۆ ئەمەش نەخشەیەك ئامادەکراو بەو پێیە:

- تیپەکانی ١٧و ٥٧و بەشێکی تیپی ٣٥ لە دارەڕەشەوە تا ناو زرگوێزی پێسپێردرا.
- تیپی ٥٣ لە دێی سوێراوەوە بۆ سەر شاخ.
- تیپەکانی ١٧و ٥٩ بۆ سەر بورجەکەو ڕەبایەکانی دەوروبەری.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم چالاکییە هێزەکان لە دۆڵی قەرەداخدا کۆبوونەوەو شەوی٢٨-١٩٨٧/٩/٢٩ لە هەموو لایەکەوە بە یەك تەوژم‌و لە ناکاو پەلاماری هەموو جێ مەبەستە دیاری کراوەکان درا. ئێمە شوێنە پێسپێردراوەکانی خۆمانمان گرت، تەنیا ڕەبایەی سوولەکان نەبێت کە بەهۆی بوونی مینەوە نەگیراو شەڕی تێدا بەردەوام بوو. شەڕ لە هەموو لایەکەوە تاکو ڕۆژی دوایی بەردەوام بوو، لە هەمان کاتدا تۆپ‌و کاتیۆشای تۆپخانەی شۆڕش جێیەکانی دوژمنی بە خەستی نەپێکاو گوللەیەکی سام ٧ کە لە لایەن کاك سوهادەوە ئاراستەی کۆپتەرێك کراو پێکای‌و بەریدایە خوارەوە. بەڵام سەرەڕای قەبەیی هێرشەکەمان‌و پاڵپشتی باشی تۆپخانە کەچی لە٤٠٪ سەرکەوتنمان بە دەست هێنا. هەر چەندە دوژمن کوژراوو بریندار فرەبوو، ٥٢ دیلی دابوو کۆمەڵێك چەك‌و تەقەمەنی کەوتە دەست پێشمەرگە، لە ئێمە پۆلێك پێشمەرگەی چاپووك بوونە قوربانی لەوانە: کاك حەمە سەعیدی حاجی غەریب فەرماندەی تیپی٥٥و ئازاد کەرکوکی فەرماندەی کەرتی سێی تیپی ٥٩و عوسمان هەڵدەرەیی فەرماندەی کەرت تیپی ٥٧، نەگەرچی ئەم شەڕە ئابڕوو چوونی حکومەتی تێدابوو بە بەرچاوی خەڵکی سلێمانییەوە هێزەکانیان

ئەشكان و شوێنەكانیان لێئەگیراو بە هەزار نقەنق و ترس و لەرزەوە بۆی ئەهاتنەوە.

بە مەبەستی تۆڵەسەندنەوەی ئەم چالاكیانە دوژمن بە هێزێكی زۆری جاش و سەربازو بە پاڵپشتی تانك و تۆپی قورس لە چەندین قۆڵەوە پەلاماری بارەگاكانی مەڵبەندی سێ لە سماقولی و هیراندا دا. ماوەی ١٠ ڕۆژ شەڕی قارەمانانە بەردەوام بوو، هێزی پێشمەرگە بەرگرییەكی كەموێنەیان ئەنجامدا، ئەو بەرنامەیەی دوژمن دایڕشتبوو بۆ كۆنترۆڵكردنی ئەو ناوچەیەو دەرپەڕاندنی هێزی پێشمەرگە بە ئاسانی سەری نەگرت و گورزی كوشندەیان تێسرەوێنراو زیانی بێ ئەندازەیان تووشبووو بە ناچاری پاشەكشەی كرد.

لەم شەڕانەدا پێشمەرگە لە ناوجەرگەی هێزەكانی دوژمندا دەستیان ئەكردەوەو لە قووڵاییدا هەراسانیان ئەكردن بە جۆرێك ترس و لەرزێكی ئەوتۆیان لێنیشت بوو بووە مایەی ئەوەی بە پەلەپرووزێ مەیدانی شەڕەكە كە خۆیان هەڵیان بژاردبوو بە جێبهێڵن. ئەم هێرش و پەلامارانە خودی وەزیری بەرگری عێراق عەدنان خەیروڵڵا سەرپەرشتی ئەكرد. ئەڵێن كاتێك هێزەكانی لە بەرەكانی شەڕەكەدا ئەشكاو ڕایان ئەكرد، پێشمەرگە لە سەنگەرەكانیاندا دەرئەپەڕن و لێیان ئەدان و شپرزەیان ئەكردن. ئەویش سەركۆنەی فەرماندە سەربازی و جاشەكانی ئەكردو بە تووڕەیییەوە بەراوردی لە نێواندا ئەكرد كە پێشمەرگە هەم بەرگری ئەكەن و هەم پەلامار ئەدەن كەچی هێزەكانی خۆی هەموو پێداویستییەكیان لە بەردەستدایەو هیچیان پێناكرێ ئەمەش پەیوەندی بە بیروباوەڕەوە هەیە، كەچی لە بیری چوو بوو هێزەكانی ئەو داگیركەرن و بیروباوەڕیان نییەو پێشمەرگەش لە پێناوی ئامانجی كوردایەتیدا گیانیان ئەبەخشن و خاوەنی مەسەلەیەكی ڕەوان.

ئەم شەڕانە نمونەیەكی كاریگەری شەڕی بەرگری بوون كە بۆ دوژمنی سەلماند هەرچەندە ئەو خاوەن گەورەترین تەكنۆلۆژیای سەربازی سەردەم بێ و تازەترین نەخشەی شەڕەنگێزانەی هەبێ ئەوا بەرامبەر بە هێزێكی خاوەن هەڵوێستی بەرگری نیشتمانی ڕووبەڕوو ئەبێتەوە.

ڕووداوەکانی ئەم مانگە بەپەلە تێئەپەڕن‌و هەر ڕۆژە شتێك ئەهاتە ئاراوە کەلە قازانجی شۆڕش بوو. سەرەتای مانگی ١٩٨٧/١٠ بوو لە سەر جادەی قادر کەرەم ـ دووز ئۆتۆمبیلێکی تیۆتای حکومی لە ئەنجامی نەشارەزایی ڕێگە هەڵە ئەکات، لەو کاتانەدا دەستەیەك پێشمەرگەی تیپی ٥١ بە ئۆتۆمبیلێکەوە ئەچنە سەرجادەکە بۆ بەنزین‌وەرگرتن، ئەو ئۆتۆمبیلەش لەسەر پردەکەی کۆرومۆر ڕائەوەستێ بزانێ ئەو چەکدارانە کێن، کە گومان ئەکەن ئەوانە پێشمەرگەن هەڵئەگەڕێنەوە بەرەو دووز، پێشمەرگەکانیش تەقەی لێئەکەن‌و بەرئەکەوێ. لە حەیبەتا سەرنشینەکانی خۆیان فڕێ ئەدەنە خوارەوەو ئینجا ئۆتۆمبیلەکە ڕائەوەستێ‌و پێشمەرگەکان ئەچنە سەریان ئەبینن ئەمانە بیانین‌و ئیتالین، یەکێکیان ناوی (جۆزیف )و ئەوی تریان (ڕۆبەرتۆ) بووو یەکێکیان بریندار ئەبێ. پێشمەرگەکان ئۆتۆمبیلەکەو بیانییەکان ئەگەیەننە بناری شاخ‌وئەیانبەنە لای کاك ڕۆستەم‌و برووسکە بۆ مەکتەبی سیاسی ئەکرێت‌و پاشان ڕەوانەی مەڵبەند ئەکرێن، لەوێ برینداره‌کە تیمار ئەکرێ‌و میوانداریی‌ەکی باش‌و ڕێزێکی زۆریان لێئەگیرێ‌و دوای چەند ڕۆژێك بەرەو سەرکردایەتی ئەگوێزرێنەوەو پەیوەندی بە دەوڵەتەکەیانەوە ئەکرێ‌و بەڕێزەوە ئازاد ئەکرێن. دیارە لە زۆر شوێنی ئەم دنیایە لەلایەن هێزە شۆڕشگێڕەکانەوە هەوڵ ئەدرێ خەڵکانی بیانی‌وەکو بارمتە بگیرێن‌و بۆ گوشار خستنە سەر دەسەڵاتی ئەو حکومەتەو کۆمەڵێك مەرجی قورس بەرامبەر ئازادکرنیان دائەنرێ کە زۆر جار لایەنی مادی تێدا ڕەچاو ئەکرێ، بەڵام یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەم جۆرە دەستگیرکردنانەی خەڵکانی بیانی تەنیا یەك مەبەستی سیاسی هەبووە کەڕای ئەو حکومەتە بەلای مەسەلەی ڕەوای کورددا ڕابکێشێ‌و دەنگۆیەك بخاتەوە.

لەو مانگەی پێشوودا هەندێ کەسی ناوچەی گەرمیان لە سەر سیخوڕی گیرابوون‌و لە زینداندا بوون، یەکێك لە زیندانییەکان کە ناوی ڕەشید حەسەن سەعدون بوو دانیشتووی فەقێ مستەفا بوو ئیعترافی لە سەر ٨٠ کەسی خەڵکی فەقێ مستەفا کردبوو کە سیخوڕن، پێشمەرگە میران فەرەج‌ووتی: چەند

ساڵێکی تر ئەڵێن ساڵی گیرانە گەورەکەی فەقێ مستەفاوەکو چۆن ئـەڵێن سـاڵی گرانییە گەورەکە، یەکێکی تـر لـەو گیراوانـە مـام غـەریب فـەتاح نـەجم خـەڵکی باشتەپە بوو، هەموو ئەمانە بڕیاری لە سەیدارە دانیان درابوو بـەڵام پـێش ئـەو بڕیارە لە سەر داوای کۆمەڵێك ڕیشسپی مام غەریب ئازاد کـرا. کـە بڕیارەکـە لـە لایەن م.س گەیشتبووە کاك ئاوات عەبدولغەفور برووسکەی بۆ کردم:

لە / ئاوات عەبدولغەفور

بۆ / کاك مەحمود سەنگاوی

( تکایـە ئاگـاداری سـوارەی فەرمانـدەی کـەرت بکەنـەوە غـەریب فـەتاح نەجم بگرن‌و ئیعدامی بکەن لە بەر ئەوەی ئەمری ئیعدام کردنی دەرچووە).

منیش یەکسەر ئاگاداری سوارەم کردەوە کە ناوبراو بگرێ‌و ڕەوانـەی لای خۆمی بکات. کە مام غەریب گەیشتە لامان، هاوڕێکانی لە سەیدارە درابوون، کـە بـە نـاو دێـی فـەقێ مسـتەفادا هـاتبوو تەماشـا ئـەکات کـار لـە کـار تـرازاوەوو زانیبووی ئەویش بۆ کوشتن ئەبرێ ڕەنگی مردووی لێنیشتبوو منـاڵێکی تەمـەن ٨ ـ ٩ ساڵی ڕووت‌و ڕەجاڵی لەگەڵا بوولـە گـەڵ پـیرە ژنێـك کـە کەشیدەیەکی بـە سەرەوە بوو هەر ئەگریان کە بینییانم زۆر بـەزەییم پێیانـا هاتـەوەو گەیشـتمە ئـەو ڕایـەی ئـەم کابرایـە نەشـکوژرێ هـیچ لـە مەسـەلەکە نـاگۆڕێ، بـانگی م. جـوامێری ڕابـەر سیاسی تیپـی ٥١ ی گـەرمیانم کـرد، ئـەویش قایـل بـوو، ئینجـا ئازادمان کردو ڕۆیشتەوە، مام غەریب کە خـاوەنی دوو ژن‌و ١٢ منـاڵی کـوڕو کـچ بوو لە ئەنفالەکاندا هەموویان بەرکەوتن‌و تیاچوون.

هەر لەم مانگەدا برووسکەیەکی سـەرکردایەتی گەیشـت بـۆ نـاردنی هێـز بـــۆ ســـەرەوە، بـــە دوو ڕۆژ خۆمـــان کـــۆکردەوەو گەیشـــتینە ســـەرەوە، کۆبوونەوەیـەکیان پێکـردین‌و نەخشـەی گرتنـی شارۆچـکەی دووکانیـان خسـتە بەردەسـتمان کـە لـە ڕاسـتیدا گرتنەکـەی لـە ڕووی سـەربازییەوە بـۆ ئێمـە گرنگییـەکی زۆری هـەبوو، ناوچـەیەکی فراوانمـان ئەکەوتـە ژێـر چـنگەوە. مەترسـیمان لەسـەر بارەگاکـانی سـەرکردایەتی دوور ئەخسـتەوەو دوژمنـیش تووشی شڵەژانێکی ترسناك ئەهات. هەروەها زۆر پێگەی سـەربازی تـر ئەکەوتـە

ناو بازنەی مەترسییەوە بە تایبەتی چاڵە نەوتەکانی کەرکوك. بەڵام ئەم نەخشەیە بە هۆی هەندێ کاری تەکنیکییەوە نەتوانرا جێبەجێ بکرێتو هەلەکە ئەوەندە لەبار نەبوو. بۆیە دواخراو لەو ڕۆژانەدا جێبەجێ نەکرا. لەبری ئەمە بڕیاردرا زینۆی سپیو دۆڵی گەڵاڵە بگیرێ.

ڕۆژی ۱۹۸۷/۱۰/۱۹ بەرەو زینۆی سپی کەوتینەڕێ، دنیا باران بوو، سەرمایەکی سەختو شەوێکی تاریكو نووتەك بوو. بە ئاستەم بەرپێی خۆمان ئەبینی، لەم دۆخە دژوارەدا هەریەکەمان لە ناخیدا دوو کەڵکەڵە سەری دائەهێنا، یەکێکیان جێبەجێکردنی ئەرکو فرمانەکانو بەدیهێنانی سەرکەوتن ئەویتریان بەرگەگرتنی مەینەتییەکانو کەندوکۆسپی سروشت بوو. بۆ مرۆڤی شۆڕشگێڕ هەمیشە کەڵکەڵەی یەکەم زاڵبوو. بەو سەرماو تاریکیو ناهەموارییە بەرەو شوێنی مەبەست ڕۆیشتن. ئەوەندە بارانەکەی بە خوڕ دای ئەکرد کە بوو بووە ڕێگر لە بەجێگەیاندنی ئەرکەکانمانو بە جۆرێك گیانمان تەڕ بوو بوو لەگەڵ چەکەکاندا حەشوەی گوللەی ئارپیجییەکان خووسان، کە ئارپیجی بۆ هەر هێرشو پەلامارێکی پێشمەرگانە بۆ سەر دوژمن دەوری سەرەکی هەیە. لێرەدا نەدەتوانرا بەو حاڵەتەوە کاری خۆی بکات. پەیوەندیمان بە کاك شێخ جەعفەرەوە کردو لەووردو درشتی مەسەلەکەمان گەیاند، بۆیە بڕیاردرا نەچینە سەر دوژمنو لە ئەشکەوتێکدا بمێنینەوە هەرچەندە هەموومان جێگەمان نەئەبووەوەو هەندێك پێشمەرگە تا بەیانی هەر لە بەر بارانەکە بوون، ئینجا بەرەو کانی توو گەڕاینەوەو چەند ڕۆژێك لەوێ حەساینەوە.

دوای ماوەیەك داوام لە برادەران کرد کە ڕێگە بدەن بچمەوە بۆ چارەسەری چاوو پشتم، ڕێگەیان دام. لەم ڕۆژانەشدا هەڤاڵ مام جەلال ئامادەی سەفەری ئێران بوو. منو کاك حەمەڕەشو کاك سەلامی کوێخا عەزیزو ئاغای ڕەحیمی ئەندامی قەرارگای ڕەمەزانی لەگەڵدا بووین. شەوێ لە کانی توو لای قادرئاغا ماینەوە، ئینجا لە نزیکی زینۆی سپییەوە تێپەڕین. شەوێکی نووتەكو ڕێگایەکی دژوار بوو، مەترسی ئەوە هەبوو لەو شاخەوە بەربینەوە، لەگەڵ هەندێ پێشمەرگەدا چووینە تەنگی بەرامبەر هەرزنە کە سیمەکەی لێبوو.

لەوێ بۆسەیەکمان دانا، ئاگامان لەوە نەبوو چل پاسدار پێش ئێمە ڕۆیشتوون بۆ ئاگادار کردنەوەی سوپا کە هەڤاڵ مام جەلال‌و هاورێکانی بەرێوەن بەرەو ئێران. سوپاش هێزێکی بێ زەبت‌و رەبتی لە شوێنێکی ناسکدا دانابوو. هەر قرەو هەرایان بوو زۆر خەممان بوو شتێك ڕووبدات زیاتر لەبەر هەڤاڵ مام جەلال. کە گەیشتینە سیمەکە پاسدارەکان‌و هەندێك لە ئێمەش پەرینەوە، کە نۆرە گەیشتە هەڤاڵ مام جەلال سیمەکە خراپ بوو، زۆر تووڕە بووو بە تەوسەوەووتی: گەر شەهیدبم ئەوا تاوانی کاك جەبارو مامۆستا عەزیزە. ئینجا بە پەلە سیمەکە چاك کرایەوە.

ڕۆژی ١٩٨٧/١١/١٠ گەیشتینە ئەشکان، ئێرانییەکان پێشوازییەکی گەرمیان لە هەڤاڵ مام جەلال کرد.چەند ئۆتۆمبیلێکی تیۆتایان ئامادەکرد بەرەو سەقز ڕۆیشتین، چەند ڕۆژێك لەوێ ماینەوە کە هەواڵی دەست بە سەرا گرتنی سەربازگەی چەرمەگامان بیست لە لایەن هێزەکانی مەڵبەندی یەکەوە لە شەوی ١٩٨٧/١١/٩٨ ئەنجامیان دابووو زیانێکی زۆر لە دوژمن کەوتبووو دەستکەوتی باش هەبوو چەند پێشمەرگەیەکی یەکێتیش شەهید بوو بوو کە یەکێکیان مام هێرش جێگری تیپی ١٧ ی زمناکۆ بوو.

ئینجا لە سەقزەوە بۆ کرماشان چووین‌و چەند ڕۆژێك ماینەوەو دواتر بەرەو تاران ڕۆیشتین، لە تاران چل ڕۆژ ماینەوە، لەوێ خەریکی چارەسەرکردن‌و سەردانی پزیشك بووم. هەر لە دوای ڕۆیشتنەکەی ئێمە برادەران بە پێی نەخشەیەکی سەرکەوتوانە پەلاماری زینۆی سپی ئەدەن‌و هەموو شوێنەکان لە دوژمن پاك ئەکەنەوەو زیانی بێ ئامانی پێ ئەگەیەنن‌و چەند پێشمەرگەیەکیش گیانیان ئەبەخشن کە یەکێکیان عەبەی دایە فاتە بوو کە بە بریندراری ئەیگەیەننە دیوی ئێران‌و لەوێ شەهید ئەبێت. پاش چارەسەرکردن‌و تەواو بوونی کارەکانمان بە یاوەری هەڤاڵ مام جەلال گەڕاینەوە کرماشان‌و سنەو نیوەڕۆیەك لە نوستانداری سنە لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلالدا میوان بووین. پاش نیوەڕۆکەی خواحافیزیمان لێکردن‌و بەرەو سەقز

ڕۆیشتین، لەوێشەوە بۆ دزڵیو سەرسنوور، لەبەر ئەوە شارەزامان نەبوو ماوەیەك ماینەوە.

لەو سەر سنوورە دەستمان نا بە پشتی ساڵێکی تری پڕ لە گرێوگۆڵی ژیانمان.. کە ئێمە تەنیا لە ژێر ساباتەکەی خۆمانداو لە کلاوڕۆژنەی ژوورە پەرپووتەکەی خۆمانەوە ئەمانڕوانیە پانتایی جیهانو ژیانو دەوروبەرمان.. زۆر ئاگامان لەو هەموو داوە ترسناکانە نەبوو بۆمان دانرابوو گەرچی ئەمانزانی ئێمە لە سەر بورکانێکی ئاگراویدا دانیشتووینو هەموو ساتێکی تەمەنمان ئامادەین ببینە قەرەبرووتو لە ڕێگەی ئەو هەموو داوە تەنراوە نەبینراوانەی لە دەرەوەیویستی خۆمان بۆمان چێنراوە.. ئەمە قەدەری کوردە..! تۆ بڵێی هەروا لە ژێر چەمۆڵەی ڕۆژگاردا بینو ڕۆژێك نەیەت دەرباز بینو دوژمنەکانیشمان ببنە تەڵەو داوی ڕۆژگارەوە..؟!

# ساڵی ١٩٨٨

ووردەووردە شۆڕ بوینەوە بۆ هەواری ساڵی نوێ. چونکە ئێمە هەمیشە لە شەڕو نەبەردیو زۆرانبازیداین لە گەڵ دوژمنەکانمان هیچ کاتێك چێژ لە زەمەنە خۆشەکانوەرناگرین، بۆیە ئەویش بە ساناییو بە خشپەیی تێئەپەڕی، بە بێ ئەوەی کەسمان لەویتر زویر ببێ بۆ مەراسیم ناگێڕینو لە ئاهەنگی تایبەتیدا بەشداری ناکەین..!

کە لە دزڵی بووین ئێرانییەکان ئەیانویست هێزێك بنێرنە سنووری قەرەداخو قسەیان لەگەڵ کردینو پێمانووتن: ئەگەر سەرکردایەتی ڕازی بێ ئەتانبەین، یەکسەر بڕیاری سەرکردایەتیمانوەرگرت کە ٤٥ کەس ببەین. ڕۆژی ١/١/ ١٩٨٨ لەگەڵ برایانی سۆشیالیستدا بەرەو چیای سوورێن بەڕێکەوتین. کە گەیشتینە سەرشاخ زریان هەڵیکرد، نەمانتوانی بڕۆین، خەریك بوو لەسەرمانا بمرین، ناچار گەڕاینەوە دزڵی.

لەوێ بۆسەیەکمان دانا، ئاگامان لەوە نەبوو چل پاسدار پێش ئێمە ڕۆیشتوون بۆ ئاگادار کردنەوەی سوپا کە هەڤاڵ مام جەلال و هاوڕێکانی بەڕێوەن بەرەو ئێران. سوپاش هێزێکی بێ زەبت و ڕەبتی لە شوێنێکی ناسکدا دانابوو. هەر قڕەو هەرایان بوو زۆر خەممان بوو شتێك ڕوویدات زیاتر لەبەر هەڤاڵ مام جەلال. کە گەیشتینە سیمەکە پاسدارەکان و هەندێك لە ئێمەش پەڕینەوە، کە نۆرە گەیشتە هەڤاڵ مام جەلال سیمەکە خراپ بوو، زۆر تووڕە بووو بە تەوسەوەووتی: گەر شەهیدبم ئەوا تاوانی کاك جەبارو مامۆستا عەزیزە. ئینجا بە پەلە سیمەکە چاك کرایەوە.

ڕۆژی ١٩٨٧/١١/١٠ گەیشتینە ئەشکان، ئێرانییەکان پێشوازییەکی گەرمیان لە هەڤاڵ مام جەلال کرد.چەند ئۆتۆمبیلێکی تیۆتایان ئامادەکرد بەرەو سەقز ڕۆیشتین، چەند ڕۆژێك لەوێ ماینەوە کە هەواڵی دەست بە سەرا گرتنی سەربازگەی چەرمەگامان بیست لە لایەن هێزەکانی مەڵبەندی یەکەوە لە شەوی ١٩٨٧/١١/٩-٨ ئەنجامیان دابووو زیانێکی زۆر لە دوژمن کەوتبووو دەستکەوتی باش هەبوو چەند پێشمەرگەیەکی یەکێتیش شەهید بوو بوو کە یەکێکیان مام هێرش جێگری تیپی ١٧ ی زمناکۆ بوو.

ئینجا لە سەقزەوە بۆ کرماشان چووین و چەند ڕۆژێك ماینەوەو دواتر بەرەو تاران ڕۆیشتین، لە تاران چل ڕۆژ ماینەوە، لەوێ خەریکی چارەسەرکردن و سەردانی پزیشك بووم. هەر لە دوای ڕۆیشتنەکەی ئێمە برادەران بە پێی نەخشەیەکی سەرکەوتوانە پەلاماری زینۆی سپی ئەدەن و هەموو شوێنەکان لە دوژمن پاك ئەکەنەوەو زیانی بێ ئامانی پێ ئەگەیەنن و چەند پێشمەرگەیەکیش گیانیان ئەبەخشن کە یەکێکیان عەبەی دایە فاتە بوو کە بە بریندارى ئەیگەیەننە دیوی ئێران و لەوێ شەهید ئەبێت. پاش چارەسەرکردن و تەواو بوونی کارەکانمان بە یاوەری هەڤاڵ مام جەلال گەڕاینەوە کرماشان و سنەو نیوەڕۆیەك لە ئوستانداری سنە لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلالدا میوان بووین. پاش نیوەڕۆکەی خواحافیزیمان لێکردن و بەرەو سەقز

ڕۆیشتین، لەوێشەوە بۆ دزڵیو سەرسنوور، لەبەر ئەوە شارەزامان نەبوو ماوەیەک باینەوە.

لەو سەر سنوورە دەستمان نا بە پشتی ساڵێکی تری پڕ لە گرێوگۆڵی ژیانمان.. کە ئێمە تەنیا لە ژێر ساباتەکەی خۆمانداو لە کلاوڕۆژنەی ژوورە پەرپووتەکەی خۆمانەوە ئەمانڕوانیە پانتایی جیهانو ژیانو دەوروبەرمان.. زۆر ئاگامان لەو هەموو داوە ترسناکانە نەبوو بۆمان دانرابوو گەرچی ئەمانزانی ئێمە لە سەر بورکانێکی ئاگراویدا دانیشتووینو هەموو ساتێکی تەمەنمان ئامادەین ببینە قەرەبرووتو لە ڕێگەی ئەو هەموو داوە تەنراوە نەبینراوانەی لە دەرەوەیویستی خۆمان بۆمان چێنراوە.. ئەمە قەدەری کوردە..! تۆ بڵێی هەروا لە ژێر چەمۆڵەی ڕۆژگاردا بینو ڕۆژێک نەیەت دەرباز بینو دوژمنەکانیشمان ببنە تەڵەو داوی ڕۆژگارەوە..؟!

# ساڵی ١٩٨٨

ووردەووردە شۆڕ بوینەوە بۆ هەواری ساڵی نوێ. چونکە ئێمە هەمیشە لە شەڕو نەبەردیو زۆرانبازیداین لە گەڵ دوژمنەکانمان هیچ کاتێک چێژ لە زەمەنە خۆشەکانوەرناگرین، بۆیە ئەویش بە ساناییو بە خشپەیی تێئەپەڕی، بە بێ ئەوەی کەسمان لەویتر زویر ببێ بۆ مەراسیم ناگێڕینو لە ئاهەنگی تایبەتیدا بەشداری ناکەین..!

کە لە دزڵی بووین ئێرانییەکان ئەیانویست هێزێک بنێرنە سنووری قەرەداخو قسەیان لەگەڵ کردینو پێمانووتن: ئەگەر سەرکردایەتی ڕازی بێ ئەتانبەین، یەکسەر بڕیاری سەرکردایەتیمانوەرگرت کە ٤٥ کەس ببەین. ڕۆژی ١/١/ ١٩٨٨ لەگەڵ برایانی سۆشیالیستدا بەرەو چیای سوورێن بەڕێکەوتین. کە گەیشتینە سەرشاخ زریان هەڵیکرد، نەمانتوانی بڕۆین، خەریک بوو لەسەرمانا بمرین، ناچار گەڕاینەوە دزڵی.

ڕۆژی سەری ساڵ لە هەموو شوێنێکی دنیا بە خۆشی بەسەر ئەبرێ، ئاهەنگگێڕان‌و پشووە، پیاچوونەوەیە بە کارەکانی ئەو ساڵەدا.. کەچی ئێمە لەناو زریانی بەفرو لە ناو سەرماو تۆفی زستاندا بەو سەرشاخانەوە ڕێچکەمان بەستووەو ڕێگای سەخت‌و تووش ئەبڕین.

ڕۆژی ١٩٨٨/١/٢ دیسانەوە کەوتینەوە ڕێ، ئەمجارەیان هەوا خۆش بوو، گەیشتینە میری سوورو لەوێ ماینەوە. شەوی٤ـ١٩٨٨/١/٥ بەتەمابووین بڕۆین، پاسدارەکان لە بری ٤٥ کەس بوو بوونە ١٤٥ کەس، ئێمە قبوڵمان نەکرد تاسەد کەسیان گەڕانەوە. لە ناو ئەو ٤٥ کەسەدا پیاوێکی پیری تێدا بوو پێم‌ووت: تۆ پیری ناتوانی بەسەر ئەو هەموو هەورازو نشێوەدا بڕۆی.ووتی: بە گەنجێتی خۆتا مەنازە لە ڕێگا یەکتری ئەبینینەوە. ئەم کابرایە خەڵکی خوراسان بوو، لەو کوردانە بوووەختی خۆی سەفەوییەکان لە کوردستان دووریان خستبوونەوەو دەربەدەریان کردبوون. ئەیووت: ئەچم بۆ سەر گۆڕی مەلا ئەحمەدی خوراسانی کە لە قەرەداخە، هەر چەندە شارەزای کون‌و قوژبنی قەرەداخم ناوێکی لەم بابەتەم نەبیستبوو.

لەو کاتەوەی لەگەڵ ئێرانییەکان پەیوەندی دۆستانەمان بەستبوو، شارەزای خوورەوشت‌و هەڵسوکەوتیان بووبووین لە سەفەرو ڕێگاوباندا، ئەوان‌وا خۆیان نیشان ئەدا کە هەر چەندەوەکو پاسدار چەکدارن‌و شەڕ ئەکەن لەگەڵ ئەوەشدا ئەرکە ئاینییەکانی سەرشانیان ئەنجام ئەدەن‌و بە موو لێی لا نادەن. گەرچی ئەمە لە ڕووی کردەییەوە ڕاست نییەو گیروگرفت درووست ئەکات‌و کارە سەرەکییەکان دوا ئەخات. بۆیە هەر کە ئەکەوتینە ڕێیان لە هەر جێگایەك لامان ئەداووریامان ئەکردنەوە کە بەپێی تەعلیماتی ئێمە هەڵسوکەوت بکەن، حساب بۆ ڕێوڕەسمی کاری عەسکەرییانە بکەن‌و پاشان ئەرکەکانی عیبادەت ئەنجام بدەن. بەلای ئەوانەوە ئەمە دژایەتی کردنی ئایین بوو، ئەوان هەر کە ئەگەیشتنە هەر شوێنێکی مەترسی‌و نزیکی دوژمن دەستیان ئەکردە نوێژو خۆیان خەریك ئەکردو بەمەش کێشەیان ئەخوڵقاند.بە حاڵێکی خراپ لە میری سوورەوە گەیشتینە چەمی ڕیشێن. زۆر هەوڵیاندا نوێژ

بکەن ڕێگەم پێنەدان، لەوێ جوولاین، سێ کاتژمێر ڕێمان کرد لە دواوە بانگیان کرد: پیاوە پیرەکە پەکی کەوتووە، گەڕامەوە دواوە پێم ووت: ئەوە چییە پەکت کەوتووە..؟ ووتی: پەکم نەکەوتووە ئاسمان لەبەرچاوم ئەسووڕێتەوە. پێم ووت: ئاسمان ناسووڕێتەوە، تۆ توانات نییە مەگەر نەمووت مەیە،ووتی: من بۆ زیارەت ئەچم، ئێوەش بەجێم بهێڵن خۆم ئەچمە شانەدەری و سبەینێ لە جادەوە ئەڕۆم و پێتان ئەگەمەوە. نەمئەزانی لە کوێوە شارەزای ڕێگاوبان بوو بوو کە خۆی بڕوات، بە دەم ڕێگاوە مشت و مڕێکی زۆریان بوو،ووردەووردە نزیکی شانەدەری بووینەوە، لە هێزەکانی دوژمنەوە دوور نەبووین، لەپڕ بانگیان کردم ئەوا یەکێکی تریش پەکی کەوتووە، کە گەڕامەوە لای تەماشا ئەکەم پاسدارێکی لەڕولاوازەو کۆڵێکی گەورەی پییەو پرزەی لێبڕاوە، کۆڵەکەمان لێ سەندو پێمان ووت: ڕاکە با لە هێزەکە دانەبڕێی. بەڵام ئەو هیچ خۆی تێك نەدا، بە گۆچانەکەی دەستم پاڵم پێوە ئەناو زۆرم لێنەکرد بڕوات نەمئەزانی ئەمە لێپرسراوی یەکەمی پاسدارەکانە کە بێجگە لەم ئەوان یەکێکی تریان بەمن ناساند ناوی مەجید بوو. کاتێ بە پاڵ گەیاندمە ناو پاسدارەکان شەش کەسیان پەلاماریان دام منیش یەکسەر دەستم دایە تفەنگ و فیشەکم لێخوڕی. پێشمەرگەکان بەربوونە پاسدارەکان و لێیان دان. ئینجا مەجیدم بانگ کردو پێم ووت: چەند کەسێکتان بگەڕێنەوەو ئەوانی ترتان پێکەوە ئەڕۆین. ئەوووتی: با کۆبوونەوەیەك بکەین و ئاگادارت ئەکەینەوە. دوای کۆبوونەوەکەیان هاتەوەوووتی: هەموومان بە جارێ ئەگەڕێینەوە، چەند تەقەلامانداا ئەو کارە نەکەن تەنیا پەککەوتەکانیان بگەڕێنەوە سوودی نەبوو. لەگەڵ دوو پێشمەرگەی سوسیالیستدا بۆ میری سوور گەڕانەوە. ئەمزانی ئەوانە شکات ئەکەن لای سەرکردایەتی و سزاش ئەدرێم. ئێمەش چووینە شانەدەری و هەندێ حەساینەوە،ویستمان بڕۆین بەڵام ڕێگاکە مینی هەبوو، ناچار بەرەو ئەشکەوتێکی لای کەچەڵی و ماو ڕۆیشتین کەچی نەمان دۆزییەوە، ڕوومان کردە کەلاوە ڕووخاوەکانی ئەو ناوە کە هەندێ کادان و گەوری تێدابوو، چەند کیلۆمەترێ لە سەید سادقەوە دوور بوو، چواردەورمان

هەمووی هێزی دوژمن بوو، لەوێ ماینەوەو بڕیارماندا کەس جووڵە نەکات بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبین.

کاتژمێر ٩ ی بەیانی ژنو پیاوێك هاتنە ناو کەلاوەکانەوە، پیاوەکە لەبەر خۆیەوەووتی: ئەم کادانەی ئێمە دەستکاری کراوە، هاتە بەردەرگای ژوورەکە ئێمەش دەستمان گرتو ڕامان کێشایە ژوورەوە، حەپەساووتی: ئێوە کێن..؟ووتم: پێشمەرگەین،ووتی: ئەگەر بەرم نەدەن ژنەکە گومان ئەکات،ووتم: ئەگەر بەرت بدەین نابێ بۆ ماڵ بڕۆیتەوە،ووتی نارۆمەوە. لەم دەوروبەرەدا خۆم خەریك ئەکەم تا کاتژمێر ٢ ی دوای نیوەڕۆ ئەوسا ئەرۆمەوە. کە لە ئێمە ڕەت بوو برادەرانی ئەولامان هێنایانەوە، نەیانزانیبوو پێشتر لای ئێمە بووە، دیسانەوە بەرمان دایەوە، لەو ناوەدا تا دوای نیوەڕۆ خۆی خەریككرد ئەوسا لێیدا ڕۆیشتەوە. ئێمە لە بارێکی دەروونی زۆر ناخۆشدا بووین تاکو ئێوارە. نزیکی خۆرئاوا بە ناو قوڕو لیتەی شارەزووردا بە دوای شێخ توفیقدا کە شارەزامان بوو کەوتینە ڕێ. هەر یەکە کۆڵێکی قورسمان پێبوو، زۆر شەکەتو ماندوو بووین، قوڕی شارەزوور مچو قەلپەو مرۆڤ هیلاك ئەکات. ئەوەندە ڕێمان کرد تا گەیشتینە کانی کەوە، لەوێشەوە لە جادەی زەڕایەن پەڕینەوە بەرەو زەلەڕەشو تا بەیانی ماینەوە. دێکە چۆڵوهۆڵ بوو، هەستمان بەوێرانەی خاكو نەبوونی خەڵك ئەکرد کە چەند کار لە دەروونی پێشمەرگە ئەکات. بەڕاستی پێشمەرگە بێ خەڵك ناژی، چونکە ئەرکو فرمانەکانی لە پێناوی خەڵکیدایەو بۆ ئاییندەی ڕووناکی ئەو خۆی بەخت ئەکات بۆیە دوور لە خەڵکی ژیان تامێکی ئەوتۆی نییە، بە تایبەتی پێشمەرگەو خەڵکی لادێ بوو بوونە جمکانە.

دوای خۆرو بان گەرمبوون ڕوومان کردە کانی هەنجیر کە هێشتا ئاوەدانی تێدا مابوو، زۆریان خزمەت کردین، دوای ماندوو دەرچوون بەرەو دووکان ڕۆیشتین، سەردانی هەندێ ماڵە پێشمەرگەمان کرد.بە ئۆتۆمبیلەکەی کاك مەلا ئەحمەدی کەلاری ڕۆیشتینەوە بۆ گەرمیان. شەو لە ماڵی باوکی کاك حەمەڕەش لە کرپچنە لاماندا و لێیخەوتین. بەیانییەکەی چووینە هەزارکانیو

له ماڵی حاجی حەمەساڵحی خاڵم تا ئێوارەماینەوە ئینجا بەرەو دەرەواری خواروو بۆ ماڵی خۆمان.

ڕۆژی ١٩٨٨/١/٨ لە ماڵەوە دانیشتبووین سێ فڕۆکەی شەڕکەری گەورەی دوژمن هاتنە ئاسمانی ناوچەی سەنگاو لە دوو شوێندا زرمەیان هەستان. هەزارکانیو ژاڵەی ڕەبات لە ناو ڕۆکێتەکانی فڕۆکەکانو تەپوتۆزدا نوقم بوون. ئەمە یەکەمجارە لەم ناوچەیەدا فڕۆکەی گەورە بێتو خۆی خاڵی بکاتەوە. پێشتر هەر کۆپتەر هاتووەو لە دوورەوە تۆپباران کراوە، ئەمە خاڵێکیوەرچەرخانە لە بەکارهێنانی شێوازی تر لە شەڕی کوردستاندا. لە دێی هەزار کانی ٣ هاووڵاتی بریندار بوونو لە دێی ژاڵەی ڕەباتیش ٢ کەس بەناوی جەمالو فرهادو پورە ڕەحمە شەهید بوون . ئێمە بە پەلە گەیشتینە شوێنی ڕووداوەکەو بەشداری ناشتنی شەهیدەکانوتیمارکردنی بریندارەکانمان کردو کەسو کاریانمان بەسەر کردەوە. بەڕاستی خەڵکێکی دڵ قایم بوون، هەڵوێستێکی مەردانەیان ئەنواند سەرەڕای ئەو زیانە گەورەیەی لێیان کەوتبوو، بەوپەڕی ئازایەتییەوە ئەمەیان بە مایەی سەربەرزی لە قەڵەم ئەدا.

هەر لەم ڕۆژانەدا بوو هێزێکی گەورەی تیپەکانی ٥١و ٥٩ بە پێی نەخشەیەکی داڕێژراو شەوی١٢ـ١٩٨٨/١/١٤ پەلاماری ئۆردووگای قەڵخانلوویانداو لە ماوەیەکی کەمدا دەستیان بەسەردا گرت، کوشتارێکی باشیان لە دوژمن کردو زۆرێك لە هێزەکەی ڕایانکردو دەستکەوتێکی زۆرو زەوەند کەوتە دەستی پێشمەرگە.

دوژمن توانای بەرگری کەم بوو بووەوە، هێزەکەی بێوورە، هەر کە بیان زانیبا پێشمەرگە پەلاماریان ئەدا هەوڵیان ئەدا بێ تەقە خۆیان دەرباز بکەن، بۆیە ئەوەندەی خۆیان ئەپاراست ئەوەندە شەڕیان نەئەکرد.دەستوەشاندنی هێزی پێشمەرگە ئەوەندە کاریگەر بوو لایەنێکی سایکۆلۆژی سەلبی لای چەکدارەکانی بەعس درووست کردبوو کەس ئامادە نەبوو خۆی بۆ بەعس بە کوشت بدات. جگە لەوەی چەکداربوون چووەکو سەربازییان جاشێتی بەڵگەی لایەنی مەبدەئیو بیروباوەڕو دڵسۆزی نەبوو، بەڵکو زۆربەیان ڕۆژگارو زەبرو

زەنگی دەسەڵاتی دیکتاتۆریانە ناچاری کردبوون خۆیان بخەنە باوەشی ڕژێم. خۆ هەرچی جاشەکە بوو هەر هەڵپەی خۆ دەوڵەمەندکردن‌و پارە پەیداکردن بوون یان خۆ دزینەوە لەسەربازی‌و نەچوون بۆ بەرەکانی شەڕی عێراق ـ ئێران. بەڵام ڕژێمیش مەبەستەکانی خۆی ئەپێکا هەم کوردی بە کورد بە کوشت ئەدا، هەم خەڵکێکی زۆری لە بیری کوردایەتی‌و دژایەتی ڕژێمی بەعس دوور ئەخستەوە.

پێشتر هەستم بەوە ئەکرد لەسەر ئەو پاسدارانە بانگ بکرێم بۆیە ڕۆژی ١٩٨٨/١/١٧ کاک نەوشیروان برووسکەی بۆ کردم بێدواکەوتن بگەمە سەرکردایەتی. خۆم کۆکردەوە، ڕۆژی دواتر لە ماڵ دەرچووم، دنیا ساردو بەفرو باران بوو، بۆ شەوی دووەم کاتژمێر ١ی شەو گەیشتمە حاجی ئاوای بەری سووورداش‌و بەیانییەکەی چوومە زێوێ. بەهۆی بەفربارینەوە ڕێگە نەبوو بچمە دیوی قزلەر، گەڕامەوە شەو لە یالان قۆز مامەوە. بەیانییەکەی لە دۆڵی نادرەوە چوومە هەنارانی سەروو، شەوی ٢٠ ـ ١٩٨٨/١/٢١ چوومە ماڵی کاک دارای حاجی برایم لە چوخماخ‌و شەوی دواتر چوومە بارەگای کاک غەریب عەسکەری لە هەڵەدن.

ڕۆژی ١٩٨٨/١/٢٢ گەیشتمە بارەگای کاک نەوشیروان لە بەرگەڵو. کە گەیشتمە لای د.مەحمود عوسمان لای بوو. زۆر ترسام بە توندی مامەڵەم لەگەڵ بکات‌و لەسەر کەمو کورِی ئێرانییەکان بە گژما بێتەوە. بەڵام بە هێمنی مامەڵەی لە گەڵدا کردم، دوای سێ کاتژمێر داوای لێکردم باسی مەسەلەکەی بۆ بکەم، شتەکان چۆن ڕوویدابوو بێ پێچ‌و پەنا بۆم گێڕایەوە، ناشزانم کە بەهۆی ئەو مەسەلەیەوە ساردی کەوتوەتە پەیوەندی نێوان ئێران‌و یەکێتی کە ئەوان داوای منیان کردبوو لە سەقز دادگایی بکرێم، سەرکردایەتی ئەوەیان ڕەتکردبووەوە. کاک نەوشیروان بەووردی گوێی بۆ قسەکانم ڕاگرت‌و دوایی‌ووتی: لەگەڵ عێراقداووتوێژمان هەبوو تێکتاندا، پەیوەندیمان لەگەڵ ئێرانییەکاندا بەستووە خەریکن هەڵیئەوەشێننەوە.

بۆ ماوەیەك لەو ناوەدا مامەوە هەرچەندە ئەمەش نەکەوێتە قالبی سزادانەوە بەڵام بە بێ بڕیارو جۆری سزادانەکەش دەستنیشان نەکرابوو.

ڕۆژی ١/٢٨/ ١٩٨٨ هێزێکی مەڵبەندی سێ پەلاماری سەری ڕەشیانداو چالاکییەکی سەرکەوتوانەیان ئەنجامدا زیانێکی زۆر لە دوژمن درا کە ١١٠٠ پارچە چەکی جۆراوجۆریان دەستکەوت. زیانی ئێمەش شەهید بوونی ١١ پێشمەرگە بوو، ئەم چالاکییە دەنگێکی زۆری دایەوەو دوژمنی ڕاچڵەکاند کە لە شوێنێکی سەختدا دەست لەو هێزەی دوژمن بوەشێنرێو زیانێکی ماڵی فراوانی لێبدرێ کە بە ملیۆنەها دینار تەقدیر ئەکرا.

پەیوەندییەکانمان لەگەڵ ئێراندا ئاسایی بۆوە. ڕۆژی ١٩٨٨/١/٣٠ بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئەو پەیوەندییەی نێوان ئێران و شۆڕشدا کۆپتەر لە بەرگەڵوو نیشتەوەو بارێك تەقەمەنیو کەرەستەی تری داگرتو لەمسەریشەوە لەگەڵ خۆیدا بریندارو نەخۆشەکانمانی بۆ ئەودیو گواستەوە، دیارە ئەمە خاڵی مەترسی بوو بۆ سەر حکومەتی عێراقو بە چاوی ڕقەوە ئەیانڕوانییە ئایینەدی ئەو پەیوەندییەو مەترسییەکانی بۆ سەر عێراقو تەشەنەکردنی بۆ زیاتر سەرئێشە درووستکردنو فراوانکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەو دوورخستنەوەی دەسەڵاتی دوژمنو کەمتر کردنەوەی خاڵی زاڵبوونی بەسەر کوردستاندا.

ڕۆژی ١٩٨٨/٢/١٥ کاك نەوشیروان بانگی کردمو ووتی: ئیتر تۆ سەرتیپ نیتو ئەشتوانی بڕۆیتەوە. لە ڕاستیدا ئەم بڕیارەم زۆر پێناخۆش بووەکو کارەبا بمگرێوابوو، هەرچەندە پێشتر چاوەڕوانیئەم سزایەم ئەکرد. ئیتر هیچم پێنەووتراو ئەبێ گوێڕایەڵی بڕیارەکانی سەرەوە بین. خۆم پێچایەوەو کەوتمە ڕێ، ئێوارەکەی گەیشتمە سرد لە نزیکی چەمی ڕێزانو لە جادەی کلاشکەرانەوە پەڕیمەوەوەخت بوو لە ئاوەکەی ئەڵلایی بخنکێم. چوومە ئاڵیبزاوو لەوێوە چوومە مێوڵێو سەرێکی بارەگای تیپمدا، ئینجا سەرێکی هۆمەر ئامانم داو ڕۆژی ١٩٨٨/٢/١٧ گەیشتمە ماڵەوە لە دەرەواری خوارووو.

هەر لەم مانگەدا دوژمن هێزێکی زۆری کۆکردبۆوە. بە پێی ئەو زانیارییانەی گەیشتبوون مەبەستی پەلاماردانی بارەگاکانی سەرکردایەتی هەبوو. سەرکردایەتیش پێشوەخت ئاگاداری ئەو هەڵوێستەی دوژمن بوو، بۆیە ئاگاداری هەموو مەڵبەندەکان کرایەوەو هێزەکان کۆکرانەوەو شوێنە

گرنگەکان قایمکران. هەر چەندە زۆربەی هێزە سەرەکییە شەڕکەرەکان لە دەوروبەری سەرکردایەتی دانرابوون.

ڕۆژی ١٩٨٨/٢/٢١ هێرشی دوژمن بۆ سەر دۆڵی جافەتی بە خەستی دەستی پێکرد. لە هەموو قۆڵەکانەوە پەلاماردان هەبوو. هێزی پێشمەرگە خۆی تەییار کردبوو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە. لێرەشدا نمونەی ئازایەتیو بەرگری بێوێنەیان لە خاکی کوردستانو بوونی میللەتەکەیان ئەنەخشاند.شەڕەکە ئەمەندە چڕو توندو تیژ بوو کە کەس بڕواناکات مەگەر لە بەرەکانی شەڕی بەسرەو خوارووی عێراقدا کرابێ بە جیاوازی ئەو شەڕە لە نێوان دوو دەوڵەتی زلهێزی عەسکەریوخاوەن تەکنۆلۆژیای هاوچەرخ ئەم شەڕەیش لە نێوان دەوڵەتێکی خاوەن دەسەڵاتی بێ پایانی سەربازیو چەکسازی نوێ لەگەڵ هێزی پێشمەرگەی تەنیا چەکدار بە بیروباوەڕی خۆبەختکردن لە پێناوی ئازادیو ڕزگاریدا. شەڕی دوو هێزی نابەرامبەر لە هەموو ڕوویەکەوە، کەچی تەرازووی سەرکەوتنەکان بەلای پێشمەرگەدا دائەشکاند، ئەگەر پەنای نەبردبایە بەر چەکی قەدەغەکراوی نێودەوڵەتی. پێشمەرگە بەوپەڕی خۆڕاگرییەوە درێغی نەئەکردو هەموو حیساباتەکانی دوژمنیان تێکئەشکاند، زیانەکانی ئەوەندە زۆر بوون لە کوژراوو بریندار لە ژمارە نەئەهات. هێزەکانی دوژمن خۆی ئەدا لە دەیان لیوای سەربازی بە تانكو زرێپۆشو تۆپخانەو ئالیاتی زۆرو کۆپتەرو فڕۆکەی جەنگیو سەدان فەوجی جاشی سووك بە سەرپەرشتی لیوا ڕوکن سوڵتان هاشم.

هەر لە کاتی ئەم شەڕانەدا خودی سەدام ڕۆژی ١٩٨٨/٢/١٢ سەردانی سلێمانی کردو لە نزیکەوە چاودێری شەڕەکەی ئەکرد.

دوژمن بە هەموو جۆرە چەکێکی سوكو قورس سەنگەرەکانی ئەکولاند، کۆپتەرو فڕۆکە بێووچان بارانی ئاسنو ئاگری دائەکردە خوارەوە، هەر کە ئەشکاوەکو کارێکی ئاسایی کیمیایی بەکارئەهێنا، نەك هەر بۆ کوشتنی پێشمەرگە بەڵکو خەڵکیش کە پێشتریش لە زۆر ناوچەو دێهاتدا ئەم دەرمانە خەتەرناکەی لە ڕێگەی فڕۆکەو تۆپبارانەوە فڕێ ئەدا بێ ئەوەی هەست بە

تۆزقاڵێكویژدان بكات. گرنگ‌ویژدان نییە، بەڵكو ئەو بەرنامەی سڕینەوەی ئاسەواری نەتەوەیەكی لەسەر نەخشەی بووندا بە دەستەوە بوو، هەرچی لە توانایدا هەبێ ئەیگرێتە بەر. ئەی كێ هەیە رێگری بكات..؟

هێرشەكان تا ئەهات توند ئەبوون، شەوو ڕۆژ نەبوو تۆزێك پشووی تێدا بدرێ. مەسەلەی بەرگری كردن‌و مانەوە لە سەنگەردا شتێكی ئاسایی نەبوو، دیارە ئاشكرێ ئێمەوەكو هێزێكی كەمینەی شێوە پارتیزان لەگەڵ دوژمندا خۆمان بەراورد بكەین‌و هەر سوور بین لەسەر ئەو ڕووبەڕوو بوونەوەیەی كە لە توانادا نەبوو، كە لە بنەڕەتدا هەڵبژاردنی شێوەی شەڕی سەنگەرو ڕووبەڕوو بوونەوە كارێكی قورس‌و جۆرێك خۆ بەكوشتدانی بێهوودە بوو. كە بە ڕای من هەڵەیەكی سەربازی بوو ئێمە پەیڕەومان كردو گوێمان نەئەدایە ئەوەی ڕۆژێك دێت نەتوانرێت بەرگەی ئەوە بگرین، بەڵكو باشترین ڕێگا بۆوەڕسكردنی دوژمن‌و هەراسان كردنی.. بڵاوە پێكردنی هێزی پێشمەرگەبوو لە قووڵایی دەسەڵاتی دوژمنداو ڕامالینی بوو. كە شەڕەكە لە سنووری خۆی تێپەڕی، سەركردایەتی‌وای بە چاكزانی كە ناوچەكە چۆڵ بكرێ‌و بارەگاكان بەرەو سونێ‌و قاسمە ڕەش‌و زەڵێ بگوازنەوە.

ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٨ مەكتەبی سیاسی لە ڕێگەی ئیزگەی دەنگی گەلی كوردستانەوە بەیانێكی بڵاوكردەوە لە بابەت چۆڵكردنی ناوچەكانی سەركردایەتی لە دۆڵی جافایەتی‌و كشانەوەی هێزەكانمان بۆ دواوەتر.لەم بەیانەدا بەم جۆرە زیانەكانی دوژمن باسكراوە:

- كوژرانی زیاتر لە ٨٠٠٠ لە پیاوەكانی ڕژێم كە ٤٠٠ یان ئەفسەرەو دەیان فەرماندەی فەوج‌و سریەیە.
- بە دیلگرتنی ١٥٠ كەس لە جاش‌و سەرباز.
- بریندارکردنی ١٠٠٠٠ كەس زیاتر لە هێزەكانی ڕژێم.

هەروەها تێكشكاندنی دەیان تانك‌و زرێپۆش و خستنە خوارەوەی دوو كۆپتەرو ددەستكەوتیش سەدان پارچە چەكی سووك‌و ناوەنجی بوو. لای خۆشمانەوە ٧٥ شەهیدو ٤٥٠ بریندار كە زۆریان بە هۆی بۆردومانی كیمیاییەوە بوو.

ئـەم بڕیـارە کاریگـەریّتی خـۆی لەسـەر هێـزی پێشـمەرگەو خـەڵکی کوردستان هەبوو، کـەس بـیری بـۆ ئـەوە نەئەچـوو هـەنگاوی‌وابنێ، جگـە لـەوە زەنگـی تـرس بـوو بـۆ پـەلاماردانو داگیرکردنـەوەی ناوچـەکانی تـریش. بـەڵام پێشمەرگە گیانفیدایانە لـە مەیـدانی خۆبەختکردنـدا هەڵئەسووڕان، بیریـان لـە هیچ شتێك نەئەکردەوە، تـەنیا لـە ڕوو بـە ڕوو بوونـەوەی دوژمـن. ڕۆژی دەیـان هێرشیان تێکئەشکاند، بە سەدانیان لە چەکدارەکانی هێزی داگیر کەر ئەکوشـت، لــە بەرگرییــەکی بێ‌وێنــەدا گیــانی بــەرزی هەنــدێ پێشــمەرگە ئەگەیشــتنە بەهەشتی سەروەری.

سەر لەئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٨/٢/٢٦ لە شەڕێکی سـەختو تووشدا لـە پشت گەرە دێی دۆڵی گـاپیلۆن پ.م بورهـان نـوری ئەکبـەر شـەهید ئـەبێ، یـەکێك لـە هاوڕێکانی تەرمەکەی ئەداتە کۆڵیدا بۆ پشتی شـەڕگەکە، دوایـی دەسـت ئەکاتـە باخەڵیا تاکو شتەکانی‌وەکو یادگار لای خـۆی هـەڵبگرێ. شـەهید هیچـی پێنابێ، جگە لە چەند تاڵەقژێکی دەزگیرانەکەی کە هەموو جارێك لە گەڵ هەڤاڵەکانیدا بە قـووڵی ئەچـووە نـاو باسـی دنیـای خۆشەویسـتییەوەو ئـاواتی ئـەوەبوو دوای ڕزگاربوون لە چنگ داگیرکەر ئەویش بە جیهانی خەونەکانی خۆی شاد بێت.

ئەم هێرشانەی دوژمن بۆ سـەر بارەگاکـانی سەرکردایەتی لە ژێـر نـاوی ئـەنفالی یەکدا کـرا، کـە ئەنفال‌ووشـەیەکی عەرەبییـەو یەکێکە لـە ئایەتـەکانی قورئان‌وواتـای دەسـتکەوت لـە شـەڕدا ئـەدات. بەعسـیش ئەمـەی قۆسـتەوە بـۆ ئـەوەی هـەموو شـتێکی کـورد بـۆ سـوپای داگیرکـەر حـەڵاڵو دەسـتکەوت بێـت، کەئەمەش بریتییە لە جینۆسایدی کورد.

لە گەرمەی ئـەو شـەڕانەی سـەرکردایەتیداو بـۆ کەمکردنـەوەی گوشـاری شــەڕەکە ئێــران هێزێکــی گــەورەی گــرد کــردەوە بــە هاوکــاری هێزەکــانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی‌و کوردستان بۆ پەلاماردانی هەڵەبجەو ناوچـەی شـارەزوور، بەڵام ئێران لە دواساتدا دەستی لەو بەرنامەیە هەڵگرتو پەشیمان بـووەوە، بۆیـە یـەکێتی بـە هاوکاری هێزەکـانی پـارتی‌و سۆسیالیسـتو بزووتنـەوەو هەنـدێك هێزی بەدر ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٤ پەلاماری نـاو شارۆچکەی هەڵەبجەیان داو لـە گـەڵ

یەکەم هەنگاوی پەلاماردانـدا هەموو شوێنەکان لە دوژمن پاککرایەوەوجێگا حەساسەکان کەوتنە دەست پێشمەرگە، هەروەها  پێشڕەوی بۆ ناوچەکانی تری شارەزووریش کرا بە تایبەتی بۆ بیارەو خورماڵو تا نزیك سەید سادق پاکسازی کرا.

ڕژێمی بەعس ئەم شکستەی بە گەورە هاتە پێش چاو لەبەرئەوەی هێزەکانی لە سەرکردایەتی یەکێتیدا خڕ کردبووەوەو جەنجاڵی هێرشەکانی ئەوێ بوو بۆیە نەیئەتوانی هێرشی زەمینی فراوان بۆ سەر ناوچەی شارەزوورو هەڵەبجە ئەنجام بدات. ئەگەر چی چەند دژە هێرشێکی کرد.بەلام سەرکەوتوو نەبوو، کار لە کار ترازابوو. زیانێکی بێ پایانی لێکەوت‌و سوپاکەی تیاچوو. بە هەزاران کوژراوو دیلی هەبوو. جبەخانەیەکی فراوانی تیاچوو، جگە لەوە ناوچەیەکی بەربلاویشی لە بەرەی شەڕدا بەرامبەر بە ئێران لە دەستدا. کە مەترسی بۆ سەر شاری سلێمانی هەبوو، هەروەها هەنگاوێکیش بوو بۆ زیاتر نزیکبوونەوە لە چاڵە نەوتییەکانی کەرکوك.

بۆیەوەکو پیشەی هەمیشەیی بۆ تۆڵەسەندنەوەی هەر شکستێکی لە بەرەکانی شەڕدا کەژاوەی ڕق‌و کینەی عەرەبییانەی خستە ڕێ.

لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦ داو لە کاتژمێر ٣٥ر١١ دا چەپەڵترین تاوانی لە مێژووی ڕەشی فەرمانڕەوایەتیدا ئەنجامدا کە لە چەند چرکەیەکدا لە ڕێگەی دەیان فرۆکەی جەنگییەوە بە بۆمبی ژاراوی کە هەندێ بە سەد تەن کیمیایی ئەیقەبلێنن، گیانی پێنج هەزار مرۆڤی بێ تاوانی لە تابلۆی ژیان هەڵپرووکاند. چەند هەزاری تریشی تووشی ئیفلیجی‌و کوێری‌و گیرۆگەواری کرد، خەلکەکەی بە گشتی دەربەدەرو ئاوارەی سەر سنوورەکان‌و ناو ئێران کرد.

هەر لەگەڵ گرتنی هەڵەبجەو لێدانی کیمیاییدا ئێران ڕۆڵی بالای بینی بۆ ڕیسواکردنی ڕژێمی عێراق بە ناردنی تیمەکانی ڕاگەیاندنی خۆی‌و ڕێگەدان بە گەیشتنی میدیاکانی جیهان لە ڕۆژنامە نووس‌و کەناڵەکانی تەلەفزیۆن بۆ شوێنی کارەساتەکە کەوێنەی تەلەفزیۆنی‌و فۆتۆگرافیان گرت‌و هەواڵەکەیان بە زیندوویی گواستەوەو بلاو کردەوە کەویژدانی مرۆڤایەتی‌و ڕای گشتی جیهانی هەژاند.

بەم جۆرە هەڵەبجە بە هۆی ئەم کارەساتە دڵتەزێنەو لە ڕێگەی بەکارهێنانی چەکی قەدەغەکراوی کیمیاییەوە چووە ناو مێژووەوە. کارەساتەکە زۆر گەورە بوو، مەگەر کارەساتیوا لە هیرۆشیماو ناکازاکی دا ڕوویدابێت. ئەکرێ ناوی کارەساتی تراژیدی سەردەمی لێبنرێ، بە جۆرێك زۆر ناوەندی جیهانی پێشنیاری ئەوەیان کرد ڕۆژی ٣/١٦ ی بۆردومانی کیمیایی هەڵەبجە بکرێتە ڕۆژی جیهانی بۆ قەدەغەکردنی چەکی کیمیاییو سەدامیشوەکو تاوانباری جەنگ بدرێتە دادگای نێودەوڵەتی. هەڵەبجە برینێکی قوڵی کردە گیانی گەلەکەمان کە تا هەتا هەتایە شوێنەوارەکەی ساڕێژ نابێتەوە. ئەم کارەساتە بە جۆرێك بوو بووەویردی سەر زمانان کەس نەبوو خۆی لە بەردەم گەورەیی ئەم ڕووداوە دڵتەزێنەدا ڕابگرێ، هەر کەسێكوێنەی خەڵکە پێکراوەکەی ئەبینی بە خوڕ فرمێسك لە چاوانی ئەباریو هەستی بە قووڵی ئازارەکان ئەکرد کە گەلێك ئاوا لە توونی مەرگێکی ناوادەدا ئەتوێنرێتەوە. لە ڕاستیدا ئەم دەنگدانەوەیەی کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە لە لایەکەوە بووە هۆی نابووتکردنی ڕژێمی مرۆڤکوژی بەعسو لە لایەکی تریشەوە بووە مایەی ناساندنی مەسەلەی کورد بە هەموو جیهان.

ڕۆژنامە نەما، حیزبو ڕێکخراوی دیموکراتخوازو مرۆڤدۆست نەما، پیاوی گەورەو پەرلەمانتاریست نەما دەروونی نەجۆشی، هەناوی هەڵنەقرچیو لە ناخەوە تەعبیر لە نارەزاییەکانی خۆی نەکات بەرامبەر درندەیی بەعس. هەتاکو لە ئاستی ڕێکخراوە جیهانییەکانو دەوڵەتانیشدا کۆنفراس لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیاییو مەسەلەی قەلاچۆکردنو جینۆسایدی کورد بەسترا. خافیر پێرێ دیکویلار سکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان بەیاننامەیەکی ڕەسمی بلاوکردەوە تیایدا ڕژێمی عێراقی لە بۆمبارانکردنی کیمیایی هەڵەبجەدا تاوانبارکرد.لێرەدا جیهان بوو بووە دوو بەشەوە: ڕۆژئاوا بۆ هەر مەبەستێك بێ داکۆکییان لە دژی جینۆساید کرد، ڕۆژهەلاتیش بە کامپی کۆمۆنیستیشەوە کپو بێدەنگ لە ئاست گەورەترین تراژیدیای سەدەی بیستەم. بۆ..؟

پرسیارێکه لـه دەوڵـەتو ڕێکخـراوو حیزبـه دەسـەڵاتدارەکانی جیهـانی سۆسیالیستیو عەرەبی و ئیسلامی ئەکرێ. ڕژێمه عەرەبییەکان خۆیان پاڵپشتی ڕژێمی سەدام بوون گوایه بۆ پاراستنی سنوری ڕۆژهەڵاتی عەرەبی بەرامبەر بـه مەترسی ئیسلامی شیعی ئێران، ڕژێمه سۆسیالیستەکانیش بـه یـەکێتی سۆڤیێتی جارانیشەوه خۆیان دەستیان له کۆمەكو هاوکاری عێراقدا بـوو، ئـیتر چـۆن بـه دەنگ دێنو دژی ڕادەوەسـتن بـه قوربـانی ئـەو کارەسـاته تۆقێنـەرەش بێـت، کـه کوردسـتان کرایـه ئەزمونگـەی تاقیکردنـەوەی چـەکی کیمیـایی. بەعسـیش لـەم کارەیدا بیری له ئاییندە نەکردەوە که لـه ئاسـتی جیهانیـدا چـۆن دژی ئەوەسـتن بــه تایبــەتی ئەودەوڵــەتو لایەنانــەی کــه خۆیــان یارمــەتیان داوەو ئــەزانن ئەنجامەکـەی بـه خـراپ بـۆ خۆیـان ئەگەڕێتـەوەو مەترسـی لەسـەریان زۆرتـر ئەبێتوگرنگیشـی لەوەدایـەووڵاتێکیوەکو عێـراق ببێتـه خـاوەنی ئـەم جـۆرە چەکه که ئەبێته مایەی هەڕەشەیەکی توند بۆ پێگەکانی دەسەڵاتی ڕۆژئـاوا لـه ناوچەکەدا به تایبەتی ئیسرائیل که ئەمەش به ئاسانی قبـووڵ نـاکرێ.وەنـەبێ ئەمه یەکەم بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بـێ دژی گـەلی کـورد بـەلکو پێشـتریش لـه ساڵی ١٩٨٧ زنجیرە هێرشـێکی تـری کیمیـایی لـه لایـەن ڕژێمـی بەعسەوە بـه بڕیاری سەدام حسێن بەرامبەر به خەڵکی بێتاوانی کوردستان ئەنجامدراوەوەك:

- بۆردومانکردنی دێهاتەکانی دۆڵی جافەتی.
- بۆردومانکردنی دێهاتەکانی دۆڵی بالیسان.
- بۆردومانکردنی دێهاتەکانی دۆڵە ڕەقه.
- بۆردومانکردنی دێهاتەکانی باڵەکایەتی.
- بۆردومانکردنی دێهاتەکانی ناوچەی بادینان.

بەڵام ڕژێمێکـی دیکتـاتۆریو شـۆڤێنی عـەرەبیوەکو بـەعس هـیچ جـۆرە ڕاو بۆچونێك له هـیچ ئاسـتێکدا کـاری تێناکـاتووازی پێنـاهێنی، هـەر بۆیەشـە لەسەر نەخشە دزێوە مرۆڤ کوژییەکەی بەردەوام بوو، ئـەو پێگـەی سـەرکەوتنی له شەڕەکانی سەرکردایەتیدا هەڵیدابوو، ئەیویست بەو سەرمەستییەوە درێـژەی پێبـداو لەسەرکێشـییەکی سـەربازیدا تۆڵـەی لـه دەسـتدانی هەڵەبجەوشـارەزوور

بکاتەوە هەر نەبێ پشتێنەیەکی بەرگری لە ناوچەی قەرەداخدا درووست بکات تاکو خواروو تری لە دەست نەچێ گەر ئێران نیازێکیوای لە خەیاڵدا بێت. ڕژێم لەو هێرشە ئاسمانییەیدا بۆ سەر هەڵەبجە سەر لە بەیانییەکەی بە بۆمبی ناپاڵمو ئێوارەکەشی گازە جۆراوجۆرەکانی خەردەل، فۆسجین، سیانیدی بە کار هێنا. ئەو گازانەیوەکو باس ئەکرێ دەوڵەتی ئەڵمانیا دەستی لە درووستکردنیدا هەیەو بە ڕژێمی عێراقی فرۆشتووە کە لە یاسای نێودەوڵەتیدا قەدەغە کراون.

لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٩ سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکانی ڕژێمی عێراقیش لای خۆیەوە بەیانێکی بلاوکردەوە لە سەر داگیرکردنی بارەگاکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە دۆڵی جافەتیدا.

بۆیە لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/٢٣ لە ژێر ناوی ئەنفالی دوو دا پەلاماری سنوورەکانی مەڵبەندی یەکی دا لە قەرەداخدا لە چەند قۆڵێکەوە بە هێزێکی زۆرو جۆرەها چەکی قورس. هەر چەند هێزی پێشمەرگە بە ژمارە کەم بوونو زۆربەی زۆریان لە شەڕەکانی سەرکردایەتیو هەڵەبجەدا بوون، بۆیە ئەو پەلامارە بەو قەبارە قەبەیە بە ئاسانی بەربەست نەئەکرا. ئەگەرچی هەندێ هێزی لایەنەکانیش لەو ناوچەیەدا بوون بەلام لەئاستی بەرگری ئیجابیدا نەبوون. هێزەکانی دوژمن کوللە ئاسا هێرشیان ئەهێنا، تەڕوووشکیان ئەسووتاند، خەڵکی بێدیفاعی دێهاتەکانیان ئەتاراندو بە دەستی ڕووتی تەنیا هەر فریای خۆ دەرباز بوونیان بوو. دێهاتەکانیان ئەسوتێنراو شمەکەکانیان بە تالان ئەبردن. نەك هەر ئەمە بەڵکو ئێوارەی ٢٣ـ١٩٨٨/٣/٢٤ لە کاتی نان خواردندا خەلاتێکی تری عەفلەقیانە هەواڵەی دێی سێوسێنانی خنجیلانە کرا کە تازە تارای بوکێنی بەهاری پۆشیبووو لە پەنا کەژی کەلۆەشو قەلاقایمەزدا بە دیدە نەرمە نمناکەکانییەوە ئەیڕوانیە لوتکە سەرکەشەکەی زەردەی سەربەرز. لە پڕ خەڵکەکەی ڕاچەڵەکینو نوقمی دەریای دووکەڵی ژاراوی سۆسیالیستیانەی بەعسی داگیرکەر بوون.وا دیسانەوە کیمیاییەو دەیان لاشەی بەستەزمان خپ لە باوەشی مەرگی ناکامدا ئەنوون، دەیان بریندارى شەلو

سەقەت لاڵو پاڵ ئەکەون، ئەوەتا دوێنێ نزیك لە هەڵەبجەی خومخانەی کیمیاییدا هەزارەها بوونە قوربانی ئەم چەکە بە کۆمەڵکوژەو دواتریش سێوسێنانو دووکانو دۆڵی قەرەداخیش ئەبنە هاودەردی ئەوان. تۆ بڵێی کورد قڕان بێت..؟

شەڕ بە خەستی لە دیوی شارەزوور بۆ سەر شاخی سوڵەو خەنجەرە دەستیپێکرد. پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك)و سۆسیالیست بەرگری باشیانکرد، بەلام بزووتنەوەی ئیسلامی بارەگایەکیان لەو ناوە بوو چۆڵیانکردو تەقاندیانەوەو بەرەو گەرمیان ڕایانکرد بێئەوەی یەك تەقە بکەنو لە گەرمیانیشەوە بەرەو سەرەوە ڕۆیشتن. لە بورجەکەوە بەسەر شاخدا پەلاماردرا، لە جادەی سەرەکی قەرەداخیشەوە هێزی دوژمن ئەهات، لەبەری بازیانیشەوە سوپای تەتەرستان ئەکشان. لە قوڵی دەربەندیخان دیوی دەرەدۆین بەرەو شاخی زەردە پەلاماردرا. شەڕ بە گەرمی کەوتە دەشتیوارماوا. برادەرانی حشع چالاکانە لێیان هاتنە دەست. لە سەر شاخی زەردەش شەڕی دەستەو یەخە بە خەستی دەستیپێکرد. لە یەکەم پەلاماردا ل ووتیان شکا، چوار پێشمەرگەی تیپی ٥٣ ی شێروانە شەهید بوون. هێزی پێشمەرگە لە چاو هی دوژمندا سەد قات کەمتر بوو، بەڵکو ئەوەی کۆبوو بووە هێزی ئەملاو ئەولابوو.

ڕۆژی ١٩٨٨/٣/٢٤ برووسکەیەکم بۆ کاك عومەر فەتاح کرد ئەگەرچی تەجمیدیشم ئامادەم بۆ هەر شوێنێکم بنێرێ. کاك عومەر داوای کرد بچمە شەڕەکەی لای زەردە، لەگەڵ دەستەکەمدا کە شەش کەس بوون چوومە ئەوێو لەگەڵ برادەراندا مامەوە. لە ڕێگەی بەرکەل بۆسەیەکمان دانا نەبا دوژمن دزەبکاتو بگاتە بارەگای دواوەمان لە چرچەقەلا. هەر بەو جۆرە بوو جاشەکان هێرشێکیان کردو لەگەڵ مام ساڵحو عەلی شەهید محەممەدو شاهۆ دا لێماندانو بەسەر شۆڕی گەڕانەوە. لەسەر شاخی زەردە شەڕ زۆر توند بوو، سەنگەری باش لێدرابوو، هێزێکی تیپی ٥١ی گەرمیان گەیشتنە ئەوێو بەوپەڕی گیانبازییەوە بەرگرییان کرد، هەرچی هێرش بوو تێکئەشکێنرا، دوژمن کوژراوی زۆری ئەداوکەلاکیان لێبەجێئەماو لە هێرشی دواتردا ئەیان بردنەوە.

هەروەها کۆمەڵێك لە عەرەبە ئیسلامییەکان ( ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە عێراق) هاتن بۆ یارمەتیمان‌و یەکێکیان لێ شەهید بوو.

ڕۆژی ١٩٨٨/٣/٣٠ کاك عومەر فەتاح برووسکەیەکی کرد لەگەڵ م.عەلیدا شەستوولاخ پەیدا بکەین بۆ گواستنەوەی کەلوپەلەکانی مەڵبەند.ئێمەش دابەزین بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کارە، هەرچی خەڵکی دێهاتەکان بوو چۆڵیان کردبوو، لە ترسی بۆردوومانی فڕۆکەوکۆپتەرو تۆپباران وولاخ دەست نەئەکەوت لە بانیمۆردوەڵامی برووسکەکەمان دایەوە کە هیچ پەیدا نابێ. مەڵبەند لەبەر ئاڵۆزی دۆخەکە بڕیاری چۆڵکردنی بارەگاکانیان دابوو.

عەسری ڕۆژی ١٩٨٨/٣/٣١ هەموو پێشمەرگەی دیوی قەرەداخ هەموو لایەنەکان ئاوای دیوی گەرمیان بوون. لەو کاتانەی کە پێشمەرگە گەیشتبوونە بناری دێی داربەڕوو دوو فڕۆکەی جەنگی هاتنە ئاسمانی دێی بانی مۆرد کە هەم بارەگای تیپی ٥١ی لێبووو، هەم بارەگایەکی بچووکی جەماعەتەکەی عەبدولکەریم قاسم } حرکە الدیمقراگیین العراقیین{ یشی لێبوو. یەك دوو جار سووڕانەوە، ئینجا خۆیان شۆڕ کردەوەو دوو چەپکە گوڵی دەشتی بەهاری بەعسیانەیان فڕێدایە گوڵدانی دڵی دێکەوە کە ئەو چەپکە گوڵانەش بریتی بوون لە بۆمبی چارەکە تەنی‌و هێشوویی لە هەمان کاتدا دێهاتەکانی داربەڕوو، قەڵاگە، ژاڵەو ڕەباتیش کەوتنە بەر ئەم پەلامارە ئاسمانییەو بە هەموویان ٨ - ١٢ بۆمبیان بەرکەوت. بەڵام خۆشبەختانە زیانیان پێوە نەبوو. لەو کاتەشدا هێزێکی جاش لە ڕێگەی سەنگاوەوە بێوەستان بە ئۆتۆمبیل یەکسەری ویستیان خۆیان بگەیەننە دێی کێلەبەرزە، بەڵام ئێمە پێشتر کاك کەریم چاوڕەش‌و مەفرەزەیەکمان ناردبووە سەر ڕێگەی قەڵاگە - کێلەبەرزە - هەزار کانی بۆ بەرگریکردن تاکو هێزەکەی مەڵبەند ئەگەن. برادەران لە نزیکەوە لێیان هاتنە دەست‌و زۆر بە پەلەپڕۆزێ فریای خۆ دەربازبوون کەوتن تاکو سەنگاو نەوەستانەوەو لە شەڕێکی ئەو قۆڵەدا کادری ناوچەکە حاکم قادر حەمە ساڵح شەهید بوو .

من‌و م.عەلی‌و حەمەی مالیە لە پشتی دێی قەڵاگەوە لە چاوەڕوانی هێزەکەی مەڵبەندا بووین، یەکەم کەسێك لەو هێزە کە گەیشتە لامان کاك

ئازادی سەگرمە بوو کە زۆر ناڕازی بوو لە هاتنی هێزەکەیان بۆ سنووری گەرمیانو پێی باشتر بوو کە لە سنووری تیپی سەگرمەوە بەرەو چەمی ڕێزان بپەڕنەوە. تا ڕادەیەکیش لەسەر هەق بوو، چونکە مەودای شەڕەکە بەرەو ئەوە ئەچوو کە ئەبێ هەموو شوێنێك لە هێزەکان چۆڵ بکرێت. لە کاتێکدا دێهاتەکانی دیوی بازیانو قەرەداخو گەرمیانیش چۆڵ بووبوو. ئینجا کاك عومەرو برادەرانی تریش گەیشتنو هێزەکەمان بۆ شەو گەیاندە دەرەواری خوارووو تیلەکۆ. هەمووومان هەر چاوەڕوانی ئەو هێزە گەورەیەی تیپەکانی مەڵبەندی یەك بووین کە لە دوای تەواوبوونی شەڕەکانی سەرکردایەتی بە بناری قەندیلو بە سنووری مەڵبەندی سێدا کەوتبوونە ڕێ بەرەو گەرمیانو شەوو ڕۆژ بێووچان ڕێیان ئەکرد. هەروەها دوژمنیش لە هەموو قۆڵێکی گەرمیانەوە هێزی زۆری بە پاڵپشتی تانكو تۆپی دوورهاوێژ گرد کردبووەو خۆی سازئەدا بۆ هێرشکردن. هەر ئەو ئێوارەیەی هێزەکانی مەڵبەند گەیشتنە دیوی گەرمیان پێشمەرگەکانی شاخی زەردە شکانو کشانەوە ناو دێی زەردەلیکاو.

ڕۆژی ١٩٨٨/٤/١ ئەنفالی دووی سنوری قەرەداخ ـ شارەزوور کۆتایی هاتو ڕۆژی دواتر ڕژێمی بەعس بەلاغی سەربازی تایبەتی بە داگیرکردنی ناوچەی ئەنفالی دوو دەرکرد.

ڕۆژی ١٩٨٨/٤/٢ لەگەڵ کاك عومەر فەتاح دا چووینە لای برادەرانی پارتی لە دێی مەسۆیی مامران بۆ بەشداریکردنی هێزەکانیان لەبەرەکانی شەڕدا. لەوێ قادر قادرو ئازاد قەرەداغیوهەندێ کادیری پارتیمان بینی .. لەبارەی بەرگری کردنو بەشداری کردنی هێزەکانمان ڕێککەوتین بەڵام لەدوای ڕۆیشتنیان ئەو مەسەلەیەیان فەرامۆش کردو ناوچەکەشیان بەجێهێشت بێ ئەوەی بەرگری بکەن ، تەنانەت ئێمەشیان ئاگادار نەکردەوە .. بۆمێژوو ئەڵێم قادر قادر لێرەداوورەی تێدابوو، هەڵوێستێکی هەبوو ، کەچی ئەوانی تریان

ڕەنگی مردوویان لێ نیشتبوو ، بڕوایان بە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ دووژمنـدا نەبوو .

ڕۆژی ١٩٨٨/٤/٣ هەموو هێزەکانی سەرەوە گەیشتنەوە، سەرەتا تیپی ٥٣و ئینجا تیپی ٥١و دواتریش برادەرانی مەڵبەندو تیپەکانی تر.

لەگەڵ کاك ئازادی سەگرمەدا چووینە لای کاك عومەرو پێمانووت ئەچینە سەردانی هەڤالان قادری حاجی عەلیو شێخ جەعفەرو ئاوات قارەمانی. ڕازی بوو. لە دەرەوارەوە بەرەو کویلك ڕۆیشتین، شەو لەوێ ماینەوە، ڕۆژی دواتر چووینە زستانە،وەزعەکە شڕ بوو، خەڵکەکە لە دڵەڕاوکەدا بوون. ماڵیان ئەشاردەوە. دێیان بەجێ ئەهێشت، لەوێوە چووینە تەپەعارەب. لە ڕێگا تووشی ژنێکی ناسیاو بووموتی: مەحمود یەژی ڕائەکەن.. بۆ کوێ جێماندێڵن..؟

قسەکانی کسپەی لە جەرگەوە ئەهێنا بە دڵێکی پڕ لە زوخاوەوە پێمووت: مەگەر بە مردوویی جێتان بهێڵین. بە چاوێکی خەمناکەوە بەجێی هێشتین دوای ئەوەی هەناسەیەکی قووڵی خەفەتاوی هەڵکێشا.

چەندە ناخۆشە ئەو هەموو ساڵە لە ناو دڵی خەڵکیدا بژیتو لە ناخیانـدا هێلانەی حەوانەوەت بۆ ساز بکەن ئێستا بێویستی خۆت لێت جیابنەوەو نەزانیت چارەنووس بەرەو کوێیان ئەبات. هەر چۆنێ بێ پێشمەرگە قەیناکە کە کۆڵی مەرگی بە کۆڵەوەیە، ئەی ئەوان چییان لێ دێ..؟

خەڵکی تەپەعارەب هێشتا بە تەواوی نەکەوتبوونە خۆیان کە ئێمەیان بینی پێشوازیان لێکردینو ڕێزیان گرتین. شەوەکەی لەوێ ماینەوە. لەولاشەوە کاك قادرو برادەرانی تر ڕەتبوو بوونو گەیشتبوونە دەرەوار. ئێمەش گەڕاینەوەو لە دەرەوار کاك قادرو برادەرانم بینیو لایان مامەوە. بە هاتنەوەی برادەرانو ئەو هێزانەمان هەندێوەزعەکە باشتر بوو. بڕیاری بەرگری دراو ڕێگە لە خەڵکیش گیرا دابەزنە خوارەوە بەرەو دەسەڵاتی دوژمن.. هەرچەندە نەئەتوانرا مسۆگەری تەواوی پاراستنیان بدرێتێ دوای

چۆلکردنی دێهاتەکانی شارەزوورو قەرەداغو بازیانو شاخی زەردەو هاتنە پێشەوەی دوژمن لە چەندین دەروازەی ترەوە کە ئەمەیان بۆ بەشبەش کردنی پێشمەرگەو پەرتەوازە کردنی هێزەکانمان بوو.

خەلکی نەیانئەزانی چی بکەن، بەشێك بەرەو خوار ئەڕۆیشتنو پێشمەرگە ئەیگەڕاندنەوە، بەشێکیش لەو شیوو دۆلانەدا خۆیان حەشاردابوو پێیان خۆش نەبوو بە ئاسانی دەست لە خاكو زێدیان هەلبگرن.

ڕۆژی ١٩٨٨/٤/٨ دوژمن بە هێزێکی زۆرو زەوەندەوە لە چەندین دەروازەوە پەلاماری گەرمیانی دا بەم شێوەیە:

١. چوارملان
٢. بەرکەل
٣. سەرقەلا ـ هۆمەرمل
٤. سەرقەلا ـ ناوچەی رۆغزایی
٥. کەلار ـ تیلەکۆ
٦. باوەنوور ـ ناوچەی شاتری
٧. دووز ـ داودە
٨. دووز ـ بناری گل
٩. نەوجول ـ داودە
١٠. قادر کەرەم ـ قەیتول
١١. سەنگاو ـ هەنارە
١٢. سەنگاو ـ کچان
١٣. سەنگاو ـ قەیتول
١٤. قادر کەرەم ـ ناوچەی زەنگنە
١٥. چەمچەمالّ ـ جەباری
١٦. چەمچەمالّ ـ قەرە حەسەن
١٧. کەرکوک ـ جەباری
١٨. زەمبوور ـ جەباری.

ئەمەش سەرەتای دەستپێکردنی ئەنفالی گەرمیان بوو( ئەنفالی سێ ).
لەم شەڕانەدا دوژمن کۆپتەرو تانكو تۆپی دوورهاوێژی بەکارئەهێنا. هێزی پیادەی سوپاو جاشە خۆفرۆشەکانیش هەنگاو بەهەنگاو ئەهاتنە پێشەوە. لە بەرامبەردا پێشمەرگەو پشتگیری ڕووبەڕوویان ئەبوونەوە، کوشتاری زۆریان لێکردن، ژمارەیەك پێشمەرگەو پشتگیری بە خوێنی سووری گەشیان ئەو ڕۆژگارە ڕەشو دووکەڵاویەی کوردستانیان ڕەنگین کرد.
ڕۆژگارێکی خەماوی بوو، خەڵکی دێهاتەکان نەیانئەزانی چی بکەن لە بەرامبەر پەلاماری سوپای داگیرکەردا. ئەگەر ئەڕۆنو دەستبەرداری شۆڕشو پێشمەرگەو سامانو خاکیان ئەبن دڵیان بەرایی نادا، ئەگەر ئەمێننەوە ئەکەونە بەر کەڵپەی دڕندانەی بەعسو هەموویان چارەنوسیان مەرگو تەفروتووناکردن ئەبێت.
بڕیاردان لەسەر هەر حاڵەتێك کارێکی قورس بوو. هیچ شتێك لە شوێنی خۆیدا نەمابوو. خاك ئەسووتا، ئاگر لە گژوگیا بەربوو بوو. دنیا سەراپا دووکەڵو بارووتو گەردەلوول بوو، گرمەی هەوری بەهارو زرمەی تۆپخانەی ئاگراوی بەعس تێکەڵ بەیەك بوو بوون. تەنانە پەلەوەریش لە لانەو مانەی خۆیان تەرەبوو بوون لەگەڵیاندا گیانی هەموو مرۆڤێکیویژداندار ئەگریاو لە حەیبەتا ئەتوانەوە. بەهاری ئەمساڵ جیا لە هەموو بەهارەکانی تر تراژیدیای زەمەنێکی ئازاراوی ئەگێڕایەوە. ئەوە بەعسەو ئەیەوێ کورد قڕ بکات، مرۆڤ ناتوانێ تەعبیر لەو کارەساتە بکاتو هەرچی لە دەروونیدایە قوڵپی بداتەوەو دنیاش لە عاستی ئەم تاوانە کپوکڕ. خوا نەکات سۆزەی هەڵوێستێك دڵی بهەژێنێ ئەو ڕێگەگرتنە لە خەڵکی زیانێکی زۆری لێداینو بووە هۆی ئەوەی بە ئاسانی بکەونە داوی سوپای داگیرکەرەوەو ڕاپێچی چاڵی نەمانیان بکەن. هەرچەندە بەعس بێ ئەوەش هەر ئەو چاڵەی بۆ هەڵکەندبوون.
دوژمن لە هەندێ قوڵەوە تەنیا شەڕی مشاغەلەی ئەکرد.لە هەندێ لای تر هێزەکانمان شەڕی مانو نەمانیان ئەکردوەکو ناوچەی داودەو بناری گڵو چوارملانو قوڵی باوەنوور. پارسەنگی سەرکەوتن بەلای ئێمەوە لاواز بوو. هەتا

ئەهات ڕووبەری بەرگریو شەڕکردن تەسکتر ئەبووەوە. پێگەی مانەوە لە ناو سەنگەردا بێهێز ئەبوو، لە لایەکی ترەوە تەقەمەنیوەکو پێویست لەبەردەستدا نەبوو، نانو خۆراك بە زەحمەت پەیدا ئەبووو شەڕەکان بە دڵگەرمییەکی بێ هاوتاوە تا ١٩٨٨/٤/١٣ درێژەیان کێشا. لەو ماوەیەدا چەندین جار لەگەڵ لایەنەکاندا کۆبوونەوە کرا، جگە لە (ی.ن.ك)و حشع کەسی تر باوەڕی بە بەرگری نەبوو، پێشمەرگەکانمان جگە لەوەی کە لە هەموو شەڕەکانی سەرکردایەتیو دۆڵی جافایەتی بەشداربوونو ماندووبوون، ماوەی ١٣ ڕۆژیش بە ڕێگاوە بوون تاگەیشتنەوە گەرمیانو دیسانەوە کەوتنە شەڕی بێئامانو ئەوەندەی تر شەکەتو شەلوپەت بوون. بۆیە جەوی شەڕەکە بێهودە بوو، ئەبوایە ڕێگەیەکی تر هەڵبژێردرایەو هەموو هێزەکانمان لە شوێنێکدا کۆبکردایەتەوەو کارێکی ترمان پێ ئەنجام بدایە. ئەگەرچی نەشئەتوانرا بە ئاسانی گەرمیان چۆڵ بکرێوئەو ناتۆرەیە بخرێتە ئەستۆی یەکێتی کە بێ شەڕ ناوچەکەی بە جێهێشت کە هەموو ژیانی هەر شەڕو پێکدادانی شۆڕشگێڕانەبوو بەرامبەر دوژمنەکانی لە پێناوی مافە ڕەواکانی کورددا. ئەم شەڕە تووشی خوێنبەربوونی کردین. لەوە زیاتر تواناى بەرپەرچدانەوە نەما.

بۆیە ڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٤ بڕیاری کشانەوەی هەموو هێزەکانمان درا لە بەرەکانی شەڕداو بەرەو بناری شاخ بووینەوە. لە دێهاتەکانی تەپەگەڕوسو دەرەواری سەروووو بانی مۆرد کۆبوینەوە. من ڕاموابوو هێزەکانمان بکرێتە چەند بەشێکەوە، بەشێکی لە گەرمیاندا بمێنێتەوە، ئەوی تری ڕەوانەی مەڵبەندی سێ بکرێ. کاك قادر پێیوابوو کەس نەمێنێتەوە، بەڵام کۆمەڵێك برادەر لەوانە کاك مەلا ئەحمەدی کەلاریو حەمەڕەشو عوسمانی حاجی مەحمود لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگە بڕیاریاندا بمێننەوە. ئەمە هەنگاوێکی مەزن بوو، لەم دەرفەتە تاریکەدا بتوانرێ دڕ بە هەوری بێبڕواییو ڕاڕایی بدرێ، جگە لەمە هەلومەرجێکی نوێ ئەرەخسێنێ بۆ خەباتوەکو سەرەتایەکی تازە کە جیا لە شێوەی پارتیزانی سەرەتای دەسپێکردنەوەی شۆڕشی نوێی

گەلەکەمان کە ئێستا خەڵکی و دێهات نییەو ئەبێ پێگەی تر بۆ بەردەوامی ئەنجامدانی کارەکان بدۆزرێنەوە. لە برادەرانی حشعیش بەشێك مانەوەو ڕۆژانە لەگەڵ برادەرانی خۆیان و ئێمەشدا پەیوەندی هەبوو.

ڕۆژی ۱۹۸۸/٤/۱٤ ڕۆژێکی نائاسایی بوو، کە تەماشای دەمو چاوی هەر یەکێکت ئەکرد تووڕەیی و ناسۆری و ئازاری لێئەباری. هەموو بە خەمباری پێکەوە دانیشتبووین، برادەران ووتیان: لە کوێوە ئەڕۆیت..؟ ئەم پرسیارەم پێناخۆش بوو، هەستم ئەکرد جیائەکرێمەوە، بە قەڵسییەوە ووتم: لە بناری هەمەوەندەوە.

لەگەڵ ۱۳ پێشمەرگەی ئاواتی شێخ جەنابدا لەوەدا بوو بکەوینەرێ، کاك قادر داوای لێکردین ۱۰۰ پێشمەرگە لەگەڵ خۆماندا ببەین. پێم چاك بوو، لە ناو ئەو هێزەدا ژن و منداڵی پێشمەرگەکانی تێدابوو، بەزەییم پیایانا ئەهاتەوە، ڕێگا دوورەو لەوانەیە بڕ نەکەن بە تایبەتی ژنی سکپڕو منداڵی وورد.ڕۆژێکی ڕەش و سەختبوو، باران ئەباری، پێشمەرگە هەموو بێزارن، بریندارەکان هاوار ئەکەن بە جێمان مەهێڵن. لە هەموو ناخۆشتر ئەو دیمەنە تەماوییەی گەرمیانم لەو بنارەوە ئەبینی هەتا چاو بڕ بکات پانتاییەو شوێنێك نەئەبینرا ساف و بێگەردی ڕۆژانی بەهاری خۆشی پێوە دیار بێ، هەمووی چڕە دووکەڵ و گڕودودی هەناسەی پڕ لە ئاهی ساردی دێهاتەکان بوو باوەشیان بە کەشکەشانی ئاسماندا ئەکردو بەرۆکی خوایان ئەگرت. تەنانەت بارانی بە لێزمەش کەف و کوڵی هەناوی هەڵقرچاوی ئەو دێهاتانەی دانەئەمرکاندەوە. ئەوە چەکمە ڕەقە بیابانییە پێ پەتییەکانی دوورگەی نەفامی و سەردەمی شۆڤێنێتییە دەست ئەنێتە بینی کوردو زەردەخەنەی بەهاری دەم کەلی دێهاتەکان ئەزاکێنن کسپەی ماڵوێرانی بەرئەدەنە ناخی هەڵکڕوزاوی کوردستان، چ مرۆڤێك لەبەردەم ئەو دیمەنە مەرگەساتبارەدا ئەتوانێ خۆی ڕابگرێ و کۆستی دڵی نەکەوێ وکەژاوەی خەفەت نەپێچێتەوە بەرەو ئاسۆی نادیاری. ئەوە خەڵکی ئەم وولاتەیە ڕاوئەنرێن یان ڕەوئەکەن..؟ ئەوە پێشمەرگەی ئەم زێدو

نیشتمانەیە بێویستی خۆی ماڵئاوایی بێدەنگی ئەکاتو نازانێ چارەنووسی بەرەو کوێی ئەبات..؟

تۆ بڵێی مەرگی کورد نووسرابێتەوە..؟

تۆ بڵێی خەڵکی لە خاکی باوباپیرانی خۆی بێزاربێو لێیهەڵبێن..؟

تۆ بڵێی پێشمەرگە بەرگەی خەبات نەگرێو مەیدان چۆڵ بکات..؟

یان بەرنامەی کاری سیاسی هەڵەو کەمو کوڕی تێدابێ..؟

یان دوژمن دوا تیری کەوانی پیلانە نگریسەکانی ئەگرێتە گەردنی کوردوووردوخاشی ئەکات..؟

تۆ بڵێی مێژوو خۆی دووبارە بکاتەوەو هەرچەند ساڵێك جارێ تووشی ئیفلیجیمان بکات..؟

لە گەرمیاندا کەس نەما، ئەو خەڵکەی دیوی قەرەداخیش لە گەڵیانا بەرەوخوار بوونەوە. بەشێکی کەمیان بە دزەو لە ڕێگە قاچاخەکانەوە خۆیان ئەکردە ناو ئۆردووگای سمودو کەلارو باوەنوورو کفریو چەمچەماڵوقادرکەرەمو...هتد

بەشە زۆرەکەشیان کە کەوتبوونە دەست هێزەکانی ڕژێم بە تایبەتی جاشە کوردە چاوشۆڕەکان بەرەو توونی نەمان بران. بە لامەوە زۆر ئاساییە ڕژێمی شۆفێنی بەعسی عەرەبی دۆزەخی ئەنفال بۆ کورد دابخات، بەڵام کە بەشێکی هێزە پەلاماردەرەکەی جاشی کوردە.! ئەوە تاوانێکی گەورەیە کە کورد خۆی ببێتە داردەستو ئامرازی دوژمنو گەلەکەی خۆی لە ناو ببات.!

بە دەم ئازارەوە گەیشتمە بانیمۆرد، زیاتر لە ٥٠٠ کەس ڕاوەستابوو، زۆربەی ژنو منداڵ بوون چاوەڕوانی شارەزابوون بۆ دەرباز بوون، کەچی من ٤ - ٥ ڕۆژێك پێش ئەمە منداڵەکانم ڕەوانەی کەلارکرد تاکووەزعەکە ئاسایی ئەبێتەوە خۆیان حەشار بدەن. ئیتر ئاگام لێیان نەما بوو. بیرم کردەوە لە قەرەی ئەم کارە نایەم، بە جیهاز لەگەڵ کاك قادردا قسەم کرد کەوا لە گەرمیاندا ئەمێنمەوەو توانای ئەم کارەم نییە ئەو هەموو خەڵکە ببەم، بەڵام

ئەو داوای کرد ئەبێ لەگەڵیاندا بڕۆم. ئینجا لەگەڵ کاك عادلو سەید محەممەدو برادەراندا یەکمانگرت، هێزو خەڵکەکەمان کردە سێ ڕەتڵەوە:

ڕەتڵی یەکەم : ئێمە بووین، تەنیا پێشمەرگە بۆ تاقیکردنەوەی ڕێگا.

ڕەتڵی دووەم: کاك عادلو بەشێکی تری پێشمەرگەو هەندێ خێزان.

ڕەتڵی سییەم: سەید محەممەدو زۆربەی خێزانەکان.

لەو کاتەدا ئەبو فەلاح(حەسەن قادر ساڵەح)م بینی بە کۆڵی پێشمەرگەیەکەوە کە لە شەڕەکەی هەزارکانی دا کەوتبووە سەر میندا و قاچێکی پەڕیبوو، ئەبوو فەلاح پێیووتم: کاك مەحمود بەجێم نەهێڵی.!

ئەم قسەیەوەکو گوللە ناخی بڕیم، ئەو ئەبوفەلاحەی بەو هەموو قارەمانێتییەوە ئێستا بپاڕێتەوە بەجێی نەهێڵین..؟

دوای ماوەیەك تێڕامان ڕووم تێکردو پێمووت: مەگەر بمرم ئەگینا بەجێت ناهێڵم. پێش ئەوەی بکەوینە ڕێ نوری مەسۆییمان ناردە سەر جادەی سەنگاو بۆ تاقیکردنەوەی ڕێگا، هاتەوەووتی: ڕێگا نییە، هەموو دوژمنی لێیە. کەچی پ.م. شەریف سدیق هەڵیدایە: درۆیە کەسی لێ نییە، هەر ئەمیش ڕاستی کرد.ئێوارە کەوتینە ڕێو چووینە کرێچنە، دنیا تاریکو شەستەباران بوو، بە حاڵێکی خراپ گەیشتینە سەرجادەی سەنگاو - قەرەداخ، لەوێ پەڕینەوە، چوومە پێش هێزەکەو گەڕامەوە دواوە ئەبوفەلاحم نەبینی، زۆر گەڕام سوودی نەبوو، دیسانەوە گەڕامەوە لای هێزەکە هەندێ ژن پەکیان کەوتبوو، یەکێکیان ژنەکەی شەهید نازم بچکۆل بوو کەلە شەڕەکەی تازەشاردا لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی تردا شەهید بوو بوون. خێزانەکەی بەمەی نەئەزانی، ئەم ژنانە پێڵاویان لە پێدا نەمابوو بە پێی پەتی ڕێیان ئەکرد، ناچار هەندێ جار سواریووڵاخمان ئەکردن، تاگەیشتینە دەربەندی مەڕاخانی لای دڵکە کە چەند کیلۆمەترێك لە سەنگاوەوە دوورە.

سەنگاو بووبووە بارەگای جووڵانەوەی هێزەکانی دوژمن بۆ سەر خۆرئاوای گەرمیان، لەوێوە ئەکشان بەرەو قەرەداخو دێهاتەکانی تری بناری سەنگاو، ئاژداخ.

لەو هەموو خەڵکەی لەگەڵماندا بوون کەسێ نەبوو بچێتە سەر شاخو ئاگاداری جموجۆڵی دوژمن بێتو ڕێگای خۆمان بزانینو بە سەلامەتی بڕۆینو ئەو هەموو ژنو منداڵە تووش نەبن. ناچار لەگەڵ مامۆستا جەلالی لێپرسراوی ڕێکخستنی تیپی ٥١ سەرکەوتینە سەرشاخو تا کاتژمێر ٥ ی ئێوارە ماینەوە، چاودێری هەموو لایەکمان ئەکرد، پاشان هاتینە خوارەوە، ژنەکان بەتانییەکیان دڕیبووو کردبوویان بە پیلاو. قرچەی دەروونم ئەهاتوڕەزای مام نامیقم ناردە کەلاوەکانی دییە ڕووخێنراوەکە بۆ یەك دوو جووت پیلاوی کۆنە، هاتەوە هەندێ پاتەی داڕزاوی هێناو دامانە ژنەکان، ئینجا بەرەو قوولە ڕۆیشتینو لەوێ کەوتینە هەوڵی پەیداکردنیووڵاخ بۆ ژنو منداڵەکان، لەو ناوەووڵاخێکم دی زۆر بە دوایا ڕامکرد تا بەهەزار حاڵ گرتم، تومەز هەرچی لە باخەڵمدابوو لێم کەوتبوو، کەوتمە هەوڵی دۆزینەوەی شتەکانمو لە هێزەکە دابڕامو درەنگانێك پێیان گەیشتمەوە. چووینە دێی کانیکەوە یەکپارچە ئاگر بوو، هەموو ئەسووتا، زۆری نەمابوو ڕۆژ بێتەوە. لەوێوە گەڕاینەوە دێی ئەحمەد لەوەند هەر مزگەوتەکەی مابووو چەند کەسێکی تێدا خەوتبوو، لە دەرەوە مەڕو ماڵاتێکی زۆر خڕکرابوو،وامزانی ئەوانە جاشن، پێشمەرگەکانم ئاگادار کردنەوە ئامادەبن بچینە سەریانو نزیك بووینەوە، یەکەم کەسموووریا کردەوە تەماشا ئەکەم پیاوێکی پیری خەڵکی کچانە، هێنامە دەرەوەووتم: حاجی ئەمناسی..؟

ووتی: نەخێر

ووتم: مەحمود سەنگاویم.

حاجی دەستی کردە ملمو بانگی کوڕەکانی کرد: مەترسن ئەوە مەحمود سەنگاوییە، ئەوانیش هەڵسانو نانوچایی بەیانیان داینێ.ووتیان: حاجی محەممەدی خزمیشت لەگەڵماندایە، یەکسەر چووم بۆ لای هەر لە دوورەوە ناسیمەوە، هاتو باوەشی پیاکردمو بانگی لێبەرز بووەوە.

ووتم: بۆچی ئەگریت..؟

ووتی: بۆ ئێوە

وەڵامم دایەوە: ئێمەش خەمی ئێوەمانە، ئێمە پێشمەرگەین خۆمان ئەم ڕێگەیەمان هەڵبژاردووە.

حاجیووتی: خواردنی باشمان لا نییە،وەرن مەڕێك ببەن ئێوە بیخۆن لە دوژمن باشترە لەوانەیە هەمووی ببەن، پاش هەندێ دەمەتەقی یەکتریمان بەجێهێشتو چووینە ئەشکەوتێکی ساردەوە لەسەرماندا هەڵئەلەرزیم. چەند کاتژمێرێك لەوێ ماینەوە. بە برادەرەکانمووت: ئەچمە دەرەوە، تۆزێ دوور ئەکەومەوە بزانم سۆراخێکی برادەرانی دابڕاو ناکەم. هەر لە ئەشکەوتەکە دوور کەوتمەوە، لە قەڵبەزێکدا دۆزیانمەوە.

مامۆستا جەلالووتی: کاك عادلو کاك حەمەڕەش هاتنە سەر خەتو قسەمانکرد، سەری سەعاتیش من پەیوەندیم لەگەڵیاندا کرد، ئەو ڕێگایەی پیا هاتبووین پێمانووتن، لە دڵکەش دوو پێشمەرگەمان بۆ دانابوون، هەروەها ئەو شوێنانەی ئازووقەی لێ بوو بۆمان دیاریکردن، پاشان گەڕاینەوە، هەندێ قازمان گرتو برژاندمان. هێشتا خۆری مابوو چووینە خاڵدان.

شەوی ١٦ــ١٧/٤/١٩٨٨ لەبەر تاریکیو بارانی زۆر نەمانتوانی ڕێگا دەرکەین، تا ڕۆژی دوایی لە خاڵدان ماینەوە، کە کەوتینە ڕێ نزیك دێی کانی سارد کۆمەڵێ خەڵکی سەرلێشێواومان بینی نەیان ئەزانی چی بکەن. هەندێ خەڵکی دێی هەسەن کە نۆشمان بینی لە ترسی ڕژێمی بەعس لە چەمچەماڵەوە هاتبوون، پرسیاریوەزعەکەمان لێکردنووتیان: هەتا بڵێی خراپە، زۆربەی خەڵکی گیراون، لە ناو شاردا خۆپێشاندان بووە بۆ بەردانی خەڵکە گیراوەکە بەشێکی زۆری ئەو خەڵکە دەستگیر کرابوون بە هۆی ئەو خۆپێشاندانەوە ڕزگاریان بووو دوژمن بە کۆیتەر لێیداون.

بەرەو جادەی سلێمانی ـ چەمچەماڵ ڕۆیشتین، لەو کاتەدا هێزێکی زۆر گەورەی دوژمن بەرەو کەرکوك ئەچوو، زۆر چاوەڕێمان کرد هەر کۆتایی نەهات، ناچار لە نێوانی هەر ئۆتۆمبیلێكو یەکێکی تردا کە دوور بوونایە ١٠

پێشمەرگەمان ئەپەڕاندەوە، بەو شێوەیە هەموومان چووینە ئەوبەرەوەو ڕوومان کردە کانی عارەبان، ڕۆژی دواتر گەیشتینە گۆپتەپە.

ڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٧ لە ڕادیۆکانەوە دەنگوباسی پەلاماردانی عێراق بۆ سەر فاوو سەندنەوەی لە ئێرانییەکان بڵاوبووەوە کە پێش دوو ساڵێك کەوتبووە جنگی ئێرانییەکان کە زیانێکی زۆر گەورە بوو بۆ عێراق. بۆیە گرتنەوەی بایەخێکی ستراتیژی هەبوو، گۆڕانێکی گرنگ بوو لە ئاستی شەڕی عێراق ـ ئێراندا. کە بووە سەرەتایەك بۆ گرتنەوەی زۆربەی ئەو شوێنانەی کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی ئێرانییەکان.

شەوی١٩ـ١٩٨٨/٤/٢٠ لەگەڵ کاك ئازادی ڕابەرسیاسی تیپی ٩٣ی کۆیەدا بووم. بەیانییەکەی چووینە موخەڕەس.

ئێوارەی ١٩٨٨/٤/٢٠ لە ڕێگای مەرزان کەوتینە بۆسەی دوژمن‌و لێیان هاتینە دەست، جاشێکمان لێکوشتن‌و یەکێکی تر بە ناوی نەوزاد خەڵکی کەرکوك بوو بە دیلگیرا، شەو چووینە مەرزان، ڕۆژی دواتر لە جادەی کۆیە ـ هەولێر پەڕینەوە، لەو کاتەدا دوو کۆپتەر هاتن خۆمان پەنادا تا ڕەتبوون.

ڕۆژی ١٩٨٨/٤/٢٤ گەیشتینە سماقولی سەروچاوە، برووسکەیەکم بۆ کاك ملازم عومەر کردو ئامادەییم دەربڕی بۆ هەر کارێك دیاری بکات. دوای دوو ڕۆژوەڵامی دایەوە بچمە توتمێ. لەوێ کاك ملازم عومەرو کاك کۆسرەت ڕێزی زۆریان لێگرتین‌و کاك ئازادی سەگرمەشمان بینی.

هێزەکەی مەڵبەندی یەك لە ڕۆژی ١٩٨٨/٤/٢٢ دا گەیشتبووە سنووری تیپی ٢٥ خاڵخالان، بڕیاری مانەوەو شەڕیان دابوو لەگەڵ دوژمندا، گەرچی ئەمە بڕیارێکی خراپبوو، بە هێزی شکاو شەڕ ناکرێ، دوژمنیش مسۆگەر خۆی تەییار کردبوو بۆ پەلاماری ئەو سنوورە. ئەبوایە هەموو هێزەکە بچوونایەتە سەرووترو سەرلە نوێ ئامادە بکرانایە بۆ کاری تر.

ڕۆژی ١٩٨٨/٤/٢٢ دوژمن بە هێزێکی زۆرەوە لە هەموو لایەکی سنووری ئاغجەلەرو چەمی ڕێزان‌و ناوشوان‌و دەشتی کۆیەو تەقتەق‌و تیپەکانی

سنووری ٢٥و ٩٢ هێرشیکرد، ئەمەش (ئەنفالی چوار) بوو. هەر بەیانی ئەم ڕۆژە بە چەند فڕۆکەیەك بە کیمیایی دای لە دێی گۆپتەپەی سەر زێو زیانێکی زۆری لە خەڵکەکەداو کۆمەڵێکی زۆر لە ژن‌و منداڵ‌و پیر شەهید بوون کە ژمارەیان گەیشتبووە ١٢٠ کەسی بێتاوان، هێزەکانی دوژمن هەموو دێهاتەکانی ئەو ناوەی سووتان‌و تەختکرد. ئنجا هێرشی پیادە لە ئاغجەلەرەوە دەستیپێکرد، تیپی ٥٧ی سەگرمە کە کاك عەدنان فەرماندەی بوو نەیانتوانی لە زێ بپەڕنەوەو بەرەو گەرمیان گەڕایەوە، لە قوڵی تەقتەقەوە تیپەکانی ٥٥و ١٧ شەڕی باشیان کردو ١١ شەهیدیان بەخشی، هەروەها تیپەکانی ٥١و ٥٣ لە دوای شەڕ بە هەر هەموویان بەرەو سنوورەکانی مەڵبەندی سێ کشانەوەو گەیشتنە سماقولی، هەرچەندە لەوێ بڕیاری مانەوەیاندا بۆ بەرگری لەو سنوورە، بەڵام کاك شێخ جەعفەر پێی باش بوو ئەو هێزانە لەوێ نەمێننەوە چونکە زۆر ماندوون‌و شەڕی ئەوتۆیان پێناکرێ، ئەبێ سەر لە هێزەکانی ئەو سنوورەش تێك نەدرێ کە بەباشی خۆیان بۆ هەموو ئەگەرەکان ئامادە کردبوو، جگە لەوەی خەڵکی دێهاتەکان ڕۆیشتبوون‌و زەمینەکە لەباربوو بۆ شەڕێکی سەرکەوتوانەو ئینجا چۆڵکردنی. بۆیە هەموو هێزەکان ڕووەو بناری قەندیل ڕۆیشتن‌و لەوناوە شوێنیان بۆ دیاریکراو دامەزران‌و بە باشی حەسانەوە.

ئێمەش پاش قسەکردن لەگەڵ برادەراندا ڕۆژی ١٩٨٨/٤/٢٥ لەگەڵ کاك ئازادا بەرەووەرتێ چووین‌و ڕۆژی ١٩٨٨/٤/٢٧ لە زارگەڵێیەوە بۆ قەڵاتۆکان‌و شەو لەوێ بووین‌و شەوی ١٩٨٨/٤/٢٩ لە دۆڵەکۆگی لاماندا. ڕۆژی ٤/٣٠ گەیشتینە زەڵێ‌و قاسمەڕەش. ڕۆژی ١٩٨٨/٥/٣ لە کانی زەرد چووینە ماڵی کاك فەرەیدون.

لەم ماوەیەدا ناردمە شوێن منداڵەکانمدا لە شارەوە. ڕۆژی ١٩٨٨/٥/٧ سەردانی سەردەشت‌و سەقزم کرد. هەر ئەمڕۆ بەیانی دامەزراندنی بەرەی کوردستانی لە ئێزگەوە بڵاوکرایەوە کە لەم حیزبانە پێکهاتبوو:

- یەکێتی نیشتمانی کوردستان
- پارتی دیموکراتی کوردستان

- پاسۆك
- حشع
- حسك
- پارتی گەل.

ئەم حیزبانە لە رۆژی ١٩٨٨/٥/٢ کۆبوونـەوەو بڕیـاری پێکهێنـانی بـەرەی کوردستانییانــدا کـە نرخێکی گرنگی هـەبوو هەرچـەندە ئەبوایـە زووتـروەکـو پێویستیـەکی نیشتمانی لە دایك ببوایە تا دەوری خۆی لەسەر گۆڕەپانی ناوەوەی کوردستاندا بگێڕایە، بەڵام لەبەر کۆمەڵێك هۆ هەردوا ئەکەوت. لەگەڵ ئەوەشدا کە لـەدوا ساتەکاندا هاتـە کایـەوە هـەر بـە ڕووداوێکی مێـژوویی چاوەڕوانکراو لەقەڵەم ئەدرا، ئەو هەموو هێزو لایەنانەی لە کوردستاندا بوون چ ئەوانـەی لـە شاخ بوونەوە چ ئەوانەی لە شاردا، لە شاخیش ئەوانەی ناکۆك بوون، گـەر هـەوڵ نەدرێ ڕیزەکان یەکبخرێن و لەسەر بەرنامەیەکی یـەکگرتووی کـاری خـەبات بـە گژ دوژمندا نەچنەوە، زەمینەی لە بارچوونی شـۆڕش و زاڵبـوونی دوژمـن زیـاتر دێتـە ئـاراوەو بـواری پیلانگێـڕان و پشێوی سیاسـی و فیکـری و لەبەریـەکترازانی کورد باشتر ئەڕەخسێت. گەر هەر هێزێکی سیاسی لـە ئاوازێك بخـوێنێ و ئامـادە نەبێ تۆزێك لە پێناوی کوردا لە هەڵوێستی خـۆی دابـەزێ و بەرژەوەندییـەکانی نەکاتـە قوربـانی ئاواتــەکانی گەلەکــەمان ئــەوا ئاسـۆی ڕزگــاربوونی ڕوونــاك نابێتــەوەو ڕەشــبینی بــاڵی بەســـەر دڵ و دەروونـــی خەڵکــە شۆڕشــگێڕەکەدا دائەگرێتەوە.

کاتێك ئەم هەلومەرجە قۆسترایەوە بۆ خزمـەتکردنی کـورد زۆر درەنـگ بوو، شۆڕش لە ڕووی چەکدارییەوە لاواز بوو، بنکەو بارەگای هێزی پێشمەرگەی هەموو لایەنەکانی ناوەوە کە ئاشـتبوو بوونـەوە گەیشـتبوونە سـەر سـنوورەکان، دێهاتەکان خـاپوور کرابـوون و خـەڵکییان ڕاپێچـی دەریالوشـی نـەمانی بەعسـیان کرابوون یان چووبوونە ئۆردووگا زۆرەملێکانەوە. لە ئاست ئـەم مـەسـەلـەیەدا کۆمــەڵێك پرســیار ســەریان هەڵئــەدا: ئایــا بــەرەی کوردســتانی لــە ئاســتی مەســئولیاتی نەتـــەوەیی و نیشـــتمانیدایە..؟ ئایـــا لایەنـــەکان بەرژەوەنـــدی

حیزبایەتییان ئەخەنە خزمەتی بەرژەوەندی گشتییەوە..؟ یان ئەمە هەر هەنگاوێکە بۆ داپۆشینی کەمو کوڕییەکانو داتەکاندنی تەپو تۆزی گوناهەکانی ئەستۆیان..؟ ئایا کورد دڵی پێی خۆشە..؟ ئایا ئەو حیزبو لایەنانە نەخشەو بەرنامەیەکی نوێ دائەڕێژن بۆ تێهەڵچوونەوەو کوڕی تێکۆشان گەرمتر ئەکەنەوەو دوژمن ئەخەنە دووڕیانێکەوەو تۆڵەی خاکی سوتماكو خەڵکی ئەنفالکراو ئەکەنەوە..؟ کە خەڵك نەبێ شۆڕشو پارتو ڕێکخراوەکانو بەرە بۆ کییەو چی ئەکەن..؟ کە لە هیچ کاتو شوێنێکدا شۆڕش بێ خەڵك نەبووەو نەکراوە.

ئەوی ڕاستی بێ بەرە جگە لەوەی ئەگەری تێکچوونەوەی ڕیزەکانی لە خۆیدا بەرجەستە کردبوو کە هەریەکەیان کۆمەڵێك بەرنامەو بیرو بۆچوونو هەڵوێستی جیاجیا تەحەکومی ئەکردن تەنیا ئەگەری هەڵگیرسانەوەی شەڕی ناوخۆی دوورتر خستەوە لەو قۆناغە ناسکەداو جگە لەوەی لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە خۆی پێشان ئەدا ئەگینا لە ڕووی یەکخستنی هێزی پێشمەرگەو ڕێکخستنی بەرنامەی کاری سیاسیو دیبلۆماسی شتێکی ئەوتۆی لێهەڵنەوەری. هەر لایەك لەماڵی خۆی، پەیوەندییەکان بە تاڵەموویەك بەسترابوونەوەو زۆر مەبەستی گەورە پشت گوێ ئەخرا، یەکێتی هەر لە کۆنەوە خجڵی ئەوە بووەو بانگەشەی بۆ داڕشتنی بەرنامەی ستراتیژی خەباتی درێژخایەنو یەکخستنی هێزی پێشمەرگەوسەرکردایەتی شۆڕش کردووەو دژی پچڕپچڕی لایەنەکان بووە، کە بەمە لای گەلانی جیهان خۆمان سەنگینتر ئەکەینو پاڵپشتییان مسۆگەر ئەکەین. نەك بە ڕێگای تاك هێزیو کەڵەگاییو خۆسەپاندن بەسەر گۆڕەپانی کارکردندا.

ڕۆژ ١٩٨٨/٥/٨ گەڕاینەوە قاسمەڕەشو لەوێوە بۆ ئالۆمتانو کەوپەڕو بادیناوا، شەو لە چیای قەندیل ماینەوە، دنیا زۆر سارد بوو، ڕۆژی ١٩٨٨/٥/٩ چووینە زمنگەڵێن لە ڕێگا لە سەر بەفر هەڵدێرام وەختبوو پشتم بشکێ، گەیشتینە باڵەیانو ماوەیەکی زۆر ماینەوە، پاش گرتنەوەی فاو ڕۆژی ١٩٨٨/٥/٢٥ عێراق پەلاماری شەلەمچەی دایەوەو لە دەستی ئێران دەریهێنایەوە،

سەرکەوتنێکی تری سەربازیەوەدەستهێنا. هەر لەم کاتانەدا ڕژێم هێزێکی زۆری بۆ پەلاماری ناوچەکانی مەڵبەندی سێ کۆکردبووەوە بە مەبەستی ئەنفالکردنو چۆڵکردنی لە هێزی پێشمەرگە. بەڵام ئێرە بە باشی قایم کرابوو، تۆپخانەی شۆڕش بۆ لێدانی بنکەو مۆڵگەکانی دوژمن سازدرابوو.

ڕۆژی ١٩٨٨/٥/٢٤ کە ئەنفالی ٥و ٦ بوو کە هەموو ناوچە جیا جیا کانی هەولێری گرتەوە، دوژمن هەرچی لە توانادا بوو بەکاری هێنا، هێزی سەربازو جاشو تانكو فرۆکەی گەورەو کۆپتەرو تۆپخانەی قورسو چەکی کیمیایی خستەگەڕ، بەڵام ئەمانە هەمووی تۆزقاڵێ لەوورەی پێشمەرگەیان نەهێنایە خوارەوە، پێشمەرگە نەبەزەکانی یەکێتیو پارتیو حسكو حشعو پاسۆك لە یەك سەنگەردا دەست لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگ بوون، ڕۆکێتی تۆڵە هەمیشە نرکەی ئەهاتو هەناوی سەربازو جاشەکانی ئەتۆقاند.هێزێکی تری یەکێتیو حسك لە باڵەیانەوە ڕەوانەی سنوورەکانی مەڵبەندی سێ کرا بۆ یارمەتیدانی هێزەکانی ئەوێو کاك سامان گەرمیانی سەرپەرشتی ئەکرد.

لە باڵەیان بووم ، ڕۆژی ١٩٨٨/٦/٥ منداڵەکانم لە شارەوە هاتن، باوکم هێنابوونی ڕێگەدرام بچمە لایان ، هاتمە گوێزێ لەنزیکی دۆڵە کۆگێ چاوم بەکاك نەوشیروان کەوت ، لەبن خێوەتێکدا دانیشتبوو، کە منی بینی زۆر ڕێزی لێگرتم ، کەوتینە قسەکردنەوەپێیووتم : مەحمود باوکت هاتووەتە لات ..؟ووتم : نەخێر ،ووتی : باوکت زەختی زۆری لەسەرە کە هاتە لات ئاگاداری بکەرەوە بابێت لێرە دابنیشێ ، ئەگەر هەموومان مردین ئەویش وەکو ئێمە ، ئەگەر ژیاشین هەروەکو ئێمە .. منیش ووتم : بەسەرچاو ئەگەر بینیم قسەی لەگەڵا ئەکەم ، بەڵام کاك نەوشیروان باوکم پیاوێکی ئازایەو سەر بۆ کەس نانوێنێ . ڕۆژی ١٩٨٨/٦/٨ گەیشتمە زەڵێ لای منداڵەکان، باوکم ڕۆیشتبووەوە نەم بینی ، منداڵە کان هەموویان لە ژوورێکدا بوون بێ پێخەفو ڕایەخو پێویستی ناوماڵ، مێشوولەو کێچ هەموو لەشیانی سوژن ئاژن کردبوو. ڕۆژی ١٩٨٨/٦/١٢ بارگەی بێبارمان پێچایەوە بۆ کانی زەرد، لەوێ ماڵۆچکەیەکمان پێکەوەنا.

دوایی گەڕامەوەو چوومە باڵەیان. ئەو کاتەی لە باڵەیان بووم لەگەڵ کاك فەرەیدووندا باسی گەڕانەوەم بۆ گەرمیان کردو پێی باش بوو، دوایش سەردانی کاك نەوشیروانم کردو لەو بارەیەوە قسەمکردو زۆری پێیخۆش بوو، ئیتر بۆ ئەم مەبەستە کۆمەڵێ پێشمەرگەم پێکەوەنا لە ڕێگەی بەمۆوە دابەزین، تەقەلایەکی زۆرماندا بێسوود بوو، دوای ئەوە ماڵەکەم بۆ سەقز گواستەوە، لەو کاتانەدا بوو کاك ڕۆستەمو کاك ئازادی سەگرمە بە هێزێکەوە لە ڕێگەی مەڵبەندی سێ بەرەو سنووری تیپەکانی ٢١و ٢٥و گەرمیان کەوتبوونە ڕێ، کاك ئازاد سەرپەرشتی هێزەکانی گەرمیانو کاك ڕۆستەمیش سەرپەرشتی ئەوانەی سنووری کەرکوك بکات، هەر یەکەیان گەیشتنە شوێنی کارەکانیانو لەگەڵ پارتیزەکانی تردا یەکیان گرتەوە.

سەرەتای مانگی ١٩٨٨/٨ بە هەندێ کار لەگەڵ کاك حامیددا بۆ سەرکردایەتی ڕۆیشتین.

ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٨ لە پەیوندییەکانی ئالۆمتان دانیشتبووین دەنگوباسی تەقەوەستانی شەڕی عێراق - ئێران بلاوکرایەوە، کە بە ناوبژیوانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەنجامدرا، هەر بە بۆنەی ئەم شەڕوەستانەوە هەمان ڕۆژی ٨/٨/ سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی بەیانێکی بلاوکردەوە تیایا داوای لە هەموو لایەك کردبە تایبەتی نەتەوەیەکگرتووەکان کە داوا لە عێراق بکات بۆ ڕاگرتنی شەڕی لە ناوبردنی گەلی کوردستانی عێراقو ڕاگرتنی بە کارهێنانی چەکی کیمیاییو شێوازەکانی تری لە ناوبردنی بە کۆمەڵو لە سێدارەدانو ڕاگواستنو ئاوارەکردنو گۆڕینی نیشانەکانی نەتەوەییو کۆمەلایەتی کوردستان.

زۆرم لا سەیر بوو، ئەوەی بیرم لێنەئەکردەوە شەڕوەستانی ئێران - عێراق بوو، ئەوەندە ناکۆکییەکانی هەردوو لایان کۆنو توندو تیژبوو چ لە ڕووی مێژووییو سنووری جوگرافیو چ لە ڕووی مەسەلەی مەزهەبییەوە دوای ئەو هەموو ساڵە خوێنڕشتنو پێکدادانە ماڵوێرانکەرە کە دەستی زلهێزەکانی دنیاشی تێدابوو، نەئەچووە ئەقڵەوەوا بە ئاسانی پێکبێن.

بەلام تازە ئیمام ژەهرەکەی نۆشی. بۆ هەر لایەك شەڕوەستاندنواتایەکی هەبوو، جۆرێك لە قازانجی بۆیان ئەخستەوە، هەریەکە

به پێوانەی خۆی سوودی لێوەرئەگرت، خۆ بۆ عێراق هەر زۆر سوود مەند بوو چونکە زۆر شەکەت بوو بوو، زیانی مرۆیی‌و مادی‌و ئابوری قورسی پێگەیشتبوو.. ئێرانیش لە لایەکەوە حەزی ئەکرد چونکە ئەویش هیلاك بوو بوو، لە لایەکەوە ئەیویست تۆڵەی زۆرتر بکاتەوە، بەڵام پیلان‌و گەلەکۆمەکە دژی قورستر بوو، بۆیە بە ناچاری‌و بە بێ دڵخوازی خۆی پەنجەمۆری شەڕوەستانی پێکرا. لێرەدا دەیان پرسیار لە کونج‌و قوژبنی مێشکدا توێتکەیان ئەکردو پەردەی ڕەشبینیان دائەدایەوە:

تۆ بڵێی چارەنووسی ئێمە لەم گەمەیەی شەڕوەستاندا چی بێ..؟

مەسەلەکەمان ڕوو لە کوییە..؟

پاشەڕۆژ چۆن ئەبێ..؟

ئەبێ کام شێوازی کارکردن لە بواری خەباتدا هەڵبژێرین..؟

هەرچەندە ئێمە ئەنفال کراین‌و هێزی سەربازیمان لەسەر زەوی خۆمان‌وەکو پێویست نەمابووەوەو لە لای ڕژێمی عێراقی ئەو پارسەنگە قورسەمان نەما بوو، هەرچەندە سەدان هەزار کەسمان بەرەو نەمان چوون‌و بەشێکیشیان لە ئۆردووگاکاندا زیندانی کرابوون، بەڵام مەسەلەکەمان نەمردووە، هاوکێشەکانیش بە ڕەشبینی چارەسەر ناکرێن. ئەبێت سەر لەنوێ تێهەڵچینەوەو کۆڵ لە خەباتی جۆراوجۆر نەدەین. چەند ناخۆشە هەواڵێکت بدەنێ‌و تۆش ناوەڕۆکەکەیت بە دڵ نەبێ‌و دژی بیت‌و ئەویش لە دژی تۆ ئەنجامدرابێ. هەردەمو چاوێکت ئەبینی خەمو کەسەریت تیا ئەخوێندەوە، لێکدانەوەکان دڵخۆشکەر نەبوون. منیش هەر لە بیری دابەزیندابووم، جارێکی تریش بە نیازی گەرمیان بەرەو بەمۆ بەڕێکەوتین بەڵام دیسانەوە ڕێگا نەبوو، گەڕاینەوە.

شەڕەکانی مەڵبەندی سێ نزیکەی سێ مانگی خایاند، دوژمن پێشڕەوی زیاتری کرد، ئیتر پێگەی مانەوە لەو سنووڕەدا نەما، دوای ئەوەی دەستێکی باش لە هێزەکانی ڕژێم‌وەشێنرا بڕیاری کشانەوە دراو ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٢٥ هەموو هێزەکان گەیشتنەوە باڵەیان‌و قرناقەو پشتئاشان. دیسانەوە سەنگەر لێدرایەوە

کە پێشتریش تیپەکانی ١٧و٥١و ٥٣و ٥٥ لەوێبوون. ئەو ناوە بە چاکی قایمکرا. دیاربوو ڕژێم پەلاماری ئەو سنوورەش ئەدا.

بۆیە ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٢٧ ئەنفالی ژمارە ٧ لە بناری قەندیل دەستپێکرد. شەڕ لە شاخی کونەکۆترو هێلانەقەلو شوێنەکانیتر هەڵایسا، هێرشەکان توندوتیژ بوو، تۆپباران خەستو خۆڵ بوو. زیانی دوژمن زۆر بوو، لە زۆر لاوە شکستی هێنا. چەند پێشمەرگەیەکی دڵسۆزیش گیانیان کردە قوربانی خاکو نیشتمانی سووتماك. سەرکردەی ڕۆشنبیر کاك ئازاد هەورامی کە سەرپەرشتی شەڕەکانی ئەکرد بە کۆپتەر پێکراو ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٣١ گیانی بەرزی بە خاکی کوردستان ئەسپێریو شەهید بوونی زیانێکی گەورە بوو بە کۆمەڵەو یەکێتی. تەرمەکەی ئەبرێتەوە دێی سەرکڕانی نزیکی پاوەو لەوێ ئەنێژرێ. دوای ئەوەی هێرشەکان توندوتۆڵتر ئەبێو مەیدانی شەڕ تا ئەهات تەسکتر ئەبووەوە، بڕیاری کشانەوە درا بۆ سەر شاخی قەندیلو ناوچەکانی پشتەوە.

هەر لەم مانگەدا ڕژێمی عێراق ئەنفالی بادینانی کرد. کە ئەنفالی ٨و کۆتایی بوو. بە هێزی زۆرو چەکی کیمیایی سەدان دێی تەختکرد، دەیان هەزار کوردی بەستەزمان ئاوارەی سنوورەکانی تورکیا کردو زیانێکی سەختی کولەمەرگیان ئەبردە سەرو تەنانەت ڕژێمی عەفلەقی لە ڕێگەی سخوڕەکانییەوە ئاوی خواردنەوەکەیانی ژاراویکردو خەڵکێکی زۆر گیانیان لە دەست داو دەوڵەتی تورکیاش لەم کارە بێدەنگ بوو.

پرۆسەی شەڕی لەناوبردنی کورد لە لایەن ڕژێمی عێراقەوە لە سەر تاسەری کوردستاندا کۆتایی هات. کە بە هەشت قۆناغ ئەنجامدرا لە ژێر ناوی ئەنفالدا کە ڕژێمویستی سوود لە ناوی ئایەتێکی قورئانەوەربگرێ بۆ جێبەجێکردنی بەرنامە ڕەشەکەی کە ئەڵێ:

} و یسألونك عن الانفال قل الانفال للهو الرسول فاتقوا اللهو اصلحوا ژات بینکمو أگیعوا الرسول ان کنتم مؤمنین{

سەدام بەویستی لێکدانەوەی خۆیو بۆ بەرژەوەندی بەعسو دەسەڵاتە دیکتاتۆریەکەی سوودی لەم ئایەتەوەرگرت کە زیاتر پەیوەندی بە شەڕی

ناموسـلمانەکانەوە هەیـە. دیـارە ئـەم بـەلای خۆیـەوە کـوردی لـە خانـەی ناموسـلماندا دانـاوەو کوشـتنو لـەناوبردنی بـە ڕەوا بینیـوە بۆیـە سـەرو سامانیان بۆ خۆیو جەلادەکانی حیزبەکەی بە حەلال زانیوە. کەچی کورد لە عەرەب زیاتر خۆیان بە بیروباوەڕی ئیسلامەوە گرێ داوەو هـەزاران مزگـەوتیان درووستکردووە بۆ خواپەرستیو خزمەتی قورئان، کەچی بە یـەك بڕیاری داخ لـە دلانـەی بەعسیانە هـەر هـەمووی تـەفروتوونا کـرانو سووتێنرانو کەسێك نەبوووورتەی لەدەم بێتـە دەرەوەو تەنانـەت قورئانـە سووتاوەکانیش نووزەیان نەگەیشتە لای خوا.

ئەنفال پرۆسەیەکی تازە نییە دژی کورد بکرێ، بـەلکو مێژووەکـەی بۆ لەمە کۆنتر ئەگەڕێتەوە، کە سوپای داگیرکەری عەرەبی چەندین جاری تـر ئـەم ناوچەیەیان شێلاوەو کوشتو کوشتاریان کردووە، ئەگەر چی بـە سـەرهاتی لـەم بابەتە بەسـەر نەتـەوەکانی تریشدا هاتووە بۆ نمونـە پـەلاماری بابلییـەکان بۆ سەر جولەکەو لە مێژووی نوێدا پـەلاماری نازییـەکان لـە هۆلۆکۆستدا بۆ سەر جولەکەکان.

ئەنفال تەنیا هەر کردەوەیەکی مادی نەبوو، تـەنیا زیـان لـە سـەرو مـالی کـورد بـدرێ، بـەلکو کارەساتێکی مەعنـەویش بـوو، ڕەنگدانـەوەی لەسـەر دلو دەروونو مێشکی کەسی کوردا بەجێهێشت، ئاسـەوارەکان تـەنیا هـەروێرانکردنی لادێـی کوردسـتانو نـوغرۆکردنیو ڕاگـوێزانی خەلکەکـەی نـەبوو، بـەلکو کاریگەرێتی لەسەروێرانکردنی شاریش هەبوو، بەلکو مەبەست لێی تـەفروتونا کردنی کۆمەلگای کوردەواری بوو، جیاوازی ئەوتۆش لە نێوان شارو لادێدا نەما.

پـێش ئـەوەی ئـەنفال ئەنجامبـدرێ ڕژێـم ئابلۆقـەی ئـابووری بەسـەر دێهاتەکاندا توندکرد تاکو ژیـانی خـەلکی تـالتر بێـتو گوزەرانیـان نـابوت بێـتو گوشاریش بکەوێتە سەر هێزی پێشمەرگەوسەرچاوەی ژیانیان ئالۆز بێت. بۆیـە هەموو شتێك بـە قاچـاغ ئەگەیەشتە ناوچەکان. نـەك هـەر ئەمـە بـەلکو سـالی ١٩٨٧ بیرۆکـەی گواسـتنەوەی خـەلکی دێهاتـەکانی زەنگابـادو تـەخت کردنـی

خانووەکانیـانو ڕەوانـەکردنیان بـۆ ئۆردووگـای سمـود دەسـتی پێکـرد کـە بـە جیاوازی کەمەوە هەر ئەخرێتە چوارچێوەی پرۆسـەی ئەنفالـە بەدناوەکانـەوە. هەروەها بێسەرو شوێن کردنی پێنج هـەزار بارزانییەکـەشو ڕاگواسـتنی ناوچـە سـەر سـنوورییەکانی دوای ئاشـبەتاڵیش هـەر ئەچـنە خانـەی ئـەنفالو جینۆسایدەوە.

پرۆسەی ئەنفال بە چەند شێوەیەك ئەنجامدرا:

١. پەلاماردانو هێرشی سەربازی بۆ سەر دێهاتـەکانو خـاپوور کردنیـانو سووتاندینان.

٢.دەستگیر کردنی خەڵکەکەیو ڕاپێچ کردنیان بۆ خوارووی عێراق، یان دەرباز بوونی هەندێکیانو نیشتەجێ بوونیان لە ئۆردووگا زۆرەملێکاندا.

٣. بە تاڵان بردنیماڵو سامانی خەڵکە ئەنفالکراوەکان.

بەرپرسیاریەتی ئەنجامدانی پرۆسەکانی ئەنفال خرابووە ئەستۆی عـەلی حەسەن ئەلەجیدی ئامۆزای سەدامو بەرپرسی نووسینگەی بـاکوری ڕێکخـراوی حیزبی بەعس لە کەرکوك. کە کاتی خۆی لای حەمادی شـهابیوەزیری بـەرگری عەریف بووە، پاشان کرایـە سـەرۆکی گشتی ئـەمنی عێـراق. کابرایـەکی دڕنـدەو عاشق بـە کوشـتنو خـوێن ڕشـتن بـوو، هـیچ جـۆرە شـارەزاییەکی لـە کاروبـاری سـەربازی نـەبوو. کـە پـێش جێبـەجێکردنی ئـەنفال هەنـدێ هـەنگاوی نـاوەکو زەمینــە خۆشــکردن بــۆ کارەکــەی لــە بابــەت: قەدەغــەکردنی هاتووچــۆو خواردەمەنی، تۆپبارانی بـەردەوامی ئـەو شوێنانەی بارەگـای پێشمەرگەی لێیـە، کوشتنی هەرکەسێك لە ناوچە قەدەغە دیاریکراوەکاندا، بۆ ئەنجامـدانی ئـەنفال فەیلەقــەکانی ١و ٢ ئامــادەکرابوون، ســەرەڕای هــەموو فەوجــە ســووکەکانی جاشــەکان. لەگــەڵ بــەکارهێنانی فرۆکــەی جــەنگیو کۆپتــەرو چــەکی قورســی جۆراوجۆرو کیمیاییو فسفۆرو هتد. هەروەها بەشداریکردنی گاردی کۆماریش.

بەمەش دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی سەدامیوەرگرت لە هەر کارێك بەرامبەر کوردی بکاتو کەس نەیئەتوانی سەرپێچی لە بڕیارەکانی بکاتو هـەموو دامو دەزگاکانی بەعس گوێڕایەڵی بوون.

داهێنـەری بیرۆکـەی ئـەنفال ڕژێمێکـی ناسـۆنالیزمی فاشـیزمی بەعسـی عەرەبی عێراقە، کە شەرعییەتی بە خۆیداوە بۆ پاراستنی بیری ناسیۆنالیزمی عـەرەبی کۆنەپەرسـتانە دوور لـە گیـانی شارسـتانیەت‌و لـە ڕێگـەی تـرس‌و تۆقاندنەوە پیرۆزییەك بـە بەرنامەکانی بـدات‌و جگـە لـە نەتـەوەی سەردەستی عـەرەبی کەسـی تـر بـۆی نییـە لـە بەردەمیـدا سـەرقوت بکاتـەوەو لـە ڕێگـەی شەڕانگێزییەوە دەسەڵاتی دیکتاتۆری تاکڕەوی بەرجەستە بکات بۆ پاکتـاوکردنی هەموو نەیارەکانی چ لە ناوەوە یان لە دەرەوە.

جـەنگی درێژخایـەنی کوردو بـەعس‌و جـەنگی هەشـت ساڵەی عێـراق - ئێران‌و دواجار شەڕی ئەنفال پۆپەی هەڵوێستە کۆکوژییەکانی ئەم ڕژێمەیـە لـە پێنـاوی مانـەوەی خۆیـدا کـە ئەمـەش پەیوەنـدی بـە نەخۆشـی خـۆ بـە گـەورە زانینـــی ســـەدام‌و حیزبەکەیـــەوە هەیـــەوەکو چەقۆکێشـــێکی ئـــەم ســـەردەمە بکەوێتەوێزەی گەلێکی بێتاوان‌و شەق لە هەموو پەیماننامـە نێودەوڵەتییـەکانی سەبارەت بە جینۆسایدو لەناوبردنی ئەتنیکی  هەڵبدات‌و گوێ بە قسەی کـەس نەدات.

گەرچی ئەنفال لە دوا دوایـی شـەڕی عێـراق - ئێـران ئەنجامـدراو بـەلای هەنـدێ کەسـیترەوە بـە بەشـێکی ئـەو شـەڕە دائـەنرێت، بـەڵام ئـەوە ڕایـەکی ناڕاسـتەو ئـەنفال بـۆ خـۆی پرۆسـەیەکی سـەربەخۆو نەخشـە بـۆ داڕێـژراوەو کردەیـەکی تایبـەت بـوو بـە لـەناوبردنی نەتـەوەی کـورد گەرچـی هەنـدێ لێکچوونیش لە نێوانیاندا هەیە لە ڕووی بەکارهێنانی چەکە کۆکوژەکانەوەوەکو کیمیـایی‌و فرۆکـەی جـەنگی‌و ڕۆکێتـی دوورهاوێـژ‌و چـەکی قەدەغـەکراوی نێـو دەوڵەتی. ڕژێمی عێراق هەموو مەبەستە تایبەتییەکانی خـۆی جێبـەجێکرد بە بەرچاوی هـەموو جیهـان‌و کۆمـەڵگای نێودەوڵەتییـەوە بـە جیهـانی ئیسلامی‌و عەرەبیشەوە، بەڵام کەسیان نقەیان لێوە نەئەهات، لە ناوبردنی گـەلێك هەسـتی نەجووڵاندن. چونکە لە شەڕیدا لەگەڵ ئێراندا هەموویان لە پشتی عێراق بوون پشتیوانیان لێئەکرد.بۆیە بۆ عێـراق زۆر ئاسـان بـوو ئـەم پرۆسـەیە بـێ تـرس‌و

لێپرسینەوە ئەنجام بدات. چارەنووسی ئەو خەلکە بێتاوانەی کوردیش دیارنەبێو مافی مرۆڤ لە گوێی گادا خۆی متکردووەو تەنیا بەیانێکیشی بلاونەکردەوە.

ئەگەر ڕێگا هەبوایە چەند ڕۆژنامەنووسێك لە دەرەوە بهاتنایەوو وێنەی ئەو کارەساتە خەفەتبارەیان بگرتایە ئەوا لەگەڵ مەرگی دلتەزێنی هەڵەبجەدا پێکەوە مۆرکێکی دوورتریان ئەدایە خەلکی جیهانو کانی بەزەییان ئەتەقاندەوە.

کۆی زیانەکانی ئەنفال بە پێی ئەو ڕاگەیاندنانەی لە دەزگاکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە پەخش ئەبووەوە:

- ١٨٢٠٠٠ مرۆڤ بێ سەروشوێن کرا.
- ٤٠٠٠ دێو ٩ قەزاو ٣٠ ناحیە خاپوور کران.
- هەزاران قوتابخانەو مزگەوتو نەخۆشخانەوسەدان پرۆژەی ئاوو کارەباو هەزاران هەزار سەر مەڕو مالاتووولاخو هەزارەها تەن بەروبومی کشتوکالی جۆراوجۆر بوو کە بە سەدان ملیار دۆلار مەزەندە ئەکرێ.

دوای تەواو بوونی شەڕەکانی قەندیلو بالەیان ڕۆژی ١٨/٩/١٩٨٨ هەموو هێزەکانی مەلبەندی یەك گوێزرانەوە سنووری دزلێ ـ مەریوان، ئێمەش بە مالو مندالەوە گواستمانەوە ئەوێو لە کانی دینار نیشتەجێ بووین، لەوێ دیسانەوە کەوتینەوە کەلکەلەی دابەزینە خوارەوە، بێ پرسی دەولەتی ئێران لە دزلێیەوە کۆمەلێك پێشمەرگە بەرەو کانی خەیاران لەوێش بۆ میری سوور ڕۆیشتین. شارەزاکەمان فەرماندەی کەرتی تیپی ١٥ی شارەزوور مام ناجیو پێشمەرگەیەکی برادەرانی سۆسیالیست بوو. ئێوارەی ڕۆژی ٢٤/١٠/١٩٨٨ بەرەو ئەشکەوتی هەورامی جوولاین، لە ڕێگەدا کەوتینە سەر کێلگەی میندا، مینێك لە ژێر پێی عەبدوللای پێشمەرگەی سۆسیالیستدا تەقییەوەو قاچێکی پەڕیو بەسەر مندا کەوت مام ناجیش بۆ لای ئەو ئەگەڕێتەوە ئەویش مینێکی پیا تەقییەوەو قاچێکی سەقەت ئەبێو بەپەلە گەیشتمە لای ، پێیووتم : کاك

مەحمود هەندێ لێم دوور بکەوەرەوە ،ووتم : بۆچی..؟ ووتی حەز ئەکەم لە بەر مین دوور بکەویتەوە .. بەلاَم من هەستم کرد کە نیازی شتێکی هەیەو ڕوانیم ڕومانەیەك لە ناو دەستیدایە و ئەیەوێ بە خۆیدا بیتەقێنێتەوە ، من لێی توڕە بووم‌و ڕومانەکەم لە دەستی دەرهێنا ئیتر لەبەر نەشارەزایی ڕۆیشتنەکەمان پەکی کەوت‌و گەڕاینەوە ، لە بەرئەوەی ئێمە بەدزی ئێرانەوە سنوورمان بەرەو کوردستان بڕیبوو ، بریندارەکانمان تەسلیمی بارەگاکانی سۆسیالیست لە کانی خەیاران کرد .. ئەو شەوەی کە ڕۆیشتین بڕیاروابوو لە چەمی قوڵخوردو عەلیاوادا بمێنینەوە کە چی بۆ بەیانییەکەی تەماشا ئەکەین هێزێکی زۆری دوژمن گەمارۆی ئەو چەمەی داوەو ئاگریان بەردابووە ئەو ناوە ، لە سالانی دواییدا بۆمان ڕوون بووەوە چاوساغەکەیان خالیدە کۆڵ بوو کە جاسوسی ڕژێم بوو ئەو شوێنەی بۆ ئێمە دەستنیشان کردبوو لە هەمان کاتدا ڕژێمیشی لە چوونەکەمان ئاگادار کردبۆوە .. بریندار بوونی ئەو دوو پێشمەرگەیە بووە هۆی دەرباز بوونمان لە چنگی تیاچوون..کۆتایی مانگی ١٩٨٨/١١ کۆمەڵێك لە پارتیزانەکانی گەرمیان‌وەکو کاك ڕۆستەم کاك عەدنان‌و کاك مەحمودی مامەعەزە گەیشتنەوە سەرەوە بۆ حەسانەوە، دیارە هێزێکی تری پارتیزان لە خوارەوە مابوونەوە، کە بووبووە بڕیار ئەبێ ماوە ماوە ئەو برادەرانە بگۆڕدرێن‌و خەڵکی تر بچێتە شوێنیان بۆ ئەوەی ئەوانەی خوارەوە پشوویەك بدەن‌و ئەوانەی ماڵ‌و منداڵیان هەیە بچنەوە ناویان، ئەوانی سەرەوەش دابەزنە خوارەوەو فێری ئەو هەلومەرجەبن‌و شارەزای ئەو شێوازەی خەبات بن.

سالی ١٩٨٨ بەو هەموو ڕووداوە سامناکانەی بەسەر میللەتەکەماندا هات بەرەو کۆتایی ئەچوو. هەموو یەکێك لە ئێمە حەزمان ئەکرد بە زوویی بارگەی بپێچێتەوەو لا نەکاتەوە چونکە ڕۆژێگارێکی پڕ لە نائومێدی‌و کارەساتاوی بوو، جگە لە خەم‌و خوێن‌و خاك سووتان هیچیتری بۆ کورد بە دیاری نەهێنا.

# ساڵی ١٩٨٩

سەری ساڵی تازەی ١٩٨٩ش هات، هەمووان بۆ ئەوە ئەچوون زۆر شت لە ئاستی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ڕووبدات، خۆ حکومەتی عێراق تووشی دوورەپەرێزییەکی سیاسی بوو بوو، لە زۆر لاوە پەنجەی تاوانی بۆ درێژ ئەکرا بە تایبەتی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و کارەساتی هەڵەبجە لە زاکیرەی زۆر خەڵکی ئەوروپادا ئەژیا. گفتوگۆکانی ئێران - عێراق پێشکەوتنی ئەوتۆی بەخۆیەوە نەئەبینی، هەرلایەکیان لەسەر داخوازییەکانی خۆی زۆر سوور بوو، ناوبژیوانی نەتەوە یەکگرتووەکانیش هەر بەردەوام بوو، ئەگەر شەڕوەستاندن ئەنجامی گوشاری دەرەوە بوو بۆ سەر ئێران ئەوا بارودۆخی ناوخۆیش ناچاری ئەکرد چیتر لەم شەڕەدا بەردەوام نەبێ.

هەر لە گەڵ ڕۆژە یەکەمەکانی ساڵی تازەدا بە تایبەتی لە ڕۆژی ١/٧ دا لە پاریسی پایتەختی فەرەنسای ئازادیدا کۆنگرەیەك لە سەر چەکی کیمیایی بەستراو نوێنەرانی ١٤٩ دەوڵەتی تیا کۆ بووەوە، گەرچی ئەمە هەنگاوێکی گرنگ بوو بۆ بڕیاردانی قەدەغەکردنی چەکی کیمیایی بەڵام بەیاننامەی کۆتایی کۆنگرەکە بە لای تاوانبارکردنی ڕژێمی سەدامدا نەچووو چاوپۆشی لەو تاوانە پڕ لە مەینەتییە کرا. سەرەڕای ئەمەش کۆمەڵێك بڕیاری گرنگی تیا دراوە.

مانگی ١٩٨٩/٢ هەڤاڵ مام جەلال لە دەرەوە گەڕایەوە، بە هاتنەوەی زنجیرەیەك کۆبوونەوە لەگەڵ سەرکردایەتی و لێپرسراو و کادیرانی مەڵبەندەکان و دەزگاکان و خەڵکیدا دەستیپێکردو بە دوورو درێژی باسی هەلومەرجی تازەی خەبات و بارودۆخی جیهان و ناوچەکەو کوردستانی کرد، شیکردنەوەیەکی قووڵی مەسەلەکانی خستە بەردەست، کە ئەبێ کورد قۆناغێکی نوێ دەست پێبکات وشەڕ شێوە کلاسیکییەکەی وەلاوەنێ کە تەنیا بایەخ بە خەباتی چەکداری ڕووت ئەدا، ئەبێ خەباتی سیاسی و دیپلۆماسی لە پێشەوەی بێ و ئینجا خەباتی پێشمەرگانەو ڕێکخستن دەوری سەرەکی لە هاندان و ووروژاندن و کۆکردنەوەو ئامادەکردنی خەڵکیدا ببینێ بۆ

بەگژاچوونی داگیرکەران. ئەبێ بایەخی باش بە فێرکردنو پەروەردەکردنی پێشمەرگە بدرێ، هەندێ نەخشەی کارکردن تاو توێکرا بۆ ئەوەی ببێتە هێزێکی شۆڕشگێڕی نوێ لە مەیدانی تێکۆشاندا.

هەر لەم کۆبوونەوەیەدا ڕاوێژێك بە کادیرە سیاسییەکان کرا لەمەڕ چارەنووسی مەلا بەختیارو ئازاد کردنی، کەوەڵامی کادیرەکان ڕازی نەبوون بوو بە ئازاد کردنی، سەرکردایەتیش بەم ڕایە قایل بوو، ئەگەرچیوروژانی ئەم مەسەلەیە لەوەوە هات کە کاتی ئەوە هاتووە ئیتر کۆتایی بە مەسەلەکەی بێتو لەوە زیاتر پێویست ناکات لە زینداندا بێت. کادیرەکانیش هەر هەموویان توندڕەو بوونو هێشتا شنەبای گلاسنۆستو پرۆسترۆیکا بە ئاقاریاندا هەڵی نەکردبوو. ئەگەرچی لە دەرەوەی یەکێتی نیشتمانیدا هەندێ دەنگ بەرز بووبووەوە بۆ ئازادکردنی، بەڵام زۆربەی دەنگەکان لەوانە بوون دژی یەکێتی بوون نەك بەرگریکردن بێت لە ئازادی.

دوای ئەنفالی بەعسیانە هەر لەم مانگەدا لە ڕۆژی ١٩٨٩/٢/١٩ کۆمەڵە پێشمەرگەیەکی خۆڕاگری پارتیزانی گەرمیان دوور لە باوەشی گەرمی کەسو کاریان، لەو چۆڵەوانییە بێ باوانەدا بوونە ژێر هەرەسی ئەشکەوتەوەو شەهید ئەبن: مەلا ئەحمەد کەلاری، حاجی حەمید، حەیدەر، پۆلا، ڕەحیم، محەممەد، دارا.. حەوت ئەستێرەی گەشی ئاسمانی سەختترین هەلومەرجی کوردایەتی لە بەرزییەوە داچۆڕانە خوارەوە، ئەمانە حەوت کەڵەمێرد بوون لە بارێکی ناسکدا بارگەیان بەرەو جیهانی سەروەری پێچایەوە، هەر یەکە بە کوڵێ خەمو ژانو ئاواتەوە ماڵ ئاوایی کردو بۆشاییەکی گەورەیان بە جێهێشت. دیارە کاریگەرێتی ئەم ڕووداوە بۆ سەر برادەرە پارتیزانەکانی خوارەوە زۆر دژوار بوو، هەوڵیاندا هەرچی لە تواناادا بوو بکرێ بۆ دەرباز کردنیان بەڵام بێسوود بوو، ئەشکەوتێکی گەورە دارمێ، دەرگاکەی خڕ لەسەر ئەم هەڤاڵانە داخرێ بە چی ئەو هەموو خۆڵو بەردە لا ئەچێ..!

تەنیا سەید محەممەدو حەمەسۆران ڕزگار بوون کە ئەوانیش لەو کاتەدا چووبوون بۆ پەیوەندی جیهاز لەگەڵ هەڤاڵەکانی تریاندا لەسەر گردۆلکەیەکی

ئـەو نزیکانـەدا گوێیـان لـە زرمەیـەکی زل ئـەبێت، بـەڵام نـازانن چییە، کـە ئەگەڕێنەوە هەوارگەکەیان نەماوە، دەرگاکەی کڵۆم دراوە، ئەوسا تێئەگەن ئـەو زرمەیـە هەرەسـی ئەشـکەوتەکە بووەئینجـا پەیوەنـدی بـە برادەرانـی تـرەوە ئەکەن‌و لە ڕاستی ڕووداوەکە ئاگاداریان ئەکەنەوە. کە هەواڵەکە بڵاو ئەبێتـەوە هەریەکە بە جۆرێ لێکیئەدایەوە، بەڵام ڕاستییەکەی ئـەو ئەشکەوتە شوێنێکی زیخـەڵانی تـەنگ بـوو، خۆیـان فراوانیـان کردبـوو، جارجـارەش‌ووردە بـەردی لێ هەڵئەوەری، کـە بـەلای خـەڵکی شارەزاوە بەڵگـەی ئەوەیـە ئـەو شـوێنە هـەرەس ئـەکات، بـەڵام ئـەوان گوێیـان نەدابوویـە، لـەوێ ڕاهـاتبوون بمێننـەوە، حـەزیان نەئـەکرد بـەجێی بهێڵن تـا دواجـار بـووە مـەنزلگای هـەتا هـەتاییان ، ئـەوەی پێویسـتە بنوسـرێت شـەهید مـەلا ئەحمـەد بـە کـاك عەدنانـدا نامەیـەکی پـڕ جۆش‌و خرۆشی شۆڕشگێڕانەی بۆ ئێران بـۆ نوسیبووم کـە بەتـەما بـووە لەگـەڵ برادەراندا بێتـە سـەرەوە بـەڵام کـە زانـی بـووی ئێمـە دا ئەبەزینـە خـوارەوە لـە هاتنەکـەی‌واز دێنـی‌و چاوەڕوانی ئێمـەی ئـەکرد .. لـەو نامەیـەدا باسـی شـێوە خەباتی نۆی کردوە کە چۆن ئـەبێ هەوڵـدەین بخزێینـە نـاو دڵی دوژمنـەوەو لەوێ دا بێووچان کاربکەین‌و هەراسانی بکەین . شەهید مەلا ئەحمەد لە هەمان کاتـدا نامـەی بـۆ هەنـدێ برادەرانـی تـریش نووسـیبوو بـە تایبـەتی بـۆ کـاك نەوشیروان‌وکاك ملازم عومەرو م.عەلی.

ڕۆژی ١٩٨٩/٤/٢٥ هـەڤالان فەرەیـدون‌و کۆسـرەت بـە دیـدەنی هاتنـە سنووری مەڵبەندەکـەمان، کۆبوونـەوەیان بـە کادیرەکـانی کۆمەڵـەو پاشان بـە هێزەکەی مەڵبەند کردو لـە بابـەت هەلومـەرجی تـازەی خـەبات‌و گەشـەپێدانی لایەنی سیاسی‌و بایەخدان بـە مەسـەلەی ڕێکخراوەیـی دیدو بۆچوونی خۆیـان باسکردو موناقەشەیەکی زۆریان لەگەڵ کرا.

لەم ماوەیەدا کۆماری ئیسلامی ئێـران داوای هێزێکـی کـرد بـۆ بەشـداری کردن لە مانۆڕێکی سەربازیدا. ئێمەش خۆمان ئامادە کـرد بـۆ ئـەم مەبەسـتەو ڕۆژی ١٩٨٨/٥/١ لە هەرسێ مەڵبەندەکەدا خولی مەشق پێکـردن کرایـەوە، مـاوەی خولەکـەی مەڵبەندییـەك ١٣ ڕۆژی خایانـدو ئاسـتێکی باشـی پێشـانداو ئـەو

چاودێرانەی ئەهاتنە سەردانی خولەکە ڕەزامەندی خۆیان لەسەریداو بە لایانەوە سەیر بوو کەلەم ماوە کەمەدا بتوانرێ ئەو ئەرکانە بە باشی ئەنجام بدرێ.

ڕۆژی ١٩٨٩/٥/٥ لە ئێزگەکانی جیهانەوە هەواڵی لەناوچوونی عەدنان خەیروڵڵای وەزیری بەرگری عێراق بلاوکرایەوە کە لە ناو کۆپتەرێکدا کەوتبووە خوارەوە. دیارە ئەمەش بە هۆی پیلانێکی سەدامیانەوە لە ئەنجامی توندو تیژبوونی کێشەو ناکۆکییەکانی خێزانییەوەو مەترسی لەناوبردنی سەدامیشی تێدا ڕەچاو ئەکرا کە عەدنان وەکو کەسایەتیەك لەبەردەم دەسەلاتو هێزی سەدامدا دەرکەوتبوو، بۆیە لە کۆڵکردنەوەی شتێکی چاوەڕوانکراوو بەرجەستە بوو کە کەسێك نییە بوێرێ چەندە لەسەردامیشەوە نزیك بێ، جموجووڵێك بکاتو ببێتە مایەی هەڕەشە لە پاشەڕۆژی سەدام. هەرچەندە عەدنان پەروەردەی دەستی تاوانەکانی سەدام بوو، هەروەکو جەللادێکی خوێنرێژ هەلکەوتبوو، دەستی لە قەلاچۆکردنی کوردووێرانکردنی کوردستانداو رۆڵی گرنگی لە شەڕی عێراق - ئێراندا هەبوو، هەروەها لە پاکسازی نەیارەکانی سەدامو بەعسیشدا، هەرچەندە کوشتنەکەی بەلای هەندێك کەسەوەوا دائەنرا کە ببێتە مایەی تێکچوونی ناوخۆیی خێزانی سەدام بە هۆی ئەوەی خالۆی منالەکانی بوو، بەلام زەبرو زەنگی سەدام ئەوەندە بە قووڵی ڕەگی داکوتاوە بە هیچ جۆرێك ناهێڵێ درزێك بکەوێتە ئەو دیوارەی بە ئێسکو پرووسکی خەلکی بەرزی کردووەتەوەو کوشتنەکەی وەکو مردنێکی ئاسایی تێئەپەڕێو پەردەی بێدەنگی بەسەرا دا درایەوە.

مانگی ١٩٨٩/٦ دوو ڕووداوی مردنی لە ناوچەکە تێدابوو، یەکێکیان مردنی ئیمام خومەینی ڕابەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران بوو کە خاوەنی کارو تێکۆشانی سیاسی ئایینی زۆر بوو، لەسەردەمی ڕژێمی شاهەنشاهیدا دژی ئەو دەسەلاتەوەستاو بۆ عێراق دوورخرایەوە. لەوێش هەر نەوەستاو کاری ئەکرد، دوور خرایەوە بۆ فەرەنسا تا ڕاپەڕینی سەرتاسەری خەلکی ئێران ئەو هەلەی قۆستەوەو بە فڕۆکەیەك گەیشتەوە تارانو لە ئەنجامی نەبوونی

سەرکردایەتییەکی ڕێکوپێک ئەو توانی ئەو ئەرکەبخاتە ئەستۆی خۆیو لەبەرداخ لە دڵبوونی خەڵکی بەرامبەر ڕژێمی شا لە ڕێگەی کۆمەڵێك دروشمی قەبەوە ڕژێمێکی کۆماری ئیسلامی دامەزراندو کەسێتیەکی جیهانی بۆ خۆی سازکرد، هەرچەندە بووە مایەی ئەوەی دنیا بەگشتی لەموەزعەی ئێران بترسنو بە دڵەڕاوکێوە بڕواننە ئایینەدەی سیاسی ناوچەکەو بە تایبەت زلهێزەکان لەم جۆرە دەسەڵاتانە زۆر ئەسڵەمینەوە چونکە بەرژەوەندییەکانیان ئەکەوێتە مەترسییەوە. بۆ لە قاڵبدانی ئەم ڕژێمە لە بۆسەیەکی ناوەختداو هەر بە کۆرپەیی عێراقیان کرد بە گژیداو شەڕێکی درێژخایەنیان تێپێچا، سەرەڕای ئەوەی تازەچوو بوونە سەر تەخت بەڵام بەرگەی ئەو شەڕەیان گرتو لە ڕێگەیوروروژاندنی ئایینیو مەزهەبییەوە توانیان ئێرانو خۆشیان بپارێزنو بمێننەوە.

هەر بیست ڕۆژ دوای ئەمە بێزراوترین زەلام لە دنیای عەرەبدا سەری نایەوە، کە میشێل عەفلەقە، زۆر بە بێدەنگی پێچیکردەوە، بایەخ بە مەراسیمی مردنەکەی نەدرا، ئەگەرچی عەفلەقوەکو ناسیونالیستییەکی کۆنەپەرستی عەرەب کە نابووتترین حیزبی پێکەوەنا چاکەی زۆری بەسەر عەرەبەوە هەیە، کە ئیدیعای یەك نەتەوەیی عەرەبی ئەکرد کە خاوەنی یەك پەیامی پیرۆز بێت، ئەگەرچی بەهۆی بەرپابوونی ناکۆکیو ململانێ لە زێدەکەی خۆیدا جێی نەبۆوەو بۆ عێراق ڕاونرا. ئیتر ئەستێرەی کەوتە کزی، گەرچی ئەو خەونی بەوەوە ئەدی هەموو عەرەب بخاتە ژێر دەوارە ڕەشەکەی خۆیەوە. کەچی بە هەناسە ساردی سەری نایەوە، بەڵام لە دوو توێی بیرە دزێوەکانیدا نەفرەتێکی بۆ عەرەب بەجێهێشت. نەوەکانی حیزبەکەی ئەوەندە دڕندە بوون بە چاوی ڕقەوە تەماشا ئەکران، هەر خۆیشی ئەو ژاراوەی ڕژاندبووە کونجی مێشكو بیری پەیرەوانیەوە، عەفلەقوەکو شۆڤێنیستێك ڕای بەرامبەر کورد خراپبوو، باوەڕی بە مافی نەتەوەکانی تر نەبوو لە چارەنوسی خۆیاندا.

کە بەراوورد لە نێوان ئەم دوو کەسەدا ئەکرێ بەووردی جیاوازییەکان دەرئەکەوێ، گەرچی خومەینیش نەیتوانی مەسەلەی کورد چارەسەر بکاتو

بگره توندیش بوو، بەلام بە لای زۆر لە بیریارانی جیهانییەوە ئەو مێژووی درووستکرد، گۆڕانێکی بەرپاکرد، هەزارو چوارسەد ساڵ شیعە لە ژێر چەپۆکی چەوسانەوەدابوو، هەر خەباتی ئەکرد بۆ ئەوەی ڕۆژێک بگاتە دەسەلات، ئەم توانی بۆ یەکەمجار دەولەتێکی شیعی درووست بکاو ئاڵهای ئیمپراتۆرییەتی ئیسلامی خستە بەرنامەیەوە کە هەموو دنیا لێی تۆقیبوون، بەلام عەفلەق نەک هەر نەیتوانی دروشمە شۆڤێنییەکەی (نەتەوەیەکی یەکگرتووی عەرەبی) جێبەجێبکا، بەلکو لە ئاستی یەکێتی حیزبی بەعسیشدا دەستەوەستان بوو، بووە دوو لەتەوەو تامردنیشی نەیتوانی دیتنیوولاتەکەی خۆی بکات.

لە ئاستی ناوخۆی یەکێتیشدا ڕۆژانی ٣ـ١٩٨٩/٦/٥ یەکێتی شۆڕشگێرانی کوردستان کۆبوونەوەی فراوانی خۆیان ئەنجامدا بۆ تاوتوێکردنی کاروباری ناوخۆییو مەسەلەی ڕێکخستنو هەلومەرجی کاری ڕێکخراوەیی، ئەوەی گرنگ بێت لەم کۆبوونەوەیەدا مەسەلەی یەکگرتنەوەی کۆمەلەو شۆڕشگێران باسکرابوو، کە مقۆمقۆیەکی زۆری خستەوە لەناو کۆمەلەداو دوو جۆرە هەلوێست بەرجەستە بوون: پشتیوانیکەرو دژایەتیکەر ئەمەش شتێکی ئاساییە بۆ هەر دیاردەیەک کۆمەلە خەلکێک لە گەلی ئەبنو کۆمەلێکیش دژی ئەوەستن، هەرچەندە قۆناغەکە بە نیسبەت ئێمەوە گۆڕانی بەسەردا هاتبوو، لەوولاتی خۆمان نەمابووین، تێشووی تازەمان بۆ خەباتی تازەتر هەلگرتبوو، ئەبوایە هەنگاوی جیدیتر لە ڕووی کاری ڕێکخراوەییو پێشمەرگایەتییەوە بنێین لە ناوخۆی خۆماندا، هەرچەندە ئێمە خوازیاری ئەوە بووین ئەمە لە ئاستی حیزبو ڕێکخراوەکانی دەرەوەی خۆماندا بکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستی بە لێکۆلینەوەو بیروڕا دەربڕین هەبوو، تا بەیەک دەنگ کاربکرێو یەکێتی ڕیزەکان مسۆگەر بکرێ.. لە ئاستی ناوخۆی کوردستانیشدا دوژمنی عەفلەقی هەر بە ئەنفالکردنی دێو شارۆچکە ڕزگارکراوەکانەوە نەوەستا بەلکو ئەیویستووردووردو بە بەرداشی بیرو نەخشە دۆزەخییەکانی کورد بهاڕێ، ئەمجارەیان تۆلەی خۆی لەو شارانەی ژێردەسەلاتی خۆیشی بکاتەوە، دیارە بۆ هەر کارێکیش لەم بابەتە پەنای بردووتەوە بەر کۆمەلێک بروبیانووی ناماقوڵی لە بابەت درووستکردنی پشتوێنەی ئاسایشو پاراستنی سنوور. ئەوەبوو لە

مانگی ۱۹۸۹/۳ دا ڕژێمی بەعس ئاگاداری دانیشتوانی شارۆچکەی قەڵادزێ ی کردەوە کە چۆڵی بکەن بە بیانووی ئەوەی کورد پشتیوانی ئێرانی کردووە، لە ڕاستیدا مەبەستی لە قەلاچۆکردنی گەلی کوردوویرانکردن کوردستان بوو. لەم ڕووەوە هەڤاڵ مام جەلال داوای لە کۆمەڵی نێودەوڵەتان کرد گوشار بخەنە سەر سەدام بۆواز هێنان لە چۆڵکردنو ڕاگواستنی قەڵادزێ، ئەم هەواڵە لە هەموو ئاژانسەکانی دەنگو باسی جیهانیدا بلاوبوەوەو کاردانەوەی تایبەتی هەبوو، ئەوروپاشی هەژاند.

عێراق ئەم هەواڵانەی ڕەتکردەوە گوایە شتیوانییە. خەڵکی قەڵادزێو پشدەریش لەم بارەوە نارەزاییان دەربڕی،وەفدێکیان چووە بەغدا بۆ بینینی سەدام. دوای بینینی عیزەت دوری ڕاگواستنەکە ڕاگیرا، لە ئەنجامدا ئەندامێکیوەفدەکە کە مەلای دلگەیی بوو گیرا. ئینجا ڕژێم چەند ڕۆژنامە نووسێکی ناردە ناوچەکە لە گەڵ جاسوسو خۆفرۆشەکاندا هەواڵەکەیان بە درۆ خستەوە بەلام لە هەنگاوێکی نوێداو لە ڕۆژی ۱۹۸۹/٦/۲٥ ڕژێم بێگوێدانە ئەو هەموو نارەزاییانەی ڕای گشتی جیهانی، قەڵادزێو دەوروبەری لە دانیشتوانەکەی چۆڵکرد کە مەزنە ئەکرا بە ۱۰۰ هەزار کەس.

قەڵادزێ مێژوویەکی گەشی لە بەگژاچوونەوەی دوژمندا هەبوو. سیاسەتە چەپەڵەکانی بەعسی ڕەتئەکردەوە، ئەمە داخێکی زۆر نابوو بە دڵی بەعسدا، ئەمجارەشیان خەڵکی بە ئاسانی خۆیان نەدا بە دەستەوە، چەند جار خڕبوونەوەو نارەزاییان دەربڕی کە ڕژێمی ناچار کرد دیسان ڕاگواستنەکە دوابخات، دواتر پەنای بردە بەر شێوازە عەفلەقییەکانی خۆیو تیکە تیکە مەبەستەکانی ئەپێکا، هەر جارەی بە بیانوویەکەوە: جارێك هەڕەشەی بڕینی ئاوو کارەباو پێشتریش گواستنەوەی دامو دەزگا حکومییەکانو جارێك بە هاندانی بارکردنی جاشە چەکدارەکانی. ئیتر ووردەووردە کار ئاسانی گواستنەوەی خەڵکەکەی تر هاتە پێشەوەو زەمینەکەی بۆ تەخت بوو کە ئەم شارەشوەکو هەڵەبجە شەهید بکات.

مەسەلەی گواستنەوەی شارو دەرکردنی خەڵکەکەی بۆ شوێنی تر خۆی لەخۆیدا بەشێکی ئەو پیلانە شۆفێنیستییەی بەعسە بۆ نەهێشتنی ئاسەواری

نەتەوایەتی کوردو کوژاندنەوەی پشکۆی گەشی سیمای شارستانیەتی لەوجودا.
ئـەم سیاسـەتە پۆلیسییەی بـەعس نارەزایییـەکی زۆری خستەوەو لـە زۆربـەی
ئاژانسەکانی دەنگوباسدا ئامـاژەی بـۆ کـرا. بـەڵام بـەعس تۆزقـاڵێ گوێی بـۆ ڕای
جیهانیو دەنگیویژدانیان ڕانەگرت. ئەوەی نیازی بوو بە هاسانی کـردی، گـرنگ
نەبوو بەلایەوە پاشەڕۆژ چی لە هەمبانەکەیدایـە بەرامبـەری. قـەت بـیری لـەوە
نەئەکردەوە کە ڕۆژێك دێت گلۆڵەی ئەمیش بکەوێتـە لێـژی، هـەموو حیزبێکـی
دیکتاتۆری کە گۆڕ بۆ نەیارەکانیان هەڵئەکەنن قەت بیر لـەوە ناکەنـەوە ڕۆژێـك
خۆیانوا بێسەروشوێن بکرێن هەر گۆڕیچەپەیەکیشیان چنگ نەکەوێ.
بـەڵام بـەعس چـەند دەسـتیوێرانە بکێشـێ بـە تـەوێڵی کـوردداا نـاتوانێ
گیـانی بـەرگری لــە جەسـتەی شۆڕشـگێڕەکانی هـەڵپرووکێنێ، بـا دێهـاتو
شارەکانیش خاپور بکات، با دانیشتوانەکەی ئەنفالو ڕاپێچی ئۆردووگاکان بکات،
بەڵام ڕۆڵە دڵسۆزەکانی ئەم گەلە هەمیشە ڕەگەکانی دڵیـان بـە بـوونی کوردەوە
گرێئـەدەنو لــە دوای هــەر نوشوسـتییەك هەڵسـانەوەیەك بـەر پـا ئەکـەن،
چــەندەووڵاتوێرانە بکرێــت ئەوەنــدەش پێشــمەرگە گیانفیــداکان کــۆڵی
ئاوەدانکردنەوە هەڵئـەگرنو جارێکی تـریش ئـاوێزانی ئەبنـەوە. ئێمـە هـەر لـە
کەلکەڵەی دابەزیندا بووین بۆ گۆڕینی ئەو هەڤاڵانـەمان کـە لـە دوای ئەنفالـەوە
لە گەرمیاندا مابوونەوە چونکە نەئەکرا هەر ئەوان لـە خـوارەوە بنومشووریان
نــەخورێ بــۆ گــۆڕینو پشــوودانو ئێمــەش هــەر لــە ئێرانــدا بــینو کــاری
پێشمەرگایەتیمانووردووردلە بیر بچێتەوەو سارد بینەوە. بۆیە بە ئەرکی سەر
شانی خۆمانمان ئەزانی ئێمەش دابەزینە خوارەوە..
بۆیە دوای پرسو ڕاوێـژ لەگـەڵ هـەڤاڵانی سـەرکردایەتیو ئامـادەکردنی
پێشـمەرگەکاندا خۆمـان سـازدا بـۆ چـوونە خـوارەوە دوای ئـەوەی هەماهـەنگی
تەواومان بـۆ کـرا بـۆ دابـەزین کـە بـە ئـەرکێکی گـەورەو پێویستییەکی گرنگی
ڕۆژگاری خەباتی سەرشانی خۆمانمان ئەزانی بە تایبەتی لـەم قۆناغـەدا کـە زۆر
کەس باوەڕی بە خەبات کزو لاواز بوو بوو.. ئێمە هەم خۆمـان تـەییار ئـەکردو
هەم پێشمەرگەشمان بەو گیانە شۆڕشگێڕییە ڕائەهێنا بۆ لە ئەستۆ گرتنـی ئـەم
ئەرکە بۆ بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوایەتیو نیشتمانییەکانمان.

# ڕۆژانــەی پـارتیزانــی

## ١٩٨٩/٦/٢٢

ئەمڕۆ لەگەڵ کاک کوردۆو ئەو مەفرەزەیەی ئامادە کرابوو بۆ دابـەزینی گـەرمیان چـووینە مـەریوانو هەرچـی پێداویستـی پـارتیزانی هـەبوو کـە لـە ئـەزموونی برادەرەکـانی ترمانـەوەوەرمانگرتبوو کڕیمـان تـاکو ئاتـاجی هـیچ شـتێك نـەبین لـە دابـەزینمان بـۆ ئـەو چـۆڵەوانیو دووره پەرێزییـەی تێـی ئەکەوین.ئەو مەفرەزەیەش بریتی بوو لەم پێشمەرگانە:

کوردۆقاسم ، مەحمود سەنگاوی ، میقداد بـرای شـەهیدجەمال ، حەمـە ئێرانـی ،حەمـە پاریاوڵـە ،هـەژار، شـەهاب خانـەقینی ،ئـازاد قەرەوڵسـی ،ماجـد فەیلی ، سوهاد داود ، حەمە ئاخە ، مامۆستا یاسین شێخ ئەحمەد ، شەماڵ شێخ لەنگـەری ، حەمـە چـاو جـوان، د.هـاوڕێ ئەحمـەد ، حەسـەن شێـخ لەنگـەری ، هەلکەوت ئەحمەد غێدان ، ئیبراهیم دیسکۆ.

## ١٩٨٩/٦/٢٣

ئۆتۆمبیلێکمان گرت بـۆ سەرووی دزڵـیو لەوێشەوە بـە لانـدکرۆزەرێکی لای برادەرانی خۆمان سەرکەوتین بەرەو چیای سـوورێن بـۆ بنکـەی ڕەنگین کـە پێشمەرگەی خۆمانی لێبوو.

## ١٩٨٩/٦/٢٤

لە کانی ڕەنگینەوە بەرەو شارەزوور دابەزینو بە ناو کێلگەی مینی چێنراوی سنووری ئێران - عێراق دا ڕێگامان کردەوەو بە پانتایی دەشتی شارەزووری بێدەنگو کپدا تێپەڕین، جاران بەناو خەڵكو ئاوەدانیدا ئەڕۆیشتین لامان ئەدایە ماڵەکانو پشوومان ئەدا، ئێستا بێ باوان، تەنانەت ناشتوانین لابدەین، قەرەیەك نییە ڕووی تێبکەین، جگە لە مین، بۆسەی جاشو سەربازو ڕەبایەی بێژمار لە هەموو ڕێگاوبانو سەرقوتەو بەرزییەکاندا بە لووتماندا ئەتەقینەوە. شارەزاکانمان برادەران: فازیل شیرەمەڕیو ڕەئوفی حاجی سابیرو حەمە سیاسیو کەمالە خڕەو خە لیل سەر کانی بوون کە هەموویان پێشمەرگەی چالاکی شارەزوورو شارەزای باشی ناوچەکە بوون. ئەمانە جگە لە حەمە سیاسی تا شارباژێڕ هاتن . هەرکە لە شاخی سوورێنەوە شۆڕبووینەوە هەستمان بە شادییەك کرد گەردی غوربەتی لێئەسڕینەوە، جۆرە پەیوەندییەکی گیانی نهێنی سەراپای هەستی داگیرئەکرد، لە هەمانکاتدا کسپەیەکی ناسۆری ناخی ئەکرۆژی، لە بەردەم تابلۆیەکی زیندوویوێرانەیی خاكو جۆڵوهۆڵیو نەبوونی خەڵكو تەنانەت زیندەوەرانیشدا خۆمان ئەبینییەوە ئەو دانە دانە باڵندانەش کە تەرە بوو بوون بێ جریوە بە سەرلقی دارو درەختەکانەوە کڕ هەڵتووتا بوون لە ناو تەمی تاریکی بێ ئارامیدا نوقم ئەبوون جار جاریش لە بەر چاومان دوور ئەکەوتنەوە. شارەزوور ڕەنگی مردووی لێنیشتبوو هەتا چاو بڕی بکردایە هەر ڕەبایەو سەربازگەو دیاردەی چەکداری دزێوی دوژمنی لێبوو. شەو لای شیرەمەڕەوە دابەزینو چووینە لای کوڵکنییەکان بە ناو کێلگەی میندا بە بێدەنگی دامان لە جادەی سەید سادق - هەڵەبجەو گەیشتینە کەلاوەکانی تەپەڕێزینە.

وەختێکمانزانی لە ١٠ مەتری نزیکی ڕەبایەکەی دوژمنداین، نەمانزانی ڕەبایەی لێیە. لەو کاتەدا سەربازە پاسەوانەکە چەکێکی بیکەیسی پێبوو دایناو ڕۆیشت سەربازەکەی دوای خۆی بۆ پاسەوانی هەڵسێنێ، گەر بمانویستایە

چەکەکەمان ئەهێناو سەربازی داماو نەیئەزانی. بە ئاسپایی ڕەتبووین‌و لەوێوە چووینە دێی تەپەسەرقوولە، لەو ناو زەل‌و ژاژو قەرەمەدا ماینەوە، زۆر ماندوو بووین تا ئەو رادەیەی نانمان پێ نەئەخورا.

## ١٩٨٩/٦/٣٥

بەیانییەکەی لە تەپەسەرقوولەوە ڕۆیشتین‌و لە ڕاستی دێی گامێش تەپە بەسەر جادەی گشتی دا کەوتینە پشتی شانەدەری، دڕك‌و داڵ زۆر بەرز بوو بووەوە بە شێوەیەك ئەبوایە هەر جارەی یەکێك ڕچەی دڕکەکەی بشکاندایەو ڕێگای بکردایەتەوە زۆریش تینوومان بوو لەوە ئەترساین لە بێ ئاویدا بخنکێین، کە نزیك چەمی چەقان بووینەوە گوێمان لە خوڕەی ئاوەکەی بوو بە پەلە هوتەرەمان کردە سەری‌و بینجمان پێوەنا ئەوەندە ئاومان خواردەوە هەناسەمان کورت بوو خەریك بوو بمرین.

دوای پشوویەکی کورت لە چەمی پەریەرەوە بەرەو دۆڵی گەلاڵ ڕۆیشتین بێئاگابووین لەوەی دوژمن بۆ کیومالی ناوچەکە دەرچووەو پێش ئێمە ڕۆیشتووە، کە ڕۆژ بووەوە گەیشتینە بەردەمی قەلای سرۆچك لە نزیك دێی قەویلە، هیچ جێگەیەك نەبوو بۆی بچین لە پاڵ هەندێ گاشە بەرددا لە سەر چەقی ڕێگاکە خۆمان دا بەزەویداو خەومان لێکەوت،وەختێ خەبەرم بووەوە خۆر لێی دابووین، قاچ‌و قولان ئەوەندە دڕك‌وداڵی پیا چەقیبوو خوێناوی بووبوون، ئەوەندەش بە ناو سووتاویدا ڕۆیشتبووین ڕەش داگەڕابوین ڕەنگ لە ڕوومانذا نەما بوو. برادەرانم لە خەو هەڵساند، زۆر تینوومان بوو تەماشایەکی ئەملاو لامان کرد تەڕاییەك نەبوو بچین بۆ ئاو، لە سەرووی خۆمانەوە لە سەر شاخەکە ئەشکەوتێك بەرامبەر قەلاکە دیاربوو کۆتری تێئەچوو، هەستم کرد ئاوی هەبێ بە برادەرانم‌ووت: من ئەچم بۆ ئەو ئەشکەوتە ئێوە جیهازەکانتان بکەنەوە ئەگەر ئاوی هەبوو ئاگادارتان ئەکەمەوە سەرکەون ئەگەریش ئاوی نەبوو دێمەوە بۆ لاتان، کە چوومە ئەشکەوتەکە تەماشائەکەم حەوزێکی پڕ

ئاوی تیایه بۆیه ئەم کۆترانە لەوێ کۆ ئەبوونەوە، ئاهێکم پیاداهاتو جیهازم بۆ برادەران کرد کە ئەوانیش بێن بۆلای من. تائەوان هاتن من خۆم شووشتو هەندێ دارو چیلکەم بۆ چای لێنان پەیدا کرد، دوای پشوودان بە دۆڵی گەلاڵدا بەرەو بەرزنجە ڕۆیشتین. لە ڕێگا لە کانییەك ئاومان خواردەوەو مەتارەکانیشمان پڕ کرد. مام ڕەئوف پێی ووتین: گوێ مەدەنە بێ ئاوی دێی ئەشکەوتان ئاوێ باشی هەیە، کە چووینە ئەوێ بۆ نەگبەتی ئاوەکەووشکی کردبوو، ئەشکەوتێکی فێنکی لێبوو چووینە ئەوێ هەندێ حەساینەوەو بەرەو دەشتی زەڵێی خوارووی ناحیەی بەرزنجە کەوتینە ڕێ. تینوومان بوو لە حەیبەتانا هەڵۆژەی کاڵمان ئەخستە دەممان کە چی ئەوەندەی تر تینووی کردین‌و زمانمان‌ووشك بوو. چووینە دێی گێڵەرە بۆ ئاو خواردنەوە بارەگایەکی سەربازی تێدا بوو نەمانتوانی لەوێ ئاو بخۆینەوە یەکسەر بەرەو دێی گاژاو چووین، لەوێش چادر هەڵدرابوو لە ناوچادرەکاندا چرا ئەگڕیا لە تینوانا ئەوەندە شپرزە بووین‌ووتمان: ئەگەر بشکوژرێین ئەبێ ئاو پەیدا بکەین، برادەران: فازیل‌و حەمەسیاسیمان ناردە سەر حەوزی دێکە، کە ئاویان هێنا من ئەوەندە ئاوم خواردەوە گەدەم هەڵشێواو ڕشامەوە هەر ئاوم ئەخاردەوەو هەڵم ئەهێنایەوەوای لێهات مەتارەکەشم هیچی تیا نەما، ئینجا بەرەو خواری دێکە ڕۆیشتین تەماتە چێنرا بوو تێگەیشتین ئەمە ماڵی ئەو خەڵکانەیە بۆ کشتوکاڵ نێردراونەتەوە تاکو پێشمەرگەیان بینی خەبەری لێبدەن. لەو ناوەدا تا کاتژمێر ٥ ی ئێوارە ماینەوە. لەوێوە برادەران: فازیل شیرە مەڕی‌و مام ڕەئوف‌و کەماڵە خڕە بەرەو ئێران گەڕانەوە حەمە سیاسیش لەگەڵ ئێمەدا مایەوە. دوای ئەوە بەرێکەوتین بۆ دێی پوشێن، کە چووینە سەر شاخەکە کاك حەمە پاریاوڵە پەکیکەوتو نەیتوانی بڕوات ناچار گەڕاینەوە نزیکی دارستانەکەی لای پووشێن‌و میقدادو سوهادو برایمم نارد بۆ ئاو لە ناو پووشێندا کەوێران کرابوو، هاتنەوەووتیان خەڵکی لێیە. ئیتر لەوێ خۆمان شاردەوە تاکو نەمانبینن.

## ١٩٨٩/٦/٢٨

له پووشێن تا کاتژمێر ٥ ی ئێواره ماینەوه تینوێتی برستی لێبڕین بە برادەرانم ووت:وا خەریکە لە تینوانا ئەخنکێین ئەبێ بچین بزانین ئەو خەڵکانە کێن ئەگەر خراپەکار بوون ئەیانگرین. برادەران ڕۆیشتن‌و دوای ماوەیەك هاتنەوە،ووتیان ئەوانە ئەو خەڵکانە بوون بۆ کشتوکاڵ کردن دێنە ناوچەکە تا چووینە نزیکیان ئەوان بەرەو عەربەت ڕۆیشتبوونەوە.

ئیتر ئێمە چووینە سەر کانی‌و ئاوەکەو شوێنێکی خۆش‌و ئاوێکی ڕوونی هەبوو. دووساڵ بوو چایی عەلەممان نەدیبوو ئەو زەلامانە چایی زۆریان دانابوو، لە سەر حیسابی ئەوان ناوی خوامان لێهێناو چایمان لێناو کاك حەمە پارياوڵەشمان ڕووتکردەوەو خستمانە ناو حەوزەکەوەو ئاومان پیا ئەکرد تاکو گورج بێتەوە، کە خۆی شۆرد هەستی بە چاك بوونەوە ئەکرد.

دوای پشوودان بەرەو چیای پشتی ئەشکەوتە ڕەش ڕۆیشتین هێشتا دنیا تاریك نەبوو بوو، خۆمان حەشاردا تا دنیا تاریك دابێ‌و لەوێوە بۆ دۆڵی دووکانیان شۆڕ بینەوە کە زۆر جار بەو دۆڵەدا بە پیادە یان بە تەراکتۆرو ئۆتۆمبیل ڕەتبووبووین لە کاتی هاتووچۆکانماندا لە گەرمیانەوە بۆ شارباژێڕو سەرکردایەتی.

کە نزیکی ناو دۆڵەکە بوینەوە گوێم لە دەنگە دەنگێ بوو ڕوانیم لە بەردەممانا لە سەر جادەکە ڕەبایەیەك هەیە، ٩ سەربازمان ژمارد، ناچار خۆمان ماتدا تاکو تاریکی بە تەواوی داهات، ئەوسا لە جادەکە پەڕینەوەو بە شاخەکەدا ڕۆیشتین بۆ دیوی کەلاوەکانی دێی کۆزەڕەقە، لەوێشەوە لە جادەی سلێمانی - عەربەت پەڕینەوەو چووینە دێی یەخی ماڵی لەوێ ئاوێکمان خواردەوەو دامان لە ئاوی تانجەرۆو تێمانتەقاند بۆ بناری باخچە. چووینە بەردە هەرەسەکانی ڕۆژئاوای دێکە ئەوەندە ماندوو بووین شلوکول بووبووین هەرکە گەیشتینە ئەوێ‌و پاڵماندایەوە یەکسەر خەومان لێکەوت کە خەبەرم بووەوە تەماشام کرد لەولامانەوە گاگەلێك ئەلەوەڕێ‌و سەرشاخیش پڕیەتی لە

سەربازو جاشوادیار بوو کیوماڵیان ئەکرد.برادەرانموریا کردەوەو لەو شوێنەدا ماینەوە تا کاتژمێر ٦ی ئێوارە ئاومان پێ نەمابوو زۆریش تینوومان بوو هەستام بەدوای ئاودا بگەرێم هەر لە ٥٠ مەتری دووری خۆمانەوە ئاوێکی پاكو خاوێن هەبوو تێر ئاوم خواردەوەو گەرامەوە لای برادەران

ووتیان: ئاوت دۆزییەوە..؟ووتم : پەلە مەکەن با تۆزێ درەنگ بکات ئاومان لێوە نزیکە.

میقداد خۆی پێرانەگیرا بە شوێن پێکەی مندا هەڵسا چووە سەر ئاوەکە بە دوایدا برایم رۆیشت ئینجا مامۆستا نەجم،وای لێهات جاشەکانی سەر شاخ هەستیان کرد خەڵکی لێیە. هەندێ هاواریان کرد بەڵام نەهاتنە خوارەوە.

هەر ئەو ئێوارە بەرەو دێی میریاسی قەرەداخ مەسافەماندا لە سەر شاخ رەبایەی زۆر دانرابوو لە سەر چەقی رێگاکە چادر هەڵدرابوو ناچار گەراینەوەو چووینە هەرەسەکەی پشتی شەممە، کاك حەمە سیاسیو سوهاد هەرچەندە زۆر ماندوو بوون ناردمان بۆ ئاو بەڵام زۆر مەردانەو بە هیمەت بوون.

لەماوەی ئەو چەند رۆژەی لە ئێرانەوە دەرچووبووین پەیوەندیمان لەگەڵ برادەراندا بچڕا بوو. جیهازێکمان پێبوو لەگەڵ جفرەدا، من ناوم حاجی بوو،ویستم جیهاز بکەم تاکو هالۆ هەواڵێك بزانم کە جیهازەکەم کردەوە کاك بەرزانی حەمەی مینا کە بە جیهازێکەوە لە سەر سوورێن بوو بۆ پەیوەندی کردن بانگی حاجی ئەکرد،وەڵامم دایەوە: فەرموو حاجیت لەگەڵە. بۆ ئەوەی یەکتری بناسینەوە نهێنیمان ئەوە بوو من بڵێم سەعیدم لەگەڵدایە. لە جفرەکەدا دێی شەممە ژمارە ٢٥ بوو، ژمارەکەم پێداو دڵنیا بوو لە گەیشتنو مانەوەمانو ئاگاداریشم کردەوە کەوەزعمان باشە.

## ١٩٨٩/٦/٣٠

ئێوارەیەکی درەنگی نزیك خۆرئاوا بوون بە رێکەوتین بۆ دێی نەوتی قەرەداخ، لە سەر شاخ سەربازێکمان بینی مەسینەیەکی پێبوو بۆ سەر ئاو ئەچوو ئەو ئێمەی نەبینی. ئێمەش هەقمان بە سەریەوە نەبوو.

ئای کە دیمەنێکی تەماوی بوو. قەرەداخ کە مەڵبەندی قەرەباڵخیو ئاوەدانی بوو خوا نەکاوورتەی تیا بێوەکو پیاوێکی کەشەنگی لێهاتبوو پاڵی دابێتەوەووەنەوزی خەو بردبێتیەوە. زەردەی باڵا بەرز دیدە خەمناكو قەرەچۆڵ بڕاو بوو، ئەتووت هێشتاش فرمێسکەکانی بۆ سێوسێنانەکەی بە کیمیایی ژاراوی کراوی سەر لە ئێوارەیەکی ئارامی ئەو دۆڵەدا هەر لە چاوا قەتیس ماوە.

لەو ڕاستە چووینە خوارەوە. بینیمان هەر لە بازیانەوە تا دەربەندیخان ئاگر ئەگرێ ئەمە بەڵگەی کێومالکردنی دوژمن بوو کە هەندێ جار هێزەکانی دەرنەچوون ئاگریان بەرئەدایە ناوچەکە، ئەم ئاگر کردنەوەیە بۆ ئێمە زۆر باشبوو ئەمانزانی دوژمن لە کوێدایە.

ئێمە بە ناو ئاگرو سەربازدا ئەڕۆیشتین ئەمانویست بگەینە چیاکەی پشتی ئەستێڵی سەروو کە چی لە هەموو لایەکی چیاکەوە لایتی دەستی سەربازەکانمان ئەبینی، بۆیە گەڕاینەوە ئەستێڵی خواروو هیچ جێگایەك نەبوو بۆی بچین. دێی چەمی سمۆریش سەربازگەی لێبوو، چووینە زەلو ژاژەکەی سەرچاوەی ئاوی ئەستێڵی خواروو لە بەیانییەوە تا ئێوارە نە ڕێگەمان هەبوو هەڵبسین نە بواری ئاو خواردنەوەشمان هەبوو، نەشمهێشت برادەران جگەرە بکێشن، مەگەر هەر پێشمەرگەی پارتیزان بتوانێ ئەوەندە ئۆقرە بگریو گوێڕایەڵی فەرمانەکان بێ، چونکە بچووکترین دەرچوون لە ڕێچکەی بڕیارەکان کێشە درووست ئەکاو لەوانەشە بە بێهوودە بە هۆی هەڵەیەکەوە گیانی هەموومان بکەوێتە مەترسییەوە.

کە درەنگ داهاتویستمان بچینە پشتی تەکیەو لەوێوە بۆ قۆپی سەگرمە بەلام دەروازەی هەموو قۆپییەکان گیرا بوو، لە هەموو لایەکەوە

فیشەکی گڕدار هەڵئەکرا. من زۆر ئینکاریم کرد بچینە پشتی دێی تەکیە بەڵام کاك کوردۆو برادەران قایل نەبوون‌و چووینە پشتی دێی کۆشکی سەروو.

## ١٩٨٩/٧/١

کە ڕۆژ بووەوە تەماشامان کرد دوژمن بە هێزێکی زۆرەوە بەرەو پشتی تەکیە سەرکەوت، ئەگەر برادەران بە قسەی منیان بکردایە هەمووومان لەو شوێنەدا تووش ئەبووین‌و ئەبووینە پاروویەکی ئاسان بۆ ئاگری چەکەکانی دوژمن، ناچار ئەو ڕۆژە تاکو ئێوارەو شەوەکەشی لەوێدا ماینەوە.

## ١٩٨٩/٧/٣

بۆ خۆرئاوا بەرەو دێی سێوسێنان ئەرۆیشتین کە چی سەربازی تێدا بوو، لەو دەمانەدا جیهازم کردبوەوە، کاك کەریم چاوڕەش هاتە سەرخەت‌و پەیوەندی پێوەکردین، هەواڵی بارودۆخەکەم لێپرسی‌ووتی: هیچ ڕێگایەك نەماوە تەنیا ڕێگای کانی مامشەی پشتی دێی بەڵخە، ئەتوانن بۆ ناو قۆپی زەردە سەرکەون.

ئیتر ئێمە لەوێوە چووینە دێی بەرزەوانی خوارووی سێوسێنان. لە کانییەکەی ئاومان خواردەوەو مەتارەکانمان پڕ کردو بەرەو عەلیاواو بەڵخە ڕۆیشتین، کەنزیکی سەرچاوەی کانییەکەی بەڵخە بووینەوە تووتڕکی زۆری هەبوو دەنگی هاژەی ئاوەکەش ئەهات، کاك حەمە پاریاوڵە چوو ئاوبێنێ ئەوەندەمانزانی خشەیەك هات تومەز کاك حەمە کەوتووەتە خوارەوە، هاواری کرد کە کەوتووەتە نا ئاوەکەو مەتارەکانی بۆ فڕێ بدەن تا پڕی بکات ئێمەش مەتارەکانمان دایەو بۆی پڕکردین‌و دواتر بە پشتوێن هەڵمانکێشایە سەرەوە. لەوێوە چووینە ناو قۆپیەکە کە دەیان جاریتر بەو ناوەدا ڕۆیشتبووین، بە تەما بووین لە ڕێگەی پیاوە ڕێوە بۆ زەردەلیکاو بچین. دنیاووردەووردە ڕووناك بوەوەو سەرشاخ دەرکەوت، سەربازەکانی دوژمن دیار بوون، ئیتر لە ڕۆژئاوای دەربەندەکە خۆمان حەشاردا.

## ١٩٨٩/٧/٣

کاك حەمە پاریاوڵەووتی: ساڵی ١٩٨٨ هەندێ شەکرو چاییم لەم ناوەدا قایم کردووە لە گەڵ حەمە ئێرانیدا ئەچین ئەیهێنین، پاش ماوەیەك حەمە ئێرانی هاتەوە لە گەڵ کاك حەمە بووبووە شەڕیان‌و بە جێهێشتبوو، دواتر کاك حەمە شەکرو چاییەکەی هێنا بەڵام هیچمان پێ نەبوو پێی لێ بنێین لە پووشێندا لە کتری جووتیارەکاندا چاییمان لێنا لێرەش ناچارگەڕاین شتێکمان دەستبکەوێ مەنجەڵە شکاوێکمان دۆزییەوە لەگەڵ کترییەکدا لایەکی ساغ بوو، لە مەنجەڵەکەدا چاییەکەمان کوڵان‌و ئەمانکردە کترییەکەوەو بە نۆرە ئەمان خواردەوە.

لەوە ئەچوو هێزەکەی دوژمن کێومالیان تەواو بووبێ چونکە لە چاووونبووبوون. دەمەو ئێوارەووردەووردە بەرەو زەردە هەڵکشاین. کە گەیشتینە سەر شاخ پشوویەکمان دا هەموو گەرمیانمان لێدەرکەوت لە ناو تەمی ئازارا ئەتلایەوەو تا بینە قاقای‌وونبوو بوو، تاسێکمان پێدا هات. لە کاتی ئەنفالەکەشدا لە سەر شاخەوە هەموو گەرمیانم دی گڕی تێبەربووبوو، دووکەڵ‌و تەپوتۆزو شین‌وشەپۆڕ بوو،وا ئەمجارە بە چۆڵ‌و هۆڵی ئەیبینمەوە قەرەی تیا نەماوە جگە لەو چەند پێشمەرگە عەوداڵە خۆشەویستانی خاکی کوردستان نەبێ. کسپەیەك لە قووڵایی ناخمەوە هات‌و کوڵی فرمێسك بەربینی گرتم. پاڵم دا بە گاشە بەردێکەوە لە بارێکی دەروونی تایبەتیدا بووم بیرو ئەدێشەم بۆ دەیەها مەبەست باڵی گرتبووەوە، یادگاری زۆری ڕۆژانی زووترم ئەهاتەوە یاد، سۆزێکی پڕ خرۆش لە ناخمەوە هەڵئەقولا بۆ خۆشەویستی گەرمیان، حەزم ئەکرد لە سەر شاخەوە بفڕم‌و خۆم بکەمە یەکە بە یەکەی ماڵە ڕووخاوو خاپوورەکاندا، ئارەزووم ئەکرد باوەش بکەمە هەموو تل‌و بەردێکیداو خەمی دووری‌و ناسۆرییەکانی ئەنفال لە بیر خۆم ببەمەوە، کەچی هەتا چاو بڕبکات کەس دیار نەبوو. لە ئەندێشەمدا چووبوومە ناو ئەو

پانتاییە چۆڵەی گەرمیانەوەو هاوارم ئەکرد: هۆ... ۆو خەڵکینە ئەوە لە کوێن..؟ بۆ دیارنین..؟ تۆ بڵێی ڕاپێچی تونی مەرگ کرابن..؟ کەسێك نەبووەوەڵامم بداتەوە.!

چ کارەساتێك قەوماوە..؟ کە سەر لەم هەوارە خاڵییە ئەدەیت زیاتر هەست بە پابەند بوون بە خاكو نیشتیمانەوە ئەکەیت. نەك هەر من هەموو برادەران کەوتبوونە هەمان کەلکەڵەوە هەر یەکە لە گەڵ ئەندێشەی خویدا گرمۆڵە بووبوو. لە دوای پشوودان شۆڕ بووینەوە لە کانییەکەی پشتی زەردەلیکاو چاومان بە کاك کەریم چاوڕەشو برادەرانی کەوت کە لە ڕۆژی ۱۹۸۸/٤/۱٤وە نەمان بینیبوون. بە دیداریان شاد بووینو تاسەمان لەیەك شکاو شەویش لەوێ ماینەوە.

## ۱۹۸۹/۷/٤

بەیانییەکەی چووینە شۆڕاوەکەی پشتی قەڵای تەپەگەڕوس تا ئێوارە لەوێ بوین، شەوەکەی چووینە چیای ئاژداخو کاك حەمە ڕەشو کاك حەمە ئاخەمان بینی لە جێگایەکدا بوون پێی ئەووترێت: بەردەکەی لالە شەریف.لەوێ ۲ ڕۆژ لایان ماینەوە ئینجا چووینە لای برادەران مەریوان حاجی حسینو مەلا سەعید لە سەرووی دێی مەلا هۆمەر، بۆ بەیانییەکەی چووینە قەڵۆمزێك لە نێوان مەلا هۆمەرو سپێسەردا کە جێگایەکی زۆر خۆشبوو ناو نرابوو بە مەسیفەکە، شەوەکەیشی بووینە میوانی کاك ئەحمەدی حاجی ڕەشید لە نیوان مەلا هۆمەرو تیلەکۆی زەنگنەدا.

## ۱۹۸۹/۷/۸

چووینە کانی دڕکەی نێوان چیای مازوخو دێی قەواڵی کە زەوی ماڵی باوکی کاك ڕۆستەمەو لە دوای ئەنفالەکە برادەران مەڕێکیان تیا دۆزیبووەوە بۆیە ئەو شوێنەیان ناو نابوو مەڕەکە.

## ١٩٨٩/٧/١٠

لای برادەرانـــی کـــاك عوسمـــان بـــووین کـــە شـــوێنەکەیان ئەکەوێتـــە خۆرهەڵاتی دێی گۆبان عەرەبی سەرووی کفری. دنیا زۆر گەرمبوو بە ڕادەیەك بوو قەیسیمان ئەکردە ئاو ئەماندا بە لەپماندا تاکو ئاوی ترش بداتەوەو ئینجا ئەمانخواردەوە تا گرەو گەرما نەمانبات و نەخۆش نەکەوین. لە کوردەواریدا نیشانەکانی گرەبردن ئەمانە بوون: زەردهەڵگەڕان، گیان گەرمبوون، ڕشانەوە، زەحیری. لە کوردەواریشداوا باو بوو ئەو منداڵەی تووشی گرە ئەبوو ئەیانخستە توێی کونەوە، ئاوی قەیسی ناوکداریان ئەدایەو بەیانی زوو بە ئاوی سارد ئەیانشۆرد، بۆ زەلامی گەورەش ئەبوایە ئاوی قەیسی بخواردایەو بە ئاوی سارد مەلەی بکردایەو چەوری نەخواردایە.

## ١٩٨٩/٧/١١

لەگەڵ کاك حەمە ڕەش و کاك عوسماندا ڕۆیشتین بۆ بینینی هەڤاڵانی ڕێکخـــراوی ســـلێمانی کـــە سەرپەرشـــتی دابینکردنـــی پێویســـتییەکانی پارتیزانەکانیان ئەکرد.لە ٣ کم ڕۆژئاوای کفرییەوە چووینە دەواجنێك لەوێ پیاوێك هاتە پیریمانەوە ناوی عەزیز بوو، ئەو منی بەناو ئەناسی، پرسیاری کرد: گوندە چۆنە..؟ منیش ووتم: گوندە کێیە..؟ ووتی: کاك شەوکەت. تومەز ئەمە خەڵکی شارەزوورەو تێکەڵی لەگەڵ کاك شەوکەتدا هەیە. دوایی زانیم ئەمە کاك ئەحمەدی برای کاك جەلال کوڵکنییە. لەگەڵ کاك عەزیزدا دامانە قسەو باس و دەمەتەقێ لە سەر زۆر شت، چەند نامەیەکم نووسی بۆ لالە سەرحەدی ڕۆغزاییی و کاك حەمەی حاجی مەحموی هارونیی و عوسمانی مام کەریمی پورزام، دامنە دەست کاك ئەحمەد بیگەیەنێتە شوێنی مەبەست..دوای تەواو کردنی کارەکانمان گەڕاینەوە حەشارگەکانی سێ قازانەی نزیك باوەشاسوار.

## ١٩٨٩/٧/١٣

ڕۆژی جەژنی قوربان بوو.. خەڵکی دنیای ئیسلام ئەکەونە جۆرە خۆشییەکەوە، گەر چی کورد ئیسلامەو جەژن‌وەکو ڕێوڕەسمێکی ئاینی ئەگێڕێ بەڵام ئێمە لە سای ئەو ڕێوڕەسمە ئیسلامییەدا بێ مافین بەڵکو لە ژێر پەردەی ئەودا لە ناو ئەبرێین. لەم ڕۆژو بۆنەیەدا هەستم ئەکرد ئێمە لە دنیایەکی تردابن، لە کوونە پەناگەیەکدا کات بەسەر ئەبەین، کەچی ئەو ڕژێمەی فەرمانڕەوایی عێراقی ئەکردو یاساو ڕێسای ئیسلامی پەیڕەو ئەکرد بە ڕەوای نەئەبینی ئێمەش‌وەکو گەلێکی موسوڵمان‌و ڕۆژ هەڵاتی مومارەسەی مافەکانمان بکەین. لەوانەشە کەسانێك هەبن بڵێن ئەم ڕژێمە دوورە لە ئیسلامەوەو بۆ مەرامەکانی بە کاری ئەهێنێ کەچی بەشێکی زۆری زانایان‌و پیاوانی ئاینی ئیسلام داکۆکی لێئەکەن، لە ژێر سایەیا کۆنگرەی ئیسلامی ئەبەستن، لە هەمانکاتدا کۆمەڵێکی تریان دژی ئەوەستن، نە ئەویان ئەتوانێ لە ڕێگەی پشتیوانی کردنیەوە بەرەو ئاقاری باشتری ببەن نە ئەمیان ئەتوانێ بیڕووخێنێ‌و لە ناوی ببات.

## ١٩٨٩/٧/١٤

ئەمرۆ لە ڕێگەی ڕادیۆکانی جیهانەوە هەواڵی تیرۆرکردنی د.قاسملومان لە ڤیێنای پایتەختی نەمسا لە لایەن دوژمنانی کوردو مرۆڤایەتییەوە بیست. کەسێك نییە بتوانێ لە ئاست ئەم تاوانەدا بێدەنگ بێ‌و هەستی دەرنەبڕێ چونکە شەهید کردنی قاسملو داخێکی گەورەیەو بەڵگەی ئەوەشە دوژمنانی کورد ئاشتییان ناوێ. کاتێ کورد ئەچێتە سەر مێزی گفتوگۆ لە جیاتی ئەوەی مافەکانی بسەلێنرێ گوللەی مەرگی پێوە ئەنرێ.

د.قاسملو کەسایەتیەکی گەورەی سیاسی‌و دبلۆماسی ئەم سەردەمەی کورد بوو، نەخشێکی باشی لە ناساندنی گەلی کورد بە جیهان‌و ئەوروپا هەبوو. سەیر لەوەدایە بکوژەکانی د.قاسملو وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون.

## ١٩٨٩/٧/١٥

هــەر لــە ســێ قازانــە بــووین، ئێوارەکــەی چــووینەوە هــەمان شــوێنی پێشــوومان لــە دەواجنەکــەی خــواری کفــری بــۆ چــاوپێکەوتنەوەی کــاك عــەزیز بۆوەرگرتنەوەی‌وەڵامی هەندێ راسپاردەی ئێمە، شەو درەنگانێك گەڕاینەوە سێ قازانە.

## ١٩٨٩/٧/١٧

لەگەڵ کـاك حەمەڕەشـدا کاتـژمێر ١٠ ی پـێش نیـوەڕۆ لـە سـێ قازانـەوە بـەرەو سـەرەوە بـەڕێ کـەوتین تووشـی کۆمـەڵێك منـاڵی کفـری بـووین ئـەوان ئێمــەیان نەئــەدی دیــارە بــە بۆنــەی ڕۆژی ١٧ ی تــەموزی جــەژنی بەعســەوە هاتبوون بەو ناوەدا ئەگەڕان بە شوێن بەچکە کورکوڕدا، ئێمە ڕێـڕەوی خۆمـان گۆڕی تا نەمانبینن نەکو ئاگاداری دوژمـن بکەنـەوە لـە ماوەیـەکی کەمـدا هێـزی گەورەیان ئەهێنایە سەرمان‌و تـووش ئـەبووین‌و حەشـارگەکەشمان ئەدۆزرایـەوە چونکە ئێمە بۆ شوێنەونکێ ئەو پەنایەمان هەڵبژاردبوو لە نزیك باوەشاسـواری کفرییەوە کە دوژمن گومانی نەئەکرد لەوناوەدا هەڵبکـەین. شـەوەکەی چـووینە نزیکی دێی هەزار کانی شێخ کاکە حەمـە، بـۆ بەیانییەکـەی هەندێ‌وێنـەمان لـە گەڵ کاك حەمە ڕەشدا گرت بـە یـادی کاکـە شـێخ حسینی هـەزارکانی کـە نـەك هــەر مــن بــەڵکو زۆربــەی برادەرانمــان یــادەوەری زۆریــان لــەم دییــەدا هەیــەو دۆستایەتیمان لە گەڵ کاك شێخ حسیندا هەبوو، هەمیشە بە ڕووە گەشەکەیەوە پێشوازی ئەکردین. لە ئەنفالەکاندا هەڵوێستێکی مەردانـەی هـەبوو، هەنـدێ لـە جاشە خزمەکانی هەوڵیاندابوو دەربازی بکەن بەڵام قایـل نـەبوو بـوو بـە تـەنیا هــەر خــۆی دەربــازبێ. داوای کردبــوو لــە فەرمانــدە ســەربازییەکانی ڕژێــم خەڵکەکەش ئازاد بکرێن. ئەوان بەمە قەڵس بوو بوون‌و بـە یـەکجاری بردیـان‌و ئیتر نەهاتەوە.

لەوێشــەوە ڕۆیشــتین بــۆ شــەوەکەی گەیشــتینە لای زاوتو چــووینە پەناگاکەی هاوڕێ سەید محەممەد کە بە قەد چیای داری خلەوە بـوو، ڕووی لـە کەلار بوو، لەوێ هەندێ خواردنیان بۆ کردین پڕ لە گووە مشكو مێشوولە بـوو. تووشی حەساسیەتی کردمو خەریك بوو بمرم. شەو سەید هەر خـەریکی جیهاز کـردن بـوو پـێموت: هـاوڕێ سـەید ئـەوە بـەم شـەوە درەنگـە جیهـاز بـۆ کـێ ئەکەیت..؟ووتی بۆ برادەرانی ڕێکخستنی نـاو شـار، هەندێ مەوعیـدم لەگـەڵیانا هەیەو خەبەری هاتنی ئێوەشیان ئەدەمێ کەچی جیهازەکـەی نـاو شـار نەهاتنـە سەر مەوعید.دوایی زانیم ئەو جیهازە لە ناو مونەزەمەی کەلاردا دانرابوو، ئـەو کابرایـەی جیهازەکـەی لابـوو پەیوەنـدی بـە یـەکێك لـە دەزگـا داپڵۆسـێنەرەکانی ڕژێمـەوە هـەبوو. لـە میانـەی قسـەکردنماندا هـاوڕێ سـەیدووتی: چـاویلکەکەم شـکاوەو بـە تـەمام سـەرێکی نـاو شـار بـدەم. پـێموت: بـۆ لەگـەڵ برادەرانـدا ناڕۆیتــەوە ئێــران هــەم پشــوویەك ئــەدەیتو هــەم چــاویلکە درووســت ئەکەیت،ووتی: هەرئەچم بۆ ناو شار.ووتم: بە شایەتی بـرادەران مـن پـێم بـاش نییـە بچیتو خۆشـت لـە هـەر گرفتێـك بەرپرسـیار ئـەبیت، ٣ ڕۆژ لای هـاوڕێ سەید محەممەد ماینـەوە پاشـان بـەرەو دێـی قولیجـان ڕۆیشتینو لەوێشـەوە بـۆ بنکەکەی خۆمـان لە ئاژداخ.

**١٩٧٨/٧/٢٣**

مـەفرەزەی دووەممـان کـە لـە ئێرانـەوە بـە ڕێکـەوتبوون بـۆ گـەرمیان گەیشتنە دێی زەردەلیکاو.

**١٩٨٩/٧/٢٦**

کۆپتــەرەکانی ڕژێــم بــە ئاسمــانی ناوچــە چــۆڵەکانی ناوچــەکەدا ئەسووڕانەوەو ڕۆژی دواتر هێزەکانی دوژمن کێومالیان دەستپێکرد.

## ١٩٨٩/٧/٢٨

كێوماڵ بەردەوام بوو.

## ١٩٨٩/٧/٣٠

دوژمن گەیشتە مەسۆیی سەرچەمەو بناری پێنج ئەنگوستو هەر ئەمرۆش برادەران حەمە ڕەشو سەید جەوهەرو کەریم چاوڕەش بە هێزەکانیانەوە بۆ دیوی ئێران گەڕانەوە کە یەکەمجار بوو لە دوای ئەنفال سەرئەکەوتنە سەرەوە بۆ پشوودانو بینینی کەسوکارو ماڵو مناڵو دۆستو برادەران.

## ١٩٨٩/٧/٣١

کێوماڵ هەر بەردەوام بوو من هێشتا شارەزای ئەو دۆخە نەبوو بووموامئەزانی کێوماڵ ماوەیەکی کەمی پێئەچێو ئینجا دوژمن ئەگەڕێتەوە.وام بە چاکزانی بچینە قەڵبەزەکەی ڕەحیم لە خۆرئاوای کۆیك، گوایە ئەو شوێنە چۆڵەو دوژمن پێی ناگات بەڵام دوژمن کە دەرئەچوو هەموو شوێنەکانی بەهێزی پیادە ئەتەنیو لە ئاسمانیشەوە کۆپتەر ئەسووڕایەوە.

## ١٩٨٩/٨/٣

دواتر گواستمانەوە بۆ قەڵبەزە رووخاوەکەی نێوان مەلاهۆمەرو سپێسەرو فەقێ مستەفا، لە دوای ئەنفال دەڵە سەگێکی تیا تەرەکی بوو برادەران ناویان نابوو دەڵەکە.

## ١٩٨٩/٨/٤

چووینە مەسیفەکە بۆ لای مەلا سەعید لەوێشەوە ئاخەو هەندێ برادەر چوون بۆ خانووەکەی کاك کەریم چاوڕەش بۆ هێنانی هەندێ ئازووقە.

## ١٩٨٩/٨/٦

چەند ڕۆژێك بوو ڕۆنمان لێ بڕابوو ئاخەووتی: من لە ساڵی ١٩٨٨ لە دەوری مەسۆیی لە شوێنێکدا قووتوویەك ڕۆنم قایم کردووە سەرقاپی نەبووە ئەچم ئەیهێنم. چوو ڕۆنەکەی هێناو هاتەوە. ئەو قووتووە ڕۆنە دوو ساڵی بە سەرا تێپەڕیبوو پێزی نەمابوو لەبەر خۆر سپی هەڵگەڕابوو لە بەرنەبوونیو پێویستیش چێشتێکمان لێکرد بۆ ژەمی دووەم کە کەوچکمان لێدا جرجێك دەرکەوت کە کەوتبووە بنیەوە، تووکی پێوەنەمابوو هەر گۆشتە سوورەکەی مابوو، برادەران ئێڵنجیان ئەداوەزعیان خراپ تێکچوو منیش دڵم دانەوەو پێموتن: ئێمە تازە ڕۆنەکەمان خواردووەو هەزممان کردووە ئیتر ئێڵنجی چیتانە..؟.

## ١٩٨٩/٨/٧

چووینە کانی دڕکەو لەوێوە چووینە سێ قازانەی لای کاك عوسمان بۆ ئازووقەو کەلوپەلی پێویست کە لە شارەوە بۆمان هاتبوو. دوای ٣ ڕۆژ گەڕاینەوە.

## ١٩٨٩/٨/١٠

گەیشتینەوە دەڵەکە دوژمن زۆر بە توندی کێومالی سنوری کۆیکی ئەکرد. هێزەکەی دوژمن زۆر بوو زۆر بەووردی ئەگەڕان تەنانەت سەگیشیان پێبوو، بە دەیان کۆپتەر ئەسووڕایەوە.

## ١٩٨٩/٨/١١

هێزەکەی دوژمن نزیك بووەوە لێمان لەوە ئەترساین بە هۆی سەگەکانەوە پەیمان پێ ببەن. بە تەما بووین شوێنەکەمان بە جێ بهێڵین. ڕۆژیش هێشتا زۆری مابوو. ناکاو کاتژمێر ٢ ی پاش نیوەڕۆ ئەو هێزەی دوژمن پاشەکشەی کردو ناوچەکەی بە جێهێشت، نەشمانزانی بۆچی گەڕانەوە.. دوای

ئەوان ئێمە چووینە خوارەوە بۆ کۆیك لەو شوێنانەی کە هێزەکانیان بۆ پشوودان مۆڵیاندابوو خواردنی قووتووکراوی زۆریان لە دوای خۆیان بە جێهێشتبوو هەموویمان کۆ کردەوە، تەنانەت شووتیشیان بە جێهێشتبوو برادەران لێیان خوارد من خۆم لێم نەخوارد نەکو ژاراوی کرابێ. نەمانئەزانی بۆ ئەو خواردنانەیان بە جێهێشتووە، لەوانەیە بۆ بارسووکی فڕەیان دابێ یان خەڵکێکیان هەبێ هەستیان کردبێ پارتیزان لە ناوچەکەدا هەبێووەکو مەسەلەیەکیویژدانی ئەو خواردنانەیان دانابێ تاکو دەست ئەو پارتیزانانە بکەوێ.

## ١٩٨٩/٨/١٣

لە دەڵەکەوە گواستمانەوە بۆ هەژاراوا. ئەمە ئەشکەوتێکی سەختبوو کاك حەمە ڕەش دۆزیبوویەوە هەموو کەس نەیئەتوانی بچێتە ناویەوەو دوژمن پێی نەزانیبوو، لەبەرئەوی خەڵکێکی بێنەواو هەژاربووین لە ڕووی سامانو داراییەوەو بە بەراوورد لە گەڵ ژیانی هایلافی خەڵکی خواپێداوی ئەم دنیایەلەم هەلو ساتانەدا ئەم ئەشکەوتە ناونرابوو هەژاراوا.

## ١٩٨٩/٨/١٣

لە دوای ڕۆیشتنی کاك حەمەڕەشو برادەران بە جیهازە گەورەکە پەیوەندیمان بە مەکتەبی سیاسییەوە کرد.

## ١٩٨٩/٨/١٤

کاك عوسمان بە جیهازە بچووکەکان هەواڵی دەستگیرکردنی هاوڕێ سەید محەممەدی پێداین کە لە کەلار ڕۆژی ١٩٨٩/٨/٢ بە پێی پیلانێکی داڕێژراو ئەنجامدرابوو.

## ١٩٨٩/٨/١٦

دوای دڵنیا بوون لە هەواڵەکەی هاوڕێ سەید محەممەد بە جیهازی گەورە ئاگاداری مەکتەبی سیاسیمان کردەوە.

## ١٩٨٩/٨/١٧

لەگەڵ برادەران میقدادو سوهاد دا بەرەو شاخەکەی پشتی قەڵای تەپەگەڕوس بەڕێکەوتین، ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە ناو کەلاوەکانی دێی قەڵاو شەو سەرکەوتین بۆ شۆڕاوەکە کە ئەکەوێتە قەد پاڵی شاخەکە.

## ١٩٨٩/٨/١٨

لەو شاخە بە شوێن ئەشکەوتێکدا ئەگەڕاین کە سەرەتای درووستبوونی مەفرەزە سەرەتاییەکانی (ی.ن.ك) لە قەرەداغو گەرمیاندا کرابووە کتێبخانە، کتێبو بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی تیا دانرابوو. لە کاتی گەڕاندا کاتژمێر ١٢ ی نیوەڕۆ میقداد بانگی کرد: ئەوە زەلامێکی جل ڕەشە. ئیتر ئێمە کەوتینە چاودێریکردنی ئەو زەلامە بینیمان چووە سەر ئاوێكو گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی، بۆمان دەرکەوت جاش دەرچوونو خۆیان بۆ چاودێریکردنی ناوچەکەو دۆزینەوەی پێشمەرگە حەشارداوە.ئێمە گوێمان نەدایە ئەو جاشانەو بەردەوام بووین لە کارەکەی خۆماندا لە هەمانکاتیشدا هەر چاودێریمان ئەکردن. میقدادووتی: ئەمە شوێنێکی زۆر باشە. کە چووین تەماشامان کرد شوێنێکی سەختبوو لە هیچ لایەکیشەوە نە ئەبینرا مەگەر یەکێکی شارەزا بیزانیایە ئەمە ئەشکەوتە ئەوەندە فراوانبوو جێگەی ١٠٠ کەسی تیا ئەبووەوە کە تەماشایەکی خوارەوەمان کرد بینیمان جاشێکی تر کەوتە گەڕانو بەرەو لای خوارەوەی دێکە ڕۆیشت، کە شەو ئێمە لەوێوە سەرکەوتبووین دیار بوو ئەو جاشە شوێن پێی ئێمەی دۆزیبووەوە یەکسەر گەڕایەوە بۆلای جەماعەتەکەیو یەکێکی تری لە گەڵ خۆیدا هێنا کە جلی سەربازی لە بەردا بوو بۆ سەیری

شوێن پێکان. لەوە ئەچوو ئەوە ئیستخبارات بووبێ، بە شوێن پێکانـدا ڕۆیشتن ماوەیەك لە دێکە دوور کەوتنەوە،واپێئەچوو شوێن پێکانیـان لێ وونبووبێ. لـە بەرئـەوی سـەرووی دێکـە بـەردەلانی بـوو نەیانئـەزانی بـەرەو چـی لایـەك ڕۆیشتووین. دوای ئەوە ٢ سەربازی تریش هاتن بۆ لایان و پێکەوە چوونە پشتی دێکە کە پێـی ئـەوترێ سـەربانی تەپەگـەڕوس، لـەوێ بـە جیهاز پەیوەنـدییان ئـەکردو ئاگرێکیشـیان کـردەوە پـووش و پـاوەنی ئـەو ناوەیـان سـووتان، دوایی گەڕانەوە بۆ ناو دێی ڕووخاوەکەو دارێکی زۆریـان کـۆ کـردەوەو ئاگریـان پێوەنـا تاوا لە پێشمەرگە بگەیەنن هەر ئەو شوێنە هێـزی تیایـە بـەلام ئـەوان دیـاربوو بەرنامەی بۆسە دانانیان هەبوو ئینجا هەموو کۆبوونەوە کە گەیشتنە ٢٥ کەس. تـا ئەمـەیان کـرد دنیـا بـەرەو تـاریکی ڕۆیشـت، ئینجـا چـاومان پێوەبـوو بـەرەو دەربەندەکـەی پشـتی تەپەگـەڕوس چـوون، دیـارە پێیـان وابووە پێشـمەرگە گـەر هەبێ لەو دەربەندەوە هاتوو چۆ ئەکەن. ئێمەش لـە خـوار بۆسـەکەی ئەوانـەوە دابەزین و گەڕاینەوە بۆ لای برادەران لە ئاژداخ.

## ١٩٨٩/٨/٣١

٢ کۆپتەر هاتن بە نزمی ئەفڕین، یـەکێکیان زۆر بچـووك بـوو لاشـەکەی زۆربەی لە شووشە درووست کرابوو قەت لەو جۆرەمان نەبینیبوو.

## ١٩٨٩/٨/٣٥

کـاك ئەحمـەدی حـاجی ڕەشـید برووسـکەیەکی بـۆ کـردین کـە شـاکری ئامۆزای گەیشتووەتە ناوچە چۆڵەکانی گەرمیان، دیارە لە لایـەن ڕژێمـەوە زۆری لێکرابوو بۆ سۆسەکردنی پارتیزانەکان، لە لایەن مەفرەزەکـەی کـاك عوسمانـەوە گیراوەو داوای ئەکرد سزای گوللە بارانکردنی بە سەرا بدرێت. کـەم کـەس هەیـە لە ڕوانگەی نیشتمانپەروەرییەوە بەو جۆرە بڕیار بداتو لە سۆزی خزمایەتیو کەسایەتی دوور بکەوێتـەوە مەگـەر کەسـە شۆڕشگێڕەووشیارەکان. هەرچـەندە کـاك ئەحمـەد خوێنـدەواری نـەبوو بـەلام وەکو تێکۆشـەرێکی قـالبووی بـواری

خەبات لە پلەیەکی باشی لە خۆبردوویی‌و تێگەیشتوو لە ئەرکەکانی سەرشانی دابوو ئەمەوای لێکردبوو لە بڕیاردانـدا جیاوازی نـەکات کەسی خـۆی بـێ یـان بێگانە. لەو ڕوانگەشەوە بـوو کـە دژی ئامۆزاکـەی خـۆی بـوو تۆزقاڵێـك بـەزەیی پیایا نەهاتەوە.

## ١٩٨٩/٨/٢٦

بـە جیهـازە ڕاکاڵەکـە خـەریکی پەیوەنـدی کـردن بـووم لـە گـەڵ سەرکردایەتیدا لە ناکاو کۆپتەرێك زۆر بە نزمی بەسەر شوێنەکەمانا تێپەڕی. پێش ماوەیەکیش بوو ڕێکخراوی سلێمانی ئاگاداری کردبووینـەوە کەوا دوژمن بـە جیهـازی ڕازێـت ئـەتوانێت شـوێنی جیهازەکـەمان ئیسـتیمکان بکـات، ئـەبێ زۆروریای خۆمان بین‌و لە کاتی پەیوەندیکردندا کەم‌و کورت قسە بکرێ.

## ١٩٨٩/٨/٢٧

کاتژمێر ٥ر٩ ی سەر لە بەیانی ٤٠ جاشی خۆفرۆش هـاتن بـۆ دێـی پێـنج ئەنگوستی شێخ مستەفا، گوێدرێژیان پێبوو یەکێك لە جاشـەکان گوێدرێژەکـەی بردە پەنایەکی کەلاوە ڕووخاوەکـانی دێکـە کـە مەرقـەدی شـێخ مسـتەفای لێیـە، خەریکی ئەووولاخە بەستە زمانە بوو، زۆر جار خەڵکی لادێ‌و تەنانەت شاریش ئەم نەخۆشییەیان هەیە کە نەتوانن لەگەڵ ڕەگەزەکەی خۆیاندا ئارەزووەکانیان جێبەجێ بکەن پەنا ئەبەنە بەر ئاژەڵە جۆراوجۆرەکـان کـە کـەر لـە هەموویان ئاسانتر دێتە دەستەوە. لەوانەیە بە لای خەڵکی سادەوە ئەمە کارێکی ئاسایی بێ ئەگـەر لـە دەشـتێکی چـۆڵو هۆڵـدا ئەنجامبـدرێ بـەلام لـە پـەنا مەرقـەدی پیاوچاکاندا ئەوە کارێکی ناپەسەندەو تۆڵەشی لە دوا ئەبێ کە چـی ئـەو جاشـە ناپەسەندە بێشەرم کردن‌و بێگوێدانە هەموو دابو نەریت‌و شەریعەت لەو ئاژەڵە داماوە حەزە پیسەکەی خۆی تێر ئەکرد.

## ١٩٨٩/٨/٢٩

جارێکی تر هەڤاڵ مام جەلال کادیرەکانی یەکێتی کۆکردەوەو مەسەلەی بەردانی مەلا بەختیاری خستبووەوە بەردەمیان: ئەمجارەیان لێدوانێکی کەم کرابوو لەسەر ئەم خاڵانە:

١. گرتنیو بڕیاری کوشتنەکەی مردنێکی سیاسی بوو پێویست بە کوشتنی جەسەدی ناکات.

٢.مەلا لەمەولا خیانەت ناکاتو تەسلیمی عێراقیش نابێتەوە، مەترسی لەسەر ڕێکخستنی خەڵکیش نییە.

٣.هیچمان لەسەر ناڵێ کەووتیشی گرنگ نییەو ڕەت ئەدرێتەوە.

ئیتر دوای ماوەیەك ئازاد کراو پەروەندەی مەسەلەکەی داخراو گەیشتەوە ناو برادەرەکانی لە ڕاژان. ئەگەر چی ئاستەکان لە دوای ئازادکردنی مەلاوە دوو لایەنی لێپەیدا بوو لایەکیان دژی بوونو لایەکی تریش پشتیوانیان لێئەکرد.

## ١٩٨٩/٨/٣٠

دیسانەوە کۆپتەرێك لە کاتی پەیوەندی کردندا بە سەر شوێنی جیهازەکەماندا زۆر بە نزمی ڕەتبوو ناچار بووین پەیوەندییەکەمان ببچڕین.

## ١٩٨٩/٩/١

ڕادیۆی ئیسرائیل لە هەواڵێکدا باسی پیاوێکی ئێرانی کرد بە ناوی زەینەڵی خەڵکی شاری ئەراك لە تەمەنی ١٢٣ ساڵیدا ئەیویست ژن بهێنێ کوڕە گەورەکەی تەمەنی ٨٥ ساڵ بوو، ٦٥ نەوەی لە کوڕو کچو کوڕەزاو کچەزا هەبوو.

## ١٩٨٩/٩/٢

هەواڵی تەقینەوەی کارگەی تەسنیع عەسکەریمان دایە مەکتەبی سیاسی کە لەلایەن ڕێکخستنەوە هەواڵەکەیان دابووە کاك عوسمانو ئەویش بە جیهازی بچووك ئاگاداری کردینەوە، ئەم هەواڵە لە بەغداوە زۆر بە پەلە گەیەنرایە ڕێکخستن تاکو ئاگاداری سەرەوە بکرێتەوە.

## ١٩٨٩/٩/٣

لە قەد شاخی ئاژداخ دانیشتبووم بە دووربین تەماشای ناوچەکەم ئەکرد یەك بە یەك چاوم ئەخستە سەر دێهاتە کاولکراوەکانو کەوتمە ناو گێژاوی ئەندێشەیەکی قووڵ، گەڕامەوە بۆ زەمەنێکی کۆنتر کە دێهاتەکان هەموو پڕ ئاوەدانی بوو، خەڵکی جمەی ئەهات کە چی لە پڕێکا قەلەڕەشکەی بەعسیان قیرانـدیو هەموو شوێنێ بوو بەوێرانە خەڵکەکەش کەس نەیزانی چیان لێهات..؟!

کەچی ئێمە لەم کونە ئەشکەوتو بن قەڵبەزو گاشە بەردانەدا هەمیشە ئازاریوونبوونی ئەوان ئەچێژین، لەو چۆڵەوانیەدا ئەمانەوێ بەشێکی ئەو ئەرکەی لە ئەستۆمان گرتووەو بەڵێنمان بە خەڵکی داوە تا دوا هەناسە خەبات بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانمان بکەین.

## ١٩٨٩/٩/٦

کاتژمێر ٨ ی بەیانی بوو ئاخە چوو بوو سەری گوێدرێژەکە بدات کە لە دوور قایمی کردبوو نەکو کۆپتەر یان جاشو سەربازی دوژمن بیدۆزنەوە کە گەڕایەوەووتی: گوێدرێژەکە خەریکە ئەزێت، منیش ئازاد قەرەوڵسیم بانگ کردو پێمووت: بچۆ ئەگەر گوێدرێژەکە زابوو جاشەکەی بکوژە.

وەنەبێت بەزەییمان بەو ئاژەڵە بەسەزمانەدا نەهاتبێتەوە بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە ئەو جاشە کەرە کێشەی بۆ دروووست ئەکردین‌و بۆمان دابین نەئەکرا لە شاردنەوەدا کە ئەبووە مایەی ئاشکراکردنمان بۆ دوژمن. بۆیە ناچاربووین لە ناوی بدەین هەرچەندە کارێکی ناخۆشیش بوو پڕ بە دڵ ئازارم پێگەیشت. ئەوەتا ئێمە بەزەییمان بەم ئاژەڵەدا دێتەوە گەر بە ناچاری‌و لەبەر هۆکارێکی ڕەواش لە ناوی بدەین بەڵام بەعس بە سەدان هەزار مرۆڤ ئەکوژێ‌و بە زەماوەندی ئەزانێ‌و دڵی تۆزقاڵێك گەردی خەم نایگرێ.!

ئازاد چووبوو لە بەرچاوی کەرەکە فیشەکێکی نابووە جاشەکەوەو تۆپیبوو کە ئەمە کارێکی خراپبوو لە نەزانینەوە ئەنجامیدابوو ئەبوایە دووری بخستایەتەوە. دواتر ئاخە سەرێکی لە کەرەکە دابوو تەماشائەکات کەرەکە لووتی نابووە سەر لاشەی جاشکەکەی‌و گیانی دەرچووبوو. تەماشاکەن ئەو کەرە بێزمانە چەندە بە بەزەیی بووە بۆ بەچکەکەی کەچی جاشەکانی کورد خۆیان ئەبنە کەواسووری بەر لەشکری سوپای داگیرکەر خەڵکی خۆیان لە دێهاتەکانی باوباپیریان تەنانەت ڕووخاندنی ماڵەکانی خۆشیان‌و دەسگیرکردنی کەسەکانی خۆشیان کە تا ئێستاش چارەنووسیان دیار نییە بێنەوەی بە قەد ئەو کەرە بەزەییان هەبێ.

## ١٩٨٩/٩/١٣

بە سەردانێك کەوتینە ڕێ بۆ لای کاك کوردۆ.

## ١٩٨٩/٩/١٣

بەدەم ڕێگاوە بووم بۆ لای پەناگاکانی کاك کوردۆو برادەراتی تر ئەم برووسکەیەی هەڤاڵ مام جەلالم بە جیهازە بچوکەکان‌وەرگرت:

**لە / مام جەلال**

**بۆ/ مەحمود سەنگاوی**

(هەندێ میوان دێنە لاتان، ئەوانە میوانی منن، هەرچی لە تواناتانا هەیە، بۆیان بکەن).

میوانەکان لە جەماعەتی لەشکری بەدر بوون، بە کارو باری تایبەتی خۆیان ئەچوونەوە ناوەڕاستو خوارووی عێراق.

کاتژمێر ١٢ ی شەو گەیشتینە لای کاك کوردۆ لە سەلاجەکە کە شوێنێکی نادیارو فێنكو خۆش بوو لە نزیك دێی پاریاوڵە، میوانەکانیش کە لە لایەن برادەران سەلامی کوێخا عەزیزو مەحمودی مامە عەزەوە لە سنوری بەمۆوە گەیەنرانە پەناگاکانی سەرووی باونور کە کاك کوردۆو برادەرانی تری لێبوون.. ئەمانە ژمارەیان ٥ کەس بوون.

هەر چەندە لەو کاتەدا ئێمە خۆمانوەزعمان باش نەبوو دوژمن، گوشاری زۆری لە سەرمان بوو تەنانەت خەڵکی ناوشاریش هەمان گوشاریان لە سەر بوو نەخوازەڵا کۆمەڵێك میوانیش بنێردرێن بۆ ڕەوانە کردنیان بەرەو خوار بێئەوەی تووشی شتێك ببن چونکە بە ئەمانەت نێردراون ئەبێ لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی ناوشارەوە تەگبیریان بۆ بکرێ.

## ١٩٨٩/٩/١٤

دەمەو بەیان کاك حەمە پاریاوڵە گوێدرێژەکانی برد بۆ شوێنێکی دوورتر قایمیان بکات. پێش خۆر کەوتن خەبەرم بووەوە، کاك حەمە پاریاوڵە هاتەوە هەندێ شڵەژانی پێوەدیار بوو کە پێشتر ئەوەم لێنەبینی بوو.

پێیووتم: هەستە خۆت بپێچەرەوە

ووتم: بۆ.. چی قەوماوە..؟

ووتی: دەورمان بە دوژمن گیراوە.

بێئاگابووین لەوەی کە شەو هێزێکی گەورەی دوژمن بە چەندین زرێپۆشەوە هاتبوونە ناوچەکە بۆ کێومالْ کردنو گەڕان بەدوای پێشمەرگەدا. تاکو خۆمان پێچایەوە دەنگی کۆپتەریش پەیدا بوو، سەربازەکانیش لە بەرزاییەکانی دەروبەرمان دەرکەوتن. سروشتی ناوچەکەوابوو کە هەموو گردو بەرزاییەکانی زیخو بەردەلانی بوو کەس ناتوانێ لەو بەرزاییانەوە دابەزێتە ناو دۆڵەکان بۆیە هەر بەسەرەوەدا ئەڕۆیشتن بە جۆرێك کە لە ١٠٠ مەتری ئێمەوە دوور بوون. خۆمانمان ئامادە کردبوو بۆ هەموو ئەگەرێك، میلی تفەنگەکانمان هێنابووەوەو نارنجۆکمان لە بەردەستماندا دانابوو هەرکە بێنە سەرمان هەموو شتێك یەکلایی ببێتەوە. میوانەکانیش بێ هیمەت نەبوون، چەکیان پێبوووەکو ئێمە خۆیان سازدابوو. کۆپتەرەکان ئەوەندە نزم ئەفڕین بەردوزیخی قەد پاڵەکان بە سەرمانا بەر ئەبووەوە.

کەریمی برای شەهید حەسەن ئای ئای هەر ئەیویست دەرچێتە دەرەوەو سەیری سەربازەکان بکات، لێی تووڕە بووم‌و پێم‌ووت: لە شوێنی خۆت دانیشەو مەجوڵێ با ئاشکرا نەبین. تاکو کاتژمێر ١٢ ی نیوەڕۆ کێومالْ بەردەوام بوو، زۆر جێگە گەڕان خۆشبەختانە نەهاتنە ناو دۆڵەکەی ئێمەوە. دوای ئەوە ئیتر هێزەکەی دوژمن کشایەوە. ئاسوودەییمان بۆ هات، زۆرتر پەرۆشی ئەوە بووین میوانەکانمان شتێکیان لێنەیەت‌و گلەییمان لێبکرێ کە کەمتەرخەمییەکمان دەربارەیان کردبێ. لە ڕاستیدا ئەمە ئەرکێکی قورسبوو چونکە ئەوان لە شوێنەکانی ترەوە نەیانئەتوانی بەو ئاسانییە دابەزن‌و بە سەلامەتی بڕۆن، ئەم ئەرکە کەوتە ئەستۆی ئێمە بۆ جێبەجێکردن.

کاتژمێر ٤ ی ئێوارە لەگەڵ کاك کوردۆو میوانەکاندا بەرەو پەناگاکانی سنوری کفری بەڕێکەوتین، شەوەکەی گەیشتتینە لای هۆمەر مل‌و لەوێ ماینەوە.

## ١٩٨٩/٩/١٥

ئەمرۆ لە ناو باخەکانی هۆمەرملدا بووین هەرچەندە جێگەیەکی پڕ مەترسییەو لە ٢ کم دووری ئەم شوێنەوە لە دەشتی سوور خەلیل دا فیرقەی ٥٥ ی زرێپۆشی سوپای عێراق هەڵیانـدابوو. ئێمەش ناچاربووین لەو ناوەدا بمێنینەوە، کە ڕۆژ ئاوا بوو بەرەو پەناگای سێ قازانە ڕۆیشتینو شەو گەیشتینە ئەوێ.

## ١٩٨٩/٩/١٧

کاک عوسمان خوا حافیزی لێکردینو لەگەڵ هەندێ لە برادەرانـدا بەرەو ئێران کەوتنەڕێ کە لە ساڵی ١٩٨٨ مابوونەوەو نەگۆڕابوون.

ئێمەش ئێوارەکەی چووینە شوێنی تایبەتیو چاومان بە برادەرانی ناوشار کەوت بۆ جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی برووسکەکەی هەڤاڵ مام جەلال لەسەر میوانەکان. دوای گفتوگۆکردن بۆ چۆنێتی جێبەجێکردنی کارەکان گەڕاینەوە بۆ پەناگاکەمانو مەوعیدی ڕۆژی ئایندەمان دانایەوە.

## ١٩٨٩/٩/١٨

جارێکی تر چووینەوە سەر مەوعیدەکەمان بۆ بینینی برادەرانی ڕێکخستن، دیسانەوە قسەمان لەسەر دانانی ڕێو شوێنی گواستنەوەی میوانەکان کردو بڕیاردرا بۆ سبەینێ برادەران بێن بۆوەرگرتنی میوانەکان.

## ١٩٨٩/٩/١٩

چووینەوە شوێنی مەوعیدەکەمانو برادەرانی میوانیشمان لە گەڵا بوو. برادەرانی ڕێکخستنی ناو شاریش هاتن کە یەکێکیان کاک حەمە نوری ئەحمەد بەسی بوو ئەوی تریشیان کاک سدیقی حاجی سەعیدی ناسراو بە هاوڕێ سوپا بوو، کە لە لایەن ڕێکخراوی سلێمانیو کاک جەباری حاجی ڕەشیدەوە کە بەناوی نهێنی حەسەن حسین نووسراوو نامەی بۆ ئەنووسین نێردرابوون.

لەوێ برادەران میوانەکانیان لێوەرگرتینو ئێمەش گەڕاینەوە شوێنەکەی خۆمان.

## ١٩٨٩/٩/٣٠

لە پەناگەی سێ قازانەوە بەرەو شوێنەکەی خۆمان لە ئاژداخ بەڕێکەوتین. هەر ئەمڕۆ ئێوارەکەی هەواڵمان پێگەیشت کە هەڤاڵ مام جەلال گەیشتبووە مەڵبەندی یەك لە دزلیو کۆبوونەوەیەکی فراوانی بە پێشمەرگەکان کردبوو لە سەر بارودۆخی کوردو کوردستانو بارودۆخی عێراقو ڕژێمەکەی، شەوو ڕۆژێك لەو سنوورە مابووەوە پاشان گەڕابووەوە، پاش ماوەیەك سەردانی تاران ئەکاتو لەوێشەوە گەشتێکی بۆ دەرەوە دەستپێکرد کەدیار بوو بۆ بەشداری کردنی کۆنفرانسی پاریس بوو کە ڕۆژی ١٩٨٩/١٠/١٤ لە پاریس بۆ ماوەی دوو ڕۆژ لەژێر ناونیشانی مافی کوردو ناسنامە فەرهەنگییەکەی بەسترابوو کە سەد کەسی جیهانی لە سیاسیو دیبلۆماسیو سەرۆکی ڕێکخراوە مرۆییو داکۆکیکەرەکانی مافی مرۆڤو چەند پەرلەمانتاریستو دۆستەکانی گەلی کوردو نوێنەرانی حیزبو ڕێکخراوە کوردستانیەکان بەشداریان کرد.

بیری بەستنی ئەم کۆنفرانسە لە لایەن ڕێکخراوی فرانس لیبرتی بە هاوکاری ئەنیستیتۆی کورد لە پاریس کە خاتوو دانیال میتران خێزانی سەرۆکی فەرەنسیو سەرۆکی ڕێکخراوی ناوبراو سەرپەرشتی کردبوو.

ئەوەی سەرنج ڕائەکێشێ لەم کۆنفرانسەدا:

- زانای سۆڤیەتی گەورە زاخاروف نامەیەکی بۆ کۆنفرانسەکە نووسیبوو لە بری ئەو خێزانەکەی خوێندبوویەوەو دەنگێکی باشی هەبوو

- خاتوو هیلنیا قاسملو بەشداری کردبوو.

- شەش ئەندامی پەرلەمان لە حیزبی سۆسیالیستی دیموکراتی گەلی تورکیا بەشداریان کردبوو کە ئەم جۆرە چالاکییە لە لایەن حکومەتی

تورکییەوە قەدەغەیە. بۆیە چارەنووسی ئەو ئەندام پەرلەمانانە دەرکردن بوو لە حیزبو پەرلەمان چونکە داکۆکیان لە کورد کردبوو

.وەفدێکی عێراقیویستی بچێتە ناو کۆنگرەکەوە کە لە هەندێ چڵکاو خۆری کوردی بەعسی پێکهاتبوون بەمەبەستی بەرگری کردن لە عێراق بەڵام بە هۆی نارەزایی توندی هەڤاڵ مام جەلالوەفدەکەی بەعس ناچار کشایەوەو نەیتوانی بگاتە مەبەستەکانی.

ـ خەڵکانێکی زۆر لە پەیامنێرو رۆژنامەنووسو نوێنەری ئاژانسو رۆژنامەکانی جیهانی تیا کۆبووەوە، رۆژانە دەنگو باسەکانیان بلاو ئەکردەوە.

ئەم کۆنفرانسە بایەخێکی گەورەی هەبوو کە بۆ یەکەمجارە لە رێگایەکی نێو دەوڵەتی یەوە کۆنفرانسێکیوا بۆ مەسەلەی کورد ببەسترێ، کوردەکان خۆیان تێدا ئامادەبن، داکۆکی لەسەر ماق بوونی خۆیان بکەن. ئەمەش لە کاتێکدایە پرۆسترۆیکا زەمینەی پەیوەندییە سیاسیو ئابووریو کۆمەلایەتییەکانی هەموو دنیای لەرزاندبوو.

کۆنفرانسی پاریس هاوارێك بوو لەویژدانی مرۆڤایەتییەوە بۆ ئەوەی چیتر چاوبەستەکی لە مەسەلەی کورد نەکرێو پیلانی دژ نەچینرێو یاری بە چارەنووسیەوە نەکرێ لە رێگای جینۆسایدەوە.

لە هەمووی گرنگ تر دوومەسەلەیە :

١. خڕبوونەوەی حیزبو رێکخراوە کوردستانیەکان لە دەوری ئەم کۆنفرانسەو یەك دەنگی لەسەر مەسەلەی کارکردن بۆ گەلەکەمان.

٢. سۆزو هەستی دۆستپەروەرانەی خەلکی هوشیارو پیاوە سیاسیو دیبلۆماسیەکانی دنیایە ئەوانەی بەرگری ماق مرۆڤو نەتەوە ژێر دەستەکان ئەکەن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا هەنگاوێکی بەرجەستەیە بۆ پاشەرۆژێکی رووناتر.

## ١٩٨٩/٩/٢٨

دوو جاش هاتنە بناری ئاژداخ لە نزیکی ئەشکەوتی کونە مارەگیرە، جلو بەرگەکانیان ڕەشبوو،وولاخێکیان پێبوو لەو ناوەدا ئەسووڕانەوە برادەران زۆر هەوڵیاندا بچن بیانگرن، ڕێگەم پێنەدان چونکە ئەبووە مایەی ئاشکرا بوونو شوێن گۆڕینیشمان.

## ١٩٨٩/٩/٢٩

٤ ئۆتۆمبیلی پڕ لە هێزی دوژمن کە ٢ لاندکرۆزەرو ٢ گازی ٦٦ بوون هاتنە دێی تەپە عارەب بۆ کێومالکردن.

## ١٩٨٩/٩/٣٠

ئازووقەمان کەمبووبووەوە ئاخەووتی: من ئەچم بۆ قولیجان هەندێ ئازووقەم لەوێ شاردووەتەوە ئەیهێنمەوە تا من ئەچمو دێمەوە ئێوەش لە سەر چەمی ئاوەسپی ڕاوەماسییەك بکەن. منیش ڕازیبووم، ئەوو د.هاوڕێ لێیاندا ڕۆیشتنو ئێمەش چووینە سەر چەمی ئاوە سپی لە نزیك کۆیك، ٣ گوللە هاوەنی ٨٢ ملمو ١ مینی شەخسیمان برد لە نێوان دێیەکانی مەسۆییو فەقێ مستەفادا دایبنێین بۆ ئەوەی بە ئۆتۆمبیلی دوژمندا لە کاتی دەرچوونیایا بتەقێتەوە. شەو لە چەمەکەدا خەوتین بەرەبەیان چووینە ناو زەلو قامیشەلانێك لە ناوەڕاستی چەمەکەداوەکو دوورگەوابوو خۆمان شاردەوە تا کاتژمێر ١٢ی نیوەڕۆ. کاك میقدادیشمان لە قەد شاخی ئاژداخ بە جیهازێکەوە دانابوو لە هەر ڕووداوێکی کوتوپڕ ئاگادارمان بکاتەوە. من لە ناو زەلو قامیشەکە دەرچووم تا کو هەندێ گەنم پەیا بکەم بیبەستمە پارچە تی ئێن تییەکەوەوەکو چەشە بۆ ماسییەکان، هەندێ گەنمم پەیدا کردو تی ئێن تیو تەرەقەکەم بەستەوایەرێکەوەو خستمە ناو دەڵقێكو فڕەمدایە ناو گۆمەکەوە

خۆم چوومەوە بۆ لای برادەران. کاتژمێر ٢ی پاشنیوەڕۆ دەنگوباسم لە میقداد پرسیووتی: ئارامە.

ئیتر تی ئێن تییەکەم تەقاندەوەو هەندێ ماسی باشی کوشتو کۆمانکردەوەو بەرەو کۆیك گەڕاینەوە بەرازێکمان تووشبوو ئەویشمان کوشت. هەم ماسییەکانو هەم بەرازەکەشمان پاککرد، تا ئێمە ئەمەمان کرد برادەران لە قولیجان بە ئازووقەوە هاتنەوە، بە ئازووقەو گۆشت ماسیو گۆشت بەرازەوە بەرەو پەناگەی فاسۆلیاکە گەڕاینەوە.

٣ مانگ ئەبوو گۆشتمان نەخواردبوو ئەو گۆشت بەرازە بە لامانەوە زۆر بەتامو بە لەزەت بوو ئێسقانەکەشمان کردە ناو شلەی فاسۆلیاوە کە پەیدامان کردبوو، برسیمان بوو، حەزمان لە گۆشت بوو،وەکو ئەڵێن برسێتی ڕەگی هاری پێوەیە ناچاربووین بیخۆین هەرچەندە ئەشمانزانی لە ڕووی شەرعەوە ئەم گۆشتە حەرامە بەڵام نازانم ئایا لە ڕۆژی تەنگاتەشدا هەر حەرامە..؟ ئەمەیان مەگەر مەلاکانوەڵامی بدەنەوە.

## ١٩٨٩/١٠/٣

٣ کۆپتەر هاتنە سەر دێهاتەکانی کۆیكو فەقێ مستەفا لەو شوێنانەی ئێمە ڕۆژی پێشوو ڕاوەماسیو ڕاوە بەرازەکەمان تیاکردبوو.

## ١٩٨٩/١٠/٦

٢ ئۆتۆمبیلی لاندکرۆزەری پڕ لە جاش هاتنە دێی سەرقەڵای پەنا سەنگاو.

## ١٩٨٩/١٠/٧

٣ ئۆتۆمبیلی جاش هاتنە دێی هەسەن کەنۆشو هەندێ جاشی تر گەیشتنە دێی درۆزنەو شەو لەوێ مانەوە.

## ١٩٨٩/١٠/٨

جاشەکان لە مەسۆیی بچووك بوونو چوونە چەمی مامرانو هەندێ جاشی تر ئاگریان بەردایە ئاشەکەی شێخ عەلی شێخ عیسا.

## ١٩٨٩/١٠/٩

هێزێکی زۆری سەربازو جاش هاتنە دێهاتەکانی خانی ڕۆستەم ئاغاو قولیجانو فەقێ مستەفاو لەویشەوە بەرەو باوەکر ڕۆیشتن.

## ١٩٨٩/١٠/١٠

هێزێکی دوژمن هاتە نێوان فەقێ مستەفاو مەسۆیی سەرچەمو چوونە کۆیکیش، کۆپتەرێکیش لە قولیجان نیشتەوە.

## ١٩٨٩/١٠/١١

هێزێکی دوژمن چووە بەکرە گەڕەو هەروەها نێوان خانوکانی عوبێدو زۆر بەووردی ناوچەکەیان ئەپشکنی.

## ١٩٨٩/١٠/١٣

هێزەکەی دوژمن دوای تەواو کردنی کێومالْ گەڕانەوەو ناوچەکەیان بە جێهێشت.

## ١٩٨٩/١٠/١٥

٢ ئۆتۆمبیلی جاش هاتنە دێهاتەکانی هێلانە قەلو هەسەن کەنۆشەکانو دووبراوو جامرێزو درۆزنە، دوای گەڕانو پشکنین گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان.

## ١٩٨٩/١٠/١٧

به داخێکی زۆرەوە هەواڵی شەهید بوونی مام ڕەئوفی حاجی سابیری برای کاکە حەمەی حاجی سابیرمان بیست کە فەرماندەیەکی قارەمانی تیپی ١٥ی هەورامان بوو، لە هاتنە خوارەوەماندا بۆ گەرمیان لە مانگی ١٩٨٩/٦ دا ڕۆڵی سەرەکی گێڕاو فرە ماندوو بوو.

## ١٩٨٩/١٠/٢٠

هێزێکی دوژمن هاتە نێوان دێهاتەکانی مەسۆیی بەرگەچو درۆزنەو چادریان هەڵداو لەوێشەوە دەستیان کردە کێومالکردنو ڕۆژی دواتر گەڕایەوە.

## ١٩٨٩/١٠/٢٤

هەندێ جاش هاتنە بانی دێی قادرئاواوو سوارو تانجیشیان لەگەڵ بوو کە پێنەچوو بۆ ڕاوەکەروێشك هاتبن.

## ١٩٨٩/١٠/٢٧

دابەزینە خوارەوەو چووینە قەڵبەزە قووڵەکەی چەمی شۆڕاوی دێی کۆیلك. کاتژمێر ١١ی نیوەڕۆ چووینە سەر ئاوەسپی بۆ ڕاوەبەراز.

## ١٩٨٩/١٠/٢٨

کاتژمێر ٥ ی ئێوارە چوومە ناو کەلاوەوێرانکراوەکانی دێکەی خۆمان ئەو شوێنەی کە زێدی منالیمە، لە پەنا کەلاوەیەکدا پاڵمدایەوەو تاس بردمیەوە. کەوتمە ناودەریای بیرەوەرییەکانی ڕۆژانی ڕابووردوو،وەکو فلیمێکم بۆ لێبدەن هەموو ساتەکانی ئەم تەمەنەم بە بەرچاوا تێپەڕی.. خزمەکانم، هاوڕێکانمو هەموو خەڵکی دێکەم بینییەوەو پەلاماریانم ئەداو دەستم ئەکردە ملیان،وەکو بڵێی ڕۆژانێکی جەژن بێو گەردن ئازادی بکەین. ئای ئەوکاتانە چەند خۆشبوو کە منالّ بووم لە هەڵبەزو دابەز نەئەکەوتم، ئاودێ چەندە قەرەباڵغو جەنجالّ بوو، دنیایەك پڕ لە کارو جموجووڵ سەرەڕای

کوێرەوەرییەکانی ژیان بەڵام مرۆڤەکانی خۆڕاگرو بەختەوەر بوون چونکە ئەیانویست بژینو لە خۆشی ژیان بگەن.. کە ڕاچڵەکیم. هەر تەنیا خۆم بووم زۆر دڵتەنگو مەلول کەسم لە دەور نەبوو. گریانێکی بە کوڵ سەری تێکردم کە هەژانێك بوو بۆ ئەو خەڵکەوونبووو ئەووێرانەخاکە. بە دڵێکی پڕ لە خەمینەوە شەوەکەی گەڕاینەوە پەناگاکەمان.

## ١٩٨٩/١٠/٣١

هەندێ جاش بۆ شەڕە خۆری هاتنە ئەشکەوتەکەی پشتی مرادەلی کە لەسەر شاخی ئاژداخەوە دابەزیبوون.

## ١٩٨٩/١١/١

برێك جاش هاتنە دێیەکانی مەسۆیی‌و درۆزنە، بۆ ئێوارەکەی ئێمەش بنەو بارگەمان بۆ هەژاراوا پێچایەوە.

## ١٩٨٩/١١/٣

لە ڕادیۆوە بڵاوکرایەوە کە ئەمرۆ لە سلێمانی بە بۆنەی هاتنی جەللادەکەی بەغدا شایی ئەکرێ. دڵنیام کەس نییە پێی خۆشبێ بە ئارەزوو لە پێشوازیکردن‌و هەڵپەڕین بۆ ئەم جانەوەرە بەشداری بکات جگە لە چڵکاو خۆرەکانی خۆی کە ژمارەیەکی کەمن. خەڵکی بۆ ئەم بۆنانە بە زۆر ڕاپێچی هەراو بەزم ئەکرێن. بووەتە داب لە چوونی جەنابی جەللاد دا بۆ هەرشوێنێك پێشوەخت ئامادەکاری بۆ ئەکرێ. ئەو جۆرە چوونانەی سەدام بۆ شارو شارۆچکەکان جگە لە گاڵتەجاڕی چیتر نییە. ئەو دەست ناخاتە سەر ئازاری ناخی خەڵکی‌و لە گرفتەکانیان ناپرسێتەوە، لە دەردو خەمەکانیان کەم ناکاتەوە، بەڵکو لە سەر شەپۆلی مەینەتییەکانیان زەماوەندی خۆی ئەگێڕێ. هەموو دیکتاتۆرەکانی دنیا لەوەدا یەك ئەگرنەوە کە زووخاو بکەنە گەرووی گەلەکانیانا، ساناترین شت کە بتوانن دابینی بکەن بۆ خەڵکی ئازادییە کە چی

هـــەرگیز بـــیری لێناکەنـــەوە. گەروانییـــە ئـــەی بـــۆ ئێمـــە لەمویرانـــەو ئەشکەوتانەداوەکو مرۆڤی سەرەتایی ئـەژین و لـە هـەموو مـافێکی سادەی ژیـان بێبەشین..؟!

## ۱۹۸۹/۱۱/٥

دوژمـن هاتـەوە ناوچـەکە بـۆ کێومـالکردن لای دێـی مامرانـەوە ئاگریـان بەردایـە کـەلاوەکان، پاشـان ٤ ئۆتۆمبیـل هاتنـە مەسـۆیی سەرچـەمو تەپەسـێو کارێزەو شەو چوونە پێنج ئەنگوست. ئێمە لـە پشـتیانەوە بـووین زۆر نزیکیان بووین. جاشەکان عەرەبێکیان لـە گـەڵا بـوو بـە عـەرەبی پرسیاری لـە جاشـەکە ئەکرد: ئێرە کوێیە..؟

جاشەکەش عەرەبی نەئەزانی ئەیووت: ئەمـە قەریـەی حـاجی ئەحمـەد. ئەم هێزە کاتژمێر پێنجی بەرە بەیان بۆ سەنگاو گەڕانەوە.

## ۱۹۸۹/۱۱/۸

دنیـا هـەور بـوو، پرووشـە بـارانیش بـوو. ئەمـە بـۆن و بەرامـەی زەوی خۆشتر کرد.

## ۱۹۸۹/۱۱/۱۳

لە ڕێگەی ئیزگەکانی جیهانەوە هەواڵی دەرکردنی یەك ملیۆن کرێکاری میسریم لە عێراقدا بیستو هەرچی سامانێکیان هەبووە لە بانکـەکانی عێراقـدا دەستی بەسەرا گیراوە، ئەم هەنگاوەی حکومەتی بەعس گێژاوێکی لە پەیوەنـدی نێوان عێـراق - میسـردا بـەر پـاکرد. کـە کـاتی خـۆی عێـراق بـە ڕەسمـی ئـەم کرێکارانەی هێنابوو بۆ مەبەستی تایبەتی کە بکرێنـە بەعسـیو بۆ پاشـەڕۆژ لـەووڵاتی خۆیانـدا دەسـت بـەکار بـن و لـە هـەمان کاتیشـدا کرێکاریووڵاتەکـەی خۆی بە تایبەتی کورد بێکار ئەهێشتەوە.

## ١٩٨٩/١١/١٤

ڕۆژێکی ساف‌و بێگەرد بوو بچووکترین پەڵە هەور بە ئاسمانەوە نەبوو، لە سەر ئاژداخەوە بورجی تەلەفزیۆنی کەرکوکمان بە دی ئەکرد، بە دووربینیش مەرقەدەکەی باوەشاسواری کفریمان ئەبینی.

## ١٩٨٩/١١/١٧

شەو چووین بۆ پەناگای دەڵەکە، لە ڕێگادا بارانێکی زۆر باری‌و بە تەواوی تەڕ بووین.

## ١٩٨٩/١١/١٩

٢ سەرباز دەرکەوتن ئەچوونە ناو دێی پێنج ئەنگوستەوە، خۆمان ئامادە کرد بچین بیانکوژین، تەماشامان کرد لە سەرووی دێکەوە ٤ سەربازی تروەکو بۆسە لە پشت سەری ئەوانەوەن، ئەمە پەشیمانی کردینەوە بچینە سەریان.

## ١٩٨٩/١١/٢١

ئۆتۆمبیلێکی سەربازی جۆری گازی ٦٦ کە ١١ سەربازی تیا بوو هاتنە ناو دێی پێنج ئەنگوستەوە، سەربازەکان هەموو داری مەرقەدەکەیان خستە ناو ئۆتۆمبیلەکەیان‌و بردیان. بیرم بۆ ئەوە ئەچوو جاران ئەیانووت: پیرانی تەریقەت تۆڵە لەو کەسانە ئەکاتەوە زاتبکەن دەستکاری شتومەکی مەرقەد بکەن، خەڵکە هەژارو نەخوێنەوارەکەوا چووبووە مێشکیانەوە کە دەستیان لێئەوەشێنن یان کوێریان ئەکەن.

ئەمەش بەڕای من دوو لایەنی هەبووە: یەکێکیان شێخ‌و پیاوەکانی تەریقەت‌وایان لە خەڵکی کردووە هەمیشە بە پیرۆزیان بزانن‌و لای موریدەکان‌و خەڵکیش سامێکیان هەبێ، ئەوی تریشیان خەڵکی هۆشمەند ئەم بەزمەیان دروست کردووە کە خەڵکی دەستکاری ئەو دارو دەوەنانە نەکەن بە ناوی

ئەوەی شەخسن، بۆ ئەوەی پارێزگاری لەو سامانە دارستانییە بکرێ بۆ ئابوری‌وولاتەکەمان‌و بۆ جوانی سرشتیش سوود مەندە.

## ١٩٨٩/١١/٢٤

کە زانیمان دنیا ئارامەو هیچ لە گۆڕێدا نییە ئێوارەکەی دابەزینە خوارەوە بۆ هەردەی نێوان زستانەو کۆیك‌و فەقێ مستەفاو مەلا هۆمەر بۆ ڕاوە سوێسك، هەم کاتەکە ئەکوژین‌و هەم بۆ گۆشتیش، مەخابن هیچمان دەستنەکەوت.

هەر ئەمڕۆ کاك عوسمان هاتە سەر خەت‌و ئاگاداری کردینەوە پەناگای هەژاراوا چۆڵ بکەین چونکە کاتی خۆی کاك حەمە ڕەش مەوعیدی لەوێ بۆ خزمێکی خۆی دانابوو، ئێستا خزمەکەی ئەزانێ کاك حەمە ڕەش لەوێ نەماوە لەوانەیە ئاگاداری دوژمن بکاتەوە. ئێمەش بۆ ئەوەی تووش نەبین مشووری ئەوەمان خوارد جێگاکەمان چۆڵبکەین.

## ١٩٨٩/١١/٢٧

ئەو ئاگادارییەی کاك عوسمان سەرقاڵی کردم، کاتی خۆی هەندێ خواردنەوەی بۆ بەجێهێشتبووم، دانیشتم بە بێ مەزە هەموویم خواردەوە تاکو هەندێ مێشکم ساف بێت. هەندێ جار پەنا بردنە بەر خواردنەوە کارێکی باشە بۆ ڕەواندنەوەی تەم‌و ناخۆشی‌و دوور خستنەوەی مرۆڤ لە دڵەڕاوکەو بێزاری.

## ١٩٨٩/١١/٢٨

کاتی خۆی لە پشتی دێی تەپەگەڕوس شوێنێکمان دەستنیشانکردبوو بۆ کاتی لێقەومان ناومان نابوو ئاغڵەکەی دکتۆر. لە سەر ئەو قسەیەی کاك

عوسمان هەموو برادەرانم ڕەوانەی ئەوێ کردوەکو ئامادەکارییەك بۆ هەر ئەگەرێك.

## ١٩٨٩/١١/٢٩

خۆم و ئاخەو برایمی خزمم لە هەژاراوا ماینەوە، بەووردی چاودێری دەوروبەری خۆمان و ناوچەکەشمان ئەکرد تاکو ئێوارە ئێمەش ئەوێ بە جێبهێڵین، لە ناکاو ئاخە پێیووتم:وەرە سەیرێکی ئەملا بکە. کە دیقەتم دا لە ڕۆژاوای چیاکەوە هێزێکی پیادەی دوژمن زۆر بە نهێنی بەرەو هەژاراوا دێن. ئێمە کۆمەڵێ شتمان پێبوووەکو جیهازی ڕاکاڵ بە مجەفیرەو تەجهیز قودرەوە خستمانە ناو کۆڵە پشتەکانمانەوە بە هێواشی لە ئەشکەوتەکە دابەزین، تا ڕۆژ ئاوا بوو هێزەکانی دوژمن لەوێ نزیك بوونەوە. کە دنیا تاریك داهات ئێمەش بەرەو ئاغڵەکەی دکتۆر ڕۆیشتین، لەو کاتەدا بە جیهاز لە گەڵ کاك سوهادو برادەراندا پەیوەندیمان کرد ئەوانیش ئاگایان لێبوو کە لایتێکی زۆر لە سەر شاخەوە دیارە. ئەو شەوە بە ڕێگاوە بووین کە گەیشتینە نێوان دەرەواری خوارووو تەپەگەڕوس بارانێکی بەخوڕ دایکردو دنیا زۆر تاریك و نووتەك بوو، ڕێگەمان وێڵکرد، کۆڵەکانیشمان گرانبوو، ناچار لە قەڵبەزێك لامان دا بەڵام لافاو دایبەسەرمانا بە پەلە خۆمان دەربازکرد تاکو ئاو نەمانبات.

## ١٩٨٩/١١/٣٠

بۆ بەیانییەکەی گەیشتینە ئاغڵەکەی دکتۆر، بەڵام نە نان نە ئازووقە نەمابوو، ئیتر ساوەرە لە بەرهێزی دوژمن خۆت قوتار بکەو باران و سەرما لێتبداو مەترسی لافاوبردنت لە بەردەما بێ وخواردنیشت نەبێ!

چونکو ئەرکێکی نیشتمانی و نەتەوایەتی بوو بە گیانێکی ئاسایی وەرمانئەگرت و لە برسێتیدا ئۆقرەمان ئەگرت. بگرە زۆر جار بە ناچاری سکمان هەڵئەگوشی و بە خەیاڵ خۆمان تێرئەکرد لە هەمان کاتیشدا مشورمان ئەخوارد بۆ پەیداکردنی خۆراکی پێویست.

## ١٩٨٩/١٢/١

دنیا زۆر سارد بوو. ئەڵێی کرێوە بۆ ئێمە هەڵیکردووە زۆریشمان برسی بوو هیچیش نەبوو بیخۆین. بە جیهازی بچووك پەیوەندیم بە کاك کوردۆوە کرد کەوەزعمان خراپەو هیچمان نییە ئەگەر بکرێ فریامان بکەون. بەو پەلە پەلەش نەمانئەتوانی بگەینە لای کاك کوردۆ چوونکە ٤ کاتژمێر لێمانەوە دوور بوو. کاك کوردۆ هیمەتی کردوووتی: بە سەر چاو بە کاك حەمە پاریاوڵە ئازووقە *بۆتان ئەینەرم*.

## ١٩٨٩/١٢/٣

برادەران: حەمە پاریاوڵەو هەڵکەوت ئازووقەیان پێگەیاندین شەو تا بەیانی باران لێی دابوون، بەڵام ئەم دوو کەڵە پیاوە گوێیان نەدابوویە.

لای ئێمە کاك حەمە ناونرا بوو پیاوی پۆڵایین، هەڵکەوتیش ماندوویی نەناس. هەر ئەمڕۆ کە بارانەکە نیشتەوەو کێوماڵ نەما برادەران بۆ ئازووقە چوون بۆ ئەشکەوتی فاسۆلیاکە.

## ١٩٨٩/١٢/٦

بە جیهازی ڕاکاڵ لەگەڵ م.عەلیو کاك عادل قسەم کرد لە هەواڵو باسی ئەو ناوەووەزعی پێشمەرگە پرسیاری دوورودرێژم کردو لە بارەی هەلو مەرجی پارتیزانیو کێوماڵی دوژمنووەزعی ئێرە باسم بۆ کردن.

## ١٩٨٩/١٢/٧

دنیا یەکجار ساردو تۆف بوو نەك هەر ئێمە سەرمامان ئەبوو کە هیچ هۆکارێکی خۆگەرم کردنەوەمان نەبوو بەڵکو هێزەکانی دوژمنیش کە لای جامرێزەوە بوون لە بەر سەرما ئاگریان کردبووەوەو لە دەوری کروشکەیان کردبوو گوایە ئەوان سوپای خاوەن دەسەڵاتو دەوڵەتن.

## ١٩٨٩/١٢/٨

ئێوارەکەی تەقینەوەیەك لە نێوان دەرەواری سەرووو کەوەڵەدا ڕوویدا نەمانزانی چیبوو،وا پێئەچێ لە کاتی ئەنفالەکەدا لەشکری بەدر کە بارەگاکەیان لە دەربەند دەرەوار بوو مینی زۆریان چاندبێ‌و ئێستا لێی تەقیبێتەوە بە سەربازو جاشدا.

لەو سەردەمەی کە لە ئاغڵەکەدا بووین میقداد تەڵەیەکی ڕێوی دۆزیبووەوە، هەموو ڕۆژێ ئەینایەوە بۆ ئەوی نێچیرێکی پێوە بێت کە چی هیچی نەئەگرت. بەیانیان کە ئەچوو بۆ لای تەڵەکەو بەدەستی بەتاڵ نەگەڕایەوە ئاخە قاقایەکی پڕ بەگەرووی لێئەداو ئەیووت: ها مام مەجید هیچت نەگرتووە..؟

مام مەجیدخازە خەڵکی تیلەکۆی قەڵەندەر بوو حەزی لە ڕاو بوو ڕۆژانە بە تانجییەکانیەوە بۆ ڕاوەڕێوی ئەچوو لە بەدبەختی ئەودا کەمجار نێچیری گیر ئەکەوت.

## ١٩٨٩/١٢/٩

میقدادوەکو هەموو ڕۆژەکانی تر چوەوە بۆ سەر تەڵەکەی خۆشبەختانە ئەمجارەیان دەڵەکێکی گرتبوو. هەر لەو دەشتە سەری بریبوو خستبوویە پشتییەوە کە گەیشتەوە لامان ئاخە قاقاکەی لێداوووتی: ها مام مەجید هەم هیچت نەکرد..؟ میقدادیش بێ سێ‌و دوو دەڵەکەکەی تێگرتو دای بە ناو قەدیا ئاخە ئیتر لە قاقاکەی کەوت‌و جێگەکەشمان ناو نا دەڵەکەکەی میقداد.

هەر ئەمڕۆش برادەران چوونە ماڵەکانی حەمەی هەواس لە قۆپی بۆ ئەوەی هەریەکە کۆڵێك بەڕوو بهێنن لە جیاتی نان بیخۆین. چوونکە ئازووقەمان کەم بووبووەوە، کە گەڕانەوە هەم بەڕوویان هێناو هەم برنجیش کە کاتی خۆی هی خەڵکی بووە لەو ناوەدا شاردوویانەتەوە، کەچی ڕسقێکمان لێپەیدا بوو بەڕووەکەی لێئەدزین تا فریا کەوتین زیانی زۆری لێداین.

چونکە پەیوەندیمان بە ڕێکخراوی سلێمانییەوە بە هۆی دابڕانی کاك ئەحمەد کولکنییەوەوەزعمان یەکجار خراپبوو،وامان بە چاکزانی خۆمان لە سەر هەندێ

خواردنی بەروبوومی دارو دەوەنیوەکو بەڕووو گوێزو ئەو شتانە ڕابهێنین تا دەروویەکمان لێئەکرێتەوە.

لەم جۆرە بارانەدا جاریواهەیە بیری دۆزەخی بە مێشکمانا دێ کە زۆر ناهەموارە، چونکەوەزعمان ناسکە هەموو شتێك ڕێی تێئەچێ ڕوو بدات. ئەو کاتە بیرمان لەوە ئەکردەوە ئەگەر ئێران - عێراق بە تەواوی ڕێکبکەون بەعس زیاتر ئەیپەرژێتە سەر جێبەجێکردنی نەخشەیوێرانکردنی کوردستانو دوور خستنەوەی خەڵکەکەی،وەکو زۆر جار بەعس بانگەشەی بۆ ئەکرد، لەو بارەدا ئیتر ئێمە هیچمان پێنەگات ئەبێ بەرنامەمان بۆ خۆڕاهێنان لە سەر ئەو جۆرە ئەگەرانە هەبێ. لە گەڵ ئەوەشدا هێشتا نەگەیشتبووینە ڕادەی نائومێدی، چەندە هەلومەرجەکە سەختبووبێ لە سەرمان ئەوەندە گەشبین بووین، مرۆڤی شۆڕشگێڕ نابێ نائومێد بێ گەروابێ مەرجێکی شۆڕشگێڕی لە دەست ئەدات.

## ١٩٨٩/١٢/١٢

باران ئەباری بە جیهازی ڕاکاڵ لە گەڵ کاك عوسمانوکاك عادل قسەم کرد.

## ١٩٨٩/١٢/١٣

باران بە توندی ڕەهێڵەی ئەکرد، ئەشکەوتەکەمان کەوتە دڵۆپەو خۆمانو هەمووشتەکانمان تەڕ بوون.

## ١٩٨٩/١٢/١٤

ئەندرێ زاخارۆڤ مامۆستای مافی مرۆڤ لە یەکێتی سۆڤێت کوچی دوایی کرد.کە خۆی ئۆپۆزسیۆنێکی ڕژێمی سۆڤێتی بوو.

## ١٩٨٩/١٢/١٥

هێزەکانی دوژمن هاتنە سەر چیای سەگرمەو لە پشتی ئێمەوە کە ئەکەوێتە پشتی ئەشکەوتی دەڵەکەکەی میقداد دەستیان کردە تەقە کردن. لە

شوێنێکدا ئازووقەمان دانا بوو دۆزیبوویانەوەو بە دیاریەوە دانیشتبوون بۆ ئەوەی گەر ئێمە بچین بۆ ئازووقە بکەوینە داویانەوە.

## ١٩٨٩/١٢/١٦

ئەمرۆش دوژمن هەر بەدیار ئازووقەکەوە بوو. حەمە چاوجوان بۆ لای کاك کوردۆ بە ڕێکەوت بۆ ئاگادار کردنەوەو تێگەیاندنی خراپیوەزعەکەمان لە ڕووی ئازووقەوە.

## ١٩٨٩/١٢/١٧

چووین بۆماڵەکانی حەمەی هەواس لە قۆپی، لەو ناوەدا هەندێ گەنمی پاکمان دۆزییەوە کە لە ئەنفالەکەدا لە خەڵکی بە جێمابوو، میقدادیش لە شوێنی شیوعییەکان کیسە خەوێکی باشی بۆ هێنام.

## ١٩٨٩/١٢/١٨

هێزێکی جاشەکان بە ئیفایەك و ٢ تیۆتاوە هاتنەدەرەواری خواروو شەویش لەوێ مانەوە.

## ١٩٨٩/١٢/١٩

کاتژمێر ١١ ی پێش نیوەڕۆ جاشەکان بۆ سەنگاو گەڕانەوە.هەر ئەمڕۆ لەگەڵ کاك بەرزان و کاك عوسماندا قسەمان کرد، کاك عوسمانووتی ڕۆژی ١٢/٢٦ دێین بۆ گۆڕینتان. ئێمە گۆڕینمان پێخۆشبوو چونکە پارتیزان لەوەها کەش و هەوایەکدا پێویستی بە پشوودان و جێکی تەندرووستی خۆی هەیە.

## ١٩٨٩/١٢/٢١

لە ئەنجامی گەڕانمان بەو شاخ و داخانەی سەگرمەدا لە پشتی شۆراوەکەی دێی تەپەگەڕوسدا هەندێ گۆزەمان دۆزییەوە کە لەسەر یەك دانرابوون بەڵام شاخەکەی بە سەرا ڕووخا بوو. لەو ناوەدا ٢ تیری کەوانمان دۆزییەوە یەکێکیان بە ئێسکی زەلامێکەوە بوو کە رزیبوو لەوە ئەچێ ئەو زەلامە بەو تیرە کوژرابێ، لە نزیکی ئەوەوە تیرەکەی تریشمان دۆزییەوە.وا پێئەچێ ئەم گۆزانە هی سەردەمانێکی زوو بێ و ئێمە نازانین هی کەیە، لەوەش

ئەچێ ئەوزەمانە خەڵکانێك هەبووبن لەو شوێنە سەختانە ژیابن کە لەوە ئەچێ یاخیبووەکان لە دەسەڵاتی ئەو سەردەمە ئەو شوێنانەیان کردبێتە مەکۆی خۆیان.

## ١٩٨٩/١٢/٢٤

میقداد چوو بۆتەپەگەڕوس و لە بن دارەکانی ئەوێدا قارچکێکی زۆری دۆزییەوەو هێنایەوە بۆ پەناگەکەو لێمان نا، ژەمە خواردنێکی بە تام بوو.

## ١٩٨٩/١٢/٢٥

لە سەرەوە ژمارەی جیهازێکیان داینێ بۆ پەیوەندی کردن لەگەڵ کاك عادل کە بڕیاربوو ڕۆژی ١٢/٢٧ بگاتە نزیك شاخی بەمۆو لەوێشەوە بپەڕێتەوە لامان بۆ گۆڕینمان.

ئەمڕۆ چێشتی یاپڕاخمان لە گەڵای ترشکەی ناو زەردەلیکاو لێناو قارچکمان تێکەڵکرد.شتێکی خۆش و بەلەزەتبوو.

## ١٩٨٩/١٢/٢٦

دیکتاتۆری ڕۆمانی شاوشیسکۆ لە لایەن خەڵکی ڕاپەڕیوی ئەووڵاتەوە لە سێدارە درا. ئەمە چارەنووسی هەموو دیکتاتۆرێکی دژی خەڵکییە. ئاواتی هەموو کوردیش ئەوەیە ڕۆژێك دیکتاتۆرەکەی عێراق ببینین لەو بەرزی دەسەڵاتە زلهێزەیەوە غلۆر بێتەوە ژێر پێی خەڵکی چەوساوەی عێراق و کورد بە تایبەتی.

## ١٩٨٩/١٢/٢٧

جاشەکان هاتنە دەرەوارو شەو بۆ خۆیان لەوێ مانەوە. ئێمە هەر چاوەڕوان بووین کاك عادل پەیوەندیمان لەگەڵا بکات بەڵام هەر دەنگی نەبوو.

## ١٩٨٩/١٢/٢٩

ئەو برادەرانەی کەوتبوونە رێ بۆ ناوچەی بەمۆ لە خۆرهەلاتی ملەی سەرتەك لە پشتی کانی کەڵەوە کەوتبوونە ناو کێڵگەی مینوووشیار بیاوێڵەیی کە شارەزای مین هەڵگرتنەوە بوو بەرنەکەویو لاقێکی ئەپەرێو برادەران پەکیان ئەکەوێو ئەگەرێنەوە بۆ ئێران.

## ١٩٨٩/١٢/٣٠

هەندێ جاش هاتنە نێوان قەڵاو تەپەگەرِوس.

## ١٩٨٩/١٢/٣١

دوا رۆژی ساڵێکی پڕ لە ماتەمی دوای ئەنفالەکانە هێشتا خەڵکی ئێمە لە ناو تەمتومانی ئەو دۆخە کارەساتاوییەدا ئەژینو بە دوایوەڵامی پرسیارەکانی چارەنووسداوێڵن، کەچی خەڵکی دنیای خوا پێداو تەمەنێکی پڕ لە بەهاو پێوانەی مرۆڤایەتی بۆ ژیان بەرێئەکەنو ڕوو لە رۆگەی تەمەنێکی نوێی ماڵێکی نوێ ئەکەن بە هیوای بەرخورداربوون لە دەستکەوتو داهاتی پێشکەوتنی ئاوەزی مرۆڤایەتی. کەچی ئەوەتا ئێمە بە هۆی رژێمێکی نا لە بارەوە گیرمان خواردووە. بۆ بەردەوامبوون لەسەر بەرنامەی خەباتو بۆ چەسپاندنی بوونی خۆمان ڕێگایەکی دژوارمان گرتووەتەبەر.

وا ئەمشەو بەفرێکی توند دایکردووەو سەرمایەکی سەختەو لە بەربرسێتیو بێنانیو خواردنی ئاسایی لاوازو کەمووزە لە کونجی ئەشکەوتێکی تاریکدا هەڵکورماوین.

# ساڵی ١٩٩٠

## ١٩٩٠/١/١

ڕۆژی ئاهەنگگێڕانە، لە هەموو شوێنێکی ئەم جیهانەدا جەژنو پشووە.. کە چی لێرە بە بێدەنگی بەڵاماندا تێپەڕیو هیچ مەراسیمێکی خۆشی نەبوووەکو ئەوەی لەووڵاتانی دنیادا ئەکریو ئەم ڕۆژە هەموو گەردن ئازادی ئەکەنو ئەکەونە ناو جەنجاڵی ساڵێکی نوێی پڕ لە داهاتو خۆش گوزەرانی. کەچی ئێمە لە کونجی ئازارو نالەباریو ئاوارەییو دژواریدا هەڵئەتوتێین، لە هەلومەرجێکی ناڕەحەتدا ئەیگوزەرێنین.

## ١٩٩٠/١/٣

منو ئاخەو د.هاوڕێ بووین گەشتێکمان دەستپێکردو گەیشتینە لای کاک حەمە پاریاوڵە.

## ١٩٩٠/١/٤

خۆمم شوشت کە بۆ سێ مانگی ڕەبەق ئەچوو ئاو لە گیانم نەکەوتبووو زۆر چڵکن بووم.

## ١٩٩٠/١/٥

لەگەڵ ئاخەو د.هاوڕێ دا سەردانێکی کاك کوردۆمان کرد لە کونە سوچەڕەکەی پشتیوڕێڵە. تووشی گرانەتا بوو بوو لەو کونەسوچەڕەدا دایان نابوو بە دەیان ئەسپێی سووچەر تێی دابوو، خۆی ڕەشبوو نەخۆشییەکەی

برستی لێبڕیبوو ئەوندەی تر ڕەش هەڵگەڕابوو تووکی ڕیشی درێژو بۆز بووبوو لە جامی ڕەسمی ڕەش‌و سپی ئەچوو.

## ١٩٩٠/١/٦

هەر لای کاك کوردۆ بووین. ئێمەش ئەسپێی سوچەڕ تێی داین‌و هەموو لەشمان ئاڵۆشی ئەکرد.داوای هەندێ ئازووقەمان کرد کاك کوردۆ پێی‌ووتین بچینە هۆمەرەخەجان‌و لەو ئازووقەیەی شاردبوویانەوە بەشی خۆمان ببەین چونکە لای خۆیان ئازووقەیان کەم مابوو.

## ١٩٩٠/١/٧

ئێوارەکەی لە کونە سوچەڕەکەوە بەرەو تورکە ڕۆیشتین شەوەکەی لە قەڵبەزێکی سەرووی تورکەدا ماینەوە.

## ١٩٩٠/١/٨

چووینە هۆمەرە خەجان بۆ سەر ئازووقەکە، دوژمن چووبووە سەری‌و هەمووی ڕژاندبووە سەر زەوی‌و ئەوەشی بە کەڵك مابوو باران تەڕیکردبوو، بەرمیلەکان پڕ بوو بوون لە ئاو. زۆر برسیمان بوو نانیشمان پێ نەبوو دەستیشمان نەئەگەیشتە هیچ لایەك نەمانئەزانی چی بکەین لەمبارەدا مرۆڤ بیری بۆ هەندێ شت ئەچێ‌وەکو بڵێی بە شوێن قەرزی کۆندا نەگەڕێ. ئاخە هەمیشەووردەکار بوو بیری بۆ زۆر شت ئەچوو کە لەو ناوچانەدا هەبووە بۆیەووتی: ساڵی ١٩٨٨ هەندێ ماڵ لەم چەمەدا لایانداوو با بگەڕێین بەڵکو شتێکمان دۆزییەوە بە دەم خەیاڵەوە دەستمان کردە گەڕان لایەکم کردە دواوە لە بن قەڵبەزێکدا شتێکی سپیم بەدی کرد بانگم کردە ئاخە: ئەوە شتێکی سپییە لە بن ئەو قەڵبەزەدا بزانە چییە..؟ بانگی کردین‌وووتی:وەرن ئەمە هەندێ شتە لێرەدا. کە چووین تەماشائەکەین ئەوە دەبەیەکی پێنج لیترییەو لە سەرروویەوە باوەڵێکی کۆن دانراوە. ئەو باوەڵانە لە کۆندا پیاو ژنی

بگواستایەتەوە ئەیانکردە جیازی بوکێنی. لە کاتی ئەنفالدا خەڵکێك ئاردیان تێکردبوو دواجاریش بە جێیان هێشتبوو. بەڵام جێگای کلیل و قفڵەکەی کونی تیا بوو لەو کونەوە مشکی تێچووبوو. لە ساڵی ١٩٨٨و ١٩٨٩ مشك تەڕاتێنی تیا کردووە. لە بەر گووەمشك ئاردەکەی بە دەرەوە نەبوو. سەرووی ئاردەکەمان فڕێ دا لە ژێرەوە هەندێ ئاردی تیا مابوو ئەویش پڕی بووبوو لە تووکە مشك ئەوەندەش میزی پیا کرابوو رەنگی زەردهەڵگەڕابوو. جگە لەوەش چەند مشکێکی تیا تۆپی بوو لە بەر برسێتی ناچاربووین ئاردەکە لەگەڵ خۆمان ببەین. هێلەکێکمان دۆزیبووەوە پێمان بێژایەوە، لە نزیك کوردەمیری حەمەمین خەرامان ئاردەکەمان کردە هەویر کە ڕای نەمابوو، هەندێ چیلکەو چەواڵمان کۆکردەوە ئاگردانێکیشمان درووست کرد لە باتی ساج بەردێکمان خستە سەر ئاگرەکە هەویرەکەمان ئەخستە سەری تابرژێ، کەبرژا بردمان بۆ دەممان بیخۆین بۆنی لاکی تۆپیوی لێئەهات، لە بەر برسێتی خواردمان، دوایی قرقێنەیەکی زۆر ناخۆشی هەبوو.

لەوێوە بەرەو فەقێ مستەفا چووین لە ناو چەمەکەدا هەندێ خواردنی قووتووکراومان دۆزییەوە تا ٥٩ قووتوو بوو کە دوژمن دوای کێوماڵ لە بەر بارسووکی فڕەی ئەدەن، لە ناو دێدا ئاگرێکمان کردەوەو سەرو دانەمان گەرم کردەوەو خواردمان تۆزێ وەزعمان باشبوو. لەوێوە ڕۆیشتینەوە بۆ دەڵەکە.

## ١٩٩٠/١/٩

ئەو کاتانەی ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ ڕێکخراودا بچڕا بوو بەهۆی کاك ئەحمەد کوڵکنی کە کێشەی پارەیان لەنێواندا بوو. کە ئەڵقەی بەیەکگەیشتن ببچڕێ شێرازەی کارەکان تێکئەچێ و هیچ شتێك ناڕوات و تا ڕێگەیەك ئەدۆزرایەوە تووشی زەحمەتی زۆر ئەبووین، ٣ مانگ بوو ئەوە حاڵمان بوو، هەر ئەمڕۆ لە م.س برووسکەیەکمان پێگەیشت:

**لە/ حەسەن حسین**

**بۆ/ مەحمود سەنگاوی**

( شەوی ۱/۲۰لە خوار شاری کفری یەوە، یەکەم تاوەری کارەبا کە لە ڕۆژهەڵاتی جادەکە بۆ ڕۆژئاوای جادەکە ئەپەڕیتەوە کە بەردێکی سپی لە ژێریدا دانراوە، لەژێر ئەو تاوەرەکارەباییەدا ئامادەبن بۆ پەیوەندی کردن لەگەڵماندا ).

حەسەن حسین کاك جەباری حاجی ڕەشید بوو کە لێپرسراوی ڕێکخراوی سلێمانی بوو.

# ۱۹۹۰/ ۱/۱۱

لە دەڵەکەوە بەرەو سپی سوار لە سەرووی دێی تەپە سپییەوە کەوتینە ڕێ، بە جیهازیش لەگەڵ کاك مکەڕەمدا لەسەر دالانییەوە قسەمان ئەکرد دەربارەی هەندێ ئازووقە کە لەوێ شاردبوویانەوەو هەر ئەو پێیئەزانی. لەشوێنەکە نزیك بووبووینەوەو لەسەر گردێك‌وەستابووین، مکەڕەم بە جیهاز باسی شوێنەکەی ئەکرد کە گردێکی بەرز لە ڕۆژئاوای ئازووقەکەیەو لەسەر گردەکەوە گەر تەماشای خوارەوە بکەی دار توویەکی بچووك ئەبینی. ئا لەو کاتەدا سەیری خوارەوەم ئەکرد، بەرمیلەکانم بەرچاو کەوت کە ڕێوی دەری خستبوو، ئیتر بە کاك مکەڕەممانووت: سوپاس ئازووقەکەمان دۆزی یەوە. لەو کاتەدا کاك کوردۆو برادەرانی پەیدا بوون‌و ئازووقەکەمان دابەشکردو بەرەو کەڵەهەڕی سەرووی دێی کاکەبرا ڕۆیشتین‌و لەوێ ماینەوەو ڕۆژی دواتر گەڕاینەوە دەڵەکەو کاك کوردۆشمان لەگەڵ بوو.

لەو کاتانەدا دوژمن لە دێهاتەکانی تاڵەوان ـ گۆڕی ئەسپ ـ مارف سەیدە ـ مامەران کێو ماڵی ئەکرد بە توندی. لەو ناوچەیەدا ماینەوە، ڕۆژێك چووین بۆ کۆیك‌و ترشکەمان کۆئەکردەوە بۆ درووستکردنی چێشتی یاپراخ. لەولاشەوە لەهەردەی زەنگنە دوژمن کێوماڵی ئەکردو تەقەیەکی زۆری ئەکرد.

## ١٩٩٠/١/١٨

بەرەو خوار بووینەوە شەو گەیشتینە پەناگاکانی جەوەڵ کە هەندێ شوێنی باشبوون کاك ئەحمەدی حاجی ڕەشید لە ڕۆژئاوای هۆمەرملەوە دروستیکردبوو دوژمن پێی نەزانیبوو.

## ١٩٩٠/١/١٩

لەگەڵ ئاخەو کاکە توکنی بەرەو دێی بەلەگە ڕۆیشتین چووینە شوێنێك شەقی شەفەی پێ ئەووترێ، لەوێ ماینەوە لەبەرئەوە ئەوشوێنە کونە سیخوڕ بوو ئەسپێی سیخوڕ تێیدابن.

## ١٩٩٠/١/٢٠

ئێوارە چووینە ئەو جێگەیەی لە لایەن حەسەن حسێن (هاوڕێ جەباری حاجی ڕەشید) بۆی دیاری کردبووین لەگەڵ ئاخەدا نزیکی تاوەرەکە بووینەوەو تا کاتژمێر ١٠ی شەو دانیشتین کەس دیار نەبوو، زۆر بێتاقەت بووم کە ڕێگایەکی دوورمان بڕیبوو لەوەها کاتێکی پڕ مەترسیداو ئێستا کەسی دووەم نەیەتە سەر مەوعید.

ئاخەووتی: با کەمێك بچمە خوارتر نەوەکو ئەو برادەرە لەو ناوەدا بێ.

هەڵسا ڕۆیشتو کەمێك گەڕاو هاتەوەووتی: ئەوە ئۆتۆمبیلێکە لەوێدا.

ووتم: لادایە یان شتی ترە..؟

ووتی: لادایەو ڕەنگیشی سوورە.

ووتم: دیارە ئۆتۆمبیلێکی شڕۆڵەشە. چونکە ئەمزانی برادەرانی ڕێکخستن شتێکی لەو جۆرەیان هەیە. چووینە لای ئۆتۆمبیلەکە، بڕێ ڕاوەستاین هەرکەس دیار نەبوو.

ووتم: ئاخە با پاترییەکەی دابگرین بۆ جیهازە ڕاکاڵەکە زۆر پێویستمانە. تومەز هاوڕێ سوپا زوو هاتووە کە ئێمەی بینیوە ٣ کەسینو دوو

گوێدرێژمان پێیه به خەڵکی تری زانیبووین، بۆیه خۆی لێداگرتبووین، که گوێی له قسەکانمان بوو زانیبووی پێشمەرگەین‌و بۆ سەر مەوعیدەکه هاتووین که پاترییەکەمان بردە لای گوێدرێژەکان هاوڕێ سوپا پەیدا بووووتی: پاتری کەسێك ببەن بۆتان بخورێ. که هاته پێشەوه کەره گوێ لەق بۆنێکی پێوەکرد، دەمێك بوو کەره گوێ لەق نەهاتبووەوه خوارەوه بۆ سەر مەوعید، هەرکەسێك بهاتایەته سەر مەوعید یان تازه بووایه بۆنێکی پێوەئەکرد، هاوڕێ سوپا پێشتر کەره گوێ لەقی بینیبوو له هاتوو چۆکاندا ناسیبووی. قسەمان لەگەڵ هاوڕێ سوپادا کرد پێشمان‌ووت که زۆرمان برسییه، چونکه ماوەیەك بوو له برادەرانی ناوشار دابڕابووین خواردن‌و خۆراکی باشمان پێنەگەیشتبوو. هاوڕێ سوپاووتی: ئەگەر چاوەڕێ ئەکەن من ئەچمەوه له ناو شار خواردنتان بۆ ئەهێنم‌و به پەله ئەگەڕێمەوه. ئێمەش ئەوەمان پێخۆش بوو، هاوڕێ سوپا ڕۆیشت‌و دوای ماوەیەك هاتەوه تەماشائەکەین له تەنەکەیەکدا گۆشتی مریشکی هێنا بوو. دەمێك بوو خواردنی چەوری‌وامان نەخواردبوو به جۆرێك سەروگوێمان تێناوەکو کوردی دۆ نەدیوله کاتێکی ئاساییدا کەسێك بمانی‌دیبایه ئەڕشایەوه. دوای ئەوەی پێویستییەکانی خۆمان بۆ هاوڕێ سوپا باسکردووتی: بڕۆن سبەی ئێوارەوەرنەوه هەموو شتەکانتان بۆ دابین ئەکەم.خوا حافیزیمان کردو گەڕاینەوه شەقی شەقه، شەوەکەی زۆر تاریکبوو، ڕێگاکەمان‌وون کردبوو کەره گوێ لەقیش ڕێگەکەی هەڵه کردبوو، هەر بۆنی به زەوییەکەوه ئەکرد، ناچاربووین دوای بکەوین له ناکاو ڕاوەستاو هەچەمان لێکرد نەئەڕۆیشت کاکه تووکنی‌ووتی: خۆئەمه پەناگاکەیه. که تەماشامان کرد گوێ لەق له بەردەرگای پەناگاکەدا ڕاوەستاوه.

## ١٩٩٠/١/٣١

جارێکی تر گەڕاینەوه هەمان شوێنی شەوی ڕابوردوو. هاوڕێ سوپا له کاتی دیاریکراوا هاتو هەموو ئەو شتانەی داوامان کردبوو له گەڵ خۆی هێنابووی لێمان‌وەرگرت و خواحافیزیمان لێکرد.

بەڕاستی هاوڕێ سوپا بۆ ئەم زەمەنە ڕۆڵی دەیان پێشمەرگەی قارەمانی لە بەرەکانی شەڕدا بۆ ئێمە ئەبینی، پیاوێکی خۆنەویستبوو، زۆر دڵسۆزی شۆڕش‌و خەباتی کوردایەتی بوو، پارتیزانەکان زۆر قەرزاری جوامێریتی ئەون.

## ١٩٩٠/١/٢٢

لە پەناگاکەی جەوەڵ کاتژمێر ٢ ی پاشنیوەڕۆ بەرەو سەرەوە بە ڕێکەوتین لە ڕێگادا باران تێی کرد، ناچار لە دێی ڕەمەیان لاماندا کە تەنیا ژوورێکی تیا مابوو نەڕووخێنرا بوو، لەو خانووەدا بێسەرو ژێر خەوتین لە سەرمانا هەڵئەلەرزین، ئەمە بووەهۆی ئەوەی تووشی نەخۆشی گرانەتا ببم.

## ١٩٩٠/١/٢٣

گەیشتینەوە دەڵەکە، کاک کوردۆ لەوێ بوو، گرانەتای بوو چاك نەبوو بووەوە دەرزی‌و درەمان‌و ماست‌و گۆشتی مریشك‌و شتی ترمان بۆ هێنابوو.

## ١٩٩٠/١/٢٦

بەیانییەکەی میقداد بەتەڵەکەی ڕێوییەکی بۆ گرتین هەرچەندە ئێمە لە ڕووی خواردنەوە پۆشتەو پەرداخ بووین، چونکە ئێوارەکەی بە بارە ئازووقەوە لە خوارەوە گەڕابووینەوەو برادەران بە پەرۆشەوە پەلاماری بارەکەیان داین بزانن چی تیایە. ئەمە یادی منالیم تازە ئەکاتەوە کە جاران لە لادێوە کەسێك ئەچوو بۆ شار نوقڵ‌و چکلێت‌و شتی شاری ئەهێنایەوە ئێمە هەر لە ڕێگاوە تێی ئەورووکاین‌و بەشی خۆمان نوقڵ‌و شتمان لێوەرئەگرت. ئای کە شتێکی خۆشبوو.!

## ١٩٩٠/١/٢٧

بە هۆی ئەو تەڕبوونەی ڕێگا خۆیشم نەخۆش کەوتم، لە بن تاوێرێکدا کەوتبووم هەموو چرکەیەك ئەترسام بەسەرمدا بڕووخێت. نەخۆشخانەو

قەرەوێڵەو شوێنی حەوانەوەی پارتیزان هەر سروشتو دیاردەو کەرەسەکانی سروشت خۆیەتی. هەر کەسێکیش نەخۆش کەوت ئەبێ تەحەدا بکات، بە ئاسانی خۆی بەدەستەوە نەدات، ئەگینا هیچی تر نی یە ڕووی تێ بکات بۆ چاك بوونەوە. جا کاتێك ئاوو هەواش ناخۆش بێت سەرماو سۆڵە بێتو نەخۆشیش بیت زۆر زەحمەتە. هەتاکو چەند ڕۆژێك نەخۆشییەکەم درێژەی کێشا.

## سەرەتای مانگی ۱۹۹۰/۳

کاك نەوشیروان لە گەشتەکەی دەرەوەی گەڕایەوە دوای ئەوەی بانگهێشتی کادیرەکانی کۆمەڵە کرا لەسەر بارودۆخی دنیاو کوردو یەکێتیو کۆمەڵە پێداویستی ڕۆژگاری خەباتو مەیدانە جیاجیاکانی گفتوگۆی زۆر کرا بوو، هەر لەم کاتانەدا بە زەقی دەنگۆی یەکگرتنەوەی کۆمەڵەوشۆڕشگێڕانو بۆچوونەکەی کاك فەرەیدوون هاتبووەوە ناوەوە مقۆمقۆیەکی زۆری لێ پەیدا بووبوو ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوووتارەی کاك فەرەیدوون کە لەکۆبوونەوەی فراوانی مانگی ۱۹۸۹/٦ ی یەکێتی شۆڕشگێڕانی کوردستاندا بەسترا خوێندرابووەوەو تێدا پەنجە بۆ مەسەلەی یەکگرتنەوەی کۆمەڵەو شۆڕشگێڕان درێژکرابوو. لە ڕاستیشدا ئەم بیر کردنەوەیە هەنگاوێکی گرنگبوو کە پرۆستڕۆیکای گۆرباتشۆف زەمینەکەی خولقاندبوو کە هەموو ڕژێمە دکتاتۆریەکان بەڵکو حیزبو ڕێکخراوەکانیووڵاتە دیکتاتۆریەکان بەخۆیاندا بچنەوەو ئاڵای دیموکراسیو مافی مرۆڤ لە سیستەمی نوێ ی جیهاندا بەرز بکەنەوە لەووڵاتێکدا کە لانکی مارکسیزم بوو،وەکو دەسەڵاتێك ڕەتبکرێتەوە ئیتر بۆچی ئێمە هەر دەروێشی ئەو بین. بە هەق کۆمەڵە لەمەداو یەکێتیش دەستپێشکەر بووە، هەمیشە بیری لای گۆڕان بووە هیچ شتێکی لا پیرۆز نەبووەوەکو قاڵب، بۆهەر قۆناغە بەرنامەی خۆی هەبووە، بەرگی کۆنی فڕێداوەو نوێ ی پۆشیوە، هەرچەندە لەمەشدا لایەنگرو دژ هەبوو لە سەرەتادا دژایەتیکردنی لە لایەنگری زۆرتر بووە، کادیرەکانی کۆمەڵە پێیان ناخۆش بوو

بە ئاسانی دەست لە سەرەوەری یەکانی کۆمەڵە هەڵبگرن، بەڵام زەمانە پێشانی دا کە ئەبێ لەگەڵ ڕەوتی ڕۆژگاردا هۆشیارانە مامەڵە بکرێ.

## ١٩٩٠/٣/٧

نەخۆشییەکەم هەندێ باشتر بوو بەڵام هێشتا هەر ماکی مابوو، تۆزێك بووژامەوە لەو نکە نکە ڕزگارم بوو دڵنیام ئەگەر لە ناو ئاوەدانیو ماڵو منداڵو کەسو کاردا بوومایە ئەوەندە ئازارم نە ئەچێژا. بەشێکی قورساییو توندی ئەو نەخۆشییە جگە لەوەی کە لەش پێوەی ئەناڵێنێ بەشەکەی تری پەیوەندی بە لایەنی دەروونی ـ مەعنەوییەوە هەیە.

## ١٩٩٠/ ٣/٨

بارانێکی نەرم ئەباریو تەندروستیم ڕوو لە باشیبوو کاك نەوشیروان برووسکەیەکی کردبوو یان من یان کاك کوردۆ قاسم بە جیهاز قسەی لەگەڵدا بکەین، هەردوکمان نەخۆش بووین بە کەڵکی ئەوە نەئەهات ڕێ بکەین جیهازەکەش لە چیای سەگرمە بوو دوور بوو ماینێکی شەل لە خوارووی دێی مەلا هۆمەر هەبوو، ناردم بۆمان بهێنن بەسواری بچین بۆلای جیهازەکە.

## ١٩٩٠/٣/٩

ماینە شەلیان هێنا بەڵام بە کەڵکی ئەوە نەئەهات سواری بین گەرچی ماوەیەك پێی ڕۆیشتین پەکی کەوتو ناچار ئێمەیش گەڕاینەوە شوێنەکەی خۆمان، نەخۆشی یەکە بەجۆرێك کاری تێکردبووین گوێم لە برادەران بوو ئەیانووت:وەزعی خراپە. خۆشم هەستم بەوە ئەکرد مردن خەریکە نزیك ئەبێتەوە پێیانمووت: ئەم ژیانە پڕ لە مەینەتباری یە، کۆتاییەکەی مردنە، مادام لەووڵاتەکەی خۆمدامو لەم خاکەدا ئەمنێنە گۆڕ هیچ دڵگران نیم

تەنیاوەسیەتم ئەوەیە بمبەنە دێی زستانە لە تەنیشت گۆڕی شەهید حەمە ئەمین ئێرانییەوە بمنێژن کە شەهیدێکی شۆڕشی ئەیلولەو تاکو ئێستا خاوەنی دیار نییە، پیاوێکی گومناوی ئەم کوردەیە بە گەورەی ئەزانم لە تەنیشت پیاوێکی شۆڕشگێڕی ئاوادا بنرێمە گۆڕ.

مەرج نییە نەخۆشی مردنی لەدوا بێت یا نەخۆشی یەکەی توند بێ‌و ئازاری زۆر بێت زۆر جاروێنەی مەرگ دێتە پێش چاوو خۆی دیار نییە لە ناکاو ئەم میوانە دەردەدارە ژیانی ئەکرۆشتین، ئەرواو لە کۆڵمان ئەبێتەوە، ئەم نەخۆشی یە چەند ڕۆژێك لە گەڵمان بوو د.هاوڕێ هەموو توانای خۆی خستبووە گەڕ بۆ چارەسەرکردنم هەمیشەوورەی بەرز ئەکردمەوە تینوو تاوی نەخۆشی لەسەر کەمتر ئەکردمەوە، بە ڕاستی پیاوێکی بە هیمەت بوو لە ڕۆژی تەنگانەدا بتوانێت گەورەترین خزمەت بە پێشمەرگە بکات‌و خێوی نەخۆشی‌و مردنیان لێ دوور بخاتەوە ئا لەووەزعەدا.

## ١٩٩٠/٣/١١

گوێدرێژێکمان هێناو بەرەو ئەشکەوتی فاسۆلیاکە ڕۆیشتین‌و لەوێ لاماندا‌و هەندێ تەندرووستیشم باش بوو نانم خوارد دوانیوەڕۆکەی ڕۆیشتین، لە نێوان دەرزیلەو ڕێگەکەی درۆزنە کە دێتە سەر چەمەکەی کانیکەوە ئاخە لە پێشەوە بووووتی: ڕاوەستن بۆنی گازی ئۆتۆمبیل دێت ئیتر ئاخەو میقداد چوونە سەر ئەو ڕێگایەیەی لە سەنگاوەوە ئەچوو بۆ درۆزنە کە گەڕانەوەووتیان ئەوە ئیڤایەکە لەناو چەمەکەداوەستاوەو کەسیشی لا نییە دەستماندایە ئەکرۆزەکەی تازە کوژابووەوە.ووتم با بڕۆین خۆمان لەمە لادەین، ئەمە هێزی دوژمنی هێناوە بۆ بۆسەدانان بۆ خۆمان. ئیتر لە بەرامبەر ماڵەکانی دەرزیلە بە لای دێی درۆزنەدا چووینە سەر گردەکەو لەوێ لە

گوێدرێژەکە دایانگرتمو دەستیان ڕاکێشام تاکو لە خوارووی گەچەکەی شەلەییەوە بەناو ئەو شاخانەدا بردمیان. بۆ دەڵەکەکەی میقداد لە چیای سەگرمەو کاتژمێر دووی نیوەشەو گەیشتین.

## ١٩٩٠/٣/١٣

لەگەڵ کاک حەمەڕەشدا بە جیهاز قسەم کرد، نەخۆشی یەکەشم باشتر بووە، مامۆستا یاسینو میقدادوولاخەکانیان بردەوە بۆ گۆڕی ئەسپو دایانەوە بە برادەرانو شەو درەنگ گەڕانەوە.

## ١٩٩٠/٣/١٤

دوایی بە نایلۆن ژوورێکمان پێکەوە ناو بەتانیمان دا بە سەریا،وامان ئەزانی کۆشکی سپیمان درووستکردووە.

## ١٩٩٠/٣/١٦

لەگەڵ عوسمانی برامدا قسەم کرد، بەفر ئەباریو دنیا زۆر سارد بوو. ڕۆژی دواتر لەگەڵ م.عەلیو کاک عەدنانو بەرزانو کاک عادلو نەقیب محەممەد دا بە جیهاز قسەم کردو هەواڵی ئەوانم بە چاکیوەرگرتو لێرەش دەنگو باسی هەموو برادەرانم پێدان. چەند ڕۆژێکیش دوای ئەوە م.عاسیو م. غازی سالاریش قسەیان لە گەڵا کردین.

## ١٩٩٠/٣/١٨

دنیا هەورەو بارانی هەیە.

## ١٩٩٠/٣/١٩

بەفرێکی زۆر ئەباریو دنیای داپۆشیوە، تەمێکی تاریکیش پەیدا بوو، دواتر تەمە کە ڕەوییەوە، لە بەر سپێتی بەفر هیچ شتێك بەدەرەوە نەما بوو.

## ١٩٩٠/٣/٣٠

هەندێ جار هەورو هەندێ جاریش سایەقە بوو، بەفرەکەش خەریکبوو ئەتوایەوە چونکە ئەم سنوورەی گەرمیان کە بنارەکەی بەفری لێئەباری زۆر نامێنتێتەوە.

## ١٩٩٠/٣/٣٣

کەشێکی زۆر ساردو ڕەشەبایەکی توند هەبوو، ئالەم کاتانەدا لە ژێر بەتانییەوە لەگەڵ م. غازی سالارو م. جوامێردا قسەمان کرد.

ئەم ڕۆژانە ئاوو هەوا زوو زوو گۆڕانی بە سەردا دێت، ڕۆژێك ساردە، هەورە، بارانە، بەفرە، ڕۆژێك خۆشە یان تەمو مژی تاریکەو ئەو دەشتایی گەرمیانەوون ئەبێ.وەنەبێ دوژمن لەم ڕۆژانەدا بێدەنگ دانیشێو دەرنەچێ.

## ١٩٩٠/٣/٣٣

ڕەشەبایەکی سارد هەڵیکرد، خەریك بوو ڕەق ببینەوە کەچی کۆمەڵە جاشێك بەرەو دەرەواری خواروو ئەهاتن، کە زیاتر بۆ چاودێری جموجووڵی پێشمەرگەو سۆسە کردنیان دەرئەچوون.

## ١٩٩٠/٣/٣٧

دووکەڵێکی زۆر لە کۆمپانیای نەوتی مارداری بەرز بووەوە لەوەئەچوو خستبێتیانە کار لەوانەشە هەربۆ تاقیکردنەوە بێت، پێش ئەنفال و تاکو پێشمەرگە لەو ناوچەیەدا هەبوو پێش ئەنفال نەیتوانی لەو کۆمپانیایەدا کار بکات. هەر ئەمڕۆ لە ڕادیۆوە گوێم لێبوو بەیاننامەی پارتو ڕێکخراوەکانی

ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە لەندەن بڵاو کرایەوە داوای عێراقێکی دیموکراتیو لاچوونی بەعسیان لە سەر حوکم ئەکرد.

## ١٩٩٠/٢/٢٨

هەڤاڵ مام جەلال لە ڕادیۆی بیبیسییەوە لەسەر پێشێلکردنی ماڤ مرۆڤ لە عێراقدا بە دوورو درێژی قسەی کرد.

لەو کاتانەدا کۆپتەرێك لە کەرکوکەوە بەرەو دەربەندیخان تێپەڕی.

## ١٩٩٠/٣/١

ئاگاداری برادەرانمان کردەوە کە مشووری گۆڕینمان بخۆنو هێز ئامادە بکەن بۆ ئەو مەبەستەو برادەرەکانی خۆمان نارد بۆ هێنانی ئازووقە بە کۆڵ بۆ ئاژداخ.

## ١٩٩٠/٣/٣

دیارە زووتر لە ڕێگەی ڕادیۆوە هەواڵەکانی دنیای سیاسەتو زانستو شتیترم وەرئەگرت لە هەمووی سەیر تر ئەو دەنگوباسەی ڕادیۆی حیزبی دیموکرات بوو کە دێیەك لە چیاکانی بوێر ئەحمەد لە ئێران دۆزراوەتەوە خەڵکەکەی تێکەڵ بە دنیای پێشکەوتوو نەبوون. هەروەها ڕادیۆی ئیسرائیل بڵاوی کردەوە کەوا نەهەنگێك ڕێگای وونکردووەو هاتووەتە ئاوەکانی ئەسکەندەریەی میسرو لەوێ مردار بووەتەوە کە درێژی یەکەی ٢٢ مەترو پانییەکەی ٥ مەترەو قورساییەکەی ١٢ تەنەو تەمەنی ٤٠ ساڵەو خێرایی ڕۆیشتنی لە سەعاتێکدا ٢٣کم بووە.

## ١٩٩٠/٣/٤

لە جیهانە نابووتەکەی جاشایەتیدا هەواڵی زیندانی کردنی جاشی خۆفرۆش سەعە درگەیی گەیشت لەسەر دەستکاری کردنی ئیجازەی جاش ١١ ساڵ حوکم درابوو، لەبەر ئەوەی ٣ نۆت شوجاعەی هەبوو ٩ ساڵی بەر عەفواتی ئەو نۆتانە کەوتو ئەبێ ٢ ساڵەکەی تر زیندانی بکرێت.

هەروەها خاکفرۆشان حەمە باساکی‌و خالیدی خوولە سوور لەسەر دزی‌و بەرتیل خواردن لە لایەن رژێمەوە بە ٤ مانگ حوکمی زیندانی درابوون. بەڵام بڕوا ناکرێت ئەمانە بکرێنە ژوورەوە، لەبەر ئەوەی خزمەتیان زۆرەو ئەڵقە لەگوێی باشی دەزگا داپڵۆسێنەرەکان بوون‌وابەو توندییە سەوایان لەگەڵ ناکرێ‌و بە فرتو فێڵ ڕزگاریان ئەبێ. ئەو جۆرە سزایانەش هەر بۆ چاوترساندن بوو. ئەو کاتانە بیرم لەوە ئەکردەوە ئەبێ دوای ئەم هەموو کارەساتانەی بە سەر کورددا هات‌و خودی ئەو جاشانە دەستیان لە گشت ئەو تاوانانەدا هەیە بۆچی ڕۆژێك بیر ناکەنەوەو پشت ناکەنە ئەو ڕژێمەو پەشیمان ببنەوەو هەڵوێستێك بنوێنن‌و خۆیان لە ڕابوردوویان پاك بکەنەوە..؟.

ترسی ئەوەم هەبوو ڕۆژێك بێت‌و جاش لە لایەن دوژمنەوە هەڵبوەشێتەوەو کاریان پێیان نەمێنێ‌و ئەو جاشانەش خۆیان بە نیشتمانپەروەر لە قەڵەم بدەن‌و لە گەڵ ئێمەدا شان لەشان بدەن‌و ئێمەش ئەمڕۆژەمان لە بیر بچێتەوە.

## ١٩٩٠/٣/٥

کۆپتەرێك بەسەر زەردەلیکاو دەرەواری خوارووا بەرەو کەرکوك ئەڕۆیشت‌و هێزەکانی دوژمن لە دەوروبەری کۆیك‌و فەقێ مستەفاو ئەو ناوە بە خەستی کێو ماڵیان ئەکرد بەشەو ئاگریان ئەکردەوەو لە بەرزاییەکانەوە گڕەکەی دیار بوو،ووردەووردە لە مەسۆییەکان نزیکبوونەوەو بەرەو دەرزیلە

هاتن‌و بە ڕومانەو ئاڕپیجی دەستیان کردە ڕاوەماسی‌و پاشان بە ڕێگەی هەزار کانیدا بەرەو سەنگاو گەڕانەوە.

## ١٩٩٠/٣/٧

بۆ جێبەجێکردنی هەندێ کارو باری پێشمەرگانە. لە دەڵەکەوە کەوتینەڕێ چووینە قەڵومز لوغمان.. دنیا زۆر سارد بوو، بایەکی توندی ئەهات، بارانیش ئەباری، شەوەکەی لە قەڵومزێکدا خەوتین.

## ١٩٩٠/٣/٨

بۆ بەیانییەکەی بەرەو قولیجان ڕۆیشتین لەوێشەوە بەرەو قەڵالووت. لە قەڵومزێکدا کۆمەڵێ فەرشی عەشایەری جوانمان دۆزی یەوە کە کاتی ئەنفالەکە لەوێدا دانرابوون، هەندێکیان تەڕیش بوو بوون ئێمەش کەڵەکە بەردمان بۆ درووستکردو بە ڕێکوپێکی دامانانەوە تاوەکو ئەو ڕۆژەی بەڵکو خاوەنەکەی پەیدا ببێتەوەو بیباتەوەودیوەخانەکەی پێ برازێنێتەوە.

دوای ئەوە چووینە کەڵەهەڕو پاشان چووینە قەڵومزی حادیسەکە. ئەوەی کەساڵی ١٩٨٨ی دوای ئەنفالەکە کاک ئازادی سەگرمەو کاک ڕۆستەم‌و کاک حەمەڕەش‌و پێشمەرگەکانیان لە گەڕانێکدا بوون لە ٣ کیلۆمەتری ڕۆژئاوای دێی قولیجانی سەرحەدو لە ناوچەی لاهێزدا کۆمەڵێك فڕۆکەی دوژمنیان لێ پەیدا ئەبێت‌و تەقەیان لێئەکەن، کاک ئازاد لەگەڵ پورزایەکیدا بە سەختی بریندار ئەبن، کاک شێرکۆ جیدی‌و هەڵکەوتی ئەندازیاری ئەلکترۆنی‌و شێرزاد عەلی ڕەمەزان پوورزای کاك ڕۆستەم شەهید ئەبن. لە کاتی تەقە کردندا کۆپتەرەکان‌ویستبوویان بنیشنەوە بەڵام کاك ئازاد بە بیکەیسی تەقەیان لێکردبوون، کاك حەمەڕەش کاك ئازاد ئەکاتە کۆڵەوە لەو ناوە دووری ئەخاتەوەو کۆپتەرەکان بەرەو کەرکوك ئەڕۆنەوە ئیتر کاك عوسمانی حاجی مەحمودو برادەرانی تر ئەگەنە ئەو نزیکانە بۆ یارمەتیدانی برادەران، پاش

سەعاتو نیوێك جارێكی تر كۆپتەرەكان دێنە سەرشوێنەكەو تەرمی شەهیدەكانو چەكو تەقەمەنییەكانیان هەڵئەگرنو ئەگەڕێنەوە، ئیتر كاك ئازادو بریندارەكانی تر ئەبەنە شوێنی باشو لە بری پزیشك كاك عەدنانی حەمەی مینا تیماری ئەكات، پاشان لە ڕێگەی ڕێكخراوی ناو شارەوە پزیشكیار شێخ سدیق ئەنێردرێتو ماوەیەكی باش خزمەتی كاك ئازاد ئەكاتو تاكو دواتر كارئاسانی بۆ ئەكرێتو ئەبرێتە سلێمانیو بەغدادو پاشان بۆ سەركردایەتی. كە ئەمە لەو ڕۆژگارەدا چالاكی یەكی زۆر گەورەو سەركێشییەكی بێوێنەبوو كەیەكێك لە فەرماندە پێشمەرگە ناسراوەكان بە بریندارى ببرێتە بەغدادو سلێمانیو عەمەلیات بكرێتو بەناو ئەو هەموو تەلبەندو دەزگا جاسوسیو پیاو خراپانەی دوژمندا دوای ئەو زەمەنەی ئەنفال هاتوو چۆی پێ بكرێتو ئەگەر ئاشكرا ببوایە ئەوە كۆمەڵێك تێكۆشەر سەریان تێدا ئەچوو، لەوانەشە ڕێكخستن تووشی كێشەو گرفت بوونایە.

دوای ئەنجامدانی كارەكانمان بەهەندێ باریووڵاخەوە بەرەو دەڵەكە گەڕاینەوەو ڕۆژی دواتر برادەرانووڵاخەكانیان گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆی.

بە پێی ئەو هەواڵانەی پێمان گەیشت ڕۆژی ١٩٩٠/٣/٧ سەركردایەتی سیاسی بەرەی كوردستانی لە قاسمەڕەش كۆبووبوونەوەو چەند ڕۆژێكیشی خایاند بوو، چەندین مەسەلەی سیاسی لەمەیدانی خەباتی كوردایەتیدا باسكراو كۆمەڵێك بڕیاری لەسەر درا. یەكێتیو پارتی لای خۆیانەوە بە دووقۆڵی چەند دانیشتنێكیان لەمەر پەیوەندی دوولایەنە كردووە بۆ یەكەمجارە مەسعود بارزانی دێتە سەركردایەتی یەكێتی.

## ١٩٩٠/٣/١١

بارانێكی بەلێزمە باری، ترسی زۆرمان هەبوو ئەشكەوتەكە بە سەرمانا هەرەس بكات، حەمەئێرانیو مامۆستا یاسینو د.هاوڕێ لەوبەری چەمی مامرانەوە گیرساونەتەوەو ڕێگایان نی یە بپەڕنەوە بە جیهاز بەردەوام پەیوەندی ئەكەین. پاش نیوەڕۆكەی توانیان بگەنە لای كاك كوردۆ لە كەڵەهەڕ.

## ١٩٩٠/٣/١٢

سەر لە بەیانییەکەی هەورێکی ڕەشو توند هەبوو، ئێوارەکەی کاتژمێر ٧ باران بە خوڕ دایکرد، بوو بە بزیسکو هوڕو چەخماخە بە جۆرێك ئەو ناوەی دەورو بەرمانی ڕۆشنئەکردەوە ئەتووت دنیا گڕی گرتووە.. سەرووی ئەشکەوتەکەمان تەقی، لافاو هاتو بەردێکی زۆریشی لە گەڵ خۆیا ڕامالییە خوارەوە. لەوە ئەترساین ئەشکەوتەکەمان بتەپێتو هیچ شوێنێکیش نەبوو بۆی بچین.. ئێمەش وەکو برادەرانی ئەشکەوتی داری خلە ببینە ژێر هەرەسەوەو کەس پێماننەزانێ.

## ١٩٩٠/٣/١٣

باران بەردەوام بوو، هەورو هەڵایەکی قایمی هەبوو، دنیاش زۆر ساردو سڕ بوو،وای بۆ ئەچووین وا بە زوویی نەیکاتەوە. بەڵام بەهارەو سەرماو بارانی بەهاریش مەترسی زۆری نییەو نەخۆشی ئەوتۆی لێ ناکەوێتەوە.

## ١٩٩٠/٣/١٧

هێزێکی دوژمن بەرەو دەرەواری خواروو ئەهاتو پێنج چادریان هەڵداو هێزێکی تریش کە بریتی بوو لە ١٠ ئۆتۆمبیل. بەرەو دێی درۆزنە ڕۆیشتن. دنیا زۆر سارد بوو کەس نەیئەتوانی سەر دەربهێنێ، سەرەڕای ئەوەش بەفر کڕیوەی ئەکرد.

## ١٩٩٠/٣/١٨

هێزەکەی دوژمن بەرەو سەنگاو پاشەکشەی کرد.

## ١٩٩٠/٣/١٩

هـەتاوێکی گـەرمو ئـاوو هـەوا خـۆشو ئاسمـانێکی بێگـەردو دەشـتایی گەرمیان بە جوانی خۆی ئەنواند، بـەڵام دوور لـە خـەڵکیو ئـاوەدانی جگـە لـەو کەمە پێشمەرگە پارتیزانانەی هەر چـەند کەسێكو لـە پەناگـەو ئەشـکەوتێکدا بوون.

## ١٩٩٠/٣/٢٠

ڕەشەبایەکی توندو زۆر ساردیش بوو ئەو کۆپتەرەی هاتووچۆی نێـوان کـەرکوكو دەربەنـدیخانی ئـەکرد تێپـەڕی بـوو، کاتـژمێر ١٢ ی نیـوەڕۆ بـەرەو کـەرکوك گەڕایـەوە لـەو کاتانـەدا بـوو کـە چـاومان لێبـوو لـە ناوچـەی داودەو دییـەکانی زینانــەو هەیـەرە سـوور دووکـەڵێکی زۆر بـەرز بـووەوە بۆمـان ڕوون بووەوە کە هێزەکانی مجاهیدینی خەڵق بـوون خـەریکی مـانۆری سەربازین لـەو ناوچەیەدا. کەبەهەموو کەرەسەو کەلوپەلێکی سەربازی یەوە هاتوونەتە ئەوێو پەناگای زۆریان هەڵکەندبوو، شوێنی سەربازگەیان دیـاری کردبـوو بەشـێوەیەکی سەربازی هاوچـەرخانە ڕۆژانـەو بێپشـوو خـەریکی مەشقو ئەنجامـدانی ئەرکـە سەربازیەکان بوون. هەرچەنـدە هاتنی ئەمانە بۆ ئـەو ناوچـەیە هەنـدێ ڕێگـری لــە کاروبــاری پارتیزانەکانــدا درووســتکردبوو، بــەڵام ئــەمانتوانی لــە دووری ئەوانەوە کارەکانی خۆمان هەڵسووڕێنین.

## ١٩٩٠/٣/٢١

جەژنی نـەورۆزە، ڕۆژی نـەتەوایەتی گەلی کوردە، بـەڵام کـام جـەژنێك..؟ ئـەوەی کـە کـوردە.. خـەمبارو کۆسـکەوتووە، ئـەوەی کـە زۆربـەی خەڵکەکـەی خزێنراونەتـە نـاو تەلبەنـدی ئۆردووگـا زۆرەملییەکانـەوە یـان لـە نـاو زینـدانـە تـاریکو نوتەکانـدا یـان لـە شـوێنە نهێنییەکانـدا سـەدان هـەزار کەسـی دامـاوی ئەنفالکراو هێشتا سەرەنجامیان نی یە.

لـەم ڕۆژەدا ئـاگری دەسـتپێکردنیوەرزێکی نـوێی سـاڵ لەسـەر لوتکـە بەرزەکانی شاخەکانی کوردستاندا ئەکرێتەوەو سەرماو سۆڵە نامێنێـت، هـەموو شوێنێك سەوزەلانی ئەنوێنێ، بەلام ئەم جەژنە بێ ئاگرو دنیاش سـەرماو سۆڵە بـوو کەسـێك نـەبوو نـازی ئـەم ڕۆژە مەلوولـە بـۆ ئێمـە بکێشـێ، ئێمـەش لـەو ئەشـکەوتە سـاردو سـڕانەدا ئاوقـای یـەکتر بووبوینـەوەو هاوبەشـی خـەمباری جەژنی نەورۆز بـووینو لـە ناخیشـەوە بڕیـاری درێـژە پێـدانێکی تـری ئەڵقـەی ڕۆژگارێکی خەباتو تێکۆشانمان نوێ ئەکردەوە.

ئا لەم ڕۆژەشدا جاشە خۆفرۆشەکان بۆ گەڕان بەدوای پێشمەرگەدا هـەر نەئەسـرەوتن، بـۆ کێـو مـاڵ دەرئەچـوون، بسـت بـە بسـتی گـەرمیانیـان ئـەپێوا، ئاگریـان بەرئەدایـە ئـەو شـوێنانەی گومانیـان لێبکردایـە شـوێنی حەوانـەی پێشـمەرگەیە بـە تایبـەت لـەم ڕۆژانـەدا چـەمو قامیشـەلانەکانی نزیـك دێـی کوردەمیریان سووتاند.

## ۱۹۹۰/۳/۲٤

دنیـا هەوروهەنـدێك جـاریش بـاران بـوو، دوای نیوەڕۆکـەی چـووینە زەردەلیکاو بۆ هێنانی ترشکە، دوو تـەنکی ئاویشمان لەگـەڵ خۆمانـدا هێنـا کـە یـەکێکیان هـی مـاڵی عـەزیزی مـام عـەول بـوو، لـەناو دێیەکـەدا دوو شـوێن پێکـەوتبوو کـە پاتـەیان لـە پێـدابوو بـەرەو شـاخەکەی پشـتی زەردەلیکـاو ڕۆیشتبوون، دوای شەش مانـگ زانیم کە ئەو دوو زەلامە هادی برای کاك شاهۆو کوڕەکەی مام ڕۆستەمی بەڵخە بوون بۆ ڕاو هاتبوون.

## ۱۹۹۰/۳/۲٦

کاتژمێر ۱۱ ی پێش نیوەڕۆ ئیزگەی یەکێتیمەوەرگرت لەسەر ۳۱ی مـەتری بەرامبەر ۹۷۵۰ کیلۆ هێرتز کەبە ئێواران تەشویشی زۆری لەسەر بوو، سوودمان

لێنەئەبینی، مەکتەبی سیاسی ئاگاداری کردینەوە کەوا سبەینێ گوێ لە ئیزگەی مەڵبەندی دوو بگرین.

## ١٩٩٠/٣/٢٨

لەگەڵ کاك عوسمانی حاجی مەحمودا لەسەر هاتنە خوارەوەیان‌و چوونە پیریانەوە قسەمان کردو ڕێککەوتین.

## ١٩٩٠/٣/٢٩

کاك عوسمان‌و برادەران لە سنووری بلەکێی ئێرانەوە بەڕێ کەوتبوون. گوێم لە ڕادیۆی بیبیسی بوو بڵاوی کردەوە کە پیاوێکی موسڵمان لە بەریتانیا باینجانێکی قاش کردووەو لە ناوەکەیدا ( لا إلـه إلا الله ) نوسرابوو، لە لەندەنەوە چوار هەزار کەس چوو بوون بۆ تەماشاکردنی ئەو باینجانە، نەشمئەزانی چۆن‌وا ئەو کابرا موسوڵمانە لەوووڵاتە ڕۆژئاواییەدا کە ئاینەکەیان مەسیحییە ئەو باینجانەی لێی نووسرابوو دۆزیوەتەوە..؟! ئەی بۆ لای خۆمان کەسێك شتێکی‌وا نابینێ..؟

ئیتر ئێمە ڕۆژانە لە گەڵ کاك عوسماندا پەیوەندیمان ئەکرد.

## ١٩٩٠/٣/٣١

لە دەڵەکەکەی میقدادەوە ڕۆیشتین بەرەو هەرەسەکەی پشتی دێی‌وێلەکە.. لە نزیك سێوسێنانەوە چووینە سەر شاخی قلاقایمەزو لەوێوە بۆ کانی هەنارو ئاوایی حەمەی کەرەم‌و بەرەو شێوی قازی. لە شانی ڕۆژئاوای دێکەوە بەهۆی تاریکی شەوەوە تووشی شوێنێکی سەختبووین بە حاڵێکی ناڕەحەت سەرکەوتین. گەیشتینە هەرەسەکە.

## ١٩٩٠/٤/١

بەیانییەکەی تەماشامان کرد ژنگەلێکی زۆر بۆ قنگر هاتبوون، ئێمەیش لەو بن دارو دەوەنانە خۆمان حەشار دا تاکو نەمانبینن‌و لە ماڵەوە قسەنەکەن‌و دوژمن ئاگادار بێ‌و بۆمان دەربچن. بە دووربین بەووردی چاودێری هەموو ناوچەکەم ئەکرد لە ڕێگەکەی شەممە کە ئەڕوات بۆ قسرت کە شیوی ناو دێی شەممە ئەچێتە خوارەوە لە بەردەم ماڵی حاجی عومەرەوە ١٣ ژن بژاری پاقلەیان ئەکردو شۆفلێکیش لەناوویلەکەدا ئیشی ئەکرد.دوایی بۆم دەرکەوت کە هەندێك لەو ژنانە کەس‌و کاری خۆمان بوون. ئەو شەوە لەو ناوە بووین تاکو ڕۆژ بووەوە باران لێی داین‌و خەومان لێنەکەوت‌و بەردەوام لە سەرە سەعاتەکاندا قسەمان ئەکرد نەکو برادەرەکانی کاك عوسمان ڕێگەکەوون بکەن.

## ١٩٩٠/٤/٢

بۆ بەیانییەکەی ١١ ئۆتۆمبیلی جاش هاتنە خوارووی ئاوەکەڵە کە بریتی بوون لە ٦ قەمەرە، ١ پاس، ٤ لاندکرۆزەر توومەز هەموویان جاشە مێچکە بوون بۆ مەعاش هاتبوون.

## ١٩٩٠/٤/٣

لە هەرەسەکەی‌وێلەکە کاك عوسمان‌و برادەران گەیشتنە لامان. ڕۆژەکەی هەر لەوێ ماینەوە، خەڵکێکی زۆر ڕوویان کردە ئەو ناوە بەدوای کۆکردنەوەی گیا بە ڕەزای شاخیدا ئەگەڕان. گیایەکی بەلەزەتەو خەڵکەکە لەبەر بێ ئیشوکاری لەناو ئۆردووگاکاندا ئەو گیایە کۆئەکەنەوەو ئەیبەنە سلێمانی بۆ فرۆشتنی. خەڵکەکە بەسەر ئێمەدا ئەهاتن، تا کاتژمێر ١٢ی نیوەڕۆ

١٨ كەسمان گرت، ئەوان ئێمەیان نەئەناسیو نەیانئەزانی چین، لەو کاتەدا دنیا بوو بە تەمو ناوچەکە تاریك بوو.وامان بە چاکزانی کە سوود لەو هەلەوەربگرینو خەلکەکە بەرەلا بکەینو خۆشمان بەرەو دۆلی قەرەداخ برۆین. کە هەلکشاینە سەر شاخ بەهۆی تەمەکەوە هەندێ رێگەکەمانوێلکردو تەماشائەکەین نزیك قوتە بەرزەکەی دێی فەقیرە بووینەتەوە کە بارەگای جاشەکان بوو. تەمەکە هەندێك رەوییەوە، دنیا روناك بووەوە کە چووینە سەر کانیەکەی بن رەبایەی جاشەکان تازە لە ئاوەکەیان برد بوو کوزەلەشیان شۆردبووەوە، هێشتا ئاوەکە لێل بوو، بەلام سەری رەبایەکە تەمی پێوە مابوو، ئەوەندە نزیك بووین لە قەمچی دەمانچەدا بووین، بە پەلە رۆیشتینو سەرکەوتینو تەمەکە بە یەکجاری نەما، باش بوو جاشەکان نەیانبینین. شۆر بوینەوە بۆ دێی شیوی قازیو لە دەربەندەکەی پشتی دێیەکە هەندێ پشوومان داو بە چیای قلاقایمەز دا هەلکشاین، ئەوەندە گیاکە بەرز بوو بووەوە تەماشای رێگاکەمان کرد کە پێدا هاتبووینوەکو کۆلانێك دەرئەکەوت. ئەو شەوە گەیشتینە قۆپی حەمەی هەواس، لە بەرامبەر مالەکاندا بە دەستەی شاخەکەی پشتی زەردەلیکاودا سالی ١٩٨٨ لە ئەنفالەکەدا مالێك چووبوونە ژێر بەردێکەوەو چادرێکیان دابووە سەر بەردەکەدا، چادرەکە مابوو، لەگەل پێشمەرگەکاندا چووینە ژێری هەرچەندە تەریش بوو چەند کاتژمێرێکمان تیا گوزەراند.

## ١٩٩٠/٤/٤

بەیانییەکەی هەر منو کاك عوسمان چووین بۆ پەناگەی دەلەکەو بە پێشمەرگەکانمانووت ئەوانیش پاش نیوەرۆ بکەونە رێ. لە رێگەدا تووشی ٦ ئاژەلە کێوی بووین بە بەرچاومانەوە ئەرۆیشتن تەقەمان لێنەکردن. کە گەیشتینە بەردەمی پەناگاکەووتم: کاك عوسمان شوێنەکەمان لێرەدایە فەرموو بیدۆزەرەوە، هەندێك تەماشای کردو ووتی هەست بە هیچ ناکەم.. ئەم پەناگایە دوو رێرەوی هەبوو یەکێکیان رووی لە خۆرئاوا بوو ئەویتریان رووی

له خوارەوە بوو، لە پێش دا ڕێڕەوی خۆرئاوامان دۆزی بووەوە، ڕێڕەوی خـواروو هـەنجیرێکی لەبـەردەم دابـوو ئـەم هـەنجیرە نەیئەهێشـت دەرگـای پەناگاکـە دەربکـەوێت. ئـەم شـوێنە زۆر گـرنگ بـوو بۆمـان، لەلایـەك داریووشـکی زۆری هـەبوو، هـەم هەنجیرەکـەشمان ئـەخوارد کـە تـامێکی خۆشـی هـەبوو دوژمنـیش پـەیی بـە پەناگاکـە نەئـەبرد دوای ٦ مـانـگ مانـەوە ئینجـا زانیمـان لـە نـاو هەنجیرەکەشەوە ئەتوانین بچینە خوارەوە.

## ١٩٩٠/٤/٦

حەسەنیە ڕەشی ئامۆزای سەمەد هۆمەرملی کە لە پەناگای کەڵەهەڕ بوو لای کـاك کـوردۆ بـە ڕووتـی ڕایکـرد بـوو چـەكو تاقمەکـەیو تەنانـەت پشتوێنەکەشی بەجێ هێشتبووو تەسلیمی ڕژێم بووەوە، بـەڵام خـەمی ئـەوەمان نـەبوو خەبـەرمان لێبـدات. کـاك کـوردۆیش هـاتبوو بـۆ لای کـاك عوسمـانو بـرادەران نەیئەتوانی سەرکەوێ زۆر ماندوو بوو بـوو بەهـەرحاڵێ بـوو سـەرمان خستە سەرەوە.

## ١٩٩٠/٤/١١

سەرماو سوڵەو باو باران هەڵیکرد بوو ئێمـەش لای خۆمانـەوە دەورەو تەسلیممان ئەکرد، کاك عوسمان چووە خوارەوە.

## ١٩٩٠ /٤/١٣

ئێمەیش لە دەڵەکەکـەوە بـەرەو قـۆپی ڕۆیشتینو شـەوەکەی گەیشـتینە هەرەسـەکەیوێلەکە،وەختبوو گورگ بمـانخوات، د.هـاوڕێ کـۆڵێ کتـێبی مارکسـی هەلگرتبوو پەکیکەوتبوو، لەگەڵیدا مابوومـەوە، پـێم‌ووت دکتـۆر مارکسیەت لـە هـەموو دنیـادا ڕووخـا تـۆ تـازە ئـەم بـارە کتێبـەت بۆچـییە..؟ بەیانییەکـەی کتێبەکانم لێومرگرتو لە هەرەسەکە قایمم کرد.

## ۱۹۹۰/٤/۱۳

هەر لەوێ ماینەوە، دووکەسمان بە ناوی مام ڕەحیمو مام عەزیز گرت بۆ ڕاوەکەو هاتبوون، سەرلەئێوارەکەی ئازادمان کردن هەندێ نانو خورمایان لەسەر کانییەکە بۆ بەجێهێشتین.

## ۱۹۹۰/٤/۱٤

بەرەو پووشێن ڕۆیشتین بە جادەی سلێمانی ـ عەربەتدا پەڕینەوە، لە چوار تاقەوە سەرکەوتین بۆ دێیە ڕووخاوەکەی پووشێن، لەوێ بڕیاروابوو کاك دلاوەر عوسمان بێتە پیریمانەوە هەموو لەشمان تەڕ بووبوو، ئاگرمان کردەوە تا دمەو بەیان ئینجا بە شاخەکەی ڕۆژئاوای دێیەکەدا سەرکەوتین لە ناکاو تووشی مەفرەزەیەك چەکدار بووین ئاگریان کردبووەوە کە ئێمەیان بینی شڵەژان، سەیرمان کرد کاك دلاوەرو برادەرانیەتی، یەکمان گرتوووتی: با هەر بە ڕۆژ بڕۆین. لە نزیکی عازەبان تووشی کابرایەکی جل ڕەش بووین ڕاوە کەوی ئەکرد، کە ئێمەی بینی ڕایکرد، هەرچی بانگمان کرد هەر نەوەستا. نیوەڕۆ لە شیوەکەی پشتی نودێ لامانداو پشوویەکماندا، ئینجا بەناو دێی نودێدا بەرەو کەتوو کەوتینە ڕێ، لە ڕێگادا تەقەم لە کەروێشکێك کرد بۆم نەپێکراو لە دەستمان دەرچوو. لە کانی تووەوە دابەزینو دامان لە تەنکە بوارو شەو لە سەربازگەکەی بەری مامەخەلان تاکو کاتژمێر ۳ی شەو خەوتین. دنیاش زۆر سارد بوو.

## ۱۹۹۰/٤/۱٥

لە ڕۆژئاوای دێی مامە خەلانەوە چووینە ئەودیودا بۆسەر ئاوی بەوزان کە ڕێگەکەی هەموو مین بوو، کاك دلاوەر لە پێشمانەوە مینەکەی هەڵئەگرتەوەو ئێمەیش بە دوایدا ئەڕۆیشتین، لە شوێنێکدا ئەو مینی

هەڵئەگرتـەوەو منـیش تەماشـای دەسـتیم ئـەكردوەختێكم زانـی ڤاڵمارایـەكی بەجێهێشتووەووەختە پـێم لێی بدات، بـانگم كـرد كـە ئەمـە مینێكـەو ڕەتـی كردووە، یەكسەر هەڵگەڕایەوەو مینەكەی بەرپێمی هەڵگرتەوەو ڕۆیشتینە سـەر ئاوەكە. كاتژمێر ٦ ی ئێوارە لە ئاوەكە پەڕینەوەو بەرەو سیرین ڕۆیشتین، دونیا زۆر تاریكونووتەك بوو، گیایەكی زۆر هاتبوو، مەیـدانی مینـی سوپای عێـراق بـوو، بـەهۆی ئـەو گیایـەوە ڕێگاكـەمانوێڵ كردبـوو كەوتبووینـە نـاو مەیـدانی مینیشەوە، نەمانئەوێرا لایت دابگیرسێنین. كاك دلاوەر لە پێشمانەوە بوو بە بێ لایتو بەو تاریكییە هەر بە دەست كوتـان مینـی هەڵئەگرتـەوەو ڕێگاكـەی پـاك ئەكردەوەو ئێمەیش بەدوایدا تاكو لەو شوێنە ڕزگاری كردین. لە ڕۆژئاوای دێـی سیرینەوە كـە نـاو دێیەكـە سـەربازگەیەكی گـەورە بـوو بـەرەو چیای سـووركێو سەركەوتین كە هێڵی بەرگری عێراق بوو بەرامبـەر بـە ئێـران. ئینجـا بـە ڕووی ئێرانیشدا هـەمووی مینـی تاكـە كەسـی (ئەشخاس) بـوو ئەبوایـە بەسـەر بـەردا بڕۆیشتینایە تاكو دێی بلەكێ. كاتژمێری ٣٠ر٤ ی بەرەبـەیان گەیشتینە بارەگـای ڕێكخراو. دوای خۆرو بان گەرمبوون لێپرسراوێكی سوپای پاسداران هاتوووتی: لە كوێوە هاتوون..؟

گەشتەكەی خۆمان بۆ گێڕایەوە..ووتی: جگە لە مەیـدانی مـین ئەمشـەو كەمینیشمان هەبووەو باش دەربازبوون.

بـەم جـۆرە ١٠ مـانگ لـەو هـەردەو هەڵەتـەی گەرمیانـدا لەگـەڵ كۆمەڵـە پێشـمەرگەیەكی دڵسـۆزو ئەمەكـدار بـۆ كوردایـەتی لـە هەلومـەرجی سروشـتی جیاجیـادا ماینـەوە، كـە جگـە لـەوەی ئـەركێكی نیشـتمانی پیرۆزمـان لـە ئەسـتۆ گرتبوووەكو پێشـمەرگە ئـەزمونێكی باشـیش بـوو بـۆ ژیـانی خۆمـانو ئەوانـەی دوای ئێمەش بۆ كاری پارتیزانی دائەبەزن، هەروەها ڕۆڵی ئـەو كەڵـە مێردانـەی ڕێخستنەكانی ناوشارمان لە یاد ناچێ كـە هەمیشـە مـژوڵی ئێمـەیان ئـەخواردو پێداویسـتییەكانیان بـۆ دابـین ئـەكردین لەگـەڵ هەنـدێ خـەڵكی تـری دڵسـۆزی پێشمەرگە كە سەربەخۆ پەیوەندییان پێوەكردبووینو یارمەتییان ئەدایـن.

١٩٩٠/٤/١٦ لە بلەکێ بووین نووسینێکی کاك عەلی بچکۆلم بینی کە ڕەخنە بوو بۆ سەر هێزی پێشمەرگەی کوردستانو بە خراپی ناوی هێنابوون. ئەو نووسینە زۆر نیگەرانیکردم، چونکە مەوزووعیانە بۆ بابەتەکە نەچوو بوو، زۆر لە هەڵچوونێکی دەروونییەوە هەڵقوڵابوو کەچی ئێمەی پارتیزانەکانو سەدان پێشمەرگەی تر لە هەلومەرجە دژوارەکاندا دوور لە هەموو خۆشییەکی ژیان هەڵمانکردبوو، گیانی زۆر کەسیشمان لە پێناوی ڕزگاری گەلەکەماندا بەختکردووە بێئەوەی چاوەڕوانی پاداشت بین. ئەگەر هەڵەیەکیش کرابێ یان ئەنجامدرابێ ئەوە مانای خراپی هەموو شۆڕشو هەموو پێشمەرگە نییە. بۆیە یەکسەر نامەیەکم بۆ نووسی: پێموابوو کە ئێمە بگەینە بلەکێ جەنابت دێیت بە پیریمانەوەو دەست خۆشیمان لێئەکەیت، کە ئەوە یەکساڵە دوورین لە هەموو خۆشییەکی ژیانوماڵو مناڵ.. کەچی لە نووسینەکەتدا هێزی پێشمەرگە بە دزو ڕێگرو تەعەداکەر ناو ئەبەیت.. ئەووەڵامێکی خراپی دامەوە، منیش جارێکی تر نامەیەکی ترم بۆ نووسییەوە ئەم جارەیان وەڵامەکەی باشبوو،وادیارە بێ ئاگا بووە لەوەی ئێمە بۆ ماوەی ساڵێکە لە خوارەوە بووین، هەڤاڵانی ترمان لە خوارەوە بوون، هیوامان هەبوو هەر سەرنەکەوتنە سەرەوەو شەهیدیش بوون، کاك عەلی خۆیشی لە ناوچەی چەمی ڕێزاندا ڕۆژگارێکی سەختی لە ئەنفالەکاندا بەسەر بردووە لەگەڵ کۆمەڵە تێکۆشەرێکی ماندوو نەناسدا. ئەو نووسینەی کاك عەلی بچکۆل بووە مایەی ئەوەی لە ناو کۆمەڵەدا گرفتی بۆ درووست بێتو دواتر بەرەو هەندەران بڕوات.

١٩٩٠/٤/١٧ لە ڕێکخراوی بلەکێ بووین مامۆستا چەتۆ حەوێزی بە نوێنەرایەتی کاك نەوشیروان هاتە لامان بۆ بەخێر هاتنەوەمانو هەندێ دیاریشی بۆ هێنابووین. دوای ٣ ڕۆژ حەسانەوە بە ڕێگای سەرشیوی سەقزدا بەرەو مەریوانو کانی دنیار کەوتینە ڕێ.

١٩٩٠/٤/١٩ برادەرەکانمان لە کانی دنیار هاتنە پیریمانەوە، لە ماڵەوە پ.م جەلالی جەبار کە دایکی ئامۆزامە مناڵێکی جوانکیلەی خستە باوەشمەوە، لێم

پرسی ئەمە کێیەووتی ئەوە شنەیە، شنە کچەکەی خۆم بوو کە بەجێم هێشتبوو منداڵ بوو، کە گەڕامەوە هەم گەورەو هەم جوانتریش بوو بوو.

چەند ڕۆژێکمان لە ماڵی خۆمانو ماڵە برادەرەکاندا بەسەر برد. دوو ئۆتۆمبیلی مەکتەبی سیاسی هاتنە دواماندا ڕۆژی ١٩٩٠/٤/٢٩ چووینە مەکتەبی سیاسیو لە لایەن کاك نەشیروانەوە لە قاسمەڕەش پێشوازییەکی گەرم کراین. تاوتوێیەکی ئەو هەلومەرجەی پارتیزانی کراو هەندێ قسەو گفتووگۆ لەسەر خەباتو ئاییندەی کوردو دواڕۆژی ڕژێمی عێراق کرا. دوای دوو ڕۆژ لە قاسمە ڕەشەوە بەرەو مەریوان گەڕاینەوە، لە سنە لە لایەن دژبانی شاری سنەوە بۆ ماوەی هەشت کاتژمێر گیراینو شەوەکەی ئازادیان کردین. چەند ڕۆژێك لە ماڵەوە بووین.

ئەو کاتە بیرم ئەکردەوە کە پارتیزانی ئەرکێکی قورس بوو، ئێمە لە سەرەتای شۆڕشی نوێدا بە قەدەر ئەمجارە ئەزموونمان نەبوو جگە لەوەی هەلومەرجەکەی ئێستا لە گەڵ ئەوەی پێشوودا جیاواز بوو، ئەگەر چی دۆخەکە نالەبارە بەلام هەمیشە لەبەردەم جۆشوخرۆشداین، ئەو کاتەی توندوتیژی بگاتە دواقۆناغی ئەوا گیانی خۆڕاگریو بەگژاچوونەوە زیاتر ئەبێ. ئالەم کاتەشدا پێشمەرگە ڕۆڵەی مەزنی خەباتە، قارەمانی مەیدانی هەوڵو مەردی ڕێگای درێژەدانی کۆڕی تێکۆشانە، پێشمەرگە هەر پێشمەرگەیە، بەلام هەلومەرجەکە دژوارو پڕ مەینەتییە، بۆ هەر قۆناغێك پێوانەی تایبەتی خۆی هەیە، پێشمەرگەی ئەم دۆخەش تایبەتمەندی خۆی هەیە. بە پێوانە کۆنەکان تەماشا ناکرێ، چونکە لەبەردەم شێوە تاقیکردنەوەیەکی نوێدایە. ئەگەرچی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە بەهاری ساڵی ١٩٨٨ دا تووشی شکستی سەربازی بوو، بەلام ئاشبەتاڵی نەکرد، پێشمەرگە چاونەترسانە تەلیسمی ئەو شکستەیان شکاند، لە قووڵایی چۆڵەوانیدا ئاوەدانی پڕ لە سەوزەلانی خەباتیان ژیاندەوە. کە ئەڵێین شێوەیەکی نوێ مەبەست ئەوەیە پێشمەرگایەتیوەکو جاران نییە، چ لە ڕووی جموجووڵو چالاکییەوە چ لە ڕووی پەیوەندی بە کۆمەلانی خەڵکییەوە بۆ حەسانەوەو پەیداکردنی سەرچاوەی بژێویو گوزەرانەوە.

پێشمەرگە بۆ خەڵکی خەبات ئەکاتو لەوانیشەوە ژیانو مانەوەی سەرچاوە ئەگرێ، قۆناغەکە گۆڕاوە، گۆڕانەکەش سەختی درووستی کردووە، هیچ سەختییەکیش نییە پێشمەرگە بپسێنێ، کە کوردستان سووتاوەو چۆڵکراوە، کە خەڵکەکەی نەماونو دوور خراونەتەوە، بەڵام پێشمەرگە لێیانەوە نزیکن، لە ڕاستیشدا پێشمەرگەی بێ خەڵکی نییە، شۆڕش بێ بەرنامە ناکرێ. بۆیە جێی خۆیەتی ووردبینانە بڕوانینە ئەم لایەنە گرنگەی شۆڕشو پارتیزانیو هەندێ ڕاستی بخەینە بەرچاو:

## ١. جۆری پێشمەرگە:

ئەبێ کۆمەڵێك تایبەتمەندی تێدابێ لەگەڵ هەلومەرجی نوێدا هەڵ بکات، بێ ئەوە ناتوانرێت پشت بە هەموو کەسێك ببەسترێت، ئەو شوێنە هەموو کەسێك ناگرێتە خۆیو بچووکترین هەڵە گەورەترین زیان ئەگەیەنێ، ئەبێ پێشمەرگەی نوێ:

١.خۆڕاگروووره بەرز بێ.

٢.بڕوای بە شێوە جۆراوجۆرەکانی خەبات بێ بە پێی هەلومەرجەکان.

٣.ئارامو لەسەرخۆو کۆڵنەدەر بێ، دوور لە توندوتیژیو تورەییو پەیوەندی لەگەڵ هاوڕێکانیدا ڕێكو نێوان خۆش بێ.

٤.شارەزای شوێنو جێگاو ڕێگاوبانو دەرو دەشت بێ بۆ:

ا/ خۆشاردنەوەو حەسانەوە.

ب/ هاتوچۆی ئەمسەرو سەر.

پ/ خۆ دزینەوە لە شەڕی لابەلای دوژمن.

پێویستە پێشمەرگە هەموو جۆرە کەرەستەیەکی سەربازی پارتیزانانەی بۆ دابینبکرێ، لە حاڵەتیوێڵ بووندا ئەگەر قومباسو نەخشەی پێنەبوو شارەزایی لە ئەستێرە جێگرەکاندا هەبێ بە تایبەتی ئەستێرەی کۆ کەوەکو دوپشكوایەو هەمیشە ڕوو لە خۆرهەڵاتە.

٥. نهێنی پارێزبێو قسە نەدرکێنی، باسی شت نەکات هەم بۆ:

ا/ پاراستنی گیانی خۆیو هاوڕێکانی.

ب/ پاراستنی دوستو ڕێکخستنەکان.

پ/ پاراستنی بنکەو حەشارگەکان.

٦. ئەبێ لەسەر ئەم شتانە دەورە ببینێ: نەخشەی مین، گەرەسەی تەقینەوە، سۆسەکردن، پلاندانان، بەکارهێنانی چەکە نوێیەکانی پارتیزانی، پزیشکی.

ئەمانە پێویستن بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانو بە ئاسانی نەکەوتنە داوە تەنراوەکانی دوژمنەوە. نابێ هەر خۆی بشارێتەوە یان خۆی بدزێتەوە، بەڵکو چالاکیش ئەنجام بدات بە پێی بەرنامەی دیراسەکراو بۆ هەراسانکردنی دوژمنو خەریککردنیو سەرلێشێوانی.

لە ڕاستیدا پێشمەرگەی پارتیزان گەرچی مرۆڤێکی ئاساییە بەڵام توانای لە ڕادەبەدەری هەیە بۆ خۆگونجاندنو هەڵکردن لەوەها بارودۆخێکدا کە بە خەڵکی ئەنجام نادرێ، لەم میانەدا د. ئاتیللا زۆر بە جوانیوووردیوەسفێکی پێشمەرگەی پارتیزانی کردووە کە ئەبێ کۆمەڵێك تایبەتمەندی تێدا بێت کە لە پێشمەرگەی ئاسایی جیای ئەکاتەوە کە ئەڵێت: ئەبێ پارتیزان بەشێك لە ئازایی شێرو بەهێزی ئەسپو خۆڕاگری هێسترو بێ عەقڵی نێرەکەرو فێڵبازی ڕێوی تیا بێت.

هەر یەکێك لەو سروشتانەی ئەو ئاژەڵانە هەیانە لە زۆر باری ژیانو کاری پارتیزاندا بە جۆرێك لە جۆرەکان ڕەنگئەداتەوەو د. ئاتیللا زۆر باشی پێکاوە ئەو بەراووردەی کردووە چونکە خۆیشی پارتیزان بووەو جارێکیان دابەزیوەتە خوارەوەو ماوەیەك لە چۆڵەوانییەکانی گەرمیاندا ماوەتەوەو ئەو بارو دۆخەی تاقیکردووەتەوە. دیارە د. ئاتیللا زۆرتر بەمەبەستی سەردانو بەسەر کردنەوەی دێی بنکە دابەزی کە لە ئەنفالەکانداوێرانکرابوو لە گەڵێشیدا ئەوکەسەی خۆشی ئەویستو تووشی ئەوینێکی بێگەردی کردبوو بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتو هەموو خەونەکانی ئاتیللاشی لەگەڵ خۆیدا بردو هەرگیز نەگەڕایەوەو بەزەییەکی بەم دەروێشە سەوداسەرەی ڕێبازی خۆشەویستیدا نەهاتەوە کە بە جێی نەهێڵێ.. دڵ کاری سەیر ئەکات.. سنوور ناناسێ تەنیا مەبەستەکانی خۆی ئەپێکێ، حەزی ئەچێتە سەر کەسانێك لەگەڵ

ئاستی خۆیدا یەك نایەتەوە.. ئاتیللایەکی ئۆمی یەخسیری داوی کچە شێخێك ئەبێ کە هەرگیز کەسوکاری قایل نەئەبوون ئەو دڵخوازەی خۆی بدەنێ لە بەر جیاوازی پایەی کۆمەڵایەتیو ئاینی کە گوایە ئەوان وەکو شێخ نەوەی پێغەمبەرن.

ئەم جیاوازییە کۆمەڵایەتیە بووە مایەی ئەوەی ئەم دوو دڵە بەستەزمانە لە چوارچێوەی ژیاندا یەك نەگرنەوە تا لە ئەنجامدا کچە شێخ ئەنفال ئەیباو ئاتیللاش ئەمجارە بۆ دیداری هەوارو جێژوانەکانیان نەگەیشتە ئەوێو بە هەناسە ساردی جارێکیتر گەڕایەوە ئێرانو تەنیا لە دوورەوە لە بەرزاییەکانی هەردەی زمنگنەوە هەوای خۆشەویستییەکی خەفەکراوی دێی بنەکەی لە ناو لمستانی بیابانەکانی عەرعەرەوە هەڵئەمژێ.. کە لە دواساتدا لە شەڕێکی ناوشاری کفریدا ئەمیش بە دەستی هەمان ڕژێمی ئەنفالکەر شەهید ئەبێو ئاواتەکانی لەگەڵ فاتیللادا بۆ ئەو دنیا هەڵئەگرێ.. تۆ بلێی لەو دنیا لە ژوانێکدا دوور لە چاوی کەسو کارو.. ئەو دوو دڵە شەهیدەی عەشق یەکنەگرنەوە..!؟

## ٣. ناوچەی کارکردن:

جاران پێشمەرگە لە هەموو شوێنێکدا بە هۆی بوونی خەڵکیەوە لە دێهاتەکاندا بوونی هەبوو، بەڵام لە هەلومەرجی تازەدا ناتوانێ لە هەموو شوێنێکدا بێ، ئەبێ شوێنەکان بەووردی هەڵبژێرێ، چونکە ناشێ هێزی زۆر پێکەوە بێ لەبەر ئەوەی:

خەڵکی نەماوە، سەرچاوەی ژیانو حەسانەوەوەکو جاران نییە بوونی دوژمن فراوانتر بووە ئەو هێزەی لە ناوچەکاندا ئەمێنێتەوە کۆمەڵێك ئەرکیان لە ئەستۆیەوەك:

- هۆی بەردەوامی شۆڕشو خەباتی کۆمەڵانی کوردستانە بە شێوازی جیا جیاوە.

- داڵدەدەری ئەو کەسانەن لە ژێر دەستی دوژمن هەڵدێن.

- هۆی دەستوەشاندنو گوشار خستنە سەر دوژمنو دامو دەزگاکانی.

بـۆ یـە ئـەبێ بـوونی پێشـمەرگە لـە ناوچـەکاندا بـە هۆشـیارییەوە هەڵبژێرێت، ناوچەیواهەیە مردووەو کەڵکی نییـە، ناوچـەش هەیـە زینـدووەو ئەبێ لەلایەن پێشمەرگەوە ئاوەدان بکرێتەوە لەبەر:

نزیکی لەپەیوەندیکردن بەخەڵکییەوە.

بواری زەبر لێدانی دوژمنی تیائاسانە.

ئەگەر لەم ڕووەوە بۆ دوژمن ئاسانتربێ گوشاری توند بخاتە سەر ناوچە زیندووەکانو گیانی پێشمەرگە بکەوێتە مەترسییەوە.. بـەڵام بـۆ پێشـمەرگە لـە هەندێ باردا ئەگـەر بـیر لەشـوێنی مـردووو نـاگرنگیش بکرێتـەوە خـراپ نییـە، ئەگەرچی زەحمەتی زۆریشی تێدابێ بۆ مانەوە لەڕووی:

- پەیداکردنی ئازووقەو پێداویستییەکان.

ـ دووری ڕێگاوبـانو درەنـگ گەیشـتنەجێی مەبەسـتو ناهـەمواری پەیوەندیکردن بەخەڵکییەوە.

## ٣. ژمارەی پێشمەرگە:

لەبەرئەوەی ئەرکەکانوەکو جاران نییە، ئەبێ ژمارەی پێشمەرگەش بـەو پێیە بێت، چەندە هێز زۆربێ ئەبێ ئەرکیش ئەوەندە گـەورە بێو جموجووڵی فرەتـر بـێ، چـەندە کـەمیش بـێ کارەکـان پـوختترو لـەڕادەی توانـا نـەبێ. ئـەو شـوێنانەی پێشـمەرگەی لێدائـەنرێ کـەمترین. لەچـاکترین بـاردا بـۆ هـەر ناوچەیەکی زینـدووو چـالاك ١ ـ ٢ مـەفرەزە هـەبێ، هـەر مەفرەزەیـەکیش ٥ ـ ٦ پێشمەرگە بێ، لەمە زیاتر هەڵناگرێ، هەرچەندە مەسـەلەی ژمـارەی پێشـمەرگە شتێکیوەسـتاو نییـە، ئەشـێ بـەپێی هەلومـەرج بڕیـار بدرێ، هـەر ناوچـەیەك ئـەبێ لێکۆڵینەوەیەکیواقیعیانـەی بـۆ بکـرێو بەهەرەمـەکی هـیچ بڕیـارێ نەدرێ، سەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێ گەرمیان یەك مـەفرەزە بـوو، پاشان زیادی کرد بوو بـە کـەرتێك، ئینجا بـووە یـەك تیـپ، پـێش ئـەنفال بـوو بەسـێ تیـپ.. بـۆ دوای ئـەنفال نـاتوانرێ نـەك سـێ تیـپ بـەڵکو یـەك تیپـێش زۆرە،

ئەتوانرێ ٢ ـ٣ مەفرەزەی ٦ کەسیو پاشان هەلەکە لەبارتر بێ زیاتر بکرێ، ناوچەی قەرەداخوبازیان سنووری دوو تیپ بوو ٢ ـ ٣ مەفرەزەی لێبێوووردەووردە زیاتربن. لەشارەزووردا تەنیا لە بنارەکەدا بواری مانەوەی هێز هەیە، ئەبێ چەند مەفرەزەیەکی جیاجیا هەبن بۆ کارکردنو سەرچاوەی هاتوچۆی هێزەکان بن بۆ سەرو خوارکردن، خۆ لەناوچەی بەمۆو زمناکۆ تەنیا ١ ـ ٢ مەفرەزە هەڵئەگرێ.. لە شارباژێڕیش ١ ـ ٢ مەفرەزەو بۆ ناوچەکانی تریش بەهەمان شێوە. لەوانەیە بۆ سنووری مەڵبەندەکانی تر بەپێی ئەو زەمینەی خۆیان بۆیان برەخسێ هێزی زیاتر دابین بکەن.

ئەگەر مەسەلەی پێشمەرگە بەهەند هەڵنەگیرێ کارەسات ئەقەومێو گیانیان لەدەست ئەدەینو لەوانەشە کاربکاتە سەروورەی پێشمەرگەکان خۆیانو ڕێکخستنیش تووشی شڵەژان ببن، یان نەتوانرێ کەرەستەو پێداویستییەکانیان بۆ دابین بکرێ.

## ٤. پەیوەندی بەخەڵکییەوە:

پێشمەرگە بێخەڵکی نابێ، پێشمەرگە شۆڕش بۆ خەڵکی ئەکەن، ئەبێ پەیوەندییەکی ئۆرگانیکی بەهێز لەنێوان هەردوولایاندا هەبێ، چونکە خەڵکی سەرچاوەی پەیدابوونو مانەوەو بژێوی پێشمەرگەیە، پێشمەرگەیش هۆی پاراستنی ژیانو بوونی ئەوانە لە بەرامبەر بەرنامە ڕەشو دزێوەکانی داگیرکەر. بەڵام بەپێی گۆڕانی بارودۆخەکان جۆری پەیوەندییەکانیش گۆڕانی بەسەردا دێت. لە قۆناغی پێشوودا پێشمەرگە لە ناو خەڵکیدابوو، لەباوەشی گەرمیاندا حەواوەتەوە، کەچی لە قۆناغی دواتردا ئەو باوەشە گەرمە نەماوە. ئەوان دوور کەوتوونەتەوە، جۆرێك لەدابڕان بەرپابووە، نەك بەوواتایەی کەئیتر هیچ نەکرێتو دەستەپاچەبن، لەم قۆناغەدا جۆرە پەرۆشییەك، خەمخۆرییەك هاتووەتە کایەوە هەندێ لەو بۆشاییەی پڕکردووەتەوە، ئەگەرچی لە ئاستێکی

بچووکیشدا بێ بەڵام تەوژمێکی کاریگەری هەیە، دوژمن قەت ئەوەندەی ئێستا بۆی نەلواوە بەرنامەی لەناوبردنی کورد جێبەجێبکات، بەڵام لەولاوە پشتیوانی خەڵکی بۆ شۆڕش دەستەبەر بووە، کەواتە ئەم هەلە لەگەڵ زەمەنی ئاشبەتاڵ جیایە، نائومێدی بەخش نەبووەو نییە. لەڕێگەی ڕێکخستنەکانەوە کەڕۆڵی باڵایان هەبووە هەموو جۆرە پێداویستییەکی ژیانیان بۆ پێشمەرگە دابین کردووە. گەیاندوویانەتە شوێنی تایبەتیو لەلایەن پێشمەرگە گواستراوەتەوە بەدوو شێوە:

١. بەکارهێنانیووڵاخ.

٢. کەووڵاخ نەبووبێ پێشمەرگە بەکۆڵی خۆیان شمەکەکانیان گواستووەتەوە.

ئەگەرچی بۆ هەریەك لەم شێوانە کێشە هەیە، لەباری یەکەمداووڵاخ زۆر بەسوودەو ناتوانین دەستی لێهەڵبگرین، بەڵام مەترسی کەشف بوونو دۆزینەوەی شوێنەکانی هەیە، لەباری دووەمدا خۆپاراستنی تێدایە، بەڵام ماندوو بوونی زۆری تێدایە، ئەوەی بەووڵاخ ئەگوێزرێتەوە پێشمەرگە بەچەند جارێك ئەیبات، ئەمە یەکجار زەحمەتە مەگەر ئیشیان هەر ئەمەبێ. پەیداکردنی ئازووقەو خۆراك گرانە، ئەبێ بەکارهێنانیشی دەستی پێوەبگیرێو هەرکەس بۆ خۆی نەبێو شتەکان بەفیڕۆ نەچێو لەناومراستدا پەك بکەوێ، ئەبێ پێوانەیەکی تایبەتی بەکاربهێنرێ بۆ ئەو برە پێشمەرگەیەو لەهەمان کاتیشدا قایمەبکرێو پاشەکەوت هەبێ بۆ کاتێ تووشی دابڕان ئەبن یان ڕێگاکانی هێنانی شمەك ئەگیرێ یان هێرشو پەلاماری دوژمنو کێومالکردن دەست پێئەکات یان ئاشکرا ئەبن. خواردن بەبڕی کەم بەکار بهێنرێ لەلایەك بۆ دەست پێوەگرتن لەلایەکیش بۆ خۆپاراستن لەتووشبوونی نەخۆشی، جگەلەوەی کەهەندێ خۆراك هەر دەست ناکەوێ یان بەکەمی هەیە ئەمە فێری کەم خۆراکیمان ئەکات، لەهەمان کاتیشدا لەوانەیە تووشی بەدخۆراکیش ببین.

خۆراك هەر مەترسی دوژمنی نییە کە بکەوێتە بەردەستی، بەڵکو ئەبێ بەباشی هەڵبگیرێو لەهەندێ دوژمنی تریش بپارێزرێ وەکو مشك، زەردەواڵە، سوچەڕ، دەعبای کێوی تر، باران، نابێ لە ناو گونیەو کیسەی نایلۆندا هەڵبگیرێ، چونکە ئەو دەعبایانە سەری تێئەکەن و هیچی ناهێڵن. بەڵکو ئەبێ سوود لە بەرمیلی گەورەی سەرگیراو یان دەبەی پلاستیکی گەورە یان تەنکی وەربگیرێ. لەبەر نەمانی ئاوەدانی مشك و زەردەواڵە ئەوەندە زۆر ئەبێت قەلاچۆکردنیان ئاسان نییە، لەکاتی نان خواردن بەملا ولای پێشمەرگەدا بە بەردەستیدا چەندین مشك فرتەی ئەکرد.بۆ هەڵگرتنی ئازووقە ئەبێ چەندین شوێنی جیاجیا هەبێ ئەگەر شوێنێك ئاشکرابوو لەلایەن دوژمنەوە، شوێنەکانی تر سوودیان لێ ببینرێ. باشترین کات بۆ هێنان و وەرگرتنی ئازووقە لە ڕێکخستنی شار یان پەیوەندی دۆستانەی خەڵکی کاتی شەوە، ڕۆژ زۆر پڕ مەترسییە، هێنانی ئازووقە لە ڕێگای ڕێکخستنەوە باشترە چونکە ئیلتیزاماتی تێدایەو مەترسی لابەلای تێدانییە لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا ئەگات، بەڵام ئەوەی لە ڕێگەی دۆستانەوە دێت لەوانەیە کاتی بێ یان هەندێ جار مەترسی لێبکەوێتەوە. نابێ لە کاتی وەرگرتنی ئازووقەدا پێشمەرگە خۆ تێهەڵقورتێن بێ و هەوڵی ناسینی ئەو هەڤاڵانە بدا کە هاتوچۆ ئەکەن، زۆرجار ئەمە ئەبێتە مایەی مەترسی بۆیان لەکاتی تەسلیم بوونەوە بە دوژمن، پێویستە ئەو ئازووقەی قایم ئەکرێ ماوە ماوە سەردان بکرێ نەکو دەعبا سەری تێکردبێ یان لەهەندێ باردا دوژمن پێیبزانێ ژەهراوی بکا یا مینرێژی بکا. لەکاتی گۆڕینی هێزدا ئەبێ حیسابی ئەو هێزەش بکرێ کەدێنە خوارەوەو ئەکەونە کارکردن بۆ شارەزا بوون و هاتوچۆی ئازووقە.

## ٥. بنـــكــــه:

که شۆڕش بەرپابووە، پێشمەرگە کەم بووە، لەناو دێهاتەکاندا جێگای خۆیان کردووەتەوە، بەڵام سەرکردایەتی لەناوچە سنوورییە دوورە دەستەکان بنکەیان چێکردووە، کە هێزی پێشمەرگە گەشەی کردووەو زۆرتر بووە هەل لەبارتر بووە بۆ دانانی بارەگای تایبەتی، بۆ مەڵبەندو تیپەکانو پێشمەرگەش گەڕۆك بوون، دواتر بارەگای کەرتو مەفرەزەش دانران، گەرچی ئەمە لەزۆر باردا بووە مایەی ئەوەی ئەو شوێنانەی بارەگای لێبووە ببنە نیشانەی تۆپبارانی دوژمنو بێزارو هەراسانکردنی خەڵکی. بەڵام لە هەمان کاتدا بنکەو بارەگا خۆی لەخۆیدا گرنگ بووە چونکە:

- خاڵی پەیوەندیو تێکەڵییە لەگەڵ خەڵکیدا.
- شوێنی هاتوچۆی خەڵکییە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان.
- جێگای حەسانەوەی پێشمەرگەو چەق بەستنی دەسەڵاتی شۆڕشە لەو ناوچەیەدا.

بەڵام بنکە لەم قۆناغەدا نابێ لەوەی پێشوو بکات، بەڵکو ئەبێ زۆر جیاوازتر بێ، لەجیاتی خانوو پێکەوەنان کون بووەتە لانەی حەسانەوە، کە لە بنەڕەتدا شوێنی ئاژەڵە کێوییە، بەڵام ناچاریوائەکات مرۆڤیش سوودی لێ ببینێ، ئەم بنکەو کونانە دوو جۆرن:

١. بنکەو کونی سروشتی: لە بنەڕەتدا خۆی هەیە، بەکەمێ دەسکارییەوە چاك ئەکرێ، مەترسی هەیە لە ڕووی هەرەس هێنانەوە یان لەبەر شارەزایی خەڵکی ناوچەکە بۆ ئاشکرابوون، مەگەر کونێك کەس نەیدۆزیبێتەوە.

٢. بنکەو کونی دەستکرد: پێشمەرگە خۆیان درووستی ئەکەن لەو شوێنانەی دوژمنی بەسەرەوە نییەو نایدۆزێتەوە یان بارانو لافاو تێکی نادا. زۆرجار لەناو دۆڵی داخراوی هاتووەیەکدا یان لەشوێنی بەرزی بەپێی سروشتی جوگرافیایی ناوچە درووست ئەکرێ کە لەناوچەی شاخاوی بە جۆرێكو لە دەشتایی بە جۆرێکی تر، لەهەردوو جۆرەکەدا ئەبێ لە نزیکی کانیاو بێت،

بەڵام کانیاوی ئاشکراو زانراو مەترسی هەیە، ئەبێ هەوڵ بدرێ کوێرەکانی بدۆزرێتەوە.

بۆ حاڵەتی پێویست ئەبێ چەندین بنکەی جیاجیا دەستنیشان بکرێ، ئەگەر بنکە ئاوەدانەکە ئاشکرا بوو بێ ماندوو بوون بچنە یەکێکی تر.

مانەوە لەناو بنکەدا ئەبێ بەو پەڕیووریاییەوە بێو پەیڕەوی ئەم خاڵانە بکرێ:

١. سڕینەوەی شوێنەواری پێو هاتووچۆ: ئەبێ پێ لە سەر بەرد دابنرێ یان پارچە لباد یان پارچە کومبار بکرێتە ژێر پێڵاوەوە تاشوێن پێدەرنەکەوێ، یان درووستکردنی ژێر پێڵاو بەپێچەوانەوە لە بنی پێڵاوەکە بدرێو بەمەش

٦. خۆشوشتنو جل شوشتن بەشەوانەبێ، ئەو بەردەی جلەکانی لەسەر ئەشۆرێ دوور بخرێتەوە، کەفاوی سابونو تایتو پارچە سابونو شتی تر بەجێ نەمێنێ.

٧. لەکاتی ئاگرکرنەوەدا نابێ دووکەڵ هەبێ، ئەو شوێنە بەزوویی ئاشکرا ئەبێ، ئەگەر ڕووی جێگەو بنکەو حەشارگەکە لەخۆری بەیانیان بوو، ئاگری زۆر لەکاتی ئێوارەدا بکەیتەوە، ئەگەریش ڕووی بنکەکە لەخۆری ئێواران بوو بەیانیان ئاگری زۆر بکەیتەوە بەتایبەتی بۆ نان کردنو چێشت لێنان، دوای تەواو کردنی کار ئەبێ خۆڵەمێشو سەرەبزووسکەکان بخرێتە ژێر خۆڵەوە.

٨. چاودێریو حەرەسیاتی بەردەوام هەبێ، نەبا دوژمن لە ناکاو بۆ کێومالْ دەربچێو تووش ببن.

٩. پێویستە لەسروشتی ناوچەکە شارەزا بین، لەدارو گابەرد یان شتیتر کەلە شێوەی مرۆڤ یان ئۆتۆمبیل دایە بۆ ئەوەی لێمان نەگۆڕێت لەکاتێکدا شتی لەو بابەتانە بەرچاومان ئەکەون.

١٠. دووربینی شەو زۆر پێویستە بۆ بینینی دوژمن لە دوورەوە بۆ زانینی ژمارەیان.

١١. شوێنیووڵاخ لەشوێنی چەپدا یان ژێرزەمیندا سازبدرێ، ئەبێ تەرسەقوولەکەی بشارێتەوە، دیارە تەنیا سەرچاوەی پەیداکردنیووڵاخیش ڕەبایەکانی دوژمنە، چونکەووڵاخ نەماوە.

## ٦. چالاکی پێشمەرگە :

جاران ئەرکی پێشمەرگە چالاکیو شەڕو دەستوەشاندن لە هێزەکانی دوژمن بوو، لەم قۆناغەدا ئەرکەکەی هەندێ گۆڕانی بەسەردا دێت، لێرەدا پێشمەرگە دەورێکی سیاسیش ئەبینێ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ نابێ چالاکی ئەنجام بدات، بەڵکووەکو جاران ناتوانێ هەڵسووڕێ، هەلومەرجەکە گۆڕاوە دوژمن لەهەموو لایەك هەیە، دەستوەشاندن ئاسانە، دەربازبوون زەحمەتە، کەشەڕ بکرێ ئەبێ باش تاوتوێ بکرێ، هەڵەشەیی نەکرێ بۆ سەرکەوتنێکی بچووك زیانی قورس بدرێ، ئەبێ حیسابی کات بکرێ بۆ پەلامارو دەربازبوون بۆ شوێنیش ئەبێ حیسابی ئەوە بکرێ:

١. لەنزیکی بنکەو حەشارگەکان نەکرێ.

٢. لەنزیکی شارو شارۆچکەو ئۆردووگاکاندا نەبێو خەڵکی بێتاوان تووش ببن.

٣. ئەبێ دەستوەشاندنەکە کوتوپڕو کاریگەر بێو بەپەلە جێگەکە بەجێ بهێڵدرێت، شەڕی بەرگری نەکرێ هەوڵ بدرێ برینداروو شەهید نەدرێ، چونکە زۆر ناخۆشە بەجێ بهێڵدرێن.

٥. خۆ خەریك نەکرێ بەکۆکردنەوەی دەستکەوتەکان مەگەر ئەوانەی ئەکەونە بەردەست..

٦. باشترین هۆی لێدانی دوژمن مین دانان یان کەرەستەی تەقینەوەیە لە نزیك ڕەبایەو دامو دەزگاکانیدا.

٧. ڕووبەڕووبوونەوەی جموجووڵی دوژمن: لەم قۆناغەدا کەچالاکی پێشمەرگانە کەمتر بووەتەوە هێزەکانی دوژمن بواری جووڵانەوەی زۆرتری ئەبێ، بەشێوەی جیاجیا بۆ پاکسازی پێشمەرگەو بنکەکانی ئەکەونە گەڕ:

ا / سۆسەکردن: دوژمن چەکدارەکانی لە شێوەی دەستەی بچووکی نهێنیدا ئەنێرێ زۆر بەدزییەوە لە ناوچەکاندا خۆیان مات ئەکەن بۆ بینینەوەی شوێنەواری پێشمەرگەو دەرکەوتنیان‌و ئاگادارکردنەوەی سەروویان لە ڕێگای جیهازەوە بۆ پەلاماردانی بەهێزی گەورەو کۆپتەرەوە. ئەبێ لەمە زۆروریابین‌و فریای خۆبکەوین، ئەگەریش بکرێ دەستیان پێدا بهێنرێت.

ب / کێومالْ: ئەمەش کارێکی کۆنی سوپای عێراقییە بۆ گەڕان بەشوێن پێشمەرگەدا لەسەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێوە. بۆ چەند ساڵێك باوی نەما، کەچی دوای ئەنفال بەرەوی پەیداکردەوە بۆ پاکسازی ناوچەکان کەجاری‌واهەیە پاکسازی هەر بەهێزی پیادەی ڕووت ئەکرێ، چەندین لیواو فەوج لەناوچەیەکی بچووك یان گەورەدا بڵاوئەبنەوەو بست بەبست ئەگەڕێن، جاری‌واش هەیە بەهێزی پیادەو ئالیاتی زۆرەوە ئەکرێ بە ڕێگا گشتی‌و جادەکاندا ئەڕۆن‌و چەکدارەکانی زۆر دوور ناکەونەوە، زۆرجاریش هەر کۆپتەر بەشداری ئەکات‌و ئاسمانی ناوچەکە جەنجاڵ ئەکات،وەکو داڵەکەر خۆر هەر ئەسووڕێنەوە.

جاری‌واهەیە کێومالْ یەك ڕۆژە، جاریش هەیە بۆ دوانزە ڕۆژ درێژەی کێشاوە، لەم کاتەدا پێویستە پێشمەرگەووریاو ئامادەبن‌و جمووجوڵ نەکەن‌و زیاتر خۆبپارێزن بەوەی:

١. لەبنکە قایم‌و نابەرچاوەکانیاندا دەرنەچنە دەرەوە.

٢. دوورکەوتنەوە بۆ شوێنێکی تر کە کێومالی تێدانەبێ.

٣. ئەبێ ئازووقەو کەرەستەی پێویست هەڵبگیرێت تاماوەی کێومالەکە تەواو ئەبێ.

٤. لەکاتی کێومالّدا نابێ قرەو دەمەتەقێ بەدەنگی بەرز بکرێ.

پ / خجڵ کردن: هەندێ جار دەستەی بچووك دەرئەچن بەئاشکرا بۆ ئەوەی دەستیان لێبوەشێنرێ، بەمەش ئاشکرا ئەبنو لەناوەڕۆکیشدا خەریك کردنی پێشمەرگەیە تاهێزی زۆریان بۆ ڕەوانە بکرێ. ئەبێ لەمە خۆبپارێزرێ.

ت / ڕێگاتەندنو بۆسەدانان: ئەو شوێنانەی جێی گومانو هاتووچۆی پێشمەرگەی لەسەرە بۆ چاوپێکەوتنی ڕێکخستنی ناوشارو دۆستانو گواستنەوەی ئازووقە، دوژمن ڕێگاکە ئەتەنێو بۆسەی لێدائەنێ بۆ ئەوەی بکەونە ناو داوەوەو زەبریان لێبدرێ.

٨. پێویستیەکانی پارتیزان:

پێویستیەکانی ئەکرێ بەچەند بەشێکەوە:

ا / پێویستیەکانی ناو بنکە : چەند جۆرێکە:

- خۆراكو خواردەمەنی: برنج، شەکر، چای، ڕۆن، ئارد، نۆك، نیسك، ماش، فاسۆلیا، خوێ، ئالەتو زەردەچەوە ...هتد

- کەرەسەی ئازووقەو کەلوپەل پاراستن: بەرمیل، تانکی، باوەڵ، دەبەی پلاستیکی ... هتد

- کەلو پەلوپێخەف:

- کەلو پەلی زستانەو هاوینەی لەبەرکردن : ئەبێ خاکی بێ، دوگمەو تەرەقەی بریقەداری پێوەنەبێ. سەعات قایشی هەبێ نەك زنجیر، پشتوێنی ئەستوور گرنگە.

- پێخەفی خەوتن بەتایبەتی کیسەخەو پێویستە.

- شمەکیوەخت بردنەسەر: ڕادیۆ، کاغەزی یاری، تاوڵەو دۆمینە، کتێبو گۆڤار

- جیهازی پەیوەندی کردن:

- جیهازی بێتەلی گەورە لەجۆری ڕاکاڵ بۆ پەیوەندی بەسەرەوە.

- جیهازی پەیوەندی بچووك بۆ پەیوەندی لەگەڵ دەستەکاندا.

- ئەبێ ماوەی جیهاز کردن کەم‌و شتەکان کورت بێ، تادوژمن بەهۆی جیهازی ئیستمکانەوە نەیان دۆزێتەوە، ئەبێ ڕۆژانە شەپۆلەکان بەپێی خشتەی تایبەتی ئامادەکراو بگۆڕدرێ، لەکاتی تەسلیم بوونەوەی پێشمەرگەدا هەموو جۆرە جفرەو شەپۆل‌و کلیلەکان بەپەلە بگۆڕدرێ، ئەگەر لەسەر جیهاز بوو یان شارەزایی هەبوو.

-وولاخ: بۆ هەر بنکەیەك‌وولاخێك یان دوان پێویستە، بەپێی توانای بەخێوکردن‌و حەشاردان‌و درووستکردنی ژێر زەمین بۆی.

ب / پێویستییەکانی ڕۆیشتن بەملاولادا:

- نەخشەو قومباس بۆ دۆزینەوەو دیاری کردنی شوێن‌و جێگاکان.

ـ مەتارەی ئاوی گالۆنی‌و زەمزەمەی ئەلەمینۆم لەکاتی کێومال‌و سەفەرکردندا.

- کەرەسەی چالێنان بە تایبەتی شەکر بۆ بەربەستکردنی برسێتی باشە.

- خواردنی قووتوو کراو

- بارانی لەزستاندا پێویستە

-وولاخ بۆ گواستنەوەی ئازووقەو شتەکان

پ / هەندێووردەواڵەی تر:

- دەرزی‌و دەزووی دروومان

- سوژن

- قەیچی

- چەقۆی هەمەجۆر

- بزماری پێلاوو بزماری کەوش

- دەزووی نایلۆنی بۆ درووونەوەی پێلاوو کۆڵەپشت

- توورەکەی شەکرو چاو خوێ‌و نان

ـ شوشەیەکی ٤٠ - ٥٠ سی‌سی نەوت لەگەڵ چەرخێکی نەوتدا بۆ ئاگرکردنەوە

- قەمە یان حەربە بۆ شوێن چاككردن یان بڕینی تەلی دڕكاوی
- كڵاوی خاكی بۆ داپۆشینی سەر
- چەرخی غاز
- سوودوەرگرتن لەپێستی ئاژەڵ بۆ پێڵاوو كۆڵەپشتو قایشی تاقمی تفەنگو فەردە درووستكردن.
- ٣ ـ ٤ مەتر گوریس بۆ باربەستنو دارهێنان
- چەند دەبەیەك گازۆیل بۆ چەك پاككردنەوەو هەڵگرتنی.

ت / پێویستیەكانی چەكو پاراستن : ئەبێ چەكی پارتیزانی نوێ:
- سووك بێ
- سوود لەچەكی بێدەنگوەربگیرێ بۆ حاڵەتی تایبەتی
- دژی فڕۆكە
- مین دەوری گرنگی هەیە
- تی ئێن تی
- بۆ پاراستنی چەكە زیادەكان سوود لەگازۆیلوەرئەگیرێ بۆ چەوركردنیانو هەڵگرتنیان لەناو بەرمیل یان دەبەی پلاستیكی تاكو نەڕزێن یان ژەنگن نەبن.

ج / هەندێووردە زانیاری تر:
- خۆپاراستن لەشمەكی بەجێماوی دوژمن بەتایبەتی خواردەمەنی: نەبادا ژاراوییان مینرێژكرابێ.
- بەشەو ئاگرنەكرێتەوە، جگەرە دانەگیرسێ، بۆ جگەرە داگیرسان چەرخی غاز لە شقارتە باشترە. هەروەها بۆ شەو دارجگەرەی سەرقاپدار هەبێ.
- هاتو چۆ بەشەو بێ، گەر بە ڕۆژیش بوو كاتژمێر ٢ـ ٣ی ئێوارە بێ.

٩. گۆڕینی هێز:

ئەو هێزەی لە خوارەوە بێ ئەبێ ماوە ماوە بگۆڕدرێت، هی تر بچێتە شوێنی، تا ئەوانەی خوارەوە پشوویەك بدەنو گوڕێك بسێنن، ئەبێ بچنە لای

پزیشك‌و فه‌حسی خۆیان بكه‌ن تاهه‌رچی نه‌خۆشی‌و موزاعه‌فاتیان تووش بووه به‌ده‌رزی‌و ده‌رمان چاك بكرێنه‌وه، خواردنی باش بخۆن بۆ به‌هێز بوونیان‌و تین‌و تاویان تێبێته‌وه.

ئه‌و هێزه‌ی ئه‌چنه شوێنی ئه‌وانه ئه‌بێ هه‌مان ده‌ستووری ئه‌وان بن، رێكوپێك ده‌ورو ته‌سلیم بكه‌ن، له كاتی گۆڕینه‌وه‌دا ئه‌بێ پێشه‌نگێك به جیهازه‌وه بنێردرێته پێشوازیان به‌هه‌مان ئه‌و رێگایانه‌ی كه‌هێزه‌كه‌ی سه‌ره‌وه‌ی پیادێت به‌وورياييه‌وه بۆ خۆپاراستن له دوژمن. نابێ ئه‌و هێزه‌ی ئه‌گۆڕدرێ هه‌موويان پێكه‌وه‌بن نه‌كو له‌كاتی تێكه‌وتندا تیابچن. پاش گه‌يشتنه‌جێ ئه‌بێ فه‌رمانده‌و كاديری رێكخستن كۆبوونه‌وه به پێشمه‌رگه‌كان بكه‌ن بۆ پاراستنی نهێنی‌و قسه‌كردن له‌سه‌ر شوێن‌و جێگاو ئه‌و كه‌سانه‌ی ده‌يان بينن تاكو به ئاسانی ده‌ست دوژمن نه‌كه‌وێ، كورد ئه‌ڵێ: قسه كه‌وته زارێ ئه‌كه‌وێته شارێ.

له درووستكردنی پێشمه‌رگه‌ی پارتيزانی نوێی گورجو گوڵی ديسپلينداری تێكۆشه‌ردا رێكخستن رۆڵی خۆی ئه‌بينی بۆيه پێويسته له كاتی ناردنی هێز بۆ خواره‌وه كاديری چاپوك‌و لاوی خوێنگه‌رم‌و كارامه‌و دڵسۆزو تێگه‌يشتوو بنێردرێ تاكو:

- گيانی هاوكاری‌و ته‌بايی‌و خۆشه‌ويستی به‌هاورێكانی ببه‌خشێ، هه‌موان خه‌می يه‌كتر بخۆن، دوور بكه‌ونه‌وه له خۆپه‌رستی‌و خۆده‌رخستن.

- جه‌وی ئيلتزام‌و گوێرايه‌ڵی درووست بكات له‌سه‌ر بنه‌ڕه‌تی رێزگرتن نه‌ك تووڕه بوون‌و سزادان.

- بايه‌خدان به‌كاری رێكخراوه‌يی‌و به‌خشينی زانياری پێويست‌و شيكردنه‌وه‌ی بارودۆخه‌كان له‌رووی سياسی‌و به‌دواداچوونی ته‌واو له‌سه‌ر رووداوه‌كان، هه‌موو پێشمه‌رگه‌يه‌ك‌وا هه‌ست بكات خۆی له‌ناو مه‌به‌سته‌كانداية‌و لێيه‌وه دوورنييه.

- به‌رزكردنه‌وه‌ی راپۆرتی هه‌ڵسه‌نگاندن له‌باره‌ی ره‌فتارو رۆڵ‌و راده‌ی ئيلتيزام‌و راپه‌راندنی كاروبار له‌سه‌ر بناغه‌ی‌ويژدان‌و راستی‌و دوور له رق‌و كينه‌و ره‌قی تاهه‌ريه‌كه مافی خۆی بدرێتێ.

ڕۆژی ١٩٩٠/٥/٨ هەواڵی مردنی مەلا عەزیزی سیامەنسووری گەیشت، کە کاتی خۆی لێپرسراوی ناوچە بوو لە گەرمیانداو مامی مامۆستا جوامێریش بوو، بەباشی یەکتریمان ئەناسیو ئەو یەکێك لە دڵسۆزەکانی ماڵی مەلا مستەفا بوو، بەڵام لەم دواییەدا کەوتبووە گلەییو بناشت لێیانو هەمیشە باسی بێوەفایی ئەو بنەماڵەیەی ئەکرد کە چۆن لە دوا دواییدا هەموو کەسێکیان لا بێنرخە تەنیا خۆیان نەبێت. بۆ ڕێزلێنانی چووینە پرسەکەی لە ئۆردووگای ڕەوانسەر.

لە دوای گەڕانەوە لە ڕێگەی لووتکەی ڕەنگینەوە چوومە سەر شاخی سوورێن بۆ پەیوەندی بە برادەرانی پارتیزانی گەرمیانەوە. ئینجا ئیجازەیەکم کرد لەگەڵ مام جەلالی گەرمیانیدا بۆ بوشەهری ئێرانیو سەردانی هەندێ خزمو کەسو کار.

ڕۆژی ١٩٩٠/٥/٢٢ لە کرماشانەوە کەوتینە ڕێ دنیا ساردو فێنك بوو، شاخی بێستوون بەفری پێوەبوو، کە گەیشتینە ئەهواز دنیایەکی تر بوو، لە ناو ئۆتۆمبیلێکی درێژدا بووین، ساردی ئیشی ئەکرد، جامەکەم تۆزێك لادا هاڵاوێکی تەنوور ئاسا هاتە ژوورەوە، کاتژمێر ٩ی بەیانی گەیشتینە بوشەهر کە شارێکی بەندەری ئێرانی یە، کە ئاو بەرز ئەبێتەوە ئەبێتە نیمچە دوورگەیەكو کە ئاو نزم ئەبێتەوە ئەکەوێتە قەراخ دەریاوە. ئێمە بۆ ماڵی براکانی کاك عەبدوڵڵا جان ئەچووینو ئەوان لە دائیرەی ژینگە پارێزی بوون، دائیرەکەمان دۆزی یەوە، بە ڕێکەوت هەردوو براکە پێکەوە لەبەردەم دائیرەکەداوەستا بوون، من نەیانم ئەناسی، مام جەلالیش بە منداڵی دیبوونی، ئەو ناسینیو خۆی پێناساندن، ئەوانیش بە گەرمی هاتن بە دەممانەوە، فەرموویان لێکردین بۆماڵەوەیان کە لە دێی بوشکانی شاری بەراز جان بوو. تەماتەی ئەو ناوچەیە خەریکبوو تەواو ئەبوو، کەچی لە کرماشان هێشتا تازە تەماتە ئەچنرا. چەند ڕۆژێك لە بووشکان بووینو دوایی گەڕاینەوە بۆ بوشەهرو چووینە سەر دەریای فارس. شەوێکیش لە ماڵی ئازادی مەلا ڕەحیمی ئەندامی ناوچەی کۆنی کفری بووینو

پیاوێك ئیخباری كردین‌و هاتنە سەرمان. دوای ئەوە گەڕاینەوە بوشەهرو كرماشان‌و ڕۆژی ١٩٩٠/٥/٢٨ گەیشتینەوە كانی دینار.

لەم مانگەدا هەندێ ڕووداوی گرنگ هاتە پێشەوە كە بوش‌و گۆرباتشۆف پێكەوە لەسەر مێزی گفتوگۆ دانیشتن‌و لەسەر زۆر مەسەلەی چارەنووساز قسەیان كرد كە بایەخی سیاسی گرنگیان هەبوو، دوای ئەو هەنگاوە گەورەیەی سەركردەی سۆڤیەتی كۆن نابووی بە ناوی گلاسنۆست‌و پرۆسترۆیكا كە ڕووی مێژووی گۆڕی‌و سەر لە نوێ پەیوەندی یە جیهانییەكان داڕێژرایەوەو زۆر مەسەلەی سیاسی پێناسەی تری بۆ كرا.

## تەشكیلات

دیار بوو لەبەر ڕۆشنایی ئەو هەلومەرجەی خەباتی نوێی گەلەكەماندا ئەبوایە هەندێك هەنگاوی كاری پێشمەرگانەو ڕێكخراوەیی بنرێت كە لە ئاستی پێداویستی قۆناغەكەدا بێت‌و تەشكیلاتێك بكرێت‌واقیعیانە بێت‌و ئامادەكاری بۆ بكرێ. بۆ ئەم مەبەستە كاك نەوشیروان ڕۆژانی ٩و١٩٩٠/٦/١٠ لەگەڵ هێزەكانی سنووری مەڵبەندی یەكدا كۆبووەوە، هێزەكان كرا بە سێ بەشەوە:

١. هێزی تایبەت یان فیدایی گەرمیان كە پارتیزانەكانی ئەگرتەوە.

٢. هێزی بەتالیۆنەكان، ئەوانە بۆ سەر سنوورەكان دانرابوون‌و جێگرەوەی پارتیزانەكان بوون.

٣. هێزی یەدەك: لە ماڵەكانی خۆیاندا ئەبن‌و یارمەتی ئەدرێن بۆ كاتی پێویست. ئێمە بووینە بەتالیۆنی یەك، بارەگاكانمان لە میری سوور بوو، تەشكیلاتەكان تەواو بوو.

ڕۆژی ١٩٩٠/٦/٢٠ هەندێك پاسدار لە پاسگای مەركەزی مەریوانەوە هاتنە سەرمان لە دێی كاڵ، دوایان كرد بە پەلە چۆڵی بكەین یان دەستووری تۆپبارانمان ئەدەن، منیش پێم‌ووتن: ئێمە بە بڕیار هاتوونیەتە ئێرەو چۆڵیشی

ناکەین‌و هەر کارێك بکەن خۆتان بەرپرسیارن.. ئەمانە بیانوویان پێئەگرتین بۆ هەندێ کاری سۆسە کردن بۆدیوی عێراق‌و زانیاری کۆکردنەوە لە سەر ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی. کە ئێمە بەو کارانە قایل نەئەبووین. جۆری مامەڵە کردنیان توند بوو، بەلام ئێمە سارد بووین، ئیتر کە زانیان هیچمان لێ هەڵناکرێنن،وازیان لێ هێنایین.

لەو کاتەدا لەناو کانی دیناردا هەندێ زەلامی سەرسەری شەڕیان پێ ئەفرۆشتین، یەکێك لەوانە کەریم قەیاس بوو، کەسێکی تلیاکی‌و هیچ‌و پووچ‌و ڕقی لە کوردی عێراقی بوو، بە فیتی هەندێ لە دەزگا ئەمنیەکان کێشەیان بەرپا ئەکرد، بەرامبەر بە ئەمە ئێمەیش ناچار لێیان هاتینە دەست‌و تەمبێیەکی باشکران، ئەمە بووە پەندێکی باش کەس نەوێرێ ڕووبەڕووی خەڵکانی ئێمە ببنەوەو لێشمان بترسن.

لەو ماوەیەدا گەدەم ئازاری ئەدام، بە پێویستم‌زانی سەردانی تاران بکەم بۆ چارەسەرکردن، ئەو ماوەیە لە خوارەوە بووین بە هۆی نەبوونی خواردنی باش‌و چۆڵەوانی‌و ئاوو هەوای ناوچەکەوە کاریگەرێتی لەسەر تەندرووستیمان دانا، چوومە تاران‌و نازوورێکم کردو گەڕامەوە کانی دینار.

ڕۆژی ١٩٩٠/٧/١٥ لە بارەگای بەتالیۆن کۆبوونەوەمان کردو ئەرکەکانمان دابەشکردو تەشکیلاتمان ئەنجام دا بەم جۆرە:

## ا / تەشکیلەی بەتالیۆنی ا:

١. هەیئەتی بەتالیۆن (٣کەس):

ل.بەتالیۆن، جێگری بەتالیۆن، ڕابەر سیاسی بەتالیۆن

٢. ل. بارەگای بەتالیۆن

٣. ئیدارە (٥ کەس): ل. ئیدارە ١کەس، نانەوا ٢کەس، ئاشپەز ٢ کەس

٤. ئیسناد: ٢ کەس

٥. زانیاری: ٣ کەس

٦. جیهاز: ٢کەس

٧. پزیشکی: ٢ کەس

٨. دارایی: ١ کەس

٩. کیمیایی: ١ کەس

١٠. هەندەسە: ٢ کەس

١١. سایەق: ١ کەس

**ب. تەشکیلەی تیپ:**

١. فەرماندەی تیپ: ١ کەس

٢. جێگری فەرماندەی تیپ: ١ کەس

٣. (٣ کەرت): هەرکەرتەی ٢ فەرماندەی هەبوو

## پ. تەشکیلەی مەفرەزەکان:

١. هەر کەرتێك بریتی بوو لە: ٢ مەفرەزە.

٢. هەر مەفرەزەیەك بریتی بوو لە: ٧ پ. م بەم شێوەیە:

فەرماندەی مەفرەزە + جێگری مەفرەزە + ٥ پ. م

کەواتە هەر کەرتێك ئەبێتە: ٧×٢=١٤ پ. م + ٢ ف. کەرت = ١٦ کەس

هەر تیپێك ئەبێتە: ١٦ × ٣ = ٤٨ +٢ ف. تیپ = ٥٠ کەس

مەفرەزەکانی بارەگای بەتالیۆن بریتی بوون لە ٨ بەش کەسەرجەمیان:

+ ١ ل. بارەگای بەتالیۆن=٢٠کەس

هەیئەتی بەتالیۆن: ٣ کەس

سەرجەمی بەتالۆنەکە ٥٠ × ٣ + ٢٠ + ٣ = ١٧٣ کەس

- چۆنیەتی دابەش کردنی چەك بەسەر تەشکیلەی بەتالیۆندا:

هەر تیپێك:

ا/ ٣٢کلاشینکۆفومرئەگرێ

ب/ ٦ ئارپیجی

پ/ ٦ ڕەشاش

٢. فەرماندەی تیپەکان + فەرماندەی کەرتەکان + فەرماندەی مەفرەزەکان کلاشینکۆفیان ئەدرێتێ

٣. جێگری فەرماندەی مەفرەزە ڕەشاشی ئەدرێتێ

٤.هەر ئارپیجیەك عەدەدی خۆی هەیە + یەك پێشمەگەری یەدەکیش

- کاروباری ڕۆژانەی بارەگا:

١.دانانی ئەفسەری ئێشکگر

٢.ئێشکگری هۆڵ

٣.دەرگای سەرەکی

٤.ڕێکخستنی لیستی ئیجازە

٥.ڕاگرتنی تۆمارەکان:

ا.تەقەمەنیو چەك

ب.دەورە

پ.بنەڕەتی

ت.شەهیدان

ج.کەلوپەل

٦.بەرنامەی ڕۆشنبیری:

ا.ئینسات

ب.کۆڕ بەستن

پ.کتێبخانە

ت.پەخشنامە

ج.سینەما

چ.قوتابخانەو پۆلی دەرسووتنەوە

ح.شانۆ

٧. بەرنامەیوەرزشی :

أ. لەش ب. تۆپێن پ. بالە ت. گۆڵدەستی

٨. بەرنامەی هەرەوەزی :

أ. تەلەفزیۆن   ب. چایخانە   پ. سۆپەر مارکیت   ت.دووکانی سەوزە

ـ لێپرسراوو کادیرو فەرماندەکانی بەتالیۆنی یەك بەم جۆرە بوو:

فەرماندەی بەتالیۆن: مەحمود سەنگاوی

جێگری فەرماندەی بەتالیۆن: م.عەلی عەبدوڵلا

ڕابەر سیاسی بەتالیۆن: سەلاحی کوێخا

لێپرسراوی بارەگای بەتالیۆن: مەنسووری ئەنومر بەگ

لێپرسراوی دارایی: مامۆستا جوامێر

لێپرسراوی جیهاز: سەید نوری گەرمکی + حەمە ڕەحیم قادر

ئیسناد: برایم مەدحەت جومعە + یوسف عەزیز عەلی( دڵشاد)

زانیاری: بەرزان محەممەد فەرەج + حەمە یوسف نەجمەدین ڕەشید + حسین حەسەن مەحمود.

کیمیایی: ڕۆستەم مەحمود نادر.

هەندەسە: حەقی محەممەد ئەحمەد + مەجید محەممەد مەحمود

پزیشك: قاسم محەممەدوەهاب + فارس محەممەد عەبدوڵلا

سایەق: حسین یوسف ئەحمەد

لێپرسراوی ئیدارە: خاڵد ئەحمەد حەمە ئەمین

ئاشپەز: سەعید ساڵەح کەریم + شکور حەمە مەحمود

نانەوا : جەلال جەبار عەباس + حەسەن شەریف فەرهاد

ـ تەشکیلەی تیپەکانی بەتالیۆنی یەك بەم شێوەیە بوو:

تیپی ١١ /

ف.ت١: حەمەی حەمە سەعید

ف.ت٢: ئەکبەری سان ئەحمەد

کەرتەکانی تیپ:

کەرتی ١:

ف.ك ١: عەبدولکەریم عەبدولڕەحمان

ف.ك٢: مەهدی حەمە سەعید

کەرتی ٢:

ف.ك ١: نەبەز حسین

ف.ك ٢: خەلیل مەحمود کەریم

کەرتی ٣:

ف.ك ١: کەیکاوس حەمە ڕەشید

ف.ك ٢: ڕەفعەت جەعفەر

ئەم فەرماندە کەرتانەش هەبوون:

ئەکرەم ئەحوەل، ئەنوەر حاجی عوسمان، خالید مۆریاسی

تیپی١٢ /

ف.ت١: مەحمود مامە عەزە

ف.ت٢: سەلام ڕەسوڵ

کەرتەکانی تیپ:

کەرتی١:

ف.ك١: سدیق عەلی تۆفیق

ف.ك٢: عادڵ پیرە مۆنی

کەرتی ٢:

ف.ك١: ئەحمەد چاوشین

ف.ك٢: مەحمود مامەلی

کەرتی٣:

ف.ك١: حەمەدووزی

ف.ك٢: عەلیورێلە

ئەم فەرماندە کەرتانەش هەبوون:

حسینی حامی، مامووریا برایم، جەلال شۆراوەیی

تیپی ١٤ /

ف.ت١: سەلام کوێخا عەزیز

ف.ت٢: ئەحمەد جەیران

کەرتەکانی تیپ:

کەرتی١:

ف.ك١: سدیق سۆفی مەجید

ف.ك٢: نەوزاد چاوشین

کەرتی٢:

ف.ك١: حاجی فایەق

ف.ك٢: حەمەپاریاوڵە

کەرتی٣:

ف.ك١: هاپۆ سمایل

ف.ك٢: سەعیدی لالە سەن

لە سنووری بەتالیۆنەکەماندا:

- کۆمەڵێك خەڵك پارمەتیان وەرئەگرت و ئیجازە درابوون، هەریەکەیان بە هۆیەکەوە.
- کۆمەڵێك خەڵك پەدەك بوون و پارمەتی بڕاوەیان بۆ دیاری کرابوو.
- کۆمەڵێك لێپرسراوو فەرماندە ئیجازە درابوون پارمەتی ئەدران.
- کۆمەڵێك پێشمەرگەی کەم ئەندام و سەقەت.
- کۆمەڵێك خەڵکی ڕیش سپی پارمەتی ئەدران.

دوای ئەو تەشکیلانە لەگەڵ م.عەلیدا سەردانێکی ئۆردووگاکانی سەریاس و کەچەڵاوا تازاواو باوەجانیمان کردو لەگەڵ پێشمەرگەکانمان و هەڤاڵانی ڕێکخستندا دانیشتین و لە سەر هەلومەرجی کاری پێشمەرگانەو گەشەپێدانی ڕێکخستن و خۆسازدان بۆ هەر ئەگەرێکی نوێ لە گۆڕەپانی خەباتدا قسەمان بۆ کردن، بە ڕاستی هەموو برادەرەکانمان لە ئاستی پێویستدا بوون و ئامادەییان بۆ هەر ئەرك و فرمانێك هەبوو پێیان بسپێردرێ. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە گیانی شۆڕشگێڕی سەرەڕای هەڵە تفت و تاڵەکان هێشتا بوونێکی هەیەو خەڵکی بیری لای ڕزگاری نیشتمانەکەیەتی و ڕۆژگارە

سەختەکان هێشتا خەڵکی خۆی هەیە تیا هەڵبسووڕێو کەس دەستبەرداری گەلو نیشتمان نابێ.

لەو ڕۆژانەدا کۆمەڵە ماڵە فەیلی یەکی عێراق دەرکرابوون بە ڕووتو قوتی، هیچیان پێ نەبوو، هەندێکیان ئەگەڕان بۆ سوالکردنی نانو خواردن، ئەمەیە دادپەروەری ڕژێمی فاشیستی کە خەڵکیوولاتەکەی خۆی بە سونگەی جیاجیا دەرئەکات بۆ دەست بەسەردا گرتنی سەروەتو سامانیان، کە ئەم فەیلییانە نیشتەجێ ی بەغداو سەرەڕای ئەوەی سالانێکی زۆرەو هەر لە کۆنەوە لە بەغدادن، بوونەتە خاوەن دەسەلاتێکی ئابووریو هێزی بازاڕ، لەم هەلومەرجی شەڕو شۆڕە سەپێندراوەدا سەدام لە چەند لایەکەوە گوڵی خۆی ئەکرد: لەگەڵ دەرودراوسێ بەو ناوەی کە پارێزەری دەروازەی ڕۆژهەلاتی نیشتمانی عەرەبە، لەگەڵ ناوەوەش دەرکردنی فەیلی یەکان بەچەند هۆیەکەوە: یەکەمیان کوردن، دوەمیان تەبەعیەی ئێرانین، سێیەمیان چاپاو کردنی پارەو سامانیان. ئەمەش بەلگەی داڕووخانی ناوەڕۆکی کۆنەپەرستانەی ڕژێمێکی دژی مرۆڤایەتییە کە بە ئاگرو ئاسن تەحەکوم لە ژیانی خەلکیدا ئەکات، درەنگ بێو زوو خەڵك تۆڵەی لێئەکەنەوە، مەگەر ئەم ڕۆژگارە هەموو ڕژێمە دکتاتۆرەکانی جیهان هەرەس ناهێنێ..؟!.

دوای تەواو کردنی گەشتەکەمان، گەڕاینەوە پاوەو سەردانێکی دێی شمشێرمان کردو چووینە خانەگاو لەوێوە چووینە ئۆردووگای وەرمەهەنگو پاشان گەڕاینەوە کانی دینار.

ڕۆژی ١٩٩٠/٧/٢٧ گەڕامەوە بارەگای بەتالیۆن، بارودۆخی عێراق لە تەقینەوەدا بوو، بە پێی هەواڵەکان چ لە ناوخۆو چ لە ئاستی دنیاداوایان نیشان ئەدا کە ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو لە ناوچەکەدا ڕووئەدات، جموجووڵەکانی عێراق لە ڕووی سیاسیو سەربازی یەوە بەلگەیەك بوون هەندێ لایەنی ئەوەی دەرئەخست.

# داگیر کردنی

# کوێت

ئەوە بوو ڕۆژی ١٩٩٠/٨/٢ هێزەکانی سوپای داگیرکەری عێراق پەلاماری وولاتی کوێتیانداو لە ماوەیەکی کەمدا داگیریانکرد کە ماوەیەك پێش ئەوەش سەدام حسێن لە کۆنگرەی بالای عەرەبی کە لە بەغدا بەسترا هەڕەشەی لە کوێت کرد ئەو کاتە لەوانەیە ئەو جۆرە هەڕەشەیەی بە هەندوەنەگرتبێ بەڵکو وەکو ئاماژەیەك بوو بۆ ناکۆکییەکی کۆنینە کە لە نێوانیاندا هەبوو گوایە کوێت بە شێکی عێراق بووەو ئینگلیز بۆ مەرامەکانی خۆی دایمەزراندووەو لە عێراقی دابڕیوە.

ئەمە گەورەترین کەرایەتی بوو کە ڕژێمی عێراقو سەرۆکە سەرچڵە دۆڕاوەکەی ئەنجامیدا لە ماوەی حوکمڕانیدا کە پێشتر پەلاماری دەوڵەتی ئێرانیشیدا، ئەگەر چی بۆ پەلاماردانی ئێران دنیای ڕۆژئاوای لەگەڵ بوو پشتیوانی سیاسیو سەربازیو ئابوری فراوانیان ئەکرد، بەڵکو زۆربەی دەوڵەتە عەرەبییەکانیش جگە لە سوریاو لیبیا نەك یارمەتی سیاسیو چەكو پارەیان داوە بەڵکو هێزی سەربازیشیان داوەتێ، کەچی لەم هەنگاوەی شەڕی دووەمی کەنداودا هەموو دنیا دژی بوون تەنانەت عەرەبەکانیش. ئەمە بووە سەرەتای لێژ بوونەوەی گلۆڵەی ئەو ڕژێمەی هەموو گەلانی عێراق هیچ خۆشییەکیان لێنەدی گەرچی بەهۆی پارەی زۆرو زەبەنەی نەوتەوە توانی هەندێ لە ڕژێمە

عـەرەبیو ڕێکخـراوە شـۆڤێنییە عـەرەبیو ئیسـلامییەکان تەنانـەت خـەڵکی عێراقو هەندێ کوردیش ڕابکێشێتە ژێـر دەواری تاوانـە ڕەشـەکانیەوە. کە چی لە هیچ بارێکدا بچوکترین هەلی ئازادی بۆ خەڵکی نەڕەخساند.ئەم هەنگاوەی لـە ئاستی جیهانیشدا نەفرەتی لێکرا.

ڕۆژی ٨/٦ ئەنجومەنی ئاسایش بڕیاری ئابڵوقەی ئابوری لـە سـەر عێـراق دانـا بـە هـۆی ئـەو کـارە نامۆڤانەیـەی ئەنجامیـدا، سـەرەڕای هاتوچۆیوەفدی دەوڵەتانی دنیاو ئاگادارکردنەوەی نەتەوەیەکگرتووەکان، ئەمەوایکرد لـە ئاسـتی ناوچەکەو دنیادا هەندێ هەنگاوی جیدی هەڵبگیرێ بۆ کۆنترۆڵکردنی هەر هیچ نەبێ بۆ ڕێگا گرتن لە ڕووداوی تر یان لە ئەنجامدا تـەمبێکردنو لـە غاوکردنی سەدام‌وەکو ڕژێمێکی دیکتاتۆری عەسکەرتاری. ئەمە بووە زەمینـە خۆشـکەر بـۆ هاتنی سوپای ئەمریکی بۆ ناوچەکە بە تایبەتی بۆ سعودیە.

لـە ڕۆژی ٨/٨و پیشـاندانی کارەسـاتی کیمیابـارانی هـەڵـەبجە لـە تەلەفزیۆنی ئەمریکییەوەوەکو بیرهێنانەوەیەکی ئەو تاوانە، گەرچی کاتی خۆی ئەمریکاو ڕۆژئاواش لە ئاستی جینۆسایدکردنی کورددا لە لایەن ڕژێمی عێراقو سەدامەوە بێدەنگ بوون، هەر لەم ڕۆژەشدا بوو ناردنی نەوتی عێراق بۆ دەرەوە ڕاگیرا. سەدام کارێکی نەکەردەنی کرد، بێ بیرکردنەوەو ڕاوێـژ، دیـارە سـەدام لـە نـاو قـەیرانی هەڵوێسـتە گورچکبڕەکانی دوای شـەڕی ئێـران خـۆی ئـەخواردەوە، ئەیویسـت لـە ڕێگـەی سـەر چـڵێیەکەوە تـەپوتۆزی ئـەو دەورانـەی نـاوەوەی بسڕێتەوەو ئەو ئاوی شەرمەزارییەی لە ناوچاوانی تکا بوو بۆی بگەرێتەوە هەر هیچ نەبێ خەونە دێرینەکەی شۆڤێنێتی عەرەبی لە گەڕانەوەی کۆیت بـۆ سـەر نەخشـەی عێـراق بهێنێتـە دی. بەمـەش سـنووری جـوگرافی بۆسـەر کەنـداو فراوانتر و لە ڕووی ئابووریشەوە سەرچاوەی داهاتی نەوتی زیاتر بکاتو بەمـەش ببێتە سەرچاوەیەکی هەڕەشەی سەربازی بۆسەر دەوڵەتەکانی تـری کەنـداو. کە دیارە ئەمە بۆ کەس ناگرێو نالوێو ناچێتە سەر. بە تایبەتی دوای ئەوەی دنیا

لەدووجەمسەرییەوە بوو بەیەك جەمسەری‌و هەر لە سەرەتاشەوە ناوچەی کەنداو لەژێر دەسەڵاتی ئەمەریکاو ڕۆژئاوادا بووە.

دوای نەمانی بلۆکی ڕۆژهەڵات‌و سۆڤیەت ئیتر بارەکە لە بەرژەوەندی ئەمەریکاو هاوپەیمانان نیشتەوەو هەرووڵاتێك بیەوێ سەرکێشییەك بکات ئەوا ئەبێ باجێکی قورس بدات، زەمەنی یاریکردن بە حەبلی ئەم بلۆك‌و ئەو بلۆك بازدان لەملا بۆ ئەولا نەماوە.

سەدام پرسی بە کەس نەکرد،ویستی سەربەخۆ کارێك بکات، نەیزانی تووشی قۆرتێکی گەورە ئەبێ، ئەوەی‌ویستی خۆی نەبوو، ئەوەی چاوڕێی نەکرد کە لەبەر پێیدا سەوز بێ، بۆ ئەوەی دژی ئەمەریکاو هاوپەیمانان شتێك بکات‌و دەروازەیەك بۆ خۆی بکاتەوە سەری لە بەردەم داواکاریەکانی ئێراندا دانەواندو هەمووی قبوڵکرد، ئەرزو ئاوە داگیرکراوەکانی گەڕاندەوە بۆ ئێران.

هەر بۆ نیاز پاکی هەردوولا ڕۆژی ٨/١٧ یەکەم دەستەی دیلەکانی شەڕی ئێران- عێراق گەیشتنەوەووڵاتەکانی خۆیان، ئێرانییەکان بە گەرمییەوە پێشوازیکران‌و گوڵبارانکران، بە پێچەوانەوە عێراقییەکان ئەو جۆرە پێشوازییەیان لێنەکرا دوای ئەو هەموو ساڵە زیندانی‌و خۆبەکوشتدانە لەبەرەکانی شەڕدا، لە پێناوی ڕژێمێکدا کە نرخی ڕۆڵەکانی لەلا بێ نرخە. هەر لەگەڵ ئەم هەڵوێست‌و هەلومەرجە نوێ یەدا ئەبێ کوردیش جووڵەیەك بکات. دۆخەکە بقۆزێتەوە. ئەگەر چی بەرەی کوردستانی هەبوو، لەکاتێکی ناسکیشدا درووست بووبوو ئەبوایە لە ئاستێکی بەرزداو بە تێڕوانینێکی سیاسیانەوجیدییەتێکی پڕ لە حەماسەتەوە بۆ ئەم مەسەلەیەی بڕوانیبایەو ڕێگا چارەی ڕێکوپێکی دابهێنایە، لە ناو بەرەدا بە پلەی یەکەم (ی.ن.ك) بە پەرۆشەوە لە ڕووی هەستکردن‌و بەرپرسیارێتی ئایندەی کوردەوە لەهەوڵی دیاریکردنی چارەنووسی کورددا بوو بە هەر نرخێك بێت با قۆناغەکە سەختتریش بێت. بۆ ئەم مەبەستە هەموو فەرماندەو جێگرو ڕێبەر سیاسی بە تالیۆنەکان بانگ کران‌و ڕۆژی ٢٨/ ٨ لە قاسمەڕەش کۆبوونەوەو گفتوگۆی

گەرم لەسەر ئاییندەی عێراق‌و بڕیاری ساڵی ١٩٧٥ ی جەزائیر کرا ئەگەر جێبەجێکرا چی بکەین:

ئەگەر دەرگای ئێرانمان‌وەکو ڕێگا پێدانی دۆستانە لێ داخرا چی بکەین..؟

ئایاوەکو مەلا مستەفا ئاشبەتاڵی لێ بکەین‌و دەست لە خەبات هەڵبگرین، یان هەنگاوی تر هەڵبگرین..؟.

ئێمە ئەزموونی شۆڕشی پێشوومان لە بەردەستدایە، زۆر جار ڕووداوەکان لەگەڵ دەرودراوسێدا بەشێوازی جیاجیاو لە هەلی جیاجیادا ڕووئەدەنەوە، بەلام ئیرادەی بڕیاری سیاسی لەم مەسەلەیەدا دەور ئەگێڕێ، ئەگەر ئیرادەکە لاوازو سەرکردەکان ترسنۆکبن ئەوا بێ سێ‌و دوو چارەنووس ئاشبەتاڵە، ئەگەریش ئیرادە بەهێزو سەرکردەکان ئازاو کوڕی ڕۆژی تەنگانە بوون ئەوا کوانووی شۆڕش‌و ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن گەرم ئەبێ.

لەم کۆبوونەوەیەدا هەمووان بەیەك دەنگ بڕیاریان دا کە سوور بین لەسەر خەبات بەردەوام ئەبین لە تێکۆشاندا، ئەگەر هەر هەموویشمان تێداچووین. بۆ ئەم مەبەستەش ئەبێ هێزەکانی خوارەوە بەهێزو پتەو بکرێن، بارەگاکانی ناو ئێران ببەینە سەر سنوور، ئەگەر عێراقیش داوای گفتوگۆی کرد قسەی لەگەڵدا ئەکەین. پاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ کۆبوونەوەکان تەواو بوو، بۆ شەوەکەی گەڕاینەوە کانی دینار.

ڕووداوەکان ڕوو لە ئاڵۆزییە، جیهان شڵەژاوە، زلهێزەکان ئەبێ لە بابەت ئەم کەرایەتییەی عێراقەوە بڕیار بدەن‌و کلك‌و گوێی بکەن. لەم ڕووەوە ڕۆژی ١٩٩٠/٩/٩ جۆرج بۆش‌و گۆرباتشۆف لە هیلسنکی دانیشتن‌و بە پەلە داوایان لە عێراق کرد لەکوێت بکشێتەوەو لەووڵاتە دەربچێ، ئەمەووریا کردنەوەیەکی ترسناك بوو بۆ عێراق‌و ئاییندەی ناوچەکە ئەگەر بێتو عێراق پابەندی بڕیارەکان نەبێت چارەنووسێکی مەترسەیدار لە پێشیدایە. زۆر لە شارەزایان‌وای بۆ ئەچوون کە شەڕێکی سەخت لە کایەدایەو عێراقیش پاڵەوانی

دۆڕاوە چونكە لە ئیرادەی نێو دەوڵەتی دەرچووەو هیچ بانگەوازێك كاری تێناكات‌و سواری سەری شەپۆلێكی تووڕە بووەو لەوانەیە سەر نەیەنێتە دواوە. بۆ ئێمە ڕژێمی عێراق چی لێبێ گرنگ نییە، چونكە زۆر ئازاری داوین، بەشوێن تۆڵەدا ئەگەڕێین، بۆیە باسو خواسی ڕۆژانەمان لەسەر هەلومەرجی شەڕ ڕوودان‌و تووشبوونی عێراق‌و دەوری ئێمەو خەڵكی كوردە بۆ گەیشتن بە ئاواتەكانمان كە كیمیایی‌و ئەنفال‌و جینۆساید تەماوی كردبوو.

ئاسۆ لەبەر دیدەماندا ڕووناكتر خۆی ئەنواند، لەم ڕۆژنەدا لە گەڵ هەڤالان حامی حاجی غالی‌و شێخ جەعفەردا سەردانی ئۆردووگاكانی كەچەڵاواو سەریاس‌و شارەكانی كرماشان‌و پاوەمان كردو چاومان بە خەڵكانی خۆمان كەوت‌و لە بارەی هەلومەرجەكەوە لە گەڵیانا گفتوگۆی تێرو تەسەلمان كرد.

هەر لەم مانگەدا بوو ڕۆژی٩/٢٠وەفدی كوردی بەسەرۆكایەتی هەڤاڵ مام جەلال چووە پاریس، لەسەر دۆخی كوردو شۆڕشەكەی قسەیان كردو داوای یارمەتی سیاسی‌و ئەخلاقییان كرد، ئەمە دەنگدانەوەیەكی باشی بۆ مەسەلەی كورد هەبوو، هەریەكە هەستمان بەوە ئەكرد كە كورد لە دنیای دەرەوەدا گوێی لێئەگیرێ‌ووردووورد تەماشای‌وەرەقەكەی ئەكرێ‌و لە ئاستێكی بەرزی نێو دەوڵەتیدا تێڕوانینی باشی لەسەر تۆمار ئەكرێ بە تایبەتی فەرەنساش كە ڕۆڵێكی گرنگی لە ناووڵاتانی ئەوروپادا هەیەو ئەندامێكی دیاری نەتەوە یەكگرتووەكان‌و ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتییە.

لەم ڕۆژانەدا بۆ خۆ چارەسەر كردن بەرەو تاران ڕۆییشتم، لە ڕێگادا سەردانی شارۆچكەی ئەبهەرم كردو دواتر چوومە خوڕەمدەرەو لە ماڵی حەمید عەبدوڵڵا كە خەڵكی كفرییەو خزممانە لامدا، لە تاران خۆم پێشانی پزیشكداو هەموو كاری تەماشاكردن‌و ئەشیعەو شتەكانی ترم ئەنجامداو پاشان ڕۆژی ١٩٩٠/١٠/١ لەگەڵ ئاغا عیسا نورییان كە هاوەڵ زاوای حەمە ئێرانی خزمی خۆمە گەڕامەوە سنەو كانی دینار، كاتی خۆی حەمە ئێرانی دوای ئاشبەتاڵەكەی ماڵی مەلا مستەفا چووە ئێران‌و لە مەشهەد ژنێكی هێنا لەوە

کوردانـەی کـاتی خـۆی شـا عەباسـی سـەفەوی ڕایگواسـتبوون بـۆ ئـەو سـنووورە دوورانە. کە ئەو ژنە لە کاتی ئەنفالە بەدناوەکاندا لەگەڵ منداڵەکانیدا کەوتنـە بەر شالاوی درندانەی سوپای داگیر کەری بەعس،و تا ئێستاش بێسەرو شوێنن.

لە ڕێگەی ئیزگەکانەوە ڕۆژی ١٠/١٨ هـەواڵێکی گـرنگم گـوێ لێ بـوو کـەوا شا حەسەن پاشای مەغریب باسی دابەشبوونی عێـراق‌و درووسـتبوونی دەوڵـەتی کـوردی‌و دانـی کـەرکوك بـەو دەوڵەتـە نوێیـەی کـورد.ئـەم قسـەیە لـە ڕووی سیاسییەوە بـۆ کـورد قورساییەکی تایبـەتی هـەبوو، کەسـەرکردەی دەوڵـەتێکی ڕۆژئاوای‌وولاتـانی عـەرەب‌و دوور لـە مەسـەلەی نەتەوایـەتی کـورد ئاوەهـا تێڕوانینی خۆی نیشان بدات‌و پەنجە بخاتە سەر ئـازارو داخوازییـەکانی خـەڵکی کورد کە لەوانەیە زۆر کەسـی کوردی خۆبەسیاسیزان هێشتاوا بـەو ڕاشکاوییە نـەوێرن داوای مـافی چارەنووسـی کـوردو درووسـتبوونی دەوڵـەتی کـوردی‌و دابەشـبوونی عێـراق بکـەن. بگـرە هەنـدێ حیزبـی کـوردی هـەر لـە کولەکـەی تەڕیشدا لەوانەیە توخنی باسکردنی دەوڵەتی کوردی نەکـەوێ هەنـدێ کەسـیش بە ڕاشکاوی زات نەکەن کەرکوك بە بەشێك لە کوردستان بزانن کە ئەمشارە بـۆ ئێمە لە چەند ڕوویەکەوە نابێ دەستبەرداری بین:

١. هـەر لـە کۆنـەوە شـوێنی نیشـتەجێ بـوونی کـورد بـووەو بەڵگـەی مێژووییانەی زۆر لە بەردەستدایە لەم بارەیەوە.

٢. لە ڕووی کشتوکاڵییەوە ناوچەیەکی بە پیتە گەر بایەخی تـەواوی پـێ بدرێ‌و پێشەسازی کشتوکاڵی تێدا بـەکار بهێنـرێ‌و ئەبێتـە سەرچاوەیەکی بـاش بـۆ بـەرەو پێشـەوە چـوونی کشـتوکاڵ‌و دابـین کردنـی گـوزەرانی جووتیـاران‌و دانیشتوانی ناوچەکەی.

٣. لە ڕووی سامانی پێشەسازییەوە زۆر دەوڵەمەندە بە تایبەتی نەوت.

٤. لـەو ڕۆژەوەی نـەوت لـە کەرکوکـدا دۆزرایـەوە گرنگـی پەیـدا کـردو دووراییەکی سیاسی‌وەرگرت لـە ڕووی ئابوورییـەوە ئـیتر مەینەتییـەکانی گـەلی کوردیش سەریهەڵدا، حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێـراق هـەوڵیان داوە بـە

هێـزی ئـاگرو ئاسـن ڕەسـەنیەتی ئـەو شـارە لـە كـوردەواری بسـڕنەوە، مـافی ئەوەیشیان نەداوە بە دانیشتوانەكەی كە لە كۆمپانیای نەوتداوەكو فەرمانبەرو كرێكاریش دابمەزرێن گەر هەشبن بە پەلە دوور خراونەتەوەو دەركراون. بۆیە هەر لە كۆنەوە هەوڵدراوە ئەم شارە لە كورد بتۆرێنن‌و خەڵكی لە دوورەوە بۆ بهێنن بە تایبەتی عەرەبی ناوەڕاست‌و خوارووو كوردیش دەربكرێن بۆ خواروو یان ناوچەی بە ناو حوكمیزاتی دەستكرد.

نەك هەر دەسەڵاتدارانی عێراقی عەرەبی ڕایان بەرامبەر بە كەركوك وابووە بەڵكو دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی توركیش هەمان بۆچوونیان لەسەر كەركوك هەیە بەڵام ئەمان بە شارێكی توركنشینی ئەزانن، بەهۆی ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان كوردستان بەشێك بووە لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی توركی‌و ئێستاش كەمینەیەكی توركمانی لێیەو توركیاش پشتیوانی مانەوەی ئەم كەمینەیە ئەكات. گەرچی ئەم توركمانانە زۆربەیان هیچ پەیوەندییەكیان بە نەتەوەی توركەوە نییە، بەڵكو لە بنەچەدا كوردن‌و تێكەڵاوی دەسەڵاتی توركی بوون‌و ئێستا خۆیان بە بەشێك لەو نەتەوەیە ئەژمێرن. ئەمەش یەكەم هەڵگەڕانەوە نییە لە مێژوودا بە نیسبەت كوردەوە.

زۆر كورد لە كورد دوور كەوتوونەتەوەو بە گەرمیش خزمەتی بێگانەیان كردووەو بوونەتە هۆی خامۆشی چرای كوردایەتی. هەرچی یەك بێت، ئێمە قبوڵمان بێت‌و نەبێت، دوژمن گەرەكی بێ‌و نەبێ، كەركوك شارێكی كوردییە، گەر ئێستا نەوت لە گەمە سیاسەتدا گڕی لە چارەنووسی باڵای ئەم شارە بەردابێ، ڕۆژگارێك دێت بە زیندووی ئەگەڕێتەوە باوەشی پڕ لە مێژووی كوردستان‌و لە چنگاڵی داگیركەرانی ڕزگاری ئەبێ.

# یەکگرتنـەوەی کۆمەڵە ـ شۆڕشگێڕان

لەم ماوەیەدا جارێکی تر مەسەلەی یەکگرتنەوەی کۆمەڵەو شۆڕشـگێڕان سـەریهەڵدایەوە،وادیارە ئـەم جـارە بـە جیـدی بـیری لێکراوەتـەوە، هەرچـەندە قۆناغەکە ئەوەی ئەخوازی، لە دوای هەلومەرجی ئەنفال پێویستی بـەوە ئـەکرد یەکێتی لە ڕووی کاری ڕێکخراوەییەوە دەست بـە خۆیـدا بهێنـێ‌و بـۆ ئـەم ساتە ناسکەی خەبات خۆی دابین بکات‌و ئەرکەکانی‌وەئەستۆ بگرێ. بۆ ئەم مەبەسـتە هەموو کادیرەکان بانگکران، لەگەڵ کاک حەمە ڕەش‌و مەلا ئەحمەدی دسـکەرەدا چووینە مەریوان‌و لەوێیشەوە بۆ سەقزو شەو لەوێ بـووین ئینجا کەوتینـە ڕێ بۆ قاسمە ڕەش.

ڕۆژی٢٠/١٠/١٩٩٠ لەسـەر ئـەو مەسـەلەیە کۆبوونەوەیـەکی فـراوان ئەنجامـدرا لـە لایـەن ناوەنـدی کۆمەڵـەوە لێدوانێکی گـەرمکرا، زۆرینـەی زۆری دەنگەکان لەگەڵ گۆڕاندا بوون، لەگەڵ ئەوەدا بوون کـە یەکگرتنـەوەی کۆمەڵـەو شۆڕشگێڕان بکرێت‌و جۆرە ڕێکخستنێکی نوێ پێکبێت. لەم ڕووەوە ئۆپۆزسیۆن هەبوو، بەڵام دەنگێکی کەمیان هەبوو، لەوانە کاک بەهزاد داوود حەمە ڕەحیم‌و مامۆسـتا ئیکـرام عـەلی حـەبێ لەگـەڵ ئـەو یەکگرتنەوەیـەدا نـەبوون، هـەر پەنجـەیان بـەرز ئـەکردەوە بـە دژ، نـەك ڕوونکردنـەوەی فیکریـان هـەبێ. ئـەم لەگەڵ نەبوونـەش شـتێکی سروشـتییە، مـافی ڕادەربـڕین‌و هەڵوێستی تایبـەتی

بروا بوونە یا نەبوونە بە شتێك، بەڵام لە ئەنجامدا نەبێتە کۆسپو دژایەتی توندو تیژ. چونکە ئەوەی ئەمڕۆ باوەڕت پێی نەبێت مەرج نییە سبەینێش وا بێت، گۆڕان خیانەت نییە لە هەڵوێست، بەڵکو بڕوا نەبوون بە گۆڕان دوگمایە. ئەم ڕۆژگارە ئەبێت زۆروریا بین لە خورد کردنەوەی بیروبۆچووندا ئەگینا ئەکەوینە چاڵی قووڵەوەو ڕزگارمان نابێ.

دوای ئەم کۆبوونەوەیە کۆبوونەوەی فەرماندەیی گشتیمان کردو بە تێروتەسەلی قسەمان لەسەروەزعی ئاییندەی عێراق کرد، ئەگەر ڕووخا ئەبێ چی بکەین..! بە نیسبەت بەتالیۆنەکەی ئێمەوە بڕیار درا کە هەموو هێزەکەمان بگوێزرێتەوە بۆ ناو پاوە بۆ باشتر سەرپەرشتی کاروبارەکانمان لەو سنوورەوە، هەم بۆ ناوچەی شارەزوورو هەم بۆ گەرمیان.

دوای تەواو بوونی کۆبوونەوەکان گەڕاینەوە مەریوانو هەوڵی گواستنەوەی هێزەکانمان دا لە ڕێگای پەیوەندی یەکانەوە بۆ پاوە. تا لە ڕۆژی ١٩٩٠/١١/١٤ پسوولەمان بۆ کراو بە ئۆتۆمبیل هەموو پێشمەرگەو کەلوپەلەکانمان گواستەوەو هەر هەمان ڕۆژ گەیشتینە پاوە.

دوای چەند ڕۆژێك لە مانەوەمان برووسکەمان لە پارتیزانەکانەوە بۆ هات لە بارەی گرتنی شینەی حەمە ڕەش کە تاکو ئەنفالەکان پێشمەرگەو فەرماندەی کەرت بوولە تیپی ٥١ ی گەرمیانو دوای خۆ بەدەستەوە دانی دوای ئەنفالەکان بە ڕژێمو هەندێ هەڵوێستی نوێی کە بووە هۆی ئەوەی برادەران لە ڕۆژی ١٩٩٠/١١/٣٠ بڕیاری گوللە بارانکردنی بدەن.

هەرچەندە ئەم بڕیارەم پێناخۆش بوو، بەڵام کار لە کار ترازابوو، ئەم هەڵوێستە لە کاری سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕش ئەچوو کە هەر کەسێك هەڵەیەك بکات ئەبێ سزای مەرگی بەسەردا بدرێ، من وای بۆ ئەچووم کە شینە تەمبێ بکرێ نەك بکوژرێ.

شینە هەندێ ڕەوشتی تایبەتی هەبوو کەوای لێکردبوو هیچ کاتێ سەر بۆ هیچ کەسێك دانەنەوێنێ، نەلەعەشایەریو نەلە پێشمەرگایەتیدا. ئەم خۆ

بەدەستەوەدانەی هەڵەیەکی گەورە بوو بە تایبەتی هەندێ قسەشیان خستە دوای، بەهەر حاڵ چەند خزمەتی کوردایەتی کرد هیچی بۆ حیساب نەکراو گەر هەڵەیەکی کردبێ لێبوردنی بۆ نەکرا. ئەمەش بۆچوونی خەڵکی توندڕەوە کە لە قۆناغێکدا خۆیشم هەر بەو ڕێرەوەدا تێپەڕبووم‌و بگرە بەهەمان پێودانگ گۆش کرابووم.

کە بەتالیۆنەکەمان گواستەوە بۆ ئەو سنوورە، بوارمان بۆ ڕەخسا بۆ سەردانی ئۆردووگاکان‌و بەسەر کردنەوەی خەڵکەکان‌و گۆڕینەوەی بیروڕاو قسەکردن لەسەر ئایندەی عێراق‌و کوردو هەڵوێستی سیاسی لە ناوچەکەدا بەرامبەر دۆزی کورد. بە نیسبەت خۆیشمانەوە لە ڕووی کاری پێشمەرگانەوە هەوڵدان بۆ گۆشکردنی پێشمەرگە بە نوێترین شێوەی سەربازی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕژێمی بەعسی داگیر کەرو خۆتەییار کردن بۆ هەر ئاڵوگۆڕێك بێتە پێشەوە. بە تایبەتی مەسەلەی پارتیزانەکان‌و هێز ئامادە کردن بۆ گۆڕینیان‌و هاتووچۆ پێکردنیان بۆ حەسانەوەو کۆمەك کردنیان.. هەر لەم ماوەیەدا بوو کە هێزێك ئامادە کرا بۆ چوونە خوارەوە بەسەرپەرشتی کاك حەمەڕەش‌و مامۆستا جەلالی برای‌و ئاواتی شێخ جەناب.

ڕۆژی ١٩٩٠/١٢/٤ لە پاوەوە ڕۆیشتین بۆ ئیسلام ئابادو کرندو سەرپێلی زەهاوو ئێوارەکەی گەیشتینە تیلەکۆی سەر سنوورو برادەران چوونە ئەودیودا بۆ گەرمیان. دوای ئەوەش ئێمە کە کارەکانمان لەو ناوە تەواو کرد گەڕاینەوە پاوە.

# کۆنفرانسی

# پـــــاوه

دوای بڕیاردان لەسەر یەکگرتنەوەی کۆمەڵەو شۆڕشگێڕان، بڕیار درا کە کۆنفرانسی ناوچەیی ببەسترێت بۆ هەڵبژاردنی لێپرسراوی ڕێکخستنی نوێی ئەم تەشکیلە نوێیەو هەروەها دیاریکردنی نوێنەرانی کۆنگرەی گشتی ئایندەی یەکێتی. ئەوەبوو ڕۆژی ١٩٩٠/١٢/١٠ لە پاوە کۆنفرانسی ناوچەیی بەتالیۆنەکەمان لە ناو هۆڵی سینەمایەکدا بەسترا، هەستمان ئەکرد ئێمە غەریبینو لە شوێنی خۆمان نین بەڵام پێویستی کارو قۆناغەکەوای لێکردبووین هەوڵبدەین بۆ کارکردنو خۆ دەربازکردن لەم هەلو مەرجە ناسازەی تێیکەوتبووین.. ئەم کۆنفرانسە بە ئامادە بوونی کاك کۆسرەتو لیژنەی سەرپەرشتی ئەنجامدرا کە سەرەنجامی هەڵبژاردنەکان بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوو:

## ١/ هەڵبژاردنی نوێنەری کۆنگرەی گشتی لە بەتالیۆنەکەماندا :

| نـــــاو | ژمارەی دەنگ |
| --- | --- |
| مەحمود سەنگاوی | ١٩٦ |
| م.عەلی عەبدوڵڵا | ١٨٣ |
| مامۆستا جوامێر | ١٨٧ |
| عوسمانی حاجی مەحموود | ١٣٢ |
| سەلاحی کوێخا محەممەد | ١٠١ |

| | |
|---|---|
| ئەکبەر سان ئەحمەد | ١٠٠ |
| مامۆستا مەحمود کەریم | ٩٣ |
| حەسەن جیهاد ( ئەبوفەلاح ) | ٩٠ |
| حەمەی حەمە سەعید | ٨٧ |
| ئاسۆی شێخ نووری | ٧٩ |
| یوسف عەزیز ( دڵشاد ) | ٧٩ |
| کەمال هەورامی | ٧٥ |
| شێرزاد عەزیز | ٧١ |
| مەجید محەممەد مەولود | ٧٠ |
| مەلا سەعید | ٦٧ |
| نیازی عیزەت | ٦٤ |

**ب/ هەڵبژاردنی لێپرسراوو کادیرەکانی ڕێکخستنی بەتالیۆنەکەمان:**

| نـــــــاو | ژمارەی دەنگ |
|---|---|
| م. عەلی عەبدوڵلا | ١٦٩ |
| مامۆستا جوامێر | ١٣٠ |
| کەمال هەورامی | ٦٩ |

ڕۆژی ١١/١٢یـش کۆنفرانسـی ناوچـەیی ڕێکخسـتنی جـەماوەری سـنوری بەتالیۆنەکـەمان ئەنجامـدرا کـە نوێنـەرەکانیان لـە ئۆردووگاکـانی تـازاواو کەچەڵاواو ڕەوانسەرو سەریاسو سونقرو کـەنگاوەرو کامیارانووەرمەهەنگـەوە هاتبوون، ئەنجامەکەشی بەمجۆرە بوو:

| نـــــــاو | ژمارەی دەنگ |
|---|---|
| غەزالی مەحمود | ٤٢ |
| مەلا ساڵەح | ٤١ |
| وەهبی پاشا | ٣٤ |
| عوسمان عەلی عارف | ٣١ |

دوای ئەم کۆنفرەنسە ئیتر کەوتینە ڕێکخستنی کارەکانمان‌و جموجووڵی باشتر بۆ گەشەپێدانی یەکێتی‌و کۆکردنەوەی خەڵکی لە دەوری بە تایبەتی هەلومەرجەکە لە دوو ڕووەوە لە بار بوو:

١. زەمەنی شەڕی کەنداوی دووەم‌و داگیر کردنی کوێت‌و ئەگەری نوێی دۆخەکەو خۆسازدان بۆ هەر گۆڕانێك بێتە کایەوە.

٢. گەشەکردنی ڕێکخستنی لایەنە ئیسلامیەکان لە ناو ئۆردووگاکاندا بۆ جێ پێ لێژکردنی ڕێکخستنی لایەنە سیاسی یە عەلمانییەکان تا ڕادەی شەڕ پێفرۆشتن‌و پێکادان لە ناو خەڵکەکەدا لە سەر هەڵوێستی سیاسی بە تایبەتی توندڕەوی ئەو لایەنە ئیسلامییانە بەرامبەر بە رەفزکردنەوەی کوردایەتی‌و خۆبەستنەوەی‌ووشك بە ئاین‌و خورافاتەکانی بێ لێکۆڵینەوەو دەرخستنی ڕاستییەکان کە هەندێ جاریش بە دەست لە پشتدان ئەم کارەیان ئەنجام ئەداو مەبەستی سیاسی لە دواوە بوو.

ئەگەر چی هەندێ جار لە هەندێ ئۆردووگا دۆخەکان ئاڵۆز ئەبوو بەڵام بەلای ئیسلامیەکاندا نەئەشکایەوە، بگرە زۆر جار دەسەڵاتی ناو ئۆردووگاکەش خۆیان تێنەئەگەیاند، بگرە هەر مەبەست نەبوو بە لایانەوە کە خۆیان بخەنە ناو باسێکەوە کە شەڕ بوو لە نێوان مارکسی‌و ئیسلامییەکان‌و نەیانئەویست سەری خۆیان بیەشێنن بەوەوە بگرە لە لایەکیشەوە پێیان خۆشبوو گرفتی ناوخۆیی بۆ ئەم لایەنانە پەیدا ببێ. ئێمە هەر شەڕی سیاسی‌و ئاینیمان بۆ درووست نەئەبوو بەڵکو کێشەی لابەلاشمان بۆ درووست ئەبوو.

کە لە ڕۆژی ١٩٩٠/١٢/٢٨ ئەکرەمی ئەحوەل لە ناو شارۆچکەی پاوەدا بە ڕۆژی نیوەڕۆ بە چەکەوە پەلاماری نیازی عیزەتیدا بۆ ئەوەی بیکوژێت، بۆیە پۆلیسی کەلانتەری هاتنە سەرمان‌و داوای ئەکرەمیان کردو لە دواییدا زیندانیان کردو هەمیشە بە چاوی گومانەوە تەماشایان ئەکردین کە لەناووڵاتەکەی ئەواندا ئێمەوەکو میوان زۆر جار کێشەیان بۆ بەرپا ئەکەین‌و

له ئیلتزامی یاسایی ئەوان دەرئەچووین، ئەمەوایکرد کە ئێمە لای خەڵکی پاوە خۆشەویست نەبین، بۆیەوەزعمان باش نەبوو، بۆیە بە چاکمان زانی سەردانێکی مامۆستا مەلا قادری ئیمام جومعەی پاوە بکەین، ئەو بە ڕاستی زۆر هاوکاری کردین‌و هەڵوێستەکانی کاریگەرێتی تایبەتی هەبوو لەسەر چاکبوونی‌وەزعەکە.

دوای ئەوەی سەردانێکی کانی دینارم کردو بەفرو بارانێکی زۆر باری‌و دارو درەختی ئەو ناوچەیەی شکاند، سەردانی هەندێ ماڵە برادەرم کرد، عوسمانی برام بەبۆنەی سەری ساڵەوە لەدەرەوە هەندێ ئامێری مۆسیقاو کەلو پەلی یاریکردنی بۆ منداڵەکان ناردبووەوە.

ڕۆژی ١٩٩٠/١٢/٣٠ سەرێکی ئۆردووگای بارام ئاوام داو چوومە ماڵی کاک حەمە ڕەشیدی عەلی شەریف‌و شەوێ لەوێ بووم بە دەمەتەقێ‌و قسەی خۆش‌و باسی جۆراو جۆرو یادگاری کۆن کاتەکەمان بەسەر بردو خەونەکانمان لەبەرەبەیانی ساڵێکی تازەدا بەبا کردو نەخشەمان بۆ ژیانێکی خۆشتر دائەڕشت کە نەمانئەزانی چۆن ئەبێ.

## ساڵی ١٩٩١

هەموو خەڵکی دنیا لەجەژنی سەری ساڵدا خەونی ڕاستەقینە ئەبینن. ئێمە خەونیشمان لێ حەرامە. نەتەوەیەك لەسەر زەویدا جێگای نەبێتەوە، دەسەڵاتەکان لێیبدەن، قڕی تێبخەن، چۆن بۆی هەیە خەونی خۆش ببینێ، بۆنی بوونی خۆی بکات. ئێمە ئەگەر خەونیش ببینین ئەوە بەهەشتێکی پڕ لە دووپشك‌و مارو جاندرمەو سوپاو ڕەبایەو هێزی سەربازی‌و کیمیایی‌و کۆپتەرو تانك‌و ئاوارەیی‌و ... هتد ئەبینین.. ژیان دۆزەخە، بەڵام مرۆڤی شۆرشگێر لەناو بۆتەی ئەم هەموو ئازارەدا خۆی ئەبینێتەوەو ڕێگا نادا ناخۆشیەکان بە تەنیا بیخۆنەوە، لەناو ئەو هەموو ناسۆرییەدا ئاسۆیەکی

ڕووناك قوتیلەكەی لە ناخیا دائەگیرسێنیو ئومێدێكی گەش تخوبی هەستو هەڵوێستی ئەگرێتەوە.

ساڵی ١٩٩٠ بۆ هەندێ لە گەلانی دنیا ساڵی یەكگرتنەوە بوو بە تایبەتی هەردوو ئەڵمانیا، ئەگەر چی بۆ ئێمەش هەندێ لاپەڕەمان هەڵدایەوە، بەڵام هەر هێشتا كەمبوو، ئەبێ ساڵی تازە چی تێدا بێت، بە تایبەتی هەلومەرجی ناوچەكە پڕ لە گرێو گۆڵو ئاڵۆزیو مەترسی شەڕو هەراو بگرەو بەردە بوو، خەونی ئێمەش تەنیا ئەوە بوو خێرو بێرێكی بۆ كورد تێدا بێت. بەو ئاواتانەوە ڕۆژانە چاوەڕوانی ئەوە بووین وەرچەرخانێك ڕوو بدات، كەس ناتوانێ خەونەكانمان لێبسێنێ، بە تایبەتی لە كاتێكدا كە دنیا ئاوسە بە دەیەها ڕووداویوا كە خەونەكانمانی خۆشتر ئەكرد، هەتا ئەهات دۆخەكە گرژی زیاتری بەخۆوە ئەدی، جموجووڵێكی سیاسیو دیبلۆماسی فراوان دەستی پێكردبوو بۆ ئەوەی خراپتر نەقەومێو عێراق لە هەنگاوە سەرشێتییەكەی پاشگەز بێتەوە.

بۆیە جیمس بیكەرو تاریق عەزیز ڕۆژی ١٩٩١/١/٩ بە ڕەسمی كۆبوونەوە، دوای گفتوگۆیەكی تێرو تەسەل هەرچیان كرد نەگەیشتنە سەرئەنجامێكی ئەوتۆ ناوچەكە لە سووتانی شەڕێكی مسۆگەر ڕزگار بكەنو شكستیان هێنا، بە پەلە دیكۆیلاری سكرتێری نەتەوە یەكگرتووەكان باڵی گرتەوەو گەیشتە عێراق، بەڵام هیچ بەرنامەیەكی داڕێژراوی پێ نەبوو، تەنها هەر ئەوەندەی پێ بوو كار لە عێراق بكات لە كوێت بە سەلامەتی بكشێتەوە، عێراق بە قسەی ئەو ڕیشسپییەیان نەكرد، كەوتبوونە هەڵەیەكی سیاسیواوەوایان ئەزانی كە دنیا لێیان ئەترسێ، نەیانئەزانی خۆیان ئەكەونە ناو تەڵەیەكەوە چارەنووسی ئایندەیان تەماوی ئەبێو لە بەرامبەر ئیرادەی نێو دەوڵەتیدا خۆیان پێڕاناگیرێو هیچیان پێناكرێ، ئەوان لە قسەو ڕاگەیاندنی سەرشێتانەی خۆیان نەئەكەوتن.

ڕۆژی ١٩٩١/١/١٢ لەتیف نسەیف جاسموەزیری ڕاگەیاندنی ڕژێمی عێراق ڕایگەیاند کوێت پارێزگای ژمارە ١٩یە. هەروەها ڕۆژی ١٩٩١/١/١٤ ئەنجوومەنی بە ناو نیشتمانی عێراق سەدامی سەرپشك کرد بۆ شەڕ کردن لەسەر کوێت.

ئەمە سەدامی هەڵنا بۆ ئەوەی ڕۆژی ١٩٩١/١/١٥ سەردانێکی کوێت بکاتو لەو دۆخە تەماوییەداوورەیەك بە هێزەکانی ببەخشێو خۆیشیوا نیشان بدات کە پاڵەوانێکی سەرکەوتووی شەڕەو گوێناداتە ئەو چاوڕاوەی لە دژی ئەکرێ، هەر ئەم ڕۆژەش دوا مۆڵەتی ئەنجومەنی ئاسایش بوو بۆ دەرچوونی هێزەکانی ڕژێمی عێراقی لە کوێت.

ئێمە زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی هەلومەرجەکە بووین، بەرچاو ڕوونیش بووین کە ڕژێمی سەدام لە ڕۆخ کارەساتێکی گورچك بڕدایە، چونکە لێی قبوڵ ناکرێوا بە ئاسانی سەرەوەریوولاتێکی سەربەخۆی ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان پێشێل بکرێ، بە تایبەتی کە کوێت خاوەنی سامانێکی زۆری نەوتەو دەورێکی گرنگ ئەگێڕێ، بە نیسبەت دەوڵەتە پێشەسازییە زلهێزەکانەوە، ڕژێمی عێراقوایزانی بە قسەی خۆی (فەرع) بۆ (ئەسڵ) ئەگێڕێتەوە، یان هەر هیچ نەبێ دەوڵەتۆکەیەکی بچووکی عەرەبی ئەخاتەوە سەر نەخشەکەی خۆیو بەمەش ئەتوانێ بەشێکی زیانەکانی جەنگی خۆی قەرەبوو بکاتەوەو کەسیش دەنگ ناکات، کەچی بۆ ڕیش چوو سمێڵیشی خستە سەری، نەك هەر خەون نەهاتە دی، بەڵکو شەرعیەتی دایە ئەمریکاو هاوپەیمانانی بە هێزی سەربازییان ڕاستەوخۆ بێنە ناوچەکەو جێگیر بن دوای ئەوەی ئەمە خەون بوو بەلایانەوەو لەدوای نەمانی شەڕی ساردو ڕووخانی کەمپی کۆمۆنیستی لەوەها بیانوویەك ئەگەڕان بەم کارە هەڵسن تا خواوڕاستان عێراق ئەمەی بۆ ئاسان کردن.

لە نزیکبوونەوەی ڕۆژە ڕەشەکانی ڕژێمی عێراق، ئێمەش باشتر خۆمان ئامادە ئەکرد، بۆ هەر ئەگەرێکی چاوەڕوان کراوی نوێ. سەرکردایەتی یەکێتی

نیشتمانی کوردستان هەندێك پرۆژەی دارشتبوو بۆ کار کردن لە کاتێکدا کە ئەمەریکاو هاوپەیمانان لە عێراق بدەن ئێمەیش دەست بەکار بین:

- رزگار کردنی شارو شارۆچکەکان.

ـ دەست بەسەردا گرتنی دامو دەزگاکانی بەعس و پاراستنی بەلگەنامەکان.

ـ وەلانانی رق و دوژمنایەتی کە بەهۆی مەسەلە کۆمەلایەتی یان سیاسییەکان درووستبوو بوو بە تایبەت لە گەڵ چەکدارەکانی رژێمدا.

رۆژی ۱۹۹۱/۱/۱۳ کۆبوونەوەی بەتالیۆنمان کردو بە پێی بەرنامەیەکی سەربازی رێکوپێك ناوچەکانمان دابەشکرد تاکو لەگەڵ هەر ئەگەرێکی پەلاماری عێراقدا ئێمەیش دەست بەکار بین و دەوری خۆمان بگێرین و سنوورەکان کۆنترۆڵ بکەین. چونکە ئەمانزانی رژێمی عێراق بەرگەی ئەو پەلامارە ناگرێ، سوپاکەی زۆر ماندووەو شەری پێناکرێ، ئەو سوپایەی بەدرووستبوونی دەوڵەتی نوێی عێراق هەمیشە لە شەردا بووە بە تایبەتی شەری کوردستان ـ رژێم، هەروەها هەمیشە لە کودەتا کردندا بووە، کەمجار بۆی هەلکەوتووە ماوەی پشوودان بە خۆوە ببینێ، بۆیە ئەو شەری ۸ ساڵەی ئێران و پەلاماردان و داگیرکردنی کوێت زیاتر کەشەنگی کردبوو، هێزێکیش لە ژێر تەپوتۆزی شەردا هیلاك بووبێ مەحاڵە بتوانێ بەرگە بگرێ.

هەموو رۆژێك کەبەسەر عێراقدا تێئەپەری لە هەناویدا شتێکی ترسناکی هەلگرتبوو، ئەگەری لێدانی لە لایەن ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانیەوە زۆر نزیك بوو، بە تایبەتی عێراق بە تاقی تەنیا کەوتبووە بەرەیەکەوە، دنیاش لە بەرەکەی تردا، تەنانەت ئەو دەوڵەتە عەرەبیانەی تا دوێنێ کۆمەکی سەربازی و ئابووری عێراقیان ئەکرد لە شەری هەشت ساڵەی بەرامبەر بە ئێران هەموویان دژی وەستان و هێزیان کۆکردەوەو لەگەڵ ئەمەریکادا هاودەنگبوون، عێراق خۆشی ئەترسا کە کەوتبێتە ناو تەڵەیەکەوە دەرباز بوونی نەبێ.

# شەڕی
# کەنداو

۱۹۹۱/۱/۱۷ ڕۆژێکی گرنگە لە مێژووی ناوچەی کەنداوو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، کە کاتژمێر ۱ی شەو بەسەرکردەیی ئەمەریکا۳۰ سی دەوڵەتی جیهان بەهێزی سەربازیو ئاسمانی هێرشی بەربلاّوو کوتوپڕیان کردە سەر سوپای داگیرکەری عێراق لەناو کوێتدا. هێرشەکە ئەمەندە توندو تیژو سەختو بەهێز بوو بواری بە هێزەکانی عێراق نەدا چاو بکەنەوە، سەدام ئەوەندە مێشکی دنیای سوتاندو گاڵتەی بە هەموو لایەك کرد تا بە گورزێکی کوشندەوەلامیان دایەوە. نەیانهێشت بیر لە هیچ بکەنەوە تەنانەت نەیانئەتوانی بەرگریش بکەن.

ئەو درەنگانی شەوە کە هەواڵەکە بلاّو بووەوە بۆ ئێمە زۆر خۆش بوو، هەموو پێشمەرگەمان ئاگادار کردەوە، بە تەلەفۆن پەیوەندیمان بە زۆر شوێنەوە کرد، لە ئۆردووگاکان تاکو هەواڵەکەیان پێ بگات، ڕادیۆ زۆر گرنگ بوو بۆ گواستنەوەی دەنگوباسی بەرەکانی شەڕ، هیچ هێزێکی پێشکەوتوو خواز نەبوو لە خۆشیدا نەبێت، هەر تەنیا ئەوانەی لە سەنگەری کۆنەپەرستیو دژایەتی مرۆڤایەتیدا بوون دڵتەنگبوون بۆ ڕژێمی عێراقی، سەیر لەوەدایە خەڵکە سونەکەی ئێران زۆر خەمبار بوون کەوا لە عێراق درا، مەولووی ئێغەمبەریان ئەکرد کەوا سەدام نەشکێ، چونکە بەلایانەوە تەنیا سەرکردەیەکی ئیسلام بەرگری لە سوونە بکات هەر سەدامە،وایانئەزانی کە ئەو شەڕی هەشت

ساڵەیە شەڕی سوننەو شیعەبووە. نەك هەر ئەمە بەڵكو پێشتریش ڕەخنەیان لێ ئەگرتین بۆچی شەڕ لەگەڵ سەدام ئەكەن..؟ لە چیتان كەم بوو..؟

ئێمە خۆمان لەو سەخڵەتیەی ئەوان هەڵنەئەقورتاند، بەڵام ئەوان زیاتر سەخڵەت ئەبوون و ئەمەش گەیشتە كاربەدەستانی شاری پاوەو پەیوەندیان پێوە كردین كە هەندێك دۆخەكە ڕابگرین و كارێك نەكەین كێشەو ڕووداو بەرپا بێت. لێدانەكە ئەمەندە گرنگ بوو پێشمەرگەكان شیرینییان بەسەر خۆیاندا ئەبەخشییەوە، ئەوەی ڕادیۆی پێبوو كەڵەكەیان ئەكرد بۆ بیستنی دوا هەواڵەكانی بەرەكانی جەنگ و تێكشكانەكانی سەدام. ئەمەش كاری لە دەروونی خەڵكی ئەكرد.ئەوەی سەرنج ڕائەكێشێ نەك هەر لە پاوە بەڵكو لە سەرتاسەری كوردستانی ئێراندا ئەم هەڵوێستە هەبوو. بگرە خەڵكیان هەبوو مەولووی كردبوو كە كچێكی نەزری سەدام بێت هیچی لێنەیەت.

ئەم هەموو ئازارەی خەڵكی كوردی ئێران هیچی لە ئازارەكانی سەدام كەم نەكردەوە. سەرەڕای ئەوەی كە ڕژێمی عێراقی ڕۆژانی ١٨ - ١٩٩١/١/٢٠ بە ڕۆكێتی سكۆد دای لە ئیسرائیل و سعودیە، بەهۆی ڕۆكێتی باتریۆتی بەرگرییەوە لەئاسماندا پوچەڵ ئەكرانەوە بێئەوەی ئامانجەكانی خۆیان بپێكن. ئەمە عێراقی زۆر شڵەژاند، ئەووای دانابوو بە چەند ڕۆكێتێك ئیسرائیل بسووتێنێ. نیشانەی شكستەكانی عێراق دەرئەكەوت كە ٧ فڕۆكەی جەنگی عێراق گەیشتنە ئێران و لە فڕۆكەخانەكانیدا نیشتنەوە، لەناو ئەم ساتەوەختە خۆشانەدا خورپەی هەواڵێكی دڵتەزێن ناخی دڵی گوشین، ڕۆژی ١٩٩١/٢/٣ هەواڵی شەهید بوونی كادیری خۆشەویستی گەرمیان سەید محەممەد مان پێگەیشت، بە یەكجار ئازاری دڵیداین، ئەو كەڵە كادیرەی كە لە ناو دارو پەردووی وێرانەی ئەنفالدا گیانی ئەكردە بەر پێشمەرگەكان، هەڵپەی ژیانەوەی ئەكرد، دژی دووركەوتنەوە بوو لە خاك، ئەو ئازارەكانی ڕام ئەكرد، نەیئەهێشت كەوشەنی ڕۆح بتەنن و نائومێدی بچنن. سەرەڕای ئەوەی ژن و منداڵە چاو گەشەكانی كەوتبوونە ژێر ساتۆرە كولەكەی ڕژێمی ئەنفالەوەو

نائومێـد بـوو لـه گەڕانـەوەیان، ڕژێـم ئەوەنـدە داخ لـە دڵبـوو گرتنـی سـەید محەممەدی لەداوێکدا بەهۆی کۆمەڵە کورد فرۆشێکەوە بەلاوە گرنگ بوو زۆر بـە پەلـە شـەهیدی کـرد.سـەید محەممـەد بۆخـۆی داستانێك بـوو هێشتا کـەس نـــەیتوانیوە هۆنراوەکــەی بهۆنێتـــەوە ئەگــەر لەبیرنەچـێ وەکو چـۆن ژنو منداڵـەکانی چوونەتە خانـەی لـەبیر چـوونەوە لەگـەڵ هـەزارەها کەسـی تـری ئـەنفالکراودا ، شـایەنی ووتنە لەگـەڵ گرتنـی هـەڤاڵ سـەیددا کۆمـەڵێك هـەڤاڵی ترمـان لەلایـەن ئیسـتیخباراتەوە دەسـتگیرکران کـە کـاتی خـۆی لـە ماڵەکـەی جـوامێری قالـە جافـدا بـۆ چـاوپێکەوتنی هـەڤاڵ سـەید چووبوونە ئـەوێ یـان نامەیان بۆ چوو بوو بۆ بینینو هاوکاری کردنـی شـۆڕشو جوامێر لـەو شـتانە ئاگادار بـووەو دەنگیـان تۆمـار کرابـوو ، لەوانـەش : حەمـەی حـاجی مـەحمودی هـارونی ، برایمـی سـەمینی زەماوەنگـەیی ، خـەلیل چیمەنتۆ ،حـاجی سـیروان ، حەمــەی‌وەلی ، حەمــەی حیــزب ، عوسمــان بــاوەنوری ، دڵســۆزی ئەحمــەد کەلاری..هتد.

---

ڕۆژی ١٩٩٠/٢/١٥ لە بارەگای بەتالیۆن بووم لە پـاوە، کـاك دانـای ئەحمـەد مەجید نوێنەری یەکێتی لە کرماشان تەلـەفۆنێکی بـۆ کـردم. کە چوومە سـەر خەت کاك نەوشیروان قسەیکرد، داوای لێکردم کە یەکسەر بچمە کرماشـان، کە گەیشـتمە ئـەوێ کـاك نەوشـیروان پێـیووتم کـە خـۆم کۆبکەمــەوەو دابەزمــە خـوارەوە بـۆ گـەرمیانو هەنـدێ پێویسـتیش هەیـە بیگەیەنمـە بـرادەرانو تێـی گەیانـدم کـە چـۆن پەیوەنـدی بـە دەسـتەکانمانەوە بکـەینو خـەڵکی ئامـادەی ڕاپـەڕین بکـەین، لـەو کاتانـەدا پێشـمەرگەکانووتیان: کـاك نەوشـیروان کـاك مەسعود بارزانی هات. کـاك نەوشیروان چووە پیرییـەوەو پێشوازی لێکـردن کە چەند کەسێکی تری لەگەڵدا بوو، یەکێکیان عومەر ئاغای دۆڵەمـەڕی بـوو، دوای بـەخێر هـاتن کەوتنــە قسـە کردنــەوە، گفتوگـۆ لەسـەر لێبوردنەکـەی بـەرەی کوردســتانی کــرا. کــاك نەوشــیروانووتی: ئێمــە ئــەبێتوەفامان هــەبێت بــۆ لێبوردنەکەی خۆمانو ڕێگە نەدەین کەس تاوانبارەکـان بکـوژێ. ئەگـەر ئەوانـە

عەفوو نەكەین ئەبێ بچن لە خوارووی عێراق بژینو پاش قەرنێكی تر نەوەكانیان ئاوارەی كورد ئەبن، كە ئێستا عەفوویان بكەین ناهێڵین جارێكی تر میللەتەكەمان ئاوارەی هەبێ. كاك مەسعود هەڵیدایەوووتی: من رامووانییە، بەرای من ئەم جاشانە هەرچیماڵیان كۆكردووەتەوە لەسەر خوێنی میللەتو خوێنی شەهیدو عارەقی پێشمەرگە كۆیان كردووەتەوە ئەبێت هەموو ماڵو سەرەوەتەكانیان لێوەربگرینەوەو بیدەینە ئەو پێشمەرگە تێكۆشەرانەی چەند ساڵە عەزیەتیان ئەبێ.

دوای قسەكردنو دەمە تەقێ ئەوان هەڵسانو لێیاندا رۆیشتن. من ئەمە یەكەم جارە لە نزیكەوە مەسعود بارزانی ببینم. لە قسەكانیدا هەندێ ناواقیعیەتم بینی كە ئەو داوای سزادانی جاشی ئەكرد كەچی هەندێ زانیاریمان لایە كە زۆربەی جاشە درندەكانی كوردستان لە لایەن پارتییەوە ئاراستە ئەكران بۆ دژایەتیكردنی شۆرشی نوێی كوردستان.وا ئێستا بە پێچەوانەی رای یەكێتییەوە داوای سزادانی جاش ئەكات. منوای بۆ ئەچووم گەر یەكێتی داوای سزای خۆفرۆشانی بكردایە ئەوان پێیان لەسەر لێبوردنیان دائەگرت. ئەم جیاوازی بیروڕایە لەسەر دیاردەیەك لەسەر ئەنجامەكەی بۆ بەرژەوەندی ئاییندەی كورد شتێكی خراپەو لە روانگەی بیری تەسكی حیزبایەتییەوە خۆی ئەنواند. ئەبوایە هەردوو بە گیانی پڕ لە پەرۆشەوە بۆ خزمەتی گەلەكەمان هەنگاویان هەڵبگرتایەو كۆنە قینو ناكۆكییەكان لە قۆناغێكیوا ناسكدا شەنو كەو نەكرێو لە هەڵوێستەكاندا تۆڵە نەكرێتەوەو هەردوولاوەك یەك خۆشەویستی میللەتیان دەستە بەر بكردایە.

ئیتر من خۆم كۆكردەوەو رۆژی ٢/١٦ لە كرماشانەوە بەرێ كەوتین بۆ تەپەرەش لەگەڵ پاسدارێكدا بۆ ئەوەی لە رێگا نەمانگرن. لە رێگە سەرمان دا لە دێی رێژاو كە ئەكەوێتە بەردەم چیایەكی بەرزو ئاوی ئەلۆەند لەو چیایە دێتە خوارەوە، رێژاو هەمووی باخاتە، ئەوەندە خۆشە ئەڵێی بەهەشتە، لەوێ چووینە ماڵی خزمەكانی كاك حەمە پاریاوڵە. دوای ئەوە رۆیشتینو گەیشتینە

تەپـەڕەش نزیکـی سـنووری عێـراق‌و شـەوەکەی لـەوێ ماینـەوە، ڕۆژی ٢/١٧ سەردانێکی سـەرپێلی زەهاوەمـان کـرد، لەسـەر شۆسـتەی جادەکـەی ناوبـازاری سەرپێلدا ڕاوەستا بووین لەو کاتەدا هەندێ ئۆتۆمبیل دایان بەلاماندا زانـیم کـە ئـەوە تـاریق عـەزیزی‌وەزیری دەرەوەی عێراقـەو بـەرەو تـاران ئەڕۆیشـت تـاکو لەوێوە سەردانی ڕوسیا بکات، چونکە ڕێگای ئاسمانی نـەبوو ناچـار بـە ڕێگای زەمینی‌و لە ئێرانەوە بڕوات. دوای ئەوە هەندێ پێداویستی‌وەکو ڕۆنی کوردی‌و شتی ترم بۆ برادەران کڕی‌و گەڕاینەوە تەپە ڕەش، کاتژمێر ٦ی ئێوارە لە نزیک دێی گردەنوو هەنـدێ گوێدرێـژی قەلغانییەکانمان هێنـا بـۆ گواسـتنەوەی کەل‌و پەلەکانمان بۆ لای پارتیزانەکان.

شـەوی ٢١ـ٢/٢٢ / ١٩٩١ لەگـەڵ کـاک حەمـە پاریاوڵـەو حەمـەی مالیـەو جومعەی مەجید داودەو مام جـەبار عـەلی قـازی‌و حەمـە چاوشـین‌و شـەریف خەلیفە سدیق‌و برایم ئەحمەدی ئامۆزام‌و حەمـە ئێرانـی‌و چـەند کەسێکی تـر کەوتینە ڕێ بەرەو ڕۆژهەڵاتی دێسووتك‌و سـەرووی حـاجی لـەرو لـە خـوارووی گۆمە بەحرییـەوە خۆمـان کـردە نـاو زەل‌و قامیشەکانی خوڕخـوڕدا کـە هـەموو ناوچەکە پڕبـوو لـە عـەرەبی تـەعریب، لـە ڕێگـادا ئاگاداریـان کردمـەوە کـە مـام جـەبارو مـام شـەریف پەکیانـە، منـیش تـووڕە بـووم‌ووتم: ئـەم دوو مـام گـووە بۆچـی پـەکیان کـەوتووە..؟ چاوەڕێمان کـردن تـا گەیشـتن‌و لـەو نـاوەدا خۆمـان حەشاردا. بۆ ڕۆژەکەی چووینە خوڕخوڕو ئێوارەکەی چووینە سەر سیروان، لەو قـەراغ چـەمەدا کەڵـەکمان شـاردبووەوە لـە ڕاسـتی دێـی لـەواوان کەڵەکـەکانمان دۆزییەوەو بەهیمەتی کاك حەمە پاریاوڵەو جومعەی مەجیدو حەمە چاوشین ئامادەمــان کــردن‌و هەرچــەندە بــاران بــوو، بارەکــان‌و پاشــان‌وولاخەکانمان پەڕاندەوە بەرەو پاریاوڵە چووین، شەو لەبەر باران‌و تـاریکی‌و ماندوویـەتی لـە ناو قامیشەکانی سەرووی پاریاوڵەدا ماینـەوە، ڕۆژەکـەی چووینە ئەشکەوتێك‌و ئاگرمان کردەوەو خۆمان گەرمکردەوە.

لێدانەکان ئەمەندە توند بوو خۆبەدەستەوەدان و تێکشکانەکانیش ئەوەندە سەختبوون ناچار سەدام بڕیاری پاشە کشەی لە کوێتدا. بەڵام ئەمریکا هەر بەو بڕیارە ڕازی نەبوو، بەڵکو جێبەجێکردنی ١٢ خاڵەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان لەمەڕ کشانەوە لە کوێتی سەپاند بۆ پابەند بوونی سەدام پێوەی. ڕۆژی ٢/٢٧ عێراق ڕایگەیاند کە هەموو هێزەکانی لە کوێت کشاندووەتەوە. ئەمەریکاش بڵاوی کردەوە کەوا ٧ فیرقەی سوپای عێراق تیاچووەو پەنجا تانك بە ساغی گیراوەو فڕۆکەخانەی ناسریە گیراوەو ڕێگەی کشانەوەی عێراق لە پشتەوە گیراوە.

ڕۆژی ٢/٢٨ کاتژمێر ٨ ی سەر لە بەیانی شەڕوەستا بەو مەرجەی عێراق لە ماوەی ٤٨ کاتژمێردا هەرچی لاشەی کوژراو هەیە بیداتەوە ئەمەریکا، دیلەکان ئازاد بکات، هەرچی مەیدانی مین لەووشکانیدا هەیە نیشانی هێزەکانی ئەمریکا بدات. هەروەها نیشاندانی هەموو مینی ناو دەریاش. بەهیچ شێوەیەك تەقە لە سوپای ئەمەریکا نەکرێت، هەرچی زیانەکانی کوێتە بیبژێرێت، مووشەك بەرەو هیچ وولاتێکی ناوچەکە نەهاوێژرێت. هەر ئەمڕۆش ژمارەی دیلی عێراقی گەیشتە ١٧٥ هەزار سەرباز، ژمارەی کوژراویش ١٠٠ هەزار کە ئەکاتە لە ناوچوونی زیاتر لە ٤٢ لەشکری سوپای عێراقی.

سەیرە هەموو ناوبژیوانی کردنەکان نەیانتوانی سەدام قایل بکەن بە کشانەوە، کەچی یەکەم زەبری پەلامارو لێدانەکان سەدامی ڕاچڵەکاندو تێیگەیاند کە بەرامبەر بڕیاری هێزەکانی نێودەوڵەتی هیچ نییە، باشتر نەبوو ئەم کابرا سەرشێتە بە ئابڕووی خۆیەوە بگەڕێتەوەو ئەو هەموو زیانە لە خۆی نەداتو سوپاکەی تێك نەشکێ..؟ سەدام گەر هێزی سوپای بەدەستەوە نەمێنێ یەك ڕۆژ لە تەمەنی دەسەڵاتدا نامێنێتەوە.

ئێمە لە گەڵ ئەو هەموو هەواڵانەدا لە ناخەوە شاگەشکە ئەبووین، لەو چۆڵەوانیەدا هەستمان بە سەرکەوتنی خۆمان ئەکرد، زۆرمان پێخۆش بوو کە

ئەم دوژمنە دیکتاتۆرە، ئەم ڕژێمە خوێنڕێژە لەو بەرزییەوە غلۆر بێتەوەو تۆڵەی ئەو دەیان ساڵە زوڵم‌و ستەمەی لێبکەینەوە.

ڕۆژی ٣/١ لە ئەشکەوتی هۆمەری نزیکی پاریاوڵەوە چووینە پەناگاکانی کاک حەمە پاریاوڵەو پاشان شۆڕ بووینەوە بەرەو تەنیا ماڵەکەی حەمەی ئەولکەریمە سوورو شەوەکەی لە هەردەیی خەوتین، ڕۆژی دوایی چووینە مارف سەیدەو کوردەمیرەکان‌و قەڵۆەز لوقمان، پاش نیوەڕۆکەی چووینە مەسۆیی مامران‌و ئینجا بۆ دێی کۆیکی زیدی خۆم کە لە شوێنێکی چەپەکدایەو لای خەڵکی زۆر خۆش نییە، بەڵام هەمووو بەردو دارێکی لە دڵمدا جوان‌و ڕەنگینە، شەوەکەی لە ئەشکەوتی هێلانە پلیسیرگەکەدا باینەوەوێنەی ئەم دێیەوێرانەیەم بۆ یادگاری گرت.

ڕۆژی ٣/٢ لە ئاوەسپی ڕاوە ماسییەکمان کردو ماسییەکانمان برد بۆوێرانەکانی زستانە. کەلە ژیانی پێشمەرگایەتیدا زۆر ڕێزیان لێگرتبووم‌و یارمەتیان دابووم، کچێکی تیا بوو بەناوی بەدیعە عەبدولکەریم خدر زۆر ئازا بوو، هەرچی کەلو پەل‌و تەقەمەنییەکمان هەبوو لای ئەو دامان ئەناو بە باشی بۆی ئەپاراستین، نەمئەزانی لە ئەنفالدا چی بەسەر هاتووە، بۆ یادکردنەوەی چوومە سەروێرانەکەیان‌ووێنەی ماڵە ڕووخاوەکەیانم گرت، ئینجا ماسییەکانمان برژاندو دوای نانخواردن بەرەو چیای ئاژداخ‌و بنکەکەی جاری پێشوومان چووینەوە.

شایانی باسکردنە کاتی خۆی جولەکە لە کوردستاندا هەبوون بەڵام ژمارەیان کەم بوو، بەشێکیان لە شارەکاندا ئەژیان بەشێکیشیان لە دێهاتەکاندا.. ئەمانە خەڵکێکی بێوەی‌و کاسب بوون بە تایبەتی دێهاتییەکانیان . باوەڕیان بە ئاینەکەی خۆیان زۆر قایمبوو، خۆڕاگر بوون‌و بەرگەی زوڵم‌و ستەمی خەڵکی تریان گرتووە بە تایبەتی ئەوانەی گەڕیان پێکردوون‌و شەڕیان پێفرۆشتوون.. جارێکیان لەم دێی زستانەیە جولەکەیەك ئەبێتە میوانی هەسەنە شەل کە کابرایەکی خاوەن دەسەڵات بووە لە دێیەکەدا.. هەسەنە شەل ئەیەوێ گەڕێك

بەو جولەکەیە بگێڕێ چونکە پارەو زێڕێکی زۆری پێبووە. هەسەن ڕوو ئەکاتە جولەکەکەو ئەڵێ: جووە جمێنی جولەکانە زۆر خۆشە بۆ هەنێ جمێنم نادەیتێ..؟ جولەکەی بەستەزمان ئەڵێ: خوا نەکات.. چۆن هەڵەی‌وا ئەکەم جمێن بە جەنابتان بدەم. هەسەنە شەل زۆری لێئەکاووازی لێناهێنێ جولەکەکەش ناچار ئەبێ جمێنێکی بداتێ: هەسەنی سەگبابو..! ئیتر هەسەن بانگی کوڕانی خێڵ ئەکاتو ئەڵێ: پیاو ئەگەر نەگبەتی بیگرێت جولەکەش جمێنی ئەداتێ. ئیتر بەو بیانووەوە جولەکەی داماو ڕووت ئەکەنەوەو دەستبەدەری ئەکەن.

ڕۆژی ٣/٤ لەوێوە بەرەو مەسۆیی بەرگەچ گەڕاینەوەو لەوێشەوە چووینە چیا چەرموو کەلە ٥٠٠ مەتری دووری دێیەکەوە فڕۆکەیەکی عێراقی کەوتبووە خوارەوە لە لایەن فڕۆکەکانی ئەمەریکاوە کە ڕۆژانە ڕاویان ئەکردن. بە جوانی‌وێنەی ئەو فڕۆکەیەم گرت. ئاخۆ ئەبێ ئەم فڕۆکەیەی ئێستا ئەم هەردەیە بووەتە گۆڕستانی چەندین جار پەلاماری کوردستانی دابێ‌و زیانی زۆری بە خەڵکی‌و دێهاتەکان گەیاندبێ..؟

کێ ئەڵێ ئەمە یەکێك لەو فڕۆکانە نییە کە بۆمبا ژاراوییەکانی کیمیایی نەڕشاندووەتە سەر هەڵەبجە دا..؟

چەند خۆشە دوژمنە درندە بێبەزەییەکەی خۆت‌وا بە زەلیلی ببینی.! ئەو دوژمنە کە سوپایەکی شەڕەنگێزی بەهەموو جۆرە چەك‌و تەکنیکی سەربازی سەردەمەوە سازو تەییار کردبوو بۆ تەفروتونا کردنی کوردو هەڕەشەشی پێ لە دەوڵەتانی ناوچەکە ئەکرد.

هەمووووڵاتانی دونیا سوپا بۆ پاراستنی خۆیان‌و گەشەپێدان‌و خزمەت کردنیان بەکار ئەهێنن، مەگەر تەنیاووڵاتە دیکتاتۆرییەکان سوپاوەکو داردەستێك بۆسەرکوتانەوەی خەڵکی‌و کوشتن‌و بڕین بخەنە خزمەتی سیاسەتی چەپەڵیانەوە. ڕژێمی بەعس‌و سەدامی دیکتاتۆر بەهەمان پێوەدانگی دیکتاتۆرەکانی تری دنیا کارەساتیان بۆ گەلەکانی عێراق ئەنجامدا، سوپاکەشیان

ئامادە ئەکرد بۆ جێبەجێکردنی نەخشە دزێوەکەیان. بۆیەئەم سوپایە هەمیشە ئەرکی بەجێهێنانی بەرنامەو سیاسەتی کوشتن‌و خراپە کاری‌و لەناوبردن بووە. سەربەخۆیی نەبووە لە ئەنجامدانی کاروبارەکانیدا، هەمیشە هیچ مافێکی نەبووە لە ڕاو بیرو بۆچوون‌و هەڵوێستدا، بگرە دەیان‌و سەدان سەرکردەی ئەفسەریان لێ پاکسازیکراوە بە تۆمەتی نابەجێی جیاجیا، کە دێتە سەر تۆمار کردنی سەروەری هیچ سەروەرییەکی تۆمار نەکردووە لەگەڵ دەرەوەی عێراقدا نموونەش شەڕی ئیسرائیل‌و شەڕی هەشت ساڵەی لە گەڵ ئێران، لەناوخۆشدا هەر خەریکی توندو تیژی بووە بەرامبەر بە خەڵکی لە ڕێگەی کودەتاوە، هەروەها خەریکی ئەنجامدانی شەڕی نابەرامبەر بووە لەگەڵ کورددا. بۆیە ئەبینین سوپایەکی بێهێزو بێدەسەڵات بووە لە حوکمداو هەموو تواناکانی لەژێر کۆنترۆڵی سەدام‌و بەعسدا بووە.

ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ یەکەم ناوکی دامەزراندنیدا کە فەوجی ئیمام موسای کازمیان پێووتووەووردەووردە گەشەی کردو بووەتە سوپایەکی پڕچەك‌و مۆدێرن‌و خاوەن توانای لە ڕادەبەدەر، هێشتا ئەوسا تای تەرازوو قورستر بوو. کەسێتی سەربازی بەهێزتری هەبوو.

بەپێی هەندێ سەرچاوەی سەربازی ئاگادار توانا سەربازییەکانی هێزەکانی سوپای عێراق بەم شێوەیە پێش جەنگی کەنداو ئامار کراوە:

- ١ ٢٠٠ ٠٠٠ سەربازی چەکداری هێزی زەمینی بەهەموو بەش‌و یەکەکانەوە.
- ٦٥٠ فڕۆکەی جەنگی هێزی ئاسمانی جگە لە کۆپتەرە جۆراو جۆرەکانی.
- ٥ ٨٠٠ تانکی جۆراوجۆری پێشکەوتوو.
- هەزاران جۆری تۆپ‌و تۆپخانەی قورس‌و مووشەکی دوور هاوێژ لەم شەڕە سەخت‌و دژوارەدا لەگەڵ ٣٠ دەوڵەتی دنیادا ئەبێ بەشی شێر لە زیان‌و

زەرەرەکان بەر سوپای عێراق بکەوێت کە بە پێی تەقدیراتی سەرچاوە ئاگادارەکان ئەو زیانانە گەیشتۆتە ئەم ڕادەیە:

**زیانی مرۆیی:**

- ١٠٠٠٠٠ کوژراوی سەربازی
- ٨٦٠٠٠ دیل
- ١٥٠٠٠ کوژراوی مەدەنی

**زیانی مادی:**

- ٢٨٥٠ تانك تێکشکێنراون
- ٤٥٠ زرێپۆش
- ٣٠٠ بنکەی مووشەکی زەوی ـ ئاسمان تەفروتونا بوون
- ٥٠ بنکەی مووشەکی زەوی ـ زەوی تەفروتونا بوون
- ٣٠٠ فڕۆکەی جۆراوجۆر فەوتان
- ١٥٠ کەشتی دەریایی تێکدران
- ٧٦٠٠ تۆپو ڕاجیمە تێکشکێنران

**زیانی ئابووری عێراق** بە ٢٤٠ ملیار دۆلار مەزەندە ئەکرێت. ئەوەی لەم هێزە زەبەلاحە مایەوە ئەوەیە:

- ٤٠٠٠٠٠ سەربازی چەکدار
- تانکی جۆراوجۆر
- زرێپۆش
- پارچە تۆپ
- فڕۆکەی جەنگی
- هەلیکۆپتەر

عێراق لەووڵاتێکی سەربازیی بە تواناو خاوەن ئابوورییەکی بەهێز بوو بەووڵاتێکی هەژاری ئەوتۆ دنیا بەزەیی پێدا بێتەوەو کۆمەکی بکات. زیانەکانی

هەر لە مەیدانی شەڕدا نەبوو بەڵكو لەوە زیاتر بژاردنەوەی زیانەكانی كوێتیشی ئەچێتە سەر، سەرەڕای قەرزی بیانیو زیانەكانی شەڕی هەشت ساڵەی لەگەڵ ئێراندا كە مەزندە ئەكرێت بە ٦٠٠ ملیار دۆلار. ئەمە هەمووی لە ناوچەوانی دەسەڵاتی دكتاتۆریانەی سەدامو فاشیەتی حیزبی بەعسدا بەسەر گەلانی بێچارەی عێراقدا هات. ڕژێمێك ئەمە ڕەفتاری بێتو سوپایەك هەر خەریكی كودەتاو بەگژداچوونەوەی بزووتنەوەی دیموكراتخوازی خەڵكی عێراقو لێدانی خەباتی ڕەوای گەلی كوردی بێ بە ئەنفالو كیمیاییو تەعریبو ڕاگواستن، ئەبێ هەر چاوەڕوانی ڕۆژێكی ڕەشبێت مەرگی خۆی تێدا ببینێتەوەو لاشەكەی فڕێ بدرێتە زبڵدانی لەبیرچوونەوەو نەفرەت لێكردنەوە.



# خۆ ســـازدان بـــۆ

# راپـەڕیـــن

گـەلانی عێـراق هـەموویان وەکو مەنجـەڵێکی پەسـتێنراو لەسـەر ئـاگر جۆشیان ئەخواردو هەمیشە لە بیری ئەوەدا بوون ڕووبـەڕووی یـەکجارەکی ئـەو ڕژێمـە ستەمکارە ببێتـەوە. ئـەو کەرایەتییـەی سـەدام لـە پـەلاماردانی کوێتـدا کـردی و ئـەو لێدانـەی لەلایـەن ئـەمریکاو هاوپەیمانـەکانی کرایـە سـەری و ئـەو شکستەی تووشـی هـات، زەمینـەی زیـاتری خۆشـکرد بـۆ هەڵچوونی کـەفوکوڵی خەڵکی و ڕاپـەڕینی سەرتاسـەری. چونکە بـەعس خـۆی لـە ڕێگـەی کودەتایـەکی شوومەوە هاتە سەر حوکم نەیئەزانی گورزی ڕاپەڕین چـەندە قورسـەو ئـازاری پێئەگەیـەنێ. هەسـتی بـەوە نەئـەکرد کـە ئـەو هـەموو سـاڵە پـڕ لـە زوڵـم و ئەشـکەنجەو تونـدو تیژییـە ئەبێتـە چـەقۆیەکی تیـژو گـەردنی ئەسـتووری ئەبڕێتەوە. ئەو لێدانەی ئەمریکاو هاوپەیمانان بـاری نـاوخۆیی عێراقـی تێکـدا، لە خوارووەدا جموجووڵ پەیدا بوو، خەڵکی هەستان. ڕژێم شڵەژابوو، ئەو هەموو شکستەی لە کوێتدا تووش بوو.. لە نـاو خۆشـیدا خـەڵکی ڕاپـەڕی، هەڵوێستێکە تەحـەمول نـاکرێ. لـە کوردستانیشـدا دۆخەکـە لـە تەقینـەوەدا بـوو، هێزەکـانی بـەرەی کوردسـتانی بـەرەو نـاوەوە ئـەهاتن، بـە تایبـەت هێزەکـانی یـەکێتی نیشتمانی کوردستان هەموویان کەوتبوونە ڕێ کـە بـە پێـی نەخشـەیەکی گشـتی کارەکـانی دارێـژرابوو هـەموو کوردسـتان کرابـووە چـەند میحوەرێکـەوە هـەر میحوەرێکیش ئەنـدامێکی مەکتـەبی سیاسـی سەرپەرشـتی ئـەکرد بـە هاوکـاری

لیژنەیەك كە بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشو كارەكان درووست كرابوون، هەر میحوەرێكش بریتی بوو لە چەند یەكەیەك:

**١. میحوەری سلێمانی.. كە سنورەكەی بریتی بوو لە:**

سلێمانی، پێنجوێن، هەورامان، شارەزوور، دەربەندیخان، باوەنوور، كەلار، خانەقین، سمود، كفری، دووز، زەنگابات.

ئەم میحوەرە دوو یەكەی هەبوو:

**ا/ یەكەی گەرمیان: كە لە سنووری تەپەڕەشی ئێرانەوە كارەكانی بۆ ناوەوە ڕائەپەڕاند.**

**ب/ یەكەی شارەزوور: لە دۆڵە ناوەوە بۆ ناوەوە خۆیان ئامادەو ساز ئەكرد.**

ئەم میحوەرە كاك فەرەیدون عەبدولقادر سەرپەرشتی ئەكرد بە هاوكاری هەڤالان شێخ جەعفەر، حامی حاجی غالی، شێخ عەلی شێخ حەمە سالەح.

**٢. میحوەری كەركوك.. سنوورەكەی بریتی بوو لە:**

كەركوك، چەمچەماڵ، دووكان، ئۆردووگاكانی: ئەڵلایی، بازیانەكان، شۆڕش

**٣. میحوەری هەولێر.. سنوورەكەی بریتی بوو لە:**

هەولێر، كۆیە، هەموو ئەو ئۆردووگایانەی كەوتبوونە ئەو دەڤەرەوە

**٤. میحوەری ڕاپەڕین.. سنووری ئەمیش پێهاتبوو لە:**

قەلادزێ، ڕانیە، چوارقوڕنە، سەروچاوەو خۆشناوەتیو هەموو ئۆردووگاكانی ئەو دەوروبەرە.

**٥. میحوەری بادینان.. سنورەكەی بریتی بوو لە:**

باڵەكایەتیو بادینان بە هەموو شارو شارۆچكەو ئۆردووگاكانییەوە.

سنوری گەرمیان لە میحوەری یەكدا بوو ئەم میحوەرەش كرابووە چەند یەكەیەكەوە بە پێی ئەو شارۆچكەو ئۆردووگایانەی سنوورەكە، هەر یەكەیەكیش هەڤاڵێك لێپرسراوی بوو لە گەڵ هێزێكی بەردەستدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

١. یەکەی دەربەندیخان: مەحمود سەنگاوی

٢. یەکەی باوەنوور: کوردۆ قاسم

٣. یەکەی کـــــەلار: عەدنانی حەمەی مینا

٤. یەکەی ســـــمود: م. عەلی عەبدوڵلا

٥. یەکەی کـــــفری: حەمەڕەش شێخ کەریم

٦. یـــــەکەی دووز: عوسمانی حاجی مەحمود

٧. یەکەی زەنـگاباد: عادل شکور

٨. یەکەی خانەقـین: عەلی شامار

هەر یەکێك لەم یەکانە چەندین کادیری جیا جیا لـە گـەڵ لێپرسـراوی یەکەکانـدا هاوکـار بـوون بـۆ بـەڕێوە بـردنو جێبـەجێکردنی ئەرکـەکان. بـەڵام دواتر بە هۆی هەندێ گلەییو گازندەوە گۆڕانێك لە یەکەی دەربەندیخاندا کـراو من چوومە میحوەرو برادەران سـەلامی کوێخـا عـەزیزو مـەحمودی مامـە عـەزە لەوێ دانران.

هەر لە پێش دەستپێکردنی ڕاپەڕینەوە یەکێتی هەندێ هەنگاوی گرنگی نـا بـۆ کـۆنترۆڵکردنی دۆخەکـەو سـەرکەوتنی بەرنامـەکان بـەوەی لـە ڕێگـەی پارتیزانو ڕێکخراوی نـاو شـارەکانو هەڤاڵانـەوە نووسـراوی مـۆرداری مەکتـەبی سیاسـی بـۆ خـەڵکی تێکۆشـەرو پیاوەکـانی سـەر بـە ڕژێـم نێردرابـوو بـۆ هاوکـاریکردنو پشـتیوانی ڕاپـەڕین، ئینجـا کۆمـەڵێك ڕێنمـایی بـۆ لێپرسـراوو کادیرەکان دابەزێنرا بۆ پەیڕەوکردنی:

١. ڕزگار کردنی کوردستان لە سوپای داگیرکەری بەعس

٢. ڕێزگرتن لە دیلو ناردنیان بۆ شوێنی پارێزراو

٣. ڕێزگرتن لەو چەکدارانەی هاوکـاری هـێزی پێشمەرگـەی کـوردستان نەکـەنو ڕێکخستنیان بۆ بەرژەوەندی گشتی.

٤. خۆ دوور خستنەوە لە شەڕی زیانبەخش کە دوژمن ئەیسەپێنێ.

٥. نواندنی ڕەفتاری جوان بەرامبەر بە خەڵکی.

٦. کۆنترۆڵکردنی هێزەکانو ڕێگە نەدان بە خراپە کردن.

٧. دەستکاری نەکردنی کەرەستەو کەلوپەلی دامودەزگا گشتیو حکومییەکان.

٨. دەستگرتن بە سەر هەموو بەڵگەنامەکانی ناو دامودەزگا حیزبیو جاسوسییەکانو پاراستنیانو گەیاندنیان بە شوێنی مەبەست.

٩. ڕێگە نەدان بە تۆڵەسەندنەوەی عەشایەری.

بە داخەوە هەندێ لەو ڕێنماییانە جێبەجێ نەکراو شارۆییەك بەرپا بوو. جا لە خۆسازدانمان بۆ ڕاپەڕین ئیزگەی دەنگی گەلی کوردستان بەردەوام بەرنامەکانی بەوپەڕی حەماسەتەوە پەخش ئەکردەوە. هەموو هێزەکانی پارتیزانی خستبووە ئینزارەوە. شانە چەکدارەکان ئامادەباش بوون لە ڕێگەی برووسکەی جفرەدارەوە هەموو زانیاریو ڕاسپاردەیەکیان پێئەگەیشتو دەست بەکاربوون. دامو دەزگاکانی ڕژێم لە بارێکی ناهەمواردا بوون، سات بە ساتووردەووردە دەستیان ئەکردە کشانەوەو چۆڵکردنی کوردستان بە تایبەتی کاربەدەستە زلەکانیان.

بۆیە ڕۆژی ٣/٥ ئاگادار کراینەوە بگەینە نزیك باوەنوور، چووینە دێیوێرانکراوی گلاڵکەوە، ئینجا گەڕاینەوە ئەسحاب، جارێکی تر گەڕاینەوە لای نزیکی باوەنوورو لەوێ لەگەڵ برادەرانی ڕێکخستندا یەکمان بینی کە یەکێکیان جووتیاری برای شەهید جەلال بێکەس بوو، دوای ئەوە ڕۆیشتینەوە بۆ ئەشکەوتی هۆمەر لەگەڵ کاك سەلاحی کوێخادا ئەو ڕۆژە تاکو ئێوارە بارانی بەخوڕ لێیدااین.

هەر ئەمرۆ کە یەکەم پریشکی ڕاپەڕین لە سەروچاوەو ڕانیەوە هەلگیرساو کۆمەلانی خەلکی شۆڕشگێڕی کوردستانو ڕێکخستنەکانو شانە چەکدارەکانو هێزی پێشمەرگە پەلاماری ڕژێمی فاشییانداو لە ماوەیەکی کەمدا ئەو دەسەلاتە زەبەلاحەیان ڕاپێچی توونی مەرگ کردو هەموو دامو دەزگا تۆقێنەرەکانیو سوپا درندەکەیو جاشو چەکدارەکانیوەکو بەفری ئەو بەهارە توانەوەو ئاسەواریان نەما. بەمەش ڕانیە بووە دەروازەی ڕاپەڕینو پریشکی بە هەموو شوێنێکی تری ئەم کوردستانەدا پەخش بووەوە.

لەملاشەوە شەوی ٥ ـ ٣/٦ چووینە سەر چەمی سیروان بۆ پێشوازی کاك فەرەیدونو لێپرسراویوەحدەکان بەهێزەکانیانەوە. بەلام ئەوندە بارانەکە بەخوڕ بوو، ئاوی سیروان زیادیکرد، نەمانتوانی بە کەلەکیش بیپەڕینەوە، هەموو لەشمان تەڕبوو بووووشکی تیانەمابوو، لە ئاستی دێی لەواوان ماینەوە کە نزیکی جادەی کەلار ـ دەربەندیخان، ئۆتۆمبیلێکی زۆر بە جادەکەدا لە دەربەندیخانەوە بەرەو کەلار ڕەت ئەبوو، نەمانئەزانی ئەوانە پیاوەکانی ڕژێم بوونو لە ترسی ڕاپەڕینی خەلکی کوردستان هەلئەهاتن. گەر پێمان بزانیبایەن ڕەنگبێ دەیان کەسمان بە دیل بگرتایە لەوانەی کە دەستیان بە خوێنی ڕۆلەکانی میللەتەکەمان سوور بوو.

ڕۆژی ٣/٧ شاری سلێمانی ڕاپەڕی، ئەو هەموو دامو دەزگا تۆقینەرەی بەعس لە ماوەی ٢٣ سالدا بە خوێنی خەلکی درووستی کردبوو هەرەسی هێنا. بەعس لە دوای خۆی جگە لە تۆماری تاوانو جینۆسایدو خراپەکاری هیچی تری بەجێنەهێشت.

هەندێك کەشو هەوا خۆشتر بوو، بارانو سەرماکەی نەمابوو، شەوی ٧ـ ٣/٨ کاك فەرەیدونو کاك عەدنان بە هێزێکەوە لە ئەشکەوتی هۆمەر گەیشتنە لامان، پێکەوە دانیشتینو لەسەر چۆنیەتی پەلاماردانو ڕزگار کردنی شارۆچکەکانی سنووری میحوەری یەك گفتوگۆمان کردو ئاگاداری برادەرەکانمان کردەوە کە ڕێکخستنەکان بە باشی خۆیان سازداوەو دوژمنوورەی نەماوە.

ڕۆژی ٣/٨ بە تەواوی شاری سلێمانی لە داگیرکەرانی کورد پاککرایەوەو کۆنترۆلکرا، پریشکی ئەم ڕاپەڕینە گەیشتە نەسرو باریکەو عەربەتو هەلەبجەی تازەو هەموو سەربازگەو ڕەبایەو مۆلگەکانی ڕژێمی گرتەوە.

شەوی ٨ ـ ٣/٩ هێزەکەی تری گەرمیان کە لە هەردەکانی خوڕخوڕو زەلکەدا خۆیان حەشاردابوو لە سیروان پەڕینەوە، بە سەرپەرشتی کاك کوردۆو م. عەلیو کاك عادل شوکرو خۆیان داواکران هەر ئەو شەوە بگەنە پەناگەی سەلاجەکەو هێزەکەشیان لە پشتی باوەنوورەوە بن. ئەو شەوەش دنیا ساردو ئینجا بارانێکی زۆر دایکرد،ووشکایی لە لەشی کەسدا نەمابوو. بەلام لەبەر

ئەوەی دنیا بەهار بوو، کەس سەرمای نەئەبوو. ئەو شەوە بۆمان نەگرا بچینە ناو باوەنوورەوە، برادەرانی ڕێکخستن هاتن‌وقسەی خۆیان کرد، ئیتر بە پێی ئەو نەخشەیەی دانرابوو ڕۆژی ٣/٩ کاتژمێر ١١ لەیەك کاتدا دەربەندیخان‌و باوەنووریش لە چنگی ڕژێمی کوردکوژ ڕزگاریان بوو، ئێمە یەکەم مەفرەزە بووین: میقدادی برای شەهید شێخ جەمال‌و فازڵی برای کەریم چاوڕەش‌و کۆمەڵێك قارەمانی تر بوون گەیشتینە ناو شارۆچکەکە هەموو سەربازو پیاوەکانی ڕژێم ڕایانکردبوو، خەڵکەکەی هەموو ڕاپەڕیبوون، ئێمە تەنها دوو ڕیز تەقەی بیکەیسیمان‌وەکو نیشانەی سەرکەوتن بەسەر شاردا کرد، ئیتر هەموو شتێك تەواو بوو بوو هەموو هێزی پێشمەرگە گەیشتینە ناوەوە، تەنانەت هێزەکەی کاك شێخ جەعفەرو کاك عەلی شامارو ئەوانیش بە ناوی سیرواندا بەو ڕۆژی نیوەڕۆیە گەیشتن ، کە چووینە ناو خۆشی خەڵکەکەوەو تەماشای خۆمانمان ئەکرد کە چەند ساڵێك لە غەریبی‌و دوورەووڵاتیدا بووین‌واهەستمان ئەکرد لە ئەستێرەیەکی ترەوە هاتووین ئەوەند لەڕو لاوازو چڵکن بووین تەنانەت خەڵکەکەش درکیان بەو دۆخە تایبەتییەی ئێمە ئەکرد بەلاّم ئەو پێشوازیە گەرمەیان باوەش بۆ کردنەوەیان بۆمان هەموو شتێکی لە بیر بردینەوە.. یەکەم جار حەمەی حیزبم بینی چەکێکی پێبوو بو پەڕی خۆشیەوە بەر ڕوومان ئەهات کە خۆی لەگەڵ کۆمەڵێك هەڤاڵی ترماندا لە سەر مەسەلەی هەڤاڵ سەید محەمەد گیرابوون‌و لە زیندانی فاشیستەکاندا دوای ئەشکەنجەیەکی زۆر ئازاد کرابوون ، ئەیویست لەو ناوە بێت تا کەس دەست بۆ ماڵەکەی سدیقی عەلی حەمە ئەمین کە موستەشاری جاش بوو نەبات ، هەر چەندە شۆرشیش ئەوە بوو نابێ دەستکاری هیچ شتێك بکرێ‌ودەبێ ڕێز لە هەموو کەس بگیرێ بەتایبەتی ئەوانەی بەدەم بانگەوازی شۆڕشەوە بێن .

# بەعس نەما

لە چاو نووقانێکدا بەعس نـەما، دەسـەلاتی چـەندین سالەی دارمـا. نـە سـەرباز، نـە تانـك، نـە فرۆكـە، نـە ئـەمن و ئـستخبارات تەنانـەت جاشیش وەكو هێزی خۆفرۆش نەمان، بە جۆرێـك هـەموو هێزەكـانی فەیلەقـەكانی ١و ٥ لـە كوردستاندا لەبەریەك هەلوەشانەوە لەوەش خۆشتر زیاتر لە ٢٠٠ فـەوجی جاش بـووە بلقـی سـەر ئـاوو پەیوەنـدییان كـرد بـە (ه.پ.ك)ەوە. هـەموو شـتێك لـە ساتەوەختێكی كەمدا گۆڕاو هەندێك خائین و كوردكوژ ڕایان كردو كوردستانیان بەجێهێشـت. ئـەوی تـر هـەموو لـە مـالی خۆیـدا مایـەوە، هاتنـەوە سـەنگەری كوردایـەتی، بـەلكو لەگـەلّ هێـزی پێشـمەرگەدا هاوكـاربوون بـۆ پـەلاماردانی دوژمن و ڕزگاركردنی ناوچەكانی تر، بە هەزاران سەربازی بێچەك بـێ سـەروبەر لەو ڕێگاوبانانـەدا بـەرەوخوار شـۆڕ ئەبوونـەوە بێئـەوەی كـەس بـیر لـە تۆلـەیان بكاتـەوە یـان ئازاریـان بـدەن، بـە پێچـەوانەوە یارمـەتی ئـەدران، نـان و ئاویـان ئەدرایە بە مەرجێك بە درێـژایی تەمـەنی ئـەم سوپایە دەزگایـەكی چەوسـێنەر بووەو خەلكی كوردستان و عێراقیشی سەركوتكردووەو سەروەت و سامانیانی بـە تالان بردووە.

ئێمـــە كاتـــێ كـــە لـــە پارتیزانییەكـــەدا دابەزینـــە خـــوارەوە كوردستانی وێرانەمان بینییەوە كە بە دەستی ئەم سوپایە ئەنجامـدرا بـوو بـەلام لـە ڕاپەڕینـدا من وێرانـەیی بەعسـم لا بەرجەسـتە بـوو، هەرەسـی ئـەو سـوپا قەبەیەم بە چاوی خۆم بینی. سەیرە ئـەو دەولەتـە زەبەلاحـە چـۆن بـە چـۆكدا هات و خۆی پێڕانەگیرا، ئەمە ئەو دەولـەت و هێـزە بـوو كـە ئێمـە هەمیشـە لێـی ئەترساین..؟ لەم بارەشدا ئێمـە هەلەیـەكمان كـرد كـەوا ئـەو هێـزەی دوژمنمـان ڕێگەدا بە ئـارەزووی خـۆی بـەرەو باوەشـی ڕژێـم بڕواتـەوە، نەمانبردنـە شـوێنی تایبەتی و وەكو دیلی جەنـگ مامەلەمان نـەكردن و بـۆ كـاتی پێویست وەكو كـارتی

گوشار بۆ سەر ڕژێم بە کاریان بهێنین. گوێمان نەدایە ئەوەی کە جارێکی تر ئەمانە بەر ئەبنەوەویێزەمان. لە هەمووی ترسناکتر ئەو هاوکاریکردنەی هەندێ خەڵك بوو بۆ پیاوەڕەشتاڵەکانی دەزگا جاسوسییەکانی ڕژێمو دەربازکردنیان بۆلای ڕژێم کە ئەمە بەڵگەی دۆستایەتیکردنی ئەو خەڵکانەیە لە گەڵ دوژمندا بە نهێنی دژی شۆڕشو گەل.

هەر شوێنێك ڕزگار ئەکرا ئەبووە جەژن، بارێکی دەروونی سەیر بوو، لە خەون ئەچوو. دەیان پرسیاری سەرسووڕهێنەر خۆی قووت ئەکردەوە:

چۆن بووەوا بەعس بەو زلییە نەما..؟

چۆن ئەم هەلومەرجە لە بەرژەوەندی کوردا بوو بۆ دەرباز بوون..؟

تاکو کوێ بڕ ئەکەین..؟

چارەنوسمان بەرەو کوێ ئەچێ..؟

تۆ بڵێی بەعس زیندوو نەبێتەوە..؟.

بارەکە ئەوەندە خۆشبوو جێی ناخۆشی تێدا نەبوو، ڕەشبینی بواری نەبوو ڕەشماڵی تیا هەڵدا. هەموو بەیەك دەنگو هەڵوێستەوەپێش ئەچوون. هەموو هێزو توانای بەعس لەبەر پێی ڕاپەڕیندا ئەتوایەوە. سەیربوو پێشمەرگەو چەکدارو ڕێکخستنو شرەخۆر هەمووی تێکەڵ بوو بوون. بە ئاسانی جیانەئەکرانەوە، هەمووی هەر خۆی بە شت ئەزانی. ئەو لێبووردنە گشتییە کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان دارێژەری بوو ڕۆڵی باشی بینی لە دڵنیابوونی خەڵکی.

دوای پشوویەکی کەم لە باوەنوور هێزی هەر یەکەیەك بەرەو سنووری شارۆچکەی خۆیان کەوتنەڕێ، منیش بۆ ئێوارەکەی گەیشتمە دەربەندیخان کە بە هۆی خەڵکی تێکۆشەری وەکو عەلی حاجی عەبدوڵلای کەلۆشو سەرداری مەحموی حەمەمرادو عەباسی شەممەو کۆمەڵێك خەڵکی ترەوە ناویان ناکەوێتەوە بیرم بۆ یەکەمجاریش ئەوانم بینیو خەڵکیش باسی ڕۆڵی ئەوانی ئەکرد. پەلاماری مونەزەمەو فیرقەو حامیەیان داو دەستی بەسەردا گیراو لە

دوژمـن پاککرایـەوە. چووینە مـاڵی کاکـە حەمـەی حـاجی مـەحمودی هـارونیو لەسەر ڕۆشنایی ڕێنماییەکانی کاك فەرەیدون قسەم لەگەڵ کاك حەمەدا کرد بۆ دانـانی ئەنجومـەنێك بـۆ دەربەنـدیخانو کۆمـەڵێك پیـاوی ناسـراو دەستنیشـان کـرانوەك ئەنجومـەنی شارۆچـکەکە کـار بکـەن. کـە تـا ئـەو کاتـە شارۆچـکەکە هێشتا ئـاڵۆز بـوو، هێزەکـەمانوەکو پێشـمەرگە کـەمو نارێـك بـوو، زۆر کەسـیش تێکـەڵ بـە ئێمـە بـوو بـە دوای شـڕەدا ئەگـەڕان. لەگـەڵ کـاك سـەلامو کـاك مـەحمودی مامەعـەزەدا قسـەمان کـرد بـۆ دەسـت بەسـەراگرتنیوەزعەکەو کۆکردنەوەی ئەو چەكو تەقەمەنییانەی هێزەکانی دوژمن بەجێیان هێشتبووو ئێمەش شارەزایی تەواومان لەسەری نەبوو. لەناکاودا لاوێك بە ئارەزوو ئەچووە سەر چەکی ٥٧و دەستی پیائەناو تەقەی ئەکرد، یـان گوللـە راجیمـەیان ئـەهێناو ئاگریـان ئـەدا. شارۆچـکەی دەربەنـدیخانیش بـە دوو هـۆ گرنگـی سـەربازی پێدرابوو: یـەکێکیان چونکە بەنـداوێکی گرنگـی تێـدابوو هـەم بـۆ ئاوەکـەیو هەموو بۆ بەرهەمهێنانیووزەی کارەبا دەیان جار لە لایەن فڕۆکەکانی ئێرانـەوە بۆردوومـان کـراوەو هێزەکانیشـی هـەوڵێکی زۆریـان دا بـۆ کـۆنترۆڵکردنی بـە تایبەت لـە شـەڕەکانی زمنـاکۆو زەواڵـیو شـەمێراندا. دووەمیـان شارۆچـکەیەکی نزیکە سنوور بوو، نیشانەیەکی گرنگی لابەلا کردنـی شـەڕی لایـەك بـوو بەسـەر لایەکەی تردا، بوو بووە جێ شـەڕگەی خەتـەرناكو عێـراق هێزێکـی زۆری تێـدا مۆڵدابوو، بەسەدان پارچە چەکی قورسی دژی هـەوایی لـە جـۆری ١٥٧ ملـمو ٣٧ ملـمو ١٤٫٥ ملـمو چـوارلوولەو یـەك لوولـەی لەسـەر لوتکـەی چـیا بـەرزەکانی دەوروبـەری شـارو سـەر بەنداوەکـە دانـابوو. لـە هەنـدێ بـاردا کۆکردنـەوەیان زەحمەت بوو، هێنانە خوارەوەیان قورس بوو، یان هەندێ کەس ئـەیان بـردەوەو لـە ماڵـەوە لای خۆیـان دایـان ئـەنا، ئێمـەش ناوەنـدێکمان دانـەنابوو بـۆ کۆکردنەوەووەرگرتنەوەی ئەو چەکانەی لە ڕێگەی ئاگادارکردنەوەی خەڵکی بۆ تەسلیم کردنەوەیانو دانانیان لە شوێنی تایبەتیدا. بۆیە نەمانتوانی سوود لـەو شتانەوەربگرین کە لە دواییدا لە دەستمان چوون، جگە لەمەش حیزبەکان یەك

هەڵوێست نەبوون هەر لایەنە بۆخۆی کاری ئەکردو شتی کۆئەکردەوەو پەنای ئەدا.

وەزعی ناو شارو شارۆچکەکان کە ڕزگاربوو بوون تارادەیەك ئارام بوو بووەوە. خەڵکی لە لایەکەوە لە خۆشیدا بوون، لە لایەکەوە جموجووڵوووروژانێکیان تێدابوو بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ چوونە ئەو شوێنانەی هێشتا دوژمنی لێمابوووەکو جەلەولاو دووزو خانەقین.

ڕۆژی ۳/۱۰ شارۆچکەی کفریش ئازاد کرا، هێزەکانی کفریو دووز پێکەوە چوونە ناو دووزو ئەوێش ڕزگاری بوو، بەڵام ئەوێ جیاوازی لەگەڵ شوێنەکانی تردا هەبوو، دوژمن بە ئاسانی دەستبەرداری نەئەبوو. چونکە دەروازەیەك بوو بۆ پەلاماردانی شاری کەرکوك لە خوارەوە هەروەها دەستبەسەراگرتنی ناوچە نەوتاوییەکەی زەمبوور، هەروەها کۆسپێکی تریش لە ڕێگادا بوو بۆ خجلکردنی هێزی پێشمەرگە ئەویش هێزەکانی مجاهدینی خەلقی ئێران بوو کە لە ناوچەی داودە کامپی سەربازییان هەبوو، دێهاتێکی زۆری ئەو ناوچەیەی گرتبووەوەو پەناگای قایمو قۆڵیان تێدا درووستکردبوو.

ئێمە هەر لە دەربەندیخان بووین خەریکی چاککردنی کارو باری ناوشارۆچکەکە بووین.. ڕۆژێك دوای ڕاپەڕین بوو کاك عومەری کاکە ئەوڵای مامی شەهیدان جیهادو بورهان هاتە لام دوای چەندین ساڵ دووری بە دیداری یەکتر شاد بووینەوە. کاك عومەر ماڵی چوو بووە عەربەت، شۆفێری تاکسی بوو لە ڕێگای دەربەندیخان ـ کەلار هاتوچۆی ئەکرد.. لە میانەی قسەکردنەکانیدا لە سەر ئەنفالەکان قسەیەکی بۆ گێڕامەوەووتی: جارێکیان لە گەراجی عەربەت بووم ئەفسەرێك هات دوو بەرخی پێبوو بەرەو کەلار ئەچوو. من بە شۆفێرەکانمووت: کەس هەڵینەگرێ. کە هاتە لامانووتی: سەرەی کامتانە..؟ منیشووتم: سەرەی منە.ووتی: باشە من لە گەڵتا دێمو دوو بەرخم پێیە بۆم هەڵبگرە. منیشووتم: هەر خۆت هەڵئەگرم.ووتی: باشە خۆم هەڵبگرەو دوو بەرخەکەشم بخە سنووقەکەی دواوە.ووتم: پیکابم پێ نییەو سنووقەکەشم پیس ئەبێ. ئەفسەرەکە زانی من مەبەستم ئەوەیە ئەو بەرخانە دزێتییە بۆیە

هەڵیناگرم. بانگی کردمە ئەو لاوەو پێی ووتم: من کوردمو ئەو بەرخانەشم نەدزیوە بەڵکو بە ٨٠ دینار لە کابرایەکم کڕیوون و گەر هەڵمبگری لە ڕێگا هەندێ شتت بۆ باسئەکەم سوودی هەبێ. کەوایووت دڵم نەرمبوو ، بەرخەکانم بارکردو یەکسەر بەرەو کەلار کەوتینە ڕێ . لە ڕێگا پێیووتم: من ناوم عەبدوڵلایەو نەقیبمو خەڵکی جەلەولامو فەرماندەی سریەی مغاویرم.. لە شەڕی تازەشاری ئەنفالەکاندا بەشداریم کردووە کە شەڕێکی سەختبوو، پێشمەرگەکان چەندین جار لیواکەمانیان شکاند.. ناچار فەرماندەی لیواکەمان داوای چەکی کیمیایی کرد کە لە گوللە هاوەنی جۆراوجۆردا بۆمان هاتو بەو گوللانە لێیاندراو فەرمانی هێرشکردنی پیادەشیان بۆ پێشەوەدا.. کە چووینە پێشەوە بەرگری نەمابوو پێشمەرگەیەکم بینی کیمیایی لێیدابوو ددانێکیشی کەوتبوو، توانای بەرگریو تەقەکردنی نەمابوو هەرئەوەندەیووت: تێرئاوم بکەن و بمکوژن. منیش بە سەربازێکمووت مەتارەکەی بداتێ..لەو کاتەدا فەرماندەی لیواکەمان هات کە بینی سەربازەکە مەتارەکەی دایە پێشمەرگەکە چاوی پەڕییە تەوقی سەری پەلاماری سەربازەکەی داو دایە بەر شەقو دەمانچەکەی هەڵکێشاو پێشمەرگەکەی گوللە باران کردو ڕووی کردە منیشوووتی: تۆ ئەفسەری حیزبی بەعسیت یان کوردایەتی ئەکەیت بۆ ڕێگەت دا ئەو سەربازە ئاو بداتە ئەو تاوانبارە..؟! منیشووتم: گەورەم.. ئەوە لە بەردەستی خۆماندایەو هیچ دەسەڵاتێکی نییە بڕیاریش لای جەنابتە.

دوای ئەوە بەرەو دێی کەریم باسام ئەڕۆیشتین فەوجەکەی مەحمود بەگی عوسمان بەگی شەرفبەیانیمان لەگەڵ بوو.. لە نزیك دێیەکە هەندێ ژنو منداڵیان بە گیر هێنابوو پارەو ئاڵتونیان لێئەسەندن، کە چاوم پێیان کەوت زۆر بێتاقەت بووم بە توندی چوومە گژی مەحمود بەگدا، ئەمەوایکرد مەحمود بەگ لای فەرماندەی لیوا شکاتم لێبکات، کە بانگکرام ناچار بە فەرماندەی لیوامووت: گەورەم.. فەرمانم پێکردووە بچێتە پێشەوە فەرمانەکەی جێبەجێ

نەکردووە بۆیە لە ڕوویاوەستاوم.

کاك عومەرووتی: کە گەیشتینە کەلار ئەفسەرەکەووتی: لێرە خەڵکی ئەمناسن‌و ئێستا بەمجۆرە بمانبینن تۆواتەنی‌وا ئەزانن ئەم بەرخانەم دزیوە بەڵکو یەکجاری بمگەیەنیتە جەلەولاو کرێی ئەوێشت بۆ حیساب ئەکەم. ئیتر منیش ڕووگیر بووم‌و بردمەوە بۆ جەلەولا. کە گەیشتینە بەردەمی ماڵەکەیان دایك‌و باوکی بە پیرمانەوە هاتن. باوکەکە چاوی بە بەرخەکان کەوت زۆر تووڕەبوو پێی‌ووت: ئەم بەرخانەت لە کوێ هێناوە..؟ ئەوە ماڵی کوردەو تاڵانت کردووە بۆیە نایەتە ئەم ماڵەوە..! ئەفسەرەکە ئەپاڕایەوەو سوێنی گەورەی خوارد کە دزێتی نییەو لە عەربەت بە پارەی خۆی کڕیویەتی. دوای ئەوە دایك‌و باوکەکە کە دڵیان ئاوی خواردەوە ڕێگەیاندا بچینە ماڵەوە.

ئا ئەمەیە هەڵوێستی مرۆڤی کورد پەروەر کە گەرچی کوڕەکەی ئەفسەری ڕژێمی ئەنفالچیش بێ هەر دڵە گەورەکەی لە لای خەڵکە ستەملێکراوی گەلەکەی بێ‌و بە ڕەوای نازانێ گەر کوڕەکەی هەڵەیەك بکات لە سەر حیسابی میللەتەڕەش‌و ڕووتەکەی خۆی.

لە ئێزگەوە ئاگامان لێبوو ڕۆژی ١١/ ٣ شاری هەولێرو دەوروبەری لە چنگاڵی بەعس بە یەکجاری ڕزگاریان بووە. هەر ئەمڕۆ هێزەکانی مجاهدین بە پێی ڕێککەوتنێك لەگەڵ یەکەی دووزدا کشانەوە بۆ خوارووی شارۆچکەی دووزو یەکسەر هەڵگەڕابوونەوەو لە بەڵێنەکانیان پەشیمان بوونەوەو بە تانك‌و تۆپ‌و هێزەکانیانەوە پەلاماری پێشمەرگەو خەڵکی ڕاپەڕیوی دووزیانداو خەڵتانی خوێنیان کرد کە زیاتر لە ٣٠٠ دانیشتووی بێتاوانی شارەکە شەهید بوون‌و چەند پێشمەرگەیەکی قارەمانیش گیانیان بەخشی کە یەکێکیان فەرماندەی ئازاو چەلەنگ کاك حەمە ڕەش شێخ کەریم بوو لێپرسراوی یەکەی کفری‌و قارەمانی پارتیزانەکانی گەرمیان بوو. لە هەمان کاتدا هێزەکانی ڕژێمی عەفلەقیش لە قۆڵی کەرکوکەوە بە هێزێکی زۆرەوە پەلاماری هێنا بوو بۆ سەر دووزو شەڕی سەخت بەرپابوو. هەر ئەمڕۆ هێزەکانی یەکەی خانەقینیش بە سەرپەرشتی کاك عەلی شامارو هاوکاری یەکەی دەربەندیخان بە سەرپەرشتی

کاک سەلام کوێخا عەزیزو هەندێ پێشمەرگەکانی یەکەی کەلارو خەڵکی سنووری کەلار پەلاماری شوێنەکانی دوژمنیان لە دەوروبەری خانەقین‌و لە ماوەیەکی کەمدا دوژمنیان ڕاوناو بە سەرکەوتوویی چوونە ناو خانەقینەوە، ئەو شارەی کە دەیان ساڵ بوو لە ژێر زەبری قامچی ئەم ڕژێمە داگیرکەرەدا ئەیناڵاندو بە توندی پرۆسەی بە عەرەبکردن‌و بە بەعسکردنی لەسەر جێبەجێئەکراو هەرچی سیمای کوردەواری هەیە لێی ڕووت ئەکرایەوە، ئەوەش بەهۆی ئەوەی ناوچەیەکی نەوتاوییەو دوژمن نایەوێ بە هیچ کلۆجێك ئەو جێگایەی نەوتی لێبێ کوردی تێدابێ.

لەبەر ئەوەی هێزەکانمان کەمبوون، بەشی کۆنترۆڵکردنی هەموو ناو شارەکەیان نەئەکرد، جگە لەوە ئەو خەڵکەی کە لەگەڵیان چوو بوون خەریکی شڕەخۆری بوون‌و جەنجاڵی کۆکردنەوەی کەلوپەل بوون بە تایبەتی ئورزدی باکەکە. ئەمەوایکرد هێزەکانی ڕژێم خۆیان کۆ بکەنەوە، خانەقین بۆ ماوەیەکی کەم هەوای ئازادی هەڵمژی. خێوی بەعس لەسەر دڵی دوور کەوتەوە، مەخابن جارێکی تریش بە تانك‌و تۆپ‌و هێزەکانیەوە پەلاماری دایەوەو سنگی ئەم شارە دڵ ئازاراوییەی کوتاو ئاڵای شەکاوەی ڕاپەڕین داگیرایەوەو خانەقین جارێکی تریش پەردەیەکی ڕەشی ئەستووری خەمباری بەسەر ڕوودا دادرایەوە.

پێشمەرگە ڕوو بەڕووی هێزەکانی دوژمن شەڕێکی قارەمانانەیان کرد زیانێکی فراوانیان تووشبوو، بە دەیان کەسیان لێکەوتوەڵێ لەم شەڕەدا پۆلێك ڕۆڵەی بەئەمەکی ئەم گەلەش کە زۆربەیان لەیەکەی دەربەندیخان بوون شەهید بوون، کە فرەتریان کەسوکاری کاك شاهۆ بوون بە تایبەت دووبرای خۆی‌و چەند ئامۆزایەکی‌و خزمی نزیکی تری‌وهەندێکیش کەس‌وکاری کاك سەلامی کوێخا عەزیز بەتایبەتی ئەویش دوو براو خوشکەزایەکی‌و خاڵۆزایەکی‌وبرای خاڵۆژنێکی‌و زاوای خاڵۆیەکی .

# شەڕی کوڵەجۆ

ڕۆژی ٣/١٢ سەردانێکی کفریم کردو گەڕامەوە کەلار، شەڕێکی سەخت لە قۆڵی کوڵەجۆ هەبوو، کاک عادل شکور گوێزرایەوە بۆ سەرپەرشتی یەکەی کفری‌و بورهانی حەمەی مینا لە جێگەی دانرا. کە هەواڵی ئەو شەڕەمان پێگەیشت، کاک شێخ جەعفەر داوای لێکردم بچمە خوارەوە بۆ سەرپەرشتیکردنی جەبهەی جەلەولا، ڕۆژی ٣/١٤ کە ڕۆیشتین لە بان ئاسیاو یەکەم کەس پێیگەیشتم بورهان حەمەی مینا بوو کە کادیرێکی هوشیارو پارتیزانێکی‌ووریاو لە ڕووی فیکریشەوە بە توانا بوو، ڕوانیم بریندارەو پەنجەیەکی قرتاوە، داوام لێکرد بچێت بۆ نەخۆشخانەی کەلار، بەڵام ئەو قایل نەبوووتی: مادام ئێوە هاتوون ناڕۆم. لەو کاتەدا کاک عەدنانی برای گەیشتە لامان‌و بورهان بەدەم پێکەنینەوەووتی: کاک عەدنان مایەوە ١٨ پەنجە. چونکە پێش ئەنفالەکان پەنجەیەکی پێی قرتا بوو.

تەقە گەرمبوو، گوللەیەکی زۆر بەرەو ڕوومان ئەهات، هاوارم کرد یاڵلا هێرش بکەن، پێشمەرگە ئازایانە خرۆشان، کە ڕۆیشتین بورهان لەگەڵ مندا بوو، بەرەو پێشەوە هەنگاومان ئەنا، لەناکاو بورهان دەستیگرت بە سنگیەوە، پێم‌ووت: ئەوە چییە، بورهان‌ووتی: گوللەیەکم بەرکەوتووە بەڵام هیچ نییە. کە چوومە سەری تەماشا ئەکەم‌وەزعی باش نییەو تا ئەهات دەنگی کز ئەبوو، هەر ئەیووت: هیچ نییە، هەتا هێزیشی تیا نەمابوو لە ژێر لێوەوە هەر ئەیووت: گوێی مەدەنێ هیچ نییە.بەداخەوە هەر لەوێدا گیانی سپارد، زیانێکی زۆرمان لێکەوت. لەو کاتەدا کاک عەدنانی برای هەر ئەوەندەی‌ووت: هەڵیگرن‌و ببەن با هێرشەکە بەردەوام بێت بۆ پێشەوە بڕۆن. بەڕاستی ئەمە هەڵوێستی مرۆڤی شۆڕشگێڕە لە کاتی شەهید بوونی برایەکیدا کە برا بچووکی بێت‌و

زۆریشی خۆش بوێتو نەیەتە سەر تەرمەکەیو تەنانەت نەشچێتە پرسەکەیو لە بەرەی شەڕەکاندا بمێنێتەوە.

ئێمە بەردەوام بووین لە هێرشکردنداو دوژمنمان تێکشکاندو دوایان کەوتین تاکو سەیتەرەی جەلەولا بە دەیان سەربازو ئەفسەرمان کوشت، سەدان پارچە چەکمان لێگرتن لەگەڵ چوار تانکی ت ـ ٦٩ چینیو چەند ئۆتۆمبیلێکی سەربازیو جیهازی ڕاکاڵی گەورەو چەندان دیلیش.جەبهەکەمان لە دێی ئیسلاح دامەزراند کە هەندێك گردۆلکەوچەمی تێدابوو، ٢٣ کیلۆمەتر سەروو شارۆچکەی جەلەولایە لەوێ سەنگەرمان گرتوووردە شەڕ هەبوو لەم شەڕانەشدا هەندێ لە هێزەکانی لەشکری بەدرمان لەگەڵا بوو.

ڕۆژی ٣/١٤ دەنگوباسی ڕزگارکردنی دهۆكو زۆربەی ناوچەکانی بادینان بڵاوبووەوە، لەم قۆڵەی خۆشمانەوە دوژمن ڕۆژانی ١٥و ١٦ / ٣ بە تۆپی قورسو کاتیۆشا بۆمبارانی کردین. بۆوەڵامدانەوەی دوژمن پەلاماریکی کۆگای تەقەمەنی سەربازگەی نزیکی جەلەولاماندا بەڵام نەمانتوانی ئامانجەکان بپێکینو دەست بگرین بەسەریدا.

ڕۆژی ١٨/ ٣ هێزەکانی مجاهدینویستیان دزەمان بۆ بکەنو پشتمان لێبگرن، بەڵام ئێمە ئاگامان لە نەخشەکەیان بوو هێرشمان بۆ کردنو ناقیلەیەکی تایە زنجیر کە دۆشکایەکی ٢٣ ملمی لەسەر بوو گیرا کە بورهان حەمە باقی لە گرتنەکەیدا دەوری باڵای هەبوو. ڕۆژی دواتر ئۆتۆمبیلێکی مجاهدین ڕێگەی هەڵەکردو هاتە ناومانەوەو کەوتە دەست لەشکری بەدرو هەردوو سەرنشینەکەی کوژران.

ڕۆژی ٣/٢٠ لای ئێمە جەبهەکە ئارام بوو، بەڵام لەولاوە هێزی پێشمەرگەی کوردستان گەورەترین سەرکەوتنیان تۆمار کرد بە چوونە ناو شاری کەرکوكو لە دەستی چەپەڵی بەعسیانیان ڕزگار کرد. بابە گوڕگوڕ ڕۆڵە چاو نەترسەکانی ئەبینی گیانبازی ئەکەنو گەڕەك بە گەڕەك چەتەوڵەکانی بەعسی ڕاوئەنێنو بە خوێنی سووریان لاپەڕەی ئازادی ئەنووسنەوە. کەرکوکی

جەستە بریندار لە چاڵی ئازارەکان سەر دەردێنێو هەناسەی قووڵی سەربەستی هەڵئەمژێ.

ئەمە بەعسی لە ناخەوە هەڵتەکاند، گەر کەرکوکی لە دەست دەرچێت چارەنووسی ڕەش چاوەڕوانی ئەکاتو لە پێتەختیش خۆی پێناگیرێ، بۆیە هێرشی بەرپەرچی دەستپێکردەوە، لە ئەنجامی هەندێ کەمو کوڕی لە بەرنامەی کارو پەرتەوازەیی هێزەکانو جەنجاڵیان بەکاری لابەلاوە دوژمن توانی پواز بخاتە ڕیزی جەبهەی شەڕی ناو کەرکوکەوەو لە هەندێ لاوە سەرکەوتن بەدەستبهێنێو پاشتریش کۆنترۆڵی زۆربەی شوێنەکان بکاتو هێزەکانی خۆشمان ناچار بن دەربچنە دەرەوەی شارو ئینجا بە یەکجاری ئەو ناوە بەجێ بهێڵن. ئەمە بیانوویەکی دا بە دەست دوژمنەوە کە ڕێڕەوی کارەکانی بگۆڕێو نەخشەی پەلاماردانەکانی سەر لە نوێ دابڕێژێتەوە.

## شەڕی مجاهیدین

لە قۆڵی ئێمەشەوە دوژمن هێزێکی زۆری مجاهیدینی کۆکردبووەوە بۆپەلاماردان ، شەوی پێش هێرشەکەو بەر لە ڕۆژبوونەوەواتە لە ڕۆژی ٣/٢٥ بۆردومانێکی چڕی تۆپو ڕاجیمە دەستی پێکرد ، ئەمە کاری لەو خەڵکە کرد کەهاتبوونە بەرەی جەلەولاو لە شێخ باوە بوونو پاشەکشەیان ئەکردو هێزێکی ئەنجومەمی باڵای شۆڕشی ئیسلامیش لەوێ بوونو دوو تانکیان پێبوو کە لەو بەرەیەدا گرتبوویان ، کاك مەلا ئەحمەدی دسکەرە بەری بەو خەڵکەو هێزەکەی ئەنجومەنی باڵا گرتبوو نەڕۆن بەڵام خەڵکەکە ئامادە نەبوون بمێننەوەو هێزەکەی ئەنجومەن مابوونەوە کاك مەلا ئەحمەد داوای لێکردبوون بەتانکەکانیانەوە بەرەو گوندی ئیسلاحو بەهانای هێزەکەی ئەوێوە بچن کەلەچەند قۆڵێکی جیاوە بەمەبەستی دوورخستنەوەی مەترسی هێزی

پێشمەرگە لەسەر جەلەولا هێرشیان بۆکردین ، لە جەلەولاوە بۆ کەلار، لە خانەقینەوە بەرەو مرواری، لە قەرەتەپەوە بەرەو بان ئاسیاوو لەوێوە بەرەو کەلار. کە پێشتر لە قۆڵی کفرییەوە پەلاماریاندا بەڵام تێکشکان، شەڕ بە سەختی دەستی پێکرد، هێزەکانمان ئابلۆقەدران، تاکو ئەهات ناوچەکە لەسەرمان تەنگەبەرتر ئەبوو، کەکاك مەلا ئەحمەدو ئەوان ئەگەنە ناوماڵەکانی پەڕی دێیەکەو تانکەکانی دوژمن پەیدا ئەبن و تەقە لە دووتانکەکەی لای خۆمان ئەکەن و هەردووکیان تێك ئەشکێنرێن و کاك مەلا ئەحمەدو ئەوان بەرگرییەکی باش ئەکەن و بۆماوەیەك ڕێگری لە پێشڕەوییەکەیان ئەکەن ، لەوکاتانەدا من و کاك حەمەڕەشید عەلی شەریف و فارووقی قادری حەمە ساڵەح بەهێزێکەوە گەیشتینە لایان و کۆپتەر لێمان تاین بوو ، دوو تانکیش ڕوویان تێکردین ، هەرچەندە کۆپتەرەکان تەقەیەکی ئەوتۆیان نەکرد بەڵام کاری لەوورەی هێزەکەمان کرد .. ناهەقیش نەبوو ، ناوچەکە زۆر ڕووتەنەو شوێنێك نەبوو پەنای بۆ ببرێ وەکو سەنگەر شەڕی تیا بکرێ .. لەگەڵ تانکەکاندا شەڕێکی سەخت کرا .. برادەران لەگەڵماندا قسەیان کردوادانرا من بچمە سەرگردێکی ئەولا تر لەدووری ٥٠٠ م و تا دواتر برادەران بێنە لای من بەڵام من نەمتووانی بگەمە شوێنەکە.. پاشان لەگەڵ برادەران یەکمان گرتەوەو کاتژمێر١٠ر٥ ی سەر لە بەیانی توانیمان لە ٥٠٠ م سەروو دێی ئیسلاحەوە لەگەڵ کاك مەلا ئەحمەد دسکەرەو محەمەد قەرەبلاخی کەدواتر شەهید بوو ڕێگەکە تاقی بکینەوەو هێزەکەمان گەیاندە ناو باخەکانی شێخ باوەو هەندێك لە هێزەکانی دوژمن دوور بکەوینەوە، لەوێ کۆبوونەوەیەکم بە هێزەکە کرد کە ئێمە بۆ شەڕی بەرگری هاتووین، مەرج نییە شەڕ هەموو کاتێك سەرکەوتن بێت، هەندێ جاریش تووشی گیروگرفت ئەبین و تەنگمان پێ هەڵئەچنرێ و ئەکەوینە تەنگانەوە، ئەبێ خۆڕاگر بین.وورە بەرز بین. لە یادم چوو کە هێشتا

لە لای دێی ئیسلاح بووین کاك حەمەڕەشیدی عەلی شەریف لە ناو گەرمەی شەڕەکەدا لێی پرسیم: چارەسەر لای تۆ چییە بۆ ئەموەزعە..؟ منیش پێموت: کاکە گیان چەند جار شەڕی مانو نەمانت بینیوە،وا ئەمڕۆ شەڕی مانو نەمانە. شەڕ ئەکەین تا هەمووەمان ئەکوژرێین، لەوانەشە دوژمن تێکبشکێو ڕزگارمان بێ.وەڵامی دامەوە: یاخوا ماڵت برمێ بۆ چارەسەرت. لەم شەڕەدا مستەفا حەسەن حسێنو باقی محەممەد شەهید بوونو هەوڵماندا تەرمەکانیان ڕزگار بکەینو دوژمن ڕێگاکانیان گرتبوو هیچمان پێنەکرا.

بەناو قوڕو زەلکاوو قامیشەڵانی چەمی سیرواندا ماوەی ٢٠ کم زیاترمان بە پێ بڕی. بەیانییەکەی کاتێك شەڕەکە دەستیپێکرد لەگەڵ کاك شێخ جەعفەردا بە جیهاز قسەم ئەکردویستم تێیبگەیەنم ئێمە ئابلۆقە دراوینو پێموت: ئێمەوەکو دوێنێی سدیقی سۆفی مەجیدواین. لەو کاتەدا پەیوەندی نەماو ئیتر نەهاتەوە سەر خەت. ئێمە بێ ئاگا بووین لەوەی کە هێزەکانی مجاهیدین پەلاماری کەلاریشیان داوەو لە کاتی پەیوەندی کردنەکەدا تانکەکان تۆپێك ئەنێنە قەڵای شێروانەوەو هەندێکی ئەڕووخێنن. ئیتر ئێمە کەوتینە چاڵیو نەمانتوانی لەگەڵ کەسدا پەیوەندی بکەین چونکە جیهازەکانمان لە جۆری تەلەفون کنی ئەڵمانی بوو، ڕووبەڕوو پەیوەندی ئەکرد، بەڵام لە چاڵیدا نەیئەکرد، بۆ ئەوەی ئاگاداریوەزعەکە بین بەدەم ڕێگاوە گوێمان لە ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان ئەگرت گوێمان لێبوو برووسکەیەکی کاك نەوشیروانی پەخش ئەکرد:

له/ نەوشیروان مستەفاوە

بۆ/ مەحمود سەنگاوی

( له هەر جێگایەك هەیت جیهازە بچووکەکانت بکەرەوە، پەیوەندی بە برادەرانەوە بکە).

بەلام ئێمە بە هۆی چالییەوە نەمانتوانی کەس لەسەر خەت پەیدا بکەین . کە گەیشتینە بان ئاسیاو زانیمان هێزەکانی مجاهدین گەیشتوونەتە ناو کەلارو پێشمەرگە پەلاماریان داوەو تێکیان شکاندوون‌و چەند دەبابەیەکیان سووتێنراوەو کۆمەلێك چەکداریان کوژراوەو ئەوانەشی مابوونەوە بە پەلەپرووزێ دەرباز بوو بوون. ئەوەی پێم زانیبێت زیاتر لە ٦٥ پێشمەرگە شەهید بوون، تەنیا دوانیان لەگەل مندا شەهید بوون، ئەوانی تر لە شوێنە جیاجیاکانی جەبهەکەوە شەهید بوون. هەر لەتیپەکەی کاك مەلا ئەحمەد زیاتر لە ٣٠ پێشمەرگە دیار نەبوون کە ١٧ کەسیان شەهید بوون ، هەندێکیان‌وونکردبوو چەند کەسێکیشیان کەوتبوونە دەست مجاهیدین لەوانە عومەری برای کاك مەلا ئەحمەدو رەفیقی خوشکەزای کە دوای ٢ مانگ بەریان دان‌و گەرانەوە کەپرسەشیان بۆ دانرابوو .

هەرچەندە ئەو هێرشە بۆ ئێمە زۆر خراپ بوو، لەو ناوچەیەی بە دەستمانەوە بوو هەلکەندراین‌و شەهیدی زۆرماندا، بەلام لە هەمان کاتدا تەمبێکردنێکی باشیش بوو بۆ مجاهدین‌و لووت شکاندیان‌وەکو چۆن لە کفریدا ل ووتیان شکاو نەیانتوانی هیچ برگەیەکی نەخشەکەیان بە ئەنجام بگەیەنن بۆ کۆنترۆلکردنی ناوچەکە. لە راستیدا ئەمە سەرەتای هەنگاوی پەلامارەکانی رژێم بوو بۆ گرتنەوەی کوردستانی رزگارکراو ئەیویست لەم سنوورەوە درز بخاتە ناوچەکەوە، بەلام بە ئاسانی بۆی نەکرا کەچی لە قولی کەرکوکەوە ئەوەی بۆ رەخسا.

لە رۆژی ٣/٢٧ دوای خۆکۆکردنەوە بە هێزی زۆرو زەوەندی زەمینی‌و فرۆکەو کۆپتەر لە ئاسمانەوە پەلاماری ناوشاری کەرکوك‌و ئەو گەرەکانەی لە

ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا بوون بداتەوەو دوای شەڕێکی سەختو دژوار توانی بە سەر دۆخەکەدا زاڵبێو هێزی پێشمەرگە ناچار بێ لە شار بکشێتەوە بۆ دەرەوە، خەڵکەکەش لە ناوشار دەربچنو بە ڕووتو قووتی ڕەو بکەن، ئەمەوایکرد ئیتر دوژمن بیر لە پەلاماردانی ناوچەکانی تریش بکاتەوە، خەڵکەکەی لە حەیبەتا خۆیان دەربازبکەن. ئەمەش بووە سەرەتای ئەو کۆڕەوەی کە دنیای هەژاند.

چەند ڕۆژێك لە کەلار بووم،وەزعی گەدەم خراپ بوو، ئیجازەیەکم کرد بۆ سەردانی کرماشانو چارەسەرکردنی خۆم. چووم‌و ڕۆژی ٤/١ گەڕامەوە کەلار..

ڕۆژی ٤/٢ بوو هەڤاڵ مام جەلالو کاك جەبار لە سوریاوە گەیشتنە سەر سنوری کوردستانو لە بادینانەوە گەڕانەوە سلێمانی کەوەزعی زۆر شەڵەقابوو.

هەر ئەمڕۆ چوومە دەربەندیخانو سلێمانی، تەماشا ئەکەم ناو شار هەڵلایە، ڕاکە ڕاکەیە، دوژمن بە هێزێکی زۆرەوە گەیشتۆتە بازیان، هێزەکانمان بە پەڕاگەندەیی ئەگەڕێنەوە ناو شارو شاریش بەرەو چۆڵ بوون ئەچێ، بەشێکی خەڵکی بە ڕێگای ئەزمڕدا ئەڕۆیشتنو بەشێکی تریشی بە ڕێگای عەربەتدا، بە جۆرێك قەرەباڵغ بوو من بە سێ کاتژمێر بە ئۆتۆمبیل گەیشتمە دەربەندیخان. خەڵکەکە لە بارێکدا بوون بەردی ئەهێنایە گریان، ئەوەی ئۆتۆمبیلی هەبوو باش بوو، ئەوەی نەیبوو بە پیادەو هەندێك پێخاوس بوون، هیچیان لە سامانو کەلوپەلی ماڵ پێ نەبوو دەستی منداڵەکانیان گرتبوو، ملی ڕێگای چارەنووسی نادیاریان گرتبووە بەر. بە پێی هەندێ زانیاری کە بیستمان ڕۆژی ٣/٣١ دوژمن لە قۆڵی هەولێریشەوە هێرشی کردبوو بۆ گرتنەوەی، دوای تۆپبارانێکی قورسو شەهیدکردنی خەڵکێکی زۆر توانیبووی دەست بە سەر شارەکەو دەوروبەریا بگرێتەوە.

# کۆڕەو

ڕۆژی ٤/٣ لە کەلار بووم، دەنگو باسەکان زۆر ناخۆشبوون، سلێمانی لە مەترسیدا بوو، هەتا ئەهات دوژمن لێی نزیك ئەبۆوە. لە قۆڵی کفریشەوە شەڕێکی سەخت بوو، دوژمن نەیتوانی یەك بست بێتە پێشەوە، لەلای دەربەند تاڵەوە کاك سالاری حاجی قادر شەهید بوو کە یەکێك لە کادیرە چالاك و فەرماندەکانی هێزەکانی شارەزوور بوو، لە بنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەری خورماڵ و برای شەهید سامانی حاجی قادرە.

دوای ئەوەی دەنگوباسەکان ئەوەیان ئەگەیاند هێزەکەی دوژمن گەیشتووەتە سلێمانی ئیتر نەتوانرا هیچ بووترێ. لە هیچ شوێنێکی خوارەوە ناتوانرێ شەڕو بەرگری ئەنجامبدرێ کە سەرەوە بە هێزی دوژمن داگیربکرێتەوەو لە خوارەوەش بەرەیەکی شەڕی ڕوو بەڕوو بوونەوە هەبێ ناکرێ ئێمە بکەوینە نێوانی مەنگەنەیەکەوەو ڕێگای دەربازبوون نەبێ، بۆیە بەیانی زووی ڕۆژی ٤/٤ هێزەکانی ناو شاری کفری کشانەوە بەرەو دەربەندی سەرتەك کشانەوە. ئینجا هێزەکانی سمودو کەلارو باوەنووریش، خەڵکەکەش بەجارێ کەوتنەڕێ. لە ناوچەی دووزو کفرییەوە بە پیادەو پێی پەتی و بێ ئۆتۆمبیل دەیان هەزار خەڵکی ڕەشو ڕووت بەرەو سنوورەکانی ئێران و دەوروپشتی بە دڵی خەمبارەوە، بە هەناسەی ساردەوە، بەچاوی فرمێسکیاویەوە، ئاخیان بۆ ئەو چەند ڕۆژە خۆشە هەڵئەکێشا کە سەروەری مێژوویی تێدا تۆمارکراو دوژمنی عەفلەقی تێدا سەرنوقم کرا.وا جارێکی تر ئەو دڕندەیە بەر ئەبێتەوەوێزەی کورد، دنیا شایەتی گەورەترین کارەساتی مێژووییە لە ژیانی کوردا کە هەموو شارو شارۆچکەکان چۆڵکراو ملیۆنەها خەڵك لە کۆڕەوێکی گەورەدا ڕوویان کردە سەر سنوورەکان لە هەلومەرجێکی

سەختی باران و سەرماو سۆڵەو برسێتی و نەبوونیدا. دیمەنی سەیرو دڵتەزێنیوا ئەبینرا کە کەس ناتوانێ وێنای بکات.

بە ڕاستی کۆڕەو پرۆسەیەکی میللیانەی تەحەددا کردن بوو، ڕەتکردنەوەی دەسەڵاتی دیکتاتۆریانەی بەعس و مل نەدان بوو بۆ حاکمیەتی سەرلەنوێی لە کوردستاندا. کۆڕەو هەنگاوی خەڵکی بوو لە ڕێپێوانێکی کارەساتاوی بۆ ناو ڕای گشتی جیهان و خستنە بەرچاوی دۆزی ئاڵۆزی میللەتێك نایەوێ لە کونجە تاریکەکانی مێژووی داگیرکردندا بژی. پەنجەی ڕقی بەرامبەر جینۆسایدو هەموو پرۆسەیەکی نامرۆڤدۆستانە هەڵبڕی. پەیامێکی دڵبریندارانە بوو بۆ بەرچاوی دنیای دەرەوە تاکو ئەو دۆزە تۆز لێنیشتووەی کورد بناسن و لە لاپەڕەکانی سەر مێزی کاری ڕۆژانەی کاربەدەستە زلهێزەکانی حوکمڕانی دنیا بنووسرێتەوە.

ئەو ڕۆژە من بە هەندێ کاری تایبەتی چوو بوومە سەرشاخی گوڵان کە پێشتر نەخشەیەکمان داڕشتبوو بۆ بەرگری کردن لە ناوچەکە گەر لە خوارەوە تەنگمان پێ هەڵبچنرێ و دامانابوو هێزەکانمان بکەینە دوو بەشەوە:

١.بەشێکیان لە قۆڵی کفری ـ کەلار بەرگری بکەن

٢.بەشێکیان لە قۆڵی دەربەندیخان ـ شاخی گوڵان.

دانرابوو من سەرپەرشتی ئەم قۆڵەی دووەم بکەم، بێ ئاگا بووم لەوەی دوژمن لە سلێمانییەوە بەرەو دەربەندیخان هاتووە، کاك حسین حامد بە ئۆتۆمبیلیەکەوە هاتە دوامداوووتی دوژمن گەیشتۆتە نزیکی دەربەندیخان و پەلە بکە با دەربازبین. بە پەلە دابەزینە خوارەوە لە پردەکەی ژاڵەناو پەڕینەوە بەری بەمۆ. کۆپتەر بە ئاسمانەوە ئەسووڕایەوە، خەڵکێکی یەکجار زۆر بە ڕێگاوە بوون بەرەو سەرتەك و پشتە، لە ئۆتۆمبیلکە دابەزین و چووینە ناو خەڵکەکەوە تا ئەگەر کۆپتەرەکان تەقەیان لە خەڵکی کرد لێیان بێینە دەست، مرۆڤ نەیئەزانی تەماشای چی بکات، کەس بە کەس نەبوو. کێ پەکی بکەوتایە حاڵی شڕ ئەبوو، پیاوێکی پیر سێ چوار کچی لەگەڵ بوو، بەسەر

عەرەبانەیەکەوە بوو لەگەڵ هەندێ پڕوپینەدا بە هەموویان پاڵیان پێوەئەنا، کچەکان خۆشیان زۆر قەڵەو بوون لە بەرەوژوورەیەکدا نەیانئەتوانی سەری بخەن، ناچار بە پێشمەرگەکانموونت یارمەتی بدەن. زۆر جار لۆری ئەڕۆیشت بە چۆڵی، ناچار ڕێگەمان لێئەگرتن‌و ئەوەی پەکی بکەوتایە لە پیرو منداڵ‌و ژن سەرمان ئەخست.ووردەووردە لەگەڵ خەڵکەکەدا ئەڕۆیشتین تا گەیشتینە بەر دەربەنەکەی سەرتەك لەو لاشەوە هێزەکانی دوژمن لە جەلەولاو سلێمانییەوە بەتانك‌و زرێپۆش‌و ئالیاتی زۆرەوە هاتن‌و کۆپتەریش بە سەر ئاسمانی ناوچەکەدا ئەسووڕایەوەو تەقەی لە هێزەکانمان‌و لە خەڵکیش ئەکرد کە بەرەو سنوری ئێران ئەڕۆیشتن.

ئێمە لەسەرتەك هەموومان یەکمان گرتەوە. بە پەلە لەگەڵ هەڤاڵان شەوکەتی حاجی مشیرو شێخ جەعفەرو حامیدا کە لە سنوری بەمۆ - سەرتەك - بێلوولە بە هێزەکانمانەوە دابمەزرێین‌و ڕێگە نەدرێ کەس بە چەکەوە بچێتە ئێران‌و هێزەکانمان لە شوێنە گرنگەکان دابنێین، بۆ ئەم مەبەستەش لە دەربەندی سەرتەك کۆبوونەوەیەکمان کرد هەموو برادەرانی بێلوولەش هاتبوون، بڕیاردرا لەو پێشمەرگانەی کە مابوونەوە بەم شێوەیە لە شوێنەکاندا دابەش بکرێن‌و بەرگری بکرێ:

- بەردەمی دەربەندی سەرتەك لە لایەن هێزەکانی شارەزوورەوە کە کاك حامی‌و کاك قادر کۆکۆیی سەرپەرشتییان ئەکرد، هەروەها ئەو هێزەی لای من‌و کاك عوسمانیش لەوێ جێگر بن.
- هێزەکەی کاك سەلام‌و مەحموی مامە عەزە لە بەردەمی شاخی خۆشك دابن.
- هیزەکەی کاك عادل‌و م. عەلی لە سەر ملەی سەرتەك‌و سەر شاخی خۆشك بن.
- هێزەکانی کاك کوردۆو کاك عەدنان لە دەربەندی بێلوولە بن‌و هێزێکی پارتی‌و سۆسیالیستیش لەوێ هەبوون.
- هەڤاڵان شەوکەت‌و شێخ جەعفەریش بۆ ڕاپەڕاندنی کارو باری ئەو هێزانەو خێزانە ئاوارەکان لەگەڵ ئێرانییەکاندا تەنسیق بکەن.

بۆیه به پەله بەشێکی هێزەکەی لای م. عەلیو کاك عادل له سەر ملــەی سـەرتەكو بەشـێکیان بۆ سـەر شـاخــی خۆشك نێـردرانو مەفرەزەکـەی سـەردار ناوتاقیش بۆ سەر شاخی بەمۆ.

لەو ناوەدا ئەسووڕامەوە تەماشا ئەکەم دوو پیرێـژن کـه یـەکێکیان کـوێر بـووو ئـەوی تریـان لـەڕو بـێ هێـز بـوو دەسـتی یـەکتریان گرتبـوو بـه ڕێگـادا ئەڕۆیشـتنو کـەس ئـاوڕی لێنەئەدانـەوە. دنیـاش زۆر سـارد بـوو، لـه برسـاندا هاواریان ئەکرد، ئۆتومبیلم پێ نەبوو بیانگەیەنمه سنوورەکه، هەنـدێ نـانم بـۆ پەیــدا کــردن، ڕۆژی دواتــریش هەمدیســانەوه دوو پیرێژنەکــەم بینــی بــه ڕێگــاداووردەووردە ئەڕۆیشــتن. ئۆتۆمبیلەکــەی کــاك مــەحمودی مامەعــەزەم وەرگرتو تا پشته بـردمن. ئەوەنـده بێـزار بووم لـه گیـانی خـۆم لـه سـەر ئـەو دۆخه له بەر خۆمەوه کفرێکم کرد. لەو سەرەوه که گەڕامەوه له نێـوان پشتەو گلێچاڵـدا کـه بـەمین چـێنرابوو، ئـەبینم ژنێـك بـه کـوڵ ئـەگری دوو منـداڵی لەبەردەستدایه هەردووکیان شەهید بوون. ئەو ژنه لـه دووزەوه منداڵـەکانی بـه پێ گەیاندبووه ئەویو له کاتێ حەوانەوەدا منداڵەکانی چووبوونه نـاو کێڵگـەی مینــەوەو شــەهید بـوو بـوون. ژنەکـه ئەوەنــده بـه کـوڵ ئـەگریاو فرمێسـکی هەڵئەڕشت که دابەزیمه خوارەوه منیش بانگم لێبەرز بووەوه بۆیان.

له ناو ئەو دیمەنه تراژیدیانەدا تووشمان ئەبوو به هەندێ کاری دزێـوی تـرەوه کـه بیرمـان لێنەئـەکردەوه بکـرێ، لـه کاتێکـدا هـەموو کـەس بـەرەو نـاو قـوولایی ئێـران ئەچـوون، زۆر کـەس نائومیـد بـوون لـه دۆخەکـه، کەسـانێك هەبوون چاوساغی خەڵکی تر بوون بۆ چەپاوکردن لـه جۆری سـەید بـەهادینی تـاوەگۆزی لەگـەڵ پاسـدارێکدا هەنـدێك دۆشـکای دوو لوولـەو چـوار لوولـەمان هەبوو ئەیاندایه دەم ئۆتۆمبیلەوەو بەرەو ئێـران ئـەیانبرد، ئەمـەم پـێ نـاخۆش بـوو، لەگــەڵ کــاك حامیــدی حــاجی خالیــد دا ڕێگــەمان لێگــرتن، بــه کــابرای پاســدارمووت: ئــەو دۆشــکانه بــۆ کــوێ ئەبــەن..؟ کــابرای پاسـدار بــه لــووت بەرزییەوەووتی: به هەوەس ئەیبەین. ئیتر یەکسەر پەلاماری دۆشکاکەم داو له

ئۆتۆمبیلەکەم کردەوەووتم: ڕێگا نادەم بیبەن. هەندێ قسەی توندو ناشیرینم بە سەید بەهادینووت، نەیوێرا هیچ بڵێ. کابرای پاسداروتی: کە ئەم دۆشکایەم لێئەسەنیتەوە نابێت جارێکی تر بێیتەوە ئێران. منیشووتم: کە تۆ مەنعم بکەی جارێکی تر هەر نایەمەوە ئێرانو لەووڵاتەکەی خۆمدا بمرم چاکترە. لە باتی ئەوەی هاوکاریمان بکەنو چەکمان بدەنێ بۆ بەرگریکردن چەکەکانی خۆشمان ئەبەن. ئیتر ئەمە بووە هۆی ئەوەی سوپای پاسدارانی ئەو ناوچەیە بە شوێنمدا بگەڕێن بۆ گرتنمو لەو بارەیەوە برادەران ئاگاداریان کردمەوەووریای خۆم بم.

دیارە لە کاتی بەرپابوونی ڕاپەڕیندا زۆر کەناڵی ڕاگەیاندنی جیا جیا هاتبوونە کوردستانەوە کە دوژمن جارێکی تر پەلاماری کوردستانی دایەوەو ئەو ملیۆنەها خەڵکە بە پێ بەرەو سنورەکانی تورکیاو ئێران بە ناو قوڕو لیتەو ئاوو هەورازو بەفرو کێڵگەی میندا ئەڕۆیشتن، لە ڕاستیشدا هەڵوێستی ئێران بەرامبەر ئەو خەڵکە ئاوارەیە زۆر باشبوو، لە ئۆردووگاکان نیشتەجێکرانو شوێنی حەوانەوەیان بۆ دابینکرا، خواردنو خۆراکیان پێدرا بەشێکیشیان لە شارو شارۆچکەکاندا جێی خۆیان کردەوە بێئەوەی گوشار بخرێتە سەریانو خەڵکی ئێران بە تایبەتی کوردەکەی هاوکاری زۆریان کردنو دەرگای ماڵەکانیان بۆ کردنەوەو بە هانایانەوە ئەچوون، کەچی تورکیا سەرەڕای ئەوەی خەڵکەکە بە زۆر چووبوونە ژوورەوە زۆر بێ بەزەیی بوون.

لەم بارەدا دەیان دیمەنی خەماویو فرمێسکاوی بە کامێرای ئەو کەناڵانەوێنەگیران، هەموو دنیا لە نزیکەوە ئاگای لە کارەساتی کورد بوو، دڵو دەروونی ڕاچەڵەکاندن ئەمەوایکرد ئەنجومەنی ئاسایشی سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکان بە پەلە بڕیاری ٦٨٨ دەربکات لە بەرژەوەندی خەڵکە ئاوارەکەی کورد کە خۆراكو ئازووقەو پێداویستی دەرمانو حەوانەوەیان بۆ دابینبکرێ جگە لەوەی کە هەڕەشەیەك بوو لە ڕژێمی عێراقی بۆ ڕاگرتنی کارە سەرکوتکەرییەکانی بۆ سەر خەڵکی مەدەنی کوردی ڕاپەڕیو. شایانیووتنە

دەوڵەتی فەرەنسا نەخشی سەرەکی هەبوو لە دارشتنی ئەم بڕیارەی ئەنجومەنی ئاسایشدا کە سەردەمی سەرۆك فەرەنسوا میتران بوو کە لە نزیکەوە خۆی و خێزانەکەی مەدام دانیال میتران دۆستی کورد بوون.

لە دوای ئەوەی کە بڕیاری ٦٨٨ دەرکراو دڵنیاییەکی بە کورد بەخشی سەرەرای ئاوارەبوونیان، هاوپەیمانان بلاویانکردەوە کە ناوچەی پارێزراو بۆ کورد دابین ئەکرێ بۆ گەڕانەوەی ئاوارەکان بۆ شوێنی خۆیان ئەمەش ناونرا پرۆڤاید کۆمفۆرت. کە پێشتر چەند یەکەیەکی هێزی ئەمریکا هاتبوونە کوردستانەوەو ئەو ئەرکەیان گرتبووە ئەستۆو دواتر لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوەوا بەچاك زانرا ئەو ناوچە پارێزراوە درووست بکرێ و ٥٠٠ پۆلیسی خۆی ڕەوانەی کوردستان کرد کەتاماوەیەك مانەوەو بارەگایەکیشیان لە کەلاری گەرمیاندا دانا، ئەمەش لە خۆیدا داکۆکی کردنێك بوو لە دۆزی کوردو پشتیوانییەك بوو لێی کە جارێکی تر ڕێگە نادرێ کورد تووشی کارەساتی گەورە ببێتەوە. ئەمە بووە هۆی ئەوەی کەووردەووردە خەڵکەکە بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان دوای ئەوەی بە سەدان کەس لە پیرو پەککەوتەو منداڵ لەو ڕێگا سەختانەدا لە برساو لە سەرما گیانیان لە دەستدا.

دوژمنی بەعس دوای ئەوەی لە کەلارو دەربەندیخان و باوەنوورو مەیدان جێگیر بوو، ئەیویست خۆی تاقی بکاتەوە، هەندێ شوێنی سەربازی گرنگی هەبوو بیگرێتەوەو زاڵ بێ بەسەریدا بەو خەیاڵەی کە هێزی پێشمەرگە ناتوانێ شەڕ بکات و ئەویش ئەتوانێ بە تەواوی زاڵ بێتەوە بەسەر کوردستاندا، بۆیە بە پێی نەخشەیەکی سەربازی ڕۆژی ٤/١٢ هێرشێکی چەند قۆڵەی کرد لە: میدانەوە بۆ سەرتەك، مەیدانەوە بۆ شەرواڵ دڕەو دەربەندی بێلوولە، دەربەندیخانەوە بۆ سەرتەك.

دوژمن بە تۆپی قورس و هاوەن سەنگەرو جێگاکانی پێشمەرگەی ئەکوتا. ئێمە هێزێکی کەمبووین، لە دەربەندەکە بووین، هێرشەکەی دوژمن

نزیك بووەوە شەڕ بە سەختی دەستیپێکرد، کاك ماجید فەیلیو کاك سوهاد داود حەمەڕەحیم کە فەرماندەی قارەمان بوون بەرگرییەکی مەردانەیان کرد، من چوومە سەر ڕەبایەیەکی کۆن لە خوارووی دەربەندەکە لەو کاتانەدا میقدادی برای شەهید شێخ جەمالو شێخ حسامی ئامۆزایو بەهادین مەحمود ئەحمەد لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی تردا گەیشتنە لام، تەماشامان کرد پێشمەرگەیەك پەلاماری هێزەکەی دوژمن ئەداو هێزەکەی شکاندووەو بە دوایاندا ئەڕوات. ئەو برادەرانەی لای من داوایان کرد بگەنە لای ئەو پێشمەرگەیەو لە چاونووقانێکدا گەیشتنو دایان لەو هێزەی دوژمنو شپرزەیان کردو بە جۆرێك شکا جگە لە ڕاکردن هیچیان لەبەردەمدا نەماو تەنانەت پێشمەرگەکان هاوەنەکانیشیان دەست بەسەرا گرت. بە دەیان لاشەیان لێبەجێماو ١٧ سەربازیان لێبەدیل گیرا، کە دیلەکانمان دواند بۆمان دەرکەوت کە دوژمن زۆر بێوورەیەو تاقەتی نەماوە.

دوای ئەو شکانە دوژمنویستی جارێکی تریش بەختی خۆی تاقی بکاتەوە، هێزێکی زۆری لە دەربەندیخانەوە کۆکردەوە بۆ پەلاماردانی شاخی خۆشكو سەرتەك، بۆیە هێزێکمان بەسەرپەرشتی حەمەی مالیەو حاجی فایەقو ساڵەحە بزە ناردە دێی بانی بی بۆ هەر ئەگەرێك لەوێ بن.

ئەوەبوو ڕۆژی ٤/١٥ دوژمن بەیانی زووەکەی بە پاڵپشتی تۆپو کاتیۆشا هێرشەکەی بۆ سەر شاخی خۆشك دەست پێکرد.پێشمەرگەکانی بانی بیو ئەوانەی سەرشاخی خوشك کە لەیەکەی سمود بوون لێیان هاتنە دەستو هێرشەکەیان تێکشکاندو زیاتر لە ٥٠ تەرمیان لێبەجێماو ٢ دیلیشیان بە ساغی گیرا، ئێمەش بێ زیان بووین. ئەمەوورەیەکی باشی بە پێشمەرگەدا، باش تێگەیشتین کە دوژمن توانای کز بووە، لە هەر پەلامارێکدا ئەتوانین برستی ببڕینو دەرسێکیوای بدەین بیر لە گرتنەوەی شوێنە ستراتیژیەکان نەکاتەوە. دوای ئەو شەڕە بە هەندێ ئیشو کار ڕۆژی ٤/١٦ لە پشتەوە ڕۆیشتم بۆ پاوەو سەردانێکی بارەگای بەتالیۆنم کردو چوومە سەریاس. هەرچەندە ئێرانیەکانیش لێم ناڕازیبوونو ئەگەر پێیان بزانیبام ئازاریان ئەدام.

ڕۆژی دواتـر لەگـەڵ کـاك شـێخ محەممـەد شـاکەلی ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسی حیزبی سوسیالیست لە جوانڕۆوە گەیشتمە سەلاسی باوەجانی، سەردانی هەندێ ماڵە پێشمەرگەو برادەرانم کرد.

# گفتوگۆ

ڕۆژی ١٨/ ٤ لە ڕادیوی بیبیسی هـەواڵی چوونی هـەڤاڵ مام جـەلالم بـۆ بەغدا بیست بۆ گفتو گۆ لەگەڵ حکومەتی بەغدا.

لە ڕاستیداو لەو هەلە ناسازەدا کە کورد هـەموو ئـاوارە بـوو بـوو، هێـزی پێشمەرگە لە دەرەوەی شارەکان بوو بگرە لەسەر سنوورەکان بوو، سـەرکردایەتی یـەکێتی بەشـێکی لـە پێنجوێن بـوو هـەر هـەنگاوێك بـۆ سازشـیش بـێ بـۆ چارەکردنی دۆخەکە لـە قـازانجی کـورد بـوو، جگـە لـەوەی ئـەوەی ئەچـوو بـۆ گفتوگـۆ لەگـەڵ ڕژێمێکـی دڕنــدەی بـێ پــەناو بــێ متمانــەدا ئازایەتییــەکی بێوێنەبوو، گەرچی لەوانەیە ئەو هەوڵە ببێتە جێی مشتومڕی خـەڵكو لایەنـە کوردیو بیانییەکان.

ئایا لەم هەلـەدا کـە ڕژێمـی سـەدام کـە لـە نێـو کۆمـەڵگای نێودەوڵەتیـدا ئەفەرۆز کراوە چۆن کورد بڕوای پێئەکات..؟ ئایا چی تازە بە کورد ئەدات جگە لە ئەنفالو کیمیایی..؟.

هەواڵەکـە بـۆ ئێمـە شـتێکی نەبیسـتراو بـوو، لـە هـیچ سەرچـاوەیەکەوە نەمانبیسـتبوو یـەکێتی شـتێکیوای لـە بەرنامـەدا بێـت. گفتوگـۆش بـەلای یەکێتییەوە کارێکی پەسەندەو جۆرێکە لـە جۆرەکـانی خـەبات بۆ گەیشـتن بـە ئاواتەکانمان. گەر دوژمنیش بە هەمان پێودانـگ بڕوای بـەوە هـەبێت گرفتـەکان بە ڕێگای قسەو گفتوگۆکۆتایی پێ بهێنێت ئـەوا شـەڕ بـەرپا نابێت،وێرانـەیی ناکەوێتەوە،ووزەی هەردوو میللەتەکە بە فیڕۆ ناڕوات.

هەڤاڵ مام جـەلال چـووە بەغـداو لەگـەڵ سـەدام حسـین کـۆ بـۆوە. ئەمـە خـۆی لـە خۆیـدا تەحەدایـەکی گەورەیـە، پـێ لـە جەرگنانـە کـە کەسـێکیوەکو

هەڤاڵ مام جەلال بێترس بچێتە ژێر چەقۆی ڕژێمێك كە مانگێك زیاتر پێش ئەوە لە ڕاپەڕینێكی سەرتاسەریدا هەموو دەسەڵاتو دامو دەزگاو پێگەكانی لە كوردستاندا لە بن هەڵتەكاند.ئەم هەنگاوەوەكو هەموو هەونگاوێكی تر خەڵكێك هەبوو پشتیوانی ئەكردو كەسانێك دژی بوونو بە چاوی گومانەوە تەماشایان ئەكرد.هەندێك تانەو تەشەریان ئەداو قسەی نابەجێیان ئەكرد، بەتایبەتی ئەو كەسو لایەنانەی كە مەسئولیەتی نەتەوایەتیان لە ئەستۆدا نەبووەو لە ڕووی ئیلتیزامەوە بەرەڵایانە تەنیا ڕەخنە ئەگرن.

وەنەبێ ئەم چوونەی مام جەلال بۆ بەرژەوەندی یان ڕەچاوكردنی تەنیا چارەنووسی یەكێتی بووبێ، بەڵكو بە بڕیاری بەرەی كوردستانی بووە كەوەفدەكەی بەرە كاك ڕەسوڵ مامەندی سۆسیالیستو سامی پارتی گەلو نێچیرڤانی پارتیشی گرتبووەوە، بۆ ئەوەی لەو هەلە نارەحەتەی كوردی تێكەوتووە كارێك یان جوولەیەك بكرێ خوێن بزێتەوە دەماری سڕبووی وەزعەكە. ئەگینا هەموو لایەك ئەیزانی كە سەدام هیچ بۆ كورد ناكات. ئەم ڕژێمە شۆڤێنییە كۆنەپەرستە لە حاڵەتی شكستیشدا ئامادەنییە بچووكترینو سادەترین مافی كورد بسەلمێنێ.وا دیارە ڕژێمی سەدامیش لای خۆیەوە پێویستی بەوە هەبووە لەبەردەم ڕای گشتی ناوخۆو دەرەوەداوا پێشاندا هەنگاوێك ئەنێ بۆ چارەسەركردنی كێشەكانو ئامادەیی تێدایە بۆ دانوستانو بەمەش بەردێك ئەداتە پەراسووی دەوڵەتە زلهێزەكاندا كە دەستیانوەرداوەتە ناو كاروباری عێراقو لەتوپەتی ئەكەن.

دیارە ئەم چوونە دەروازەیەك بوو بۆ چوونە ناو ژووورە تاریكەكانی گفتوگۆوە، چونكە بەبێ یەك بینینو دانیشتن گرێو گۆڵەكانی دۆزی كورد تەواو شی ناكرێتەوە. لە ڕێگەی ڕاگەیاندنیشەوە شتەكانوا باسكرا كە سەدامو داروودەستەكەی ڕەزامەندییان لەسەر گفتوگۆ نیشانداوەو بەردەوامیش ئەبن لەسەر كاركردن ووەفد هاتوچۆ بكاتو پڕۆژەی داواكارییەكان پێشكەش بكرێ.وەفدەكەی بەرە هەمیشە هەر خەریكی قسەكردن بوو هیچی پێ نەئەكرا

سەدامیش قایل نەبو  چارەنووسی کوردوەکو مەسەلەیەکی نەتەوایەتی دیاری بکرێ بەڵکو ئەیویست لە چوارچێوەی دەسەلاتی بەعسدا بێو لە دەرەوەی ئەودا نابێ بیر لە هیچ شتێکی تر بکرێتەوە، بۆیە بە چاوی گومانەوە تەماشای ئەم گفتو گۆیە ئەکرا، جگە لەمە نارەزاییەکی زۆری خەڵکی بەرپابوو، یەکێتیش جگە لەوەیوەکو سازش گفتوگۆی ئەکرد باوەڕی بەوە نەبوو سەدام چارەسەری ریشەیی بۆ مەسەلەی کورد ئەنجامبدات، کە چی لایەنی تر هەبوون بە کەفوکوڵەوە پەرۆشی رێککەوتنو پەیوەست بوون بە ئۆتۆنۆمییەوە بوون.

دۆخەکە هەندێك گۆرا،ووردەووردە خەڵك گەرایەوە، لیژنەی تەنسیق درووست بوو، گەرچی رژێم لە شارەکاندا بەتایبەتی سلێمانیو هەولێرو شارۆچکەکانی تر جێگەی خۆی کردبووەوە، هێزەکانی تەنیا لەسەر جادەکان هەبوو، لە هەندێ سەربازگەشدا بەلام بێوورەو بێووزەو هیچ لەبارانددا نەبوو، دوای ئەو هەموو شەڕ پێکردنو خۆ بەدەستەوەدانو تێکشکانە ئەبێ چییان پێ بمێنێ..؟ جگە لەوە هەر بەناو دەزگا تێرۆریستییەکانی دانابووەوە، بەلام نەیانئەتوانی بەو قەبەییەی جاران بن، هەروەها هیچ جموجووڵو ئیجرائاتێکیان نەئەکرد، زیاتر لە چارەنووسی خۆیان ئەترسان.

لەو ماوەیەدا بوو هاوپەیمانان هەنگاوێکی گرنگو پڕ بەهایان نا کە بریتی بوو لە قەدەغەکردنی فڕینی فرۆکەکانی عێراق بە سەر ئاسمانی بەشێکی کوردستاندا بە درێژایی هێڵی پانی ٣٦ کە بۆ ئەم مەبەستە هێزەکانی خۆیانیان لە فرۆکە خانەی ئەنجەرلیکی تورکی دانابوو بۆ چاودێریکردنی ئەم ناوچەی دژە فڕینە کە نابێ فرۆکەکانی عێراق لە سەروو هێڵی ٣٦ بسوورێنەوە کە بەشێکی کوردستانی ئەگرتەوەو ئێمە پێمان خۆشبوو ئەو ناوچەیە فراوانتر بێ بۆ ئەوەی مێردەزمەی دەسەلاتی بەعس بە یەکجاری  بە سەر دڵو دەروونمانەوە نەمێنێ لە گەڵ ئەوەشدا هەرباشبوو بەشی سەرەوەمان لە ئارامیدا بێ بۆ هەر ئەگەرێك کە تووشی خوارووی هێڵی ٣٦ ببێ.

لەبەر ئەوەی لە گفتوگۆدا بووین شەڕو پەلاماردان نەبوو ئێمە کارێکی ئەوتۆمان نەبوو، هەر چاوەڕوانی هەلەکەمان ئەکرد، کاتەکانمان بە گەڕان‌و سەردان بەسەر ئەبرد.جارێکیان چوومەوە کانی دیناری مەریوان‌و چەند ڕۆژێك مامەوەو گەڕامەوە گۆخلان‌و پێنجوێن‌و لە هەڵەبجەی شەهیدەوە گەڕامەوە پشتەو سەرتەك. هەندێك جاریش لەگەڵ شاهۆدا کە شاخەوانێکی مەزن بوو ئەچووینە ڕاوە ئاژەڵە کێوی لەسەر شاخی بەمۆو خۆشك.

لەو کاتانەدا هەندێ ئازووقەمان کەم بوو بووەوە، کاتی خۆیشی ساڵی ۸۹ -۹۰ هەندێ ئازوقەمان لە نزیك خورخور لەلایەن کاك حەمە پاریاوڵەو حەمە چاوشینی دەستەکەی خۆمەوە لە ژێر زەویدا شارابووەوە. ناردمە لای ئامیر لیوای مەیدان‌و چەند سەربازێکی لەگەڵ پێشمەرگەکاندا ناردبوو، ئەو ئازووقەیە چەند تەنێك ئەبوو. ئامیر لیواکە سەری سوورمابوو لەو ناوچەیەدا کە ناوچەیەکی سەربازی قەدەغەکراوو ژێر کۆنترۆڵی ئەوان بووە چۆن پێشمەرگە توانیویەتی ئەم هەموو ئازووقەیە هەڵبگرن‌و ئەوان پێی نەزانن. ئینجا داوای هەندێك لەو ئازووقەیەی کردبوو بەشیان دابوو.

دوای گەڕانەوەی هەڤاڵ مام جەلال لە بەغدا، کاك نەوشیروان بە سەرۆکایەتی‌وەفدێك ڕۆیشت بۆ بەغداو ئەمەش تەوژمێکی تریدایە مەسەلەی دانوستان‌و ئەووەرەقانەی ئەخرایە بەردەست بەووردی توێژینەوەی لەسەر ئەکرا، داخوازییەکان سازشی تێدا نەئەکرا، ئەوەی بۆ کورد پێویست بوو ئەخرایە ڕوو، بەڵام مەودایەکی دوور لە نێوانی هەردوولایاندا هەبوو. ئەوەندە ئاسان نەبوو بە پەلە بگەنە یەك‌و هەموو دیوارەکان بڕووخێنن، هەموو پەردەکان لە ڕوو لابرێن‌و ناخەکان بە پاکی دەربکەون، گەرچی دەیان جار گفتوگۆکراوەونەبێ ڕژێم هەموو جارێ بێ ئاگا بێ لە داخوازییەکانی کورد یان هەر جارەی جۆرە داواکارییەك پێشکەش بکرێ بەڵکو لە بنەڕەتدا یەك مەسەلەیەو بە پێی ڕۆژگاریش هەندێ خاڵ زیادو کەم ئەکرێتەوە، جگە لەوەی

له ناو بەرەدا گەرچی بە یەك‌وەفد چووبوونە خوارەوە بەلام تێڕوانینەکان یەك نەبوون، بە حەزەرەوە کار ئەکرا.

وەنەبێ کە ڕژێم گەڕابێتەوە کوردستان توانیبێتی بەو توانایەی جاران یان هیچ نەبێ گورو تینێکی هەبێ حوکمی کردبێ بەڵکو کە خەڵکی گەڕانەوە ناو شارەکان ئەم ترسی زیاتری لێئەنیشت. نارەزایی خەڵکی بەرامبەری زیادی ئەکرد، ڕۆژی ٧/١٧ لە هەولێر خۆپێشاندانێك بەرپابووو ژمارەیەك خەڵکی شەهید کران. هەروەها لە سلێمانیش ئەمە ڕوویداو ١٥٠ کەس کوژران بەلام دوژمن زیانی زۆری لێکەوت ٢٥٠٠ دیل زیاتری لێ گیرا. ئەمە زەنگێکی ترسناك بوو بۆ ڕژێم کە ناتوانێ بە ئاسودەیی لە کوردستاندا بژی. هەر ساتێکی بە ڕۆژگارێکی تاڵ لێئەڕوات. ئەبێ هەرچۆنێ بێ با باجێکی قورستریش بدات هەر بمێنێتەوە. بەعس تووشی کوردە ناموسە بوو بوو لەڕاپەڕیندا کوردستانی پێچۆڵکرا، جارێکی تر لە پەلامارێکدا گەڕایەوە، دوای ئەوەش خەڵکی سەریەشەی بۆ دروست ئەکەن‌و هیچی پێناکرێ‌و ڕاکردنیشی شکستێکی سەربازی‌و مەعنەوییەو ئابڕووی لە ناوخۆو دەرەوەیشدا ئەچێ.

ڕۆژی ٨/١١ بوو.. سەردانێکی قەلاچوالانم کردو کاك کۆسرەتم بینی پێی‌ووتم کە بڕیاریان داوە ببمە فەرماندەی بەتالیۆنی ٨ ی بتوێن. دوای هەندێ قسەکردن ڕەزامەندیم پێشان داو گەڕامەوە پێنجوێن بۆ ئەوەی پەیوەندی بکەم بە بەتالیۆنەوە. ڕۆژی ٨/١٧ گەیشتمە ڕانیەو لە بارەگای بەتالیۆن دەستبەکاربووم. لەو ماوەیەدا لەگەڵ کاك ڕەهبەرو عەبدوڵلای مام عەلی سەردانێکی شەقلاوەمان کرد لەگەڵ کاك عومەر فەتاح کۆبووینەوەو لەسەر کاروباری هێزەکانمان قسەمان کرد. دوای ئەوە ڕەئیس کەمال موفتی هاتە لامان لەسەر ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگە گفتوگۆی تێرو تەسەلمان کرد.

ڕۆژانی ١ ـ ١٩٩١/٩/٣ لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلالدا کۆبووینەوە. دوای ئەوە ڕۆژی ٩/٤ هەڤاڵ مام جەلال لە سەرسەنگ لەگەڵ ئەمریکییەکان‌و

هاوپەیمانەکان کۆبووەوە. ئەمە مەغزایەکی گرنگی هەبوو، ئەوەی بۆ کوردستان فەراهەم کرابوو هێزێکی پارێزەری بۆ دانرابێ‌و لەگەڵ سەرکردەکانیدا دانیشتن بکرێ لە ڕووی سیاسییەوە ناوەڕۆکێکی بەهێزی لە خۆ گرتبووەوە پەیامێکیش بوو بۆ دەوڵەتەکانی ناوچەکە کە کورد بێ خاوەن نییەو لەلایەن هاوپەیمانانەوە پشتیوانی لێئەکرێ. هەرچەندە هەندێ کەس‌و لایەن‌وای بۆ ئەچوون کە ئەم هێزە بۆ پارێزگاری کردن لە کورد نییە بەقەد ئەوەی کە بەرژەوەندییەکانی زلهێزەکان لەبەرچاو ئەگرێ‌و گورزێکە بۆهەر ئەگەرێکی کە دژی ئاییندەی ئەوان بوەشێنرێ لەبابەت ئەو ملهوڕییەی سەدام بەرامبەر بە کوێت کردی. هەرچی بێ ئەوە بۆ ئێمەی کورد بێسوود نییەو ئەبێ بە باشی‌وەکو کردەیەك بیقۆزینەوەو لە دەستی نەدەین.

# ڕاپەڕینی دووەم و سێیەم

وە نەبێ کە ڕژێمی سەرکوتکەری سەدامی هاتبێتەوە کوردستان شێوازی ڕەفتارو بیری سیاسی خۆی بگۆڕێ‌و لەگەڵ کوردا جۆرە نەرمییەك بنوێنێ بە تایبەتی خۆی بە چاوی خۆی تێکشکانەکانی بەرامبەر هاوپەیمانان‌و بەرامبەر خەڵکی ڕاپەڕیویش بینی‌و بوونە مایەی ئەوپەڕی لاوازی بۆی بە تایبەتیش ئەو کە لە گفتوگۆدا بوو لەگەڵ لایەنەکانی کوردستانیدا کەچی بەردەوام بوو لە ملهوڕییەکانیدا، ئەمەوایکرد کە چیتر لێی قبوڵ نەکرێ، لە شارۆچکەی کۆیە جامی غەزەبی خەڵکی بەرامبەر بە ڕژێم‌و دەسەڵاتە نابووتەکەی پڕبوو، سەرو چاوی هەر یەکێکت بخوێندبایەوە پڕ بوو لە پرتەو بۆڵەو ڕق، هەستت ئەکرد ئێستا نا ساتێکی تر ئەتەقێتەوە، دوژمن هەمیشە بە بیانوو بوو، شەڕی بە خەڵکی ئەفرۆشت‌و هەندێ ئیجرائاتی لابەلای ئەکرد، بۆیە لەگەڵ هەڵوێستی خەڵکەکەدا ئێمەیش‌وەکو هێزی پێشمەرگە هەڵوێستمان‌وەرگرت. خۆمان سازدا بۆهەر مەبەستێك ڕووبدا.

ئەوەبوو ڕۆژی ٩/٧ خەڵکی کۆیە لە دوژمن ڕاپەڕین. پەلامارێکی کوتوپڕیاندا، ناو شاری کۆیە لە هەموو ئاسەوارێکی بەعس پاککرایەوە، لەملایشەوە باداوای لێسەنرایەوەو هێزەکانی ڕاونرا. لە تۆڵەی ئەمەدا دوژمن لە بیستانەوە پەلاماری هێزەکانمانیدا، نەیزانی بەسەر مینی چێنراوی هێزی پێشمەرگەدا ئەکەوێ‌و نەخشەکانی پووچەڵ ئەبنەوە. ئێمە لێی ڕاپەڕین‌و بەتوندی لێماندا. هەر ئەوەندەی بۆ کرا مەیدانی شەڕەکە بەجێ بهێڵێ‌و بەرەو مۆڵگەکانی ڕابکاتەوە. لەم شەڕەدا ٦٥ دیلی لێگیراو ٨ بریندراری لێ بەجێما. ئەمە

شکستێکی تری ڕژێم بوو ئاماژەیەکیش بوو کە لە کوردستاندا نامۆیەو جێی نابێتەوەو هەر جموجووڵێك بکات بە سەر شکاوی ئەگەڕێتەوەو سەرکەوتنودەست ناهێنێت. ئەبێ بەرنامەیەکی تر لای خۆی گەڵاڵە بکات نەك هەر هەموو ڕۆژێك تووشی تێکشکانو ڕاونانو ڕووخان بێت، ئەمەش لە لای خەڵکی بە ڕاپەڕینی دووەم تۆمارکرا.

لەم هەلومەرجە ناسکەدا کە خەڵکی زیاتر لە بیری ئەوەدا بوون کە چۆن بەرگری لە خۆیان بکەن، بەرەکانی شەڕ بپارێزن، پڕ چەك بن بەرامبەر هەر ئەگەرێکی نگریسانەی ڕژێمی مرۆڤکوژی بەعس، یەکێتی نیشتمانی کوردستان کە لەم ڕووەوە هێزێکی بەرگری باڵا دەست بوو، بە تەنیاش هەر خۆی بە مەسەلەی شەڕەوە خجڵ نەئەکرد، بەڵکو لە ڕووەکانی تریشەوە پەلی ئەهاویشت. داهێنانی گەورەیان ئەنجام ئەدا بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان.

یەکێك لەو داهێنانەش پەخشی تەلەفزیۆنی بوو کە لە ڕۆژی ١٩٩١/٩/١١ لە شاری سلێمانییەوە بەووتاری هەڤاڵ مام جەلال دەستی پێکرد ئەمە کارێکی گرنگ بوو لەم قۆناغەدا کە هێشتا سەقامگیر نەبووە، بەو تواناو ئیمکاناتە کەمە کەناڵێکی تەلەفزیۆنی دابنرێ کە لە ڕووی تەکنیکیشەوە کادیری شارەزای کەممان هەبوو. هەنگاوەکە خۆی لە خۆیدا زۆر گەورە بوو، دڵخۆشییەکی بەخشییە کورد کە لەم ڕۆژگارەدا بە توانای خۆماڵی لە ڕووی ڕۆشنبیریو هونەرییەوە دڵو دەروونو مێشکی مرۆڤی کورد مشتوماڵ بکرێت. لەپاڵ شەڕی بەرگری کردن لە کوردستان چالاکی ڕۆشنبیریو پەروەردەی کەسێتی کوردیش بکرێ. ئەگەر چی ڕژێمی بەعس لە تەلەفزیۆنی کەرکوکەوە بەرنامەی کوردی هەبوو، کە زیاتر بۆ خزمەتی سیاسەتی بەعسیانەی ڕژێم بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ بابەتی هونەریو ئەدەبی کوردی تێدا پێشکەش ئەکرا.

لەم ماوەیەدا سەردانێکی پێنجوێنم کردو لەگەڵ منداڵەکاندا قسەم کرد، ماڵەکەمم پێچایەوە بۆ سلێمانیو لەوێ نیشتەجێ بووین. دوایی سەرێکی

گەرمیانمـداو لـە دەشـتی داودەدا هەنـدێ ئاسـکمان کوشـتو بـۆ حەسـانەوەش چووینە خۆرنەوەزانی لای قەوالّی کە بە سەر چەمی ئاوەسپییەوەیەو شوێنێکی فێنكو ئاودارو گژوگیا دارەو تابلۆیەکی سروشتی ڕەنگینـە بـۆ گەشـتو گـوزارو سەیران زۆر بە کەڵكو سوودمەندە، کـاتی خۆی برادەرانی حیزبـی شـیوعی بـۆ خۆحەشاردانو پارتیزانی هەروەها ئێمەش سوودمان لێ بینیوە.

دوای ئەوەی لەوێ گەڕامەوە سەردانێکی هەولێرم کردو چوومە لای کاك کۆسرەتو باسی ئەشکەوتی داری خلەو تەرمەکانی ٧ شەهیدەکەم بۆ کردو بـڕی ١٠ هـەزار دینـاری دامـێ بـۆ دەرهێنـانی تەرمـەکانو گواسـتنەوەیان. لەگـەڵ برادەرانی تـردا کـاك کـوردۆو کـاك عـەدنانو کـاك عوسمانـدا قسەمان کـرد لـەو بارەیـەوە ڕۆژی ٩/٣٠ سـەردانێکی ئەشـکەوتەکەمان کـردو لـە خواریشـەوە بەسەرپەرشتی م.عـەلی کـار کـرا بـۆ ئەنجامـدانی ڕێـو ڕەسمـی ناشـتنیانو کـۆڕ بەسـتنو ئاگادارکردنـەوەی کـەسو کـاری شـەهیدانو خـەڵکی ناوچـەکە بـۆ بەشـداریکردن لـە هێنانـەوەو بـەخاك سپاردنیان لـە گۆڕسـتانی کـەلاری کـۆن. شـۆفڵمان بـرد بـۆ لابردنـی ئـەو بارستاییە زۆرەی خـۆڵو بەرد کـە بـەردەمی دەرگـای ئەشـکەوتەکەی گرتبـوو، ئێمـە لـە کارکردنـدا بـووین ڕۆژی ١٩٩١/١٠/٥ دوژمـن بـەهێزێکی زۆری تانـكو زریپـۆشو سـەربازەوە پـەلاماری کفـری داو لەشەڕێکی نابەرامبەردا توانی دەستی بەسەردا بگرێو ئەو کەمە پێشـمەرگەیەو خەڵکەکەی لەشار دەربچنو هەنـدێ پێشمەرگەشوەکو حسین حەمـە سـەمکەو زۆراب هۆمەرملی و د.ئـاتیللا شـەهید بـبن. هێزەکـەی دوژمـن بـەم سـەرکەوتنە بچـووکە لـە خۆبـایی بـوونو زیـاتر پێشـڕەویان کـرد.لای کـەلاریش هەنـدێ جموجووڵیـان هـەبوو لـەو بـەری سـیروانەوە تۆپبـارانی نـاو کـەلاری ئـەکرد. هێزەکانی دوژمن گەیشتنە سەرقەلا، بەلام لەوێ دۆزەخێکی گەرمیان بۆ داخـرا، ئەو دەشتاییە بووە گۆڕستانی تانکە پەلاماردەرەکانی ڕژێمی بەعسی فاشیست. لە چەند قۆڵەوە پێشمەرگە نەبەزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان شـێر ئاسـا هەڵمەتی کوتوپڕیان کردە سەریانو لە قۆڵێکیشەوە مەفرەزەیەکی حشع هاوکـار

بوون، لێرەدا ئەو فیزو لەخۆبایی بوونە سەربازییە دادی نەدان و هەر ئەوەندەیان زانی ئاگری تۆڵە لە پوشوویان کەوتووەو ئەبنە قەرەبرووت. لە ماوەیەکی یەکجار کەمدا ٣٥ تانکی زەبەلاح پخدران و لەناو هاڕەو قرمژنی گوللە ئارپیجی و بیکەیسی و تفەنگی قارەماناندا لەپەو ڕوو ئەکەوتن و گڕو بڵێسەی مەرگیان لێ بەرز ئەبووەوە. لەم شەڕەدا فەرماندەی قارەمان ئەحمەدی حاجی ڕەشید کە یەکێك بوو لە پارتیزانە بەووەرەکان، ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە گەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگەی ئازای تردا. ئەم سەرکەوتنە لاسەنگییەکی خستە بەرنامەکەی ڕژێمەوە کە بە پێی ئەو نەخشەیەی لەو شەڕەدا دەستمان کەوتبوو بە نیازبوو هێزەکانی لە سەرقەڵاوە بچنەوەلی هەیەرو لەوێوە بەسەر زنجیرە چیای شاکەلدا شۆڕببنەوە بۆ گردە گۆزینە، بەڵام بۆیان نەکرا، جگە لەمە لە سنووری سلێمانی و شارەزوورو دەربەندیخان و ئەوبەری سیروانیش هێزەکانی کەوتنە بەر هەڵمەت و پەلاماردان جگە لە خۆبەدەستەوە دان هیچی تریان پێنەکرا. لەوبەری سیروانیشەوە هەر بە یەکجاری ڕۆیشتن، پردی دەبابەیان تەقاندەوەو لەدوای خۆیانەوە هێزەکانی پشتی بانی‌بی و ژاڵەناوو ناو فرقەی دەربەندیخان و حامیە هەموو تەسلیم بوون بە ئەفسەرو سەربازەوە، ئەوانەی کەلار دوو مدرعەیان لەسەر قەڵای شێروانە لێگیراو سووتێنران و سەربازەکانیش بە دیل گیران.

ئەمە بە ڕاپەڕینی سێیەم ناوی دەرکرد. ئەمەوای لە ڕژێم کرد بە پەلە لەگەڵ نوێنەرانی بەرەی کوردستانیدا دابنیشن لە بارەگای فرقەی ٢٢ لە باریکەی بنکورە لە لایەن ڕژێمەوە نوێنەری وەزارەتی بەرگری ڕژێم و لە لایەن بەرەی کوردستانیشەوە کاك جەبار فەرمان و جەوهەر نامیق سالم بەشدار بوون، دوای گفتوگۆ گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە کۆتایی بەشەڕ بهێنرێ، هێزەکانی ڕژێم لە سەرقەڵاو سەرووی کفری بکشێتەوە، بۆ کۆنترۆڵکردنی بارودۆخەکە بازگەیەکی هاوبەش لە سەر ملەی ئاساڵەح دابنرێ، بازگەیەکیش لە گردە گۆزینەی خوارەوەی کەلار، هێزێکی هاوبەشی یەك فەوجی

سەربازی و٧٥ پێشمەرگە لە ناو کفریدا دابنرێ. ئینجا لیژنەیەك پێکهات لە هەڤالآن جەمیل هەورامی و حەمە عەلی قەرەچەتانی و م.عەلی و عوسمانی حاجی مەحمودو ئەفسەرێکی ئیستخباراتی فیرقە بۆ هەماهەنگی لەگەڵ ئەو هێزەی سەرقەڵادا بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری کشانەوەکەیان و دابینکردنی پێشمەرگەکانی ئەو جەبهەیە. ئەو لیژنەیە چوونە دێی برایم خان و لەگەڵ فەرماندەکانی ئەو هێزەدا قسەیان کردو ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی تا ١٥ کاتژمێر مۆڵەتیان بدرێ بۆ تەگبیر کردنی لاشەی ئەو هەموو تانکەیان و چاوەڕێی بڕیاری سەرەوەیانن بیگوێزنەوە یان بیخەنە ژێر گڵەوە.

شایانی باسە ئەفسەری ئیستخباراتەکە کە مقدم بوو بەناو لاشەی ئەو تانکانەدا تێپەڕی و بەچاوی خۆی ئەو هەموو کەلاکە زەبەلاحەی بینی لەو گۆڕەپانەدا یخ درابوون. ئەوەی سەیر بووو چاوەڕوان نەئەکرا ئەوەبوو ڕۆژی دواتر ئەوان کشابوونەوەو هیچیان لێبەجێ نەما، تەنانەت ئەو بڕگەیەی کە هێزی هاوبەش بوو بۆ ناو کفری و بۆ بازگەکان ئەوەشیان نەکرد.لە سلێمانیش هەموو هێزەکانیان کۆنترۆڵکران و لە ڕێگەی بەرەی کوردستانییەوە بۆ دەرەوەی سلێمانی بەڕێکران.

ڕژێمی بەعس لەگەڵ ئەوەی بڕیاری دابوو ئیدارات لە کوردستاندا بکشێنێتەوە بڕیاریشی دابوو هەردوو بەنداوی کارۆئاوی دووکان و دەربەندیخان تێك بدات تاکو زیان بە سەرچاوەی کارەبای کوردستان بگەیەنێت.. مەکتەبی سیاسی یەکێتی لەم پیلانە ئاگاداربوو ، بۆیە بڕیاری دا کە سەرەڕای ئەوەی فیرقەیەکی سەربازی ڕژێم لە بەنداوی دووکان دانرابوو پاسەوانی بۆ دابنێ و هەوڵیش بدرێت بێ شەڕ ڕێگە لە جێبەجێ کردنی نەخشەی تێکدانەکە بگیرێت ، بۆیە هێزێکی لە شکری یەکی سلیمانی ئامادەکرا بۆ ئەو مەبەستە ، ئەو کاتەش من فەرماندەی هێزی ٨ی بتوێن بووم نەبوایە لە کاك مستەفا چاورەشەوە بڕیاری جووڵان وەربگرم بەڵام بە حوکمی هاوڕێتی لەگەڵ برادەرانی لە شکری یەکداو کاك جبار فەرمان فەرمانمان پێکرا لە دووریانی

کۆیـە – ڕانیـە بـۆ سـەر بەنـداوی دووکـان هێزەکانمـان دابنـێن ، کـە ئـەو کاتـە بارەگـای لیـوا لـە نـاو خەلەکانـدا بـوو ، هـەموو سـریەو فەوجـەکانی بەسـەر گردۆلکەکاندا بلاوەیان کردبـوو ، ئێمـە لەگەڵ کـاك توفیـق کانیوەتمانیو کـاك عـەلی نـەبیو برادەرانـی تـری هێـزدا بەتالیۆنـەکانمان دابەشـکردوو هەریەکـە شوێنی خۆی بۆ دەستنیشـان کـراو پێمـان ڕاگەیانـدن کـە بـە سـەیارە بچنـە نـاو ڕەبیەکانیانەوە بەبێ تەقە لەگەڵیان دانیشن ، ئەگەر ڕێگەیان نەدا ئینجا بـەزۆر لەگەڵیاندا بکەن.. بۆیە ئێمە بەرنامەکەمان بێ تەقە جێبەجێکرد .. لەو کاتەدا بروسکەیەکمان لەلایەن کاك مەسعود بەرزانیـەوە پێگەیشـت ئـەڵێ : کوردسـتان موڵکی ڕۆستەمو مەحمود سەنگاوی نی یە بە هەوەسی خۆیـان تەسـەڕوفی پێـوە بکەنو نابێ ڕێگەیان .

بـەڕێز کـاك مەسـعود بـێ ئاگـا بـوو لـەوەی کـە ئێمـە بـەبڕیار ئـەو کـارە ئەنجام ئەدەینو لە خۆمانەوە هیچ شتێك ناکەین .

هەندێك دۆخەکە خـاو بـووەوە ، پاسـەوانـی بەنداوەکـە کەوتـە دەسـتی هێزی پێشمەرگە ، ئەفسـەری ئیسـتیخباراتی فیرقـەی دووکـان کـە نـاوی عەقیـد موەفەق بوو لەگەڵ شێخ حەسیبدا هاتنـە لامـانووتی : هەوڵـدەن کـەمێك لـەناو ڕەبیـەکان دوور بکەونـەوە بـۆ ئـەوەی بتـوانین نـانو خـواردن بگەیەنینـە سـەربازەکانمان ، منـیش پـێمووت : ئێمـە بـەبڕیار هـاتووینو بـەبڕیاریش ئەکشێینەوە بۆیە ئەبێ بڕیار لە مەکتەبی سیاسـی یـان کـاك جـەبار فەرمانـەوە بێتو گوێ لە قسەی تـۆ نـاگرین . ئـیتر ئـەوانیش بەناچاری گەڕانـەوە . دواتـر کاك کۆسرەتو کاك جەوهەر نامیق بڕیاری کشانەوەی ئێمەیان دا.

# کشانەوەی ئیدارات

ئیتر ئەمە هەنگاوی کشانەوەی دەسەڵاتو ئیداراتی ڕژێم بوو لە کوردستان کە ڕۆژی ١٠/٢٢ دەستیپێکرد، لەم هەنگاوەیدا مووچەی ١٥٠ هەزار مووچەخۆری بڕیو کەرەسەو کەلوپەلێکی زۆری ئیداراتی بردەوە بۆ کەرکوكو موسڵ. بەو مەبەستەی کورد بێ سەرپەرشتی ڕژێم بۆ کاروباری ڕۆژانەی ناتوانێ بژیو دەستەو ئەژنۆ لێی ئەکەوێ. ئەمەش یەکێکی تربوو لەوجۆرە هەڵانەی ڕژێم ئەنجامەکە بە قازانجی گەورە بۆ کورد گەڕایەوە. ئەگەر چی هەندێ لایەنیواقیعیشی تێدا بوو چونکە ڕژێم نەیئەتوانی لەو هەلو مەرجە ئاڵۆزەی ناو کوردستاندا هێزی سەربازیو ئیداراتی دابنێتەوە کە دایشی نایەوە زیانی زۆری لێکەوت. بۆیە ئەم هەنگاوەی نا چونکە لە دوولاوە تێی ئەڕوانی: ئەگەر بەرنامەکەی سەرکەوتوو بێ کورد داوای دەسەڵاتی ڕژێم ئەکەنەوە ئەو کاتەوەك پاڵەوانێك شەرعیەتی حوکمڕانیوەرئەگرێتەوەو ئەزانێ چی ئەکاتو کەسیش ناتوانێ سەرپێچی بکات. ئەگەریش سەرکەوتوو نەبوو ئەوا ئەو ناوچەیە بەجێ ئەهێڵێ بەحیسابی خۆی زۆر ستراتیژی نییە لە ڕووی ئابوورییەوەو خەڵکەکە زوو پەکیان ئەکەویو ڕووبەڕووی هێزە سیاسییەکانی سەر ساحەکە ئەبنەوەو پەشێوی ڕووئەداتو لەمەشدا گرەوەکە ئەباتەوە. بەڵام بەعس لەمەشیاندا بەهەڵە چووبوو، خەڵکی کوردستان هەڵوێستێکی سیاسی هوشیارانەیان پێشاندا بۆ ڕەتکردنەوەی بەرنامە نگریسەکانی بەعسو تەحەدا کردنیو خۆژیاندنو پشت بەستن بە ئیدارەی ناوخۆ بە هیمەتی خەڵکە بە پەرۆشەکەی ڕاپەڕین.

کشانەوەی ئیداراتی ڕژێم لە کوردستاندا زەمینەی خۆشکرد بۆ ئەوەی کورد بیر لە درووستکردنی ئیدارەی تایبەت بەخۆی بکاتەوە، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە ئەو پرۆفاید کۆمفۆرتەی هاوپەیمانان هاندەرێکی تر بوو بۆ هەنگاوی لەو جۆرە بیرکردنەوە. دیارە ئەم جۆرە بیرەش لە ئەنجامی پێداویستی ژیانی قۆناغەکەوە هاتە کایەوە، ئەمەش یەکێکە لە داهێنانە زیندووەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان کە بوێرانە لە کۆبوونەوەکانی بەرەی کوردستانیدا پێشنیاری کردبووو پێشی لەسەر داگرتبوو. زەمینەکە زۆر لەبار بوو بۆ ئەم مەبەستەو بارودۆخی کوردستان بوو بووە ئەمریواقیع. بوێریو پڕکێشی لە بڕیاردان بۆ کارێکی سیاسی لە بەرنامەی حیزبێکدا بەڵگەی هۆشیاریو دوور بینییە بۆ بنیاتنانی پاشەڕۆژی گەلو بەرەو پێشەوە بردنی کۆمەڵ. یەکێتی هەر لەیەکەم ڕۆژی درووستبوونیەوە کاری بۆ پاشەڕۆژی کورد کردووە، خەباتی لە پێناویوەدیهێنانی ئاواتەکانیدا کردووە، خوێنی زۆری لەو ڕێگەیەدا ڕشتووە. هیچ ڕۆژێك سڵی لە دوژمنو نەخشە دزێوەکانی بۆ لەناو بردنی کورد نەکردۆتەوە. بۆهەر قۆناغێكو هەر بەرنامەیەکی نامرۆڤدۆستانەی بەعس گەڵاڵە نامەی خەباتی شۆڕشگێڕانەی هەبووەو لە کاتی خۆیدا کوتەکی خۆیوەشاندووەو جێ دەستی دیار بووە. نەك هەر ڕەنگرێژی بۆ کاری شۆڕشو شەڕو پێشمەرگایەتی کردووە بەڵکو لە ڕووی سیاسیو ڕێکخستنو پێشخستنی کۆمەڵگاشەوە کاری جیدی کردووەو هەڵوێستەکانی دیار بوونو کۆمەڵێك سەروەری تۆمار کردووە کە هەموو لە بواری داهێنانی تایبەتی بە یەکێتی ئەژمێررێ. کە لە شەڕەکان بووینەوە جارێکی تر کەوتینەوە تفراقی هێنانەوەی تەرمی شەهیدەکانی داری خلە. ئەوە بوو لە ڕۆژی ١١/١ دا لە ڕێوڕەسمێکی شکۆداری شایان بەو پیاوەگەورانەی کورد بێ کە هەموو حیزبو لایەنەکانو خەڵکێکی زۆری گەرمیانو کەسو کاری شەهیدان بەشدار بوون تەرمەکان گەیەنرایە گۆڕستانی کەلاری کۆنو بە خاکی پیرۆزی کوردستان سپێردران دوای ئەوەی بۆ ماوەی ٢ ساڵ لە ناوقوڕگی ئەو ئەشکەوتە بێ بەزەییەدا مابوونەوە.

گەرچی دوژمن ئێستا لە ناوخۆی کوردستاندا نەماوەو هێزەکانی بردووەتە سەر ئەو سنوورەی کە خۆی کێشاویەتی، دەستی سەربازەکانی لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگە بۆ لێدانی بالآی بەرزی دەسەلاتی کوردی. ڕۆژانەش لە دوورەوە تەقە ئەکات، جار جارەش ئەیەوێ دڵی ئارامی خەڵکەکەی کوردستان داچڵەکێنێ بە پەلاماری ناوچەیی بچووك کە گیانی هەندێ لە قارەمانەکانمان ئەبنە قوربانی ئەو دۆخە نائاساییە. داخی گرانمان ناچار هەر جارەیش یەکێك لەو کەڵە مێردانەی ڕۆژگاری تەنگانە لەم هەلە ئازادەی بۆمان ڕەخساوە شەهید ئەبن. ئاسۆی دڵو دەروونی خەڵکی تەماوی ئەبێت. لە یەکێك لەو هێرش‌و پەلاماردانە ناوچەییانەی سنووری قادر کەرەمدا فەرماندەی پارتیزان‌و ڕۆڵەی قارەمانی ڕۆژانی سەختی خەبات کاکە حەمە ئاخە گیانی بەرزی بەرەو بەهەشتی سەروەری باڵ ئەگرێتەوەو بۆهەتا هەتایە لەژێر سەیوانی شەهیداندا ئارام ئەگرێ. ڕۆژی ١٩٩١/١١/٦ داخێکی گەرمی ئەو هەواڵە ناکاوەی شەهید بوونی کاکە حەمە ئاخە بوو گۆی دڵمی سمی‌و تابلۆی یادەوەرییەکانمی تەڵخ کرد، بەدڵێکی پڕ لە کەسەرەوە ڕۆژی دواتر پرسە پڕخەماوییەکەی لە چەمچەماڵ دانرا. پاشان گەڕاینەوە ڕانیە.

لەو ماوەیەدا هەندێ خەڵکی خاوەن هەڵوێستی ئەو کوردستانە ئازادە لە هەنگاوێکی چاو نەترسانەدا بۆ بەگژا چوونەوەی هەڵوێستە شۆڤێنییەکەی ڕژێمی بەغداد دەستیاندایە مانگرتن‌وەکو دەربڕینێك بۆ پاڵپشتی ئیرادەی مرۆڤی کورد لە هەلومەرجی تازەدا. ئەمە دڵی هەموو مرۆڤێکی کوردی داخورپاند بۆ داکۆکیکردن لەم هەڵوێستەیە لە هەموو شوێنێك خەڵکی بە ڕێپێوان‌و مانگرتن هاودەنگی‌و هاو هەڵوێستیان پێشاندا. ئێمەش بۆ ئەم مەبەستەو بۆ پشتگیریکردنی مانگرتووەکانی سلێمانی ڕێپێوانێکمان لە چوارقوڕنەوە بۆ ڕانیە دەستپێکردو لە لای مانگرتووەکانی ڕانیە کۆتاییمان بە ڕێپێوانەکە هێنا. ڕۆژی پاشتر چووینە شەقڵاوەو لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلال دوو کۆبوونەوەمان کرد لەسەروەزعی سیاسی کوردستان‌و پێداویستییەکانی ئەو قۆناغەو شێوازی کارکردنمان.

له ڕۆژه دوادواییه‌کانی ساڵی ١٩٩١ دا (ی.ن.ك) شاکارێکی تری داهێنانی به‌خشییه گه‌له‌که‌مان له بواری خزمه‌تکردن به کاری پێشمه‌رگایه‌تی بۆ پێگه‌یاندنی (هـ.پ.ك) له ڕێگه‌ی زانستی سه‌ربازی سه‌رده‌مه‌وه چونکه ناکرێ هه‌ر به پێودانگی ڕۆژگاری ڕابوردوو هێزه‌کانمان کار بکه‌ن‌و نه‌توانن له ئاستی پێویستدا بن، ئه‌مه‌وایکرد که یه‌کێتی بیر له دامه‌زراندنی کولیه‌ی سه‌ربازی بکاته‌وه.

له ڕۆژی ١٩٩١/١٢/٢٤ به شێوه‌یه‌کی ره‌سمی ئه‌و کولیه‌یه کرایه‌وه. گه‌رچی ئه‌م هه‌نگاوه زۆر گرنگه‌و بایه‌خی خۆی هه‌یه به‌لام به‌لای هه‌ندێکه‌وه کارێکی پڕمه‌ترسییه‌ووای لێك ئه‌ده‌نه‌وه که ئه‌مه بۆنی جیا بوونه‌وه‌ی لێ دێت که چی ئێمه به مافی خۆمانی ئه‌زانین ئه‌م کولیه‌یه‌و هی تریش بکه‌ینه‌وه‌و نه‌وه‌کانمان له سه‌ر بنه‌مای بیری پێشکه‌وتووی سه‌ربازی بۆ به‌رگری له خۆمان‌و ئاینده‌ی نه‌ته‌وه‌که‌مان پێ بگه‌یه‌نین.

ساڵی ١٩٩١ یش له یاده‌وه‌ری مێژووی کورد دا تۆماری خۆی ئه‌پێچێته‌وه، ساڵێکی پڕ ده‌ستکه‌وتی سیاسی گه‌وره که به خۆبه‌ختکردنی ڕۆڵه دڵسۆزه‌کانی له ڕاپه‌ڕینێکی مێژوویی‌داوه‌ده‌ست هات. ئه‌گه‌ر چی له‌ساته‌وه‌ختی شادییه‌کانی ڕاپه‌ڕینی خوێناویدا کاره‌ساتی کۆڕه‌وه‌ی گورچکبڕمان هاته ڕێ به‌لام به خێرو بێر بۆمان شکایه‌وه که سه‌رنجی ڕای گشتی جیهانی ڕاکێشاو هه‌ڵوێستێکی گه‌وره‌یان‌وه‌رگرت‌و گوشار خرایه سه‌ر ده‌سه‌ڵاتی‌وولاته‌کانیان بۆ کۆمه‌کی کوردو له‌مه‌شه‌وه بڕیاری ٦٨٨و درووستکردنی هێزی پرۆڤاید کۆمفۆرت‌و ده‌ستنیشان کردنی هێڵی ٣٦. له‌هه‌مووش گرنگتر کشانه‌وه‌ی ڕژێم بوو له کوردستاندا که ڕێگه خۆشکه‌ر بوو بۆ هه‌لێکی تری مێژووی چه‌سپاندنی ده‌سه‌ڵاتی کوردی.

# ساڵی ١٩٩٢

## کۆنگرەی یەکی یەکێتی

کە چووینە ناو ساڵی ١٩٩٢، ڕوداوێکی گرنگ لە مێژووی یەکێتیدا ڕوویدا ئەویش بەستنی کۆنگرەی یەکەم بوو. دیارە لە دوای درووستبوونی یەکێتی جگە لەوەی کۆمەڵەو شۆڕشگێڕان هەریەکە بۆ خۆیان کۆنفرانسیان بەستووە، یەکێتی هیچ کۆنگرەیەکی تایبەتی بە خۆی ئەنجامنەداوە. لە دوای ئەنفالو دوای ئەوەش کە کۆمەڵەو شۆڕشگێڕان لە دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیێتوازیان لە خۆیان هێناو لە ساڵی ١٩٩٠ یەکێتییان پێکهێنا، کۆنفرانسێکی ناوچەیی لە سنوری هێزو ڕێکخستنەکانی لە ناو ئێراندا بەستوەکو خۆئامادەکردن بۆ کۆنگرە بەڵام هەلومەرجی داگیرکردنی کوێتو پەلاماری هاوپەیمانان بۆ سەر عێراقو دەربەڕاندتی لە کوێت بواری نەدا ئەو کۆنگرەیە ببەسترێ، دوای ڕاپەڕین هەلێکی باش ڕەخسا بۆ بەستنی کۆنگرە کە کارێکی پێویست بوو بۆ دارشتنی سیاسەتو هەڵوێستو دانانی سەرکردایەتییەکی نوێ بۆ بەڕێوەبردنی کارو بارەکانی حیزبیو پێشمەرگەییو حوکمڕانیش.

ئەوەبوو ڕۆژی ١٩٩٢/١/٢٧ لە شاری سلێمانی یەکەم کۆنگرەی یەکێتی بەستراو ڕۆژی ١/٢٩ هەڤاڵ عومەر دەبابە ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی دوای تەمەنێکی دورو درێژ لە خەباتی سیاسیو پێشمەرگایەتیدا لە پێناوی گەلەکەیدا لەم ڕۆژە گرنگەی ژیانی یەکێتیدا لە ناو هۆڵی کۆنگرەدا گیانی بە خاکی کوردستان سپاردو کۆنگرەکە ڕاگیراو تەرمەکەی بۆ کۆیە گوێزرایەوە کە ڕۆژگارێکی ساردو بەفراوی بوو پێچەکانی هەیبەتسوڵتان لە بەر بەفر زۆری

گیرابوو. ئۆتۆمبیلەکان سەر نەئەکەوتن، بە شان تەرمەکە سەر خرایە سەرو برایەوە بۆ گۆڕستانی کۆیە. ئینجا کۆبوونەوەکانی کۆنگرەش بۆ هەولێر گوێزرایەوە.

من خۆم لە کۆنفرانسی بەتالیۆنی ۱ دا دەنگی یەکەمم هێنا لەم کۆنگرەیەشدا بەشداریم کرد.کە نوێنەری زۆر حیزب و ڕێکخراوو دامەزراوە کوردیو کوردستانیو عێراقیو عەرەبییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستو ئەوروپاو ئەمریکاو کەنەدا ئامادە بوونو هەریەکەیانووتەی خۆیان خوێندەوە پاشان لە کۆبوونەوەی داخراودا هەڤاڵ مام جەلالووتەی خۆی خوێندەوەو لەم کۆنگرەیەدا یەکخستنەوەی کۆمەڵەو شۆڕشگێڕان لە ناو یەکێتیداو پرەنسیپی دیموکراسیو هەروەها پرەنسیپی سۆسیال دیموکرات چەسپا.

لەم کۆنگرەیەدا سەرکردایەتییەکی نوێ هەڵبژێردرا کە هەر ۳ سکرتێرەکە: هەڤاڵ مام جەلال سکرتێری یەکێتیو کاك نەوشیروان سکرتێری کۆمەڵەو د.فوئاد سکرتێری شۆڕشگێڕان لە دەنگدان بوێردرانو ۱۷ هەڤاڵی تر بوونە ئەندامی سەرکردایەتی لەگەڵ ٦ یەدەکدا کە هەندێك لەو هەڤاڵانە بۆ یەکەمجارە دێنە ناوریزی سەرکردایەتییەوە. ڕۆژی ۲/۱٤ کۆنگرە کۆتایی بە کارەکانی هێنا.

# هەڵبژاردن

دوای ئەوەی حکومەتی ناوەندی عێراق دامو دەزگا ئیدارییەکانی لە هەنگاوێکی تێکدەرانەدا لەکوردستاندا کشانەوە، بۆ ئەوەی بۆشایی ئیداری بەرپا ببێ زەمینە خۆش بکرێ بۆ گەڕانەوەی سەر لەنوێی دەسەڵاتی بەعسو دەزگا تۆقێنەرەکانیو جارێکی تریش کوردستان بخاتە ژێر ڕکێفی داپڵۆسێنەرانەی خۆی. گەرچی ئەو خەونەی بەعس نەهاتە دی، بەپێچەوانەوە کورد ڕازی نەبوو بەعس بگەڕێتەوە، بەیەك دەنگو یەك هەڵوێست ڕووبەڕووی نیازە چەپەڵەکانی بەعس بووەوە، بەرەی کوردستانی کە لە دوای درووستبوونیەوە بوو بووە حکومەتی ئەمریواقیع و کاروباری کوردستانی لە ڕووی ئیداریو

سیاسییەوە بە ڕێوەئەبرد لەبڕیارێکی بوێرانەدا کەوتە کارکردنو بۆ ئەمەش بڕیاری دامەزراندنی لیژنەی کارو لە هەر شارو شارۆچکەیەکدا ئیدارەی ناوخۆی درووستکرد، بەڵام شپرزەیی بەمەوە دیار بوو، بەباشی کۆنترۆڵی کاروبارەکان نەئەکرا، بۆیە دوای گفتوگۆیەکی زۆر بیر لەوە کرایەوە دینامیکیەتێکی نوێ بۆ حوکمڕانی بێتە کایەوە، ئەو شێوە سادەیە گۆڕانی بەسەردا بێتو شێوازێکی حوکمی مەدەنی پەیڕەو بکرێ، ئەویش لەڕێگەی هەڵبژارنێکی گشتییەوە پەرلەمانێك بۆ کوردستان دابمەزرێو حکومەتێك پێك بهێنرێ بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکیو سەرپەرشتی مەسەلەی سیاسیو ئیداریو ئابووریو کۆمەڵایەتیو فەرهەنگی بکاتو ئەو بۆشاییەی حکومەتی عێراق هێنابوویە کایەوە پڕبکاتەوە.

ئەمە هەڵوێستێکی نوێی جیدیو گرنگ بوو لەو هەلومەرجەدا بەتایبەتی عێراق لە تەنگەژەیەکی نێودەوڵەتیدا ئەژیا، فایلی کوردیش لە سەرەوە بوو، پارێزگاری نێودەوڵەتی بۆ مسۆگەر کرابوو، هەرچەندە لە ناوخۆی کوردستانو لەناو لایەنەکانی بەرەی کوردستانی بەیەك ئاست مەسەلەکان تاو توێ نەئەکرا، بەڵکو هەندێك لایەن ئەترسان، زاتی ئەوەیان نەبوو پڕکێشی بڕیارێك بکەن بەلایانەوە ئایندەکەی تەمو مژاوییە، بەڵام ئیرادەی گەل، خواستەکانی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان، ئەو هەموو مەینەتییانەی بەسەریاندا هاتووەوای ئەخوازی کە هەنگاو بەرەو یەکلاییکردنەوە بنرێ، لە پێشەوەی هەموویانەوە (ی.ن.ك) بەبەرچاو ڕوونییەوە ئەیڕوانییە ئەو مەبەستەو کاری خۆی ئەکردو لە هەوڵێکی بەرفراواند هەموو لایەك گەیشتنە ئەو سەرەنجامەی بڕیاری هەڵبژاردنی گشتی بدرێ بۆ دیاری کردنی ئایندەی کوردستانو لەڕێگای دەزگایەکی یاسادانانەوە پەرلەمان بڕیاری شێوازی حوکمڕانیو پەیوەندی بەناوەندەوە بدرێ. لەم بوارەشدا یاسای هەڵبژاردنی ژمارە یەكو دوو دەرکرا، بەوپێیە هەموو حیزبەکان خۆیان ئامادەکرد بۆ هەڵبژاردن.

بۆ ئەنجامدانی هەر پرۆسەیەکی هەڵبژاردن پێویستە ئاماری دانیشتوانەکەی بکرێ، لیستی ناوی دەنگدەران ئامادەبکرێ لەهەموو ناوچەکاندا،

بەڵام لە بارودۆخی کوردستاندا ئامار کارێکی ئاسان نەبوو، شارەزای باشمان نەبوو، کولفەیەکی زۆری گەرەك بوو، بۆیە پەنا برایە بەر شێوازێکی سادە لە بری ئامادە کردنی ئاماری ڕێکوپێکی دانیشتوانی کە مافی دەنگدانیان هەیە، لیستەکانی خۆراك کرایە بناغەو لە کاتی ئەنجامدانی دەنگدانیشدا بۆ گزی نەکردن بڕیاری پەنجە مۆر درا، هەروەها بۆ هەر ناوچەیەك مەڵبەندی هەڵبژاردن دیاریکراو لەهەر مەڵبەندێك بە پێی ژمارەی دەنگدەران سنووقی دەنگدان دانراو لیژنەکانی سەرپەرشتی دەنگدانیش دەست نیشان کران. لە ڕێگەی ئاژانسەکانی دەنگو باسەوە مەسەلەی هەڵبژاردن بڵاو کرایەوە، ئاگاداری زۆر لایەنی دەرەوەش کرایەوە بۆ کۆمەكو هاوکاریکردن.

بانگەشەی هەڵبژاردن لە جەوێکی دیموکراسەیدا دەستیپێکرد، هەر حیزبە لە ڕێگەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی خۆیەوە قسەی بۆ جەماوەر ئەکرد، بەو پەڕی ئازادییەوە ڕای خۆی دەرئەبڕی، هیچ جۆرە سانسۆرێکی نەبوو، لە هەموو شوێنێکدا ئاهەنگی بانگەشە کردن ئەگێڕدرا.

ڕۆژی ١٩٩٢/٥/١٥ دیاریکرابوو بۆ دەنگدانی گشتی، بەڵام دەرکەوت هەندێ کۆسپ هاتووەتە ڕێگا بەهۆی ئەو مەرەکەبەوە کە لە دەرەوە ئامادەکرابوو بۆ مۆرکردن، کە پارتی لای خۆیەوە بێ ئاگاداری لایەنەکانی تر دەستکاری کردبوو، ڕۆژەکەی دواخرا بۆ ١٩٩٢/٥/١٩. نەك هەر ئەمە بەڵکو کۆسپی تریش هەبوو بەتایبەتی لە دانانی سنووقەکانی دەنگدان لە مەڵبەندەکانی هەڵبژاردندا کە جۆرە ناعەدالەتییەکی تیاکرابوو، ئەو سنووقانەی بۆ بادینان دانرا بوو لە ژمارەی سنووقەکانی تری هەولێرو سلێمانیو کەرکوك زیاتر بوون، ئەمەش پیلانێکی تری پارتی بوو بۆ لەباربردنی ئەم پرۆسەیە. لەگەڵ هەموو ئەو کەمو کوڕییانەشدا هەڵبژاردن پەك نەخرا، ئەگەرچی پارتی لەبانگەشەکانیدا هەوڵی ئەداوا لەجەماوەر بگەیەنێ کەئەمە کارێکی قورسە، لەوانەیە تووشی شکستی بین، ئەوان هەڵلایان بۆ حوکمیزاتی ئەکرد، ترسیان ئەخستە دڵو

دەروونی خەڵکییەوە گەر بەووەرەقانەی حوکمی زاتی ڕازی نەبین کەوەفدی بەرەی کوردستانی لە دوای کۆڕەو پێشکەشی حکومەتی عێراقیان کردبوو، بەڵام خەڵکی زۆر گوێ بیستی ئەو پڕوپاگەندانە نەبوون، لەملاشەوە (ی.ن.ك) بە عەقلێکی مۆدێرنەوە لەگەڵ ئاواتەکانی گەلی کوردستاندا مامەڵەی ئەکرد، داوای مافی چارەی خۆنووسینی ئەکرد، کۆمەڵانی خەڵکی ئەتوانن لەڕێگەی دەنگدانەوە دوارۆژی خۆیان دیاریبکەن، لەڕێگەی ئەو نوێنەرانەیانەوە بۆ پەرلەمانێکی ئازاد.

بە ڕاستی ڕۆژگارێکی پڕ لە جۆشوخرۆش بوو، لەوێنەی فیستیڤاڵێکی نەتەوایەتی ئەچوو، بۆ یەکەم جارە خەڵکی کوردستانی ئازادکراو لەکەش و هەوایەکی سازگاردا دوور لە چاو سوورکردنەوەی دوژمنان خۆیان ئامادە ئەکرد بۆ ڕۆژی دەنگدان، شتێکی سەیریش بوو لەم کوردستانە تەنراوە بەدیاردەی چەکداری و میلیشیاگەری هیچ ڕووداوێکی ئەوتۆ نەهاتە کایەوە دۆخەکە تێکبدا کەچی لە دەوڵەتە پێشکەوتووە دیموکراسییەکاندا لەکاتی بانگەشەی هەڵبژاردندا دەیان ڕووداوی دڵتەزێن ڕوو ئەدا.. لەگەڵ ئەوەشدا ڕژێمی دیکتاتۆری بەغدا هەڕەشەو گوڕەشەی زۆر ئەکرد بۆ تێکدان و شێواندنی هەڵبژاردنەکەو دڵی خەڵکی سارد ئەکردەوە. ئایینـدەی لەبەرچاو تاریک ئەکردین، دەوڵەتە دراوسێکانیش لە سەرەتادا نیگەران بوون، دواتر هەندێ هێمن بوونەوە، دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت ئەم پرۆسەیە هەڕەشە لە بەرژەوەندییان ناکات.

ڕۆژی ٥/١٩ مێژوویەکی پڕ لەسەروەرییە بۆ گەلەکەمان، ڕۆژی هەڵبژاردنی یەکەم پەرلەمانە کەخەونی دێرینەی ملیۆنەها مرۆڤی تینووی ئازادییە. ئەو ڕۆژە لەگەڵ ڕۆژەکانی تردا جیاواز بوو هەر لە کاتژمێر ٨ ی بەیانییەوە هەموو مەڵبەندەکانی دەنگدان قەرەباڵغ بوون، ڕیزی درێژ درێژ گیرابوو، هەرکەسە بە پەرۆشەوە ئەڕۆیشت و بە ڕوویەکی گەشەوە ئەگەڕایەوە،

دەنگی دابووە ئەو لیستەی خۆی بڕوای پێی بوو، هیچ ڕووداوێکی سەرنج ڕاکێش بەرپا نەبوو، لەکاتی دەنگداندا. ئەگەرچی لە زۆر شوێن دەنگدانەکە بەسستی ئەڕۆیشت، لە زۆر شوێن خەڵکی لەبەر قەرەباڵغی ئەگەڕایەوە تادوای نیوەڕۆ دەنگ بدات، کەچی هەر فریانەکەوتن. ڕاستییەك ڕوون بووەوە کە پارتییەکان وەکو مەبەستێك سەر لە بەیانییەکەی تا دوانیوەڕۆ پاڵەپەستۆیەکیان درووست ئەکرد، پرۆسەکە بە هێواشی دەڕۆیشت، درەنگێك ڕوون بووەوە کە مرەکەبەکە ساختەیەو بە ئاسانی ئەچێتەوە، بەڵام پرۆسەکە هەر نەوەستا. زۆر خەڵك فریای دەنگدان نەکەوتن، چونکە لەناوچەکانی کەرکوك و سلێمانی و هەولێر سنوق کەم بوو، دەیان هەزار دەنگ فەوتا، دەریش کەوت ئەو دەنگانە هی یەکێتی بوو، سەرەڕای ئەوەی کە سنوقەکانی بادینان زۆرتر بوون، کەچی ژمارەی دەنگەکانیش لەوەی هەبوون زۆرتر بوو، تەنانەت بەپێی هەندێك زانیاری خەڵکی لەکوردەکانی تورکیاوە هێنابوو بۆ دەنگدان، جگەلەوەی خەڵکێکی زۆری لە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمەوە بەکێش کردبوو، ئەو هەوڵانەی پارتی لە سەرەتاوە دەرنەکەوتن وەك فێڵوتەڵەکەیەك لەگەڵ ئەنجامدانی پرۆسەکەدا یەکە یەکە ئاشکرابوون، کەچی لەهەندێ شوێندا بەهاندانی پارتی و بە هاوسۆزی هەندێ لایەنی تری وەکو شیوعی و حسك کۆنووسی ئەنجامی دەنگدانەکە کە لە بەرژەوەندی ئەواندا نەبوو مۆر نەئەکرا.

بۆیە سەرەنجامی دەنگدانەکە هەڵبژاردن بۆ ڕۆژی ١٩٩٢/٥/٢٢ دواخرا، دوای پێکهاتنێك ئەنجامەکان ئاشکرا کران کەبریتی بوو لەوەی هەردوولای سەرەکی یەکێتی و پارتی ڕێك بکەون لەسەر بەنیوەیی کورسییەکانی پەرلەمان واتە هەر لایەك ٥٠ کورسی کە ئەکاتە ١٠٠ کورسی و ٥ کورسیش بۆ مەسیحییەکان کە ئەکاتە ١٠٥ کورسی، لەبەرئەوەی لایەنەکانی تر ئەو ڕێژەیان وەدەست نەهێنا هیچ کورسییەکیان بەرنەکەوت. هەرچەندە لەسەرەتادا قسەو لێدوانێکی زۆر لەسەر شێوەی هەڵبژاردنەکە کرا کە زۆربەی دەنگەکان بە شێوەی ڕێژەیی درا بەڵام ڕێژەکەش بەپێداگرتنی پارتی لە ٧٪ بوو

که ڕێگەی له هێزه بچووکەکان گرت نەتوانن هیچ بەهیچ بکەن، لەوانەیشه ئەم پێداگرتنی پارتییه به ئەنقەست بووبێ تا ئەو حیزبانه سەربەخۆ دەنگ نەهێننو ناچاربن له گەڵ ئەواندا پێك بێن بۆ ڕوو به ڕوو بوونەوەی یەکێتی.

بەڵام بۆ لیستی ڕابەر که ٤ سەرکرده خۆیان کاندید کردبوو: هەڤاڵ مام جەلال، مەسعود بارزانی، مەلا عوسمان، د.مەحمود سۆرانی. که ئەم مەسەلەی ڕابەره له لایەن د.مەحمودەوه پێشنیار کرابوو کەووتبووی: با کوردیش شوانێکی هەبێ. له ڕاستیدا ئەمه پێشنیارێکی پێشکەوتوو خوازانه نەبوو له گەڵ سەردەمدا ناگونجێ لەوانەشه ئەو شوانه خۆی ببێته گورگو خوارەحم لەو ... بکات.!

هیچ لایەك له هەڤاڵ مام جەلالو مەسعود بارزانی دەنگی تەواویانوەدەست نەهێنا. هەرچەنده ئەم مەسەلەی ٥٠ به ٥٠ یه زیانێکی زۆری لێداین، بەڵام ئەبوایه هەروا بڕۆیشتایه، ئەوەی زۆرتر تەگەرەی ئەخسته ڕێگا پارتی بوو، ئەگینا ئەیتوانی لەڕووی پەرۆشەوه سوود لەو ٥٠ به ٥٠ یەوەربگرێ بۆ ڕاژەکردنی بەرژەوەندی کورد نەك بۆ بەرژەوەندی تەسکی خۆی.. لەسەرەوه تاخوارەوه ئەم مەسەلەیه ڕۆچووه خوارەوەو بووه دیاردەیەکی کوشندەو سوود له تواناکانی خەڵکی کوردوەرنەگیراو ڕقەبەرییەکی توندی درووست کرد.

پارتی هەمیشه بانگەشه بۆ ئەوه ئەکات که ئەو دەنگی زیاتری هێناوه، گوایه بۆ خاتری ڕاگرتنی دۆخه ناسکەکه ڕازی بوو بۆ بەشکردنی کورسییەکانی پەرلەمان.وەکو بڵی خێر بەیەکێتی ئەکات، دەست له مافەکانی خۆی هەڵئەگرێ، ئەو زانیارییانەی بڵاوی ئەکاتەوه جگه له شێواندنی ڕاستییەکانو هەڵفریواندنی ڕای گشتی کورد نەبێ هیچی تر نییه. ڕاستییەکان لای لیژنەی باڵای هەڵبژاردنو ئەوان لەو بەیانەی کەبڵاویان کردەوه لەسەر ئەنجامی هەڵبژاردنەکه هەموو شتێك ڕوون ئەکاتەوه. هەموو دۆکیومێنتەکانیش لەبەردەستدایەو ئەندامانی لیژنەکەش دان بەو ڕاستییەدا ئەنێن که نوێنەری هەموو حیزبەکانیشی تێدابوو.

هەڵبژاردن چەندە خۆشی بەدڵی خەڵکیدا ئەهێنا، ئەوەندەش تاڵی پێچێشت، هەر لە فرتو فێڵەکانی پارتیو گزی کردنەکانی تا ئەگاتە سیاسەتە چەوتەکانی تری ناو هۆڵی پەرلەمان.

دوای بڵاوکردنەوەی ئەنجامی هەڵبژاردنەکەو دەستنیشان کردنی ئەندامەکانی هەر لیستێك ڕۆژی ١٩٩٢/٦/٤ یەکەم دانیشتنی پەرلەمان لە شاری هەولێر ئەنجامدرا لە هەمان بینای ئەنجومەنی یاسادانانی کارتۆنیدا. بەپێی هەندێ ئیجرائاتی ئوسوڵی لە ڕێگەی خۆپاڵاوتنو دەنگدانەوە یەکەم سەرۆکی پەرلەمان بەرپارتی کەوتو جێگرەکەی بۆ یەکێتی، هەروەها سکرتێرەکەشی بۆ پارتی.

یەکەم دانیشتن گرنگییەکی مێژوویی هەبوو، یەکەمجارە نوێنەرانی پەرلەمانی کوردی لەووڵاتەکەی خۆیاندا دابنیشن، نوێنەرایەتی ئامانجی گەلەکەیان بکەن، بیر لە دواڕۆژی بکەنەوە، خەڵکی زۆر ئومێدیان بەو نوێنەرانە هەبوو بتوانن نەخشەی هەلومەرجێکی نوێ دابڕێژنو چوارچێوەیەك بۆ حوکمی کوردی دابنێن، دوور لە هەڵوێستی تەسکی حیزبایەتی بۆ کورد کاربکەن. دوای چەند کۆبوونەوەیەك پڕۆژەی پێکهێنانی حکومەتی هەرێمی کوردستان خرایە بەردەست، دوای مشتومڕێکی زۆر ڕۆژی ٧/٤ بڕیاری لەسەر دراو یەکەم کابینە بەسەرۆکایەتی د.فوئاد مەعسوم بوو، کە کابینەکە بریتی بوو لە ١٥وەزارەتو جێگرەکەشی پارتی بوو.

***پۆستەکانی ئەم کابینەیە بەم شێوەیە دابەشکرا:***

**٦وەزارەت بۆ یەکێتی**

**٦وەزارەت بۆ پارتی**

**١وەزارەت بۆ شیوعی**

**١وەزارەت بۆ ئاشوری**

**١وەزارەت بۆ بێلایەن**

هەروەزارەتێك‌وەزیرەكەی یەكێتی بوو جێگرەكەی پارتی بوو بە پێچەوانەشەوە هەروەزارەتێك‌وەزیرەكەی پارتی بوو جێگرەكەی یەكێتی بوو.

لەكۆبوونەوەكانی پەرلەماندا زۆر ڕاستی مێژوویی ڕوون بووەوە كە لە ڕۆژانی بانگەشەی هەڵبژاردندا خەڵكی هەستیان پێئەكرد، لەسەر زۆر شت جیاوازی بیرو بۆچوون هاتە ناوەوە، لەسەرووشەی حكومەت، هەرێم،وەزارەت، تەنانەت ناوو بەرنامەی هەندێ لەوەزارەتە حەساسەكان‌وەكو:وەزارەتی پێشمەرگە،وەزارەتی كاروباری مرۆڤایەتی‌و هاوكاری.

پارتی ئەترسان ناوی‌وەزارەتی بەرگری بهێنن چونكە بۆنی جیابوونەوەی لێ دێت، بەهەزار ناری عەلی لەسەر ناوی‌وەزارەتی پێشمەرگە پێكهاتن. پێیان ناخۆش بوو ناوی‌وەزارەتی دەرەوە بچەسپێ‌و لە ئەنجامدا ناویان ناوەزارەتی كاروباری مرۆڤایەتی‌و هاوكاری. هەرچەندە ناو گرنگ نییە، ناوەڕۆك بناغەیە ئەگەر مەبەست خزمەتی بەرنامەكە بێت. ئەیانویست لەبری‌وەزارەت ئەمانەتی گشتی دابنرێ، حكومەت هەندێ بەسەر دڵیانەوە قورس بوو.

تاپۆی ترس‌و بێئومێدی سەراپای دڵ‌و دەروونی تەنیبوون‌و لە دڵەڕاوكەدا بوون‌و نەیانئەویست ئەو تاڵە مووەی پەیوەندی لە نێوان خۆیان‌و بەغدادا بوو بپسێ. بۆیە هەرچی بیركردنەوەیان بوو لەو هەوارەوە سەری دەرئەهێنا.

ئەمە بۆ هەموو خەڵكی كوردستان ڕوون بووەوە، لەو لاشەوە یەكێتی لەسەر شتە مەبدەئییەكان پێی دائەگرت. تەواو بە پێچەوانەی پارتییەوە بوو بۆ مەبەستەكان ئەچوون، هەڵوێستەكان جێگەی ڕەزامەندی خەڵكی بوون، ئەندامانی فراكسیۆنی سەوز زۆر بەئازادانە ڕایەكانیان دەرئەبڕی، هەموو گفتوگۆكان لەسەر شاشەی تەلەفزیونەوە نەقڵ ئەكران، لاوازی هەڵوێست‌و بۆچوونی ئەندامانی فراكسیونی زەرد لای خەڵكی بەرجەستە بوو بوو، جۆرە ڕێزێك بۆ فراكسیۆنی سەوز پەیدا بوو بوو، ئەمەوایكرد كە سەرۆكی پەرلەمان

هەمیشە ڕێگە لە ئاشكرایی كۆبوونەوەكان بگرێ كە ڕێگەگرتن بوو لە ئازادی ڕادەربڕین. ئیتر ووردەوورده ململانێو ناكۆكییەكان خۆیان دەرخست، تیشك ئەكەوتە سەر شتە شاراوەكانی ناخو ئەوانەی لەپشتی پەردەوە هێلی بۆ ئەكێشرا. كە ڕێك لەگەڵ هەڵوێستی دوژمنانی كورددا ئەهاتەوە.

وەزعی حكومەتیش لەوەزارەتەكانو دامو دەزگاكانی خوارەوە لەوە باشتر نەبوو، بەڵكو سیاسەتی چەپەڵی٥٠ بە٥٠ بەشێوەیەكی زۆر خراپ دابەزییە خوارەوە، نەك هەر لە ئاستیوەزیرو جێگرەكاندا نەوەستا بەڵكو لەدانانی كارمەندو بەردەستەكانیشدا دەخالەتو بەشبەش ئەكرا. ئیتر هیچ بوارێك بۆ كەفائەتو شارەزایی نەما، بۆ هەركێشەیەكی چارەنووسسازو سیاسی ئەبوایە ڕای هەردوو مەكتەبی سیاسیوەربگیرایە، بەمەش زۆر لە روحی مەدەنیەتو دیموكراسی دوور كەوتینەوە، قۆرتی گەورە لە ڕێگادا قووت بووەوە. خەونەكانی خەڵكی پووچەڵ بوونەوە. پارتی بێ هۆ كۆسپی ئەخستەوە، درگی ئەچاند، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا بەپێ داگرتنی فراكسیۆنی سەوزو كاریگەرێتیان پەرلەمان بڕیارێكی بوێرانەی لەمەر فیدراڵییەتی هەرێمی كوردستاندا، كە ئەمە خۆی لەخۆیدا هەنگاوێكی گرنگ بوو، جۆری دەسەڵاتی هەرێمی دیاریكرد، ئەمە بەبەراورد لەگەڵ داخوازی حوكمیزاتی هەنگاوێكی پێشكەوتووتر بوو، بەڵام لە چاو داخوازی كورددا لە زەمانی شێخ مەحموودی نەمردا كە داوای دەوڵەتی كوردی ئەكرد زۆر بۆ دواوە چووین.

ئەگەرچی دەوڵەتە دراوسێكانمان ئەم بڕیارەیان پێناخۆش بوو، بە توندی دژیوەستان، چەند جارێك لە نێوان خۆیاندا كۆبوونەوە بۆ ئەوەی دژی ئەم هەلومەرجەی كوردستانی باشوور هەڵوێستێكوەربگرن، كەچی نێوانیان زۆر دوورتر بوو لەوەی بتوانن پێكبێن بەهۆی ئەو هەموو ناكۆكییە سیاسیانەی ناخیان ئەكرۆژێ. ئەگەرچی پەرلەمانو حكومەتی هەرێمی كوردستان لە ڕووی سیاسییەوە هیچ دەوڵەتێك بە ڕەسمی دانی پێدا نەنا، بەڵام بەناڕاستەوخۆ پشتیوانییەكی نێودەوڵەتییان بۆ پەیدابوو، بەتایبەتی ئەو پێشوازییە گەرمەی

لەوەفدی پەرلەمانی کوردستان لەووڵاتانی ئەوروپی کرا، هەروەها هاتوچۆی ڕێکخراوەکانی دەرەوە بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستانو بنیاتنانی ژێرخانی ئابووری کوردستان کە کەوتبووە ناو ئەڵقەی ئابلۆقەی ئابووری نێودەوڵەتیو عێراقیشەوە. بەمەش شەرعیەتێك بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان گەڵاڵە بوو لە ڕووی ئەو مامەڵەیەوە.

یەکێك لە دەستکەوتە گرنگو مێژووییەکانی پەرلەمانی کوردستان کە بایەخی سیاسی خۆی هەیە بڕیاری جاڕی فیدراڵی بوو بۆ کوردستانوەکو شێوازی دیاریکردنی پەیوەندی کورد لە گەڵ دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیدا گەرچی کورد خەباتی بۆ فیدراڵی نەکردووە بەڵکو ئەو خوێنەی بۆ دیاریکردنی مافی چارەنووس ڕشتووە بەڵام دیارە هەلومەرجە نێو دەوڵەتییەکان هێشتا لە بار نین بڕیاری سەربەخۆیی بدرێ. بۆیە پەرلەمانی کوردستانوەکو هەنگاوێك بۆ زیاتر دەستەبەر کردنی مافەکانی کە هەنگاوێك لە پێشترە لە ئۆتۆنۆمی ئەم بڕیارەیوەرگرت بەلاموەنەبێ فیدراڵی دوا مەکۆ بێتو ئیتر شێوازی حوکم گۆڕانی تیانەکرێ.

لە ناو ئۆپۆزسیۆنی عێراقدا لەم بارەیەوە دوو بۆچوون هەیە:

ـ عەلمانییەکان دژایەتی فیدراڵی ناکەن گەر چی هەندێك لایەنی شۆفێنیش هەیە دژی فیدراڵینو بە جیاوازخوازی لە قەڵەم ئەدەن.

ـ ئیسلامییەکان بە ئاشکرا دانی پیادا نانێن هەندێکیشیان ڕای تایبەتی خۆیان هەیەو فیدراڵیەت بە شێوازی سستمیوولایەتەکان ئەزانن.

بە هەر حاڵ جاڕدانی فیدراڵی خۆی لە خویدا هەنگاوێکی مێژوویی گرنگەو قۆناغێکە ئەتوانرێ بە پێی هەلومەرج بگۆڕێ. گەر ڕژێمێکی دیموکراسی پێشکەوتوو لە عێراقدا بێتە کایەوە لەوانەیە ڕێگر نەبێ کورد جۆری پەیوەندی خۆی بە دەسەڵاتەوە بڕیار بدات: فیدراڵی یان سەربەخۆیی.

# شەڕی پەکەکە

جێگەی داخە لەناوخۆی خۆمانەوە هەندێ هەڵوێستی لەرزۆکی هەندێ حیزبو لایەن بەچاوی گومانەوە لەم پەرلەمانو حکومەتەیان ئەڕوانی، بەڵام دەنگەکانیان ئەمەندە بەهێز نەبوو کار لەڕێڕەوی دۆخەکە بکاتو لە ڕاستەهێڵی خۆی لای بدات، کەچی ملۆزمێکی ترمان بۆ پەیدا بوو لەدەرەوەی هەرێمە ئازادەکەی خۆمان، کە ئەیویست ڕەوتی ڕووداوەکان بەرەو ئاقاری تێکدانو پشێوی ببات. پەکەکە لەبری ئەوەی سوود لەم هەلومەرجەی کوردستانی ئازاد کراووەربگرن، ئەم ئەزموونە بکەنە سەرمەشقی خەباتی خۆیان، لەتواناکانی کاری تێکۆشانی خەلکی ئێرە بەهرەمەند بن، کەچی بەشێوەیەکی ناواقیعیانە کەوتنە دژایەتیکردنو بڵاوکردنەوەی هەڕەشەو گوڕەشەی بێ جێو ڕێ بۆ لەبار بردنی ئەو دەستکەوتە مەزنەی گەلی کوردستانی باشوور کە بەخوێنی شەهیدو ئەنفالو کیمیابارانووێرانکردنی کوردستان هاتە بەرهەم.

پەکەکە هێزێکی چەکداری کوردستانی تورکیایە کە ساڵی ١٩٧٤ لە لایەن ئۆجەلانەوە کە خوێندکاری زانستی سیاسی زانکۆی ئەنقەرە بوو درووستکراوەکو ڕێکخستنێکی چەپی ستالینی هاتە ناوانەوە، بە بڕوای خۆیان داکۆکی لە کوردستانی گەورە ئەکەن. دوای ئەوەی لە لایەن تورکیاوە ڕاوەدوونران ساڵی ١٩٨٤ دێنە کوردستانی عێراقو چالاکی دژی سوپای تورک ئەنجام ئەدەن. ئەمانەوەکو میوان بچنە هەربەشێکی کوردستانەوە ڕێزێیان لێ ئەگیرێ بەڵام خۆیان بە کوێخا دائەنێن نەك بە میوان هەروەکو هەڤاڵ مام جەلال دەربارەیان ئەڵێ: ( خۆی لێکردوین بە حوکمڕان، بێ پرسو بێ گوێدانو بایەخدان بۆ ئەو ڕووداوو دەستکەوتانە، خۆی کردووە بە میر محێو قبوڵ ناکەن مەسەلەی بونیان لە کوردستان ڕاوێژی لە سەر بکرێ ).

نـەك هـەر ئەمـە بـەڵكو هـەموو حيزبـە كوردسـتانييەكان بـە خـائينو هـەموو سـەركردەكانى كـورد بـە جاسـوسو نۆكـەرو جاشو كرێگرتـەو بێگانـە ئەزانن، بە تەنيا كوردستان بە ماڵى گەورەى خۆيان دائەنێن و هەوڵيان داوە لە هـەموو پارچـەكاندا ڕێكخسـتنيان هـەبێ، گەرچـى بڕوايان‌وايـە دۆزى كـورد لـە كوردسـتانى بـاكوورەوە دەسـت پێئـەكات بـەڵام كوردسـتانى باشـووريش بـە قووڵاييـيـەكى سـتراتيژى كـارى پێشـمەرگانەى خۆيـان ئـەزانن‌و سـوود لـە هەلومـەرجى ئێرەش‌وەرئـەگرن بـە تايبـەتى كـە گوشارى سـەربازى توركيايـان بكەوێتە سەر.

لـە ڕاستيشدا ئەمـە سنور بەزانـدنـەو خـۆ بـە خـاوەن ماڵزانينـەو ئـەم كردەيـە دوورە لـە هەرچـى نـەريتى نێـو دەوڵـەتى هەيـە، ئەمـە سەريەشـە بـۆ حكومەتى هەرێمى كوردستان درووست ئەكات‌و بيانوويش ئەداتە دەست ڕژێمى ميليتاريستى توركيا بۆ هاتن‌و دەستێوەردانى سەربازى فراوان لـە نـاو هەرێمدا. هەرچـەند ئـەمكارەى پەكەكـە هـەر بەوەنـدەوە ڕاناوەستێ لـەوە زياتر بـير بـۆ مەبەستى شاراوەى ترى چوارچێوەى پيلانـە نگريسەكانى دەوڵەتە ئيقليمييـەكان ئەچێ. پەكەكەش هێزێكى فريشتەيى نييە لە ئاسمانەوە هاتبێ‌و گوناهى نـەبێ، بـەڵكو هـەڵقوڵاوى نـاو هـەناوى‌واقعى كوردەوارييـەو لـە چوارچـێوەى بەشـێكى داگيركراوى كوردستاندا پەيدا بووەو لە ناو جەنجاڵى گرفتەكانى كوردو دەوڵەتە داگيركەرەكانـدا ياريـيـەكى پـڕ لـە ئـاڵۆزى ئـەكات، لـەو جـۆرە سەرچـڵييانەدا بێگومانم كە سەربەخۆيى سياسى بۆ خۆى مسۆگەر كردبێ‌و دوور بێ لە سازشى پشتى پـەردەى دەزگـا هـەواڵگريـيەكـانى دەوڵەتانى ئيقليمى.

پەكەكـە بەرنامەيـەكى ئاڵۆزيـان داڕشـتووەو لـەم هولومەرجـە نێـو دەوڵەتييـە نوێيـەدا دەستيان گرتووەتـە ئەڵقـەى كـارێكى دژوارەوە كـە تاوانبـار بكـرێن بـە تيرۆريست كـە كـارى زۆرى لـە ناوبـانگى كـورد كـردووە لـە دەرەوەى كوردستاندا. جگە لەمـە لـە هونـەرى شەڕيشـدا سـەرەڕاى ئـەو خەڵكـە دڵسۆزەى خۆيـان بـەخت ئەكـەن شـارەزاييەكى زانستيانەيان تێيدا نييـە، تـەنيا لـە ڕووى

دیسـپلینی حیزبییـەوە توندو تـۆڵن‌و لـە نـاو بۆتـەی ڕێکخسـتنێکی تۆکمـەی ئۆجەلان پەرستیدا تواونەتەوە.

دیارە کـە خۆیـان بـە کەڵـەگای کـورد ئەزانن‌وەنـەبێ تـەنیا هـەر پشـت بـەکوردو شـاخەکانی ببەسـتن لەگـەڵ ڕژێمـە داگیرکـەرەکانی بـە شـەکانی تـری کوردستاندا دەسـت تێکـەڵ نەکـەن، بـەڵکو هاوکارییـەکی تونـدوتۆڵیان هەیـە لـە گـەڵیانا، نوێنـەرو بارەگایـان لەووڵاتانـەدا هەیـە بگـرە زۆر جـاریش ئـەو دەوڵەتانەوەکو کارت بە کاریان دێنن چ بۆ گرفتەکانی ناوخۆی خۆیان یان بۆ بە گژاکردنی لایەنەکانی تری کوردی ئەو بەشەکان.

ئـەو جموجـووڵانەی پەکەکـە زۆر جـار لایەنەکـانی کوردسـتانی باشـوری نیگـەران کـردووە بـەڵام قـەت بـە قـەدەر ئـەوە نـەبووە ئاژاوەیـان بـۆ حکومەتی هـەرێمی کوردستانی تـازە دروستبوو ناوەتـەوە. گـەر چـی چـەندین جار گفتوگۆیان لەگەڵا کراوە کەواز لـە سیاسـەتی منالْبازاریانـەیان بێـنن‌و هەڵـە نەکەن کەچی سوودی نەبووە،وەکو بڵێی لە کارەکانیاندا بـە فیتـی دەرەوە ئەمـە ئەکەن.

کە دوا کاریان لە ڕۆژی ۱۹۹۲/٦/۲٦ دا کۆمەڵێکیان ( لە ڕێکخستنەکانیان) خۆپیشاندانێکیان لە هەولێردا سازکردو گوایـە بـۆ نـاڕەزایی دەربـڕین بەرامبـەر بەو تاوانەی ڕژێمی تورکیـا ئەنجامیـداوە بـۆ لـەناو بردنـی ژن‌و منـاڵی کـورد لـە شـەڕناخ‌و داوای مسـۆگەر کردنـی پاراسـتنی پێویستیان ئـەکرد بۆیـان، جـارێ پەکەکە بۆ ئـەم خۆپیشـاندانە پرسیان بـە حکومـەتی هـەرێم نـەکردبوو ئینجا حکومەتی هەرێمیش لەگەڵ ڕژێمی تورکیادا هیچی پێناکرێ، ئەبوایە یان لە ناو تورکیا ئەمەیان بکردایە یان لە ئەوروپا بواری زیاتر بۆ ئەم کارانە لە بەردەمـدا بوو.

ئەم خۆپیشاندانە جگـە لـە گێرەشـێوێنی هیچی تـر نـەبوو، خەڵکـەکانی سووری‌و تورکی‌و هەندێکیشیا کورد بوون تەنانـەت عـەزیز ئـاکرێیش بەشـداری کردبـوو. ئـەنجامی پێکـا هەڵپـژانی خۆپیشـاندەران‌و پۆلیسـی حکومـەتی هـەرێم کۆمـەڵێك خۆپیشـاندەر کـە ژمارەیـان گەیشـتبووە ۲۳ کـەس گیرابـوون‌و چـەند

پۆلیس و هاوولاتییەکیش ئەکوژرێن. بە پێی هەندێ زانیاری ئەمانە لە لایەن دەزگای سیخوڕی دەوڵەتانی ناوچەکەکە دژی ئەزمونی حوکمڕانی و دیموکراسی لە کوردستاندا هاندراون ئاژاوە بنێنەوە.

لە ئەنجامی سەرکێشییەکانی پەکەکە حکومەتی تورکیا ڕێگای هاتووچۆی لە خاپوورەوە گرت وهەموو شتێك وەستا ئەمە زیانی زۆری بە هەرێم گەیاند بە تایبەتی لە ڕووی ئابورییەوە کە هەم کەلوپەل و پێداویستییەکانی ژیانی خەلکی دێتە ناوەوەو هەم باجێکی زۆری گومرگی لێ چنگ ئەکەوت کە بڕبڕەی پشتی ئابوری کوردستان بوو.

بۆیە ئەبوایە ڕێگە لەو سەرچڵیانەی پەکەکە بگیرێ و مەترسی لە سەر حکومەتی هەرێم کەمتر بکرێتەوەو کوردستان نەبێتە ناوچەی شەڕو پەلاماری هێزی دەرەکی و پەلپ و بیانووەکانی تورکیاش ڕەتبکرێتەوە کە لایەنەکانی کورد ناچار ئەکات دژی پەکەکە بن و پەکەکەش ناژیرانە هەڵسوکەوتی ئەکردو ملی نەئەدا.

بۆیە پەرلەمانی کوردستان لە دانیشتنی ڕۆژی ١٩٩٢/١٠/١ دا ئاگاداری پەکەکەی کردەوە کە لە ماوەی ٤٨ کاتژمێردا چالاکییە سەربازییەکانی ڕابگرێت و بنکەکانی لە کوردستانی عێراقدا دابخات و ئیلتیزام بە بڕیارەکانەوە بکات. حکومەتی هەرێمیش لەم بارەیەوە بەیاننامەیەکی دەرکردو داوای لە پەکەکە کرد ناوچە سنورییەکان بە جێ بهێڵێ و بگەڕێتەوە ناو سنوری چالاکی خۆیان یان بێتە ناو کوردستانی ئازادەودو بە پێی بەرنامەی حکومەتی هەرێمی کوردستان ڕەفتار بکات.

بەلام پەکەکە خۆیان تێنەگەیاند بۆیە بڕیاردرا تەمبێ بکرێن، ئەو کاتانە من فەرماندەی هێزی ٦ ی کەرکوك بووم، خۆم بە مەغدور ئەزانی لەو شوێنەدا بمەو خەلکی تریش بە پەیژەی دەسەلاتا هەلژنێن، سەردانێکی هەڤاڵ مام جەلالم کردو لە میانەی دەمەتەقێ کردندا پێم ووت: ئەو شوێن و لێپرسراوێتییەم پێ کەمەو داوا ئەکەم مافی خۆمم بدرێتێ کە بە خەلکی تر ڕەوا بینراوە. هەڤاڵ مام جەلال دوای تاوتوێکردنی ئەو مەسەلەیە بڕیاری دا بکرێمە جێگری

لەشکری یەك کە کاك جەبار فەرمان لێپرسراوی بوو هەڤاڵان شێخ جەعفەرو عوسمانی حاجی مەحمودیش جێگری بوون. ئەو کاتە تەشکیلاتی پێشمەرگەی یەکێتی بەمجۆرە بوو: لەشکر - بەتالیۆن - هێز - تیپ - کەرت، کوردستانیش کرابووە ٣ لەشکرەوە:

١. لەشکری یەك: لەزێی دووکان بەمبەرەوە هەموو ناوچەکانی سلێمانی - کەرکوك - گەرمیان - شارەزووری گرتبووەوە.

٢. لەشکری دوو: لە نێوان هەردوو زێی گەورەو بچووکدا هەموو ناوچەکانی هەولێر - ڕاپەڕینی لە خۆگرتبوو.

٣. لەشکری سێ: لە زێی گەورەوە هەموو ناوچەکانی بادینانی گرتبووەوە.

کە هەموو تەقەلاکان لەگەڵ یەکەکەدا بێسوود بوو حکومەتی هەرێم هێزەکانی خۆی ڕەوانەی بەرەکانی ڕووبەڕوو بوونەوە لە خواکورك و بادینان کرد کە ئەوان لەو دوو شوێنە هەبوون. بڕیاردرا لە هەردوو قۆڵەکەوە بە هاوبەشی هێزەکانی یەکێتی و پارتی پێکەوە پەلامار بدەن. لە قۆڵی خواکورکەوە هێزەکان لە لایەن کاك کۆسرەتەوە سەرپەرشتی ئەکراو کاك مستەفا چاوڕەش و هەندێ هەڤاڵی تری لەگەڵا بوو نوێنەری پارتیش حەمید ئەفەندی بوو. لە قۆڵی بادینانیشەوە هێزەکان لە لایەن فازیل مەتنییەوە سەرپەرشتی ئەکراو نوێنەری یەکێتی کاك حەسەن کوێستانی بوو.

بەشێکی هێزەکانی لە شکری یەك بە سەرپەرشتی کاك عوسمانی حاجی مەحمود بەرەو خواکورك ڕۆیشتبوون. بەشەکەی تریشی من سەرپەرشتیم ئەکرد.

هێزەکان لە بەرەکاندا ئامادەو سازی دەستبەکاربوون بوون بەڵام پێش دەستبەکاربونی شەڕەکە هەڤاڵان: حامی حاجی غالی، مام ڕۆستەم، حەمەئەمین پێنجوێنی نێردرانە لای یەکەکە لەگەڵ هەندێ لە سەرانی یەکەکە دا کۆبوونەوە، باسی بارودۆخەکە کرابوو داواشیان لێکرابوو:

- شەڕ نەکرێ

- یەکەکەش بکشێتەوە.

لەوە ئەچوو یەکەکە خۆیان بۆ شەڕ لە بۆسە نابێ،وەلامێکی ڕێکوپێکیان نەدابووەوەوەفدەکەش گەڕابووەوەو ئەنجامێکی ئەوتۆیان نەهێنابووەوە. شەڕ بووە ئەمری‌واقیع‌و ئیتر ئەبوو ڕێگە نەدرێ بە کامی دڵی ئەوان بێ.

یەکەم پەلامار بۆ گرتنی شاخی خواکورك لە لایەن هەردوو هێزی گەرمیان‌و هێزی خانەقینەوە بوو کە ۷ ڕەبایە بۆ گەرمیان‌و ۱ ڕەبایە بۆ خانەقین دانرابوو، کاتژمێر ٤ ی بەیانی بۆ پەلاماردان دەسنیشان کرابوو، کە پەلاماردران لە کاتی دیاریکراودا لە ماوەی ۲ چارەکدا هەموو شوێنەکان کۆنترۆڵکران، تاکو بەیانی ڕۆژی داهاتوو یەکەکە چەندین پەلاماریان داو شکستیان ئەهێنا.

ئەو شوێنەی گەرمیانییەکان گرتیان زۆر سەخت‌و ستراتیژی بوو بە سەر بارەگای سەرکردایەتی یەکەکەدا ئەیڕوانی. کە شەڕەکان سەخت‌و توندتر بوو برادەران داوای هێزەکەی تری لەشکری یەکیان کرد.منیش هەموو هێزەکەم کۆکردەوە کە زۆربەیان شارەزووریەکان بوون‌و بەشێکی گەرمیانیش، لە سلێمانییەوە بەرێ کەوتین بۆ ئێوارەکەی گەیشتینە سیدەکان لەوێشەوە بێ پشوو یەکسەر بۆ سەر شاخی خواکورك، لە ڕێگای سەرکەوتنماندا کەوتینە ناو کێڵگەی مینەوە کە یەکەکە چاندبوویان هەندێکیان تەقینەوەو چەند پێشمەرگەیەك لە دەستەکەی خۆم برینداربوون‌و شەهیدێکیشمان دا بەڵام هەرنەوەستاین تا شەو گەیشتینە لای کاك عوسمان.

دوای پشوویەك بە کاك عوسمانم‌ووت: ئێمە بەم هێزەوە کە تازە پشووین هێرشێکیان بۆ ئەکەین بەڵکو هەندێ شوێنیان لێ بسێنینەوە. لەو کاتانەدا خەلیلی کوێخا یاخی ٤ چەکداری یەکەکەی هێنا کە بە دیلی گرتبوویان. کاك عوسمان‌ووتی: یەکەکە پەیوەندییان کردووە گفتوگۆیان لەگەڵا بکەین منیش‌ووتم: من مەبەستم لەو هێرشە بەهێزبوونی هەڵوێستمانە.

لەو کاتانەدا کە قسەمان ئەکرد فەرهاد ئۆجەلان بە جیهاز پەیوەندی کرد لەگەڵ کاك عوسماندا ووتی: ئەمانەوێ لەگەڵتانا دانیشین، کاك

عوسمانوەڵامی دایەوە: ئێمە لەگەڵ کاك کۆسرەت قسە ئەکەینو دواییوەڵامتان ئەدەینەوە.

ئیتر ئێمە کەوتینە هەوڵی جێبەجێکردنی بەرنامەی پەلاماردانەکەمان بەو هێزەی شارەزوور کە کاك حەمەی حەمە سەعید سەرپەرشتی ئەکردو ئەم فەرماندانەشی لەگەڵا بوو: عەزیز کولکنی، عومەر کولکنی، کەیکاوس.

بە پێی نەخشەیەك هێرشێکی کوتوپڕمان لە یەك قۆڵەوە کردە سەریان بە داخەوە بەهۆی نەشارەزاییو سۆسە نەکردنو تەماشانەکردنی جێگاکە بە ڕۆژ سەرکەوتنمان بە دەست نەهێنا، پەکەکە هەموو لە سەنگەردا خۆیان مەڵاس دابوو کە چووینە سەریان بە نارنجۆك بەرپەرچیان داینەوەو لەوێدا کەیکاوسی فەرماندەی لێهاتووو چاپوك شەهید بوو، چەند پێشمەرگەیەکیشمان بریندارببوو. لە کاتی شەڕەکەداو کاتژمێر ٦ ی بەیانی کاك کۆسرەت بە جیهاز پێیووتین: خۆتان ڕابگرن پەکەکە لە شکستدایەو داوای گفتوگۆئەکەن. شەڕ گەرم بوو تاکو کاتژمێر ١٠ سەرلەبەیانی، پاشان شەڕەکە بە هۆی پاشەکشەی ئێمەوە ڕاوەستا، لەو جێگایانەی ڕۆژی پێشووتر لێیان گیرابوو ماینەوە گفتوگۆ لە نێوان هەردوولادا دەستی پێکرد کە پەکەکە ڕۆژی ١٩٩٢/١٠/٢٦ داوای ئاگر بڕیان کردبوو. بۆ ئەوەی کارەکانی گفتوگۆ بچێت بەڕێوە پەکەکە داوایان کردبوو چەند کەسێك لە ئێمەوەکو بارمتە بچنە لایان تاکو فەرهاد ئۆجەلان بەرێ بکەوێت بۆ بینینی هەڤاڵانمان، ئینجا م. بەکرو عوسمانی قالە منەوەروەکو بارمتە نێردران تاکو فەرهاد ئۆجەلان بێتە لای کاك کۆسرەت بۆ گفتوگۆو گەڕانەوەشی بۆ شوێنی خۆی. لە هەمان کاتدا ئێمە برادەران نەبەرد کەلاریو سەلام شووشەمان لەگەڵیانا ناردوەکو ٢ فەرماندەی سەربازی بۆ بینینی شوێنو جێگاکانیانو کۆکردنەوەی هەندێ زانیاریوورد لە سەریان بۆ قۆناغی ئاییندە، ئەوانوا چووبوون بۆ ئێوارەکەی بگەڕێنەوە بەڵام پێیان زانیبوون کە ئەمانە فەرماندەی سەربازینو گومانیان لێکردبوون بۆیە ئەوانیشیان گل دابووەوەو نەیانهێشتبوو بگەڕێنەوە بۆ ماوەی ٤ ـ ٥ ڕۆژ مانەوە.

فەرهاد ئۆجەلان هاتە لای کاك کۆسرەتو برادەران پێکەوە بەرەو هەولێر ڕۆیشتنو چوونە لای هەڤاڵ مام جەلالو لە دوای گفتوگۆو هەڵسەنگاندنی هەلومەرجەکە لە سەر شەڕ ڕاوەستانو چالاکی ڕاگرتنو گواستنەوەی هێزەکانیان بۆ ناوچەی پشدەر لە ناوزەنگو توژەڵەو مامەندە ڕێککەوتن.

لە کاتی ڕێککەوتنەکەدا منو کاك ئاواتی شێخ جەناب لەگەڵ لێپرسراوێکی سەربازییانداوەکو سەرکردایەتی مەیدانی لێدوانی زۆرمان کرد لە سەر کوردو شۆڕشو سەرکردایەتی کردنو پەیوەندی ناوخۆییو دەرەوەی کورد.ئەوان مێشكووشکانە شتەکانیان هەڵئەهێنجان، ئێمەیان لە لیستی ئیمپریالیزمدا دائەنا، ئێمەش پێکەنینمان بەو جۆرە قسە عەنتیکانەیان ئەهات کە سەردەمی بەسەر چووبوو، کاتی خۆیشی ئێمە لەو بابەتە قسانەمان ئەکرد تا ڕۆژگار سەلماندی ئەوە ئاسنی سارد کوتانەو تێنەگەیشتنە لە مەبەستە سیاسیو فیکرییەکانی ئەم زەمانەو باش مامەڵە نەکردن لەگەڵیاندا کە دوامان ئەخاو قازانجێکی ئەوتۆی لێناکەین.

لەم شەڕانەدا پەکەکە خەڵکێکی زۆریان لێکوژراو برینداریشیان هەبوو کە بەقسەی ئۆجەلان ١٠٠ ـ ١٥٠ کەسیان تیاچوو بوو. لای ئێمەوە تەرمیان لە مەیدانی شەڕەکەدا لە بەردەستدا بوو یەکێکیان کچ بوو ئێمەش ئەم شەهیدانەمان دابوو: کەیکاوس، ئازاد سەید قادر، تۆفیق قەرەداخی، سەعید مەحمود عەبدوڵڵا، نوری مەسۆیی. برینداریکی زۆریشمان هەبوو. لە دواییدا بڕیارماندا تەرمەکانیان بدەینەوە، ئەوان ئەوەندە پەرۆشی دانەوەی تەرمەکان نەبوون بیبەنەوەو مەراسیمی تایبەتیان بۆ بکەن، بەڵکو هەر چاڵی بچووکیان بۆ هەڵئەکەندنو ئەیانشاردنەوە کە هەندێ چەکداریان هاتنو ١٦ تەرمەکەیان تەسلیم کرایەوەو چاڵیان بۆ هەڵکەندنو ناشتیان.

لە دوای ڕاوەستانی شەڕەکە فڕۆکەی تورکیا هاتە سەر ناوچەکەو بە سەر سەرمانەوە ئەسووڕانەوە بەلام تەقەیان نەئەکرد.لە ناخمدا زۆرم

پێناخۆشبوو ئەو فڕۆکانە ئەسووڕانەوەو بە برادەرانەوەوت گەر تەقەیان کرد ئێوەش دەستیان لێبکەنەوە هەرچەندە بەراوورد لە نێوان ئێمەو تورکیادا لە ڕووی چەکسازییەوە نەئەکرا بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە، کە لەم شەڕەدا تورکیا هێزی نەهێنا بوو.

هەرکە شەڕەکە لە سەر پەکەکە گەرم بوو بوو ئەوان خۆیان سووک ئەکردەوەو بەرەو ناوەوەی سنوری تورکیا ئەڕۆیشتن ، تورکیاش هیچ هەڵوێستێکی نەئەنواد بەرامبەریان. دوای ڕێککەوتنی پەکەکەو حکومەتی هەرێم لە سەر دڵنیایی (ی.ن.ك) هێزەکانیان بە سواری ئۆتۆمبیل بەرەو پشدەر ڕەوانە کران‌و لەوێ نیشتەجێبوون.

هێزی سەرەکی ئەم قۆڵە یەکێتی بوو، پارتی هێزێکی کەمیان هێنا بوو بۆیە ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نەبوو، لە قۆڵی بادینانیشەوە هێزەکانی پارتی‌و یەکێتی پێکەوە بوون، لە ناوچەی ڕێدارو هیزۆپ بەرەو باتوفە پەلامار دەستی پیکردبوو شەڕەکە زۆر سەخت بوو ماوەی ٢٠ ڕۆژی خایاند، لە ئەنجامدا ٣٥٠ چەکداری پەکەکە خۆیان دا بە دەستەوەو لە ڕێگەی کاك حەسەن کوێستانییەوە بۆ قەڵای سوسێ بە چەکەکانیانەوە گوێزرانەوە. بە پێی هەندێ زانیاری٦٠ پارتی کوژرابوون‌و ٤ یەکێتیش. لەم قۆڵەوە فڕۆکە جەنگییەکانی تورکیا جگە لە هەلیکۆپتەر لە هێزەکانی پەکەکەیان دابوو. کە هێزەکانیانمان بەرەو پشدەر گواستەوە تورکیا داوای تەسلیم کردنەوەیانی کرد بەڵام یەکێتی قایل نەبوو، تەنانەت بریندارەکانیشیان بۆ تیمارکردن نێردرانە نەخۆشخانەی سلێمانی.

لە ڕاستیدا پەکەکە لە ئاڵۆزکردنی بارودۆخی هەرێمدا تاوانبار بوون، ئەیانویست ئەو هەلە مێژووییە لە دەست کورد بدەن کە بە کامی دڵی دەوڵەتە ئیقلیمییەکان بوو. ئەمەش هێزێکی شۆڕشگێڕ نایکات بەڵکو هێزێکی کرێگرتە لە ناو پیلانە ڕەشەکانی دوژمناندا چینە بکات بەم ئەرکە ناکەس بەچەیە هەڵئەسێت. ئەم شەڕ پێفرۆشتن‌و کەڵەگایی کردنە بەڵگەی پەرۆشی سیاسی بۆ چارەنووسی کوردستانی گەورە نییە، پێویستیش بە لێکدانەوە ناکات بەڵکو

هەموو تاڵە دەزووەکانی بەرنامەی پەکەکە بە ڕوونی دەرئەکەوێ کە تەنیا دژایەتیکردنی حکومەتی هەرێمی کوردستانە.

ئەوەتا فیدراسیۆنی کۆمەڵە کوردستانییەکان لە سوید لە بانەگەوازێکیاندا ڕۆژی ١٩٩٢/١٠/١٧ پشتگیری پرۆسێسی دامەزراندنی دەوڵەتی فیدراڵی کورد لە باشووری کوردستان ئەکات، داواش ئەکات کە شەڕی نێوان هێزەکانی حکومەتی فیدراڵی باشووری کوردستانو پەکەکە ڕابوەستێ، کێشەکە ئاشتیانەو لە ڕێگای گفتوگۆوە چارەسەربکرێ، چونکە پەیدابونی کێشەی ئەوتۆ لە بەرژەوەندی گەلی کورددا نییەو بەڵکو دوژمنانی کورد دڵخۆش ئەکات. فیدراسیۆن داوا لە پەکەکە ئەکاتوەکو هێزێکی کوردیو نیشتمانپەروەرانی کوردستان پشتگیری دەوڵەتی فیدراڵی باشووری کوردستان بکاتو پەرلەمانی نەتەوەییو حکومەتی فیدراڵی باشووری کوردستانوەك دەسەڵاتێکی سیاسیو ڕەواو هەڵبژێردراوی ئەم بەشەیووڵاتی ئێمە بناسێ.

## یاسای ڕێزلێنانی پێشمەرگە

وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە یەکێکە لەوەزارەتەکانی کابینەی یەکەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ ئەم پۆستەش بەر فراکسیۆنی سەوز کەوت کە بەڕێز لیوا کەمال موفتی ئەرکی ئەموەزارەتەی پێ سپێردرا، بەڕێزیان یەکەم ئەفسەری سوپای عێراق بووە بووەتە پێشمەرگەی شۆڕشی کوردستان. کە نەك تەنیاوەکو فەرماندەیەکی خاوەن بڕوانامەی سەربازی بەڵکووەکو پێشمەرگەیەکی دێرینی شۆڕش ڕۆڵێکی باڵای لە ژیانی کوردایەتیدا بینیوەو ئەزموونێکی دەوڵەمەندی لا کۆبووەتەوە کەوەکو شارەزایەك بتوانێ کارەکانیوەزارەتی کاروباری پێشمەرگە بە ئەنجام بگەیەنێ.

هەموو خەڵکی کوردستان چاوەڕوانی ئەوە بوون ئەموەزارەتە سوپایەکی یەکگرتووی هاوچەرخ دابمەزرێنێ بۆ پاراستنی ئاسایشی هەرێمی کوردستانو چەسپاندنی دەسەڵاتی یاساو پارێزگاری کردن لە گەلی کوردستانو خاکەکەیو نەهێشتنی دیاردەی دزێویو فرە ملیشیایی چەکداری کە لە ڕۆژی ١٩٩٢/٨/١ دا

پەرلـەمانی کوردستان بڕیـاری هەڵوەشـانەوەی میلیشـیاکانو کۆکردنـەوەیان لـە سوپایەکی نیزامیدا دەرکردو لە هەمان کاتدا ڕێـز لێنـان لـە ڕۆڵی قارەمانانـەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لـە ڕێـڕەوی خـەباتی کوردایەتیـدا بـە تایبـەت لـە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ دا.

ئــەوەبوو لــە دانیشــتنی ڕۆژی ١٩٩٢/٩/٢٢ ی پەرلــەمانی کوردســتاندا یاسایوەزارەتی کاروبـاری پێشـمەرگە خرایـە بەرنامـەی کـارەوە. دوای گفتوگـۆو مشــتو مڕێکــی زۆر لــە لایــەن ئەنــدامانی پەرلــەمانو لیژنــەی کاروبــاری پێشمەرگەوە لە دانیشتنی ڕۆژی ١٩٩٢/٩/٢٩ دا دەنگی لەسەر درا.

لەگـەڵ ئـەو هـەموو ناسـازییەدا کـە هـەبوو پەرلـەمانی کوردسـتان لـە دانیشـتنی ڕۆژی ١٩٩٢/١١/٤ دا یاسایەکی بـۆ ڕێزلێنـانی پێشـمەرگە دەرکـرد، ئـەم یاسایە بایەخی لە چەند ڕوویەکەوە هەیە کە:

١. ڕێزلێنانــە لــە خــەباتــی ئـەو مرۆڤانــەی خۆیـان لـە پێنـاوی چارەنووسـی گەلەکەیاندا تەرخان کردووە.

٢. ئەوبڕگانەی لــە یاسـاکەدا هاتووە زۆر باشە چ لە ڕووی حیساب کردنی ڕاژەو خانەنشین کردنو چ لە ڕووی بەخشینی مەدالیای تایبەتی.

٣. ئەم یاسـایە ڕۆڵی ژنی لە بەر چاو گرتـووەو هـەمان ئـەو بەخششـانەیان بـەر ئەکەوێ.

بـە داخـەوە ئـەم یاسـایەوەکو خـۆی مایـەوەو جێبـەجێ نـەکرا بـە هـۆی ئاڵۆزیو ناکۆکییەکانی نێوان هەردوو لایەنەکـەو هەڵگیرسانی شـەڕی نـاوخۆش کە پـارتی هـەمیشە هەڵوێستی توندو نەسازانی هەڵبژاردووە.

لــە دوای درووســتکردنیوەزارەتی پێشـمەرگە کــە ئەبوایــە ڕۆژێـك بـۆ پێشمەرگە دیاری بکرایە کەچی ئێمە هـەر پابەنـدی ڕۆژی سوپای عێـراقین کـە لە ڕۆژی ١/٦ ی هەموو ساڵێکدا یادی ئەکرێتـەوەو ئـەو ڕۆژە بـە پشـوو دانـراوە. ئەم سوپایە هەمیشە سـوپایەکی سـەرکوتکەر بـووە چ لـە زەمـانی پاشایەتی یان سەردەمی کۆماری یان لە زەمەنی ڕەشی بەعسدا کەوەکو داردەستێك بـە دەست دەسەڵاتەوە بووە بە تایبەتی بەعس بە بەرنامەیەکی توندو تۆڵ سوپای کـردە

بنکەیەکی بنەڕەتی حیزب کە تەنیا بەعس بۆی هەبوو لە ڕیزی سوپادا ڕێکخستنی هەبێ هیچ لایەنێکی تر قوورەتی ئەوەی نەبوو هەر بیریشی لێبکاتەوە.

گەرچی بەشێکی ئەم سوپایە بە ئەفسەرو سەرکردەو سەربازەکانیەوە کورد بوون بۆ لێدانی کوردو کوشتنی خەڵکەکەی وویرانکردنی شارو لادێی کوردستان بە کار هێنراوە.

بۆیە ئەم سوپایەوەکو دەزگایەکی تۆقێنەر ڕۆڵی خۆی بینیوە نەک وەک سوپایەکی میللەتپارێز، حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراقیش هەرچی شەڕی نارەوا هەیە بەم سوپایە ئەنجامیان داوە کە لەو ڕۆژەوە درووستکراوە ڕۆژێك ئاسوودەیی بە خۆیەوە نەدیوە هەمیشە لە باری ناسایی و ڕەشبگیریدا بووە.

کۆتایی مانگی ١٩٩٢/١٢ بوو لە ڕوداوێکی تازەی یەکگرتنەوە لەگەڵ یەکێتیدا بەشێکی حیزبی سۆسیالیستی کوردستان بە سەرۆکایەتی کاك ڕەسوڵ مامەندی سکرتێرو هەندێك لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی پەیوەندییان بە (ی.ن.ك)ەوە کرد.

دیارە ئەمە لە ئەنجامی قسەو گفتوگۆی درێژخایەن بووە تا ئەو بڕیاری یەکگرتنەوەیە بدرێ کە کاك ڕەسوڵ ببێ بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی و هەڤاڵەکانی تریشی هەندێکیان ببنە سەرکردایەتی و کادیرەکانیشیان لە دامودەزگاکانی تری ئیداری و حیزبی و پێشمەرگایەتیدا جێیان بکرێتەوە.

بەرەی کوردستانی بەهەموو لایەنەکانیەوە کۆبوونەوەیان کرد بۆ یەکخستنی هێزی پێشمەرگە، یەکێتی و پارتیش بە تایبەتی بۆ هەمان مەبەست دائەنیشتن.

ئێمەش وەکو یەکێتی کۆبوونەوەمان کرد بۆ ئیلتزام کردن بە سوپای یەکگرتووی کوردستانەوە دوای ئەوە لەلایەن وەزارەتی پێشمەرگەوە قیادەی مەنتیقەکانی: سلێمانی، هەولێر، کەرکوك، بادینان دامەزرا.

# ساڵی ١٩٩٣

# قیادەی مەنتیقەکان

پۆستی قیادەی مەنتیقەی سلێمانی بەر پارتی کەوتو دەروێش ئاغا لێپرسراوی بوووە منیش لە لایەن یەکێتی بە جێگری قیادەی مەنتیقە دانرام.

لە مانگی ١٩٩٣/٣ دا هەموو لیواکانی قیادەی مەنتیقەی سلێمانی پێکهێنرا بەم شێوەیە:

- لیوای ٢ی شارەزوور لە سەراوی سوبحان ئاغا
- لیوای ٢١ ی شارباژێر لە چوارتا
- لیوای ٢٢ ی دووکان لە سووسێ
- لیوای ٢٣ ی بێتوین لە ڕانیە

دیارە دوو لیوای دووکانو بتوێن بەر یەکێتیو دوو لیوای شارەزوورو شارباژێر بەر پارتی کەوتن. پێکهاتەی هەر لیوایەکیش:

- لیوایەك: ٣ فەوج + یەك فەوجی دیفاعوواجبات
- هەر فەوجێکیش:٣ سریە + یەك سریەی دیفاعوواجبات
- هەر سریەیەکیش: ٣ حەزیرە + یەك حەزیرەی دیفاعوواجبات
- هەموو بەشەکانیش هەیئەیان هەبووەکو:
- هەیئەی قیادەی مەنتیقە
- هەیئەی لیوا
- هەیئەی فەوج
- هەیئەی قیادەیش بریتی بوو لە:

- ئیداره
- هەوالگری
- پشکنین
- جوولان
- فەوجی دیفاعوواجبات

بۆ هەموو شوێنەکان کادیری پێشمەرگایەتی چالاكو خاوەن تواناو ئەزموونی باش دیاری کران.

دیاره دیاردەی ٥٠ بە ٥٠ لەم بوارەشدا جێبەجێکرا کە لە ڕاستیدا کارێکی خراپوڕەنگدانەوەیەکی سەلبی هەبوو کە لە ئەنجامدا بووە مایەی ئەوەی بەرنامەی یەکخستنی هێزەکان گەرچی بە شەکلی کاری بۆ کرا لە ناوەڕۆکدا هەنگاوی پراکتیکی ڕێکوپێکی بۆ نەنرا، بگرە خۆبەستنەوە بە بڕیارەکانی حیزبەوە بە ئاشکرا دیار بوو، هیچ لایەك نەیئەویست خۆی لێ ببوێرێو بەرژەوەندی دواڕۆژی کورد ڕەچاو بکات. هەر لایەك مانەوەی خۆی لە بوونی میلیشیادا ئەبینییەوە، نەیان ئەویست ببنە حیزبێکی مەدەنی هاوچەرخ. هەر خەریکی کۆکردنەوەی خەڵکی بوون بۆ بەهێز کردنی خۆیانو فراوانکردنی دەسەڵاتیان، چەندە هێزت زۆرتر بێ دەسەڵاتی سیاسی ئیداریت فرەتر ئەبێت. ئەگەر چی ئەو هێزە خێڵەکیش بێتو دوور بێ لە گیانی پێشکەوتنو سەردەم.

بۆیە گەرچیوەزارەتی پێشمەرگە دامەزراو قیادەی مەنتیقەکان دانران بەهەموو پێکهاتەکانیانەوە، بەڵام ئەمە تەنیا کارێکی رووکەش بوو، لە دەرەوەیوەزارەتی کاروباری پێشمەرگەدا هێزی میلیشیا هەر مایەوە. نەك هەردوولایەنە سەرەکییەکەی حکومەتی هەرێم، بگرە لایەنەکانی تری ناو بەرەی کوردستانیو دەرەوەی بەرەی کوردستانی میلیشیاکانیانوەکو خۆی مایەوە. نە هەردوو حیزبەکەی ناو حکومەتو نەپەرلەمانیش توانیان بڕیارێك بۆ هەڵوەشانەوەی میلیشیاکان دەربکەن، نەحیزبەکانیشوەکو نیشاندانی ڕادەی دڵسۆزی یان بۆ ئەزموونەکە تەکانێکیان دا.

دیاردەی فـره میلیشـیای چـەكداری زۆر ترسـناكه، بـه تایبـەتی بـۆ ئەزموونێكی كۆرپەیوەكو ئەزموونی حوكمڕانی له كوردستانـدا.وه نـەبێت ئـەم دیاردەیه تەنیا هەر له كوردستاندا باو بێ، بەڵكو له زۆروولاتـی تـری دنیـادا كـه خـاوەنی حكومـەتی یاسـایین ئـەم دیاردەیـه هەیـه. لەوولاتێكـدا دیموكراتیـەت نـەبوو یـان شـەڕ لەسـەر دەسەلات بـوو هـەر لایـەنێك ئەیـەوێ خـۆی بـه تـەنیا فـەرمانڕەوا بێـت، بـه تایبـەتیش لـه كوردسـتاندا كـه لـه قۆنـاغی شـاخدا شـەڕی ناوخۆیی له ناو هێزەكاندا هەبووه كه ئاشـتبوونەوەش كـراو بـەرەی كوردسـتانی دامـەزرا بـه جیـدی كـار بـۆ یەكخسـتنی هێـزی پێشـمەرگەی كوردسـتان نـەكرا. مەگەر بۆ موجامەله كردن بێ. ئەگەر لایەك به گـەرمی هـەوڵی دابـێ، لایەكـەی تر له پشتەوه بۆسـەی دانـاوه تـاكو جێبـەجێ نـەكرێ. بـۆ ئـەم كاتـەش لـه دوای ڕاپەڕینـەوه ئـەم حیزبانـه هێزەكانیـان ئەوەنـده بۆگـەن بـووه بـەهۆی تێخزانـی خەڵكانی كۆنه مستەشارو جاشه دەست سوورەكان لـه خـوێنی خـەڵكی بێتـاوانی كوردسـتاندا بـه ئاسـانی نـاتوانین دەسـتبەرداریان بـنو پاكسـازی ئـەنجام بـدەن. چونكه هێشتا له ئاییندەی دۆستایەتی نێوان خۆیان دڵنیا نین.

بـۆ یەكخسـتنی هێزەكـانیش زۆر تەگـەره هەیـه لـه بـەردەمـدایه ئاسانكاری بۆ نەكراوەوەكو:

- دامەزراندنی دەزگای تەجنید
- ژمارەی هێزی پێشمەرگەی پارێزەری ئاسایشی كوردستان
- بودجەی ئەو هێزه چۆن دابین ئەكرێ
- ئایا حیزبەكانوەكو یەك بـه تـەنگ ئـەو مەسـەلەیەوەنو میلیشـیاكانی خۆیـان هەڵئەوەشێننەوە..؟!

بۆیه هەر نەتوانرا میكانیزمی تۆكمه بۆ یەكخستنی هێزەكان دابنرێو ئەوەی كرا هەنگاوێكی بچووك بـوو لـه چـاو داخوازییـەكانی گەلەكەمانـدا هـیچ نەبوو، بەڵكو هەمیشه چاوەڕوانی ئەوە ئەكرا لەهەر ڕووداوێكـی نێـوان هـەردوو لایەنەكەی حكومەتی هەرێمدا هێزه یەكگرتووەكەی سوپای كوردسـتان بچنەوه باوەشی میلیشیاكانیانو له سەنگەری بەرگری كـردن لـه چارەنووسـی كوردسـتان

بگەڕێنەوە بۆ سەنگەری حیزبایەتی. چونکە لە کاری ڕۆژانەدا ئەو هەڵوێستانە ئەوەیان نیشان ئەدا کە کەس نایەوێ لەو چوارچێوە تەنگەبەرە دوور بکەوێتەوە. یانوا گۆش کرابوون یان ڕۆژانە ڕێنوێنی بەو ئاراستەیە دەرئەچوو کە نەك زیانی بۆ ئەو سەردەمە هەبوو بەڵکو هەڕەشەیەك بوو بۆ پەیوەندی ئاییندەو خلۆربوونەوە بەرەو شیوی ناکۆکییەکان کە هەمیشە خۆی لە بۆسە نابوو بۆ تەقینەوە ناکاوەکان.

من نامەوێ داکۆکی لە یەکێتی بکەم کە هەڵوێستی باشتر بووەو زۆر نەرم تر بووە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەگەرەکانداو پارتیش زۆرتر خۆپارێز بوونو نەیان ئەوێرا گۆڕان بکرێ. یان شتێ بکەن لە قازانجی خۆیان نەبێ. بەڵام کە پارتی هەر بەلای خۆیدا ڕایئەکێشا ئیتر ئێمەیش بەرەنگاری ئەبووینەوە بەهەمان ئەو چەکەی ئەو بەکاری ئەهێنا. کە ئەمەش خاڵی لاوازی بوو لە لابەلا کردنەوەی کێشەکاندا.

ئێمە گەرچی بڕوامان بە تازەگەرێتیو کرانەوەو دیموکراتیەت هەبووە، لە هەمان کاتدا نەمانتوانی گیانی گۆڕان بە بەر کادیرەکانیاندا بکەین، چەنکە پارتی بۆ پۆستەکانیان خەڵکانیووشكو مولتەزیم بە بڕیاری دامودەزگا تایبەتییەکانی دائەنا کە نەیان ئەویست هەناسەی گۆڕانکاری هەڵمژن.

## کابینەی دووەم

لە جەوێکیوادا زۆرتر ئاڵۆزی بەرپا ئەبێ، بارەکان بە لای ناسازیدا ئەڕوات. چونکە کەمترین ڕێگای تێگەیشتن ئەگیرێتە بەر.

لە بەرامبەر ئەو هەلومەرجە ئیستفزازییەی پارتی پێویست بوو یەکێتی دەستێك بەخۆیدا بهێنێو کابینەی حکومەت کە هەڤاڵ د.فوئاد مەعسوم بوو بگۆڕێ تاکو لە بەرامبەر هەڵوێستەکانی پارتیدا پتەوتر ڕابوەستێو ڕێگر بێت لە بەردەم پیلانەکاندا. هەرچەندە هەڤاڵ د.فوئاد تا ڕادەیەك سەر کەوتوو بوو تەنیا هەندێك نەرم بوو بە کاوەخۆ بۆ مەسەلەکان ئەچوو، پارتیش ئەوەیان پێخۆشبوو، بەڵکو پێیان ناخۆش بوو کابینەکە

بگۆڕێ. بۆیە یەکێتی بڕیاری دا کە پۆستی سەرۆک‌وەزیران بگۆڕێو ئەو ئەرکە بخرێتە ئەستۆی هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسول عەلیو ڕۆژی ١٩٩٣/٤/١٠ کابینەی دووەم ڕاگەیەنرا.

لەم کابینەیەدا هەڤاڵ جەبار فەرمان لە پۆستیوەزارەتی کاروباری پێشمەرگەدا دەستبەکار بوو. هەندێک‌وای بۆ ئەچوون ئەم‌وەزارەتە بکەوێتە خۆیو گورێکی پێبدرێو پارتیش باشتر بێنە پێشەوەو خۆیان تەنگ بکەنەوە بۆ یەکخستنی هێزەکانو پێشخستنیوەزارەتەکە، بەڵام دوایی دەرکەوت ئەم بۆچوونە لە جێی خویدا نەبووە چونکە پارتی بە چاوی گومانەوە لەم گۆڕانکارییەیان ئەڕوانیو بە مەترسییان ئەزانی.

## ئۆزال مرد

ڕۆژی ١٩٩٣/٤/١٧ هەواڵێکی کوتوپڕی تورکیاو دنیاشی هەژاند. تۆرگۆت ئۆزال مرد.! نە کەس بڕوای بەم مردنە کردو نە لێکۆڵەرانو چاودێرانی سیاسیش.

هیچ ئاماژەیەک نەبوو بۆ نەخۆشی ئۆزال کەوا یەکسەر بمرێ، بێ پێشینەیەکی لەش ناساغیو نەخۆشی گومان لای مرۆڤ بەجێ ئەهێڵێ کە لە پشت ئەم مردنەوە شتێک هەبێ. ڕۆژێک پێش ئەم مردنە ئۆجەلان لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامە نووسیدا زۆر بە شانو باهۆی ئۆزالدا هاتبوو. نە تورکیای عوسمانیو نە تورکیای ئەتاتورکی ڕۆژێک لە ڕۆژان دانی خێریان بە کوردا نەهێناوە، یەک سیاسەتیان بەرامبەری پەیڕەو کردووە لە ئاستی چارەسەرکردنی کێشەکەیدا خۆیان بواردووەو ئامادە نەبوون بچووکترین مافی بسەلمێنن یان گەر لە دیدێکی دیموکراسیانەوە تێی بڕوانن لەوانەیە دەروازەیەکی باش بۆ کورد لە سەر پشت بکرێتەوە بۆ لێتێگەیشتنی، چونکە کاربەدەستانی تورک باوەڕیان بە دیالۆگ نییە. هەرچەندە خۆیان ئەیانەوێ بە

ڕێگەی دیالۆگ بچنە ناو بازاڕی ئەورووپییەوە تاکو لەو پێشکەوتنە ئابوریو یارمەتیو کۆمەكو هاریکارییەی ئەورووپا سوود مەند بنو باری خراپی ئابوریو گوزەرانی خەلکی ببووژێتەوە.

تەنیا یەك کەس بە سەرزارەکیش بێ ووریتەیەکی لە دەم دەرهاتبێو باسی کوردی کردبێو هەندێ نەرمی نواندبێو بە دلی شۆڤێنیستەکانی تورك نەبووبێ ئۆزال بوو.

ناشزانم چۆن ئەو گۆڕانەی بە سەرا هاتبوو.وادیارە ئەو تۆزقالە بیرکردنەوەیە بە مەترسی دانرابێ بۆ دواڕۆژی تورکە شۆڤێنییەکانو عەسکەرتاریای دەسەلاتدارانی تورکیا.

پێ ئەچێ ئەم مردنەی ئۆزال پاکسازی کردنێکی نهێنی بێ بۆ ئەوەی لە کۆلی خۆیانی بکەنەوە نەبادا هەلوێستەکەی گەشە بکاتو لە ناوخەلکیدا ڕەگداکوتێو لە جادەی تورکیدا خەلکێکی زۆر پەلکێش بکات بۆ پشتیوانی کردنی مەسەلەی کورد.گەرچی خەلکێکی زۆری تورك پالپشتی لە کورد ئەکەنو زۆریشیان بە دەست سیاسەتە چەوتەکانی جەندرمەی تورکییەوە ئەنالێنن، نمونەش ئیسماعیل بێشکچییە کە دۆستێکی گەورەی کوردەو چەندین جار زیندانی کراوە.

لە ڕۆژی ۱۹۹۲/٦/۲۱ دا لەگەل بەڕێزوەزیری کاروباری پێشمەرگەدا سەردانێکی دهۆکمان کرد بۆ چاوپێکەوتنی هێزەکانی ئەو دەڤەرە. لە ڕۆژی ٦/۲۲ دا چووینە سەر فورات لەسەر سنووری سوریا ـ عێراق بۆ پێشوازی هەڤال مام جەلال کە لە گەشتێکیدا بۆ دەرەوەی کوردستان ئەگەڕایەوە.

لە ڕۆژی ٦/۲٦ دا لەگەل مەسعود بارزانی داوەکو وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە کۆبووینەوە کە تیشکی خستە سەر تەبایی هێزەکانو دوورکەوتنەوە لە مۆرکی حیزبایەتیو کردنی ئەو هێزانە بە هێزی سوپای ڕزگاری گەل. قسەکانی لە لایەن تیۆرییەوە چاك بوو، دەربڕین بوو لە خواستەکانی

گەلەکەمان، بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆك و پراکتیکییەوە جێی دڵخۆش نەبوون، چونکە زۆربەی سەرکردەکانی کورد تەنیا لەڕووی ڕوخسارەوە قسەی دەوڵەمەند ئەکەن، کە کار گەیشتە بەرژەوەندیو بە تایبەتی چارەنووسی دەسەڵات ئەوا تەزووی نائومێدی دەیانگرێو پەژیوان ئەبنەوەو هەرچی ئاواتی خەڵکییە ئەیبەنە قوڵایی گۆڕەوە. تەنیا خۆیان ئەپارێزن. ئەو کاتانە ئێمە بەهەر قسەیەك کە بۆنی تەباییو ئارامی لێ بهاتایە با بە سەرەزارەکیش بێ دڵخۆش ئەبووین، زۆر بیرمان لە ئایندەی هەڵوێستەکان نەئەکردەوە. گەرچی هەندێك زانیاریشمان لابەرجەستە بووبێ کە مل بەرەو کوێ ئەنێین.

هەرچۆنێ بوو ئەمانویست کارو ئەرکەکانمان ڕێك بخەین هەرکەسە لە سنووری دەسەڵاتی خۆیدا.

## غەریب هەڵەدنی شەهید کرا

لیوای ٢٢ی دووکان کە فەرماندەکەی هەڤاڵ غەریب هەڵەدنی بوو شوێنیان نەبوو، دامان نابوو بارەگاکەیان ببەینە بینایەی جەیشە شەعبییەکە کە چەند ماڵێکی سەر بە حیزبی شیوعی تێدا بوو. بۆ ئەم مەبەستە لە قیادەی مەنتیقەی سلێمانییەوە نووسراوێکمان بۆ کۆمیتەی پارێزگای سلێمانی حیزبی شیوعی نووسی. پاش چەند ڕۆژێك کۆمیتەی پارێزگای سلێمانی حیزبی شیوعیوەڵامی داینەوە کەوا ڕۆژی ٧/٢٢ نوێنەرمان بنێرینە دووکان بۆلای نوێنەری حیزبی شیوعی کە هاوڕێ سۆران بوو بۆوەرگرتنی بارەگاکە. ئێمەیش ئاگاداری هەڤاڵ غەریب هەڵەدنیمان کرد بەو کارە هەڵسێ هەڤاڵ غەریب بە دوو پێشمەرگەوە چوو بوو بۆ ئەوێ کە یەکێکیان سمکۆی برای بوو، خۆیشی چەکی پێنەبوو کە چووبووە ناو

بارەگاکەوە لەلایەن چەند چەکدارێکەوە میلیان لێهێنابووەوە، لە جیاتی بەخێر هاتنو میوانداری کردن تەقەیان لێکردو شەهیدیان کرد.

لەو کاتەدا ئاگاداریان کردمەوە کە هەڤاڵ غەریب هەڵەدنی شەهید کراوەو ئەو چەکدارانە لە ناو بارەگاکەدا لە لایەن خزمە جافەکانی شەهید غەریبو هەندێ پێشمەرگەی ئەو ناوەوە ئابڵوقە درابوون. هەتا گەیشتمە دووکان لەلایەن هەندێ ڕیشسپیو مەلا سدیقی دووکانەوە هەوڵ درابوو چەکدارەکان نەکوژرێنو ڕەوانەی قیادەی مەنتیقەی سلێمانی بکرێن. منیش لەگەڵ ڕیش سپیو مامۆستادا تاوانبارەکانم سوار کرد بۆ قیادەی مەنتیقە، بەڵام خزمانی شەهید غەریب پێشو دوایان لێگرتینو لەگەڵماندا هاتن. لەکاتێکدا تاوانبارەکانمان دائەگرت هاوڕێ سۆران بەشێوەیەکی ناشیرین قسەی کرد، کۆنترۆڵی خزمانی جافمان پێنەکرا. تەقەیان لێکراو سۆرانیان کوشت.

ڕۆژی ٧/٢٣ تەرمی شەهید غەریب برایەوە بۆ هەڵەدنو حیزبی شیوعی بەیانێکی خراپیان لەسەر ئەو ڕووداوە دەرکرد بێ ئەوەی لە نزیکەوە شارەزاییان لە چۆنیەتی هەبێ، ئەمەش دەقی ئەو بەیانەیە:

بەیاننامەی کۆمیتەی پارێزگای سلێمانی حیزبی شیوعی کوردستان - عێراق دەربارەی ڕووداوەکەی ١٩٩٣/٧/٢٢ی دووکانو شەهید کردنی هاوڕێی دیلمان هاوڕێ سۆران:

## کۆمەڵانی خەڵکی بە شەرەفی شاری سلێمانی
## حیزبو کۆمەڵە سیاسیو نیشتمانپەروەرەکان

دوێنێ لە ئەنجامی پەلاماردانی مەڵبەندی - ئەلجەیش ئەلشەعبی - لە دووکان لە لایەن هێزێکی لیوای ٢٢وەوە بە فەرماندەیی ئامر لیوا کە خێزانی ١٠ هاوڕێی ئێمەی تێدایە، مشتومڕو تەقە ڕوویداوەو چەند کەسێك لە هەردوولا بریندار بوون کە بە داخەوە ئامر لیواکە لە ئەنجامی برینەکەی مردووە. دوای

ئەوەی دەستیان گرتووە بە سەر بیناکەداو بەڵێنی شەرەفیان داوە بە ڕیشسپی‌و مامۆستا ئاینییەکان‌و پیاوماقوڵانی ناوچەکە ٦ کەسیان لە هاوڕێیانی ئێمە بە دیلگرتووەو بە ئۆتۆمبیلێکی کۆستەر هێنراون بۆ بارەگای قیادەی مەنتیقەی سلێمانی. لەوێ دەستبەجێ هاوڕێ سۆران ئەندامی کۆمیتەی پارێزگای حیزبمان ڕەمیکراوە، دوای ئەشکەنجە دانێکی زۆر بە نووکی سونگی‌و بە ڕاکێشان بە سەر زەویدا. ئەمەو لە کاتێکدا بڕووسکەی هەڤاڵ مام جەلال کە لە ڕێگەی سەرکردایەتی حیزبمانەوە سەعات ٤٥:١١ای شەو پێمانگەیشتووە دڵنیامان ئەکات کە هەر ٦ دیلەکە سەلامەتن‌و ئەپارێزرێن.

ئێمە لە هەموو لایەك ئەپرسین، لە هەموو خاوەن‌ویژدان‌و خاوەن بیروباوەڕێك ئەپرسین ئاخۆ کێن ئەوانەی دیل ئەکوژن..؟ هەروەها بۆمان دەرکەوتووە کە ٦ کەسی تر لەو دیلانە سەرنگوم کراون، ئێمە لەو ساتەوەی کە ئەو هەواڵە بڵاو بووەوە تەقەلایەکی زۆرمان دا بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ سەرکردایەتی هەردوو حیزبی: پارتی دیموکراتی کوردستان‌و یەکێتی نیشتمانی، بە نیازی ئەوەی مەسەلەکە ڕوون بکەینەوەو دەستی بەسەر دا بگرین‌و چارەسەری بکەین، بەڵام ئەو تەقەلایانەمان بە زایە چوو چونکە هەندێکیان نەهاتن بە دەنگمانەوەو هەندێکیان بە دەست نەکەوتن.

ڕەمیکردنی دیلێك لە بارەگای قیادەی مەنتیقەی سلێمانی کە سوپای یەکگرتووی کوردستانە لە لایەن کار بەدەستانی هەمان سوپاوە کە سەر بە یەکێتی نیشتمانین، دیلکردنی کەسێکی ناسراو، کادیرێکی حیزبمان‌و گومکردنی چەند کەسێکی تر لەو دیلانەو هەروەها ڕێگە گرتن لە خەڵکی خێرخوازو خزموکەس‌و کار کە یارمەتی برینداره‌کان بدەن لە خەستەخانە، ئەمجۆرە کارانە زۆر دوورن لە هەستکردن بە گیانی هاوپەیمانێتی‌و هاونیشتمانییەوە، ئێمە هەروەك لای هەموان ڕوون‌و ئاشکرایە هەمیشە دژی ئەو جۆرە ڕەفتارو کارانە بووین کە بەردەوام گیانی هاوکاری‌و کۆمەکمان پاراستووەو هەرگیز چاوەڕوانی ئەمان نەئەکرد کە کاربەدەستانی عەسکەری یەکێتی نیشتمانی ئەو کارە ناڕوایە نا مرۆڤانەیە ئەنجام بدەن بە مەرجێك ئەوەی ڕوویداوە دژی ئەوان نەبووە بە تایبەتی‌و چەکداری ئەوان هەڵیان کوتاوەتە سەر

بینایەوویستوویانە بە زۆری چەك ئەو خێزانانە لەو بینایە دەر بکەن، ئەمە لە کاتێکدا کە فەرماندەی مەنتیقەی سلێمانی ڕۆژی ١٩٩٣/٧/٢١ کتابێکی ڕەسمی دەربارەی ئەو بینایە ناردووە بۆ حیزبمان و ئێمە شەهید هاوڕێ سۆرانمان کە لاوێکی لە سەرخۆو ڕۆشنبیرو دەرچووی زانکۆیە نارد بۆ دووکان بۆ تەگبیروڕای ئەو مەسەلەیە، جگە لەوەش وەڵامی ئەو نووسراوەمان بە نووسراوی ژمارە ٦٦ ی ڕۆژی ٧/٢٢ داوەتەوە ئامادەییمان پیشانداوە بۆ چۆلکردنی خانووەکە بە مەرجێك شوێن بۆ ئەو خێزانە ئاوارانە پەیدا بکرێ، ئەمەیە ڕاستی ڕووداوەکەو ئاکامەکەی جا داوا لە سەرکردایەتی حیزبەکانی بەرەی کوردستانیو هەردوو حیزبی هاوپەیمان بە تایبەتی ئەکەین کە ئەمجۆرە کردەوە نامرۆڤانەیە مەحکوم بکەنو داوا لە حکومەتی کوردستانو ڕێکخراوی مافی مرۆڤی کوردستان ئەکەین بە تایبەتی سەرکردایەتی مەنتیقەی سلێمانی کە لەم تاوانە بکۆڵنەوەو تاوانکار دیاری بکەنو بە سزای ڕەوای خۆی بگەیەنن بۆ ئەوەی خەڵکی پارێزگاکەمان دڵنیا بکەن لە پاشەڕۆژی خۆیان.

سەربەرزی بۆ شەهیدی نەمر هاوڕێ سۆران

سەر شۆڕی بۆ پیاو کوژو پێشیلکەرانی مافی مرۆڤ

حیزبی شیوعی هەر بەوەوە نەوەستان لە ئیزگەی ئازادییەوە هێرشیان کردبووە سەر هەڤاڵانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە ناڕەوا. کە ناوی مام ڕۆستەمو کاك شێخ جەعفەرو منیش هێنرا بوون.

شەهید کردنی هەڤاڵ غەریب هەڵەدنی هەموو خەڵکیووروژاند بەتایبەتی هەڤاڵە دێرینەکانی خۆی لە کۆمەڵەی پێشمەرگە کۆنەکانی کوردستان ڕۆژی ١٩٩٣/٧/٢٥ یاداشتنامەیەکی نارەزاییان بلاوکردەوە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

بۆ/ بەڕێزان مام جەلال تاڵەبانیو کاك مەسعود بارزانیو

هەموو حیزبەکانی بەرەی کوردستانی

بەڕێزان سەرۆکی پەرلەمانی کوردستانو

سەرۆکی ئەنجومەنیوەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان

بە بۆنەی تاوانی شەهید کردنی هەڤاڵی هێژاو پێشمەرگەی ١٧ ساڵی خەباتی سەختی کوردایەتی کاك غەریب هەڵەدنییەوە پڕ بەدڵ نارەزایی خۆمان دەرئەبڕین بەرامبەر ئەو تاوانە گەورەیەو نیگەرانی خۆشمان دەرئەبڕین بەرامبەر ئەو بێدەنگییەی حیزبەکانو کاربەدەستانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ئاست ئەو تاوانەی کە لە کاتی ئەنجامدانی فەر مانی حکومەتەکەماندا سەرکردەیەکی لێهاتوومان شەهید بکرێ.

ئێمەی پێشمەرگە دێرینەکانی کوردستان لە بەر بەرژەوەندی گشتی گەلی کورد ڕازی بووین بە ئاشتبوونەوەی نیشتمانی لە کاتی ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ دا کە دەستبکەینە مل بکوژانی هەزاران هاوڕیمان لە چەند ساڵەی ڕابوردووی شەڕو شۆڕی کوردستانداولاپەڕەی سپیمان هەڵدایەوە لە گەڵ هەموو تاوانبارانی زەمانی ڕابوردوو بە مەرجێ دوای ئەو ئاشتبوونەوەیە تاوانی تر نەکەنو لە هەمان کاتیشدا ڕێز لە خەباتی بێووچانی پێشمەرگە دێرینەکان بگرێو شەرمیان لێبکرێ.

بەڵام بە داخەوەوا ڕۆژگار تێئەپەڕێو جگە لەوەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بە چاوی سووکتر تەماشای پێشمەرگەی دێرین ئەکرێ مافی خۆی پێنادرێوا زۆر بێشەرمانەش یەکە یەکە بە بیانووی جیا جیا تیرۆر ئەکرێنو تۆمەتی ناڕەوا ئەدرێتە پاڵیان چەندین نموونەیوەك شەهید کردنی کاکە غەریب هەڵەدنی لە بەردەستایە لە چەند ساڵەی دوای ڕاپەڕینو ئازادیدا کە ئەبوو جەماوەرو حیزبەکان ڕێزو حورمەتیان لێبگرتنایە چونکە لە سایەی خەباتی بێووچانی ئەوانەوە بوو دوژمن لاواز بوو هەر ئەوانیش بوون ڕێبەرایەتی ڕاپەڕینیان کردو کوردستان ئازاد کرا کەوابوو ئەبێ لە کەشوهەوای ئازادیداو لە پاڵ حکومەتی هەرێمی کوردستاندا یەکە یەکە لە ناوبرێن یان پارێزگارییان لێبکرێ.

ئێمە بەم یاداشتنامەیە ئاگاداری هەموو جەماوەرو سەرکردەی حیزبەکانو کاربەدەستانی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەکەین کە چیتر

ناتوانین هەروا دەستەوسان ڕاوەستینو بە بەرچاوی هەموانەوە بکوژرێینو پاشانیش مامەڵەمان پێبکرێ.

داوا ئەکەین کە تاوانبارانو بکوژانی هاورێکانمان بە سزا بگەیەنرێن، ئەگینا بە مافی ڕەوای خۆمانی ئەزانین بێسلکردنەوە لە هیچ لایەکو لە هەر کۆسپێك بێتە ڕێگەمان تۆڵەی هەڤاڵەکانمان بە چەند قات لە تاوانباران بسێنینو خۆشمان نابەستینەوە بە هیچ لایەنێکی سیاسییەوە.

وەبیری هەمووولاشی ئەخەینەوە: تۆڵەمان بە سەبرە ئەمما بەزەبرە.

کۆمەڵەی پێشمەرگە کۆنەکانی کوردستان

١٩٩٣/٧/٢٥

دۆخەکە بەرەو ئاڵۆزی ئەچوو حیزبی شیوعی دواتر لە ڕووی هەست کردن بە مەسئولیەتەوە گەیشتە ڕاستی ڕووداوەکەو ڕۆژی ١٩٩٣/٧/٢٥ بەیاننامەیەکی تریان دەرکردو ئەو تۆمەتانەی درابووە پاڵ هەڤالانی یەکێتی ڕەتکردەوە ئەمەش دەقەکەیەتی:

## جەماوەری سلێمانی خۆڕاگر

چۆن لە ڕۆژی ١٩٩٣/٧/٢٢ دا لە دووکان بەهۆی ڕوداوێکی چاوەڕان نەکراوو دڵتەزێنەوە هەڤاڵ غەریب هەڵەدنی فەرماندەی لیوای ٢٢ی سوپای یەکگرتووی کوردستان شەهید کراو لە ئەنجامی ئەوەش هاوڕێ سۆران عوسمان شەهید کراو چەند پێشمەرگەو هاووڵاتی تر بریندار کران.

ئەنجامی ئەو ڕووداوانە بووەهۆی دڵگەرمیو هەڵچوونی کاتی کە بوونە هۆی بەرپابوونی هێرشێکی ئیعلامی لە لایەن ئێمەوە لە ڕێگەی ئیزگەو تەلەفزیۆنەوە، کە ئەبوایەووردبینانەترو بە دەمارێکی هێمنەوە بەرەو بناوانی کێشەکە بچووینایە بە مەبەستی چارەسەرکردنی نەك تەسعید کردنی، چوونکە

ئەبوایە پاراستنی ئەم بارودۆخەو دەستکەوتەکانی گەل‌و حکومەتی هەرێمی کوردستان‌و گیانی تەبایی لە زوور هەموو هەڵچوونێکی عاتفی‌و ناکۆکییەکی‌وەختی دابنرایە، دان بەوەدا ئەنەین کە ئەبێت چارەسەرکردنی ئەمجۆرە ڕووداوانە بە گیانێکی بەرزی هەست بە لێپرسینەوە بکەین بۆ دیاریکردنی چارەسەرێکی عادیلانە دوور لە تەسعید کردنی دۆخەکەو ئاڵۆزکردنی کێشەکە، چونکە چارەسەرکردنی ئەمجۆرە کێشانە بە توندو تیژکردنی ڕاگەیاندن‌و بە کارهێنانی چەك ناکرێ چونکەواقیعی کوردستان‌و تاقیکردنەوەی خەباتی هەموو لایەنەکان لە سەنگەرێکدا کۆی کردووینەتەوە دژ بە دوژمنان.

جا بۆیە لە ئەرکی هەستکردن بە لێپرسراوێتی‌و لێکدانەوەی ئەم‌وەزعە ئاڵۆزەی کوردستان تێکڕای ڕووداوەکان‌و بە تایبەتی شەهید کردنی کاك غەریب هەڵەدنی فەرماندەی لیوای ۲۲و پاشان شەهیدکردنی سۆران ئەندامی کۆمیتەی حیزبمان بە کارێکی ناڕەوا ئەزانین، ئێمە دژ بە هەموو ئەو هێرشە ناڕەوایانەین کە دەرهەق بە حکومەتی هەرێمی کوردستان‌و یەکێتی نیشتمانی کوردستانی هاوپەیمان کرابێ‌و هەروەها ناوهێنانی برادەران: مام ڕۆستەم‌و کاك شێخ جەعفەرو کاك مەحمود سەنگاوی بە ناڕەوا دائەنێین، پێش ئەوەی لیژنەی لێکۆڵینەوە بڕیاری لە سەر بدات کە ئەبێ هەموو مەسەلەکان بخرێتە بەردەم لیژنەی لێکۆڵینەوە.

هەر بەم بۆنەومیەوە لە کۆبوونەوەی سەر لە بەیانی ڕۆژی ۱۹۹۳/۷/۲۵ لیژنەی ئەمنی پارێزگای سلێمانی بە ئامادەبوونی هەموو لایەنەکانی بەرەی کوردستانی‌و کاربەدەستانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە سەرۆکایەتی بەرێز پارێزگاری سلێمانی بڕیاردرا:

۱. لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە لە نوێنەرانی حیزبەکان‌و حکومەتی هەرێمی کوردستان بە زووترین کات پێکبێت بۆ لێکۆڵینەوەو لێپرسینەوە لە هۆو ئەنجامەکانی ئەو ڕووداوە.

٢. هەمووجۆرە هێرشێکی ئیعلامیو جموجوولێکی دژ بە یەکتری ڕابگیرێت.

٣.گیراوەکان بە زووترین کات بدرێنە دەست دادگاو یاسا.

بەم بۆنەیەشەوە زۆر سوپاسی بەڕێز پارێزگاری سلێمانیو هەڤاڵانی لقی ٤ ی پارتی دیموکراتی کوردستانو نوێنەرانی کۆمیتەی سلێمانی حیزبی یەکگرتنی کوردستانو هەموو لایەنەکانی بەرەی کوردستانی ئەکەین بۆ ئەو کۆششو ماندوبوونەی ئەنجامیان دا بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە.

هەرێمی حیزبی شیوعی کوردستان

کۆمیتەی پارێزگای سلێمانی

١٩٩٣/٧/٢٥

لە ڕاستیدا شەهید کردنی هەڤاڵ غەریب هەڵەدنی زیانێکی یەکجار گەورە بوو لە یەکێتی نیشتمانیو هێزی پێشمەرگەی کوردستان کەوت. ئەو مرۆڤێکی ئاسایی نەبوو، فەرماندەیەکی لێهاتووی بواری پێشمەرگایەتیو پێشمەرگەیەکی دێرینی شۆرشی نوێی گەلەکەمانو کادیرێکی بە ئەزموونی چاکبوو کە لە ڕۆژە سەختەکانی سەرەتای شۆڕشەوە تا ڕۆژی شەهید کردنی ڕۆڵی بەرچاوی گێڕاوە لە مەیانی کارو خەباتی بێووچاندا بە تایبەتیش لە کاتی ئەنفالەکانو لە ماوەی پارتیزانیدا لە ناوچەی دۆڵی جافایەتی کە ئەکرێ چەندین کتێبی لەسەر بنووسرێت. نەك هەر ئەمە بەڵکو شەهید غەریب لە بوارە جیاجیاکانیشدا کاری زۆری بۆ خزمەتی شۆڕشو گەلەکەی ئەنجام داوە کە لەکاتی پارتیزانیەکەیدا هەندێ شوێنەواری گرنگی دۆزی بووەوەو لە شوێنی تایبەتدا پاراستبوونی تادوای ڕاپەڕین پێشکەشی حکومەتی هەرێمی کوردستانی کرد. ئەمە بەڵگەی ئەمەکی ئەو پیاوە تواناداره بوو.

لە هەمان کاتیشدا هاوڕێ سۆران کادیرێکی حیزبی شیوعی بوو، برازای عومەری خاوەری هەڵەبجەی شەهید بوو کە بووە ڕەمزی شەهیدانی کیمیایی هەڵەبجەووێنەکەی کرایە پۆستەرو لە هەموو جیهاندا بلاو بوویەوە.

# یەکگرتنەوەی حیزبەکان و شەڕی ئاغاو جووتیار

ئەمساڵ وەکو بڵێی ساڵی یەکگرتنەوەی حیزبەکان بێ چەندین حیزبی بچووك لە نێوان خۆیاندا یەکیان ئەگرتەوە یان ئەچوونە پاڵ حیزبەزلهێزەکان کە دواترینیان باڵەکەی ئاڵای شۆڕش بوولەناو حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستانەوە ڕۆژی ۱۹۹۳/۷/۲٤ هاتنەوە ناو (ی.ن.ك)، دوای دابڕانی چەند ساڵ جیابوونەوە جارێکی تر کۆمەڵێك کادیری یەکێتی بۆ پتەوکردنی ڕیزەکانی یەکێتی تێکەڵ بوونەوە بە ڕابوردوویان.

هەر لە ڕۆژی ۱۹۹۳/۷/۲٥ دا لە ناوچەی قەڵادزێ شەڕ لە نێوان ئاغاو جووتیارەکان دا بەرپا بوو. شەڕەکە شێنێ و شیوەکەڵ و گۆمەتاڵ و گۆچاڵی گرتەوە. ئاغاکان لە قلاسێوکەو لوتکەی کورە تاوڵ و جووتیارەکانیش لە چەند قۆلێکەوە هاتبوون کە دێکانی دێرسین و دیگە بەدەستی جووتیارەکانەوە بوو. مەسعود بارزانی برووسکەی بۆ کۆمیتەی ڕێکخستن و لیژنەی ناوچەی قەڵادزێ و مەڵبەندی شەشی سۆران و لقی چواری و قیادەی مەنتیقەی سلێمانی و هەڤاڵ مام جەلال کرد کە ئەبێ هەردوولا یەك هەڵوێستیان هەبێ و ئەوانەی تاوانبارن یان ئاژاوە درووست ئەکەن بیانگرن و هەیبەتی حکومەتی هەرێم فەرز بکەن.

لە ڕاستیداوەنەبێ ئەم شەڕەی کە هەڵگیرسا هی ئەم ساتانە بێ و زەمینەی پێشتری نەبووبێ، بەڵکو کێشەیەکی کۆنترەو بۆ ساڵانێکی دوورو درێژ تر ئەگەڕێتەوە لە نێوان عەشیرەتەکانی مامەش و مەنگورو میراودەلییەکاندا.

مامەش و مەنگورەکان بە ناوی جووتیارو میراودەلییەکانیش بە ناوی ئاغاوە، هەرچەندە میراودەلییەکان خاوەنی ئەو هەموو زەوی و ئاوە نین ، جگە

لەمە میراودەلییەکان وەکو هۆزێك زۆر تێکەلاوی هۆزو تیرەکانی تری ناوچەکە نە ئەبوون و خزمایەتی ژن و ژنخوازیان نە ئەکرد کە خزمایەتیکردن ئبێتە هۆی دروستکردنی پەیوەندی دۆستایەتی لە نێوان خەلکیداو پشتیوانی پەیاکردن .. هەر بۆیە لەو شەڕانەدا بەتەنیا خۆیان بوون و کە سێکیان وەکو خزم لە ناو تیرەو هۆزەکانی تردا بەبوو لە سەریان بێنە قسەو لایەکی سەنگەرێکیان بۆ بگرن .

هەندێ لایەنی سیاسیش ئەو هەلەیان قۆستبووەوە بە تایبەتی برادەرانی شیوعی و پارتی بۆ ئەوەی سوودی خۆیانی لێوەربگرن. ئەمە ئاژاوەیەك بوو، بوو بە کێشەیەك لایەنە سیاسییەکانیشی گرتەوە چونکە زۆربەی میراو دەلییەکان سەر بە یەکێتی بوون هەر لە زەمانی جەلالییەوە تا درووستبوونی شۆرشی نوێ، کۆمەلێکیشیان پێشمەرگەی دێرینی یەکێتی بوون وەکو سەلیمی حەمە ئاغا، قادرئاغای مەمەند ئاغا، لە ناو ئەو کەسانەش خۆیان بە جووتیار ئەزانی کۆمەلێکیان جاشی خۆفرۆش بوون و دەستیان لە خوێنی دەیان کەسی بێتاواندا هەبوو کەسێکی وەکو عەبدوللا پۆلیس بە درێژایی تەمەنی خۆفرۆش بووە. هەرەشەی ئەکرد کە مالی سەلیمی حەمە ئاغا ئەسووتێنێ کە لە سالی (١٩٧٦)دوە لە سەنگەری کوردایەتی و پێشمەرگایەتیدا بووە. لەسەر ئەو هەرەشەیە یەخەی عەبدوللا پۆلیسم گرت و پێم ووت: سەلیم ئاغا هەرچی بێ کەس ناتوانێ بچێتە سەری. عەبدوللا پۆلیس ووتی: من هەر ئەچمە سەر مالی سەلیم ئاغا. وەلامم دایەوە کە من ئێستا ئەچمە لای مالی سەلیم ئاغاو کێ پیاوە با بێتە ئەوێ. مەسەلەکە لە سنووری ئاغاو جووتیار تێپەری و بووە کێشەی نێوان یەکێتی و پارتی.

هەر ئەو شەوە لەگەل دەرویش ئاغا قسەم کرد. دەرویش ئاغا بریاری دا کە عەبدوللا پۆلیس و چەند کەسێکی تر بگرێ کەسەر بە پارتی بوون. بەلام بریارەکەی خۆی جێبەجێنەکرد. ناچار ئاغاکان بەرەو سنووری ئێران رۆیشتن بۆ بازێر کە ناوی جێگاکەیە. پاش دووسال مانەوە لەو شوێنەدا دوای ئەوەی کە

یەکێتیو پارتی بوو بە شەڕیانو ناوچەکە کەوتە دەست یەکێتی، یەکێتی سوڵحی نێوان ئاغاو جووتیارەکانی کردو ئاغاکان گەڕانەوە جێگای خۆیان.

## تۆپبارانەکانی ئێران

شایانیووتنە هەر لەم ڕۆژەدا ٧/٢٥ ئێران زۆر بە توندی دێی ناوتاقی نزیکی شارۆچکەی دەربەندیخانی تۆپباران کرد کە بارەگایەکی حیزبی دیموکراتی لێبوو پێشتر لە سنووری ناحیەی مەیداندا بوونو لەبەر پاراستنی ئاسایشی سنوورەکە گوێزرانەوە ناوتاق،وەنەبێ ئەمە یەکەم تۆپباران بێ لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئێرانەوە بەڵکو لەو ڕۆژەوە هەڵبژاردن کراوەو پەرلەمانو حکومەتی هەرێمی کوردستان دامەزراوە. حکومەتەکانی دەوروبەر بیانووی جۆراوجۆریان پێگێڕاوەوەکو هۆکارێکی دژایەتی کردنی ئەزموونەکەمان،وائەزانن گەر تۆپبارانی ناوچەکەیان کرد یان سنووریان بەزاند ئیتر ئیرادەی گەل ئەپسێتو لە دەرەوەی بازنەی هەڵوێستی جیهانی بۆیان ئەچێتە سەر، خۆیان لەوە ئەبوێرن کە هەلومەرجی نوێی کوردستان لەچوار چێوەیەکی نێو دەوڵەتیدا ڕەخساوەو ئەگەر بەرامبەری هەندێ هەڵسوکەوتی ئەو دەوڵەتانە بێدەنگ بێ مانای ئەوە نییە دەستی لێهەڵئەگیرێو گورگ ئەیخوات. ئەو کردارانەی ئێرانیەکان بە بیانووی بوونی ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی لەناو کوردستانداوەکو دیموکراتو کۆمەڵەو سازمانی خەبات بووە گوایە هێزەکانیان دزە ئەکەنە ناو ئێرانەوە، ئەو تۆپبارانو زیان پێگەیاندنە بە مەبەستی بێزار کردنووەڕسکردنی خەڵکی بوو تاکو تەنازولات بکرێ بۆ ئێران. هەر لە مانگی ١٩٩٢/٥ بە شێوەیەکی تایبەتی شوێنە جیا جیاکانی کوردستان دراونەتە بەر ڕێژنەی تۆپەکانیان.

شەوی ٢٧ ـ ٢٨ /٥ بۆ ماوەی ١٠ کاتژمێر قرناقاو پشتئاشانو بۆڵی تۆپباران کران.

ڕۆژی ٦/١٩ هەندێ ئەفسەرو ئیتیلاعاتو ڕەسەد چوونە بەرزاییەکانی جاسوسانو گۆڕەشێرو بێدەلانو تۆپبارانی شیوەڕەشو جۆلانانو ئالیمرِیان کرد.خەڵکی بریندار کردو دەغڵودانو پاوەنێکی زۆری ناوچەکە سووتاو خەڵکەکەش بەرەو قلادزێ ڕەویان کرد.

ڕۆژی ٦/٣٠ دیسانەوە بە خەستی تۆپبارانی دەفتەری سیاسی حیزبی دیموکراتی ئێران کراو زیانی ماڵی زۆری هەبوو.

شەوی٣٠ ـ ٧/١ ماوەی ٣ کاتژمێر تۆپبارانی کەناروێ کرا.

ڕۆژی ٧/٣ بە تۆپو فڕۆکەو کۆپتەر تۆپبارانی قەندیلی کرد.پێنج هاووڵاتیو هەندێ پێشمەرگەی دیموکراتی شەهید کردو هەندێکیش بریندار.

ڕۆژی ٧/٦ تۆپبارانی قەسلانو کونە قەلو بناری بەمۆی کرد.

دوانیوەڕۆی ڕۆژی ٧/٢٢ هێزێکی زۆری پاسداران لە چەمی توتمانی تازە دێوە هاتنە خوارەوە بە تانکو کاتیۆشاوە بەرەو زنجیرە شاخەکانی: کانی سێف، کۆڵێتان، خرنوك، شاخی سوورێن، جۆمەرەسی. جووتیاری ناوچەکەیان ڕاوناو چەکیان لێسەندنوووڵاخیان پێ بەجێهێشتن.

ڕۆژی ٨/٢ سوپای ئێران لە دێی کێلەی نزیکی شاری بان جێگیر بوونو ١٠ تۆپیان دانا، لە ڕێگای باشماخ ـ سێ ڕای بەردەڕەش جێگیر بوونو هەشت هاوەنی ١٢٠ ملمو چوار کاتیۆشایان دانا، هێزێکیش هاتبووە نزیکی توتمانو تولە بی.

ئێران هەر بە تۆپباران کردنەوە نەوەستا بەڵکو ئۆتۆمبیلی مینرِێژکراویشی ڕەوانەی کوردستان ئەکرد.

## کۆنگرەی پارتی

ڕۆژی ١٦/٨/١٩٩٣ کە یادی ڕۆژی دامەزراندنی پارتییە، پارتی کۆنگرەی ١١ی بەست. دیارە ئەم کۆنگرەیە لە ئەنجامی یەکگرتنەوە لەگەڵ حیزبی سۆسیالیستی کوردستاندا گیرا لە ژێر ناوی کۆنگرەی یەکگرتنەوە دا کە ساڵی ١٩٩٣ بوو بووە ساڵی یەکگرتنەوەی هەندێ لە حیزبو لایەنەکان چ لەگەڵ یەکێتیو چ لەگەڵ پارتیدا. بەشێکی حیزبی سۆسیالیست بەسەرکردایەتی هەڤاڵ ڕەسول مامەندو چەند سەرکردەو کادیرێکی تر پەیوەندییان بە یەکێتییەوە کردو کەلێنێکی گەورەیان کردە حیزبی سۆسیالیست. بەشەکەی تریشی بەسەرکردایەتی کاکە حەمەی حاجی مەحمودی گوڵەخانە لەگەڵ پارتیدا کەوتنە گفتوگۆ. دیارە هەر یەکگرتنەوەیەکیش لەخۆڕا نابێو بێ بەرامبەر، بەڵکو ئەبێ حیزبی گەورە ئیمتیازی باش بەوانە بدات کە ئەچنە ناویەوە. بۆیە پێش کۆنگرە سۆسیالیستەکان لەئاستی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیو دامو دەزگاکانی تردا جێگەیان بۆ دەستنیشان کرابوو، بۆکۆنگرەش دیارە هەر لە ژێرەوە جۆرە ڕێککەوتنێك هەبووە لە ڕووکەشیشدا هەڵبژاردن ئەکرێو دەنگ ئەدرێو هەر ئەو نەخشەیەی لەسەری ڕێککەوتوون دەرئەچێت. کە کۆنگرەی ١١ بەسترا ئەو ڕێژەیەی کەلەسەری پێکهاتبوون ئەندامانی سۆسیالیست بوونە مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتی. بەڵام لە دوای کۆنگرە سکرتێری سۆسیالیست هەستی ئەکرد ئەستێرەی دەسەڵاتو کەسایەتی کز ئەبێ، چونکە هیچ کاتێك حەزی نەکردووە کەسی دووەم بێ، هەمیشە هەوڵیداوە هەر لەسەرەوەی لیست دابێو سەربەخۆ بێ. بۆیە بە خشکەیی پاشەکشەی کردو سەرلەنوێ سۆسیالیستی لە هەندێ لە ئەندامانی

سەرکردایەتی پێشوو کەسەر بە خۆی بوونو هەندێك خەڵکی تازە ژیانەوە. بەشێکی تری ئەندامانی سۆسیالیست هەر لای پارتی مانەوە بەتایبەت ئەوانەی هەستیان ئەکرد لە ڕیزی حیزبی بچووکدا هیچ نینو لەلای پارتی گەورەترئەنوێنن. لای کورد گرنگ نییە چیتو کێیتو چەندت پێیە بۆگەلەکەتو چۆن ئەتوانی کار بکەیت بۆ سەرخستنی بەرنامەی خەبات، بەڵکو گرنگ ئەوەیە لەگەڵ کاردا چۆن ئەگەیتە لووتکەو لە دەسەڵاتدا پێگەی خۆت ئەچەسپێنیو لەناو خەڵکیدا لەسەر زاران ئەبی. ئەمەش سرووشتێکی نەخۆشەو کاتێکی زۆری ئەوێ کەوشەنی بیرمانی لێ پاك بکەینەوەو لەو پەتایە ڕزگار بین.

جگە لەم مەسەلەیە هیچ گۆڕانێکی بەرچاو لەبەرنامەو سیاسەتی پارتیدا ئەنجامنەدرا. بەڵکو حیزبێك پابەندی کەلەپورێکی کۆنینە بێ بە ئاسانی ناتوانێ گۆڕان درووستبکات. هەرچەندە لە یەکەم ڕۆژەوەووشەی دیموکراتی بە خۆیەوە لکاندووە، بەڵام مەرج نییە هەر حیزبێك گەربەتیوری دانی بەدیموکراتیدا نابێ ئەوا لە پراکتیکیشدا دڵسۆز ئەبێ بۆی.

جارێ بە بڕوای من لە ڕۆژهەڵاتدا دیموکراتی ناتوانێ بەباشی جێگەی خۆی بکاتەوە مەگەر زەمینە سازییەکی لەباری بۆ بکرێ لە پانتایی هۆشی خەڵکیداو ئەو پانتاییە گیانی حیزبەکانیش بگرێتەوەو ئامادەی هەموو گۆڕانێکی بنەڕەتی بن بۆ دانانی کۆمەڵێکی مۆدێرن کە ئازادی تاکەکەسی تیا فەراهەم بێو لەوێوە کۆمەڵ بەرەو گەشە کردن بڕوات.

پارتی خاوەنی کەلەپورێکی کۆنینەیەو بە ئاسانی ناتوانی دەستی لێ هەڵبگرنو ئەو کەلەپورەش بەندە بەکەسێتی مەلامستەفای بارزانەوە کە بەلای پارتییەوە بووەتە ڕەمز نەك هەر بۆ خۆیان بەڵکو بۆ هەموو کورد. هەرچەندە مەلا مستەفا لە بەڕێوەبردنی شۆڕشدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێناو لە پرۆسەیەکی خۆبەدەستەوەداندا ئاشبەتاڵی بەشۆڕشو هێزی شۆڕشگێری کورد کردو دواجار لە ئەمریکاوولاتی غەریبیدا سەری نایەوە، تەرمەکەیشی هەر

لەوولاتی ئێرانی غەربیدا نێژرا لە شاری شنۆ.وادیار بوو لەدەمەدەمی بەستنی کۆنگرەکەیاندا بڕیاریان دابوو تەرمەکەی مەلا مستەفاو ئیدریسی کوڕی بهێننەوە بۆ کوردستان. بۆ ئەم مەبەستەش دایاننابوو لە ڕێگەی پێنجوێنەوە بیانهێننەوە لەمەشدا نەخشەیەکیان هەبوو، ئەیانویست بە زۆرترین ناوچەو شارو شارۆچکەکانی کوردستاندا تێبپەڕن‌و بەشێکی زۆری خەلکی لە ڕێوڕەسمی پێشوازیدا بەشداری بکەن‌ووەکو خۆپێشاندانێکیش بێ بۆ هێزو توانای پارتی لە ناو خەلکیدا. کاتێ کە تەرمەکەیان بەناو ئاپورەی خەلکیدا ڕەتئەبێ، ئەبێ چەند پەڕۆی زەرد هەلبکرێ کە نیشانەی قودرەتی پارتییە.!

ڕۆژی ١٠/٤ لە گەلْ دەروێش ئاغادا سەردانی لیوای ٢٣ی بێتوێنمان کرد لە گەڕانەوەماندا لە نزیك دێی کانیخان عەبدولوهەیمن بارزانیمان بینی کە لەسەردانی هەڤالْ مام جەلال ئەگەڕایەوە. لای خۆیەوەوەسفێکی زۆری هەڤالْ مام جەلال کرد کە بەلێنی باشی پێداون بۆهاوکاری کردنی گەڕانەوەی تەرمی مەلامستەفاو ئیدریس. لەگەلْ ئەوەشدا ئەمن ئەوم ئەناسی‌و ئەئەو ئەیزانی من یەکێتیم.

بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەبەستە هەموو هێزەکانی سوپای یەکگرتووی کوردستان خرابوونە ئامادەباشییەوە، هەموو ڕێگاکان تەنرابوون.

ڕۆژی ١٠/٦ چووینە باشماخ لەوێ سەرۆك‌و سەرکردەی هەموو حیزبە سیاسییەکان ئامادەبوون، نوێنەری پارتی نێچیرفان بارزانی بوو بە تەنیا چووبووە جێگایەکی دوور دانیشتبوو کەسی لەدور نەبوو، دیارە خۆی ڕێگای نەئەدا کەس نزیکی بکەوێتەوە. بەلام هەڤالْ مام جەلال هەزاران کەس لێی ئالابوون، خەریکی قسەکردن بوو، باسی بارودۆخی سیاسی کوردستان‌و دنیای ئەکرد.

هەردوو تەرمەکە بە هەلیکۆپتەری ئێرانی گەیەنرانە باشماخ. لەوێشەوە بە ئۆتۆمبیل لەناو ئاپۆڕەیەکی زۆری خەلکیدا کە هەموو حیزب‌و لایەنە سیاسییەکان هاوبەشیان تیا کرد بەرەو سلێمانی بەڕێکران. ئێمەیش بۆ

پاراستنی ئاسایشی ڕێگاو بانەکە هاوڕای تەرمەکان بووین. لەم دەمەدا بوو پێشمەرگەیەکی لیوای ٢٢ ی سوسێ بەهۆی ئارپیجی لەدەست دەرچوون شەهید بوو. تەرمەکان گەیەنرانە سلێمانیو شەوێك لە مزگەوتی کاك ئەحمەدی شێخدا مانەوەو هەڤاڵ مام جەلال ئەو شەوە بە دیاریانەوە بوو تابەیانی بەڕێکران بۆ شاری هەولێرو برانە بەردەمی پەرلەمان لەوێش هەڤاڵ مام جەلالو مەسعود بارزانی قسەیان کردو پاشان تەرمەکان بەرەو زێدی خۆیان کە بارزانە بەڕێخران.

بە درێژایی ڕێگای بەڕێکردنی تەرمەکان هەر لە باشماخەوە تاکو ئەگاتە هەولێرو بارزان خەڵکی بەئاڵای سەوزەوە لە پێشوازیدا بوون، زۆر بە کەمی ئاڵای زەرد دەرئەکەوت. ئەمە بووە مایەی سەرسووڕمانی پارتیو‌وای بۆ نەئەچوون کە ئەو ئامادەییە هەبێتو خەڵکی یەکێتی ئەوەندە زۆربن، ئەمەش لە خۆیدا خوانواندنێکی یەکێتییانە بوو، ئاماژەیەکیش بوو بۆ پارتی کە یەکێتی هێزێکی خاوەن خەڵکی خۆیەتی.

## هاتنی سوپای تورك

هەر لەمانگی ١٠ /١٩٩٢ دا سوپای تورکی لەگەڵ کۆمەڵێك چەکداری کورددا بۆ جارێکی تر هاتنەوە ناو خاکی هەرێمی کوردستان لە ڕێگەی کانی ڕەشەوە. ئەم هێزە بوون بە دووبەشەوە بەشێکیان لەگەڵی ئاریو بەشەکەی تری بەرەو گەلی ڕەش چوون بەمەبەستی یەکگرتنەوە لە خوا کورك.

بیانووی تورك لەم سنوور بەزاندنە مەسەلەی پەکەکە بوو کە لە سنووری کوردستانەوە ئەچنە ناو تورکیاو چالاکییەکانیان ئەنجام ئەدەنو زیان بەهێزی سوپای تورك ئەگەیەننو ئاڵۆزی بۆ درووست ئەکەنو باری ژیانی قورستر ئەکەن بە تایبەتی لە ڕووی ئابوورییەوە کە خۆی ئابوورییەکی لاوازی هەیەو بەدەم گرانییەوە ئەناڵێنن. ئەمە ڕوویەکی مەبەستەکەیەتی بەڵام

ڕووەکەی تریشی بە کەم زانینی دەسەڵاتی کوردەو هەڕەشە کردنە لە توانای حوکمڕانێتی.وەکوئەوە بڵێی هەرکاتێ تورك بیانەوێ سەروەری کورد پێشێل ئەکەن و حیسابی بۆ ناکەن، جگە لەمە ڕوویەکی تریشی هەیە کە تورك هەمیشە هەوڵ ئەدات ئەم بەشەی کوردستان بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی تورکی عوسمانیدا بووە. هەر چەندە تورك ئەم هاتنانەی وەکو بیانوویەك لە دژی پەکەکە پاساو ئەدات، بەڵام لە ناوەرۆکیشدا مەبەستی شاراوەی تری هەیە. بەڵام ناشێ ئەم هەڵوێستە تاسەر بێت و تورکیا چەند لە ڕووی میلیتارییەوە بیەوێ مافی کورد پێشێل بکات ئەوەندە لە ڕووی سیاسییەوە زیان بە خۆی ئەگەیەنێ کە جگە لە تێکشکان هیچی تری چنگ ناکەوێ، لە ڕووی ئابووریشەوە هەڵئەتەکێت چونکە هەموو ئۆپەراسیۆنێك خەرجیەکی زۆری پێویستەو بازاڕی گرانتر ئەکات. خۆ گەر کەمێك لەو کەلی میلیتارستییەی بێتە خوارەوەو دەسەڵاتی شەڕ هەڵگیرسان لە چنگی جەندرمەکانی دەربێنێ و دیموکراتیانە لە گرفتەکانی بکۆڵێتەوەو دان بە مافەکانی کوردا بنێ ئەوا قازانج بەخۆی ئەگەیەنێ و ئاسوودەیی بەرپا ئەکات بۆ خەڵکەکەی.

## گێچەڵییەکانی بزووتنەوە

وەنەبێ ئێمە هەر هەڕەشەی دەرو دراوسێمان لەسەر بووبێ و هەمیشە دەستمان لەسەر بەلەپیتکی تفەنگەکانمان بێ بۆ بەرەنگار بوونەوەی هەر پیلانێکیان. بەڵکو زۆر جار ناکۆکییەکانی ناوەوە مەترسی زۆری بۆدرووست کردووین و ئەو شەڕی خۆبەخۆو لابەلایەی توشمان بووەوای لە دوژمنەکانمان کردووە کە لە ڕووکەشدا تەماشاکەرمان بن و لە پشتیشەوە دنەی زۆرتر بۆ ڕۆچوونمان بەناخی کوشتوکوشتاری یەکتریدا داوە. ئەمەش زیانی زۆری پێگەیاندووین لە قازانجی دوژمنانماندا بووە. فرەتر دووری خستووینەتەوە

لەیەکێتی بەرنامەو هەوڵو تێکۆشانمانو بگرە هەڵوەشاندنەوەی هەر نەخشەیەك کەهەر حیزبو لایەك بۆ ئاییندەی کوردو کوردستان دایانڕشتبێ. زۆر جار لە جیاتی زمانی گفتوگۆ لوولەی تفەنگ سیاسەتمانی بەڕێوە بردووە، بەرژەوەندی تەسك بە سەر گۆڕەپانی تێگەیشتنی فراوانماندا زاڵبووە بۆ لابەلا کردنەوەی گرفتەکانمان. جاریوا هەیە تووشی شەڕێك ئەبی بێ ئەوەی خۆت نەخشەت کێشا بێ یان مەبەستت بووبێ، بەڵام لەولاتەوە ئەوی تر لە بۆسەدایە، ڕات ئەکێشێتە ناو جوغزی ئەو نەخشەیەی خۆی، بێئەوەی بە ئاشکرا هەموو تاڵە دەزووەکانی پیلانەکە دەربکەوێ.

دیارە بزووتنەوەی ئیسلامی کە لەمووڵاتەدا جێ پێی خۆی کردووەتەوەوەکو ئەندامێکی نامۆوایە، ئەو بەرنامەو ستراتیژی لە هی لایەنو خەڵکی تری کوردستان جیایە. بۆیە ئەوەی لایەنە کوردیەکان دایانڕشتووە بڕوای پێ نییە. هەرچەندە بەشداری هەڵبژاردنی کرد بەڵام بۆ مەبەستی دەرخستنی هێزو توانای خۆی نەك لە بڕوابوون بە چارەنووسی کورد.بۆیە پەرلەمانو حکومەتەکەی بە دڵخوازی خۆی دانەناوە، گەرچی داوای مافی بەشداریشی کردووە، هەمدیسانەوە بۆمەبەستە شاراوەکانی خۆی بووە، ئەمە هەڵوێستی بێ ئیتر چۆن پەیڕەوی یاساکانی حکومەتی هەرێم ئەکاتو ئیلتیزام بە بەرنامەکانیەوە ئەکات.

لە یەکێك لەو پیلانە چنراوانەیدا ڕۆژی ۱۹۹۳/۱۰/۲۱ ئۆتۆمبیلێکی بزووتنەوە لە بازگەی ئاسایشی تونێلەکەی دەربەندیخاندا ئامادە نابن پێناسەکانیان بدەنووتبوویان خۆیان ئەچنە ئاسایشو خۆیان ئەناسێنن. ئەمەوەکو تەحەداو گاڵتە پێکردنێك. کە ئەچنە دەربەندیخان یەکسەر ئەچنە بارەگای مەڵبەندەکەیانو گوێ نادەنە ئاسایش. ئاسایش داوا لە مەڵبەندی بزووتنەوە ئەکات کە نوێنەریان بچێتە لایان بۆ لێکۆڵینەوە لەو مەسەلەیە. نوێنەرەکەی بەهەندێ حیمایەوە ئەچێتە ئاسایش لە دەرچوونیدا حیمایەکانی کەدیارە هەمان چەکدارەکانی ناو ئۆتۆمبیلەکە ئەبن تەقە لە ئاسایشەکان

ئەکەنو یەکسەر ٢ ئاسایشی خەڵکی چەمچەماڵ شەهید ئەبنو ٣ ی تریش بریندار ئەبن کە هەموویان سەر بە یەکێتی ئەبن. ئیتر بارودۆخەکە ئەشڵەقێ، تەرمی شەهیدەکان ئەبرێنەوە چەمچەماڵ.

ڕۆژی ١٠/٢٣ لەچەمچەماڵ شەڕ لە نێوان یەکێتیو بزووتنەوە ئەقەومێ، هەروەها لە کەلاریش. بۆ تەشەنە نەسەندنی ئاگری شەڕەکە بۆ ناوچەکانی تر،وەفد درووست ئەکرێ. سەرکردایەتی بزووتنەوە ئەکەونە خۆیانو ئامادەیی دەرئەبڕن بۆ بنەبڕکردنی کێشەکەو بەوەی تاوانبارانو بکوژان تەسلیمی حکومەتی هەرێم بکرێن. بۆ دڵنیاییوەفدێکی بزووتنەوە بەسەرپەرشتی مەلا عەلی عەبدولعەزیز سەردانی دەربەندیخان ئەکات،وەفدێکی تریش کە بریتی بوو لە مامۆستا مەلا محەممەد شانەدەریو کاک حامی حاجی غالیو عارف تەیفور سەردانی دەربەندیخانو کەلار ئەکەن. هەرچەندە ئەو بڕیارانەوەکو پێویست جێبەجێنەکرانو بکوژەکان تەسلیم نەکران. هەر لەو ڕۆژانەشدا مەسعود بارزانی لەسلێمانی ئەبێو لای خۆیەوە تەدەخول ئەکاتو هەوڵ ئەدات شەڕەکە زیاتر پەرە نەسێنێ. هەر چۆنێك بێ ئاو بەسەر ئاگرەکەدا کراو شەڕەکەوەستێنرا سەرەڕای ئەوە ئەم زیانانەی لێکەوتەوە:

- لە شەڕی چەمچەماڵ ٦ پێشمەرگەی یەکێتی شەهیدو ٦٥ هاووڵاتی بریندار ئەبن.
- لە کەلاریش ٢ هاووڵاتی شەهیدو ٥ ی تریش بریندار ئەبن.
- بزووتنەوە لە چەمچەماڵدا ١٢ کوژراوو ٢٣ بریندارو لە کەلاریش ٢ کوژراویان ئەبێ.



# هەرای پارتیو حسک

نەك هەر شەڕ یەخەی یەکێتی گرتبووەکو لایەنێکی ناو حکومەتەکەی هەرێمی کوردستان، بەڵکو پارتیش‌وەکو لایەکەی تری حکومەت ئەویش ملۆزمی بۆ پەیدا بوو بوو، چونکە ساردییەك کەوتبووە نێوان کاکە حەمەی حاجی مەحمودی گوڵە خانەو سەرکردایەتی پارتییەوە دوای یەکگرتنەوەیان.. کە لە هەنگاوێکدا کاکە حەمە لە پارتی کشایەوە.. ئەم کشانەوەیەی کاکە حەمەی حاجی مەحمودی گوڵەخانە لە پرۆسەی یەکگرتنەوە لەگەڵ پارتیدا بەواتای سەرنەکەوتن‌و تێکشکانی یەکگرتنەوەکە دێت کە بایەخێکی سیاسی گرنگی پێدرابوو، هەلایەکی زۆری بۆ کرابوو، بەلاموادیار بوو هەنگاوەکانی ئەم پرۆسەیە بە باشی هەڵنەسەنگێنرابوو یان هەردوو لا بە تەواوی لە نیازی ناوەوەی ناخی یەکتری نەگەیشتبوون بۆیە ماوەی یەکگرتنەوەکەش تەمەنی کورت بوو. پارتی ئەمەیان پێناخۆش بوو نەشیان ئەویست لە بایەخی ئەو هەلایەی بەرپایان کرد بوو کەم بکەنەوە، بۆیە بەشوێنی تۆڵەدا ئەگەڕان لە هەلومەرجی لەباری خۆیدا کاتێك‌ویستیان مەسەلەی شوێن‌و بارەگاکانی سۆسیالیست بە کەلوپەلەکانیەوە بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە ڕووبەڕووی کێشە بوونەوە.

سەرەتا ڕۆژی ۱۹۹۳/۱۲/۱۱ شەڕ لە نێوان هێزەکانی سۆسیالیست‌و لیوایەکی حکومەتدا لە تانجەرۆ بەرپابوو، کە مەلا فایەقی کۆنە حسك فەرماندەی بوو. سۆسیالیست لیواکەیان گرت، ئیتر شەڕەکە تەشەنەی سەند.پارتیش لای خۆیانەوە چوونە سەر فەوجێکی لیوای ۲۲ ی قیادەی مەنتیقەی سلێمانی لە نالپارێز کە ئیدارەی سۆسیالیست بوو، دەستیان بەسەردا گرت‌و هەرچی کەرەسەو کەلوپەلی تێدا بوو تالانیان کردو هەندێ خەڵکیشیان لێکوژرا.

ئینجا پارتی ویستیان کاکە حەمەی حاجی مەحمودیش تەمبێ بکەن، هێزێکی زۆری خۆیان هێنایە ناو سلێمانییەوە، ڕۆژی ١٩٩٣/١٢/٢٢ هەموو دەوروبەری بارەگاکەی کاکە حەمەیان کە لەسەرووی چوار ڕێیانی سەرچنارەوەبوو کۆنترۆڵکرد، تەقە دەستی پێکرد، تەنگیان بە سۆسیالیست هەڵچنی. دیارە بۆ ئەم مەبەستە هەندێ ئامادە کاری کرابوو، پارتی ئەیویست هێزەکانی و لێپرسراوەکانی لە قیادەی مەنتیقەی سلێمانی و کەرکوك سەربەخۆ بەکار بهێنێ بۆ ئەنجامدانی کارەکانی لە شەڕەکاندا بێئەوەی پەیوەندی بە حکومەتەوە بکات بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان.

من ئەو کاتە لە ماڵی خۆمان بووم، کە گرژییەکەم بینی و زانیم کە ئەنجامەکەی بەلای کاکە حەمەدا ناشکێتەوەوەکو خۆم نەك بەبڕیاری سەرکردایەتی یەکێتی چوومە ناو ئەو مەسەلەیەوە، دواتر هەڤاڵان: مەلا ئەحمەد دسکەرەیی، ئەحمەد قەدەفەری، خەلیل سەرکانی، عەبە ڕەق، شێخ حسینە سوور، نوری حاجی عەلی زەرەنگەر، عەلی چەلەبی و هەندێ کەسی تریش فریا کەوتن و هاتن.

ئینجا یەکێتی هاتە ناوەوەو نەیویست کار لەکار بترازێ، لیوای تایبەتی دابەزییە ناو شاری سلێمانییەوەو هەموو ڕێگاکانیان گرت. تەنانەت من خۆم بە پێشمەرگەکانمەوە چووم چوار ڕێیانی سەرچنارم گرت و نەمهێشت کەسی پارتی لەوێوە هاتووچۆ بکات.

وا دانرابوو کە هێزەکانی قیادەی مەنتیقەکان بەشداری نەکەن و لەناو شار دەرچن، بەڵام پارتی خۆیان ئەو هێڵەیان بەزاندوویستیان سوود لەو هێزانەوەربگرن، کە زانییان هەندێ لە پێشمەرگەو فەرماندەکانی یەکێتی تەدەخولیان کردووە دۆخەکە گۆڕا.

دەروێش ئاغا برووسکەیەکی کردبوو کەوا: قووەتی برادەرانی (ی.ن.ك) لەسەر ڕای (ی.ن.ك) سەیتەرەکانیان گرتووە کە مەدخەلی سلێمانین بە ئاگاداری ئەوان پارتی کە ئیتیفاقمان وابوو هەموو پێشمەرگەکانی (ق.م.ك)

و (ق.م.س) لەناو شاردا سەحب بکەنەوە، بەلام ئەمە بە خیلافی هەموو ئیتیفاقێکە بۆیە ئەبێ کاك مەلا عەلی بچێتە سەیتەرەکەی باخی بەختیاریو ئەو چەکدارانە لەسەیتەرەکە دەربکات.

هەر ئەمشەو کاك حامی حاجی غالی لای خۆیەوەوەلامی دەروێش ئاغا ئەداتەوە بەم شێوەیە:

١. لە بەر ئەوەی کاك دەروێش ئاغا دەسەلاتی نییە، نەیتوانی بارەگای قیادەکەی خۆی ڕابگرێ، ئەو ئیتیفاقە لە بارەگاکەیو محافەزەدا کرا بە حزوری هەردوو قیادە. بەبێ ئەوەی هیچ حیسابێك بۆ قیادەکان بکرێت، ئەو ئیتفاقێیە پێشێلکراو ڕەفز بوو لە لایەن برادەرانی پارتییەوە.

٢. لەبەر ئەو هۆیانە بۆ پاراستنی ئەمنو ئاسایشی سلێمانی ئەو هێزەی (ق.م.ك) لەوێ ماونەتەوە، ماوە نادات بە دەستدرێژی هیچ لایەك. مەلا عەلی ئەندامە لە(ق.م.ك) نەك لە (ق.م.س). پێویستە لە (ق.م.ك) تەوجیهاتوەربگرێ نەك لە کاك دەروێش، ئێمە بەو تەوجیهە نارازینو ئیلتزامی پێوە ناکەین بە ئەمریوەزیر نەبێت، برادەرانی پارتی ٣ ڕۆژە بە بێ ئەمری قیادەو لیواو فەوجەکان هێزەکانی خۆیان سەحب کردووە بۆ شەڕ.

کە یەکێتی هاتە ناوەوە پارتی نەخشەکەی پووچەڵ بووەو ناچار هێزەکانیان کشانەوەو کاکە حەمەو سۆسیالیست لە پلانی مەرگێکی جاوەڕوانکراودا ڕزگاریان بووە.

من لە چەند ڕوانگەیەکەوە پێم ناخۆش بوو سۆسیالیست تیا بچن:

١. ئەمانەوەکو هێزێکی بەرهەڵستکاری کوردایەتی دژی داگیرکەر لە گۆڕەپانی خەباتدا بوون، پێشمەرگە بوونو شەهیدیان داوە.

٢.وەکو لایەنێکی سیاسی پەیوەندییان بە بەشێکی خەلکی ئەم کوردستانەوە هەیەو بەپێی قەوارەی خۆیان دۆستو لایەنگریان هەیە.

٣.وەکو ئەرکێکی دیموکراسیانە پێم ناخۆش بوو حیزبێکی گەورە لایەنێکی بچووك قووت بداتو لەبەر هەڵەیەکی هەڵوێست یان تێروانین لە بەرنامەیەك

بەشەڕو پەلامار ئاسەواری لایەك ببڕێتەوە، نەك بە ڕێگەی ئازادی دان بەهەر لایەك بۆوەرگرتنی مافی خۆی لە ڕاپەڕاندنی کارەکانیدا لە پانتایی خەبات و کوردایەتیدا.

هەرچەندە تێڕوانینی تایبەتیشم بەرامبەر بە سۆسیالیست و پێکهاتەکەی و بەرنامەکەی هەیەو لە کەموکوڕی و خەوش و هەڵە بەرخوردار نین و کاتی خۆیشی کارەساتێکیان هێنا بەسەر یەکێتیدا لە هەلومەرجێکی ناسکداو بۆ دەستکەوتی تایبەتی و مەرامخوازی کەسێتی لە یەکێتی جیابوونەوەو بەرەیەکی تری شەڕیان زیاد کرد لە کاتێکدا یەکێتی لە هەموو لایەکەوە ئابلۆقە درابوو چ لای ئێران بێ یان پارتی یان عێراق.

## گەشتی سوریا

ناوەڕاستی مانگ ١٩٩٣/١٢ بوو سەردانێکی هەولێرم کرد.هەڤاڵ مام جەلال بە گەشتێك بەرەو سوریا ئەچوو. پێشتر باسی ئەوە کرابوو هەرکاتێك بەڕێزیان بچێتە دەرەوە هەندێك کادیر لەگەڵ خۆیدا ببات بۆ شارەزا بوون و دنیا بینین. دیارە باسی زۆر کەس کرابوو، کەس منی بە خەیالدا نەهاتبوو، هەڤاڵ مام جەلال خۆی منی دیاری کرد بوو کە لەگەڵیدا بچمە سوریا. کە هەڤالان عارف روشدی، نەوزاد کاکە ڕەش، مەحمود عوبێدو م. گۆرانیش یاوەری بوون. لە هەولێرەوە بەرەو بادینان کەوتینە ڕێ و گەیشتینە زاخۆ لە بارەگای ئیدارەی یەکێتی لاماندا. پاشان لەوێوە چووینە ناو خاکی سوریا، چووینە قامیشلی کە شارێکی کورد نشینە دوو ڕۆژ لەوێ میوانی حکومەتی سوریا بووین، دوایی ئۆتۆمبیلیان بۆ هێناین بەرەو دیمەشق، لە ڕێگادا بە شارەکانی حەلەب و حەماو حمس دا تێپەڕین.

ئێمە میوانی حکومەتی سوریا بووین. لە ئوتێلێکی پاك و پوختەدا بەناوی ئەیوان دابەزین. لە مانەوەشماندا زۆر جێگا گەڕاین و سەردانی هەندێ شوێنمان کرد کە بۆ من تام و چێژێکی تایبەتی هەبوو، چونکە پەیوەندییان

بەلایەنی مێژوویی نەتەوەکەمەوە هەبوو. چوومە سەردانی ئارامگای زانای گەورەی گەلەکەمان مەولانا خالیدی نەقشبەندی. کەوەکو خواناسێکی گەورە توانی ڕێبازی نەقشبەندی بێنێتە کوردستانو عێراقەوەو لە ئەنجامی ناکۆکی لەگەڵ قادرییەکانی سلێمانیدا ناچار ئەبێ ڕێگای غەریبی بگرێتە بەرو لە سوریا لەنگەر بگرێتو خەریکی کاروباری ڕێبازەکەی بێت. شانازییە بۆ کورد کەڵە پیاوی‌وای تێدا هەڵبکەوێت کە سەدانی تریشی تیا پەیدا بووە لە بوارە جیاجیاکاندا بۆ خزمەتکردن، بەڵام جێگای داخە کە لەووڵاتەکەی خۆیدا جێی نەبێتەوەو پیلانی‌دژ بکرێو تا دەربەدەری‌ووڵاتان بێت. هەرچەندە جێگای داخیشە مەردێکی ئەم (ئێلی جافە) لەو دەشتی شارەزوورەدا ئەو کەسێتییە مەزنەی لێ پەیدا ببێ تەنیا لە ڕێگای خواپەرستی‌و کاروباری ئاینیدا کار بکاتو هەوڵەکانی بۆ خزمەتی گەلەکەی نەخستبووە کارو هەر هیچ نەبێ نەیویستووە ببێتە کاربەدەستێکی گەورە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکی کورد لە کوردستانداو پایتەختی سەڵتەنەتی عوسمانی ناچار بکردایەوەکو هێزێك تەماشای بکرابایە. کە چووەتە سوریاش هەر کونجی خانەقای گرتووە. دوایش بەبێدەنگی سەری ناوەتەوە هەرچەندە هەندێك‌وای بۆ ئەچن کە مەولانا هەستی کوردایەتی لابەهێز بووەو لە شیعرو نووسینەکانیدا ئەو مەبەستە بەجوانی دەرئەکەوێ، دوای ئەوەی لەدوای خۆی مریدێکی زۆرو شوێنەوارێکی فرەی نەك لە کوردستانو عێراقدا بەڵکو لەووڵاتانی تری ڕۆژهەڵاتیشدا بەجێهێشت کە تا ئێستاش پەیڕەو کەرانی ماونو بەردەوامن. کەچی ئارامگاکەی‌وێرانەیە. ئەو هەموو سۆفیەی نەقشبەندی لە کوردستانو ڕۆژهەڵاتدا هەن‌وشانازی درووستکردنی ڕێبازەکە بۆ مەلانا ئەگەڕێننەوە، بەڵام کەسێکیان سەرەڕای زۆر دەوڵەمەندییان بیر لەوە ناکەنەوە یان ئامادە نین گۆڕەکەی چاك بکەنەوەو هەندێ بایەخی بدەنێ کەلە هی پیاو چاکێکی خواپێداوی موسوڵمان بکات. تەنانەت گومەزی ئارامگاکەی ڕووخابوو، کابرایەك لەسەر حیسابی خۆی چاکی کردبووەوە.

هەروەها سەردانی ئارامگای سەلاحەدینی ئەیوبیمان لە ناو مزگەوتی ئەمەویدا کرد.کە یەکێکە لە سەرکردە گەورەکانی دنیای ئیسلامەتی. بەڵکو

شەڕی خاچپەرستانی کردووە، قەڵەمڕەوی ئیسلامی پاراستووەو تاکو ئێستاش عەرەب بە شانازییەوە ناوی ئەهێنن‌و باسی قارەمانێتی ئەکەن، بەڵام‌وەکو کوردێك نا. زۆر شۆڤێنی عەرەب هەیە هەر بە عەرەبی دائەنێن‌و پێیان ناخۆشە ئەو پیاوە ڕۆڵێکی‌وا گەورەو بە بایەخی لە مێژووی ئیسلام‌و عەرەبدا گێڕاوەو توانیویەتی لە ناوجەرگەی دەسەڵاتی عەرەب‌و ئیسلامدا دەوڵەتی ئەیوبی درووست بکاو حوکمڕانی بکات بە کورد ناو ببرێ.

مەخابن ئەو سەرکردە زەبەلاحە ئارامگاکەی لە شوێنێکی تەنگەبەری مزگەوتی ئەمەویدایە بەجۆرێك کە شوێنی دووکەس نەئەبووەوە لە پاڵیداوێنە بگرین، خۆ گەر سەرکردەیەکی مامناوەندی عەرەب بوایە ئەوا گۆڕەپانێکی گەورەیان بۆ ئارامگاکەی تەرخان ئەکرد.

تێناگەم عەرەب بۆ ئەوەندە فشە بە سەلاحەدینەوە ئەکەن‌و فلیمی گەورەی لەسەر دەرئەکەن. کەچی لە ڕاستیدا لەو تەنگەبەرییەدا لە ناو گۆڕەکەیدا فەرامۆش کراوە.وابزانم تەنیا مەبەستیان ئەوەیە شانازی بە مێژووی خۆیان‌وئیسلامەوە بکەن کە سەلاحەدینی پێ گەیاندووە، ئەگینا ئارەزووی ئەوە ناکەن سەلاحەدینێکی کوردوەکو ڕزگارکەر نیشان بدەن. سەلاحەدین ئەوەندە خزمەتی بواری عەرەب‌و ئیسلامی کردووە کە نەك هەر خۆی‌و بنەماڵەکەی بەڵکو خەڵکێکی زۆری کوردیش لە سنووری دەسەڵاتی قەلەمڕەوییەکەی خۆیدا بەکار هێناوە بۆ بەرگری کردن لە عەرەب‌و ئیسلام. ئەی نەئەبوو لەو زەمەنەشداوەکو کوردێك دوو تیریشی بۆ کورد بهاویشتایە..؟! تا ئێستا لە تەلارێکی گەورەدا گۆڕەکەی لە ناو چراخانی نیشتمانەکەیدا برازایەتەوە.

هەروەها سەردانی گۆڕی شاعیری مەزنی کورد قەدری جانمان کرد.هەروەها سەردانی گۆڕی گەورە پیاوی کورد جەلادەت بەدرخانیشمان کرد ئەمانە ناویان لە لاپەڕەکانی مێژووی کورد بە بەرزییەوە ئەدرەوشێتەوە

چونکە هەموو ژیانو تەمەنی خۆیان لە پێناوی کورددا تەرخانکرد.بۆیە هەمیشە لای نەتەوەکەی خۆیان بە گەورەیی ماونەتەوە.

هەروەها سەردانی دوڵی بلودانمان کرد کە سەیرانگایەکی زۆر خۆش و دلگیرە لە نێوان سوریاو لوبناندایە. لەم گەشتەماندا هەڤاڵ مام جەلال لەگەڵماندا بوو کە چووینە ئەوێ مقۆمقۆ کەوتە ناو کرێکارانی سەیرانگاکەوە، زۆربەی ئەوانەی لەوێ کاریان ئەکرد کورد بوون، بەهاتنەکەی هەڤاڵ مام جەلالیان زانیبوو، لە ئێمەیان پرسی: ئەوە هەڤاڵ مام جەلالە ..؟ وتمان: بەڵێ. لە دواییدا لێمان کۆبوونەوە. ئەوەندەیان وێنە لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلال گرت باس ناکرێ.

ڕۆژی ١٢/٢٥ سەردانێکی کاك دانای ئەحمەد مەجیدمان کرد کە نوێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو لای حکومەتی سوریا. بۆ ئێوارەکەی چووینە ئوتێلی تولەیتیلە کە یەکێتی نیشتمانی کوردستانی تیا دامەزرا. هەر لە خۆمەوە هەستم بە مووچرکە ئەکرد لەشمی ئەتەنییەوە، ئەو ڕۆژانەی کۆمەڵێك تێکۆشەری کورد لەم شوێنەدا بڕیاری هەڵگیرسانەوەی شۆڕش بدەن.. کە تەماشای دارو دیواری ئەو ئوتێلەم ئەکردوێنەی دانیشتنەکانی ئەو سەرکردانەم ئەهاتەوە پێش چاو: گفتوگۆ گەرمو گوڕەکانیان، بڕیاری شۆڕشکردنەوە، خۆسازدان بۆ چوونەوە ناوخاکی کوردستانی ئاشبەتاڵکردوو.

# شەڕی بزووتنەوە

ڕۆژی ١٩٩٢/١٢/٢٦ بوو هەواڵی شەڕی بزووتنەوەمان لە گەرمیاندا بیست. ئەو شەڕەی کە بە ناوی شەڕی قازەوە تۆمار کرا. کە هێشتا شەڕی کیلی گۆڕ لەم سنوورەدا لە یاد نەچووبووەوە. ناکۆکییەکانی ناو هەناوی کۆمەڵگای کوردی هەمیشە ڕوو لە تەقینەوەیە، چونکە تێگەیشتن نییە، هەردەم دەمی شمشێرەکانمان تیژ ئەکەینەوە، کەمتر بیرمان بۆلای پێکهاتن ئەچێ. کە شەڕیش قەوماو شیرازە تێکچوو، چاوەڕێین خێرخوایەك بکەوێتە نێوانمانەوەو ئاڵای ئاشتی هەڵبکرێ، لەو بارەدا بەزەییمان بە ڕووباری لرفەی خوێنی بەناهەق ڕژاودا نایەتەوە دڵمان بەلاشەی ئەو خەڵکە بێگوناهە ناسووتێ کە ئەبنە قوربانی گەمەی سیاسەتبازی بێهوودە کە کەسانێ پەیڕەوی ئەکەن دڵو هەستیان نییە چرای ئومێدی تیا بسووتێ. نەخوازەڵاش بۆ کۆمەڵێك کە کەوتوونەتە بازرگانی کردن بە ناوی ئایینەوە. چونکە تووشی دووفاقیی بوونو لە کەسایەتیاندا ناتوانن گونجانێك بسازێنن لە نێوان عەقڵو خۆبەستنەوە بە ڕابوردووی ئاینییەوە. لەم زەمەنەدا کە هەموو بەربەستەکان دائەڕمێنو نێوان مەودا دوورەکانیش زۆر نزیك بوونەتەوەو مرۆڤایەتی ئەوەندەی گەشەی کردووە پێویستی بە تەئویلو لێکۆڵینەوەی ئاینی نییە. بەڵکو لەهەندێك حاڵەتدا ئەبێ گونجان دروست بکرێت، یان ئەبێ ئێمەش بۆ ئەوەی نەبین بە ژێر لێشاوی لافاوەوە ئایینوەکو مەسەلەیەکی تایبەتی مرۆڤ لەگەڵ خوای خۆیداوەربگرینو نەیکەینە ئایدیۆلۆژیایەك بۆ پەرستنوەکو کراوەو ئەکرێو ڕۆژانە لە کولەکەی بیرو هەستمانا ختوکەمان ئەدرێ.

ئیسلامییەکانی کوردستانوەنەبێ تایبەتمەندێتی ئاینی ئیسلام لە کوردستاندا ڕەچاو بکەن، بەڵکووەکو هەموو توندڕەوەکانی تری بیری ئیسلامی نوێ لە ژێر ئەو کارتێکردنەدا ئەیانەوێ کۆمەڵگای کوردی پەلکێش بکەنو

بیکەنە بنکەیەکی سەرەکی جێبەجێکردنی بەرنامەی کارو جوڵانەوەکانیان لە ڕۆژهەڵاتدا بە تایبەتی کوردستان ڕۆڵێکی هەیە بۆ جموجووڵو هەڵسووڕاندن. هەردەمێکیشە خەڵکی جیاجیا بە فیتی دەوڵەتانی ناوچەکە درووست ئەکرێنو سازئەدرێن بۆ لە ناودانی بزووتنەوەی کوردایەتیو لە کارخستنی جووڵەی دیموکراسیانەو هەوڵی چەپگەرایی. هەر لە سەرەتاشەوە ڕێگە لەو جموجووڵە نامۆیانە گیراوە، ئەمەش بووەتە هۆی ئاڵۆزی نێوان هێزە عەلمانیو ئایینییەکانو تا دێت ناکۆکییەکان پانتایی زۆرتر بەخۆوە ئەگرێت. هەر تەکانێك بە مەبەستێکی نالەبار بورکانی ڕقو بوغزی ئەتەقانەوەو کارەساتی شەڕی لێپەیدا ئەبوو.

ئیسلامییەکانی کوردستان گوێ بەوە نادەن کە ئیسلام تەنیا ئایین نییە لە کوردستانداو ئەبێ ئاماژە بۆ بوونی ئاینو مەزەبەکانی تریش بکرێو ڕێزیان لێ بگیرێ، بەڵکو ئەبوایەوەك چۆن عەرەب یان فارسو تورك ئایینیان خستووەتە خزمەتی قەوارەی نەتەوایەتیو نیشتمانیو کلتوری خۆیانەوە ئاواش ئەمان بهاتنایە بۆ کورد کارێکیان بکردایەو لە پەنا ئاییندا کولبەیەکیان بۆ کورد پێکەوە بنایە.

کورد گەرچی میللەتێکی موسڵمانە بەڵام لە پاڵ ئیسلامدا مافی پێشێل ئەکرێ، شەڕی جینۆسایدی دژ ئەکرێ. بە داخیشەوە ئیسلامییەکانی کوردستان پاساو بۆ ئەو مەبەستگەرایی ئایینییە دێننەوە کە جگە لە خزمەت کردنی شۆڤێنێتی عەرەب یان نەتەوە سەردەستەکانی تر هیچیتر نییە.

بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستانی عێراقوەکو ڕێکخستن ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٦ کە پەیوەندی بزووتنەوەی ئیسلامی لەلایەن مامۆستا شیخ محەممەد بەرزنجییەوە درووستکراو لە ساڵی ١٩٨٧ بزوتنەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق لە لایەن مەلا عوسمان عەبدولعەزیزو مەلا عەلی برایەوە دامەزراو مامۆستا شێخ محەممەد بەرزنجی خۆیشی بووە ئەندامی مەکتەبی سیاسییەکەی، هەرچەندە پەیوەندی مەلا عوسمانو مەلا عەلی بە کاری ڕێکخستنی ئیسلامییەوە بۆ کۆنتر لەم مێژووە ئەگەڕێتەوە. کاتێ کە سەرانی

ئیخوان موسـلیمینی عێـراق هاتوونەتـە هەڵەبجـەو گـەرایان دانـاوە یەکـەم کەسانێك پەیوەندییان پێوەکردوون ئەم دوو مەلا کوردە بوون کەوەکو میکرۆب چوونە نـاو خـوێنی کوردایـەتیو ئالودەیـانکرد.وەنـەبێ ئەمانـە لای خـەڵکیش خۆشەویست بن بەڵکو بە گێرە شێوێن لـە قەڵەم دراون. ئـەڵێن کـاتێ کـەخێڵی مەلا عوسمانو ملا عەلی ئەچنە هەڵەبجە حامی بەگی جاف ئـەڵێ: ئـیتر خێـری هەڵەبجە ببەخشنەوە مادام ئەمانە هاتنە هەڵەبجەوە.واتا حامی بـەگ پێشبینی ئـەوەی کردبـوو ئەمانـە قـۆرتو تەگـەرە بەسـەر هەڵەبجـەدا ئـەهێنن. نـەك هەڵەبجە بەڵکو بە سەر هەموو کوردستانیشدا چونکە بزووتنـەوەوەکو ڕەوتێکی توندڕەوخۆیان ناساندو لەژێر کارتێکردنی بیری سەید قوتبدا بـوون، جگە لـە خۆیان هەموو خەڵكو لایەکیان بە جاهیلو کافر دائـەنا. ئەیانەوێ خەلافەتی ئیسلامی لە سەر پشتی حوشتر زیندوو بکەنەوەو لە ژێر باری ڕیشی چڵکناویدا فەرمانڕەوایی جیهانی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو بکەن.

سـەرەتای ئـەم شـەڕە ڕۆژی ١٩٩٣/١٢/١٧ لـە کفریـدا سـەری هەڵـدا کـە کابرایەك بە نـاوی ڕەشە خومێنی لەگەڵ دراوسێیەکیاندا لەسەر قاز شـەڕیان ئـەبێ، دراوسێکەیان سـەر بـە بزووتنـەوە ئـەبێ، ئـەیگرن فەلاقەیـەکی تونـدی ئەکەن لە بارەگاکەی خۆیاندا کە لە هی مرۆڤ ناچێو بەشێکی تێهەڵدانەکەیشی لەبەر ئەوە بووە کە سەر بە یەکێـتی بـووە. ڕەشـە هانـا بـۆ کۆمیتـەی ڕێکخسـتن ئەباو ئەو ئەشکەنجەیە سۆزی هەندێ لە پێشمەرگەکانی یەکێتی ئـەورووژێنێ. ئەچـن لــە دەروازەی کفـری بۆســەیەك بــۆ بزووتنــەوە دائــەنێن کــە دوو ئۆتۆمبیلیانی تێ ئەکەوێو لێیان دێنە دەستو ٤ کەسیان ئـەکوژرێو ٢ کەسـیش بـەدیل ئـەگیرێو ئۆتۆمبیلکەشـیان دەسـتی بەسـەردا ئـەگیرێ. لـە کوژراوەکـان دوانیان خەڵکی ڕانیەو یەکێکیان کەلاریو ئەوی تریشیان دەربەندیخانی ئەبێ.

کە دەنـگو باسـەکە ئەگاتـە سـەرکردایەتی یـەکێتیو بزووتنـەوە ڕۆژی ١٢/١٨ مامۆستا شێخ محەممەدی بەرزنجی ئەندامی مەکتەبی سیاسی بزووتنـەوە لەگـەڵ لیژنەیـەکی یـەکێتی دا کـە بریتـی بـوو لـە هـەڤاڵان عیمـاد ئەحمـەد لێپرسراوی مەڵبەندی کەرکوكو مستەفا چاوڕەش پارێزگاری کەرکوكو م. عەلی

عەبدوللا و عوسمانی حاجی مەحمودو عەدنانی حەمەی مینا بە دەم کێشەکەوە ئەچن‌و ئەگەنە کفری‌و سەردانی بارەگای هەردوولایان کرد لە بارەگای بزووتنەوە مامۆستا شێخ محەممەد تیشك ئەخاتە سەر ئەو مەسەلەیەو ئەیەوێ لە ڕێگەی ئسولییەوە ئیجرائات بکرێ، هەندێ لە چەکدارە ڕیش تۆزاوییەکانی ئەو ئەشکەوتەی لێ کەنار گیر بوون بەرهەڵستی‌ووتەکانی مامۆستا ئەبن‌و بێشەرمانەوەڵامی مامۆستا ئەدەنەوە کە نابێ تەرمەکان بشۆردرێن‌و کفن بکرێن. ئەبێ هەر بە جلی خوێناوییەوە ڕەوانە بکرێنەوە. هەرچەندە ئەوان لەچاو زانایی مامۆستا لە شەرعی ئیسلامدا هیچ نەبوون نەك‌وەك زانایەك بەڵکو وەکو ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی بزووتنەوەش ڕێزیان لە قسەکانی نەگرتبووو بایەخیان پێ نەدابوو. هەڤاڵانی یەکێتی مامۆستا دڵنیا ئەکەنەوە کە تەرمەکان هەم شۆردراون‌و هەم کفن کراون‌و ئامادەی ڕەوانەکردنن. ئیتر مامۆستاو هەڤاڵانمان لەوێ ئەڕۆن‌و تەرمەکان لەگەڵ خۆیان ئەبەن.

بە ڕاستی چوونی هەڤاڵانمان بۆ بارەگای بزووتنەوە بە بێ هێزێکی چەکداری ئەوتۆ تەنانەت لەگەڵ گەورە لێپرسراوێکیشیاندا موجازەفە بووە، ئەو دڵڕەشانە هیچ بە لایانەوە گرنگ نەبووە دەستدرێژێکیان لێبکەن‌و تەواویان بکەن لە کاتێکدا پێشمەرگەیەکی حیمایەی هەڤاڵان گوێی لە چپەی چەکدارەکانی ئەو چەتەولانە بووە کەوتوویانە ڤیروسیا لەوەی خۆشمان هەقە دەستێکیان پیا بهێنین.

مامۆستاو هەڤاڵان تەرمەکەی کەلار ئەنێرنەوەو ئەگەنە دەربەندیخان بۆ ناردنەوەی تەرمەکەی دەربەندیخانیش مامۆستا بۆ خۆی ئەچێتە بارەگای مەڵبەندی بزووتنەوەو دوای مشتومڕێکی زۆر بە هاتو هاوار هێرش ئەکەنە سەر مزگەوتی کەناساوای دەربەندیخان کە تەرمەکانی لێبوو. هەڕەشە لە یەکێتی‌و کوفر ئەکەن. دوایی دوو تەرمەکەی ڕانیە بەرێ ئەکرێ بۆ سلێمانی‌و لەوێشەوە بۆ ڕانیە. کە تەرمەکان ئەگەنە ئەوێ، بزووتنەوە ئەشڵەژێن تەرمەکان نانێژن، دیارە مەبەستیان تۆڵە سەندنەوە ئەبێ.وەکو کارێکی نەخشە بۆ داڕێژراو چەکدارانی بزووتنەوە بەسەرپەرشتی مەلا عەلی باپیر پەلاماری

کۆمیتەی ڕێکخستنی ڕانیە ئەدەن، هەڤاڵانی کۆمیتە ئاگایان لە هیچ نابێ، ئەکەونە بەر ئەو شاڵاوەو لە ئەنجامی تەقەو پەلاماردا کادیری هوشیارو چالاکی یەکێتی مامۆستا محەممەد سوڵتان شەهید ئەبێو ١٠ کەسی تریش بریندار. ئەمەوای کرد کە جەماعەتەکەی UN ڕانیە بەجێ بهێڵنو شارۆچکەکە چۆڵ بکەن.

نەك هەر ئەمە بەڵکو مەلا عەلی باپیر لە ڕێگەی برووسکە فتوایەکەوە بۆ هەموو مەڵبەندو هەرێمەکانیان بەنزین بەسەر ئاگری شەڕەکەدا ئەکاو دوور لە هەستی مرۆڤایەتی.. ئیسلاموەکو پەیژەیەك بەکاردێنێ بۆ بڕیاری کوشتن:

لە / مامۆستا عەلی باپیر

بۆ / هەموو مەڵبەندەکانو هەرێمەکان

بسم الله الرحمن الرەحیم

ئەی شێرە کوڕەکانی ئیسلام، ئەمڕۆ پیرۆزترین ڕۆژە لە تەئریخی ئیسلامدا، جاهەر لەبەر ئەوە بە توندی لێیان بدەنو دەستیان لێ مەپارێزن. هەوڵبدەن لە پیاوە گەورەکانیان بکوژنو هەر دیلێکتان گرت بیکوژنو مەیهێڵنەوە.

لە هەمان کاتدا مەکتەبی سیاسی بزووتنەوە بە بێ بیر لێکردنەوەو لە ژێر کارتێکردنی سۆزەوە بۆ تۆڵە سەندنەوە برووسکەیەکیان بڵاو کردەوە:

لە / م. س

بۆ / هەموو لایەك

تکایە لە هەموو کوردستان دەست بەکار بنو شەڕ دامەزرێننو دەست مەپارێزن بەهیچ شێوەیەك، ئەوانە پیاوی بەکرێگیراوی ئەمەریکاو یەهودن، جا بۆیە کوشتنیان خێرەو لەو دنیا خودای گەورە ئەت بەخشێ.

دەم خۆش ئەی پیاوەکانی خودا، دەروونتان شاد ئەی جەللادەکانی لەوێنەی قەعقاعو هاوڕێکانی تری کە لە زەماوەندی خوێن ڕشتنو کوشتو

بڕیندا ئاسودە ئەبن. ئەوە ئێوە بەو دڵو دەروونە زوخاوییەوە دێنو ئایینی خودا پەخش ئەکەنەوەو پێگەکانی ئەچەسپێنن. لە جیاتی ئاشتی فەتوا ئەدەن، دەست مەپارێزنو گەورەکانیان بکوژنو دیلەکانیان مەهێڵنەوە هەر کەس لەگەڵتانا نەبێ بەکرێگیراوی ئەمەریکاو یەهودە.

کە دیارە خۆشیان لە کام فابریقەیوولاتو دەزگای تیرۆریستانەوە بە ناوی ئیسلامەوە سەریان لە هێلکە جوقاوە ..؟! کە جۆری پەیوەندییەکانیان دیارەو ئەزانرێ لە کوێوە خۆراکیان ئەدرێتیو ئامادە ئەکرێن بۆ پیلانگێڕی.

لەگەڵ ئەو هەموو هەڵەو هەڵەشەییانەی بزووتنەوەدا یەکێتی ئەیویست لەوە زیاتر شەڕەکە کلپە نەسێنێ، لە هەوڵی جیدیدا بوو بۆ ڕاوەستانی شەڕەکە، تەنانەت هەڤاڵ مام جەلال لە سوریاوە بەردەوام لە پەیوەندیدا بوو بۆ دانانی چارەسەر. لە هەوڵێکی تایبەتیشدا بۆ تەشەنە کردنی زیاتری شەڕەکە ڕۆژی ١٢/٢٠ هەندێ لە مەلاکانی بزووتنەوە: مەلا برایم، جەمال ئەشرەف قارەمانی، مەلا محەممەدی خالدانی لەگەڵ هەڤالان عوسمانی حاجی مەحمودو م. عەلی دا ئەچنە کەلارو کفری. لە کفری مەلا برایمی کوڕی مەلا عوسمانو دڵشاد گەرمیانی ئەمێننەوەو ڕۆژی ١٢/٢١ لە هەوڵێکی خەڵکی کفری دا لەگەڵ هەردوولادا بۆ ڕێگە گرتن لە شەڕ کردن نوێنەری هەردوولا (م.علی، مەلا برایمو دڵشاد گەرمیانی) لە بارەگای ناوچەی پارتی بەیەك ئەگەنو شەوەکەیشی بەچاودێری هەندێ لە پیاو ماوقولانی کفری لەوێ ئەمێننەوە.

هەر لەمرۆدا بۆ زیاتر ئالۆز بوونی دۆخەکەو هەلومەرگرتن ئاغاکانی پشدەر بۆسە بۆ جووتیارەکان دائەنێنو شەڕیان ئەبێو خەڵکیشیان لێ ئەکوژرێ.

لە چوار قورنە شەڕ بە خەستی لە نێوان یەکێتیو بزووتنەوەدا ڕووئەدات. لە هەڵەبجەو عەربەتیش هەردوولا پێکەوە دائەنیشو ڕێککەوتنی شەڕ نەکردن مۆر ئەکەن. بەڵام لە هەیبەتسوڵتان کە بنکەیەکیانی لێ بووە سەیتەرە دائەنێنو خەڵکانی سەر بە یەکێتیو پارتی ئەگرن.

هەر لەمرۆدا ڕژێم بە پاڵپشتی کۆپتەرو تانك هێرش ئەکاتە سەر فەوجی ٢ی لیوای ٣ لە تەکیەو لە بەیانییەوە تاکو کاتژمێر ٣ی پاش نیوەڕۆ شەڕ بەردەوام ئەبێ‌و هەندێکیش دێتە پێشەوە.

دیارە هەموو ئەمە بۆ زیاتر گوشار خستنە سەر یەکێتی بەرپاکرا، لە ڕۆژی ١٢/٢٢ دۆخی شارەزوور ئاڵۆز بووەوە، بزووتنەوە لە باریکەو زەڕایەن‌و زەمەقی تا کاتژمێر ١ی دوای نیوەڕۆ سەیتەرەیان دانابوو.

لە سلێمانیش بە هاوبەشی مەڵبەندی سلێمانی یەکێتی‌و لقی ٤ی پارتی، م. جەمال‌و فایەقە ڕەش و (ق.م.س)و(ق.م.ك) دانیشتنیان کردو چەند بڕیارێکیشیان ئەرکرد:

١. ئەرکی پاراستنی هێمنی‌و ئاسایش لە سنووری شاری سلێمانی بدرێتە دەستی پۆلیس‌و ئاسایش.

٢. هەر قیادەی مەنتیقەیەك لە سنووری قیادەکەی خۆی ئاسایش بپارێزێت.

٣. فەوجی حیمایەی (ق.م.س) هێز بنێرن بۆ سەیتەرەی سەرکارێزو دەباشان.

٤. لیوای (ق.م.ك) هێز بنێرن بۆ تونێلەکەی دەربەندیخان.

٥. فەوجی حیمایەی (ق.م.ك) هێز بنێرن بۆ سەیتەرەی بەختیاری.

٦. لیوای ٢٢ سەیتەرەی دووکان قەپات ئەکات.

٧. لیوای ٣و لیوای ٤ ی (ق.م.ك) هێز ئەنێرن بۆ دەربەندی بازیان.

لە هەمان کاتدا شەڕ لە سنووری بتوین بەردەوام بوو، لەحەوزی سۆران دا هەندێ شوێن لە بزووتنەوە پاك کرایەوە.

ڕۆژی ١٢/٢٣ دۆخی گەرمیان گرژ بوو، هێزەکانی یەکێتی ئابڵۆقەی هێزەکانی بزووتنەوەی لە کەلارو کفری‌و دەربەندیخان دابوو، لەلایەن هەڤاڵ عیمادو مامۆستا شێخ محەممەدەوە برووسکەیەك بۆ مەڵبەندەکانی ١و٢ ی یەکێتی‌و مەڵبەندی ٧ ی بزووتنەوە کرا:

(بە گەیشتنی ئەم برووسکەیە تەقە ڕابگرن‌و ئەبێت ئاشتی ڕابگرن‌و بیپارێزن، چونکە هەوڵی ئاشتی سەرانسەری‌و دۆستایەتی دراوە ).

بـــەڵام چـــەکدارانی بزووتنـــەوە زۆر خۆیـــان بـــەو جـــۆرە ئاگـــاداریو بروسکانەوە نەئەبەستەوە، بەڵکو ئەیانویست سوود لـەکات ببیـنن‌و هـەڵێکیان دەسـتکەوێ بـۆ دەستوەشـاندن. یـەکێتیش زۆر دڵنیـا نـەبوو لـە هـەنگاوەکانی بزووتنەوە. بۆیە بەووریاییەوە هەڵوێستیوەرئەگرت. تـاکو لـەم ڕۆژەدا یەکـەم تەقـەی شـەڕ دەسـتپێکردن لـە لایـەن بزووتنـەوەوە ئـەنجام دراو بـە بێسـیم پەیوەنـدیان بـە هێـزی کفریشـەوە کـرد کـە دەسـتپێبکەن‌و لـە کفریـدا یەکـەم فیشـەکی بزووتنـەوە گیـانی بـەرزی پێشـمەرگەی پـارتیزان‌و فەرمانـدەی ماندوونەناس ئەحمەدی حاجی ڕەشید ئـەسمیو شەهید ئەکرێ. ئیتر بڵێسـەی ئـاگری شـەڕ لـە هـەردوو شارۆچـکەکەدا بـەرز ئەبێتـەوە. لـە کفـری چـەندین پێشمەرگەی قارەمانی یەکێتی شەهید ئەبن لە کەلاریش پێشمەرگەی پارتیزان‌و پیـاوی چاونەترسـی گەلەکـەمان هـاپۆ ئیسـماعیل شـەهید ئـەکرێ. هـەروەها فەرمانـدەی ئـازای شـیوعی هـاوڕێ هێـرش لـە شـەڕێکی قارەمانانـەدا شـەهید ئەکـەن. بـەم بۆنەیـەوە ئیزگەکـەیان هەواڵـەکانی شـەڕەکەیان بـەم جـۆرە بڵاوئەکاتەوە:

( فەرموون لەگەڵ ئـەم هەواڵە خۆشـە لـە شـارەکانی کفـریو کـەلارەوە: ئـەمڕۆ دووکـەس لـە پاڵەوانـەکانی منافیقینمـان نـارد بـۆ جەهەنەم‌وەکوسـەگ تـۆپێنـران‌و بەسـزای ئیسـلامی گەیـەنران. سوپاس بـۆ خـوای مـەزن لـە هـەموو شوێنەکان شێرە کوڕانی ئیسلام سـەرکەوتوون. ئەمـەش نـاوی ئـەو تۆپیوانەیـە: ئەحمەد حاجی ڕەشید، هاپۆ ئیسماعیل).

ئەوەی ڕاستی بێ نەمئەزانی ئـاڵا هـەڵگرانی ئیسلامی سـەردەم ئەوەنـدە دەمپیسـن موسـوڵمان بـە سـەگ ئـەزانن. ئـەم جـۆرە لۆجیکە مەگـەر هـەر لـەم پیاوانـەی ئیسـلام بوەشـێتەوە. ئـەگـینا دوژمنـانـی ئیسـلام قـەت قسـەیوا بەرامبەر ئیسلام دەرنابڕن.

ئـەم جاهیلانـە ئەگـەر لـە شـوێنێك یـەکێك یـا چـەند کەسـێك شـەهید بکەن‌وا ئەزانن سەر ئەکـەون. بۆیـە هەنـدێك جـار بـە درۆکـردنیش سەرمەسـت

ئەبن‌و شووڵی لێهەڵئەکێشن بۆ تەفرەدانی خەڵکی بەسەرکەوتنی درۆزنانە لە ڕێگەی ئێزگە ڕیشنەکەیانەوە: (هەر ئێستا لە سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراوەوە پێمان ڕاگەیەنرا کە لە کفری مەقەڕێکی شەڕ فرۆشەکانی یەکێتی کەوتە ژێر دەستی مجاهیدەکانی ئیسلام. سوپاس بۆ خوا لە هەموو لایەك سەرکەوتووین).

نەیانزانی کلکی درۆکانیان کورتەو بەزوویی لە بندا ئەبڕێ. نەك بارەگایەکی یەکێتی کەوتووەتە دەستیان بەڵکو ئابلۆقەی مەرگیان لێ توندتر کرابووەووە.

ڕۆژی ١٢/٢٤ش شەڕ لە نێوان هەردوو لادا هەر بەردەوام بوو، بۆ یەکلایی کردنەوەی شەڕەکە لە کفری فەوجەکەی سەید جەوهەر لە چەمچەماڵ بە برووسکەیەك ئەگاتە ئەوێ‌و بەشداری لە شەڕەکەدا ئەکەن. لەهەمان کاتدا هێزەکانی بزووتنەوە لە قەڵادزەو ژاراوە، چوار قورنە، سەروچاوە بەرەو سنووری سەرکردایەتییەکەیان ڕایان کرد. هێزەکانی یەکێتیش بەدوایانەوە بوون‌و لەوێش سەربازگەی سەلاحەدینیان ئابلۆقە درا. لە کەلار مەلا عومەر کەلاری ئەندامی سەرکردایەتیان‌ووره بەرئەداو پەیوەندی ئەکات بە هەڤاڵانی یەکێتییەوە لە کەلارەوە ئەیگەیەننە مەڵبەندی ٢ی کەرکوك لە دەربەندیخان‌و گیانی ئەپارێزن.

شەوی ٢٦-٢٧/ ١٢ بە پێی نەخشەیەکیان هێزەکانیان لە کەلارو کفریشدا بەرەو دەرەوەی شار دەرئەچن، پێشمەرگەکانی یەکێتی دوایان ئەکەون‌و لە دێهاتەکانی ژاڵەی سەفەرو قاسم ئاغاو مچە شەل ئەبێتە شەڕو لەوێ سەرداری فەقێ محەممەدی کادیری لێهاتوو شەهید ئەبێ. ئەوانیش هەندێکیان لێئەکوژرێ‌و لێیان بەدیل ئەگیرێ. بەشێکیشیان بە دزەو خۆحەشاردان خۆیان ئەگەیەننە شارەزوورو هەڵەبجەی شەهید، لە قوڵی کفریشەوە پێشمەرگەکانی فەوجەکەی سەید جەوهەر دوایان ئەکەون‌و لە قاتەکانی بەلەگە ٢٥ کەسیان لێئەکوژن، لە هەڵمەتی ئاوایی شەرەفیش ٣ کەسی تریان ئەکوژرێن‌و بەشێکی

تریشیان بەدیل ئەگیرێنو هەندێکیان بە دێهاتە خاپور کراوەکانی گەرمیاندا ئەڕۆن بەرەو سنووری بازیانو چەمچەماڵو لەوێ هەندێکیان ئەکەونە بۆسەی پێشمەرگەی یەکێتییەوەو مەلابرایمی کوڕی مەلا عوسمان لەگەڵ هەندێکی تردا ئەگرن.

ڕۆژی ١٢/٢٧ لە شارۆچکەی دەربەندیخان مەڵبەندی بزووتنەوە بە بێ تەقەو شەڕ خۆیان ئەدەنە دەستەوە کە مەلا محەممەد هۆرێنی لێپرسراویان بوو. لە هەمان ڕۆژدا لە هەڵمەتێکی شێرانەدا پەلاماری سەربازگەی سەلاحەدینو بارەگاکانی تری سەرکردایەتی بزووتنەوە ئەدرێو هەمووی بە چاو نووقانێك ئەگیرێو لەمەشدا ڕابەری گشتی بزووتنەوە مەلا عوسمان عەبدولعەزیز بە دیلی ئەگیرێ. یەکێتی بە پێچەوانەی ڕەفتارو گوفتاری سەرانی بزووتنەوەی ئیسلامی هەڵسوکەوت ئەکات، هەڤاڵ مام جەلال کە بەردەوام لە پەیوەندیدابوو یەکسەر ئاگاداری هەڤاڵانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتی ئەکاتەوە کە گیانی مەلا عوسمان بپارێزرێو ڕێزی لێبگیرێ. سەرەڕای ئەو لافاوی خوێنەی سەرانی بزووتنەوەو هێزە فشەڵەکەی ڕشتیان، یەکێتی یاسای لێبوردنو ڕێزی مرۆڤایەتی لا بەرجەستە ئەبێو لە لووتکەی هەڵوێستی مەزنیدا فەرمانی بەرزی ڕێزلێنان بۆ کەسی یەکەمی ئەو ڕێکخراوە سەرلێشێواوە بە کرێگیراوە دەرئەکات.

جیاوازی فرەیە لە نێوان هێزێکی ئیسلامی بەدرەفتارو هێزێکی عەلمانی خاوەن ڕێزو بڕیاری مرۆڤدۆستانە.

## ساڵی ١٩٩٤

سەری ساڵمان لە ئوتێل شام بەسەر برد کە جێگایەکی دلگیری ناو شاری دیمەشقە. پاش ئەوە سەردانی هەڤاڵ مام جەلالم کردو داوای گەڕانەوەم لێکرد بۆ کوردستان. بەڕێزیان ڕێگەی پێدایو خۆمان سازدا بۆ گەڕانەوە.

ئامانجی گەشتەکەمان بۆ ئێمە گەشتو گوزارو دنیا بینین بوو، هەڤاڵ مام جەلالیش کاروبارەکانی خۆی ڕائەپەڕاند لە ڕووی سیاسییەوە.

لە سوریا بەڕێ کەوتینو ڕۆژی ١٩٩٤/١/٩ گەیشتینەوە هەولێر. ماوەیەك لە ماڵەوە بووم، دوایی ڕۆژی ١/٢٢ دەستم لە کارکردن لە قیادەی مەنتیقەی سلێمانی هەلگرت.

# خۆڕاگەیاندنی یەکگرتوو

لە ئەنجامی تێکەوتنی بزووتنەوەو تێکشکانی لە شەڕەکانی لەگەڵ یەکێتیدا سەرەڕای ئەوەی بزووتنەوە لە بەر یەك هەڵوەشایەوە لە بەردەم لێدانەکانی یەکێتیدا لە ناوخۆشدا لە بەر یەك هەڵتەکێنران و پرزۆڵ پرزۆڵ بوون. ئەوە بووە مایەی ئەوە حیزبێکی تازەی ئیسلامی خۆی ڕابگەیەنێت.

دیارە سەرەنجامی شەڕ دەرهاوێشتەی خۆی هەیە، ئەم شەڕەی بزووتنەوەش لە هەناویدا چەندین مەبەستی شاراوەی دەرخستو ئاشکرا کرد کە یەکێکیان خۆئاشکرا کردنی ڕێکخستنێکە کە هێڵێکی فیکری دیاری هەیەو لە دوای ئەوەشەوە ڕێڕەوی هەندێ ڕێکخراوی ئیسلامی باشتر دەرکەوتن بۆ خەڵکی کە چی مەبەستێکیان هەیە لە درووست بوونو پەیدابوون گەرچی ئەمانە بۆ پێویستی کۆمەڵگاکەی خۆیان نەهاتوون بەڵکو لە دەرەوی بازنەی ئێرەوە خولقاندوویانو بە دەیان بیرۆکەی دژ بە چارەنووسی خۆمانو بە دەیان بۆمبی ژاراوی مینرێژکراون تا لەکاتی تایبەتی خۆیدا بتەقێنرێنەوە.

ڕۆژی ١٩٩٤/٢/٦ یەکگرتووی ئیسلامی لە کوردستاندا خۆیان وەکو حیزبێك ڕاگەیاند، ئەگەر چی ئەمان لە ناو ڕیزەکانی بزووتنەوەدا بوونو لەوێدا کاریان ئەکرد بەڵام ڕیشەی خۆیان بۆ مێژوویەکی کۆنتر ئەگەڕێننەوە بەتایبەتی کە دامەزرێنەری یەکگرتوو سەلاحەدین بەهادین کە لە بنەماڵەی شێخانی بیارەیە لە کۆنە ئیخوانەکانەو دوای ئەوەی ئەچێتە ئێران هەوڵ ئەدات

هەموو کۆنە ئیخوانەکانی کوردستان کۆ بکاتەوە پێکەوە کار بکەن. ئەمانە لە ناوبزووتنەوەداوەکو هێڵێك هەبوون شێوازی کارو بیرکردنەوەیان جیاواز بوو، ئەمانە کوتومتوەکو ئیخوان هەڵسوکەوتیان ئەکرد زۆرتر بایەخ بە لایەنی کاری خزمەتگوزاری جەماوەری ئەدەن لەگەڵ توندو تیژی عەسکەرتاریدا نین، لە ڕێگەی نەرمونیانییەوە خەڵکی بۆ لای خۆیان پەلکێش بکەن. ئەو سەرچاوە داراییەی کە لەووڵاتانی کەنداوەوە بۆیان دابین ئەکرا مزگەوتو پرۆژەی ئاوو هەتیوانەو هەژارانەو..هتد، ڕووبەری ڕێکخستنەکانی فراوان ئەکردن.

لە ڕاستیدا یەکگرتوو هەندێ ڕوتووش بە کاردێنێ‌و لە ڕوخساردا وا نیشان ئەدا کە ڕێکخستنێکی مۆدێرنی ئیسلامی بوو باوەڕی بە گۆڕان‌و جوانکاری هەیە لە مەبەستە ئاینییەکاندا کە چی لە ناوەڕۆکدا ئەمانە بەچکەی‌وەهابیەتن کە ئەیویست لە ڕێگەی دژایەتیکردنی بیدعەتەوە چاکسازی لە ڕێبازی ئاینییدا بکات کە چاکسازی لە خۆیدا مەبەستی گۆڕانیش ئەگەیەنی، کەچی بیدعەت ئەو شتەیە کە لەگەڵ بیری ئیسلامگەراییدا ناگونجێ نەك گۆڕان بێ کەچی لە ناوەڕۆکدا بەموو لانادات زۆرتر خۆ بە بیری ئیسلامگەراییەوە ئەبەستنەوەو باوەڕیان بە حکومەتی ئیسلامی هەیە، هەرچی شتێك کە پێی ئەڵێن: کۆمەڵگای مەدەنی، دیموکراسی، مافی مرۆڤ، نەتەوە، ئازادی لە هەگبەی بیرکردنەوەی ئەواندا جێی نابێتەوە. گەر باسیشی بکەن بۆ پروپاگەندەو گونجاندن‌و سەلماندنە.

ئەمانە ئەیانەوێ بڵێن دیدێکیان بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی‌و چارەنووسی نەتەوایەتی هەیە کەچی لە بنەڕەتدا ناتوانن دەرمانی ئەو دەردە بکەن، چونکە لە ئیسلامدا نەتەوەو نەتەوایەتی نییەو هەمووی لە ژێر چەتری برایەتی ئاینی‌و ئیسلامیدا یەکئەگرێتەوە. کەواتە ڕێکخستنێکی ئیسلامی کوردی نییە، گەر بشڵێن هەیە ئەوا هەر بە ناوە نەك بە ناوەڕۆك. ئەمانەوەکو حیزبێکی ئیسلامی کوردی تەنیا زمانەکەیان کوردییە، بەلام بیریان کوردی نییەو دژی دەسەلاتی کوردین.

# یادی ئەنفال

یادی ساڵانەی ئەنفال نزیك بووبووەوە. لە لایەن لیژنەی باڵای یادەوەری ئەنفالەوە لە کەلار بانگهێشت کرام بۆووتنەوەی بابەتێك لە سەر پارتیزانی دوای ئەنفال. لە ڕۆژی دووەمی یادەوەری یەکە ١٩٩٤/٤/١٥ لە هۆڵی هونەرمەندانی کەلار بابەتێکی دوورو درێژم بە نووسین پێشکەشی ئامادەبووان کرد.چونکە ئازاری ئەنفال هێشتا ناخمان ئەکرۆژێ، بە تایبەتی ئێمە بە فیعلی لە ناو پرۆسەکەو لە ناو کوانووی شەڕدا بووین بەرانبەر سوپای ئیحتیلالی بەعسی بەرگریمان لە خەڵك‌و خۆمان ئەکرد، هەر جۆرە قسەیەك تامەزرۆیی خۆی هەیە، هەر گێڕانەوەی یادەوەرییەك مرۆڤ ڕائەکێشێتە پانتایی جیهانێکی پڕ لە ژان‌و دەردەوە. بۆیە خەڵکەکە بە پەرۆشەوە گوێیان ئەگرت، لەگەڵ گێڕانەوەکاندا تێکەڵ ئەبوون بە تایبەتی ئەو لاوانەی کە سەردەمی ڕوودانی ئەنفالەکان هێشتا منداڵ بوون، یان تازە پێ ئەگەیشتن.

لەو نووسینەمدا بە تێرو تەسەلی باسی پارتیزانیم کرد لە دوای هەلومەرجی ئەنفال کە قۆتاغێکی ناسك بوو لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا، لە هەمان کاتیشدا تەحەدایەکی گەورەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو دژی دەسەڵاتی عەسکەرتاریەتی بەعس کە بە خەیاڵپلاوی خۆی کۆنترۆڵی سەر پاکی کوردستانی کردبوو. هەر چەندە خەڵکێکی زۆر لە کۆڕەکەدا ئامادە بووبوون، بە باشی گوێ بیستی بابەتەکە بوون، بەڵام کەسێك بەشداری گفتوگۆی ئەکرد کە خۆم حەزم ئەکردو بە لامەوە مەبەست بوو لە ڕێگای پرسیار کردنەوە گرێو گۆڵی تر ڕوون بکرێتەوە کە لە نوسینەکەدا بواری باسکردنی نەبووبێ. چونکە هێشتا ئەنفال‌وەکو مەتەڵوایە بە ئاسانی بۆمان هەڵنایە، بە تایبەتی چارەنووسی ئەو هەزاران کەسە لە پشتی هەوردایەو بەعس ئامادە نی یە دووا هەواڵمان پێ ڕابگەیەنێ.وا خەڵکانێکی زۆری پاشماوەی ئەنفالیش لە چاوەڕوانیدا سەریان نایەوەو تەنانەت بە کوێرە هەواڵێکیش شاد نەبوونەوە،

زۆری تریش ماون‌و لە ژێر قامچی چاوەڕوانی خەماویدا بە هەناسە ساردی ئەتلێنەوە.

# شەڕی ناوخۆ

هێشتا سامۆتکەی ڕەشی ئەنفال لە کونجی یادەوەریماندا دوور نەکەوتبووەوە، کەوتینە ناو زەلکاوی کارەساتێکی چاوەڕوانکراوی ترەوە کە زۆر درێژەی کێشاو ئازاری زۆری داین‌وەکو پێشتریش لە ناو خومی ئەو بارە نالەبارەدا دەردی زۆرمان چەشت، ئەویش شەڕی ناو خۆیە. بەڵام ئەم گێمەی شەڕ لە ناو شاردا بەرپا بوو، کەچی مێژوویەکی دووروودرێژمان لە شەڕی شاخیشدا هەیە لە نێوان لایەنەکانی شۆڕشەوە کە دوای ئاشبەتاڵ: لە نێوان یەکێتی ـ بەرەی جوددا. کە هۆکاری جیا جیای هەیەو لەم سەردەمەدا بە زۆری ئەگەڕێتەوە بۆ ناکۆکی یەکانی نێوان یەکێتی‌و پارتی لە سەر زۆر مەسەلەی جیا جیا. هەلگیرسانی شۆڕشی نوێ بە ڕابەرایەتی یەکێتی‌و هەنگاو نان لە کەلاوەکانی ئاشبەتاڵدا، پارتی‌ووروژاند، پارتی خۆی ئاشبەتاڵی کرد، ئیتر پێی خۆش نەبوو کەسێك لە دایك بێت‌و لە ئاستانەی شۆڕشدا گاگۆلکێ بکات. بە تایبەتیش یەکێتی چونکە پارتی‌وای بۆ ئەچوو کە هەڤاڵ مام جەلال‌و زۆر لە سەرکردەکانی تری یەکێتی پاشماوەی جەلالییەکانن‌و ئەمە تۆڵە سەندنەوەیە لە پارتی کە گەورەترین شکستیان بە شۆڕشی کورددا‌و مەیانەکەیان چۆلکرد.ئەم کۆنە قینە هەمیشە لە دڵ‌و دەروونی پارتیدا ئامادەیی هەبووەو ڕقێکی ڕەشیان لە یەکێتی بووەتەوەو پێیان خۆش نەبووە جێ پێی لە کوردستاندا هەبێ. گەر بۆ سەردەمێکیش بن ئەوا ناچاری یە. جگە لەوە هەمیشە دوژمنانی شۆڕشی کورد لە پشتی پەردەوە لە سەر خەت بوون‌و پلانیان دارشتووە بۆ پێکهەلپژانی هێزەکانی گۆڕەپانی کوردایەتی، بە تایبەتیش زەمینە ساز بووە بۆ پارتی بە ئاسانی بکەوێتە ناو ئەو داوەوە هەر هیچ نەبێ بۆ تۆڵە سەندنەوەو ڕێگە نەدان

بە کەس ببێتە کوێخای کوردایەتی جگە لە خۆیان. لە ڕاپەڕینیشدا پارتی ڕۆڵی دیار نەبوو، بە ناچاری کەوتە ناو تۆڕی بەشداری کردنەوە، لە شەڕەکاندا بە باشی دیار نەئەکەوت، چونکە بڕوای بەوە نەبوو ڕژێمی بەعس ئەڕووخێ، یان هێزەکانی کوردستان بتوانن دەسەڵاتی بەعس لە ناو بەرن. کاتێکیش بەعس ڕووخا، پارتی هەوەسا، ئیتر کەوتە ئەوەی شوێنی خۆی بکاتەوە، یەکێتی شەڕی ئەکردو مەشغوڵ بوو بە بەرەکانی شەڕەوە، پارتیش لەگەڵ عەشیرەتەکانو موستەشارو گەورە جاشەکاندا خەریك بوو.

دوای کۆڕەو بەعس هەلێکی بۆ ڕەخسا سەرکردایەتی کورد گفتوگۆی لەگەڵا ساز بدەن، کورد ئەیویست گرەوی خۆی بباتەوە، بەعس ڕێڕەوی خۆی بگۆڕێو دان بە ماف کورددا بنێ، کەچی ڕژێمی بەعس لە دوو قۆڵەوە ئەیویست بەرنامەی خۆی جێبەجێ بکات، لە لایەکەوە بە بێدەنگیو لە پەنا ڕاکێشانی هێزە کوردی یەکانەوە بگەڕێتەوە کوردستان، گەر بۆی نەکرا ناکۆکی بخاتە ڕیزەکانی کوردەوە، چونکە ئەیزانی کورد بە یەك پێودانگ کار ناکەنو نێوان دووریان تیایە. کاتێك کە ڕژێمی بەعس لە کوردستان کشایەوە پارتی ئەو داوەی پەیوەندی لەگەڵیدا نەپسان، بەڵکو ئەیویست بە هەر جۆرێك بێت لە گەڵ ڕژێمدا ڕێك بکەوین. ئەمەش بەلای یەکێتی یەوە کارێکی ئاسان نەبوو. دەیان ساڵە لە ململانێداین، ڕووباری خوێن ئەڕێژین، ڕژێم دانی خێری پیا نەناوین ئیتر بۆ لەم لاوازی یەدا، لەم دابڕانە نێودەوڵەتییەدا ئێمە تەسلیمی ببینەوە. هەڵبژاردنیش سوێیەکی تری درووست کرد، پارتی زۆر ئەترسا دەنگی پێویست نەهێنێ، بۆیە کۆسپ بوو، فێڵی زۆری بە کار هێنا، سوودی لە شارەزایی دەوروبەر وەرگرت، یەکێتیش شتەکانی بە سەرا تێئەپەڕی، تا ئەنجامی هەڵبژاردنەوای لێهاتو سیاسەتی ٥٠ بە ٥٠و پەرلەمانو حکومەتی ٥٠ بە ٥٠ دامەزرێنرا کە زیانێکی خراپی بە کورد گەیاند.موناقەشەکانی ناو پەرلەمانیش ڕەنگدانەوەی خۆی هەبوو، خەڵکی تێئەگەیشتن پارتی نوێنەری بیری دوواکەوتووە، یەکێتی لە سەر گردی گۆڕانو پێشکەوتندا ئەوەستێ، جگە لەمە

ئەو ڕۆژگارەی یەکێتی بە هانای سۆسیالیستەوە چوو نەیهێشت تەواو ببێو بووە کۆسپ لە بەردەمی پارتیداو حەمەی حاجی مەحموودو سەرەکانی تری سوسیالیستی پاراست، ئەمە داخێکی نابووە دڵی پارتیەوە. بۆیەشە پارتی لە شەڕی یەکێتی ـ بزووتنەوەدا لایەنگری بزووتنەوەی کرد.جگە لەمانە پارتی بە گیانی خێڵەکیو قبوڵ نەکردنی خەڵکیترو زەوتکردنی پانتایی خەبات بە تەنیاو بڕووا نەبوونی بە ناوەڕۆکی دیموکراسیەت بە ڕووکەش نەبێ، کاری ئەکرد بۆ ئەمەش هەمیشە بە کاری عەسکەرتاری هەڵئەسووڕاو ئەوەی بە سەنگی مەحەکی لابەلاکردنەوەی گرفتەکانی بەردەمی ئەزانی. جگە لەوەی کە بە ئاسانی پابەند بوو بە دەورووبەرەوەو نەیتوانیوە خۆی دەرباز بکات لە داوەکانیان کە زۆر جاریش سوودی لەوە بینیوە بۆ مەبەستەکانی خۆی. بۆیەشە هەمیشە یەکێتی پێ قبوڵ نەبووەو بە مێملێ خۆی داناوەو هەوڵیداوە نەبێتە ئەلتەرناتیڤی لە ڕووبەری شۆڕشو خەباتدا.

لە هەمووی ترسناکتر ئەو گیانی دوژمنایەتیەی نێوان ئەندامانو لایەنگرانی یەکێتیو پارتی بووەوەکو دوو حیزب کە ئەکرا لە جیاتی ئەو توند ڕەوییە لە لایەنگری کوێرانەو سەنگەر گرتن لە یەکتر بە شێوەیەکی مۆدرێنتر بۆ خزمەتی کوردو کوردایەتی لە باخچەی دۆستایەتیو گفتوگۆی دڵسۆزانە یەکیان بگرتایە بۆ بنیاتنانی ئایندەی کوردستان وەك چۆن حیزبە گەورەکانی بەریتانیاو ئەمریکا هەڵسوکەوت ئەکەن شەڕی هاوچەرخانە لە پێناوی دەستە بەرکردنی دواڕۆژ بۆ خۆیان. ئەم کارە سەلبییە کاری لە کەسێتی مرۆڤی کوردیش کردووە، ئەو سەنگەر بازییە ماوەیەکی زۆری گەرەکە بۆ لە ناوبردنیوەکو دیاردەیەکی قێزەوەن.

هەموو ئەمانەوایکردبوو ناکۆکییەکان کۆنو تازە لە مەنجەڵێکی پەستێوراودا ئامادەی تەقینەوە بێ. چونکە پارتی پێی خۆش نەبوو لە دایك بوونێکی تازە بێتە ناوانەوەو جێگەی ئەو لێژ بکات. هەروەکو چۆن منالی یەکەم هاتنی منالی دووەمی پێناخۆشەو دژایەتی ئەکات.

له هەمووی خراپتر پارتی بۆ قۆرخکردنی دەسەڵات هەرگیز ئامادەنییە گۆڕان لە هەڵوێستەکانیدا بکات، گەرچی هەلومەرج و شێوازی کارکردن گۆڕابێ، ئەو هێشتاوەکو سەردەمی شاخ و ڕابوردووو بیر ئەکاتەوە لەگەڵ سەردەمی شاردا بە باشی ناگونجێ، بۆیە لە بیانوو ئەگەڕا یەکێتی تووش بکات و هەموو ڕیسەکە بکاتەوە بە خوری. بە تایبەتی هەندێ بۆ چوونی لا گەلاڵە بووبوو کە یەکێتی لە شەڕی بزووتنەوە ـ یەکێتیدا لای دروست کردبوو کە پارتی خۆیشی لە ژێرەوە هاوکاری بزووتنەوە بوو لەشەڕەکانداو پێی ناخۆش بوو بە دەستی یەکێتی تیا بچێ. ئەگینا پارتی بوونی بزووتنەوەی پێ هەرس نەئەکرا.

دیارە پارتی بەووردی نەخشەی هەڵگیرسانی شەڕی تاو توێ کردبوو. هەموو لایەنەکانی تێبینی کردبوو، چ لە سەر ئاستی ناوەوە چ لە سەر ئاستی دەرەوەدا. چونکە نەخشی دەرەکی لە ناکۆکی یەکانی کورد ـ کوردا دیارەو ئامادەیی لە تەقاندنەوەی گرفتەکاندا هەیە، بەڵام تاوانباری سەرەکی خۆمانین بۆ دەستەبەرکردنی سەرکەوتن لە شەڕەکانماندا پەنا ئەبەینە بەر هێزی دەوروبەر.

جا هەروەکو چۆن لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا چەندین هۆی جیا جیای کەڵەکە بووی پەنامەکی لە بۆسەدا بوون بۆ تەقینەوەو بە کوشتنی دۆقی نەمسا ئاگر لە جەستەی جیهان بەر بوو، ئاواش پارتی لە ڕۆژی ١٩٩٤/٥/١ دا بە هۆی گێچەڵی عەلی حەسۆ میرخانەوە بەرامبەر خەڵکی قەڵادزێ بە هۆی پارچە زەوی یەك گوایە هی باوکی بووە بلێسەی ئەم شەڕەی بەرز کردەوەو کوشتنی عەلی کە باوکیشی لە مانگی ١٩٨٣/٩ دا لە شەڕێکی بناری قەندیلی نێوان یەکێتی و پارتی کوژرا، بووە هۆی خوێن بەر بوونی لاشەی کوردی کەنەفت. هەوڵێکی زۆر درا بۆ ڕاگرتنی دۆخەکەو پەرە نەسەندنی. بەڵام پارتی بۆ تۆڵە سەندنەوە ڕۆژی ٥/٢ پەلاماریان داو سێ کادیری پێشمەرگەی یەکێتی یان شەهید کرد.عەلی نەبی، سمایل‌وەرتێ، مام جووتیار کە ئەمانە بەرگرییان لە خەڵکی قلادزێ ئەکرد. لە ئەنجامی ئەمەدا شەڕەکە سیرایەتی کردو یەکێتی

پـەلاماری بارەگاکـانی پـارتی لـە قـلاّدزیّو بێتـوێن داو دەسـتیان بـە سـەرا گیرا.بزووتنـەوەی ئیسلامی ئـەم شـەڕەیان بـە هـەلزانیووەکو پشتیوانییەك بـۆ پارتی پەلاماری   هەڵەبجەو خورماڵیانـداو گرتیان، ئەمـە بەرمیـەکی تـازە بـوو پارتی سوودی لێبینیو هاو بەشێکی بۆ پەیدا بوو لـە بـەڕێوە بردنـی شـەڕەکانـدا کە کاتی خۆیشی پارتی کۆمەکی ئەوانی کردبوو. بەڵام ئێمـە نەمانهێشت ئـەوان لـە سـەر ئـەو سـەرکەوتنە بـە دڵنیـایی یـەوە بنیشـنەوە، بـە پێـی نەخشـەیەك پەلامارمان دانەوە، هەڵەبجەو بیـارەو خورمـاڵو تەوێڵـەشمان لێسـەندنەوە. ئـەو ڕۆژانە من لەو جەبهەیەدا بوومو لەو شەڕانەدا بەشداریم ئـەکرد کـە ئـەو کاتـە جێگری قائیدی مەنتیقەی سلێمانی بوومو لێپرسراوی پێشمەرگەکانی یـەکێتی لە سنووری پارێزگای سلێمانیدا جگە لە لیوای تایبەتی سکرتاریەت.

ڕۆژی ٥/٩ لە شاخی شرامەوە بۆ هەرمێ دۆڵ پێشڕەویمان کـردو لەگـەڵ کاك شەوکەتی حاجی مشیردا لە باخەکۆن پێکەوە بـووین. بـۆ ئێـوارە ئێـران بـە کاتێوشـاو تـۆپی قـورس لێیـداین بـەڵام بـێ زیـان بـووین. ئەمـە سـەرەتای هەڵوێستێکی تایبەتی بوو کە ئێران ئەیەوێ لەم شەڕەدا بـە لای لایەکـدا دایـبڕێ کە پارتی یە. بۆ ئەوەی لەو سەرەوە یـەکێتیش هەڵوێسـتەیەك بکـاتو ڕووی لـە دۆستی خۆرهەلاّت بێ لە ئەنجامگیری ئەم شەڕەدا.

لـەو لاشـەوە هـەردوو مـەکتەبـی سیاسـی یـەکێتیو پـارتی لـە مەسـیف کۆبوونـەوەو لـە سـەرهەندێ خـاڵ پێکهـاتن بۆوەسـتاندنی شـەڕەکە لـە بابـەتی پێکهێنـانی چـەند لیژنـەیـەك بـۆ سـەردانی سـنووری پارێزگـای   سـلێمانیو کـەرکووكودهۆك بـۆ ڕاگـرتنی شـەڕو پـەرە نەسـەندنی، هـەروەها ئـازادکردنی دیلەکانو چۆڵکردنی بارەگا دەست بە سەرا گیراوەکانو گەڕانـەوەی هێزەکـان بـۆ شوێنەکانی خۆیان.

لـەم کاتانـەدا هـەڤاڵ   مـام جـەلال لـە دەرەوەی کوردسـتان بـوو، لـە تورکیاوەویستی بگەڕێتەوە، بەڵام ڕێگاکـە مسـۆگەر نـەبوو، لەوانـەبوو لـە ڕێگـای ئێرانــەوە بگەڕێتـەوە،وەختێکمان زانــی بــە کۆپتــەرێکی تــورکی گەیشــتەوە

بارەگاکەی خۆی لە هەولێر. لەم سەرو بەندەدا یەکێتی ئەیویست شەڕەکە نەچێتە بادینانەوە.وەفدەکەی بادینان کە نوێنەری یەکێتی کاك فەرەیدون عەبدولقادر بوو، هەموو هەڤاڵانی یەکێتی دڵنیا کردەوەو هێزەکانی گەڕانەوە شوێنی خۆیان، دوای ئەوەی کە مەسعود بارزانیش برووسکەی دڵنیایی کردبوو لە بارەی دۆخەکەوە کە هیچ روو نەدات، بەڵام هەر دوای ئەو بروسکەیە پەلاماری مەڵبەندی بادینان دراو دەستی بە سەرا گیراو رۆژی ٥/١٧ یش رێگە لە هەڤاڵ حەسەن کوێستانی گیرا لە ئازادی خوارووی حاجی هۆمەران لە بۆسەیەکدا تەقەیان لێئەکەن‌و بە بریندار دیلی ئەکەن دوایش خۆی‌و هەڤاڵەکانی شەهید ئەکەن. ئیتر بواری ئەوە نەما لەگەڵ فرۆفێڵەکانی پارتیدا مامەڵەی دۆستانە بکرێ‌و لە بەرامبەردا پەلاماری لقەکانی سلێمانی‌و کەرکووك دراو هەرچی لێپرسراوی زلیان هەبوو بە دیلگیران‌وەکو قادر قادر، دەروێش ئاغا، کەمال حەسەن چاومارە، نیزامەدین گلی، مەسعود ساڵەیی‌و گەلێکی تریان. هەروەها هێزەکانی یەکێتی کۆیەیان پاکسازی کردو شەڕ لە ناو هەولێریشدا نرایەوە. لە قوڵی شارەزوورو هەورامانیشەوە لە هەرمێ دۆڵ‌و گوڵپدا لە شەڕێکدا خراپ تێکشکاین‌و ١١ شەهیدو ٥ دیلمان دا، بزووتنەوەش لە ئەحمەد ئاواو خورماڵ‌و لە دێکۆنەوە بۆ خورماڵ هێرشیان کردو تێکشکان، هێزەکانمان لە کانی ناسکان پەلاماری پارتییان داو شکان، بزووتنەوەش هێرشیان بۆ خورماڵ کردو گرتیان.

لەم کاتانەدا پارتی ئەوەی مەبەستی بووو نەخشەی بۆ کێشا بوو لای خۆیەوە جێبەجێی کرد، ئەویش دەستبەسەرا گرتنی داهاتی گومرکی برایم خەلیل بوو. کە ئەمە کارێکی پێچەوانەوەی یاسا بوو، هەنگاوێکیش بوو بۆ ئەوەی پارتی هەنگاوی تری لە پاڵدا بنێ. پارتی‌وای بۆ ئەچوو گەر داهاتی گومرکی برایم خەلیل بۆ خۆی ببا یەکێتی لە رووی داهاتی مالی یەوە سەرچاوەیەکی ئەو تۆی نییەو توشی گرفتی بەڕێوەبردن ئەبێ‌و ئەرکەکانی سنوورەکەی‌و دەسەڵاتەکەی بۆ ناچێتە سەڕووو روو بە رووی گرفتی مادیش

ئەبێتەوە چ بۆ بەردەوامی کاری حکومەت چ بۆ بەردەوامبوونی کاری شەڕو سەربازیو لە دووایيدا ناچار ئەبێ چۆك دابدا. بەلام يەکێتیو خەلکی کوردستان ئەیانزانی بردنی داهاتی گومرکی برایم خەلیل تەنیا بۆ باخەڵی بنەمالەیەو تەنانەت پارتیش وەکو حیزب لێی بەهرەمەند نابێ. جگە لەوە گومرکی برایم خەلیل مولکی حیزب نییە. سەرچاوەیەکی دارایی هەرێمی کوردستانەو هەموو خەلکییەو کارو بەرنامەی ژیانو ئاوەدانکردنەوەی پێ دابین ئەکرێ. یەکێتی هەمیشە داوای ئەوەی ئەکرد کە داهاتی گومرکی برایم خەلیل تەسلیم بە حکومەتی هەرێم بکرێو لەوێوە هەموو خەلکی کوردستان لێی سوود مەند بن، کەچی پارتی لەم مەبەستە گرنگە خۆی ئەبواردو ملی نەئەدا. لەو ڕۆژانەدا بوو گوێزرامەوە بۆ سنووری جەبهەی خەلیفان سەرپەرشتی ئەوێ بکەم. پارتی لە شاخە سوورو کەلکی هەریرەوە هێرشێکی گەورەیان بۆ کردینو شوێنەکانیان لێگرتین. ئێمەش خۆمان سازدایەوەو لە ماوەیەکی کەمدا هەموو شوێنەکانمان لێسەندنەوە بە زینە تیریشەوە.

لەم سەرو بەندەدا کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی لە پەیوەندیدا بوون لە نێوان هەردوو لایەنی شەڕکەردا بۆ ڕاگرتنی شەڕ، زۆر بە جیدی هەوڵیان ئەداو هێزێکیشیان بۆناو بژیوانی درووستکرد.

ڕۆژی ٥/٢٥ د.ئەحمەد چەلەبی سەردانێکی هەڤاڵ جەبار فەرمانی کردو لە سەر شەڕوەستان گفتۆ گۆیان کرد لە سەر هەندێ خاڵ ڕێك کەوتنو بە ئاگاداری سەرەوە شەڕەکەوەستا. دیارە ئالیەتێك بۆ جێبەجێکردنی شەڕ ڕاوەستانەکەش ئامادە کرابوو. بەلام پارتی ئەیویست سوود لە کاتوەربگرێ، لەو لاشەوە بزووتنەوە هەر هەڕو گیڤیان بوو.

ڕۆژی ٥/٢٦ پردی زەڵمیان گرت لەو شەڕەدا کاك حامی حاجی غالی بریندار بوو. لە ناو هەولێرێش لە هۆڵی زەرد شەڕ هەبوو. لەم کاتانەدا نوێنەری یەکێتیو پارتی هەڤاڵ مام جەلالو مەسعوود بارزانی بە ئامادەبوونی جێگری وەزیری دەرەوەی تورکیا لە سلۆپی ڕۆژی ٥/٣٠ پێکەوە دانیشتنو

گەیشتنە ئەوەی شەڕەکە ڕابگیرێتو هەردوولاش هەواڵەکەیان لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە بڵاو کردەوە. هەڤاڵ مام جەلال بۆ ڕادیۆ بیبیسی قسەی کردوووتی: لە گەڵ پارتی گەیشتوینەتە ڕێککەوتن. کەچی سامی عەبدولڕەحمان ئەڵێت: شەڕوەستاوە نەگەیشتووینەتە ڕێککەوتن. ئەوە بوو لە ڕۆژی ٦/٢ بە چاودێری کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی دەستکرا بە داگرتنی هێزەکانی یەکێتیو پارتی لە سەر شاخەکانی شاخە سوور، زینە تیر، ئالانە. بەڵام پارتی زۆر خۆی بە ناوەڕۆکی ڕێککەوتنامەکە نەئەبەستەوە.

بۆیە ڕۆژی ٦/٨ پارتی بە پاڵپشتی ئێران پەلاماری پێنجوێنی داو هیچیان پێنەکراو بە پێچەوانەوە زۆر بە خراپی تێکەوتنو شکستیان هێناو بوونە شاردی بندرك. بەتایبەتی یەکێك لە لێپرسراوە گەورەکانیان کە عوسمانی قادر منەوەر بوو کوژرا. کە دواتر ڕێگا درا تەرمەکەی ببرێتەوە سلێمانی. لە ڕێو ڕەسمێکدا ڕەوانەی گۆڕستان کرا. پارتی خەڵکی خۆی خزاندبووە ناو ڕێورەسمەکەوە، لەوانەی بە ناوی غورفەی عەمەلیاتی پێنجوێن هاتبوون بۆ ناو سلێمانیو تێکەڵ بە خەڵکەکە بوونو دوو نارنجۆکی دەستییان فڕێدایە ناو پێشمەرگەکانی لیوای تایبەتی یەکێتی یەوە کە لە دەورو بەری لقی پارتی بوون. پاشان بوو بە تەقە، لە ئەنجامدا ١٨ کەس کوژراو ٤٦ کەس بریندار بوون.

لە مەراسیمەکەدا بەیان نامەیان بڵاوکردەوەو قسەی ناشرینیان بە یەکێتی ئەووتەوە. بڕیار بوو بە کورتترین ڕێگا بەرەو گۆڕستان بڕۆن. بەڵام ڕێگاکەیان گۆڕیو بە ناو شاردا گەڕانو پاشان بەرەو لای لق ڕۆیشتن بە نیازی گرتنەوە کە لەوێدا تەقەکان کرانو شەڕەکە قەوما. لەم شەڕەدا ٤ پێشمەرگەی یەکێتی شەهید بوون.

لە ئەنجامی ئەمەدا کاك ملازم عومەر لە غورفەی عەمەلیات کشایەوە. هەر لەم کاتانەدا بوو پارتیو بزووتنەوە بە پاڵپشتی ئێران هێرشیان کردە سەر فەوجێکی لیوای خانەقین لەسەر ملەی بەمۆ، کە دوو پێشمەرگە شەهید ئەبنو

تۆپخانــەی ئێــرانیش تۆپبــارانی بنــاری بــەمۆو دێهاتــەکانی ئــەو نــاوەی کــردو زیــانێکی زۆری لــە دەغڵودانی خــەڵکی ناوچــەکەدا. لــە بەرامبــەردا هێزەکــانی یەکێتیو جەماوەری ناوچەکە لە هەمان ڕۆژدا پەلاماریانداو بەرەو مـەرزەکان ڕاویان نانو زیانی زۆریان لێکەوت. لە قـوڵی قەڵادزەشـەوە شـەوی ٦ـ٥/٧ پـارتیو بزووتنــەوە پــەلاماری قەڵادزەیــان داو گرتیــان، یــەکێتیش لــە دژە هێرشـێکدا قەڵادزەیـان ڕزگـارکردو زیـانی زۆر لـە هـەردوو لای پـارتیو بزووتنـەوە کـەوتو تەرمی ٢٨ کەسیان لە بەردەستی هێزەکانمان بوو. دیسانەوە پارتیو بزووتنـەوە لە شارەزوورەوە پەلاماری هێزەکانی یەکێتییان داو تێکشکانو سەرکەوتنیان بـە دەستنەهێنا. شەڕەکان بە جۆرێك بوون کە هەردوولا پەلاماریان ئـەدا، شـوێنیان ئـەگرتو دواتـر لـە پـەلامارێکی تـردا لـە یـەکتریان ئەسـەندەوە. ئەمـەش ئـەوە دەرئـەخا کـە هێزەکـانی هـەردوو لا زۆر تاقـەتیان لـە مانـەوەو بـەرگریکردن لـە گردو یاڵو شاخو داخ نەبوو.

بۆ ڕاگـرتنی شەڕو نەهێشتنی گـرێوگۆڵی ناکۆکییـەکان ڕۆژی ١٩٩٤/٥/٢٠ هەردوو مەکتەبی سیاسی یەکێتیو پارتی بە سەرۆکایەتی حەسـەن ئەلنـەقیبو بەشــداری کردنــی نوێنــەری بــەرەی کوردســتانیو سەرپەرشــتی I.N.C کۆبوونەوەیەك کراو بڕیاردرا:

- هێزەکان لە هەولێر جیا بکرێتەوە
- کشانەوەی ئەو هێزانەی هاتووەتە ناوچەکەوە
- جێبەجێکردنی ڕێککەوتنەکانی پێشوو تر
- دامزرانـدنی ژووری عەمـەلیات لـە مەسعود بـارزانیو د.ئەحمـەد ئەلچـەلەبی نوێنەری بەرەی کوردستانیو نوێنەرانی یەکێتیو پارتی.

ئەو خاڵانە زۆر گرنگ بوون ئەگەر جێبەجێ بکرانایە، بەڵام پارتی زۆر پابەندی جێبەجێکردنی نەبوون، کە لەو کۆبوونەوانەشدا ئامادە ئەبوون لە بەر خاتری پەرۆشی خەڵکیو لایەنـەکان بـوو کـە پێیـان خـۆش بـوو شـەڕ نـەمێنێو هـەردوولا پێـك بێنــەوە کەچـی بـە کـردەوە هیچـی ئـەنجام نەئـەدا، خـەڵکیو

لایەنەکانی ئەخستە بارێکەوە کە ئەویش‌وەکو ئەوان دڵسۆزە بۆ چەسپاندنی ئاشتی بەڵام لە ناوەڕۆکدا نەخشەیەکی دیکەی شەڕی دائەڕشت.

هەواڵەکانی شەڕ نەك هەر خەڵکی کوردستانی‌وەڕس کردبوو، بەڵکو دۆستەکانیشی بێزار کردبوو، پەرۆشی ئەوە بوون ئەو شەڕە تاقەت پڕووکێنە بوەستێ‌و کورد دەست لە بینی یەکتری هەڵگرن‌و ژیانێکی دۆستانەو هاو نیشتمانانە بە سەر بەرن. هەر لەم سۆنگەیەوە بوو حکومەتی فەرەنسا هەردوو لای یەکێتی‌و پارتی بانگ کرد بۆ گفتو گۆو ئاشتبوونەوە، ئەوە بوو هەردوولا لە ڕۆژی ١٩٩٤/٧/١٦ دا لە پاریس لە سەر مێزی گفتوگۆ دانیشتن، نوێنەری یەکێتی کاك نەوشیروان مستەفاو نوێنەری پارتی سامی عەبدولڕەحمان‌و بە ئامادە بوونی نوێنەری حکومەتی فەرەنسی‌و هەندێ لایەنی تریش. هەردوولا لە سەر بەرنامەیەکی ڕێکوپێکی هەمە لایەنە پێکهاتن بەو نیازەی بە ئامادەبوونی سەرۆك میتران، هەڤاڵ مام جەلال، مەسعود بارزانی ئیمزای لە سەر بکەن، بڕیارپش‌وابوو ئەم ڕێککەوتنە بڵاو نەکرێتەوە تاکو هەردوولا ئیمزای ئەکەن.

چونکە حکومەتی تورکی دژی ئەم ڕێککەوتن‌و پێکهاتنە بوو، پارتیش نەیویست پەیوەندییەکانی خۆی بۆ حیساباتی دووا ڕۆژی لەگەڵ تورکیا تۆکمە بکات. بۆیە لە گەڕانەوەدا پارتی دەقی ڕێککەوتنامەکەیان خستە بەردەستی حکومەتی تورکی. تورکیاوا چووبووە زەمینەوە کە ئەمە بەرنامەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی یە. بۆیە ڕێگەی نەدا ئەو ڕێککەوتنامەیە جێبەجێبکرێ‌و پارتی‌والێکرد کە لەو هەنگاوەی بۆ ئاشتی پەشیمان ببێتەوە. گەرچی دەقی ئەو ڕێککەوتنامەیە خرایە بەردەستی پەرلەمان‌و بایەخی زۆری پێدرا بەڵام لەبار چوو. پارتی بەمە گەورەترین تاوانی ئەنجام دا کە نەیهێشت ئاشتی سەربگرێ، چونکە لە بەردەوام بوونی شەڕدا قازانجەکانی زۆر کەڵەکەی ئەکردو ڕەسیدی بانکەکانی فراوانتر ئەبوو بۆ گیرفانی بنەماڵە. بەمەش هەوڵێکی گرنگی

دڵسۆزانە كە نەك كورد خۆی بەڵكو دۆستەكانی كە زۆر بە پەرۆشبوون بۆ یەكخستنی ماڵی كوردیو ئاو بەسەر ئاگری شەڕدا كردن دەستنرایە بینی.

لە ڕۆژی ١٩٩٤/٧/٢٥ دا لە لایەن (م.س) هەردوولاوە كۆبونەوەكراو دوای گفتوگۆیەكی زۆر، بڕیاریان دا لیژنەی ئاسایی كردنەوە دامەزرێ بۆ ئاسایی كردنەوەی بارودۆخی شەڕەكەو گەڕانەوە بۆ باری جارانو نەمانی دوو دڵیو ئاڵۆزی. بۆ زۆرتر دڵنیا بوون هەڤاڵ مام جەلال خۆی ئالای زەردی لە سەر بارەگای لقی ٤ ی پارتی سلێمانی هەڵكرد لە ناو ئاپۆرەی خەڵكێكی زۆردا، پارتی ئەبوایە ئەم هەڵوێستەیان بە جوانیوەربگرتایەو بە هەنگاوێكی دڵسۆزانەیان تۆمار بكردبایە، بەڵام لە ناخەوە دەیان داوی دڵپیسیو كینەیان دانابووەوە، بگرە پێشیان خۆش نەبوو پەنجەی هەڤاڵ مام جەلال لەو پەڕۆ زەردە بكەوێ، چونكە سەركەوتنی خۆیان لە هەنگاوەكانی ئاشتیدا نەئەبینیەوە. بەڵكو هەمیشە بە دوای پیلانی نوێدا ڕایان ئەكرد تاكو پەتی بارودۆخەكە بپسێننو تای تەرازوو بەلای خۆیاندا بشكێننەوە. بۆیە هەمیشە شەڕیان پێ خۆشتر بوو، حەزیان بە سوتانی لاشەی كورد ئەكرد لە كورەی شەڕدا.

كاتێ كە ڕەوڕەوەی شەڕەكە خێراتر ئەبووەوەو مەترسی زۆرتری لێئەكەوتەوە، لە هەموو لایەكەوە دەنگ دژی شەڕ بەرز ئەبووەوە. پەرلەمانی كوردستانیش لای خۆیەوە لە یەكێك لە بەرنامەكانی ڕۆژانەی كۆبونەوەكانیدا لێكۆڵینەوەیەكی لە سەر شەڕەكەو مەترسییەكانی تەرخانكردو بڕیاریدا لیژنەیەكی پەرلەمانی سەردانی شەرگەكان بكات لە نزیكەوە لە گەڵ لایەنەكانی شەڕدا قسەو گفتوگۆ بكەنو هەوڵی ڕاوەستاندنی شەڕ بدەنو ڕێگری لە پەرەسەندنی بكەن.

ڕۆژی ١٩٩٤/٨/٩ ئەووەفدەی پەرلەمان كە لە هەموو فراكسیونەكانی ناو پەرلەمان پێكهاتبوون گەیشتنە سنووری قەڵادزیو ڕانیەو سەردانی هەردوو سێ لایەنەكەیان كردوگفتیان دا كەشەڕ ڕابگرنو پەلاماری یەكتری نەدەن. ئەووەفدە لە قەڵادزێ سەردانی منیشیان كردو لای منەوە بەرەو لای پارتیو

بزووتنەوە ڕۆیشتن، خەڵکەکە زۆر بە توندی یەخەی مەمەند ئاغای ئەندام پەرلەمانی سەر بە لیستی زەردیان گرتو من بە هەزار حاڵ ڕزگارم کرد.

کەچی هەر لەو ساتانەدا کەوەفدی پەرلەمان هێشتا لەوێ بوون، پارتیو بزووتنەوە پەلاماری دێی دێرێ یان دا، لە جیاتی سەرکەوتنو ناوچە گرتنەوە، بە توندی شکانو پاشە کشەیان کرد. یەکێتیش بۆ تەمبێکردنیان لە چەندین قۆڵەوە:

- نورەدین بۆ کورە تاوڵ
- دێرێ بۆ هەڵشۆ
- گردەسپان بۆ دارەشمانە
- چۆمخرکە بۆ قۆپی ئالانە

- بەر قەڵشیو بۆ کانی شینکە.. پەلاماری دانو تاکو ئێوارە هەموو ناوچەکانیان لێ پاککرایەوە هاوکات پارتی لە زینە تیر پەلاماری یەکێتی دا لە ئەنجامدا شکانو تا هەریر ڕاو نران، لە تاراوەشەوە پەلاماریان دراو تا خەلیفان ڕایان کرد. بەمجۆرە پارتی لە گەڵ ئیرادەی ئاشتیدا نەبوون. گوێیان لە داخوازی کەس بۆوەستاندنی شەڕ نەئەگرت، ناو بژیوانی هیچ دۆستو لایەکیان بە لاوە مەبەست نەبوو. بەرەکانی شەڕ هەندێ بێدەنگی بە خۆوە بینی. بەڵام هەر دڵنیا نەبووین کە بێدەنگی یەکجارەکی ئەبێو زرمەی تەقو تۆق ئەبڕێتەوە. بۆ ئێمە مانیش دەنگی تەقە جۆرە ئاوازێك ئەبەخشێ کە زۆربەی مرۆڤایەتی لێیوەرس ئەبن تەنیا گوێی عەسکەری یەکانی پێ ئاشنان. ئاوازێك لە دروێنەی ڕۆحەکان ئیلهاموەرئەگرێووێنەی کاولیوویرانی لە سەر ژێیەکانی ئەگرێ.

لەو سەردەمی نەشەڕ نە ئاشتی یەدا یەکێتی یادی هەڤاڵە دێرینەکانی ڕۆژانی پارتیزانی دوای ئەنفالی کردەوە، لە ڕێو ڕەسمێکی شایستەداو بە پێی بەرنامەیەکی ڕێکوپێك هەموو ئەو هەڤاڵە پێشمەرگەو سرکانەی بەشدارییان لە پارتیزانیدا کرد بوو کە ژمارەیان گەیشتە ٣٩٩ کەس ڕۆژی ١٩٩٤/١٠/١٥ بانگهێشتکران بۆ قەڵاچوالان بۆ ڕێزلێنانیانو بەخشینی مەدالیای زێڕین پێیان. ئەمەش لا کردنەوەیەکی باش بوو لەو هەڤاڵانەی ڕۆژانی تەنگانەو بە سەر

کردنەوەشیان لەم ڕۆژگارەداواتای تایبەتی خۆی هەبوو کە یەکێتی لە شەڕدابوو بەرامبەر بە لایەنە نەیارەکانی کە ئەیانویست لە گۆڕەپانی کوردستانداوەکو حیزب نەمێنێ.

وەزعی پشێوی کوردستانو شەڕو ململانێکان هەر بەردەوام بوو، بە لای هەندێکەوەوا ڕەچاو ئەکرا کە ئەگەر تەشکیلەی پەرلەمان بگۆڕێو کەسایەتی بەهێز بەڕێوەی ببات وەك هەڤاڵ مام جەلالو مەسعود بارزانی لەوانەیە ئیتر گرفتو کێشەکانوا توندو تیژ نەبنو ڕووداوی کارەساتبار ڕوونەدات. بەڵام پارتی بەمە قایل نەئەبوون بەڵکو بە شوورەییان ئەزانی کە مەسعود بارزانی لە جیاتی جەوهەر نامیق ببێتە سەرۆکی پەرلەمان، تا ئەو ڕادەیەی سەرۆکی دەستەی زەردی پەرلەمان فرانسۆ هەریری ڕایگەیاند ئەوە لە گەورەییو پیرۆزی مەسعود بارزانی کەم ئەکاتەوە. لە هەموویشی خراپتر ئەمە لە ڕۆژنامەی گولاندا بڵاوکرایەوە کە ئەکەوێتە بەردەستی خەڵکی.

پارتی ئەوەندە پەرلەمانیان لە بەرچاو سووکە تەنانەت دانانی مەسعود بە سەرۆکی بە کارێکی ناشایستە ئەزانن، کە چی هەرهەمان مەسعود بارزانی لە کۆنگرەی ئۆپۆزیسیۆندا ئەندامەو پێیشی بچووك نابێتەوە. ئائەم لووت بەرزییە.. کە لە ناو خەڵکی میللەتەکەی خۆتدا هاوبەشی خەمو ئازاریان نەبیو لە ڕێگەی دەزگایەکی گەورەی چارەنووسسازەوە هاوکاریان نەبێت بەڵام لە دەزگایەکی غەیری نەتەوەکەی خۆتدا گەر بە بچووکیش کڕنۆش بەری هەر گەورەییە. ئەم جۆرە ڕەفتارە لە هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی هەندێ خەڵکی کوردستاندا باوەوەکو ئەوەی هەندێ لە شێخەکان ژن نادەنە ئۆمی، یان هەندێ لە ئاغاو بەگەکان ژن نادەنە هۆزەکەی خۆیانو بە هی تری ئەدەن چونکە نایانەوێ بە کەم تەماشا بکرێن.

پارتی بۆ تێکدانی ئاشتی هەمیشە لە کاردا بوون، لە ڕۆژی ١٩٩٤/١١/١ بەسەرپەرشتی حەمە ڕێگر هێزێکی چەتەو ڕێگر ڕێگە لە هەڤاڵانی مەڵبەندی دووی کەرکوك لە سەر ڕێگای سلێمانی - چەمچەماڵ ئەگرنو ئەیاندەنە بەر

دەستریژو هەشت کەس لە هەڤالانی مەلبەند بریندار ئەبن کە لێپرسراوی مەلبەند هەڤاڵ عیماد ئەحمەدو شالاوی عەلی عەسکەری ئەندامی پەرلەمان‌و جێگرو کارگێڕو ئەندامانی مەلبەندو دوو پێشمەرگە ئەبن. ئەم هەڤالانە لە چەمچەماڵ سەردانی بارەگای پارتیان کردبوو بۆ ئاساییکردنەوەی دۆخەکەو هاوکاری کردنی یەکتری بە تایبەتی گێڕانەوەی کەلو پەلەکانی بارەگاکان. ئەبێ ئەمە چۆن تەماشا بکەین..؟ ئایا دڵنیا بین لەم جۆرە ئاشتییە..؟ یان لە پشتی پەردەوە دەیان تۆڕی پیلانگێڕی دامەزراوە..؟!

هەوڵەکانی ئاشتی هەر بەردەوام بوو، بۆ ئەوەی بەرەکانی شەڕ گەرم نەبێتەوەو خوێنی لاشەی پێشمەرگە بە فیڕۆ نەڕوات. لە هەوڵێکی تردا هەردوو لایەنی یەکێتی‌و پارتی ڕۆژی ١٩٩٤/١١/٢٤ ڕێککەوتنامەی هاو پەیمانێتی ستراتیژیان مۆر کردو پەرلەمانی کوردستانیش لە دانشتنێکیدا پەسەندی کرد.

## لە ئەوروپا

لەم هەلومەرجەدا بوو بنەو بارگەم تێکنا بۆ گەشتێکی ئەوروپا. وامزانی ئیتر شەڕ نابێتەوە، ئەم هاوپەیمانێتی یە زۆر ستراتیژییە بەردی بناغەی ئاشتی یەو چیتر چەك نابێتە فەرمانڕەوای پەیوەندییەکانمان، بۆیە ڕۆژی ١٩٩٤/١٢/١٠ خۆم ئامادە کردو کاتژمێر ٢ ی شەو لەگەڵ مام ڕۆستەم هەولێرمان بە جێهێشت چووینە کەلاوەکانی بارەگاکەی سەرچڵ قەزاز لە زاخۆ. ڕۆژی ١٢/١١ چووینە ماڵی کاك محەممەد سلیڤانی‌و ڕۆژی ١٢/١٢ لە پردی خاپوورەوە پەڕینەوە بەری تورکیا، شەو گەیشتینە دیار بەکرو لە ئوتێل کاروانسەرا لاماندا. ڕۆژی دواتر لەگەڵ مام ڕۆستەم‌و فازیلی مەلیح چووینە ئەنقەرە تاکو ڕۆژی ١٢/٢١ لەوێ ماینەوە، کاك شازاد سائیب ڤیزەیەکی بەلجیکای بۆوەرگرتم.

ڕۆژی ١٢/٢٢ سوار بووم‌و لە هۆڵەندا دابەزیم، لە فڕۆکە خانە دەستگیر کرام، بە ئازایەتی کاك مستەفا چاوڕەش‌و کاك د.چیا ئازادکرام، لەوێ چووینە

ماڵی کاك زاهیری برای کاك مستەفا. نزیکەی هەشت ڕۆژ لەوێ مامەوە لە ١٢/٣٠ لە ئەمستردامەوە لەگەڵ د.چیاو کاك شێرکۆی شێخ نوری چووین بۆ ماڵی هاوڕێ جەبارە بچکۆل لە هامبۆرگ.

# ساڵی ١٩٩٥

شەوی ١٩٩٥/١/١ مان لە هامبۆرگ بردە سەر. لەووڵاتە خۆش‌و دڵگیرە، لەو دنیای پێشکەوتنە کە لە گەڵ ئاستی‌ووڵاتەکانی خۆماندا لە هیچ ڕوویەکەوە بەراورد ناکرێ، بەڵام من بە جەستە لەوێ بووم. بە گیان لە فەزای کوردستانەکەی خۆمدا ئەژیام کە هەمیشە هەورو هەڵای شەڕو پشێوی بە سەرەوەیەو دڵ‌و دەروونەکان لە زرمەی تۆپ‌و تەق‌و تۆقی تفەنگەکان دائەچڵەکێن، دەم‌وچاوەکان خەمباری لێ ئەباری.

دوای دوو ڕۆژ برادەران تەسلیمی پۆلیسیان کردین، پاش ئەوە فەحسیان بۆ کردین‌و بردینیان بۆ شوێنێك‌وەکو ئوتێل‌وابوو شەو تیا بخەوین. کابرایەکی لێبوو بۆ خزمەتگوزاری، لێی پرسین: ئێوە کوردن..؟

ووتمان: بەڵێ

ووتی: خەڵکی کوێن..؟

ووتمان: خەڵکی سلێمانی.

لەو ڕۆژەدا شەڕ لە نێوان یەکێتی‌و پارتی دەستی پێکردبووەوەووتی: جاشە جەلالی یەکانیان فڕاند تاکو باوەشی بەعس. بە مام ڕۆستەم‌ووت: قسە مەکە هەرچی ئەڵێ با بیڵێ، چونکە ئاگامان لە شەڕەکە بوو، بەڵام بەو شێوەیە نەبووەوەکو ئەو کابرایە باسی ئەکرد.

تاکو ڕۆژی ١٩٩٥/٣/٢٠ لەوێ ماینەوە. بارودۆخەکەمان بە دڵ نەبوو، ڕۆژانە دەنگ‌و باسەکان بێزاری ئەکردین، لە ناخەوە خۆمان ئەخواردەوە، هەر چەندە ئێمە لە ڕاستیدا بۆ ئەوە چووینە ئەوروپا بە پەناهەندەوەربگیرێین.

کەچی پەشیمان بووینەوەو بڕیارمان دا کە بگەڕێینەوە کوردستان. بە تایبەتی لە هەندێ جێگەدا هێزەکانی یەکێتی شکا بوون، ئیتر خۆمان پێرانەگیرا. لە لایبزیکەوە بۆ هامبۆرگ گەڕاینەوە، لەوێشەوە بۆ ئەمستردام. شایانی‌ووتنە هەردوو سەفەرەکە کاک سەلاح قادر زاوای کاک سەلاح چاوشین بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆی ئەیگواستینەوە، لە پێناوی ئێمەدا هەردوو جارەکە ئۆتۆمبیلەکەی شکا. لەم سەفەرانەدا هاوڕێ جەبارە بچکۆل‌و کاک سەلاح قادروکاك فەریدوون سالەح‌و کاك یاسین سالح ئەرکی زۆریان لەگەڵماندا کێشاو ماندووبوون کە جێگای ڕێزو شایستەی پێزانینمانن.

# گەڕانەوە

پاش چەند ڕۆژێك لە ئەمستردامەوە بە ڤیزەی ژمارە گەڕاینەوە سوریا، لە سوریاش کاك دانای ئەحمەد مەجید کار ئاسانی گەڕانەوەی بۆ ئێران بۆ کردین. دوو ڕۆژ لە تاران ماینەوەو ئینجا لە سنووری پەروێز خانەوە پێمان نایەوە خاکی کوردستان. لە ڕێگەدا لێپرسراوێکی سوپای پاسدارانمان لەگەڵا سوار بووبوو بۆ سەر سنوور، لە ئەنجامی قسە کردنداووتی: بۆچی لەگەڵ مالی مەلا مستەفا دا شەڕ ئەکەن..؟ چ عەیبێکیان هەیە..؟ لەوەلامدا پێم‌ووت: شاکەی ئێوە چ عەیبێکی هەبووا ڕووخانتان..؟! ئەو خاوەنی‌وولاتێکی گەورەو ئابوری یەکی باش بوو. بۆیە ئێمەش شاکەی خۆمانمان ناوێ، ئەبێت لە کوردستاندا گۆڕان درووست بکەین. نیزامی خێڵەکی لە گۆڕ نێین. ئیتر کابرای پاسدار لێی بێ دەنگ بوو. هەرچەندە ئێمە شامان نییەو بڕوامان بەوە نییە کەس ببێ بە شایەك ئاییندەی یەکگرتووی کوردی نەوێت.

دیارە دوای ئەوەی ئاگر بڕێکی کورتخایەن کرا، ناکۆکییەکان هەتا ئەهات توندتر ئەبوو، بە جۆرێك دۆخەکە بەرەو ئالۆزی ئەچوو بە ئاگر بڕ چارەسەر نەئەکرا، بەڵکو زۆرتر لە سنووری تێهەڵچوونەوە نزیکتر بوون تا پێکهاتن. بۆیە

جارێکی تر شەڕ لە مانگی ١٢/١٩٩٤ بەرپا بووەوە. جارێکی تر هەموو پێکهاتنەکانو پەیماننامەو ڕێککەوتننامەکان پێشێلکرانو پشتگوێخران، جارێکی تریش لوولەی تفەنگ بووە سەرپشكو هیچ ڕێگایەکی تر نەگیرایە بەر. کە بشمانەوێ بگەینە ڕاستی لە ئەنجامی هەڵسەنگاندنو تاوتوێ کردن لە بارەی شەڕو هۆکارەکانی هەڵگیرساندنی زۆر شتمان لێوون ئەبێ، یان تاڵە دەزووەکان ئەئاڵۆزکێن. بەڵکو هەرکەسێك بە پێی کامی دڵی خۆیو لایەنگری بوونی بۆچوونەکانی دەرئەبڕێ یان تۆماری ئەکات کە لەوانەیە بە باشی مەبەستەکانی نە پێکی یان لێی دوور بکەوێتەوە، بە داخەوە لای ئێمە نەبووەتە دابو دەستور خەڵکی یان ڕای گشتی بێنەوەڵامو بڕیار دەربکەنو هاوکێشەکان بگۆڕنو بەرژەوەندی گشتیو چارەنووسی لە بەرچاو بگیرێ. بەڵکو جۆرە بێدەنگی یەك باڵی بەسەر بارودۆخەکەدا کێشاوە کە زیانی زۆری لێئەکەوێتەوە، ئەمەش یان نەزانیو هەست نەکردنە بە لێپرسراوێتی یان کەمتەرخەمیو گوێنەدانە بە ئەنجامی چارەنووسی خۆ لە دوای ڕاپەڕینو دامەزراندنی پەرلەمانو حکومەتی هەرێمەوە کە هەندێ حیزبو لایەنوبگرە خەڵکیش لە هەلومەرجەکە بێزار بوونو قسە ئەکراو شت ئەنووسرا،وەکو بڵێی ئەمە هەڕەشەیەك بێ بۆ دروستبوونی هێڵی سێیەموەکو ئەڵتەرناتیڤێك بەرامبەر هەردوو هێڵە سەرەکییەکەی تر کە شەڕیان بەر پا کردبوو لە سەر دەسەڵاتو گەیشتنە ئاستانەی چارەنووس، هەر هێڵەش بە ڕبەی خۆی ئەیپێوا. کامەیان ڕاستەو کامەیان ناڕاست. ئەوە ئەبوا خەڵکی بڕیاری لێبدا. بەڵام کەس نقەی نەئەکرد. خۆیشیان نەیانئەویست لە بری پەنا بردنە بەر ڕێگا چارەی شەڕ بە ڕاپرسییەك بگەنە ئەو ڕاستییە کە دەنگی خەڵکی مسۆگەر ئەکەن یان نە..! بە هەر حاڵ لە پاڵ ئەم شەڕەدا پلانێکی دۆزەخیانە هەبوو نەك بە مەبەستی خزمەتگوزاری خەڵکی کوردستان. بۆیەش ئەبینین بۆ ئەنجامدانی ئەو پلانە یان گەیشتن بە لوتکەی مەبەستە تایبەتیەکان شەڕی بێهوودە لە تونێلە تاریکەکانا بەڕیوە ئەچێ.

## گرتنی شەقڵاوە

پارتی بۆ ئەوەی جێ پێی خۆی قایم کاتو بە ئاسانی لە بەرەکانی شەڕدا نەخلیسکێ، ئەبوا هەندێ شوێن بۆ خۆی دەستەبەر بکات، بەتایبەتی ئەو شوێنانەی کە مەترسی ئەخستە سەر بارەگاکانی سەرکردایەتییان ڕێگای هاتوو چۆو لۆجستی ئەبڕی لێیان. بۆیە لە ڕۆژی ٩٩٤/١٢/٢٢ دا پەلاماری بنکەو بارەگاکانی یەکێتی یان لە شەقڵاوە دا کە هێزێکی کەمی لێبوو. گرتنی شەقڵاوە بۆ پارتی گرنگی تایبەتی خۆی هەبوو، هەرچەندەوەفدی هەردوولا چوونە شەقڵاوە بۆ ڕێگری لە گرتنی بارەگاکانی یەکێتیو خودی مەسعود بارزانی قسەی تیا کردبوو، بەڵام ئەوەی ئەوتری جیایە لە نەخشەی ناخ. سەرەڕای هەموو گفتەکان شەقڵاوە گیرا. لەم لاشەوە پارتی ترسی لە هێزو لێپرسراوەکانی سلێمانی لێنیشت کە بە دەردی جاری پێشوو نەچێ، بۆیە بڕیاری دا لە ڕۆژی ١٩٩٤/١٢/٢٨ دا هەموو بۆ هەڵەبجە بکشێنێتەوە لە ڕێگەی بزووتنەوەو سۆسیالیستەوە.

## پاککردنەوەی هەولێر

ئینجا یەکێتی خۆی ئامادە کرد بۆ گورزوەشاندنی کاریگەر لەوەڵامی ئەو دەستدرێژی یانەی پارتی، هەولێر کرایە نیشانە. کە گرنگی تایبەتی هەبوو لای پارتی لە بەر ئەوەی پێتەختی هەرێم بوو، بارەگای پەرلەمانی تێدا بوو بە حیساباتی پارتی گەورەترین پێگەی کارکردنی حیزبی یان لەوێ دابوو، بە بیریان دا نەهاتووە ڕۆژێك لە ڕۆژان یەکێتی بتوانێ پەلاماریان بداو دەریان پەڕێنێ. بەڵام لە چاو ترووکانێکدا هەموو دامودەزگاکانی حیزبی، عەسکەری، ئیداری یان بە یەکجاری تەفروتونا کران. تەنانەت ئەو خۆ قایمکردنەی ناو شیراتۆنو لقی دوو دادی نەدان. پارتیوەکو با پووشکەیان لێهاتو بەرگەی ئەو

تەوژمــە بــەگوڕەی هێزەکــانی یــەکێتی یــان نــەگرت، بەشــێکی لێپرســـراوو کادیرەکانیان کە لە شیراتۆن و لقدا مابوونەوە لە ڕێگەی حیزبی شیوعیو I.N.C و بە ڕەزامەندی یەکێتی گەیەنرانە مەسیف.

## تۆپبارانی ئۆردووگاکان

هـەر لـەم مانگـەدا بـوو کـە پـارتی داهێنـانێکی تـری کوردکوژیوەکـو دەستکەوت دۆزی یەوە کە بریتی بوو لە تۆپبارانی ئۆردووگـاو شارۆچکەکان بـە مەبەستیوەرسکردنی خەڵکەکەیو دژی یەکێتیوەستان یان بۆ زیان گەیاندن بـە ئەندامو لایەنگرانی یەکێتی. لە هیچ شوێنێکی ئەم دونیایەدا نـەبووە بـەرەکانی شەڕ بگوێزرێتەوە ناو ماڵو خانەی خەڵکی بێتاوان. مەگەر تەنیا بەعس ئەوەی بەرامبەر کورد کردبێت. ئـەوەبوو لـە بنـە سلاوە لـە ١٩٩٥/١/٢١ دا لـە ئـەنجامی تۆپبارانی خەستی هێزەکانی پارتی کە تا بەیانی درێژەی هەبوو ٩ کەس شەهید بـوونو ٦٠ کەســی تــریش برینــدار بــوون. کاریگــەری ئــەم تۆپبارانــە لــە برووسکەیەکی لیستی زەرددا بۆ مەسعود بارزانی دەردەکەوێ:

بۆ/ م.ب

لە/ فراکسیۆنی زەرد

( تۆپباران کردنی هێزەکانی ینـك نزیـك بنەسلاوە زۆر تەئسیری باشـی هەبوو لە سەرووورەی جەماوەری هەولێر تکایە درێغی نەکرێت، تاکو ئینشائەڵڵا بە زووترین کات شاد ئەبینەوە لەگەڵ هێزەکانمان لە ناو شاری هەولێر ).

ئەگەر فەرماندەیەکی عەسکەری پارتی ئەم برووسکەیەی بکردایـە جێـی ڕەخنە نەبوو، بەڵام کە نوێنەرەکانی لیستی زەردی پارتی بـەو جـۆرە هەڵوێست دەربـڕن ئـەبێ لـە چ خانەیەکـدا جێیـان بێتـەوە..؟ ئایـا لـە خانـەی خزمـەتی چارەنووسی خەڵك یان خانەی جاسوسی..؟ لە جیاتی ئەوەی ناڕەزایی بەرامبـەر سـەرکردایەتی عەسکەری پـارتی دەربـڕن دەستخۆشـیان لێئەکـەن. کـە ئەشـڵێن

تۆپبارانی هێزەکانی یەکێتی نزیك بنەسلاَوە ئەوە بۆ چەواشە کاری یە بەڵکو هەموو خەڵکی هەولێر ئەزانن کە تۆپەکان داویەتی بە ناو خەڵکی ئەنفال کراوی بنەسلاَوەدا نەك بە ناو هێزەکانی یەکێتیدا. ئەمەش یەکەم جار نییە کە تۆپبارانی شارۆچکەو ئۆردووگا بکرێ، بەڵکو ڕۆژی ١٩٩٤/٨/٦ هێزەکانی پارتی تۆپبارانی قلاَدزەیان کردو زیاتر لە ٥٠ کەسیان شەهیدو بریندار کرد، خەڵکە کە نەیانتوانی پرسەیان لە قلاَدزی بۆ دابنێن گواستیانەوە بۆ ڕانیە.

## پەناگیری و جاسوسی

پێش ئەوەی هەولێر بە تەواوی بگیرێ لە هەوڵێکدا بۆ قوتار کردنی بارو دۆخەکە ٥٧ ئەندام پەرلەمان بۆ ماوەی ١٠١ ڕۆژ لە بینایەی پەرلەماندا لە ڕۆژی ١٩٩٤/١٢/٢٣ پەنایان گرتبوو. هەموو ڕۆژێك چەندین کاتژمێر کۆبوونەوەیان ئەکردو چەند بانگەوازێکیان ئاراستەی هەردوو حیزب کرد، لە ناوەوەی کوردستاندا ئەم کارە دەنگدانەوەیەکی پڕ بایەخی هەبوو، ١٧ حیزبو دەیان ڕێکخراوی جیاجیاو جەماوەری گەلەکەمان لە هەموو شاروو شارۆچکەکان پشتیوانی خۆیان بۆ پەناگیرەکانو هەوڵی ئاشتی نواند. بەلاَم پارتی کە سەرۆکی پەرلەمانەکەیو ئەندامانی پەنایان گرتبوو لە ڕووی هەستی دڵسۆزیو پەرۆشییەوە نەبوو بۆ ئاشتیو دوور خستنەوەی تارمایی شەڕ، بەڵکو بە پێی بەرنامەیەکی تایبەتی مابوونەوە کە دوواتر ڕیشاڵەووردەکانی پیلانەکە دەرکەوت کە ئەوانە بۆ گەیاندنی زانیاری شەڕو جاسوسیکردن لە سەر هێزەکانی یەکێتی ماونەتەوە. بۆ ئەمەش جیهازە بێتەلەکەی پەرلەمانیان بە کار ئەهێنا کە دواتر لەلایەن ئاسایشی گشتییەوە دەستی بەسەرا گیراو هەموو بەڵگەنامەکانی گیراو بۆ خەڵکیش بلاَوکرانەوە، کە بەناوی جەوهەر گێتەوە ناوی دەرکرد. کاتێکیش دوای ١٠١ ڕۆژ پەناگیری کە هەوڵەکەیان پوچوڵ کرایەوە

کۆتـایی بـە پـەناگیری هێنـراو زۆربـەی ئەندامـەکانیان چـوونەوە مەسـیفو هەندێکیشیان هەر لە هـەولێر مانـەوە بێ ئـەوەی کـەس لێیـان بپێچێتەوە یـان هەڵـەیان بەرامبــەر بکـرێ.وە نـەبێ پـارتی کـە لـە هـەولێر دەرکـرا ئـیتر دەستبەرداری بن بەڵکو هەمیشە لە هەوڵی بێووچاندا بوون بۆ گرتنـەوەی، بـۆ ئەمـەش هێزیـان کـۆ ئـەکردەوە، بانگەشـەی گرتنـەوەیان ئـەکرد، تـاکو لـە ڕۆژی ۱۹۹۵/۱/۱٤ دا بـە هێزێکـی زۆرەوە لـە قـۆڵی کەسـنەزانەوە پـەلاماری هێنـا، بـەڵام نـەیانتوانی سـەرکەوتن بـە دەسـت بهێـنن، ڕووبـەڕووی هێـزە سەرسـەختەکانی یەکێتی بوونەوە، تووشی شکستی بە زەبر هاتنو بەرەو دواوە کشانەوە کە تێیـدا یەکێك لە فەرماندە زلەکانیان بـە نـاوی عـەلی شـەعبان کـوژرا. ئیتر یـەکێتیش کەوتەوە خۆ قایمکردنو سەنگەر بەندی بۆ پاراستنی هەولێر لە هەر ئەگەرێکی هێرشی نوێ. هێزێکـی زۆری لـە ناوچـەکانی تـرەوە بـە تایبـەتی گـەرمیان بـردە هەولێرو دەوروبەریو بـە درێـژایی دەیـان کیلۆمـەتر سـەنگەری قـووڵو شـوێنی بەرگریو مەتەرێز درووستکران بەرامبەر بە پارتی. کـە جـار ناجـارە هـەوڵێکی نەزۆکانەیان ئەدا لە قۆڵێکەوە درز بخەنە ئەو سەنگەربەندی یە تاوەکو جارێکی تریش دەستیان بگاتەوە نـاو هـەولێر. چونکە کـە گـەیشتنەوە هـەولێر ئـەتوانن تەرازووی دۆخەکە لاسەنگ بکرێو گۆڕان ڕووبداتو ئاڵۆزی بخەنەوە. بـەڵام بـۆ خۆیان ئەوەیان پێنەئەکرا. چونکە پێکهاتەی هێزەکانی پارتی هەمە چەشـنەیە، جگە لەوەی ناکۆکی لە نێوانیاندا هەمیشە بەر پایـەو زۆر پێکـەوە ناسـازێن. بـە تایبـەتی سۆرانیو بادینی، کۆنو نوێ. زاڵبـوونی پەیوەنـدی خێڵەکایـەتیو پشـت بەسـتن بـە کەسـایەتییە جاشـەکانی دەسـت لـە خـوێنی خەڵکـدا سـوور بـووو ئەنفالکەر. ئەم ناکۆکییەی نوسەر باسی لێوە دەکات

لەناو (پارتی) دا بەزیادەوە هەیە،
هەرکەسێك روانیبێتە حاڵیانە ئەوە
بۆی دەردەکەوێت ٥٢٤ ... ناکۆکیەی
نێوانیان ... گەیشتوە ... کەیەی

# هاتنی تورک

لەم کاتانەدا دەنگۆی هاتنە ژوورەوەی هێزێکی زۆری سوپای تورکیا بۆ ناو کوردستان بڵاو بووەوە کە لە ڕۆژی ۱۹۹۵/۳/۲۰ دا بوو گوایە بۆ لێدان‌و پاکسازی پەکەکە هاتووە. بە ڕووکەش ئەوە بەڵگەیەکە بە دەستیەوە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا ئەو سنوور بەزاندنە بۆ پێشێلکردنی ڕێزو سەروەری هەرێم بوو. بۆ دەرخستنی لایەنی تەماحکاری یەکانی بوو لە هەرێمی کوردستاندا یان بۆ چاوترساندنی کورد بوو کە بیر لە ئازادی‌و درووستکردنی قەوارەی خۆی نەکاتەوە. یان بۆ ناچار کردنی سەرکردایەتی کوردبوو بۆ هاوکاری کردنی لە لێدانی هێزەکانی پەکەکەدا. کە دوو لایەنی هەبوو لە لایەکەوە بێ ئاستی کوردو سەرکردایە تییەکەی دەرخا کە خاوەنی دەسەڵاتی خۆیان نین‌و پاشکۆی هێزی ئیقلیمین، لە لایەکی ترەوە کورد بە کورد بە کوشت بدات‌و ناکۆکی بخاتە ڕیزەکانی کوردی بەشەکانی کوردستانەوە، بە هەردوو بارەکەش کورد لە دونیادا ڕیسوا بکات. لێرەدا جیاوازی لە نێوان هەڵوێستەکانی یەکێتی‌و پارتیدا هەیە. پارتی هەر زوو کەوتە ناو داوی خۆبەدەستەوەدانەوە، چونکە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی نەك بەرژەوەندی نیشتمانی‌و نەتەوایەتی‌وای ئەخواست کە هاوکارو دەست تێکەڵکەر بێت.وەکو باس ئەکرا پارتی لە ژێرەوە یارمەتی لە تورکیا بۆ چەکدارەکانی‌وەرئەگرت کە بۆ پەرچدانەوەی پەکەکە چەکدار کرابوون. دیارە هەموو هاتنێکی هێزەکانی تورکیا بۆ کوردستان بێ ئاگاداری مەسعوود بارزانی‌و سەرانی پارتی نەبووە. بەڵام هەڵوێستی یەکیتی زیاتر هوشیارانەتر بووە لە مامەڵە کردن لەم بارەیەوەو بگرە یەکێتی باجی خۆیشی داوە لە سەر ئەو هەڵوێستەی کە ئامادە نەبوو لە ژێر گوشارو هەڕەشەی تورکیادا دەست لە پەکەکە بکاتەوە، هەر چەندە هەمیشە لەگەڵ پەکەکەدا

شەڕە دەنووکی بووە لە سەر سیاسەتە چەوتەکانیو زۆر جاریش بەڵێنی لە ئۆجەلانوەرگرتووە کە شێوازی کارو مامەڵەی بگۆڕێو بە پێ ی سیاسەتی سەردەم ڕەفتار بکاتوکاروانی کوردایەتی بەرەو هەڵدێر نەبات.

## پەلاماردانی هەولێر

لە دوای گرتنەوەو پاکسازی هەولێر یەکێتی هەمیشە قایمەکاری لە هەولێردا کردووە لە بەرامبەر ئەگەری هەر هێرشیکی پارتیدا، چونکە زۆر جار دەنگو باسی پەلاماردانی بلاوئەبووەوە یانووردە شەڕ لە سەنگەرەکانی ڕوو بە ڕوو بوونەوەدا بەرپا ئەبوو. ئەم هەواڵانە بوو بە ڕاستی، لە ڕۆژی ١٩٩٥/٣/٢٧ دا پارتی بە هێزێکی زۆرەوە پەلامارێکی کوتوپڕی هەولێریدا بە مەبەستی گرتنەوەیو دەرپەڕاندنی یەکێتی. بەلام لەم هەوڵەیاندا سەرکەوتوو نەبوون،وەکو جاری پێشوو لە کەسنەزانەوە پەلاماریان دا. بە جۆرێك شکان ٨٠ کەسیان لە مەیدانی شەڕدا لێبەجێماو بە دەیانیان بریندارو سەقەت بوون. پارتی هەر چەندە شکانو کشانەوەو هیچیان پێنەکرا بەلام لەم هێرشانەیاندا هەروا بە هەڕەمەکی نەهاتبوون بەڵکو بە پێی زانیاری تایبەتی کە لە ڕێگەی جیهازی بێتەلی پەرلەمانەوە پێیان ئەدرا ئەم هێرشەیان کرد. ئەو بێتەلە ڕۆژانەو بە بڕیاری سەرۆکی پەرلەمان برووسکەی زانیاری لە سەر هەلومەرجی ناو شاری هەولێرو دەورووبەری ئەدرایە دەزگا عەسکەرییەکانی پارتی، یانوەکو زانیاری لە سەر ئەحداسیاتی ناوچەکە بۆ تۆپبارانکردن. لەم ڕووەوە دەیان بەڵگەنامەیان گیراوە کە دەری ئەخەن سەرۆکی پەرلەمانو هەڤاڵەکانی لە بینایەی پەرلەماندا لە کاتی پەناگیریدا بۆ چی مابوونەوە. ئەم کارەیان تەنیا زیانی لە هێزەکانی یەکێتی نەئەدا بەڵکو زیانی ڕاستەوخۆی لە دانیشتوانی هەولێرو دەورووبەرەکەی زیاتر ئەدا. هەر ئەمەشوایکرد کە ئاسایشی گشتی هەرێم لە هەنگاوێکی یاساییدا دەست بەسەر ئەو بێتەلەدا بگرێ کە بە

شێوەیەکی ناڕاست بەکار هێنراوە نەك بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی پەرلەمان بەڵکو بۆ جاسوسی کردن بۆ لایەنێکی شەڕ کەر کە ئەبووایە سەرۆکی پەرلەمان وەکو ناو بژیوان ئەرکی خۆی بەجێ بهێنایە.

## ووردە شەڕ

مانگی ۱۹۹٥/٥ ووردە شەڕ هەبوو، بە تایبەتی کاتێ پارتی ئاگر بڕی هەڵوەشاندەوەو ئاگاداری حیزبە کورستانی یەکانی کردەوە. ئەمەش بەڵگەیەکی زیندووە بۆ گوێنەدانی پارتی بەویستی ئاشتیو داخوازییەکانی گەلەکەمان. لە مانگی ۱۹۹٥/٦ یشدا دیسانەوە بە ڕاجیمە درایەوە لە بنەسلاوەو دێی سێبەردانو زیانیان بە خەڵکەکە گەیاند. هەر لەم مانگەدا هێزێکی ڕژێم کە پێکهاتبوو لە ٥ تانكو ۳ زرێپۆشو ٥۰۰ سەرباز لە چەند فەوجێکی فەیلەقی پێنج پەلاماری دێی عوێنەو شێخ شەروانیان دا، پێشمەرگەکانی یەکێتی لە کانی قرژاڵە لێیان هاتنە دەستو لە ماوەی نیو سەعاتدا ڕاویاننانو ئۆتۆمبیلێکی جیپو دۆشکایەکی ۱۲/٥ ملمو جیهازێکی ڕوسی ۱۰٥ یان دەسکەوت بوو. هەروەها پارتی لەوەڵەسمتەوە پەلامارێکی دا بەڵام تێکشکاو لە قوڵی شەقڵاوەشەوە تەقە هەبوو، زیان گەیەنرایە زەویو زاری هاوڵاتیان لەو ناوەو لە گەروەتە. هەروەها لە دۆڵی بالیسانیش چەندین پارچە دەغڵو ڕەزی دێهاتەکانی توتمە، بالۆکاوە، زینەتیر سووتا.

## ناکۆکی لەگەڵ حیزبوڵڵادا

وەنەبێ پارتی تەنیا لەگەڵ یەکێتی یان حیزبەکانی تردا نەیار بێو ناکۆکیەکان بگاتە ئاستی تەقینەوەو شەڕی گەرم، بەڵکو لەگەڵ ئەوانەشدا کە لە بنەماڵەکەی خۆیەتی با لە حیزبێکی تریش بێ لەئاستێکی بەرزی ململانێدا بوو، ئەدهەم بارزانی کەسێکی نزیکی سەرۆکی پارتیە ئەگەر چی وەکو

حیزبایەتی پارتی نیە.. بەڵام بە زۆر هۆکار لەگەڵ پارتیو بنەماڵەدا پێکەوە نایانکرێ، هەمیشە لە ڕووی بەرژەوەندیەوە دژ بە یەکن، لە ئەنجامی ئەو ناجۆریەدا ڕۆژی ١٩٩٥/٦/١٤ مەفرەزەیەکی نێچیرڤان بارزانی بارەگای ئەدهەم بارزانی لە مەسیف دەرئەکەن. هەمان ڕۆژیش پارتیو حیزبوڵلا لە حاجی هۆمەران بەرامبەر یەك‌وەستاونو تەقەشیان لە یەکتری کردووە. بە پێی هەندێ زانیاری مەسعود بارزانیو ئەدهەم بارزانی بە جیهاز قسەیان کردووە، ئەدهەم بە مەسعودی‌ووتوە: تۆ ئەو پیاوە نیت لەبەر ئێمە نەبێت یەکێتی نیشتمانی ئاودیوی ئێرانی ئەکردیت. ئێمەش لە مەولا بە هیچ شێوەیەك هاوکاریت ناکەین. حیزبمان ڕێگا نادات چەکدارانی پارتی لە چۆمان سەرکەوێت بۆ حاجی هۆمەران.

## پەیکەری مادام میتران

ڕۆژی ١٩٩٥/٦/٢٨ لە هەڵەبجەی شەهیددا دەستی تاوانکارانەی پارتی گەیشتە پەیکەرەکەی مادام میتران کە لە ڕووی ڕێزەوە بۆ مرۆڤە ناسکەکەی فەرەنسا لە لایەن هونەرمەندانی کوردەوە درووستکرا. ئەو ژنەی ناوی دایکی کوردی لێنرا، کە لە هەندەرانێکی دوورەوە لە کاتی کۆڕەودا بە هانای کوردەوە هاتو لە خۆشەویستی کورددا سەردانی پەرلەمانی کرد. ئەبێ حیکمەتی پارتی چی بێ لە شەڕێکی ناو خۆییدا یەخەی پەیکەری ئەو ژنە مەزنە بگرێو بێتەقێنێتەوە..؟ تۆ بڵێی لە ژێرەوە مادام میتران ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی بوو بێ..؟ هەڵوێستی پارتی چی ئەبێ ڕۆژێك لە ڕۆژان لەگەڵ مادام میتراندا دانیشن چۆن پاساوی ئەو کارەیان ئەدەنەوە..؟.

# دیسانەوە سوپای تورک

جارێکی تر سوپای تورك لە مانگی ١٩٩٥/٧ خۆیان کردەوە بە کوردستاندا. کەس نەبوو پێی بڵێ بۆ چی هاتووی..؟ مادام کورد لە ناوخۆدا ناکۆکن‌و لە شەڕی دەستەو یەخەدان‌و یەکەکەش هۆکارێك بێت بۆ ئەو هاتنە ناوەوەیە، هەرگیز تورکیا دەست لەو جۆرە دەستێوەردانە نایاساییە هەڵناگرێت. نەبوونی دەسەڵاتی یاسایی بیانوویەك ئەداتە دەستەوە بۆ هەر جموجووڵێکی لەو بابەتەی تورکیا پەیڕەوی ئەکات. بە تایبەتی لە بارێکی‌وەکو ئەمەی کوردستانی تیادا ئەژی لە شەڕێکی خوێناوی نێوان یەکێتی‌و پارتی. هەر لەم ماوەیەدا لە هەوڵێکی بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی پارتیدا یەکێتی لە چەند قۆڵێکەوە پەلاماری سەنگەرەکانی پارتی دا بە جۆرێك شپرزەیی خستە ناو ڕیزەکانی پارتی یەوە، زیانی زۆریان لێکەوت، بە تایبەتی لە قۆڵەکانی: دۆڵی بالیسان‌و کەپکی حەمەد ئاغاو قۆڵی زیارەتەوە کە جۆرە هەڕەشەیەك بوو بۆ سەر سەری ڕەش. پارتی هەمیشە هەوڵی ئەدا لە بەرەی ڕەواندزەوە درزێك بخاتە ئەویوەو ڕەواندز داگیر بکات کە کاریگەری بۆ سەر جەبهەی دۆڵی شەهیدان‌و دۆڵی بالیسانیش هەبوو. سەرەڕای ئەو هەموو تۆپباران‌و پەلامارانەی کە هەندێکی خودی پیاوانی بنەماڵە سەرپەرشتیان ئەکرد هیچیان پێنەکرا، گوشارێکی زۆر کەوتبوە سەر ڕواندزو دەوروبەری.

شەڕەکان‌وای لێهاتبوو هەر جارەی لایەك لە شوێنێکەوە سەرکەوتنی‌وەدەست ئەهێناو لایەکەی تر ئەشکاو پاشەکشەی ئەکردو ناچار لە هەوڵێکی نوێی هێز کۆکردنەوەداو لە ساتەوەختێکی چاوەڕوان نەکراودا دەستی بەسەردا ئەگیرا.

## پەیوندییەکانی پارتی ـ بەغداد

کاتێ کە پارتی ئەیزانی خۆی ناتوانی لە شەڕگەدا گرەو بباتەوەو سەرەنجامی شەڕەکان بەلای خۆیدا بشکێنێتەوە، لاپەڕە کۆنەکانی پەیوەندییە ڕەشەکانی لەگەڵ دەوروبەردا بۆ یەکلاییکردنەوەی شەڕ لەگەڵ یەکێتیو چارە ڕەشی هێنان بۆ کورد هەڵئەدایەوە، لەم مانگەدا بوو هەندێ زانیاریمان چنگ کەوت کە نوێنەرانی پارتی فازیل مەتنیو د.ڕۆژ نوری شاوەیس لەگەڵ پیاوەکانی ڕژێمی بەعسی کورد کوژدا پێکەوە دانیشتوون نەك بۆ گفتوگۆ لەسەر داخوازیەکانی کورد بەڵکو هاریکاریکردنی یەکتری لەسەر لێدانی یەکێتیو هێزە تێکۆشەرەکانی تری مەیدانی کوردایەتی. لە ئەنجامی ئەم دانیشتنەدا بڕێکی باش چەكو تەقەمەنیان پێ بەخشراوەو لە ڕێگەی مەنشەئەی یەرموکەوە پێیان گەیشتووە.

ئەم هەنگاوەی پارتی کارێکی تازە نییە بەڵکو بەردەوامی پەیوەندییەکانی سەردەمی گفتوگۆی ساڵی١٩٩١، هەموو لایەنێکی دژ بە داگیرکەر لە دانوستاندا فێری بەرگریکردن لە مافەکانی گەلە چەوساوەکەی ئەبێت، کەچی پارتی فێری هاریکاری ئەبێت لەگەڵ ڕژێمدا بۆ تەفروتونا کردنی هێزە شۆڕشگێڕەکانی گەلەکەی خۆی. کەم لایەنی ناکۆك هەیە بۆ یەکلاییکردنەوەی ناکۆکیەکانی پەنا بباتە بەر هێزی بیانیو دەستکێشی دوژمن کە ناپاکیەکی کەموێنەیەو لێخۆشبوونی هەر نییە. هەموو ئەو پەلامارە تێکشکاوانەی پارتی بۆ سەر ڕەواندزوای لە مەسعود بارزانی کرد بوو ڕۆژی ١٩٩٥/٨/٣ کە خودی خۆی داوا لە فەرماندە عەسکەری یەکانی بکات کە ئەبێ ڕەواندز بگیرێتو گۆڕانێك لە تەرازووی ئەو جەبهەیەدا درووست بکرێتو زۆریش تەئکیدی لەوە کردۆتەوە. چوون ئەیزانی ئەم قۆڵە کلیلی سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ فراوانکردنی ڕووبەری ناوچەی دەست بە سەراگیراو لە لای ئەوانەوەو

تەسکبوونەوەی ڕووبەرێکی بەر پێی هێزەکانی یەکیتی و لەوێشەوە ئەتوانێ نەخشەی پەلامارەکانیان بۆ سەر ڕانیەوقلادزە دابڕێژن.

## هەڵهاتنی حسێن کامیل

هەر لەم مانگەدا بوو کە ڕووداوێکی سەیرو کوتوپڕ لە عێراق و ناو بنەماڵەی دیکتاتۆری بەغدا دا بەرپا بیٚ و هەموو خەڵکی و لایەنە ئاگادارەکان بهەژێنێ. ئەویش هەڵهاتنی حسین کامیلی وەزیری پێشەسازی و کانزاکان و بەڕێوەبەری دامەزراوەی پێشەسازی سەربازی و سەدام کامیلی برای و ژنەکانیان کە کچی سەدامی خوێنڕێژن لەگەڵ کوڕە مامێکیان بە ناوی عیزەدینەوەو گەیشتنیان بە ئەردەن و داواکردنی پەناهەندەیی لەووڵاتە دراوسێیەی عێراق. سەدام مەرسومی کۆماری لە بارەی دەرکردنی حسین کامیلەوە لە هەموو پلە کارگێری و حیزبی یەکان دەرکرد. وەنەبێ سەدام حسین وەکو دیکتاتۆرێکی بێبەزەیی نەك هەر بەر بووەتەویزەی خەڵکی عێراق و کوردستان بەڵکو پەلاماری ووڵاتانی دەرو دراوسێشی داوەو هەڕەشە لە ئاشتی جیهانی ئەکا، بەڵکو لە ناو خودی خێزانەکەی خۆشیدا بشێوی و قۆرتی زل سەری هەڵداوەو کونی کردۆتە جگەری. بە جۆریك کە هەردوو زاواکەی و هەردوو کچەکەی لە دژی سیاسەتەکانی ناو خێزانەکەی هەڵبێن کە لە ڕاستیدا ئەم کارە ڕەنگدانەوەی دۆخە سیاسیە گشتی یەکەشی تێدا دەرئەکەوێت نەك هەر ناکۆکی ڕووتی ناو خێزان بێت. ئەمەش ئەو ڕاستییەمان بۆ دەر ئەخات کە دیکتاتۆر چەند بە زەبرو زەنگ بێت بەرامبەر بە خەڵکی، لە ئاژاوەی ناو خۆیی ناو ماڵەکەی خۆی دەرباز نابێت. ئەم ڕووداوە کارێکی زۆری کردە سەر دڵ و دەروونی سەدام و کوڕە جەللادەکانی و ئەندا مانی بنەماڵەکەی. بۆیە بە پەلەویستی ئەم درزە لە گیانی خێزان و ماڵەکەیدا پینە بکات لە ڕێگەی پیلانەوە بۆ گێڕانەوەیان بە هەر فرت و فێلێك هەیە.

زۆر سەیرە کەسێك لە چەقۆی تیژی ئەم دیکتاتۆرە دەرباز بوو بێو خۆیشی چەقۆ کێشێکی درندەی ئەو جەللادە بووبێ چۆن دڵنیا ئەبێ بچێتەوە بەر دەستی کە ئەزانێ کونی بەزەیی لە دڵیدا نییەو تۆڵەی خۆی ئەکاتەوە. حسین کامیلو سەدامی برای لە ئەردەنەوە بە پێی خۆیان دوای قایل بوونو گوشاری ژنەکانیان گەڕانەوە بەغداد تا لە دوورەووڵاتدا نەمرن بەڵکو بە دەستی سەدام حسین لە تەناف بدرێن، سەدام حسین لە ئەنجامی ناکۆکی ناوخۆیی حیزبو خێزاندا بە هەزارانی لە ڕووباری خوێنی سووردا هەڵکێشاو بە دیار شەپۆلانی خوێنیانەوە زەماوەندی ئەگێڕا. دەستی چووە خوێنی زاواکانی کە نزیکترین کەسانێك بوون لە گاردە پارێزەرەکانی خۆیو لە بەر خاتری کچەکانی چاو پۆشی لێ نەکردن. تەنیا عیزەدین بڕوای بە سەدام نەبوو نەگەڕایەوە.

# ناوبژیوانی

لەم لاشەوە لە کوردستاندا شەڕ خەڵکیوەڕس کردبوو. تەنانەت دۆستەکانی دەرەوەشمانی بێزار کردبوو، هیچ ناوبژیوانییەکیش سوودی نەبوو هەر ماوەیەکی کەم ئاگر بڕ ئەبوو دواتر زرمەی تفەنگەکان گوێی خەڵکی ئەزرنگانەوەو خەویان لە چاوان ئەتاراند.

هەر لەم پێودانگەوە ئەمریکیەکان هاتنە سەر خەتو هەوڵێکی ناوبژیوانیان داو هەردوو لای شەڕکەریان لە ڕۆژانی ١١-٩/٨/١٩٩٥ لە شاری درۆگیدا لە سەر مێزی گفتوگۆ کۆکردەوە بە ئامادەبوونی نوێنەرانی تورکیاو INC. دوای بگرەو بەردەیەکی زۆرو تاوتوێکردنی شتەکانو هەڵسەنگاندنی گیروگرفتەکانو جیاوازی لێکدانەوە هەردوولا پەیمانیان دا شەڕ ڕاگرن، هەوڵیش بدەن ئەم هەنگاوی شەڕ ڕاگرتنە یەکجارەکی بێت. بۆ جێبەجێکردنی ئەمەش ئەبێ هێرشی ڕاگەیاندن بوەستێنریو هەردوولا بەردەوام بن لە کۆبوونەوەی هاوبەشو گەیشتن بە ڕێککەوتنو ئاشتی. ئەم ڕێککەوتنی ئاشتییەش ئەم خاڵانەی گرتەوە:

١. داماڵینی چەك لە هەولێر.

٢. لیژنەیەکی بێلایەن بە سەرپەرشتی INC پێکبهێنریت.

٣. هێزەکانی دەوروو بەری هەولێر کەم بکرێتەوەو ببرێتە شوێنی تر.

٤. لە ماوەی ٤٨ کاتژمێر لە داماڵینی چەك لە هەولێرو گومرکەکان بدرێتەوە بە حکومەتی هەرێم.

٥. جەردووردبینی هەموو گومرکەکان بکرێت لە ڕۆژی ١/٥/١٩٩٤ەوە.

٦. لە دوای ٤٨ کاتژمێر لە داماڵینی چەك لە هەولێر حکومەتی هەرێم دەست بە کاری خۆی بکاتەوە.

٧. پەرلەمان کاری خۆی ئەکات بە خێراییو حکومەتی تازە پێك ئەهێنی.

لەم گفتو گۆیەدا پارتی هەوڵی ئەدا کە یەکێتی پەکەکە تاوانبار بکات کە تیرۆریستە. چونکە لەگەڵ خۆیدا لە شەڕدابوو، ئەیویست یەکێتیش ڕاکێشێتە ناو هاوکێشەکەوە، بەلام یەکێتی دژی ئەوە ڕاوەستا. هەرچەندە یەکێتی پەکەکەشی باش ئەناسی بەلام سیاسەت لەو کاتانەدا ئەوەی ئەویست.

ئەم ڕێککەوتنەش بە دەردی ئەوانەی پێشووتری لێهات، پارتی ناوەڕۆکەکەی بە دڵ نەبوو. بۆیە لە کاتی ئاگر بڕدا دیسانەوە پەلاماری هەندێ شوێنیان دا:

- **ڕۆژی ٨/١١ پەلاماری ناوچەی شارەزووریان داو تێکشکان.**
- **ڕۆژی ٨/١٣ تۆپبارانی ڕەواندزیان کرد.**
- **ڕۆژی ٨/١٦ تۆپبارانی سێ بەردانیان کرد.**
- **ڕۆژی ٨/١٨ پەلاماری وەرتێیان داو سەرکەوتوو نەبوون.**

# گرفتی ئۆپۆزیسیۆنی ئێران

هەر لەم مانگەدا ڕۆژی ١٩٩٥/٨/٢٣ سەد پێشمەرگەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە سەرۆکایەتی حسین نازدار ئاودیوی ناو ئێران بوونەوە، لەوێش چالاکی پێشمەرگانەیان کردبوو. حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە سنووری یەکێتیدا لە هەندێ شوێن بارەگایان هەبوو، کاتی خۆی لەلایەن حکومەتی عێراقییەوە ڕێگەیان پێدرا بوو بۆ چالاکی ئەنجامدان دژی ئێران لە نزیکی سنوورەکانەوە هەبن. بەڵام دوای ڕاپەڕین و درووستبوونی حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئێرانییەکان بیانوویان لە بوونی هێزە ئۆپۆزسیۆنییە ئێرانییەکان ئەگرت و بەو بۆنەیەوە کێشەیان درووست ئەکردو تۆپبارانی ناوچەکانی ناوەوەی هەرێمیان ئەکردوو زیانیان بە خەڵکی ئەگەیاندو دەروونی دانیشتوانی ڕائەچەڵەکاند، چونکە هیچ دەسەڵاتێک نەبوو ڕێگری لەو ڕەفتارەی ئێرانیەکان بکات جگە لەوەی کە لە گەڵیانا ڕێکبکەوین لە سەر هەندێ مەرج. بەتایبەتی سنوور دانان بۆ هاتوچۆی ئەو هێزانەی ئۆپۆزسیۆن بۆ ناو ئێران کە زۆربەی بارەگاکانیان و زۆربەی هاتووچۆشیان لە سنووری یەکێتیدا بوو. لای پارتی کەمتر ئەو کێشانە سەری هەڵئەدا. بۆیە یەکێتی لە گەڵ ئەو لایەنانەدا پێکهاتبوو لە سەر ئەوەی هەر هیچ نەبێ لەم قۆناغەدا دان بەخۆیاندا بگرن و چاودێری هەلومەرجی هەرێمی کوردستان بکەن و ئالۆزی نەخولقێنن. لە دابی نێودەوڵەتیشدا هەر هێزێکی میوان ئەبێ ئیلتیزام بە بڕیارو سیاسەتی ووڵاتی میوان دارەوە بکات و لێی لانەدات. بەڵام بەداخەوە برایانی دیموکرات لێرە گوێیان بەو ڕێککەوتنە نەئەداو ڕەچاوی دۆخی ئێرەشیان نەئەکرد، ئەمەش لە دوو سەرەوە زیانی بۆ ئێمە بەجێ ئەهێشت:

- له سەرێکەوە گرفتی لە گەڵ ئێراندا بۆ ئەسازاندین.
- له سەرێکی ترەوە ئەو کارەی ئەوان بێڕێزییەکی نیشان ئەدا بەرامبەر بە دەسەڵاتی حکومەتی هەرێم کە لە ڕاستیشدا کاردانەوەیەکی نێگەتیڤی هەبوو لەسەر کارو بەرنامەکانمانو جۆرە بێ متمانەیەکی ئەنواند لە سەر هەستو هەڵوێستی خەڵکی.

## شەڕی پارتی ـ پەکەکە

پارتی ئەم جۆرە کارانەی پێخۆش بوو، چونکە سەر ئێشەی بۆ یەکێتی درووست ئەکردو پەیوەندییەکانی بە ئێرانەوە ئەخستە بارێکی لەقەوە. بەڵام ئاگای لەوە نەبوو بۆ خۆیشی تووشی ملۆزمێکی پڕ کێشەتر ئەبێتەوەو خوردو خەوی لێ حەرام ئەکات. دیارە پەکەکەوەکو هێزێك دەمێك بوو بەرنامەی کارکردنیان گواستبووەوە باشووری کوردستان، نەك وەکو هێزێکی میوان بیانەوێ سوود لە هەلومەرجی ئێرەو شوێن دابین کردن بۆ خۆیانوەربگرن، بەڵکووەکو ئەلتەرناتیڤێك خۆی دائەناو هەموو هێزەکانی کوردستانی باشووری بە کۆنە پەرستو بەکرێگیراو ئەژمارد. هەتا ئەهات لە ناو خەڵکیدا پێگەیان دائەکوتا، بەڵام بە پێوادانگێکی دوور لە گیانی سەردەم، دوور لە داخوازییەکانی گەلەکەمان هەر بە دروشمی زەقو بریقەداری سەردەمی ستالین گەنجانی ئەمووڵاتەو بەشەکانی تری کوردستانیان هەڵئەخەڵەتاند بە کچو کوڕەوە، ئامادەیان ئەکردن بۆ مردنی بێهودە کە ئەبوایە لە بنەڕەتدا بۆ ڕزگاری کوردستان بێت. بۆیە هەتا ئەهات ناکۆکییەکان توندتر ئەبوونەوە، بە تایبەت لە ناوچەی بادینانەدا بوو بوونە ملۆزمی پارتیوئەیانویست لە بنەوە هەڵیتەکێنن، جار جارەش دژی یەکێتی ئەدوان.

هێشتا پارتی هەر لە شەڕدا بوو لەگەڵ یەکێتیدا. لە ناکاو لە ڕۆژی ١٩٩٥/٨/٢٧ شەڕ لە نێوان پارتیو پەکەکە هەڵگیرسا. پەکەکە لە پەلامارێکدا گەلی زاخۆیان گرت. شەڕەکە بە جۆرێك بوو سەرانسەری بادینانی تەنییەوە،

ڕۆژی ٨/٢٩و دواتریش هەموو ڕێگاکانی سەرسەنگ ـ دهۆك، ئەتروش ـ دهۆك، بەرواری بالآ ـ زاخۆ، ئامێدی ـ دهۆك کۆنترۆلکرابوو.

ئەم شەڕە سەرانی پارتی هەژاند، ناچاربوون بیر لە دەربازبوون بکەنەوە لەو تەنگژەیەی تێی کەوتوون. چونکە هەرخۆیان بەتەنیا نەیانئەتوانی ڕووبەڕووی یەکەکە ببنەوە، سەرەڕای بالآدەستیان لە ناوچەکەدا کە یەکێتی لێنەمابوو، گوشاریان بۆ سەر لایەنەکانی تریش هەبوو. یەکەکە توانیبووی پێگەی جەماوەری بۆ خۆی قایم بکاتو لە دەستکردنەوەداوورەی هێزەکانی پارتی ببات.

بۆیە ڕۆژی ١٩٩٥/٨/٣٠ نێچیرڤان بارزانی بە پەلە گەیشتە سلۆپیو لە لایەن گەورە بەرپرسانی سەربازی تورکەوە پێشوازی لێکرا. دیارە تەنیا مەبەست لەم دیدارو پێشوازییە مەسەلەی یەکەکە بوو، کە هەردوولاوەکو یەك گیرۆدەی یەك دەردنو پێویستیان بەوە هەیە لە ڕووی داکۆکی لە خۆکردنەوە هاوکاری یەکتر بکەن. پارتی کە خۆی نەیتوانیوە یەکەکە قایل بکات ڕەفتارەکانی بگۆڕێ هەوڵی نەداوە یان بۆی نەکراوە خەڵکیوا لێ بکات باوەش بۆ یەکەکە نەکەنەوە، ئەچێ داوای هێزی سەربازی تورك ئەکات بۆ دەرپەڕاندنی یەکەکە لە سنوورەکەیان. خۆ چەندین جاری تر سوپای تورك هاتوونەتە کوردستانەوەو لە یەکەکەیان داوە، کەچی یەکەکە گەرچی زیانیان لێکەوتووە بەڵام کۆتاییان نەهاتووە. ئەبێ ئێستا بە هاتنی سوپای تورك چی شتێ بگۆڕێ مەگەر تەنیا هاوپشتییەك بۆ خۆیان پەیدا بکەنو هیچی تر.

تورکیاش بە پەلە بەدەم داواکارییەکەی پارتییەوە هاتنو لە هەوڵێکی دۆستانەدا فڕۆکەجەنگییەکانیان نارده سەر هەرێمی کوردستانو بە خەستی بۆردومانی:

- دەوروبەری زاخۆ
- دەرکار عەجەم
- بامەڕنی

- سەرسەنگیان کرد.

بەڵام هێشتا بەرەسمی سوپاکەیان نەناردبووە کوردستانەوە. لە مانگی ١٩٩٥/٩ یشدا شەڕ گرمەو کەفو کوڵی دانەمرکاوەتەوە بەڵکو مەسعود بارزانی خۆی ڕاستەو خۆ سەرپەرشتی شەڕەکانی ئەکرد کە لەناوچەی بارزان‌و ڕێکانیان بەردەوام بوو، هەروەها شەڕ لە دەڤەری زاخۆو باتوفەو جادەی گشتی دهۆك - زاخۆ هەبوو. جگە لەمە فڕۆکەکانی تورکیا ڕۆژی ٩/٨ بۆردومانی چیاکانی مەتین، گارە، بارزان‌و ڕێکانیان ئەکرد.

هەر لەم کاتانەدا بوو هەر سێ دەوڵەتی ئیقلیمی داگیرکەری کوردستان تورکیا-ئێران- سوریاوەکو هەموو جارەکانی تر کۆبوونەوە. دیارە بۆ پیلانگێڕان بوو دژی هەرێمی کوردستان. بۆیە ترسێکی زۆر لە خەڵکی هەرێم بەگشتی‌و خەڵکی بادینان بە تایبەتی نیشتبوو کە دوای کۆبوونەوەی هەر سێ دەوڵەتەکە سوپای تورك بێتە ناو کوردستانەوەو تەڕوووشك پێکەوە بسووتێنێ.

ڕۆژی ١٠/ ٩ مەسعود بارزانی چووە دهۆك بۆ بەسەرکردنەوەی بارو دۆخەکەو شەڕەکەش هەتا ئەهات لە ناوچەکانی مەتین، گارا، باتوفەو دەروبەری زاخۆ گەرم تر ئەبوو.

لە هێرشێکی پارتیدا دژی پەکەکە پاش کوژرانێکی زۆر لە پارتی لە گەڵی زاخۆ، دەرکار عەجەم، ئەوشوێنانە لە لایەن پارتییەوە گیرایەوە. جگە لەوە ڕۆژانە کۆپتەرەکانی تورکیا بە سەر هێزەکانی پەکەکەدا ئەسووڕانەوە بە لام بوردومانیان نەئەکرد.

ڕۆژی ٩/١٤ چەکدارەکانی پارتی‌و حیزبوڵلا کە پێشتر ناکۆك‌و دژی یەك بوون، یەکیان گرتەوەو دژی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کەوتنە شەڕەوە. دیارە ناکۆکی پارتی‌و حیزبی دیموکرات تازە نییەو دەمێکە دانوویان بە یەکەوە ناکوڵێ‌و سەنگەریان لە یەك گرتووەو لە ڕاگەیاندندا شەڕیان پەرپاکردووە.

کە گفتوگۆ لە دبلن کرا یەکێك لە خاڵە گرنگەکانی گفتوگۆ کردن گەڕانەوەی گومرگەکان بوو بۆ دەسەڵاتی حکومەتی هەرێم، بەڵام پارتی ڕۆژی

٩/١٥ ڕایگەیاند کە ئامادە نییە داهاتی گومرگی برایم خەلیل بگەڕێنێتەوە، بۆیە دانیشتنەکەی دبلنیش چارەسەری دەردی شەڕی نەکردو ئەمیش لە گۆرستانی ڕێکنەکەوتنەکانی تردا نێژرا. هەروەها یەکێتی دژی ئەو خاڵە بوو کە پەکەکە تیرۆریستەو بووەتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ لەگەڵ پارتیدا، شەڕەکانی پارتی ـ پەکەکە لە ناوچەی سیدەکان بەردەوام بوو، هەروەها لە ئەترووش‌و چیاکانی دەوروبەری بەتوندی هەبوو بریندارێکی زۆری پارتی بۆ دهۆك ئەهێنرایەوە. بەڵکو شەڕ کەوتبووە ناو شارۆچکەی زاخۆوەو دیسانەوە لە چیاکانی گارە، چیا سپی‌و کانی ماسی‌و خاپوور، چیای بێخێرو پشتی چۆمان بەگەرمی بەردەوامەو زیانی پارتی زۆرە بە جۆرێك ٢٥ تەرمی کوژراوی پارتی گەیشتبووەوە دهۆك کە ٥ کەسیان هی یەك ماڵ بوو. هەروەها تەرمی ١٠ بارزانی برایەوە دیانا. دۆخەکە کارەساتبارە بە شێوەیەك لە زۆر دێی ناوچەکانی بادیناندا پرسە هەبووەو لافیتەی شەڕ هەڵواسراوە خەم‌و ماتەمی ڕەنگ‌و ڕووخساری خەڵکی داپۆشیوە. هێزەکانی پارتی زیانی زۆریان لێکەوتووە،وورەیان نەماوە، ترس دڵ‌و دەروونیان ئەخوات، لە بەرامبەردا زیانی پەکەکە کەمتر دیاربوو، ئەگەر هەشبوایە ئەوان بایەخیان پێنەئەدا،واپەروەردە کرابوون گرنگی بە کوژراوەکانیان نەدەن. لە بەرامبەر ئەو هەموو کوشتارەی لە پارتی ئەکرێ. پەکەکە چوار کەسیان لێبەدیلکرا لە ناوچەی دهۆك‌و دەستبەجێ گوللە باران کرابوون.

بە درێژایی مانگەکانی ١٠و ١١ / ١٩٩٥ لە هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پارتی شەڕ لەگەڵ پەکەکەدا بە گەرمی بەردەوام بوو، شوێن نەبوو زرمەی تیا نەبێ، چەکداری هەردوو لای لێنەکوژرێ. لە زۆر شوێن‌و چیای سەختی‌وەك گارە یان چیای سپی یان شاخی گێرە پەکەکە زاڵبوون‌و دەستیان بە سەردا گرتبوو. زۆر جار پارتی هێزەکانی کۆئەکردەوەو ڕەوانەی بەرەکانی شەڕی ئەکردن کەچی زۆریان بە فڕوفێڵ خۆیان ئەدزییەوە ئەمەش نیشانەی

بێزاریو نەویستنی ئەو باری شەڕخوازییەیە کە پارتی بەرهەمی هێنا بوو هیچ ڕێگایەکی تری نەئەگرتە بەر.

## ناوبژیوانی ئێران

هەر لەمانگی ١٠ /١٩٩٥ کۆماری ئیسلامی ئێران دۆستی هەردوولای شەڕ کەری کورد لە هەوڵێکی ناوبژیوانیدا هەردوو لای بانگهێشتی تاران کردو ڕووبەڕوو پێکەوە دانیشتنو گرفتەکانیان باسکردو هەردوولا هەڵوێستی کۆماری ئیسلامی ئێرانیان بە باشی نرخاند. کە هەمیشە هەوڵیداوە ناکۆکی نێوان هەردوولا چارەسەربکرێو شەڕ نەمێنێ. خشتەی کارەکانی ئەم گفتو گۆیە لە سەر ئەم تەوەرانە ئەسووڕایەوە:

- هەولێر بکرێتە ناوچەیەکی چەك داماڵراو.
- گومرگەکان بدریتەوە دەستی حکومەتی هەرێم.
- پەرلەمانی کوردستان بکەوێتەوەگەڕ لە سەر بنەمایەکی فراوانتر کە حیزبەکانی ترو نوێنەری نەتەوەکانی تری ناو هەرێم بگرێتە خۆی.
- ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی هەموو ناوچەکانی کوردستان.
- هەڵبژاردن.
- پێکهێنانی دەستەیەکی بێ لایەن بۆ چاودێریو بە دوادا چوونی ڕێککەوتنەکە.

گوایە ئەم دانیشتنو گفتوگۆیانە پێشکەوتنی بە خۆیەوە بینیوە. بەلاّم هەندێ برگە لەم جەولەیەی گفتوگۆدا دوا خرا بە هۆی نەگەیشتنە ڕێگە چارەی تەواو، هەردوولاش بەڵێنیاندا کە بگەڕێنەوە لای سەرکردایەتیانو گفتو گۆی زۆرتر ئەنجام بدەن بە چاودێری ئێران. دیارە هەردوولا بەڵێنیان دابووە

ئێــران کــە یــەکێتی خــاکی عێــراق بپــارێزن‌و ئاسایشــی ســنووری دەوڵەتــە دراوسێکانی تورکیا ـ سوریا ـ ئێران بپارێزن.

ئــەوەی ڕەچــاو ئــەکرێ هــەر لایــەك ناوبــژیوانی ئــەکات لــە دەوڵەتــە ئیقلیمییەکان لە نێوان یەکێتی‌و پارتیدا جگە لەوە بە لاوەکی خۆیان لە قەرەی گرفتەکانی هەردوولا ئەدەن، بگرە پێشیان خۆشە ئەم دوو لایەنە لە شــەڕو پێکــادان‌و دەردی ســەریدا بــن، چــەندین ئەوەنــدە مەبەســتیان بەرژەوەندییەکانی خۆیانە کە ئەبێ لە بەرچاو بگیرێ، ئەوان نایانەوێ کورد چارەنووسی خۆی بە دەستبهێنێ‌و ئەبێ هەر لە زیندانی عێراقدا بمێنێتەوە، لە بەر ئەوەی کورد لەووڵاتانەدا هەن‌و سەر ئێشەن بۆ ئەوان، ئەبێت ئێمەش باجی ئەوە بدەین کە ئاسایشی سنوورەکانیان بپارێزین‌و هەمیشە لە ژێربـاری هەڕەشە قورسەکانیاندا بناڵێنین.

وەنــەبێ ئــەم ناوبژیوانیــەی ئێــران بــەختی لــە هــی ناوبژیوانیــەکانی تــر باشــتر بــووبێ‌و چارەســەری ســیحری بــووبێ بــۆ دەردێکــی کوشــندە کــە دەمێکــە پێیەوە ئەناڵێنین. بەڵکو ئەمیش چووە خانەی فەرامۆشیەوەو دیسانەوە پارتی بوونــە هۆکــاری ئەفــەروزکردنی ئــەم ناوبژیوانیــەش کــە گــەر ناوەرۆکەکــەی جێبەجێ ببوایە لەوانەیە زووتر لە خەم‌و ئازارەکانی شەڕ ڕزگار ببوینایە.

## زاڵگەی کۆیە

پێمان نایە مانگی ۱۹۹۵/۱۲ ئەوکاتە من فەرماندەی لەشکری کۆیە بووم، لەو کاتانەدا هەندێك زانیاریمان پێگەیشت کە بزووتنــەوەی ئیسلامی لــە ڕێگای هاتووچۆکردنیان لە مەسیفەوە بۆ سلێمانی‌و هەڵەبجەی شەهید خەڵکی پارتی بــە ئۆتۆمبیلــەکانیان ئەگوێزنــەوەو هــات‌و چــۆیان پێئەکــەن، چــونکە بەشــێکی هێزو ڕێکخستنەکانی پارتی لە هەڵەبجەی شەهید دا بوون. پەیوەنــدیان ڕۆژانــە بــە جیهــازەوە ئــەکرد، بــۆ کــاری پێویســتیش لــە ڕێگــەی ئێرانــەوە، ئــیتر هــەنێ

جاریش به هۆی بزووتنەوە ئەهاتن‌و ئەچوون، بۆ ڕێگری لەم کارە، برادەران هێزێکی جەماله سووریان نارده زالگەی کۆیه بۆ پشکنین‌و دەستگیرکردنی ئەو جۆرە خەڵکانە، ئیتر ڕۆژێك کە لە کۆیه بووم لە ژوورەکەمدا خەوتبووم زەنگی تەلەفون لێدرا، هەڵم گرت مام سیامەندی فەرماندەی هێزی لەشکری کۆیه بووووتی: کاك مەحمود لە زالگەی کۆیه تەقەیە. خۆم کۆکردەوە یەکسەر ئەوەم بە خەیاڵدا هات کە لەوانەیە جەماله سوورو بزووتنەوە بەیەکدا تەقیبنەوەو شەڕ بەرپابووبێت. کە هاتمە دەرەوە بینیم جەماله سوور هەندێ بریندار پییە، لێم پرسی: ئەوە چییە..؟ جەمال‌ووتی: پێشمەرگەکانمان لەگەڵ جەماعەتەکەی حەمەی حەلاقدا بەیەکدا تەقیونەتەوە هەندێ پێشمەرگەمان بریندار بوون‌و لەوانیش هەندێك کوژراوە. ئیتر لەوە زیاتر نەوەستاو بریندارەکانی بردوو لێیدا ڕۆیشت. منیش لەگەڵ دەستەکەی خۆمدا چوومە زالگەکەوکۆنترۆڵی ئەو ناوەمان کرد، تەماشام کرد حەمە حەلاق لە ناو کوژراوەکاندایە، حەمەی حەلاق ئەندامی سەرکردایەتی پارتی کاری سەربەخۆیی کوردستان بوو، لە ڕاستیدا یەکێك لە پیاوە خراپەکانی ناو ڕیزەکانی حیزبی شیوعی عێراق بوو، پێش ئەوەی لە حیزبی شیوعی جیا بێتەوەو ببێتە پارتی کار، لە شەڕەکانی نێوان حیزبی شیوعی‌و یەکێتی دا چەندین پێشمەرگەی یەکێتی شەهید کردبووو هەندێکیانی بە زیندوویی چاودەرهێنابوو. بۆیە کەسێکی زۆر خۆشەویست نەبوو لای خەڵکی سەر بە یەکێتی. بەڵام لە مەسەلەی ئەو پێکادانەی زالگەی کۆیەو کوشتنی حەمەی حەلاق من ئاگادارنەبووم‌و نیم‌و لە دوورو نزیکەوە پەیوەندیم پێوە نییە. تەرمەکان برابوونە سلێمانی‌و دواتر ڕەوانەی لای کەس‌و کاریان کرابوونەوە.

هەڤاڵ مام جەلال لەم ڕووداوە زۆر نیگەران بوو،وای بۆ چووبوو کە من ئەو کارەم کردووەو پرسم بە کەس نەکردووە هەرچەندە جەماله سووریش بە دەست ئەنقەس‌و لە خۆیەوە ئەم کارەی ئەنجام نەدابوو بەڵکو ئەو زانیارییەی

گەیشتبووە برادەران هەڵەی ئەو جەماعەتەی حەمەی حەلاقەوای کرد بوو ئەو ڕووداوە بەرپابێ.

## لادان لە پەیڕەو

ڕۆژی ١٢/٢٣ سەردانێکی هەولێرم کردو چوومە مەکتەبی ڕێکخستن، لەوێ هەڤاڵان مستەفا سەید قادرو عەدنانی حەمەی میناو عوسمان حاجی مەحمودو مامۆستا جلال جەوهەرم بینی، باسی ئەوەیان کرد گوایە هەندێ ئەندامی سەرکردایەتی دانراوە بە بێ ئەوەی پەیڕەوی ناوخۆ ڕەچاو بکرێ یان لە پلینیۆم یان لە کۆبوونەوەی فراواندا بڕیاری لەسەر بدرێ کە ئەمە بە لادان لەناوەرۆکی پەیڕەوی ناوخۆ ئەژمێردرێت، بۆیە ئەیانەوێ هەڵوێستوەربگرن. منیش پێموەوتن: ئەگەر مەسەلەکەوابێو لە پەیڕەو لادان بێ منیش لە گەڵتاندام.

ئیتر نووسراوێکمان ئاراستەی هەڤاڵ مام جەلال کردو چاوەڕێیوەڵام بووین. ئەوەی ڕاستی بێ دوایی بۆم دەرکەوت کە مەبەستی برادەران هەر لادان نەبوو لە پەیڕەو بەڵکو لە پشتی ئەوەوە هەست کردن بە ستەم لێکردن بەرامبەر کەرکوکیو گەرمیانیەکان لە ئاستی سەرکردایەتیداوای لێکردن ئەو ڕاپۆرتە بەرز بکەنەوە، جگە لە ئەم ڕاپۆرتە بۆنی کۆمەڵبەستنێکی لێوە ئەهاتوەکو گوشارێك گەر حسابیان بۆ نەکرێ ئەنجامەکەی باش نابێت. هەرچەندە لە ڕووی هەستی برادەرییەوە من پشتیوانیم لێکردن بەڵام مەبەستم نەبوو خۆم ببمە ئەندامی سەرکردایەتی جگە لە من کاك عەدنانیش هەمان هەڵوێستی هەبوو. ئێوارەی ئەو ڕۆژە هەڤاڵ مام جەلال داوای منو عەدنانو عوسمانو مستەفای سەید قادری کرد، پێیووتین: ئەگەر هەڵوێستوەرئەگرن بە دەستی خۆتان بۆم بنووسن.

هەستم کرد هەڤاڵ مام جەلال کەم لووتفەو ساردی ئەنوێنێ بەرامبەرمان، بێئاگا بووم لەوەی هەڤاڵ مام جەلال لە سەر مەسەلەکەی حەمەی حەلاق لێم نیگەرانە گەرچی پەیوەندی بە منیشەوە نەبوو، لەوەش بێئاگابووم کە برادەران تەنیا مەبەستیان بوونە ئەندامی سەرکردایەتی خۆیانەو هیچیتر.

## ئیجازە

بۆ بەیانیەکەی لە هەولێر گەڕامەوە کۆیە، کاك هاشم عەلی فەرماندەی هێزەکەی هەڤاڵ مام جەلال پەیدا بوو، نامەیەکی هەڤاڵ مام جەلالی دایە دەستم کە ئەمە ناوەرۆکەکەیەتی:

### هەڤاڵ کاك مەحمود سەنگاوی بەڕێز

سلاوێکی گەرم

شادیو خۆشیتانم داوایە.وا هەڤاڵ هاشم ئەنێرم بۆ سەردانی کەسو کاری کوژراوەکانی کۆیەو سارێژکردنی ـ ئەوەندەی ئەکرێ ـ برینەکانی دڵیان. بۆیەواباشە بۆ ماوەیەك تۆیش ئیجازە بێتو لە کۆیە نەمێنیت.

هیوادارم بە مووەقەت دەورو تەسلیم لەگەڵ کاك تەحسین کاوانی بکەیت کە دامناوە بە جێگری یەکەمی فەرماندەیی لەشکرەکەتان.

هەر شادو سەرکەوتووبن

برای دڵسۆزتان

مام جەلال

هەولێر / بەیانی

١٩٩٥/١٢/٢٢

منیش یەکسەر بڕیارەکەم جێبەجێکردو لەگەڵ هەڤاڵ تحسین کاوانی دەورو تەسلیمم کردوو کۆیەم بەجێ هێشتو هاتمەوە بۆ ماڵ.

بەڵام پاش چەند ڕۆژێك هەڤاڵ مام جەلال بۆی دەرکەوتبوو کە من بێ ئاگام لەو ڕووداوەی کوشتنی حەمەی حەلاقو بڕیاری دا سەرپەرشتی لەشکری شارەزوور بکەم.

## ئاگر بڕی نێوان پارتی ـ پەکەکە

لە دوا دوایی ساڵی ١٩٩٥ دا شەڕی نێوان پارتیو پەکەکە بە بێ هیچ مەرجێك وەستا. کەسیش نەیزانی ئەم شەڕوەستانە بۆچی ئەگەڕێتەوە. ئیتر سروشتی ئۆجەلان وابوو خۆی چۆنی بیر بکردایەوە ئاوا ئەکرا، قسەی هیچ کەس نەئەچووە گیرفانییەوە.هەمووووتەیەکی خۆشی فەرمایشتێکی پیرۆز بوو لای خۆیشیو پەیڕەو کەرانیشی. ئۆجەلان زیاتر پیاوێکی ئەندێشە باز بوو تا کەسێکی واقیعی.

## ساڵی ١٩٩٦

لە ناو بارێکی نائاسایی نەشەڕ نەئاشتیدا، چووینە ناو کەژاوەی ساڵێکی نوێوە. خەلکی دنیا بۆ هەموو ساڵێکی نوێ نەخشەی تازە ئەکێشنو بەرنامەی تێرو تەسەل بۆ ژیانیان دائەڕێژن، هەمیشە بیر لە پێشکەوتنی شارستانیو خۆشگوزەرانی ئابووریو کۆمەڵایەتی ئەکەنەوە، کەچی ئێمە لە ناو تەپو تۆزی شەڕو زرموهوڕی چەكو دڵە کوتێی مەرگدا ساتەکانمان بە سەر ئەبەین، جگە لە مردن مانایەك بۆ ژیان نییە، تامی هیچ خۆشیەك نازانین.وەنەبێ شەڕ بە یەك جاری تەواو بووبێ، بەڵام هەندێ کپیو بێدەنگی هەبوو، جار جارەش کونە بەبووی شەڕ نەیقیڕاندو کپیەکەی لێئەشێواندین.

هیچ جۆرە ڕێککەوتن‌و پێکهاتنێك لەگەڵ پارتیدا قاڵبی نەگرت، ئەوان لە کەلی بەرزی خەیاڵەکانیان نەئەهاتنە خوارەوە، ئەوەی داوایان ئەکرد هی ڕێککەوتن نەبوو، ئەوان ئەیانویست یان بەهێز دەستیان بکەوێتەوە یان یەکێتی بە هێواشی دەست لە هەموو دەستکەوتەکانی هەڵبگرێ‌و ئەوان لە سەر دوندی دەسەڵات دابنیشن. چونکە لە باو باپیرانیانەوە ئەم سەرکردایەتی کردنەی کوردیان بۆ خۆیان بە ڕەوا بینیوە. بە تایبەتیش لە ناوچەکانی خۆیانداوەك بارزان، ئەو دەسەڵاتە ئاینییەیان بۆ خۆیان قورخکردووەو لەمەشەوە ئەو مافەیان بۆ خۆیان بە ڕەوا بینیوە کە سەرکردایەتی کورد بکەن. ئەوانیش‌وەکو زۆر لە پاشاکانی دنیا خۆیان لە کوردستاندا بە سێبەری خوا ئەزانن، کەسێکیش لە ڕووی ئاینییەوە سەرکردایەتی بزووتنەوەیەك بکات بە تایبەتی بزووتنەوەی نەتەوایەتی ئاسان نییە ئەو شوێنە بە خۆشی‌واز لێبێنێ. بەڵکو خۆیشی لە پێناودا دائەنێ یا زۆربەی زۆری خەڵکی ڕەفزی بکەنەوە.

## پەیوەندی یەکێتی - ئێران

کەواتە هیچ جۆرە هەڵوێستێکی تازەی دڵخۆشکەر بۆ نێوان خۆشی لەگەڵ پارتیدا نەهاتە کایەوە. لە بەرامبەردا یەکێتی پەیوەندی لەگەڵ ئێراندا ڕووەو گەشە کردن ئەچوو، ئێرانیەکان زۆر تر ئەهاتنە پێشەوە، هاتوچۆکانیان بۆ سنووری یەکێتی‌و ئاسانکاری بۆ هاتوچۆو دۆستایەتی پێشکەوتنێکی بەر چاوی بە خۆیەوە ئەبینی. دیارە ئێران دەوڵەتەو لەگەڵ دەرو دراوسێکانیدا پێویستی بە هەندێ هەنگاو هەیە بۆ مەبەستە تایبەتیەکانی خۆی بە تایبەتی کە دوژمنی زۆرە، دژایەتی ئەکرێ، دوای ئەوەی تووشی شەڕێکی هەشت ساڵەی خوێناوی بووە لەگەڵ عێراقداو ئابلۆقەی لەسەر بووە. هەر بەهۆی ئەوەی کە بەشێکی کورد لە ئێراندایە هەمیشە ئێران بە جیاوازی دەسەڵاتی حوکمەوە شاهنشاهی بێ یان ئیسلامی شیعەگەری سیاسەتێکی نارێکی هەبووە لە بەرامبەر کورددا، بۆیە دۆستایەتییەکانیشی لەگەڵ کوردی دەوروبەردا

سەقامگیر نەبووەو هەمیشە گۆڕاوە. لە ناوەڕۆکیشدا پێیخۆش نەبووە لە هیچ پارچەیەك کورد بگاتە مافەکانی خۆی، بگرە هەوڵی تێکدانیشی داوە یان لە چاوێلکەی بەرژەوەندییەکانی خۆیەوە تێی ڕوانیوە. پەیوەندییەکانی یەکێتی ئێرانیش ئەم هەڵبەزو دابەزەی بە خۆیەوە بینیوە، قۆناغێك گەر پەیوەندی هەبووە بەڵام لە ئاستێکی نزمدا بووەو گێچەڵی تێدا کراوەو بیانووی جیاجیا هێنراوەتەوە بۆ کزبوونی پەیوەندییەکان لە قۆناغێکی تردا گرفتی پەیوەندییەکان لە ئاستێکی بەرزتردا بووە چونکەوای پێویست کردووە. بە تایبەتی کەدەرودراوسێکانمان هەمیشە خۆیان لە پشتی هەموو پشێوی و ناکۆکیە ناوخۆییەکانمانەوە بوون دنەیان داوین بۆ پێکدادان و بە یەك نەگەیشتن، هەر لایەنێکی شەڕکەریش لە ڕێگەی دەزگایەکی ئەو دەوڵەتانەوە پەیوەندی پێوە کراوەو لایەکەی تریش دەزگایەکی تر. چونکە نەیانویستووە یەك دەزگا ئەرکەکان بگرێتە ئەستۆو لەو مامەڵە جیاوازەیەدا شەرمەزار نەبن. ئێرانیەکان ژیرانە توانیویانە ئەو شێوازە ئاڵۆزەی پەیوەندییەکانی نێوان خۆیان و لایەنە جیاجیا ناکۆکەکانی کورد ڕایی بکەن.

## گۆڕان لە مەڵبەندەکاندا

لای خویشمان یەکێتیویستی هەندێ ئاڵ و گۆڕ بکات بەتایبەتی لە ئاستی مەڵبەندەکاندا، جۆش و خرۆشێکی تر بخاتەوە ناو دڵ و دەماری ڕێکخستن تا زاڵ بن بە سەر کارەکانیانداو فریای جێبەجێکردنی ئەرکەکان بکەون و باشتر لە ناو خەڵکیدا هەڵسووڕێن و بەرنامەو سیاسەتەکانی یەکێتی لە ناویاندا ڕەنگ پێبدەنەوە. لەم ڕووەوە مەڵبەندی کەرکوك کرایە دوو مەڵبەند. هۆکاری سەرکیش ئەوە بوو مەڵبەندی کەرکوك نەیئەتوانی بە کارەکانیا ڕابگات، سنوورەکەی دابڕانێکی تیایەو دوورن لە یەکەوە، کادیرو لێپرسراوەکان بە سەریدا نەئەشکانەوە، هۆکاری تریش هەبوو. ئەو دوو مەڵبەندەش:

ـ مەڵبەنـدی دووی کـەرکوك. بارەگاکـەی لەتەکیـە دانـراو سـنوورەکوی چەمچەماڵ ـ ئاغجەلەر ـ تەکیە ـ سەنگاو ـ ناوچەی شوان بـوو. لێپرسراوەکەشی هەڤاڵ عوسمانی حاجی مەحمود بوو.

ـ مەڵبەنـدی ١١ی گـەرمیان. بارەگاکـەی لـە دەربەنـدیخان و سنوورەکەشـی دەربەندیخان ـ کـەلار ـ بـاوەنوور ـ تیلـەکۆ ـ کفـری ـ زینانـە ـ ناوچـەی خانـەقین بـوو. لێپرسراوەکەشـی هـەڤاڵ عـەدنانی حەمــەی مینـا بـوو. لـە ڕێـوڕەسمی تایبەتیـدا هـەردوو هـەڤاڵی لێپرسـراوی مەڵبەنـدەکان لـە جێگـای کـاری تازەیـان دانران ڕۆژی ١٩٩٦/٢/٣ کاك عەدنانمان بـرد بـۆ دەسـتبەکار بـوون لـە مەڵبەنـدی گەرمیان.

# کاك نەوشیروان لە گەرمیاندا

دوای ماوەیەك لەگەڵ کاك نەوشیروان مستەفادا بە هاورێ یەتی هـەڤاڵان شەوکەت و عەدنان سـەردانێکی گـەرمیانمان کـردو لـەوێ کـاك نەوشـیروان ڕۆژی ٢/١٩ چـاوی بـە کەسـایەتیە دیارەکـانی گـەرمیان کـەوت و لەگەڵیانـدا کـۆ بـووەو بـارودۆخی کوردسـتان و شـەڕی یـەکێتی ـ پـارتی بـۆ باسـکردن و شـەوەکەی لـە بـاوەنوور مایـنـەوە. گەرمیانیـەکان بـە تایبـەتی یەکێتییـەکان چ ڕێکخسـتن و چ پێشمەرگە هـەر لـە کۆنـەوە پەیوەندییـەکی گیانییـان لەگـەڵ کـاك نەوشـیرواندا هەیەوچ ئەوانەی لە نزیکەوە ئەیناسن و چ ئەوانەش نایناسن خۆشیان ویستووە، حــەزیان بــە قســەو کۆبوونــەوەکانی کردووە،ووتــارو نووســینەکانیان خوێندووەتەوەو کەسایەتیان بە دلا چووە. جگە لەمە کـاك نەوشـیروان خویشـی پەیوەنـدی تونـدو تـۆڵی لەگـەڵ زۆربـەی کـادیرو فەرمانـدەو لێپرسـراوو ڕێکخستنەکانی گەرمیان و کەسە دیارو ناسراوەکانیاندا هەیە، بـەڵکو لـە هەنـدێ کاتیشدا دەستە تایبەتیەکەی بە گشتی گـەرمیانی بوون و خـۆی داوای کـردوون.

یان له هەندێ له گەشتەکانیدا بۆ ناوچه جیاجیاکان گەرمیانیەکانی لەگەڵدا بووه. بۆیه له نزیکەوه شارەزاییەکی باشی له سەریان هەبووه. زۆر جار تواوجی تێگرتوون که گەرمیانی له سێ شتدا لاوازن:

- بەرگەی سەرما ناگرن
- تاقەتی هەورازیان نییه
- فره خۆرن.

## تەشکیلاتی لەشکرەکان

ئەوەی له سەرەتای ئەم ساڵدا گرنگی پێ درا مەسەلەی شێوەی ڕێکخستنەوەی هەموو لەشکرەکان و تەشکیلاتەکانیان بوو. که یەکێتی هەر له سەرەتای درووست بوونیەوه زوو زوو دەستی به خۆیدا هێناوەو تەشکیلاتەکانی به پێی هەلومەرجەکه گۆڕیوەو تازەگەرێتی تێدا کردووه له یەك قاڵبی ووشك و برینگدا نەماوەتەوه. جارێ هەرێم، جارێ تیپ، جارێ بەتالیۆن. بارێ هێزو ئینجا لەشکرو ...هتد. بەڵکو له ڕووی فەرماندەیی کردنیشەوه ماوەیەك مەکتەبی عەسکەری سەرپەرشتی سەرجەم هێزی پێشمەرگەی ئەکرد، دواتر گۆڕاو فەرماندەیی گشتی پێکهات هەر بۆیەشه لەم ساڵەدا لەبەر ڕۆشنایی هەلومەرجەکەدا پێویستی بەوه ئەکرد هێزی پێشمەرگەی کوردستان چاکتر ڕێکبخرێت، بایەخی زیاتری پێبدرێت، تاکو له ئاستی پێداویستی قۆناغەکەدابن، که فەرماندەیی گشتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان هەندێ ڕێنوێنی دابەزاندبوو بۆ پەیرەو کردنی:

ا. بۆ هەر لەشکرێك تەنها یەك فەرماندەی لەشکر ئەبێت.

ب. هەیئەی لەشکر بەم شێوەیه پێك دێت:

- دوو ـ سێ جێگر لەشکر به مەرجێ یەکێکیان ئەفسەری دەرچووی کۆلێژی سەربازی یان دەورەی قیادە بێت.

- ڕابەرسیاسییەك كەس
- لێپرسراوی ئیدارە + ١٠ كادیری ئیدارە بۆ نووسینگە
- لێپرسراوی زانیاری +١٠ كادیرو پێشمەرگە
- لێپرسراوی ئیستیتلاع + ١٥ كادیرو پێشمەرگە
- لێپرسراوی هەندەسە + ١٥ كادیرو پێشمەرگە
- لاسلكی + ٣ كادیر
- كەرتی حیمایەی لەشكر لە ٣٥ پێشمەرگەو مەسئول تێنەپەڕێ
- تیپی كوبرای دەورەدیو كە لە ١٢٠ پێشمەرگەو مەسئول تێنەپەڕێوكەمتر نەبێ.

هەموو لەشكرێك پێویستە یەك كەرتی ئیسنادی هەبێ كە لە ٣٥ پێشمەرگە كەمتر نەبێو گشت چەكەكانی ١٠٦ملم+ SPG 9 +٨٢ ملم+ دۆشكا+٢٣ ملم+٨١ ملم لەو كەرتەدا كۆ بكرێتەوە سەر بە بارەگای لەشكر بێت.

پ. پێویستە هەموو لەشكرێك تا١٠ تیپ پێكبهێنن كە هەر تیپە لە ١٢٠ پێشمەرگە كەمتر نەبێت.

ت. هەر تیپێك لە ٣ كەرت پێك بێت، هەر كەرتەش لە ٢٥ پێشمەرگەو مەسئول كەمتر نەبێت.

بەڵام مەخابن زۆر كەرەت ئەم ڕێنوێنیانە بە باشی پراكتیك نەكراوە، گۆڕانەكە هەر لە ڕووخساردا بووە، نەتوانراوە لە ناوەڕۆكدا مەبەستەكان بپێكین. بۆیە ئەو تەشكیلاتە هەڵوەشاوەتەوەو یەكێكی تر جێگەی گرتووەتەوە. یان ئەو كەسانەی نێردران بۆ خولەكانی فێربوون كەمتر شارەزاییانوەرگرتووە، یان هەندێ جار بەواسیتەكاریو بە خاترانە دانراونو ئیفلیجی خستووەتە كارەكانەوەو بە عەقڵیەتی سەربازی بۆ مەسەلەكان نەچوون. بگرە پارەیەكی زۆرو خەرجی لە ڕادە بەدەر بۆ ئەو خولانە یان دەرچوواندنی ئەفسەرەكان كراوە، بەڵام دواتر لە بوارە سەربازییەكەدا دانەنراوە، یان خۆی بۆ كاری ئیداری دزیوەتەوە. یان بەشێكیان دوای تەواو كردنی خولەكە لێیان نەپرسراوەتەوەو

بێکار ماونەتەوە یان بەرەو هەندەران چوونو هیچ حسابو کتابێکیان لە گەڵدا نەکراوە. خۆ کاتێکی زۆر بە مەشقو پەروەردە کردنو پێگەیاندنی تیپی کۆبراوە خەرجکراوە کە چی هەموویان هەڵوەشێنرانەوەو نەمانو کەسیش خۆی بە ساحێبیان نەکرد. ئەمە زیانی زۆری لێداین لە ڕووی کاتو پارە بە فیرۆدانو لە دەستدانی کەسانیووریاو زرنگ. جاریواش هەبوە میزاج دەوری هەبوە لە تەشکیلاتدا قەبارەی هێزەکان بچووك تر کراوەتەوە تاکو جێگا بۆ هەندێك خەڵك پەیدا بکرێ بەمەش چۆنێتی فەرامۆشکراوەو کەسێتی کەسەکان زاڵ بووە.

هەرچی چۆنێك بێ هەر دەست بەخۆدا هێنانو گۆڕینێکی شێوازی ڕێکخستنو کاروباری پێشمەرگایەتی بەلای هەندێکەوە مەبەستو بەرنامەیەکی شاراوەی لە پشتەوەیە، کە لەوانەیە لە مەودای دوورتردا بۆ ئەنجامدانی کارێکی سەربازی ئامادەبکرێن.

## درێژکردنەوەی تەمەنی پەرلەمان

لە بارێکیوادا کە بۆچوونەکان زیاتر بۆنی خۆسازدانی شەڕێکی لێوەئەهات، بە پێچەوانەوە هەنگاوێکی ناوبژیوانی نرا بۆ دوور کەوتنەوە لە ئازاری شەڕو یەك خستنەوەی تواناکان بۆ ڕێکخستنەوەی ناو ماڵی کوردی.

ئەم هەوڵەش لە لایەن کەسایەتی ناوداری گەلەکەمان هاوڕێ عەزیز محەممەد هاتە کایەوە. کە ڕۆژی ١٩٩٦/٥/٢٧ هەردووووەفدی یەکێتیو پارتی بە ئامادەبوونی لیژنەی هاریکاریو هەندێ کەسایەتی ناوداری کورد بە سەرپەرشتی هاوڕێ عزیز محەممەد لە هاوینە هەواری پیرمام کۆبوونەوەو بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك دانیشتنیان کرد، لە ئەنجامدا لەسەر درێژ کردنەوەی تەمەنی پەرلەمان بۆ ماوەی ٣ مانگ بڕیار دراو هەوڵیش بدرێت پەرلەمان بەبەشداریکردنی هەندێ لایەنی تری دەرەوەی پەرلەمان فراوان بکرێ.

ئەوە بوو ڕۆژی ۱۹۹٦/٦/۲ بۆ دووەم جار ئەندامانی پەرلەمان لە هەموو ڕەنگەکان لە ژێر خێوەتێکی گەورەدا لە نێوان شاوەیس - مەلا ئۆمەردا کۆبوونەوەو بڕیاری درێژکردنەوە درا.

شایانیووتنە جاری یەکەم لە ۲۷ /۱۹۹٥/٥ لە دێی داردبەن بۆ ماوەی ساڵێك تەمەنی پەرلەمان درێژکرایەوە،وەکو لە خەڵکی یاسا ناسانم بیستووە لە باری شەڕدا درێژکردنەوەی ماوەی کار کردنی پەرلەمان کارێکی ئاساییەو لە زۆر پەرلەمانی تری دونیادا ئەمە ڕووی داوە، بەڵام ئەوەی نەشازە ئەوەیە ئەم درێژکردنەوەیەو دانیشتنەکان لە هۆڵی پەرلەماندا نەکران، بەڵام لەدەرەوەی هۆڵی پەرلەماندا کراو ئەویش بڕیاری لە سەر نەداوە بەڵکو فراکسیۆنەکانو سەرکردایەتی هەردوولا ڕێککەوتوون لە سەر ئەوە. هەرجارەی لە شوێنێکی نێوان سنووری شەڕگەی هەردوولا. بیانکەی پارتی ئەوەبوو کە پەرلەمان داگیرکراوە لەلایەن یەکێتییەوە. کەچی باسی ئەوەناکەن کە خۆیان دوای تەواو بوونی کارەکەیان لەناو هەولێردا دوای پەناگیرییەکە کشانەوەو ڕۆڵی پەرلەمانیان مراند. کەواتە پەرلەمانەکەمان پەرلەمانێکی حیزبی بوو، ئەندامان تیایدا ئازاد نەبوون بە تایبەتی پەرلەمانتارانی پارتی. بەڵکو هەمیشە چاوەڕوانی بڕیاری سەرەوەیان بوون، بەڵگەش بۆ ئەوە سەرۆکی فراکسیۆنەکان لێپرسراوی بە دەسەڵاتی هەردوو حیزب بوون. جگە لەمە هەندێ لە لێپرسراوەکانی پارتی لە چاوپێکەوتنەکانیدا ڕایان ئەگەیاند کە ئامادەنین لە هەولێردا کۆبوونەوە بکەن.. بۆیە من بۆ خۆم بە چاوی گومانەوە ئەمڕوانیە ئەم جۆرە کۆبوونەوەو دانیشتنو ملدان بۆ ناوبژیوانیش لەبەر بەرژەوەندی خەڵکی نەبوو، بەڵکو لە پشتییەوە تەڵەی تر نرابووەوەو بەڵکو بۆ دەستەبەرکردنی کات بوو. ئەم ناوبژیوانیە ماوەیەك ئاگربڕی بەدوادا هات، بۆ ئەوەی هەردوولا پشوویەك بدەنو دەست بەخۆیاندا بهێنن. بەڵام خەڵکی هەمیشە بەنابەدڵی پێشوازییان لەو هەنگاوانە ئەکردو دڵنیا نەبوون لە بەرامبەری، بەڵکو ئەترسان لەوەی گێمێکی تری شەڕی لە دواوە بێت.

# کاک کۆسرەت لە سەنگاودا

لەم ماوەیەدا هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسوڵ سەردانێکی ناوچەی سەنگاوی کرد، بۆ پەردەلادان لەسەر وێنەی شەهیدانی فەرماندە حەمەڕەش وووریای شێخ ڕەشید، لە ڕێوڕەسمێکی شایستەدا کەسەدان کەس لە خەڵکی ناوچەکەو دەرەوەی ئامادەی بوون،وەکو وەفایەك بۆ ڕێزلێنان لە کەسایەتی شۆڕشگێڕانەی ئەم کەڵە جوامێرانەی گەلەکەمان. دوای تەواو بوونی ڕێوڕەسمەکە سەردانی هەندێ کەسایەتی ناوچەکەی کردو نیوەڕۆکەی لە کانی باجگەی سەگرمە نانی نیوەڕۆمان خواردو کاك کۆسرەت بە هەلیزانی کە لەگەڵ هەڤالان عەدنانی حەمەی میناو عوسمانی حاجی مەحمودو هەندێ برادەری تریشدا دابنیشێ‌و پێکەوە گفتوگۆ بکەن‌و سنوورێك بۆ ساردی نێوانیان دابنێ کە بەڕای من بناغەیەکی حیزبی ـ سیاسی نەبوو، بەڵکو بارێکی نائاسایی هاتبووە ناوانەوە کە ڕەنگدانەوەی کارو بۆچوونی سەرەوە بوو لای خوارەوەشی تووشی گێژاو کردبوو بە تایبەتی کادیرانی ناوەڕاست، لەهەمووشی گرنگتر لە ناو یەکێتیدا گەر ناکۆکی هەبێ ئەوا بنەمایەکی فیکری ـ سیاسی نییە. ئەم جۆرە کارانەش گیانی شۆرشگێڕی لە حیزبایەتیدا ئەکوژێ. بە تایبەتی ئێمە هێشتا بە دوژمن چواردەور دراوین‌و نەیارمان زۆرەو ئەبێ هەمیشە ئامادەباش بین بۆ ڕەتکردنەوەی هەر ئەگەرێکی نالەبار.

# کارەساتی کەڵەکین

وە نەبێ پارتی بەتەنیا لەناوخۆدا هەر لەگەڵ یەکێتیدا لە ململانێدا بووبێ بەڵکو لەو سنوورەی دەسەڵاتیدا هەندێ حیزب‌و لایەنی تریش هەبوون کە پێکەوە لەگەڵ پارتیدا پێکنەئەهاتن‌و تا ئەهات دەمی داسەکەیان لە یەکتری تیژ ئەکردو چاوەڕوانی هەلێك بوون ملی یەکتری پێ ببڕنەوە. بەتایبەتی ناکۆکی لەگەڵ سوورچییەکاندا کەوا ئەزانم شتێکی تازە نەبێ. بەڵام بە بیانووی

تازەوە توانرا تۆڵە لە ڕابوردوویش بکرێتەوە، چونکە حسێن ئاغای سوورچی جگە لەوەی کە سەرۆك هۆزی سوورچی بوو، سەرۆکی کۆمەڵەی عەشایەری کوردیش بوو کە لەوولاتێکی بیانییەوە کۆمەك ئەکراو هاوکاری پارتی پارێزگارانیش بوو کە عومەر ئاغای برای سەرۆکی بوو، ئەمەش مەترسی خستبووە بەر پێی پارتی دوای ئەوەی کە عومەر ئاغا پشتیوانی لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەکردو دۆستایەتی پتەو لە نێوانیاندا هەبوو. پارتی ئەم جۆرە هەڕەشانەی پێ قووت نادرێ‌و ئەبێ شکۆی خۆی بسەلمێنێ لە بەردەم هۆزەکانداو پاکسازی ئەوانیش بکاتو بالادەستی دەربکەوێت. گەرچی کۆمەڵێك لە حیزبە کوردستانییەکان کەوتنە نێوانی هەردوولا بۆ نەقەومانی شەڕ، بەلام پارتی نەخشەی لە ناوبردنی حسێن ئاغای سوورچی دابوو،وەکو تەمبێکردنێك.

بۆیە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٩٩٦/٦/١٦ هێزێکی گەورەی پارتی تۆپبارانێکی خەستی دێی کەڵەکینیان کردو ئینجا پەلاماریان داو خەڵکێکی زۆریان لە ناو دێکەدا کوشت لە گەورەو بچووك،وەکو باس ئەکرا هەندێکیان دوای دەسگیرکردن کوژرابن، لەناو کوژراوەکانیشدا حسێن ئاغای سوورچی بوو. ئەم پەلاماردانەی کەڵەکین‌و کوشتاری خەڵکەکەی کارێکی قێزەوەن بوو، بگرە دووره لە ڕەووشتی کوردەوارییەوە، تەنیا لایەنێك لە ڕیزی تۆدا نەبێت، پشتگیری سیاسەتو بەرنامەکەت نەکات ئیتر لێی بدەیت..؟! ئەتوانی بە ڕێگای تر قایلی بکەیت یان هەوڵ بدەیت بە شێوازی تایبەتی قسەو ڕاکێشانی خەڵکی ڕیزەکانی ئەو چۆڵ بکرێت.

بەلام پاکسازیکردن کردەیەکی ناڕەوایە بۆیە ئەمە دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو، نارەزایی زۆری خستەوەو شتی زۆر لەسەر پارتی‌ووترا، بەتایبەتی یەکێتی بە توندی نارەزایی دەربڕی‌و لەووتەکاندا ئەوە نیشان ئەدرا کە بەرامبەر ئەوتاوانە بێدەنگ نابێ. پارتی پارێزگارانیش ڕۆڵی خۆیان بینی لە بەرپەرچدانەوەی ئەم کارەساتەو بلاو کردنەوەی لە هۆیەکانی ڕاگەیاندنی بینراو، بیستراو.

ئەم پاكسازيكردنەی بنەماڵەی ئاغای سوورچی هەر لە پاكسازييەكەی بنەماڵەی مێرگەسووری ئەچێت. یەكێتی ناهەقی نەبوو هەڵوێستوەربگرێ، لە لایەكەوە لە شەڕدابوو لەگەڵ پارتیدا، دوژمنی دوژمنم دۆستمەو لە لایەكی ترەوە پارتی پارێزگاران لە سەنگەری دۆستایەتیو هاوپەیمانێتی یەكێتیدا بوو، هەر ئەوەش بوو پارتی نیگەران كرد لەگەڵ هۆكارەكانی تردا دەستیان پێدابهێنێ.

## هاتنی هێزێكی ئێران

زۆری نەخایاند هێزێكی ئێران بێپرسی یەكێتی هاتە ناوەوەو ڕووی كردە سنووری كۆیە بۆ پەلاماردانی حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران كە بارەگای سەرەكییان لەوێ دانابوو. هەركە هێزەكە هاتە كوردستانەوە دیموكرات ئاگادار بوون لە نیازەكەیان خۆیان سازدا بۆ پارێزگاری كردن لە خۆیان. ئەو هێزە هیچیوایان پێنەكرا جگە لە هەندێ تۆپباران كردن نەبێ كە زیانی بە برادەرانی دیموكرات نەگەیاندو هەندێ خەڵكی دێهاتەكانی ئەو ناوانە شەهیدو بریندار بوونو هەندێك لەو هێزانەی ئێران لە سنووری پارتییەوە گەڕانەوە بۆ ئێران، هەندێ لە سەرانی دیموكرات كەوتنە پڕو پاگەندە دژی یەكێتی لە ئەورووپاو بەیان بلاوكردنەوە. كە لە دوایشدا ڕەتدرانەوەو سەركردایەتی دیموكرات خۆیان گەیشتنە ئەو سەرەنجامەی كە یەكێتی پەیوەندی دوورو نزیكی بەو پەلامارەوە نەبووە.

## گرژییەكی نوێ

هاوكات هەندێ ئاڵۆزی لە بەرەكانی شەڕی باڵەكدا لە نێوان یەكێتیو پارتیدا ڕوویدا بووە هۆی پێشڕەوییەكی باشی هێزەكانی یەكێتیو پاشەكشەكردنی هێزەكانی پارتی لە حاجی هۆمەرانو چۆمانو گەلاڵەو ناوپردانووەرتێ. ئەم گورزە پارتی داچڵەكاندو هەرزوو ڕایگەیاند كە ئێران لە

پشت ئەم پەلامارادانو سەرکەوتنەی یەکێتییەوەیەوە لە سەر ئەمەش بەیانیان بلاّوکردەوە لە ڕۆژنامەو بلاّوکراوەکانیاندا. وەکو بڵێی یەکێتی خۆی هیچی پێنەکرێ. پارتی لای خۆیەوە ڕایگەیاند کە ئاگربڕ کۆتایی هات.

پارتی لەناو دڵەڕاوکەی شەڕو تەنگ پێهەڵچنینیدا لەلایەن یەکێتییەوە ڕۆژی ١٩٩٦/٨/١٦ یادی یۆبیلی زێڕینی دامەزرانی خۆی ئەکردەوە، ترسێکی زۆریان چووبووە دڵەوە، هەستیان ئەکرد لە بارێکی نائاساییدان. ئەو قسەو ڕاگەیاندنەیان بەڵگەی هەنگاوێکی نهێنی تربوو لە بواری ئەنجامدانێکی تری پیلانێکی شەڕخوازانەوە. بۆیە یەکێتیش کەوتە خۆیو هێزەکانی سازداو لەشکرەکەی ئێمە داواکرا بۆ قوڵی بالیسانو ڕۆژی ١٩٩٦/٨/١٨ کەیشتینە ئەوێو بە بڕیاری هەڤاڵ مام جەلال کەوتینە ئینزارەوە. لە هەنگاوێکدا بۆ پشتگیریکردنی ئەو شەڕەی ناوچەی باڵەكو گوشار خستنە سەر پارتی پەلاماری شاخی کلاّو قاسمان دا، هەندێ شەهیدمان داو هەندێ لە چەکدارەکانی پارتیش کوژران.

ڕۆژی ٨/٢٠ بۆ ئەنجامدانی هەندێ کارو بار لە کلاّوی داوەری ناوچەی خۆشناوەتی، پارتی ئێمەیان دایە بەر دەستڕێژی دۆشکاو بە سووکی بریندار بووم.

## پەنابردن بۆ دوژمن

ئەم شەڕانەی ئەم جارەو پێشڕەوی هێزی پێشمەرگە لە باڵەکایەتیو ناوچەی سیدەکان پارتی خستە بەردەم دووڕێیانی تێکشکانو نەمانی موحەقەق ئەبێ چی بکات: یان ئەبێ ڕابکاتو لە دواییدا خۆ بەدەستەوە بداتو بمرێ یان بیر لە ڕێگەچارەی تر بکاتەوە بۆ دەربازبوون. کەس نییە مردنی پێخۆش بێ، پارتیش ئامادە نییە لە گەڵ یەکێتی پێکبێتەوە ئینجا چۆن خۆی بە دەستەوە ئەدات. کەواتە ئەبێ ڕێگەی دووەم بگرێتە بەر، ڕیگای پەیوەندیکردن بە دوژمنو هانا بردن بۆی.! کام دوژمنیش، بەعسی ئەنفالکەرو بکوژی

بارزانیەکانو بکوژی کوردەکانی بارزانی. بەڵام ئەمانە هیچ نین، پەنابردنو هێنانی هێزو تێکشکانی یەکێتی مەبەست ترە.

چی ئەبوو پارتی لەو ساتە ناسکانەدا یەکێتی ناچاری ڕێککەوتن بکردایە، پەنای بۆ ئاشتی ببردایە نەك بۆ هێزی دوژمنان..!

ڕۆژی ١٩٩٦/٨/٢٢ لە مێژوودا باس ئەکرێ کە مەسعود بارزانی نامەی بۆ سەدام حسێن نووسیبوو کە خۆیشی دانی پێدا ناوەو نایشارێتەوە، نەك نامە نووسین بۆ هەڤاڵ مام جەلال و داوای ئاشتی کردن. بەڵکو هەندێكوا باس ئەکەن کە مەسعود بارزانی خۆی چووەتە بەغدا.

ڕژێمی عێراق چەندە پێیان خۆشبوو کە سەرکردەیەکی کورد داوای پاکسازی هێزێکی تری کورد بکات. لە مێژووی دوورو نزیکی کورددا ئەم هەڵوێستە زۆر دوو بارە بووەتەوە. بۆیە بە چاو کردن لەو ڕابوردووە بە لای سەرۆکی پارتییەوە شەرم نەبوو نامە بۆ سەدام بنووسیّو داوای هێز بکات بۆ یەکلاکردنەوەی بارودۆخەکە لە بەرژەوەندی خویدا.وەنەبێ ئەم نامەیە یەکەم پەیوەندی نێوان پارتی - ڕژێم بێ بەڵکو چیرۆکی پەیوەندییەکان لەم زەمەنە زۆر کۆنترە، ئەگەڕێتەوە بۆسەرەتای گفتوگۆی بەرەی کوردستانی لەگەڵ ڕژێمدا لە دوای کۆڕەو. ئیتر پارتی - ڕژێم لێکك دانەبڕان. هاتو چۆکان بەردەوام لە ئاستی جیاجیادا هەبووە، تا ئەو ڕادەیەی کەچەكو تەقەمەنیو کەرەسەو کەلو پەلی جەنگیو پێداویستی سەربازییانوەرگرتووەو خەلکی زۆر لەو شتانە ئەزانن.

بە ڕای من ئەم ڕێککەوتنەی پارتی - ڕژێم کۆمەڵێك شتی نهێنی تێدایە لە بەرامبەر هاوکاری سەربازی ڕژێم بۆ گرتنەوەی هەولێر لەوانەش: پاکسازیکردنی هێزەکانی ئۆپۆزسیۆنو هەوڵدان بۆ سەر لە نوێ گرتنەوەی کوردستانو گەڕاندنەوەی بۆ ژێر دەسەڵاتی بەعس. ئێمە هەندێ زانیاری سەرەتایمان لە سەر هەندێ جموجووڵو هاتوچۆی پارتی - ڕژێم هەبوو،

تێگەیشتین کە پیلانێك هەیە لەئاراداو ئەبێ خۆمانی بۆ ئامادە بکەین. بەڵام نەمانئەزانی کە بەهێزی هاوبەشەوە پەلامارمان ئەدەن.

لە هەمان کاتدا ئەمانویست لە بەرەکانی شەڕیشدا بێزاریان بکەین، بۆیە ڕۆژی ١٩٩٦/٨/٢٦ بە لەشکری حەمرینو هەورێ پەلاماری زنجیرە چیای بەنی هەریرمان داو گرتمانو کەوتە ژێر دەستمان. بەڵام لە شەڕێکی زۆر توندو سەختدا ئەوان جارێکی تر لێیان سەندینەوە.

# ئۆپەراسیۆنی ٣١ / ئاب

هەموو کاتژمێرێك بە خێرایی تێئەپەڕیو تێیدا هەستمان بە ئاڵۆزی یەك ئەکرد، دەنگو باسەکانی خوارەوەمان پێئەگەیشت کە ڕژێم خۆی ئامادە ئەکات بۆ هەندێ جموجووڵ، سەرەڕای دڵنیا نەبوونمان لە ڕژێم، بە ئاسانی ئەوە نەئەچووە مێشکمانەوە کە ڕێککەوتنی پارتی - ڕژێم گەیشتبێتە ئەو ڕادەیەو لە هاوکێشەیەکدا خۆی ببینێتەوە کە لایەکانی ناکۆك بەیەکن.

دیارە ئەم پێکهاتنەی پارتی - ڕژێم بە خۆڕایی نەبوو، بگرە هیچ ڕێککەوتنو پێکهاتنێك لە نێوان دوو لایەندا بە بێ بەرامبەر یان بێ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی تایبەتی نابێت. چەندە پارتی پەرۆشی هاوکاری ڕژێم بوو بۆ سەرخستنو باڵادەستیبوونی، ڕژێم دە ئەوەندە تاسەیوەها هەلومەرجێکی ئەکرد کە نەخشەکانی لە ڕێگەی پارتییەوە جێبەجێ بکات کە لە ڕاپەڕینەوە هیچ دەسەڵاتێکی بە سەر کوردستانەوە نەمابوو.

ڕژێم لە چەند قوڵێکەوە کاری ئەکرد:

- بە هۆی هاوکاری کردنی پارتییەوە یەکێتی لەناو ئەباتو لاوازی ئەکات - ترسو بیم ئەخاتە هەناوی کوردەوەو هەمیشە لە دڵەڕاوکەی هاتنەوەو گەڕانەوەی ڕژێمدا ئەبن
- گەر بۆی بچێتە سەر بە تەواوی ئەگەڕێتەوە کوردستان.

ڕۆژی ١٩٩٦/٨/٢٩ بە ڕووکەش ئاگربڕێك کراو هەوڵێك درا کە گفتوگۆ دەست پێبکرێتو پەرلەمان درێژبکریتەوە. یەکێتی پێی باش بوو ئەو هەنگاوە بە جیدیی جێبەجێ بکرێ، گەر لە ژێر کڵاوی پارتیدا پیلانێك نەنراوەتەوە. تەنیا یەك ڕۆژ کەمتر بەسەر ئەو مقۆمقۆیەدا تێپەڕی سەرەتای بەرنامەی داڕێژراوی پارتی - ڕژێم دەرکەوت کە هێزێکی ڕژێم پەلاماری کەڵەکی داو داگیریکردو ئەو حیزبانەی بارەگایان لەوێبوو خۆیان دەربازکرد. تا ئەم کاتانەش لەلایەن برادەرانمانەوە لە هەولێروا هەست نەئەکرا شتێکیوا لە گۆڕێدا بێت. ئەو جۆرە پەلامارە بە کارێکی سنووردار تەماشاکراو زۆر جار شتیوا ڕوویداوەو تەواو بووە. بەڵام ئەم جارەیان ئەمە لە گەمە نەئەچوو، بەڵکو پیلانێکی چێنراو بوو ئامادەکاری تەواوی لە ڕووی سەربازیو هێزو تەنسیقەوە بۆ کرابوو، بە جۆرێ بەرەبەیانی ڕۆژی ٣١/ ئابی/١٩٩٦ ئەوەی لە ماوەی شەڕی ناوخۆدا بە لایدا نەئەچووین ڕوویدا. ئۆپەراسیۆنەکەی بە ناوی ( اب المتوكل على الله ) لە کاتژمێری پێنجی بەیانیدا بوو. کارەساتێك قەوما، لە ژیانماندا زۆر کارەسات قەوماوە بەڵام هیچیانوەکو ئەمە کاریگەر نەبووە، هیچیان بە قەد ئەمە برینی لە جەستەماندا بە جێ نەهێشت. جاران کە لە شاخ بووین ئەمانووت: داگیرکەران لە بنەوە زەمینەی شەڕو ناکۆکیەکانمان خۆش ئەکەن تا یەکگرتوو نەبین، هەمیشە پەرتەوازە بینوەکو کای بندڕك بەڵام ئێستا هەلومەرج جیاوازە، ئومێدێکمان هەیەو شتێکمان پێکەوە ناوەو بە دەستی خۆمان بە زیندوێتی لە چاڵی مەرگدا نەینێژین.

بەرەبەیانی ڕۆژی ٣١/ ئاب ناخۆشبوو، خەڵکی هەولێرو دەوروبەری بە زرمەی تۆپو هاڕەی تانکەکان لە خەو هەستان، تێگەیشتن ئەوەی ڕوو ئەدات لە هی ڕۆژانو مانگەکانی تر جیاواز ترە. لە هەردوو قۆڵی قوشتەپەو کانی قرژاڵەوە کە هێزەکانی یەکێتی سەنگەریان لێدابوو دوژمن پەلاماری دا: سەرەتا بە تۆپ بارانێکی چڕو پڕو ئینجا هێزەکە بە تانكو زرێپۆش ئەو ناوچە پانو پۆڕەیان دایە بەر، لەم قۆڵەوە لەشکری سەگرمە دانرابوو بە فەرماندەیی کاك

ئـەنوەر دۆلآنـی. هەنـدێ هـەڤاڵمان‌وەكو جەمالـە سوورو قـادری حـاجی كـەریم بـرای شـەهید بـەختیارو ڕەزای حـاجی عـەلی بـە دیلگـیران‌و چـەندینی تـریش. شەڕێكی گەرم بەر پابوو بە شێوەیەك ئەو هێزە زۆرەی دوژمن كە بە چاوساغی پـارتی هـاتبوون‌و ئـالآی زەرد بەسـەر تانكەكانـەوە بـەرز كرابـوودوە، سـەرەڕای تۆپبـاران نـەیان ئـەوێرا نزیـك ببنـەوە، بەرگرییـەكی سـەختی بێوێنـە كـرا، هێزەكانمان بەرامبەر بەو هێزە زۆرو كەرەستە سەربازییەو فراوانـی شـەڕگەكان كەمتر بوون، لە قۆڵی كانی قرژاڵەشەوە بـەرگری باشـكرا، هێرشـە یـەك لـە دوای یەكـەكانی ڕژێـم - پـارتی تێكشـكێنرا، چـەندین تانـك سووتێنرا، زۆر سـەربازو چـەكداری پـارتی كـوژران، هەنـدێ پێشـمەرگە شـەهید بـوون. لـە قـۆڵی سـێ بیرانیشەوە شەڕ گەرم بوو بە جۆرێك بوو كە پێشمەرگەو دوژمن تێكـەڵ بـوون، زیانی دوژمن زۆر بـوو، هەنـدێ پێشـمەرگە شـەهید بـوون، هەنـدێكیش كەوتنـە دەسـت دوژمـن، لەوانـەش ئاسـۆ ئـەڵمانی كـە دواتـر ئـازاد كـران‌و گەڕانـەوە كوردستان.لە قۆڵی مەسیفیشەوە شەڕی سـەختكرا، دوای بەرگرییـەكی كەم‌وێنـە ئینجا پـارتی‌و ڕژێـم لـە ئێوارەكەیـدا توانیـان بگەنـە سـكرتاریەتی هـەڤاڵ مـام جەلال. لە قۆڵی عـەینكاوەش شـەڕی قورسـكرا، كـە لـە قۆڵـەكانی تـرەوە دوژمـن گەیشتە نـاوەوە لـەم قۆڵەشـەوە هـاتن. ڕژێـم بـە پاڵپشـتی چـەكدارەكانی پـارتی هێرشیان كرد، كە هەندێ سەرچـاوە ئاماژەیـان بەوە ئـەكرد كـە زیـاتر لـە ٧٠٠ - ٨٠٠ تانك‌و زرێپۆش بەشداربووەو بەشێكی زۆری ئەو تانكانـە لـە جـۆری ت ـ٧٢ ی پێشكەوتوو بوو، لەگەڵ چەندین فیرقەی سەربازی كـە لـە كـەركوك‌و موسـڵ‌و دەوروبـەری خـوارووی هـەولێر وەكو هێـزی تـەماس دانرابـوون‌و هێزێكـی زۆری گاردی كۆماری تایبـەتی‌و هێزیكـی میكـانیكی گـەورە بـە پاڵپشـتی تۆپخانەیـەكی گـەورەو فڕۆكـەی هەلیكۆپتـەری شـەڕكەر.وەكـو بـاس ئـەكراوەزیری بـەرگری عێـراق سەرپەرشـتی ئۆپەراسـیۆنی ٣١/ ئـابی ئـەكرد. ئـەوەی لـە توانـادا بـوو هێزەكانی سەنگەری بەرگری یەكێتی لە ڕوو بـە ڕوو بوونـەوەی ڕژێـم - پارتیـدا نواندیان، داستانێكی بەرگری قارەمانانە بوو، زەوی گڕی گرتبوو، بستێك زەوی نـەبوو گوللـە تـۆپێكی تیـا نەتەقێتـەوە، لـە ئاسمانیشـەوە بۆردوومـان بـوو، چڕەدوكەڵ‌و تەپ‌و تۆز بەرز بوو بوودوە. زۆر لـەدوژمن كـوژرا. كـە پارسـەنگی

هێزەکان بەراوورد نەئەکرا، توانای پێشمەرگە لەوە زیاتری هەڵنەئەگرتو هێرشەکە توند تر ئەبوو، دوژمن لە قوشتەپە زاڵ بوو، تانکەکان بێوەستان کشان بەرەو دارەتوو، لەوێوە بۆ بنەسلاوە تا لەگەڵ هێزەکانی تری پارتی لە کەسنەزان یەك بگرنەوەو هێزەکانی یەکێتیو دامو دەزگاکانی لە ناو هەولێردا ئابلۆقە بدەن. ئێمە لە دۆڵی بالیسانەوە ئاگامان لە زرمەی تۆپ بارانەکەی رژێم بوو. شەڕ گەیشتە ناو هەولێر لە هەموو لایەکەوە تەقو تۆق بوو. ئیتر ووردەووردە دەسەڵاتی یەکێتیوەکو حکومەت ئاوا بوو، چونکە فریای ئەوە نەئەکەوت هەم شەڕ بکاتو هەم کاروباری حکومەتیش ڕایی بکات، چونکە ئەم شەڕە دەستەو یەخە بوو، حیسابی بۆ نەکرابوو. جگە لەوەی بەرەکانی شەڕ زۆر فراوانو دوورو درێژ بوو نەئەتوانرا بەو هێزەی یەکێتی بە هەموو شوێنەکاندا ڕابگەین. دەنگو باسەکانی شەڕ ئەگەیشتە لامان، شپرزەیی بە ڕەنگو ڕووی خەڵکیو پێشمەرگەشەوە دیاربوو، نەئەتوانرا شکستەکان بشاردرێتەوە، سەرەڕای بەرگری ئازایانە. کاتێك کە زانرا هێزەکانی ڕژێمی بەغدا بەشداری کردووەو پارتی بە تەنیا نییە ئەوە کاردانەوەی خراپی درووستکرد، بچووکترین جموجووڵ بەس بوو بۆووره بەردان، چپە چپو خووتەو بۆڵە هەبوو، بەشێکی نارەزاییو بەشێکی ترس بوو، بەڵام هێشتا لای بەشێکی هێزەکانمان ئازایەتییەك بۆ ڕوو بە ڕوو بوونەوە چەخماخەی ئەدا.

هەواڵەکانی ناو هەولێر بە باشی نەئەگێڕدرایەوە، هەڤاڵانی لێپرسراوی حیزبیو حکومیو پێشمەرگە کە لەبەرەکانی شەڕەوە گەڕابوونەوە ناو شار گیریان خواردبوو، هێزێکی ئێمە کە پێش دەست پێکردنی شەڕەکە بە سەر پەرشتی سەید جەوهەر بە ڕیمان کردن بۆ ناو هەولێر، لەوێ شەڕێکی گەوردیان کردو زیانێکی زۆریان لە دووژمن دابوو، هێزەکەش زیانێکی باشیان لێکەوت، دوای ئەوەی زانرا هیچ ناکرێ بڕیاری کشانەوە بۆ دەرەوەی هەولێر درابوو بەڵکو لەوێوە خۆ کۆ بکرێتەوەو سەر لە نوێ پەلامار بدرێتەوە.

ئەوەی توانرا کۆ بکرێتەوە لە هێزەکانو هەڤالانی بەرپرس بە سەرپەرشتی کاك کۆسرەت بە ڕێگەی بنەسلاوەدا بەرەو بێستانە - چەمرگە بە شەوەکەیدا بە ناو بۆسەی هێزەکانی ڕژێم - پارتیدا بە دەمووردە شەڕو تەقەوە

دەربازبوون، بەڵام زۆر پێشمەرگەو لێپرسراوی تریش دابڕابوون‌و نەیانتوانی لە گەڵ ئەواندا دەرچن. هێزەکانمان لە لای بەرزاییەکانی چەمرگە - بەستی شەرغە دامەزران. هەرچەندە هێزێك بە سەر پەرشتی کاك جەبار فەرمان گەیشتە ئەو ناوە بۆ یارمەتیدانی برادەران، بەڵام لە ڕێگادا ئەکەونە بۆسەی هێزەکانی دوژمن‌و هیچیان پێناکرێ. لە کاتێکدا ڕژێم - پارتی پەلاماری هەولێریان دا هەڤاڵ مام جەلال بانگەوازێکی بۆ گەلی کوردستان بلاو کردەوەو تەئکیدی لە سەر هاوکاری پارتی لەگەڵ ڕژێمدا کردەوە بۆ تێکدانی ئەزموونی دیموکراتی گەلەکەمان‌و داوای لە کۆمەلانی خەلکی کوردستان کرد کە هەریەکە لای خۆیەوە بەرپەرچی پەلامارەکەی مەسعود بارزانی بدەنەوە.

من لە بالیسانەوە بۆ بەسەر کردنەوەی هەڤالان چوومە ناوچەی دێگەلەو حاجی‌ووسوو، شەڕەکە لەوێ زۆر گەرم بوو، پارتی کە لە هێرشدا بوو هێزەکەی ئێمەش هەر لە شکاندا بوو، بۆیە نەمتوانی برادەران ببینم‌و بە ناچاری گەڕامەوە بۆ سنووری بالسان. هەر لە قوڵی هەولێرەوە هێزەکەی کاك ئەنوەر دۆلانی دەرگیری شەڕێکی نابەرامبەر بوون‌و بە دەیان تانك پەلاماری ئەدان، لە هەموو پەلامارەکاندا تێك ئەشکان‌و هێزێکی زۆری دوژمن کوژران‌و پێشمەرگەیەکی فرەی خۆمان شەهید بوون‌و کاك ئەنوەرو کۆمەڵێك پێشمەرگەی تر بە نارەحەتیەکی زۆر ڕزگاریان بوو، لە ڕێگەی دەشتی تەقتەقەوە بەرەو چەمچەماڵ‌و لەوێشەوە بۆ دۆلی قەرەداخ‌و هەر لەو ناوەشدا مانەوەو نەچوونە سەر سنوور. ئەو هێزەی کە نێردرا بوو بۆ پشتیوانی برادەران سوودی نەبوو چونکە کار لە کار ترازابوو، هێزەکانمان بە تەواوی ماندوو بوو بوون، لەم قوڵ بۆ ئەو قوڵ ئەگوێزرانەوە، هێزی یەدەك نەمابووەوە، هەر هەمووی لە سەنگەری شەڕدابوون‌و بواری پشوودانیان نەبوو. ئەو هێزانە بۆ فریاخستن‌و پینەو پەرۆی بەرەی شەڕەکان بوو، هێزی یەکلاکەرەوە نەبوون، هێزی یەکلا کەرەوە ئەبێ حەساوەو لە رووی دەروونییەوە کۆك‌و لەڕووی چەك‌و چۆڵەوە پڕ تفاق‌و کەرەسەو بە پێی نەخشەیەکی تۆکمە

بچنه ناو شەڕەوەو لە لێداندا سەرکەوتن مسۆگەر بکەن‌و هێزی دوژمن شندڕوووندڕ بکەن.

سەیر لەوەدایە ئێمە هەر چاوەڕوانی گورزی هێزی هاوپەیمانان بە تایبەتی ئەمریکا بووین، پشتمان بەوان بەستبوو کە بەرگریمان لێبکەن‌و ڕێگە بە عێراق نەدرێ سنووری هێڵی ٣٦ ببەزێنێ کە هەولێر کەوتووەتە ناو ئەو هێڵەوە. هەڤاڵانمان لە هەولێر بە تایبەتی هەر بە تەمای ئەوە بوون کە هاوپەیمانان شتێکیان بۆ بکەن‌و چرکە بە چرکەیان ئەژمارد. کە گرمەی فڕۆکەکانی هاوپەیمانان هات‌و لە ئاسمانی هەولێردا بینران بە یەکجاری دڵیان خۆشبووکەوا ئاواتەکەیان دێتە دی، ئەوان بە ئاسماندا ئەسووڕانەوەو لە زەویشەوە هێزەکانی هاوپەیمانێتی ڕژێم ـ پارتی بە تانك‌و زرێپۆش‌و گاردی کۆماری دەوروبەری هەولێریان پاك ئەکردەوەو هێواش هێواش بۆ ناو هەولێر ئەهاتن. کە چی خوانەکات ئەو فڕۆکانە لەو بەرزییەوە دڵیان پێمان بسووتێ ئەگەر دەست ڕێژێکیشیان بکردایە لەوانەیە تەرازووی دۆخەکە بگۆڕایە. چەند خۆشە لەتەنگانەدا فریادڕەسێك بێت بە هاناوە. ئەمە کوتومت لە کاتی ئەنفالە کەیشدا ڕوویدا، کاتێك بەعس لە هەموو قوڵەکانەوە گەرمیانی کۆنترۆڵکردو ناچاربووین چۆڵی بکەین، هێزێکی مەجلیسی ئەعلاش لە دەربەندی دەرەوار مابوونەوە، دەنگو باس‌وا کەوتەوە کە بۆ دەربازبوونمان کۆپتەری کوبرای ئێرانی دێت‌و دەرمان ئەکەن، لەوواقیعە تفتوتاڵەدا دەیان ختورە بە دڵ‌و مێشکماندا گوزەری ئەکرد، کە جگە لە خەیاڵ هیچی تر نەبوو.

فڕۆکەکانی هاوپەیمانان لەو سەرەوە ئەیانڕوانییە مەیانی شەڕەکەو تاقەتیان نەبوو ڕۆکێتێك بهاوێژن‌و دڵی کەنەفتی ئێمەش خۆش بکەن. دڵنیام ئاگاشیان لە دەردە دڵی ئێمەو تەنگانەمان هەبوو، کە هیچێك ڕووی نەدا ئیتر ئومێدی برادەرانمان بە ئەمریکا کز بووەوە، تێگەیشتین لە پشتی پەردەوە بەرنامەیەك هەیەو ئێمە نایزانین. چەندە باری دەروونی‌و هێزی شەڕکردنمان نائاسایی‌و ئاڵۆز بوو، ئەوەندەش لایەنی I.N.C دژوارترو ناهەموارتر. ڕژێم بە

چاوساغی پارتی کەوتەویزەیان، بە جۆرێك باس لە کوشتنی زیاتر لە ١٠٠ کەسیان لە سنووری قوشتەپەو گرتنی خەڵکێکی زۆرتریشیان بە دیلی هەبوو، رژێم ئەوانی زۆر لا مەبەست بوو، راوی ئەکردن، چونکە عەرەب بوون داخ لە دڵتر بوو بەرامبەریان، ئەمەو لەو شەڕانەدا دەیان پێشمەرگەی یەکێتی دوای شەڕی زۆر سەخت لە لایەن رژێمەوە لە قۆڵەکانی کانی قرژاڵەوە بە دیلگیران.

بە هاتنە ناو شارەوە بە هیمەتی تانكو دەزگا سیخوڕییەکانی بەعس، پارتی سەرمەست بوون، دوای دابڕانێکی دوو ساڵە گەر هاوکاری بەعس نەبوایە هەرگیز نەیان ئەتوانی پێ بنێنە ناو هەولێر. لە بری ئەوەی بە ڕێزەوە بچنە ناو خەڵکەکەو باوەشیان پیا بکەنو دەستدرێژی نەکەنە سەر ماڵو ناموسیان، ئاسایشیان بپارێزن. هێزەکانیان هۆلاکۆ ئاسا کەوتنەویزەی خەڵکی بە تایبەتی دۆستو لایەنگرانی یەکێتیو حیزبەکانی تریش. لە جیاتی پارێزگاری لە دامو دەزگاکانی حکومەتی هەرێم تالاّنیان کردن، بێشەرمانە بێدەنگ بوون لە ئاست تانكو گاردی کۆماریدا کە چوونە سەر پەرلەمانو دایانە بەر تۆپو داگیریان کردو بەڵگەنامەکانی ناویان بردو دواتریش مەسعود بارزانی لەگەڵ کوڕەکەی دکتاتۆردا لەو پەرلەمانەدا پێکەوە پیرۆزباییان لە یەکتری ئەکرد بەم کارە دەرگا کرایەوە بۆ هاتوچۆی سەرانی رژێم بە تایبەت سەردانەکەی قوسەی کوڕی سەدامی دیکتاتۆرو هاتنی زۆر لە پیاوەکانی دەزگا جاسوسییەکانی بەعس بۆ چاوشکاندن.

پارتی بە لایەوەوابوو هەولێری لە چنگی داگیر کەر رزگار کردووە. پەنا بردنی بۆ دوژمن لە دۆستایەتیو ڕێککەوتنی یەکێتی پێ باشتر بوو. لالە ئەنوەری خەلیفە یۆنسی تیرەی رۆغزایی گێڕایەوە: کە هەر چەندە یەکێتی باسی داگیرکردنی پەرلەمانی لە لایەن گاردی کۆمارییەوە ئەکرد بڕوام نەئەکرد، تاکو چوومە بەغداو لەوێ سەعە دڕکەییم بینیو بۆی باسکردم کە خۆی دوو رۆژ پاسەوانی پەرلەمانی کردووەو لەگەڵ گاردی کۆماریو تانکەکاندا. شایانی باسکردنە سەعە دڕکەیی موستەشارێکی جارانی رژێم بوو

لە ناوچەی کەلارو دەربەندیخاندا فەوجی جاشی ڕاگرتبوو، لە ڕاپەڕیندا لای یەکێتی بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٩٢ دا خۆی بۆ نەگیراو ڕایکردەوە بۆ لای ڕژێم.

پارتی ئەم هاوکاریکردنەی ڕژێمو گرتنەوەی هەولێری لە لایەن گاردی کۆمارییەوە نەشاردەوەو لە هۆیەکانی ڕاگەیاندنەکانیدا هەنگاو بە هەنگاوی ئەنجامەکانی پەلامارەکانی ڕژێمی پەخش ئەکردو خۆشحاڵی خۆی دەرئەبڕی‌ووایئەزانی قارەمانێتییەکی نیشتمانی ئەنجامداوە. هاوکات هەندێ لە کەناڵە ئاسمانییەکانی جیهان ڕەوتی ئەو پەلامارو شەڕەیان لە دەنگو باسەکانیاندا بەوێنەوە بڵاو ئەکردەوە.

نەخشەی پەلامارەکە هەر بە تەنیا هەولێر نەبوو بەڵکو مەبەستی لەوە زیاتری بە دواوە بوو، بە پێی ئەو ڕێککەوتنەی لەگەڵ ڕژێمدا مۆری کردبوو گرتنەوەو کۆنترۆڵکردنی سەراپای کوردستانو دەرپەڕاندنی یەکێتی بوو بۆ دەرەوەی سنوور.

بۆیە دوای ئەوەی دڵنیا بوون کە هێزی یەکێتی لە ناو هەولێردا نەماوە، هەنگاوی تریان نا بۆ فراوانکردنی ڕووبەری دەسەڵاتیان لە شارو شارۆچکەکانی تری ژێر دەسەڵاتی یەکێتی. کە یەکێتی نەیتوانی پەلاماری دژ ئەنجامبداتو هەوڵێك بۆ گرتنەوەی هەولێر بدات پارتی هەستی کرد زەمینە لەبارە بۆ هەرجموجووڵێك.

هێزەکانی یەکێتی ئەیانویست بەرگری بکەن نەك هێرش لە سنووری بێستانە - چەمرگە ڕۆژی ١٩٩٦/٩/٥ شەڕێکی توند بەرپابوو،ووردەووردە کشا بەرەو بەستی شەرغەو حاجی‌ووسوو تا ئەهات ڕووبەری شەڕەکە بەرەو سەرەوە هەڵئەکشا، هێزەکانی پارتی لە قوڵی کەسنەزانیشەوە بەرەو قۆپی سوسێو ڕۆژی ١٩٩٦/٩/٧ بە ڕێگەی دێگەڵەشدا کشان بۆ ڕێگە گرتن لە کشانەوەی هێزەکانی یەکێتی.

هەڤاڵ مام جەلال خۆی ڕۆژی ١٩٩٦/٩/٧ هاتەکانی‌وەتمانو لەگەڵ مەکتەبی سیاسیدا کۆ بووەو بڕیاری کشانەوەی هێزی پێشمەرگە دراوەکو

کارێکی تاکتیکیو کاتی چونکە هێزەکانمان ماندوو بوونو هەموویان لە شەڕدابوون، بەشێکی لە هەولێردا گیریان خواردبوو، شەهیدو بریندارى زۆرمان هەبوو، بەشێکیش ترسنۆکانە سەنگەرەکانیان بە جێ ئەهێلا، ئەمەش وایکرد کە ڕێگە خۆش بکرێ بۆ هێزەکانی پارتی دەمەخوێنین ببنو پەلامار بدەن. ئیتر برادەران بە دەم شەڕەوە بەرەو کۆیە هەلکشان، لەم کاتانەدا منو هەڤاڵ محسن بایز لە دۆڵی بالیسانەوە کە هێشتا لای ئێمە شەڕ نەبوو بوو، جگە لە هەندێ تەقو تۆق، بۆ بەسەرکردنەوەو ئاگاداربوون لە دۆخی شەڕەکەو هەواڵ زانینی برادەران بەرەو هەیبەتسوڵتان ڕۆیشتین، لە ڕێگادا ئەمان بینی هێزەکانمان پاشەکشە ئەکەنو بەرەکانی شەڕ بەجێ ئەهێلن، هەندێکیان بە تۆپی ١٠٦ ملمەوە ڕایئەکرد،وە تەنانەت کابرایەك بە ناوی نەقیب ئارام کە لە هێزی دژە تانك بوو بە ١٠٦ ملمەکەیەوە بەرەو ڕانیە ڕایئەکرد. لە سەر هەیبەتسوڵتان کاك کۆسرەتمان بینی بە ئێمەیووت بچنە خوارەوە بۆ بەرگری کردن، منیش کە دابەزیمە خوارەوە لە چاخانەکەی بە ڕووی کۆیەدا کاك جەبار فەرمانم بینی.ووتی لێرەدا دامەزرێن بەرگری بکەن. کە لەشکری سلێمانی لەوێ بوو.ووردەووردە هێزو تانکەکانی پارتی لە دوو قۆڵەوە هێرشیان ئەهێنا لە:

- قۆڵی کۆیە بۆ هەیبەتسوڵتان
- قۆڵی باواجی بۆ هەیبەتسوڵتان

شەڕەکە گەرم بوو، شاخەکە ئاگری تێ بەربوو بوو هێزەکەشمان ماندوو تا ئەو ڕادەیەی مامە غەفە دۆشکای سەر ئۆتۆمبیلەکەی کردەوەو بەجێیهێشت، منیش هێنامو بەستمەوە سەر ئۆتۆمبیلەکەی خۆم. لەو کاتانەیشدا ئێمە پشتمان بە هەندێ پۆلیس بەستبوو کە لەگەڵ عەمید سەیفوڵلادا هاتبوونو نێردرابوونە قۆڵی باواجی، بەڵام ئەوانە ترسنۆك بوونو هەڵاتبوونو عەمید سەیفوڵلاشیان بە جێهێشتبوو. کە چووینە سەر هەیبەتسوڵتان ڕۆیشتمە لای تەقویەی تەلەفزیۆنەکەی کۆیەو بە چاوێکی خەمباریەوە تەماشایەکم کردو

زانیم دوای ئێمه خێڵی پارتی دێنه سەری بۆ خزمەتی خۆیان بەکاری دێنن.. له ناخیشەوه پێم ناخۆشبوو ئەوان سوودی لێ ببینن.

ئێمــه هــەموو بێزاربــووین تاقــەتی هیچــمان نــەمابوو لەوێــدا پێشمەرگەیەکی هێزدکەی سلێمانی هاتـه ژوورەوە تـەنیا مریشکێکی زینـدووی لێبوو گرتیو لەگەڵ خۆیدا بردیو له کانیوەتمانیش هـەر پـێم بینـی، لێرەشـدا شــەڕێکی زۆر گــەورەمان کــرد، زیــانێکی باشمــان لــه پارتیــدا، چــەندین جــار هێرشەکەیمان دواخست پارتی له پێشڕەوی کردن هەندێ دواکەوتن، کـه بـەرەو کانیوەتمان هاتن شەڕی باشتریان لەگەڵدا کـراو خـەڵکی دیاریشیان لێکوژرا، کـه له هەیبەتسوڵتان شۆڕ بووینەوه چووینه کانیوەتمان لـەوێ لەگـەڵ کـاك جـەبار فەرمانو کاك ملازم عومەردا چووین بۆ ڕانیه، له چناروٚكو بێستانه شەڕ گەرم بوو، له ڕانیـه کـاك جـەبار پێـیووتم کـەوا ئاگاداری مامۆسـتا جـەمال بکەمـەوه هێزدکەی له هیران بکشێنێتەوه بۆ قەمتەرانو لەوێ سـەنگەر لـێ بـدەن، منـیش یـەك دوو پێشـمەرگەم نـارد بـۆ لای مامۆسـتا جـەمال، هەرچـەندە هێزدکـەی ئەویش له کشانەوەدا بوون.

لەو دەمەدا برادەران باسـی ئـەوەیان ئـەکرد ئایـا هێزدکانمـان لـه کـەپکی حەمـەد ئاغـاو کلاوقاسـم بمێننــەوه یـان نـا..؟ دواجـار بڕیـار درا کـه بمێننــەوه کەچی پارتی لەوێشەوه پەلاماری داو تەنگی پێهەڵچنینو کشانەوەی هێزدکان لـه شوێنەکانی تـر کارێکی خراپـی کـردە سـەریانو ئـەوانیش شـوێنەکانی خۆیانیـان چۆڵکرد. کاك جەبار ئاگاداری کردمـەوه بـه بنـاری کۆسـرەتدا لەگـەڵ هێزدکـانی مامۆستا جەمالدا بچینه دووکان بەڵام هێزدکانی مامۆستا جـەمال پـەرشو بـڵاو بووبوون، ئیتر من بـه قـەیاخ پەڕیمـەوه بـەری مەرگـەو لـەوێوه بـۆ دووکـان. لـه ڕێگـادا پێشـمەرگه پەرتـەوازەکانم ئـەبینی بـەرەو دۆڵـی جافایـەتی ئەڕۆیشـتنو بەرەکانی شەڕیان بەجێ ئەهێشت. له دووکـان لەگـەڵ مامۆسـتا جـەمال یـەکمان بینیەوەو پێکەوه سەردانی لەشکری کەرکوکمان کرد له فریزەڵەو بەرزاییـەکانی

کە فەرماندەکانیان شێرزاد موەفەری و سیامەند سەنگاوی بوون، کاك مەلا ڕەحیمیش لەگەڵ هێزێکی سکرتاریەتدا لە کەڵکە سماق بوون.

پێشمەرگە کەمێکیان نەبێ توانای شەڕکردنیان نەمابوو، بۆیە زوو زوو سەردانمان ئەکردن لەسەنگەرەکانیانداو کەمێك ووزەوووره‌مان پێ ئەبەخشین و زۆر جاریش بە جیهاز قسەمان لە گەلا ئەکردن بە لام بێ سوود بوو هەرکە هێزەکانی پارتی دەرکەوتن دوای بەرگرییەکی کەم کشانەوە، منیش بە جیهاز هاتم ئەدان خۆڕاگربن، لەو کاتەدا کەسێکی پارتی هاتە سەر هێڵی پەیوەندییەکەمان کە پێم وابوو عومەر عوسمان کە لێپرسراوێکی بەرزی پارتی بێ پێی ووتم: مەحمود هەڵێ. هەڵێ.

منیش پێم ووتەوە: ڕووی ڕۆژگار ڕەش بێ من ئەوە نیم لە بەر زەلامی وەکو تۆ هەڵێم.

دواتر ئێمە سەر کەوتینە سەرەوە بۆ سەر بەستی دووکان و لە لای کارۆماییەکە شەڕێکی سەختمان لە گەلاکردن و چەندین کەسیان لێکوژرا، کەزانیمان لەوە زیاتر هیچمان پێناکرێ چووم لە بەدالەی دووکانەوە پەیوندیم کرد بە جەنابی مام جەلالەوەو دۆخەکەم بۆ باسکردو ئەویش ووتی ئەوەی پێتان ئەکرێ بیکەن. ئیتر ئێمە لەوێوە بەرەو دۆڵی جافەتی بە ڕێکەوتین. لەوێ چووینە دێی قەڵەم پاشا، مامۆستا جەمال ووتی: با لێرە بمێنینەوە، منیش ووتم: با بەرەو قەلا چوالان بڕۆین، هەر لەو کاتەداووتم: با پەیوەندییەك بکەم و بزانم ڕای هەڤاڵ مام جەلال چۆنە. کە چوومە سەر خەت کەس نەبوووەلاممان بداتەوە ئەمە ئەوەندەی تر منی خستە سەر بەزمی ڕۆیشتن بەرەو قەلاچوالان.لەوێوە بەڕێکەوتین تا گەیشتینە قەلاچوالان، تەماشائەکەین هەڤاڵ مام جەلال زۆر تووڕە بووە. بە درێژایی ڕێگاش خەڵك و پێشمەرگە بە پێ و بە ئۆتۆمبیل بەرەو سنوور ئەڕۆیشتن، لە ناو قەلاچوالاندا کاك کۆسرەت و هێرۆخان وەستا بوون خەریکی سووتاندنی کەرەسەو دیکۆمێنتەکان بوون کە بە جێمابوون، لەوێ بووین تا شتەکان تەواو بوون، قاتی خوارەوەی ماڵی هەڤاڵ مام جەلال ئەسووتاو قاتی سەرەوەی هێشتاوەکو

خۆی‌وابـوو، هێرۆخـان پێشـمەرگەیەکی نـارد بـە پەیژەیەکـدا هـەڵزنا بـە نـاو ئاگرەکەداو چووە سەرەوە ئەویش ئاگر تێبەر بدات. چونکە هەندێ شتی تیابوو نەئەکرا بە ساغی بمێنێتەوە. ئیتر دوای ئەوە بـەرەو ئاوەکورتـێ ڕۆیشتین شـەو لەوێ ماینەوە، بەیانیەکەی چووینە شاناخسێو لەوێ هەڤاڵ مام جەلالمان بینـی. ئێمە ماتو مەلوول بەلام ئەو زۆرووره بەرزبوو، بـڕوای بـە هەڵسانەوە هـەبوو. هەر لەوێدا سەبیحە خانی خێزانی شەهید عەلی عەسکەریمان بینی‌ووتـی: ڕۆڵـە بۆ ڕاتانکرد..؟ ئێمـەوەلامێکمان نـەبوو، لـە پاشانداووتی: بەسایی خـواوە عـەلی عەسکەری نەماوە ئەگینا ئێستا ئەویش‌وەکو ئێوە ترسـنۆكو ڕیسوا ئـەبوو. کـە ئێمە دووکانمان چۆلکرد ئیتر پارتیش بە جادەدا بەرەو سلێمانی ڕۆیشتن. لێـرە بـە دواوە پـارتی بـە کـەمی نـەبێ ئەوەنـدە ڕووبـەڕووی شـەڕ نـەبووەوە، بـەڵکو هێزەکانمـان ئـەوەی مابوونـەوە یـان لـە بـەرەکان پاشـە کشـەیان کردبـوو پاشـان بـەرەو سنوورەکان ڕۆیشـتن بـێ ئـەوەی گیانیـان نـووزەی شـەڕکردنی تیامابێت. شارۆچکەکانی چەمچەماڵو کفریو کەلارو دەربەندیخانو شارەزوورو پێنجوێن بـەبێ تەقـەو بـێ ئـەوەی هێـزی دوژمـن دیاربـێ لـە پێشـمەرگەو کـادیرو لێپرسراوەکان چۆلکراو بەرەو سنوورەکان چوونو شەڕ نـەکرا. بۆیـە هێزەکـانی پـارتی کۆسـپی ئـەوتۆیان لـە بەردەمـدا نـەبوو، کاتـێ ئـەو هێزانـەی لـە دەربەندیخانو کەلارەوە بە دوو قۆڵی ڕوویان کردە دێی دێسووتكو چیا ڕەزا کـە خـەڵکێکی زۆر لـە پێشـمەرگەو کـادیرو کـەسو کـاری ئەوانـەی لێکۆبـووەوە، پـەلامار دران هـەموو شـڵەژانو بـەرەو پـەتی زالگەکـەی ئێـران لـە تەپـە ڕەش ڕایانکردو بە زۆر کردیانـەوەو چوونە ژوورەوە کە پێشـتر ڕێگـەیان پێنەئـەدان توانیان بـە نـاو هـەزارەها مینـی چێنراوی کـاتی شـەڕی ئێـران ـ عێـراقـدا بچنـە ناوەوەو لە شوێنێکی زۆر پیسو نالەباری پڕ لە مێشوولەو دووپشكو بـێ ئـاودا ئۆردووگایەکیان بۆ کرایەوە. لە پەنای دێسووتکدا هەندێ پێشمەرگە کـە خۆیـان ئەشۆرد کەوتنە دەست هێزەکانی پارتی لەوانە: ئەمجەدی حاجی غـالی، ئەحمـەد سۆیلەمیشـی، مامۆسـتا سـتار، فایـەقی ڕابـە. بـە داخـەوە دواتـر ئـەم پیـاوە تێکۆشەرانە لە لایەن سەرکردایەتی پارتییـەوە گوللە بـارانکران. دیارە ئەمـەش لـە تۆڵـەی کوژرانی ئـەو بەرزانیـەدا بـوو کـە لـە قـۆڵی پێنجوێن ـ سـەیرانبەن

کوژرا. تەنیا کاك عەدنان‌و حسێن مەنسوورو هەندێ پێشمەرگەی تر ڕاپەڕین‌و پەلاماری پارتییانداو شەڕێکی باشکراو نەیانهێشت پارتی بێتە پێشەوەو دەستیان بگاتە خەڵکەکە. لە قۆڵی ڕاپەڕینیشەوە شەڕێکی کەم کرا، هێزەکانمان لێکدابڕان بە تایبەتی گەرمیانییەکان بە هۆی نەشارەزاییەوە خۆیان بە دەستەوە داو چەکەکانیان لێسەنراو هەندێکیان بە کەفالەت ئازاد کران‌و هەندێکیشیان کە فەرماندە بوون بران بۆ زیندانە تاریکەکانی پاراستن ئەوانی تریش ڕووەو سنوور بەرەو سونێ‌و قەندیل‌و قاسمەڕەش ڕۆیشتن.. بە جۆرێك زۆر ئازاریان بوو لەڕێگادا. ئۆتۆمبیلێکی زۆر لە ڕێگەی هەڵشۆ بە جێماو کەوتنە دەست پارتی، سلێمانیش بەشێکی لە ڕێگەی شارەزوورو بەشێکی لە ئەزمەڕەوە بە رەو سەر سنوور ڕۆیشتن، شەڕ لە ناو سلێمانیدا نەکرا، کە قەلاّ چوالان جموجووڵی کرد، پێشمەرگە هەندێ شوێنی تەقەمەنی‌و کەلوپەلیان سووتاند، دوکەڵیش بەرز بوو بووەوە، ئەمە کاری لە دڵ‌و دەروونی خەڵکی کردبوو. ئەم ڕۆیشتنە بێدەنگەوایکرد کەپارتی لە خۆبایی بێ‌و بە هەمووولایەکدا هێز بنێرن‌و سوود لە شکستی هێزی پێشمەرگەوەربگرن، لە سلێمانییەوە هێزیان نارد بۆ شارەزوور - هەڵەبجە، شارەزوور - پێنجوێن - سەیرانبەن، دەربەندیخان - کەلار - دێسووتك، سلێمانی - چەم چەماڵ، سلێمانی - قەلاّچوالان - ماوەت - چۆمان.

بەڵام لە ناوەندی شارو شارۆچکەو ئۆردووگاکان دوور نەئەکەوتنەوە. هێزەکانی پارتی هاتنە ناو قەلاّچوالانەوەو هەرچی ماڵی هەڤاڵ مام جەلال‌و فەرماندەو پێشمەرگەمان کەمابوونەوە تاڵانیان کردو بیناکانیشیان ڕووخاند. هەستم بەوە کرد بوو گەر عێراق بێت نەتوانین خۆمان لە بەرامبەری ڕابگرین بەڵام بیرم بۆ ئەوە نەچووبوو ئاوا بشکێین، دامانابوو بچینە شوێنە سەختەکان بۆ شەڕو بەرگریکردن.

بۆیە هەر لەسەرەتاوە منداڵەکانم ڕەوانەی میشیاوی دۆڵی شلێر کردبوو تا لەوێ پارێزراوبن بە حوکمی ئەوەی خەڵکی ئەو دێیە خزممانن.

کە چووینە سەر سنور ئیتر من ئاگام لە منداڵەکانم نەبوو، کاك ساڵەح نەسرەدین کە بریندار بوو بوو نامەیەکم پێدا کە بچێتەوە بۆ سلێمانی‌و لەوێوە

بچێتەلای شێخ محەممەدی شێخ عەبدولکەریمی کربچنە بۆئەوەی بیپارێزێ، شێخ هەرئەوەندە بوو کاك سالەحی پاراستبوو بەلام نامەکەی تەسلیمی دەزگای ئەمن کردبوو لەوەش ئەچێ لە ترسابووبێ. پێش ئەوەی بچێتە کەرکوك لە گەڵ عیزەت کەریم درەیی‌و عەلی پێنجوێنی هەوڵی ئەوەیان دابوو منالەکانم رزگار بکەن بەلام کەوتبوونە بۆسەی برادەرانی خۆمان لە سەیرانبەن‌و عیزەت درەیی رانی شکابوو. کە پارتی زانیبوویان منالەکانم لە میشیاوە هێزێکیان بە سەرپەرشتی مەلا فایەق چووچانی چووبووە سەریان‌و ئاگریان بەردابووە ئەو ناوەو سووتاندبوویان‌و ئەو ئۆتۆمبیلەی منالەکانمانی بردبوو بۆ خۆیان بردیان، نەزیرەی براژنم قاچێکی شکا.

مستەفای حەمە سدیق خان کە خاوەنی دێکەو ئەو مالانە بوو کە منالەکانی ئێمە میوانیان بوون چەکداری پارتی بوو، ئەو خۆی هەرچی چەك‌و شتمان لە مالی جەوهەری برایدا دانابوو دەستی بەسەراگرتبووو بردبووی، جەوهەری برای منالەکانمانی لە رێگای دێی دووپلوورەی مەریوانەوە دەربازکردبوو بۆ مەریوان، خەلکی ئەم دێیە کە ئێمەشیان نەناسیوە بەلام بە تایبەتی بنەمالەی مام سەعیدو کاك عەبدوللا زۆر یارمەتیان دابووین.

رۆژانی ١٢و ١٣ای مانگی ١٩٩٦/٩ پارتی هێرشیان کردە سەر چۆمان کە هەندێ هێزی یەکێتی لێ بوو کە لەگەڵ من‌و مامۆستا جەمالدا بوون، بەو هێزەی خۆمانەوە پەلاماری هێزەکانی پارتیماندا‌و بەرەو دواوە راومانانن‌و نەمانهێشت ماڵ‌و سامانی ئەو خەلکەی کە لەگەڵماندا هاتبوون بکەوێتە دەسیان‌و بە تالانی ببەن. دوای شەرەکە من بەرەو قاسمەرەش کەوتمە رێ بۆ سەردانی مەکتەبی سیاسی. بە ئۆتۆمبیل گەیشتینە پردی کەلوێ کە لە نێوان سەردەشت‌و بانەدایە لە لایەن زالگەیەکی ئێرانییەوە رێگەمان پێگیراو نەیان نەهێشت تێپەرین، لەوێداجیهازەکەم هەلداو برووسکەم بۆ هەفالْ مام جەلال کردو ئیتر کار ئاسانیمان بۆ کراو چووینە سەردەشت‌و لەگەڵ کاك جەبار فەرمان‌و برادەرانی‌تردا بەرەو قاسمە رەش بەرێکەوتین. رۆژی ٩/١٨ پارتی بە

هێزێكی زۆرەوە پەلاماری سەیرانبەنیدا كە زۆری خەڵكی سلێمانیو شارەزوورو پێنجوێن لەو شوێنەدا كۆ بوونەوەوەكو ئۆردووگایەك لە لایەن ئێرانەوە ئامادەكرابوو، گەرچی شوێنێكی باش نەبوو، هەموو پێداویستییەكی ژیان تەرخان نەكرابوو، بەڵام دیسانەوە بۆ كارێكی كارەساتاوی كوتوپڕیوا یارمەتیەكی باشیانداوە. هەر هیچ نەبێ گیانیان ئەپارێزرێ، هەرچەندە ئەم پەلامارەی پارتیو تەقە كردنیان لە خەڵكەكە كارێكی نامرۆڤانە بوو، خەڵكەكە هیچ بوارێكیان نەبوو چونكە لە ناو چادری گونیەو نایلۆندا ئەژیان، پەنایەكیان نەبوو لە گولله بیان پارێزێ، بۆیە لە ئەنجامی تەقە كردن بە ناو خەڵكو پێشمەرگەدا چەندین ژنو منداڵ بریندارو ٤ هاووڵاتی بێ گوناەو ٤ پێشمەرگە شەهید بوونو یەك پارتی كوژراو هی تریشیان هەبوو، دوای ئەوە ئیتر سەر سنوورەكان ئاسودەو بێدەنگ بوو، شەڕی تیا نەما.

ڕۆژی ١٩٩٦/٩/١٩ مەكتەبی سیاسی بەیاننێكی بڵاوكردەوەو پەنجەی بۆ هەموو مەبەستەكانی پشتی پەردەی هاوكاری ڕژێم - پارتی درێژ كردو ڕێوشوێنی دەست پێكردنەوەی خەباتی دارشتەوەو بووە بناغەیەك بۆ هەڵوێستی نوێ.

# مەدالیای ڕێزلێنان

لەولاشەوە لە دوای سەرکەوتنەکانی ڕژێم‌و هاوکاریکردنی پارتی بۆ داگیرکردنی شاری هەولێر، سەدام مەدالیای ڕێزلێنانی دا بەو فەرماندانەی بەشداری شەڕی (اب المتوکل علی الله) یان کردبوو، ئەمەش بەڵگەیەکی دوو سەرەیە:

- لە سەرێکەوە لە هات‌و هاواری پارتی کەم ئەکاتەوە کە گوایە ئەوان هەولێریان گرتۆتەوە.
- لە سەرێکی تریشەوە دان پیانانی ڕاشکاوانەی ڕژێم بوو بۆ هاوکاری کردنی پارتی‌و یارمەتیدانی بەرچاوی بۆ پەلاماردانی کوردستان کە ئیتر هیچ جۆرە تەفسیرێك هەڵناگرێ.

کردەی ٣١/ ئابی ١٩٩٦ لە هەموو میدیاکانی جیهاندا باس‌و بڵاوکرایەوەو بگرە هەندێ کەناڵی سەتەلایتی عەربی‌و جیهانی ڕاستەوخۆو پێ بە پێی هێرش‌و پەلامارەکانی ڕژێم - پارتی بۆ سەر کوردستان دەنگ‌و باسەکانیان بەوێنەی زیندووەوە بڵاو ئەکردەوەو لە لای کەسایەتییە سیاسی‌و ڕۆشنبیرەکان دەنگی ئەدایەوەو تاوانبار ئەکرا، گەرچی لەلایەن هەندێ چڵکاو خۆری پارتی‌و ڕژێمەوە زوڕنای بۆ ئەژەنراو دەهۆڵی بۆ ئەکوترا.

# لێبوردنی بارزانیانە

هەر لەم کاتانەدا کە پارتی لە ئێزگەکانیەوە لێبوردنێکی مەسعود بارزانی بۆ هەموو یەکێتی‌و خەڵکە ئاوارەکە دەرکرد کە بە خۆیان‌و چەکەکانیانەوە تەسلیمی پارتی ببنەوەو بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان، ئەمە دەقاودەق لەو لۆژیکەی ڕژێمی بەعس ئەچێ کە هەموو جارێ داوای لە سەرانی کوردو شۆڕشەکە کردووە کە خۆیان‌و چەکەکانیان تەسلیم بە ڕژێم بکەنەوە.

مەسعود بارزانی لە بری ئەوەی بیر لە ئاییندەی کوردو چارەنووسی کوردستان بکاتەوەو بەو سەرکەوتنەی بە هۆی هێزەکانی دوژمنی داگیرکەر بە دەستیهێناوە لە خۆبایی نەبێتو لە دوا هەلیشدا دەستی ئاشتی درێژ بکردایە، کەچی ئاوا لێبوردنێك دەرئەکات نەیزانی ئەو سەرکەوتنەی بە ئاسانی بۆ قووت ناچێ، یەکێتی گەرچی تووشی شکستێك بوو ناچار بوو بکشێتەوە، هەروا بە سووكو سانایی نارواتو جارێکی تر خۆی کۆئەکاتەوەو ئەو جۆرە شکستانە لە بەرەکانی شەڕدا نابێتە هۆی لە ناو بردنی یەکجارەکی. چوون یەکێتی هێزێکی بچووكو بێ بناغەی جەماوەری نەبووەو جگە لەوە یەکێتی پێگەیەکی بەهێز لە ڕووی سیاسی، کۆمەلایەتی، فیکرییەوە بنیاتناوە کە زەمینەی بۆ خۆش بکات سەر لە نوێ خۆی ساز بداتەوە.

هەر پێش چەند ڕۆژێك لە گرتنەوەی سلێمانی ڕێکخراوەکانی دەرەوە کە لە کوردستاندا کاریان ئەکرد، ڕۆژی ١٩٩٦/٩/٥ کشانەوەو هەرچی ئەو کوردانەی لە گەلیانا کاریان ئەکرد بە خێزانەوە گوێزرانەوە تورکیاو لەوێشەوە برانە دوورگەی گوامو دواتریش ڕەوانەی ناووولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کران.

## نەخشەی دابەزین

ڕۆژی١٩٩٦/٩/٢٠ لە زەلێ کۆبوونەوەمان کرد کە هەڤالانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیو فەرماندەیی گشتی بە ئامادەبوونی هەڤال مام جەلال نەخشەی دابەزینمان بۆ خوارەوە بۆ ناوچەکانی خۆمان دیاری کردو کە هەر لێپرسراوەو لەگەل هێزێکدا دابەزێت، من بۆ قەرەداخ دانرام. لەم کاتانەدا پارتی پەلاماری سونێی دا، بەلام سەرکەوتوو نەبوو تێکشکاو کوژرانی زۆری لێکرا. مەبەستی پارتی لەم شەڕانەیدا کە بەردەرکەی بە یەکێتی ئەگرت بۆ تێکشکانی دەروونیو ئامادەگی پێشمەرگەکانی بوو بۆ خۆ سازنەدانەوەو ترسو

بـيم بـڵاو كردنەوەوواتێگەيانـدنمان كـە ئـەوان بـەهێزو توانـان لـە ڕووی سـەربازييەوەو خـەڵكيان لەگەڵـدايەو ئێمـەش خزاوينەتـە سـەر سـنوورو لـە ئۆردووگادابنو جارێكی تر ناتوانين هەڵسينەوە.

مـن دوای تـەواو بـوونی كارەكانم بـە ڕێگـای بانـەدا گەڕامـەوە چۆمان. لەوێشـەوە بـە سـەردانێ چووم بـۆ سـەيرانبەن بـۆ كۆكردنـوەی هێزەكانمـان كـە پرش‌و بڵاو بـوو بوونـەوە، ئـيتر كـاتی ئـەوە هـاتبوو خۆسازبدەين، هێزەكانمـان ئامادەبكەين بۆ پەلاماردانەوەی پارتی‌و ڕزگار كردنەوەی كوردستان.

# گەردەلولی تۆڵە

هـەڤاڵ مـام جـەلال‌و سـەركردايەتی‌و فەرمانـدەيی گشـتی يـەكێتی دوو كۆبوونەوەيان كرد بـۆ داڕشـتنی بەرنامەيـەكی تێـرو تەسـەل‌و هەمـەگير كـە لـە هەموو قۆڵەكانەوە ئەنجامبدرێ، ئەم كارەش ناوی ( گەردەلوولی تۆڵـەی ) لێنـرا. ديارە لەمەدا يەكێتی خۆی بە تەنيا نـەبوو بـەڵكو زەحمەتكێشـان، سۆسياليسـت، پارتی پارێزگاران، ديموكراسيخوازان ئامادەبوون لەم كاردا.

بەرنامەكە هەڤاڵ مـام جـەلال سەرپەرشـتی ئـەكردو نەخشـەكەش بـەم شێوەيە بوو:

قۆڵـــەكان:

- چۆمان ـ ماوەت ـ سلێمانی / كاك كۆسرەت سەر پەرشتی ئەكرد
- پێنجوێن ـ شارەزوور ـ هەڵەبجە/ كاك فەرەيدون سەرپەرشتی ئەكرد
- بەمۆ ـ دەربەنديخان ـ سلێمانی / كاك جەبار سەرپەرشتی ئەكرد
- مەرگە ـ سووورداش ـ دووكان / كاك مستەفا سەيد قادر سەر پەرشتی ئەكرد
- بناری قەنديل ـ قەڵادزە ـ ڕانيە / ليوا خەليل دۆسكی سەرپەرشتی ئەكرد

ديارە هەر قۆڵێك كۆمەڵێك هەڤاڵ هاوكاری ئەكرد جگە لەوەی كە لـە قۆڵـەكانی سەرەوە حيزب‌و لايەنەكان بەشدارييان كردووە.

ئێمە قۆڵی پێنجوێن - شارەزوور - هەڵەبجە بووین، کە هەڤالان شەوکەتی حاجی مشیرو شۆڕش ئیسماعیلو مام ڕۆستەمو مەحمود سەنگاویو شێخ حسینە سوورو جەمیل هەورامی هاوکاری کاك فەریدون بووین.

ئەم قۆڵە بریتی بوو لە چەند ڕەتلێك:

- ڕەتلی یەکەم: لە سەیرانبەنەوە بۆ پێنجوێن: کاك فەرەیدون + شۆڕش + مام ڕۆستەم + سەید جەوهەر +مامۆستا شاهۆ بوون
- ڕەتلی دووەم دوو بەش بوو:

- بەشێکی بۆ باشماخ - بناری پێنجوێن: کاك شەوکەت + مەحمود سەنگاوی + شێخ حسینە سوور

- بەشەکەی تری لە باشماخ - دۆڵی توتمان: کاك جەمیل هەورامی بوو

هێزەکانی ئەم قۆڵە پێك هاتبوون لە:

١. لەشکری شارەزوور

٢. لە شکری پێنجوین

٣. لەشکری حەمرین

٤. کۆمیتەکانی پێنجوێن + هەڵەبجە + هێزیکی کۆمیتەکانی مەڵبەندی شارەزوور + ئاسایشی سلێمانی.

ڕۆژی ٩/١٠/ کۆبونەوەمان کردو خۆمان سازو ئامادەکرد بۆ دەستبەکاربوون لە سنووری خۆمانەوە، هەموو هێزەکانمانووریا کردەوە، چەكو تەقەمەنیو پێویستییەکانی شەڕمان بە سەردا دابەشکردن، ئەرکەکانمان پێووتن. ئەوەی بەدی ئەکرا لە ڕەنگو ڕووی پێشمەرگەو فەرماندەکاندا ئەو پەرۆشی گەڕانەوەیە بوو بۆ ناو خاکی کوردستانو تۆڵە سەندنەوە بوو لەو خۆفرۆشانەی دەستیان نایە ناو دەستی ڕژێمی ئەنفالیستەوە، لەشکرەکەیان پەلکێش کرد بۆ داگیرکردنی هەولێرو پەرلەمان.

چل ڕۆژی نەخایاند.. یەکێتی بە تەوژمێکی توندەوە لە ڕۆژی ١٠/١١/ ١٩٩٦ لە هەموو قۆڵەکانەوە بەرنامەی گەردەلوولی تۆڵەی دەستپێکرد، ئێمە لە

قۆڵی خۆمانەوە کاتژمێر ٣ ی بەیانی پەلاماری دۆڵی شلێرو پێنجوێنمان داو بە یەك گورِ تا کانیمانگامان پاککردەوە. پارتی خۆیان ڕانەگرتو بەرەو شارەزوور ڕایانکرد.

لە ڕۆژی ١٩٩٦/١٠/١٢ قۆڵی بەمۆ - دەربەندیخان - سلێمانی بە سەرپەرشتی کاك جەبارو هاوڕییەتی هەڤاڵ کوردۆ قاسمو شێخ جەعفەرو مامۆستا محسنو عەدنانی حەمەی میناو ئاواتی شێخ جەنابو نازم کەرکوکیو مەحمودی مامە عەزدو سدیقی سۆفی مەجیدو مەلا ئەحمەدی دسکەرەو مامۆستا جەلالی ئاسایشو عادل نادرو حەمە قاشتیو سدیقی عەلی تۆفیقو حاجی فایەق بەرنامەی کاری خۆیان دەستپێکرد.

هێزەکانی ئەم قۆڵەش بریتی بوو لە:

- لەشکرەکانی گەرمیانو خانەقینو پێشمەرگەکانی کۆمیتەکانی مەڵبەندی ١١ گەرمیان، ئەم قۆڵەش کرابووە دوو ڕەتڵەوە:

- ڕەتڵێك بۆ بێلولە: بە سەر پەرشتی حەمە پاریاوڵە.

- ڕەتڵێك بۆ ملەی سەرتەك: بە سەرپەرشتی مەحمودی مامە عەزە پاشان عەدنانی حەمەی مینا.

- ڕەتڵێك بۆ دەربەندی سەرتەك: بە سەرپرشتی حاجی فایەقو سدیقی عەلی تۆفیق.

- ڕەتڵێك بۆ شاخی زمناکۆ - بەربەستی دەربەندیخان: بە سەرپەرشتی مامۆستا جەلالی ئاسایشو مەلا ئەحمەدی دسکەرەوحەمە قاشتی.

- ڕەتڵی پشتە: بە سەرپەرشتی مامۆستا محسنو برادەرانی مەڵبەندو کۆمیتەکان.

- ڕەتڵێکی تر لە دۆڵی قەرەداخەوە بۆ ناو دەربەندیخان کە بریتی بوو لە ئەنوەر دۆلانیو م. عەلی پەرلەمانو سەرکەوت سێوسێنانی.

لەم قۆڵەشەوە پارتی بەرگەیان نەگرت، لە ملەی سەرتەك کوژراوی زۆریان دا، ئێمەش فەرماندەیەکی ئازاو بلیمەتو چاو نەترسمان شەهید بوو

ئەویش کاك مەحمودی مامە عەزە بوو کە زۆر داخ لە دڵ بوو بەرامبەر بە گردەی ٣١ی ئاب. مەخابن لەگەڵ یەکەم گوللە ئارپیجیدا بەرامبەر بە هێزەکانی پارتی بە گوللەیەکی ڕەشی دەستی ڕەشی ئەو دەروون ڕەشانەی پەلکێشکەری داگیر کەر شەهید ئەکرێو ئەمەش ئەبێتە مایەی ئەوەی کە هێزەکانمان زۆر بە توندی لە چەکدارەکانی پارتی بێنە دەستو لە چاو تروکانێکدا لە هەموو شوێنەکان هەڵیان بکەنو ترسنۆکانە لەوێ ڕابکەنە خوارەوە بەشێکیان بەرەو کەلارو دەربەندیخان. لە ناو دەربەندیخانیشدا خۆیان پێ ڕانەگیرا کاتێ کە لە دۆڵی قەرەداخەوە لێیاندرا، هەر ئەوەندەیان پێکرا بە پەلە بە ئۆتۆمبێلەکانیان بە تونێلەکەدا بەرەو شارەزوورو سلێمانی بڕۆن. ئەم هێزە ڕۆڵی سەرەکی بینی لە ڕاونانی هێزەکانی پارتیو شکانیانو گرتنی ڕێگەی دەربازبوونو زەمینە خۆشکردن بۆ پێشڕەوی کردنی قۆڵەکانی تر.

لە قۆڵەکانی چۆمان - ماوەت - سلێمانیشەوە بە فەرماندەیی کاك کۆسرەتو هەڤاڵان ملازم عومەرو سالار عەزیزو مستەفا چاوڕەشو مەلا بەختیارو عیماد ئەحمەدو عوسمانی حاجی مەحمودو مامۆستا جەمالو چەندین هەڤاڵی تریش، هێزەکانی ئەم قۆڵەش بریتی بوون لە:

لەشکرەکانی سنووری هەولێرو باڵەكو ڕەواندزو کەرکوكو بابەگوڕگوڕ، ئەم قۆڵە بوون بە دوو ڕەتڵەوە:

- ڕەتڵی چۆمان - کەناروێ - چوارتا - قەڵاچوالان
- ڕەتڵی چۆمان - ماوەت - قەڵاچوالان.

بە یەکگرتنەوەی هەردوو ڕەتڵەکە لە قەڵاچوالان بەرەو سلێمانی پێشڕەوییان کرد. لەم قۆڵەشەوە هێزەکانی پارتی بە خراپی شکانو نەیانتوانی لە بەرامبەر پەلاماری پێشمەرگەی یەکێتیدا خۆیان ڕابگرن، هەرچەندە مەسعود بارزانی خۆی لە سلێمانی بوو، بە سەرپەرشتی خۆی ٣ هێرشی یەك لە دوای یەکیان کردەوە بەڵام سوودی نەبوو، کە لە دەربەندیخانو شارەزوورەوە یەکێتی هاتن، ئیتر کەوتنە خۆیانو لە دیوی قەڵاچوالانەوە بەرەو

ئەزمەڕوسلێمانی ڕایانکرد، لە ڕێگەشدا تووشی بۆسەیەکی هێزی قۆڵی پێنجوین بوون‌و شپرزەیان کردن‌وویان لێهات لە سلێمانیش نەمێننەوەو مەسعود بەرزانیش ئەوێ بەجێ بهێڵێ‌و بەرەو هەولێر بگەرێتەوە. بەشێکی هێزەکانیش بەرەو دۆڵی دووکان‌و بەشێکی تریش بەرەو چەمچەماڵ بڕۆن. ئەم چەکدارانەو ئەوانەی ناو کەلارو کفریش لە حەیبەتدا خۆیان کردە ناو ڕژێمداو لەوێشەوە لە پاڵ نەفرەتی خەڵکی کوردستاندا ڕەوانەی هەولێر کرانەوە. بە تایبەتی لە کەرکوکدا ئاپۆڕەی خەڵکی پارتییەکانیان دایە بەر تەماتەو توێکڵە شووتی.

بەم جۆرە هێزەکانی هەردوو قۆڵی سلێمانی‌و گەرمیان یەکیان گرتەوەو قۆڵەکەی پێنجوێنیش لە شارەزوورەوە هاتنەوە سلێمانی.

بڕیار بوو هێزەکانی شارەزوورو گەرمیان بەرەو دووکان بچن، هەموومان لە خواری سلێمانی کۆ بووینەوە، بەڵام دواتر بەرەو شارەزوور گەڕێنراینەوەو چووینە ناو هەڵەبجەوە. لە قۆڵی مەرگە ـ سووورداشەوە کە کاك مستەفای سەید قادر سەرپەرشتی ئەکرد لە گەڵ هەڤاڵان تۆفیق کانی‌وەتمانی‌و غەریب سەعیدو مامۆستا مەهدی‌و باپیر حاجی خدر، هێزەکانیان بریتی بوو لە لەشکری بتوێن، لەشکری پشدەر، لەشکری داستان، هێزی شیلانەییەکان‌و مەڵبەندی ڕاپەڕین بە هەموو کۆمیتەکانییەوە.

لە ماوەیەکی کەمدا ناوچەکانی بنگردو مەرگەو سووورداش پاککرانەوەو پارتی هەر ڕایان ئەکرد تا خۆیانگەیاندە ئەوبەری پردەکەی دووکان، لەو بەرزاییانە خۆیان گرتەوە، چەند هێرشی یەك لە دوای یەکیان هێنا، بەڵام پێشمەرگەی یەکێتی ڕوو بە ڕوویان بوونەوە، نەیانهێشت پێشڕەوی بکەن، لە کاتێکدا بەشێکی هێزەکانی گەرمیان‌و شارەزوورو سلێمانی گەیشتنە ئەو ناوە دوای ئەوەی بەشێکی هێزێکی ڕێکخستنەکان‌و ئیدارییەکان چوونەوە بۆ ڕاپەڕاندنی کارو بارەکانی خۆیان‌و سەرپەرشتی ئەرك‌و فرمانەکان‌و بەڕێوە بردنی دامودەزگاکان‌و چەسپاندنی ئاسایش‌و ئاسوودەیی.

لەولاشەوە هێزەکانی بناری قەندیلو قەڵادزێ بە سەرپەرشتی لیوا خەلیل دۆسکی لە کێلێوە لەگەڵ برادەرانی سۆسیالیستو زەحمەتکێشاندا دابەزینو ئەو ناوچانەیان پاکسازی کردو لە پێشڕەویدا بوون بە جۆرێك پارتییەکان نەیانتوانی بەرگری بکەن، بگرە جەماوەری ناوچەکەش لێیان ڕاپەڕینو بە توندی دوایان کەوتنو لەگەڵ پێشمەرگەکاندا بەشێکیان بەرەو دۆڵی شەهیدان -وەرتێ بە دوایانەوە بوون، بەشێکی تریش بەرەو دۆڵی بالیسانو ئۆردووگاکانی ئەو ناوچەیە ڕاویاننان.

ڕۆژی ١٩٩٦/١٠/١٩ هێزەکانی پارتی لە کەڵکە سماقەوە کاتیۆشاباران کران، ئەمە خۆئامادەکردن بوو بۆ پەلاماردانیان، من لێرە دانرام بۆ سەرپەرشتی بەرەی چەمچەماڵ ـ گۆپتەپە.

ڕۆژی ١٩٩٦/١٠/٢٠ پارتیویستیان لە خوارەوە بە هێزێکەوە دزە بکەنو لە پشتەوە بدەن لە هێزەکانی یەکێتیو بەرەیەکی تر بۆ شەڕ بکەنەوە، یەکێتی بشڵەژێنن، بۆیە لە تەقتەقەوە هاتن بۆ ئاغجەلەر، لە دێی داڵەوا هاتنە سەر چەند پێشمەرگەیەکمانو پاش چەند شەڕێکی کورت پێشمەرگەکانمان شکانو دوو شەهیدیان دابوو، لەو کاتەدا من چووبوومەوە بۆ سلێمانی کە گەڕامەوە لە دەربەندی بازیان هێزەکەی خۆمانم بینی شکابوون، کۆمیتەی چەمچەماڵو هێزەکانی تری ناو چەمچەمال کە بریتی بوون لە برادەران حەمە تەپە دێیو کاك عومەر ئەسعەدو عادل نادرو شێرکۆی فاتیح شوانیو فاتیح شوانی خۆیو مام حەمیدی گومرگو سیروان دێرەشەییومستە فا چالاوی . هەمویان لە دەربەندی بازیان کۆ بووبوونەوە. منیش لە کاتی گەڕانەوەم لە مەڵبەندی سلێمانی کاك عومەر فەتاح پێیووتم: هێزەکانی لای دووکانوەزعیان خراپە، با هێزەکانی لای ئێوە بێتە تاسلوجە لەوێ بەرەیەکی پتەو درووست بکرێ بۆ پاراستنی سلێمانی.

بۆیە ئەو هێزەم هێنایە تاسلوجەو برووسکەم بۆ کاك کۆسرەت کرد کە هێزەکەمان لە تاسلوجەیە، کە چی داوای لێکردم کە بە پەلە بگەڕێمەوە

دەربەندی بازیان. کە گەیشتینە سەر ملەی تاسلوجە ئاگاداریان کردین کەوا پارتی گەیشتنە ناو بازیان، لەو کاتەدا حەمە سوور دووشیوانیو ئەنوەر دۆڵانیو دێو حەسەنو کۆمەڵێك برادەری تریش پەیدا بوونو کاك حمە دووشیوانیووتی : ئەمڕۆ ڕۆژی تەنگانەیەو ئێوە چی بڕیار ئەدەن ئێمە ئامادەین، منیش پێمووتن.. فەرموون با بچینە بازیانو لێیان بدەین.. بە پەلە هێزێکمان سازکردو هەموومان چووین. لە بازیان لە دێی بیبیجەك بە یەکدا تەقینەوەو ئەوەندە ترسنۆك بوون هەر نەیانتوانی شوێن پێیەك بۆ خۆیان بکەنەوە، بە هەڵەداوان ڕایان کردو گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێی هاتبوون، لەم شەڕەدا پێشمەرگەیەکمان کە خزمی خۆم بوو بەناوی قادر حاجی عەبدولکەریم برای شەهید یاسین لێخوڕەیی شەهید بوو، دەستبەجێ تەرمەکەیم بە پێشمەرگەیەکی دەستەکەمدا بە ناوی حەمە چاوشین کە پارتیزان بوو لەگەڵمدا ناردەوە بۆ ماڵی خۆیان لە ئۆردووگای سمود، بەڵام لە زاڵگەی سلێمانی ـ قەرەداخ کەوتنە بۆسەی هەندێ خەڵکی سەر بە پارتیو تەقەیان لێکردنو حەمە چاوشینیان شەهید کرد. دواتر لە تۆڵەی ئەم ڕووداوەدا چوومە سەریانو هەندێ ئیجرائاتی توندم بەرامبەریان کرد. کە لە نزیك بیبجەك بووین ئۆتۆمبیلێك لە سلێمانییەوە هاتو پێشمەرگەکان پێیانووتبوو تۆ کێی..؟ شۆفێری ئۆتۆمبیلەکە ووتبووی تەحسینم، پێشمەرگەکانوایانزانی تەحسین شاوەیسە، خەریك بوو بیکوژن، هاواری کردوووتبووی: من تەحسین قادرم.. دوای ئەوە کاك فەرەیدون گەیشتە لامانو سەردانی کردینو هەندێ قسەی لە بارەی شەڕەکەوە بۆ کردینو گەڕایەوە.

هەر لەم ڕۆژەداو لە قۆڵی دووکانەوە بە پێی نەخشەیەکی ڕێكو پێك برادەران پەلاماری پارتییانداو لە ماوەیەکی کەمدا پارتییان هەڵکەندو سەنگەر بەسەنگەر دوایان کەوتن تا زاڵگەی سێ ڕێیانی بێستانە ڕاویاننان، بەم جۆرە هەم شاخی کەڵکەسماقو هەم دۆڵی خەلەکانیان لێپاك کردنەوە، کە لەڕاستیدا کوشتنی تاوانبارێکیوەکو تەحسین شاوەیس زۆر کاریگەر بوو، پشتی

چەكدارەكانی شكاندو چیتر نەیانتوانی لە بەرامبەر پێشمەرگەی یەكێتیدا بووەستن.

هێزەكانی یەكێتی لە دیوی كۆیەوە تا دێی شیواشان ڕۆیشتن، ئێمەش لە قۆڵی چەمچەماڵەوە بە ناوچەی شوانو شێخ بزێنیدا لەگەڵ كاك ڕۆستەمدا یەكمان گرتەوە. هێرشمان كردو نەوەستاین تا چووینە نزیكی پردی تەقتەق.

ڕۆژی ۱۹۹٦/۱۰/۲۳ پەلاماری ناو تەقتەقمان داو گرتمانو پارتی لێرەش ڕایانكرد لەوكاتەدا ژنێك كەخۆی نابووە قوڕ بەهاوار هاوار بەرەو لامان هات : ڕۆڵە چەكدارەكانی پارتی كەرامەتیان شكاندین ، ماڵیان دزینو تالآنیان كردین ..ئێمەش هێورمان كردەوەو دڵمان دایەوە .. ئێمەش هێزەكەمان بەرەو كۆیە ئاراستە كردو لەوێشەوە ڕووەو باوەقوبو بۆ ئێوارەكەی چووینە سماقوڵی گەلی.

قۆڵی دووكان بەباشی پارتیان ڕاوناو هێزەكانیان كردبووە چەند بەشێكەوە: بەشێكی بەرەو ڕانیەو بتوێنو بەشێكی بەرەو دۆڵی هیران.

هێزەكانی پارتی ئەمەندە فشەڵو ترسا بوون بە هیچ جۆرێك لە هیچ شوێنێك نەیانئەتوانی لە سەنگەردا خۆ ڕابگرنو لە هەموو قۆڵەكانەوە ئەشكانو پاشەكشەیان ئەكرد، دوای ئەوەی بە دەیان كوژراوو برینداریان دا، یەكێتی سەرگەرمی سەركەوتن بوو، ئەیویست لەو شەڕو پەلامارانەدا ئاسەواری شكستی ۳۱ی ئاب بسڕێتەوەو پارتی دەربپەڕێنێ، نەك بە تەنیا هەولێر بگرێتەوە بەڵكو پەلی بگاتە بادینانیش. بەڕاستیش پارتی هەر ئەشكانو ڕایان ئەكرد، شوێن كەوتنیان ئاسان بوو، دەربپەڕاندنیان قورس نەبوو بە تایبەتیش خەڵكی ڕقی لێیان ئەهاتەوە. هەر هێزێكیش لە بەرەكانی شەڕدا بشكێ بە ئاسانیخۆی پێ ناگیرێتەوە.

## هێڵی بقـە

بەڵام ئـەم دلگەرمییـە بە پێـی ئـەو نەخشەیە بە کامـی دڵ نەهاتـەوە، بەڵکو دەوڵەتانی ئیقلیمی جارێکی تـریش لـە بۆسـەدا بوون بـۆ یـەکێتی هاتنە سەر خەتو نیشانەی هێڵی بقـە یـان هـەڵکردو تـا لـەوە زیـاتر نـە جوڵێو لـەو شـوێنەدا ڕابووەسـتێ کـەپێی گەیشـتووەو مشـت لـە هـەولێرو ئـەولاتر نـەگرێ. ڕژێمـی عێـراق لـە ڕێگـەی هەنـدێ کەسـەوە ئاگـاداری سـەرکردایەتی یـەکێتی کـردەوە لـەوە زیـاتر نـەڕواتو هێرشـەکانی ڕابگـرێ ئـەگینا لێـی ئـەدرێ. ئـیتر هێزەکانی یەکێتی لە سەر ئەم هێڵانە جێگیر بوو:

- هێڵی کۆیە ـ پیرەر
- کاموسەك ـ هیران
- بالیسان ـ توتمە
- دۆڵی شەهیدان ـ وەرتێ.

بەمـەش کوردسـتان خـۆی لـە خۆیـدا بـوو بـە دوو کـانتۆنو پـارتی لـە لایەكو یەکێتی لەلایەك، بەمەش دیاردەیەکی کۆنی کوردی زیندوو کرایەوە کـە ئەم دوو کانتۆنە کاتی خۆیشی سنووری نێوان دوو ئیمارەتی سۆرانو بابان بوو.

## دانیشتنی ئەنقەرە

هەر لەم میانەدا بوو هـەوڵێکی ناوبـژیوانی لـە لایـەن ئـەمریکاوە کەوتـە کاروومەفـدی یـەکێتیو پـارتی لـە گـەڵ نوێنـەری ئـەمریکا ڕۆژی ۱۹۹٦/۱۰/۳۰ لـە ئەنقـەرە دانیشـتن بـە ئامـادەبوونی بـەرەی تورکمـانی بـۆ ڕێککـەوتن لـە سـەر بەرنامەیـەك بـۆ ئاشـتی، ڕۆژی ۱۹۹٦/۱۰/۳۱ بـە هاوکـاری ئـەمریکاو بـەریتانیاو تورکیا، هەردوو لا لە ئەنقـەرە ڕێککـەوتنێکی ۲۲ مادەییـان مـۆر کـرد. هـەردوولا بەتەواوی پێی قایل بوون. بەڵام ڕۆژی دواتـر پـارتی لـە مەسـیفەوە ١٦ مادەیـان

ڕەتکردەوەو تەنیا ٦ مادەیان پێ قبوڵ بوو ئەمەش جۆرە دڵ ساردکردنەوەیەکی خستەوەو دۆخەکەی تەماویکرد، دیارە پارتی شێوازێکی فێڵاوی بۆ گفتوگۆ ئەگرتە بەر، کاتێك کە شتێك لە سەریان بکەوێ، خەڵکی لاوازی بێ بڕیار بە دەست بۆ کۆبوونەوەکان ئەنێرن تاکو نەتوانێ بێ ناوەند هیچ شتێکی یەکلاکەرەوە بڵێ، کە شتێکیشی ووت زۆر گوێی پێنادەن و بەهەندێ وەرناگرن. پارتی ئەم یاریەی ئەکرد تاکو واخۆی نیشان بدات کە نووزەی تیاماوە، ئەوەی لە بەرەکانی شەڕدا پێی نەئەکرا لە گفتوگۆدا کۆسپ ئەخاتەوە. گرژیو ئاڵۆزی ئەنێتەوە، تاکو وا هەست بکرێ ئامادەیە بۆ هەر گێمێکی تری شەڕ، یان لایەنی بەرامبەر ناچار بکات بۆ مەرجەکانی خۆی.

## هاوپەیمانی دیموکراسی

لە ئەنجامی ئەو ڕێککەوتنەی نێوان پارتیو ڕژێمی بەعسو هەڵکەنرانی هەموو حیزبەکان لە هەولێرو لێدانیان لەلایەن ڕژێمیشەوە، جۆرە ڕیز بەندییەك دروستبوو دژ بە پارتیو دۆستایەتی لەگەڵ یەکێتیدا. ئەمە هەربەقسەکردنو ڕاگەیاندنی ڕۆژنامەنوسی نەبوو لەبۆنەو مەراسیمەکاندا، بەڵکو لەکرداردا بەرجەستە بوو، هەموو حیزبەکانی: زەحمەتکێشان، سۆسیالیست، پارێزگاران، دیموکراسیخوازان، زەمینەی هاوپەیمانێتی یان بۆ ڕەخسا لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی کوردستان تاکو بۆ هەرئەگەرێکی خراپ بێنە پێشەوەو ئامادەییان تێدابێت.

ئەم هەڵوێستەیان لە ڕۆژی ١٩٩٦/١٢/٦ لە کۆبونەوەیەکدا خۆی دەرخست کە بڕیاریان دا لەژێر چەتری هاوپەیمانی دیموکراسی کوردستاندا خۆیان ڕابگەیەنن.

دیارە ئەمەش کاریگەرێتی سیاسیو جەماوەری خۆی لە ئاستی ناوەو دەرەوەش هەیە. بەم کارەش پارتی ئەکەوێتە پەراوێزەوەو ئەم کۆمەڵە حیزبو

لایەنانە کە دژی ئەوەستن ئەکاتە بێهێزی ئەو خەڵکێکی زۆر لایەنگرو دۆستانی ئەم حیزبانە لە کوردستاندا بە گشتیو لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی پارتیدا لە دەرەوەیویستی پارتیدا ئەبن لە هەر هەڵوێستو کارێکدا، با پارتی بە ئاشکراو بە نهێنیش لە ڕوویاندا بووەستێو گرفتیان بۆ بخوڵقێنێ کە ئەم دۆخە هاتە ئاراوەو ئەم سنوور بەندییە ناچارییە کراو بە پێویست زانرا.

# ساڵی ١٩٩٧

هەوارمان گواستەوە ئاستانەی ساڵێکی نوێ، هەرچەندە شەڕ نەبوو، بەرەکان کپ بوون، دەنگی تەقەو زرمەی گوللە تۆپ دڵی ڕانەئەتەکاند، بەڵام ئەو کپییە ئاشتی تیا دەرنەکەوت. هەمیشە لەو کپیو بێدەنگییە سڵمان ئەکردەوە، هەلومەرجەکەشوا‌ینیشان ئەدا کە ئەگەری شەڕ هەیە، هەردوولا دڵنیا نەبوون لە هەنگاو نان بەرەو ئاشتی، یان نیشانەکانی شەڕ لای هەردوولا لە ئاسۆوە سەریان دەرنەهێنا. بەڵام نەئەزانرا کەی جارێکی تر ئەو شەڕە ئاگر بەر ئەداتەوە لە ماڵەوێرانەکانی کورد.

لە سەرەتای ئەم ساڵەدا ڕۆژانی ١/٤و ١/١١ ی ١٩٩٧ هەڤاڵانی فەرماندەیی گشتی لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلالدا کۆبوونەوەمان کرد، لەو کاتانەدا بوو کە هەڤاڵان مام جەلالو ملازم عومەر لە سەر سەفەر بوون بۆووڵاتانی تورکیاو عەرەبستانی سعودی، هەڤاڵ مام جەلال بە تەما نەبوو بچێ بەڵام بە هۆی گۆڕانکارییە تازەکانی دنیاوە، مەکتەبی سیاسی داوایان کرد کە ئەو سەفەرە بکات بە تایبەتی نەجمەدین ئەربەکان سەرۆکی حیزبی ڕەفای تورکی کە ڕێکخستنێکی ئیسلامییە لەوێنەی یەکگرتووی ئیسلامی لە کوردستاندا، داوای چاوپێکەوتنی هەڤاڵ مام جەلالی کردبوو.

## پەیوەندی سعودیە ـ کورد

هەروەها عەرەبستانی سعودیش داوای چاوپێکەوتنی نوێنەری یەکێتی بە تایبەتی هەڤاڵ مام جەلالی کردبوو، کە بە حیسابی خۆیان سیاسەتی تازەیان بەرامبەر عێراق گرتووەتەبەر. عەرەبی سعودی لە شەڕی کەنداوی یەکەمدا هاوبەشێکی دڵگەرمی عێراق بوو لە شەڕدا بەرامبەر بە ئێران کە عەرەبی سعودیو وڵاتێکی سوونە مەزهەبو وەهابییەو پشتیوانی کردنیشی لە عێراق لە دوو ڕوانگەوە بووە:

- لە ڕوانگەی عەربچێتییەوە دژی ئێران بوو، لە چاوتێبڕینی بۆ زاڵبوون بە سەر کەنداودا بە تایبەتی دەست بە سەراگرتنی ۲ دوورگەکە.
- لە ڕوانگەی مەزهەبیەوە کە ئێران شیعەیەو مەترسی بەرپا ئەکاتو ئەو کەمەکە شیعەیەی کە لە سعودیەو کەنداویشدا ڕائەچنێ.

بەلام لە شەڕی کەنداوی دووەمدا لە سەر گرتنی کوێت ناکۆکی ئەکەوێتە نێوان عێراقو سعودی یە، چونکە پێیوابوو جگە لەوەی عێراق مافی دەوڵەتێکی سەربەخۆی خاوەن ئاڵا پێشێل ئەکات، نیازی بەرامبەر بەویش خراپەو لە ئاییندەدا قرم لەویش خۆش ئەکات. بۆیە سعودیە کەوتە بەرەی دژ بە عێراقو پشتیوانی لە ئەمریکاو هاوپەیمانان کردو لە شەڕیشدا ڕۆڵێکی گرنکی بینی چ بە بەشداری هێزەکانی خۆی لە شەڕەکەداو چ بە یارمەتیدانی هێزی هاوپەیمانەکان. کە عێراق لە کوێت تێکشکاو هەموو ئەو هێزانەی بە دیل گیران برانە ناو خاکی سعودیەو دواتر بەرەو ئەمریکا.

لە مەڕ پەیوەندی کورد ـ سعودیەش، ئەووولاتە قەت ئامادە نەبووە دۆستایەتی کورد بکات، گەرچی لە هەندێ جاریشدا سەرکردەکانی کورد سەردانی ئەوێیان کردووەو لە بارەی کوردیشەوە قسەیان کردووە. بۆیە هەر جۆرە قسە کردنێك قازانجی بۆ ئاییندەی پەیوەندی کورد ـ عەرەب هەیەو ئەبێ

دبلۆماسیەتی کوردی کاری جیدی خۆی لەو بوارەدا بکات، هەر هیچ نەبێ تەکانێك بە هەڵوێستی سعودیە بدات بۆ دۆستایەتی کردن و ڕوونکردنەوەی باری سیاسی کوردو لە قاودانی مومارەسە نامرۆڤایەتیەکانی ڕژێمی بەعس بەرامبەر بە کورد، بە تایبەت کە سعودیە لە ناووولاتە عەرەبییەکاندا قورسایی و سەنگی تایبەتی خۆی هەیە.

هەر لەم کاتانەداوەفدی یەکێتی لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکادا دانیشت و ئەمریکاییەکان بە ڕاشکاوی سیاسەتی خۆیان بەرامبەر بە عێراق دەربڕیوە کە توند بوون و کوردیان دڵنیا کردۆتەوە ئەمریکاواز لە کورد ناهێنێ، گەرچی لە ٣١ ی ئابیشدا چاوی لە ئاست پەلامارەکانی ڕژێم بۆ سەر یەکێتی لە هەولێردا پۆشی ئەگەر خۆی ئاماژەیەکیشی پێ نەدابێ..!

بڕیاردرا لەم سەفەرەی هەڤاڵ مام جەلال دا بۆ دەرەوە کاك کۆسرەت ببێتە قائیدی عام تا کاتی گەڕانەوەی هەڤاڵ مام جەلال.

## دیسانەوە کۆبوونەوەی ئەنقەرە

هەروەها دوانیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٩٧/١/١٥ لە ئەنقەرە کۆبوونەوەی نێوان یەکێتی و پارتی کراو بڕیار لەسەر ئەم خاڵانەدرا:

١. دەستنیشانکردنی هێزی چاودێرەکان بۆ چاودێری خاڵەکانی تەماسی نێوان یەکێتی و پارتی کەلە برایانی تورکمان و ئاشوری پێکهاتووە.
٢. ئەبێت کێشەی دیلەکان لە بنەڕەتەوە چارەسەر بکرێت.
٣. هەموو گیروگرفتی ئاوارەکان چارەسەر بکرێت.
٤. ئەبێت شەڕی ڕاگەیاندن ڕابگیرێت.

هەروەها کۆمیتەیەکی سیاسی پێکهات لە ٣ کەس لە یەکێتی و ٣ کەس لە پارتی ٣ کەس لە تورکمان و هەموو مانگێك جارێ کۆ ببنەوە بۆجێبەجێکردنی ڕێککەوتنەکان. شایانی باسکردنە کەوا ڕۆبەرت بلیترۆ جێگری وەزیری دەرەوەی

ئەمریکا سەرپەرشتی کۆبونەوەکانی ئەکرد، بە ئامادە بوونی نوێنـەرانی سیاسـی بەریتانیاو تورکیاو نوێنەرانی جەبهەی تورکمانی.

لەلایەن یەکێتییەوە هەڤالان: حەمە تۆفیـق ڕەحـیم‌و عـەدنان مـوفتی‌و شازاد سائیب‌و لەلایەن پارتیشەوە: سامی عەبـدولڕەحمان‌و عیـزەدین بـەرواری‌و پیرۆت ئەحمەدو سەفین دزەیی‌و ئازاد میران بەشدار بوون.

پلـــیترۆ جێگری‌وەزیـــری دەرەوەی ئـــەمریکا لـــەبارەی ئـــەم کۆبونەوەووتبوی: ئەنجامەکانی باش بووەو کێشەیان لەسـەر داهـاتی گـومرگی ئیـبراهیم خەلیلـە هـەروەها ڕادیـۆی لەنـدەنیش لـە زمـانی جێگری‌وەزیـری دەرەوەی بەریتانیاوە،وتوویەتی زۆربەی شتەکانیان دوبارە بوونەوەیە.

لەو سـەروبەندەی کـە هـەڤاڵ مـام جـەلال گەیشـتبووە تورکیـا ڕۆژی ١/١٦ لەلایـەن تانسـۆ چیلەری‌وەزیری دەرەوەی تورکیـاوە داوایـەك خرابـووە بـەردەم هـەڤاڵ مـام جـەلال کـە ڕێگـە نـەدرێ هێزەکـانی پەکەکـە لـەخاکی هـەرێمی کوردستانەوە پەلاماری تورکیا بدرێ.

ئەم داوایە شێوەیەك لەکوێخایەتی بەرامبەر کوردو هەرێمی کوردسـتانی تێدایە، جگە لەمە بۆ ئەبێ تورکیا سنوورەکانی خۆی نەپارێزێ لە ئەگەری هەر پەلامارێك لـە لایـەن پەکەکەوە بۆسـەری، بـۆ داوا لـە ئێمـە بکـرێ کـە نـەهێلین پەکەکە پـەلامار بـدات. ئەمـە ڕاستەوخۆ تۆمـەتبار کردنـی یـەکێتی تێدایـە بـۆ هاوکاری‌ودۆسـتایەتی کردنـی پەکەکـە. کـە لەوانەیـە پەکەکـە زۆرخۆیـان بـەڕای حیزبـەکانی باشـورەوە نەبەسـتنەوەو زۆریـش گـوێ نەدەنـە هەلومـەرجی کوردستان‌و بوونی ئەوان لە سەر سنووردا.

# دامەزراندنەوەی حکومەت

دوای ئـەوەی هاوپـەیمانی دیموکراسـی کوردسـتان دامـەزراو دۆخێکـی نـوێو سنووربەندییەکی ناچاری خۆی سەپاند بـە پێویست زانـرا لـەم قۆڵـەی یەکێتییـەوە کاروباری حکومـەتی هـەرێم‌وەکو درێژەپێـدانی شـەرعیەت دەسـت بەکار بێتەوە بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکان، بـەو بۆنـەیـەوە ڕۆژی ۱۹۹۷/۱/۲٦ لەبـەر ڕۆشنایی یاسای ژمارە(۲) ی ساڵی ۱۹۹۲، بڕیاردرا بۆشاییەکانی کابینـەی دووەم لەوەزارەتەکان بە سەرۆکایەتی کاك کۆسرەت پڕ بکرێتەوە کە بەم شێوەیە بوو:

- د. کەمال فوئاد — جێگری سەرەك‌وەزیران
- جەبار فەرمان — وەزیری پێشمەرگە
- عومەر عەبدوڵڵا — وەزیری ناوخۆ
- ئەرسەلان بایز — وەزیری پەروەردە
- محەممەد ئەحمەد شاکەلی — وەزیری ئەوقاف
- قادر جەباری — وەزیری پێشەسازی/ سۆسیالیست
- سالار عەزیز — وەزیری کشتوکاڵ
- سەعدی ئەحمەد پیرە — وەزیری تەندرووستی
- نەجم سوورچی — وەزیری ئەشغاڵ / پارێزگاران
- بەهمەن حسین — وەزیری ئاوەدانکردنەوە/ زەحمەتکێشان
- عەبدولڕەحمان نەوڕەسی — وەزیری داد / بزووتنەوە

یەکـەمین کۆبوونـەوەی ئەنجومـەنی‌وەزیران لـە ڕۆژی ۱۹۹۷/۱/۲۹ لـە سلێمانی ئەنجامـدرا، لـەم حکومەتـەدا حیزبـەکانی زەحمەتکێشان، سۆسیالیست، پارێزگاران، بزووتنەوە، بەشدارییان کرد. حیزبی شیوعی ئامادە نەبوو هاوکاری بکەن‌و ئەوان لە حکومەتەکەی هەولێردا مانەوە. پارتیش لای خۆیەوە کابینـەی سێیەمی بـە سـەرۆکایەتی دکتـۆر ڕۆژ نـوری شـاوەیس ڕاگەیانـد. ئـەوە دەزانـرێ

پاش ماوەیەك لەم كابینەیەدا گۆڕانكاریەك كراو محەمەد مەلا عومەر عەبدولعەزیز لەسەر میلاكی بزووتنەوە كرا بەوەزیری ئەوقافو محەمەد ئەحمەد شاكەلی بەوەزیری هەرێمو لەهەمان كاتیشدا لێپرسراوێتی مەڵبەندی ڕێكخستنی كەركوكیشی پێ سپێردرا .

ئێمە ئەوسا بە سیاسەتی ٥٠ بە ٥٠ لە یەك حكومەتدا بێزارو قەڵس بووین، كەچی یەكێك لە دەرهاوێشتەكانی شەڕی ناوخۆ ئەوەشی تێپەڕاندبووو گەیشتە قۆناغی دابەشبوونی ئیدارەی كوردیو حكومەتەكەی كرد بە دوو كانتۆنەوە، كانتۆنی سلێمانیو كانتۆنی هەولێر. گەردەلولی تۆڵەی یەكەم تەواو بوو ڕێككەوتنی ئەنقەرە بووە هۆی ڕاگرتنی شەڕو ئاگربڕ لە بەرەكانی شەڕدا بەڵام ئیتر هەنگاو نەنرا بۆ جێبەجێكردنی بڕیارەكانی خودی ئەو ڕێككەوتنە. ئاگر بڕ هەمیشە شرینقەیەكی كاتییە، هەردوو لای شەڕ ئەیانەوێ هەندێ ماندوێتی شەڕ لە جەستەیان دەربكەنو پشوویەك بدەنو بە باشتر خۆیان ساز بدەنەوە چ لە ڕووی دەروونیو ئامادەبوونی چەكدارەكانەوە چ لە ڕووی پەیدا كردنی كەرەستەی نوێی جەنگو داڕشتنەوەی نەخشەو پلانی تازە بۆ سەر لە نوێ تێهەڵچوونەوە لە قۆناغێكی تردا.

## دەرەنجامەكانی ٣١ / ئاب

دیارە شەڕ هەمیشە ماڵوێرانیو كارەساتە، چەندە هۆكاری جیاجیا هەبێ بۆ بەر پاكردنی ئەوەندەش دەرەنجامی لێئەكەوێتەوە، گەرچی هەندێ هۆكار پەنامەكییە، هەندێكیشیان ئاشكرایە، بەڵام دواتر زۆر شت ڕوون ئەبێتەوەو لایەنە نهێنییەكانی دەرئەكەون. ئەوەی لە ئۆپەراسیۆنی ٣١/ ئابی پارتی - ڕژێم بۆ سەر كوردستان دەركەوت ئەوەیە:

- بێدەنگی ئەمریكا لە ئاست پەلاماری ڕژێمی عێراقو هاوكاری كردنی پارتی بۆ گرتنەوەی هەولێر، ئەمریكا بێ ئاگا نەبوو لەو كارە.

- چاوەڕوانی بێهودەی یەکێتی بۆ بەدیهاتنی بەڵێنەکانی ئەمریکا لە ڕێگە نەدان بە هەر جموجوولێکی ڕژێم.

- عێراق بۆ شێواندنی ڕووی دەسەڵاتی کوردی زۆر بە پەلە بە دەم داواکەی پارتییەوە چوو، بۆ ئەوەی‌وا لە خەڵکی بگەیەنن کە بێ ڕژێم‌و بەعس کورد بۆی ناکرێ دەسەڵاتی هەبێ.

- هێزەکانی یەکێتی لە بەرامبەر هێزە فشۆڵەکانی پارتیدا خۆیان ڕانەگرت، تەنیا هەر ئەوەندەی کە هێزی ڕژێمی لەگەڵدایە، ئیتر ترس باڵی ئەکێشا بە سەر دڵ‌و دەروونی هەموو خەڵکەکەدا،واتە ترسی ئەنفالێکی تریان لێئەنیشت، بەڵام نووزەی بەرگری بە ئاستەم هەبوو.

- لە ماوەی گرتنەوەی هەولێرو پەلاماردانی سنووری سلێمانی‌و گەرمیاندا چەند ڕۆژێك هەبوو، نەتوانرا قایمکاری بکرێ، ڕێ‌و شوێنی بەرگری نەگیرایە بەر، هەر هیچ نەبێ ڕوو بکرێتە شاخ‌و دێهات‌و ناوچە سەختەکان، جگە لەوە هێزی یەدەك نەمابوو ڕێگە لە پەلامارەکانی پارتی بگرێ.

- هەموو هێزو ڕێکخستن‌و خەڵکەکەی کە لە خۆیان ئەترسان‌و ڕوویان کردە سەر سنوورو لەوێش نەئەمانەوە بە زۆر خۆیان ئەکرد بە ناو ئێراندا. ئەو خاکی نیشتمان بەجێهێشتن‌و سنوور بڕینە بووە دابێکی خراپ،وای لێهاتووە بووینەتە میللەتێکی چاوشکاو.

٣١/ ئاب هەر دەرهاویشتەیەکی هەبێ، هەرچی لە سەر بووترێ، بە هەر پێودانگێك پێوانە بکرێ، تاوانێکە لێخۆش بوونی نییە، بەڵام ئەگەر پێ بنێینە دەروازەی کارکردن بۆ ئاشتی‌و بە هیچ جۆرێك لە زاکیرەماندا ڕەنگی نامێنێ، کە چی لە ڕاستیدا کەسێتی کوردی تێکشکاند، دوای ئەوەی کە دوژمنان بە هەموو جۆرێك لە سەر لاشەی یاری جۆراو جۆریان کردووە، کەچی خۆشمان بووینە هاوکاری داتەپینی.

من دژی ئاشتی نیم، پێم خۆشە شەڕ نەمێنێ، کەشەڕ لە نێوان گەلێکدا بە هەر بیانوویەك بکرێ هیچ مانایەکی نییە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نیم

زاکیرەمان بە یەکجاری بەتاڵ بکەینەوە، یان ڕێگە بە خەڵکی نەدرێ ڕەخنە لەو هەنگاوو ڕەفتارە خراپەکارییانە بگیرێ، هەر هیچ نەبێ بۆ بنیاتنانی کەسێتی کورد.

# هەڕەشەکانی پارتی

دوای کۆبونەوەکانی هەڤاڵ مام جەلال لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکانی تورکیادا ڕۆژی ۲/۲۱ گەیشتە فرۆکەخانەی میهرئابادو لەلایەن بەرپرسە گەورەکانی ئێرانەوە پێشوازی گەرمی لێکرا. هەر لەم ڕۆژەدا بوو کە عارف تەیفور لە ڕادیۆکەیانەوە هەڕەشەی هێرشی بۆسەر ناوچەکانمان کردو داوای لە هێزەکانمان ئەکرد کە لەم شەڕانەدا بێلایەن بن. ئەمە خۆی لەخۆیدا ئاگادارکردنەوەیەك بوو بۆبەرپاکردنی شەڕ. جگە لەمە ئەم کابرایە زۆر سەیر بیر ئەکاتەوەوائەزانێ هێزەکانی یەکێتی جیایە لە سەرکردایەتیو بڕیارەکانی یەکێتی، گەر نەیانویست شەڕبکەن بێلایەن ئەبن..!

ئەم قسانەی عارف تەیفور کاریگەرێتی خۆی هەبوو، لەخۆیەوە نەهاتبووە قسەکردن بۆیە ڕۆژی ۲/۲۵ لە بارەگای کاك کۆسرەت لە دورلئەمن کۆبووینەوە، لە سەرئەم خاڵانە گفتوگۆ کرا:

۱. دۆخی هێزی پێشمەرگەی کوردستان

۲. توانای شەڕکردنی هێزەکانمان

۳. دارشتنی نەخشەی شەڕ بەم شێوەیە:

- کاك کۆسرەتو شێخ جەعفەر پەلاماری دەربەندی گۆمەسپان ـ بەرەو سەری ڕەش بدەن.
- مەحمود سەنگاویو عوسمانی حاجی مەحمودو کوردۆ قاسم پەلاماری دۆڵی هیران- بەرەو شەقلاوە بدەن.
- کاك جەبار فەرمانو مستەفای سەید قادر پەلاماری کەپکی حەمەد ئاغا ـ بەرەو سپیلك بدەن.

بەمەرجێ هەڤاڵ مام جەلال بڕیار لە سەر ئەم خاڵانە بدات. پێش ئەم کۆبونەوەیە ڕۆژانی ١/٢٢و٢/١ یش کۆبونەوەی فەرماندەیی گشتی کرا لە سەر دۆخی سیاسی کوردستانو یەکێتیو پارتیو سازدانی هێزی پێشمەرمەگەی کوردستان لە ڕووی هۆشیارییەوەو تیشک خستنە سەر کۆبونەی ئەنقەرەو ئەگەری ڕێکنەکەوتن لەگەڵ پارتی. لە هەندێك لەم کۆبوونەوانەدا کاك عومەر فەتاحو هێرۆخان ئامادە بوون.

دوای ئەوەی هەڤاڵ مام جەلال گەشتێکی دیبلۆماسی زۆر سەرکەوتوی تەواوکرد. ڕۆژی ٢/٢٦ گەڕایەوە کوردستانو لەلایەن هەندێ لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتی یەکێتیو نوێنەرانی بزووتنەوەو یەکگرتووو حیزبی شیوعی کوردستانو خەڵکێکی زۆرەوە لە پەرویزخان پێشوازی لێکراو ڕۆژی ٣/٢ لەسلێمانی کاتژمێر ١١ ی پێش نیوەڕۆوەکو فەرماندەیی گشتی لەگەڵیدا کۆبوینەوە بۆ باسکردنی گەشتەکەی کە بەڕێزیان تیشکی خستە سەر:

ـ دۆستایەتی ئێرانو هەڵوێستی ئێرانی یەکان باشترەو پێیانوایە پەیوەندی ئەوانو کورد هەر بمێنێ لە عێراقدا.

ـ دانیشتنی لەگەڵ تورکەکاندا، بە تایبەتی لەگەڵ تانسۆ چیلەرو جێگرەکەی ئەربەکان لەحیزبی ڕەفاه. کە هەموویان پێیان باشبووە کە ڕژێمی عێراق نەگەڕێتەوە کوردستان، لایەنگری حکومەتو پەرلەمانی کوردن لەچوارچێوەی عێراقی فیدرڵیدا.

کە لە ڕاستیشدا تورکەکان بوونی دەسەڵاتی کوردیو هەر گۆڕانکارییەك کە لە ئاییندەی عێراقدا کە قازانجی کوردی تێدا بێت ڕەتئەکەنەوەو لەم دانیشتنو چاوپێکەوتنانەی سەرکردەکانی کورددا بە ناچاری باس لە ئەزمونی کوردی ئەکەن. تەنیا بۆ ئەوەیە کە جۆرێك پەیوەندی هەبێت بۆ ڕاگرتنی ڕایەڵەی بەرژەوەندی یەکانیان.

سەرەڕای ئەو ڕێککەوتنەی یەکێتیو پارتی لە ئەنقەرە بەڵام پارتی زۆر پابەند نەبوون، بگرە لە بیانوو ئەگەڕان بۆئەوەی شەڕ هەڵگیرسێننەوە، یان گوشار بخەنە سەر یەکێتی بەتایبەتی دوای ئەو گەشتە سەرکەوتووەی هەڤاڵ

مام جەلال. ئەوە بوو ڕۆژی ٣/٣ هێزەكانی پارتی لە بەنەباوێ پەلاماری هەندێ شوێنیانداو لای دێگەڵەش هەندێ ڕەبایەیان داناو هەندێ تەقوتۆقیش لەنێوان هەردوو لادا ڕوویدا. هەر بەمەوە نەوەستان، بەڵكو ڕۆژی٣/٦ هێزێكی پارتی بەسەرپەرشتی حەمە ڕێگری كۆنە یەكێتی دزەیان كردە چەمچەماڵو لەلایەن هێزەكانی فەرماندەیی كەركوكەوە لێیاندراو خراپیان بە سەرهات كە لە ئەنجامدا پارتی: ١٠ كوژراو٦دیلو١ بیكەیسیو چەند پارچە چەكێكی تری زیان لێكەوت، یەكێتیش: ٢ شەهیدو ٤ بریندار كە بەداخەوە سەید عیزەتی جەباری جێگری فەرماندەی هێز شەهید بوو، ٣چەكداری پارتی خۆیان گەیاندە بانیمەڤانو تەسلیم بە ڕژێم بوونەوە، تاكو لەوێوە بگەنەوە سنووری پارتی. دیارە ئەم جۆرەكارانە بۆ پشێوی نانەوە بوو، كەیەكێتی ڕووبكاتە شەڕێك پارتی ئەیویست ئەنجامەكەی بۆ خۆی مسۆگەر بكاتو لەلایەكی تریشەوە ناوچەیەك كۆنترۆڵ بكات كە گرنگێتی بۆ ئەوان هەیەو لەنگەری هێزەكانی یەكێتی تێكئەدات. كەچی لەو كارەیاندا كە پشتیان بە كەسێكی بە لای خۆیانەوە ئازارو شارەزای ناوچەكە بەستبوو سەرنەكەوتنو شپرزەش كران كە جارێكی تر نەتوانن بێنەوە ئەو ناوچەیە.

لەم كاتانەدا بوو كۆبوونەوەی خولی دووەمی ئەنقەرە لە ڕۆژی ٣/١١ دەستپێكردەوە، بەڵام پارتی بەهۆی كوژرانی محێدین ڕەحیمی ئەندامی كۆمیتەی ناوەندیو ئەندامی سەرەكی لە پاراستن لە كۆبونەوەكان كشانەوەو یەكسەر یەكێتیان تاوانباركرد، كەئەمە تۆمەتێكی ناڕاستو دەست هەڵبەستێكی بێ ڕێوجێ بوو كە پەلەپەلی پێوە دیار بوو، كە بێ بەڵگە یەكێتیان تاوانبار كردو بەمەش هەڵوێستێكی ناشارستانەیان تۆماركردو بێ ئوسوڵانە لەكۆبوونەوەكەدا دەرچوونە دەرەوە كە ئەمە بیانوویەك بوو بۆ خۆدزینەوە لە گەیشتنە ئەنجامی ڕێككەوتن لە ئەنقەرەدا. كەچی لە دواییدا ناوەرۆكی ئەو گەمەیە ڕوون بووەوەو پەیوەندیشی بە یەكێتییەوە نەبوو جگە لەوەی محێدین لە نوسینێكدا بێزاری دەربڕی بووو ئەیویست بچێتە دەرەوە لەمەشدا پارتی هەزارو یەك حیسابیان ئەكرد كە ئەو شارەزای هەموو نهێنی یەكانیانەو لەو ڕۆیشتنەدا لەوانەیە سەریەشەیان بۆ بنێتەوە، بۆیە لە كۆڵ كرایەوە.

# دامەزراندنی فەرماندەیی دووکان

ڕۆژی ٣/١٥ هەڤاڵ مام جەلال داوای کردمو چومەلای، لەو دانیشتنەدا باسی ئەوەی کرد کەسنووری دووکان بکرێتە فەرماندەییو دەستکاری سنوورەکەش بکرێ، گۆڕانی تێدا بکرێت بەم شێوە:

- لە کۆتەڵ تاکو تاسلوجە بخرێتە سەر فەرماندەیی کەرکوک.
- ئینجا لە کۆتەڵ بەرەو خەلەکانو هیزۆپو هیرانو سماقولی بکرێتە فەرماندەیی دووکان.

بەم جۆرە بڕیاری دامەزراندی فەرمادەیی دووکانی دا. کە بە نووسراوێکی ڕەسمی بڕیاری دانانی فەرماندەی پێنجەم درا: ( بڕیارمان دا فەرماندەیی پێنجەم پێکبهێنین لە دۆڵی هیرانودۆڵی سماقولیو هیزۆپو دۆڵی خەلەکانودووکان. هەڤاڵ مەحمود سەنگاوی فەرماندەی ئەبێت، جگە لەو هەڤاڵانەی کە پێشتر لەگەڵی بوون: هەڤاڵان مامەغەفەو کاك تۆفیق کانیوەتمانیش ئەبنە ئەندامی فەرماندەییەکە.

هیوادارم هەڤاڵان سەیدو شێخ هاوکاری تەواوی بکەنو هەموو یارمەتییەکی پێویستی بدەن.

**بۆپێشەوە ڕووەو سەرکەوتن**

**فەرماندەی گشتی**

**ه. پ. ك**

**مام جەلال**

بۆ ئەم مەبەستە ڕۆژی ٣/١٦ سەردانێکی دووکانمان کرد بۆدیاری کردنی شوێنو جێگای بارەگای فەرماندەییو تەشکیلات. هەر دوا بە دوای ئەمە هەڤاڵ مام جەلال برووسکەیەکی بۆ کردین بەم شێوەیە:

لە/ مام جەلال

بۆ/ هێزی پێشمەرگەی کوردستانو فەرماندەیی ١+ ٢ + ٥

ئـەمرۆ عەمیـدێکی تـورکو چـل ئەفسـەرو سـەربازی تـورکی بەچـوار مودەرەعە هـاتن بـۆ کۆیـە بۆچاودێری کردنـی ئاگر بـڕ، ئەیانـەوێ فـەوجێ لـە کۆیە دابنێن، فەوجێکیش لە هەولێرو فەوجێکیش لە بەستی شەرغە. پێویستە هاوکاری تەواویان بکەنو ڕێزی زۆریان لێبگرن.

ئەم هێزە چاودێرە لـە دانیشتنەکانی ئەنقـەرەدا بڕیاری لـێدراو ئـەرکی دولایەنانەیان لە ئەستۆدا بوو هەم چاودێری ئاگربڕی نیـوان یەکێتیـ پارتیو هەم سۆراخی زانیاریو زانینی جموجووڵەکانی پەکەکەو تێگەشتنی بارودۆخی کوردستان هاتبوون کە لە نزیکەوە ئاگایان لـە ژیانو بارودۆخی تورکمانـەکان ئـەبێ. چـەندین لایـەنی خـراپ لـە کارەکەیانـدا هـەبوو، بـەڵام بـۆ بەرژەوەنـدی گشتیو دوور کەوتنەوە لە کەوتنە نـاو کوانـووی شـەڕەوە هـاتنی ئەمانـەمان پـێ باش بوو.

کە زەمەنی شەڕبێ هیچ شتێك لە شوێنی خۆیـدا نابـێ، لەگـەڵ ئەوەشـدا خۆتی بۆ ئامادە ئەکەیتو توێشوی بۆ هەڵئەگری. لە شەڕیش نابووت تـر نییـە، بەڵام کە بەرامبەرەکەت پێت قایل نەبێو ڕەتت بکاتەوەو چاڵت بۆ هەڵبکـەنێ.. ناچار ئەبیوەڵامت هەبێ بەتایبەتی کـە ئـەرکێکی نیشتمانی لـە ئەستۆتدا بـێ. بەڵام باری نە شەڕ نە ئاشتی لەو بارەی تر ناخۆش ترە، هەمیشە لە چاوەڕوانی بێهـوودەدا ئـەژیت، دڵەڕاوکـە ڕاپێچـمان ئـەکات. بۆیـە نـەوروزی ئەمسـاڵەمان بەبێـدەنگی بە ڕێکـرد، لـە نـاو ئـاڵۆزی ئـەو بـاری نەشـەڕ نـە ئاشـتییەدا، زیـاتر خۆمـان خـەریك کردبـوو بـە کـاری فەرمانـدەییو پێشـمەرگەو ئـەرکو پێداویستییەکانیەوە.

## مام جەلال لە كۆیە

لە ڕۆژی ٣/٢٦ دا بوو لە بێستانە چاومان بە هەڤاڵ مام جەلال كەوت كە لەلایەن خەڵكی كۆیەوە پێشوازی لێكرا. كە گەیشتینە كۆیە كۆبوونەوەی لەگەڵ كردین لە بارەی:

- ڕێكوپێكی هێزی پێشمەرگەی كوردستان.
- چاوەڕوانی ملدانی پارتی بۆ ئاشتی.

هەروەها باسی ئەوەی بۆكردین كە تاریق عەزیز لە مۆسكۆ بۆ هەندێ پەرلەمانتاری ڕووس قسەی كردووەوووتوویەتی: پارتی بە هەموو شتێ ڕازییە، ئەمریكا ڕێگە نادات ڕێكبكەوین. پاشتر لەگەڵ هێزی ئاشتی پارێز كۆبووینەوە.

## لەلای حیزبی دیموكرات

نیوەڕۆی ڕۆژی ٣/٢٨ لای برادەرانی حیزبی دیموكراتی ئێران دەعوەت بووین، لە لایەن یەكێتییەوە بەڕێزان: مام جەلالو دارۆی شێخ نوریو بەهرۆز گلاڵیو سمكۆ دزەییو شێخ جەعفەرو شاخەوانو مەحمود سەنگاوی، لەلایەن دیموكراتیشەوە: بەڕێزان مەلاعەبدوڵلای حەسەن زادەو جەلیلی گادانیو فەتاحی كاویانیو مستەفای هیجریو مەلاحەسەن.

پاش نوكتە گێڕانەوەیەكی زۆر بوبە مەناقەشەو گفتوگۆ لە سەر یەكێتیو پارتیو شەڕو ناكۆكییەكان، لە سەرجەمی دەمەتەقێو قسەكاندا بۆنی ئەوەی لێئەهات كەلایەنگری پارتی بكەن. دواتر جەلیلی گادانی هەریەكە دانەیەك لە كتێبی ٥٠ ساڵ خەباتی لە نووسینی خۆی داینێ. كە پەیوەندی نێوان یەكێتیو دیموكرات لەسەرەتادا بەشێوەیەك بووەو ئێستا گرژییەكی تێكەوتووە كە زۆرتر پەیوەستە بە هەڵوێستی هەندێ لەو سەركردانەیان كەئێستا لە سەركردایەتیدا هەنو زۆرتریش لەژێركاریگەرێتی پارتیدان

سەرەڕای ئەو هەڵوێستانەی پارتی لەگەڵیاندا لە لێدانو کوشتنو پەلاماردانو دەرپەڕاندنیان لە ناو ئێران.

## شەڕ پێفرۆشتنەکانی بزووتنەوە

وەنەبێ هەر پەیوەندی نێوان یەکێتیو پارتی گرژیو ئاڵۆزی تێدا بێو مەترسی شەڕکردن هەمیشە لە ئارادا بێت، بەڵکو لە نێوان یەکێتیو بزووتنەوەشدا گرژی هەبوو، بزووتنەوە سەرەڕای رێککەوتنو پێکهاتنەوە هەمیشە لە بۆسەدا بوون بۆ تۆڵە سەندنەوە لە یەکێتی، ئەوان وەکو هێزێکی ئیسلامی بچووک ئەیانویست دەسەڵاتی خوایی لەسەر زەوی پەیرەو بکەنو بوونی هێزە عەلمانیەکانیان بە گوناح زانیوە، بۆیە لە دوو ئاستەوە لەمەڕ دژایەتیکردنی یەکێتی هەڵسوکەوتیان کردوە:

- قینێکی کۆنیان لەدڵدایە بۆ تۆڵەسەندنەوە.
- یەکێتیوەکو هێزێکی عەلمانی قبوڵ نییەو ئەبێ نەمێنێ.

بۆیە لە بیانوو ئەگەڕان کە شەڕێك بسازێننو لە مەشدا خۆیان بێ پشتیوان نەزانیوە.وایانئەزانی کە یەکێتی لەگەڵ پارتیدا نەسازێو ئەگەری شەڕ لە ئارادابێ ئەوا ئەوانیش گرەوێك ئەکەن، لەوانەشە باش بۆ ئەنجامەکە نەچووبوونو هەڵسەنگاندنەکەیان لە ئاستی تەماکەیاندا نەبوو. ئەو هەڵکەوتەی لێی ئەگەڕان بۆیان جووتبوو، کە رۆژی ٤/٤ خەڵکێکی زۆری هەڵەبجە بۆ سەیران چوو بوونە سلێمانی کە بۆ یەکەم جار لە دوای دەست بەسەراگرتنی لەلایەن بزووتنەوە ئەو خەڵکە توانیویانە هەناسە بدەنو سەیران بکەن لە دەرەوەی هەڵەبجە.

کە بە پەرۆی سەوزەوە دەرچوو بوونو لە زۆر شوێن دائەبەزینو هەڵپەرکێیان ئەکرد، ئەمە لەخۆیدا جۆرە پشتیوانێك بوو بۆ یەکێتیو بزووتنەوەی پێ توورِ بووبووو ترسیان لێنیشتبوو، بۆیە لەکاتی گەڕانەوەیاندا

بەلای بارەگای بزووتنەوەدا تێئەپەڕن‌و تەقەیەك ئەكرێ كە گوایە خەڵكی ناو كۆستەرەكان هات‌و هاواریان ڕووبەڕووی ئەوان كردووەو لە ئیسلامەكەی بزووتنەوەدا هاوارو خۆشی حەرامە، بۆیە تەقە درووستبووە.

مەلا عەلی عەبدولعەزیز داوای كوژاندنەوەی ئاگری ئەو شەڕەی كرد بوو بۆیە بڕیار درا نوێنەری هەردوولا: حەمەی حەمە سەعید لەلایەن یەكێتییەوەو مەلا عومەر كەلاری‌و مەلاعەبدولڕەحمان لەلایەن بزووتنەوەوە دانیشن بۆ گەیشتن بە میكانیزمێك‌و پێكهاتن لەسەر نەهێشتنی ئەو گرژییە بەڵام پێش ئەوەی نوێنەرەكەی یەكێتی بگاتە شوێنی كۆبونەوەكە لە سیروان كەوتبووە ناو بۆسەیەكی بزووتنەوەو دەرباز بوو بوو، ڕۆژی ٤/٥ نوێنەری لایەنەكان لە سەید سادق لەگەڵ نوێنەری بزووتنەوەدا كۆبوونەوە لەسەر دۆخی سیروان‌و ئەو گرژییە تازەیەو پێشێلكاریەكانی بزووتنەوە بەرامبەر بە لایەنەكان‌و خەڵكی ئەو ناوچەیە. هەر لەكاتی كۆبوونەوەكەدا لە سنووری كۆمیتەی هەورامان تەقە دەستیپێكردبوو لە نێوان یەكێتی‌و بزووتنەوە. ئەمە هەنگاوێك لە شەڕنزیكی ئەكردینەوە. هەستمان ئەكرد مینی گەورەمان بۆ چێنراوە.. بۆیە هەندێ كاری ئیجرائیمان ئەنجامدابوو بۆ بەرگرتن لە هەر جووڵەیەكی بزووتنەوە كە ببێتە مایەی تێكدانی بارودۆخەكە، كەهەم پارتی‌و هەم دەستی دەرەكیش دنەی ئەدان بۆئەم جۆرە پشێوییانە. بۆیە هێزێكی فەرماندەیی چواری گەرمیان زۆر بە نهێنی پەڕینەوە بۆ ملەی دارێ‌و شاخی نوەر، لە شارەزوریش هێزەكانمان ئامادەكاری باشیان كردبوو.

ڕۆژی ٤/٦ لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلال لە بارەگای فەرماندەیی كۆبووینەوە بە تێرو تەسەلی لە بارەی سازدانی هێزی پێشمەرگەو سیاسەتی دنیاو دەوروبەرەوە قسەی بۆ كردین.

بەهۆی لاسارییەكانی بزووتنەوەوە شەوەكەی بە هێزێكەوە چووینە هەڵەبجەی تازە. چونكە بەپێی زانیاریەكانمان ئەمانزانی بزووتنەوە خۆی كۆكردبووەوەو لەئان‌و ساتدا بوو. ئەوە بوو شەوی ٧ ـ ٨ /٤ بزووتنەوە لە كاتژمێر ٥ر٥ بەرەبەیاندا كە هەموو خەڵكی لە خەوی شیریندا بوون لە هات‌و

هـاواری بڵنـدگۆکانی بزووتنـەوە لـەناو هەڵەبجـەدا ڕاچڵەکین‌و لـە ڕێگـەی ڕادیۆکەشـیانەوە جـاڕی شـەڕیان بەرامبـەر یەکێتیـدا. هێزەکانیـان پـەلاماری بارەگاکانی مەڵبەند، کۆمیتە، ئیدارەی گشتی، ئاسایش، خوێندکاران، ڕادیۆیان لە ناو هەڵەبجەداو شـەڕێکی گـەرم‌و قـورس ڕوویـداو هـەموو شـوێنەکانمان دەستی بەسەرا گیرا، هەروەها بارەگاکانمان لە شارۆچکەی سیروان‌و بیارە گیران.

هـەموو ئـەو پێشـمەرگەو هەڤاڵانـەمان لـە دامـو دەزگـا حیزبـی‌و حکومیـەکان کشانەوە بۆملـەی داریّ کـەهێزەکانی فەرمانـدەیی ٤ ی گـەرمیانی لێبوو لەوێشەوە بەرەو هەڵەبجەی تازەو شارەزوور چوونەوە.

لـە بەرامبـەر ئـەوەدا یـەکێتی پـەلاماری بارەگاکـانی بزووتنـەوەی لـە ڕانیەو قەڵادزەداو دەستی بەسەراگیرا، کە لە ڕاستیدا لێپرسراوەکانی بارەگاکانی بزووتنـەوە لـە قـەڵادزە }مـەلا زراری ناوچـەو مەلاشـوان{ خۆیـان تەسـلیمی ئاسایش کـرد. لە سلێمانیش خۆیـان بارەگاکـانی خۆیانیـان سووتاند، ڕۆژەکـەی هاوەنبـاران بـوو لـە نێـوان هـەردوو لادا. هـەر لـەم کاتانـەدا بوووەفـدێکی ئێـران هاتن بۆ ناوبژیوانی لەنێوان هەردوولادا بۆ چارەسـەرکردنی کێشـەکان بەڕێگـەی ئاشـتیانە. هەوڵەکەی‌وەفدەکـە سـەری گـرت‌و کاتـژمێر ٥ر٤ ی ئێـوارە بڕیـاری شەڕوەسـتان درا. بـەڵام بزووتنـەوە هـەر تەقـەیان ئـەکردو زۆر خۆیـان بـە بڕیارەکانەوە نەئەبەستەوە.

لەهـەمان کاتـدا بزووتنـەوە لـە سـنووری پارتیـدا هێزەکـانی تێکـەڵ هێزەکـانی پـارتی کردبـوو لـە سـەنگەرەکانی پێشـەوەی شـەڕدا بەرامبـەر بەهێزەکانی یەکێتی بەتایبەتی لە سنووری کۆیەودێگەڵە. هـەروەها هێزەکانیـان گەیاندە دێگەڵە، تەکەور، گۆمەشین، لەگەڵ خۆیانـدا ڕاجیمـەو هاوەنیـان پێبـوو کە لەوەئەچیّ پارتی پێی دابن.

ئەنجامی ئەو ڕێککەوتنە لەسەر دەستی‌وەفدی ئێرانـی ئێمـە هێزەکانمـان بەرەو زەرایەن کشانەوە، کاك کوردۆ قاسم بە هەڵە هێزەکانی فەرمانـدەیی ٤ ی گـەرمیان لـە ملـەی داریّ گەڕانـدە دواوە. بـەڵام بـە ڕاسـتی بزووتنـەوە نیازیـان نەبوو ڕێك بکەون، گوندەیان ئەکردو زۆریان لە خـەڵك‌و دۆسـتەکانی یـەکێتی

ئەکردو ئازاریان ئەدان، بگرە دیلەکانیشیان ئەکوشتو دەستیان لێنەئەپاراستن بۆ نمونە: محەممەد ئەحمەد مەحمود خەڵکی مەلا هۆمەری گەرمیان کە لە نۆردووگای سمود دانەنیشتن هەروەها جەمال محێدین خەڵکی دووز هەردووکیان بەدیلی گیرا بوونو دواتر سەربڕابوون.

ئا ئەمە ڕەفتاری هێزێکی ئیسلامییە..! کە ئەیەوێت بە ناوی ئیسلامەوە حوکم بکات، هەرلە سەرەتاوە ناوەڕۆکی دژی مرۆڤایەتیان دەرئەخەن، بەپێی بۆچوونی سەدان ساڵ دواکەوتوویی پێش ئێستا هەڵسو کەوت ئەکەن، جۆرەها بیری کۆنەپەرستی داپڵۆخاو زیندوو ئەکەنەوە کە لەگەڵ ئاستی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی ناگونجێ. ئەمانە هەر لە سەرەتاوە تۆوی مردنی خۆیان چاندووەو لە زەوییەکی ڕەقەندا هیچی لێ بەرهەم ناهێنن جگە لە نەفرەتو شکست. لەبەر ئەو هەلومەرجەی شارەزوور، بە بڕیاری کاک جەبار فەرمان ڕۆژی ٤/١٤ نێردرامە سنووری شارەزور بەرامبەر ئیمامی زامن.

## تەمبێکردنی بزووتنەوە

لە ڕۆژی ٤/١٦ لە قەلآچوالان فەرماندەیی گشتی بە ئامادەبوونی هەڤاڵان جەبار فەرمانو مستەفای سەیدقادرو کوردۆ قاسمو عوسمانی حاجی مەحمودو شێخ جەعفەرو عەدنانی حەمەی مینا، مەحمود سەنگاوی لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلالدا کۆبووینەوە، دوای تاوتوێکردنی بارودۆخی شارەزوورولاسارییەکانی بزووتنەوەو یاریکردنی بە ئاگری شەڕی بێ ئامانەوە هەندێك بڕیارماندا لەوانە:

- تەمبێکردنی بزووتنەوە.
- کردنەوەی خولی فێربونی تایبەتی بە پەلە بۆ چەکی قەناسو ئارپیجیو بیکەیسی.

لەم ماوەیەدا بزووتنەوە هەر ئاڵۆزیان درووست ئەکرد،وایان ئەزانی یەکێتی پێیان ناوێرێتوگوایە ئەوان لەناوچەی هەڵەبجەو سیروانو هەورامانندا

بالآدەستن‌و پشتیان بەئێرانەوەیەو ئەو ناوەیان‌وەکو ناوچەی دەسەڵات‌و هێز بۆ خۆیان کۆنترۆڵ ئەکەن . ئەم جۆرە لێکدانەوە هەڵەیە یارمەتیان نادات بۆ ئەوەی بە ئاسوودەیی بژین، چونکە ئەوان مەبەستیان نیە بە ئاشتی دابمەزرێن‌و ڕۆڵ لە بنیاتنانی کوردستاندا ببینن، بەڵکو دەرپەڕاندنی یەکێتی‌و هێزە کوردستانییەکانی تریان مەبەستە کە پێیان ئەڵێن حیزبە عەلمانییەکان. ئەو هەڕەشەو گورەشانە دەسەڵاتی یەکێتی چوەکو حکومەت‌و چوەکو حیزب بێزار کرد بوو، بۆیە نەئەکرا بێدەنگی هەڵبژێرین بەتایبەتی ئەوان ئەو جۆرە هەڵوێستەیان بۆ زیاتر پێ درێژکردن ئەقۆستەوەو هەلەکەیان بۆ ئاسوودە بوون لە بار ئەبردو شێوازی شەڕ خۆی قوت ئەکردەوە.

بۆیە لە بەر ڕۆشنایی کۆبونەکانی ڕۆژی ٤/١٦ داو بۆدانانی نەخشەیەکی ڕێکوپێك بۆ سنووردانان بۆکارە هەڵەشەکانی بزووتنەوە بەسەر پەرشتی کاك جەبار فەرمان‌و بە ئامادەبونی هەڤالآن کوردۆو عوسمان‌و عەدنان‌و مەحمود سەنگاوی، ڕۆژی ٤/٢٤ دانیشتنێکمان کردو زۆر بەوردی بارودۆخەکەمان لە ڕووی سەربازییەوە هەڵسەنگاندوئینجا نەخشەی پەلاماردانەکەمان دانا بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

- هێزەکانی لای هەڤالآن عەدنان‌و عوسمان لە پردی زەڵم‌و بناری سوورێنەوە پەلامار بدەن.
- هێزەکانی لای کاك کوردۆ لە نێرگسەجاڕو ملەی دارێوە پەلامار بدەن.
- هێزەکانی لای مەحمود سەنگاوی لە بێسەڵمێنەوەو لەگەڵ هێزەکانی لای کاك کوردۆدا یەك ئەگرنەوە لە بەرەی هەڵەبجە.

دوای داڕشتنی ئەو بەرنامەیە، هەریەکەمان گەڕاینەوە لای هێزەکانمان بۆ خۆسازدان‌و دەستبەکاربوون لە کاتی دیاریکراودا.

من ئاگاداری هێزەکانی فەرماندەیی دووکانم کردەوە لە توومەقووت لەسەر ئاوی سیروان بکەونە ڕێ. هێزەکانی تری قۆڵەکانی تریش هەریەکەیان

زۆر بـه نهێنـیو ئەوپەڕیووریاییـەوە بـەرەو شـوێنو مەبەسـتەکانیان ڕۆیشـتن. بەتایبـەتی بەشـێکی فەرمانـدەیی٤ ی گـەرمیان دووشـەو پـێش دەسـتپێکردنی چـالاکیەکان چـوونە ناوچـەی شـەمێرانو لـەئاوی سـیروان لەئاسـتی دێـی دڵـف پەڕینەوەو بە هاوکاری هەندێ شارەزای ئـەو نـاوە خۆیـان گەیانـدە سـەر شـاخی نومر، کەدوو ڕەبایەی بزووتنەوەش لە سەر ملەی دارێ هـەبوونو بـەو هێزانـەی گەرمیانیان نەزانیبوو.

بـەپێی نەخشـەکە سـەعاتی سـفری شـەڕەکە بەرەبـەیانی ڕۆژی ٤/٢٦ لـە هەموو قۆڵەکانەوە هێرش بۆ سەر بنکەو شوێنەکانی بزووتنەوە دەستپێکرد.

هێزەکانی میحوەری شارەزوور بـە سەرپەرشتی کـاك عـەدنان لـە بنـاری سـووڕێنەوە بـۆ سەرشـێرەمەڕ پەلاماریانـداو شـەڕی قورسـیان کـردو تـەنگیان بەبزووتنەوە هەڵچنی، هاوکات هێزەکانی کاك عوسمانیش لەسەر جادەوە بـەرەو گـردی گـۆ هێرشـیانکردو گوشـاریان خسـتە سـەریانو هەنـدێ پێشـمەرگەیان شەهید بوون. هێزەکانی گـەرمیانی لای کـاك کوردۆش لـە سـەر شـاخی نـومرەوە هەڵیانکوتایە سـەرملەی دارێو لـە ماوەیـەکی کەمـدا ئـەو دوو ڕەبایـەیان گـرتو کوژراوو برینداریان لێکردنو ڕاویاننان، هێزەکانی تری گەرمیان بـەرەو بـالأمبۆ چوون بـەڵام نەگەیشتنە جێ مەبەسـتەکانو گەڕانـەوە لای ملـەی دارێو لـەوێ هێزەکـانی ئێمـەش گەیشـتنە جەرداسـنەو پێشـڕەوییان بـەرەو بەرزاییـەکانی قارەمـانیو غـولامیو داری زەرپـینو ئیمـامی زامـن کـردو سـەرکەوتنی باشمـان بەدەسـت هێنـاو شـان بەشـانی هێزەکـانی گـەرمیان کـەتا ڕۆژهـەڵاتی غـولامیو قارەمانیو چروسانە تانزیك گونـەو ملـەی مزیـار ڕۆیشـتن، سـەرەڕای تێکشـکانی هێزەکانی بزووتنەوە، هەندێك شـەهیدو برینـدارمان هـەبوو. ئـەوی ڕاسـتی بـێ گەر ئـەو هێـزەی گـەرمیان لـەقۆڵی بـالأمبۆوە بگەیشـتنایەتە سـەر بـالأمبۆ ئـەوا

هەڵەبجە ئەکەوتە ژێر دەستمان، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پێشڕویەی ئێمە لەم قۆلانەوە کاریگەری خۆی هەبوو، بە بەراورد لەگەڵ دوو قۆڵەکەی سەرەوە کە لە سنوورێکدا ڕاوەستان، ئەگەر بەشێکی ئەو هێزانە لەم قۆلانەی ئێمەوە بهاتنایەو تەنها بۆموشاغەلەکردن جموجووڵیان بکردایە سەرکەوتنی مسۆگەرترمان ئەبوو، کە ئەو کاتە گوشاری زۆرتر ئەکەوتە سەر هەڵەبجە.

دیسانەوە لە هەوڵێکدا بۆ ڕاگرتنی تەقە کاتژمێر١٢ی شەوی ١/٢٨ شەڕ ڕاگیرا، بەڵام چەکدارەکانی بزووتنەوەوەکو هەموو لاسارییەکانی تریان پابەندی ئەو شەڕ ڕاگرتنە نەبوون، بەڵکو لە دۆڵی سماقولییەوە چەکدارەکانی بزووتنەوە پەلاماری سەنگەرەکانی یەکێتییانداوەکو گوشار خستنە سەر یەکێتی.

لەگەڵ بەرپابوونی ئەم شەڕەدا نارەزاییەکی زۆر بەرامبەر بە بزووتنەوە بەرزبووەوە، بەڵکو خەڵکێکی زۆر خۆیان چەکدارکردو ڕوویان کردە بەرەکانی شەڕوەکو هەڵوێستوەرگرتنێك لە دژی ڕەفتارە پووچەڵەکانی بزووتنەوە کەخۆی بەسەرویستی خەڵکیدا ئەسەپێنێ‌و بیرو بۆچونێکی نامۆ ئەسەپێنێت، کە کەس ناتوانێ بەپولێکی قەڵپ لێیانوەربگرێ، هەرچەن چەردەیەك خەڵك هەن بەدەم ئەم ئاوازە نارەسەنەوە ئەچن، بەڵام زۆرینەی خەڵکی تر ئامادەنین بچنە ژێر ئەم ئاڵا شرەوەو کۆمەڵی کوردەواری پێی قایل نابێ‌و لەئەنجامیشدا هەرئەبێ بەر شەقی زەمانە بکەون، با ئێستا لەبەر هەندێ هۆکاری دەرەکی جێ پێ یەکیان هەبێ .

ئێمە هەرلەسەرەتای دەست بەکار بوون‌و خۆئامادەکردنمانەوە بۆزاڵبوون بەسەر دۆخەکەداووڕێ خۆشکردن بۆ جوڵەی هێزەکانمان کەناوی سیروان ڕێگرمان بوو هەندێ کارمان کرد بۆ تەختکردنی ئەو کۆسپەش، بە دروستکرانی قایغ بۆ پەڕاندنەوەی هێزەکانمان بە تایبەتی ئۆتۆمبیل بۆ

گەیاندنی پێشمەرگە بە پەلەو گواستنەوەی کەلوپەل‌و ئازوقەو تەقەمەنی بۆ بەری هەڵەبجە لە قۆڵی ئیمامی زامنەوە کەرۆژی ٤/٣٠ قایغەکانمان کەوتە کارو ئۆتۆمبیلەکانمان پەڕینەوە. بەمەش بزووتنەوە کەوتنە بارێکی دەروونی ئاڵۆزەوە کەزۆرتر تەنگیان پێهەڵئەچنرێ‌و جووڵەیان قەتیس ئەکرێ.

هەر لەم ڕۆژەدا، لە تاران بە سەرپەرشتی ئێرانییەکان هەردوولای یەکێتی‌و بزووتنەوە دانیشتن‌ودوای گفتوگۆیەکی زۆر لە نێوان نوێنەرەکاندا گەیشتنە ڕێککەوتنێك بۆوەستاندنی شەڕ کەئەم خالانەی لێپێکهاتبوون:

- ئاسایشی ناوچەکان بپارێزرێ.
- ڕێگەنەدان بە نیشتەجێکردنی هێزی نیزامی‌و درووستکردنی بارەگا لە لایەن گروپەکانی ترەوە لە هەڵەبجەی شەهید.
- گەڕانەوەی هێزەکانی هەرلایەك بۆشوێنەکانی خۆیان.
- ملکەچ بوون بۆ فەرمانڕەوایی حکومەتی هەرێمی کوردستان.
- لەبەرچاو گرتنی خواستە ئاینیەکانی خەڵك‌و ڕەچاوکردنی کاروباری ئاینی لەهەڵەبجە.

بۆ ئەم مەبەستە برووسکەیەکمان بۆ هات:

لە / جەبار فەرمان

بۆ / هەموو هێزی پێشمەرگەی کورستان

سلاوێکی گەرم..

لیژنەیەك لە هاو پەیمانەکان هاتن بۆڕاگرتنی شەڕ لەگەڵ بزووتنەوەو لیژنە پێکهات بۆ دورخستنەوەی هێزەکان، تکایە هەموو لایەك بڕیارەکانیان پەیڕەو بکەن.

هەر لەمسەرو بەندەدا بوو کە خدر مەندە خەڵکی مەمکان فەرماندەی هێزی بزووتنەوە بە ٧٠ کەسەوە پەیوەندی بە فەرماندەیی هەولێرەوە کرد کە٤٠ کەسیان چەکدار بوون‌و بی کەی سی‌و هاوەن‌و قەناس‌و کلاشینکۆفیان پێبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا بارەکە هێشتا ئاڵۆز بوو، ڕۆژی ٥/١ شەڕەهاوەن لە نێوان هەردوولادا هەبوو، ئێمە هاوەنێکمان تەقاند لەوەلامی بزووتنەوەدا چاودێرێکی ئێرانی بریندار کرد کە کەوتبووە نێوانمانەوە بۆڕاگرتنی شەڕەکە. ئیتر ووردەووردە بێدەنگی سەرانسەری بەرەکانی شەڕەکەی گرتەوەو هەرلایەنە لە سەنگەرەکانی خۆیدا مایەوە. من چومە لای کاك جەبارو برادەران بۆسەردان‌و هەواڵ پرسینی دۆخی ڕێککەوتنە کە، لە ڕۆژی ٥/٦ دا لەگەڵ کاك جەبارو برادەران شێخ جەعفەرو کاك عەدنان‌و لیوا خەلیل‌و هەندێ کەسی تردا بڕیارماندا کە سەردانی قۆڵی ملەی داری‌و سەنگەرەکانی پێشەوە بکەین، هەر ئەو ڕۆژە چووینە دەربەندیخان‌و لە شەمێرانەوە بە سیرواندا پەڕینەوە بەری ملەی داری‌و بە پێ گەیشتینە سەنگەرەکانی چروسانەوغولامی‌و قارەمانی‌و ئیمامی زامن. لەگەڵ کاك کوردۆو فەرماندەی پێشمەرگەکاندا قسەمان کردو ئەوە بوو برادەران بۆیان دەرکەوت کە ڕووبەرێکی باش پێشڕەوی کراوە ئەوەشیان بۆ ڕوون بووەوە کە ئەگەر قورسایی بخرایەتە سەر پەلاماردانی ئەم ناوچەیە کارەکە بە ئاقارێکی تردا ئەڕوشێت.

لە سەر ڕۆشنایی ڕێککەوتنەکەی تاران ڕۆژی ٥/١٤ لە لایەن فەرماندەیی گشتییەوە بڕیاری پاشەکشەی هێزەکانمان درا. بەلام بەهۆی پێداگرتنی بزووتنەوە لەسەر نەمانەوەی هێزی سیروان من قایل نەبووم.

# هاتنەوەی تورکیا

لەم بارودۆخە تەماوییەدا، بۆجارێکی تر سوپای تورکیا سنووری کوردستانی بەزاندو بەهێزێکی گەورەو قەبەوە کە خۆی ئەدا لە٥٠ هەزار سەربازو٣٥٠ تانکی پێشکەوتووو بە بەشداری چەندین فڕۆکە بۆ هاوکاری کردنی پارتی دوای ئەوەی پارتی هانایان بۆ ئەبات بۆ لەناو بردنی پەکەکەو تێکشکاندنیان لەو ناوچانەدا.

ئەم هاتنی تورکیایە بوو بووە شتێکی ئاساییو کەسێش دەسەلاتی نەبوو بەر بەو هێزە بگرێ، بەتایبەتی کە هێزێکی کوردی هێزێکی داگیرکەر بهێنێ بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هێزێکی تری کوردی، چەندە ئەمە ناڕەوایەو ناخۆشە، بەڵام گێچەڵ کردنی پەکەکە ئەم بارەی ئەخوڵقاند بیانوی ئەدایە دەستەوە، گەر پەکەکە لێرە نەمێنێو بۆ زەوی خەباتی خۆی بگەڕێتەوە، تورکیا نەیئەتوانی بێتە کوردستانەوە، چونکە پەکەکە لە دونیادا بە تیرۆرست ناوی دەرکردووە، هیچ دەوڵەتێکی جیهانی لەسەر ئەم هاتنە ناوەوەی تورکیایە بەدەنگ نەهاتنو بەمافی تورکیایان ئەزانی بۆسەر کوتکردنی پەکەکە هەموو ڕۆژێک ئەم پێشێلکاریە بکات، ڕۆژی دواتر کاک جەبار نامەیەکی بۆنوسین هەموو هێزەکانمان بگەڕێنینە دواوە، هێزەکەی ئێمە بچێتە بەرەی بێسەلمێنو لەگەڵ سەردار ئاسیابانی ڕێکەوتین کاتژمێر ٤ ی ئێوارە بگەڕێینەوەو هێزەکانی سیروان ئەبەن بۆ جێگرکردنی لە شارۆچکەی سیروان.

ڕۆژی دواتر لەسەراوی سوبحان ئاغا هەموو فەرماندەکان لەگەڵ کاک جەبار فەرمان کۆ بووینەوە باسی ئەم خاڵانە کرا:

- ڕێککەوتنی یەکێتی - بزووتنەوە.
- هاتنی سوپای تورک بۆ کوردستانو شەڕی پەکەکە.
- پەیوەندی یەکێتی - ئێران.
- پەیوەندی یەکێتی - بەریتانیا.

بزووتنـەوە بەناچاری نـەبێ ڕێککـەوتنی یـەکێتی پـێ هـەرس نـاگرێ، یـەکێتی‌و بزووتنـەوە قـەت لـە مەنجەڵێکدا نـاکوڵێن، دوو بەرنامـەی جیـا، دوو ئاستی بـیر کردنـەوەی جیـا، ئامـادەنین پێکـەوە بـژین، لـە ڕاسـتیدا بزووتنـەوە بڕوای بە پێکەوە ژیان‌و دیموکراسیەت نییە، بۆیە ئەبێ لەگەڵیانا هەڵبکەین.

کـە سـوپای تـورك هاتـە کوردسـتانەوە، بـەو هێـزە زۆرەوە بـە هاوکـاری پارتی کەوتنە شەڕەوە لەگەڵ هێزەکانی پەکەکەدا، کە هەواڵدەری سوپای تورك بـۆ کوردسـتان ڕایگەیانـد کـە گوایـە٤٥٠ پێشـمەرگەی پەکەکـە کـوژراون، هـیچ هەواڵێکیان لە بریندار ڕانەگەیاند، بەڵام ١٢ سەربازی تورك کوژران‌و ٢ ی تریش بریندار. لەوە ئەچێ ئەم هەواڵە چەواشەیە دوو مەبەستی هەبێ:

١.وورە بەرزکردنەوەی هێزەکانی خۆی کە لە دەستوەشاندندا سەر کەوتوون کە ئەبێتە مایەی‌وورە بەردانی هێزەکانی پەکەکەش کە زۆریان لێئەکوژرێ.

٢. ڕاکێشانی سـەرەنجی ڕای گشـتی تـورکی بـۆ ئاکـامی کارەکـانی سـوپا بـۆ لـەناو بردنی پەکەکە.

ناچـێتە مێشـکەوە سـوپایەکی نیزامـی ١٢ سـەربازی لـێ بکـوژرێ، بـەڵام هێزەکـانی پەکەکـە هەرچـەند دەسـتەیەك لەناوچـەیەکی سـەختدان‌و پـەرش‌و بـڵاون بەیـەکجار ٤٥٠ پێشـمەرگەیان لێبکـوژرێ. دەوڵـەتی سـەربازی ئـەبێ درۆبکـات بۆ پاساودانی تاوانـەکانی، ئـەگینا بـۆ لەگـەڵ خۆیـدا تـەرمی چـەند پێشمەرگەیەکی نەبردەوە تورکیا، پەکەکە لە شەڕدا لە ئـەنجامی کـەم ئـەزمونی پێشمەرگایەتیان لێیان ئەکوژرێ لە ئاستی دەستەیەکدا کە لەوانەیە بۆشـەڕێکی بچووك کوژرانی ژمارەی زۆر کارێکی ناڕاست‌وورە ڕووخێن بێت. جگـە لـەوەش تـا تورکیـا بیـەوێ بـە شـەڕو پـەلامارو کوشـتن پەکەکـە لـەناو ببـات گـەر بـە هێزێکـی تێرورسـتیش نـاوزەد بکـرێ دووزی کـورد زۆرتـر گەشـەئەکات‌و باشـتر خۆی لە مەیدانی کاری سیاسی‌و خەباتگێڕی‌و دۆست پەیدا کردندا ئەدۆزێتەوە.

لەسەر ئەم هاتنـە نـاوەوەی تورکیا بـۆ کوردسـتان‌و هەنـدێك کـەس دژی سـوپای تورکیـا خۆپیشـاندانیان کـرد، بـۆ نـاڕەزایی دەبڕین‌ووریـا کردنـەوەی خەڵکی لە بابەت ئەو هەڵوێستە زیان بەخشانەی تورکیـاو دەسـت تێکـەڵکردنی پـارتی لەگەڵیـدا بـۆ بەرژەوەنـدنی تایبـەتی. لـەدوای کۆبونەوەکـەی سـەراوی

سوبحان ئاغا رۆژی ٥/٢٧ لای هەڤاڵ مام جەلال لە قەڵاچوالان بە ئامادە بوونی کاك کۆسرەتو کاك جەبار کۆبووینەوە بۆ:

- باسکردنی دۆخی کوردستانو هێرشی سوپای تورك لەسەر داواکاری پارتی.

- شەڕی بزووتنەوەو ڕێککەوتنی ئەم دواییەو هەڵسەنگاندنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە شەڕی بزووتنەوەدا.

ئەم کۆبوونەوەیە ماوەی ٤ ڕۆژی تەواوی خایاند. هەڤاڵ مام جەلال زۆر بەووردی لەسەر ئەو مەسەلانە قسەی کردو دەستی خستە سەر زۆر شتی شاراوەو هەموو ئەگەرەکانی باسکردو هەموو هەڤاڵانیش بە شداری تەواویان لە گفتو گۆکاندا کردو ڕێوشوێنی تایبەتی گیرایە بەر بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هەموو ئەگەرەکان.

## سەردانی ئێران

لەو ماوەیەدا مەعیدەم ئازاری ئەدام، بێتاقەتی کردبووم، بە پێویستم زانی سەردانێکی ئێران بکەمو چارەسەرێکی خۆم بکەم، دوای تەواو کردنی کاری پێویستی ڕێگاپێدان. ڕۆژی ٦/٥ لە ڕێگەی باشماخەوە چوومە ئێرانو لەوێوە بۆ تاران. لە تاران چومەلای پزیشکێك (ئەبو حسێنی سەجادی) پیاوێکی ڕووخۆشوواقیعبین بوو. پێمووت کەمن خەڵکی کوردستانی عێراقمو دەمێکە پێشمەرگەمو لە ئەنجامی ئەمەوە توشی ئەم نەخۆشیە بووم. کەزانی کوردم پێکەنیوووتی: ئەم تارانە ئێمە تیا دانیشتوین لە بنەڕەتدا شوێنی کوردە. ئێمە داگیرمان کردوە، کورد کۆنترین میللەتی ئەم ناوچەیەیە. ئینجا لەسەر یەکەکە زۆر گفتوگۆمان کرد، هەندێ بۆچوونی خۆی هەبوو.

بە ڕاستی ئەو کوردی خۆش ئەویست، پیاوێکی عەلمانی بوو، باوەڕی بە هەندێ شت نەبوو. هەتا پێمووت: دکتۆر من خواردنەوە ئەخۆمەوە ئایا زیانی بۆ مەعیدەم نییە..؟ووتی: ئەگەر دەستت کەوت فۆدگا بنۆشە، کە پەرداخەکەت نا بەسەرەوە یادێکی منیش بکەرەوە.

دوای تەواوکردنی چارەسەری نەخۆشیەکەم خۆم کۆکردەوەو ڕۆژی ٦/١٥ لەڕێگەی قەسری شیرینەوە گەڕامەوە کوردستان. لە ماوەی مانگی ٧ دا چەند جارێك کۆبوونەوەمان لەسەر بارودۆخەکە کرد بە تایبەتی پێمان لە سەر ئەوە دائەگرت پارتی نابێ هەتا هەتایە هەولێری بەدەستەوە بێتو گومرگی برایم خەلیل بخوات،واتە ئەبێت: یان ڕێککەوتن یان شەڕ.

هەرلەم ماوەیەدا بوو کە بڕیاری گواستنەوەی کاك عوسمان بانی مارانی لەگەڵ ٣٨١ پێشمەرگەدا بۆ سنووری میحوەری سماقولی درا. لەم کاتانەشدا بوو هەڤاڵ مام جەلال گەشتێکی بۆ ئەمریکا دەستپێکرد کە گرنگی تایبەتی خۆی هەبوو.

## بۆ تەنگیسەر

لە ٨/١٥ دا لەگەڵ کاك کۆسرەتو مەلا بەختیارو سەعدی ئەحمەد پیرەو شێخ جەعفەرو عوسمانی حاجی مەحمودو حاکم قادردا سەردانێکی گەندی تەنگیسەرمان کردو چووینە سەر گۆڕی شەهیدی سەرکردە کاك ئارامو لە لایەن خەڵکییەوە پێشوازییەکی گەرم کراینو دەیان ژنو منداڵو لاوو پیر هاتبوونە سەر ڕێگاکەمان، ئەم بەسەر کردنەوەیە منی خستەوە دۆخی ئەو ڕۆژانەی سەرەتای شۆڕشو کارکردنی ئەم سەرکردەیە لەو هەلە سەختانەدا کە ئەمڕۆ بەرهەمی کۆششو ڕەنجی ئەوو سەدان تێکۆشەری ترە کە بەو پەڕی بڕواوە خۆیان بۆ ئایندەی گەلەکەیان ئەسووتان.

نیوەڕۆ لە ماڵی ئەحمەدی حاجیساڵح بووین لە قازانقایەو پاشان چووینە سوڵەو دێلێژە، ئیوارەکەی گەڕاینەوە سلێمانی.

هەڤاڵ مام جەلال لە ٨/٢٠ دا گەڕایەوە کوردستان، لەو گەشتەیدا چاوی بە گەورە لێپرسراوانی ئەمریکا کەوتبوو، لە بابەت جێگری سەرۆك کۆمارووەزیری دەرەوەو سکرتێری نەتەوەیەکگرتووەکان کوفی ئەنان. هەروا لە

بەریتانیاش چاوی بە گەورە لێپرسراوان کەوتبوو، لە تورکیاش چاوی بە ئیسماعیل جەم‌وەزیری دەرەوەی تورکیاو جێگرەکەی‌و چەندین کەسی ترلە سەرکردایەتی عەسکەری کەوت. لە ئێرانیش سەردانی ئایەتوڵڵا حەکیمی کرد.

ڕۆژی ٨/٢٩ لە قەڵاچوالان بە ئامادە بوونی هەڤاڵان مام جەلال‌و کۆسرەت‌و جەبار فەرمان کۆبوونەوەی فەرماندەیی کراو بە دوورو درێژی باسی گەشتەکەی بۆ دەرەوە کردو لەو کۆبوونەوەدا باسی بارودۆخی ناوخۆش کراو ئینجا مەسەلەی شەڕیش باسکرا گەر پارتی ملی بۆ ئاشتی نەدا.

لە ڕۆژی ٩/١٠ بە ئامادەبوونی هەڤاڵ مام جەلال بەشداریمان لە ئاهەنگی خولی یەکەمی دەرچووانی لەشکری سلێمانی‌و فەرماندەیی حەوتی سلێمانیش کرد، هەڤاڵ مام جەلال‌ووتارێکی دوورودرێژی دا لە بارەی هەلومەرجی کوردستان لە ڕووی سیاسی‌و سەربازی‌و نەتەوەیی‌و ٣١/ ئاب‌و دەستپێکردنی شۆڕش لە ئەیلول ١٩٦١ دا.

# گەردەلوولی تۆڵەی دووەم

جارێکی تر لە ڕۆژی ٩/١٤ لە قەڵاچوالان بە سەرپەرشتی هەڤاڵ مام جەلال‌و ئامادەبوونی هەموو ئەندامانی فەرماندەیی گشتی، کۆبوونەوەیەك کراو ئاماژە بە دۆخی شەڕ لەگەڵ پارتی‌و دۆستایەتی ئێران‌و سەردانی کاك جەبار فەرمان بۆ ئەوەی دەنگوباسی خراپی‌وەزعی پارتی شیکرایەوە.

دوای ئەمە چەند کۆبوونەوەیەکی تر کرا، هەر لەم بارەیەوە دواجار ڕۆژی ١٠/٩ لە قەڵاچوالان کۆبوونەوەیەکی چڕو پڕ کراو بە پێی نەخشەیەکی داڕێژراو بڕیار درا کە هێرش لە شەوی یەك شەممە لە سەر دوو شەممە دەستپێبکرێ لە ژێر ناوی } گەردەلولی تۆڵەی دووەم{ دا کە هەموو بەرەکانی هێرشەکە بەم شێوەیە دابەشکرا:

ـ قـۆڵی هـیران: هـەڤاڵان: کۆسـرەت ـ شـێخ جەعفـەر ـ تۆفیـق کانیوەتمانیو چەند برادەرێکی تر، بڕیار درا کاک تۆفیق بە هێزەکەیەوە بە نهێنـی بـە نـاو هێزەکـانی پارتیـدا بـڕواتو لەسـەر سـەفین خـۆی بشارێتەوەو لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕدا پەلاماری کەپکی شیلانە بـدات، چونکە شوێنێکی سـتراتیژییەو چـەندین جـار هەوڵـدراوە بـۆ گرتنـیو نـەگیراوە. کـاک شـێخ جەعفەریش لـە سـەر جادەوە پـەلاماری پێگـەی هێزەکـانی پـارتی بـدات بـەرەو ئاقووبانو شەقڵاوە.

ـ قۆڵی دۆڵی بالیسان: هەڤاڵان: جەبار فەرمان ـ عومەر فەتاح ـ کوردۆ ـ مستەفا سەید قادر ـ عەدنان حەمەی مینا ـ عوسمانی حاجی مەحمود ـ مەلا نـەجم. هەر هەڤاڵێك شوێنی خۆی بۆ دیاریکرا:

- عەدنان بۆ کەپکی حەمەد ئاغا
- عوسمان بۆ شاخە سوور
- مەلا نەجم بۆ لای دۆڵی ئالانە
- کـوردۆیش هێزەکـانی کرایـە دووبەشـەوە: بەشـێکی بـۆ گرتنـی کـلاو قاسمو بەشێکی بۆ شاخی شەکرۆك

ـ قۆڵی چۆمان: هەڤاڵان محسن بایز ـ حەمەی حاجی قادرو برادەرانی تریش.

ـ قۆڵی کۆیە: هەڤاڵان ئەرسەلان ـ بورهان سەعید سۆفی.

ـ قۆڵی سماقولی: هەڤاڵان ملازم عومەر ـ مەحمود سەنگاوی.

دیارە هەموو هێزەکانی یەکێتی هەریەکە بەرەو قۆڵی خۆی بە ڕێکەوتن.

ڕۆژی ١٠/١١ لـە سـەربازگەی سـەلام لـە گـەل هـەڤاڵ مـام جەلالـدا کۆبوونەوە، بڕیار درا شەوی ١٢ ـ ١٣ /١٠ هێرش دست پێبکرێ، تاکو پارتی مل بـۆ ئاشتی بـدات، ڕۆژی ١٠/١٢ هـەموو هێزەکان گەیشتبوونە سەربازگەی ڕانیـە بەشداری مانۆڕێکی سەربازییان کرد، ئەمە لە خۆیدا هەڕەشـەیەکی گـەورە بـوو بـۆ سـەر پـارتیو ئاگادارییـەك بـوو بـۆ هـەنگاونان بـەرەو شـەڕ کـردن. دوای مانۆڕەکە هەموو هێزەکانمان بەرەو شـوێنە دیاریکراوەکان ڕۆیشتن، کـە هـەموو

لێپرسراوانی پێشمەرگە چەندین جار بە نهێنی چووبوونە سۆسەکردنو چاودێری کردنی جموجوولّی پارتیو هێزەکانیو دەستنیشانکردنی خاڵی پەلاماردان.

شەوی ١٢ ـ ١٠/١٣ لە هەموو قۆڵەکانەوە لە کاتژمێر دووی شەودا هێرشی بەر بلاّو کرایە سەر هێزەکانی پارتی، لە ناوچەکانی حاجی هۆمەرانەوە تاکو سماقولی.

ئێمە لە قۆڵی سماقولییەوە بووین. لە کاتژمێری نۆدا لە چوارلاوە پەلامارماندان:

ـ لای یەکەم/ بۆ سەر چیای بەنەباوێ کە حەوت ڕەبایە بوو لە لایەن هێزەکانی میحوەری دووکانەوە پاککرایەوە.

ـ لای دووەم/ دۆڵی سماقولی بوو لە لایەن هێزەکانی میحوەری سماقولییەوە دوای شەڕێکی سەخت هەموو ڕەبایەکانی بارەگای فەوجو لیواکانی کە پێنج ڕەبایەی بارەگای لیوای ٢٧ی سوپای هەشتو بارەگای لیوای ٥٢ ی سوپای کەرکوكو بارەگای لیوای ٨ ی سوپای ٨ بوو گیران.

ـ لای سێیەم/ سەری سۆرکی سوسێ بوو کە حەوت ڕەبایەی تێدا گیرا.

ـ لای چوارەم/ ناو دارۆکان بوو.

بە گشتی ١٩ ڕەبایەو کۆمەڵێك بارەگایان لێگیراو کوژراوێکی زۆریان هەبوو ٦ کەسیشیان بە دیلگیراو دەیان پارچە چەك تێیدا حەوت دۆشکا دەستکەوت بوو. زیانی ئێمەش ٧ شەهیدو ١٣ بریندار بوو.

لە قۆڵی هیرانیشەوە بەپێی ئەو نەخشەیەی داڕێژرا بوو فەرماندەیی دووی هەولێرو حەوتی سلێمانیو میحوەرەکانی ـ تۆفیق کانیوەتمانیو هێزە تایبەتەکانی کاك کۆسرەتو تۆپخانە پەلاماری ئەم شوێنانەیان دا:

هەموو ڕەبایەکانی سۆرکی هیرانو دارەبەندو کەپکی شیلانەو کەپکی حاجی ساڵحو دێی ئاقوبانو گردی گەورەو گردی جاسوسان، هەموو ئەمانە لە ماوەی ١٠ خولەکدا لە هێزەکانی پارتی پاککرانەوە. تەنانەت هێزەکانی

میحوەری تۆفیق کانیوەتمانی پێشرەوییان کردو گەیشتنە کەپکی قەل. کە ئەروانێتە سەر شەقلاوەدا.

لە هەمان کاتدا پێشمەرگەکانی هێزیوەرتێ و چەکوچو هێزەکانی کاروخو جووتیارانو شەهیدانی ماکۆك، پەلاماری زنجیرە چیای درەبییان داو دەستیان بە سەرا گرت.

لە قۆڵی بالیسانیشەوە برادەران هەڵمەتی شێرانەیان بردە سەر شوێنەکانی پارتیو لە یەکەم پەلاماردا کڵاو قاسم لە لایەن هێزەکانی فەرماندەیی گەرمیانەوە گیراو هێزەکانی کەرکوکیش شاخە سووریان گرتو هێزی هاوبەشی کەرکوكو گەرمیان شاخی شەکرۆكو زینەتیریان کۆنترۆڵ کردو هێزەکانی شارەزووریش کەپکی حەمەد ئاغایان گرتو هێزکانی بتوێن لە دۆڵی ئالانە پێشرەوییان کردو شوێنە دیاری کراوەکانیان گرت.

ئەم چالاکییە پارتی راچڵەکاندو لە هەموو لایەکەوە شوێنەکانیان لێئەگیراو هێزەکانی خۆیان پێ رانەئەگیرا لەبەر هەڵمەتی شێرئاسای پێشمەرگەکانی یەکێتی، هەر لەم کاتەدا هێزەکانی هاوپەیمانی لە گەڵ پارتیدا کەوتنە شەرو پەکەکەش لە قۆڵی خۆیەوە دەستیان پێکردو توانییان ناوچەی سیدەکان بگرن. پەکەکە لەم شەرەدا زیانیان لێکەوت کە لە ناو هەولێرو شارەکاندا بارەگایان هەبوو، هەمووی گیراو زۆر خەڵکیان کەوتە دەست پارتی وپاکسازیکران.

رۆژی ١٠/١٤ رەبایەی دووی بارەگای فەوجی سێی قۆڵی بیرۆکانو دەوروبەری لە لایەن لەشکری سکرتاریەتی هەڤاڵ مام جەلالەوە دەستی بە سەرا گیرا، لە هەمان کاتدا هێزەکانی قۆڵی کەپکی حەمەد ئاغا گەیشتنە لووتکەی چەقەڵ سپیو بەسەر سپیلکدا ئەروانێ رزگارکراو دێیەکانی بناری ئالانەو ماوێز پاك کرانەوە. هەروەها پێشمەرگەکانی لەشکری باڵەكو لەشکری قەندیلو هێزەکانی ئامادەو هێزی ناودەشت هێرشی پارتیان تێکشکاندو بەرەو سینی دارسەلانو شیرکاوە راویاننان. دیسانەوە لە قۆڵی هیرانەوە هێرش بۆ سەر

شاخی سەفین و دانازوکەیکی قەل دەستیپێکردو گیران و لە سەر جادەشەوە پێشڕەوی کراو گەیشتینە دووری ٤ کم لە شەقڵاوە.

لەم کاتانەدا بوو هێزەکانی مەڵبەندی شارەزوور هاتنە لای ئێمە بە سەرپەرشتی کاك شەوکەت کە لێپرسراوی مەڵبەندی شارەزوور بوو لە گەڵ سەید کەریم کاکە حەمەی خەلیفەو سەرداری غەفوری سلێمان، لە پەلامارێکدا زنجیرە چیای بەنەباویٚ بەهاوکاری هێزەکانی دووکان و میحوەری سماقولی لە ماوەی یەك کاتژمێردا بە تەواوی پاککرایەوە.

# پەنابردنە بەر توركیا

پارتی تووشی شکستێکی کەمەر شکێن بوو، زۆر ترسی لێنیشت کە ئەم هێرشە نەوەستیٚ و شوێنەکانی تری لێبگیریٚ. بۆیە زۆر بە پەلە پەنای بۆ تورکیا بردو تورکیاش بیٚ سیٚودوو کردن ئامادەبوو بۆ هاوکاریکردن بە پێی ڕێککەوتنێك لە نێوانیاندا، هێزێکی بۆ هاوکاریکردن بە تانك و تۆپخانەوە هێنا، هەروەها فڕۆکەکانی بۆ گرتنەوەی پارتی لە شکست و ڕاگرتنی هێرشەکانی یەکێتی و هاوپەیمانەکانی بەشداری پێکرد.

ڕۆژانە ئێمە هەواڵی هاتنی سوپای تورکیامان پێئەگەیشت تاکو بە چاوی خۆمان بینیمان کەوا گەیشتنە بەرەکانی شەڕی شەقڵاوە - هەریر - گۆمەسپان. تورك تۆپخانەیان بەرامبەر هێزەکانمان دامەزراندو تانکەکانیان مۆڵ دا.

ڕۆژی ١٠/١٥ یەکەم دەستەی فڕۆکەی تورکیا هاتنە ئاسمانی ناوچەکانی شەڕو پەلاماری سەنگەرەکانی ئێمەیان دا. بەتایبەتی لە شاخی شەکرۆك بە شێوەیەکی دڕندانە بۆمبارانیان کرد، چەندین شەهیدو بریندارمان دا، بەڵام پێشمەرگەوورەیان بەرز بوو، کاریگەریٚتی نێگەتیفی درووستنەکرد، ئێمە چاوەڕوانی ئەوەمان نەئەکرد کە پارتی و تورکیا بەو شێوەیە پێکبێن و تورك بە

هەموو چەك‌و چۆڵەیەوە بێنە ناو كوردستان‌و ببنە لایەنێكی شەڕو پشتیوانی لەلایەك دژی لایەكەی تر بكەن، ئەگەر بیانووی پەكەكەش بە دەستەوە بێ كە هیچ قورسایی بۆ ئەو درووستنەكردبێ، خۆ هەولێرو دهۆك نەبوو بوونە پارێزگایەكی توركیا، تا ئەو مافەی هەبێ بەرگرییان لێبكات.

فڕۆكەی توركیا ڕۆژی ١٠/١٥ بۆردومانی شاخی مامە ڕووت‌و گردی گەورەو سەری باڵەكیان كردو پارتیش هێرشیان كرد لەلایەن هێزەكانی چەكوچ ـــا و چەكوچ ٢ـ ووەرتێ‌و جووتیاران‌و ماكۆك‌و شەهیدان‌و كاروخ بەربەرچدرانەوەو ڕاویاننان.

هەروەها ڕۆژی ١٠/١٦ پارتی دژە هێرشێكیان كرد بۆ بەنی هەریرو لەلایەن هێزەكانی شارەزوورو میحوەری بالیسان‌و ڕەواندزو پشدەر تێكشكێنران‌و خەڵكێكی زۆریان لێكوژرا ٥ كەسیان لێ بەجێما.

هەر لەم ڕۆژەدا فڕۆكەكانی توركیا بۆ ماوەی یەك كاتژمێر شەكرۆكیان بۆردومان كرد. لە پەنا ئەو پشتیوانییەی توركیادا شەوەكەی هێزەكانی سوپای ڕزگاری پەلاماری چیای بنەباوێ یان داو سەركەوتنیان بە دەست نەهێناو زیانی زۆریان لێكەوت، كە لاشەی ١٢ كوژراویان لە شەڕگەكەدا بە جێهێشت‌و ١١ تریشیان بردەوە.

پارتی ئەیویست لە ڕێگەی ڕادیۆكەیانەوە گوشاری ئەو شەڕە كەمبكەنەوەو هەندێ هەواڵی درۆ بڵاو بكەنەوە گوایە شاخی بەنەباوێیان گرتۆتەوە، كە كۆمەڵێك هێزی تۆكمەی یەكێتی لێبوو.

لە هەمان كاتدا ئێمە لە ڕێگەی ئێزگەوە داوامان لە خەڵكی كرد كە بچن تەرمی كوژراوەكانیان ببەنەوە كە لە شەڕگەكەدا بڵاو بوو بووەوە، لە ناوچەی گەلاڵەش لە ژێر گوشاری هێزەكانی یەكێتیدا بوون، لە میحوەری وەرتێ‌و خانە قاوە هێرشیان كرد بەڵام هیچیان پێنەكرا.

له قۆڵی سماقولییەوە شەوی ١٦ ـ ١٧ / ١٠ له چوار قۆڵەوە هێرشیان هێنـا، له دیوی‌ونکەو عەلیاوا شەڕ بۆ ماوەی ٣ کاتژمێر بەردەوامبوو، پارتی تێکشکان‌و ٢٨ کوژراویان له بەردەم سەنگەرەکانماندا بەجێ مابوو.

ئـەوەی لـەم شـەڕانەدا بـەدی ئـەکرا بەشـداری تۆپخانـە بـوو، کـە فشاری خستبووە سەر پارتی، بە تایبەتی کاتێ ڕۆکێتی} گراد{ ەکان ئەگەیشتە سـەری ڕەش‌و ترسێکی زۆری خسـتبووە نـاو دڵـی سـەرانـی پارتییەوە.

لەم کاتانەدا هەڤاڵ مام جەلال لەگەڵ دێڤدوێڵشدا له بارەی ئـەم شـەڕەوە قسەیکردبوو، ئەویش لەگەڵ تورکەکاندا قسەی کردبوو، ئەنجامەکەی بـاش بـوو، تورك ووتبوویان گەر یـەکێتی‌واز لـە بۆردومـانی سـەری ڕەش بهێنـێ، ئـەوانیش بۆردومـانی فڕۆکـە ڕائـەگرن، هـەروەها داوای کردبـوو کارەبـای هـەولێریش بدرێتەوە، له ئەنجامی ئەمەدا هەڤاڵ مام جـەلال ئـەم برووسکەیەی بـۆ هـەموو لایەك کرد:

( دوێنـێ تورکـە پـەلامار دەرەکان بـە هـۆی ئـەمریکاوە داوایان کـرد کـە ئێمەواز له بۆردومانی سـەری ڕەش بهێـنین‌و ئـەوانیش‌واز لـە فڕۆکـە هەڵسان‌و بۆردومان کردنمان بهێنن. بەمەش توانیمان بـە هێـزی خۆمـان دوژمنـی تـۆرانی ناچار بکـەین‌واز لـە لایـەکی دوژمنایەتیەکەی بهێنـێ. هـەروەك دەریـش کـەوت ئەوەیان بۆ فریاکەوتنی جاشەکانیان کردووە ).

لـە ڕۆژی ١٠/١٧ هێزەکـانی لەشـکری باڵـەك‌و لەشـکری قەنـدیل‌و هێـزی ناودەشـت‌و هێزەکـانی سۆسیالیسـت مـەفرەزەکانی قـەزای چـۆمان‌و ڕەوانـدز‌و تۆپخانە لە ٥ قۆڵەوە پـەلاماری هێزەکانی پارتییـان داو ئـەم شـوێنانەیان ڕزگـار کـرد: ناحیـەی گەڵاڵـەو شاخەسـپی‌و زینـی دارولسـەلام‌و گـرد کـۆتری‌و شـاخی درداسن‌و دێیەکانی ئۆمەر ئاواو ناو کەیلاکان‌و پاشکۆڵ‌و دارولسەلام‌و گوێزینەو شیرکاوەو چۆمانی بچووك‌و باڵەك. هەر لەم ڕۆژەدا بوو فڕۆکەکانی تورك چیای شەکرۆکیان بۆردومان کردو سەید جەوهەری فەرماندەی ئـازا شـەهید بـوو، کـە پێشمەرگەیەکی کۆن‌و پارتیزانێکی چاونەترسـی دوای ئەنفالـەکان‌و قارەمـانێکی

گۆڕەپانی خەباتی بێووچانی هەموو ناوچەکانی کوردستان بوو، بە ڕاستی ئەم هەواڵە بزیسکەی لە ناخمان هەڵساند، دلێرێکی کوڕی تێکۆشانمان لە کیس دا کە هەرگیز لە مردن نەئەترسا، هەمیشەووره بەرزو خۆڕاگر بوو، ئامادەی خۆ بەختکردن بوو، هەموو ژیانی بۆ کوردو کوردایەتی تەرخانکردبوو، نەفرەت لەو شەڕەی کەوا گیانی کوڕە ئازاو دڵسۆزەکان ئەسووتێنێ.

ڕۆژی ۱۰/۲۰ لە ئەنقەرەو لەوەزارەتی دەرەوەدا کۆبوونەوەیەکی نارەسمی کرابوو، دواتر ئەوەیان ڕاگەیاندبوو کە دوو ڕۆژ ئاگربڕیان درێژکردۆتەوەو داواش لە نوێنەری یەکێتی کرا بوو لەم بارەیەوە ئاگاداری سەرکردایەتی بکاتەوە. دیارە پێشتریش ئاگربڕێکی تر کرا بوو، بەڵام تورکەکان تێکیانداو بۆردومانیان دەستپێکردەوە. بە ڕای ئێمە ئەم درێژکردنەوەیە نیازپاکی بۆ شەڕ ڕاگرتن نییە، بەڵکو بۆ خۆسازدان‌و هێزهێنانی ترە بۆ سەر یەکێتی.

جارێکی تر هەڤاڵ مام جەلال‌و دیڤدویڵش پێکەوە قسەیانکردەوە، ئەم جارەیان زۆر نەرم‌و ئیجابی بووەو هەڵوێستی باشتر بووە ئەم جۆرە قسەو پەیوەندی کردنە هەنگاوێکە بۆ ئەوەی دۆخەکە هێور بکرێتەوە. دیارە لە مەدا دبلۆماسییەتی یەکێتی کاری خۆی کردووەو دکتۆر بەرهەم هەمیشە لە هەوڵدا بووە بۆ تێگەیاندنی ئەمریکییەکان.

بە پێی هەندێك هەواڵ P.M.F لە قۆڵی دێگەڵە - کۆیە سەنگەرەکانی هێزی یەکێتیان لە سەر نەخشە دیاریکردووە بۆ لێدان‌و هێرشکردن‌و بۆردومانی فڕۆکەی تورکیا.

ئەوە بوو ڕۆژی ۱۰/۲۳ فڕۆکەکانی تورکیا هاتنەوە سەر ئاسمانی شەڕ گەکانمان، بەمەش ئاگربڕ کۆتایی هات، بە تایبەتی بۆردومانی سەنگەرەکانی یەکێتی لە بەنی هەریر، کەپکی حەمەد ئاغا، سەرەزێ، حەمەد عەباسان ، مەتەڕێزان کردبوو بۆ ماوەی کاتژمێرێك زیاتر.

هەر ئەمڕۆ سەردانێکی کاك کۆسرەتم کرد لە پونگینە، لەو کاتەدا فڕۆکەکانی تورك بە سەر ناوچەکەدا ئەسووڕایەوەو دەنگوباسی هێرشی پارتی

بـو سـەر ناوچـەی کویـە هـەبوو، دوای چـاوپێکەوەتنو قسـە کـردن لـە سـەر بـارودۆخی شـەڕەکە گەرامـەوە بـۆ دۆڵـی سمـاقولی لای بـرادەران. ڕۆژی ١٠/٢٤ هێزەکـانی میحوەرەکـان پـەلاماری زنجـیرە ڕەبایـەکانی سـەری مەیـدانو داری جـوخێنو ڕەبایـەی زنجیرە چیای نیشتـەی سـەرووو نیشتەی خوارووویانـدا کـە هـەموویان هەشـت ڕەبایـە بـوون، دەسـتیان بـە سـەرا گـیراو لـە هـەمان کاتداپەلاماری ڕەبایەی دێی ناودارۆکانو سولاوکو بەرزاییـەکانی دەورو بـەریان داو گرتیانن. پارتی دژە هێرشیکیان بۆ سۆلاوك کـرد بـەڵام تیکشکان. لـە زۆر قۆڵی تریشەوە شەڕو پەلامار هەبوو زۆر شوێن لـە پـارتی گیرانو زیـانی زۆریـان هەبوو. فڕۆکەی تورکیش بۆردومانی خۆی ئەکرد.

جاریکی تریش هـەڤاڵ مـام جـەلالو دیڤـدوێڵش قسـەیانکرد، د.بەرهـەمو فرانك بیکەریش پێکـەوە قسـەیانکرد، ئـەوان ئـەڵێن گوایـە گوشـاریان خسـتوەتە سەر تورك. خوشحاڵییان دەربریوە کە زیانمان کەمبووەو نەیانتوانیوە پێشڕەوی بکـەن.د.بەرهـەم لـە ئـەمریکادا هـەوڵی باشـی داوەو چـەندین سـیناتۆرونوێنەر نامەیان بو ئۆڵبرایت ناردووە دژی بوردومانی تورکو شەڕ فرۆشتنی بە یـەکێتی نیشتمانی کوردستانو دەستوەردان لە کاروباری کوردستان.

پـارتی لەگـەڵ بۆردومانـەکانی تورکیـادا بـە فڕۆکـە لـە ئاسمانـەوە ئەیانویست لـە زەوییـەوە هـەوڵێك بـدەنو گوشـاریك بخەنـە سـەر هێزەکانمـانو گورێکیـان پیـدا بێتـەوە، بۆیـە ڕۆژی ١٠/٢٥ بـە هـۆی تۆپخانـەی تورکـەوە بۆردومانیکی خەستی سـەنگەرەکانی یـەکێتیان لـە چیای سـەفین کـردو لـە دوو قۆڵیشەوە هێرشیان دەستپێکرد.

- لە چیای سەفینەوە بۆ کەپکە قەل.
- لە شاخی خۆرانەوە بۆ کەپکی حاجی ساڵەح.

بـەڵام لـە هـەردوو قۆڵەکـەوە ل ووتیـان شـکاو نـەیانتوانی پێشـڕەوی بکەنو کوژراوو بریـنداری زۆریان هەبوو. بۆ بـەر پەرچـدانەوەی ئـەم هێرشـەی پـارتی فەرمانـدەیی دوو پـەلاماری زنجـیرە چـیای نێـوان دیگەڵـەو کۆیـەیان داو

کەپکی سپیو چەندین شوێنی تریان لێگرتن. ئەمە کاریگەری خۆی هەبوو بۆیە مەسعود بارزانی هاتبووە سەر جیهازوجوێنی زۆری بە بەرپرسەکان دابووو هەڕەشەی گرتنەوەی شوێنەکانی لێکردن کە لێیان گیرا بوو. بۆیەش کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ هێزەکانی پارتی بە پاڵپشتی تۆپخانەی تورك کە حەسەن قەبڵان سەرپەرشتی ئەکرد پەلاماری سەنگەرەکانیاندا. بەڵام هێزەکانمان ئازایانە لێیان هاتنە دەستو پاش کوشتاریکی زۆر کاتژمێر پێنجی ئێوارە گەڕانەوە گەرووی عارەقان، لە ژێر گوشاری مەسعود بارزانیدا جارێکی تر کاتژمێر حەوتی ئێوار دیسانەوە بەهاوکاری تۆپی قورسو هاوەنی ۸۲و ۱۲۰ ملم هێرشیان کردەوەو تا ۱۱ی شەو بەردەوام بوو، ئەمجارەش تێکشکانو بەرەو چێشکەو گەرووی عارەقانو سەرووی کوڕەدێر ڕایان کردەوە.

ڕۆژی ۱۰/۲٦ لە ڕۆژەکانی تر جیاواز بوو کە فڕۆکەکانی تورك بوردومانیان ئەکرد پارتیش هێرشی ئەهێنا بۆ ڕەبایەکانی سەر مەیدانو دار جۆخینو بەرمێشان. فڕۆکەکانی تورك بۆمبی گەورەو بۆمبی چارەکە تەنیان ئەهاوێشت. لە ماوەی ۱ کاتژمێردا ۱۱ بریندارمان دا. جارێکی تریش هەمان شوێنی تریان بۆردوومان کردەوە کە بە هەمووی ۲٦ بۆمبیوەشاند لە سۆرکی سوسیو کانی هەرمێو کلاوی قەسرۆكو گەرووی دار بە مازووو سەر بەنەباوێشی گرتەوە. دیسانەوە هاتەوە سەرمانو بۆ ماوەی ۱ کاتژمێر بۆمبارانی کردین لە بەنەباوێو ناودارۆکانو لای سولاوكو لە ئەنجامدا ۱۰ بریندارمان دا. لە هەمان کاتدا ٤ فڕۆکەی تورکی بۆمبارانی سەنگەرەکانی گوشینەو مەڕی سەرو ڕۆستیان کرد.

قیادەی مەیدانی زۆر بیریان لەوە ئەکردەوە کە تەکانێ بدەن بۆ هەندێ شوێنی پارتی لە سەر جادەی هەریر- شەقلاوە بۆ ئەوەی ئەو هێڵەی هاتوچۆی پارتی ببڕنو گوشاریان بکەوێتە سەر، بۆیە بیر لەوە کرایەوە کە پەلاماری سپیلكو سیساواو قووتەی سۆری نێوان هەریرو شەقلاوەو گردی شەهید حەمید بدرێ. بە تایبەتی کە تۆپخانەی تورکیش هاتبووە سەرووی گەرووی

شـەقلاوە، بـەڵام ئەبوایـە هـەمووهێزەکان لـەو بەرەیـەداو بـە درێـژایی پـەلامار بـدەن، بۆیـە هەنـدێ زەحمـەتی تێـدابوو لەگـەڵ ئەوەشـداوەکو چـالاکییەك هەنگاوێکی بـۆ نـراو هێزێکـی فەرمانـدەیی شارەزوور لـە قـۆڵی بـەنی هـەریرەوە شەوێکی درەنگ پەلاماری ڕەبایەکانی دێی باویان‌و سیساوایان داو لـە ماوەیـەکی کەمدا ڕەبایەکانیان گرت لە گەڵ بارەگای ڕێکخـراوی سیسـاوادا ئاگریـان تێبـەردا ئەمەش بۆ خۆی هەڕەشەیەکی گەورە بوو. بـۆ ڕەتدانـەوەی ئـەم کـارە پـارتی لـە دوو قۆڵـەوە هێرشـیان بـۆ بـرادەران کـردو بـە تونـدی شـکێنران‌و بـرادەرانیش گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان. هـەر ئـەو ڕۆژەش فڕۆکـەکانی تـورك بـۆ مـاوەی ١ کاتــژمێر بــە بــۆمبی هێشـوویی‌و ناپـاڵم‌و شەسـتیر بۆمبـارانی سـەنگەرەکانی پێشـمەرگەیان لـە شـاخە سـوورو زەرتکـان کـردو بـرادەران بـێ زیـان بـوون، پێشـمەرگەش بـە کلاشـینکۆف‌و بیکەیسـی‌و ئـاربیجی تەقـەیان لێکـردن. ئێمـە ئەمانویست لە قۆڵی دێگەڵەو کۆیە جووڵەیەك بکەین‌و هەنـدێ ڕەبایـەی پـارتی بگـرین، دوو شـەو پـێش ئـەوە هێزێکـی فەرمانـدەیی دووکـان‌و گـەرمیانمان بـۆ نـاردبوون بـە هاوکـاری هێزەکـانی ئـەو قۆڵـەی کۆیـە بـەڵام لـە بـەر هەنـدێ کەموکوڕی هیچیان نەکردبوو. بۆیە لە گەڵ کاك کوردۆو م.عەلی‌و عوسمان بـانی مارانی‌و مامە غەفەو بورهانی سەعید سۆفیدا، چووینە بان شاخی عەزیز گاوان بـۆ سۆسـە کـردن‌و تەماشـاکردنی شـوێنەکان کـە ١٥ ڕەبایـە بـوون. لـە کـاتی گەڕانەوەمانـدا ٨ فڕۆکـەی تـورك جـۆری ئیـف ١٦ دایـان بەسـەر دۆڵـی سمـاقولی گرتك‌و گەلیداو بۆمبەکانیان داچۆڕاندو باش بوو زیانی گیـانی بـە دواوە نـەبوو تەنیا ئۆتۆمبیلێکی بەرازیلی‌و کۆستەریك بەرکەوتن‌و لە کار کەوتن.

پـارتی لـە سنووری دێگەڵـەدا تەحەشـودیان هـەبوو، هێزەکـانی سـوپای دووی جەمال مۆرتکەو سۆپای دووی هەرکییان هینابوو. لـە ڕۆژی ١٠/٣٠ پـارتی بە پاڵپشتی تۆپخانـەی تـورك لـە ٣ قۆڵـەوە هێرشـیان کـردە سـەر سـەنگەرەکانی پێشمەرگە لە گوربە شیلانە بەڵام تێکشکێنران، بـۆ جـاری دووەمـیش هێرشـیان کردەوەوەکـو جـاری پێشـوو درا بـە پۆزەیانـا. بـۆ جـاری سـێیەم بـە هاوکـاری

فرۆکـەی تـورکی هێرشـیکی تریـان کـردەوە، ئـەمجارەش شکسـتیان هێنـاو ١٧ تەرمیان لە بەردەستی پێشمەرگەدا بەجێماو کوژراوو بریـنداری زۆری تریـان لەگەڵ خۆیان بردەوەو هەندێ دەستکەوتیش هەبوو.

بـەداخێکی زۆرەوە لـەو شـەڕە سـەختو دەسـتەو یەخەیـەدا دوو ڕۆڵـەی چاونەترسی یەکێتی بوونـە قوربـانی کە یـەکیکیان شیرە پیاوی دۆڵـی بالیسـان فەرماندەی ئازا مەلا نەجمو ئەویتریان کوڕی دڵسۆزی دەشتی شـارەزوور فـازڵ شـیرەمەڕی بـوو، کـە هـەردووکیان دوو فەرمانـدەی قارەمـانو دوو پـارتیزانی بلیمەتی گەلەکەمان بوون لە ڕۆژی تەنگانەدا. ئەمە زیانێکی قـورس بـوو لێمـان کەوت، هەرچەندە شەڕەکەش زۆر توندو تیژو هێرشـەکان گـەورەو فـراوان بـوو مەگـەر کەسـانیوەکو مـەلا نجـمو کاکـە فـازڵ ڕووبـەڕووی ئـەو جـۆرە شـەڕانە ببنەوەو دەستی دوژمن لە بندا بشکێننو نەهێڵن بێنە پێشەوەو لەو پێناوەشـدا گیانی خۆیان بەخت بکەن. هەر ئەو ڕۆژە فرۆکـەکانی تـورك لـە جـۆری فـانتۆم هێرشـیان کـرە سـەر دۆڵـی هـیرانو چـیای ئـاوەگردو بـە تـوندی سـەنگەری پێشمەرگەکانیان کووتا، بێ ئەوەی کار لەوورەی پێشمەرگە بکەن.

هەر ئەمرۆ سەردانێکی دووکانم کـردو لـەوێ منالـەکانم هـاتبوون بـۆلام چاوم پێیـانکەوتو ماوەیەکی کەم لایان مامەوەو ئـەوان گەڕانـەوە بـۆ سلێمانیو منـیش بـەرەو سماقولی چوومەوە. شـەڕەکان زۆر گـەرم بـوون، فرۆکـەی تـورکی ڕۆژانـەو بـۆ چـەندین جـار هـەر جـارەش بـۆ چـەندین کاتـژمێر بـە ئاسمـانی ناوچـەکەدا ئەسـووڕانەوەو بۆمبـەکانیان بـە سـەر سـەنگەرەکانی ئـەو ناوچـەدا بەتاڵ ئەکردەوە.

ڕۆژی ١٠/٣١ بـوو کـاك سـەعدی ئەحمـەد پـیرە لەگـەڵ پۆلیسـی دەولیـدا هاتنە دۆڵی سوسێ بۆ سەردانی بـەرەی شـەڕەکانو بینینـی شـوێنی بۆردوومـانی فرۆکەکانی تـوركو بـە چـاوی خۆیـان هـەموو شـتێکیان بینـیو زانیارییـەکانیان تۆمـار ئـەکرد. لـە قـوڵی سماقولییەوەویسـتمان جووڵەیـەك بکـەینو فشـارێك بخەینە سەر هێزەکانی پارتیو تەکانێك بەرەو پێشـەوە بـدەینو لـەم قۆڵەشـەوە

جێ پێیەك بكەینەوە بە تایبەتی لای دێگەڵەوە، بۆیە بە پێی نەخشەیەك بڕیارماندا هێزەكانی فەرماندەیی دووكان بە هاوكاری هێزەكانی مەڵبەندی شارەزوورو هێزەكانی فەرماندەیی گەرمیان كە كاك كوردۆ قاسم سەر پەرشتی ئەكردن‌و چەند ڕۆژێك بوو هاتبوونە لامان، پەلاماری ڕەبایەكانی كوڕەدێرو چێشكەو گەرووی عارەقان‌و ئەو دەورو بەرە بدەین كە ئەیانڕوانیە سەر دێگەڵەدا.

بۆیە خۆمان سازدا، دوای تەماشاكردنی هەموو جێگەكان شەوی١ـ١١/٢ هێزەكانمان هێرشێكی گەورمیان كردە سەر هێزەكانی پارتی لە كوڕەدێرو چێشكەو گەرووی عارەقان‌و كەپووی سپی‌و چل مەیتان كە ئەكەونە ئەمبەرو بەری چیای سەری دێگەڵەوە لەگەڵ هۆمەرە كوتە، مەلا بداغ، پانكی شێخ ڕەش، پانكی دارێ كە ئەكەونە زنجیرە چیای باواجی بەرەو دێگەڵە. هەر لەگەڵ یەكەم هەڵمەتدا فەرمانـدەیی ٥ ی دووكان ڕەبایەی چێشكەیان گرت‌وتیایا مانەوە، ١ شەهیدو چوار بریندارایان دا. فەرماندەیی گەرمیانیش شێرانە ڕەبایەی كوڕەدێریان گرت كە ڕەبایەكی گەورەو بەرفراوان بوو كاتی ڕژێمیش هەر ڕەبایە بوو. مامە غەفە بە پێشمەرگەكانی گەرمیانی‌ووتبوو كە ئەوان ناتوانن كوڕە دێرە بگرن كەچی بۆچوونەكەی‌وا دەرنەچوو بوو. هێزەكانی پارتی بە هەڵەداوان ڕایانكردو خۆیان پێنەگیرا، هەندێ پێشمەرگە بریندار بوون‌و دۆشكەیەكیان لەگەڵ هەندێ كەلو پەلدا دەسكەوت بوو. ئەو چەكدارانەی پارتی خۆیان گەیاندبووە ڕەبایەی چل مەیتان، ئەو هێزەی كە كاك حسین مەنسورو مەلاڕەحیم سەرپەرشتیان ئەكرد لە ڕێگا دەستیان لێكرابووەوەو ٥ شەهیدیان دا لەگەڵ هەندێ بریندارردا بۆیە بۆیان نەگیرا، كاك مەلا ڕەحیم فیشەكێك دابووی لە مەخزەنیكی پڕ فیشەك‌و ڕاوەستابوو تاكو هەموو فیشەكەكانی تەقیبوونەوە، خۆشبەختانەخۆی بێ زیان بوو. پێشمەرگەكانی مەڵبەندی شارەزووریش هەركە نزیك ئەبنەوە لەو ڕەبایەی بۆیان دیاری كرابوو كاك مەلا ئەحمەدی دسكەرە بە سەختی بریندار ئەبێ

لەگەڵ ٣ کەسی تر، ئیتر هیچیان پێناکرێ. ڕەبایەکەی عەلیاوایش لەلایەن گەرمیانییەکانەوە دەستی بە سەرا گیرا. ڕەبایەکانی تریش نەتوانرا بگیرێن، بۆیە چالاکییەکە کەموکوڕی تێکەوتو هەموو شوێنەکان کە دەستنیشان کرابوون وەکو پێویست نەگیران، ئەم شوێنانە گرنگی خۆیان هەبوو هەم دێگەڵە ڕزگاری ئەبوو هەم گومەسپانیش ئەکەوتە مەترسیو بگرە دۆڵی زیارەتیش پاك ئەکرایەوە. کە هێزەکانی پارتی زانیان هێرشەکەی ئێمە سستو خاوەو خاڵەکان کۆنترۆڵ نەکراوە. هێزیان بە هانای چەکدارەکانیانەوە نارد بۆ یارمەتیدانیان. ئێمەش کە زانیمان لەوە زیاترمان پێناکرێ کە ڕۆژ ببێتەوە تووشی زیانی زۆر ئەبین، لەگەڵ کاك کوردۆدا قسەمان لەگەڵ کاك ملازم عومەردا کرد بۆ کشانەوە بەرەو بەنەباوێ.

ڕۆژی ١١/٤ پارتی لە چوار قۆڵەوە پەلاماری زینی ماویلیانو قۆپی چەوریو بناری هەندرێنو زنجیرە شاخی تاوەرو ڕۆڵەیان داو لە شەرێکی دەستەویەخەی گەرمدا بەرەو دواوە ڕاونران. هەروەها لە میحوەری وەرتێشەوە بە پاڵپشتی تۆپی قورسو دوور هاوێژ هێرشیان کردو تێکشکێنران. ڕۆژی دوا تریش هێرشیان بۆ کێل کێلو ڕەشکیو دۆڵی ئاکۆیانو قۆپی مەڕەکێوی کرد هەرهەموویان تێکشکێنرانو زیانی زۆریان لێکەوتو کشانەوە بۆ شوێنەکانی پێشوویان. هەروەها تۆپبارانی خەستی هەردوو دێی بنمێردەو فەقێیانو زێڕینەیان کرد.

ڕۆژی ١١/٦ دوژمن سەنگەرەکانمانی لە بەنەباوێو چیای سوسێو دێی سوسێو بەرمێشانو سەرمەیدانو چێشکە بە تۆپی دوور هاوێژ ئاگرباران کرد، لەو کاتانەدابوو کە هێزیکی زۆری فەرماندەیی دووی هەولێرو فەرماندەیی ٥ ی دووکان، خۆمان ئامادە ئەکرد بۆ پەلاماردانی کوڕەدێرو گەرووی عارەقانو چێشکەو دەوروبەری، بەپێی نەخشەیەك هێزیکیش نێردرا بووە ڕێگەی حاجیووسوو بۆ لێدانی کاروانی ئوتۆمبیلی هێزەکانی پارتی، ئەم هێزانە بە سەر پەرستی کاك کۆسرت بوو، لەکاتی دیاریکراودا هێزەکان پەلاماری

شوێنەکانیان داو هەندێ شوێنیان گرت، دیسانەوە تووشی هەندێ گرفت بووین، بۆیەوەکو چاوەڕوان ئەکرا چالاکییەکە بە باشی جێبەجێ نەکراو بە ناچاری هێزەکانمان گەڕانەوە بنکەکانی خۆیان. لە ڕاستیدا نەئەبوایەوە ئەم چالاکییە ئەنجام بدرێ چونکە پێنج ڕۆژ پێش ئەمە پەلاماری هەمان ئەو شوێنەمان دابوو هەندێ سەرکەوتنمان بەدەست هێناو گەڕاینەوە، دوای ئەوەی پارتی ئەو ناوەیان باش قایم کردبوو، هەر هێرشیك بۆ ئەو ناوە ئەنجامی باش نەئەبوو. لە هەمان کاتدا لە قۆڵی باڵەکایەتیەوە هێزەکانی ئەو ناوە لە چوار قۆڵەوە دژە هێرشێکیان کردە سەر هێزەکانی پارتی لە گەرەوانی خواروو بەرەو ڕەبایەکانی سەر زیخانو کەڵەکین، لە شاخی زێڕینە بەرەو قەڵاتی ئاکۆیان لە دیبورەشەکەوە بەرەو جادەی ئاکۆیانو بنە کاول. لە ماوەیەکی کورتدا ١٤ ڕەبایەکەی سەر زیخانو کەڵەکینو سەر جادەی ئاکۆیانو گەرەوان گیرانو هێزەکانی پارتی پەرتو بڵاوکرانو ڕاونران.

ڕۆژی١١/٧ هێرش کرایە سەر هێزەکانی پارتی لە تەپۆڵکەی پشتی ماویلیانو گردی مەلیك کە بریتی بوو لە چوار ڕەبایەو دەستیان بە سەردا گیرا، هەروەها لە سێ قۆڵەوە هێرش کرایە سەر ڕەبایەکانی دەورو پشتی زیارەتو دەستیان بەسەردا گیرا. لەم ماوەیەدا زیاتر بایەخ بە چالاکی پارتیزانی ئەدراو پەلاماری دوژمن ئەدرا. بۆوەرسکردنی چەکدارەکانی پارتی. هەتا ئەهات دۆخەکە ئاڵۆزتر ئەبوو زانیاری زۆرمان بۆ ئەهات هێزی سوپای تورکی نیازی جموجووڵی زیاتریان هەیە بە تایبەتی کە ڕۆژانەو بەردەوام فڕۆکەکانیان لە ئاسمانەوەو لە هەموو قۆڵەکانەوە هەڵیان ئەکوتایە سەر سەنگەرەکانی پێشمەرگەو تۆپخانەی تورکی بۆردومانی چڕو پڕی بەرەکانی شەڕو سەنگەرەکانیان ئەکردین، هەروەها هەواڵی هاتنی ژمارەیەکی زۆری تانکی سوپای تورکمان پێ ئەگەیشتو خۆشمان لە قۆڵی شەقڵاوەوە هاتوچۆی ئەو تانکانەمان ئەبینی. بەوەدا زانیمان کە بەرنامەیەکی تەواویان هەیە بۆ پەلاماردانمان. چونکە تورکیا زۆر بە جیدی هەوڵی ئەوەی ئەدا کە یەکێتی لە

سەنگەرەکانی پێشەوەی بکشێتەوە بۆ شوێنەکانی ڕۆژانی پێش ئەنجامدانی ئەم شەڕە. ئەوەی کردبوو بە مەرجێك بۆ ڕاوەستانی هێرشەکانی خوی بۆ سەر یەکێتی. بۆیە ئێمەش خۆمان بۆ ئەو کارە ئامادە کردبوو کە بەرپەرچی هاتنی سوپای تورك و پارتی بدەینەوە.

## پەلامارە زەمینیی و ئاسمانییەکانی تورک

ئەوە بوو بەرەبەیانی ڕۆژی ١١/٨سوپای تورك بە دەیان تانکی تازەو پێشکەوتوو بەشداری هەزاران کۆماندۆو هێزی شرۆڵەی پارتیو بە پاڵپشتی ٨ فڕۆکە لە جۆری F16و F4 پەلاماری سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگەیان دا لە بەری سوسێو زنجیرە چیای بەنەباوێ. هێرشەکە بە جۆرێك بوو کە دەنگی فڕۆکەکانو تانکەکان تێکەڵ بوو بوونو پێشمەرگەوایئەزانی هەر لە ئاسمانەوە بۆمباران ئەکرێ، کەچی هاوکات تانکەکانیش پێشڕەوییان ئەکرد بە بێ ڕاوەستانو هەڵیان ئەکوتایە سەر بنکەو سەنگەرەکانی پێشمەرگە.

پێشمەرگەکان هاتبوونە دەرەوەی سەنگەرەکان بۆ خۆ دوورگرتن لە بۆمبارانی فڕۆکەکان، بەلام فڕۆکەکان دەوروبەری سەنگەرەکانیشیان ئەکووتا،گوشارەکە زۆر زۆر بوو لەسەر پێشمەرگەو لە خولەکێکدا هەزاران گوللەتۆپو شەستیرو بۆمب ئەکەوتە سەریان، ئەمەوایکرد کە لەو شوێنانە بکشێینەدواوەو لە سماقولی گەلی خۆمان بگرینەوەو هێزی تورکیو پارتی بچنە شوێنەکانی ئێمە. بۆ ڕۆژی دواتر هێزی سوپای تورکو پارتی بە هەمان شێوە شەڕەکەیان گواستەوە دۆڵی هیران. پاش نەبەردییەکی دلێرانەی ١٢ کاتژمێری هێزەکانمان لەو دۆڵەش کشانەوە دواوە تا گەیشتنە کاموسەلك، لەم شەڕەدا چەندین تانك تێکشکانو دەیان کۆماندۆی تورك کوژران، بەلام بە داخەوە

کۆمەڵێك فەرماندەی ئازامان شەهیدبوون لەوانە کاك تەحسین کاوانیو کاك نەبی ڕەشید. هەروەها هەواڵی شەهید بوونی دوو برای کاك عوسمان بانی مارانیمان پێگەیشت، کە ئەمە سێهەمین برای شەهیدی بوو لەگەڵ ئامۆزایەکیدا لە شەڕەکانی گەردەلوولی تۆڵەی دووەمدا شەهید ئەبن، بە ڕاستی کاك عوسمان زۆر دڵ گەورەو خۆڕاگر بوو. هەر ئەو ڕۆژەش هەواڵی شەهید بوونی مامۆستا مەهدی کادیری شۆڕشگێڕ و پێشمەرگەی نەبەزمان بیست. کە لە هەموو شەڕەکاندا ڕۆڵی بەرچاوی ئەگێڕا. شایانیووتنە لە کاتی تێکەڵ بوونی هێزەکانماندا لەو شەڕە دەستەو یەخەیەدا هەندێك لە برادەرانمان لە یەکدابڕانو هەندێ هەواڵی ناخۆشمان پێئەگەیشت کە گوایە کاك کۆسرەتو کاك شێخ جعفەر دیار نەماون، بۆیە لای خۆمانەوە زۆر پەرۆشی چارنووسیان بووینو لە ڕێگەی بێسیمەکانمانەوە هەمیشە لە سەر خەت بووینو سۆراخمان ئەکرد، تاکو لە دواییدا هەواڵی ساغو سەلامەتیمان بیستەوە. دوای ئەوەی هێزەکانمان لەو شوێنانە کشانەوە لە دێی کامووسەك جێگیر بوون. هێزێکی فەرماندەیی ٥ ی دووکان ڕەوانەی سەر ئازمنینو شاخی ئاوەگرد کرا تاکو ڕێگە لە هەر ئەگەرێکی هاتنە پێشەوەی لەوە زیاتری هێزەکانی پارتی بگیرێ. ئیتر بەرەکانی شەڕی ئەم ناوە ئارامی بە خۆیەوە بینی. لە قۆڵی کۆیەشەوە هێزەکانی فەرماندەیی ٤ی گەرمیان نێردرانە هەیبەت سوڵتانو باواجیو میرسەیدو فەقێیانو پشتی حەماموك. هێزەکانی تری هەولێر لە ڕووی دیگەڵەوە بوونو لە شوێنەکانی خۆیان جێگیربوون، بارەگای مەیدانی سەرەکی فەرماندەیی دووکانو میحوەری سماقوڵی لە سماقوڵی گەلی بوون، لەو ناوچەیەدا بنکەو بارەگامان دانابوو کە پارێزگاری لە ناوچەکە بکەن.

ڕۆژی ١١/١٠ برووسکەیەکی هەڤاڵ مام جەلال هات باسی ئەوەی ئەکرد کە تورکەکان ئاگاداری باڵوێزی ئەمریکای لە ئەنقەرە کردۆتەوە کەوا لە هێرشەکانیاندا بۆ سەر (ی.ن.ك)، هێزەکانی یەکێتیان گەڕاندۆتەوە شوێنی خۆیانو پێش هێرشەکانی ڕۆژی ١٠/١٣و ئیتر لەوە زیاتر ناڕۆنو ڕائەوەستن.

له ڕۆژی دواتر ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ بە خەتێکی گەورە مانشێتێکی نووسیبوو کە سووپای داگیر کەری تورك لە ژێر گوشاری نێودەوڵەتیو خۆڕاگری هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە ناچاری دەستی بە کشانەوە کردووە. هەروەها بەرپرسانی تورك لە ئەنقەرە دوو جار نوێنەری یەکێتی لە تورکیا کاك شازاد سائیب بانگ ئەکەنو پێی ڕائەگەیەنن کە یەکێتی هێزەکانی بۆ ناوچەکانی ڕۆژانی پێش ۱۰/۱۲ بکێشێتەوە ئەگینا هێرشمان بۆ ئەکرێت.

ڕای مەکتەبی سیاسیوابوو تاکو چەند ڕۆژێکی تریش چاوەڕوانی بکرێو بزانرێ بارووودۆخی سیاسی بەرەو کوێ ئەچێت، ئایا عێراق لە گەڵ تورکیادا تێك ئەچێت..؟ ئەگەر دۆخەکە لە بەرژەوەندیماندا بوو لە شوێنی خۆماندا ئەمێنینەوە، ئەگەر نا ئەوا ئەکشێینەوە.

لەو شەڕانەشدا هەر بە تەنیا فەرماندەیی ٥ ی دووکان ٣٨ شەهیدو ١٠١ بریندارمان دا، فەرماندەییەکانی تریش هەریەکە کۆمەڵێك شەهیدو برینداری لە پێشمەرگەو فەرماندەی ئازای بەخشییە خاکی کوردستانو بەرگری لەسەروەری حکومەتی هەرێمی کوردستان.

دیارە ئەمە کۆتایی شەڕ نەبوو، بەڵکو تورکوپارتی خۆیان سازدا بۆ هێرشکردنە سەرقۆڵەکانی سەرەوە. ئەمەش پەیوەندی بەو ڕێککەوتنەی نێوان تورکو پارتی هەبوو بۆ کۆنترۆڵکردنی هەموو ئەو ناوچە سنوورییەی کە دەستی بە سەردا گیرابوو. لەو چوار چێوەیەدا بوو کە دوژمن بە هەموو هێزو تۆپو فڕۆکەو ڕەوەچەکدارەکانیەوە بەرەو گوشینەو سیدەکان لە میحوەری باڵەك هێرشیان کردوشکێنران.

ڕۆژی ١١/١٧ پارتی بەهەماهەنگی سوپای تورك هێرشێکی توندیان کردە سەر میحوەری باڵەكو ناوچەی حاجی هۆمەران، دوای شەڕێکی قورسو زیانێکی زۆر لە هێزەکانی دوژمن، ئەو ناوچانەشیان کۆنترۆڵکرد. دیارە ئەم شەڕانەش بەهۆی دەیان تانكو فڕۆکەو تۆپی دوور هاویژو کۆماندۆی تورك

ئەنجام درا. ئەگینا پارتی خۆی بە تەنیا زاتی ئەوەی نەبوو کاریوای پێ ئەنجام بدرێ، بۆیەش هانای بۆ هێزی تورکی دوژمن برد. دوای ئەوە پەلاماری دێیوەرتێو چیاکانی دەوروبەریان داو گرتیان، بەڵام لە پەلاماردانی گردەشاڵیو دۆڵی باڵەیاندا تێکشکان، لەم شەڕانەدا بە داخەوە ۲ لە فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگە شەهید بوون ئەوانیش فەقێ حەسەنو برایمە کوێر بوون.

## کشانەوەی تورک

بەمە ئیتر تورك گەیشتە مەرامەکانی خۆیو پارتیو ئەیویست کۆتایی بە کارەکانیان بهێنێ، لە هەمان کاتدا دەستیکردە کشانەوە دوای ئەوەی ئامانجەکانی پێکاو بەشێك لە تانکەکانی لە ئاکرێ جێگیر بوونو پاشماوەی هێزەکەشیان بەرەو دهۆك کشانەوە. پێشتریش ژمارەیەك تانك لە شەقڵاوە بەرەو هەریر کشانەوە دواوە. ئیتر ڕۆژانە هێزو تانكو کەرەستەو کەلو پەلەکانی ئەبردەوە بەرەو بادینانوتا دواجار لە برایم خەلیلەوە بۆ تورکیا هەمووی پەڕاندەوە.

لە ئەنجامی ئەو ڕاگەیاندنانەی تورك لە ڕۆژی۱۱/۱۰ دا کەوا هێزەکانی ئامانجەکانی خۆیان بە دیهێناوەو دەستی کردووە بە کشانەوە، ئەمریکاو ئینگلیزیش پیان باشە بکەونە نێوانمانەوەو عێراقو ئێرانیش بە تورکیایان ڕاگەیاندووە کە قایل نابن تورکیا بمێنێتەوەو لەوەش ئەچوو کە تورك بەڵێنی پێدابن.

بۆیە ڕۆژی ۱۱/۲٤ لە چوارقوڕنە بەئامادەبوونی هەڤاڵ مام جەلال هەموو فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگە کۆبوونەوەیەکی فراوان کرا لە سەر هەلومەرجەکانی مەسەلەی شەڕوەستان، دوای لێدوانو تاوتوێکردنێکی زۆر هەموویان گەیشتنە ئەوەی کە قایل بن بەوەستاندنی شەڕەکە، ڕای کاك جەبار فەرمان ئەوە بوو کە شەڕەکە ڕابگرینو ڕاینەگەیەنین، هەروەها بڕیاریان دا

چیتر تورك وەك ناوبژیكەرێك قبوولّ نەكەن، چونكە لایەنێكی شەڕ بووەو نابێ لە پرۆسەی ئاشتیدا بەشدار بێ.

كاتژمێری ١٢ای ئەو ڕۆژە پارتی لە ڕێگەی ئیزگەكەیانەوە شەڕی ڕاگرت بەو مەرجەی پەكەكە لە سنووری یەكێتییەوە پەلاماری پارتی نەدەن. ئەمە داوایەكی تەعجیزی بوو كەس ناتوانێ ئەم گرنتییە بدات، چونكە پەكەكە هێزێكی پارتیزانەو بۆ كەس كۆنترۆڵ ناكرێ. یەكێتیش پاسەوانی پەكەكە نییە. هەر ئەو ڕۆژە كەمال كەركوكی نوێنەری پارتی لە فەرەنسا داوای لە حیزبی سۆسیالیستی فەرەنسا كردبوو كە ناوبژیوانی نێوان یەكێتیو پارتی بكات. یەكێتیوەڵامی دایەوە بەو ناو بژیوانییە قایلە بە مەرجی ڕێككەوتنامەی پاریس كە لە سەر دەستی پارتی سۆسیالیستی فەرنسیو سەرۆكی كۆچكردووی دۆستی كورد مۆر كرابوو. بەڵام ئەم مەرجە بۆ سەر دڵی پارتی قۆرسە.

## یادی چلەی شەهیدان

كە دۆخەكە نیشتەوەو شەڕ نەما ڕۆژی ١١/٣٠یادی چلەی شەهیدانی گەردەلوولی تۆڵەی دووەم لە گردی سەیوان لە سلێمانی ئەنجامدرا، ئاپۆڕەیەكی گەورەی خەڵكی كە بە ١٥٠هەزار كەس مەزەندە ئەكرا ئامادەبوونو هەڤاڵ مام جەلالووتارێكی دورودرێژی لە بارەی شەڕەكانو كۆتایی هاتن بەو شەڕە باسكرد.

لە ڕۆژی ١٢/٨ كاتژمێر ٧ی سەر لە بەیانی كۆمەڵێك لە ئیتیلاعاتی ئێرانو حیزبی دیموكراتی ئێران لە نێوان دووكانو خەلەكانو نزیك دێی قەڵات بە یەكدا تەقینەوەو ٣ پێشمەرگەی دیموكرات لە نیوانیاندا بەرپرسی كۆمیتەی شارستانی بانە شەهید بوون. ئیتیلاعاتەكان خۆیان دەربازكردو دیموكراتەكان دەستیان بەسەر ئۆتۆمبیلی ئیتیلاعاتەكاندا گرت.سەید مەنسوری فەتاحی ئەندامی سەركردایەتی هاتبووە سەردانی شوێنی

ڕووداوەکە، بەڵام بەداخەوە بە هەڵەو لە ڕووی نەناسینەوە لە لایەن ئاسایشی هەولێرەوە لە گەڵ ٣ پێشمەرگەی دیموکراتدا شەهید کران. کاتژمێر ٦ی ئێوارە لەگەڵ هەڤاڵان ملازم عومەرو ئەرسەلان بایزو سمکۆ دزەییو دلاوەر ئەحمەد مەجید چووینە سەرکردایەتی حیزبی دیموکراتی ئێرانو سەردانی کاك عەبدوڵلای حەسەن زادەمان کردو لە دانیشتنەکەماندا قسەمان لە سەر ڕووداوەکە کرد. کاك عەبدوڵڵا ڕای‌وابوو ئەو ئاسایشانە بە بەرنامە تەقەیان لە سەید مەنسور کردووەو ئامادەیش نین لە لیژنەی لێکۆڵینەوەدا بەشداری بکەنو چاوەڕوانی یەکێتی ئەبن چی ئەکات لەم بارەوە. لەو لاشەوە ئاسایشەکان چەککرا بوونو ڕەوانەی سلێمانی کرابوون بۆ لێکۆڵینەوە.

هەر لەو مانگەدا بوو یادی شەهیدانی گەردەلوولی تۆڵەی دووەم لە کۆیەو ڕانیەو شارەزوورو چەمچەماڵو کەلار کرایەوەو لە هەموو شوێنەکاندا هەڤالانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیو سەرکردەی لایەنەکانی تریش ئامادەبوون کە بوو بووە خۆ پێشاندانێکی گەورە لە دژی شەڕی داسەپاوو پشتیوانی بۆ یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

لە کۆتایی ڕۆژی ١٢/٣١ دا بڕیاری گواستنەوەم لەفەرماندەیی ٥ دووکان دراو هەر ئەو ڕۆژە لەگەڵ فەرماندەییو کاك فاتح حەمە ڕەش کە دانرا بە لێپرسراوی فەرماندەیی دووکان دەورو تەسلیمان کرد بە نووسراوێك کە ئەو کاتە فەرماندەیی دووکان ٧٥١ پێشمەرگەی هەبوو.

هەر لەوڕۆژەدا نامەیەکم لە لایەن مامۆستا محەممەد حەمە ساڵەحی خزمم لە ئەمەریکاوە پێگەیشت کە کاتی خۆی لەگەڵ ڕێکخراوەکاندا کاری ئەکردو لە ڕووداوەکانی ٣١ ی ئابدا بە ماڵو منداڵەوە گوێزرانەوە بۆ ئەمریکا. لە نامەکەیدا بێزاریو بێتاقەتی خۆی دەربڕیوەو لە بڕگەیەکیدا هاتووە: ئێمە لە ئەمریکا ژیانو گوزەرانمان خراپ نییە، بەڵام بە ڕاستی ئێرە بۆ ماڵێکی منداڵداری‌وەك ئێمە خۆش نییەو لێرە لە ماڵێکدا چەند کەسێك کار بکات باشە بەڵام بۆ خێزانێکی‌وەك ئێمە کە تەنها من کار ئەکەم کەمێك زەحمەتە لەبەر

ئەوە بڕیارمانداوە لە بەهاری داهاتوو بچینە ئەوروپا هۆڵەندا یان سوید، هیچ نەبێ لەوێ ژیان دابین ئەکەمو ئەو کاتە من خەریکی کاری خۆم ئەبم بۆ نووسینی بابەتی ڕۆشنبیری، چونکە ئەوێ بە پێچەوانەی ئەمریکایە کە ئەگەر کار نەکەی ئەفەوتێی.

## دەستپێشکەریەکی تر

هەر لەم مانگەدا کۆبونەوەی فەرماندەیی گشتی کراو هەندێك برادەر بوونە ئەندامی فەرماندەیی. لە دوای تەواو بوونی شەڕو سەقامگیر بوونی ئارامیو بەرپابوونی دۆخی نەشەڕ نەئاشتیدا، هەڤاڵ مام جەلال لای خۆیەوە دەستپێشکەرییەکی گرنگی کرد بۆ ئاشتیو نامەیەکی بۆ مەسعود بارزانی نووسی کە تیایدا داوای کردبوو کە چارەسەری سیاسیو ڕاستەقینەو دادپەروەرانەی هەموو مەسەلەو کێشەو ناکۆکییەکان بکرێ بە شێوازی دیموکراسی ئاشتیخوازانەو هەروەها یەکخستنی حکومەتی هەرێمی کوردستان. کە هەلومەرج بڕەخسێنێ بۆ هەلبژاردنێکی ئازادو چارەسەری هەموو کێشەکانو هەروەها ئاساییکردنەوەی بارودۆخی شارەکانی هەولێرو سلێمانیو دهۆكو دیاریکردنی ماوەیەکی دیاریکراو بۆ جێبەجێکردنی هەموو ئەو خاڵانەی لە سەری ڕێککەوتن. لەم هەنگاوەیدا هەڤاڵ مام جەلال سەرپشکی کردووە لە سەر:

- هەڵبژاردنی یەکێك لە ڕێککەوتنە مۆرکراوەکانی نێوان هەردوولاوەکو ڕێککەوتنی پاریس یان ڕێککەوتنی دوو قۆڵی یان بڕیارەکانی پەرلەمان.
- پێشنیاری ئەمریکاو بەریتانیا، کاتی خۆی ڕۆبەرت دۆیچ پێشکەشی هەردوولای کردووە.
- پێشنیارەکانی هاوڕێ عزیز محەممەدو دکتۆر مەحمود عوسمان.

ئەمەش لە پێناوی ئەوەی ڕێگە چارەیەك بۆ دابەشکردنی داهاتی کوردستان بەسەر هەموو لایەكو هەموو موچەخۆرو پرۆژەکانی ئاوەدانکردنەوەو گەشەپێدانی بژێوی خێزانی شەهیدانی کوردستانو پێشمەرگەی کوردستان دابین بکرێ. ئەم دەستپێشکەرییە سەرەڕای ئەوەی کە هەنگاوێکی گەورەیە بۆ فەرامۆشکردنی ناکۆکیو قەتماغە بەستنی برینەکان بۆ گەیشتنە ئاشتییەکی ڕاستەقینە، لە هەمان کاتدا ئازایەتیەکی لە ڕادە بەدەری تێدایە کە تەنیامەبەستی یەکێتی ڕیزەکانی گەلەکەمانە نەك کەڵەگایی کردنو دەست بە چمکی دەسەڵاتەوە گرتن بۆ مەرامی تاکەکەسو نەخۆشی حوکمڕانی. هەرچی خوینڕژاوەو چی ماڵوێرانییەکمان تووشبووە ئەبی تەنیا هەر بە پێو دانگی لە خۆ بووردوویی چارەبکرێو لە پێناوی دابینکردنی ئاییندەی گەش بۆ کوردو کوردستان کار بکرێ.

## کۆتایی ساڵ.. ئەگەری کۆتایی شەڕ

ئەمساڵەش کۆتایی هات، بە ڕاستی ساڵێکی پڕ لە ئازارو شەڕو خوێنرشتن، ساڵێکی دوکەڵاوی بوو، چی لە بەرەکانی شەڕو چی لە ماڵی کورد بە گشتیو ماڵی پێشمەرگەدا بە تایبەتی. ئەو ماڵانەی کە کوڕو کەسەکانیان پێشمەرگە بووەو دڵیان لە ناو مشتیانا بووە، ئەو ماڵانەی کە تەرمی ڕۆڵەکانیان چووەتە بەردەمیانو سکڵی مردنو لە دەستدانی کەسەکانیان پیایاندا چزاوە، ساڵێك گەر ئەو هەموو توانایەی بۆ شەڕو چەکسازی شەڕ خەرج کراوە بۆ ئاوەدانیو بنیاتنانەوە بە کار هاتبا ١٠ جار کوردستانیوێرانەمانی پێ ئەبووژایەوە. ساڵێك کە لۆژێکی شەڕ بەسەرلۆژێکی دیالۆگدا زاڵ بوو، ئارەزووی شەڕ فراوانتر بوو بۆ قووتدانی دەستکەوتەکان. شەڕ لە هەموو بارەکانیدا ناخۆشو قیزەونە، تەنیا لە یەك باردا نەبێت ئەویش شەڕە لە پێناوی بەرگریکردن لە مافی نەتەوەو دژی داگیرکەرە.

ئەی ئەگەر ئێمە ئەزموونێکمان هەبێ‌و خەڵکانێك بیانەوێ بۆ مەبەستەکانی خۆیان لە کیسمان بدەن.! ئەبێ چی بکەین..؟

من بانگەشە بۆ شەڕ ناکەم. بیانووش بۆ پیرۆزی ئەم شەڕە ناهێنمەوە، بەڵام کە پیلانێك، بەرنامەیەك دژی‌ویستی من، بۆ لە ناوبردنی من هەبێ، ئەوە کارێکە پاساوی بۆ نییەو ئەبێ بەرپەرچبدرێتەوە. ئەو ڕاپەڕینەی بەرپا کرا بە توانای هەموو گەلەکەمان، ئەو ئازادییەی دەستمبەر بوو بە خوێنی هەموو لایەك بوو، مەیدانی خەبات بۆ تەنها لایەك قۆرخ ناکرێت، دەسکەوتەکان هی تەنیا کۆمەڵێك نییە، ئەبێ هەمووان لە بەروبوومەکەی بەرخورداربن. ئێمە هێشتا مەترسی زۆرمان لە سەرە، دوژمنەکانمان کۆسپ‌و قۆرتی گەورە لە بەر پێماندا قوت ئەکەنەوە، هەموو لایەکمان‌وەکویەك بەر ئەکەوین،وە نییە لایەك تووش ببێ‌و لاکەی تر دەربازبێ. دوژمنەکانمان دوژمنی هەموو کوردن، ئەو شەڕەش کە ئەکەوێتەوە گیانی هەموومان ئەسووتێنێ، ئەگەر دوژمنە داگیرکەرەکەمان لێمان دوور کەوتبێتەوەو بوارمان بۆ ڕەخسابێت، خۆمان بە بەرچاوی هەموو جیهانەوە ئیدارەی خۆمان بدەین، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو دوژمنە بۆ یەکجارەکی دەستی لێهەڵگرتووین. بەڵکو هەرکاتێك بۆی بکرێ تۆڵەمان لێئەکاتەوە، هەروەکو ڕۆژانە بەردەوامە لە تێکدان‌و ئاژاوەنانەوە چ بەناردنی تەقینەوە یان تۆپبارانی ناوچە سنوورییەکانمان، یان سەپاندنی ئابلۆوقە بە سەرماندا.

ئەبوایە ئەو پەرلەمان‌و حکومەتەی درووستمان کرد دەستمان پێوە بگرتایەو ڕێگەمان نەدایە زیندەبەچاڵ بکرێ‌و ڕێگەمان بە دەرو دراوسێ نەدایە جارێکی تر یاری بە چارەنووسمان بکەن‌و دەست بخەنە ناوکاروبارمانەوە بۆ لە ناو بردنمان. گەورەترین تاوانە کە هەموو دنیا چاوی لێمانەوە بێت‌و بە شان‌و باڵماندا هەڵبدات‌و خۆمان نەمانەوێ لەو زەمینەیەدا بژین کە بۆمان فەراهەم بووە. گەر ئەم شەڕە لە پێناوی دەسەڵاتدا ئەکرێ، ئەوا هێشتا ئێمە نەگەیشتوینەتە دوا قۆناغی ڕزگاری. لە دنیادا هیچ‌وولاتێك پێش بڕینی

قۆناغی ڕزگاری نیشتمانی شەڕی دەسەڵاتی تێدا نەکراوە، مەگەر تەنیا لای گەلی کوردی داماو نەبێت کە هەم خۆمان‌و هەم دوژمنەکانمان لەسەر لاشە هەنجن هەنجن کراوەکەی کار ئەکەن. ئەم شەڕە سەرەڕای (تحریم‌و تجریم ) کردنی لە لایەن پەرلەمانی کوردستانەوە کە خودی هەڤاڵ مام جەلال‌و مەسعود بەرزانیش بڕیاریان لەسەرداوە، هەمدیسان بەرپا بووەتەوە. ئەم شەڕە خەماوی‌و کارەساتاوییەماڵوێرانی بۆ کورد درووست کردو سەرەنجامی خراپی لێبووەوە:

- بەسەدان کوژراو
- بە سەدان برینداروو سەقەت
- هەزاران خەڵك ئاوارەبوون کە لە باری کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و دەروونییەوە ڕەنگدانەوەی نیگەتیفی هەبوو.
- ناکۆکی لە نێوان خێزانی کوردیدا خستەوەو سەنگەر بەندی لە بەرانبەر یەکتردا درووست کرد کە لە ڕاستیدا ئەم سەنگەر بەندییە دوور بوو لە بیروباوەڕ، بەڵکو بەشێکی پەیوەندی بە بەرژەوەندیەوە هەبوو کە پەیوەست بوو بە پێداویستی ڕۆژگارو هەڵپەی بژێوی‌و کێشەو گرفتی ناکۆکییە کۆمەڵایەتیەکان، کە ڕیزی حیزبەکان لەم جۆرە خەڵکانە پڕو ئاوەدان بوو بووەوە، بەشێکی ئەمەش بۆ ڕۆڵی حیزبی بەعس ئەگەڕێتەوە کە ڕیزەکانی گەلەکەمانی لە بنەوە هەڵتەکاندبوو کەسێتی تێکدابوو، خەڵکانێکی زۆر بوو بوون بە جاش‌و ئیستخبارات‌و ئەمن‌و... هتد. ئەمانەوەکو پاشماوەی ئەو دامو دەزگا داپڵۆسێنەرانە ماونەتەوەو فێری جۆرەها چڵێسی‌و فرتو فێڵ بوون‌و کاتێکی زۆری ئەوێ لەو گوناهانە پاك ببنەوە.
- لە دەست دانی ڕاستگۆیی نەك لای خەڵکی کوردستان بەڵکو لای نیای دەرەوەش.
- کەرتکردنی دەسەڵاتی کوردی.

- له هەموو ناهەموار تر دەست کێشکردنی سوپای داگیرکەران بۆ بەشداری لە یەکلاییکردنەوەی ناکۆکییەکانی ناوخۆ. کە بەتاوانێکی گەورە ئەژمێردرێتو بووەتە هۆی لە کارخستنی پەرلەمانی تاقە سەرچاوەی دەسەڵاتی یاسایی لەکوردستاندا کە تەعبیر لە بوونی کوردو دەسەڵاتەکەی ئەکات.

ئەم هاریکاریکردنەی دەوڵەتە دراوسێکان لە شەڕدا، لەبەر خۆشەویستی چارەنووسی کوردو پارێزگاری لە دەستکەوتەکانی گەلی کورد نەبووە، بەڵکو دەستێوەردانێك بووە بۆ لەبەر یەك هەڵوەشانەوەی کوردو حیزبەکانیو بۆ کوشتنی ئایندەی کورد بووە کە ئەوان زۆر لێی ئەترسێن. بانگهێشتکردنی سوپای عێراقو تورکیا لەلایەن پارتییەوە لە چەند ڕوویەکەوە خوێندنەوەی بۆ ئەکرێ:

- سنووردانان بۆ دەسەڵاتی یەکێتی کە پارتی ڕەتی ئەکاتەوەو بە مێملی خۆی دائەنێ.

- دەربازکردنی لە شکستی تیاچوونو هەڕەشەی نەمان چ لە ڕووی سیاسیەوە چ لە ڕووی سەربازییەوە.

- تێکشکاندنی هاوکێشەی پەیوەندی یەکێتی - ئێران - ئۆپۆزسیۆن کە مەترسی نەك هەر بۆ سەر پارتی هەبوو بەڵکو سەرئێشەی بۆ ئەو دەوڵەتانەش درووست ئەکرد.

- جگە لەمە ئەو هەنگاوە بۆ خۆی جۆرە کوێخایەتی کردنێك بوو بە سەرویستی کوردەوە بۆ هەمیشە نیشاندانی کەسێتی کورد بەلاوازیو قرچۆکیو ترۆیی. بۆ ڕاگرتنی شەڕ هەرچی هەوڵ بوو لەبار براو گوێ لە کەس نەگیرا، چی هەوڵی ناوبژیوانی هەبوو نەیتوانی ئاوازی ناسازی شەڕخوازی کپ بکاتەوە، چی داوای پڕ لە کەفوکوڵی خەڵکی کوردستان بوو، بە هۆی بەسەرکردنەوەی حیزبەکانو نارەزایی دەربڕینو خۆنیشاندانەکان، نەیتوانی ئاو بکاتە سەرئەو گڕە بڵێسە دارەی ڕقی ئەستوری دڵە پڕ لە کینەکان.

کاتێکیش شەڕ گەیشتە بنبەستو بۆ هیچ لایەکیش یەکلایی نەکرایەوە، سەرەڕای هێنانی هێزی دەرەکیو ئەو هەوڵەش گەیشتە ئەنجامێك کە چیتر دنیای دەرەوە قایل نەبێ بە بەردەوامی ئەم شەڕە، ئیتر هەردوولا لە شوێنی خۆیاندا ڕاوەستان. بەڵام هەر لایەك بە مەبەستی جیاو ناوەڕۆکی جیا. یەکێتی ئەیویست چیتر خوێنی کورد بە خۆڕایی بەر نەبێت، کورد تووشی سەر لێشێوانو دەربەدەری زیاتر نەبێت. بەڵام پارتی ئەیویست بەرژەوەندییەکانی لە ناو کەلاوەی شەڕدا بپارێزێو دەسەڵاتی سیاسی بۆ خۆی کونترۆڵ بکات، لەم پێناوەشدا سەرچاوەی داهاتی کوردستانی قووت ئەدا بۆ بنەماڵە.

دوای جێبەجێبوونی نەخشەو پلانەکانی سوپای داگیرکەری تورکو جێگربوونی پارتی لە شوێنەمەبەستەکانی خۆیانو نەمانی مەترسی هێرش کردن بۆ سەریان. دوای کەشەنگییەکی زۆر شەڕ سەر خەوێکی قووڵی شکاند، بەرەکانی شەڕو ڕوو بەڕوو بوونەوە ئارام بوونەوە. تاڕادەیەك خەڵك هەناسەیەکیان هەڵکێشا لە ژێر ساباتی سەقامگیریدا، بەڵام خەڵك هەمیشە لە دڵەڕاوکێدا ئەژیان نەوەکو شەڕ دووبارە بێتەوە، نەوەکو ماڵی کورد جارێکی تریش لە کورەی ئاگرێکی بێئاماندا بسووتێتەوە.

# ساڵی ١٩٩٨

هەرچۆنێك جەژنی سەری ساڵی ١٩٩٨ مان بە ئاسوودەییەوە بەڕێکرد، قەلەڕەشی شەڕ لێمانەوە دوور بوو، کەوی ئاشتی لە پەنا گوێی هەموانـدا ئەیقاسپاند، ساتەکانی ژیان بە بێدەنگو دوور لە زرمەی تۆپو هاڕەی فیشەك تێئەپەڕی. لەوانەیە ئەمەش سەرەتای دەست پێکردنیوەرزێکی نوێی نە شەڕ نەئاشتی بێ لە نێوان هەردوو لادا کە پێویستی بە کاری زۆر جیدی هەیە بۆ بڕینی ئەم قۆناغە ناسكو پڕ لە دڕكو داڵە کە لە ڕۆژانی ڕابوردووی ساڵی پێشوو دا بە دەست پێشکەرییەکی هەڤاڵ مام جەلال زەمینەی بۆ خۆشکرا.

هێزی شەڕ کەر پێیوایە تەنیا ئەو خاوەنی ڕاستیو مافو دەسەڵاتەو تەنیا ئەو ئەتوانی بڕیار لە سەر چارەنووس بداتو تەنانەت مافی شەڕ فرۆشتنو شەڕکردنیش هەر بۆ خۆی قورخ ئەکات. کە مەسەلە سەپاندنی خوود بێت، زاڵبوونی دەسەڵاتی تاکە لایەن بێت، شەڕ ئەبێتە کارێکی حەتمی، چونکە هەموو دەرگاکان دائەخرێ. هیچ دەنگێك نابیسترێ جگە لە یەك دەنگ کە دەنگی ئەو لایەنەیە، کاتێکیش لایەکەی تر دەنگ بۆ ئاشتی بەرزبکاتەوەو فوو لەو ئاسنە سووتێنەرەی شەڕ بکات بۆ کوژاندنەوەی، زۆرکەسوائەزانن ئەوە لە لاوازییەوەیە، لە کەم توانایيو بێهێزییەوەیە. بەڵام لای ئاشتیخوازان بەڵگەی گەرموگوڕیو دڵسۆزیو پەرۆشییە بۆ ڕاگرتنی لافاوی خوێنڕشتنو دوور خستنەوەی مەینەتیەکانە. بۆیە زۆر جار نووزەی ئاشتی بە ئاستەم ئەبیسترێ. یان بەواتایەکی تر بێدەنگی جادەی کوردی بە گشتی ڕێگە پێدانی شەڕ ئەگەیەنێت. چونکە گەلەکەمان هێشتاش لە بارێکی دەروونی ئاڵۆزاویدا ئەژی کە ساموتکەی شەڕ چنگاڵی لێگیر کرتووە. چ بەهۆکاری دەرەکی یان خۆمان ببینە هۆکاری کەوتنە ژێر ئەو هەرەسەوە. بەڵام ئەمجارەیان لەوە ئەچی ئەم نامەیەی هەڤاڵ مام جەلال کاریگەری خۆی هەبێت هەناسەیەکی قووڵی بێزاری دژی شەڕ هەڵکێشین، چونکە دوای کپی بەرەکانی جەنگ هەموو کەسێك ئەیەوێت بچێتەوە دۆخی ئاساییو ژیانی بێوەیی.

## بۆ فەرماندەیی سلێمانی

١/١٥ سەردانی هەڤاڵ مام جەلالم کردو باسی بارودۆخی سلێمانیمان کرد، لەبەر گرنگیو بایەخی ئەو شارە لە ڕووی پاراستنو ئاسایشەوەو نزیکی لە خۆیەوە بڕیاری دا کە لە فەرماندەیی سلێمانی دابنرێم. بۆ ڕۆژی دواتر چوومە فەرماندەیی سلێمانیو لەگەڵ شێخ جەعفەر دانیشتمو لە سەر دەورو تەسلیم کردنووەرگرتنی فەرماندەییەکە قسەمان کردو دوای ئەوەی گۆڕانکاری لە

فەرماندەیی‌و بڕیاری دروستکردنی هەندێ فەرماندەیی تازە درا بوو. پاشان لەگەڵ بەرپرسانی فەرماندەیی٧ ی سلێمانی دانیشتنم کردو داوای لیستی تەواوی چەك‌و کەرەستە پێویستەکانی فەرماندەییم کرد بۆ دەورو تەسلیمکردن.

## پاپاو کورد

لەو مانگەدا پاپای گەورەی فاتیکان‌و ڕێبەری مەسیحییەکانی جیهان هاوبەشی خۆی بۆ ئازارو نەهامەتیەکانی کورد دەربڕی‌و داوای کرد ئابلۆقەی ئابوری لە سەر گەلانی عێراق هەڵبگیرێ، ئەمەش هەڵوێستێکی باشەو کاریگەری خۆی هەیە بە تایبەت لە نێوەندی سیاسی جیهانیدا پیاوێکی گەورەی‌وەك پاپا لا لە کورد بکاتەوەو قسەی لە سەر بکات، بە تایبەت پاپاوەك ڕێبەرێکی ئاینی. دڵناسك ئەو بارودۆخە پڕ ئازارەی گەلانی عێراق بە گشتی‌و گەلی کوردی بە تایبەتی پێ ناخۆشە، چونکە لە کوردستان‌و لە عێراقیشدا بەشێکی باش مەسیحی هەیەو لە کۆنەوە لەم‌وولاتەدا ئەژین‌و لە سەر ئاینی خۆیان ماونەتەوە.

ئەوەتا پاپای فاتیکان لە دوورەوە هەست بەدەردو مەینەتیەکانمان، دەرك بە خەمەکانمان ئەکات کە شەڕی بێهودە دەستی ناوەتە بینەقاقامان‌و تەڕوووشك پێکەوە ئەسووتێنێ، کەچی ئەو لەگەڵ ئەو ناسۆریانەماندا تێکەڵ ئەبێ‌و نوێژمان بۆ ئەکات.

## ڕەوتی ئیسلامی

ئەوە هەر ئێمە نین‌وەکو گەلێکی ستەم دیدە بە دەست دوژمنانەوە ئەناڵێنین، ئەوەتا لە جەزائیریش خەڵکی بێتاوان دوای ڕزگار بوونیشی لە چنگ فەرەنسییەکان تێك بەربوونەتە خۆیان‌و لە هەلومەرجێکی نالەباردا ئەژین، بەتایبەت کەئیسلامییە توندڕەوە چەکدارو یاخیبووەکان ماوە ماوە هەڵئەکوتنە

سەر خەڵکەکەو بە بیانووی ئەوەی سەر بەڕژێمی دەسەڵاتداری جەزائیرن، بێبەزەییانە ئەیانکوژن‌و سەریان ئەبڕن. مرۆڤایەتی قیز لەو ڕەوشتە دڕندەو هەڵسوکەوتە دزێوەی ئیسلامییەکان ئەکاتەوە کە بە هیچ کلۆجێك دەست لە منداڵ‌و ژن‌و پیرو پەککەوتە ناپارێزن.! ڕەش‌و سپی لە یەك جیاناکەنەوەو ئەوەی لەگەڵ ئەواندا نەبێت ئیتر فەرمانی مردنی بەسەردا ئەدەن. کوشتنەکەشیان بە فیشەك نییە یەکجار ئەو کەسە تەواو بکەن‌ووازی لێبهێنن، بەڵکو زۆرجاروەکو باس ئەکرێ بەتەورو چەقۆ سەریان لە لاشەیان ئەکەنەوەو ئەنجن ئەنجنیان ئەکەن. ئەم کارە تەنیا لە پای ئەوە ئەکەن. کە لە هەڵبژاردندا فێلیان لێکراوەو نەیانهێشتووە ئەو دەنگەی هیناویانە پێی بگەنە کورسی فەرمانڕەوایەتی. ئەو٥٠ ژن‌و منداڵ‌و پیرە پیاوە تاوانیان چی بوو کە ڕۆژی ١/١٢ بە تەورو چەقۆ کوشتیانن..؟! ئایا ناکرێ شێوازی کار کردنیان بگۆڕن‌و لەم دنیای پێشکەوتنەدا پەنا نەبەنە بەر چەك بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەو ناکۆکییەکانیان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ڕژێمەکەیاندا..؟ کوا باوی ئەوە ماوە خەڵکی‌وولاتیکی ڕزگار کراوی خاوەن دەسەڵات‌وسیستمی فەرمانڕەوایی یاخی بن‌و بدەنە شاخ‌و لە شەوە زەنگدا چەقۆ بخەنە ملی خەڵکی بێتاوان‌و بێچەك..؟

ئائەمەیە تیرۆریست، ئائەمەیە ئەو مێشکەووشکانەی لە دوادوایی ئەم سەدەیەدا بەم جۆرە کارانە هەڵئەستن کە مرۆڤایەتی بێزی لێئەکاتەوە. ئەم ڕەوتە ئیسلامیانە دەقیان بە کوشتنەوە گرتووە، هەمیشە مەرگ دۆستن، ئەیانەوێ ئالآی ئیسلام لە سەر لووتکەی مردن‌و کوشتن دابچەقێنن، چونکە تەنیا باوەڕیان بەو دنیا هەیەو لەزەت‌و چێژ لەوێوەرئەگرن.وەکو بڵێی ئەم دنیایەی ئێرە خوا نەیخوڵقاندووە، ئەم ڕەوتانە هەم عەرەبن‌و هەم موسوڵمان، بەیەك دیدو بۆچوون گۆش ئەکرێن ڕەوتە ئیسلامییەکانی لای ئێمەش بە هەمان پێودانگی ئەوانە ئەڕۆن‌و لە ڕووی ناوەڕۆك‌و ڕووخساریشەوە بەموو جیاوازییان نییە، تەنیا چتێك جیاوازیان هەبێ لەوان ئێمە خاوەنی دەوڵەتی

یاسایی خۆمان نین‌و کیانی سیاسیمان نییە، هەروەها ئەم ڕەوتانە لەو تەنها ئەزموونی هەلبژاردنەدا نەیانتوانی دەنگی بەرچاو بەدەستبهێنن.

ئیسلامی سیاسی بووەتە مۆدەیەك‌و لە هەر کوێیەك بشێوی هەبێ، دیکتاتۆریەت هەبێ، ڕژێمی میلیتاری هەبێ، ئەوان گەرا دائەنێن‌و لە ناو توێژی هەژاراندا هیلانەی دواکەوتوویی دائەنێن‌و بیری ژەهراویان لە ناو ژیانی پاك‌و بێگەردی خەلکدا ئەپرژێنن. بەلام کوردستان تایبەتمەندییەکی خۆی هەیەو زەمینە لەبار ئەکات بۆ پەیدابوونی ئەم تاقمە ڕیشپانانە، بۆ ئەنجامدانی کاری توند ڕەوی بەناوی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا لەسەر زەوی، ئەویش پیلانی دەولەتە داگیرکەرەکانی کوردستان‌و ئەوبارە نائاساییەی گەلی کوردی تێدایە بۆ دەستێوەردان. سەرەڕای ئەو هێزە چەکدارانەی ئیسلامییەکان کە لە کوردستاندا بە دەست لە پشتدانی هێزی دەرەکی‌و دەرودراوسێ سەریان هەلداوەو کارئەکەن‌و مەترسی ئەخەنە سەر چارەنووسی گەلی کورد. لەناوخۆشدا بە هەمان کۆمەك‌و یارمەتی دەرەکی حیزبی سیاسی لەکاردان، بەلام ئیسلامییەکان لە ناوەڕۆکدا جیا ناکرێنەوەو تەنیا دەوریان دابەش کردووەو سیاسەت پیادە ئەکەن. ئایا ئیسلام کە ١٤ سەدەیە هاتووەتە کوردستانەوە لە هەموو دنیادا پێگەی خۆی هەیەو بە دەیان دەولەت پەیڕەو لە ناوەڕۆکی ئاینی ئیسلام ئەکەن پێویستی بەوە هەیە ئەمڕۆ لە ڕێگەی شەڕ کردنەوە دەسەلاتەکەی بە زۆری زۆداری بسەپێنرێ..؟

ئایا لە چوولاتێکی ئیسلامیدا خەلك‌و ڕژێمەکەشی لە ئیسلام هەلگەڕاونەتەوە تاکو جیهاد ببێتە فەرزی عەین..؟ بۆ گەڕاندنەوەی شکۆمەندی ئیسلام‌وەکو چۆن لە سەردەمی ئەبوبەکر ڕوویدا، ئەمە بەڕای من هیچ پەیوەندی بەئیسلامەوە نییە، جگە لەوەی کە ئیسلام پێویستی بە جولانەوەیەك نییە بۆ دەربازکردنی، پێویستی بەو شێوازی تۆقاندنەو کوشتوبڕ بلاوکردنەوەیە نییە. ئەکرێ‌وەکو چۆن حیزبی عەلمانی هەیە، حیزبی ئاینیش هەبێ بۆ بەشداریکردن لە بەڕێوەبردنی کاروباری خەلك‌و دەولەتدا نەك بە

تـەنیا کـونترۆڵکردنی دەسـەڵات لـە لایـەن ئەوانـەوە، ئـەگرێ ئـەوان ببنـە ئۆپۆزسیۆن لە بەرامبەر هێزەکانی تـردا بـەڵام بـە شێوازی هاوچـەرخانە، نـەك ببنـە بەربەسـت لـە بـەردەم هەرچـی ئـەوانی تـرو ڕەتکردنـەوەیان. ئەمانـە لـە ناوەڕۆکـدا لـە قۆناغێکـدا لـە پشـتی پـەردە ئەسـتوورەکانەوە ئامادە کـراون بـۆ ئەنجامـدانی ئـەم جـۆرە کارانـەی کـە نـاوەڕۆکی ئـسلام بـەتاڵ ئەکاتـەوە. کـە ئەڕوانینە پێگەی درووستبونی ئیخوان موسلمین لـە میسـر بۆمـان دەرئەکـەوێت کە چۆن هاتە ناو ڕووداوە سیاسیەکانەوەو حەسەن بەنای دامەزرێنـەر چـۆن لـە ڕێگـەی ئینگلیزەکانـەوە پەیوەندیـەکانی بەستبوو، ئیتر لەوێشەوەو لـە ڕێگـەی باڵی ڕێکخستنی سەربازییەوە پەرەیان بە کاری تیرۆریستیداو سەید قوتـب بـووە تەوەرێکی گرنگی توندڕەوی پاڵپشت بە هەندێ دەقی قورئان کە پەیوەندی بـەم ڕۆژگارەوە نییەو هی سەردەمی خۆیەتی کە دەقەکانی تێدا دابـەزیوە. ئـەوان لـە ڕێگەی تەئویلکردنەوە شتەکانیان دائەمەزرێنن. ئەم پەتایە تورکیای عەلمانیشی گرتەوە کە ئەتا تورك بـە هـەموو توانایەکیـەوە دەسـەڵاتی خەلافـەتی ئیسـلامی عوسمـانی بـە تـەواوی ڕامـاڵی کەچـی ڕەوتـی ئیسـلامگەرایی لـەوێش پەیـدابوو. بەڵام ڕژێمی عـەلمانی تـورکیو عەسـکەتاریەتی تـورکی ڕێگـەیان پێنـادەن بگەنـە مەبەستەکانیان. گەر ڕۆژێکیش بگەنە ئەو ڕادەیە هەر سەرکەوتوو نابن چونکە کۆمەڵگای تورکی لە زۆر ڕووەوە چونەتە ناو مەدەنیەتەوەو لە ئەنجامدا شکست دێـنن. گەرچـی لـەم سـاڵانەدا حیزبێکـی ئیسلامی میـانڕەو بـە نـاوی حیزبـی ڕەفاهەوە توانیویەتی شوێنێك داگیر بکاتو مەترسی بنێتەوە لە سەر دەسـەڵاتی سیاسی عەلمانی تورکی، بۆیە زۆر بە پەلە دادگای دەسـتووری تـورکی ڕۆژی ١/١٦ بڕیاری داخستنتی حیزبی ڕەفاهی داو بگرەوەکو حیـزبێکیش قەدەغـەی کـرد. ئـەم هەڵوێسـتە زۆربـەی زۆری سیاسـەتمەدارانی ئێرانـی قەڵسکردو دژی ئـەم هەنگاوەی حکومەتی تورکی بیرو ڕایان دەربڕی. عەبدوڵلا ئوجـەلانیش گەرچـی لە ڕوانگەی ئیسلامییانەوە دوورە،ووتبووی: هەرچەندە حیزبی ڕەفاە دژی گـەلی کورد بـووەو لـە سـەردەمی ئـەودا پـەیمانی تورکیـاو ئیسـرائیل مـۆرکراوە بـەڵام

داخستنی کارێکی خراپە، دیارە ئەم هەڵوێستەشی تەنیا لە دژی تورکیا بووەو پشتیوانی نەبووە لە حیزبی ناوبراو کە ئەکرا عەبدوڵلا ئۆجەلان ئەوەی کە خۆی باسی ئەکات کە ڕەفاه دژی گەلی کوردە لە بەر چاو بگرتایەو جیاوازی نەکردایە لە نێوان عەلمانییەکی تورك‌و ئیسلامییەکی تورك کە پێکەوە هەردووکیان بەرامبەر بە کورد یەك سیاسەتیان هەیە. بەڵکو ئەتوانرێ لەگەڵ عەلمانیەکاندا قسەیەك بکرێ. بەڵام ئیسلامییەکان بە هیچ جۆرێك ئامادەی هیچ گفتوگۆیەك نین بۆ چارەسەری دۆزی کورد. ئیسلامییە کوردەکانی لای خۆشمان بە بۆنەی ئەو هەڵوێستەی تورکەوە کۆستیان کەوت‌و ڕەنگ‌و ڕوویان خەمباری لێئەباری کە حیزبێکی هاوڕایان ئەخرێتە کونەوەو ڕێگەی لێئەگیرێ بەرنامە چەپەڵەکانی پەیڕەو بکات‌وەکو کاری حیزبایەتی.

لە جیاتی ئەوە ئەبوایە ئەم ئیسلامیانە نارەزاییان بەرامبەر حیزبی ڕەفاه دەربڕیبایەو لە سەر کورد بە دەنگ بهاتنایە، کەچی پشت ئەکەنە داخوازی‌و مافەکانی گەلەکەی خۆیان‌و دەست ئەنێنە دەستی حیزبێکی دژ بەویستی کورد بگرە ئەو کاتانەی حیزبی ڕەفاه لەسەر حوکم ئەبێت هەڤاڵە ئیسلامییەکانی کوردستان بە بنکەی خۆیان دائەنێن‌و نوینەرانیان ئەنێرنە لایان‌و پەیوەندی توندو تۆڵ ئەبەستن کەچی لە ناو ئیسلامییەکانی خۆیاندا دەیان ناکۆکی‌و بگرەو بەردە هەیەو زۆریان پێکەوە هەڵناکەن، بەڵام کە کار ئەگاتە سەر کورد هەموویان یەك ئەگرنەوەو ئیسلامییەکانی لای خۆشمان شوێن پێی ئەوان هەلئەگرن‌و ئەبنە بەشێك لە هەنگاوو هەڵوێستەکانیان، کەچی هیچ ئیسلامیەکی عەرەب بە قەد تۆزقاڵێك بیری عەرەبچێتی خۆیان نادۆڕێنن‌و ئامادەنین دەستبەرداری بن.

# وەڵامی ئاشتینامەکە

ڕۆژی١/١٨ بوو لە ڕێگەی ئیزگەی پارتیەوەوەڵامی ئاشتینامەکەی مام جەلال درایەوە کە لە ڕۆژی ١/١٤ لەلایەن مەسعود بارزانیەوە نووسرابووەوەو تەئکیدی لەسەر ئەم خاڵانە ئەکردەوە:

١. پرۆژەکە لە چوارچێوەی پرۆسەی ئاشتی لە ئەنقەرە جێبەجێ ئەکرێت.

٢. پێویستە بە دوای ئەڵتەرناتیفێکی ڕێکوپێکدا بۆ پێکهاتەی نیوە بە نیوەدا بگەڕێین، کە تاقیکردنەوە دەریخست سەرکەوتوو نییە.

٣. هەموو ڕێککەوتنەکانی پێشوو پەیوەست بووە بە هەلومەرجی ئەو کاتەوەو نابێ بۆی بگەڕێینەوەو پێویستیش ناکات ئاماژە بەوە بکەین کێ پێشێلی کردووە بۆ نموونە کاتێك کە ڕێککەوتنی پاریس مۆر کرا یان بڕیارەکانی پەرلەمان‌وەرگیرا حکومەتیکی یەکگرتوومان هەبوو کەچی ئەبێت هەوڵێکی زۆر بدەین تاکو حکومەتێکی هاوبەشی تر دابمەزرێنین.

ئینجا شتەکان ئەکاتە ٣ قۆناغەوەو لە هەر قۆناغێکیشدا کۆمەڵێك خاڵی هێناوەتەوە کە لەگەڵ ناوەڕۆکی نامەکەی هەڤاڵ مام جەلالدا ڕێك دێتەوە. ئەوی ڕاستی بێت خاڵی سێیەم کە ئەکاتە هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنەکانی پێشوو، کارێکی خراپەو ئەبوایە لەوێوە هەوڵ بدرایە بچینە ناو دەروازەی ئاشتییەوە، نەك سڕینەوەی جگە لەمە ڕێککەوتنی ئەنقەرە پارتی ڕەتیکردەوەو تەنیا خۆی بە ٥ بەندەوە بەستەوە، کە مەبەستیان تەنیا ئەو٥ بەندە بێ ئەوا هیچ نییە. لەگەڵ ئەوشدا کە هێشتا چاڵی قووڵ لە نێوان هەردوولادا هەیەو خوێنی زۆر ڕژاوەو برینەکان سارێژ نەبوونەتەوە.

# هەوڵەكانی ئاشتی

ئەم نامەو نامە كارییە هەنگاوێكی بایەخداری تێگەیشتنە بۆ دانانی خاڵ لە سەر پیتەكانو بیر كردنەوە لە ئایینەدەی گەشی پێكەوە دانیشتنو هەڵبژاردنی ڕێگای دیالۆگو پێكهاتن لە سەر چارەسەری گرفتەكان. دیارە نامەو نامەكاری تر لە نێوان هەردوولادا هەبووەو هەردوولا ئاماژەیان بەوە داوە كە نامەی یەكەمی هەڤاڵ مام جەلالووەڵامەكەی مەسعود بارزانیوەكو دوو پڕۆژە لە بەردەستدا بێت بۆ كاركردن لە سەریان لە لایەن لیژنەیەكی باڵاوە بە سەر پەرشتی هاوڕێ عەزیز محەممەد. هەر ئەمەش بووە بناغەی ئەو پێكهاتنەو ڕۆژی ٢/١٢ لە شارۆچكەی شەقڵاوە مەكتەبی سیاسی هەردوولا بە ئامادەبوونی تێكۆشەر مامۆستا عزیز محەممەد دانیشتن.وەفدی یەكێتی بریتی بوو لە د.كەمال فوئادو عومەری سەید عەلیو ئەرسەلان بایز،وەفدەكەی پارتیش پێك هاتبوو لە د.سامی عەبدولڕەحمانو جوهر نامیقو بروسك نوری شاوەیس. لە دوای گفتوگۆیەكی چوار سەعاتی لە سەر پلانی ئاشتیو پڕۆژەكان لەسەر كۆمەڵێك خاڵ پێكهاتن:

- پەیوەست بوونی هەردوولا بە ئاگر بەستەوەو پەیڕەوكردنی شێوازی دایەلۆگ بۆ چارەسەری كێشەكان.
- ڕاگرتنی هێرشی ڕاگەیاندن.
- ئازاد كردنی دیلو گیراوەكان بەبێ مەرجو لە ماوەی هەفتەیەكدا.
- ڕاگرتنی ڕاگواستنو دوور خستنەوەو پێكهاتن لە سەر گەڕانەوەی هەموو ئاوارەو ڕاگوێزراوەكان بۆ شوێنەكانی خۆیانو گەڕانەوەی سەروەتو سامانیان بۆیان.
- قەدەغەكردنی ڕاونانو گرتنی هاوولاتیان بەهۆی سیاسیەوە.

- دانانی لیژنەیەکی هاوبەش لە پسپۆڕەکان بۆ بەدوادا چوونو جێبەجێکردنی بڕیاری ٩٨٦ .
- دانانی لیژنەیەکی هاوبەش بۆ هاوکاریکردنو کارکردن بۆ مسۆگەر کردنی کارگوزارییە گشتییەکان لە بواری تەندرووستیو خوێندنوووزەدا.
- کار کردن لە سەر بەردەوام بوونی کارگوزاری گشتی لە بواری کارەباو بازرگانیو هاتووچۆی هاوولاتیان.
- بڕیار درا هەردوو لا بەردەوام بن لە سەر دانیشتن.

ئەمەش بووە بەردی بناغەی ئاشتی نێوان هەردوولاو ئەم ڕاگەیاندنە ڕۆژنامەوانیە ئاهێکی بە دڵو دەروونی خەڵکیدا هێنایەوەوەکو سەرەتایەك بۆ پێکهاتنی هەمیشەییو سەرخستنی پرۆسەی ئاشتی. ئەمەش دڵنیاییەکی خستەوە کە هەوڵەکانی ئاشتی بێ بەرهەم نەبێو بنەوبارگەی شەڕ بۆ ماوەیەکی دوورتر بپێچرێتەوەوویستگەیەکی پشوودان بێتە کایەوە.

## ڕاوە ئاسک

لەم دۆخە نەشەڕ نە ئاشتییەدا کەڵکەڵەی ڕاوەئاسك کەوتە سەرم کە یەکێکە لە ئارەزووە دێرینو خۆشەکانم، نەك بۆ گۆشتەکەی بەڵکو ڕاوکردنەکەی ئاسوودەییەکی گیانی بە مرۆڤ ئەبەخشێو چێژێکی خۆشی لێوەرئەگرێو ئەیخاتە جیهانێکی ئەفسووناوییەوە.

ئاسك ئاژەڵێکی زۆر جوانوناسکە، زیاتر لە پێدەشتەکاندا ئەبینرێت، بە تایبەتی لە گەرمیاندا، کاتی خۆی ئەوەندە زۆر بووە بە ڕەوەو گەل پێکەوە بوون، زۆر تر لە نزیکی چەماوو کانیاودا ئەبن، نەك دوور لە سەرچاوەی ئاوەوە، ئەم ئاژەڵە لەشولارێکی ڕێكو باریكو سووکەڵەی هەیە. سركو بە هەڵمەتەو کە دوژمن بەدی ئەکات بە خێراییەکی تیژ ڕائەکاتو دوور ئەکەوێتەوە کە تەقە کەوتە کوردستانەوە تا ئەهات ژمارەیان کەم ئەبووەوەو

پێشتر لەبەر ئەوەی تفەنگ کەمتر بوو ڕاو بە تفەنگ نەئەکرا بەڵکو زۆرتر بە تانجی ئەکرا، خەڵکیش ئەوەندە چڵێس نەبوون‌و لە ڕاو کردندا بەبەزەیی بوون.

جارێکیان پیاوێکی جاف تانجییەکی بۆ ڕاو ڕاگرتبوو، بەڵام نە نانی باشی ئەدایەو نە جلی ئەکردو نە خزمەت. بردبووی بۆ شاخی مازوخ، ئەیووت ئەبێ بیگریت، کەنەیشی گرتایە تانجی داماوی فەلاقە ئەکرد. مەرج نییە هەموو کەسێك‌وابێت بەڵکو خەڵی‌وا هەیە تانجی‌وەکو ئاژەڵێك لا خۆشەویستەو باشترین خزمەتیشی ئەکا.

دوای ڕاپەڕین خەڵکیکی زۆر سەریان کردە ڕاوکردنی ئاسك بە جۆرێك‌وای لێهات کە ئاسك ژمارەیان یەکجار کەم بێتەوە. بۆیە لەڕووی بەزەیی هاتنەوە بەم ئاژەلە بەستە زمانە کەوەکو سامانێکی نەتەوەیی‌وایە، هەڤاڵ مام جەلال بڕیارێکی بە سەر هەموو دامودەزگا حکومی‌و حیزبییەکاندا بلاو کردەوە کە ڕاو بە هەموو جۆرەکانیەوە قەدەغەیەو سەرپێچیکەر سزای توند ئەدرێ. ئەمەوایکرد کە ژمارەی ئاسك تاڕادەیەکی بەر چاو زۆر بێت. من لە ڕاوکردندا بە یاوەری دۆستو برادەر دەرئەچووم، زۆرتر مەبەستم لەوەختبردنە سەرو چێژوەرگرتن بوو لە چوونە ڕاو تا ئەوەی ئاژەڵەکە بکوژم‌و تامەزرۆی گۆشتەکەی بم کە گۆشتێکی ڕەشی هەیە بەڵام تامی تورتەو دەمارو ڕەگی زۆرە بە هۆی ئەوەی هەمیشە سرکەو لە ڕاکردن‌و هەڵبەزو دابەزیندایە.

لە یەکێك لە دوا ڕۆژەکانی ئەم مانگەدا لەگەڵ کاكساڵەح نەسرەدین‌و عومەری حەمە سەعیدی خەڵکی دێی سەدوبیست‌و مامۆستا مستەفا بۆ ڕاو چووینە گەرمیان بۆ ناوچەی داویەو بناری گل. شەوەکەی چووینە ئاوایی جەلال لە نزیکی کۆمپانیای نەوتی مارداری، کە هێزێکی دوژمنی لێبوو بۆ پارێزگاریکردنی، ئەو هێزە بە توندی بەدۆشکای دوو لوولەو ۲۳ ملم‌و هاوەنی ۱۲۰ ملم‌و تۆپ‌و تانك لێیداین. بەڵام ئێمە بێ زیان بووین، ناچار لەو ناوە کشاینەوەو لە کاتژمێر ۹ی شەو نزیك دێی شێخ حمید ئۆتۆمبیلەکەمان لە قوڕدا

چەقیو بە دەردێکی خراپ دەرمان هێنا، لەم ڕاوکردنەدا کە زەحمەتێکی زۆریشمان چەشت، بەرازو چاڵەکەمان کوشت نەك ئاسك. لە کاتی ڕاوکردندا هەرچی ئازارو مەینەتی دنیا هەیە لە بیر ئەکریو جۆرە خۆشییەکت پێ ئەبەخشیو ئەتخاتە بارێکی تایبەتەوە، هەرچەندە تووشی ماندوێتیو هیلاکی ببی هەستی پێناکەیت، کە ئەگەڕێیتەوە ئەزانی چیت بە سەر هاتووە.

## یادی شێخی بیارە

گەیشتمەوە سلێمانی ڕۆژی ١/٢٦ لەگەڵ هەڤاڵان کوردۆو شێخ جەعفەرو جەمیل هەورامی چووینە باریکە بۆ بەشداری لە یادی ساڵڕۆژی کۆچی دوایی شێخ عوسمانی بیارەیی نەقشبەندی بە هاوکاری بەشی کۆمەڵایەتی مەڵبەندی شارەزوور، کۆڕەکەی بۆ گێڕدرا دەیان مەلای ئاینیو موریدو سۆفی نەقشبەندیو خەڵکێکی زۆر لە هەموو ناوچەکانەوە هاتبوون.

مێژووی پەیدابوونی نەقشبەندییەکان بۆ حەزرەتی مەولانا خالیدی میکایەلی جاف ئەگەڕێتەوە، کە تەریقەتێکی تازەی داهێنا لە بەرامبەر تەریقەتی قادریدا. مەولانا خالید پیاوێکی ئاینی دڵسۆزو داهێنەرێکی بە توانا بووە، لە ماوەیەکی کەمدا توانی ڕێوشوێنی بەرچاو بۆ تەریقەتەکەی بکاتەوەو خەڵکێکی زۆر لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوەو خەلیفەو موریدێکی زۆر پەیدا بکات. نەك هەر لە کوردستاندا بەڵکو لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیشدا، مەولانا ئەم ڕێبازەی لە دوای گەڕانەوەی لە هندستان لەگەڵ خویدا هێنایەوە. کە جیاوازی لە گەڵ تەریقەتەکانی تردا هەیە کە نەقشبەندییەکانی کوردستان دوای مەلانا خالید زۆربەیان تێکەڵ بە ژیانی سیاسی گەلەکەیان بوونو زۆر لە شێخەکانی تەریقەت بوونە سەرکردەی یەکەمی شۆرشی کورد،وەکو شێخ سەعیدی پیرانو شێخ عوبیدوڵلای نەهریو شێخ عەبدولسەلامی بارزان بەڵام ئەوەی ئەزانرێ شێخانی بیارە لەوانی تر جیاوازترنو ئەمان زۆر پابەندی لایەنە ئاینیەکە

بـوون‌و ئەوەنــدە خۆیــان بـەکاری سیاســی‌و نەتەوایەتییــەوە نەبەســتووەتەوە. هەرچەندە شێخ عوسمانی بیارە هەندێ هەڵوێستی خۆی هەبووە لـە بەرامبـەر ڕووداوەکانــدا، هەرکــە ڕژێمــی کۆمــاری لــە عیراقــدا پەیــدابوو کوردســتانی بەجێهێشت‌و ڕووی کردە ئێران‌ولە دێـی دووڕووەی سـنووری مـەریوان دانیشت. کـە ڕژێمــی شاهنشــاهی ئێــرانیش ڕووخــا ڕووی کــردەوە عێــراق‌و لــە بەغــدا دانیشت‌و پێش بـەر پـابوونی ڕاپــەڕین چـووە تورکیـا تــا ساڵـی پـار لــە دنیـا دەرچـوو.وە نــەبێ ڕێبــازی نەقشــبەندی هــەروەکو پێشــتر باســم کــردووە بــە بێـدەنگی هـاتبێ‌و کاروبـاری تەریقـەتی ئـاینی خـۆی بـە ئاسـوودەیی ئـەنجام دابێ، بەڵکو قادرییەکان‌وەکو مێملێك تەماشایان ئەکردو کۆسپیان بـۆ درووسـت ئـەکردو پـڕو پاگەنـدەیان بـۆ هەڵئەبەسـتن، تـاوای لێهـات مـەولانا بـە ناچـاری بچێتە بەغداو جارێکی تر بگەڕێتـەوە کوردستان‌و دوا جـاریش بـە یـەکجارەکی دوور بکەوێتــەوەو لــە دوورە زێــدی خــۆی لــە ســوریا ســەر بنێتــەوە. بــەڵام ڕێبازەکەی تا ئەهات پەرەی ئەسەندوموریدەکانی دڵسۆزانە لە هـەموو لایەکـەوە کاریان ئەکرد تاکو ناوی مەولاناو ڕێبازەکەیان بە زیندوویی بمێنێتەوە.

## تەشکیلاتی نوێ

هەر ئێوارەی ئەو ڕۆژە فەرماندەیی گشتی بە سـەر پەرشـتی هـەڤاڵ مـام جەلال‌و ئامادەبوونی هەندێ لە هەڤاڵانی مەکتەبی سیاسـی‌و هـەموو ئەنـدامانی فەرمانــدەیی گشـتی کۆبوونــەوە کـرا، دوای گفتوگـۆی چـڕوپڕو هەڵسـەنگاندنی کاروباری پێشمەرگە، لە ئەنجامدا بڕیار درا کە هێزەکان ڕێکبخرێنـەوەو گـۆڕانی تێـدا بکرێـت‌و تەشـکیلاتی سیانی پـەیڕەو بکـرێ، کـە هـەر فەرماندەییـەك ٣ لەشکرو هەر لەشـکرەش ٣ هێـزو هـەر هێـزیکیش ٣ تیـپ بێـت، هێـزیش لـە١٠٠ پێشــمەرگە کــەمتر نــەبێ‌و لەشــکریش لــە٢٥٠ کــەس‌و فەرمانــدەییش لــە ١٢٥٠پێشمەرگە پێکبێت بە هەموو پێکهاتەکانیەوە.

ڕۆژی دواتـر بـە ڕەسمـی لەگـەڵ کـاك شـێخ جەعفـەر دا دەورو تەسـلیمم کردو لە فەرماندەیی٧ی سلێمانی دەست بەکار بووم. کـە پێش تـریش سـەردانم کردبوون‌و تەشکیلەکەمان بەم شیوەیە ڕێکخست:

- لەشکری سلێمانی
- لەشکری ئەزمەڕ
- لەشکری شارباژێڕ.

# نامەیەک لە زیندانەوە

ڕۆژی ١٩٩٨/٢/٨ لە زیندانی فاشیەکانەوە لـە ئـەبو غرێـب، نامەیـەکی پـڕ لـە سـۆزی کـاك ڕەزای حـاجی عـەلیم پێگەیشـت کـە لـە ١٩٩٨/٢/١دا بـۆی نووسـیبووم. ڕەزا پێشـمەرگەیەکی ئـازا بـوو، لـە شـەڕەکانی ٣١ ی ئابـدا لەگـەڵ هێزەکانی ڕژێم‌و پارتیدا لە قۆڵی قوشتەپە بە دیلگیرا. مـن هـەموو جارێـك بـە هـۆی کـەس‌و کارەکـەی هەواڵپرسـیم ئـەکردو بـە سـەرم ئـەکردەوەو لـە بـیرم نەئەکردو بۆ دڵنەوایی کردنی هەندێ کۆمەکی سادەم ئـەکرد. ڕەزا لـە زینـداندا پیـاوێکی خـۆڕاگر بـووە، لـە زینـدان‌و لێـدان نەترسـاوە، لـەو چـەند دێـڕەی نامەکـەیدا دێڕۆکی قارەمانەتی ئەخوێنیتەوە:

زیندان هەر ئەو زیندانەی بەعسە کە هەموو ئـەزانین چاوەڕوانی باشـی لێ نـاکرێ، بـەڵام زۆر باشـین‌و خـۆڕاگرین‌و ڕەق‌و ئەسـتوورترین لـە دیوارەکـانی زینـدان‌و نابـەزین‌و مانـدوو نـابین‌و باوەڕمـان بـە ڕزگـاربوون زۆرە. پـەنا بـە یەزدان ئەو ڕۆژە نزیکە کە دکتاتۆرەکـەی بەغـدا ئەخرێتـە زبڵـدانی مێـژووەوە. بژی سەرکەوتن کە ملیۆنکێکی زێڕینە لە ملی دوا ڕۆژماندا.!.

ئەمـە هەڵوێسـتی پیـاوی مـەردو چاونەترسـە لـەناو زینـدانێکی تاریکـدا بـاوەڕی بـە خـۆی هەیـەو نابـەزێ، بـاوەڕی بـە دوا ڕۆژو ڕزگـار بـوون هەیـەو پێشبینی ئەوەش ئەکات لە دواجاردا سەدام بخرێتـە زبڵـدانی مێـژووەوە. کەچـی

لێرەش لەم هەلومەرجی ئازادییەدا کەسانێکی  چەپەڵو دڵڕەش هەن، هێشتا بە پیلانــی دژی مرۆڤایــەتی دکتاتۆرەکــەی بەغــدا فریــو ئــەخۆنو لــەوێوە دیــاری T.N.Tو مــادەی تەقینــەوە بــۆ کوردســتان دێــننو خــەڵکی بێتــاوانی پێنــەکوژنو ئــازادیو ئەزموونەکــەمان تێکئــەدەن. لــە ڕۆژی ٢/٢٧ دا لــە ســینەما دڵشــادی سلێمانیدا تەقینەوەیەکی گەورە ڕوویدا، باش بـوو زیـانی گیـانی نـەبوو، هەنـدێ زیــانی مــادی لێکەوتــەوە، بــەڵام لــە ڕووی دەروونیــەوە کاریگــەری خراپــی بەجێهێشــتو خــەڵکی خســتە نائارامیــەوە کــە هەمیشــە لــەو جــۆرە کارانــەی دەستوپیوەندە چەپەڵەکانی ڕژێم بترسن. نەك هەر ئەو جۆرە خەڵکە بە ڕژێـم فریو خواردووانـە زیـان ئەبەخشن بـەڵکو تونـدڕەوە ئیسلامییەکانیش لـە سـەر لاشەی ئەو خەڵکە بەستەزمانەی گەلەکەمان تاوانو پشێوی درووست ئەکەن بـە ناوی ئاینەوە تـاوانی دژی مرۆڤایـەتی ئـەنجام ئـەدەنو دژی هـەموو داهێنـانێکی تەکنەلۆژی هاوچەرخن. ئەمانە تەنیا خۆیان لە سەردەمی حوشتردا ئەبیننـەوە. بۆیە بە ئەرکی ئـەزانن پـەلاماری هەنـدێ گـازینۆو دووکـانی سـەتەلایت بـدەنو بیان سووتێننەوەك ئەوەی قەرەجاوای سلێمانی. هەروەك لە هەولێریش هەنـدێ کاری لەو بابەتەیان ئەنجام دا یان بە هوها ئەکەونە شوێن ژنـی سفور. ئەمـەش گیانی دواکەوتوویيو کۆنەپەرستی بە ناوی ئایینەوە دەردەخات.

## یادی نەورۆز

نەورۆزی ئەمساڵمان دوور بوو لە ئاگری شـەڕ. ئـاگرێکی خـۆش لـە سـەر دوندی شاخەکانو شوێنە بەرزاییەکاندا کرایـەوە کـە سـاڵێکی کـپو خـۆشو پـڕ تەڕو تووشی بوو.

ڕۆژی ٣/٢٢ لـە یـادی نـەورۆزو ڕاپەڕینوسـاڵیادی ئـازاد کردنــی شـاری کەرکوکدا ئاهەنگێکی گەورە لەسلێمانی ساز کراو خەڵکێکی فـرە ئامـادەی بـوون، لەم ئاهەنگەدا هەڤاڵ مام جەلالووتارێکی بە پێزی مێژوویی خوێنـدەوە، تیایـدا تیشکی خستە سەر چەند لایەنێکی مێژووییو بەڵگەی کوردبوونی کـەرکوك کـە

سەر دەمانێك پێتەختی حكومەتی شارەزوور بووە كە قەڵمڕەوی تا سەقزو سنەو مریوانو هەولێر چووە. چەند ڕۆژێك دوای ئەوە لە بارەگای فەرماندەیی گشتی لە سەربازگەی سەلام بە ئامادە بوونی كاك جەبار فەرمانو برادەرانی فەرماندەیی گشتی پێشوازیمان لەو ٢١ قارەمانەی یەكێتی كرد كە لە شەڕەكانی ٣١/ ئابدا لە لایەن گاردی كۆماری عێراقەوە بە دیلگیرابوونو دوای ساڵو نیوێك لە زیندان ئازاد كران. كە یەكێك لەوانە ڕەمزای حاجی عەلی بوو كە نامەكەی بۆ نووسیم، دواتریش كاك كۆسرەت هەموویانی لە میوانخانەی ئاشتی داوەتی نان خواردن كرد،وەك ڕێزلێنانێك بۆ ئازایەتییان.

## دوو جەژن

هەر لەم سەرو بەندەداوەكو ڕووداوێكی سەیرو كوتو پڕ، خزمێكم كە خەڵكی كفرییە بە ناوی نەسرەدین حەمە ئەمین لە ساڵی ١٩٨٢وە لە شەڕی عێراق ـ ئێراندا كە سەرباز بووە بە دیل ئەگیرێو هیچ هەواڵێكی نەبوو، دەستمان لێ شۆردبوو، كە ئەو گیرا منداڵەكانی ساوا بوون، كوڕەكەی منداڵ بوو. بە ڕێكەوت ئەو ڕۆژەی ئەو لە دیلی گەڕایەوەو خۆی كرد بە ماڵا كەس نەیزانی، ئەمڕۆی كوڕی زەماوەندی ئەكردو ژنی ئەگواستەوە، بۆ ئەو مەبەستە خۆمان سازدابوو، ئیتر ئاهەنگی ژن هێنان بوو بە دوو ئاهەنگ فرمێسكو خۆشی تێكەڵ بەیەك بوون، لە لایەك شادی زەماوەندی كوڕو لە لایەك فرمێسكی شادمانی ڕزگاربوونی باوك بوو دوای ١٦ ساڵ دیلێتی درێژخایەن لە زیندانی بێسەرو شوێن بووندا. لە خۆشیدا زەماوەندەكەمان بردە ئەو دەشتە بەهارییەی گەرمیانو تا درەنگانێك هەڵپەڕكێو شادیو خۆشی بوو.

# له ئاوایی حەمەی کەرەم

ڕۆژی دواتر له خزمەتی هەڤاڵ مام جەلال‌و بە ئامادە بوونی هەڤاڵان: کۆسرەت ڕەسول‌و عومەری سەید عەلی‌و ملازم عومەرو عومەر فەتاح‌و کاك حەمە حاجی مەحمودی گوڵەخانەو کاك قادر عەزیزو حاکم قادرو پارێزگاری سلێمانی‌و ئاوات عەبدولغەفور لێپرسراوی ئاسایشی گشتی‌و کۆمەڵێك خەڵکی تردا گەیشتینە ئاوایی حەمەی کەرەم کە بانگهێشتی میوانداری ئەوی کرا بووین. هەڤاڵ مام جەلال لە میانەی دەمەتەقیەکانیدا باسێکی تێرو تەسەلی لەمەڕ حکومەتی شێخ مەحمودی حەفیدو کێشەی نێوان‌وەزارەتی موستەعمەراتی بەریتانی‌ووەزارەتی هیندی کرد.وەزارەتی موستەعمەرات ڕای‌وابووە کورد بکرێتە حکومەت کەچی‌وەزارەتی هیندی ڕای‌وابووە کوردستان‌وەك سەرێك‌وایە بە لاشەی عێراقەوە، هیچ لاشەیەك بێ سەر نابێت، هەروەها باسێکی میجەرسۆنی کرد کە لە کوردستاندا خۆی ناو نابوو غولام حسین شیرازی بۆ جاسووسی هاتبووە کوردستانەوەو خۆی کردبووە بازرگان لە سلێمانی. ئەم کابرایە لەگەڵ شێخ مەحمودی نەمردا نیوانی خراپ بوو کە بەریتانیا عێراقی داگیر کرد، میجەرسۆن بوو بە حاکمی سیاسی سلێمانی، زۆر بە توندی دژایەتی حکومەتی شێخی ئەکرد.

هەروەها باسی خاڵە هەرە لاوازەکانی حکومەتی شێخی کرد کە کاری دبلۆماسی بوو لە دەرەوەی کوردستاندا، ئەگەر چی ئەووەفدەی شێخ ناردی بۆ دەرەوەی‌وولات بۆ ئەوەی شریف پاشا بکاتە نوێنەری کورد لە دەرەوە لە شام گیران‌و نەگەیشتنە پاریس، جگە لەمەش هەندێ لە سەرۆك خێڵەکانی کورد دژی حکومەتەکەی شێخ مەحمود بوون‌و پشتیوانیان لێنەئەکرد، ئەوی ڕاستی بێ ئێمە ناتوانین بە پێوانەی ئەمڕۆ ڕەخنە لە شێخ بگرین‌و گلەیی لێبکەین کە چی بکردبایە یان هەڵوێستی چۆن بوایە..؟ لەگەڵ ئەمەشدا بۆ ئەو

سەردەمە شێخ هەندێ شتی باشی کردووەو گەلێك کەمو کوڕیشی هەبووە، کەموکۆڕییەکان بەشێکی خودی شێخ ئەگرێتەوەو خۆی ڕای لەسەر بووەو پێی هەڵساوە، لە پەناشەوە ئەو خەڵکانەی دەوروبەری کاریگەرییان لە سەری هەبووە.. بەشێکی تریش پەیوەندی بە دەرەوەی ئەوەوە هەبووە کەچی بە باشی نەیانتوانیوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن‌و هەڵەکانی ڕاستبکەنەوەو لەگەڵیدا تێکەڵبن، بە پێچەوانەوە چەند خەوش‌و کەم‌و کوڕی هەبووە ئەوەندەش لە لایەن ئەو توێژانەوە بە تایبەت ڕۆشنبیران باری گرانتر ئەبوو، بە ڕەواو نارەوا هێرشیان ئەکردە سەری‌و ڕەش‌و سپییان لێك جیا نەئەکردەوە. شێخیش نەیتوانی ئەم توێژە لە خۆی نزیکبکاتەوە کەمێکیان نەبێت، هەروەها ئەو بگرەو بەردەو ناکۆکییە ناخوشانەی نێوان خێڵەکانی کوردوای ئەکرد کە دابەش ببنە سەر چەند بەرەیەکدا، هەندێك لەڕووی بەرژەوەندییەوە لەگەڵ شێخدا بوون‌و هەندێکی تریش لەدژی بوون‌و هەندێکش بێدەنگ بوون. لەگەڵ ئەوەشدا شێخ مەحمود لە مێژووی کورد دا لاپەڕەیەکی لە ڕووی قارەمانەتی‌و ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنی گەلی کورددا ڕازاندۆتەوە، گەرچی بە باشی نەیتوانیوە هەڵوێستی کۆنکریتی لە دوژمن‌و دۆستوەربگرێ، جاریك دۆستی تورکی داگیرکەر بووە، جارێك خۆی تێکەڵی شۆڕشی عێراق کردووە بە ناوی غەزاوە چووەتە شەڕی شوعەیبەو دژی ئینگلیز بووە، جارێکی تریش داوای دۆستایەتی‌وکۆمەکی لە سۆڤیتی کۆمۆنیستی کردووە.!

ئەگەروەکو موسڵمانێك دژی ئینگلیزبووە ئەی چۆن داوای هاوکاری لە سۆڤیتی کۆمۆنیستی ئیلحادی کردووە..؟! ئەبێ مێژوونووسانی کورد ئەم لاپەڕە گرنگانەی مێژووی شێخ‌و کورد بەووردی هەڵبدەنەوەو قسەی یەکلاکەرەوەی لە سەر بکەن.

# فیستیڤاڵی فۆلکلوری

دوای گەڕانەوەمان لەم گەشتە، ڕۆژی ٤/١٣ بەرێ کەوتم بەرەو گەرمیان بۆ بەشداری کردن لە فیستیڤاڵی فۆلکلۆری گەرمیان کە پێشتر بانگهێشت کرابووم، ئەم فیستیڤاڵە فیکرەیەکی کۆنەو کۆمەڵێك برادەر دەستیان دابوویە، بەڵام دەستپێکردنی شەڕی ناوخۆ ئەو بەرنامەیەی دوا خست، دواتر هەر لەسەر ئەو پێودانگە لەلایەن بەشێك لەو برادەرانەوە کاری بۆ کراو ڕێکخرایەوە. کە ئاهەنگی یادەوەری ژیانی ڕابوردووی گەرمیانیەکان نیشان ئەدات کە ئەنفال ئاسەواری لە بنو بێخ دەرهێناو خەریك بوو لە بیر ئەچووەوە، ئەم جۆرە مەراسیمە لە هەموووولاتانی دنیادا باوەو بایەخی تایبەتی پێئەدەن، گەرچی هەندێ کەسی لای ئێمە ئەم کارانە بە کۆنەپەرستیو ڕابوردوو خوازی لە قەڵەم ئەدەن کە تاڕادەیەك دوورە لە ڕاستییەوە، چونکە مەرج نییە هەر یادەوەری هێنانەوەیەك بەڵگەی نادرووست یا ن دواکەوتوویی بێ چونکە ڕابوردوو خاڵی گەشی تێدایەوەك خاڵی ڕەشیشی تێدایە، جگە لەمە ئەم فیستیڤاڵە هەندێ مەراسیمی هەمە جۆر لە خۆئەگرێ:

- گەرمیانو کوێستان کردن بە مەڕو ماڵاتەوە.
- شێوازی کۆمەڵایەتی لە ژن هێنانوزەماوەند کردنو هەڵپەڕکێو ڕەشبەڵەكو ڕمبازیو تەقەکردنو خۆڕازاندنەوە بە جلوبەرگی کوردییەوە.
- گۆرانیووتنو هۆرەچڕین.
- لەگەڵ هەندێ چالاکی تردا.

ئەم فیستیڤاڵە لە لایەن کۆمەڵێك هونەرمەندی ژنو پیاوی گەرمیان ماوەیەك پرۆڤەیان لەسەر بەرنامەکانی کردبووو هەندێ خەڵکیش لە ژنو پیاوی گەرمیان لە تیرەو هۆزەکان کە خۆیان شارەزای ئەو بوارانەن. لەم ڕۆژەشدا خەڵکێکی یەکجار زۆر لە هەموو شوێنێکی گەرمیانەوە بە ماڵو

منداڵەوە هاتبوون، لەگەڵ خۆیاندا خواردنو پێویستی سەیرانیان هێنا بوو، لەو دەشتەی بەردەسووری سەرپووی کەلاردا بلاّوبووبوونەوە، دیمەنێکی دڵرفێنو شیرینی درووست کردبوو، هەروەکو بڵێی هەموو کەسێك ئەیەوێ بگەڕێتەوە دۆخی ئەو ساڵانەی پێش ئەنفال کە هێشتا بەعسی مرۆفکوژ بە کۆمەڵ خەڵکی بەرەو قەسابخانەکانی نەبردبوو، هێشتا دێهاتەکان لە جێگای خۆیان مابوون. دیمەنەکان چەندە جوانیو ناوازەییان نیشان ئەدا ئەوەندەش ئێمەی ئەبردەوە بۆ ئەو ڕابوردووەی ئازیزانمانی تێدا ئەژیاو هەموو جوانییەکی ئەوەیان لە دەستداوە. بەلاّم ئەوەی جێی سرنج بوو ئەوە بوو کە هەندێ دیمەنوەکو لە کوردەواریدا باوبووەوانەکراوەو گۆرانی بەسەردا هێنراوەو چێژەکەی لەدەست داوەو ئەو جوانیەی نەداوەتە دەست کەپێشتر پێمانی بەخشی بوو، بۆ نمونە بووك سواری کەر بکرێ، قەت لە کوردەواریدا شتیوا نەبووە، یان ڕمبازی بە کەرنەکراوە کە چی ڕووی داوەو زۆریش دوور نییە خەڵکانێك هەبوو بن گایان زینکردبێوەکو مایین سواری بوو بوونو لە گەڵ سوارەکانی تردا غارغارێنیشیان پێکردبێ. ئەبوایە لەلایەن لیژنەی سەرپەرشتییەوە ڕێگە بەوکارانە نەدرایە، بەڕاستی ڕۆژیکی یەکجار پڕ لە بیرەوەریو تامەزرۆمان بە سەر برد. دوای تەواو بوونی بەرنامەی فیستیڤاڵەکە ئیتر ئێمە بەرەو سلێمانی گەڕاینەوە.

## باڵوێزی ڕوسیا لە سلێمانی

لە ناوەڕاستی ئەم مانگەدا بوو دەنگوباسی سەردانی باڵوێزی ڕووسیا بۆ سلێمانی بلاّوبووەوە، کە لەلایەن بەر پرسە بالاّکانی یەکێتییەوە پێشوازی لێکراوەو دواتریش چاوی بە هەڤاڵ مام جەلال کەوتووەو پێکەوە نانیان خواردووە. کە پێشتر ئەم باڵوێزە سەردانی مەسعود بارزانیشی کردبوو. بەپێی ئەو زانیاریانەی هەبوو مەبەست لە هاتنی ئەم باڵوێزە چەند شتێك بووە:

- ڕێگە خۆش کردن بۆ گفتو گۆکردنی هەردوو حیزبی دەسەڵاتداری کوردی لەگەڵ ڕژێمی عێراقدا.
- لایەنێکی ئابوری هەبوو کەوا ڕووسیا ئەیەویت لە ڕێگەی کوردو دەسەلاتی یەکێتییەوە چاککردنەوەی هەردوو بەنداوی دووکانو دەربەندیخانی پێ بسپێردرێت، کە دەستکەوتێکی زۆری بۆ ڕووسیا لە ڕووی پارە پوولەوە تێدایە، لە ڕێگەی ئەمەشەوە ئەیانەوێ پەیوەندی نێوان ڕووسیاو حکومەتی هەرێمی کوردستان پتەوبکرێت.

لەمەڕ خاڵی یەکەمەوە ئەم باڵوێزە ئەوەی دەربڕیوە هەروەکو سیاسەتی حکومەتەکەیداوایە کە ڕژێمی عێراق‌وەك جاران نەماوەو گۆڕانی تێدا بەدی ئەکرێ‌و ئەشێ لە ڕێگای گفتوگۆوە گرفتەکان چارەسەر بکرێن، بەلام خۆی لەوە بوارد بوو یان بە ئەنقەست نەیویستبوو باسی ئەوە بکات کە هەر گفتوگۆیەك یان پەیوەندییەك بە ڕژێمەوە بۆ دارشتنی سیستمی ئایندە لە کوردستاندا پەرلەمانی کوردستان بڕیاری لەسەرداوە، کەسیستمی فیدراڵییەو ناکرێ لێی لابدەین. ئایا ڕژێمی عێراق دان بەو سیستمەدا ئەنێت..؟ جگە لەوە ئەبێت هەموو حیزب‌و لایەنەکان لە گفتوگۆدا بەشدار بن‌و ئیرادەی سیاسی کورد دابەش نەکرێ.

لە بارەی خاڵی دووەمیشەوە ئەوان تاچەند ئەتوانن ڕۆڵیان بەرچاو بێت لە بڕیاری ٩٨٦و ئەو پشکەی ئەدرێتە کوردستان.. ئەمە یەکەم جارە لە ئاستێکی بالادا نوێنەرێکی حکومەتی ڕووسیا لە دوای ڕاپەڕین‌و پێکهێنانی ئەزموونی حوکمڕانی کورد بێتە کوردستان. تاکو ئێستاش پەیوەندییەکانی ڕژێمی عێراق‌و ڕووسیا هەروەکو خۆیەتی‌و دانەبڕاوە، سەرەڕای ئەو هەموو تاوانانەی ڕژێم بەرامبەر بە کورد بە چەکی ڕووسی، هیچ هەڵوێستێکی نەبووە بۆ بچووکترین پشتیوانی لە کوردو دژوەستان بەرامبەر بەڕژێم یان ڕێگریکردن لە ئەنجامدانی شێوازی جینۆساید کە لە دوونیادا قەدەغەکراوە، چونکە بەرژەوەندییەکانی ڕووسیا لە ڕووی ئابوری‌و سیاسی‌و سەربازی‌و چەکسازییەوە

توندو تۆڵەو چەندین ڕێککەوتننامەیان لە نێواندایەو قەرزو قۆڵەیەکی زۆر هەیەو شارەزایانی ڕووس لە هەموو بوارەکاندا لە عێراقدا کار ئەکەن. ئیتر لایەنە مرۆڤایەتیەکە ئەوەندە بایەخی نییە، مادام سوودو بەرژەوەندییەکانیان پارێزراو بێت.کەسیش لەو باوەڕەدا نییە کە ئەم سەردانەی بالۆیزی ڕووسیا بتوانێ سەرکردایەتی کورد قایل بکات بۆ گفتوگۆی خۆ بە دەستەوەدان، گەر چی جیاوازی لە هەڵوێستی هەردوو حیزبی سەرەکی کورد دا هەیە لەم بارەیەوە.

# لە پرسەی کۆمۆنیستەکاندا

لەم ماوەیەدا دوو ئەندامی مەکتەبی سیاسیو سەرکرایەتی پارتی کۆمۆنیستی کرێکاری عێراق لە هەولێر تیرۆر کران، کە ئەوانیش شاپوور عەبدولقادر تاڵەبانیو قابیل عادل بوون، لە سلێمانی پرسەیان بۆ دانرا. نیوەڕۆی ڕۆژی ٤/٢٠ لە گەڵ هەڤالان کۆسرەتو داڕۆی شێخ نوریو شێخ جەعفەرو سەعدی ئەحمەد پیرەو جەمیل هەورامیو مامۆستا بەکرو حاکم قادر لە ماڵی کاك ئاواتی شێخ جەناب میوانداری کرابووین. دوای نانخواردنو دەمەتەقێ پاش نیوەڕۆکەی ڕوومان کردە هۆڵی بازرگانی بۆ پرسەی ئەو کۆمۆنیستانە. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشاینو لە دابو نەریتی ئێمەوە دوور بوو کەس لێی نەئەزانی، ئەوەبوو هەمووشتێکی ئەوان سروودی ئەنتەرناسیونال بوو جگەلەوە بێدەنگ ئەبوون. لە ناکاو پیاوێکی ڕیشسپی خۆی کرد بەناو پرسەکەداو فاتیحایەکی پانو پۆڕی دادا بەڵام کەسوەڵامی نەدایەوە، نە ووتیان بەخێربێی نەهیچ شتێکی تر. کابراواقیووڕماو خۆیوەڵامی خۆی ئەدایەوە. ئەمەش کارێکی نامۆیە، گەر وەکو کۆمەنیستی مولحید هەڵسوکەوت ئەکرێت بۆچی پرسە دائەنرێت، گەر لەبەر دابو دەستووری کۆمەڵایەتییە با بړواشی پێنەکرێ هەرئەبێ لە چوارچێوەیدا بجووڵێتەوە. ئەمەش جۆرە سەر لێشیوانێکە کەبە بازدان بمانەوێ کۆمەڵگاکەمان بگوازینەوە بۆ قۆناغەکانی گۆڕانو پەرەسەندن، بێ ئەوەی لە زەمینەی خۆیەوە هەنگاو هەڵبگرین.

## مەشقکردن

لە ناوەڕاستی مانگی ١٩٩٨/٥ دا. لە سەر بڕیاری هەڤاڵ مام جەلال مەشقی ڕێگا برینمان ئەنجام دا بۆ تاقیکردنەوەی هێزو توانای پێشمەرگە لە ڕێڕۆیشتنو شایستەیی لەش‌ولار. گەر پێیشمەرگە مەشق نەکات، پایەیەکی سەرەکی ئەرکەکان لە دەست ئەدات، ئەوکاتە ئەو کەسە نییە کە ئەتوانێ لە بواری شەڕدا گۆڕانکاری درووست بکات یان لە ئاشتیدا کەسێکی تەندرووستو داهێنەر بێت. ئێمە ڕێگای نێوان سەربازگەی چوارقورنە بۆ سەنگەسەر مان بە پێ بڕی کە بە چوونوگەڕانەوە ٤٢ کیلۆمەتر ئەبێت. نیوەڕۆکەی لە سەر چەمی سەنگەسەر لاماندا و نانی نیوەڕۆمان خوارد، دوای ئەوە بێستوون سابوراوایی‌وەکو نوێنەری مەڵبەندی پێشمەرگە هاتەلامانو کۆبوونەوەی بە هێزەکەمان کرد، من خۆم زۆر ماندوو بووم، لەشم سووتا بووەوە، لە حەسرەتا خۆم ڕووت کردبووەوە، هەرچەندە زەحمەتمان ببیٚو ماندوو کەشەنگ بین ئەو جۆرە ماندووبوونە زۆر پێویستە، پێشمەرگە گورجو گۆڵو ئامادە ئەکات، فێری ئارامیو خۆڕاگریو دان بەخۆداگرتنو هەست بە بەرپرسیارێتی کردنی ئەکات. زۆر مانەوەی پێشمەرگە لە بنکەو بارەگاکاندا بەبێ مەشقو جووڵان، لیاقەیان نامێنیٚو سستو تەمەڵیان ئەکاتو لە ئەنجامدا سەرەڕای ئەو هەموو خەرجییە بە کەڵکی ئەنجامدانی کاری پێشمەرگانە نایەتو بگرە زیانیشمان لێئەدات.

## کەرێکی هار

لەم مانگەدا ڕووداوێکی زۆر سەیرو دەگمەن، لە گردە زوبێری شارباژێڕ ڕوویدا. کە هاووڵاتییەك کەرەکەی ئەباتە ناو گیایەك ببەستێتەوە بۆ لەوەڕاندن، لە ناکاو کەرەکە پەلاماری خاوەنەکەی ئەداتو ئەینێتە ژێرو زۆر دڕندانە تێیبەر ئەبێت، کە ئەو هاووڵاتییە داماوە سەری لێئەبێتەوەووورگی

ئەدڕێو لاقو دەستێکیشی ئەشکێنێو ئەشلێن لە لەشی کابرای خواردووە.! من نازانم ئاخۆ ئەو کەرە تووشی حاڵەتێکی نەخۆشی بووبێ یان نە. تۆ بڵێی لە ئەنجامی ئازاردانی خاوەنەکەیدا تۆڵەی لێکردبێتەوە..؟ زۆر جار بووە کەرێك کە عەزیەت درابێ، جووتەی داوە، یان ڕایکردووەو بە زەحمەت گیراوەتەوە. بەڵام بەم جۆرە گوێدرێژ پەلاماری خاوەنەکەی بداتو پەل پەلی بکاتو لێی بخوات..؟! ئەوە مەسەلەیەکە ئەبێت لەڕێگەی شارەزایانی بەیتاڵەوە تیشکی بخرێتە سەرو لە ڕەفتاری ئەو جۆرە ئاژەڵە سەر شێتو ئاڵۆزانە بکۆڵنەوە، کە تووشی ئەم دیاردە ڕیزپەڕە ئەبن کە بە درێژایی تەمەن لەگەڵ مرۆڤ دا پەیوەندی باشو تێکەڵاوی تایبەتیان هەیە لە ڕووی هاوکاریو ڕاییکردنی کاروبارەوە چونکە لە ژیانی پێشمەرگایەتیو لە قۆناغی پارتیزانیدا کەڵکی زۆرمان لە گوێدرێژ بینیوە بۆیە بەزەیی زۆرم پێیدا دێتەوەوەکو ئاژەڵێکی هۆگرو سوودمەندیش لە گۆمەڵگای خۆماندا تەماشا کراوە.

## دیالۆگی عەرەبیی کوردی

هەر لە ناوەڕاستی ئەم مانگەدا بوو هەڤاڵ مام جەلال لە کوردستاندنەوە بەرەو تاران ڕۆیشتبوو بە مەبەستی بەشداریکردن لە دیالۆگی عەرەبی - کوردی کە لە قاهیرەی پایتەختی میسر ئەنجام ئەدرا، ئەوە بوو لە ڕۆژی ٥/٢٧ لە قاهیرە کۆبوونەوەی دیالۆگی عەربی - کوردی دەستی پێکرد کە ئەحمەد حەمروش بەووتارێك کردییەوە. پاشان هەڤاڵ مام جەلالووتارێکی بە نرخی خویندەوەو تیایدا ئاماژەی بە هەندێ لە قسەکانی ڕەحمەتی جەمال عەبدولناسرو نووسەرو سیاسەتمەدارانی عەرب کرد. لە بارەی پەیوەندی کوردو عەرەبەوە، کە مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە، پاشتر پڕۆفیسۆر د. عێزەدین مستەفا ڕەسوڵ قسەی کردبوو. ئێوارەش لە قسە کردنێکدا لە گەڵ تەلەفزیونیMED دا، ئەحمەد حەمروش بە هەڤاڵ مام جەلالیوتبوو کە

ماموٚستای قسەووتارە. ئەم دایەلوٚگەی عەرەبی - کوردییە لە نێوان ڕوٚشنبیرانی هەردوولادا سەرەتایەکی گرنگە بوٚ لە یەکگەیشتن‌و پتەوکردنی پردی پەیوەندییەکان‌و ڕەواندنەوەی تەمومژی ساردی‌و ئەو بێدەنگییەی بەرامبەر ئەنجامدانی تاوانەکانی ڕژێمی عێراق‌و سەدامی دکتاتوٚر هەڵیان بژاردبوو. هەنگاوێکی باش نراوە، ئەبێت نەك لە ئاستی ئەم خەڵکە هەڵبژاردەیەدا قەتیس بێت بەڵکو ئەبێت بە ئاستەکانی تریشدا بڕوات، هەر لە تێگەیاندنی خەڵکی سەر شەقام تا ئەگاتە پیاوانی دەسەڵات‌و سیاسەت کە زوٚر بە خراپی لە کورد گەیشتوون، ئەگەر یەکێکیش هەبێت بوٚ جارێك پشتگیری نواندبێت، تا سنوورێك بڕی کردووە یان پاشگەز بووەتەوەویان ترساوە بەردەوام بێت، چونکە پێگەی بە هێزی بوٚ خوٚی پەیدا نەکردووە.

بەڕای من ماوەیەکی زوٚرمان ئەوێ، ئەولاپەڕە ڕەشانەی مێژووی پەیوەندی‌و ناکوٚکییەکانمان بسڕینەوەو جوٚرە دڵنیاییەك بە یەکتر ببەخشین. زوٚر لاپەڕە بە دروٚی زەق‌و بێبەڵگەی زانستی پڕکراونەتەوەو کووچەو کوٚڵانەکانی مێشکی خەڵکی سادەو بگرە خوینەوارو ڕوٚشنبیرە باڵاکانی عەرەبی پێ پڕ کراوەتەوە.

## ڕووناکی کارەبا

دوای شەڕ هەمیشە بیر لە ئاوەدانی ئەکرێتەوە، دەسەڵاتداران ئەیانەوێ هەر چوٚنێك بێ بەشێکی ئەو زیانانەی کە لە خەڵك کەوتووە لە ئەنجامی شەڕەکاندا بە کەمیش بێت قەرەبوو بکەنەوە،وەکو سارێژکردنێکی برینەکانی لەشی دافەرەقاویان کە دەیان کون‌و کەلەبەری تێبووە. گەرمیان بەشی شێری لەو هەموو جوٚرە ئازارو مەینەتیانەی شەڕ بەرکەوتووە، بوٚیە لە ڕووی نەوازشەوە هەوڵدراوە بەپێی توانای مادی حکومەتی هەرێم کارێکیان بوٚ بکرێ، ئەم جارەیان لە بواری ڕووناکی‌و کارەبا ڕاکێشان بوٚ سنووری هەندێ دێهاتی بناری بەموٚی ئەوبەری سیرواندا. کە هەردوای ئاشبەتاڵی شوٚڕشی پێشوو،وەکو

بەشێك لە بەرنامەی جێبەجێکردنی بەرنامەی پشتێنەی ئەمنی ئەو دێهاتانەی چۆڵکردو خەڵکەکەی بەرەو خوارووی عێراق ڕاگوێزا.

بەم بۆنەیەوە ڕۆژی ٦/٤ کاك کۆسرەت ڕەسوڵ سەرۆکی حکومەتی هەرێم بە یاوەری وەفدێکی گەورەی حکومی و حیزبی کە پێکهاتبوو لە هەڤاڵان ملازم عومەر جێگری سەرۆکی حکومەت و عومەر فەتاح ئەندامی (م.س)و مستەفا سەید قادر وەزیری ناوخۆو سەعدی ئەحمەد پیرە وەزیری مرۆڤایەتی و سەید قادر جەباری وەزیری پیشە سازی و ووزەو لیوا کەمال موفتی وەزیری پێشمەرگەو شێخ جەعفەر جێگری وەزیری پێشمەرگەو حاکم قادرو مامۆستا بەکر پارێزگارەکانی هەولێرو سلێمانی، گەشتێکی بەرەو گەرمیان دەستپێکرد، منیش لە گەل هەندێ هەڤاڵی تری سەرکردایەتیدا هاوڕێیان بووین. لای دێی بیرکێی نزیك دەربەندیخان لە لایەن پارێزگای کەرکوك و بەرپرسی مەڵبەندی کەرکوك و لێپرسراوانی حیزبی و حکومی و خەڵکێکی زۆر پێشوازی کراین. کە گەیشینە دەربەندیخان چووینە پارێزگاو پاشان مەڵبەندی کەرکوك، پاش پشوویەکی کورت، بەرەو بناری بەمۆ بەڕێ کەوتین و لە دێیەکانی تۆڤگەو شاوازی پێشوازی گەرم کراین، کە گەیشتینە ناوەڕاستی دێهاتەکانی شاوازی و باخە هەنارە کاك کۆسرەت کارەبای داگیرساندو سەرجەم ماڵەکان لە ناو چەپڵەڕێزانی خەڵکەکەدا ڕووناك بوەوەو خۆشیەکی زۆر دڵو دەروونی پڕ کردن. لەووتەیەکدا کاك کۆسرەت ئاماژەی بەوەکرد کە چۆن خەڵکی بناری بەمۆ لە قارەمانەتی و شەهید بەخشیندا لە پێشەوە بوونە، ئەبێت لە خزمەتگوزاریشدا لە پێشەوە بن.. دواتر هەموو خەڵکەکە چوونە سەر خوانی نانخواردنێکی کوردانە کە بەوبۆنەوە ئامادە کرابوو، دوای ئەوە هەمووان بەرەو کەلارو کفری بە ڕێکەوتین و لە هەردووشارۆچکەکەدا پێشوازی باش کراین و کۆبوونەوەیان لەگەڵ کراو بەڵێنی کۆمەك و پرۆژەی خزمەتگوزارییان پێدرا.

# هەناردەکانی ڕژێم

هەمووئـەزانین ڕژێمـی بەعسـی فاشـی هـەموو جـارێ بـە مەبەسـتی تایبەتیویستوویەتی لە دەرگای کوردو حیزبەکان بدات، لـە ڕێگـەی کەسایەتیە کوردەکانەوە کە لە بەغدا دائەنیشن، ڕەوانـەیان ئـەکات بـۆ کوردستان گوایـە بـۆ گفتوگـۆو گەیشتنەچارەسـەری دۆزی کـورد. ئەمـە لـە ڕاسـتیدا بـۆ گفتوگـۆو چارەسـەری دۆزی کـورد نییـە. بـەڵکو لێکۆڵینـەوەی بـارودۆخی کوردسـتانو هەڵێنجانی سەرنجو تێڕوانینو مەبەستەکانی ئـەو سـەردەمەیە، بـۆ بنیادنـانی سیاسـەتی بەعسـیانە لـە بەرامبەریـدا. هەرچی ئـەو جـۆرە خەڵکانـە هـاتوونو گەڕاونەتـەوە بـە کـوڵێ قسـەو بـاسو زانیارییـەوە کەچـی ڕژێمـی بـەعس نەجووڵاوەو گۆڕانی لەسیاسەتو بەرنامەی خۆیـدا نـەکردووەو ئـەکرێ بـووترێ ڕژێم مەبەستەکانی خۆی پێ جێبەجی کردوون.

ئەم جارەیان کاك فوئاد عـارف کـە کەسـایەتییەکی ناسـراوی کـوردەو لـە بەغدا دائەنیشێ، لە لایەن ڕژێمەوە بەمەبەستی گفتو گۆ کردن لە گەڵ سـەرانی کـوردا لـە هـەردوو کانتۆنەکـە ڕەوانـەی کوردسـتان کـرا. سـەرەتا چـوو بـووە هەولێرو لەگەڵ مەسعود بارزانیو سـەرانی پـارتی دانیشـتبوو، پاشـان ڕۆژی ٧/٨ لە دێی تەکەوری کۆیە لەلایەن کاك ملازم عومەر جێگری سەرۆکی حکومـەتو ئەندامی (م.س) پێشوازی لێکرا. کە گەیشـتە سلێمانیش هـەڤاڵ مـام جـەلال بـە گەرمی چووە پێشوازیو بەخێرهاتنی. بـۆ ڕۆژی دواتـر بـە ئامـادەبوونی هـەڤاڵ مام جەلالو برادەرانی تریش لە سەرچنار میوانداری کرا.

ئا لەو کاتانەدا کـە کـاك فوئـاد عـارف لـە سلێمانی بـوو، لـە سـەعات ١٢ی شەودا لـە زالگـەی دەباشـان چـەند تەقینەوەیـەك ئەنجامـدرا کـەT.N.T بـوو، بـە فتیلە ئاگری تێبەردرا بوو، فڕێ درابوو بـۆ ئـەوەی زیـان بـە خـەڵکی بێگونـاهی کوردستان بگەیەنێت. دیارە ئەوەش دیاری ڕژێمی بەعسیە کە لەلایەك خەڵکانی ناسراوو دیار بـۆ گفتوگـۆ ڕەوانـە ئـەکاتو لەلایـەکی تریشـەوە لـە ڕێگـەی پیـاوە ئەڵقە لە گوێکانیەوە تەقەمەنیمان بۆ ڕەوانە ئەکات.

# تەرمی کۆچە

هاوینی ئەم ساڵە زۆر گەرم بوو.. پلەکانی گەرما زۆر لە پلەکانی گەرمای ساڵانی پێشوو بەرز تر بووە، هەرگیز لە ژیانمدا گەرمایوام تووش نەهاتووە، لە هەندێ شوێنی کوردستان پلەی گەرما گەیشتە سەرووی٥٠ پلە. زەویو دەشتو دەر گڕی لێ هەڵئەسا، هەموو شتێك ڕەنگی پەڕیبوو، تەنیا مرۆڤ بەرگەی ئەگرت.. ئەویش زۆر خەڵکی لەش لاواز یان قەڵەو تووشی نارەحەتی ئەبوونو لە هۆش ئەچوون.

٧/١٥ یەکێك بوو لەو ڕۆژە زۆر گەرمانەی کە لە بیروەریمدا هەمیشە ئەمێنێتەوە، کە خەڵکێکی زۆر بووین چووین بۆ مەرزی پەرویزخان بۆ پێشوازی لە تەرمی کوڕە گەورەکەی کاك عەدنانی حەمەی مینا، کە بەو منالییە تووشی نەخۆشی بوو بوو. نەلە کوردستانو نەلە عێراقدا چارەی نەبوو، ڕەوانەی نەخۆشخانەکانی ئەوروپا کرا. لە نەخۆشخانەی لایدنی هۆڵەندی چارەسەر ئەکرا کەچی کار لە کار ترازابوو. هەرچی لای خۆمان چارەسەر کرابوو کەڵکی نەبوو، کە گەیشتبووە لای ئەوانیش هیچی بۆ نەئەکرا. ئەو بەستە زمانە لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. باوكو دایکی نەیانتوانی لەگەڵ تەرمەکەیدا بێنەوە، بەرزانی برای کاك عەدنان لە ڕێگەی ئێرانەوە هێنایەوە کوردستانو لە گۆڕستانی کەلاری کۆندا نێژرا. ئەو ڕۆژە ئێمە لە کاتژمێری ٨ ی بەیانی تا ٤ ی ئێوارە بە بەر ئەو خۆرە سووتێنەرەوە بووینو بەخاکمان سپارد. ئاپۆڕەیەکی زۆر گەورە هەم لە پێشوازی تەرمەکەیداو هەم لە بە خاکسپاردنیدا ئامادە بووبوون، چەندین کەس لەو سەر گۆڕستانە لە تاو گەرما لە هۆش چوون. کاك عەدنانووتەیەکی پڕ لە سۆزی نووسیبوو م.عەلی لەسەر گۆڕەکەی خوێندیەوە. بەڕاستی زۆر بەم کۆچ کردنەی (کۆچە) کە لە ماڵەوەی خۆیانوایان پێئەووت دلگران بووم، هێشتا زوو بوو منالێکیوا بەو جۆرە نەخۆشیە بڕواتو لەکیسی باوكو دایکی بچێت کە لە ناو هەزاران کەسدا یەك کەس تووش ئەبێت، ئەویش کوڕەکەی کاك عەدنان بێت. کە هیوای زۆری بۆ ئاییندە لە سەر بنیات نابوو .

# دیڤیدویڵش لە سلێمانیدا

ڕۆژی دواتر هەڤاڵ مام جەلال سەر پەرشتی کۆبوونەوەیەکی فەرماندەیی گشتی کرد، بە چڕوپڕی باسی بارودۆخی سیاسی کوردستانو عێراقو مەسەلەی ئاشتی نێوان یەکێتیو پارتیو پەیوەندییەکانی یەکێتی لە گەل دەرو دراوسێکانیداو هەروەها لە گەلوولاتە زلهێزەکانداو باسی دۆخی خراپی ڕژێمی عێراقی کرد. پاشان ئاماژەی کرد بەهاتنی دیڤدویڵش بریکاریوەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە ڕۆژی ٧/١٨ بۆ سلێمانی بۆ ناوبژیوانیو پرۆسەی ئاشتی لە کوردستاندا کە لەو ڕۆژەدا لە نزیك کۆیە لە لایەن برادەرانی مەکتەبی سیاسییەوە پێشوازی گەرمی لێکراو لە دووکانیش لەلایەن سەرۆکی حوکمەتو هاوپەیمانی دیموکراتیەوە پێشوازییان لێکردو لەوێشەوە گەیشتە سلێمانیو لە مۆتێل سەرچنار لایدا. لە دانیشتنەکاندا لەسەر کێشەکانی کوردستانو پەیوەندی نێوان یەکێتیو پارتیو بڕیاری ٩٨٦ قسەی زۆر کراووەکو ئەڵێن تیگەیشتنێکی باش هەبووە لە گفتوگۆکاندا.

ڕۆژی ٧/١٩ دوای کۆنگرەیەکی ڕۆژنامە نووسی،وێڵش گەڕایەوە سنووری دەسەڵاتی پارتی. ناکۆکیەکانی نێوان یەکێتیو پارتی باڵانسی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکای تێکداوە. بۆیە ئەوان ئەیانەوێ سنوورێك بۆئەم ناکۆکیانە دابنێن، چەندین جار هاتوو چۆیان کردووە یان چاویان بە نوێنەری هەدوولا کەوتووەو لەمەترسیەکانی بەردەوامبوونی باری نائاسایی‌ووریایان کردوونەتەوە. کە لە ڕوویەکیشەوە سوودی بۆ ئێمە هەیە لەو خوینبەر بوونەی شەڕی ناوخۆ دوور ئەکەوینەوەو ئەمانخەنە سەر ڕێی گفتوگۆو لە ئەنجامدا ڕێککەوتن.

## وەزارەتی شارەوانی

دوو ڕۆژ دوای ئـــەوە ســـەردانی کافیـــە ســـلێمانیوەزیری شـــارەوانیو گەشتوگوزارم کرد. لە سەر بەخشینی زەوی بۆ پێشمەرگە قسەمان کرد، من زۆر بە توندی لە ڕوویاوەستامو گلەیی ئەوەم لێکرد کە ڕۆژگاری پێشـمەرگایەتی لـە بیر چووەتەوەو قوربانیدانی پێشمەرگەی لە بەرچاو نییـە. ئـەو هەرچـی زەوی باش هەبێ ئەیشاردەوەو لە دواییدا ئەدرایە خـەڵکی ناموستەحەقوتێکۆشـەرانی ڕۆژگاری تەنگانەش لە شوێنی دوورو بێ کەڵکدا پارچـەیەکیان پێئـەدان کـە بـۆ هیچ ناشێ. ئەم جۆرە لێپرسراوانە تەنیا لە ڕۆژانی شەڕو ناخۆشیدا چاویان لـە پێشـمەرگەیە، بیریـان لای ئازایـەتیو خۆبەختکردنیانـە، کـە ئـەو شـەڕو شـۆڕە نەماو بارودۆخ ئاسایی بووەوە،وەکو بڵێی هیـچ ڕووی نـەدابێو ئـەوە پێشـمەرگە نـەبووە ئـەو بـارە نائاسـاییەی لابـە لا کـردووەو دەسـەڵاتی دوژمنـی سـڕییەوەو هەرچـی ئـازارو مەینـەتی هـەبووە بـۆ ئـەوان بـووە. ئەبوایـە لێپرسـراوانی ئـەم دامودەزگایانــە کـە خۆشـیان پێشــمەرگە بـوون، بـە باشـی پاداشــتی خـەڵکی ساتەوەختەکانی   دژوارو ڕۆژ ڕەشییان بدایەتەوە کەچی ئەو گوناهانە بەباشی ئەفەروز ئەکرێن. کێ زۆر خـۆفرۆشو خوێڕییـە دەسـت بـە بالآیانـەوە ئـەگرنو ئیمتیازاتیـان  پێئـەدەنو بـە درۆ هـەزارو یـەك قسـەیان بـۆ ڕێـك ئەخـەن کـە: پەیوەندی هەبووە، پارمەتی داوین، سرك بووە، چەکداری شۆڕشگێڕ بووە..هتد. لە ڕاستیشدا پەیوەندی تایبەتیو دۆستایەتیوخزم خزمینە ڕەچاو ئەکەن. کـە ئەمـەش تـاوانێکی گەورەیـە.! خـەڵکی بـۆ ئەمـە شۆڕشـی نـەکردووە ئـەم جـۆرە خەڵکانە بەرەکەی بخۆنو ئەو جۆرە بەرپرسانە بیچننەوە.

دیارە بە پەلە ئاگاداری هەڤاڵ مام جەلالی کردبووەوە، لەبری ئەوەی لـێم تێبگـاو گرفتـەکان چارەســەر بکـاتو مــافی هــەموو کەسـێك  بـداتو حــەق جێگیربێـت. سـکالای لـە دەسـتم کردبـوو.. کـە بـوو بـووە پیشـە لەگـەڵ هـەر

لێپرسراوێکی لاوازدا قسه بکەیو لـه ڕوویا بوەستی یەکسەر پـەنا ئەباتـه بـەر هەڤاڵ مام جەلال نەك بۆ جێگیرکردنـی ڕاستییەکان بـەڵکو بـۆ سـزادانو پۆرت شکاندن.

ڕۆژی ٧/٢٢ هـەڤاڵ مـام جـەلال برووسـکەیەکی بـۆ کـردمو ئاگـاداری کردمەوە بۆ ماوەی مانگێك لە کار خراوم، ئەمەش دەقی برووسکەکەیە:

## لە / مام جەلالەوە

## بۆ / کاك مەحمودی بەڕێز + گشت فەرماندەییەکان

## سـلاو

( بـە پێچـەوانەی بڕیـارو ئامۆژگارییـەکانمان، لـە خۆتـەوە چـویتەتە سەروەزارەتی بەلەدیـە، کە ئەبوایە بـە هـۆی فەرمانـدەیی گشـتییەوە، بیکـەیت نـەك لـە خۆتـەوە، بۆیـە بڕیـارم دا بـە تەجمیـد کردنـت لـە فەرمانـدەی فەرماندەیی سلێمانی بۆ ماوەی مانگێك، دواتریش ئەبێ بچیت عوزر لـەوەزارەت بخوازیت، ئینجا ئەچیتەوە سەر کارەکـەت. ئـەگینا ئەتگوازینـەوە بـۆ دەزگایـەکی تر، ئەو بڕیارە دەرسێکە بۆ هەموو ئەو فەرماندانەی لە خۆیانەوە ئەچـنە سـەر دەزگاکانی میری خۆمان یان موراجەعەی سەربەخۆ ئەکەن).

هەر چۆنێك بێ سزاکەی هەڤاڵ مام جەلالموەکو یوەرگرتووەلامەکەیم دایەوە، ئەویش لە ڕۆژی ٧/٢٣وەڵامی برووسکەکەمی دایەوە کە بەم شێوەیەبوو:

لە/ مام جەلالەوە

بۆ/ کاك مەحمود سەنگاوی بەڕێز

سـلاوێکی گەرم.

(برووسکەتان ژمـارە/٢١٧/ لـە ٢٣/٢٢ مـانگی/٧. مـن هـەر ئەمـەوێ بـە قانوون کار بکەیتو مافی مـرۆڤ بپارێزیـت، بۆیـە سـزام دایـت کـە زۆر دۆسـتو

نزیکی خۆمیت، هەتا هەموو ئەوانەی لاساری ئەکەن بترسن‌و بزانن کە مەحمود سەنگاوی سزا بدرێت،وای لە حاڵی ئەوان ).

ئێمە مانان لە سزادانی هەڤاڵ مام جەلال بێ تاقەت نابین،، هەڤاڵ مام جەلال دژی کەس نییە، ڕقی لە کەس نابێتەوە، بەڵکو بە ڕێگەی یاسایی ئەیەوێت کارەکان ئەنجام بدرێت‌و هەموو فێری ئوسوڵی مەدەنیانە ببین. بەلام جاری‌وایش هەیە فریای لێکۆڵینەوەو لیژنە دانان ناکەوێ‌و لای خۆیەوە بڕیار ئەدات.

# پەیکەری شێخ ڕەزا

دوای ئەمە هەندێ بوارم بۆ ڕەخسا، بکەومە سەردان‌و بەسەر کردنەوەی دۆست‌و برادەران‌و خزم‌و ناسیاوەکانم لە شوێنە جیاجیاکان. ڕۆژی ٨/١٥ لەگەڵ شێخ محەممەدی شاکەلی بەرپرسی مەڵبەندی ڕێکخستنی کەرکوك چووینە چەمچەماڵ بۆ بەشداریکردن لە پەردە لادان لەسەر پەیکەری شاعیری گەورە شێخ ڕەزای تالەبانی. کە بۆ یەکەم جارە کارێکی‌وای بۆ ئەکەن.

شێخ ڕەزا یەکێکە لە شاعیرە هەرە گەورەکانی کوردو لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا پایەکی گەورەی هەیەو لە بواری شیعری داشۆریندا لە لووتکەدایەو هەر ئەویش توانیویەتی ئەو بۆشاییە لە ئەدەبی کوردیدا پڕبکاتەوە. شیعرەکانی تام‌و چێژێکی زۆریان هەیە،وەستاییەکی زۆری تیا بەدی ئەکرێت، هەر ئەو لەو مەیدانەدا ئەسپی شاکارانەی داهێنانی تاو داوە. نەك هەر لە ڕووی داشۆرینەوە کارامە بووە، بەڵکو لە جۆرەکانی تری شیعردا توانای چاکی هەبووە،وا ئەزانم لەو شیعرانەیدا مەبەستی جنێودان‌و جنێو فرۆشتن‌و ڕێزشکاندنی کەسەکان نەبووە کە پلەی کۆمەلایەتیان هەبووە، بەڵکو مەبەستی سەرەکی ڕەخنە گرتن بووە لە دیاردە خراپ‌و ناشیرینەکانی کۆمەڵگای

کوردەواری. ئەوویستوویەتی لە جێی هەر درکێك گوڵێکی ناسك برِوێنیٚو هەرچی شتی نابووتە نەمێنیو چی دەروونی نەخۆشە چاك ببێتەوە، شیعرەکانی بەووردی دارِشتووە. لە هەر هەمووشیدا راستیووتوەتەوەو راستی پێکاوەو لێی لانەداوە، گەر کەسو کاری خۆیشی گرتبێتەوە. بۆیە شایانی ئەوەیە لەم دەروازەیەدا ئەم پەیکەرەی بۆدرووستبکرێ، کە بەشێکی کەمی بایەخدانە بەو مرۆڤە بلیمەتەی دنیای ئەدەبی کوردی.

بەداخەوە هەندێ خەڵکی ساویلکە، کاتێ باسی شێخ رِەزا ئەکرێت، بە چاوی سووکەوە تەماشای ئەکەنو ئەڵێن ئەو هەر خەریکی قسەی قۆرِ بووە، یان هەندێ خەڵکی تر کە چێژ لە شیعرەکانیوەرئەگرن زۆرتر چێژی سێکسیانەیەو تەنیا لەو رووەوە هەستیان بۆ شیعرەکانی ئەبزوێ کە باسی ئەندامەکانی لەشو کردە سێکسیەکان ئەکات. ئەمەش ستەمێکە لە شێخ رِەزا ئەکرێو لە راستی ناوەرِۆکی بەرهەمە ئەدەبیەکانی ناگەن.

## لە میوانداریبیەکدا

رِۆژی ٨/٢٨ لە گەڵ کاك شەوکەتو کاك عوسمانی حاجی مەحمودو کۆمەڵێك لە رِیشسپی خێڵە جیاجیاکانی گەرمیانو شارەزووردا: لالە سەرحەد، کەریم ئاغای هەمەوەند، حاجی رِەفعەتی تەرخانی، مارف ئاغای گلاڵی، مامۆستا نیزامی زەند، رِەحیم ئاغای باجەلانو کۆمەڵێك پیاوی تر میوانی هەڤاڵ مام جەلال بووین. هەڤاڵ مام جەلال زۆر رِێزی لە هەموویان ئەگرتو قسەی خۆشی بۆ ئەکردن، منیش هەلم بۆ رِەخسا بە درێژی لە سەر خەباتی خۆم قسەبکەمو ئەوستەمەی لەلایەن یەکێتییەوە لێم ئەکرێ بخەمە روو. هەڤاڵ مام جەلال زۆر رِێزی لە قسەکانم گرتو سوێندی خوارد کە لای ئەو خۆشەویستم کە چی لە هەمان کاتدا ئازاریشم ئەدات ئەگەر چی بە مەبەستی شکاندن نەبووە.

# ڕێککەوتننامەی واشنتۆن

٣ڕۆژ دوای ئەوە هەڤاڵ مام جەلال لە ڕێگەی کۆماری ئیسلامییەوە بەرەو ئەمریکا گەشتێکی دەستپێکرد، بۆ ئەوەی لەگەڵ مەسعود بەرزانیدا لە سەر خوانی گفتوگۆ بە ئامادەیی ئەمریکیەکان دابنیشن. بۆ ئەم مەبەستە مەسعود بارزانیش ڕۆژی ٩/٤ گەیشتە تورکیاو لەگەڵ بلند ئەجەویدی جێگری سەرەك‌وەزیرانی تورکیا کۆبووەوە، هەروەها لەگەڵ ئیسماعیل جەم وەزیری دەرەوەشدا دانیشت.

ڕۆژی ١٦/ ٩ لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا پاش ٤ ساڵ لە شەڕو ماڵوێرانی‌و دوور کەوتنەوەودابڕان لە یەکتری، بۆ یەکەم جار هەڤاڵ مام جەلال‌و مەسعود بارزانی دەست لەناو دەستی یەکتر ئەنێن‌و لە نیوانیاندا خاتوو ئۆڵبرایتی‌وەزیری دەرەوی ئەمریکاوەستا بوو، ئاشتبوونەوەیان ڕاگەیاند. ئەو هەنگاوانەی کە لە لایەن لیژنەی ئاشتییەوە نران، ڕێگەی خۆشکرد کە ڕووداوی دوور کەوتنەوەو ناکۆکییەکانی هەردوولا نزیك تر ببێتەوەو بەرژەوەندی گشتی کورد لە بەرچاو بگیرێ‌و چیتر خەڵکی لە ناو کورەی شەڕدا نەسووتێنرێن. بۆیە لە هەوڵێکی دۆستانی کورددا بۆ چارەسەرکردنی گرفتی شەڕی ناوخۆ، حکومەتی ئەمریکا هەردوو لای بانگ کرد بۆواشنتۆن‌و هەردوو سەرکردەی پێکەوە دانان‌و دوای گفتوگۆو مشتومڕی زۆر لە سەر دەستی خاتوو ئۆڵبرایتی‌وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، ڕۆژی ١٩٩٨/٩/١٧ ڕێککەوتنی‌واشنتۆن لە نیوان هەردوو لادا مۆر کرا، کە بناغەیەکی بتەوی بۆ پێکهاتن‌و تیگەیشتنی دۆخەکەو گەیشتن بە ئامانجێکی باش پێکهینا. لەڕاستیدا ئەمە یەکەمین جارە ئەمریکا لەگەڵ نوێنەرانی کورددا بە تەنیا دائەنیشن، لە ناوتەلاری‌وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاو لە لایەن گەورە بەرپرسانی ئەمریکا، تا ئەگاتە سەرۆك‌و جێگری سەرۆکی ئەمریکاو لێپرسراوی ئاسایشی نەتەوەیی، چاودێری دانیشتن‌ووتوویێژەکانی یەکێتی‌و پارتی ئەکەن. کە جارانیش هەموو کورد لە

ئاسته باڵاكانیشدا نەیانئەتوانی بچووكترین كاربەدەستی ئەمریكا ببینن. ئەمە گۆڕانێكی گەورەو بەر چاوە لە بەرەو پێشەوە چوونی دۆزی كورددا لە ئاستی جیهانیدا. ئەمەش لە خۆیدا پشتیوانییەكی گرنگی دەستەبەر كردووە بۆ كورد، كە لە لایەن زلهێزەكانەوە پارێزگاری‌و داكۆكی لێئەكرێت ئەم ڕێككەوتنە لە لایەن خاتوو ئۆڵبرایتەوە لە هۆڵی ڕێككەوتننامەكان، لە بەردەم چەندین كەناڵی ڕاگەیاندندا ئاشكرا كراو لە كاتی تەوقەكردنی هەڤاڵ مام جەلال‌و مەسعود بارزانیدا، هەموو ئامادەبوانی ناو هۆڵەكە كردیانە چەپلە ڕێزان‌و خۆشحاڵی نیشاندان. ناوەڕۆكی ئەم ڕێككەوتنە بریتییە لە سوپاس كردنی خاتوو ئۆڵبرایت‌و حكومەتی ئەمریكا بۆ سازكردن‌و زەمینە خۆشكردنی چاو پێكەوتن لەواشنتۆن، هەروەها سوپاسی توركیاو بەریتانیاش ئەكەن بۆ پەیوەندی بەردەوامیان لە پیناوی ئاشتی‌و ئاشتبوونەوەدا. ئەم ڕێككەوتنە قۆناغێكی گواستنەوەی هەیە لە ڕێگەی لیژنەی باڵای ئاشتییەوە كارەكان جێبەجێ ئەكرێت بۆ ئاشتبوونەوەی تەواو لە نێوان هەردوولادا. ئاسایی كردنەوەی هەولێرو سلێمانی‌و دهۆك بۆ پێكهینانەوەی ئیدارەیەك‌و ئەنجوومەنێكی یەكگرتوو لە سەر بناغەی ئەنجامەكانی هەڵبژاردنی ساڵی١٩٩٢ دەست بە سەرا گرتنەوەی تەواو بە سەر داهاتدا بۆ ئیدارەی هەرێم‌و خۆ ڕێخستنەوە بۆ هەڵبژاردنێكی نوێ لە هەرێمدا. هەروەها لیژنەی ئاشتی هەوڵ ئەدات لە ماوەی٣ مانگدا حكومەتێكی كاتی هاوبەش پێكبێنێت كە پەرلەمان دەنگی لەسەر ئەدات. ئەو پەرلەمانەیش دەست بە كارەكانی ئەكاتەوە لەو ٣ مانگەدا لە هەلێرو دواتریش لە سلێمانی‌و لە هەمان ئەندامەكانی پێشوو كە لە ساڵی ١٩٩٢ دا هەڵبژێردراون پێكدێت. ئەم پەرلەمانە ئەركی تری ئەكەوێتە ئەستۆ، لەوانەش یەكخستنی پەیوەندییەكان لەگەڵ كۆمەڵگای نیودەوڵەتیدا.

هەروەها بە پێی ئەم ڕێككەوتنەو تا دامەزراندنی حكومەتی كاتی لەلایەن پارتییەوە پارەی پێویست بە شێوەی ڕێكوپێك‌و بەردەوام ئەدرێتە ئەووەزارەتانەی سنوری یەكێتی كە خزمەتگوزاری پێشكەش ئەكەن. هەروەها

پەرلـەمان‌و لیژنــەی ئاشـتی بـارودۆخی سـلێمانی‌و هــەولێرو دهـۆك ئاسـایی ئەكەنـەوە. بـۆ مەسـەلەی هەڵبـژاردنیش لیژنـەی ئاشتی خـەریكی ڕێكخسـتنی هەڵبـژاردنێكی ئـازادو دادپـەروەر ئـەبن لـە مـاوەی ٦مانگـدا. هـەروەها ئـەم ڕێككەوتننامە باسی ئەوەی كردووە كەوا هەردوو سەركردە بە لای كەمەوە هەر دوو مانگ جارێك لە دەرەوەو ناوەوەی كوردستان دابنیشن، یان لـەو شـوێنانەی كـە هـەردوولا لـە سـەریرێك ئەكـەون. جگـە لەمـە خشـتەیەكی تێدایـە بـەو چاوپێكەوتنانەی ئـەنجام ئـەدرێ. ڕێككەوتنەكـە لـە لایـەن هـەڤاڵ مـام جـەلال‌و مەسعود بـارزانی‌و دێڤیـدوێڵش‌وەكو شایەتێك مـۆر كـراوە. دوای ئـەوە هـەردوو سەركردە كەوتنە چاوپێكەوتن‌و قسەكردن بـۆ دەزگاكـانی ڕاگەیانـدنی جیهـانی‌و ڕوونكردنـەوەی هـەنگاوەكانی ڕێككەوتنەكـە، ئـەوە بـوو شـەوی ٩/٢٤ هـەڤاڵ مـام جەلال‌و مەسعود بارزانی لـە تەلـەڤزیۆنی M.B.C دیـداریان لەگەڵدا كـراو باسـی ڕێككەوتنی‌واشـنتۆنیان كـردو زۆر بـە بایەخـەوە لـە سـەری دوان، لـە زۆربـەی شوێنەكانی دنیاوە موداخەلـە كـراو لـە سلێمانییەوە مستەفا ساڵەح كـەریم، لـە سعودیەوە عادل یەزیدی، لـە ئـەمریكاوە د.نەجمـەدین كـەریم، هـەروەها محسن جوامیرێش بەشدارییان كردو ڕای خۆیان بەرامبەر بە ڕێككەوتنەكە دەربڕی.

لـە ڕاسـتیدا ڕێككەوتنی‌واشـنتۆن لـە ڕووی گرنگییـەوە لـە ڕێككـەوتنی پاریس كـەمتر نییـەو لـە هەموویشـی گـرنگتر ئەوەیـە كـە هـەردوولا پابەنـدی ئەبن‌و لە سەری ئەڕۆن‌و لەو ڕۆژەشەوە كە مۆركراوە سامۆتكەی شەڕ دوور تـر كەوتووەتـەوە گرنگـی ئاشـتی جـوانتر دەرئەكـەوێت. ئەگـەر هـەردوولا بیانـەوێ قـەت ناشـێ جـارێكی تـر شـەڕ بـەم گـوزەرەدا تێپـەڕێ. هـەر پـێش ئـەوەی ئـەم ڕێككەوتنە مۆر بكرێ، لە ڕۆژی ٩/١ دا بۆ نیاز پاكی‌و دڵنیـا بـوون ئەم پرۆسـەی ئاشـتییە لـە لایـەن پارتییـەوە ١٦٠ دیلـی یـەكێتی ئـازاد كـران، كـە بەشـێكیان پێشـمەرگەبوون‌و لـە شـەڕەكاندا بـە دیلگـیرا بـوون‌و هەندێكیشـیان ئەنـدامی ڕێكخسـتن بـوون. لـە ئـەنجامی ئەمەشـەوە لیژنـەی بـاڵای ئاشـتی بـۆ ئاسـانكاری فرمانەكانی خۆی هەنێ لیژنەی فەرعییان درووست كردوەكو:

- لیژنەی دیلو گیراوەکان

- لیژنەی ئاوارەکان

- لیژنەی ئەمنی

- لیژنەی بڕیاری ٩٨٦.. هتد.

بەم بۆنەیەوە ڕۆژی ٩/٢٩ لە شاری سلێمانی ٢٢ حیزبو لایەنی سیاسی ڕاگەیاندنێکیان بڵاوکردەوەو پشتگیری خۆیان بۆ ڕێککەوتننامەیواشنتۆن دەربڕی، ئەمەش ئەوە دەرئەخات کە ڕێککەوتنی هەردوو حیزبو نەمانی شەڕ بۆ ژیانی گەلەکەمان گرنگە.

## مەسەلەی ئۆجەلان

لە کاتێکدا ڕووداوەکانی شەڕ تۆماری خۆی لە کوردستانی باشوردا ئەپێچایەوەو هەردوو لای شەڕکەر دوای شەڕێکی درێژ خایەن، لەسەر ئاشتی پێکدینەوەو برینەکان قەتماغە ئەبەستنو ئەو هەموو ڕووباری خوێن ڕشتنە لە بیر ئەچنەوە، لە ئاستی کوردستانی باکوور ڕووداوێك سەر هەڵئەدات کە ڕەچاو نەئەکرا، دەرکردن یان ئیزندانی عەبدوڵڵا ئۆجەلان سەرۆکی پەکەکە لە لایەن سوریاوە لە ئەنجامی فشاری تورکیا لە ڕۆژی ١٩ /١٠ دا.

تورکیاو سوریا کە هاوسنووری یەکن، لە پەیوەندییەکانیاندا ناکۆکن، هەریەکەیان کارتێکی گوشاریان لە بندەست دایە بەرانبەر یەکتری. بەڵام کارتی تورکیا بەهێزترە لەوەی سوریا، کارتی سوریا کە پەکەکەیە ئەوەندە کاریگەری نییەو کاتییە، جگە لەمە تورکیا لەگەڵ ئیسرائیلدا هاوپەیمانەو پەیوەندی ستراتیژیان هەیە کە سوریا ئەترسێنن، لەلایەك تورکیا گوشاری ئەخاتە سەرو لەلایەکیش ئیسرائیل، هەردووکیشیان بەشێکی خاکی سوریایان لە بندەستدایە.

تورکیا هەمیشە لە کوردو شۆڕشی کوردستانوەڕسە لە هەر بەشێکدا بێت. بەتایبەتی لە بەشەکەی خویدا بۆیە بە هەموو توانایەوە بەرنامەی

عەسکەر تاری توندوتۆڵی گرتووەتە بەر بۆ کۆنترۆڵکردنی خەڵکی کوردستانو پاکسازی شۆڕشەکەی کە هیچی پێنەکراوە. لە ئەنجامدا تووشی گێژاوی سیاسیو ئابووری زۆور بووە، لەلایەکیش کورد لە خەباتدا بەردەوامە، تورکیش بەوپەڕی درندەییەوە بەر بووەتە ئەو گەلە ستەمدیدەیەو لێی ئەگرێو ئەکوژێو ڕایان ئەگوێزێو دێهاتیان کاول ئەکات، لە لایەکی تریشەوە بارگرانیەکی زۆر کەوتووەتە سەرشانی حکومەتی تورکی لە ڕووی ئابوورییەوە. کە ئەو شەڕو باری نائاساییە خەرجی زۆری تێئەچێت، تورکیایش وولاتێکی هەژارەو ئابورییەکەی زۆرتر لە سەر گەشتوگوزار ڕاوەستاوە.

کاتێ کەپەکەکە زۆرتر هەڕەشەی لێئەکردو ئۆجەلان لە بنکەکەیەوە لە سوریا سەرکردایەتی هەموو جموجۆڵێکی پەکەکەی ئەکرد.. تورکیا گەیشتبووە تینی. لە کردەیەکی هەڕەشە ئامێزدا کردیە سەر سوریا کە چیتر قایل نابێ ئۆجەلان لەوووڵاتەوە ئاسایشی تێکبدات، کە دۆخەکە لە تەقینەوەدا بوو، ناچار سوریا کارتەکەی خۆی دڕیو ئەووەیەی لە کۆڵێ خۆی کردەوەو ئۆجەلان ناچار کرا پەناگا دێرینەکەی لە سوریا بە جێ بێڵێ. بەڵام ئەم سەرکردە زەبەلاحە کە چەندینساڵی دوورو درێژ لەوولاتێکی بیگانەدا پەنای خۆی دابوو، بە پۆلیسی ئاسایشی ئەوووڵاتە کۆنترۆڵ کرابوو، ئامادە نەبوو ڕۆژێك لە سەنگەری پێشمەرگایەتیوولاتەکەی خۆیدا بێت، یان لەو بەشانەی کە شۆڕشی تێدا ئەکرێ بە تایبەتی لە کوردستانی باشور. بەڵکو لە دەرچوونەکەیشیدا هەر ڕووی نەکردەوە کوردستانی ئازاد، گەرچی لەلایەن سەرکردایەتی یەکێتییەوە داوای لێکرابوو شوێنیشی بۆ دابینکرابوو.

تورکیا بڵاوی کردەوە کە ئۆجەلان چووەتە ڕووسیا، ڕووسیاش ئەیووت ئۆجەلان لەوێ نییەو پەنا بەریشی ناداتێ، گەرچی پەرلەمانی ڕووس بانگهێشتی کردبوو کە بچێتە ئەوووڵاتە. دواتر ڕۆژی ١١/١٢ ئۆجەلان لە

فرۆکەخانەی رۆمای پایتەختی ئیتالیا دەستگیر کرا کە لە رووسیاوە بە بەڵگەنامەیەکی ساختەوە گەیشتبووە ئەوێ. تورکیا یەکسەر داوای کرد ئۆجەلان تەسلیم بکرێتەوە. ئۆجەلان نامەیەکی بۆ پاپا یۆحەننا پۆڵسی دووەم نارد داوای لێئەکات بچێتە هانایەوەو کێشەی کورد چارەسەر بکات.

دادگای رۆما داواکەی تورکیای لە مەڕ تەسلیم کردنی ئۆجەلان رەتکردەوە، بەڵام لە بەرامبەر ئەگەری تەسلیم کردنەوەیدا چەند مەرجێکی خستە بەردەمی تورکیا:

- ئازاد کردنی پەرلەمانتارە کوردەکان
- وازهێنان لە یاساکانی بەرگری لە تیرۆر
- لێبوردنی گشتی بۆ چەکدارانی پەکەکە
- رێگەدان بە کارکردنی ئازادانەی حیزبە کوردییەکان
- پابەند بوون بە بەڵگەنامەکانی مافی مرۆڤ

وەنەبێ ئۆجەلان لەو ماوەیەی لە ئیتالیادا بووەوەزعی باش بووبێ، بەڵکو هەستی بە بێزاری ئەکرد، ئەیزانی هیچ دەوڵەتو لایەك نایگرێتە خۆ، چونکە خۆیو حیزبەکەی بە تیرۆریست ناویان رۆیشتووە.لە بارێکی نائومێدیدا قسەیەکی دا بە گوێی ئەمریکادا کە فیدراڵیەت بدرێ بە کوردستانی تورکیاوەکو کوردەکانی عێراق. کە چی ئەمریکا گوێی لێرانەگرت.

گرتنی ئۆجەلان کوردی لە هەموو دنیادا هەژان، کوردەکانی ئەوروپا بە ژمارەیەکی زۆر بەرەو ئیتالیا رۆیشتن بۆ مانگرتن لە خواردن تا کو پەنابەری سیاسی بە عەبدوڵڵا ئۆجەلان بدرێ. ژمارەی ئەو کوردانە خۆی ئەدا لە ١٠ هەزار کەس، یەکێك لەو مانگرتووانە ئاگری لە خۆی بەردا، بەڵام هاورێکانی کوژاندیانەوە، لەو کاتانەدا مەسعود یەڵماز هێرشی کردە سەر ئیتالیا گوایە هاوکاری تیرۆریستە.

# گەڕانەوەی هەڤاڵ مام جەلال

لەو سەرو بەندەدا کە هێشتا لە دنیادا هەرا لە سەر گرتنەکەی ئۆجەلان بەردوام بوو، ڕۆژی ١١/٣٠ هەڤاڵ مام جەلال لە گەشتێکی مێژوویی سەرکەوتوودا بۆ ئەوروپاو ئەمریکا بۆ مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی ئاشتی لەواشنتۆن چوو بوو، لە مەرزی پەروێز خانەوە گەڕایەوە کوردستان. لە ڕێو ڕەسمێکی شایستەدا کە هەموو خەڵکی لە هەموو ناوچەکانی: قەڵادزە، ڕانیە، کۆیە، دووکان، چەمچەماڵ، سلێمانی، پێنجوێن، هەڵەبجە، چوارتا، شارەزوور، دەربەندیخان، کفری، کەلارو ناوچەکانی ترەوە بە بە شداری کردنی سەرکردەو ئەندامانی هەموو حیزبەکانی کوردستان پێشوازی گەرمی لێکرا کە بە پێنج کاتژمێر لە دەربەندیخانەوە گەیشتە دەروازەی شاری سلێمانی، لە ناو شاریش دا بە دەیان هەزار کەس لە بەر ڕێڕەوی ڕۆیشتنەکەیدا قەرەباڵغییان کردبوو.وەك چۆن هەر لە سەر سنوورەوە تا دەروازەی شار ئاپۆرایەکی زۆر لە سەر ڕێگادا ڕاوەستا بوون بۆ پێشوازی کردن‌و بە خێر هاتنەوەی. چونکە لە پرۆسەیەکی مێژووییدا بۆ ئاشتی کۆتایی بە دەردی سەری شەڕ هێنا. چەندە ڕێککەوتنەکە گەورەو مێژوویی بوو ئەوەندەش پێشوازی لێکردنەکەی گەورەو مێژوویی بوو بۆ هیچ سەرکردەیەکی تر شتیوا نەکرا بوو.

دوای چەند ڕۆژێك پشوودان لە فەرماندەیی گشتی هەڤاڵ مام جەلال کۆبوونەوەیەکی لەگەلا کردین بە دوورو درێژی باسی گەشتەکەی بۆ ئەمریکاو مۆرکردنی ڕێککەوتنی‌واشنتۆن‌و سەردانەکانی بۆ ئەوروپاو ئەنقەرەو تاران کرد، تیشکی خستە سەر گفتوگۆکانی لەگەڵ گەورە بەرپرسانی حیزبی‌و حکومی ئەووڵاتانەو تەئکیدی ئەوەی کردەوە کە ئەمریکاو ئەوروپایش پشتیوانی لە کوردو شێوازی حوکمی فیدراڵی بۆ ئایندەی کوردستان ئەکەن گەر چی ئەمە دەرو دراوسێکانمان ئەترسێنێ.

## ڕووناککردنەوەی سیۆسێنان

ڕۆژی ١٢/١٧ بوو لەگەڵ برادەران حاکم قادرو شێخ جەعفەرو کۆمەڵێك خەڵکدا سەردانی دێی سیۆسێنانمان کرد بۆ بەشداریکردن لە کردنەوەی کارەباو ڕووناککردنەوەی ئەم دێیەدا کە پێش ئەنفالیش کارەبای هەبووەو گەورە دێیەکی ناوچەی قەرەداخەو خەڵکی زۆری تیا نیشتەجێ بووەو دووکانو بنکەی پۆلیسو بنکەی تەندروستیو قوتابخانەو مزگەوتی تیا بووە، دێیەکی کشتوکاڵی ئاوەدارەو بۆ شۆڕشیش بنکەیەکی قایم بووە. بۆیە لە ئێوارەی ڕۆژێکی مانگی ٣/ ١٩٨٨ دا کاتێك دانیشتووانەکەی دەستیان لە ناو نانەدا بوو، ڕژێمی کیمیایی ڕوکێت بارانی کردن، ژەهری مەرگی ناوادەی بۆ ناردن، لە چەند چرکەیەکدا ٨٦ مرۆڤی بێتاوان بە بێدەنگی گیانیان سپارد، کە دوای ڕاپەڕین گۆڕستانێکیان لە پەڕی ئاواییەوەوەکو یادەوەری ئەو ڕۆژە تاڵە بۆ درووستکراوە.

ووردەووردە لە کۆتایی ساڵێکی تری تەمەنمان نزیکتر بووینەوە کە بە درێژایی لە چاو ساڵانی تردا بێ کێشە بوو، شەڕو تەقوتۆق دەنگی نەبوو، پێشمەرگەش کەوتبوونەوە بنکەو بارەگاکانیان جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێ لە بەرەکانی هێڵی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئارامدا بوون. خەڵکی لە ژیانی ئاسوودەو ئاساییدا بوون کە بە سایی کۆششی دۆستەکانمانەوە هاتبووە کایەوە کە بنەڕەتێکی بتەوی بۆ گەیشتنە ئاقاری پێکهاتنو پێکەوە سازان بنیاتنا.

## ساڵی ١٩٩٩

سەرەتای ساڵی ١٩٩٩ بە هێمنی دەستی پێکرد. لە تارای ئاشتیدا ئومێدێکی نوێ بە جوانی خۆی ئەنواند، کاتێ ڕۆژی ١/٨ بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لە هەوڵێکی بوێرانەدا هەڤاڵ مام جەلال گەیشتە هاوینە هەواری سەلاحەدین. ئەم دەستپێشخەرییە ئازایانە پەرۆشی یەکێتی بۆ ئاشتی

دەرئەخات، ئەیەوێ ئەو دیواری بێدەنگییە بڕوخێ، هەنگاوەکان بەرەو تخووبی ئاشتی بنرێ، گەر چی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیو فەرماندەیی بەم چوونە قایل نەبوون، مام لەو چوونو چاوپێکەوتنو دانیشتنە لەگەڵ مەسعود بارزانیو پارتیدا لە سەر هەنێ شت ڕێککەوتن لەوانە مەسەلەی دارایی.

ئێوارەی ڕۆژی ١/٩ کۆنگرەی ڕۆژنامە نووسییان بەستو بۆ کەناڵەکانی ڕاگەیاندن قسەیان کرد. دواتر مام لە گەشتەکەی بە سەرکەوتوویی گەڕایەوەو لە دەروازەی دێگەڵە لە لایەن هەڤالانەوە پێشوازی لێکرا. ئەم چوونە بایەخی سیاسی تایبەتی هەبوو، دڵنیاییەکی بە خەڵکی بەخشی، کە یەکێتی بە هەموو توانایەوە ڕێگەی گفتوگۆی ئاشتیانە ئەگرێتە بەر.

## ئۆجەلان گەیشتە نایرۆبی

هێشتا کۆڕو کۆبوونەوەو نارەزایی دەربڕین لە سەر ئۆجەلان بەردەوامە، بەلام هیچ کاردانەوەیەکی لە سەر مەسەلەکەی نییەو هەڵوێستی حکومەتەکان ناگۆڕێ. ڕۆژی ١/٢٦ دەسەلاتدارانی ئیتالیا ڕایانگەیاند ئۆجەلان ئیتالیای بەجێهێشتووە. زوبێر ئایداری جێگری پەرلەمانی مەنفا کە یەکەکە سەرپەرشتی ئەکا ئەڵێ: ئۆجەلان گەیشتووەتە ئەو شوێنەی مەبەستی بووە بێ هیچ کێشەیەك، بەلام ناوی جێگەکەی ڕانەگەیاندبوو. بەلام لە هەوڵێکدا بۆ لادان لە هۆڵەندا حکومەتی هۆڵەندا ڕێگەی پێ نەدا بچێتە خاکەکەیەوە نا چار چووە ئەسینا لەوێشەوە فڕۆکەیەکیان خستە ژێر دەستی تاکو بچێتە کینیا. لە ڕۆژی ٢/٢ گەیشتە نایرۆبیو چووە باڵوێزخانەی یۆنانەوە. لە ڕۆژی سێیەمدا ئۆجەلان داوای پەنابەری سیاسی لە یۆنان کرد، بەلام لە یۆنانەوە چەند ئەفسەرێك هاتنو داوایان لێکرد کە باڵەخانەی باڵوێزخانەکە بە جێ بهێڵێ، دیارە هەر لە ڕەوانە کردنیەوە بۆ نایرۆبی داوی پیلانێك چنرا بوو، هێشتا لە باڵوێزخانەکە دەرنەچووبوو داوایان لە پیاوانی ئاسایشی کینیا کرد بچنە

باڵەخانەکەوە بۆ دەرکردنی، هەروەکو ئەڵێن ئۆجەلان بڕیاری دابوو بچێتە هۆڵەندا.

## مردنی شاحسێن

لەم ماوەیەشدا شاحسێنی ئەردەن کۆچی دوایی کرد، پێش مردنەکەی هەندێ ئیجراناتی شایانەی کرد، شازادە حەسەنی برای دوور خستەوەو عەبدوڵڵای کوڕی بە پاشای ئەردەن دانا. شاحسێن پیاوێکی‌وورياو کارامە بوو لە ئاستی جیهانی‌و عەرەبی دا ئەیزانی چی ئەکات، پەیوەندی لەگەڵ ڕۆژئاوادا پتەو بوو، دۆستایەتی لەگەڵ ئیسرائیلدا درووستکرد. سەرەتا ڕێگەی بە فەلەستینییەکان دا لە سەر خاکەکەی بن، دواتر بە توندی لە ئەیلولی ڕەشدا لێدان، ڕێگای بە ئیخوانەکان نەئەدا بێنە ناو دەسەڵاتەوە. بە هۆی باری لاوازی ئابوورییەوە پشتیوانی لە سەدام ئەکردو هەمیشە دەستی بە پشتیدا ئەهێناو لەگەڵ خۆیدا ئەوتو پارەی ئەبردەوە. هەرچەندە لە نزیکەوە ئاگای لە مەسەلەی کورد بوو، نەیتوانی بە ئاسانی کار لە سەدام‌و سیاسەتی بەعس بکات بۆ باشتر چارەسەرکردنی بەڵام ئەو دیارە دڵی بە کورد نەئەسووتا یان نەینەویست بە دڵی کورد بکاتو ئاڵوگۆڕ لە هەڵوێستی عێراقییەکان بکات لە بەرژەوەندی کورددا بێت.

## کارگێڕی فەرماندەیی

بۆ چالاک کردنی کاروباری فەرماندەیی گشتی‌و زۆرتر بایەخدان بە ئەرکەکانی‌و فراوانکردنی دەسەڵاتەکانی‌و ڕاگەیشتن بە هەڵسووڕاندنی، دوای لێکۆڵینەوەی‌وورد لە پێویستی دانانی، هەڤاڵ مام جەلال ڕۆژی ٢/٩ بڕیارێکی کارگێڕی دەرکرد بۆ دانانی کارگێڕی فەرماندەیی (هـ.پ.ك):

( بڕیارمان دا بە دانانی کارگێڕی فەرماندەیی (هـ.پ.ك) لەم هەڤاڵانەی خوارەوە:

هەڤاڵ فەرماندەی گشتی

هەڤاڵ جێگری فەرماندەی گشتی

هەڤاڵ لێپرسراوی مەڵبەندی پێشمەرگایەتی

هەڤاڵ عوسمانی حاجی مەحمود ئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی

هەڤاڵ سەرۆکی هەیئەتی ئەرکانی (هـ.پ.ك)

هەڤاڵ لیوا خەلیل دۆسکی

ئاگاداری: لە کاتی پێویستیشدا ئەگەر هەڤاڵ لێپرسراوی زانیاری (هـ.پ.ك)و هەڤاڵ لێپرسراوی پلانو نەخشە لە (هـ.پ.ك) داوەك ئەندام بەشداری کۆبوونەوەکان بکەن.

بۆ پێشەوە ڕووەو سەرکەوتن.

سکرتێری گشتی (ی.ن.ك)

فەرماندەی گشتی (هـ.پ.ك)

مام جەلال

١٩٩٩/٢/٩

## دەستگیرکردنی ئۆجەلان

ڕۆژی ٢/١٥ لە هەنگاوێکدا ئۆجەلان باڵوێزخانەی یۆنانی لە نایرۆبی بەجێ هێشت، لەو کاتەدا دەسەڵاتدارانی کینیاو پیاوانی ئاسایش دەستگیری ئەکەن‌و دواتر بە پێی پیلانێك تەسلیمی دەستی جەندرمەکانی میتی تورکیا ئەکرێ‌و بەرەبەیانی ڕۆژی ٢/١٦ بە فڕۆکەیەکی تایبەتی ڕەوانەی تورکیا ئەکرێ. لە ناو فڕۆکەکەدا یەکێك لە پیاوەکانی میت پێی ئەڵێ: بە خێر بێی بۆ نیشتمانەکەت. ئۆجەلان بە گرژییەوە پێی ئەڵێ: سوپاس، من تورکیام بە ڕاستی خۆشئەوێ‌و گەلی تورکیشم خۆش ئەوێ.

لەوە ئەچێ ئەمە قسەی زەلیلی بێ، کاتێ مرۆڤ ئەکەوێتە ژێر چەقۆی دوژمنەوە لەوانەیە هەندێ قسەی بە زاردا بێ هی پێشووتری نەبێ.

شایانی‌ووتنە نایرۆبی مۆڵگەیەکی گەورەی هەواڵگری هێزی ئەمریکاو ئیسرائیلە، زەحمەتە هیچ پیلانێك بە ئاسانی بەم ناوەدا تێپەڕێ‌و ئاگایان لێ نەبێ ج جای مەسەلەیەکی داو بۆ چنراوی‌وەکو ئەمەی ئۆجەلان کە هیچ ماندوو بوونێکی بۆ ئەوان تێدا نییە.

خەڵکی لە ئەوروپادا پرۆتستۆیان ئەنجامداو بە زۆری پەنجەی تاوانبارکردنیان بەرەو ڕووی یۆنان ڕائەکێشا کە لە هەڵێکی نادیاردا لە سەفارەتی یۆنان دەرچووەو بە پیلانێکی کینی ـ تورکی ـ ئیسرائیلی ـ ئەمریکی دەسگیر کرا، لەم کردەیەشدا هیچ کەس نە کوژراو پلانەکە بە هێمنی ئەنجامدرا.

کە ئەم هەواڵەم بیست زۆر بێتاقەت بووم، خەمێکی بێئەندازە دایگرتم، دڵم پڕ بوو تا سنووری گریان.. نەك بۆ ئۆجەلان بەڵکو بۆ چارەڕەشی کورد بۆوا بێدەرەتان بێ، لە تەنگانەدا کەسێك نەبێ دالدەی مرۆڤێکی بدات..؟ تۆ بڵێی ئەمە لە بەر بێچارەیی‌و بەد بەختی کوردو ئۆجەلان بێت یان زەمەن ئاڵۆزکاوەو نەفرەتی لە چارەی کورد کردووە..؟

ئـەو زەبەلاحـەی دوێنـێ تـورکی ئەتۆقانـد، خـەوی لـە چـاوی خـەڵك‌و دامودەزگاکانی ئەتاراند، ئیستا بە دەستی چەند میتێکەوە دیل‌و زەلیلە.! کـە لـە سـەر شاشـەی تەلەفزیۆنـەکان دیمـەنی گرتنەکـەی‌و کەلەپچـە کـردن‌و شەتەکدانەکەی ئەبینم زۆر شتم لا ئاوەژوو ئەبێتـەوە، هەسـت بـە لاوازی مـرۆڤ ئەکەم بە تایبەتی ئەوانەی سەرکردایەتی جووڵانەوەیـەك یـان حیزبێك ئەکـەن کە لەوانەیە بە تەنیا بە ناو قەبەو بێ نـاوەڕۆك بـن، هەلومـەرجێك درووسـتی کردبن بابەتی نەبێ، لە دوایشدا ببنە کارەسات‌و داهەڕۆژان نەك هەر بۆ خۆیـان بەڵکو بۆ میللەتەکەشیان.

بۆ ئەبێ ئۆجەلان ئەوەندە لاواز بێ..؟ بۆ ڕێگەی چارەنووسی خـۆی بـەم دەردە برد..؟ ئەبێ ئایندەی حیزب‌و هێزە گەورەکەی بەرەو کوێ بڕوات..؟ ئایا کاردانـەوەی سـەلبی ئـەبێ بـۆ ئاشـبەتاڵ یـان لاواز بـوون یـان لـە بەریـەك هەڵوەشانەوەی پەکەکەو تێکچوونی ڕیزەکانی..؟!

ئەوەی دوێنێ بە قارەمانم ئەزانی ئیستا بـە چـاوی بەسـتراو بـە دەسـتی کەلەپچاوی ئەیبینم، نەك‌وەك پیاوێکی قارەمان لە بەر دەسـتی دوژمنـدا بـەڵکو سەرەڕای ئەوەی ئاسەواری لێدانی پێوە دیـار نییـەو لـەو کەلەپچە کردن‌و چـاو بەستنەدا هەست بە ئازار ئەکات‌و لێوی ئەکرۆژێ. تۆ بڵێـی قـەت ڕۆژێ هەسـتی بە ئازاری گیان لە دەستدانی سـەدەها پێشـمەرگەی کـورد کردبـێ کـە بـە قسـەی ئەو خۆیـان بـە شـەهید کـردن داوە..؟! زۆر سـەیرم پێـدێ کەسێك بتوانـێ بـەم لاوازییە دۆخێکی شۆڕشگێڕانە بەڕێوە ببات‌و هەزاران کەس دوای بکەوێ..؟

لـە دالغـە لێدانـەکانما پرسـیارێك خـۆی قـووت ئەکاتـەوە: ئایـا تاکـی کوردوەکـو سـەرکردە شـۆڕش هەڵئەگیرسـێنێ یـان پرسـی کـوردە ئـەو تاکـە هەڵئـەتۆقینێ..؟ گـەر ئۆجـەلان نموونـە بـێ زوو زوو هەنـدێ بـۆ چـوون لـە لام هەرەس دێنێ ئەبێ سەر لە نوێ شتی تر بنیات بنێمەوە بۆ لە سـەر ڕۆیشتن‌و پەیرەویکردنی.

ئۆجەلان بوو بووە ئەفسانە، زۆر شتی ئەدرایە پاڵ کە لەوانەیە لە ڕاستیداوانەبێ.. کەچی لەوانەیە هەنێ ئەفسانەی کوردی لە مەڕ سەرکردەکانی لە ڕاستییەوە نزیکبن‌و بگرە بەشێکی گەورەی ڕاستیبن.

کە ئۆجەلان گیرا هەموو کورد پێی ناخۆشبوو کە کەسێکی‌وەکو ئەو دەست دوژمنێکی کورد کوژی‌وەکو تورك ئەکەوێ. بە لای منەوە گرنگ کوشتنەکەی نییە بەڵکو تورك بەو گرتنەوە فشە ئەکەن‌و پێیان‌وایە ناشبەتاڵ بە شۆڕشی کورد ئەکەن. لە دوای گرتنی ئۆجەلان دیمیرێل ئەڵێ: ئەوە گەورە ترین ڕووداوە لەووڵاتەکەیدا لە ڕۆژی دامەزراندنیەوە پێش ٧٥ ساڵ بەر لە ئێستا. پەکەکەش لای خۆیانەوەوەکو کاردانەوەیەك لە سەریان بۆداپۆشینی ئازاری دەردە دڵ‌و کارتێکردنی لە سەریان کەوتنە هێرشی هەڕەشەکردن‌و بەیاننامە دەرکردن‌و تۆقاندنی لێپرسراوانی تورکیا گوایە هیچیان لە ماڵەکانیاندا ئاسوودە نابن، دژی ئەمریکاو ئیسرائیل‌و ئەڵمانیاو ڕووسیاو ئیتالیاو یۆنان قسەیان ئەکرد.

لە نایرۆبی پێتەختی کینیاش سەر جادەکانی هەواڵی‌وایان ڕائەگەیاند کە ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکاو مۆسادی ئیسرائیلی دەستی بالایان لە گرتنەکەدا هەبووە.

دیارە ئۆجەلان لەم گرتنەیدا زۆر تۆمەتی ئەکەوێتەپاڵ:

- کوشتنی دەیان هەزار کەس لە ماوەی ١٤ ساڵی شۆڕش کردندا.

— هەڕەشەی دابەشکردنی‌ووڵاتی تورکیاو دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ کە بە پێی دەستوری تورکیا بە خەیانەتی گەورە ئەژمێرێ‌و بە پێی یاسای سزادانی تورکی سزاکەی لە قەنارەدانە.

# پشتیوانیکردن لە ئۆجەلان

لـە سلێمانیدا ڕۆژی ٢/١٨ ڕێپێوانێـك بـۆ ئۆجـەلان كـرا سـەدان كـەس هاتنـە سـەر جـادە، خـەمباری لـە دەمو چـاویان ئـەبـاری داوای ڕزگـاركردنی ئۆجـەلانیان ئـەكرد بـەلام لـە دەسـتی كـێ..؟ هـەر لـە ژمـارەی ئـەم ڕۆژەی ڕۆژنامەی}كوردستانی نوێ{ دا لـەوەلامی پرسیارێكی ڕۆژنامـەی }ئەلحـەیات{ قسەكانی هەڤاڵ مام جەلال بلاو كرایەوە كە لـە بـارەی دوایـین گۆڕانكارییـەكانی بارودۆخی ئۆجەلان‌و گیرانەوەی بۆ كوردستان ئەڵێ:

( لەو باوەڕەدام ئەو ڕەوشەی كە ئیستا ( سـەركردەی كوردی‌و سـەرۆكی پارتی كرێكاران) ی تێدایە ( پاش گیرانەوەی لە لایـەن توركیـا )وە پێویستی بـە مانە هەیە:

یەكـەم: پێویسـتە دادگـایی كردنێكـی ئاشـكرای عادیلانـە بكـرێ بـە ڕەچاوكردنی هەردوو مادەی ١٠و ١١ ی دەقی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ.

دووەم: لـە ڕووی سیاسییەوە ئەمەوێ ئەوە بلێم كە كاتی ئـەوە هاتووە دان بە ڕاستی هەبوونی گەلی كورد لە توركیادا بنرێت كـە سـەرۆكی خوالێخۆش بـوو تۆرگـۆت ئـۆزال بـە ١٢ ملیـۆنی قەبلاّنـدووە، هـەروەها دان بنـرێـت بـە مافـە نەتەوەیی‌و دیموكراتیەكانیان لە چوارچێوەی دەوڵەتی توركیادا.

سێیەم: تكاموایە هیـچ كـەس خـۆی بـەوەهمی لـە نـاوبردنی جوڵانـەوەی كـورد هـەڵ نەخەڵـەتێنێ یـان تەنانـەت پـارتی كرێكـارانی كوردسـتانیش تـەنها لەبەرئەوەی سەرۆكەكەی لە ناو ببرێ.

بـە پـوختی مـن داوای دادگـایی كردنێكـی ئاشـكراو سـەربەخۆو پـاك بـۆ بـەڕێز عەبـدوڵلا ئۆجـەلان ئەكـەم‌و داوای ڤۆسـتنەوەی ئـەو دەرفەتـەش ئەكـەم حكومـەتی توركیـا سـەركەوتنێكی بـۆ خـۆی بـە دەسـتهێناوەو ئێسـتا ئـەو لـە پێگەیـەكی بـە هێزدایـە نـەك لـە سـەركوتكردنی هەڕەشـەكان‌و تـرس لـە

دەستپێکردنی چارەسەرێکی دیموکراتی ڕەوا بۆ مەسەلەی کورد لە چوارچێوەی یەکێتی نیشتمانیو یەك قەوارەیی کۆماری تورکیاداو داواکارم کە نەکەوێتە دوای ئەووەهمەی کە لە ناوبردنی ئۆجەلان مانای لە ناوبردنی گەلی کوردو جولانەوەکەیەتی بۆ مافە ڕەواکانی).

هەروەها لە کوردستانی نوێدا دەقیووتەکەی عەقید قەزافی سەرکردەی شۆڕشی لیبیا لە سەر گرتنی ئۆجەلان بە کوردی بلاوکرایەوە کە تیایدا ئاماژەی بەوە کردووە کە بە کوشتنی ئۆجەلان کورد تەواو نابێ، چەند خوێنی کورد بڕژێ ئەوەندە سووتەمەنی ئەکرێ بە سەر ئاگری شۆڕشەکەدا. قەزافی قسەکانی ئاراستەی گەلی کوردو کاربەدەستانی تورك‌و ئەو دەوڵەتانە کرد کە لە گرتنی ئۆجەلاندا بەشدارن.

دوو پارێزەری تورك چاویان بە ئۆجەلان کەوت کە لە دوورگەی مەڕمەڕە زیندانییە، ئۆجەلان ڕای گەیاند بوو کە خۆی‌و حیزبەکەی تیرۆریست نییەو ئەو پیاوێکی ئازادیخوازو شۆڕشگێڕە.

خاتوو دانیال میتران لە ئاست ئەم ڕووداوە بێدەنگ نەبوو نامەیەکی کراوەی ئاراستەی سەرۆك‌وەزیرانی فەرنساووەزیری دەرەوەو پانزەووڵاتی ئەندام لە یەکێتی ئەوروپا کرد. لە ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی فەرەنساشدا بلاو کرایەوە، ئەووەکو خەمخۆرێکی کورد هەم داکۆکی لە مافی خوراوی گەلی کورد ئەکات هەم باس لە کێشەی دەسگیرکردنی ئۆجەلان ئەکات‌و داوای پاراستنی ژیان‌و مافەکانی ئەکات:

( پێویست ناکات لەوەی زیاتر بڵێم کە ژیانی ئۆجەلان، پەیوەندی تایبەت‌و ڕاستەو خۆی بە ئێوەوە هەیە بۆ پارێزگاری کردن لە مافی بەند کراوان، بۆ دادپەروەرییەکی درووست‌و ڕاست ).

لە بڕگەیەکی تریدا داوا ئەکات بە پەلە چاودێری ئەوروپایی بۆ تورکیا بنێرن:

(ئەم هەواڵانەی کە بە دەستمان ئەگات زۆر نالەبارو خراپە بەرامبەر ژیان و هەڵسوکەوت لەگەڵیدا، ئەنجامەکەشی لە ناردنی چاودێری ئەورووپایی بۆ تورکیا زۆر بە خێرایی و هەروەها پێویستی بە هەنگاوی وورد و خێرا هەیە).

## ئەندامی دەستەی کارگێڕی

لەم ماوەیەدا هەڤاڵ مام جەلال بڕیاریدا دەستەی کارگێڕی فەرماندەیی گشتی فراوان بکرێ، بۆ ئەم مەبەستە هەندێ هەڤاڵی هێنایە پێشەوە، لەم سەرو بەندەدا منیش کرامە ئەندامی دەستەی کارگێڕی بە بڕیارێکی ڕەسمی:
بڕیارماندا بە دانانی هەڤاڵ مەحمود سەنگاوی بە ئەندامی کارگێڕی فەرماندەیی گشتی بۆ سەرپەرشتی کردنی فەرماندەییەکانی سلێمانی - شارەزوور - گەرمیان لەگەڵ پێشمەرگەی حیزبە هاوپەیمانەکانی ناوچەکە.

بۆ پێشەوە ڕووەو سەرکەوتن.

مام جەلال

فەرماندەی گشتی / ه.پ.ك

٣/٣

# بایەخدانی یەکێتی بە ژن

یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ڕۆژی درووستبوونیەوە بایەخی تەواوی بە ڕۆڵی ژن داوە لە ڕیزی خەباتدا شان بە شانی پیاوان، چونکەوەکو ڕێکخستنێکی پێشکەوتووخواز ژنی بە نیوەی کۆمەڵ زانیوە، ئەرکی لە پیاو کەمتر نییە لە ناو کۆمەڵدا. بە پێچەوانەوە لایەنە کۆنەپەرستەکانی ناو کۆمەڵ هەمیشە ژن لە پلەی دووەمدا ئەبینن و لە خوارەوەی پیاوەوە دایئەنێن، بۆیە یەکێتی هەمیشە هەوڵیداوە ژن وەکو پێشەنگ بن، ئامادەییان هەبێت چ لە ڕیزەکانی ڕێکخستن و خەباتی ژێر زەمینیداو چ لە ڕیزی پێشمەرگایەتی و خەباتی شاخدا، لە هەموو بوارە جیاجیا کاندا. بۆیە ژن سەرەڕای ئەوەی کە ڕۆڵی کۆمەلایەتی خۆی هەیە هەمیشە ئەتوانێ وەکو تێکۆشەری سیاسی و خەباتگێری شۆڕگێڕ کار بکات و دەیان نمونەش هەن بۆ ئەو ئەستێرە ژنانەی کە توانیویانە لە گۆڕەپانی تێکۆشاندا بەوورشەداری خۆیان بنوێنن، بە داخەوە ژن لە کۆمەڵی ئێمەدا کەوتووەتە ژێر کۆتی دوو چەوسانەوەی پیاوو کۆمەڵیش. پیاو لە ژێر پەردەی ئایندا چەندە ستەمی لە ژن کردووە کۆمەڵیش ئەوەندە زیاتر بە بیانووی جیاجیاوە ژنی ئازار داوەو ڕێگر بووە لە بەر ئەم پێشکەوتن و بەشداری کردنی لە بەرەو پێشەوە چووندا.

بە پێچەوانەی ئەو بیرە پووچ و کۆنە پەرستییە ژن ڕێك و ڕاست خاوەنی ئاوەزو چالاکی و بیر کردنەوەی بنیاتنەری خۆیەتی بۆ خزمەتکردن. بۆیە بوونی لە هەموو بارێکی ژیاندا ئاماژەیە بۆ زیندوێتی کەسایەتی ژن، هەر

کۆمـەڵێك ژنـی تیانـەجوڵێ، فەرمانـدە نـەبێ، بیرکەرەوەوووشـیار نـەبێ ئـەوا کۆمەڵێکی نەخۆشە.

ئا لەم ڕوانگەوەیە یەکێتی لە ئەدەبیاتیدا لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیدا بە قسەو بە کردەوەش گرنگی بە ژنو بەشداری ژن لە بنیاتنانی کۆمەڵدا داوە. لـە بـواری حیزبایـەتیو حکومــەتو کـاری پێشـمەرگایەتیداو لــە هـەموو ئــەو شوێنانەشدا ژنان درێغیان نەکردووە، جێگـەی خۆیـان دۆزیوەتـەوە. بـە داخـەوە تـەنیا لــە ئاسـتی سـەرکردایەتیدا ژنــان نــەیانتوانیوە ســەرەڕای بەشــداری ژمارەیەکی بەرچاویان لە کۆنگرەدا هەڵبژێراوی خۆیان هەبێو دەنگی بـدرێتێ. کە ژن ئەمە پلەو پایەی بێ ئەبێ هـەموو حیـزبو ڕێکخـراوو لایـەنێك پشتیان پێ ببەستێت بە تایبەتی لەم ڕۆژگارەدا کە کۆمەڵگا هەنگاو بەرەو دیموکراسیو ڕۆژگاری پێشکەوتنی خێرا ئەنێ.

بۆیـە هـەڤاڵ مـام جـەلال لای خۆیـەوە بـە چاوی ڕێـزو خۆشەویسـتیو گرنگیدانەوە ئەڕوانێتە ژنو ئەیـەوێ لـە جۆشو خرۆشـەکاندا بـە تـەوژمی بـە هێـزەوە بێنـە کایـەوە کـە ئـەوەش پێویسـتە بـۆ گەشـەپێدانی کـوردەواریو پـتر جۆشدانی کوردایەتیو دامەزراندنی کۆمەڵێکی شارستانی. بۆیـە نووسـراوێك بـە سەر گشت هەڤالانی یەکێتیو هێزی پێشمەرگەی کوردستاندا بلاوئەکاتـەوە، لـە بڕگەیەکی دا ئەڵێ:

( پێویسـتە لـە سـەر هـەموو ئەنـدامانی (ی.ن.ك) و پێشـمەرگە دلێرەکـانی (هـ.پ.ك) کـە خۆیـانو لایـەنگرانو دۆستانیشـیان هانــدەن بـۆ هەڵسـان بـەم ئەرکانەی خوارەوە:

- هــــاندانو هـوشیارکـردنــــەوەی دایـــكو خـــوشكو کـــچو ژنو دەزگیرانی خۆیان بۆ بەشـداریکردن لـە ڕێکخسـتنی (ی.ژ.ك)و چـالاکییەکانیداو بەشداریکردنیان نیشانەی دڵسۆزیو پەروشییانە بـۆ کـوردەواریو کوردایـەتیو (ی.ن.ك) و پێشمەرگایەتی.

- هاوکاریکردنی ی.ژ.ك‌و چالاکییه‌کانیان به پێی تواناو هه‌ر یه‌که له ئاستی خۆیه‌وه.
- ڕێزگرتن له (ی.ژ.ك)و خه‌باتو داخوازییه‌کانیان.
- نه‌ك هه‌ر خۆدوور گرتن، به‌ڵکو به گژاچوونی تیرۆرو کوشتنی ژنان‌و سوکایه‌تی پێکردنیان.
- داکۆکیکردن له مافی ڕه‌وای ژنان له‌وه‌کیه‌کی له‌گه‌ڵ پیاوان، ئازادی شووکردن، قه‌ده‌غه‌کردنی ژن به ژنه‌ی به زۆر، به زۆر به شوودانی کچان‌و کچانی مناڵ‌و شیره‌خۆرو ...هتد.
- به گژاچوونی فره‌ژنی‌و ته‌لاقدانی ناڕه‌وا مه‌گه‌ر له به‌ر هۆی ته‌ندرووستی‌و مناڵ نه‌بوون‌و بێ ڕه‌وشتی دیارو ئاشکرا بێ ).

له ڕاستیدا ئه‌م مۆچیاریانه نیشانه‌ی بیر فراوانی یه‌کێتییه بۆ به ته‌نگه‌وه هاتنی ژن‌و که‌مکردنه‌وه‌ی ده‌سه‌ڵاتی دکتاتۆریانه‌ی پیاوان له قورخکردنی ئیراده‌ی ژن‌و بێبه‌شکردنیان له سه‌رکردایه‌تی کردنی کۆمه‌ڵدا.

په‌یڕه‌وو پڕۆگرامی یه‌کێتی له هه‌موو قۆناغه‌کاندا به‌ڵگه‌یه‌کی دیارن بۆ شایه‌تی له سه‌ر ڕۆشنی بیرو هه‌ڵوێستی یه‌کێتی بۆ باش لێکۆڵینه‌وه کردن له سه‌ر ژن‌و ڕۆڵی به‌رچاوی له به‌ڕێوه‌بردنی ژیانی کۆمه‌ڵدا. له‌وانه‌یه به لای هه‌ندێکه‌وه ژن‌وه‌کو شتێك، ئامرازێك ته‌ماشابکرێ،وه‌ك لاشه‌یه‌کی بێ گیان، به‌ڵام ئه‌مه ڕاده‌ی بێ هه‌ستی‌و دواکه‌وتوویی ئه‌و لایه‌نانه ده‌رئه‌خات، به‌ڵام یه‌کێتی به فیعلی ژنی خستووه‌ته شوێن‌و پله‌ی خۆیه‌وه‌و له هه‌موو دامه‌زراوه‌کاندا کورسی خۆی هه‌یه. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا پێویستمان به کاری زۆر، به خه‌باتی بێ ئامان هه‌یه تاکو ڕێڕه‌وی بیری خه‌ڵکی دواکه‌وتوو بگۆڕێ، هه‌مووان له ئاستێکدا بین بۆ ته‌مشاکردنی ژن‌و ڕێزلێنانیان.

## بۆ فەرماندەیی گشتی

ڕۆژی ٣/٢٢ بە ڕەسمی لە فەرماندەیی حەوتی سلێمانی نەمامو لەگەڵ کاك حەمە نوریدا دەورو تەسلیمم کردو چوومە فەرماندەیی گشتی بۆ دەستبەکار بوون.

دوای ئەوە لە فەرماندەیی گشتی سەردانێکی لیوا نەوشیروان فوئاد مەستیم کردو لە سەر مەسەلەی بە نیزامی کردنی هێزی پێشمەرگە قسەمان کرد کە لەوانەیە لەم قۆناغەدا کارێکی تا ڕادەیەك سووك نەبێ، چونکە هێشتا میلیشیاوەکو خۆی ماوەتەوە، بارو دۆخی سیاسی سەقامگیر نەبووە بۆ یەکخستنی هەوڵەکانو دروستکردنی حکومەتی یەکگرتوو. جگە لەمە شێواوییەکی زۆر بە هێزەکانمانەوە دیارە کە بۆ زۆرگۆڕینی شێوەی تەشکیلاتەکان ئەگەرێتەوەو کاتی تەواوی بۆ دابین ناکرێ تاکو دەقی پێوە بگرێتو ڕادەی سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی نیشان بدرێ. جاریوا هەیە میزاجی تاکە کەس ڕۆڵ ئەبینێ، بۆشایی دروستئەکرێ بۆ دانانی خەڵکی ناتوانا کە لە دواییدا زیانی زۆرترە کەسیش لە کەموکوڕیو خەوشەکانو زیانەکان بەرپرسیار نییە چونکە لێپرسینەوە نییە.

لە هەموویشی خراپتر دەردی کوشندەی تەکەتولاتو نەخۆشییە حیزبییەکان خۆیان گەیاندووەتە ناو ڕیزەکانی هێزەکانمانەوە لە هەموو ئاستێکدا چ لای لێپرسراوان بێ یان پێشمەرگەکان، شتەکان بە ئاشکرا باس ئەکرێ: سەنگەر بەندی، کۆمەڵ کۆمەڵ، دژایەتیکردن، ناکۆکی تەقاندنەوە،بگرە بێگوێیو پابەند نەبوون بە بڕیارو کارو باری حیزبیو پێشمەرگایەتییەوە زۆر بە زەقی دیارە، لەو لاشەوە پشتیوانی کوێرانەو هەڵسەنگاندنی بێویژدانانەو ئیمتیازات بە خشینی بێهودانە بووەتە دیاردەی ناپەسەند کە لە ئەنجامدا گەر چارەسەر نەکرێو بە توندی لە ڕوویاندا نەوەستین یەکێتی ئەخاتە مەترسییەوە.

له سەر ئەوەو کێشەی فەرماندەییەکان ڕۆژی ٣/٣١ له سلێمانی سەردانی هەڤاڵ مام جەلالم کرد. بە تێرو تەسەلی لە سەر هەموو کێشەو گرفتەکانی فەرماندەییەکانو له ڕیشه دەرهێنانی پێڕو پێڕکاری قسەمان کردو بە ڕاشکاوی پێی ڕاگەیاندمووتی:

(نابێ لە کەس بترسی، ئەبێ هەرچی کوتلە هەیە هەوڵی لابردنی بدەیتو ئەگەر خۆت نەتکرد بە خۆم بڵێ له ڕیشه دەری ئەهێنم ).

ئەمە ئاماژەیەکی بەهێزە بۆ ڕادەی ئەو خراپەکارییەی پێڕو پێڕ کاری لە سەر چارەنووسوازی ئەکات بۆ لاوازکردنو بێ ئاست کردنی لە بەرامبەر ئەو دوژمنەی کە هەیەتی، لە لایەکی تریشەوە ئاماژەیەکی توندە بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەو بەرامبەر گرتن لەو دیاردەیەو ئەو کەسانەی یاری بە ئاگر ئەکەنو ئەیانەوێ بەو جۆرە یەکێتی بۆ نیازەکانی خۆیان بقۆزنەوە.

یەکێتیوەکو ڕێکخستنێکی سۆسیال دیموکرات جێگەی هەموو کەسێکی تیادا ئەبێتەوە کە بڕوای بە پرەنسیپی سۆسیالیزمو دیموکراسی هەبێت، لەم پەڕی چەپەوە بۆ ئەوپەڕی ڕاست. بەڵام لە یەکێتیدا ناکۆکی فیکری لە سەر ستراتیژو لێکدانەوەو شیکردنەوە نییە، بەڵکو ناکۆکی له ئاستی کەسایەتیدا بۆ شەڕی دەسەڵات هەیە کە زۆر جار زۆرمەبەستی ناساز ئەخولقێنێو گەورەی ئەکەنەوەوەکو ناوچەگەرێتی کە لەم بارەدا کەسانی ناشایستە دێنە پێشەوە، پێوانەی خەباتو حیزبایەتیوون ئەبێ، دڵساردی لێئەکەوێتەوە، بێباوەڕی تەشەنە ئەسێنێ، خووتەو بۆڵەو داوای ئیمتیازی مادیو نەمانی گیانی خۆبەخت کردن بڵاو ئەبێتەوە.

هەر بۆیە بە پێی بەرنامەیەك کەوتمە سەردانی فەرماندەییەکانی سنووری کارکردنی خۆمو بە پێی ئامۆژگاریو ڕێنماییەکانی هەڤاڵ مام جەلال کۆمەڵێك ڕێوشوێنمان بۆ چارەسەرکردنی گرفتولابردنی کەموکوڕییەکانو جۆشو خرۆش درووستکردن لەناو ڕیزەکانی پێشمەرگەداو بە نیزامیکردنی هێزەکانو یەکخستنەوەیانو مەشق پێکردنیان دانا.

# داوای لێبوردن

کۆمەڵگای کوردی بە هۆی ئەو هەلومەرجی نائاساییەوەو بە هۆی گرفتی داگیرکەران لە گەڵماندا کە هەمیشە داومان بۆ ئەنێنەوەو ناهێڵن لە پانتایی ئەم ژیانەدا بە ئاسوودەیی بژین، جگە لەوە ڕادەی ناهوشیاری خەڵکەکەمان کاری خراپ ئەکاتە سەر هەڵسوکەوتمان‌و بە دەیان کێشەو ناکۆکی لە بەردەمماندا ئەتەقێتەوە کە کاتی زۆری ئەوێ بۆ چارەسەر کردنی. بە تایبەتی ئەو کارانەی دژی یاسا ئەکرێن، ئاسایشی کۆمەڵ‌و کاروباری حکومەت تێکئەدەن، لەم ڕووەوە کۆمەڵێك کاری لاساری کرابوو، من هەوڵمدا بۆ ڕێگری کردن لێیان هەندێکیانم ڕوو بە ڕووی دادگا کردەوە کە لە دوایدا بڕیاری دادگا زۆر توند بوو بەرامبەریان. ئەوانە سەر ڕای ئەوەی خراپەیان کردبوو بەڵام لە ڕۆژگارێکیشدا خەڵکانی دڵسۆزو چاکبوون‌و کەوتبوونە ناو ئەو زەلکاوەوە.

بۆ ئەم مەبەستە نامەیەکم ئاراستەی هەڤاڵانی مەکتەبی سیاسی کرد بەم ناوەڕۆکە:

بۆ/ هەڤاڵانی بەڕێزی مەکتەبی سیاسی

ب/ پێشنیار

سڵاوێکی گەرم.. بە هیوای هەمیشە سەرکەوتنتانم.

بەڕێزان..

بە حوکمی ئەوەی لەم ساڵانەی دواییدا کە من لە هەندێ جێگا کارم کردووە، لەو شوێنانەدا کاری خراپی‌وەکو دزی‌و تاڵانی‌و بڕۆو لاساری‌و سەرپێچی لە کاری یاسادا کراوەو منیش بە ئەرکی سەر شانی خۆمم زانیوە بۆ سەر خستنی کارەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ڕێگەی بەکار هێنانی هێزەوە یان لە سەر سیقەی ئەوانەی کە خراپەیان کردووە تەسلیمیان بکەم کە

کۆمەڵێکیان پێشمەرگەی ڕۆژی تەنگانەی (ی.ن.ك) بوون، حوکمی لە سەیدارەدانیان دراوە بۆ نموونە:

١. جەمال عەبدوڵڵا چاوشین: کە باوکی بە هۆی بەشداریکردن لە بۆسەکەی ڕێگای خەلەکان لەگەڵ کاک تۆفیق کانیوەتمانیدا بوو بە دیلی گیراو لە سێدارە درا. کۆمەڵێك کچی لە دوا بە جێماوەو ئێستا جەمال حوکمی لە سەیدارەدانی دەرچووە.

٢. فایەق فەریق شوانکارە: پێشمەرگەیەکی تێکۆشەرو قارەمان بوو کە تۆمەتی پیاوکوشتنی دراوەتە پاڵ من تەسلیمم کردووەو حوکمی لە سێدارەدانی دراوە.

٣. ئەنوەر ڕەباتی: کە پیاوی لە سەر قەرز کوشتووە، لە دوای ڕاپەڕینەوە پێشمەرگەی (ی.ن.ك) بووەو لە هەموو شەڕەکاندا بەشداری کردووەو دەوری باڵای هەبووە، قارەمانەتی ئەم پیاوە هەمووی بە کامیرای ڤیدیۆ لای کاک عوسمانی حاجی مەحمود تۆمار کراوە.

جا ئێستا لەبەرئەوەی من گوشارێکی زۆرم لەسەرە داوا ئەکەم حوکمی لە سەیدارە دانیان بکرێتە ئەبەدی چونکە کەس‌و کاریان یان شەهیدیان هەیە یان خۆیان ڕۆژگارێك باشبوون‌و خزمەتگوزاری (ی.ن.ك)ن.

ئەم داخوازییەی من ئەوانە ناگرێتەوە کە لە سەر جاسوسی حوکم دراون.

تکام‌وایە بڕیار بفەرموون ئاگاداری بەڕێز سەرۆکی حکومەتی هەرێم بکەنەوە کە ئەو حوکمە گۆڕانی تێدا بکرێ‌و مەرحەمەت بکات. ئومێدەوارم ئەم داخوازییەم بە هەندوەربگیرێ‌و لووتف بفەرموون.

هەر سەربەرزبن..

براتان

مەحمود سەنگاوی

١٩٩٩/٤/١

بەڵام گرفتی ئەم برادەرنە لە ڕووی یاساییەوە قورس بوو، هەروا ئاسان نەبوو بە نامەو داوایەك ئازاد بکرێن.

# ووشكە ساڵی

ئەم ساڵ بارانبڕان بوو،ووشكە ساڵی كاری خراپی كردبووە سەر دۆخی ئابووری، بەتایبەتی خەڵكەكە پشتیان بە كشتوكاڵو ئاژەڵداری بەستووە، كە لەوەڕ نەبێت، خەلەو دانەوێڵە نەبێت كێشەیان بۆ درووست ئەبێت، ناچارن لە شوێنی خۆیان ڕەو بكەن بەرەو ژوور تر بڕۆن بۆ لەوەڕ پەیدا كردن. جگە لەمە باران نەبارین سرووشتیش تووشی نەخۆشی ئەكات، ئاو كەم ئەبێتەوەو سەوزایی نامێنێ، بگرە كار لە مرۆڤیش ئەكات، ڕەنگو ڕووخساری نەخۆش ئەكەوێت، ئاوەزیان نامێنێت، بۆ لاچوونی ئەو دەردی سەرییە پەنا ئەبەنە بەر قوربانی كردنو نوێژو پاڕانەوە، بە تایبەتی هەموو ڕۆژانی هەینی بە دەنگی بەرز هاوار ئەكەنو لە خوا داوا ئەكەن بارانیان بۆ ببارێنێت.

مەلای دێی بەكربایەف لەووتاری ڕۆژی هەینیدا پاش نوێژ دەستی نزا بەرز ئەكاتەوەو ئەڵێ: خوایە لە بەڵای شەڕو فەوتان لامان بدەیت، لێمان ببوریت، خوایە ساڵێكی تروەكو ئەمساڵ بێبارانی ڕەحمەتمان نەكەیت. لە ڕیزی دواوە یەكێك لە نوێژكەرەكان ئەڵێ: حەو.. مامۆستا باریكی كردەوە بۆ ساڵێكی تر و دەستی لە ئەمساڵ شۆرد.

ئەم ساڵە ئەوەندە ناخۆشبوو تەنانەت عەرەبە ئاژەڵدارەكانی دەرەوەی سنووری هەرێمیش لەبارێكی ناسازو ئاڵۆزدا بوون، عەرەبیوا هەبووـ ٣ هەزار سەر مەڕی هەبوو، بەناچاری ڕوویان ئەكردە سنوورەكانمان لە بناری گڵو داودەو هەندێ شوێنی تر، ئەمەش تەنگی بە ئاژەڵدارەكانی لای خۆمان هەڵئەچنیو هەندێ جاریش بەزم ئەقەوما.. بۆیە هەڤاڵ مام جەلال ئاگاداری كردمەوە بە نوێنەری بەرێزیان بچمە سەردانی بناری گل بۆ بینینی ئەو ماڵە عەرەبانەی خێڵی شومەرو ڕیشسپیەكەیان ئەبو حەمید كە مەڕو ماڵاتێكی زۆریان هێنا بووە ئەو ناوە بۆ لەوەڕ خۆری.

ڕۆژی ٥/٨ چـوومەلایانو میوانـداریان کـردینو لـەو بارەیـەوە قسـەم لەگەڵدا کـردن، کـە ئێمـەوەکو یـەکێتی ڕێگـەیان لێنـاگرین، بـەڵام ئـەبێ لەگـەڵ خەڵکەکـەدا لەسـەر لـەوەڕ خـۆری ڕێکبکـەون، چـوونکە بێبـارانی کـاری لـە خەڵکەکەی ئێمەش کردووە، لەوەڕ کەمەو گوشاری زۆریان لـەسەرە بـە جـۆرێك زۆر لـە ئاژەڵدارەکانـی ناوچەکانی گـەرمـیان بەرەو شارەزوورو قـەرەداخ ڕەویـان کردووە.

عەرەبـەکانیش بـە قسـەکانی ئێمـە قایـل بـوون. شـایانیووتنە ئـەم هاتووچۆی عەرەبانە بۆ لەوەڕ خۆری هەر لـە کۆنـەوە هـەبووە بـە تایبـەتی لـە ساڵانی بێ بارانیـدا بـە مـەڕو ماڵاتـەوە ڕوویـان کردووەتـە کوردسـتان، کەسـیش ڕێگەی لێنەگرتوون، عەرەبەکانی ئەو خوارە دۆستایەتیان لەگەڵ کوردا هـەبووە، کێشـەو ناکۆکیـان نـەبووە، بـەڵام ڕژێمـی بـەعس ڕۆڵێکـی نـابووتی گێـڕاوە لـە تێکـدانی ئـەو پەیوەندییـەو زۆر عـەرەبی لـە دوورەوە هێنـاو کردنیـە حـەرەس قەومی بۆ بە گژا چوونی کـورد بـە تایبـەتی لـە ساڵی ١٩٦٣ دا سـەدان چـەکداری جاشی عەرەب پەلاماری دێهاتەکانی کوردستانیاندا بە تایبەتی لە گەرمیانـدا بـە هاوکاری هێزی سەربازی تالاّنیان کردن.

ئەمە خاڵێکی ڕەشی لە دەروونی خەڵکی دێهاتی کوردا درووستکردو ئـەو پردی دۆستایەتیە پسا، کە ئەنفالیش کرا هەرچـی سامانی ئـاژەڵی کـورد هـەبوو بـەرەو خـوار کرایـەوەو کەوتـە دەسـتی عەرەبـەکان. کـە ئـەکرا هەڵوێسـتێکیان هەبوایـەو قایـل نەبوونایـە تـالاّنی کـورد بچـێتە ماڵەکانیانـەوە، چ لـە ڕێـی مرۆڤایەتییـەوە یـان ئـاینی یـان دراوسێتییەوە بـێ، بـە داخـەوە عەرەبـەکان بـە تـەواوی کەوتبوونـە نـاو داوی بەرنامـە ترسـناکەکانی بەعسـەوەو بگـرە بوونـە هاوبەشی خراپەکارییەکانی. کە عەرەب بەوە بـەناوبانگن کـە پیاوەتیـان ڕێگـەی خراپەیان نادا، دۆستایەتیو دراوسێتیان ڕێگـەیان نـادات دەسـتیان بچـێتە مـاڵی لێقەوماوانەوە.

کێ هەبوو لە کورد لێقەوماو تربێ لەکاتی ئەنفالدا..؟ کە چی پیاوێکی عەرەب نەبوو تاقە یەك هەڵوێستی هەبێ لەم ڕووداوە کارەساتاوییە سامناکەدا.! لەگەڵ ئەوەشدا کورد بەرامبەر بەو تاوانانەی بەعس‌و هاوکاری عەرەبەکان هەڵوێستێکی ناجۆری نەبوو، کاتێك ئەوان لەو ساڵانی قات‌و قڕی یەدا ڕوویان ئەکردە کوردستان. گەر چی بارودۆخی کوردستان خۆی زۆر لەبار نەبوو، بەڵکو بە قسەکانی ئێمەش ڕازی بوون‌و ئامادەی هاوکاری بوون لەگەڵیاندا.

## لە بنکەی مەشقدا

دوای ئەوە گەڕامەوە سلێمانی‌و سەردانێکی بنکەی مەشقی سلێمانیم کرد. دوو ڕۆژنامەنووسی ئیتالی هاتبوون بۆ سەردانی بنکەکەو تێگەیشتن لە کاروبارو ئەرکەکانی‌و چۆنێتی مەشقی پێشمەرگەو وێنە گرتنی مەشقەکە، چاوپێکەوتنیان لەگەڵ عەقید قارەمان قەرەداخی سەرۆکی بنکەی مەشقدا کردو پاشان لەگەڵ منیشدا لە سەر پێشمەرگایەتی‌و شەڕی پارتیزانی‌و شەڕی ڕزگاری کوردستان چاوپێکەوتنیان کرد، دوا پرسیاریان داوای ڕای من بوو لە سەر عەبدوڵڵا ئۆجەلان، لەوەڵامدا پێم‌ووتن: ئۆجەلان ئیعدام ئەکرێت چونکە بەرامبەر بە دوژمن نابەزێ‌و خۆڕائەگرێ. هەرچەندە ئەمزانی ئەم قسەیە کۆنە لەوانەشە ئۆجەلان چۆك دابداو لە بەردەم تورکدا هەرەس بهێنێ، بەڵام لە ناخەوە پێم ناخۆشبوو لە ڕۆژنامەیەکی بیانیدا قسەی دڵشکێنی پێ بڵێم‌و لە دڵەوە ئەوەم ئەخواست کە بە ڕچەی سەرکردە گەورەکانی تری کورددا بڕوات‌و ملکەچ نەکات لە بەرامبەر هەڕەشەکانی دوژمن‌و زیندان نەیترسێنێ.

# تەسلیمکردنەوەی شەمدین ساکیک

چونکە گرتنی ئۆجەلان کاری لە هەستو دەروونی هەمووو کورد کردبوو، کەچی هەرچەند ڕۆژێك دوای ئەوە، هەواڵی تەسلیم کردنەوەی شەمدین ساکیکی گەورە بەر پرسی سەربازی پەکەکەو براکەی لەلایەن پارتییەوە بە میتی تورکی بلاو بووەوە.

شەمدین پلەو پایەیەکی بەرزی لە ناو پەکەکەدا هەبوو، بەڵکو لەوە ئەچوو کەسی دووەم بێ، بەلام ناکۆکییەکانی ناو پەکەکەو تەنگ پێهەڵچنینی لەلایەن ئۆجەلانەوەوایلێکرد کە خۆی تەسلیم بە پارتی بکات، شەمدین ڕێگایەکی پڕ دڕکەزی هەڵبژاردو هەڵەیەکی گەورەی کرد، ئەو ئەیتوانی بە ڕێگای تردا خۆی دەربازبکاتو بچێتە دەرەوە. ئەم کارەی لە تێگەیشتنەوە نەبوو، لەوە ئەچوو خۆی دابێتە دەست قەدەر. کەچی پارتی لە بەرامبەر گوشاری میتی تورکی خۆی ڕانەگرتو زۆر بە ئاسانی خۆیو براکەی تەسلیمکردن. ئەمەش هەنگاوێکی نێگەتیفی بوو کاری خۆیشی کرد. ڕاستە پارتیو پەکەکە لە شەڕدان بەلام، کە بەرپرسێکی پەکەکە خۆی بداتە دەست پارتییەوەوەکو دابونەریتی کوردەواری نە ئەبوایە بدرێتە دەست دوژمنەکەیەوە، لە سەر هەڵەو تاوانەکانی دەرهەق بە پارتی گەر هەیبێ، زیندانی بکرێو سزا بدریت، بەلام نابێت بە هەر بیانوویەك بێت بدرێتەوە تورکیا کە ئەزانرێ چارەنووسی نادیارئەبێت، دادگای ئەمنی دەوڵەتی تورکیش لە لای خۆیەوە فەرمانی لە سێدارەدانی بە سەردا سەپاند، بەلام نازانرێ کەی ئەو فەرمانە جێبەجێ ئەکریت..؟

# دادگایی کردنی ئۆجەلان

هەرچەند ڕۆژێك دوای ئەمە لە تورکیا دادگایی کردنی ئۆجەلان لە دوورگەی ئیمرالی دەستی پێکرد، کە لە هەموو کەناڵە ئاسمانیەکاندا نیشان ئەدرا، ئۆجەلان لە قەفەسێکی شووشەییدا بوو، تەنیا ئەیتوانی بە بڵندگۆ قسەی ئەکر، ئۆجەلان لە قسەکانیدا داوای لێبوردنی لە بنەماڵەی کوژراوە تورکەکان کرد. هەروەها داوای کرد کە ببێتە پیاوی ئاشتی لە نیوان کوردو تورکیادا.

هەر تێکۆشەرێك دەست دوژمن بکەوێت گەر خۆڕاگرنەبێت، بەرامبەر دەردو ئەشکەنجەکان، گیانی تەحەدای تیا نەبێ زوو ئەڕووخێت وبە چۆکا دێت، لاوازی کەسێتی دەرئەکەوێ، هەندێ شت ئەڵێ کە دوورە لە هەڵوێستەکانیەوە، کە نابێت ئەو تێکۆشەرە بترسێت یان پەشیمان ببێتەوە.

کە ئۆجەلان شۆڕشی کردووە لە سەر ڕاستی بووە، داواکانی داوای نەتەوەیەك بووە، هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان داخوازییەك لە دەرەوەی زیندان و ناوەوەی زینداندا، ئۆجەلان و تێکۆشەرانی کورد داوای مافی کوردیان کردووە وەکو پیاوی ئاشتیخواز خەباتیان کردووە، گەر دوژمنی داگیرکەر گوێی لێبگرتایە لایەنی کەمی داخوازییەکانی جێبەجێ بکردایە لە شاخ نەئەمان و لە سایەی ئاشتیدا ئەژیان. بەڵام کاتێك ئۆجەلان ئەخرێتە زیندانەوە، ئەو ئۆجەلانەی دەرەوەی زیندان نییە، پەیامەکانی ئەگورێ، ترسی پێوە دیارە، ئەم هەڵوێستەش کاردانەوەی خراپی ئەبێت لە سەر خەڵکی کورد کە چاوەڕوان بوون سەرکردەیەکی وا کاروانی خەبات بەڕێوە ببات پێشوازی لە پەتی سێدارە بکات و پەنجەی مەرگ بچەقێنێتە گلێنەی چاوی ڕژێمێکی کورد کوژدا. لەوانەشە خەڵکێك هەبن ئەم هەڵوێستەی ئۆجەلان بە قارەمانەتی بزانن، بیانووی جۆراوجۆری بۆ بهێننەوە، بەڵام ئەوە تەنیا لە ڕوانگەی خۆشەویستی

کوێرانەوە بۆ سەرکردەیەك سەرچاوە ئەگرێ کەواقیعبینانە تێی ناڕوانن‌و هەڵی ناسەنگێنن.

سەرکردە ئەبێت ئازاو نەترس بێت، ژیانی سەربەرزانەو لەخۆبردوویی هەڵبژێرێ، نرخی مانەوەی لەلا تەنیا بۆ درێژەپێدانی کاری شۆڕشگێڕانە بێت، سەرکردە ئەبێت لە بەردەم دوژمندا گەورەو زاڵ‌و جەربەزە بێت، پەتی سێدارەو بڕیاری مردنی لا هیچ نەبێت.

کارێکی پڕمەترسییە کە سەرکردە ئازانەبێت، بە تایبەتی ئەم ڕۆژگارە لە ڕێگەی هۆیەکانی ڕاگەیاندنەوە لە سەر شاشەی کەناڵە جیهانیەکانەوە ڕووداوی دادگایی کردنەکان نیشان ئەدرێ‌و هەر قسەیەك کاری خۆی لە دڵ‌و دەروون ئەکات، بە باش‌و خراپەوە. دڵنیام ئەم جۆرە قسە کردنانە کە نائومێدی لێنەباری نەبێتە مایەی هەڵوەشانەوەی پەکەکە. لە دوا جاردا بشێوی ئەکەوێتە ڕیزەکانیەوە، ڕژێمی میلیتاریستی تورکیش باشترین سوود لەوە ئەبینێت. لێرەشدا ڕۆڵە دڵسۆزو خەباتگێڕەکان ئەبنە قوربانی‌و لە ناو تەمومژی ناکۆکییەکانداوون ئەبن. هەرچەند هێشتاش زووە دوا قسە لە سەر ئۆجەلان بکرێ، بەڵام تورك ئەیەوێ لە زینداندا بیپووکێنێتەوە.

## سەردانی سۆڵە

هەر لە کۆتایی ئەم مانگەدا بوو، کە لەگەڵ بەڕێز کاك کۆسرەت سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان سەردانی دێی سۆڵەی شێخانمان کرد، لە لایەن بنەماڵەی شێخانی سۆڵەو خەڵکێکی زۆری ناوچەی شارەزوورو قەرەداخەوە پێشوازی لێکرا. زیارەتی ئارامگەی شێخ ڕەسوڵی سۆڵەو شێخ قادری سۆڵەو شێخ حسێنی چرچەقەڵامان کرد، کە لە کاتی ئەنفالدا دێی سۆڵە لە لایەن سوپای داگیرکەرەوە خاپوور کرا. گوایە شۆفڵەکان کە دەمیان گەیشتبووە ئارامگەکان لە کار کەوتبوون، بۆیە هەروەکو خۆیان مابوونەوە.

له کۆبوونه‌وه لـه گـه‌ڵ خه‌ڵکه‌کـه‌دا  کـاك عومـه‌ر غـه‌ریبی  پێشمه‌رگه‌و کادیری دێرین. به ناوی خه‌ڵکی دێکه‌و شێخانه‌وه بـه خێرهاتنی‌وه‌فدی مێوانی کردوو کـاك کۆسـره‌تیش سوپاسـی پێشوازی کـردن‌و میوانداریه‌کـه‌ی کـردن‌و لـه باره‌ی شۆڕش‌و هه‌لومه‌رجی سیاسی ڕۆژه‌وه قسه‌ی بـۆ کـردن، دواتـر بابه عـه‌لی شـێخ حه‌مـه تایـه‌ریش بـه‌خێرهاتنی کـردن‌و هیـوای خواسـت پـه‌یڕه‌وی لـه به‌نده‌کانی ئاینی ئیسلام بکرێ له‌لایه‌ن کادیره‌کانی حیزب‌و حکومه‌ته‌وه.

زۆر جار ئه‌م ئاوازه لێئه‌درێ، زۆر مـه‌لاو شـێخ هـه‌ن پێشمه‌رگه‌و کـادیر به کافرو لاده‌ر ئه‌زانن،وه‌کو بڵێی که‌س جگه له‌وان موسوڵمان نییـه، یان ئـاینی ئیسلام ئه‌بێ به زۆری کوته‌کی ده‌سه‌ڵات په‌یڕه‌و بکرێ یان بچه‌سپێ.

## له ناڵپاریز

هه‌ر چه‌ند ڕۆژێك دوای ئه‌مه له‌گه‌ڵ کاك جه‌بار فه‌رمانـدا چووینه ناڵپـارێز بـۆ سـه‌ردانی باره‌گـای ئه‌نجومـه‌نی بـالآی شۆڕشـی ئیسـلامی لـه عێـراق، کـه دوای ڕاپه‌ڕین ئه‌م باره‌گایه‌یان هێنابووه ئێره‌و بـه قسـه‌ی خۆیـان ٧٠٠ کـه‌سـن، که‌چـی ئێمـه ٢٠٠ کـه‌سمان بینـی‌و جـۆری چـه‌که‌کانیان کلاشـینکۆف‌و بیکـه‌یسی‌و کاتیوشاو هاوه‌نی ١٢٠ مله‌م‌و دژه تانکی ١٠٦ مله‌م‌و دۆشکای ٥ر١٢و ٥ر١٤ ملـم بـوون. ئه‌مانـه شـیعه‌ی عێـراقین، دژی ڕژێمـی بـه‌عس‌و سـه‌دامن، باره‌گـای سـه‌ربازی هێزه‌کانیـان لـه نـاو   ئێراندایـه، هێزیکی باشـیان هه‌یـه، که‌ره‌سته‌و که‌لوپـه‌لی چاکیان لـه بـه‌ر ده‌سـتدایه، مه‌شق ئه‌کـه‌ن، چـالاکییان لـه دژی سـوپای عێـراق هه‌بووه‌و زۆر جـاریش هاوکـاری ئێـران بـوون لـه شـه‌ڕدا دژی عێـراق. بـیرورای ئه‌مانه له باره‌ی کورده‌وه زۆر ڕوون نییه به‌ڵام ئه‌مانه دوو که‌ڵکه‌ڵه‌یان هه‌یه:

- شـیعه‌ن‌و شـیعه‌ش چه‌وسـاوه‌یه‌و لـه مه‌شـدا له‌گـه‌ڵ کـورد دا یـه‌ك ئه‌گرنه‌وه.
- عه‌ره‌بن‌و له‌وانه‌یه پێیان قبووڵ نه‌بێت کورد ببێتـه خـاوه‌ن ده‌سـه‌ڵاتی خۆی، ته‌نانه‌ت فیدراڵیش‌وه‌ربگرێ.

چونکه ئەمانە خاوەن بیری ئیسلامگەرایین، بگرە پێیان خۆشە لە چوارچێوەی دەسەڵاتی ئیسلام دا کورد لەگەڵ عەرەبداوەکو موسڵمان هاوکار بن، یان باشتر بڵێین کورد لە پلەی دووەمد دا بێت، چونکە عەرەب خاوەنی دەسەڵاتی ئاینین، کە شیعەکان سەر بە بنەماڵەی پێغەمبەرو ئال و بەیتی عەلی کوڕی ئەبو تالیبن. لەم قۆناغەشدا ئەوان دۆستایەتیان لەگەڵ کوردو هێزە سیاسیەکانیداوەکو ئۆپۆزسیون دژی ڕژێمی عێراق زۆر باشەو قسەو گفتوگۆیان هەیە. بە تایبەتی پەیوەندییان لەگەڵ یەکێتیدا لە پلەیەکی چاکدایەو ڕێگەیان پێ دراوە کە بنکەو بارەگای سەربازییان لەو سنوورەدا هەبێت. جگە لەمەش لە پێش ڕاپەڕین لە گەرمیاندا هێزیان هەبووە، لە ڕێگەی هەڤاڵانمانەوە لە کاتی پارتیزانی دوای ئەنفالەکاندا، کادیرەکانیان دابەزیوون و چوونەتە ناوەڕاستو خوارووی عێراق بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانیان. لە زۆر بۆنەشدا هەندێ بۆ چوونی سەر پێی لە مەڕ پەیوەندی کوردو ئایینەدەی عێراق دەرئەبڕن، بەڵام لەوە ئەچێ بۆ ئیستیهلاکی سیاسی بێ، نەك هەڵوێستێکی چەسپاو. لەگەڵ ئەمانەشدا لە کاتە ناسکەکاندا هەندێ لایەنی شیعەو کەسایەتی ناوداریان هەڵوێستیان باش بووەوە بەرامبەر بە کوردو دژی ستەمی ڕژێم بوون، قسەی خۆیان کردووە کە مایەی دڵخۆشکەر بووە بۆ کورد کە لە سەنگەری شۆڕشگێریدا دۆستیوای هەبێ بە تایبەتی لە عێراقدا.

## جیابوونەوە لە سۆسیالیست

سەرەتای مانگی ٨ بوو کە حیزبی سۆسیالیتی دیموکراتی کوردستان، تووشی گرفتێکی گەورە هات بووە هۆی لەبەریەك هەڵوەشانەوەی حیزبی سۆسیالیستو جیابوونەوەی برێك لە ئەندامانی سەرکردایەتیو کادیرو پێشمەرگەکانی. دوای ئەوەی ئەوانە بەیانێکیان لە سەر سکرتێری حیزب دەرکردو پەنجەیان خستبووە سەر زۆر گرفتو ناکۆکی نێوان ڕیزەکانی حیزب، لە بەرامبەریشدا سکرتێری حیزب بەیانێکی لە سەر ئەوانە دەرکرد.

حیزبی سۆسیالیست دوای ئەوەی کە بوو بە دوو بەشەوەو بەشێکیان گەڕانەوە ناو ریزەکانی یەکێتی نیشتمانیو بەشەکەی تری مایەوەو دواتر چوونە لای پارتیو ئینجا لەوێش جیابوونەوە.وەکو حیزبێکی بچووك مایەوەو قاعیدەیەکی حیزبی فراوانی نەبوو، تەنانەت لە ڕووی پێشمەرگەو هێزی چەکداریشەوە. کە هەر لە سەرەتای درووست بوونیشیەوە هەر بەو جۆرە بووەو لە سەر سنوور ئیمپراتۆریەتێکی دەسەڵاتیان دامەزراند بوو، بگرە پەیوەندی گوماناویشیان بەملاو لاوە پەیدا کردبوو، دیسپلینی حیزبیو بەرنامەی سیاسیو پێشمەرگایەتییان توندو تۆڵو مکوم نەبوو. پەیوەندی خێڵەکی زۆرتر زاڵ بووە بەسەر کارەکانیدا، تەنانەت لەو کاتانەشدا کە لە یەکێتی جیا بوونەوەو خوالێخۆشبوو ڕەسوڵ مامەند سەرکردەی یەکەم بوو، سکرتێری ئێستا زۆر خۆی نە ئەدا بە دەستەوە. بەڵکو جۆرە سەربەخۆییەکی هەبوو. کەوایئەکرد خۆی حیزبێکی سەر بەخۆ بێتو هەر بەناو سۆسیالیست بێت. تا لە دوا جاردا ئەو هەلەی بۆ ڕەخسا،ومنەبێ ریزەکانی ئەم حیزبە بێگرفت بێت بەڵکو هەمیشە پڕ بووە لە ناکۆکی لە نێوان کادیرەکانیدا، ڕێگە نەئەدرا چاکسازی بکرێتو خەڵکی خراپو مشە خۆرو دزی لێ دوور بکەوێتەوە.

عەتا سەراویو کۆمەڵێکی تر لەو سەرکردانەی سۆسیالیست کە جیا بوونەوە بە دەمی ڕایانگەیاند کە ئەبنە یەکێتی. دواتر هەر بە ڕەسمی هاتنە ناو یەکێتییەوەو هەر یەکە لە شوێنێکدا کاریان پێدرا. بەم جیابوونەوەش قەبارەی سۆسیالیست ئەوەندەی تر بچووك بووەوە.

دیارە لە کوردستاندا ژمارە زۆر گرنگ بوو بۆ بوونی حیزب یان چۆنێتی ئەوەندە بایەخی نییە، بەڵکو سەرەوە گرنگە، باندێك یان کۆمەڵە خەڵکێك هەبن بتوانن کار بۆ خۆیان بکەنو پێگەیەکیش لە ناو خەڵکدا پەیدا بکەن، یان لە دەوروبەردا کە دەورو بەر زۆر پێویستیان بەم جۆرە هێزو لایەنو حیزبۆکانە هەیە بۆ جێبەجێکردنی نەخشەو بەرنامەکانی خۆی بۆ تێکدانو شێواندنیواقیعی خەباتو شۆڕشی کورد. کە زۆر جار حیزبوەکو

پێداویستییەکی خەباتی نەتەوایەتی نەهاتووەو لە دەرەوەی ئەو داخوازییەدا پەیدا بووە. کە ئەگەر دەست پێوە گرتنی دەرەکی نەبێت زۆر بە زوویی ئەپووکێتەوە. جاری‌وایش هەیە سەرکردە ڕۆڵی نێگەتیف ئەگێڕێ لە تێکوپێکدانی حیزب کە لە بارێکی ناسکدا خۆی پێڕاناگیرێ.

## وازهێنان لە خەباتی چەکداری

لەم مانگەدا عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە ناو زیندانەوە داوای لە چەکدارەکانی کرد لە سنووری تورکیا بچنە دەرەوەوواز لە خەباتی چەکداری بهێنن. بەڵام چەکەکانیان تەسلیم نەکەن. هەر ڕۆژێك دوای ئەم ڕاگەیاندنەی ئۆجەلان قسەکەرێکی‌وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا پشتگیری لەو بڕیارو داوایەی ئۆجەلان کرد. کە لە ناوەڕۆکدا بڕیارێکی بێ ناوەڕۆك بوو، کەسێك با سەرۆکی حیزبیش بێت کە لە لایەن دوژمنەوە گیرا ئیتر هیچ مافێکی نامێنی بۆ قسەو بڕیاردان. سەیریش لەوەدایە کە پەکەکە سەرەڕای ئەوە زۆر بە توندی پابەندی ئۆجەلانن.وەکو بڵێی ڕێککەوتوون لە ناو زیندانیشدا پابەندی بن با بە زیانی چارەنووسیش بێت هەر ئەخوات. ئەگینا ئەمە چی‌واتایەك ئەگەیەنێت کە پەکەکە لە سنووری تورکیا بچنە دەرەوە، ئەی خەبات لە کوێ بکەن..؟ ئەی کە چوونە دەرەوە بۆ چەکەکان تەسلیم نەکەن..؟

ئەمە هەندێ بۆچوونمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە کە گومان بکەین ئەرکی پەکەکە چی‌و چۆن ئەبێت..؟! ئەمەیە کارەساتی حیزب لە کوردستاندا، لە بەرامبەر پیلانەکاندا هێزی نەبێت، بەرنامەی لاواز بێت، یان زوو خۆی بداتە دەستەوە. کە جاری‌وایش هەیە سەرکردەی یەکەم ئەو ڕۆڵە ئەبینێت کە حیزب هەڵبوەشێتەوە یان ڕۆڵی هەبێت.

## خۆرگیران

ڕۆژی ٨/١١ کاتژمێر سیو پێنج دەقیقە، خۆر لە ئاسمانی سلێمانیدا گیرا، بۆ ماوەی دوو دەقیقە زیاتر دنیا تاریك بوو، من بۆ خۆم دوو ئەستێرەم بە چاوی خۆم بینی. ئالەم کاتانەدا کابرایەك لە نزیکی ماڵمانەوە، تفەنگێکی بەرەو ئاسمان تەقاند تاکو خۆر لەگیرانەکەی دەربازبێت. جاران خەڵك لە تەنەکەیان ئەداو هاواریان ئەکردوو ئەگریان. خۆر گیرانوەکو دیاردەیەکی سروشتی زۆر مەبەستی ئەفسانەیی پێوە ئالکاوە. کە لە نەزانیو کاڵفامی خەلکەوە سەرچاوە ئەگرێو بە هەڵە لێککدانەوەی ئەو دیاردەیە لەلایەن مەلا ئاینییەکانەوە. کە بە عەقڵیەتی سەدە کۆنەکان ڕێئەکەنو لە مەسەلەی زانستدا کۆڵنو فریان بە تێگەیشتنەوە نییە.

## خولی فەرماندەیی

ڕۆژی ٨/١٥ لە ڕێوڕەسمێکی تایبەتدا بە ئامادەبوونی هەڤاڵ مام جەلال، ئاهەنگی دەرچوونمان لە خولی فەرماندەیی گشتی بۆ کراو بڕوانامەمان لە لایەن هەڤاڵ مام جەلالەوە پێ بەخشرا کە لەڕۆژی ٧/٣١ دا تاقیکردنەوەکانمان دەستی پێکردو لە ڕۆژی ٨/٩ ئەنجامەکانمان وەرگرتەوە کە پلەکانی من بەم شێوە بوو:

- تەعبیئەو تەنزیم: ٦٨
- تەختیت: ٧٩
- تەحسین: ٥٣
- تەدریبو مەیدان: ٩٢

بە پلەی باش دەرچووم، ئەمە گۆڕانووەرچەرخانێکی تایبەتی بوو لە ژیانمدا، کە فێری تاقیکردنەوەو پلەو نمرەوەرگرتن ببم، کە لە ڕاستیدا کارێکی زەحمەتە بەڵام پێشمەرگایەتی سنووری موستەحیلی پێ بڕینو زۆر شتی بۆ

ژیان فێر کردین. کە ئەنجامەکانم وەرگرت، کەوتمە ئەندێشەی ڕۆژانی منالی کە چۆن لەو خۆشییەی خوێندن بێبەشبووم کە ئێستا لە کاتی وەرگرتنی ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەی قوتابخانەکان لە منالەکانی خۆم و هی تریشدا ئەبینم ئەوانەی سەرئەکەون گەشییەك دایان ئەگرێت. منیش هەمان هەلوێستم تووشبوو کە بە پلەی باش دەرچووم.

## سەفەری ئێران

دوای ئەمە سەردانێکی هەڤاڵ مام جەلالم کرد بۆ سەفەر کردن، مام جەلال نەخۆش بوو کانیۆلایەکی لە دەستدا بوو، نامەیەکی بۆ کاك بەهرۆز گلالی بۆ تاران بۆ نووسیم. ڕۆژی ٨/٢١ لە مەرزی باشماخەوە بەرەو مەریوان لەگەڵ کاك مەلا ئەحمەدی دسکەرەو کاك حەمەی حاجی مەحمودی هارونی پونگەلەو گەرمیانی کوڕم پەڕینەوە بۆ ئێران.

لە مەریوانەوە چووینە سنە، لە دەفتەری هەواپەیمایی ئێرانی پلیتمان بڕیو لە فرودگای سنە سواری فڕۆکە بووین و بە ٣٥ دەقیقە گەیشتینە فرودگای مهرئابادی تاران. لەو کاتەدا ٢ ماتۆڕ سوار بە توندی و خێرایی خۆیان کردە ناو خەلکەکەداو پەلاماری جانتای خەلکیان ئەدا، ئەمانە باندی دزی و جەردەیی و دەستبڕینن لە زۆر شوێندا هەن، کە کارێکی ناشارستانییەو هەموو کارەکەیان بۆ بێهێزی دەسەلات یان دەست تێکەل کردن لەگەل کار بەدەستاندا ئەگەڕێتەوە. ئەمەش پەیوەندی بە پشێوی نائارامی بارو دۆخەکەوە هەیە.

لە فرودگاوە چووینە ئوتێلی فیردەوسی گەورە لە مەیدانی فیردەوسی، چەند ڕۆژێك لە تاران ماینەوە، بە هەلمان زانی کە زۆر شوێن و جێگا بگەڕێین. چووینە (باغ وحش ) لە سەرووی تاران جێگایەکە ئەلێی بەهەشتە، هەوایەکی زۆر فێنك و دارو درەختێکی جوان و ڕازاوەی هەیە، بە سەر هەموو شاری تاراندا ئەڕوانیێ و لە بەردەم شاخی شەمیراناتدا.



ئێوارەی ڕۆژی ٨/٢٣ لای کاك بەهرۆز گلاڵی نانمان خوارد، لە پارکی نوێ کە هەمان خۆشی پارکی (باغ‌وحشی) هەبوو. بۆ سبەینێ چووینە کۆمەڵێك کۆگای شت فرۆشتن، ئینجا چووینە چێشتخانەیەکی دلگیرو ڕازاوە بە کەلو پەلی فۆلکلۆری ئێرانی کە دیمەنێکی ئەفسووناوی پێئەبەخشین.

ڕۆژی ٨/٢٥ بوو هەڤاڵ مام جەلال لە پەروێزخانەوە گەیشتە ئێران‌وپاش نیوەڕۆکەی گەیشتە تاران‌و من‌و کاك عوسمانی حاجی مەحمودو مەلا ئەحمەدی دسکەرەو کاك محەممەدی حاجی مەحمود لە ئوتێل ئیستقلال پێشوازیمان لێکرد.

ڕۆژی دواتر میوانی کاك ئەحمەد غەفەر بووین لە ڕێستیورانتی نائب، پاش نیوەڕۆکەی چووینە سەردانی هەڤاڵ مام جەلال لە ئوتێل ئیستقلال پاش ئەوەی لای پزیشکی پسپۆڕ خۆی فەحس کردبوو، تەندرووستی زۆر باش بوو. ئێوارەی هەمان ڕۆژ میوانی کاك ئەحمەد بووین لە ئوتێل ئازاد لە قاتی ٣٦ کە هەموو تارانی لێوە دیاربوو، جێی‌وەبیر هێنانەوەیە درێژی تاران ٧٠ کم‌و پانیەکەشی ٤٥ کیلۆمەترە. جگە لەوەی کە شارێکی گەورەیە زۆر خۆشیشە دیمەنی جیا جیای تێدایە، خوارووی تاران ناوچە هەژارەکەیە، ژووروشی ناوچەی دەوڵەمەندەکانە، کە لە هەمان کاتدا شوێنی گەشتوگوزارو کات ڕابواردنە. بۆ سەردانی ئەم شوێنانە میوانی ئاغای ئەمیری‌و حاجی حەسەن‌و ئاغای مهندس بووین کە بازرگانی تاران بوون، لەگەڵ کاك نەجاتی عومەر ئاغای سوورچیدا بردینیان بۆ دەربەندی شەمیران‌و ئێوارەکەشی لە ڕیستیوران (بام تهران) لە قەد چیای شەمیرانات هەر میوانی ئەوان بووین، بە ڕاستی دنیایەکی ترە، ئاوو هەوایەکی فێنك، دیمەنی قەشەنگ‌و دلڕفێن، هەست ئەکەی لە ژیانێکی تردای.

دوای بەسەر بردنی چەند ڕۆژێك لە تاران، ڕۆژی ٨/٢٨ بە ئۆتۆمبێل بەرەو سنە گەڕاینەوە، لە شاری ساوە لە دووری ١٣٠ کم لە تاران ئۆتۆمبیلەکەمان شکاو بە پەیکانێك چووینە سنەو لەوێشەوە بەرەو سنوورو گەیشتینەوە سلێمانی.

## لیژنەی لێکۆڵینەوە

چەند ڕۆژێکی نەبرد هەڤاڵ مام جەلال بڕیارێکی دەرکرد بەم شێوەیە:

} بڕیارمـــان دا کۆمیتەیـــەك پێـــك بێـــت بـــۆ لێکۆڵینـــەوەو ڕاستکردنەوەیوەزعی گەرمیان، بە تایبەتی لە ڕووی زەویو زارو لاساریو لادان لە قانوونو داگیرکردنی خانووی خەڵكو ...هتد. لەم هەڤالانەی لای خوارەوە:

| | |
|---|---|
| ١. هەڤال شەوکەتی حاجی مشیر | سەرۆك |
| ٢. هەڤاڵ عەدنانی حەمەی مینا | ئەندام |
| ٣. هەڤاڵ عەلی شامار | ئەندام |
| ٤.هەڤاڵ مەحمود سەنگاوی | ئەندام |
| ٥.مامۆستا حەسەن جیهاد | ئەندام |

پێویستە لە سەر هەموو فەرماندەو لێپرسراوانی پێشمەرگەو میری هاوکارییان بنو بڕیارەکانیان جێبەجێ بکەن.

بۆ پێشەوە ڕووەو سەرکەوتن.

**برای دڵسۆزتان**

**مام جەلال**

١٩٩٩/٩/١٢

ئێمە یەکسەر کۆبووینـەوەو سـەردانێکی سـنوورەکانی کـەلارو کفـریو خانـەقینمان کـردو لەگـەڵ زۆر لـە هەڤاڵانـدا دانیشـتینو داوامـان لێکـردن هـەر یەکەو ڕاپۆرتی خـۆی بـۆ لێکۆڵینـەوە بنووسـێو مەبەسـتەکان بـەووردی ڕوون

بكاتەوە، تاكو بەر چاومان ڕوون بێت بۆ گەیشتنە ئەنجامو بڕیار لێدان. بە ڕای من ئەو كێشەیەی كە ڕوویدا لە ئەنجامی نەشارەزاییو تێنەگەیشتن لە ناوەڕۆكی كێشەكانو بڕیاردانی سەرپێیو هەندێ جاریش هەڵەشەیی بووە، كە ئەكرا بە نەرمیو ژیرانە كۆسپەكان دەستنیشان بكرێو ڕێگە لە سەرپێچیكەران بگیرێو دۆخە گرژەكان ئاسایی بكرێتەوەو نەگاتە ئاستی تەقینەوە، كە كەسێكی تیا بكوژرێو ئۆتۆمبیلی ئاسایش بسووتێنرێ. كە دواتر باجەكەی دراو بە شێوازی عەشایەری كوشتنی كابرا چارەسەر كراو كرایە شەهیدیش.

زۆریشی نەبرد كەسو كاری ئەم كابرایە بە فیتی دەزگا جاسوسیەكانی ڕژێم دەستیان لە پێشمەرگەی دێرین حەمە تارانیوەشاند كەوەكو پۆلیس لەو كارەدا بەشدار بوو. دوای شەهید كردنی حەمە تارانی بكوژەكانی خۆیان گەیاندە لای ڕژێم.

## هەڵبژاردنی مەڵبەندی پێشمەرگە

هەر لەم ڕۆژانەدا بوو كە هەڵبژاردنی مەڵبەندی پێشمەرگە كرا، هەڤاڵ مام جەلالووتارێكی باشی خوێندەوە، كاك كۆسرەتیش قسەی خۆی كرد. ئینجا پرۆسەی هەڵبژاردن دەستی پێكرد بۆ دەستنیشانكردنی دوو جێگر مەڵبەندو كارگێرەكان. لە ئەنجام داوەستا ڕەسوول دەنگی یەكەمو ئارێز عەبدوللا دەنگی دووەمی هێنا بۆ جێگری مەڵبەند، ئەمە شێوازێكی دیموكراسیانەیە، كە لە ناو هێزی پێشمەرگەدا هەڵبژاردن بكرێ بۆ دەستنیشانكردنی نوێنەرانی ڕێكخستنو بەڕێوەبردنی كارو بارەكانو پێشخستنی ئاستی فیكریو پێگەیاندنی پێشمەرگەو پەروەردەكردنیوەكو مرۆڤێكی سیاسی بۆ ئایندەی كورد. چونكە پێشمەرگەش ئەندامی حیزبنووەك چۆن لە بواری كاری سەربازیدا بەشداری

بەرچاو ئەکەن، گیان فیدایی ئەنوێنن، ئەگەرێ لە مەیدانی سیاسیشدا هەڵوێستیان هەبێو توانای خۆیان دەربخەنو پیاویووشیارو هەڵکەوتوویان لێ پەیدا ببێت.

هەر لە سەرەتای بەر پابوونی شۆڕشی نوێوە، بایەخی تەواو بە لایەنیووشیاری پێشمەرگە داوە، لە ڕێگەی دانانی ڕابەر سیاسیو لێپرسراوی ڕێکخستنو کۆبوونەوەی چڕو پڕو دەرکردنی بڵاو کراوەو دابەزاندنی ڕێنوێنیو پەخشکردنی بەرنامەی ئیزگەییو ڕۆژنامەیی. بۆ ئەم ڕۆژگارەشوەکو ئەرکێکی پێویست گرنگی بە کاری پێشمەرگایەتی ئەدرێ بۆ ساز دانیان نەك هەر بۆکاری شەڕو بەرگری، بەڵکو بۆ بنیاتنانەوەی کوردستانو سەقامگیرکردنی ئاشتیو پاراستنی دەستکەوتەکان. بۆ ئەمەش ئەبێت لێپرسراوو نوێنەرەکانیان لە ئاستێکی بەرزی تێگەیشتنو پلەیەکی باشی پێگەیاندندا بن، تاکو هێزیکی مۆدێرنی هاوچەرخ ئامادە بکرێ بۆ ڕاژەکردنی بەرژەوەندی دواڕۆژی کوردو کوردستان.

## کۆبوونەوەی ئۆپۆسزیۆن

ڕۆژی ٩/١٧ هەڤاڵ مام جەلال بەرەو تاران کەوتەڕێ بۆ بەشداری کردن لە کۆبوونەوەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لەواشنتۆن، کە بە چاودێری ئیدارەی ئەمریکا ئەنجام ئەدرا. ئەم کۆبوونەوەیە گرنگی مێژوویی خۆی هەیە کە کورد ڕۆڵێکی دیارو بەرجەستەی هەیە، چونکە لە نزیکەوە چاویان بە گەورە بەرپرسانی ئەمریکا ئەکەوێت. سەرکردەکانی کوردیش بە ڕاشکاویووردی مەسەلەی کوردو پەیوەندی بە دواڕۆژی عێراقەوە ئەخەنە ڕوو، هەروەها ئاماژە بەو گرفتو کۆسپانە ئەکەن کە کورد پێوەی ئەناڵێنێ، هەر لەم پێو دانگەوە بوو هەڤاڵ مام جەلال لەم گەشتەیدا چاوی بە مادڵین ئۆڵبرایتیوەزیری دەرەوەی ئەمریکا کەوتو لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی عێراقیشدا دانیشتن.

هەڤاڵ مام جەلال لەم کۆبوونەوەیەدا داوای یارمەتی نێو دەوڵەتیو بە دەنگەوەهاتنی دەوڵەتانی دنیای کرد، دژی تەعریبو پاکتاوکردنی ڕەگەزی گەلی کورد.

## مناڵەکان.. بۆ هەندەران

دەمێك بوو ئەمویست مناڵەکانم بەرەو هەندەران بەڕێ بکەم، لەو هاتو چۆ کردنانەمدا بۆ ئێران ڕێگەم خۆش کردبوو بۆ ئەم مەبەستەو لە ڕێگەی هەندێ دۆستو ناسیاوەمەوە لە ئێراندا بەرنامەکەم سەریگرتو لە ڕێگەی پەیوەندییەکانی یەکێتییەوە لە سلێمانی هەماهەنگی کرا بۆ گواستنەوەی مناڵەکانو ڕۆژی ٩/٢٦ ئاگادار کرامەوە کە بۆ سبەینێ لە پەروێزخانەوە ئامادەبین بۆ پەڕینەوە.

ڕۆژی ٩/٢٧ لە مەرزی پەروێزخانەوە چووینە قەسری شیرین و دواتر کرماشانو لەوێشەوە کاتژمێر ٧ ی ئێوارە بە ئۆتۆمبێل بەرەو تاران بە ڕێکەوتین. لە زاڵگەی نزیك هەمەدان گرتینیان، ئیهانەیەکی زۆریان کردین، تەنانەت هەموو جلی مناڵەکانیان تێکدا، دیاربوو پێشوەخت ئیخباری کرابووین، چونکە تەنیا دوو ئۆتۆمبیلەکەی ئێمەیان ڕاگرت. کە چووینە تاران لە ئوتێل ئەتلەس لاماندا‌و پاشان گواستمانەوە ئوتێل فەردیس.

ڕۆژی ٩/٢٩ چوومە ماڵی ئەبو ئەزهارو بڕی ١١ هەزارو حەوسەدو پەنجا دۆلارم پێدا بۆ ڕەوانە کردنی مناڵەکانم لە تارانەوە بۆ سوید. کە پارەیەکی زۆر بوو، بەڵام ڕەوانە کردنەکە مسۆگەر بوو، گرتنی تیا نەبوو، مەگەر یەکێك نەشارەزاو بێئاگا بێت، ئەگەرچی ئەمە خۆی موجازەفەیە.

ڕۆژی ١٠/٦ کاتژمێر ٣ی عەسر لە فرودگای میهرئابادەوە مناڵەکانم سواری فڕۆکە بوون بەرەو سوید. کە مناڵەکان خواحافیزییان کرد ساتێکی خەماوی بوو، دڵم گوشرا، کە گەڕامەوە ئوتێلو چوومە ژووری مناڵەکان کەسی لێنەبوو. چۆڵوهۆڵ بوو، زۆر بێتاقەت بوومو تووشی تەنیایی‌ەکی

سەیر بوومو گریانێکی بە کوڵ سەری لێدام. دابڕان لە ماڵو منداڵ زۆر ناخۆشە،وەنەبێ ئەمە یەکەم دوور کەوتنەوەو دابڕانم بێت، بەڵکو چەندین جاری تر لێیان دوور کەوتوومەوتەوەو بیرم کردوون، بەڵام هیچیان بە ئەندازەی ئەم جارە کەفوکوڵی لا نەووروژاندووم.

دوای ماوەیەکوە سەر خۆهاتمەوەو ئاسوودەییەکم پیا هاتەوە، کە ئەوان ئەچنەووڵاتێکی خۆشو پێشکەوتوو ئارامی ئەم دنیایە، هەر هیچ نەبێت پاشەڕۆژێك بۆ خۆیان فەراهەم ئەکەن، زمانو زانستو شارەزاییەکوەدەست ئەهێنن کە سوودی بۆ گەلەکەمان هەبێت. ڕۆژی دواتر گەڕامەوە کرماشانو لەگەڵ عوسمانی برامدا قسەم کردو هەواڵی منداڵەکانم زانی کە گەیشتوونەوتە شوێنی مەبەست.

ڕۆژی ١٠/٨ گەڕامەوە قەسری شیرینو بۆ ئێوارەکەی گەیشتمەوە سلێمانی. ڕۆژی ١٠/١٣ هەڤاڵ مام جەلال لە گەشتەکەی ئەمریکای گەڕایەوە بۆ کوردستان. ڕۆژی ١٠/٢٠ لەگەل هەڤاڵ مام جەلالو کاك جەبارفەرمانو کاك شەوکەتی حاجی مشیردا لە ناڵپارێز سەردانی هێزی مستەفای لەشکری بەدرمان کرد. جێگری فەرماندەی گشتی هێزەکانی بەدر حاجی مەهدیو حوجەتی ئیسلام بەدری لێپرسراوی نووسینگەی لەشکری بەدر، لە سەردانەکەماندا وەسفێکی هەڤاڵ مام جەلالیان کردو مامیش ووتەیەکی گرنگی پێشکەشکرد.

# کۆبوونەوەی فەرماندەیی گشتی

هەڤاڵ مام جەلال هەرجارێك چووبێتە گەشتێکی دەرەوەی کوردستانو گەڕابێتەوە کۆبوونەوەی لە بارەی ئەو گەشتەو کارەکانی پێکردووین، ئەوەی کە پێویست بێو پەیوەندی بە ئێمەوە هەبێتوەکو فەرماندەیی گشتی.

بۆیە لە ڕۆژی ١٠/٢٥ لە بارەگای فەرماندەیی گشتی بە سەرپەرشتی هەڤاڵ مام جەلالو ئامادە بوونی کاك جەبارفەرمان جێگری فەرماندەییو کاك فەرەیدوون عەبدولقادر لێپرسراوی مەڵبەندی پێشمەرگەو هەموو کارگێڕەکانی فەرماندەیی گشتی، کۆبوونەوەی فەرماندەیی گشتی ئەنجامدرا.

هەڤاڵ مام جەلال باسی گەشتەکەی بۆ ئەمریکا کرد، کەوا ئەمریکیەکان دەرك بە هەموو کێشەکانی کوردستان ئەکەن، ئاگادارن کەوا ئێمەوەکو ئۆپۆزسیۆن پێشەنگی هێزەکانی سەر ساحەی کوردستانین، دەرك بەوە ئەکەن ئێمە ئاشتیمان ئەوێو پارتیش خۆی لێئەدزێتەوە.

ئەمریکا نامەیەکی بۆ یەکێتی ناردووە کە هەڤاڵ مام جەلالوەکو سەرۆکی ئۆپۆزسیۆن کاربکاتو بەڵام یەکێتی قایل نەبووەو داوایان کردووە هێزەکانی ئۆپۆزسیۆن بێتە ناوچەکانی یەکێتی، لەوەڵامدا پێیانووتوون ئەگەر ئێوە لە کاتی پەلاماری عێراقدا لە ئاسمانو زەوییەوە پشتیوانیمان لێبکەن ئامادەین.

لەبارەی حوکمی فیدراڵییەوە ئەمریکیەکان بە نامە دووپاتیان کردووەتەوە، بەشێك لە ئەمریکیەکان ئەڵێن ئێمە سیاسەتی تایبەتی خۆمان لە

سەر کێشەی کورد هەیەو سەرۆکی ئەمریکا ئەڵێ: کورد ئەگەر بتوانێ حوکمی خۆی بکاتو لە ناویەکدا بە شەڕ نەیەن هەقوایە دەوڵەت بن. لە سەر کێشەی پەکەکە ئەمریکیەکان ئەڵێن ئۆجەلان پیاوێکی بێ هەڵوێستو ترسنۆکەو هەموو کێشەکەی کردە قوربانی خۆی، لەو دادگایەدا ئەیتوانی خۆی بکاتە ماندیلای کورد. هەروەها ئەمریکیەکان لە سەروەزعی کورد لە ئێراندا پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵەو دیموکراتو هەندێ کەسایەتی کوردا بکەن. ئەمریکیەکان هەندێ بەڵێنیان پێداوین لە رووی هاوکاریکردن بە چەکی دژە تانكو دژە فرۆکەو جیهاز. ئەمەش لە خۆیدا هەنگاوێکی باشە لە جۆری پەیوەندیو هەڵوێستی سیاسی نوێ کە گۆڕانێکی جیدی نیشان ئەدا لە لایەن ئەمریکاوە بەرامبەر بە کورد، کە دەمێك چاوەڕوانی هەلێکیوابووین لەو بێدەنگییە دەربازمان بکاتو لامان لێبکرێتەوەو چیتر تەنیاییو پیلانە ئیقلیمیەکان نەمان خۆن.

## هەڕەشەی عێراق

هەموو جارێك کە گۆڕانێك لەگۆڕەپانەکەدا دێتە پێشەوەو لە دەرەوە باسێکی کورد ئەکرێ. رژێمی عێراق ئەکەوێتە هەڕەشەو گورەشە کردنو هێز کۆکردنەوە لە سەر سنوورەکان، بە مەبەستی هێرشو پەلاماردانەوەی کوردستان، ئەمەش گەرچی لە توانیادا نەبێ بەڵام رەنگدانەوەی نێگەتیفی لە سەر دڵو دەروونی خەڵك هەیەو ئارامی دۆخەکە ئەشێوێنێو ترسیان لێئەنیشێ. ئەو کۆبوونەوانەی ئۆپۆزسیۆن لەواشنتۆنو هەڕەشەکانی ئەمریکا بۆ سەر عێراقوایکرد عێراق هێزێکی زۆر کۆبکاتەوە.

لە بەرامبەر دا رۆژی ١١/١٤ فەرماندەیی گشتی بە سەر پەرشتی کاك جەبارفەرمان کۆبوونەوەیەك سازکرا، باسی هەلومەرجی نوێو پەیوەندیەکانمان لەگەڵ دنیادا بەتایبەتی لەگەڵ تورك بەرەو باشی ئەچوو، بۆ

عێراقیش بڕیاردرا لە باری ئامادە باشیدا بین‌و غافلگیر نەبین‌و چاوەڕوانی هەموو ئەرکێك بین‌و بڕیاریش درا هێزەکانمان بەم شێوەیە لە شوێنەکاندا دابەشبکرێن:

ـ فەرماندەیی کەرکوك: سنووری دەربەندی بازیان تاکو چەمچەماڵی پێسپێردرا. لە سەر شاخی دەربەندی بازیان پێنج تیپ دابمەزرێت، بیست بیکەیسی‌و شەش دۆشکای ١٤٫٥ ملم بۆ هەردوو بەرەی دەربەندی بازیان، جادەکەی قوڵەڕەش بۆ سەر شاخ چاك بکریٚ بۆ هاتوچۆی ئۆتۆمبیل بەرەو پشتی تەوەکەڵ

ـ فەرماندەیی بابە گوڕگوڕ: لە سەر ڕێگەی تەقتەق بەرەو ئاغجەلەر دائەمەزرێن.

ـ فەرماندەیی سلێمانی: لە تاسلووجەو سەر شاخی سەگرمە ئەبن.

ـ فەرماندەیی سەگرمە: لە گەڕاوی سەرووی قادر کەرەم تاکو سەنگاو دائەمەزرێن، ئەگەر هێرشیان بۆ کرا لە گەڕاوی نەتوانرا شەڕ بکریٚ ئەوا لە شاخی زەنووری نزیکی ئاوە بۆرەکە تاکو سەنگاو شەڕ ئەکەن، لە گردە مەنیلەش بەرەیەکی تر درووست ئەکەن.

ـ فەرماندەیی گەرمیان: ئەم سنوورە فراوانەو سیٚ قۆڵ ئەگرێتەوە:

کفری ـ ناو داودە

کەلار ـ سمود

بنکورە ـ قۆرەتوو

لە هەموو ئەو شوێنانە دائەمەزرێن‌و فەرماندەیی شارەزووریش لە نزیك باوەنوورو دەربەندیخان پێشتیوانیان ئەکەن. بەم بۆنەیەوە هەموو هێزەکانمان کەوتنە ئینزارەوەو هەموویان لە شوێنە دیاریکراوەکاندا جێگربوون، ئەگەر چی بۆچوونێکیش هەبوو کە ئەم کارانەی ڕژێمی عێراق بۆ ماندوکردن‌وئاڵۆزی درووستکردن‌و بیٚوورە کردنی پێشمەرگە بوو. بەشێك بوو لە شێوازی جەنگی دەروونی، ئەگینا بە فیعلی هێرش ناکات. بەڵام ئێمە خۆمان

ئامادە ئەکردو پێشمەرگەمان ڕائەهێنا بۆ ئەوەی سارد نەبنەوەو فێڵەکانی دوژمنمان بە سەرا تێنەپەڕێو خەڵکیشمان دڵنیا ئەکردە لە هەر ئەگەرێکی چاوەڕوان نەکراو.

بۆ زیاتر دڵنیا بوونیش ڕۆژی ١١/١٥ لەگەڵ کاك جەبار فەرمانو لیوا نەوشیروان فوئاد مەستیو لیوا خلیل دۆسکیو کاك دلێری سەید مەجید سەردانێکی قوڵی سەنگاومان کردو شوێنی دامەزرانی پێشمەرگەکانمان بینیو ڕێنوێنی تایبەتیمان کردو لەگەڵ فەرماندەو لێپرسراوەکانیان کۆبوونەوەمان کرد.

هەروەها ڕۆژی دواتر لەگەڵ کاك جەبار فەرمانو لیوا نەوشیروانو کاك شەکەوتی حاجی مشیر چووینە سنووری گەرمیانو بەرەکانی ئەوناوەمان بەسەر کردەوەو لە چۆنێتی جێبەجێکردنی کاروبارەکانو دابەشبوونی هێزەکانو پێداویستییەکانیان قسەمان لەگەڵ لێپرسراوەکانیاندا کردو لە گەڕانەوەشماندا سەردانی هێزەکانی فەرماندەیی شارەزوورمان لە قەترەو دەوروبەری دەربەندیخان کردو لەگەڵیاندا باسی هەموو ئەگەرەکانی بارودۆخەکەمان کرد. ئێمە بۆ هەموو ئەگەرەکان ڕێوشوێنی باشمان دانابوو، لە هەر بارێکدا بێت خۆمان ئامادەو تەیار کردبوو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنو بەرپەرچدانەوەی هەر کردارێك بەو تواناو کەرەستە کەمانەی هەمان بوو. چونکە باوەڕمان بە هێزی لە بن نەهاتووی شۆڕشگێڕانەی خۆمان هەبوو کە ئەو دوژمنە داگیرکەرە ڕەت بکەینەوە، نەهێڵین سنوورمان ببەزێنێ. پێشمەرگەو فەرماندەکانیشمان بەو پەڕی دڵگەرمییەوە خۆیان ساز ئەدا بۆ هەر کارێکی پەلاماردەرانەی ڕژێم. چونکە بڕوایەکی پتەوو بەتینمان بە شەڕی داگیرکەر هەبوو کە هەمیشە مەترسی لەناو بردنی کوردی لە بەرنامەی شەڕخوازانەیدا داڕشتبوو. دوژمنەکانی کورد بۆ ساتێکیش دانانیشنو بێدەنگ نابنو هەردەم لە پیلان داڕشتن دان دژی چارەنووسی کورد لە هەر بەشێکی کوردستاندا بێت.

# فەرمانی لە سێدارەدانی ئۆجەلان

ئـەوەتا دادگـای ئاسایشـی تورکیـا ڕۆژی ١١/٢٥ جـارێکی تـر حـوکمی لـە سـێدارەدانی بەسـەر ئۆجەلانـدا تـازەکردەوە. لای ڕژێمـی تـورکی گـەر چـی ئـەو خەڵکانەی لە سەر سیاسـەتو کـاری حیزبـی قەدەغـەکراو ئـەگیرێنو لـە دادگـادا بڕیـاری لـە سـێدارەدانیان ئـەدرێ ئەمـەوەکو یاسایەکی چەسپاو هەیـە بـەڵام دەمێکـە جێبـەجێناکرێ. چـونکە تورکیـا گوشـارێکی زۆری لەسـەرە لـەڕووی پێشێلکردنی مافی مرۆڤە. ئەوروپاییەکانیش کۆمەڵێك مـەرجیان لەسـەر دانـاوە بۆ ئەوەی لە خانەی ئەوروپیداوەربگیرێ، ئەبێ ئەو مەرجانە دابـین بکـات تـاکو لەو خانەیەدا خۆی ببینێتەوەو باری ئابوری لاوازو تێکچووی چاك بکاتـەوە کـە زۆربەی بوودجەکەی بۆ کاری عەسکەرتاریو چەکسازیو بەرنامەو نەخشەکاری بـۆ تواندنـەوەی کـوردو لـە نـاوبردنی جوڵانەوەکـەی خـەرج ئـەکات. ئەمـەش بارگرانیـەکی ئـابووری بـۆ درووسـتکردووە. هـەموو ئەمانـەش لـە تێڕوانینـی شۆڤێنیانەی تورانیزمەوە سەرچاوە ئـەگرێ کـە بـڕوای بـە بـوونی نەتـەوەی تـر نییـەو تـەنیا بـوونی خۆیوەکـو نەتـەوەی بـاڵا ئەبینێتـەوە. بۆیـە قەدەغەیـە کەسـێك باسـی مەسـەلەی نەتەوایـەتی بکـات لـە چوارچـێوی حیزبێـك یـان شۆڕشـێکدا. زیندانـەکانی تورکیـا بەڵگـەی زینـدووی ئـەو ڕاسـتیەن کـە ڕژێمـی تورکیای کۆنەپەرست چ جۆرە سیاسـەتێکی ڕەگەزپەرسـتانە بەرامبـەر بـە کـورد پەیڕەو ئەکات.

بۆیە لەم ڕوانگەیەوە زۆر دوورە ئەو بڕیاری لـە سـێدارەدانە بـە کـردەوە جێبەجێ بکرێ. نەك لەبەر ئەوەی گوشاری زۆری لە سەرە لە لایـەن ڕای گشـتی ئەوروپاوە، بەڵکووەکو هەڵوێستو هـەنگاوێك بـۆ پووکانـەوەی ئۆجـەلان خـۆیو حیزبەکەیشـی. هـەر لـە زینـدان ئەیهێڵێتـەوەو تلپـی تـەڕی تێـدا نـاهێڵێو بەردەوامیش یاری پێئەکاتو داخوازییەکانی بە سەردا ئەسەپێنێ بـۆ کارکردنـە

سەر حیزبەکەی‌و ئەندام‌و لایەنگرەکانی تاکو بەرەکانی شەڕ چۆڵ بکەن‌و دەست لە خەبات هەڵبگرن‌و تورکیا لە مەترسی کورد ڕزگاری بێت.

سەیرە ئۆجەلان‌وەکو سەرکردەیەکی شۆڕشگێڕ خۆی بە دنیا ناساند، بەڵام تاقە یەك کاتژمێر لە شاخەکانی کوردستاندا شۆڕشی نەگێڕاوە، بەڵکو لە پەناووڵاتێکی تردابە نامەو تەلەفۆن بەرنامەی داناوەو بڕیاری داوەو خەڵکەکەی ئاراستە کردووە. کە لەووڵاتەشدا ئازاد نەبووە، بەڵکو جۆرێك دەستبەسەر بووەو هەواڵگری ئەووڵاتە ئاگای لە هەموو جموجووڵەکانی بووەو بێئەوان نەتوانراوە هەندێك کار بکرێ. هەر شۆڕش‌و جووڵانەوەیەکیش سەربەخۆیی کارو بڕیاری خۆی لە دەستبدات بە ئیفلیجی ئەمێنێتەوەو ناگاتە دوا قۆناغی مەبەستەکانی خۆی، یان زۆر بە ئاسانی ئەبێتە پارووەیەکی چەوری پیلانە نەگریسەکانی دوژمن.

بە داخەوە زۆر سەرکردەی کورد کە ئەو شەرەفی سەرکردایەتیەیان پێئەبەخشرێ لە بواری خەبات کردندا،ووریایانە ناچنە ناو چوارچێوەی هاوکێشە سیاسیەکانەوەو بە قووڵی لێکۆڵینەوە لە هەلومەرجەکان ناکەن،واقیعەکان ناخوێننەوە، لە دووژمن‌و نیازەکانی بە باشی ناگەن، زۆر جار بێ لێکدانەوە یان بە ناچاری سواری ئەسپی هەناسە سواری بۆچوونە ناکامڵەکانی خۆیان ئەبن‌و لەو سەرەوە بە گلاوی‌و سەرو پووتەلاك تۆزاوییەوە ئەگەڕێنەوەو کوردیش دوای ئەو هەموو گیانبازییە هەناسە ساردو خاکە سار.

## مردنی سەرۆکی تیرەی تەرخانی

ڕۆژی ١٢/٨ تەلەفونیان بۆ کردم کە حاجی ڕەفعەتی تەرخانی لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووەو تەرمەکەی لە مزگەوتی عەبدوڵڵا لوتفییە، بە پەلە چوومە ئەوێ‌و دوای کۆبوونەوەی خزمان‌و دۆستان تەرمەکەیمان بەرەو کەلارو دوا ئارامگاکەی بەڕێکرد. ڕۆژی ١٢/٩ لەگەڵ کاك جەبار فەرمان‌و کاك

عومەری سەید عەلیو کاك عەدنانی حەمەی میناو م. عەلی بەرەو کەلار بەرێکەوتین بۆ بەشداری کردن لە پرسەکەیدا.

حاجی ڕەفعەت سەرۆکی تیرەی تەرخانی کە یەکێکە لە تیرەکانی جافی مورادی. پیاوێکی خانەدانو بە دەسەڵاتو خاوەن ڕێز بووە لە ناو تیرەکەی خۆیو هۆزەکانی تریشدا. تەنانەت دۆستێکی نزیکی هەڤاڵ مام جەلال بووەو بە چاوی ڕێزەوە تێی ڕوانیوەو پێشوازی لێکردووە. پیاوێکی بە هەڵوێست بووە، گەرچی نەخوێنەوار بووە، خراپەی نەبووە، دژی گەلەکەی نەوەستاوە، لە زەمانی ئەنفالدا بەر ئەو شاڵاوە نامرۆڤانەیەی ڕژێمی بەعس ئەکەوێ.دوای ماوەی چەند مانگێك لە بەر تەمەن گەورەیی لەگەڵ ژمارەیەك خەڵکی تردا ئازاد ئەکرێو ئەگەڕێتەوە کەلار بەڵام بەشێکی زۆری خێزانەکەی لەو بیابانەدا نایەنەوەو هەتا هەتایە بێ سەرو شوێن ئەبن. حاجی ڕەفعەت لە نوگرە سەلمان زۆر یارمەتی ئەو خەڵکە هەژارو ڕەشوڕووتو کەم دەرامەتە ئەدات، کە هیچیان پێنابێ ئەم بە پارەی خۆی شتیان بۆ دابین ئەکات.

هەر ئەم ڕۆژە پاش کۆبوونەوەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقو بەشداری لە کۆنگرەی سۆسیال دیموکرات، هەڤاڵ مام جەلال بێئەوەی کەس ئاگاداربکاتەوە لە دەرەوە گەڕایەوە خاکی نیشتمان.

## گرفتەکانی پەکەکە

ئا لەم کاتانەدا ئێمە لەگەڵ پەکەکەدا نێوانمان خۆشنەبوو، ئەوان لەو بناری قەندیلەوە هەڕەشەیان لێئەکردینو گرفتیان بۆ ئەنایەوەو کوردستانی باشووریان کردبووە مەیدانی کارو چالاکیان، لە بری ئەوەی لە کوردستانی تورکیا جموجوولیان هەبێو دامودەزگاکانی ڕژێمی تورکیای کەمالی بۆ چالاکییەکانیان دەستنیشان بکەن، کەچی بە فیتی دەوروبەر پەکەکە ئێمە بە دوژمن ئەزانێو ئەزموونی دیموکراتیو حکومەتی هەرێمی کوردستانیان پێ هەرس ناکرێ بە توندی دژایەتی ئەکەنو بە دەستکردی ئیمپریالیزمی

دائەنەن،وەنەبێ ئەمانە لە سنووری تورکیاوە هاتبن‌و لەم دەڤەرەی ئێمەدا جێ پێی خۆیان بکەنەوە، بەڵکو لە بەشەکانی تری کوردستانەوە هەوادا‌ریان پەیدا کردوەو هاتوونەتە ریزەکانیانەوە، بگرە بەشێکی زۆر سووری‌و ئێرانیەکان بە فیتی دامودەزگاکانی ئەوووڵاتانە پەیوەندییان پێوە کردوون، نەك هەر ئەمە بەڵکو خەڵکی غەیری کوردیشیان لەگەڵدایە. کە ئەمەش دیارە بۆ چی..؟! بۆ زیاتر پشێوی نانەوە بە دزە هێز ئەنێرنە هەندێ ناوچە کە ئەبێت رێگە نەدرێن‌و کلك‌و گوێ بکرێن.

چەمی رێزان ناوچەیەکی سەخت‌و دژوارە، ئەوان مەفرەزەیان بۆ ناردبوو، تا لەوێوە ئاڵۆزی بنێنەوە، بۆ بەر پەرچدانەوەیان هەڤاڵ مام جەلال ئاگاداری کردمەوە کە هێزێك پێکبهێنین‌و کیومالی ئەو ناوچەیەی چەمی رێزان بکەین‌و نامەیەکیشی بۆ کاك لەتیفی حاجی فەرەج‌و کاك فاتیح حەمە رەش نووسیبوو:

هەڤاڵ لەتیف حاجی فەرەج بەرێز

هەڤاڵ فاتیح حەمە رەش بەریز

سلاوێکی گەرم.

هەموو لەشکرە تایبەتەکانتان لەگەڵ خۆتان‌و کاك مەحمود سەنگاوی ئەبەنە سەر ناوچەی چەمی رێزان بۆ ئەوەی ئەو چەکدارانەی پەکەکە کە دزەیان کردووە ناچار بکەن بگەڕێنەوە بۆ قەندیل یان چەکیان بکەن‌و خۆتان بیان نێرنەوە بۆ ئەوێ. پێویستەوەك بە کاك مەحمودیشم گوتووە کە ئەکرێ بە خۆشی‌و بە ئاشتی ئەو کارە بکەن.

هەر بژین بۆ

برای دڵسۆزتان

هەڤاڵ مام جەلال

١٩٩٩/١٢/٢٥

## هێزەکان بریتی بوون لە :

فەرمانـدەیی دووکـان: بەسەرپەرشـتی فـاتیح حەمـە ڕەش. لـە سـوور قاوشانو سرتەوە بەرەو چەمی ڕێزان.

فەرمانـدەیی سـلێمانی: بەسەرپەرشـتی لـەتیفی حـاجی فـەرەج. لـە کەڵەشێرەو کانیبی بەرەو چەمی ڕێزان.

منـیش لەگـەڵ دەسـتەکەی خۆمەوەکـو کارگـێڕی فەرمـاندەیـی گشـتی سەرپەرشـتی ئـەو کـارەم ئـەکرد. هێزەکانمـان هەریەکـە لـە قـوڵی خۆیانـەوە جووڵان، بـەڵام ئـەوان پـێش ئـەوەی ئێمـە بگەینـە سـەریان رایـانکردبوو دیـارە زانیاریـان پێگەیشـتبوو کـە ئەچـینە سـەریان. بۆمـان دەرکـەوت کـە بـەرەو قەڵاسـێوکە بڵاوەیـان لـێ کردبـوو، گـرنگ ئـەوەبوو ئـەوان ئـیتر لـەو شـوێنەوە مەترسیان بۆ ئێمە درووست نەئەکرد. دوای ئەوەی ئـەو ناوچەیەمان بـەووردی پشـکنیو زانیاریمـان لـە سـەریان کـۆ کـردەوەو گەشـتێکمان تێـداکردو بـەرەو بنکەکانی خۆمان گەڕاینەوە.

# ئاوا بوونی سەدەیەك

لەگەڵ ئاوابوونی ئەو دەستە سەرلێشێواوانەی پەکەکە،ساڵیش بەرەو ئاوابوون ئەچوو، ڕۆژگاریش لە تەمەن لار ئەبووەوە لەگەڵیشیدا هەنگاوەکانی سەدەی بیستەم خێراتر ئەبووەوو لەگەڵ خۆیدا لە ماوەی سەد ساڵی ڕەبەقدا هەزاران ڕووداوو کارەساتو قەومانی گەورەو گۆڕانی فراوانو پێشکەوتنی شارستانی بەربلاو لە ژیانی مرۆڤ دا بەرپا بووکە گەورەیی عەقڵی مرۆڤایەتی نیشان ئەدات، لەگەڵیشدا چەندین شەڕی جیهانو سەدان شەڕی بچووکتر لە لایەن داگیرکەرو دژ بە چەوساوەکانی جیهاندا، بەرپا بوونی شۆڕشی ئۆکتۆبەر کە گەورەترینوەرچەرخانی سەدە بوو کە بووە هۆی کێبەرکێ لە نێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواداو لەوێشەوە شەڕی سارد بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ بەردەوام بوو.. هەلایسا، دامودەزگای جیهانی لە بابەتی نەتەوەیەکگرتووەکانو ئەنجومەنی ئاسایشو..هتد درووستکران، چەندین سیستمی حوکمڕانی لە بابەت کۆمنوێڵسو یەکێتی سۆڤێت پەیدابوون، کۆلۆنیالی بەشێوازی کۆن نەماو زۆربەیوولاتە ژێردەستەکان ڕزگاربوونو دەوڵەتی سەربەخۆیان دامەزراندو ئالایان لە نەتەوەیەکگرتووەکان ئەشەکێتەوە. هەندێ میللەتیش بوونە ژێر پێی سیاسەتی چەپەڵی زەبەلاحی جیهانیوەکو ئەرمەنو فەلەستینیو کورد بەلام هیچیانوەکو کورد نییە. کورد توندترین چەپۆکی زەمانەی بەرکەوت، ڕووبارێکی دوورو درێژ لە خوێنو خەمی هەڵڕشت. ئازاری تاقەت پڕووکێنی بەدەست دوژمنەکانیەوە چەشت، داگیرو دابەشکرا، مافەکانی

بە توندی لێزەوتکرا، ناسنامەی نەتەوەیی شێوێنرا، تا دواجار کیمیایی بە سەرا ڕژێنرا،وازیشی لێنەهێنرا تا بە سەدان هەزاری لێ ئەنفالکرا.

بەڵام ئەم هەموو تاوانە بەرنامە بۆ داڕێژراوانەی سەردەم بێوەڵام نەبوون، پیلانە ڕەشەکانی دوژمنان چەندە دۆزەخی بن بۆ لەناو بردنو تەفرو توناکردن، توانای تەکنیکیو سەربازیان چەندە فراوانو بەهێز بێت، بەڵام نەتەوەی بچووکو ژێر دەستەیوەکو کوردیش لە ئاست ئەو ستەمو دەست درێژییانەدا پڕکێش بووە، ئازایەتی خۆی نیشانداوە، قارەمانەتی تۆمار کردووە، دەری خستووە کە لە دڵی ژیاندا زیندووە سەرەڕای هەموو گوشارەکان نامرێ.

لە ناو دارو پەردووی ئەم ژیانە تراژیدیەی کورددا ئەمە بەسەرهاتی خەڵکی ئێمەمانان بووە، کە پڕبووە لە شەڕو شۆڕ ئازارو دەردی سەری، بالأمان لە خوومخانەی کارەساتدا هەڵکێشرابوو. خۆشترین تافەکانی ژیانمان لەو پرۆسە تفتوتاڵانەدا بە سەر ئەبرد، قەدەری کورد بۆ ئێمەیوایهێنابوو ئەرکێکی گەورەو گران لە سەر شانمان بێ، ئەبوایە بە دڵسۆزییەوە بیگەیەنینە شوێنی خۆی، پیرۆزترین شت لامان خۆبەختکردن بوو بۆ ڕزگاری کوردو کوردستان، کەسی ژێر دەستە نازانێ چێژی ژیان چییە.!

دوای ئەو هەموو ڕەنجو ماندوو بوونو ئارەقە هەڵرشتنو خوێن بەخشینو کەفو کوڵی ناخی شۆڕشگێرانەو تاسەی گەیشتنە ئاوات، لە دوا دەیەی سەدەی بیستەمدا لە بەر بەستی پێخستنە دەروازەی سەدەیەکی نوێدا گۆڕانێکی سیاسی مەزن بە سەر دۆزی کورددا هات، ڕاپەڕینی سەرتاسەری لە دژی ڕژێمی دیکتاتۆریو کۆڕەوی ملیۆنی، کوردی بە دنیا ناساند، ئاڵوگۆڕێکی بنەرەتی هێنایە کایەوە، کە هەڵبژاردنی گشتیو دامەزراندنی پەرلەمانو حکومەتی هەرێمی کوردستانی لێڕسکا. کە دواتر لە شەڕێکی ناو خۆییدا ماڵوێرانییەکی تری بە دوادا هات.. دوای چوار ساڵ لە سەنگەر گرتنو تەقو تۆقو لەشکرکێشیو هەڵرشتنی لافاوی خوێنو ئاوارە بوون ئاو بەسەر ئەو ئاگرەشدا کراو بارێکی نوێ هاتە ناوانەوە، کە نەشەڕی گەرمو نەئاشتی ڕاستەقینەی تێدا دەرنەکەوێت.

# پارتیزانەکان
# لە بەڵگەنامەکانی ڕژێمدا

زۆربـەی دەزگـا جاسوسـییەکانی ڕژێـم هەوڵـەکانیان بـۆ چـاودێری جموجـووڵی شـۆڕش‌و تێکۆشـەرانی کوردایـەتی خسـتبووە کـارو دەیـان تـۆڕی نهێنییان پێکەوە نابوو کە بە سەدان‌و هەزاران کەس لە ناویدا جمەیان ئـەهات‌و زانیاری‌و دەنگوباسەکانیان لە ڕێگەی هەواڵدەرو خەفیەکانیانـەوە کۆ ئـەکردەوە بۆ لە داونانی پێشمەرگە قارەمانەکان یان تێکۆشەرانی ڕێکخستنەکانی ناو شـارو شارۆچکەو ئۆردووگاکان.

تێچووی ئەم دەزگایانە زۆر قەبە بوو چونکە ئەرکەکانیان گران‌و فراوان بوو، لە چـەندین لای جیـا جیـاوە سـەریان کردبـووە لاشـەی ئـەم گەلـە داماوەی کوردو شۆڕشەکەی‌و بـە دەیـان هۆکـاری جیـا جیاویستوویانە خۆیـان بگەیەننـە مەبەستە چەپەڵەکانیان.

وەنەبێ ئەم دەزگایانە هەر بە تەنیا پیاوی دڵسۆزی پلە یەکی ڕژێمەکەی تیا کۆبووبێتەوە بەڵکو دەیان جۆر خەڵکی ئاست جۆراوجۆری تێ پێچا بـوو کـە هەریەکەیان ڕادەی دڵگەرمی بۆ دەزگاکەو ڕژێـم جیـاواز بـووە، بۆیـە لـە ئاسـتی بـالآی ئـەو دەزگایانـەدا ئامـاژە بـە کەسێتی نۆکـەرەکانیان کـراوە کـە دڵنیاییـان بەرامبەریان بۆ هەڵسەنگاندن بەمجۆرە بووە: باش، مامناوەندی، خراپ.

کەواتـە بـە یـەك چـاو تەماشـایان نـەکراوە هـەر یەکـە لـە ئـەنجامی تێگەیشتن لە کارەکانی حیسابی تایبـەتی بۆ کـراوەو لـەو ڕوانگەیەشـەوە بـڕوای

بەباش یان بە خراپ پێبەخشراوە. ئەوان گوێیان نەداوەتە ئەوە ئەو کەسە ڕاستگۆ بووە یان درۆزن، دڵسۆز بووە یان نادڵسۆز لەگەڵیاندا، بەڵکو ئەوە گرنگ بووە کە خەڵکی پەلکێش بکەنە ناو جوغزی کارەکەیانەوەو تا هەتایە نەتوانن لێی دەربازبن‌و ناچاریش بن هەمیشە زانیاری جاسوسی بە سەرەوەی خۆیان بدەن. بۆیە ئەم دەزگایانە شێوازی تۆقێنەریان‌وەرگرتبوو هەر مەبەستیان تێکشکاندن‌و تەفروتوونا کردنی دەروونی کەسێتی مرۆڤی کورد بوو کە نەتوانێ لە چوارچێوەی عێراقدا بیر لە چارەنووسی ڕەوای خۆی بکاتەوە. ئەمە چەند بۆ کورد ڕاستە هەمان دەستور ئەم دەزگایانە کەوتبوونەوێزەی خەڵکانی تری دژ بە سیاسەت‌و دەسەڵات‌و کارو کردەوەی حیزبی بەعس‌و ڕژێمەکەی بە تایبەتی شیعەو لایەنە حیزبییەکانی تری عەرەب کە هەمیشە لە گەڵ بەعسدا ناجۆر بوون.

ئەوانەی پەیوەندیان بەم دەزگایانەوە کردووە لە ڕووی کەسێتی‌و ئاستی شارەزاییەوە جیاوازن، هەیانە گەورەترین خوێنەوارو سیاسەتزان‌و ڕۆشنبیر بووە هەشیانە کابرایەکی ڕەمەکی بووە. هەریەکەیان بۆ کارو شوێنی خۆی بە کەڵك هاتووەو بەکارهێنراوە، نەك هەر بۆ ناوخۆ بەڵکو بۆ دەرەوەی عێراقیش خەڵکێکی زۆریان لەم دەزگایانەدا بۆ جاسوسی کردن لە سەر خەڵك‌و حیزبە ئۆپۆزیسیۆنەکان درووستکردووە سەرەڕای کنە کردنی جاسوسیانە لە سەر ئەووولاتانەی کە پەیوەندییان هەبووە لەگەڵیاندا.

ئەوزانیاریانەی چنگیان ئەکەوێ ئاستی جیا جیا بە خۆوە ئەگرنەوە، بەشێك لە هەواڵدەرەکانیان نادڵسۆز بوون تەنیا بۆ پارەو پلەو پایە کاریان کردووەو لەو ڕێگایەشەوە پیاوە چاوزاقەکانی ئەو دەزگا تۆقێنەرانەیان قەڵەوو دەوڵەمەند کردووە بە زەبروزەنگ‌و هەڕەشە کردن لە خەڵکی بێ تاوان‌و لە دوایشدا بە سازشکردن‌و بە بەرتیل دەربازکردنیان. ئەم دەزگایانە ئەوەندە بۆگەن بوو بوون تا ئەو ڕادەیەی لێپرسراوە عەرەبە بەعسیەکانیش هەر بەو ڕێچکەدا ئەڕۆیشتن بۆ پێکەوەنانی دواڕۆژی خۆیان.

ئەم دەزگایانە مێژوویەکی ڕەشیان هەیە لە ژیانی خەڵکی داماوی عێراق‌و کوردستاندا، هەرچی ڕێگای ناڕەوا هەیە گرتوویانەتە بەر بۆ داپڵۆسین‌و سەرکوتکردن‌و ئەشکەنجەدان، قسەیەکی بچکۆلەی ناڕەزایی ئامێز بەسبوو بۆ ئەوەی ئەو کەسە سەری لە لاشەی جیا بکرێتەوە. جۆرەها کەسی بێتاوان بە هەڵە یان بە زانیاری درۆ یان بە دەسیسەی ناحەزی‌و ناکۆکی لە لایەن هەواڵدەرە جاسوسەکانەوە بێسەرو شوێن کراون‌و تالاوی مەرگیان پێچەشتوون.

بەعس ئەم دەزگایانەی بۆ پێشخستنی کۆمەڵگای عێراقی پێکنەهێناوە بەڵکو بۆ قایمە کاری خۆی‌و پاکسازیکردنی ئەو خەڵك‌و خوایەی لەگەڵیدا نەبوون بە باش‌و خراپیشەوە، تەنانەت سەری هەزاران بەعسی لە ڕیزەکانی خۆیدا چ لە حیزب‌و چ لە سوپادا پەڕاندووە تەنیا لە بەر ئەوەی‌وورتەیەکی ڕەخنە ئامێزیان لە دەم دەرهاتووە.

مێژووی ئەم دەزگایانە لە تاوان ئەنجامدان بەرامبەر بە کورد لاپەرەیەکی زۆری گرتووەتەوە، ئەوەی هیچ کەسێك بە بیریدا نەهاتبێ لە داتاشینی شێوازی ترسناکی توندو تیژی‌و کوشتوبڕین دەستی بۆ بردووەو لێی نەسڵەمیوەتەوە. تاوانەکان چەندە ترسناکبووبن بەعس‌و جەندرمەکانی مردن لێی بێباکبوون‌و بایەخیان بە ناڕەزایی خەڵکی‌و ڕێکخراوە جیهانی‌و نێو دەوڵەتیەکانیش نەداوە.

کە چاوێك بەم بەڵگەنامانەی بەردەستمان کەوتووە بگێڕین ڕوون ئەبێتەوە ئەو زانیاریانە چەندە بێسەرو بەرن، زۆر بە باشی مەبەستیان نەپێکاوە، لە ڕاستیشدا بێسەرو بەری بنووسەکانیشیان نیشان ئەدەن.

ئێمە ناڵێین هەموو شتەکانیان ناراستە بە ڵکو لە ڕێگەی ئەو هەموو خەڵکە زۆرەوە درووستیان کردووە بازێك زانیاریان هەر پەیدا کردووە بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بۆ دەزگا گەلێك کە دەوڵەتێکی‌وەکو عێراق بیانبات بەڕێوە

کارێکی سووك‌و بێ نرخە، ئەبوایە شتەکانیان‌ووردو بەهێزو پتەو بوایە، کەسەکانیشیان لێهاتووو کارامەو شارەزاتر بوونایە.

لێرەدا ئەوەی ئێمە چنگمان کەوتووە لەو بەلگە نامانەی دەزگای ئیستیخباراتی عێراقی دەقەکەی کە بە عەرببیە ئەنووسینەوەو زانیارییە هەلەو چەوتەکانیان دەسنیشان ئەکەین کە سەرەڕای قەبەیی ئەو دەزگایەو ئیمکاناتی مادی‌و مرۆیی بەردەستیان لە بەرامبەر کەم ئیمکاناتی شۆڕشی کورد بە تایبەتی لە کاتی پارتیزانی دوای ئەنفال تا ڕاپەڕین بۆمان ئاشکرا ئەبێ دوژمن نەیتوانیوەوەکو پێویست کۆنترۆلی بارودۆخەکان بکاو مەبەستەکانی خۆیشی جێبەجێ بکات بە تۆکمەیی، بەلکو ئەبینین درزێکی زۆر لەو بوارەدا هەیە کە ئەو دەزگایانە نەیانتوانیوە کوێرلەمەی بکەن. هەر بۆیەشە پارتیزانەکان توانیویانە کاری خۆیان بکەن‌و ڕێکخستنەکانیش ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن مەگەر لە ئەنجامی هەلەیەکەوە یان سەرکەشی کردنی هەڤالێکەوە تووش بوو بن‌و کەوتبنە بەر قەپیلکی ئەو دەزگا داپلۆسێنەرانە.

ئەمەش هەندێك لەو بەلگەنامانەیە:

# بەڵگەنامەی (١)

سريةء فورية

من /م ا س كلار

١٩٩٠/١/١٤

الى /م ا س م الشرقية ـ ش ٢

رقم المنشيء / ق ٣ /٥٢/١/

(.) رسالتكم السريةء الفورية ش٣/ق٢/١٦١٥٥ في ٨٩/١٢/٢٠

(.) تتجول مفرزتين من زمرة عملاء ايران بامرة المجرم احمد حاجى رشيد في قريتي (عمر بل)ء (قورى جاى) (.) اسلحتهم بنادق كلاشينكوف مع رمانات يدوية.

(.) يرجى التفضل بالاطلاع ... مع التقدير.

الملازم الاول

و/امر مركز استخبارات كلار

ك٢ ١٩٩٠

- هەموو پێشمەرگەیەکی دڵسۆز بۆ گەل و نیشتمانەکەی بەلای بەعسەوە ( مجرم)ە.
- هەموو هێزێکی شۆڕشگێڕ هەر پەیوەندییەکی ڕەوایشی لەگەڵ دەوروبەردا هەبێ بەلای بەعسەوە ( زمرە عملاو ایران ) ە.

# بەڵگەنامەی (٢)

سريةءفورية

من / م ا س كلار

الى / كافة المفارز كفرى ـ الصمود

رقم المنشيء /ق٢/٣

في نهايـة شـهر ك٢ ١٩٩٠ عـاد العميـل نوشـيروان مصـطفى مـن الخـارجء توجـه الى مقـرات زمرتـهءالتقى بقيـادي الزمـرةء ادعـى بـانهم سيبداون بتنفيـذ عمليات تخريبية داخل اراضيناء خاصة في المحافظات الوسطىء الجنوبية بواسطة عناصر حزب الدعوة العميلء تشمل العمليات التخريبية تفجير السياراتء القنابل الموقوتة في اماكن تجمع المسؤلين في المحافطـات المـذكورة امـا في المنطقـة الشـمالية فتكون العمليـات التخريبـة عـن طريـق حـرب العصاباتء باسـلوب سـري لتحقيـق نتائج جيدة باقل ما يمكن من الخسائر (.) نـرجو متابعة المعلوماتء تزويدنا بـاي مستجدات حولهاءاعلامنا.

م. اول

امر م ا س كلار

- بەعس لە هەموو جموجوولێکی سەرکردەکانی شۆڕش ترساوە، هەر قسـەیەکیان بووەتە هۆی شڵەژانو ئاڵۆزییان ئەگەر جاران لـە پـێش ئەنفالـدا مەترسـی چـالاکی پێشـمەرگەیان لـە کوردسـتاندا هـەبووبێ، لـە دوای ئـەنفالیش مەترسـی چـالاکی پێشمەرگە لە ناوەڕاستو خوارووی عێراق ناخی سمیونو زەندەقی بردوون.
- لـەم ڕووەشـەوە هەنـدێ زانیاریـان دەسـتکەوتووە کـە لەوانەیـە سـەرەنجامی لێکدانەوەی هەلومەرجەکە بووبێ کە پێویستی کـردووە شـێوازی کـارکردن بگـۆڕێو بیر لە بەرنامی تازە تر بکرێتەوە.

## بەڵگەنامەی (٣)

رسالة سريةءفورية

من / م ا س كلار      /   / ١٩٩٠

الى / م ا س م الشرقية ـ ش ٣

رقم المنشيء /ق٢/١١٥

(.) بتاريخ ١/١٦ دخلت مفرزة من مخربي عملاء ايران الى القطر بامرة المجرم سلام كوخة عزيز امر تيب بموءالمجرم محمود ماما عزيز امر تيب زمناكو (.) يقدر عدد المفرزة بـ (٨) مخربء عند دخولهم الى منطقة شهرزور اصطدموا بكمين في منطقة خداجان التابعة الى ناحية عرينء تمكن افراد الكمين من اسر احد المخربين (.) تمكن المخربين الباقين من الهروب الى منطقة قرداغ (.) علمنا كانت اسلحتهم خفيفة(.) يرجى الاطلاع.

الملازم الاول

و/ امر مركز استخبارات كلار

• ڕاستە ئەم مەفرەزەیە دابەزیون ، بەلام زانیارییەکان کە دەست ئەم دەزگا جاسوسییە کەوتووە فڕی بە ڕاستییەوە نییە.. چونکە ئەمانە لە قوڵی بەمۆوە دابەزیون نەك شارەزوور.. تووشی شەڕیش نەبوونو کەسیشیان لێنەگیراوەو ناوچەی (خداجان) خەراجیانەو (عرین) عەربەتە کە پێ ئەچێ هەڵەی چاپ بێ.

## بەڵگەنامەی(٤)

مديرية الاستخبارات العسكرية العامة

منظومة استخبارات المنطقة الشرقية

سري للغاية

الرقم/ش٣ /ق٣/ /قادسية صدام/٤٩٧٣

التاريخ/٦/مايس/١٩٩٠ م

١١/شوال/١٤١٠ هـ

الى/مركز استخبارت(كلار)

الموضوع/معلومات

توفرت لدينا معلومات حول تسلل مفارز تخريبية الى المنطقة الشماليةء كما يلي:ـ

١. مفرزة تخريبية بامرة المجرم محمود سنكاوى تقدر قوتها(١٥) مخرب يتجولون في منطقة كرميانء كلارء دربندخانء سنكاوء بازيانء معهم جهاز لاسلكى نوع راكالء ادناه بعض اسماء المخربين: ـ

أ. المخرب ماجد فيلي ـ من اهالي بغداد (امر كرت).

ب. المخرب شهاب خانقيني (مخرب عادي).

ج. المخرب جاوحوان (امر كرت).

د.المخرب حسن سوور ـ من اهالي كلار (مخرب عادي).

هـ. المخرب ازاد فلولس ـ من اهالي خانقين (امر مفرزة).

و. عدد من المخربين من اقارب المجرم محمود سنكاوى.

٢.مفرزة تخريبية بامرة المخرب كردو فيلي ـ من اهالي بغداد (اسمه الحقيقي عباس)ءهو مسؤول منطقة كلارء خانقينء كرميانء دربندخانءيتجولون في المناطق المشار اليها في المادة (١) اعلاه عرف منهم مايلي: ـ

أ. المخرب هلكوت احمد ـ من اهالي كفري (كادار سياسى من جناح الكوملة).

ب. المخرب شمال ـ من اهالي كفري (كادر سياسي في جناح الكوملة).

ج. المخرب محمد باربولة ـ من اهالي كلار (معاون امر كرت).

د.المخرب هزارءاسمه الحقيقي( خليل محمد )ءهو مكلف بجمع المعلومات.

هـ. عدد من اهالي المخربين العائدين للصف الوطني.

٣.ءاجب المفارز المشار اليها اعلاه الاختفاء في المناطق المذكورةء ادامة الاتصال مع التنظيمات الداخليةءجلب المعلوماتءعدم القيام بعمليات تخريبية.

نرجو الاطلاعء تدقيق صحة المعلوماتءاعلامنا.

العقيد

عـ /مدير منظومة استخبارت المنطقة الشرقية

٦ مايس ١٩٩٠

خاڵی ١: هەندێك لە ناوەكان بە هەڵە نووسراون:

ـ حسن سوور نییە بەڵكو حەسەنە ڕەشە كە هەمان حەسەن شێخ لەنگەرییە.

ـ ازاد فلولس نییە، ئازاد فەرەوڵسییە.

خاڵی ٢: ـ كردۆ: ناوی ڕاستەقینەی عەباس نییە بەڵكو سەعدون قاسمە.

ـ هزار: ناوی خەلیل ئیبراهیم محەممەدە.

ـ محمد باربوله: محەممەد پاریاوڵەیە.

## بەڵگەنامەی(٥)

سرية فورية

وقت الانشاء

يومـــــــه     ١٩٩٠/٥/١٦

من / م ا س كلار

الى / م ا س م الشرقية/ ش٣

رقم المنشيء / ق٣ (.) علمنا من مصدرنا محمد زاهر درجة الثقة به جيدة (.) تتواجد حاليا مفارز تخريبية تابعة الى مخربي عملاء ايران فى قاطع قرداغ بامرة المجرم كردو (.) نيتهم القيام بعمليات تخريبية (.) يرجى الاطلاع.

الملازم الاول

ء / امر مركز استخبارات كلار

١. ناوی سەرچاوەکەی خۆیانی بە ئاشکرا نووسیوە کە محەممەد زاهیرە، بەڵام نازانرێ خەڵکی کوێیە، لەوەش ئەچێ خەڵکی ئەو دۆڵی قەرەداخە بێ.

٢. کاک کوردۆ لە سنوری قەرەداخ نەماوەتەوە، مەگەر بۆ ئەمسەرو سەری هاتن‌و گەڕانەوە بەو ناوەدا ڕۆیشتبێ، چونکە ئەو لە گەرمیان بووەو قەرەداخیش مەفرەزەی پارتیزانی تری تیا بووە.

## بەڵگە نامەی (٦)

بسم الله الرحمن الرحيم

سري

( النصر لنا )

مركز استخبارات كلار

الى / م ا س كلار        مفرزة استخبارات الصمود

الموضوع / اجابة

العدد/٣٦

التاريخ/١٩/٥/١٩٩٠

( ١) كتابكم السرب ٥٨ في ٥/١٣ الفقرة (١) من كتابكم اعلاه المعلومات غير مؤيدة.

(٢) المعلومات مؤيدة فقط بتواجد في قاطع كلاره كرميان المجرم عثمان حاجي محمود.و معه مجموعة من المرخبين تقدر عددهم ( ١٢) مخربا. هذا بالنسبة للفقرة (٢) من كتابكم اعلاه.

(٣) الفقرة (٣) من كتابكم اعلاه المعلومات غير مؤيدة.

(٤ ) الفقرة (٤) من كتابكم اعلاه تم استدعاء المدعو حسن شيخ لنكري الى مفرزتنا لتأكد من صحة المعلومات. فاجاب بأنه لايعرف أي شيء عن المخربين داخل القطر في المنطقة الشمالية. نقترح استدعاء المذكور في كتابكم اعلاه الى مركزنا لكونه يعرف معلومات تفصيلية عن المخربين.

يرجى التفضل بالاطلاع

ن ض ا س

امر مفرزة استخبارات الصمود

١٩/٥/١٩٩٠

المصدر

نوري مجيد

(سري)

تم تبليغ كمال بتبليغ حسن لنكر بالحضور الى المركز ١٩٩٠/٥/٢٠

١. ناوی سەرچاوەکەی خۆیانی نووسیوە کە نوری مەجیدە.

٣. ئەو بۆچوونەی لە سەر حەسەن شێخ لەنگەری هەمان بوو کاتێ تەسلیم بووەوە بە ڕاست دەرچووکە لە لای دوژمن هیچ لە سەرمان نالێ، ئەوەتا ئیستخبارات حەسەنیان بانگ کردووەو هیچ زانیارییەکی لە سەر پارتیزانەکان نەداوە.

## بەڵگەنامەی (٧)

سرية فورية

من / م ا س م الشرقية ٦/١١

الى / م ا س تكريت / م ا س كلار / م ا س جم جمال

رقم المنشيء / ش٣ /ق٢ /٥٤٦٢ / طوز خورماتوو/١/١٠٠٠٠٠/./ توفر لدينا المعلومات التالية /./ تتجول مفرزة من زمرة عملاء ايران بامرة العميل عثمان حاج محمود مؤلفة من /١٠/ مخربين في القرى بلكة الكبيرة/ ٩٢٨١/وبلكة الصغيرة/٨٩٤٩/./ نرجو تدقيق صحة المعلومات اعلامنا بسرعة الممكنة.

دوژمن زانیارییەکیان هەبووە کە مەفرەزەکەی کاك عوسمانی حاجی مەحمود سنوری ڤاتەکانی بەلەگەی سەروو و خواروو هەبوون. بەڵام نەشیان توانیوە بیاندۆزنەوە.

## بەڵگەنامەی ( ٨ )

سرية فورية ١٩٩٠/٦/١٣

من / مفرزة ا س كفري

الى / م ا س كلار

رقم المنشيء/٢٤/رسالتكم السريةءالفورية ٥٦٢ في ٦/١٢/. المعلومات مؤيدة /./تتجول المفرزة في قاطع كفريء كلارء قد عرف منهم المخرب محمود سنكاويء المخرب احمد حاجي رشيد /./ يرجى التفضل بالاطلاع.

- هەمان شت زانیاری ئەوەیان دەستکەوتووە کەوا مەحمود سەنگاویو کاك ئەحمەدی حاجی ڕەشید لە ناوچەی کفریو کەلار جەولە ئەکەن..
- لە ڕاستیشدا کاك ئەحمەد زۆر جار پەناگاکانی لە ناوچەی کفری دروستکردووەو لەو ناوە کەمتر دوور کەوتووەوەتەوە ، منیش مەگەر بۆ سەردانو کاری پەیوندیو چاوپێکەوتنی برادەرانی ناو شار چووبێتمە ناوچەی کفریو بەسەرکردنەوەی هەڤاڵان لە ناوچەی کەلار، زیاتر لە پەناگاکانی شاخی سەگرمەو ئاژداخ بووم..بۆیە زانیارییەکانیان زۆروورد نییە.

## بەڵگەنامەی (٩)

بسم الله الرحمن الرحيم

مركز استخبارات كلار

مفرزة ا س الصمود

العدد / ٣٠

التاريخ/٢٠/٦/١٩٩٠

الى/ م ا س كلار

م/ معلومات

١. بتاريخ ٦/١٥ قتل خمسة من مخربي الحزب الشيوعي العراقي العميل في منطقة طاسلوجة من قبل قطعاتنا العسكريةء عرف من بين هؤلاء المخرب المجرم المقتول عمرء المجرم المقتول عثمانء هم من القومية الكرديةءالثلاثة الاخرى المقتولين من القومية العربية.

٢. دخل الى قاطع قرداغ المجرم محمود سنكاوىء معه (١٠) مخربا من جماعة عملاء ايرانءيحملون الاسلحة التالية جهاز راكال عدد(١)ء قاذفة عدد (٢)ء بي كى سى عدد(٢)ء عدد من بنادق كلاشينكوفء عندءصول المفرزة الى قاطع قرداغ عاد المجرم محمود سنكاوى مع احد المخربين الى ايران. حيث تتجول (٩) من مخربي عملاء ايران في قاطع قرداغ.

المصدر

غفور قادر درويش

ن ض ا س

امر مفرزة استخبارات الصمود

(سري للغاية)

له بارەی خاڵی دووەمەوە زانیارییەکانیان هەڵەیەو سەرچاوەکەیان کە غەفور قادر دەروێشە بە درۆ بۆی ناردوون، مەگەر هەر بۆ ئەوەی بێ کە بڵێ چالاکی جاسوسیانەی هەیە.. ئەگینا ئێمە لە مانگی ١٩٩٠/٤ دا گەڕاینەوە دیوی ئێران‌و لە خوارەوە نەبووین.

## بەڵگەنامەی(١٠)

سرية فورية

وقت الانشاء

يومــــــــه ٩٠/٦/٢٢

من/م ا س كلار

الى/ م ا س م الشرقية/ش٣

رقم المنشيء/٤٦٤ /ق١/٣ (.) علمنا من مصدرنا غفور قادر درويش درجة الثقة بەءسط (.) دخل الى قاطع قرەداغ المجرم محمود سنكاويء معه (١٠) مخربين من مخربي عملاء ايرانء يحملون الاسلحة التاية قاذفة عدد (٢)ء بي كي سي (٢)ء عدد من بنادق كلاشينكوفء جهاز راكال عدد(١)ء عندءصول المرفزة الى قاطع قرەداغ عاد المجرم محمود سنكاوى مع احد المخربين الى ايرانء حيث يتجول (٩) من مخربي عملاء ايران في القاطع اعلاه (.) يرجى الاطلاع.

الملازم الاول

امر مركز استخبارات كلار

١.دیاره ئەم غەفور قادر دەروێشە هەر درۆزن بووەوەکو دەزگاکەی چۆن لـە سـەر درۆو دەلەسە لە سەر پێ ڕاوەستاوە.. ئەوەتا دەزگاکەی زۆر بە جێی باوەڕی خۆی نازانێ‌و بـە باشی متمانەی پێناکات.

٢. نەینووسیوە کەی ئێمە دابەزینو کەی منو یەکێك لـە مخەربیەکـەکان گەڕاوینەتـەوە بۆ ئێرانو ٩ کەسەکەی تر لە سنوری قەرەداخدا جەولە ئەکەن.

## بەڵگەنامەی( ١١ )

**رئاسة الجمهورية**

**السكرتير**

**مديرية الاستخبارات العسكرية العامة**

**منظومة استخبارات النطقة الشرقية**

**مركز استخبارات كلار**

**سري للغاية**

**العدد /ق٣/ ٥٦٥**

**التاريخ ٢٠/ ربيع الاول / ١٤١١ هـ**

**الموافق ٩/ت١/١٩٩٠ م**

**الى / منظومة استخبارات المنطقة الشرقية (ش ٣)**

**الموضوع / معلومات**

**علمنا من مصدرنا علي محمد سعيد بما يلي: ـ**

**١. بتاريخ ٢ ت١ ١٩٩٠ خرجت من مجمع الصمود التابع الى قضاء كلار مفرزة من مخربي زمرة عملاء ايران بامرة المخرب محمود سنكاويء كان عددها يقدر بـ (١٥) مخربءاتجه الى قاطع قرداغ.**

**٢. بتاريخ ٤ ت١ ١٩٩٠ خرج من المجمع المذكور المخرب عثمان حاجي محمد كادر سياسي لمخربي زمرة عملاء ايرانء برفقته المخرب مكرم رشيد الدلوي كادر**

عسكري لمخربي زمرة عملاء ايران بعد ان كانوا يمكثون في دار المدعو فريق احمد رشيد من سكنة المجمع المذكورء اتجه الى قاطع قرداغ.

يرجى التفضل بالاطلاع ... مع التقدير.

النقيب

امر استخبارات كلار

٩ ت ١ ١٩٩٠

(١ - ١)

سري للغاية

- ناوی سەرچاوەکەی نووسیوە کە عەلی محەمەد سەعیدە.
- هەرگیز نەچوومەتەناو ئۆردووگای سموددوە، بەڵکو کارم بەوێ نەبووە.. هەندێ جار برادەران هاتوچۆی ئەوێیان کەلاریان کردووە جاری‌وا هەبووە بۆ بینینی کەسوکار جاریش هەبووە بۆ پێگە دروستکردن‌و کەلوپەل پەیدا کردن.
- نەشم بیستووە کە کاک عوسمان‌و کاک مکەڕەم پێکەوە بچنە ناو سمود..
- سەیرە ئەگەر دوژمن زانیبێتی ئەو برادەرانە ئەچنە ماڵی فەریق ئەحمەد ڕەشید ئەی چۆن نەگیراوە، یان چۆن ئەو برادەرانە ئابڵوقە نەدراون‌و دەستگیر نەکراون..؟.

# بەڵگەنامەی (١٢)

مديرية الاستخبارات العسكرية العامة

منظومة استخبارات المنطقة الشرقية

مركز استخبارات كلار

سري للغاية

العدد /ق٣/٥٨٤

التاريخ/١/ربيع الثاني/١٤١١ هـ

الموافق ١٩/ت١/١٩٩٠ م

الى منظومة استخبارات المنطقة الشرقية (ش٣)

الموضوع / معلومات

علمنا من احد مصادرنا بما يلــــــــــــــــي: ـ

في الاونة الاخيرة بعد حركة فق/٢٧ من قاطع خورمال ـ حلبجة الى قاطع اخر لوحظ الىءجود مقرات لزمر الحركات التخريبية في القاطع اعلاهء كما يلي: ـ

١. مقر في قرية كرجال التابعة الى ناحية خورمال تابع الى زمرة سليلى الخيانة بأمرة المجرم شيخ جعفر مسؤول لجنة محلية حلبجةء يقدر عددهم بـ(٦٠ ـ ٨٠) مخرب ينون القيام بعملية كسب العناصر الى تنظيماتهمء عمليات التخريب.

٢. مقر قرية باني شار التابعة الى ناحية خورمال تابع الى زمرة سليلي

الخيانة بأمرة المجرم حمة حمة سعيد امر بتاليون التابع الى لجنة محلية حلبجة.

٣. مقر في منطقة رنكين التابعة الى ناحية خورمال تابع الى الحركة الاسلامية بامرة المجرم ملا احمد من اهالي حلبجةء يقدر عددهم بـ (٢٥ ـ ٣٥) مخرب.

٤. مقر في منطقةءادي بان بنوك التابع الى قضاء سيد صادق تابع الى زمرة مخربي الحسك بأمرة المجرم علي بجكول يقدر عددهم بـ(٣٠ ـ ٤٠) مخرب.

٥. مقر في قرية مير سوور التابعة الى قضاء سيد صادق تابع الى زمرة مخربي الحسك بأمرة المجرم محمد حاجي محمود الملقب (محمد كاخانة).

٦. مقرين في قرية درمر التابعة الى ناحية خورمال احدهما تابع الى زمرة سليلي الخيانة بأمرة المجرم فلاح حمة امين امر كرت في لجنة محلية حلبجةءيقدر عددهم بـ(١١) مخربءالاخر تابع الى زمرة مخربي الحسك بأمرة المجرم محمد حمزة من اهالي قضاء كلارء يقدر عددهم بـ(١٦) مخرب.

يرجى التفضل بالاطلاع ... مع التقدير.

النقيب

امر مركز استخبارات كلار

١٩ ت١ ١٩٩٠

(١.١)

<u>سري للغاية</u>

- هەموو زانیارییەکان لە بارەی ژمارەی پێشمەرگەکانەوە بەو جۆرە نییە، بەڵکو هەر بنکەیەك لە چەند پێشمەرگەیەك تێنەئەپەڕی.
- محمد کاخانە نییە بەڵکو مەحەممەد گوڵە خانەیە.

## بەڵگەنامەی (١٣)

مديرية الاستخبارات العسكرية العامة

منظومة استخبارات المنطقة الشرقية

سري للغاية

العدد /ق١/ ٥٩٦

التاريخ /٤/ ربيع الثاني /١٤١١ هـ

الموافق ٢٢/ت١/ ١٩٩٠ م

الى / منظومة استخبارات المنطقة الشرقية (ش٣ )

الموضوع / معلومات

علمنا من مصدرنا سعيد نادر درجة الثقة به فةق الوسط ما يلي: -

١. يتدرب في معسكر خدر شاه الايراني التيبات المدرجة ادناه العائدة الى زمرة عملاء ايران على الاسلحة الخفيفةء المتوسطةء الكيمياويةء عدد كل لجنة (٥٠) مخرب.

أ. تيب (٥١) كرميان

ب. تيب (٥٣) شيروانة

ج. تيب (٥٩) حمرين

٢. يتدرب في معسكر خدر شاه الايراني ثلاثة محليات من اللجان التابعة الى سليلي الخيانة المدرجة ادناه على الاسلحة الخفيفةءالمتوسطةء الكيمياويةء عدد كل لجنة (٥٠) مخرب.

أ. لجنة محلية خانقين

ب. لجنة محلية حلبجة

ج. لجنة محلية دووكان

٣. يتواجد الكرت السادس التابع الى تيب (٥٣) شيروانة بأمرة المخرب عثمان حاجي محمود امر كرت في قرية قليجان التابعة الى قضاء كفري.

٤. تتواجد مفرزة من مخربي الحزب الشيوعي العراقي العميل بأمرة المخرب محمد رشيد قرداغ يعاونه المخرب اسكندر كاكا عبدالله في منطقة قوالي التابعة الى قضاء كفري، عدد المفرزة (٢٥) مخرب مهمتهم الاتصال بعناصر التنظيمات الداخلية في قضاء كفري ،مجمع الصمود.

يرجى التفضل بالاطلاع... مع التقدير.

النقيب

امر مركز استخبارات كلار

٢٢ ت١ ١٩٩٠

(١-١)

سري للغاية

- هەر چەندم کرد نەمزانی معسکر خلر شاه لە چی شوێنێکدایە.
- ناوەڕۆکی خاڵی (٤) ڕاست نییە، چونکە ئەو هاوڕێیانەی حیزبی شیوعی لە خوارەوە نەبوون.

# بەڵگەنامەی (١٤)

مديرية الاستخبارات العسكرية العامة

منظومة استخبارات المنطقة الشرقية

مركز استخبارات كلار

سري للغاية

العدد /ق/١/٦٤٤

التاريخ/١/جمادي ١/١٤١١ هـ

الموافق ١٧/تشرين الثاني/١٩٩٠م

الى /منظومة استخبارات المنطقة الشرقية (ش٣)

الموضوع / معلومات

علمنا مايلي:-

بتاريخ ١٩٩٠/١١/١٣ خرجت مفرزة من مخربي عملاء ايران بأمرة المخرب حمة تلة من منطقة شهرزورء دخلت الى منطقة قرةداغ لغرض جمع المراتب الاكراد الهاربين من الخدمة العسكريةء الذين عادوا مؤخراً الى الصف الوطنيء التنسيق مع افواج الدفاع الوطنيء ذلك لكسبهم الى جانبهم.

يرجى التفضل بالاطلاع. مع التقدير.

المصدر

سعيد حمة رسول

النقيب

امر مركز استخبارات كلار

١٧ ت٢ ١٩٩٠

(١ - ١)

سري للغاية

تء (ا.ب.ح)

- سەرچاوەی زانیارییەکە سەعید حەمە ڕەسوڵە.
- حەمە تەلە کە شەهید شاهۆیە، لە دوای ئەنفال خۆی براکانی گەڕانەوە لای پارتیزانەکانو خێزانەکانیشیان دەستگیرکران، هەمیشە لە گەرمیانەوە ئەچوو بۆ قەرەداخ بۆ ئەنجامدانی کاری پارتیزانی..
- لە پێش ڕاپەڕینیشدا بە هاوکاری هەڤاڵانی ترو بە پێی ڕێنماییەکان پەیوەندییان بە خەڵکیو دۆستانو چەکدارەکانی ڕژێمەوە ئەکرد بۆ خۆسازدان بۆ ڕاپەڕین. دیارە ئەوانەی کە شاهۆو برادەرانی تریش پەیوەندییان پێوە کردوون زانیارییان داوەتە دامودەزگا جاسوسیەکانی ڕژێم و لەوانەشە لە ترسدا بووبێ نەوەکو ڕژێم پێیان بزانێو لە ناویان بدات..



مەحمود سەنگاوی          هەڤاڵ مام جەلال          كاروان مەحمود



ئەندامانی فەرماندەیی گشتی هێزی پێشمەرگەی كوردستان



هەڤاڵ مام جەلال لە کاتی وتار خوێندنەوەدا

دزلی ١٩٨٩



سەردانی کاک نەوشیروان بۆ بەسەرکردنەوەی تەشکیلاتی

بەتالیۆنەکان ١٩٩٠/٦/١٠



قەڵاچوالان – ١٩٩٥

مەحمود سەنگاوی- هەڤاڵ جەبار فەرمان



هۆڵەندا – ئەمستردام -١٩٩٤

مەحمود سەنگاوی- شێخ جەعفەر- عەدنانی حەمەی مینا- مام رۆستەم



سوریا دیمەشق -١٩٩٣

مەحمود سەنگاوی – مەحمود عیدۆ- عارف روشدی- دانای ئەحمەد مەجید-

مەلا رەحمان- مامۆستا گۆران- نەوزادی کاکە رەش



ئێران – کرماشان ١٩٨٧

شەهید حەمە رەش - مەحمود سەنگاوی



ئێران – دزڵی ١٩٨٩

نووسەرو فەرماندەکانی سنوری مەڵبەندی یەك



گەرمیان ١٩٩١/٣/٧

هەڤاڵ فەریدوون عبدالقادرو پێشمەرگەکانی کاتی دابەزین بۆ راپەڕین



حەمەئەمین عەلی عەبدوڵڵا          عوسمان حەمەئەمین

باوکی نوسەر          برای نووسەر



تەمین مەحمود مراد خان          جەلال شۆڕاوەیی          کەریم حەمەئەمین

دایکی نووسەر          برای نووسەر

لەکاتی ئاوارەیی ئێراندا ١٩٨٨



خێزانی نووسەرو خێزانی کەریمی برای نووسەر

ئاوارەیی ئێران ١٩٨٨



مەحمود سەنگاوی و شنۆی کچی

گوندی کانی دینار – ئێران ١٩٨٨



ئێران – گوندی کانی زەرد ١٩٨٨

هەموو ماڵەکەمان ئەوەندە بوو



پارتی زانەکانی گەرمیان

گوندی کەڵەشێرە ١٩٩١/٢/٢٨



**شەهیدانی ئەشکەوتی داری خلە**

**١٩٨٩/١٢/١٩**



**گەرمیان- گوندی زستانە ١٩٨٩**

**ماڵە روخاوەکەی عەلی خدر**



مەحمود سەنگاوی

شەهید قاسم فەقێ عەلی

چەمی شۆڕی گەرمیان - ١٩٨١





سوریا - دیمەشق ١٩٩٣

لەسەر گۆڕی قەدری جان



پارتیزانەکانی گەرمیان

ئەشکەوتەکەی سەرووی پاریاوڵە ١٩٩١/٣/٨



شەهید عەلی شوکر غالب تاڵەبانی



پارتیزانەکانی گەرمیان

گوندی مەسۆیی بەرگەچ ١٩٩١/٣/٤



گەرمیان- گوندی کۆیکی روخێنراو پایزی ١٩٩٠



پارتیزانەکان بەدیار لاشەی فڕۆکەیەکی پێکراودا

گەرمیان گوندی چیا چەرمو ١٩٩١/٣/٧



پارتیزانی ١٩٨٩

گەرمیان – گوندی روخێنراوەکەی زستانە



پارتیزانەکانی گەرمیان

گوندی سێ قازان ١٩٨٩



مەحمود سەنگاوی      شەهید فازڵ شیرەمەڕی

پارتیزانی ١٩٨٩



مەحمود سەنگاوی      شەهید عوسمان هاڵدەرەیی

گوندی قازانقایە ١٩٨٢/١١/٢٠



**سوریا – دیمەشق ١٩٨٣**

**مزگەوتی ئەمەوی- گۆڕی سەلاحەدینی ئەیوبی**




ئەشکەوتی داری خلە - لە کاتی دەرهێنانی تەرمەکاندا

١٩٩١/١٠/٥



گۆڕستانی کەلار

تەرمی شەهید

مەلا ئەحمەدی کەلاریی



گەرمیان ١٩٧٩

حەمیدە بچکۆل      شەهید قاسم فەقێ عەلی      مەحمود سەنگاوی



پارتیزانەکانی گەرمیان

ئەشکەوتی پاریاوڵە ١٩٩١



**ئێران کانی دینار ١٩٨٨**

**مەحمود سەنگاوی      گەرمیانی کوڕی      مامۆستا جوامێر      مام جەلالی گەرمیان**



